**نەوشیروان مستەفا ئەمین**

# بەدەم رێگاوە گوڵچنین؛
## چەند لاپەڕەیەک لە مێژوی
## رۆژنامەوانیی کوردی
1898– 1958

**کتێبی دوەم– بەرگی یەکەم**



الدار العربية للعلوم ناشرون ش.م.ل
Arab Scientific Publishers, Inc. S.A.L

# ناوەرۆک

# پێشەکی

تائێستا زۆر باس و بابەت و لێکۆڵینەوە لەسەر مێژوی رۆژنامەوانی کوردی، بە کوردی و بە زمانی تر، بە تایبەتی لەم چەند ساڵەی دواییدا نوسراوە. بێگومان ئەمانە هەریەکەیان بە جۆرێ ئەو کۆشکە بەرز و پیرۆزەیان رازاندۆتەوە. مێژوی رۆژنامەوانیی کوردی بەشێکە لە مێژوی نەتەوەی کورد، لە گەڵ جولانەوەکەدا رۆیشتوە و تێکەڵاوی بوە، کاری لە جولانەوەکە کردوە و جولانەوەکە کاری لەو کردوە. رۆژنامەی کوردی لە 114 ساڵی رابوردودا، سەرچاوەیەکی بە نرخ و باوەڕپێکراوی لێکۆڵینەوەی لایەنی سیاسی، رۆشنبیری، کۆمەلایەتی، ئابوری، ئەدەبی، پەروەردەیی... ژیانی گەلی کوردە.

ئەم چەند لاپەڕەیە، بەشێکە لە پرۆژەیەکی گەورەتر بۆ لێکۆڵینەوەی مێژوی رۆژنامەوانیی کوردی. لەم بەشەدا و، لە بەشەکانی تریدا هەولم داوە، پرۆگرامێکی نوێی لێکۆڵینەوە بەکاربهێنم کە زۆرتر گرنگی بدا بە زیندوکردنەوەی ناوەرۆکی بلاوکراوەکان و، پۆلێنی بابەتەکان و شیکردنەوەیان و، بەستنەوەیان بە روداوە سیاسییەکانی سەردەمەکەیانەوە. لەم کارەدا تا چەند ئامانجم پێکاوە ئەوە بە جێ ئەهێڵم بۆ شارەزایانی ئەم مەیدانە. ئەگەر کەسێ سەرنجێکی جیاواز، تتێبینییەکی پێچەوانە، یان رەخنەیەکی هەبێ لە کارەکە و پرۆگرامی لێکۆڵینەوەکە، یان هەڵەیەکم بۆ راست بکاتەوە، پێشەکی ئەڵێم: منەتبارم ئەکا.

**سلێمانی، 25 ی 10 ی 2001**
**نەوشیروان مستەفا**

## 1. سەرەتای رۆژنامەوانی لە ئەوروپا

چاپ داهێنانێکی ئەوروپاییە، هەروەها رۆژنامە. دەرکردنی رۆژنامە بە بێ دەزگای چاپ کاری نەکردەیە.

سالّی 1436 گۆتنبێرگی ئەلّمانی چاپی داهێنا. لەگەلّ بلاوبونەوەی دەزگای چاپ بە ولاتانی ئەوروپیدا، ئیتر لە سەرەتای سەدەی حەڤدەهەمەوە رۆژنامەی رۆژانە لە ئەوروپا دەستی کرد بە دەرچون: لە 1615 دا فرانکفۆرتەر جۆرنالّ لە ئەلّمانیا و لە 1631 دا بە هاندانی کاردینال ریشیلیۆ بۆ خزمەتکردنی دەرباری لویسی چواردەهەم رۆژنامەی لا گازێت و، دوای ئەو لە 1777 دا ژۆرنالّ دو پاری و، لە 1605 دا رۆژنامەی نیوتیدیگین لە بەلجیکا و، لە 1620 دا لە هۆلّەندا و، لە 1641 دا رۆژنامەی ریڤیو لە بریتانیا. ریڤیو رۆژنامەیەکی رۆژانەی دو لاپەڕەیی بو. لاپەڕەی یەکەمی بۆ دەنگوباسی پارلەمان و هی دوەمی بۆ هەوالّەکانی رۆژ تەرخان کرا بو. لە 1785 دا تایمس دەرچو کە تائێستایش بەردەوامە. لە 1703 دا رۆژنامە لە روسیا پەیدا بو. لە ئەمەریکایش لە 1690 دا ڕاکردویەکی ئینگلیزی لە بۆستن رۆژنامەیەکی بلاو کردەوە. ئەگەرچی ئەم رۆژنامەیە داخرا و کابرایش خۆی خرایە زیندانەوە، بەلام لە 1704 ەوە بۆستن نیوز لێتەر رۆژانە کەوتە دەرچون. بە دوای ئەم سەرەتایەدا، ئیتر هەزاران رۆژنامەی رۆژانە لە سەرانسەری ئەوروپا و ئەمەریکا، بە زمانی جیاواز دەرچون و، خوێندنەوەی رۆژنامە بو بە نەریتێکی رۆژانەی هاوولاتی ئاسایی.

## 2. سەرەتاکانی چاپ و رۆژنامە لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاستدا

ئەگەرچی لە سەرەتای سەدەی شانزەهەمەوە ئەوروپاییەکان حەرفی عەرەبی و فارسییان داڕشت، سەرەتا کتێبە پیرۆزەکانی ئینجیل و هەندێ کتێبی ئاینی تریان بە زمانەکانی گەلانی ڕۆژهەلات پێ چاپ کرد، بەلام کاربەدەستانی عوسمانی و قاجاری، لە ژێر کاریگەری و گوشاری پیاوانی ئاینیدا کە چاپیان بە (رجس من عمل الشیطان) دائەنا، تا ماوەیەکی زۆر نەیانهێشت ئەم دەزگا تازە داهێنراوە و بەرهەمە چاپکراوەکانی بێنە ولاتەکانیانەوە. لەبەرئەوە رۆژنامەیش نەبو.

بۆ یەکەمین جار گەلانی نەموسولّمانی وەکو جولەکە، ئەرمەنی، یۆنانی و، مژدەدەرانی دینی مەسیحی، چاپخانەیان هێناوەتە ناوچەکەوە. کتێبی ئاینی و ئەدەبی و مێژوییان بە زمانەکانی خۆیان و بۆ گەلەکانی خۆیان پێ چاپ کردوە. ئەمانە لە سەرەتادا رێگە نەدراون کتێب بە زمانەکانی گەلانی موسولّمان چاپ بکەن.

بۆ یەکەم جار جولەکە دەزگای چاپی بردۆتە تورکیا. ساڵی 1546 تەوراتیان بە حەرفی عیبری پێ چاپ کردوە. دوای ئەوانیش ئەرمەنی و یۆنانی چاپخانەیان دامەزراندوە. لە ئێرانیش بۆ یەکەم جار باوکە کەرملیەکان لە نێوان ساڵانی 1611-1620 دا دەزگای چاپیان بردۆتە ئەسفەهان. لە پەرستگاکەی خۆیاندا هەندێ دوعایان بە عەرەبی و فارسی پێ چاپ کردوە. ئەرمەنییەکانیش ساڵی 1640 لە جولفا چاپخانەیان دامەزراندوە.

ساڵی 1702 قەشە مەسیحییەکان چاپیان لە حەڵەب دامەزراند.

ساڵی 1712 بە فەرمانی سوڵتان ڕێگە درا بە سەعید ئەفەندی دەزگای چاپ دابنێ، بەو مەرجەی قورئان و تەفسیر و حەدیس و فیقهـ و کەلام چاپ نەکات.

ساڵی 1733 شەمماس عەبدوڵڵا ئەلزاخیر لە گوندی شویر لە جەبەل لوبنان لە دێری مار یۆحەنا ئەلصایغ، دەزگایەکی چاپی دانا. ئەمانە کاسۆلیک بون. ئەرسەدۆکسەکانی لوبنان بۆ مونافەسەی ئەمان، ساڵی 1750 لە بیروت دەزگایەکی تری چاپیان دانا. لە 1834 یشدا چاپخانەی ئەمەریکی و لە ناوەڕاستی سەدەی نۆزدەهەمدا چاپخانەی باوکە یەسوعییەکان (مطبعة الآباء اليسوعيين) دامەزرا کە لەو کاتەدا گرنگترین دەزگای چاپی ناوچەکە بو. تا ئیستایش ماوە.

### 2. 1. یەکەمین ڕۆژنامە بە عەرەبی

ناپلیۆن لەگەڵ لەشکرکێشییەکەیدا بۆ سەر میسر (1798- 1801) کۆمەڵێ زانا و پسپۆڕی برد بو. دەزگایەکی چاپیشی برد بو حەرفی لاتینی، یۆنانی و عەرەبی هەبو. کۆڕی زانیاری میسری، کتێبخانە، دو قوتابخانەی بۆ مناڵی فەرەنسییەکان دامەزراند، دو ڕۆژنامەی بە فەرەنسی و ڕۆژنامەی (التنبیه)ی بە عەرەبی دەرکرد. ڕۆژنامەی (التنبیه) یەکەم ڕۆژنامەی چاپکراوە بە زمانی عەرەبی.

محەممەد عەلی پاشا، کردنەوەی قوتابخانە و، ناردنی بەعسە بۆ ئەوروپا و تەرجومەی کرد بو بە ڕێبازی پێشخستنی میسر. لە 1821 دا چاپخانە کۆنەکەی ناپلیۆنی نوێ کردەوە، بە ناوی (المطبعة الأهلية) کە پێیشی ئەوترا (مطبعة بولاق)، ئەوراقی ڕەسمیی حکومەتی چاپ ئەکرد و لە 1828 دا کەوتە بڵاوکردنەوەی (الوقائع المصرية).

هونەری چاپ لەناو موسوڵماناندا لە چاو گەلانی نەموسوڵماندا زۆر دواکەوتوە. یەکەم چاپی حەرفی عەرەبی ساڵی 1728 براوەتە ئەستەموڵ. ساڵی 1817 لە سەردەمی وەلیعەهد عەباس میرزادا لە تەورێز و، ساڵی 1838 لە شیراز و، ساڵی 1844 لە ئەسفەهان دامەزرا و، ساڵی 1840 لە ورمێ مژدەدەرانی مەسیحی چاپخانەیەکی خاوەن حەرفی سریانی، عەرەبی، فارسی، ئینگلیزییان دامەزراند.

### 2. 2. یەکەمین ڕۆژنامە بە تورکی و یەکەمین ڕۆژنامە بە فارسی

یەکەمین ڕۆژنامە کە لە تورکیا بە زمانی تورکی دەرچوە (تەقویمی وەقایع)ە، کە ساڵی 1831 بۆ بڵاوکردنەوەی فەرمان و هەواڵە ڕەسمییەکانی بابی عالی دەرکراوە.

یەکەمین ڕۆژنامە بە زمانی فارسی لە ئێران دەرنەچوە، لە هندستان دەرچوە. ئەو سەردەمە هندستان ژێردەستەی ئینگلیز بوە و، کۆمپانیای هندی شەرقی وڵاتەکەی بەڕێوەبردوە. هەر ئەوان چاپخانەیان بردۆتە هندستان و بۆ یەکەم جار ساڵی 1780 بە ئینگلیزی ڕۆژنامەیان لە بەنگال پێ چاپ کردوە. ئەوسا زمانی فارسی لە هندستان بەکارئەهێنرا. ساڵی 1820 ڕۆژنامەی (مرات الاحوال) بە فارسی لە کەلکەتە چاپ کراوە. بە دوای ئەویشدا چەند ڕۆژنامەی کەی فارسی دەرچون و، هەندێ ڕۆژنامەیش بەشێکی بە زمانی ناوچەیی خۆیان و بەشێکی بە فارسی نوسراوە.

لە ئێران سەرەتای رۆژنامەوانی ئەگەڕێتەوە بۆ ساڵی 1837 کە میرزا ساڵحی شیرازی (کاغذ اخبار) ی لە تاران بۆ بڵاوکردنەوەی هەواڵی ناوخۆ و دەرەوە و هەواڵەکانی شا و دەربار و بڕیار و ڕێنمایی‌یەکانی دەرکرد. میرزا ساڵح بۆ خوێندن نێردراوەتە لەندەن و فێری هونەری چاپ بوە. دیارە هەر ئەویش (Newspaper) ی ئینگلیزی بە (کاغەزی ئەخبار) وەرگێڕاوە. (کاغذ اخبار) ئەگەرچی بڵاوکراوەی رەسمی دەربار بوە، بەڵام دوای چەند ساڵێ داخراوە.

دەیان ساڵی پێ چو تا جارێکی تر لە سێیەمین ساڵی سەڵتەنەتی ناسرەدین شادا، لە سەردەمی صەدارەتی موسڵیحی گەورە میرزا تەقی خانی ئەمیر کەبیر دا کە (دارالفنون) ی لە تاران دامەزراند، دوەمین رۆژنامەی فارسی لە ئێراندا دەربچێ. هەر بە دەسپێشکەری و سەرپەرشتی ئەمیر کەبیر لە 7 ی شوباتی 1851 دا (روزنامه وقائع اتفاقیه) حەفتانە وەکو رۆژنامەی رەسمی حکومەتی ئێران، هەندێ جار بە 4 لاپەڕە و هەندێ جاریش بە 6 و 8 لاپەڕە، بە چاپی سەنگی دەرچو. (روزنامەی وەقائیعی ئیتیفاقیە) هەواڵی روداوەکانی پایتەخت و ولایەتەکان و هەندەران و، وتاری ئەدەبی و زانستی و نرخی کەلوپەل و خۆراکی بڵاو کردۆتەوە. لە پاش چەند ساڵێ ناوەکەی کراوە بە (جەریدەی عیلمیەی دەوڵەتی ئێران).

پێش ئەم دو رۆژنامە رەسمیە لە قەڵەمڕەوی عوسمانی و قاجاریدا بە دەیان رۆژنامە بە زمانی گەلانی نەموسوڵمانی ئەو وڵاتانە، بە زمانەکانی ئەرمەنی، بولغاری، یۆنانی، ئاسوری، تەنانەت بە فەرەنسی و ئینگلیزی بڵاو ئەکرانەوە.

## 2. 3. یاسای رۆژنامەوانی

لە دەوڵەتی عوسمانیدا قانونێکی تایبەت بە رێکخستنی رۆژنامەوانی نەبو. لە هەندێ حاڵەتدا، بە تایبەتی لە حاڵەتی جەنگدا، وەزارەتی مەعاریف و ناوخۆ سانسۆریان ئەخستە سەر رۆژنامەکان. ئەم وەزارەتانە بە ناوی بابی عالیەوە بڕیار و فەرمانیان دەرئەکرد و مەکتوبچی‌یان دانابو بۆ چاودێری رۆژنامەکان. ئەگەر یەکێ هەواڵێکی بنوسیایە و بە دڵی مەکتوبچی نەبوایە، لە سزای ئەوەدا فەلاقەیان ئەکرد.

کە ساڵی 1858 قانونی سزادان دەرچو، هەندێ مادەی تێدا بو تایبەت بە رۆژنامەوانی. لە یەکێ لە مادەکانیدا نوسیبوی: "ئەوەی کتێب و چاپکراوی زیانبەخش دژی سەڵتەنەت و حکومەت و میللەتانی ژێر ئاڵای ئیمپراتۆری لەو چاپخانانەدا کە بە فەرمان و موافەقەتی دەوڵەت دامەزراون، چاپ یا بڵاو بکاتەوە، سزا ئەدرێ بەوەی دەس بە سەر چاپکراوەکەدا ئەگیرێ و، بە پێی رادەی تاوانەکەی بۆ ماوەیەک یان بە یەکجاری چاپخانەکە دائەخرێ و، لە نێوان 10 تا 50 لیرەی زێڕی مەجیدی غەرامەی لێ ئەسێنرێ."

ساڵی 1863 سوڵتان عەبدولعەزیز قانونێکی تایبەتی بۆ رێکخستنی کاروباری رۆژنامەوانی دەرکرد کە هەندێ ئازادی سنورداری دابو بە رۆژنامەکان. بە پێی ئەم قانونە ئەبو بۆ دەرکردنی رۆژنامە ئیزن لە حکومەت وەربگیرێ. وڵاتانی ئەوروپایی لەو سەردەمەدا بە دەوڵەتی عوسمانی‌یان ئەوت پیاوە نەخۆشەکە. بۆ ئەوەی ئەمە بە درۆ بخەنەوە ئەبو رۆژنامەکان باسی سوڵتان و داوودەزگاکانی بە چاکە بکەن و، باسی کەموکوڕی نەکەن و رەخنە نەگرن.

## 2. 4. والیەکانی عوسمانی و رۆژنامەی عەرەبی

دەرچونی رۆژنامەی رەسمیی حکومەت، دەرگای کردەوە بۆ دەرکردنی هەرچی زۆرتری رۆژنامە بە زمانەکانی تورکی و عەرەبی نەک هەر لە پایتەخت دا، بەڵکو لە ناوەندی ولایەتەکانیشدا. والیەکانی تورک لە ولایەتەکانی خۆیاندا، بە تایبەتی لە ولایەتە عەرەبیەکاندا، ئەوانیش دەزگای چاپیان دائەمەزراند و

ڕۆژنامەی ڕەسمی‌یان بە تورکی و عەرەبی دەرئەکرد. ژمارەیەکی زۆری ڕۆژنامەوانانی عەرەبی شام، بیروت، بەغداد، موسڵ و بەسرە، لەو ڕۆژنامە ڕەسمی‌یانەدا کە لە ناوەندی ولایەتەکاندا، بۆ نواندنەوەی سیاسەتی حکومەتی ناوەندی و تۆمارکردنی بڕیارەکانی والی و هەواڵ و ڕوداوەکانی ولایەتەکە، بە دو زمانی تورکی و عەرەبی دەر ئەچون، فێری هونەری ڕۆژنامەوانی بون و دەرکەوتن.

ساڵی 1865 والی شام ڕۆژنامەی (سوریە) ی بە تورکی و عەرەبی لە دیمەشق دەرکرد تا 1918 بەردەوام بو.

ساڵی 1867 والی حەلەب (غدیر الفرات) ی لە حەلەب دەرکرد و، پاش 2 ساڵ ناوەکەی بو بە **(فورات)**، سەرەتا بە زمانی تورکی و عەرەبی و ئەرمەنی دواتر بو بە تورکی و عەرەبی.

ساڵی 1869 مەدحەت پاشا دەزگایەکی چاپی لە پاریسەوە هێنایە بەغداد ناوی نا (مطبعة الولایة). لە 15 ی حوزەیرانی 1869دا یەکەمین ژمارەی (الزوراء) ی بە 4 لاپەڕە، 2 لاپەڕەی بە تورکی و 2 لاپەڕەی بە عەرەبی، پێ دەرکرد. سەرنوسەرەکەی، ڕۆژنامەوانی تورک ئەحمەد مەدحەت ئەفەندی بو. (الزوراء) یەکێکە لە ناوەکانی شاری بەغداد. (الزوراء) حەفتەی جارێک بڵاو ئەکرایەوە، تا داگیرکردنی بەغداد لە لایەن ئینگلیزەوە (1918)، لە ماوەی 49 ساڵدا 2606 ژمارەی لێ دەرچوە. لە هەندێ ژمارەی **(الزوراء)** دا هەواڵی کوردستان بڵاوکراوەتەوە.

ساڵی 1885 کاربەدەستانی عوسمانی بە تورکی و عەرەبی، جەریدەی (الموصل) یان لە موسڵ دەرکرد.

ساڵی 1895 کاربەدەستانی عوسمانی بە تورکی و عەرەبی، جەریدەی (البصرة) یان لە بەسرا دەرکرد.

### 2. 5. ڕۆژنامەی ئەهلی

یەکەم ڕۆژنامەی عەرەبی زمان کە لە ئەستەموڵ دەرچو، ساڵی 1855 ڕۆژنامەی (مرات الاحوال) بو کە (رزق الله حسون حلبي) دەری کرد. بە دوای ئەودا لە قاهیرە لە 1857 دا (اسکندر شلهوب) بۆ خۆشناوکردنی سوڵتان و بەدناوکردنی خدێوی (السلطنة) و، (خلیل الخوري) لوبنانی لە 1858 دا لە بیروت (حدیقة الاخبار) و، (کونت رشید الدحداح) لە پاریس (برجیس باریس) یان دەرکرد.

ئەگەرچی ڕۆژنامە بە زمانەکانی تورکی، عەرەبی، فارسی، یۆنانی، ئەرمەنی، تەنانەت بە ئینگلیزی و فەرەنسی دەرئەچو، کەچی کوردی لە ریزی ئەمانەدا بەشی نەبو، نە هیچ والیەک کردی بە زمانی دوەمی ڕۆژنامەی ولایەتەکەی و، نە ڕێگەیشیان بە ڕۆشنبیرانی کورد دا لە تورکیا ڕۆژنامە بە کوردی بڵاوبکەنەوە.

## 3. سوڵتان عەبدولحەمید و ڕۆژنامەوانی

کە عەبدولحەمید هاتەسەر تەختی سەڵتەنەت، ئەو ئازادی‌یە سنوردارەی کە ڕۆژنامەکان هەیان بو، زیاتر کۆت و پێوەند کرد. گرتن و ڕاونان و کوشتن و دزی و بەرتیلخۆری زۆر زیادی کرد. عەبدولحەمید، کە لە بەر زۆرداری و خوێنڕێژی ناو نرابو سوڵتانی سور، ڕەنگە یەکێ لە باشترین وەسفەکانی ئەو سەردەمە بۆی، لە قەسیدە بە ناوبانگەکەی حاجی قادری کۆیی دا بخوێنینەوە، کە لە سەرەتاکەیدا ئەڵێ:

قسەیێکم هەیە دەیکەم مەڵێ بێ تەجرەبەیە
باوجودی ئەوی نادانە لە لای وەک گەمەیە

ئینجا ئەڵێ:

حاکمی ڕێگری مەعمورەیە، قازی دزی ڕۆژ،

وزەراو وکەلا گورگە، ڕەعییەت گەلەیە

لە بەیتێکی تردا ئەڵێ:

زانی و شاریب و لۆتی دەگرن، والی دەڵێ:

بەری دەن پارەی خۆی دایە، چ عەیبێکی هەیە

تا ئەگاتە ئەوەی ئەڵێ:

زوڵمیان عامە لە سەر عاممە، ڕەعییەت فەوتا

تۆ مەکە مەنعی عەوامیل، کە خەتای گای بنەیە!

بێگومان مەبەستی لە (گای بنە) سوڵتان عەبدولحەمید بوە.

شێخ ڕەزای تاڵەبانی چەندین شیعری لە ستایشی عەبدولحەمیدا داناوە. بەڵام کە سەفەری ئەستەموڵ ئەکات و لە نزیکەوە شارەزای دەزگاکەی بابی عالی ئەبێ، لە شیعرێکی فارسی‌دا ئەڵێ:

کاشی یک روزم بمابین همایون ره دهند

تا حمید خان را بگویم: ای (حمیر المؤمنین)

بعثت تو بر خلاف بعثت پیغمبر است

انت ما ارسلت الا زحمة للعالمین

واتە: کاشکی یەک رۆژ رێگەیان ئەدام بچمە مابەینی هومایون

تا بە (حەمید خان) بڵێم: ئەی (حەمیری موئمینین)

ناردنی تۆ بە پێچەوانەی ناردنی پێغەمبەرەوەیە

تۆ بۆ ئازاردانی خەڵک نەبێ بۆ هیچی تر نەنێردراوی

وشەی (حمیر المؤمنین) ی لە باتی (امیرالمؤمنین) بەکارهێناوە کە لەو کاتەدا بە سوڵتانیان وتوە.

لە ئەستەموڵ رۆژنامەیەکی ئەدەبی بە زمانی فارسی بە ناوی **(اختر)** دەرئەچو. قەسیدەیەکی لە ستایشی سوڵتان عەبدولحەمیدا بە بۆنەی لە دایکبونی‌یەوە بڵاوکردبوەوە، لە بەیتێکی‌دا رستەی (نەتیجەی ئالی عوسمان) ی نوسی بو. سانسۆر ئەمەیان بە (نیهایەتی ئالی عوسمان) لێک دابوەوە. لەسەر ئەوە رۆژنامەکەیان بۆ ماوەیەک داخست. لە کاتێکدا شاعیر لە (نەتیجەی ئالی عوسمان) مەبەستی (نەوەی ئالی عوسمان) بوە.

### 3. 1. **رێنمایی‌یەکانی بۆ رۆژنامەکان**

لەم سەردەمەدا ناوبەناو هەندێ رێنمایی لە بابی عالیەوە ئەنێردرا بۆ بەڕێوەبەرایەتی رۆژنامەکان کە بە تەواوی ئازادی لێ زەوت ئەکردن. لێرەدا بە کورتی هەندێکیان ئەنوسم:

- ئەبێ بە باشی تەندروستی سوڵتان و پێشکەوتنی بەروبومی کشتوکاڵ و پیشەسازی و بازرگانی لە مەملەکەتدا، باس بکرێ.
- نابێ بە بێ ڕەزامەندی وەزیری مەعاریف، هیچ بابەتێ بڵاوبکرێتەوە.
- نابێ وتاری درێژ، هەرچی بابەتێ بێ، بڵاو بکرێتەوە. بە هیچ جۆرێ نابێ وشەی (ماوێتی) بنوسرێ.
- لەبەرئەوەی بەجێهێشتنی بۆشایی و ریزکردنی نوقتە ئەبێتە هۆی لێکدانەوەی جۆراوجۆر، بە هیچ جۆرێ نابێ لە هیچ وتارێکدا ڕێی پێ بدرێ.
- نابێ ڕێ بدرێ بە تانە لێدانی هیچ کەسایەتیەک و، نابێ ڕێ بدرێ باسی دزی و بەرتیلخۆری و کوشتن بدرێتە پاڵ هیچ والی و موتەسەڕیفێ.

- قەدەغەیە زۆرلێکرانی کەس و کۆمەڵ لە ئەنجامی رەفتاری خراپی کاربەدەستانی دەوڵـەتدا بـاس بکرێ. هەروەها قەدەغەیە کە رۆژنامەکان ئیشارەت بدەن بەوەی ئـەم جـۆرە سـکاڵایە، گەیشـتۆتە گوێی زاتی شاهانەی پیرۆز.
- ناوبردنی وشەی ئەرمەنستان و وشەی جوگرافی و مێژویی لەو بابەتە بە تەواوی قەدەغەیە.
- بۆ ئەوەی خەڵک ئاگادار نەبێ، نابێ هەواڵی هەوڵی کوشتنی شای وڵاتانی بێگانـە و دەنگوباسـی پشێوی و ئاژاوە و خۆپیشاندانی موفسیدەکانی ئەو مەملەکەتانە بڵاوبکرێتەوە.
- بۆ ئەوەی هەلپەرستەکان نەتوانن ئەم رێنماییانە بەکاربهێنن، نابێ لە رۆژنامەکاندا بـاس بکـرێ و هیچی لەسەر بنوسرێ.

## 3. 2. کۆچی رۆژنامە بۆ تاراوگە

تەنگهەڵچنین بە رۆژنامەوان و رۆژنامەکانیان لە هەردو دەوڵەتی عوسمانی و قاجاری دا، ژمارەیـەک لـە رۆژنامەوانەکانی ناچار کرد وڵاتەکانیان بە جێ بهێڵن و رو بکەنە شـوێنانی تـر، لەوانـە قـاهیرەی پایتـەختی میسر و کەلکەتە و بەمبەی لە هندستان و پایتەختەکانی وڵاتانی ئەوروپی. قاهیرە لەو سەردەمەدا ئازادیـیەکـی زۆرتری تێدا بو، چونکە لە ژێر دەسەڵاتی سوڵتاندا نەما بو، کەوتبوە ژێر دەسەڵاتی ئینگلیـزەوە. هەنـدێ لـە رۆژنامەوانەکانی ولایەتەکانی بێروت و شام، کە هێشتا لە ژێر دەسەڵاتی عەبدولحەمید دا بون، ئەوانیش رویان کردە قاهیرە. قاهیرە بو بە گرنگترین ناوەندی راگەیاندن لە رۆژهەڵاتی ناوەراست دا.

بە سەدان ئازادیخوازی عوسمانی و ئێرانی، لەبەرئەوەی لە وڵاتەکانی خۆیاندا ئازادی دەربڕینی بیر و ئازادی رۆژنامەوانییان نەبو، رویان کردبوە دەرەوە.

رۆژنامە ئێرانییەکانی (حبل المتین) لە کەلکەتەی هندستان، (حکمت) و (ثریا) و (پرورش) لە میسـر و، (قانون) لە لەندەن و (اختر) لە ئەستەموڵ دەر ئەچون.

رۆژنامـــە عوســـمانییەکانی (مشـــورت) و (میـــزان) و (عوســـمانلی) یـــش لـــە قـــاهیرە و ئـــەوروپا دەرئەچون.

## 3. 3. کوردستان: یەکەمین رۆژنامەی کوردی

کـورد رێی نـەدرا لـە قەڵـەمرەوی عوسـمانیدا رۆژنامـە دەربکـات. لەبەرئـەوە بەدرخانیـیـەکان بـۆ بڵاوکردنەوەی رۆژنامەی کوردستان **(کردستان)** چونە قاهیرە. کە لەوێش تەنگیان پێ هەڵچنین، رویـان کـردە ئەوروپا.

یەکەمین رۆژنامە بە زمـانی عـەرەبی نـاپلیۆن لـە قـاهیرە و، یەکـەمین رۆژنامـە بـە زمـانی تـورکی لـە ئەستەموڵ بابی عالی و، یەکەمین رۆژنامە بە زمانی فارسی لە ئێـران دەربـاری قاجـار دەریـان کـردوە. بـەڵام یەکەمین رۆژنامە بە زمانی کوردی، کوڕی بنەماڵەیەکی زۆرلێکراو، بەڵام شۆڕشگێر و گەورە، بە پـارەی خـۆی، لە وڵاتێکدا کە هی خۆی نەبوە، دەریکردوە.

ژمارەی یەکەمی غەزەتەی کوردستان لە 22 ی نیسانی 1898 دا لە قاهیرە لە لایـەن میقـداد مەدحـەت بـەگی کـوڕی بـەدرخان پاشـاوە دەرکـراوە. کـە ئـەم بـە هـۆی نەخۆشـیەوە دەس لـە کارەکـەی هەڵئـەگرێ، عەبـدولڕەحمان بـەگی بـرای درێـژە بـە دەرکردنـی ئـەدا و، لـەتاو تـەنگ پێهـەڵچنینی پیاوەکـانی سـوڵتان عەبدولحەمید، گواستویەتیەوە بۆ جنێڤی سویسرا و فۆلکستۆن لە بریتانیا. تا سـاڵی 1902 بـە هـەموی 31 ژمارەی لێ دەرچوە.

## 4. کورد و ئینقیلابی مەشروتەی ئێران (1905)

شای ئێران لە ژێر گوشاری خەڵکدا، بە ناچاری دەستور (قانونی ئەساسی) ی قبوڵ کرد. لە ئـەنجامی ئەوەیشدا بوارێکی فراوان بۆ ئازادیی رۆژنامەوانی رەخسا و، دەیان رۆژنامەی ئازاد و ئازادیخواز لە تـاران و تەورێز و شارەکانی تری ئێـراندا بڵاوکرانـەوە. هـەڵبژاردەی کـورد لـەو سـەردەمەدا لـە تـاران هـەبونێکی بەرچاوی نەبوە، بە تایبەتی کە بەشێکی گەورەی سەرانی بزوتنەوەکـە ئاخونـدی شـیعە و زۆرایـەتی کـوردی ئێرانیش سوننە بون. لە ئەنجامی ئەوەیشدا دەورێکی دیاری لە ئینقیلابی مەشروتەدا نەبوە.

ئاستی خوێندەواری و رۆشنبیریی کورد لە ئێراندا بە گشتی زۆر نزم بـوە. هۆشـی نەتـەوەیی کـز و ئاگاداریyیان لە روداوەکانی ئێران و دنیا کەم بوە. لەبەرئەوە بەشداریشیان لە بزوتنەوەی مەشروتەدا و کـەڵک وەرگرتنیشیان لە دەسکەوتەکانی، یان هەر نەبوە یان زۆر کەم بوە. هەر بەو پێیەش کورد هیچ کـەڵکێکی بـۆ کاروباری رۆشنبیری لەو کەشە ئازادە وەرنەگرتوە کە ئینقیلابی مەشـروتە لـە سەرانسـەری ئێـراندا خوڵقانـد بوی. هیچ رۆژنامە یان بڵاوکراوەیەکی کوردی لە تاران یا لە هـیچ شـارێکی کوردنشـین دەرنـەچوە. پێنـاچێ هیچ کوردێ هەوڵی دەرکردنی دابێ، یا تەنانەت بیریشی لێ کردبێتەوە.

## 5. کورد و ئینقیلابی عوسمانی (1908)

### 5. 1. هەڵبژاردەی کورد لە ئەستەموڵ

تەنگهەڵچنین بە رۆژنامە و رۆژنامەوانەکان بەردەوام بو تا ساڵی 1908 شۆڕش دژی سوڵتان کـرا و دەستور (قانونی ئەساسی) ی بە سەردا سەپێنرا. داوای هەمو ئـازادیخوازانی عوسـمانی، سـەرەڕای جیـاوازی نەتەوەییyیان، بریتی بو لە: حوریەت، عەدالەت، ئوخوەت. ئینقیلابی عوسمانیyیش هەر لە ژێر ئەم دروشـمانەدا رویدا، کە دروشمەکانی شۆڕشی فەرەنسی بون. سەرەتا خەڵک بە ئازادی شاد بون، ئازادیی رۆژنامەوانـیش دابین کرا، کوردیش کەڵکی لەم ئازادییە وەرگرت.

هەر لەو کاتەوە کە میرایەتیyیە کوردەکان روخێنران، بابی عالی زۆری منداڵی میر و مەزنەکانی کـوردی بە زۆر برد لە ئەستەموڵ دای نیشاندن. زۆر لەمانە چونە بەر خوێندن و پیاوی گەورەیان تێدا هەڵکەوت و پلە و پایەی بەرزیان لە دەزگاکانی دەوڵـەتدا وەرگـرت. ئەمانـە لـە گـەڵ بیـری تـازە و ژیـانی نـوێی ئـەوروپا ئاشنایەتیyیان پەیدا کرد. دو کەس لـە دامەزرێنـەرانی بزوتنـەوەی تورکـانی لاو (ژۆن تـورک) و رێکخـراوی ئیتیحاد و تەرەقی کە ئاڵای چاککردن و نوێکردنەوەی دەوڵەتی عوسمانیyیان هەڵگرت بو: عەبـدوڵڵا جـەودەت و ئیسحاق سیکوتی، کورد بون و لە ئەوروپا خوێندبویان.

هەڵبژاردەی کوردی لە ژیانی سیاسـی و رۆشـنبیری و کۆمەڵایـەتیی دەوڵـەتی عوسـمانیدا، چـالاک و بەرچاو بو. لەبەرئەوە کە ئینقیلابی عوسمانی بو، جگە لەوەی کورد لە مەجلیسی مەبعوسان و مەجلیسی ئەعیان و لە وەزارەتدا بەشدار بون، هەڵبژاردەی کوردیش لە ئەستەموڵ کەوتە چالاکی بۆ سەلماندنی مـافی نەتـەوەیی کورد. رێکخراوی سیاسـی، کۆمەڵایـەتی، رۆشـنبیریی تایبـەتیی خۆیـان دامەزرانـد. قوتابخانـەی کوردیـیـان کردەوە، رۆژنامە و گۆڤاریان دەرکرد.

ئەوەی جێگەی سەرنجە هەمو ئەو رۆژنامە و گۆڤارانەی لەم ماوەیەدا دەرچـون، نـاوی کوردسـتان یـان کوردیان پێوەیە. ئەوەیش نیشانەی هەوڵدانە بۆ سەلماندنی ناسنامەی نەتەوەیی گەلی کـورد و، جیاکردنـەوەی لە نەتەوەکانی تری عوسمانی.

### 2.5. قانونی چاپەمەنیی عوسمانی

ئیتیحادیـیەکان، دوای ڕاگەیانـدنی مەشـروتییەت، لـە 16 ی تـەموزی 1325 ڕۆمـی (29 ی 7 ی 1909) دا قانونی چاپەمەنییان دەرکرد کە تا ساڵی 1931 یش بەهەندێ دەسکارییەوە لە عێراق کاری پـێ کراوە. یاساکە لەچوار فەسڵ پێکهات بو: فەسڵی یەکەم، 7 مادەیە تەرخانە بۆ (چۆنیەتی بڵاوکردنەوە). فەسـڵی دوەم، 17 مادەیە تەرخانە بۆ (حوکمەکانی سزادان). فەسـڵی سـێیەم، 6 مادەیـە تەرخانـە بـۆ (زەم و جنێـو). فەسڵی چوارەم: 3 مادەیە تەرخانە بۆ بابەتی جیا جیا.

لە فەسڵی یەکەم دا کە تەرخانە بۆ چۆنێتی بڵاوکردنەوە:

لە مادەی 1 دا،

دایناوە، ئەبێ هەمو ڕۆژنامە یا گۆڤارێکی ڕۆژانە و هەمو کاتنامەیەک بەڕێوەبەرێکی بەرپرسی هەبێ و،

لە مادەی 2 دا،

کردویەتی بە مەرج کە بەڕێوەبەرێکی بەرپرس ئەبێ هاووڵاتی عوسمانی بێ و، 21 ساڵی تەواو کردبێ و، هیچ لەکەیەکی ئەخلاقی و یاسایی بەدواوە نەبێ و، دەرچـوی قوتابخانەیـەکی بـەرز یـا خـاوەن بڕوانامـەی قوتابخانەی ئامادەیی بێ. خاوەنی ئیمتیازی بڵاوکراوەی سیاسی ڕۆژانـە لـە ئاسـتانە ئـەبێ 500 لیـرە و لـە ولایەتەکاندا 100 لیرە، بۆ کاتنامەی سیاسی لە ئاستانە 200 لیرە و لە ولایەتەکاندا 50 لیرە بارمتە دابنێ.

ئەم مادەیە کۆسپێکی گەورەی لە بـەردەم ڕۆشـنبیرانی کـوردا دروسـت کـرد، ئەوانـەی ڕۆژی کـورد و بانگی کوردیان دەر کرد. لە بەر ئەوەی ئەو تەئمیناتەیان پێ دابین نەکرا، نـەیانتوانی ڕۆژنامـە یـا کاتنامـەی سیاسی دەر بکەن.

مادەی 3 ئەڵێ:

ئەوی بیەوێ ڕۆژنامە و گۆڤاری ڕۆژانە یا کاتنامـە دەربکـات، ئـەبێ داواکارییـەک بـەئیمزای خـۆی و بەڕێوەبەری بەرپرس بداتە وەزارەتی ناوخۆ لەئاستانە، یا والی و موتەسەڕیفەکان لە ویلایەتـەکان، ناونیشـانی بڵاوکراوەکە و شوێن و کات و زمان و بابەتەکانی و، ناو و شوهرەت و تەمـەن و شـوێنی ژیـان و جنسـیەی داواکار و بەڕێوەبەری بەرپرسی تێدابێ.

مادەی 4 ئەڵێ:

ئەوی بەبێ ئەو داواکارییەی پێشو ڕۆژنامە یا گۆڤار بڵاو بکاتەوە، دادگا 5 تا 50 لیرەی لـێ ئەسـەنێ و، ئەگەر دوبارەی کردەوە بە 10 تا 100 لیرە غەرامە یا 24 سەعات تا مانگێک زیندانیکردن، سزا ئەدرێ.

مادەی 5 ئەڵێ:

جەریدە و گۆڤاری ڕۆژانە و کاتنامە موڵکی خاوەنەکەیەتی و ئەشـێ مڵکایەتـییەکـەی بـە یـەکێکی تـر ببەخشـێ. ئەگـەر خاوەنەکـەی مـرد، ئەبێتـە مـوڵکی میراتگرەکـانی. ئەگـەر خـاوەن ڕۆژنامـەی مـردو خـۆی بەڕێوەبـەری بـەرپرس بـوبێ، میراتگرەکـانی ئـەتوانن درێـژە بـە دەرچـونی بـدەن، ئەگـەر بەڕێوەبـەرێکی بەرپرسیان دانا مەرجە قانونییەکانی تێدا بێ.

مادەی 6 ئەڵێ:

نابێ ناوی جەریدە یا گۆڤاری کاتنامە بە جۆرێ بێ کـە ببێتـە هـۆی سـەر لـێ تێکـدان. ئەشـێ نـاوی ڕۆژنامەیەکی داخراو دوای 15 ساڵ بەکاربهێنرێ ئەگەر ڕۆژنامەکە بەردەوام ساڵێک دەرچوبێ.

مادەی 7 ئەڵێ:

ئەگەر بەڕێوەبەری بەرپرس دەستی کێشایەوە یا مرد یا حوکمی بەسەردا دراو لە بەڕێوەبـەریی کـەوت، یان ئەگەر زانیارییەکانی ماددەی 3 گۆڕانکارییان بەسەردا هـات، ئـەبێ ئەوپەڕەکـەی لـەماوەی 5 ڕۆژدا ئـەم

هەواڵە بدرێتە لایەنی بەرپرس. ئەگەر درێـژەی بـەدەرچون داو پێـڕەوی ئـەم مـەرجانـەی نـەکرد، مـاددەی 4 ئەیگرێتەوە.

مادەی 17 ئەڵێ:

سـزای قـانونی بـە هـۆی نـاوەرۆکی بڵاوکراوەکـەوە، یەکـەم بەرپێوەبـەری بـەرپرس یـا نوێنەرەکـەی ئەگرێتەوە و، دوەم نوسەرەکەی و سێیەم چاپکەرەکەی و چوارەم فرۆشیار و بڵاوکەرەوەکانی.

مادەی 23 ئەڵێ:

ئەشێ بڵاوکراوەکە بە بریاری ئەنجومەنی وەزیران بۆ ماوەیەک دابخرێ، ئەگەر شتێ بڵاو بکاتەوە کـە ئاسایشی ناوخۆ یا هی دەرەوەی دەوڵەت تێک بدا.

ئەم مادەیە بیانویەکی باشی دابوە دەست کاربەدەستان بـۆ داخسـتنی هـەر رۆژنامەیـەک کـە لـە گـەڵ سیاسەتی ئەواندا نەگونجێ.

دوای ئەمە یاسایەکی تر بڵاوکرایەوە، لە رۆژنامە و گۆڤارەکاندا نوسینی لە کارمەندانی سوپا بەگشـتی قەدەغە کرد.

یاسای چاپەمەنی تا هەڵگیرسانی یەکەمین جەنگی جیهانی 5 جار دەستکاری کراوە.

## 6. کاتنامە کوردیەکان

### 6. 1. کوردستان (ئەستەموڵ 1908)

خولی دوەمی درێژە پێدانی یەکـەمین جەریـدەی کـوردی (کوردسـتان 1898-1902) بـوە. سـورەیا بەدرخان ساڵی 1908 لە ئەستەموڵ دەری کردوە.

وەکو لە سەروتاری یەکەمین ژمارەی خولی سێیەمینی کوردستاندا نوسراوە، ئـەم رۆژنامەیـە بـەردەوام بوە تا مەحمود شەوکەت پاشا لە نیسانی 1909 دا بە لەشکرەوە چوە ناو شاری ئەستەموڵ و کودەتای کـرد و ژمارەیەکی زۆر لە نەیارەکانی خستە زیندانەوە لەوانە سورەیا بەدرخان و، رۆژنامەکەیان داخست.

تا ئێستا هیچ ژمارەیەکی ئەم رۆژنامەیە لە بەر دەس دا نیە.

### 6. 2. کورد تەعاون و تەرەقی غەزەتەسی (ئەستەموڵ 1908)

غەزەتەیەکی کوردی- تورکی بوە. ساڵی 1908 جەمعیـەتی تـەعاون و تـەرەقی کـورد (کـرد تعـاون و ترقی جمعیتی)، لە ئەستەموڵ دەری کردوە. جەمعیەتی تەعاون و تەرەقی کورد دوای ئینقیلابی عوسمانی سـاڵی 1908 لە کۆبونەوەی هەڵبژاردەی کوردەکانی ئەستەموڵ، لە شەمزینی و بەدرخانی و بابانی، بە سـەرۆکایەتی شێخ عەبدولقادری شەمزینی دامەزرا، بـۆ سـەلماندنی مـافی نەتـەوەیی کـورد لـە نـاو چوارچێـوەی جامیعـەی عوسمانیدا. ئیتیحادیەکان، کە سیاسەتی تورکاندنیان بەرامبەر نەتەوە نەتورکەکان گرت بو، ریکخراوەکـەیان قەدەغە کرد و رۆژنامەکەیان داخست و، چالاکەکانیان گرت و دایانن بە دادگا.

دوای جەریدەی کوردستان ئەمە دوەمین غەزەتەی کوردی و یەکەمین بڵاوکراوەی کوردیـە کـە لـە ئەستەموڵ دەر چوبێ. کوردستان هەموی بە کرمـانجی سـەرو نوسـراوە. بـەڵام ئـەم بـە هـەردو لەهجـەی سەرو و خوارو نوسینی بڵاو کردۆتەوە. نوسەرەکانیشی سلێمانەیی و هـەولێری و دیاربـەکری و هـەکاری تێدا بوە.

ژمارەی یەکەمی لە 11 ی زیلقەعیدەی 1326 کۆچی، 22 ی تشرینی دوەمی 1324 ی ڕۆمی، کە ئەکاتە 22 ی تشرینی دوەمی 1908 دا دەرچوە.

دوا ژمارەی کە نۆهەمە لە 8 ی موحەڕەمی 1327 ی کۆچی، 17 ی کانونی دوەمی 1324 ی ڕۆمی، کە ئەکاتە 17 ی کانونی دوەمی 1909 دەرچوە و ئیتر داخراوە. بە سەر یەکەوە هەموی 88 لاپەڕەیە.

خاوەنی ئیمتیاز و بەڕێوەبەری، سلیمانیەلی تەوفیق/پیرەمێر(1867-1950) و سەرنوسەرەکەی ئەحمەد جەمیل دیاربەکری (1872-1941) بوە.

لەم بەشەدا لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتی لەسەر ئەم غەزەتەیە نوسراوە.

## 6. 3. **ڕۆژی کورد (ئەستەموڵ** 1913**)**

جەمعیەتی هێڤی، کە کۆمەڵەیەکی خوێندکاری بوە، ساڵی 1913 لە ئەستەموڵ بە کوردی- تورکی دەری کردوە. خاوەنی ئیمتیاز و بەڕێوەبەری بەرپرس عەبدولکەریمی حاجی عەبوڵڵای کەرکوکلی زادە (عەبدولکەریم سلێمانی) بوە.

ژ1 ی لە 6 ی حوزەیرانی 1329 ڕۆمی و ژ4 ی کە دوا ژمارەیەتی لە 30 ی ئاغستۆس (ئاب) ی 1329 (1913) دا دەرچوە.

لە سەر بەرگی ژ1 وێنەی سەلاحەدینی ئەیوبی و،

لە سەر بەرگی ژ2 ی وێنەی کەریم خانی زەند و،

لە سەر بەرگی ژ3 ی وێنەی بەدرخانی حسێن کەنعان پاشا و،

لە سەر بەرگی ژ4 ی وێنەی شاری ئەرزرۆمی چاپ کردوە.

لە بەشی کوردیدا بە هەردو زاراوی کرمانجیی خوارو و کرمانجیی سەرو وتار و شیعریان نوسیوە. ئیتیحادیەکان پاش چەند ژمارەیەک دایان خستوە.

لەم بەشەدا لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتی لەسەر ئەم غەزەتەیە نوسراوە.

## 6. 4. **هەتاوی کورد (ئەستەموڵ** 1913**)**

کە (ڕۆژی کورد) داخراوە جەمعیەتی هێڤی بە ناوی (هەتاوی کورد) هوە دەریان کردۆتەوە. ئەمجارەیان عەبدولعەزیز بابان خاوەنی ئیمتیازی و بەڕێوەبەری بەرپرسی بوە.

ژ1 ی لە 23 زیلقەعیدەی 1331، 11ی تشرینی یەکەمی 1329 ی ڕۆمی (تشرینی یەکەمی 1913 ز) لە ئەستەموڵ دەرچوە.

ژ10 ی لە 9 ی شەعبانی 1332، 20 ی حوزەیرانی 1330 ی ڕۆمی (حوزەیرانی 1914 ز) دەرچوە. تا ژ3، یەکی 32 لاپەڕە و مانگانە بوە. لەوە بەدوا تا ژ10 ی 16 لاپەڕە و نیو مانگی بوە. بە هۆی هەڵگیرسانی جەنگەوە داخراوە.

لەم بەشەدا لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتی لەسەر ئەم غەزەتەیە نوسراوە.

## 6. 5. **بانگی کورد (بەغدا** 1914**)**

بڵاوکراوەیەکی کوردی- تورکی نیومانگی بوە. جەماڵەدین بابان لە بەغداد دەری کردوە.

ژ1 ی لە 26 ی کانونی دوەمی 1329 ڕۆمی (1914) و

ژ4 ی لە 24 ی مارتی 1330 دا دەرچوە.

بە هەر 4 ژمارەکەی 96 لاپەڕەیە. لە گەڵ هەڵگیرسانی یەکەمین جەنگی جیهانیدا ڕاوەستاوە. لەم بەشەدا لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتی لەسەر ئەم غەزەتەیە نوسراوە.

## 7. هەڵگیرسانی جەنگ و ڕاوەستانی چالاکیی ڕۆژنامەوانیی کورد

هەندێ لەم ڕێکخراو و ڕۆژنامانە بە پچڕ پچڕی لە چالاکیدا بون تا هەڵگیرسانی یەکەمین جەنگی جیهانی. لە بەر ئەوەی هەمو ئەوانەی لەم ڕێکخراوانەدا کاریان ئەکرد ڕاپێچ کران بۆ مەیدانەکانی جەنگ، لە چالاکی کەوتن و، ئیتر لە سنوری قەڵەمڕەوی عوسمانیدا تا کۆتایی جەنگ هیچ ڕۆژنامە و گۆڤارێ بە زمانی کوردی دەرنەچوە.

## سەچاوە:

1. بۆ نوسینی ئەم باسە کەڵک لە هەندێ سەرچاوە وەرگیراوە لەوانە:
1. 2. فائق بطي، صحافة العراق: تاريخها وكفاح أجيالها، مطبعة الاديب البغدادية، 1968
1. 3. فائق بطي، الموسوعة الصحفية العراقية، بغداد، 1976
1. 4. اديب مروة، الصحافة العربية: نشأتها وتطورها، منشورات دار مكتبة الحياة، بيروت، 1961
1. 5. وزارة الاعلام، مديرية الاعلام العامة: دراسات في الصحافة العراقية، 972
1. 6. قيس عبدالحسين الياسري، الصحافة العراقية والحركة الوطنية، بغداد، 1978
1. 7. عبدالرحمن خضر، مجموعة قوانين المطبوعات والمطابع وحق التأليف، بغداد، 1929
1. 8. لغت نامەی دهخدا
1. 9. محيط طباطبائی، تاريخ تحليلی مطبوعات ايران، موسسه انتشارات بعثت، تهران، بلا
1. 10. گوئل کهن، تاريخ سانسور در مطبوعات ايران (جلد يکم از 1253 ه. ق. تا صدور فرمان مشروطيت)، موسسه انتشارات آگاه، تهران 1360

2. غەزەتەی کوردستان 3 جار چاپ کراوەتەوە:
2. 1. بۆ جاری یەکەم، د. کەمال فوئاد ساڵی 1970 زۆری ژمارەکانی (کوردستان) ی، لە گەڵ پێشەکی‌یەکی کورت و پوخت، لە بەغداد سەرلەنوێ بە ئۆفسێت چاپ کردۆتەوە.
2. 2. بۆ جاری دوەم، محەمەد ئەمین بۆز ئەرسەلان ساڵی 1991 چاپەکەی د. کەمال فوئادی سەرلەنوێ لە ئۆپسالای سوید بە ئۆفسێت لە 2 بەرگدا چاپ کردۆتەوە و، هەمو نوسینەکانی هێناوەتە سەر ڕێنوسی لاتینی.
2. 3. بۆ جاری سێیەم، مەحمود زامدار ساڵی 1998 بە بۆنەی یادی سەدساڵەی کوردستانەوە چاپەکەی د. کەمال فوئاد و، 2 ژمارەی تازە دۆزراوە و، یادێکی خۆی، سەرلەنوێ لە هەولێر چاپ کردۆتەوە.
2. 4. بنکەی ئەدەبیی و ڕوناکبیریی گەلاوێژ ساڵی 2000 لە سلێمانی هەمو وتارە تورکی‌یەکانی خولی یەکەم و خولی سێیەمی جەریدەی کوردستانی بە کوردی بڵاو کردەوە، بەڵام هەڵەی چاپ هەندێ لە وتارەکانی شێواندوە.

وەرگێڕانی بەشە تورکیەکەی: شێرزاد عەبدولکەریم و، پێداچونەوەی: مستەفا زەنگەنە و عوسمان محەممەد هەورامی، کردویانە. د. کەمال فوئاد (سوپاس و پێزانین) و، د. فەرهاد پیربال و مەلا بەختیار دو (پێشەکی) یان بۆ نوسیوە.

3. محەمەد ئەمین بۆز ئەرسەلان هەر 9 ژمارەکەی (کورد تەعاون و تەرەقی غەزەتەسی) بە ئۆفسێت لە ئۆپسالای سوید ساڵی 1998 چاپ کردۆتەوە و هەمویشی بە حەرفی لاتینی نوسیوەتەوە و پەراوێز و پێشەکی بۆ نوسیون.

4. دەربارەی ڕۆژی کورد
4. 1. جەمال خەزنەدار 3 ژمارەی (ڕۆژی کورد) ی ساڵی 1981 لە بەغداد بە ئۆفسێت سەرلەنوێ لە گەڵ پێشەکی دا چاپ کردۆتەوە.
4. 2. سدیق ساڵح، لە ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ دا لە سەر ژ 4 ی نوسیوە.
4. 3. عەبدوڵڵا زەنگەنە، لە ژێر سەرناوی: (ئایا گۆڤاری ڕۆژی کورد یەکەم گۆڤاری کوردی بووە؟) باسێکی پڕ لە زانیاری لە ژ3491 ی ڕۆژی 19 ی 9 ی 2001 ی ڕۆژنامەی برایەتی‌دا بڵاوکردۆتەوە.
4. 4. ژ4 ی (ڕۆژی کورد) م لە مامۆستا ڕەفیق ساڵح وەرگرتوە.

5. دەربارەی هەتاوی کورد

5. 1. مەحمود زامدار، لە ژێر سەرناوی: (هەتاوی کورد و سەردەمی راپەڕین) دا وتارێکی لە سەر ژ3 ی هەتاوی کورد نوسیوە. زۆری ناوەرۆکی ژ3 ی بە لێدوانەوە، لە گەڵ وێنەی چەند لاپەڕەیەکی، بڵاوکردۆتەوە. بڕوانە: مەحمود زامدار، گەشتێک لە نێو بزاڤی ڕۆژنامەگەری کوردیدا، هەولێر، 1998، ل 13- 49.

5. 2. ژمارەکانی 1 و 2 و 4 - 5 و 10 ی (هەتاوی کورد) م لە مامۆستا رەفیق ساڵح وەرگرتوە.

6. دەربارەی بانگی کورد

6. 1. ئومێد ئاشنا، لە ژێر سەرناوی: (چەند ڕۆشنایی‌یەکی نوێ بۆ سەر گۆڤاری بانگی کورد) وتارێکی لە سەر ژ1 ی بانگی کورد نوسیوە. زۆری ناوەرۆکی ئەم ژمارەیەی بە لێدوان و پەراوێزەوە، لە گەڵ وێنەی چەند لاپەڕەیەکی، لە ل 58- 66 ی ژ119 ی ئەیلولی 1988 ی گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ) ی بەغدادا بڵاوکردۆتەوە.

6. 2. سدیق ساڵح، لە ژێر سەرناوی (گۆڤاری "بانگی کورد 1914" ساخکردنەوە) لێکۆڵینەوەیەکی لە سەر ژمارەکانی 1 و 3 و 4 ی (بانگی کورد) بە دو بەش لە ژ2517 و 2518 ڕۆژانی 29 - 30 ی 7 ی 2001 ی ڕۆژنامەی کوردستانی نوێدا بڵاوکردۆتەوە.

6. 3. ژمارەکانی 1 و 3 و 4 ی (بانگی کورد) م لە مامۆستا رەفیق ساڵح وەرگرتوە.

7. هەندێ سەرچاوە باس لە هەندێ جەریدەی تر ئەکەن بە ناوی (یەکبون) و (شرق و کردستان) و (پیمان) کە ئەبێ لەو سەردەمەدا دەرچوبن، بەڵام لە بەر ئەوەی هیچ ئاگاداری‌یەکی باوەڕپێکراو دەربارەی دەرچون و وەستان و ناوەرۆکی ئەو ڕۆژنامانەم لە بەر دەسدا نەبو، ناوەکانیانم نەخستە ریزی بڵاوکراوەکانی ئەو زەمانەوە.

Avisa

Relation oder Zeitung

Was sich begeben vnd

zugetragen hat / in Deutsch: vnd Welsch
land / Spannien / Niederlandt / Engellandt / Franck
reich / Vngern / Osterreich / Schweden / Polen /
vnnd in allen Provintzen / in Ost: vnnd
West Indien etc.

So alhie den 15. Januarij angelangt.



Gedruckt im Jahr / 1609

له رۆژنامه یه‌كه‌مه‌كانی ئه‌ڵمانی ساڵی 1609



NEW-ENGLAND. No. 3

THE

# Boston Gazette.



*Published by Authority.*

From MONDAY December 28. to MONDAY January 4. 1719.

POST OFFICE, January 4.

THE Approbation this Paper has already met with from the better Part of the Town, deserves a suitable Acknowledgement from this Office, with repeated Assurances, that it shall be carried on in such a manner as to render it both beneficial and entertaining.

And whereas some few Merchants have made their Objections against the Possibility of carrying on an exact Price Currant (in the manner proposed in the first and second of these Papers) by reason of the different Prices given for the same Commodities. This Part therefore is particularly address'd to those of this Town, desiring their matured Opinions, Whether the continuing of the said Price Currant in the Method already mentioned, will not be a means of promoting in general the Trade of this Place, or the contrary? And it is hereby promised, That an entire Regard shall be had to the greatest Part of such Merchants Sentiments, whose Judgments in Trade are unquestionable; it being the chief Design of this Undertaking to endeavour to advance, but not prejudice Trade.

ژماره 3 ی رۆژنامەی بۆستن گەزەتە

# THE
# New-York Weekly JOURNAL

*Containing the freshest Advices, Foreign, and Domestick.*

*MUNDA* April 8th, 1734.

*New-Brunswick*, March 27, 1734.
Mr. *Zenger*;

I Was at a public House some Days since in Company with some Persons that came from *New-York*: Most of them complain'd of the Deadness of Trade: some of them laid it to the Account of the Repeal of the *Tonnage Act*, which they said was done to gratify the Resentment of some in *New-York* in order to distress Governour *Burnet*; but which has been almost the Ruine of that Town, by paying the *Bermudians* about *l.* 12,000 a Year to export those Commodities which might be carried in their own Bottoms, and the Money arising by the Freight spent in *New-York*. They said, that the *Bermudians* were an industrious frugal People, who bought no one Thing in *New-York*, but lodg'd the whole Freight Money in their own Island, by which Means, since the Repeal of that Act, there has been taken from *New-York* above *l.* 90,000 and all this to gratify Pique and Resentment. But this is not all; this Money being carried away, which would otherwise have circulated in this Province and City, and have been paid to the Baker, the Brewer, the Smith, the Carpenter, the Ship-Wright, the Boat-Man, the Farmer, the Shop-Keeper, *&c.* has deadned our Trade in all its Branches, and forc'd our industrious Poor to seek other Habitations; so that within these three Years there has been above 300 Persons have left *New-York*; the Houses stand empty, and there is as many Houses as would make one whole Street with Bills upon their Doors: And this has been as great a Hurt as the Carrying away the Money, and is occasioned by it, and all degrees of Men feel it, from the Merchant down to the Carman. And (adds he) it is the industrious Poor is the Support of any Country, and the discouraging the poor Tradesmen is the Means of Ruining any Country. Another replies, It is the excessive High Wages you Tradesmen take prevents your being imployed: learn to be contented with less Wages, we shall be able to build, and then no need to employ *Bermudians*. Very fine, replied the first, now the Money is gone you bid us take less Wages, when you have nothing to give us, and there is nothing to do. Says another, I know no Body gets Estates with us but the Lawyers; we are almost come to that Pass, that an Acre of Land can't be conveyed under half an Acre of Parchment. The Fees are not setled by our Legislature, & every Body takes what they please; and we find it better to bear the Disease than to apply for a Remedy thats worse: I hope (said he) our Assembly will take this Matter into Consideration; especially since our late Judge hath prov'd *no Fees are lawful but what are setled by them.* I own a small Vessel, and there is a Fee for a *Lett-pass*,

ڕۆژنامەی نیویۆرک ویکلی جۆرناڵ



روزنامه وقایع اتفاقیه بتاریخ جمعه ششم شهر جمادی الثانی مطابق سال تنگوزئیل سنه ۱۲۶۷

نمره دهم

هرکس در ایران طالب خریدن این روزنامه باشد در بازار در دکان ... برسید ... بگیرد فروخته میشود

قیمت

یک نسخه ده شاهی

ماهی ششهزار دینار

ششماهه دوازده هزار

یکساله بیست و چهار هزار

## اخبار داخله ممالک محروسه پادشاهی

### دار الخلافه طهران

چونکه سرکار اعلیحضرت پادشاهی از زمان جلوس بر تخت فرمانروائی تا اکنون ممالک محروسه را سیاحت نفرموده اند و خاطر خسروانی مایل بانتظام ولایات و آسودگی رعایا از بدو جلوس ... فرموده و چون اقتضا بجا است ... بوجود مبارک روشنی بخش ... گردید عموم رعایا در سایه رأفت ... رسیدی و آسودگی و تقدیم شکرگذاری حاصل نمایند لهذا خاطر مبارک ... سیاحت ممالک عراق ... سلاطین سلف ... همیشه با قشون و شوکت تمام بولایات حرکت مینمودند ولی اعلیحضرت پادشاهی که شوکت و دولت همایون ... بلال بسته و افزون ... در آسایش و رفاه رعیت ... میباشند منظور دارند که از زیادتی قشون در حرکت آسیبی برعایا نرسد باین ملاحظه با جزئی قشونی بعد رکاب ... قراول وجود مبارک و بقدر لزوم ... از سایر چاکران و ... دربار خسروانی در ... بعزم سیاحت تشریف فرمای ... اصفهان ... خواهند شد انشاءالله تعالی این سفر فرخنده اثر برای عموم اهالی ولایات محروسه ... منافع کلی حاصل خواهد گردید

تذکره ... که سابقا قرار شده بود که در ... دولت علیه داده شود

در این هفته باشتین تذکره که بولایات بایست بروند مامور شده رفته و بعد از این قرار شده است که احدی از ولایات نرود بی تذکره ... و بر هرکس لازم است در عبور ... بطوریکه در کتابچه دستور العمل تذکره مرقوم است تذکره بگیرند

عالیجاه ... خان سرهنگ که ... احضار شده بود با فوج ... و صاحب منصبان فوج قدیم برکاب همایون آمده وارد دار الخلافه شدند و عالیجاه ... خان ... سابقه ... فوج ... سرتیپی ... فرمودند

شاه نهر بزرگی که در دار الخلافه در بالای نگارستان حفر شده بود که از رودخانه کرج بشهر بیاید در عهد شاهنشاه ... آن ... کنده شده و تاکنون آبی بشهر از نهر مزبور جاری نشده بود در این اوقات که اول بهار است و اهل شهر قدری کم آبی میکشیدند بسبب ... حال آب در نهر مزبور ... جاری نبود قدری خرابی بآن رسیده بود ... رفاه رعایا و برایا ... دار الخلافه ... دولت علیه ... حفر و تعمیر و بنائی نهر مزبور را که قریب به ... سنگ آبگیر دارد ... اعلی داده و درست نموده آب کرج ... بشهر جاری کرده ... شبانه روز ... محلات و خانها تقسیم شده ... اغلب ...

شماره ۱ — سال بیست ویکم — ۱

(مطبعه واداره خانهٔ اختر)

اسلامبول خان والده‌در دائرهٔ مخصوصه است کارهای متعلق باداره باقا محمد طاهر راجع است

اسامی وکلای کرام درممالک دور ونزدیک گاهی درصفحهٔ آخرین نگاشته می‌شود

سه‌شنبه ۶ محرم ۱۳۱۶

۲۸ حزیران‌ماه رومی سنه ۱۳۰۹

۱۰ ژوئیه ماه فرنگی سنه ۸۹۴

# اختر

۱۲۹۲

L'AKHTER

(تعرفه بدلات سالیانه)

درسعادت ۤ ۴ مجیدی سیم

دیگر ممالک محروسهٔ عثمانیه ۵ مجیدی

ممالک محروسهٔ ایران ۲۵ قران

ممالک هندوستان وبنادر ۱۲ روپی

ممالک روس وقفقاز ۱۰ منات

ممالک اروپ ۲۵ فرانک

یک نسخه ۶۰ پاره‌است

اجرت پوست همه جابعهدهٔ اداره‌است.

منشی اول حاجی میرزا مهدی تبریزیست

(دراین روزنامه از هرگونه وقایع واخبار وسیاسیات وپولیتیک وعلم وادب ودیگر منافع عمومی سخن گفته میشود. هفتهٔ یکبار طبع)
(میگردد اوراق ونوشتهای سود مندرا بامتنان می‌پذیریم • درنوشتن کاغذهایی که ازخارج میرسد اداره مختار است • کاغذی راکه)
(نوشته نمی شود صاحبش حق استرداد آنرا ندارد کاغذ هایی که پول پوست ندارد گرفته نمی شود •)

( فهرست مندرجات )



## عرض مخصوص

سپاس خدای را که ماراتوفیق کرامت فرمود بدیدن سال بیست ویکم انتشار اجرای روزنامه‌ای که خادم حقیقی اسلامیت وانسانیت است .

بزرگان ملت‌را پوشیده نیست‌که از آغاز تأسیس این‌نامه ازمقصود اصلی‌که خدمت بعالم اسلامیت وانسانیت‌است بقدرقوه انحراف نورزیده‌ایم وپیشرفت آن‌مقصود مقدس‌را برهمه چیزی مقدم‌داشته باوجود صدمات متوالیه بقدریکه مقدور بوده بحصول آن مقصود همت گماشته ایم . واین بارگران‌را درظرف این‌مدت طولانی بتنهایی بدوش کشیده چون سایر روزنامها ازهیچ طرفی وظیفه ومعونتی نداشته‌ایم مگر معدودی ازبزرگان ملت‌که گاهی باقتضای قدر شناسی وبلندی همت مبلغی اعانت فرموده اداره‌را مرهون منت خود داشته‌اندکه تاحیات داریم انسانیت ایشانرا فراموش نکرده زبان ازثنایشان کوتاه نخواهیم‌داشت. ازهم‌وطنان محترم‌که درممالک محروسهٔ عثمانی وخطهٔ وسیع هندوستان ومملکت قفقاز اقامت‌وتجارت دارند وازمشترکین روزنامه هستندنیز نهایت تشکرراداریم زیرا که این جوانمردان باقتضای بصیرتی که دروضع خارجه‌دارند بیش‌ازدیگران ازمراتب منافع روزنامه آگاهی حاصل نموده‌وجه‌روزنامه‌راماننده‌سایرملل پیشکی میپردازندکه‌درحقیقت پیشرفت‌اموراداره‌ماز این رهگذر است.بالعکس‌ازمشترکین‌محترم‌ممالک‌محروسهٔ‌ایران‌دربعض نقاط‌اداره‌یکساله‌بلکه‌چندساله‌طلبکاراست‌وسبب‌عمدهٔ این‌معنی نیزمسامحهٔ وکلای محترم‌است وگرنه مشترکین گرامی باورنداریم‌که درادای این‌مبلغ جزئی تااین‌پایه ایستادگی نمایند . زیرا که میدانند بسبب تنزل

8. کاتنامە کوردیەکان: لێکۆڵینەوەی تایبەت

8. 1. جەریدەی کوردستان: سەرەتای رۆژنامەوانیی کوردی

ژوپیر ۱ — سالا عوڵی — عدد ۱

حجی کاغذێ ڤی ربکه
دیقی ریکێ مصری سر
ناف خویی ڤی جریده‌یی
بدرخان پاشا
مقداد مدحت بکی
هرجار دوهزار جریده‌یا
بی پره ازیٚ ربکم
کردستانی د بدین خلکی
پازده روژا جارکی تیت
نفیساندن

# کردستان

۱۳۱۵

✽ کردلری ایقاظ وتحصیل صنایعه تشویق ایچون شمدیلك ✽
✽ اون بش گونده بر نشر اولنور کردجه غزته‌در ✽

عنوان
مصرده «کردستان» غزته‌سی
صاحب ومحرری بدرخان
پاشا زاده
✽ مقداد مدحت ✽
هر طبعنده ۲۰۰۰ نسخه کردستان
ولایت‌لرینه ارسال ووسائط ایله
قراوقصبه‌لره نشر وتعمیم اوله‌جقدر
کردستان خارجنده هر بر
ایچون سنه‌لك آبونه بدلی
۸۰ غروشدر
کردستان داخلنده خصوصی
استانلره مجاناً کوندریلور

✽ روژا پنجشیده ۳۰ ذوالقعده سنه ۱۳۱۵ پنجشنبه فی ۹ نیسان سنه ۱۳۱۴ ✽

بسم الله الرحمن الرحیم

صد هزار شکر وحمد ژ خدی تعالی‌ره آم مسلمان خلق بکرن. وظائفنا علم ومعرفتیره هش وزکا دامه. در حقا علماندنا علم ومعرفتیره گلك آیتین جلیله واحادیث شریفه هنن دنیابده چقاس مسلمان هبن گوند وبازیرین حماده مکتب ومدرسه وجریده هنن دنیابده چه دبه چه نابه جریده دنفیسن. حیفامن تیت ژ کرداره کرد ژ گلك قوما زیده‌تر خویی هش وزکانه جامیرن دبنین خوده راست وقوینه خورتن ودیسا وکه قومین دی نه خوندانه نه‌دولندن دنیابده چه دبه جیران وان موسقوف چاوه‌به وی چه بکه نظانن. لوما ربلخدیده من آف جریده باها نفیسی باذنا خدی تعالی پاش نهو هر پازده روژاده جارکی آزی جریده‌کی بنفیسم. ناف ڤی من کربه (کردستان) ڤی جریده‌یده آزی بحثا قنجیا علم ومعرفتا بکم لکوده‌ری مرروف دعلمه لکودری مدرسه ومکتبن قنج هنه آزی نیشا کردا بکم لکودری چه شر دبه دولتین معظم چه دکن چاوه شر دکن تجارت چاوه دبه ازی حمیا حکات بکم حتی نهو کسی جریده‌کی هولی نفیسی‌یه آف جریده‌یا منا‌ها یا عوڵی‌یه لوما وی گلك کیمایی هبتن. از هیفی دکم کیمایا جریده‌یی ژمنره بنفیسن حمی تشت وکی نو چه دبن رکین پاشی رهنکی دچه دکوه ریده آقه ایدی آزی دست مقصدی بکم. (ومن الله التوفیق)

---

حضرت پیغمبر علیه الصلوة والسلام گوتی‌یه «العلماء ورثة الانبیاء» انکو علما وارثین انبیانه ژ طرف خدیده مامورن وعظ ونصیحتی بدن خلکی ریا قنج نیشا وان بکن لوما گلی علمایین کردا چاوه اون وعظ ونصیحتا نمیژی ددن ولی دفی اون میر وآغا وکرمانجین دناسن وان تشویقا ظانینا علم ومعرفتی بکن ریا قنج نیشا وان بکن هکی اون وی نکن گنهی حمیا سطوی‌وه‌یه

## 8. کاتنامە کوردیەکان: لێکۆڵینەوەی تایبەت

### 8. 1. جەریدەی کوردستان: سەرەتای ڕۆژنامەوانیی کوردی

#### 1. دەرچون و بڵاوکەرەوەکانی

ژ1 ی لە 22 ی نیسانی 1898 لە قاهیرە و

ژ31 ی، کە دوا ژمارەی ئەم خولەیەتی، لە 14 ی نیسانی 1902 دا لە جنێڤ دەرچوە.

میقداد مەدحەت بەگی کوڕی بەدرخان بەگ، میری پێشوی جزیرەی بۆتان، دەری کردوە.

لە ژمارەی شەشەمەوە ئەوڕەحمان بەگی برای لە دەرکردنیدا جێگەی گرتۆتەوە.

لە ژ6 دا نوسیوێتی:

"ئەم جەریدەیە هەتا ئیستا برای من میقداد بەگ دەری ئەکرد، بەڵام لە بەر ئەوەی خونکار (مەبەستی لە خونکار سوڵتان عەبدولحەمیدە) نەیهێشت ئەو لە میسر دانیشێت گەڕایەوە ئەستانبول، لە ئەستانبول نەیتوانی جەریدەکەی دەر بکا... چونکە پیاوە گەورەکانی دەوری خونکار هەمو خائین و بێ ئەسڵ و نەسەبن، نەیاری جەوانمەردانن... یەکێکیان ناوی ئەبولهودایە... لە هەمویان زیاتر نەیاری ماڵی بەدرخان بەگە، ئەو نەیاری هەمو کوردانە، ناوی باش لە کورد بنێ ی ئەو خونکار ئەخەڵەتێنێ. بە راستی ئەو ئەبولهودا نیە و ئەبولزەلالە (ابوالضلال)، لە فسق و حەسەدا بێ هەڤاڵە. ئەو ناهێڵێ کوڕانی بەدرخان بەگ جەریدەیەکی وەها دەر بکەن ببێتە مایەی باشی کوردان... منیش کە کوڕی بەدرخان بەگم، لە بەر تەعەسوب و حەمییەتی خۆم، لە موڵکی خونکار دەرچوم، هاتمە دیاری غەریبی تا ئەم خزمەتە بە وەتەن و میللەتەکەی خۆم بکەم. لە کەرەمی خوا هیوادارم کە کوردیش بە هۆی ئەم جەریدەیەوە لە خەوی گرانی چەند ساڵەی هوشیار ببێتەوە".

ئینجا باسی ئەوە ئەکا کە جەریدەکەی بە نامەیەکەوە ناردوە بۆ خونکار، لە نامەکەیدا بۆی نوسیوە چونکە ئەو نەیهێشتوە براکەی لە موڵکی ئەودا جەریدەکەی دەربکا، ئەم لە موڵکی سوڵتان دەرچوە تا بە هۆی ئەم جەریدەیەوە خەبات بکا بۆ چاکەی کورد.

ئەم جەریدەیە خۆی بە خاوەنی پەیامێکی سیاسی زانیوە بۆ گەلی کورد، بۆیە لە لاپەڕەی یەکەمی جەریدەکەدا و، لە ژێر سەرناوەکەیدا نوسیوێتی:

"هەر جارەی 2 هەزار ڕۆژنامە بە خۆڕایی ڕەوانەی کوردستان ئەکا تا بیدەن بە خەڵک" و،

لە وتارێکی تردا لە ژ26 دا ئەڵێ:

"ئێوە ئەزانن من کوڕی ئەو پیاوەم کە بە شیر بۆ سەعادەتی ئێوە غیرەتی زۆری نواند، منـیش ئـەمڕۆ بە موقتەزای زەمان بە قەڵەم ئەو خزمەتە ئیفا ئەکەم."

بۆ چاوترساندن و دەستەمۆکردنی ئەورەحمان بەگ پێنج لە براکـانی: ئـەمین، عـەلی، مـوراد، حەسـەن، کامیل، لە ئەستەمولْ گیراون. سوکایەتی‌یان پێ کردون و ئەشکەنجەیان داون.

لە عەرزوحاڵێکی کراوەدا کە بۆ سوڵتانی نوسیوە، لە ژ7 دا بڵاوی کردۆتەوە ئەڵێ:

"ئەگەر مەبەست لە زیندانی کردن و ئەشـکەنجەدانی ئـەو برایانـەم بـەو شـێوەیە بـۆ (بـە) لاوە نـانی بیروباوەڕ و عەزم و، گەڕاندنەوەم بێت بۆ ئەستەنبوڵ، قەسەم بە خودا، ئەو تەگبیرە لە بەهێزترکردنی عـەزم و خۆڕاگریم بەولاوە هیچی تر نابێت، (شێر هەرچەندە بریندار بێت چنگی توندوتیژتر دەبێت)"

### 2. مەبەست لە دەرکردنی

سورەیا بەدرخان لە سەروتاری یەکەمین ژمارەی سێیەمین خولی جەریـدەی کوردسـتاندا (1917)، کە ئـەویش هـەر لـە قـاهیرە دەرچـوە، چیرۆکـی دەرکردنـی یەکـەمین رۆژنامـەی کوردسـتان بـەم جـۆرە ئەگێڕێتەوە:

"... هەمو سوڵتانەکانی تورک نە تەنیا لە وڵاتی کورد هیچ کارێکی باشیان نەکرد، وڵاتی تورک یەعنی وڵاتی ئێمەشیان خراپ کرد، لە زەمانی میرانی کوردا لە وڵاتی کـورد هـەمو شـتێکی بـاش هـەبو، بـەرە بـەرە هەموی خراپ بو. تورکەکان دو صەد ساڵ بو نەیان ئەزانی لە ئەدرنە تا ئەسـتەموڵ ڕێیـەک دروسـت بکـەن، ئیتر چۆن بزانن ڕێگا و شتی باش لە وڵاتی ئێمەدا دروست بکەن؟ پێش دو سەد ساڵ حاڵی وڵاتـی ئێمـە لـە ئێستا خراپتر نەبو. پادشاهانی عوسمانی بینی‌یان بە باشی ناتوانن وڵات بگرن، تۆوی خراپەیان فـڕێ دایـە ناومانەوە. بەرە بەرە هەمو وڵات وەک جێگەی شەڕی لێ هات. میرانی کورد کە حکومـەتی عوسـمانی بـە زۆر هێنابونی بۆ ئەستەموڵ ئەم حاڵەیان دی. بینی‌یان حکومـەتی عوسـمانی هـەر رۆژە ئـەڵێت بـۆ چاکـەی وڵات هەوڵ ئەدەم، هەر ڕۆژەی درۆیەک ئەکات و شتێکی باش ناکات. وتیان مادام حکومەتی عوسمانی خۆی خـراپ ئەکات بۆچ ئێمەش لە گەڵ ئەو خراپ ببین. لە ساڵی 1313 (1896) هوە بۆ چاکەی وڵاتی کـورد بـە نهێنـی کەوتنە کار. بۆ ئەوەی لە پێناوی چاکەی کوردا تێ بکۆشێت، ڕێی ڕاست و باش بە ئێمە بڵێت، ساڵی 1314 (1897) کوڕی میر، جێگای بەهەشت بێت، مەدحەت بەگ کوڕی میر بەدرخان لە (بنەماڵـەی) بۆتـان چـو بـۆ میسر. لە قاهیرە رۆژنامەی کوردستانی دەرکرد. پـاش سـاڵێک مەدحـەت بـەگ نـەخۆش کـەوت. بـرای ئـەو عەبدولڕەحمان بەگ چوە سویسرە. سەرلەنوێ رۆژنامەی کوردستانی دەرکردەوە. کاتێک سوڵتان حەمید هەمو ماڵی بەدرخانی بەند کرد، کەس نەما ئەو رۆژنامەیە دەر بکات... "

لە سەروتاری تورکی هەمان ژمارەدا رونتر ئەنوسێ:

"لە بەر ئەوەی سوڵتانە گـەورەکان... ماکیاڤیلیـەکان، دەسـتیان کـرد بـە دوبـەرەکی خسـتنە نـاو ئـەو میللەتانەی کە دەوڵـەتی عوسـمانی‌یان لـێ پێکهـاتبو و، ئـەو ئیـدارە هەڵەیـە کاریگەریـەکی زۆری کـردە سـەر کوردەکان، بۆیە هیچ هیوایەکیان نەما و دەستیان لە چاکبونی بار و دۆخەکە شـت. هەنـدێ لـە سـەرکردەکانی کورد بۆ رزگارکردنی کوردەکان لە دەست زوڵم و زۆرداری نەتەوەکانی عوسمانی، سـاڵی 1313 کۆمەڵەیـەکی نهێنی‌یان دامەزراند، مەدحەت بەگ کوڕی خانەدانی بەڕێزی بۆتان و دوا حوکمداری جەزیرە حـەزرەتی ئـەمیر بەدرخان، جێگای بەهەشت بێـت، بـۆ بڵاوکردنـەوەی بیروبۆچـونی ئـەو کۆمەڵەیـە سـاڵی 1314 رۆژنامـەی کوردستانی لە قاهیرە دەرکرد..."

مەدحەت بەگ لە سەروتاری یەکەمین ژمارەی کوردستان دا نوسیوێتی:

"بە داخەوە کورد کە لە زۆر نەتەوە زیاتر خاوەنی بیر و هۆشن، جوامێرن، لە ئاینی خۆیـان دا ڕەوا و بەهێزن، بەڵام وەکو نەتەوەکانی دیکە خوێندەوار و دەوڵەمەند نین. نازانن دراوسێکانیان چۆنن و چی ئەکەن و ئاگایان لێ نیە. بۆیە پشت بە خوا ئەم ڕۆژنامەیەمان نوسی و بە پشـتیوانی خـوای گـەورە لەمـەودوا هـەر پانزە ڕۆژ جارێک بڵاوی دەکەمەوە.

"ناوی ڕۆژنامەکەشمان ناوە کوردستان و لەم ڕۆژنامەیەدا سودەکانی زانست و زانیاری باس دەکەم، لـە چ جێگایەک مرۆڤ فێر دەبێت، لە چ جێگایەک خوێندنگای باش هەیە پیشانی کوردی دەدەم، لە چ جێگایـەک شەڕ ببێت هەڵوێستی وڵاتانی گەورە چی دەبێ و چۆن شەڕ دەکەن، چۆن بازرگانی دەکرێـت، هـەمویان بـاس دەکەم. تا ئێستا هیچ کەسێک ڕۆژنامەیەکی وەک ئەمەی بڵاو نەکردۆتەوە."

لە مانە هەموی ڕونتر مەدحەت بەگ لەو کارتەدا، ئامانجەکانی خۆی بە ئاشـکرا نوسـیوە، کـە لـە گـەڵ ژمارەی یەکەمی ڕۆژنامەکەیدا بە فەرەنسـی نوسـیویێتی و ناردویـەتی بـۆ ئەوانـەی ڕۆژنامەکـەی بـۆ ڕەوانـە کردون:

"گەورەم!

زۆر بەختیارم بەوەی کە ژمارەی یەکەمی ڕۆژنامەی کوردسـتانتان بـۆ دەنێـرم، ئـەوی هـەر ئێسـتا لـە قاهیرە دامەزراندوە.

"نەتەوەی من، کە نەتەوەی کوردە، ژمارەی 6 ملیۆن کەسە لە ئاسیای بچوکدا. زمانیـان گـەلێک کۆنـە. ئەمە یەکەمین جارە کە بەم زمانە ئەم ڕۆژنامەیەم بڵاو کردۆتەوە، بۆ مەبەسـتی تێگەیانـدنی زانیـاری و گیـانی خۆشەویستی لە ناو ڕۆڵەکانی نەتەوەکەمدا و هاندانی کوردەکان بۆ ئەوەی ڕێگەی پێشکەوتن و شارسـتانێتی نوێ بگرن، لە هەمان کاتیش دا ئەدەبی نەتەوەیی خۆیانیان پێ نیشان بدەین.

"باوکم، میر بەدرخان، لە جەنگی سەربەخۆیی کوردستاندا بەشـدار بـو، دژی حکومـەتی عەبدولحەمیـد، ئەو کەسەی کە ژیانی لە بنەماڵەی ئێمە قەدەغە کرد لە نیشتمانی خۆمان دا. لە بەر ئەمە ڕوم کـردە قـاهیرە، وە لەبـەر ئـەوەی دەمـەوێ نیـزام و ئاسـایش بـاڵ بـە سـەر کوردسـتان دا بکێشـێ، بڕیـارم دا لـە ڕێگـەی ئـەم ڕۆژنامەیـەوە هـەمو توانـای خـۆم لـە دورەوە تـەرخان بکـەم بـۆ هـەمو کارێـک کـە قـازانج و بـەختیاری و پەروەردەکردنی بیری تێدا بێت بۆ هاووڵاتیانی کورد. میقداد مەدحەت"

نـاوەرۆکی بـاس و بابـەت و وتارەکـانی کوردسـتان بەڵگـەی ئـەوەن، هـەم مەدحـەت بـەگ و هـەم عەبدولڕەحمان بەگ دو کەسی بیرئازاد و دو ڕۆشنبیری گەورە و هۆشیار و ئاگاداری سەردەمی خۆیان بون.

بڵاوکەرەوەکانی ئەم ڕۆژنامەیە پێیان وابوە پەیامێکی پیرۆزیان بۆ نەتەوەکەیان پێیە لـە ڕێگـەی ئـەم ڕۆژنامەیەوە پێی ڕائەگەیەنن. کاتێ کە فەرمایشتە بە ناوبانگەکەی پێغەمەر: (کلکـم راع و کلکـم مسـئول عـن رعیتە) ئەکا بە ناونیشانی سەروتاری ژ3 ی ڕۆژنامەکە و، نوسیویێتی:

"ئەمەش لە حەدیسـی: (کلکـم راع...) بـە دەر دەکـەوێت کـە منـیش بـەم فەرمودەیـەی پێغەمـەر (د. خ) مەئمورم و دەبێت خزمەتی چاکـەی کـورد بکـەم و ڕێی ڕاسـت و ڕەوانیـان پیشـان بـدەم و لـە خراپـەکاری بیانپارێزم، چونکە دەوڵەت ڕێ نادات هیچ کەس لە ئێمە بچێتە کوردستان، بۆیە وەک ئەرکی سەرشانم ئـەوەی پێم بکرێ لە ڕێی ئەم ڕۆژنامەیەوە ئەیکەم تا یارمەتی خۆمان و هەمو موسوڵمانان بدەم".

دواتریش لە ناواخنی چەندین وتاردا دوبارەی ئەکاتەوە، بە ئاشکرا ڕو لە سوڵتان ئەکا و ئەڵێ:

"... لە بەر ئەوەی خۆم بە یەکێک لە ئومەرا بەرزەکان دەزانم و خۆم بە لێپرسراویان دادەنێم، بە پـێی فەرمودەی پێغەمەر کە دەفەرموێت: (کلکم راع و...)".

هەروەکو لە تورکیا بواری دەرکردنی نەبو، لە قاهیرەش کەوتنە راونانی. رۆژنامەی کوردستان لە ناو تورکیادا قەدەغە کرا و، مەدحەتیش حوکم درا و، براکانی گیران بۆ ئەوەی ناچاری بکەن دەس لە دەرکردنی کوردستان هەڵبگرێ و بگەڕێتەوە تورکیا و، ئەگەر نەگەڕێتەوە داوا لە کاربەدەستانی میسر بکرێ تەسلیمی بکەنەوە.

کوردستان سەرەتا بە زمانێکی نەرم لە گەڵ سوڵتان و دەسوپێوەندەکانی ئەدوێ و تکا ئەکا و ئەپاڕێتەوە. بەڵام کە ئەم زمانە سودی نابێ، ژمارە لە دوای ژمارە زمانەکەی تونـدوتیژتر ئەبێ و، گۆڕینی سوڵتان ئەبێتە ئامانجی سەرەکی و، هۆی چارەسەری زوڵم و فەساد لە دەوڵەتی عوسمانیدا. نەبەردێکی سەختی سیاسی دژی سوڵتان و دەسوپێوەندەکانی دەس پێ ئەکا.

## 3. بابەتی سیاسی

### 3. 1. هاندانی کورد بۆ خوێندن و فێربون

لە وتارێکی درێژی ژ1 یدا نوسیوێتی:

"حەزرەتی پیغەمبەر (علیە الصلواة والسلام) گوتویەتی: (العلماء ورثة الانبیاء) زاناکان وەرەسەی پیغەمبەرانن لە لایەن خواوە مەئمورن وەعز و نەسیحەتی خەڵکی بکەن و رێی راستیان نیشان بدەن. بۆیە گەلی زانایانی کورد چۆن وەعز و نەسیحەتی نوێژ ئەدەن ئەبی ئێوە ئەو میر و ئاغا و کرمانجەی ئەیانناسن تەشویق بکەن بۆ زانینی عیلم و مەعریفەت و رێی راستیان نیشان بدەن. ئەگەر ئێوە ئەوە نەکەن گوناحی هەمویان لە ئەستۆی ئێوەدایە."

لە بەشێکی تریدا ئەڵێ:

"دیسان حەزرەتی پێغەمبەر وتویەتی: (العلم علمان علم الابدان وعلم الادیان) واتە زانست دو جۆرە یەکێکیان زانستی لەشە، یەکێکیشیان زانستی دین و ئیمانە، زانستی لەش حەکیمی‌یە.

"گەلی میر و ئاغایان! تا ئێستا کێ لە ئێوە گوێی دایە ئەم فەرمانەی پیغەمبەر؟ کێ لە ئێوە منالەکانی خۆی، براکانی خۆی، مرۆڤەکانی خۆی ناردوە بۆ خوێندن؟ کێ لە ئێوە لە گوندەکەی خۆیدا، لە شارەکەی خۆیدا، مەکتەبێ، مەدرەسەیەکی کردۆتەوە؟

"گەلی عولەما! ئێوە بۆچی ئەو حەدیسانە بۆ میر و ئاغایان ناخوێننەوە؟ ئێوە بۆچی جەریدەی عەرەبی ناخوێننەوە تا ئێوە بزانن چی لە دنیادا ئەبێ؟

"لەم ساڵانەدا لە ئەستەموڵ مەکتەبێ کراوەتەوە، ناوی مەکتەبی عەشائیرە. جگە لە منالی عەشایەر کەسی کە وەرناگرێ. لە بەغدا و شام و لە یەمەنەوە شەممەر و عەنەزە، هەمویان منالی خۆیان ئەنێرن بۆ ئەستەموڵ لە مەکتەبی عەشائیردا بخوێنن. هەر ساڵ دو مانگ ئەچنەوە مالی خۆیان پاشان دێنەوە لە شەش حەوت ساڵان دا زانای باشیان تێدا هەڵئەکەوێ و ئەچنەوە گوند و شارەکانی خۆیان. دەوڵەت هەمو مانگێ پارەیان ئەداتێ و ئەبن بە مەئمور هێدی هێدی ئەبن بە موتەسەریف و والی.

"گەلی میر و ئاغایان! گوناهی منالەکانتان لە ئەستۆی ئێوەدایە. ئێوەیش منالەکانتان بنێرن بۆ خوێندن دەوڵەمەند بن. لە گوندەکان دا مەکتەب بکەنەوە لە رێی خوادا خێر بکەن."

لە جێیەکی تردا ئەنوسێ:

"من زۆر شوێن گەڕاوم. ئیستایش لە میسرم. لە هەمو جێیەک منالی چەرکەس و ئەرناوود و عەرەب ئەبینم کە باوک و براکانیان ئەیاننێرن بۆ مەکتەب پێیان ئەخوێنن. لە میسر لە جامیعەی ئەزهەر توشی هەندێ کوردی سۆران بوم هەندێکیان کەرکوکین و هەندێکیان هی لای سلێمانین، هەمو ئەخوێنن. بەڵام من

هیچ جارێک و لە هیچ کوێیەک توشی خەڵکی بۆتان، غەرزان، شێروان، هەکاری نەبوم، لـە هـیچ مەکتـەبێک دا توشی مرۆڤی خێڵەکی کورد نەبوم. من چەند جار توشی پیاوی ئەم عەشـیرەتانە ئـەبم، هـەمویان رەنجبـەرن، هەژارن، رەبەنن، سنعەتێک و هونەرێک نازانن."

بۆ ئەوەی کورد هان بدا بە منالّەکانیان بخوێنن، چەنـدین وتـاری درێـژی نوسـیوە و، وتارەکـانی بـە ئایەتی قورئان و حەدیسی پێغەمبەر و قسەی نەستەق ڕازاندۆتەوە. لەوانە:

سەروتاری ژ2 کە دو لاپەڕە و نیوی جەریدەکەی گرتۆتەوە.

سەروتاری ژ3 کە ئەویش دو لاپەڕەی گرتۆتەوە.

لە ژ4 دا (فضیلة العلم) و

لە ژ5 دا (فضیلة التعلم)

لە ژ8 دا (هل یستوی الذین یعلمون والذین لایعلمون)

لە ژ9 دا (رتبة العلم اعلی الرتب)

سەیری دلّسۆزی ئەم پیاوە و سەیری ئەم ئاگادارییە:

"لە یەکەم ژمارەی جەریدەکەدا نوسی بوم کە من کوڕی بەدرخان پاشام. ئەلحەمدولیلا ئیسـتا ئـەوی لـە دنیادا ماوین حەڤدە براین. هەمو خاوەن پلە و پایەین. هەمویشمان ئەخوێنین و ئەنوسین. لە ناو ئێمەدا پاشا و ئەفسەری عەسکەرییش هەیە. سپاس بۆ خوا عیلم و مەعریفەت فێر بوین. هەندێکمان لە شام و هەنـدێکمان لە ئەستەموڵ و هەندێکیشمان کاربەدەستن لە ولاّتان. ئێمە لە باووباپیرمانەوە میری بۆتـان و گـەورەی کـورد بوین بۆیە دەینە لە سەرمان کە خەبات بۆ چاکەی کورد بکەین. ئەبێ ئێمە وەکو منالّی خۆمان بیـر لـە منـالّی کورد بکەینەوە. بۆیە لە خەڵکی کوردستان کێ منالّی خۆی بۆ خوێندن بنێرێتـە ئەسـتەموڵ، بینێـرن بـۆ لای براکانی من لە ئەستەموڵ. ئەوی بیشـنێرێ بۆ میسر ئەبێ لە پێشەوە نامەیەکم بۆ بنێرێ لە سـەری بنوسـێ: (بمصر نجل المرحوم بدرخان باشا مقداد مدحت بک) ئەو کاغەزە بگاتە دەستی من ئەبێ بـزانم وەڵامـی ئـەم نامەیە بۆ کوێ بنێرم، بۆیە لە نامەکەدا ئەبێ شوێن و ناوی خۆی بنوسێ."

لە ژ1 دا بۆ ئەوەی گرنگی خوێندن و زانین و پێشکەوتن و پیشەسازی دەربخا، باسی شەڕی میسر و سودان و، بەراوردی هێزەکانیان ئەکا و ئەڵێ پیاوێکی سودانی بە 10 میسری ئەچێ بەڵام ئێمـە هـەمو ڕۆژێ لە ڕۆژنامەکاندا ئەخوێنینەوە "10 لە میسری ئەکوژرێ بـەڵام 50 لـە سـودانیەکان ئـەکوژرێ. هـۆی ئەمـەش خەڵکی سودان نەخوێندەوارن، فروفێڵی شەڕی ئەم زەمانە نازانن. تۆپ و تفەنگی ئەم زەمانەیان نیە، هەیشیان بێ نازانن بەکاریبهێنن..."

لە ژمارەکانی تریشدا هەمیشە، کە هەواڵی شەڕ و گەلان ئەگێڕێتەوە، پێ لە سەر ئەوە دائەگرێ کـە لـەو سەردەمەدا باڵادەستیی تەکنۆلۆجی و پێشکەوتنی پیشەسازی و هونەر بۆ کورد پێویستە.

### 3. 2. دژایەتیی زوڵموزۆری عەبدولحەمید

لە سەروتاری ژ11 یدا لە ژێر سەرناوی (واعتصموا بحبل الله جمیعا ولاتفرقوا) نوسیوێتی:

"گەلی کوردان!... ئەگەر ئێوە ئیتیفاق نەکەن، لە ژێر زوڵمدا ولاّت و دین و ناموسی خۆتان ون ئەکـەن. پێتان بڵێم ئەو کاربەدەستانەی خونکار ئەیاننێرێتە کوردستان، چۆن تەعین ئەکرێن و لە چ فکرێک دان و چی ئەکەن؟

"خونكار بیست سی هەزار زێڕ بەرتیل لـە وەزیرێـک ئەسـێنێ ئەیكاتـە سـەدری ئـەعزەم، دوای ئـەوە سەدری ئەعزەم چەند هەزار زێڕ بەرتیل ئەسێنێ وەزیر ئەكاتە نازر. پاشان پاشایەک هـەزار زێڕێـک بـەرتیل ئەداتە سەدری ئەعزەم ئەبێتە مەسەلەن والی دیاربەكر. ئەو والیە بۆ ئەوەی ئـەو پارەیـەی داوێتیـە سـەدری ئەعزەم دەربهێنێتەوە ئەبێ بەرتیل بخوا. هەرچی بەرتیلی زۆری دایە ئەیكا بە موتەسەڕیف، ئینجا موتەسەڕیف بۆ ئەوەی پارەكەی خۆی دەربهێنێتەوە ئەوی پارەی زۆری بـداتێ ئـەیكا بـە قایمقـام، قایمقـامیش بـۆ ئـەوەی پارەكەی كە داوێتی بە موتەسەڕیف دەربهێنێتەوە لە كوردی بەسزمانی ئەسێنێ."

ئینجا نمونەیەک ئەهێنێتەوە كە چۆن لە جزیرە قایمقام ئەكاتە سەر كابرایەک كـە ڕانەمـەڕێكی هـەبوە چۆن قایمقام ئەیگرێ و سەرەنجام ئەوەندە ئەیگرن و ئەیهێنن و ئەیبەن و بەرتیلی لێ ئەسێنن، نابوت ئەبێ.

لە ژ13 دا لە ژێر سەرناوی (كاغەزێ كە لە كوردستانەوە هاتوە) بە ئیمزای (لە ئەشرافی دیاربـەكر ش. م) بە كرمانجی نوسیوێتی:

"ئەمە دوسێ مانگە جەریدەی كوردستان دێتە وڵاتی ئێمەوە، بەڵام مـەئمورەكانی حكومـەت نـاهێڵن بـە سەربەستی بیخوێنینەوە. بە دەستی هەر كەسێكەوە بیبینن ئەیگرن و ئەو كەسەیش ئەگرن و ئازار ئەدەن. لـە گەڵ ئەوەیشدا كرمانج هەمو گەلێ مەیلی ئەكەن." لە جێیەكی تردا ئەڵێ سـوڵتان عەبدولحەمیـد باشـی ئێمـەی ئەوێ بەڵام وەكو نوسیوێتی: "ئەو والی و قایمقام و مدیر و، حاسڵی چەنـد مـەئمور ئەنێرێتـە سـەرمان گـەلێ زاڵم و بێ ئینسافن. ئەوان كوردستانیان وێران كرد و، كەس حاڵی نەماوە. ئەو گوندانەی لە سەردەمی باوكتـا 100 خانو بون، ئیستا 10 ماڵی نەماوە، ئـەویش ڕەبـەن و هـەژارن. زۆر كرمـانج لـە كوردسـتان هیجـرەت ئەكەن، هەندێكیان ئەچن بۆ ناو عەجەم و هەندێک بۆ ناو تورک، هەندێكیشیان لە بەر ڕەبەنی لە ناو ئەچن و لە برسا ئەمرن."

ئینجا ئەڵێ: "ئێمەی كورد هیواداریین كە تۆ لە جەریدەكەی خۆت دا بە توركی بۆ خونكاری بنوسی:

"عەرزی خونكار بكەی مەئموری ڕاست و عادل بنێرێتە كوردستان. ئەگەر ئـەم حاڵـە وەهـا دەوام بكـا كوردیش تەحەمولی ئەم زوڵمە ناكەن و ئەبنە هەڤاڵی ئەرمەنی و پێكەوە داوای ئەسبابی عەدالەت ئەكەن.

"هیوادارم ئەوەش بنوسی ئەو شوێنانەی بەمنزیكانە لە دەس خونكـار دەرچـون وەكـو بولغارسـتان و كرید سەبەبەكەی ئەگەڕێتەوە بۆ زوڵمی مەئمورەكان. ئەوە مەعلومی عالەمە كە عەدالەت لە كوێ بێ مرۆڤ ڕو لە وێ ئەكا.

"بە خونكار بڵێ: (العدل اساس الملک)، حەیفم لێ دێ، مەئمورەكانی ئەو ناعادلن، زاڵمـن، خـائینن، بـێ ئینساف و مروەتن، نەفعی خۆیان لە فەلاكەتی ئێمەدا ئەبینن.

"بە خونكار بڵێ: ئەی ئەمیرەلموئمنین! حەزرەتی پێغەمبەر ئەمری كردوە كە: (الامام مسئول علی الناس عن رعیته) بۆچی ئەم ئەمرەی پێغەمبەر جێبەجێ ناكەی، ئەگەر تۆ فكری حاڵی تەبەعـەی خـۆت نەكـەی تـۆیش عیندەڵڵا مەسئولی. جەزای تۆ لە هی هەمویان زیاترە.

"بڵێ: ئەی پادشا تۆ نازانی (عدل ساعة خیر من عبـادة سـبعین سـنة)" لـە كۆتـایی نامەكـەی دا ئـەڵێ باووباپیری تۆ شمشێر بە دەستەوە پێش لەشكرەكانیان ئەكەوتن و دنیایان ئەلەرزانـد تـۆیش خزاویتـە نـاو سەراكەی خۆتەوە و دەرناچی. ئینجا ئەڵێ: "سەری خۆت هەڵبڕەو نەختێ سەیری دەوروبەری خـۆت بكـە، تـا تۆ ببینی عەبدەكانی خوای تەعالا چ زوڵم و غەدرێكیان لێ ئەكرێ و چۆن ئەناڵێنن. تا تۆ ببینی چاوی هـەتیو و ژن چۆن باران ئەبارێنن. تا تۆ كوردستان ببینی كە وەكو جـەنگیز و تـەیمور پیـا تێپـەڕی بـن. یـا وەكـو زەلزەلە لێی دابێ، وێران بوە. لە ئاوەدانی ئەسەرێ نیە. ئەو ژن و مناڵ... ڕوت و برسی ماونەوە، بڵـێ: ئـەی خەلیفە حقوقی ئەم عەبدانەی خوا بە تۆ سپێردراوە!"

نوسەری کوردستان سەروتاری ژ13 ی بۆ نـاوەرۆکی ئـەم نامەیـە تـەرخان کـردوە و، هـەروەکـو داوایان لێ کردوە بە تورکی راستەوخۆ روی دەمـی کرۆتـە سـوڵتان عـەبدولحەمیـد. هـەر لـەم ژمارەیـەدا وتارێکی تری بە کرمانجی لە سەر هەمان نامە نوسیوە روی دەمی ئەکاتـە زانایـانی کـورد و داوایـان لـێ ئەکا خەڵک هوشیار بکەنەوە بۆ ئەوەی زوڵموزۆری مەئمورەکانی حکومـەت قبـوڵ نەکـەن و، لـە رویـاندا راپەڕن.

لە سەروتاری ژ30 دا کە بۆ باسی (ئەساسی نیفاق لە کوردستان) دا تەرخان کراوە، رونی ئەکاتەوە بە هۆی نەبونی قانونیی ئەساسی و، زۆرداری خونکار و کاربەدەستەکانی‌یەوە، مافی هاووڵاتی‌یـان پایـەماڵ بـوە و، بۆتە بەهانە بۆ دەستێوەردانی دەوڵەتانی روسـیا و ئینگلیـز و فەرەنسـە لـە کاروبـاری نـاوخۆی دەوڵـەتی عوسمانی‌دا. باسی خراپی ئەو ئیمتیازاتە ئەکا کە بە وان و بە مسیونەرە مەسـیحیەکان دراوە. دەوری خراپـی مسیونەرەکان رون ئەکاتەوە.

لە ژ31 دا دو ریپۆرتاجی، یەکێ بە کرمانجی و یەکێ بـە تـورکی لـە سـەر کـۆنگرەی ئـازادیخوازانی عوسمانی نوسیوە. ئەم کۆنگرەیە بە سەرۆکایەتی ئەمیر سەباحەدین بەستراوە، بۆ باس و لێکۆلینەوەی دانانی رێوشوێنی کۆتایی هێنان بە دەسەڵاتی عەبدولحەمیـد. پـێ ئـەچێ عەبـدولرەحمان بـەگ، چالاکانـە بەشـداری کۆنگرەکە بوبێ.

### 3. 3. زیندوکردنەوەی یادی مەدحەت پاشا

لە ژ21 دا بە زمانی تورکی بابەتێکی لە سەر مەدحەت پاشا و هەڵاتنی کوڕەکەی نوسیوە.

لە ژ22 دا نوسیوێتی:

"ئەوە چەند مانگێکە کوڕی شەهید مەدحەت پاشا، عەلی حەیدەر بەگ کە لە ئیزمیر نەفی بو نەیئەتوانی لەوێوە بۆ هیچ جێیەک بچێ، لە زوڵم و ئیستیبدادی پاشا بێزار بو... خۆی لـە وڵاتـی خونکـار رزگـار کـرد ئەویش هەڵات هاتە میسر...

"بەری 20 ساڵ خونکار بابی ئەو و هەندێ وەزیری تری نارده تائیف لەوێ نەفی کرد بو، دواتـر دوسێ کەسی جەلادی بە نهێنی ناردە ئەوێ، ئەو وەزیـرە غـەیورەی بـە شـەو لـە نـاو جـێدا بـە دزیـەوە خنکاند."

عەلی حەیدەری کوڕی مەدحەت پاشا ژیننامەی باوکی نوسیوەتەوە و بڵاوکردۆتـەوە. کوردسـتانیش لە ژ22 ەوە دەستی کردوە بە تەرجومەی کوردیی ئەم کتێبە و بڵاوکردنەوەی. لـە لاپـەڕەی یەکـەمی ژ22 و 23 و 24 و 25 دا چاپ کراون. کۆتایی باسەکەی بەمجۆرە نوسیوە: "خوا رەحمەت لـەو پاشـایە بکـا و، خوا جەزای خونکار بدا و، خوا زو لە سەر ئەم موڵک و میللەتە لای ببـا، تـا موسـوڵمانان هـەمو لـێ رزگار بن".

مەدحەت پاشا لە تورکیـا بـە بـاوکی ئـازادیخوازان و رەمـزی تێکۆشـان لـە دژی زوڵـموزۆر دائـەنرا. عەبدولحەمید ناوبردنی مەدحەت پاشای بە تاوانێکی گەورە دائەنا دژی خۆی.

### 3. 4. پێوەندی کورد و ئەرمەن

بەدرخانی‌یەکان، ئەگەرچی کوردپەروەر بون و نەتەوەکەی خۆیان خۆش ویستوە و، هەوڵی بـەدیهێنانی مافی نەتەوەیی کوردیان داوە، بـەڵام دژی گـەلانی تـر نـەبون. لایـەنگری برایـەتی و پێکـەوە ژیـانی گـەلانی عوسمانی بون، سەرەڕای جیاوازی دین و نەتەوەیان.

لە ڕێکەوتننامەی بەرلیندا مادەیەک دانرا بو بۆ پاراستنی ئەرمەن لە دەستدرێژی کورد، بابی عالی ئەیویست ئەم مادەیە بەکاربهێنێ بۆ وروژاندنی کورد لە دژی ئەرمەن. تەنانەت ڕۆشنبیری گەورە و تێگەیشتوی وەکو حاجی قادری کۆیی‌یش کەوتبوە ژێر کارتێکردنی ئەم جۆرە پروپاگاندانە. لە یەکێ لە شیعرە نەتەوەیی‌یە بە ناوبانگەکانیدا ئەڵێ:

خاکی جزیر و بۆتان، یەعنی وڵاتی کوردان
صەد حەیف و صەد مەخابن، دەیکەن بە ئەرمەنستان
وا ڕێگەتان دەبەسترێ عێلاتی جاف و بڵباس
گەر مردوون لە گەرمێن مەمنوعە بچنە کوێستان
کامی کچ و هەتیوی شیرین بێ، رای دەکێشن
هاوار دەبەنە بەر کێ پەشمە دەخیل و ئامان
مەسجید دەبێتە دێرە، ناقوسیان موئەزین
مەتران دەبێتە قازی، موفتی دەبێتە رەهبان

ئەوڕەحمان بەگ لە ژ26 دا وتارێکی بە کرمانجی لە ژێر ناوی (بۆکوردان) لەو بارەیەوە نوسیوە. ئەڵێ:

"من... لە سەر مەسەلەی ئەرمەن مەعروزی سەرزەنش بوم. واقیعەن من ئەزانم کە هەندێک ئەرمەنی ئەیانەوێ کوردستان بۆ خۆیان بکەن بە ولایەتێک و جیای بکەنەوە".

لە جێیەکی تردا ئەڵێ:

"بەڵێ لە ناو ئەرمەنیدا هەندێک هەن نەیاری ئێوەن، لاکین ئەم میقدارە گەلێک قەلیلە. ئەرمەنی‌یەکانیش لەوان ناڕازین، بەڵام باش بزانن کە نەیاری ئەسڵی ئێوە خونکاری ئێوەیە. ئەو خونکارەی کە ئەوە 25 ساڵە بە پارەی خۆی و بە جاسوسەکانی خۆیەوە ئەتانخاتە خراپیەوە".

لە هەمان ژمارەدا بە تورکی وتارێکی لە ژێر سەردێڕی (کورد و ئەرمەنی) دا نوسیوە.

ئەوڕەحمان بەگ لە وتارەکانیدا، هەردو گەلی ئەرمەنی و کوردی بانگ کردوە بۆ برایەتی و هاوکاریی دژی زوڵموزۆری سوڵتان و، بۆ ئەوەی عەبدولحەمید نەتوانێ کورد بۆ کوشتنی ئەرمەن بە کار بهێنێ. باسی ئەوە ئەکا کە لە ناو هەردو گەلدا هەن حەز بە هەڵگیرسانی شەڕ و، کوشتنی یەکتری ئەکەن و، داوا لە کورد و ئەرمەن ئەکا کە هوشیار بن و، ئەم فێڵەیان بە سەردا تێ نەپەڕێ. لە هەمان کاتدا سەرنجی کورد رائەکێشێ بۆ ئەوەی کە دژایەتی کورد بۆ ئەرمەن ئەبێتە هۆی ئەوەی رای گشتی ئەوروپا و دەوڵەتەکانی دژی خواستە رەواکانی کورد رابوەستن.

لە ژ13 دا لە وتارێکدا کە بۆ بەدرخان بەگ تەرخان کراوە لە کۆتایی‌یەکەیدا نوسیوێتی:

"لە بەر ئەوەی ئەرمەنی ئاگاداری ئەم حاڵە بون کار ئەکەن بۆ ئەوەی خۆیان لە ژێر زوڵمی مەئمور دەربێنن. هەندێکیان لێ کوژرا، هەندێکیشیان لە ناوچون، بەڵام دیسان بە غیرەتەوە درێژەی پێ ئەدەن. ئەبێ کوردیش لە گەڵ ئەوان ڕێک بکەون، چونکە ئەرمەنی‌یش و کوردیش مەزڵومی عەبدولحەمیدن. بەڵام کورد جاهیلن ئەم ڕاستی‌یە نازانن بۆیە ئەرمەنی ئەکوژن. بەڵام ئەم حاڵەی کوردە بە پێی دین، عەقڵ و عادەت ناجائیزە. ئەگەر کورد و ئەرمەنی ڕێک بکەون کاربەدەستان ناتوانن زوڵم لە کوردستان ئیجرا بکەن. سەد حەیف کە خێڵەکانی کورد نەیاری یەکترین، کاربەدەستانیش بەلاوازی نیفاقی ئەوان بون بە بەڵا بە سەریانەوە."

لە سەروتاری ژ27 دا کە بە کرمانجی نوسیوێتی ئەڵێ:

"تورک و خونکار چ ناو و عینوانێک بە خۆیان ئەدەن با بیدەن، لاکین خوا کوردی بۆ خزمەتی ئەوان خەلق نەکردوە... من مەوسوق بیستومە کەوا عەبدولحەمید، وەعدی ئێوە، یەعنی وڵاتی کوردستانی، بـە روسـیا داوە، جا ئەگەر لە ئیستاوە نەکەونە خۆ پاش چەند ساڵێکی تر ئەکەونە بن لنگی عەسکەری مسقۆف. لە باتی ئەوەی خەبات بکەن بۆ تەئمینی حەیات و ناموسی خۆتان، یەکتری ئەکوژن و، ژن و مناڵی بێتاوانی ئەرمـەنی ئەکوژن. پێغەمبەر وتویەتی (بشروا القاتل بالقتل) دەوامی ئەم حاڵە و نیهایەتەکەی ئەبێ بە موجیبی کوشـتاری هەموتان. ئێوە ئیتاعەتی ئەمری عەبدولحەمید ئەکەن ئەرمەنی ئەکوژن، بۆچی ئەمری عەبولحەمیـد لـە حەدیسـی پێغەمبەر مەزنترە؟ لە ئەمری خوای تەعالا ئەقدەمترە؟ عەبدولحەمید ئەڵێ کە ئەرمەنی نەیاری ئێوەن بەم قسـەیە ئیغفالتان ئەکا. بۆچی ئێوە نازانن ئەرمەنی ناتوانن نەیاریی ئێوە بکەن؟ نەیاری ئێـوە ئـەو خونکارەیـە کـە وەعدی وڵاتەکەی ئێوەی بە مسقۆف داوە."

لە درێژەی ئەم وتارەدا نمونەیـەک لـە هەڵوێسـتی سـەرکردەی ڕاپـەڕینی گـەورەی 1880 ی کـوردان ئەگێڕێتەوە و ئەنوسێ:

"من ئەزانم پێش چەند ساڵێ لە وان مەجلیسێ تەرتیب بو تا ئەرمەنی بە کورد بە کوشت بـدەن. شـێخ عوبەیدوڵڵای مەرحوم لەو مەجلیسەدا حازر بو. شێخی مەرحوم مرۆڤێکی زۆر عـالم و موتـەقی بـو، ئیعتیـرازی لەم ئەمرەی خونکار گرت، جـوابی دایـەوە: (ئەگـەر ئـەمڕۆ ئێمـە ئەرمـەن بـێ سـەبەب بکـوژین، ڕۆژێـک دێ میللەتێکی تریش ئێمە بکوژێ)"

لە سەروتاری ژ29 دا لە ژێر سەرناوی (وەزعیەتی ئیسـتا و پاشـەڕۆژی کوردسـتان) دا بـە کرمـانجی نوسیوێتی:

"... ئەمە دە ساڵە بە ئیفساد و تەشـویقی خونکـار شـەڕی گـەورە لـە کوردسـتان ئەقـەومێ و، کـەس ئاسایشی نەماوە، کەس ئومێـدی چاکـە ناکـا، خـەڵک هـەمو چـاوەڕوانی گـۆڕینی ئیـدارەی حکومـەتین، بـۆ سەلامەتیمان هیچ ڕێگەیەکی تر نەماوە."

## 3. 5. ئاڵا سواریەکانی حەمیدی

لە سەروتاری ژ28 دا بە کرمانجی لە ژێر سەرناوی (ئالایین سوارین حەمیدی) دا نوسیوێتی:

"ئەم ئالا سوارییانەی حەمیدی وەکو هەمو ئیجرائاتێکی تری خونکار بە نیەتێکی فاسید دانراون، مـن لەم جەریدەیەی خۆم دا ئەو مەسەلەیە تەشریح ئەکەم".

لە شوێنێکی تری وتارەکەیدا نوسیوێتی:

"ئەسڵی مەقسەد لە تەئسیسی ئەم سوارانە ئەوە بو لە وەقتێک دا کە ئەرمەنی لە زوڵمـی حکومـەت زۆر بێـزار بون عەدالەتیان خواست. زەکی پاشا ترسا کە کوردیش لە تاو زوڵمی حکومەت خۆیان بدەنـە لای ئەرمـەنی و هـەردو میللەت پێکەوە دەس بکەنەوە، لە بـەر ئـەوە عـەرزی خونکـاری کـرد ئیزنـی دامەزرانـدنی ئـەم ئالایانـەی خواسـت. خونکاریش ئەیویست نیفاق بخاتە ناو میللەتان و ئەفرادی بندەسـتی خـۆی، بۆیـە فکرەکـەی زەکـی پاشـای گـەلێک موناسیب بینی و، تا کورد جەلبی لای خۆی و لە ئەرمەنی دور بخاتەوە زو فەرمانی دامەزراندنی ئەم سوارانەی دا".

هەر لەم وتارەدا باسی ئەوە ئەکا کە سوارەی حەمیدی چۆن دەستدرێژی ئەکەنە سەر مافی خەڵک و لـە تاڵان و دزی و ڕاووڕوت ناپونگێنەوە و، خەڵک چەندی شـکات ئەکـەن و هـاوار ئەبەنـە بـەر کاربەدەسـتانی حکومەت کەس لە شکاتەکانیان ناپرسێتەوە. لە هەمان ژمارەدا وتاریکی درێژتـری بـە هـەمان ناونیشـان، بـۆ هەمان مەبەست، بە تورکی نوسیوە.

## 4. بابەتی ئەدەبی

### 4. 1. بڵاوکردنەوەی مەم و زین

کوردستان لە پلەی یەکەمدا بۆ مەبەستی سیاسی دەرچوە. لە بەر ئەوە زۆرتر بابەتەکانی سیاسی بـون و کەمتر ئەدەبی. لە ژ3 یدا نوسیوێتی کەوا هەندێ میر و ئاغای کورد نامـەیان نـاردوە داوایـان کـردوە کـە باسی هەلومەرجی ئیستایان بۆ بنوسن و شیعر و بەیتی کرمانجی بڵاو بکەنەوە، ئەویش بەڵێنیان ئـەداتێ کـە بەیت و شیعر و حیکایەتی قنجیان بۆ بنوسێ. هەر لەو ژمارەیەشەوە دەستی کردوە بە بڵاوکردنەوەی (مـەم و زین) ی ئەحمەدی خانی. ئەو نوسخەیەی کە ئەم شیعرەکانی لێ وەرگرتوە، وەکو نوسـیوێتی، لـەو کاتـەدا کـە ساڵی 1315 ک/1898 ز بوە، 210 ساڵ لەوەوپێش نوسراوەتەوە. ئەگەرچی لە چاپی ئەم شـیعرانەدا هەڵـە و کەموکوڕی هەیە، بەڵام بێگومان لە بەر کـۆنی ئـەم دەسنوسـە، بـۆ سـاخکردنەوەی مـەم و زیـن گرنگیـەکی گەورەی هەیە. ئیستا چارەنوسی ئەم دەسنوسە دیار نیە.

### 4. 2. باسی حاجی قادری کۆیی

هەر بە هۆی جەریدەی کوردستانەوە ساڵی مردنی حاجی قادری کۆیی دۆزرایەوە. تا ژ3 ی کوردستان نەدۆزرایەوە کەس بە ڕاستی ساڵی مردنی حاجی قادری نەئەزانی.

لە ژ3 ی کوردستاندا شیعرێکی حاجی قادری کۆیی بڵاوکردۆتەوە. لە پێشەکی شـیعرەکەدا نوسـراوە: "عالمێک لە سۆران هەبو ساڵی رابوردو وەفاتی کرد، ڕەحمەتی خوای لێ بێ و خوا لە گوناهەکانی خۆش بـێ، ناوی حاجی عەبدولقادر بو. ئەم پیاوە تا لە ژیان دا بو خەباتی زۆری کرد بۆ فێرکردنـی عـیلم و مـەعریفـەت، زۆری بەیت و شیعری کرمانجی ئەنوسی، ئەیناردەوە بۆ سۆرانی وڵاتی خۆی..." بـەوەدا کـە ئـەم ژمارەیـەی ڕۆژنامەکە ساڵی 1898 ز دەرچوە و ئەڵێ حاجی ساڵی رابوردو وەفاتی کرد، ئەوسا زانرا حاجی قادر ساڵی 1897 مردوە.

ئەو شیعرەی لە گەڵ ئەم پێشەکیەدا بڵاوکراوەتەوە بەمجۆرە دەس پێ ئەکا:

زەمانە ڕەسمی جارانی نەماوە

چراغی نازم و مونشی کوژاوە

ئەم شیعرە، دوای ئەوە، چەند جارێ بڵاوکراوەتەوە و لە دیوانەکەیشیدا هەیە.

### 4. 3. بابەتی تر

جگە لە مەم و زین و ئەو شیعرەی حاجی قادر، کوردستان شیعرێکی تری کـوردیی بڵاوکردۆتـەوە کـە ستایشی ڕۆژنامەکەیە. لاوی شێخ فەتاح لە شامەوە بۆی ناردون. هەروەها چەند شـیعرێکی تورکیـشـی بـڵاو کردۆتەوە.

کوردستان لە ژ3 دا باسی کتێبی (الهدية الحميدية في اللغة الكرديـة) بـەم جـۆرە نوسـیوە: "هەنـدێ خالیدی هەن لە قودسی شەریفن، یەکێ لەوان خاوەن فەزل و کەرەم شـێخ یوسـف زیائـەدین پاشـایە، خـوا عومری درێژ و عیلمی زیاد بکا. پێش شەش ساڵ کتێبێکی داناوە ناوی (الهدية الحميدية في اللغة الكرديـة) یە. ئەم کتێبە وەک عەرەبی، باسی ڕێزمانی زمانی کرمانجی ئـەکا. وشـەی کرمـانجی کۆکردۆتـەوە و لـەم کتێبەدا نوسیونی. ماڵی ئاوا بێ بنچینەیەکی بۆ زمانی کرمانجی داناوە. من هیـوادارم کـە عـالم و میـر و پاشاکانی کورد ئەم کتێبە پەیـدا بکـەن. کتێبێکـی زۆر باشـە. لازمـە عالمـەکانی کـوردیش بـۆ زمانەکـەی خۆیان شتێ بنوسن."

**5. بابەتی مێژویی**

**5. 1. میژوی میرانی جزیره**

لە ژ8 هوە دەستی کردوە بە بڵاوکردنەوەی مێژوی حاکمەکانی جزیـرە کـە باووبـاپیری خـۆی بـون. سەرچاوەکەیشی وەکو خۆی ئیشارەتی پێ ئەدا چاپەکەی ڕوسیای شەرەفنامەی ئەمیر شـەرەفخانی بتلیسـیـە. ئەم بابەتە بە زنجیرە لە چەند ژمارەیەکیدا درێژەی هەبوە.

**5. 2. باسی بەدرخان بەگ**

لە ژ13 دا وتارێکی مێژویی بە کرمانجی لە سەر بەدرخان بەگ و،

لە ژ14 دا وتارێکی تری بە تورکی نوسیوە.

ئەم دو وتارە بایەخێکی مێژویی گرنگیان هەیە، چونکە ئاگاداریی بـەنرخ و نـەزانراویان تـێ دایـە لـە سـەر دوایـین شـەڕەکانی بـەدرخان بـەگ لـە گـەڵ هێزەکـانی عوسـمانی و، گیـران و دورخرانـەوەی بـە خاووخێزانەوە بۆ کریت و، ئینجا بۆ شام، تا لەوێ کۆچی دوایی ئەکا.

**5. 3. هەواڵی تر**

لە سەر کوردستان و، شەڕی نێوان سودان و میسـر و، لـە دەسـدانی کریـت و ئـەلبانیا و بولغارسـتان چەند هەواڵ و لێدوانی تێدایە، کە ئەکرێ کەڵکیان لێ وەربگیرێ.

**6. لە روی هونەری ڕۆژنامەوانی‌یەوە**

**6. 1. شێوە و ڕوخساری**

ئەگەرچی جەریدەی کوردستان لە میسر و سویسرا و بریتانیـا ئامـادە و چـاپ کـراوە، بـەڵام لـە بـەر ئـەوەی لـە هەلومـەرجێکی نائاسـاییدا دەرکـراوە و، هەمیشـە لـە گوێزانـەوەی مـاڵ و چاپخانەکـەیدا بـوە، خاوەنەکەیشی ڕاونراو بوە، نەیتوانیوە بـە ڕێکـوپێکی لـە کـاتی خـۆیدا دەربچـێ. هەرچەنـد ژمارەیـەکی لـە وڵاتێک و لە چاپخانەیەکدا چاپ کراوە. ئەم جەریدەیە دەوری بەیاننامەی سیاسی بینوە.

ڕوخسـاری دەرەوەی قەشـەنگ و، نـاوی جەریدەکـە بـە خـەتێکی گـەورەی جـوان نوسـراوە. لـە ژێرناوەکەیدا 1315 کە ساڵی دەرچونێتی، نوسراوە.

بۆ ناساندنیشی لە ژێر ناوەکەیدا بە تورکی نوسراوە: (بۆ ڕاپەڕاندنی کوردان و هاندانی بۆ فێربونی صنعەت).

لە لای ڕاستی بە کرمانجی نوسراوە: "هەرچی کاغەز بنێرێ، بینێرێتـە میسـر بـە نـاوی خـاوەنی ئـەم جەریدەیە: لاوی بەدرخان پاشا میقداد مەدحەت بەگ. هەر جارێ دو هەزار جەریدە بێ پـارە مـن ئـەنێرم بـۆ کوردستان تا بیدەن بە خەڵک. پانزە ڕۆژ جارێک ئەنوسرێ."

لە لای چەپی بە تورکی نوسراوە.

ژ1- 3 ی لە میسر لە (مطبعة الهلال) و،

ژ4- 5 لە میسر لە (مەتبەعا جەریدەی کوردستان) و،

ژ6- 16 کە لە جنێڤ دەرچون لە چاپخانەی (جەمعیەتا تفاق و قنجیا موسولمانا) و،

ژ20- 21 لە میسر چاپکراوە بێ ناوهێنانی چاپخانەکەی و،

ژ23 لە (هندیة مطبعة) و،

ژ24 کە لە لەندەن و،

ژ25- 27 لە فۆلکستن چاپکراون، بێ ناوهێنانی چاپخانەکە و،

ژ28- 30 کە لە فۆلکستن و

ژ31 کە دوا ژمارەیەتی لە جنێڤ، دەرچون لە چاپخانەی (انتقام) چاپ کراون.

هەندێ لەو ناوانە ڕەنگە بۆ شوێنونی بێ لە جاسوسەکانی سوڵتان. ئەم هەمو گوێزانەوە و راونـران و جێگۆڕینە، بـەڵام نەبـەزین و کۆڵنـەدانی ئـەم کەڵـەپیاوەی کـورد، دەری ئەخـەن کـە ئـەوڕەحمان بـەگ تـا چ ئەندازەیەک ئاشقی کورد و کوردستان و، باوەڕی قوڵی بە پرسـی گەلەکـەی و ڕەوایـی خواسـتەکانی هـەبوە. خاوەنی جەریدە بە تەما بوە هەر پانزە ڕۆژ جارێک ژمارەیەکی لێ دەر بکـا، بـەڵام لـە بـەر ئـەو هۆیانـە، لـە ماوەی 4 ساڵ دا تەنیا 31 ژمارەی لێ دەرچوە.

هـەمو ژمارەکـانی 4 لاپـەڕەن و قـەوارەی ژمارەکـانی بـە گشـتی 50.x 32 25.50 سـم ن. هـەمو لاپەڕەکانی دابەش کراون بە سەر دو ستوندا، جگە لە ژ20- 23 کە لاپەڕەکانی دابەش کراون بە سـەر سـێ ستوندا. هەمویان بە حەرفی عەرەبی و بە ئیملای فارسی نوسراون.

ناونیشانی جەریدەکە لە هەر کوێ بوبێ، لە لای چەپی لاپەڕەی یەکەمیدا نوسـراوە. ئـەو ژمارانـەی لـە ئەوروپا دەرچون، لە گەڵ هەندێ لەو ژمارانەی لە میسر دەرچون، ئەدرەسی جەریدە و خاوەنەکـەی بـە حـەرفی لاتینی نوسراوە.

### 6. 2. زمانەکەی

تا بڵاوکردنەوەی کوردستان زمانی کوردی تەنیا بۆ ئاخافتن و هۆنینەوەی شیعر بەکارئەهێنرا. جگـە لـە عەقیدەنامەکـەی مـەولانا خالیـدی نەقشـبەندی (1779- 1827) و، مەولودنامەکـەی شـێخ حسەینی قازی (1791- 1870) بە کرمانجی خوارو و، چەند نوسینێکی مێژویی و فۆلکلۆریی مـەلا مەحمودی بایەزیدی (1799-1867) بە کرمانجی سەرو، بەرهەمێکی تر نیە بـەم زمانـە نوسـرابێ و ئیستا لە بەر دەس دا بێ. کوردی هێشتا نەبوبو بە زمانی نوسینی نامـە و پەخشـان. خوێنـدەوارانی کورد لە نـاو خۆیـان دا بـۆ نامەنوسـین زمـانی فارسـی یـان تورکی‌یـان بـە کـار ئـەهێنا. جەریـدەی کوردستان، سەرەتای دەسپێکردنی نوسینی بابەتی سیاسی و ئەدەبی و کۆمەڵایـەتی و مێژوییـە، بـە زمانی کوردی.

3 ژمارەی یەکەمی هەمویان بە کرمانجیی زاراوی جزیـرە و بۆتـان نوسـراون. بـەڵام لـە ژ4 ەوە هەم بـە کرمـانجی و هـەم بـە تـورکی بـاس و بابـەتی بڵاوکردۆتـەوە. کوردی‌یەکـەی ڕەوان و پـاراوە و، هەڵبژاردنی وشەکانی و داڕشتنی ڕستەکانی، بەڵگەی شارەزایی و زانایی هەردو بران لە زمانی کـوردی‌دا. سەیر ئەوەیە ئەم دو برایە، کە هەردوکیان لە گەڵ بەدرخان بەگی باوکیان بـون، لـە کوردسـتان و لـە نـاو کۆمەڵی کوردەواری‌دا نەژیاون، بەڵکو هەمو تەمەنیان بە دەسبەسەری و دورخراوەیی لە کریـت و، شـام و، ئەستەموڵ بە سەر بردوە، کەچی ئەو کوردی‌یە جوانەیان زانیوە. هـەروەکو لـە خوێندنـەوەی بابەتـەکانی کوردستاندا دەرئەکەوێ، پێ ئەچێ هەردو برا، زۆر چاک شـارەزای زمـانی تـورکی و عـەرەبی و فارسـی بون و، ئەبێ زمانی ئەوروپی بە تایبەتی فەرەنسی‌یشیان زانی بێ. لە نوسـینەکانیاندا ئایـەتی قورئـان و حەدیسی پێغەمبەر و، مەسەل و شیعری فارسی و عەرەبی‌یان بە کارهێناوە بۆ ئەوەی بابەتـەکانیان بـەهێز و بەڵگەکانیان ڕەتنەکراوە بن.

## 6. 3. بڵاوکردنەوەی

ئەگەرچی ئەم جەریدەیە لە دەرەوەی قەڵەمڕەویی عوسمانی دەرچوە و، لە ناو دەوڵەتی عوسمانی‌دا قەدەغە بوە و، کە بینرا بێ دەستی بە سەردا گیراوە و، خەڵکی لە سەر گیراوە، لە گەڵ ئەوەیشدا توانیویتی خۆی بگەیەنێتە دەستی خوێندەواران لە زۆر شوێنی وڵاتەکەدا و پێوەندی‌یان لە گەڵ دروست بکا:

لە ژ2 دا تەقریرێکی کوردستانی بڵاوکردۆتەوە کە لە شامەوە بۆی چوە.

لە ژ5 دا نامەیەکی تاهیر بۆتی نوسیوەتەوە کە لە ئەدەنەوە پێی گەیشتوە، باسی گەیشتنی جەریدەکە و پێخۆشحاڵی کوردەکانی ئەوێ بە دەرچونی و، داوا ئەکا ژمارەی زۆرتری بۆ بنێرێ.

لە ژ8 دا نامەیەکی عەلی کوڕی حسێنی ئامەدی بە ناوی زاناکانی ماردینەوە بڵاوکردۆتەوە.

لە ژ13 دا نامەی یەکێ لە ئەشرافی دیاربەکر کە ناڕەزایی لە زوڵموزۆری کاربەدەستان دەرئەبڕێ و،

لە ژ14 دا نامەیەکی مەلا ساڵحی جزری لە ماردینەوە کە هێرش ئەکاتە سەر سوڵتان و،

لە ژ15 دا نامەیەکی موسڵ کە باسی نائارامی و تاڵان و رووروت ئەکا لە ناوچەکەدا، چاپ کردوە.

لە ژ16 دا نامەیەکی عەرەبیی شێخ حەسەن، سەرۆکی کۆمەڵەی ئیسلاحیەی، کە لە تەرابلوسی شامەوە پێ گەشتوە بڵاوکردۆتەوە، ئامادەیی خۆی دەرئەبڕێ بۆ هاوکاری بۆ ئیسلاح و نەهێشتنی زوڵم.

لە ژ13 دا باسی گەیشتنی پارەی یارمەتی بە جەریدەکە لە دیاربەکر و سلێمانی و ئەتەنە ئەکا و، هەروەها باسی گەیشتنی نامەی شێخ محەمەد و ناردنەوەی وەڵامەکەی ئەکا.

ئەم پێوەندی‌یانە جێگەی سەرنجن. دور نیە ئەو رێکخراوەی سورەیا بەدرخان باسی ئەکا، دەستی هەبوبێ لە رێکخستنی پێوەندی نێوان رۆژنامەکە و خوێندەوارەکانی‌دا.

کوردستان، وەکو خۆی نوسیوێتی، جگە لە کورد، لە گەڵ چەندین زانای ئەڵمانی، نەمسایی، ئینگلیزی پێوەندی هەبوە. رۆژنامەکەیان بۆ چوە و ئاڵوگۆڕی نامەی لە گەڵ کردون، لەوانە زانای ئەڵمانی مارتین هارتمان.

## 7. پایەی لە جوڵانەوەی کوردایەتی‌دا

جەریدەی کوردستان، وەکو یەکەمین تەقەلای دەرکردنی رۆژنامەی کوردی و، وەکو نوێنەرەوەی ئایدیۆلۆجیی سیاسی‌ی هەڵبژاردەی ئەو سەردەمەی کۆمەڵی کورد، وەکو داهێنانی شێوەیەکی نوێی خەبات لە پێناوی سەندنی مافی نەتەوەیی‌دا، کارێکی ئەوەندە گەورەیە، ئەگونجێ بە نوقتەی وەرچەرخان دابنرێ لە مێژوی بزوتنەوەی رزگاری‌ی نەتەوەیی کوردا.

**چەند تێبینی‌یەک:**

1. ئەو کارتەی کە مەدحەت بەگ لە گەڵ یەکەمین ژمارەی کوردستاندا بە فەرەنسی بڵاوی کردۆتەوە، د. فەرهاد پیریاڵ دۆزیویەتیەوە و کردویەتی بە کوردی و، وێنەی فەرەنسی‌یەکەی و تەرجومە کوردی‌یەکەی بڵاوکردۆتەوە.
2. د. کەمال فوئاد، لە وتارێکدا کە بۆ ژ1 ی گۆڤاری (ڕوناکی، بەغداد، 1969) ی نوسی بو، بۆ یەکەم جار پشتئەستور بە نوسینەکەی کوردستان، ساڵی مردنی حاجی قادری کۆیی ڕاست کردەوە.
3. زۆری تێکستەکانی وەرم گرتون، ئەوانەیشیان کە بە لەهجەی کرمانجی‌ی ژورو نوسراون، گۆڕیوە بۆ لەهجەی کرمانجی‌ی خوارو، بەڵام بە زۆری وشەگەلی ئەسڵی وتارەکانم بەکارهێناوەتەوە. ئەوانەیان کە لە تورکی‌یەوە کراون بە کوردی، لە بڵاوکراوەکەی بنکەی گەلاوێژ وەرگیراون.

4. ئەو سەردەمە زاراوەگەلی (کۆوار) و (گۆڤار) و (ڕۆژنامە) وەکو زاراوەی ڕۆژنامەوانی نەزانراو بوە. زاراوەکانی (غەزەتە)، کە لە (گازێت) ی زمانە ئەوروپاییەکان و، (جەریدە)، کە لە (الجریدة) ی عەرەبییەوە، وەرگیراوە، بە کار هێنراون. ئەوان خۆیان چ زاراوەیەکیان بەکارهێناوە بۆ بڵاوکراوەکانیان، منیش هەمان وشەم بە کار هێناوە. پێم باشە وەکو بەشێ لە مێژوی ڕەوتی زمانی ڕۆژنامەوانیی کوردی، ئەم وشەگەلە، لە زمانی کوردیدا بە زیندویی بمێننەوە.

**8. 2. کورد تەعاون و تەرەقی غەزەتەسی**



# کرد

## تعاون وترقی غزته‌سی


١٣٢٤

جمعیتك واسطهٔ نشر افكاریدر

تاریخ تأسیسی ١٣٢٦ — ١٣٢٤

نومرو ١ ✕ شمدیلك هفته‌ده بردفعه نشر اولنه‌جق دینی، علمی، سیاسی، ادبی، اجتماعی غزته‌در ✕ جلد


استانبول مناظرندن

## 8. 2. کورد تەعاون و تەرەقی غەزەتەسی

### 1. شۆڕشی دەستوری لە تورکیا

لە ئەنجامی ئەو جوڵانەوە سپاییەدا کە ئۆردوی تورک لە سالۆنیکەوە دەستی پێ کرد و گەیشتە ئەستەموڵی پایتەخت، سوڵتان عەبدولحەمید ناچار بو، ئەوە قبوڵ بکا کە سەرلەنوێ قانونی ئەساسی (دەستور) رابگەیەنرێ و (سەڵتەنەت) (مەشروتە) بێ. هەڵبژاردنی مەبعوسی ناوچەکان کرا. مەجلیسی مەبعوسان و مەجلیسی ئەعیان پێک هاتن و، لە 24 ی تەموزی 1908 دا کۆبونەوە. هەر لەو رۆژەدا رۆژنامەوان و نوسەرەکانی پایتەختیش کۆبونەوە و، بڕیاریاندا ئیتر پرۆڤەی نوسینەکانیان بۆ سانسۆر نەنێرن. بەمجۆرە دوای 30 ساڵ سانسۆر و دەمکوتکردن، وتار و هەواڵ لە رۆژنامەکانی عوسمانیدا بە ئازادی بڵاوکرایەوە.

بەهاری ئازادی دەستی پێ کرد. لە چەند حەفتەی یەکەمدا ژمارەی رۆژنامەکانی ئەستەموڵ، کە لە پێش شۆڕشدا تەنیا 3 رۆژنامە بون، بون بە 15 رۆژنامە و، رۆژنامەی سیاسی و رۆژنامەی حیزبی دەستیان کرد بە دەرچون. کوردیش کەڵکی لەم ئازادییە وەرگرت.

### 2. کورد تەعاون و تەرەقی جەمعیەتی

هەڵبژاردەی کوردەکانی ئەستەموڵ، لە شەمزینی و بەدرخانی و بابانی، بەسەرۆکایەتی شێخ عەبدولقادری شەمزینی ساڵی 1908 رێکخراوێکیان دامەزراند بە ناوی (کرد تعاون و ترقی جمعیتی) واتە (جەمعیەتی تەعاون و تەرەقی کورد)، بۆ هەوڵدان بۆ سەلماندنی مافی نەتەوەیی کورد لەناو چوارچێوەی جامیعەی عوسمانیدا. ئەم رێکخراوە بۆ بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕەکانی خۆی بڕیاری دا غەزەتەیەکی حەفتانە بە تورکی و کوردی لە ئەستەموڵ دەر بکا و، لە ولایەتەکاندا لق دابمەزرێنێ. خوێندنگایەکی بۆ مناڵانی کورد لە ئەستەموڵ کردەوە. ئەم کۆمەڵەیە بە تەمابوە ببێتە حیزب (فیرقەی سیاسی)، بەڵام ئیتیحادییەکان لەباتی ئەوەی رێگەیان بدەن ببن بەحیزبی سیاسی، کۆمەڵەکەیان و غەزەتەکەیان و خوێندنگاکەیان پێداخستن.

شێخ عەبدولقادری سەرۆکی کۆمەڵە، کوڕی شێخ عوبەیدوڵڵای شەمزینی، لە راپەڕینی ساڵی 1880 دا سەرکردەی قۆڵی موکریان بو. دوای تێشکانی راپەڕینەکە، لە گەڵ باوکی دورخرایەوە بۆ تائیف لە حیجاز. چەندین ساڵی بەدەربەدەری و دەسبەسەری لەحیجاز و ئەستەموڵ بە سەر برد بو. یەکێ بو لە ئازادیخوازە ناودارەکانی دەوڵەتی عوسمانی و یەکێ بو لە تێکۆشەرە گەورەکانی رێگەی رزگاری کوردستان. لە 1908 دا

کە مەجلیسی ئەعیان لە ئەستەموڵ پێکهێنرا ئەم کرا بە ئەندامی. لە 1925 دا لە گەڵ شێخ سەعیدی پیران و هاوڕێکانی لەسێدارە درا.

### 3. کورد تەعاون و تەرەقی غەزەتەسی

ژ1 ی لە 11 ی زیلقەعیدەی 1326 ی کۆچی، بەرامبەر 22 ی تشرینی دوەمی 1324 رۆمی (1908) دەرچوە.

دوا ژمارەی کە نۆهەمە لە 8 ی موحەڕەمی 1327 ی کۆچی، 17ی کانونی دوەمی 1324ی رۆمی (1909) دەرچوە و ئیتر داخراوە. بەسەر یەکەوە هەموی 88 لاپەڕەیە.

خاوەنی ئیمتیاز و بەڕێوەبەری، سولەیمانیەلی تەوفیق/پیرەمێرد (1867-1950) و سەرنوسەرەکەی ئەحمەد جەمیل دیاربەکری (1872-1941) بوە. پیرەمێرد لە وتارێکیدا نوسیویتی، ئەڵێ:

"بەوە دەنازم کە غەزەتەی کورد لە ئەستەموڵ من خاوەن و سەرنوسەری بوم."

### 3. 1. هۆی دەرکردنی

کورد تەعاون و تەرەقی غەزەتەسی بۆ مەبەستێکی سیاسی دەرکراوە. لەژێر ناوی غەزەتەکەدا بە تورکی نوسراوە: "جمعیتک واسطه نشر افکاریدر" واتە: "هۆی بڵاوکردنەوەی بیروڕای کۆمەڵەیە".

سولەیمانیەلی تەوفیق، کە ساحێبی ئیمتیازی غەزەتەکە و مدیر و موحەڕیری بوە، لە سەروتاری ژ1 یدا بەتورکی مەبەستی لە دەرکردنی رون کردۆتەوە.

لە دوالاپەڕەی هەمان ژمارەدا بەیاننامەکەی جمعیت کە لە لاپەڕەی یەکەمیدا بەتورکی نوسراوە، بە کوردی لە ژێر سەرناوی: (مەقصودی گردەوەبونی جمعیت) دا نوسیوەتەوە. لەم بابەتەدا ئامانجی کۆمەڵەکەی بە رونی باس کردوە و، نوسیویتی:

"جەمعیەتی ئێمە نیزامنامەی بۆ هەمو تەرەفێ ناردوە، وەکو لە وەدا نوسیویە مەقصودمان ئەمەیە: حوکمی قانونی ئەساسی کە لە گەڵ شەریعەتدا رێ دەکەوێ محافەزە بکەین. ئەوی لازمە بۆ تەرەقی قەومی نەجیبی کورد هەموی رێک بخەین. مەعاریفیان، حاڵ خۆشییان، رێک کەوتنی ناوخۆیان، ئاشتبونەوەی لە گەڵ هاووەتەنیان، باخصوص لە گەڵ ئەرمەنیان، بێنینە جێ. لە ڕێی محافەزەی دەوڵەت و میللەتی عوسمانیدا بە عەزمێکی مەحکەمی دینی، بە یەک وجودی میللی رۆح ببەخشین. ئەگەر لەپاش گردبونەوەی مەجلیسی مەبعوسان ببین بە فیرقەی سیاسی، گۆڕینی قانونی ئەساسی بە رەنگێ قبوڵ دەکەین ئەو حەقی مەقامی گەورەی خەلیفەی موسوڵمانان و سەڵتەنەتی عوسمانیان نەگۆڕێ، هیچ میللەتێ خۆی لە میللەتێکی تر زیاتر نەگرێ.

"جەمعیەتی ئیتیحاد و تەرەقی عوسمانی ئەو دەستورولعەمەلە کە نوسیویە بۆ سەلامەتی وەتەن، بۆ تەرەقی هەمومان، زۆر چاکە، ئێمەیش وا دەچین بەڕێوە."

### 3. 2 نوسەرەکانی

نوسەرەکانی هەردو بەشی تورکی و کوردی غەزەتەی (کورد تەعاون و تەرەقی) لە کوردە ناسراو و ناودارەکانی دانیشتوی ئەستەموڵ بون و، خەڵکی ناوچەی جیاوازی کوردستان بون. لەناو ئەوانەدا خەڵکی سلێمانی، هەولێر، دیاربەکر، ئەرجیش، مەلاتیە، بتلیس، ئەرزنجان، هەبون.

سولەیمانیەلی تەوفیق، کەدواتر بەحاجی تۆفیق بەگی پیرەمێرد ناوی دەرکـرد، کـە خـاوەنی ئیمتیـاز و بەڕێوەبەر و نوسەری غەزەتەکە بوە، هەڵگری بڕوانامەی حقوق بوە. بەر لە دەرکردنی ئەم غەزەتەیە بە تورکی و فارسی لە رۆژنامەکانی ئەستەموڵ و تاراندا باس و بابەتی بڵاوکردۆتەوە و، بە تورکی شیعری سەرکەوتوی نوسیوە. ماوەی 4 ساڵ خاوەنی ئیمتیازی غەزەتەی (رسملی کتاب) ی تورکی بـوە. لـەم غەزەتەیـەشدا، وەکـو دەرئەکەوێ، دەوری سەرەکی هەبوە.

جگە لە سولەیمانیەلی تەوفیق، چەند کەسێکی تریش هەر بەناوی سولەیمانیەلی سەیفوڵڵا، سـولەیمانیەلی فەتحی، سولەیمانیەلی ع. حیلمی، بابەتی سیاسییان نوسـیوە. مـن خـۆم پـێم وایـە ئـەم ناوانـەیش هـەر هـی پیرەمێرد بون، بەڵام بۆ شوێنونی ئەم ناوانەی بەکارهێناوە، چونکە دواتریش لـە رۆژنامـەی (ژیـن) دا هـەمان کاری کردوە، بەناوی جیا جیاوە شیعر و وتاری بڵاوکردۆتەوە.

دیاربەکرلی ئەحمەد جەمیل، کە سەرنوسەری غەزەتەکە بوە ئەویش بەشدارییەکی دیاری هەیـە بـەناوی خۆیەوە لە زۆری ژمارەکانیدا بەتورکی وتاری نوسیوە.

ئیسماعیل حەقی بابان، کە یەکێ لە کوردە ناسراوەکانی ئەستەموڵ و، مامۆستای زانکـۆ بـوە، ئـەویش چەند وتاری بە تورکی تێدا نوسیوە:

لە ژ1 دا (کوردەکان و کوردستان) و،

لە ژ3 دا وتارێکی تر و

لە ژ4 دا (شوێنی جوگرافی وسیاسی کورد).

رەنگە بۆ خوێنەری کورد شتێکی تازە بێ، کە دو لەو نوسەرانەی لـەم غەزەتەیـەدا بابـەتی سیاسـییان نوسیوە و داکۆکییان لەمافی کورد کردوە، لـەمێژوی کـوردا بـە کوردپـەروەر نەناسـراون. یـەکێکیان سـلێمان نەزیف و ئەوی تریان بەدیع ئەلزەمان مەلا سەعیدی کوردییە.

سلێمان نەزیف بە ئیتیحادییەکی تورکپەرستی دژی کورد و، بەدیع ئەلزەمان بە شێخێکی کۆنەپەرسـتی تەریقەتی نەورەسی ناسراوە. کەچی بەدیع ئەلزەمان مەلا سەعید کوردی لە زۆری ژمارەکـانی غەزەتـەی کـوردا چەندین وتاری بە کرمانجی و بە تورکی نوسیوە. ئامۆژگـاری کـورد و، مەبعوسـەکان ئـەکا. گیروگرفتـەکانی کۆمەڵی کورد شی ئەکاتەوە و چارەیان بۆ دیاری ئەکا. سـلێمان نـەزیفـیـش لـە چەنـدین وتـاریدا بـەزمانی تورکی باس لە کورد و کوردستان ئەکا و، رەخنە لە کاربەدەستان ئەگرێ سەبارەت بەوەی کوردستانیان پشت گوێ خستوە.

حەیدەری زادە ئیبراهیم، کە خەڵکی هەولێر بوە، لە ئەستەموڵ گەیشـتۆتە پلـەی شێخولئیسـلام و، دوای دامەزراندنی دەوڵەتی عیراق لەبەغداد بوە بە وەزیر، یەکێکی تر بوە لەوانەی بـە شـیعر بەشـداری غەزەتەکـەی کردوە.

هەروەها مەلاتیەلی بەدری، ئەرزنجانلی حەمدی سلێمان، حسـین پاشـازادە سـلێمان، رکـانی زادە سـەید محەمەد عیصمەتوڵڵا، نەوەی شەرەفخانی بتلیسی ئەحمەد، مەزهەرزادە مەزهەر و، چەنـد کەسـێکی تـر، بـاس و بابەتیان بەتورکی تێدا نوسیوە.

جگە لە پیرەمێرد کە شیعر و وتاری بە کرمانجی خوارو بڵاوکردۆتەوە، یەکێ لە نوسەرە بەبڕشـتەکانی بەشی کوردی، کە لە زۆری ژمارەکانیدا بابەتی بە کرمانجیی سەرو نوسیوە، کەسێکە بەناوی: سەیاح ئەحمـەد شەوقی، کە خەڵکی ئەرجیش بوە. هەروەها محەمەد تاهیر جزری و، موتکی خەلیل خەیاڵی.

**3. 3. زمانەکەی**

غەزەتەی کورد تــەعاون و تــەرەقی بــەتورکی‌ی عوســمانی و کــوردی نوســراوە. کوردی‌یەکــەی هــەردو شێوەی تێ‌دایە. بەشە کوردی‌یەکەی لە چاو بەشە تورکی‌یەکەی‌دا زۆر کەمە. دیارە ئەمەیش ئەبێ چەند هۆیەکی هەبوبێ:

یەکەم،

هــەڵبژاردەی سیاســی کــورد لــە ئەســتەموڵ لەڕێگــەی ئــەم غەزەتەیــەوە ویســتویانە کــار لەهــەڵبژاردەی سیاسی‌ی عوسمانی بکەن و، هەر بەم زمانەیش ئەیانتوانی بیروڕا و بۆچون و خواستەکانی خۆیان دەربڕن.

دوەم،

ئەوسا زمانی کوردی هێشتا وەکو زمانی نوسین لــە قۆنــاغی ســەرەتایی‌دا بــو، نــە ئەوەنــدە نوســەری کوردینوس پەیدا بوە و، نــە ئەوەنــدەیش خوێنــدەواری کــورد هــەبوە. دوای غەزەتــەی کوردســتان (1898-1902) ئەمە دوەمین غەزەتە بوە بە کوردی شتی تێ‌دا بنوسرێ.

کوردی‌یەکەی هەردو زاراوی کرمانجی‌ی سەرو و خــواروی بــەکارهێناوە. دیــارە نوســەری کرمــانجی‌ی خوارو سولەیمانیەلی تەوفیق (پیرەمێرد) بوە، کە هەم وتار و هەم شیعری بەم شێوەیە نوسیوە. ناوی کەسێکی تر بەرچاو ناکەوێ کە بەم زارەوەیەی نوسی بێ، لەکاتێکدا ناوی چەندین کەس بەرچاو ئەکەوێ کەبــەزاراوی کرمانجی‌ی سەرو نوسیویانە، وەکو: بەدیع ئەلزەمان مەلا ســەعیدی کــوردی، ســەیاح ئەحمــەد شــەوقی، محمــەد تاهیر جزری.

من تورکی نازانم تا بتوانم لە ناوەرۆکی بابەتە تورکی‌یەکان بکۆڵمەوە. بۆز ئەرســەلانی بڵاوکــەرەوەی غەزەتەکە، ئەگەرچی هەمو بابەتەکانی خستۆتە سەر ڕێنوسی لاتینی، بەڵام نە بابەتە تورکی‌یــەکانی کــردوە بــە کوردی و، نە بابەتە کوردیەکانیشی کردوە بە تورکی. خۆزگە کەسێکی شارەزا ئــەم کــارەی ئــەکرد. بەمــەیش خزمەتێکی گەورەی مێژوی سیاسی و ڕۆژنامەوانی‌ی کوردی ئەکرد.

لێرەدا من هەر لە بابەتە کوردیەکانی و، ئەوەندەی بــە چــاو سەرباســی بابەتــە تورکی‌یــەکان ئــەبینم و، ئەوەندەی بۆز ئەرسەلان لە پێشەکی‌یەکەی‌دا باسی هەندێ لە بابەتە تورکی‌یەکانی کردوە، بــاس ئەکــەم. لەبــەر ئەوە بێگومان ئەم لێکۆڵینەوەیەم ناتەواوە.

**4. بابەتەکانی**

**4. 1. بابەتی سیاسی**

غەزەتەکە بۆ مەبەستی بازرگانی، یان ئایینی، یان ئەدەبی دەرنەکراوە. بۆ مەبەســتێکی سیاســی و، بــۆ بڵاوکردنەوەی بیر و بۆچونی سیاسی‌ی ڕێکخراوێکی کوردی، لە وەرچەرخانێکی مێژویی گرنگی ناو دەوڵەتی عوسمانی‌دا، دەرچوە.

**4. 1. 1. یەکێتی‌ی ریزەکانی کورد**

خۆخۆری کورد و ناکۆکی ناوخۆی، کە بە درێژایی مێژو دەردێکی کوشــندەی نــاو جوڵانــەوەی کــورد بوە، نوسەرانی غەزەتەی کــورد ئــەم دەردەیــان کــردوە بــە یــەکێ لــە بابەتــە ســەرەکی‌یەکانی غەزەتەکــەیان و، لەچەندین وتاری تورکی و کوردی‌دا باسیان کــردوە و داوایــان لــە گــەلی کــورد کــردوە: یــەکگرتو، یەکــدڵ و یەکدەست بن.

مەلا سەعیدی بەدیع ئەلزەمان لەوتارێکدا کەبەکرمانجی لە ژ1 ی‌دا نوسیویێتی ئامۆژگاریی‌یەکانی بە (ئەی گەلی کورد) دەست پێ ئەکا و، ئەڵێ:

"ئەی گەلی کوردان! لە ئیتیفاق دا قوەت، لە ئیتیحاددا حەیات، لە برایەتی‌دا سەعادەت، لە حکومەتدا سەلامەت هەیە.. باش گوێ بگرن، من شتێکتان پێ ئەڵێم: ئێوە بزانن 3 جەوهەرمان هەیە پاراستنی خۆیان لە ئێمە ئەوێ.

یەک، ئیسلامیەت، کە خوێنی هەزاران شەهید لە نرخەکەی‌دا دراوە.

دو، ئینسانیەت، کە لازمە ئەم خۆ نەزەرا خەلقی دە بە خدمەتا عەقلی و جوامێرانی و ئینسانیەتی خۆ نیشانی دونیا بدەین.

سێیەم، میللیەتا مەیە."

ئەبێ کورد 3 شت بپارێزن: ئیسلام و ئینسانیەت و قەومیەت و، ئەڵێ کورد 3 دوژمنی هەیە ئەیانەوێ لەناوی بەرن:

هەژاری، کەبەڵگەکەیشی ئەوەیە 40 هەزار حەماڵی کورد لە ئەستەموڵ دان، نەزانی و نەخوێندەواری، بە دەلیلی ئەوەی لە هەزار کەس تەنیا یەکێ ئەتوانێ رۆژنامە بخوێنێتەوە و، ناکۆکی و دوبەرەکی و دوژمنایەتی کە کورد لاواز ئەکەن و هێزی تێ‌دا ناهێڵن.

مەلا سەعید بۆ بەگژاچونی ئەم 3 دوژمنە، پێی وایە، پێویستمان بە 3 شمشێر هەیە: شمشێری عەدل و مەعاریف، شمشێری پێکهاتن و تەبایی نەتەوەیی، شمشێری پشت بەخۆبەستن نەک پشتبەستن بە بێگانە. لە کۆتایی‌دا بەمجۆرە ئامۆژگاری کوردان ئەکا: "خوێندن، خوێندن، خوێندن و، دەستی یەک گرتن، دەستی یەک گرتن، دەستی یەک گرتن!"

سەیاح ئەحمەد شەوقی، لە ژ1 ی‌دا لە ژێر سەردێڕی: (ئەی گەلی کوردان) دا نوسیویێتی: "هۆشیار بن! ڤێ فرسەتا هایێ تەرەقیێ وندا نەکەن. تەرەقی دبێژنە زانینا سنعەت و مەعاریف، خوێندن و خۆش دەرباس کرنا وەلاتی‌یە. ئیتیحاد دبێژنە ئیتیفاقا ب وەلاتی‌یا خوە را، برا فلە بێ. لاکین دین ژ هەمی تشت موشەرەفترە. لازمە شەریعەت چ ئەمر کریە، بوی رێ هەرین. شەریعەتا موحەمەدی زوڵم، غەدر، دزی، تالان، خراپ، بێئیتیفاقی مەنع کریە.

"هەتا نوها وان زوڵمێ مەئمورا هەمو شۆڵ ب مە کرن، ب مە دانە کرنێ ژی. خودێ کەرەم کر، حوریەت دەرکەوت. حوریەت مینا چیایێ قاف کەتیە پێشیا هەمو خرابیا. ب وی شەرتی ئەم دینێ موبینێ ئەحمەدی موحافەزە بکەن. داییرا دیندا هەمو شۆڵێن قنج، وەلاتی‌یا خوەیێ فلە را خۆش دەرباس کرن، خودێ ل مە ئەمر کریە. لەورا خەراج ددنە حکومەتێ. هەرچی کەسێ ئەمری حکومەتێ نەگرێ، دینێ وی زەعیفە. خودێ ئەمر کریە: (اطیعو الله والرسول واولي الامر منكم). دیندارییا کوردستانێ ل هەمو جییا تونە. دزی، تالان، بێ ئیتیفاقی شەریعەتێ‌دا حەرامە، حکومەتێ ژی مەنع کریە. موسلمانێ دایما ل حەرامییا بخەبتێ، ئیفلاح نابێ. ئیستیبداد ژ وە را فەتسانەیەکە. زەمانێ ئیستیبداد چ قاس خرابی دبو، لەورا مەئمورێد مە، ئەکسەر، دینی وان زەعیف بو.

..."

### 4. 1. 2. پشتیوانی لە شۆڕشی مەشروتە

پێ ئەچێ رۆشنبیرانی کورد و تێکۆشەرەکانی بە شۆڕشەکە و، دانانی قانونی ئەساسی زۆر خۆشحاڵ بوبن و، ئومێدی گەورەیان لەسەر هەڵچنی بێ. بەهیوا بون زوڵموزۆر و ئیستیبداد نەمێنێ، حوکمی قانون و

ئازادی و یەکسانی، لە نێوان هاووڵاتییـان و لـەنێوان نەتـەوە و ئاینـە جیاوازەکـان دا بچەسـپێ. هیوایـەکی زۆریان بەمەجلیسی مەبعوسان هەبوە، بە خۆشیەوە باسیان کردوە و پشتیوانییان لێ کردوە.

لەبەرئەوە غەزەتەکە هەوڵی ناساندنی کـورد و خواسـتەکانی بـە کاربەدەسـتانی سـەردەمی شـۆڕش و ناساندنی شۆڕشی دەستوری بەکورد داوە. لەچەند وتاری تورکی و کوردیدا باسی زوڵموزۆر و ئیسـتیبداد و بەرتیلخۆری و خراپی مەئمورەکانی سەردەمی پێش ئیعلانـی دەسـتوری کـردوە و، باسـی ئـازادی و خۆشـیی سەردەمی نوێی کردوە. وێنەی ساڵۆنی مەجلیسی ئەعیان و مەبعوسان و پێشـوازی خـەڵک لـە نوێنـەرەکانی بڵاوکردۆتەوە. بەخۆشیەوە هەواڵی دانانی سەرۆکی کۆمەڵە شێخ عەبدولقادری شەمزینی بە ئەندامی مەجلیسـی ئەعیان و هەواڵی هـەڵبژاردنی ئەنـدامی کۆمەڵـە ئیسـماعیل حـەقی بابـان بـە نوێنـەری بەغـداد لـە مەجلیسـی مەبعوساندا، نوسیوە.

لەبەشی کوردی ژ6 یدا لە دیاربەکرەوە تەلغرافچی، محەمـەد تـاهیر جـزری نامەیـەکی تایبـەتی بـۆ پیرۆزبایی لە ژێر سەرناوی: "صەدهەزار سـلاو و مەرحـەبا لـە جەمعیـەتا تـەعاون و تـەرەقییا کرمانجـا" بەشیعر و پەخشان بۆناردون. هەرئەم زاتە وتارێکی بە کرمانجی: (گەلی براکێن عەزیز و گەلی کرمانجـا) نوسیوە، ئەڵێ:

"هون هەمی زانن، حکومەتا مە بەری نهۆ حکومەتکی موستەبید بو. ژ پێنج هەیڤا بهـوردا حکومەتـەک مەشروع و مەشروتەیە. لاکین تەحقیق هندەک ژ وە، چونکە حکومەتا کەڤن وەکـە مـال و جـانێ وە، عـەقل و چاڤ و گوهێ وەژی تالان کر بی، هون نزانن دمابەینا ڤا هەردو حکومەتا فەرق چیە، وە مـەعنا ئیسـتیبداد و حورپەتێ چیە؟

..."

واتە:

"ئێوە هەموتان ئەزانن حکومەتەکەی ئێمە پـێش ئیسـتا حکومـەتێکی موسـتەبید بـو. لـە پێـنج مـانگی رابوردودا حکومەتێکی مەشروع و مەشروتەیە. بەڵام بێگومان هەندێ لە ئێوە، چونکـە حکومـەتی کـۆن وەکـو ماڵ و گیانی ئێوە، عەقڵ و چاو و گوێی ئێوەشی تالان کرد بو، ئێوە نازانن لە مابـەینی ئـەم دو حکومەتـەدا فەرق چیە و، مەعنای زۆرداری و ئازادی چیە؟"

غەزەتەی کورد، کردنەوەی مەجلیسی مەبعوسانی لەسـەروتاری ژ3 دا بەجـەژنی گـەورەی ئـازادی گـەل داناوە و، دووانەکەی سوڵتان عەبدولحەمیدی، جگە لەوەی بەتورکی بڵاوکردۆتەوە، لە ژ4 یدا لەژێر سـەرناوی: (صورەتی نوتقی هومایون) دا بەکوردی نوسیوەتەوە. لێرەدا وەکـو بەڵگەیـەکی مێژویـی و، وەکـو نمونەیـەک لەوەرگێڕانی کوردی و، نمونەیەک لەپەخشانی ئەو سەردەمە، وەکو خۆی ئەنوسمەوە:

"ئەعیان، مەبعوسان!

"وەقتێ کە هاتمە سەر تەخت قانونی ئەساسیم وەزع کردبو. لە پاشا لە خصوص تەتبیقاتیـەوە توشـی زەحمەت بوبوین، لە بەر ئەوە پیاوگەورەی ئەو زەمانە وایان لازم بینی کەوا بوەستێ تا مەعاریف تەرەقی دەکا و تا قابیلیەتی خەڵق دێتە جێ.

"ئێمەیش تەعلیقی وەقتیی خۆیمان کرد و، خەریکی تەرەقی مەعاریف بوین.

"شوکر ئەو مەقسەدە هاتە جێ، هەمو صنفی ئەهالی لە ریزدا سەرکەوت، ئارەزوی قـانونی ئەساسـییان کرد. موتمەئین بوم کەئەم ئارەزوە باعیسی سەعادەتی موڵک و میللەتە، بە رەغمی زۆر کەس کـە دەیـان گـوت قانونی ئەساسی چاک نیە، هیچ سێ و دوم نەکرد، دڵم لە دڵ نەدا، قانونی ئەساسیم ئـیعلان کـرد و، ئیـرادەم کرد کە سەرلەنوێ پیاو هەڵبژێرن، مەجلیسی مەبعوسان گردبنەوە.

"کە ئەحواڵی ئیدارە گۆڕا، کامیل پاشام کرد بەصەدر، ئیـرادەم کـرد مەشـغوڵی ڕێکخسـتنی مەجلیسـی مەبعوسان بێ. لەو وەقتەدا پرنسی بولغار و والی ڕۆم ئێلی شەرقی، پرنس فێردینانـد، هـەرچۆنێ بـو ڕوی لـە صەداقەتی دەوڵەتی عەلییەمان وەرگێڕا، ئیعلانی سەربەخۆیی کـرد. ئاوسـتریا و مەجارسـتان کـە بـە مـوافیقی عەهدنامەی بەرلین بە ئەمانەتی بۆسنە و هەرەسەکی بەدەستەوە بو، بەتەواوی خستیە سـەر مەملەکـەتی خـۆی. لەم دو مەسـئەلەیە زۆرم خەفـەت خـوارد. تەئەسـوفم کـرد، مودافەعـەی ئـەم تـەجاوزە و، موحافـەزەی حقـوقی دەوڵەتمان، حەواڵەی ڕەئی هەیئەتی وکەلایە، موعاوەنەتی عومومی ئێوەیش ئارەزو دەکەم.

"دەوڵەتی عەلییەی ئێمە لە گەڵ هەمو دەوڵەتـەکان ڕێکـە، ئومێـدم هەیـە ئـەوان موعاوەنـەت بکـەن ئـەم مەسئەلەیە بەرتەرەف بێ.

"ئیشی موهیم: ڕێکخستنی مالیـە، ئـاوەدانکردنی مەملەکـەت، ڕەفاهییـەت و ڕاحـەتی ئـەهالی شـاهانەم، زۆرکردنی مەکتەب و عیلم و مەعاریف، فەلاحی و صنعەت و مەعریفەتە. بەتەمەنای ئەوە کە خودا لە دەوڵـەت و میللەتی موبارەک بکا ئەمڕۆ مەجلیسی مەبعوسانم کردەوە، بەچاو پێ کەوتنی ئێـوە لـە حـزورم دا بـەختیارم. عەزمم قەتعیە ناگۆڕێ. ئینشائەڵڵا مەجلیسی مەبعوسان ئیشی چاک بۆ موڵک و میللەت دەبینێ.

"خودا تۆفیقی هەمومان بدا"

سلێمان نەزیف، کە لە ناو کوردا بە تورکخوا و، دژی کورد لەقەڵەم دراوە، لەبەرئەوەی لەسەردەمێکدا کە والی موسڵ بو شێخ عەبدولسەلامی بارزانی و هاوڕێکانی هەڵواسی، چەند وتارێکی سیاسیی پـڕ بایـەخی بـە تورکی لەم غەزەتەیەدا نوسـیوە. لـە ژ2 دا لـە ژێـر سـەردێڕی (کـورد و کوردسـتان) دا و، لـە ژ7 دا لـە ژێـر سەردێڕی: (ئیزمیر کوردستان نیە!) ڕەخنە لـە نوێنـەری ئیزمیـر ئـەگرێ لەسـەر ئـەوەی لـە دووانەکـەیدا لـە مەجلیسی مەبعوساندا، کە باسی پشت گوێ خرانی ئیزمیر ئەکا، ئەڵێ ئیزمیـر کوردسـتان نیـە بـۆچی پشـت گوێ خراوە، واتە کوردستان لەبەرئەوەی کوردە ئەگەر پشت گوێیش بخرێ، جێگەی ڕەخنە نیە، بەڵام ئیزمیـر چونکە تورکە نابێ پشت گوێ بخرێ.

### 4. 1. 3. بایەخدان بە خوێندەواری و پەروەردە

مەلا سەعید لە وتارێکدا کە لە ژ2 دا بڵاوی کردۆتەوە ئەپرسێ: کورد پێویستی بـە چـی هەیـە؟ خـۆی وەڵامی ئەم پرسیارە ئەداتەوە و ئەڵێ: "15 ساڵە من بیر لەم پرسـیارە ئەکەمـەوە، هیچـی کـەم نەدۆزیوەتـەوە جگە لەم دو ڕێگایە: یەکەم، یەکگرتن. دوەم، عیلم و مەعریفەت، بە تایبەتی زانستە ئاینییەکان و ئـەو زانـین و هونەرانەی بۆ شارستانێتی ئەم سەردەمە پێویستن."

### 4. 1. 4. یەکێتیی گەلانی عوسمانی

و، پتەوکردنی پێوەندی کورد لـە گـەڵ گـەلانی وڵات و، ئاشـتبونەوە لـە گـەڵ ئەرمـەن، یـەکێ بـوە لـە ئامانجەکانی کۆمەڵە. غەزەتەکەیش کەزمانی کۆمەڵە بوە، بۆ ئەو مەبەستە چەندین وتاری بڵاوکردۆتەوە.

لە ژ4 دا بەبێ ئیمزا لەژێر سەردێڕی (گەلو برا) نوسیویێتی:

"ناوی میللەتا مـە کرمانجـە. کرمـانج هـەمو یـەکن. بـازارێ مـە موقەدەسـە. مەملەکـەتا مـە تـابیعی حکومەت و دەوڵەتی عەلییەی عوسمانییەیە. ئم ژی تابیعی عوسمانلی نە. تورک، کرمانج، یەهودی، ئێزیـدی، نەستوری ژ وان غەیرێ، یەکونێ میللەتا کە ملکێ عوسمانلی دە ڕودنـە، گـش ئـەم ب هـەڤ ڕا بەرامبـەرن، یەکن، مابەینا مەدا فەرق تونینـە. نـاڤێ مـە و نـاڤێ میلـەتا غـەیر تـو جـار عوسـمانلییە و مەملەکـەتا مـە مەملەکەتێ عوسمانلییە.

"... ئەم ئەوقا کرمانج سادقن کە ب هەڤ را سیلاح کشاندن و نەکوشتن، بەدەلی ئـەو، خـوە دەوڵـەتێ عوسمانی را تەسلیم بون، مەملەکەتی مە تەرک کـردن حکومـەتێ عوسـمانی را موتیـع، کـە بـو دەورێ زەمـانێ ئیستیبداد دە، ماڵی مە خەراب، جانێ مە سەراب، دڵی مە کەباب بو..

"برائێن من!

"خودێ رەب ئەلعالەمینە، تەنێ رەب ئەلموسلمین نینە. موسولمانا، فلە را هەمو خودێ خەلق کریە، خـالقێ مە و وان یەکە. (بەنی ئادەم ئەعزای یەکدەیگەرەند) دبێژن. ئەو گوتن چ قـا راسـتە، لزومـێ ئیتیحـاد تـەئمین دکە. یەعنی نوها ئەقوامێ موختەلیفـە ئیتیحـاد حاسـل کرنـە، یـەکـدل و یەکدەسـت و، تـەرەقیێ مەعریفـەت و ئیعمارێ وەتەن را چالشمیش بونە. ئەم ژی مینا وان چالشمیش بن. فلە، یەهودی، بیلا فەر ئیتیفاق و ئیتیحـاد بکن، مابەینێ خوە دا نیفاق هلینن، یەکوجود و یەکدەست ببن. حکومەتێ زاڵمە کە خوەدێ هلانێ، مابەینی فلـە و موسلمان را توخمێ نیفاقێ زەرع کر بو، ئەو زەراعـەت قـەلع، تـوخمێ ئیتیحـادێ زەرع بکـن. مەئموریـەتێ مەملەکەتا مە، تەربیە و عیلم و مەعاریفا مە، تەرەقی، سەنایع و تیجارەت و زەراعەتا مە تەوسیع کرن را موتەفیق بن. گوندێ مە، بازارێ مە، ئالێ مە و مەملەکەتێ مە شاد بکن. فلـەیێ هـا ژی وەتەنداشـی مەیـە، ئـەوانا را دل بدن، ئیلتیفات، کەرەم و شـەفەقەت بکـن، ئیکـرام ئوسـا ب مێرانـی بکـن کـە خـودێ ژی مـە را موعاوەنـەت، مەرحەمەت بکە، چونکی خودێ قورئانا عەزیمولشەئن دا: (تعاونوا..) فەرمان و ئیرادە کریە."

سەروتاری ژ9 یش لەلایەن حسێن پاشازادە سلێمانەوە بەتورکی لەژێر سەردێڕی (کـورد و ئەرمـەن) دا نوسراوە.

### 4. 1. 5. داکۆکی لە ئالای حەمیدی

ئەگەرچی لەناو ڕۆشنبیرانی کوردا ئاڵا حەمیدیەکان ناویان بەخراپی ڕۆیشتوە، بەتایبەتی لەبـەر ئـەو دەورە خراپەی لە کوشتاری ئەرمەنیەکاندا گێڕاویانە، کەچی غەزەتەی کورد داکۆکیان لێ ئـەکا و داوا ئـەکا بایەخیان پێ بدرێ، لە ڕوی مەشق و فێرکردن و پێ خوێندن و چەکدارکردنەوە چاودێری بکرێن.

سولەیمانیەلی فەتحی لە ژ1 و 2 و

بەدیع ئەلزەمان لە ژ2 دا کە ئەپرسێ (کورد پێویستی بە چیە؟) هەردو بەگەرمی لەسەریان ئەکەنەوە.

### 4. 2. بابەتی ئەدەبی

غەزەتـەی کـورد لەچەنـد ژمارەیـەکیدا بابـەتی ئـەدەبی بـەتورکی و بـەکوردی، بـەتایبـەتی شـیعری بڵاوکردۆتەوە:

پیرەمێرد بەناوی سولەیمانیەلی تەوفیق و، م. تەوفیق، لە ژمارەکانی 3 و 8 دا دو شیعری تورکی و،

ئیبراهیم حەیدەری شیعرێکی لامارتینی فەرەنسی کردۆتە تورکی و لەژمارەکانی 2 و 3 و 6 و،

محەمەد زیا لە ژ3 دا شیعرێک و

لە ژ9 دا شیعرێکی درێژی تورکی بێ ئیمزا، بڵاوکردۆتەوە.

پیرەمێرد بەئیمزای سولەیمانیەلی: تـەوفیق، لـە ژ1 و 2 دا دو شـیعری کـوردی خـۆی بڵاوکردۆتـەوە. شیعری یەکەمی وەکو من بزانم تا ئێستا لە دیوانە چاپکراوەکانیدا بڵاو نەکراوەتەوە، لە سەرەتاکەیدا ئەڵێ:

ئەمڕۆ کە ڕۆژی هەمومانە سەربەسەر

کوردیش لە گەڵ گەلان لە چلەخانە هاتنەدەر

سی ساڵ بو ڕۆژو، ڕۆژی بەساڵێ لەبەر دەچو

ڕۆژوی حەرام بو، خێری لەبەر شەڕ دەبو بە شەڕ
مەتبوع و تابیع، وەک مەم و زین بون لەرێگەدا
گورگ و چەقەڵ لە چڵی بەکر مەرگەوەڕ بەتەر
میللەت نە دەنگ و ڕەنگی خەلیفەی دەدیی و دەبیست
مەزلوم نە حەدی بو بە شکات دەنگی بێتە دەر
عالم کە بوبوە خزمی خەزوری سەپانی شێخ
کورد دەستی گرت بون بەبێ نۆبەی نەکەوتە بەر
هەرچی کە بیوتایە ئەمن کوردم ئەو دەمە
ڕێگەی تەرابلوسی بە پێخواسی دەگرتە بەر

لە ژ2 دا شیعرێکی تری بڵاوکردۆتەوە کە گرنگیەکی ئەدەبی هەیە، چونکە لە وانەیە ئەمە یەکەمین هەوڵدانی نوێکردنەوەی شێوە و ناوەڕۆکی شیعری کوردی بێ. شیعرەکەی پیرەمێرد بەمجۆرە دەس پێ ئەکا:

لەسەر بەردێ هەڵۆیە هەڵفڕی کەوتە هەوا بێ غەم
هەوای صەید و شکاری کەوتە سەر، تا کەوتە سەر عالەم
هەوایێکی غروری کەوتە سەر، خۆی زۆر لە بەرز زانی
پەڕی گیف کردو، بای باڵ ئەدا هەرتاکو دەیتوانی

ئەم شیعرەی چەند جارێ بڵاو بۆتەوە و، لە دیوانەکەیدا هەیە.

هەندێ لە شیعرە تورکییەکان و شیعرە کوردیەکانی پیرەمێرد ئەچنە خانەی شیعری سیاسییەوە.

لە ژ7 یدا غەزەلێکی نالی بڵاوکراوەتەوە کەبەم بەیتە دەس پێ ئەکا:

ئەی جیلوەدەری حوسن و جیلوەبەخشی تەماشا
سەررشتەی دین بێ مەدەدی تۆ نیە حاشا

مەتنە کوردیەکەی بەیت بە بەیت نوسراوە و لەژێریدا تەرجومەی تورکی کراوە.

لە ژ8 یدا خەلیل خەیاڵی موتکی پەخشانێکی سیاسی و کرمانجی لەژێر سەردێری: (وەتەن و ئیتیفاقا کرمانجا) بەچەند پارچەیەک نوسیوە و، لەژێر هەر پارچەیەکیدا تەرجومەی تورکییەکەی نوسراوە. ئەم پەخشانە نرخێکی ئەدەبی بەرزی هەیە، لە سەرەتاکەیدا ئەڵێ:

"وەتەن! تۆ چە قا عەزیزی؟ تو چە قا لەتیفی؟ لالەزارێ تە ژ خونا شەهیدانە. سونبول و رەیحانی تە ژ رندیا چاڤێ عەگیدانە. وەختەکی هەر تەرەفی تە ئاڤا بو، هەر گۆشەی تە مەجمەعی سواران بو... "

## 4. 3. هەواڵ و دەنگوباس

غەزەتەی کورد زۆر هەواڵی ئەو سەردەمەی کوردستان، دەوڵەتی عوسمانی، ناوچەکە و جیهانی نوسیوە. لەناو هەواڵەکانیدا ئەوەی گرنگ بێ بۆ مێژوی کورد رەنگە بریتی بێ لەو هەواڵانەی پێوەندیان هەیە بە:

**4. 3. 1. کردنەوەی لقەکانی کۆمەڵە لە ویلایەتە کوردیەکاندا**

**4. 3. 2. عەشیرەتەکانی کورد و دەوریان لەداوای مافی نەتەوەییدا**

**4. 3. 3. نەفی کردن و کوژرانی شێخ سەعیدی حەفید**

لە ژ5 یدا ڕۆژی 4 ی کانونی ئەوەلی 1324، لە موسڵەوە (رەئیسی سادات حەفید ئەلسەید سەعید) بروسکەی پیرۆزبایی بەبۆنەی کردنەوەی مەجلیسی مەبعوسانەوە ناردوە.

بەڵام لە ژ6 یدا هەواڵی کوژرانی شێخ سەعیدی لە ژێر سەردێڕی: "شئونات: تأسف عظیم" بەداخێکی زۆرو بە پەژارەیەکی قوڵەوە نوسراوە. هەواڵەکە تورکی‌یە بەڵام بەم بەیتە فارسی‌یە کۆتایی هاتوە، کەروی دەمی کردۆتە خەڵکی موسڵ: "سهل کاری نیست خون ال احمد ریختن/خاک غم بر فرق فرزند محمد ریختن."

لە ژ7 یدا لە دو کورتە لێدوانێدا بە تورکی باسی کوژرانی شێخ سەعید نوسراوە و، بروسکەیەکی لقی موسڵی جەمعیەتی تەعاون و تەرەقی کورد لەم بابەتەوە بڵاو کراوەتەوە.

هەروەها ئەرجیشلی سەیاح: ئەحمەد شەوقی، لە ژێر سەردێڕی: (گەلی کورد) نوسویێتی:

"ژ ساداتی کیرام، ئەولادی ئەحمەدی کاک ئەحمەدی شێخ مەرحوم شێخ سەعید ئەفەندی، وقوعا وەفاتا وی، جەمعیەتا مە بهیست، ژ دلێ وان ئاگر بەر بو، تەمامی جەمعیەت ژ بۆ وی حالی تەئەسوفەک مەزن دکەن، لەورا ژ ڕوی غەرەزێ خانەدانەکە وەها بێچارە کە مەحو بو، ئەلبەت کەسێ موسلمان بێ، باخصوص ئەهلی تەریق بێ، چەوا موتەئەسیر و مەحزون نابێ؟ جەمعیەتا مە ژ بۆ مەرحوم شێخ سەعید ئەفەندی حوزنا خۆ ئیزهار دکە. ئەز وە دەزانم کوردستان تەمام بە وی حالی دڵتەنگ بونە. تەنێ خودێ ئەو مەرحومە مەغفور موستەغرەقێ بەحرێ رەحمەتا خۆ بکە. ئامین. حکومەت ژ بوی سەبەبا وەفاتا شێخ سەعید ئەفەندی ئیزهارا حەقیقەتێ دکە. وێ حەقێ ئیجرا ژێ بکە. کورد لازمە خۆ تەف نەدت، حاکمێ حەقیقی خودی‌یە!"

**5. لەڕوی هونەری ڕۆژنامەوانی‌یەوە**

**5. 1 شێوە و ڕوخساری**

ئەگەرچی تا ئێستا وا باوە کورد تەعاون و تەرەقی غەزەتەسی ڕۆژنامە بوە و، خۆیشی نوسیویەتی غەزەتە، بەڵام دوای دۆزینەوەی 9 ژمارەی دەرکەوت کە لە شێوەی گۆڤاردا دەرچوە، نەک ڕۆژنامە. هەمو لاپەڕەیەکی 3 ستونی تێدا نوسراوە. شوێنێکی تایبەتی بۆ بەشی کوردی تەرخان نەکراوە، بەڵکو هەرجارەی لەشوێنێکدا نوسراوە و، تێکەڵاوی بابەتە تورکیەکان کراوە.

ژ1 و 2 لە (سلانیک مطبعەسی: چاپخانەی سەلانیک) و

ژ3 و 9 لە (مرکز مطبعەسی: چاپخانەی مەرکەز) چاپ کراوە. ئەدرەسی هەردو چاپخانە نوسراوە: (درسعادت: دەرگای بەختیاری)، کە مەبەستی پایتەختی دەوڵەتی عوسمانی، شاری ئەستەموڵ، بوە.

سەر بەرگی هەمو ژمارەکانی بەوێنەی جوان، کە بە زنگۆگراف کراوە، ڕازێنراوەتەوە.

سەربەرگی 1 هەمین ژمارەی بە وێنەی دیمەنێکی جوانی ئەستەموڵ و،

هی 3 هەمین ژمارەی بە وێنەی (مەبعوسان دائیرەسی) کە مەبەستی بینای پارلەمانە و،

هی 4 هەمین ژمارەی بەوێنەی سوڵتان عەبدولحەمید لە سەر دیوی پێشەوەی و وێنەی ساڵۆنی مەجلیسی ئەعیان لەسەر دیوی پشتەوەی و،

هی 5 هەمین ژمارەی بەوێنەی سالۆنی تایبەتی زاتی شاهانەی ناو مەجلیسی مەبعوسان و لە لاپەڕەیەکی ناوەوەیدا وێنەی دیوی ناوەوەی (مسجد الاقصی) ی قودس و،

هی 6 هەمین ژمارەی بەوێنەی پردی موسڵ لەسەر روباری دیجلە و، لەلاپەڕەی ناوەوەیدا بەوێنەی کریت و،

هی 8 هەمین ژمارەی بە وێنەی ئەندامانی مەجلیسی مەبعوسان کە بە کۆمەڵ لە چاوەڕوانی زاتی شاهانەدان و

هی 9 هەمین ژمارەی بە وێنەی پێشوازی هەندێ لە مەبعوسەکان کە وەکو خۆی نوسوێتی گەیشتونەتە "دەری سەعادەت" و لە ل81 یدا وێنەی هەڵبژاردنی مەکتەبی سوڵتانیی و لە لاپەڕەی ئەم ژمارەیەدا کە دوا ژمارەیەتی بەوێنەی "خلیجی دەری سەعادەت"، رازێنراوەتەوە.

ژمارەکانی 2 و7 وێنەیان لە گەڵ نیە.

جا هەر لە ئەسڵدا وێنەیان لە گەڵ چاپ نەکردوە، یان ئەو نوسخەیەی دەس کەوتوە لێی دڕاوە، نازانرێ.

### 5. 2. ناوەرۆکی

نوسەرەکانی غەزەتەی کورد پیاوی شارەزای دنیای رۆژنامەوانی و سیاسی و ئەدەبی و، زانا و بەتوانا بون. ناوەرۆکی غەزەتەکە بەپێی پێوانەکانی ئەو زەمانە لە ئاستێکی بەرزدا بوە.

چەندین لێدوانی سیاسی تێدایە و، چەندین هەواڵی ولایەتە کوردیەکان، هەواڵی ئەستەموڵ و مەجلیسی ئەعیان، هەواڵی هەندێ لە کەسایەتیی‌یە ناسراوەکانی کورد، هەندێ لە هەواڵە گرنگەکانی دنیای بڵاوکردۆتەوە.

### 6. داخرانی

لە بەر ئەوەی بەڵگەکانی ئارشیفی تورکیامان لە بەر دەسدا نیە، وردەکاری داخستنی غەزەتەی کورد نازانین. هەروەها نازانین هەر ئەو 9 ژمارەیەی لێ دەرچوە و ئیتر داخراوە، یان زیاتری لێ دەرچوە. بەڵام ئەوە دیارە کە سەرانی ئیتیحاد و تەرەقی زۆر زو لەو بەڵێنانە پاشگەز بونەوە کە بە گەلانی نەتورکیان دابو. سیاسەتی تورکاندنیان گرتەبەر و، ئەو نەختە ئازادیی‌یەی گەلانی نەتورک بەدەستیان هێنا بو، لێیان سەندنەوە. لە ئەنجامی ئەم سیاسەتەدا بارەگاکانی کۆمەڵەی تەعاون و تەرەقی کورد لە ئەستەموڵ و، لقەکانی لە ولایەتەکاندا داخران و، غەزەتەکەیان و ئەو خوێندنگایەیش کەبۆ منالانی کوردیان کرد بوەوە داخرا.

پیرەمێرد چەند جارێ باسی گیرانی خۆی لە ئەستەموڵ گێڕاوەتەوە و، لە یەکێ لە شیعرەکانیدا ئەڵێ:

کاک ئەحمەدەکەی خۆشەویستی خوا
زۆر کەس لەسایەی تۆوە نان ئەخوا
لەوانە زیاتر من تۆم خۆش ئەوێ
هەر تۆی سەربەرزی قەومەکەت ئەوێ
کەلە زیندانیان تێکخزاندبوین
سێدارەیان بۆ داچەقاند بوین
تۆ چوبویتە لای بەدیع ئەلزەمان
مژدەت دابویە بە ژیان ومان
فەرمو بوت: "ئێوە نامرن، ئەمێنن

تا سەر ئازادی گەلتان ئەبینن"

ئەبێ لە گەڵ داخستنی غەزەتەکەیاندا پیرەمێرد و بەدیع ئەلزەمان مەلا سەعید کوردی، کە ئەویش لە نوسەرە بە بڕشتەکانی بوە، گیرابن.

## 7. چیرۆکی دۆزینەوەی

غەزەتەی کورد، تا ئەم ساڵانەی دوایی کەس هەواڵ و دەنگوباسی ژمارە ئەسڵی‌یەکانی نەئەزانی. چەند وتارێکی لە سەر نوسرا بو، کە گرنگترینیان ئەوە بو جەلیلی جەلیل نوسی بوی. ئەویش خۆی غەزەتەکەی نەدی بو، بەڵکو پشتی بست بو بە نوسینی نوسەرێکی ئەرمەنی. ئیتر هەمو ئەوانەی کە باسیان کردبو خۆیان ژمارەکانیان نەدی بو، بەڵکو ئاگاداری‌یەکانی یەکتریان نوسیبوەوە، تا محەمەد ئەمین بۆز ئەرسەلان سەرلەنوێ ژمارەکانی 1-9 ی بە ئۆفسێت چاپ کردەوە و هەمو نوسینەکانی هێنایەوە سەر پیتی لاتینی و، پێشەکی و پەراوێزی بۆ نوسی.

بۆز ئەرسەلان لە پێشەکی کتێبەکەیدا نوسیوێتی: دوای تەواوکردنی بەرگی یەکەمی ژین دانەیەکی بە دیاری لێ ناردوە بۆ کوردناسی هۆڵەندی مارتن فان براونەسن، ئەویش ئاگاداری ئەکا کە 9 ژمارەی (کورد تەعاون و تەرەقی غەزەتەسی) و ژمارەی یەکەمی (هەتاوی کورد) لە ئینستیتوتی ڕۆژهەڵاتناسیی زانکۆی میونیخدا هەڵگیراون، ئاخۆ ئەم پێ ئەزانێ یا نە؟ وەکو بۆز ئەرسەلان خۆی نوسیوێتی ئاگای لە بونی ئەم غەزەتەیە نەبوە. بۆیە هەواڵەکە بە خۆشیەوە وەرئەگرێ و، داوای لێ ئەکا کۆپی‌یەکی بۆ بنێرێ و، پاشان دەس لە کارەکانی تری هەڵئەگرێ و، ساغکردنەوەی ئەم غەزەتەیە ئەخاتە پێش کارەکانی ترەوە و، ئەم کتێبە هێژایەی لێ بەرهەم ئەهێنێ.

بۆز ئەرسەلان، جگە لەم غەزەتەیە، پێشتر غەزەتەی (کوردستان: 1898-1902) ی بە 2 بەرگ و گۆڤاری (ژین: 1918-1919) ی بە 5 بەرگ، ساغ کردۆتەوە و هێناونیە سەر ڕێنوسی لاتینی و پێشەکی و پەراوێزی بۆ نوسیون. لە گەڵ کۆپیی نوسخەی ئەسڵی‌دا سەرلەنوێ لە ئۆپسالای سوید چاپی کردونەتەوە. بۆز ئەرسەلان، لەم بوارەدا خزمەتێکی گەورەی بە مێژوی کورد کردوە، جێگەی سپاس و ستایشە.

## 8. جێگەی لە ڕۆژنامەوانی‌ی کوردی‌دا

غەزەتەی (کورد) بێگومان جێگەیەکی تایبەتی هەیە نەک هەر لە مێژوی ڕۆژنامەوانی‌دا بەڵکو لە مێژوی سیاسی‌ی کوردا. ئەوەی تا ئیستا زانراوە ئەمە یەکەمین غەزەتەی کوردی‌یە لە تورکیای عوسمانی‌دا دەرچوبێ، بیروباوەڕی ڕێکخراوی (تەعاون و تەرەقی) دەربڕیوە. لە ڕێگەی ئەم غەزەتەیەوە ئەتوانین بیروبۆچونی ڕۆشنبیران و تێکۆشەرانی ئەو سەردەمەی کورد بخوێنینەوە دەربارەی جۆری چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوەیی کورد و، دواکەوتویی و بە جێ مانی کوردستان لە شارستانێتی. ڕێکخراوی (تەعاون و تەرەقی) خەباتی ئەکرد بۆ سەلماندنی مافی نەتەوەیی کورد لە چوارچێوەی دەوڵەتی عوسمانی‌دا.

## 8. 3. ڕۆژی کورد

صاحب امتیاز :
و مدیر مسئول
عبدالکریم



# روژ کرد

تاریخ تأسیسی
۱۳۳۱

عدد : ۱

جلد : ۱

۱٤ رجب سنه ۱۳۳۱ — شیمدیلك آیده بر نشر اولنور — ٦ حزیران سنه ۱۳۲۹




سلطان صلاح الدین ایوبی


[ حقوق مطبعه‌سی ] باب‌عالی جوارنده ابوالسعود جاده‌سنده نومرو ۱۹




صاحب امتیاز
ومدیر مسئول :
عبدالکریم

عدد : ٤


# روژکرد


تاریخ تأسیسی :
غرهٔ رجب
١٣٣١

ژمار : ٤

١٠ شوال سنه ١٣٣١ شیمدیلك آیده بر نشر اولونور ٣٠ اغستوس سنه ١٣٢٩




کردستانك مستحکم بلادندن ارضروم شهری

## 8. 3. ڕۆژی کورد

### 1. ڕۆژی کورد

### 1. 1. دەرچونی

ساڵی 1912 خوێندکارانی کورد لە ئەستەموڵ ڕێکخراوێکی خوێندکارییان پێکهێنا بە ناوی: (کرد گلبه هیوی جمعیتی: جڤاتا هێڤی فەقیّی کوردان) ەوە، ئەم ڕێکخراوە دەستی کرد بە بڵاوکردنەوەی غەزەتەی تورکی-کوردی (روژ کرد: ڕۆژی کورد).

ساحێبی ئیمتیاز و مدیری مەسئولی: سلێمانی عەبدولکەریم (عەبدولکەریم حاجی عەبدوڵا کەرکوکلی زادە) بوە، کە دواتر لە سەردەمی دامەزراندنی دەوڵەتی عیراقدا بوە بە (حاکمی مونفەرید) لە کەرکوک و سلێمانی.

ژ1 ی ڕۆژی کورد لە 14 ی ڕەجەبی 1331 کۆچی، 6 ی حوزەیرانی 1329 ی ڕۆمی، بەرامبەر 19 ی حوزەیرانی 1913 زاینی، لە چاپخانەی (حقوق) و،

ژ2 ی لە 14 ی شەعبانی 1331 ی کۆچی، 6 ی تەموزی 1329 ی ڕۆمی، بەرامبەر 19 ی تەموزی 1913 زاینی، لە چاپخانەی (ئیجتیهاد) و،

ژ3 ی لە 11 ی ڕەمەزانی 1331 ی کۆچی، 1 ی ئاغستۆسی 1329 ی ڕۆمی، بەرامبەر 14 ی ئابی 1913 ی زاینی، لە چاپخانەی (محمود بەگ) و،

ژ4 ی، کە دوا ژمارەیەتی، لە 10 ی شەوالی 1331 ی کۆچی، 30 ی ئاغستۆسی 1329 ی ڕۆمی، بەرامبەر 12 ی ئەیلولی 1913 ی زاینی، لە چاپخانەی (ڕەسملی کیتاب) لە ئەستەموڵ چاپ کراوە.

### 1. 2. ئامانجی

سەروتاری ژ1 ی بە تورکی بە ئیمزای (روژ کرد) لە ژێر سەرناوی: (غایە، مسلک) واتە (مەبەست، ڕێباز) بۆ ڕونکردنەوەی ئامانجی گۆڤارەکە تەرخان کراوە، لە بەر ئەوەی بە تورکییە و کوردییەکەی لە بەردەس دا نیە، نەمتوانی کەڵکی لێ وەر بگرم. بەڵام لە وتارێکی کوردیدا کە خاوەنی ئیمتیاز (سلێمانی عەبدولکەیم) لە ژێر سەرناوی (عیبرەت) دا نوسیوێتی ئەڵێ:

"لە داری دنیادا بەختیارم چونکە نیسبەتم بە قەومی کوردە، خۆم بە بەدبەخت دەزانم چونکە ئەو قەومە نەجیبە لە ساحەی تەکامولا دو هەنگاو نەچۆتە پێشەوە. بۆ دەفعی ئەم تەزادە، بۆ چارەی نـەجاتی ئـەم قەومـە دو ڕێگە ئینتیخاب کراوە: یەکێ جەمعیەتی کوردە کە مەقسەد و غایەی مونحەصیرە لـە سـەر خدمـەتی کـورد. دوەم، ڕۆژی کوردە، کە ئەویش دوبارە بۆ خدمەتی کورد هاتۆتە ساحەی نەشـرەوە. فەوائیـدی ئـەم جەمعیەتـە ئەوەندە زۆرە کە لە ژماردنی زبان عاجزە. ئەوەلەن، ئەم جەمعیەتە قەتعیەن لە ئوموری سیاسەتا بێ دەخلە. بۆ نەشر و تەعمیمی مەعاریف، بۆ جەمع و تەدوینی ئەدەبیات، ئەشعار، بـۆ ئیجـادی قەواعیـدی لیسـانی کـوردی، تەشەکولی کردوە. فیکری، مالی، جانی، حەصر کردۆتە سـەر خدمـەتی کـورد. ڕۆژی کـورد وەزیفـەی زیـاترە، مەعلومە کە ئەوروپا دەڵێن: کورد زبانی نیە، بێ ئەدەبیاتە. وە لە ناو جیهانا عام فام بوە کـە کـورد ئەشـقیایە. وە مەعلومی هەمو کەسە کە کورد چەند پیاوی عالم، چەند شاعیر، چەند سیاسـی، چەنـد عابیـدی هەیـە. ڕۆژی کورد ئەم وەزیفانەی دەر عوهدە کردوە کە ڕەدی ئەم ئەراجیفانە بکا."

وەکو لە وتارێکی سالح بەدرخاندا دەر ئەکەوێ پێ ئەچێ ویستبێتیان ڕۆژنامەیەکی سیاسی دەر بکەن. بەڵام دەرکردنی ڕۆژنامەیەکی لەو بابەتە، بە پێی (یاسـای چاپەمـەنی عوسـمانی) پێویسـتی بـە دانـانی 500 لیرەی زێڕ بارمتە هەبوە، لە بەر ئەوەی ئەمان ئەو پارە زۆرەیان پێ دابین نەکراوە بەم جەریدەیـە ئیکتیفایـان کردوە.

### 1. 3. نوسەرەکانی

ڕۆژی کورد بە دو زمانی تورکی و کوردی دەرچوە. بەشە تورکییەکەی زۆرترە لە بەشە کوردییەکەی. ئەگەرچی بە ناو (جڤاتا هێڤیی فەقێی کوردان) دەری کردوە، بەڵام پێ ناچێ هیچ کام لە نوسەرەکانی فەقێ یا خوێندکار بوبن، بگرە زۆریان نوسەری شارەزا و ناسراو بون.

ئەوانەی بە تورکی تێیدا نوسیویانە:

د. عەبدوڵا جەودەت، بابان زادە ئیسماعیل حەقی، بابان عەبدولعەزیز، محەمەد سالح بەدرخان (جگـە لـە ناوی خۆی، م. س ئازیزی، ئەبو ڕەوشەن و، بابی ڕەوشۆی بەکارهێناوە) کەرکوکلی نەجمەدین، خـەرپوتلی ح. ب، فەخری، مەدحەت، سـلێمانیەلی مەسـعود، بولغارسـتانلی تۆغـان، لـوتفی فکـری، حسـێن شـوکری، ئەرغـەنی مەعدەنلی ی. ج، بەنی ئەردەڵانی ا. م.

هەندێ لەم نوسەرانە لە ناو کۆڕ و کۆمەڵە سیاسی و ڕۆشنبیری و ڕۆژنامەوانییەکانی ئـەو سـەردەمەی عوسمانیدا کەسایەتی ناسراو بون، بە تایبەتی دکتۆر عەبدوڵا جەودەت، ئیسماعیل حەقی بابـان، عەبدولعـەزیز بابان، سالح بەدرخان.

ئەوانەی بە کوردی تێیدا نوسیویانە:

سلێمانی عەبدولکەریم، دیاربەکری فکری نەجدەت، فوئاد تەمۆ، محەمەد سالح بەدرخان، خـەلیل خـەیاڵی لە ژێر ناوی: (مودانی خ)، بەنی ئەردەڵانی ئەحمەد موحسین، زێوەر، فازیـل مـوخلیس لـە عەشـیرەتی ملـی، غ. سەری زەر.

نوسەرانی بەشی کوردی، وەکو نوسەرانی بەشـی تـورکی، تێکـەڵاون لـە کـوردی ناوچـە جیاجیاکـانی کوردستان. وتار و شیعری بە هەردو لەهجەی کرمانجیی سەرو و خوارو تێدا بڵاو کراوەتەوە.

ئەم باسە تەرخانە بۆ بەشە کوردییەکەی. لێکۆڵینەوەی بەشە تورکییەکەی بە جێ هێڵراوە بۆ یـەکێکی تورکی زان، یان بۆ کاتێ کە ئەو بەشەیش بە کوردی تەرجومە ئەکرێ.

### 1. 4. سەرچاوەی دارایی

ئابونەی ڕۆژی کورد وەکو لە سەر دیوی دوا لاپەڕی بەرگەکەی نوسراوە: "ساڵی هەفتدە قرۆشە. شەش مانگ بە نۆ قرۆشە. قیمەتی یەکێ بە چل پارەیە."

گرنگترین سەرچاوەی دارایی ڕۆژی کورد ئابونەکانی بوە. لە دوا لاپەڕەی ژ2 یدا لە ژێر سەرناوی (ئیعلان) دا نوسیوێتی: "سەرمایەی ریسالەی ڕۆژی کورد با لە هەمو کەس مەعلوم بێ کە زۆر بێ بیزاعە و کەمە، لە موشتەرییەکانی خۆمان رجامان وەهایە کە بەدەلی ڕۆژی کورد لە گەڵ پۆستەدا زو بە زو بۆمان رەوانە بفەرمون."

هەندێ (ئیعلان) ی بڵاو کردۆتەوە پێ ئەچێ بە خۆڕایی بڵاوی کردبنەوە، بۆ نمونە:

لە دوا لاپەڕەی بەرگی ژ1 و 2 دا: "ئیعلان: هەکیم حەیدەری زادە ئەحمەد بەگ: هەمو ڕۆژی یەکشەنبە بە خۆڕایی لە ئەجزاخانە (اچیق باش) لە وەزنەجیلەر کوردە نەخۆشەکان موعایەنە دەکا و عیلاجیش ئەدا."

لە دیوی ناوەوەی بەرگی ژ3 و 4 دا: "ئیعلان: لە مونتەسیبینی حقوق بابان زادە عەبدولعەزیز بەگ بە ناوی (عثمانلی تسهیل مسالح) ئیدارەخانەیەکی کردۆتەوە. هەرچەند ئیش و دەعوا ببێ بە زۆر هەرزان دەیبینێ. نەجمەدین ئەفەندی کەرکوکییشی لە گەڵایە. حەمو کوردەکان لازمە ئیشیان بدەنە ئەم کوردە نەجیبە."

## 2. بابەتە کوردیەکانی

### 2. 1. بڵاوکردنەوەی هۆشیاریی نەتەوەیی

حاجی قادری کۆیی ئەو ماوەیەی لە ئەستەموڵ ژیاوە کاری لە زۆری ڕۆشنبیرە کوردەکانی سەردەمی خۆی و نەوەکانی دوای خۆیشی کردوە. لە دیوانی شیعرەکانی حاجی قادردا ئەتوانین بەرنامەیەکی سیاسی گشتلایەنە بۆ رزگاریی کوردستان بخوێنینەوە. کاریگەری بیروبۆچونەکانی حاجی لە بیروبۆچونەکانی هەڵبژاردەی کوردا رەنگی داوەتەوە و دیارە. خەلیل خەیاڵی و ساڵح بەدرخان، کە دو ڕۆشنبیری ئەو سەردەمە بون، لە چەندین وتاری خۆیان دا، بۆ سەلماندنی بیروڕاکانی خۆیان و، بەهێزکردنی بەڵگەکانیان، شیعرەکانی حاجی قادریان کردوە بە شایەت.

مودانی. خ. (خەلیل خەیاڵی) لە ژ2 دا لە ژێر سەردێڕی (پیرۆزناوە) دا کە مەبەستی (پیرۆزنامە) یە نوسیوێتی: "هەژمارا ئەوەلی ڕۆژناڤەی وە من خۆند، گەلەک پێ چاونور و دلخۆش بوم، صەد ئافەرین بێ غیرەت و هیمەتا وە... خودێ تەعالا عومرێ وە درێژ، هیمەتا وە زێدە بکا، هەون دزانن کو هیمەتا مێران چییان دبن تێن، حاجەت قسە کرن نیە، ئەدیبێ مەزنێ مە بنێر چ گوتیە." ئینجا یەکێ لە شیعرە نەتەوەییەکانی حاجی قادری کۆیی ئەنوسێ کە بەمە دەس پێ ئەکا:

| | |
|---|---|
| تا ڕێک نەکەون قەبیلی ئەکراد | هەروا دەبنە خەرابە ئاباد |
| ئەنواعی میلەل لە گەورە تا چوک | خەمڵیوە مەمالیکی وەکو بوک |
| هەر کوردن ئەگەرچی پاکی مەردن | پاماڵی زەمانە میسلی گوردن |
| هەر مانەوە بێ نەواو و مەزڵوم | وەک بومی خەرابەزاری مەشئوم |
| گەر باعیسی ئەم دەپرسی کامە | شەرتێکە کە بۆ هەمو تەمامە |
| ئەو شەرتە بە کوللی ئیتیفاقە | گەر مەرعەش و وانە، گەر عیراقە |

لە جێیەکی تری وتارەکەیدا نوسیوێتی:"رۆژناڤەی وە پیرۆز بێ. پیرۆزکرن لە سەر من فەرزە. ئەز فەرزا خۆ بە چەند خەبەری بێ سەر و بن ئەدا دکەم. ژ من عەرز ژ وە قبول. غایەتا، هێڤیا من ئەوە کو ڤێ وەسیلە خیتابەیا جەنابێ حاجی بنویسم، رەحمەتا خودێ لێ بێ بفکرن چ ... ریتیە. روحی وی بە فاتیحەک شا کەن..."

ئینجا شیعرەکەی حاجی ئەنوسێ کە ئەڵێ:

کێ دەڵێ کوردەکان بە ئیدراکن — بەسە ئەم نەقسە گوێ لە من ناکەن

...

لە رۆژی ئەوەل، لە بەندە و ئازاد — خزمەتی خەلقە قیسمەتی ئەکراد

...

ئینجا ئەنوسێ: "خودان فەزل و کەمال، قەدر و قیمەتا حاجی دزانە. حاجی عالیجەنابەکە کو چاڤی زەمانە ئەمسالی نەدیتیە. مە درێژ کر ئەم بێنە سەر مەقسەدا خۆ، ئەڤا خیتابەیا حاجی لە ژێر ریز دکەم."
لێرەدا شیعرە نەتەوەییە درێژەکەی حاجی ئەنوسێتەوە:

سلام اللە منی کل یوم — لە ئەسحابانی ساحیبی غیرەت و دین

...

چوار ملیۆنە کوردستان نفوسی — بە قسەی ئەهلی تەخمین کە نوسی

هەمویان شێری بێشەن، حاتەمی جود — لە شەڕدا کێوی جودی و بەحری مەحدود

وە لێکین فائیدەی چی هەرج و مەرجن — لە دەعوادا لە گەڵ یەکتر بە مەرجن

لە گوێی گا نوستوون، هەرچەندە شێرن — وەکو کەروێشکی چاو ئازا و کوێرن

...

کوڕێکی وا نەبو هەستێتە سەر پێ — بزانێ چۆنە هەرکەس کەوتە سەر رێ

بکا سەیری جەریدە و حاڵی میلەت — کتێبی تازە و تاریخی دەوڵەت

بزانێ تا چ قەوماوە لە ئەتراف — سەراپا ئاگرە ئەتراف و ئەکناف

ئەگەر کارێک نەکەن لەم بەینەدا زو — مەمالیک کاتەکی زانیت لە دەس چو

...

بە غەیری رۆمی و ئینگلیز و روسی — (بێ حەددن دەوڵەتان) ناویان بنوسی

لە جێی خۆیان هەلستاون بە غیرەت — لە دنیا نێوی خۆیان ناوە دەوڵەت

سەراپا ساحیبی سکە و سپاهن — وەکو جەم ساحیبی تەخت و کولاهن

لە تەدبیری ئومووری مڵکی خۆیان — شەریکن پینەدۆز و شاە و گاوان

لە هەر وەقتێ یەکێکی هاتە هاوار — لە جوتیار و شوان و ئەهلی بازار

لە جۆشین و لە نێشا مێشی هەنگن — بە من چی کافرن یا نە فەرەنگن

وەکو بیستومە بۆ دەفعی مەصائیب — ئەمە تەدبیری کورت و فکری صائیب

(لە دەشت و دێ) و ولایەت بینە ئەحباب — وەکو شەخصێکی واحید بن لە هەر باب

لە ئەولاتر وەها نۆش بێتە سەر دەی — لە بۆتان تا بەبان و سەرحەدی رەی

ببینە یەک لە تەعلیم و لە نوسین — جلوبەرگ و زبان و رەسم و ئایین

مودانی ئەنوسێ: رۆژنامەکەتان بە صورەتی سەلاحەدینی ئەیوبی خەملیوە، ئـەو سـەلاحەدینەی شـەش صەد ساڵە ناو و، مێرانی و، عەدالەتی ئەو تەواوی دنیای گرتوە و، عالەم باسـی کـردوە و ئـەکا، کـەچی کـورد ئاگای لەو قسەیە نیە، هۆی ئەوەیش نەزانی و نەخوێندەوارییە. ئەگەر ئێمە خوێندەوار بوینایە، زانا بوینایـە، شارەزای حاڵ و ئەحواڵی باووباپیرمان بوینایە، وەکو (گای بەش) لـە نـاو عالـەم دا لـە هـەمو شـت مـەحروم نەئەبوین. ناوی باووباپیر و، شێخ و مەلا و موئەلیفی ئێمە ون نەئەبو. لە هەمو لایەکەوە لە ژێر تانەی دۆسـت و دوژمن دا نەئەبون، وەکو خەڵک ئەمانیش جەوهەری خۆیان پیشـان ئـەدا. لێـرەدا دیسـان شـیعرێکی تـری حاجی قادر بە نمونە ئەهێنێتەوە کە ئەڵێ:

ئەگــەر کوردێــک قســەی بــابی نــەزانی موعەیــەن دایکــی حیــزە و بــابی زانــی

...

م. خ. (خەلیل خـەیاڵی) لـە ژ3 دا بـە ناونیشـانی (زمـان) وتـارێکی نوسـیوە پرۆژەیـەکی رۆشـنبیری نەتەوەیی پێشنیار کردوە، ئەڵێ:

"ئەمرۆ 3 صەد ملیۆن موسوڵمان هەیە هەمویان بە زمانی خۆیان ئەخوێنن و ئەنوسن. هیچ زیـانێکیش بۆ دینی خۆیان فەرز و تەصەور ناکەن. بۆ پێشکەوتنیان چی لازمە ئەوە ئیجرا ئەکەن، ئێمـەش لازمـە وەکـو ئەوان بکەین. لێرە بە دواوە بە زمانی خۆمان بخوێنین و بنوسـین. چەنـد فـەقێی کـوردان، غیرەتـی کـوردی بەوان دا پەیدا بو، هەستان جڤاتا هێڤی‌یان دامەزراند، پاشان رۆژنامەی رۆژی کوردیان دەرکرد. بە دڵ و گیان خەبات ئەکەن، لازمە ئێمەش ئاری ئەوان بکەین، ئەم ئاری کردنە فەرزە و واجیبـی لـە سـەر ئێمـە. بـێ ئـاری کردن لە دنیادا هیچ ناکرێ.

"ئەوی کوردە، عار و ناموس و غیرەتی کوردێتی تێدایە و، لە تانەی دۆست و دوژمن ئەقەهرێ و شەرم ئەکا، با ئاری ئەوان بکا. ئەم ئاری کردنە جۆراوجۆرە، هەندێک بە قەڵەمی خۆی، هەنـدێک بـە عیلمـی خـۆی، هەندێکی کە بە ماڵ. هەمو ئەوەش بۆ پیشەوە بردنی کوردانە...

"کورد ئەمرۆ موحتاجی چین ئێمە ئەوانە بلێین:

"1. بۆ زو خوێندن و نوسین حەرفێک.

"2. لە سەر تەرزێکی نوێ ئەلفبایەک.

"3. بۆ زانینی تەواوی زمانی کوردی قاموسێک.

"4. عیلمی حاڵێک.

"5. تاریخی باووباپیرانە کورد و عەنعەنەیان.

"6. وڵاتی کوردان و عادەت و تەبعی ئەوان و میقدار و ناوی عەشیرەتەکانیان.

"7. کتێبی حساب.

"8. بۆ زمانی کوردان صەرف و نەحوێک.

" 9. تەرجومەی حاڵی گەورەکانی کورد.

"10. ئەدەبیاتی کوردان و ناوی شاعیرەکانیان."

داوا لە خەڵک ئەکا کتێبی کوردی چی‌یان لـە لایـە و، مـەلا و فـەقێکان بـەیت و چیرۆکـی کـوردی کـۆ بکەنەوە و بۆیان بنێرن، تا چاپی بکەن.

خەلیل خەیاڵی (م. خ.) لە ژ3 و 4 دا لە (بەخت رەشی و مەحرومیا کوردان) دا ئەڵێ: "شێخ، مەلا، فەقێ، میر، سەرۆک و ریش سپی‌یەکانمان ئەمرۆ ئەزانن و هەستی پێ ئەکەن کە چوار دەوری ئێمـە ئـاگری گرتـوە، چاک و خراپمان ئەسوتێنێ، کەس بە هاوارمانەوە نایە رزگارمان بکا. با ئەوان رابـن دەسـت بدەنـە دەسـتی

یەک، خاوەنی لە ئێمە: بەخترەشان، دەربەدەران و مەحرومان بکەن و، لەو ئاگرە بێ ئامانــە خەلاسـمان بکـەن، ڕێگەی ڕزگاریمان نیشان بدەن، حوکمی ئایەتی کەریم (احسن کما احسن الله الیک) دەرهەقمان ئیجرا بکـەن. من گومان ناکەم کە گەورەکانی ئێمە غیرەت و هیمەتی خۆیان و ڕەحم و کەرەمی خۆیان لە ئێمە دریـخ بکـەن، ئێمە لەم زەلیلی‌یەدا جێ بهێڵن. باوەڕ ناکەم کە گەورەکانمان بۆ پێشەوەچونی ئێمە و بـۆ بـە مرۆڤبـونی ئێمـە هەرچی‌یان لە دەست بێ، بیدەنە دواوە." بەڵام بە گلەیی‌یەوە ئەڵێ: دڵی پڕ دەردی من ئەڵێ ئەگەر ئەوە ڕاسـت بوایە یەکێکیان بۆ خاتری خوا و نەبی ڕائەپەڕی خۆی لێ ئەکرد بە خاوەن و کوردی ئەخستە سـەر ڕێیـەک، هەتا مەحشەر ناوی لە سەرنامەی تارخدا ئەما. بۆ سەلماندنی بۆچونەکەی خۆی بەشـێ لـە دێباچەکـەی مـەم و زینی ئەحمەدی خانی بە شایەت ئەهێنێتەوە، ئەڵێ:

| | |
|---|---|
| کرمـــــــانج پـــــــــڕ کـــــــــەمالن | ئـــــەمما یــــــەتیم و بـــــێ مـــــەجالن |
| فـــــی الجملـــــە نــــەجاهیل و نــــەزانن | بـــــەلکو ســــەفیل و بـــــێ خــــودانن |
| گــــەردی هــــەبویا مـــە ژی خودانــــەک | عـــــالی کەرەمــــــەک، لەتیفـــە دانــــەک |
| عـــیلم و هونــــەر و کــــەمال و ئیزعـــان | شــــیعر و غــــەزەل و کیتـــاب و دیــــوان |

خانی لەم شیعرەیدا ناوی مەلای جزیری، عەلی حەریری و فەقێ تەیران ئەهێنێ. خەیاڵی ئەڵێ: "ئەمڕۆ لە ڕوی ئەرزدا چەند دەوڵەت و میللەت هەیە.."

محەمـەد سـاڵح بـەدرخان (م. س. ئـازیزی) لـە ژ2 دا لـە ژێـر سـەردێڕی (هشـیار بـن) چوارچێـوەی پرۆژەیەکی بۆ کاری ڕۆشنبیری نەتەوەیی کورد پێشنیار کردوە و ئەڵێ:

"ئەبێ باش بزانین کە ئەمڕۆ حاڵی ئێمە وەکو حاڵی نەخۆشێکە لە سەرەمەرگ دا بێ، دۆست چـاو بـە گریانە و دوژمن ڕو بە پێکەنین... هەرچی چاوی بریوەتە میراتی ئێمە یەکجار شاد و بە کەیفە، ئیتر ئێمـەش ئەبێ هەمو، زانا و نەزانای ئیمە هەمو، چاوی خۆیان بکەنەوە و دەس بدەنـە دەسـتی یـەکتری بـۆ سـەلامەتی کوردان تێ بکۆشن، وڵات لە تەهلوکە خەلاس بکەن، بۆ ئەوەی لەمەودوا ئێمەش لە بەردەم دۆست و دوژمـن دا سەری خۆمان بەرز بکەینەوە.

"ئەمڕۆ شەش ملیۆن کورد زیاتر هەیە... بەڵام سەد حەیف ناویان لە ناو میللەتان دا نایەتـە وتـن، بـۆ کوردێک چەند شەرم ئەبێ وەکو ناوی گەلان دێ، کەس ناڵێ کوردیش هەیە، چونکە کورد نە خاوەنی عـیلم و مەعریفەتن، بۆیە ئیشی دنیا و سیاسەت نازانن، نە خاوەنی مەوجودیەتێکی بە هێـزن، لـە بـەر ئـەوە کەسـیش ئەوان ناناسێ.

"ئەمڕۆ مێژویەکی کوردان نیە، کورد نازانن بەر لە ئیستا خاوەنی چـی بـون و، چ خزمـەتێکی نـەوعی خۆیان و ئیسلامەتی‌یان کردوە.

"ئەمڕۆ غەزەتەیەکی کوردی نیە، ناتوانن خۆیان لە تەعەدا، لە حیلە و دەسیسەی سیاسەت خۆیان محافەزە بکەن. خوێندن و نوسینی کرمانجی نیە. تا ئیستا کەسێک کتێبێکی صەرف و نەحوی تەدوین نەکردوە.

"ئەمڕۆ هیچ قەومێ نەماوە کە خاوەنی پازدە بیست جەریدە نەبێ. بەم جەریدانە حـاڵی خۆیـان بـەیان ئەکەن، دەردی خۆیان تەشریح ئەکەن، مەتلەبێکیان هەبێ داوای ئەکەن. جەریدە بۆ هـەر قـەومێ ئەبێتـە زمـان، هەر قەومێ بێ جەریدە بێ وەکو مرۆڤێکی لاڵە، نەئەتوانێ دەردی خۆی بڵێ و نەئەزانێ کـە حـاڵ و مـەوقیعی خۆی چیە.

"لێرە گەنجانی کورد کۆبونەوە و جەمعیەتێکی کوردانیان دامەزرانـدوە و ئیسـتا دەسـتیان کـردوە بـە دەرکردنی جەریدە. ئەم جەریدەیە باسی عیلم و مەعریفەت ئەکا، ناتوانێ باسی شتی تر بکا، چونکە لە قانونی

دەوڵەت دا مادەیەک هەیە ئەڵێ هەرکەسێ جەریدەی سیاسی دەر بکا، ئەبی 500 زێڕ ئەمانەت دابنێ، هەرچی کوردە عاجزە لە تەداروکی ئەو پارەیە، لە بەر ئەوە ئیستا بەم جەریدەی رۆژی کوردە ئیکتیفایان کردوە."

م. سالح بەدرخان لە ژ3 دا لە وتارێک دا بە ناونیشانی (بەری شیر قەلەم) باسی گرنگی عیلم و مەعریفەت و خراپی نەزانی ئەکا کە چۆن کورد مێژوی خۆیان نازانن، زانا و گەورە پیاوان و مێژونوس و شاعیرەکانی خۆیان ناناسن و، بە درێژی باسی گرنگی رۆژنامە بۆ کورد ئەکا. وتارەکەی بە دێباچەکەی (مەم و زین) ی ئەحمەدی خانی کۆتایی پێ ئەهێنێ، کە یەکێکە لە شاکارەکانی ئەدەبی کوردایەتی.

لە ژ4 دا (کوردێ) لە وتاری (ئەصل و نەسلی کورد) ا نوسیوێتی:

"کورد بەر لە نبوەت هەبون و مەوجود بون. کورد لە ئەقوامی ئاریەن. لە پاش بەعسەت فیسمێ لە ئەوان وەکو ئێمە، وەکو ئەفغان، وەکو ئێران، دینی ئیسلامیان قبوڵ کرد. وەلحەمدولیلا بوینە ئیسلام. قیسمێ لە ئەوان وەکو رۆم، وەکو ئەرمەن، وەکو ئەڵمان، لە سەر رێگەی جەهالەتا مانەوە. چ رۆم، چ ئەرمەن، چ ئەڵمان، چ پۆرتوکیز، ئەمانە هەمو لە عیرقی کوردن.

"دیقەت فەرمون: خواردنمان، لیباسمان، عەنعەناتمان وەکو عەجەمە، لە بەر ئیختیلات لە گەڵ بەغدا جوزئی فەرقمان هەیە. فەقەت بە دیقەت ئەگەر تەعمیق بکرێت عەینی عەجەم حائیزی حەرەکات و سەکەناتین. عەجەم لە وەقتی خۆیا مەزهەبی سونی بو، فەقەت شاە ئیسماعیلی صەفەوی بە فکری خۆی ئەم مەزهەبی شیعەیەی ئیحداس کرد و مەقسەدی تەوحیدی قەومی عەجەم بو، وە ئیللا ئەساسەن مەزهەبمان یەک بو.

"ئەڵمان و زبانی ئەڵمان زۆر موشابەهەتی بە کورد هەیە. ئیمرۆ ئەگەر کوردێ بچێ بۆ ئەڵمان لە زەرفی دو مانگا فێری زبانی ئەڵمان ئەبێ، فەقەت ئەگەر تورکێ، یا عەرەبێ بچێ بۆ فێربونی زبانی ئالمان متەوەقیفە سەر ساڵێک، چونکە زبانی ئاڵمان وەک زبانی کوردی گرانە. حەتا لە ئەڵمانیا دائیر بە عەنعەنە و تاریخی کورد زۆر کیتاب تەئلیف کراوە، ئینشائەڵا ئەگەر قلوبی کورد بە واسیتەی معاوەنەتی ئەربابی حەمیەت نەختێ بێ بە ساحیبی پارە، تەبیعی ئەم کیتابانە تەرجومە ئەکا بە کوردی و رەوانەی کوردستانی ئەکا، ئەو وەقتە تەحقیق ئەکا کە کورد چەند زەکی و چەند ئازان. ئیستا کە مادام کە ئیدیعا ئەکەین و دەڵێین ئەڵمان لە عیرقی کوردە، ئەسبابی چیە ئەو ئەوەندە تەرەقی کرد و ئێمە بە جاهیلی ماینەوە؟ ئەسبابی مەعلومە، چونکە ئەوان بەر لە هەمو چشت نیفاقیان رەفع کرد، دەستیان دایە دەستی یەکتری، معاوەنەتی یەکتریان کرد، مەکتەبیان گوشاد کرد، مەعاریفیان تەعمیم کرد، لە پاشانا مەیلیان دا بە صنعەت. کە ئیمرۆ ئەڵمان لە صنعەتا ئەوەندە موتەرەقیە کە ئینسان حەیرانی ئەفعالی ئەو ئەبێ. مەسەلەن تەیارە، باڵۆن دروست ئەکا بە قەدەر مەسافەی نیوەی عاسمان بڵند ئەبێ و کەشفی هەمو کائینات ئەکا. عەمەلەی ئەو فابریقە مانگی بە سەد لیرە ئیش ئەکەن، چونکە چشتی وەک تەیارە دروست ئەکەن. ئەڵبەتە ئەگەر ئەو عەمەلە، فەعەلە، دو سەد لیرە تەلەب بکا کەمە.

"ئێمە حەق ئەلئینصاف ئیقرار بکەین: بە غەیری نیفاق، بە غەیری یەک لە عەلەیهی یەک، چ خدمەتێکی میلەتی کوردمان کرد، کە ئیمرۆ چاومان لەمە بێ کە ئێمە ببین بە مومەسیل، ئەوان ببن بە مومەسیل، چ ویجدانێ قبوڵی ئەکا، بە خولیای مەبعوسی هەمو شەو لە ناو جیگەی خۆمان بتلێینەوە. کەی چوار کەسمان جەمع بون و تەدبیری لە ئیسلاحی ئەم قەومە بەدبەختە کرد؟ کەی پارەدار بۆ تەعمیمی مەعاریف ئیعانەی دا؟ ئەمانە هەمو دەلالەت لە سەر ئەوە ئەکەن کە ئێمە بە خیلافی قسەی پێغەمبەر (صلعم) ئەکەین، چونکە ئەو ئەفەرموێ (حب الوطن من الایمان). ئەگەر ئێمە حوبی وەتەنمان بوایە بۆچی ئەوەندە سەرگەردان ئەبوین؟ یەکێ لە کوردان، کە ئیمرۆ بە واسیتەی کوردەوە بۆتە ساحیبی موڵک و عەقار لە بەر خاتری ئەمە کە چل پارە نەدا بە نوسخەی رۆژی کورد، خیتاب بە یەکێ لە ئەعزای جەمعیەتی فەرمو بوی: رۆڵە من کورد نیم. دیقەت

فەرمون چەند پیاوی منەوەرمان هەیە (شێخ ئەوا گۆی هونەری بردەوە، کەشکەک سڵاوات) براگەل حاڵی ئێمە وەهایە ئەبێ ئێمە کە ئەم نەوعە چشتانەمان هاتە گوێ دەرحاڵ ئانەن ئیبا لەم نەوعە کەسانە کەین. تا قامی قیامەت ئێمەش ئەو لە خۆمان عەد نەکەین.

"وە موتەنەبیهـ بی خۆمان سەعی بۆ خۆمان کەین. ڕێگە نەدەین کە ئەم نانکورانە لە ماڵ و حاڵی ئێمە ئیستیفادە کا. بە خودا قەسەم ئەخۆم کە ئەم زاتە کە فەرمو بوی (ڕۆڵە من کوردی نازانم) ئیمڕۆ بە غەیری کوردی زبانی تر نازانێ، چونکە لە هەمو عیلم و عیرفان مەحروم و بێ بەهرەیە. خودا ئیسلاحی حالمان کا."

لە ژ4 دا بەنی ئەردەڵانی (لە تاریکی بۆ روناکی) نوسیوێتی: "شەوی درێژی بێ رەحم لە موحیتی ئێمەدا ئەمەندەی دەوام کرد، ئەمەندە ئومێدی مەحو کردەوە کە دڵی کۆمەڵی کورد، ئاوێنەی قەلبی هەمو، ژەنگی هێنا. هەمو کۆمەڵێ، بە دەرەجەی خۆی، لە تاریخی ئینسانیەت دا جێگایەکی بەرکەوت، تەئمینی مانی خۆی کرد. ئێمە هێشتا لە ناو تاریکیدا نەجاتمان نەبو. شاخ و داخی موحیتی کورد هێشتا وەکو مژی زەمانی سریانە و کلدانی لە سەر ماوە. دار و بەردی کوردستان هێشتا خەریکی سوجدە بردنە بۆ رابوردو."

لە شوێنێکی تردا ئەڵێ: "کە خەبەری بوەوە (مەبەستی کوردە) دەوراودەوری بە نوری عیلم و مەعریفەت رونەو بۆتەوە. وەزعیەت کە وای لێ هات، بۆ مانی خۆمان ئەمەندە بکۆشین، ئەمەندە هەوڵ بدەین، کە عەنعەنەی چەن هەزار ساڵەی کۆمەڵ نەخەینە بەر پێی بێگانە، نەبین بە ژێردەستەی ئەم و ئەو. شوبهەی تیا نیە کە هیچ کوردێ ئەم زیلەتە قبوڵ ناکات ..."

ئینجا ئەڵێ:

"ئینسان بە سایەی قسە کردنیەوە لە حەیوان جوێ ئەکرێتەوە، ئەگەر قسەی نەبێت لە حەیوان جوێ نابێتەوە. زمانی کوردی بەم شیرینی و نازکیەیە کە هەیە، نە قەواعیدێکی هەیە و نە کتێبێ. کۆمەڵی کورد بەم زۆریە و بەم کۆنیەوە کە هەیە تاریخێکی چاکی نیە. بەم سەبەبەوە کورد مەجبور ئەبێ وەقتی خۆی حەصر بکات بۆ فارسی، تورکی، زمانی کە و، لە زمانی خۆی مەحروم ئەبێ. ئەگەر هەوڵ بدرێت قەواعیدێک بهێنرێتە ناو، نە مەجبوریەتی فێربونی زمانێکی کە ئەبێت و نە کوردیەکەیشی لە ناو ئەچێت. بە زمانێ جوزئی منداڵ فێری خوێندن و نوسین ئەبێت..."

تا ئەڵێ:

"... بۆ ئەم مەسئەلە فیداکارانی کورد جەمعیەتێکمان کردۆتەوە بە ناوی (جەمعیەتی هێوی) بۆ بڵاو کردنەوەی مەعاریف، ئەوە کە لە دەست بێت کۆتایی ناکات فەقەت موحتاجە بە سێ چشت:

"1. هیمەت و بەرەکەتی مەشایەخ و عولەما و تەشویقیان.

"2. ئەشعار، ئەدەبیات، تاریخ، زەربولمەسەل.

"3. ئیعانە."

م. خ. لە ژ4 دا رو ئەکاتە گەورەکانی کورد (ژ مەزنی کوردان را) دوای ئەوەی گلەییەکی زۆریان لێ ئەکا و ئەڵێ:

"لە کوێیە ئالی ئەیوب و مەروانی کوردی، ئالی عەناز؟ لە کوێیە والی سەنەندوج و بەگزادەی رەواندز؟ لە کوێیە میری جزیر و بۆتان؟ لە کوێیە حاکمی سۆران و بابان؟ سەری خۆتان هەڵبڕن، حاڵی کوردان ببینن چۆن لە دەست کافری دور لە ئیمان، ئەو وڵاتەی کە ئێوە بە ماڵی خۆتان و بە گیانی خۆتان خاوەنیتان ئەکرد و، لە رێی موسوڵمانیدا خوێنیان ئەڕشت، مەدرەسەیان ئەکردەوە، ئەمڕۆ بێ خاوەن ماوەتەوە. ئەو کوردەی کە ئێوە لە گیانی خۆتان زیاتر خۆشتان ئەویستن ئەمڕۆ زەلیلە، لە بن پێیان دایە..."

لـە وتـارێکی تـری دا م. خ. بـە ناونیشـانی (گلـی و گـازن) بـە زمـانی گوندنشـینەکانەوە گلـەیی لـە دانیشتوانی شار ئەکا کە خۆیان بە زلتر ئەزانن و یارمەتییان نادەن لە نەزانی دەرچن.

لە ژ3 دا هەر م. خ. لە (تەفسیری شەریف) دا باس لە یەککگرتن ئەکا.

لە ژ3 دا سلێمانی عەبدولکەریم لە (بە فریا کەوین: معاوەنەت) دا باسی یاریدەدانی یەکتری ئەکا.

## 2. 2. نوێکردنەوەی سیستەمی پەروەردە

سلێمانی عەبدولکەریم لـە ژێـر سـەرناوی (منـداڵ بـۆچ زو فێـری خوێنـدن نـابێ) دا داوای گـۆڕین و نوێکردنەوەی سیستەمی خوێندن و پرۆگرامەکانی فێربون ئەکا و ئەنوسێ:

"لە شاری کوردە بەدبەختەکاندا منداڵ بۆچی زو فێری خوێنـدن نـابێ و منـداڵی فـەڕەنگ بـۆچی بـە شەش بە حەوت ڕۆژ فێری خوێندن و نوسین دەبێ؟ منداڵی ئێمە لـە بـەر چـی لـە مەکتـەب را دەکـا و مـەیلی تەحسیلی نیە؟ ئەم دەردە توشی حەمو لایە بوە. دەوای ئەم دەردە ئاسـانە کـەس نایکـات... دیقـەت فـەرمون جەهالەت چەند خراپە. ئینسان بە مەحزی ئەمە کە داخلی مەکتەب بێت وە یا نیسـبەت بـە مزگـەوت پەیـدا کـا نابێ بە عالم. بەدبەخت فەقێ لە هەورامانەوە شەدی ریحال دەکا دێت بۆ تەحسیلی علوم، مـەلای ئـەو مزگەوتـە ئەوەل ئەمر دەکا: جامی بخوێنە! فەقێ چەند ساڵ لە گەڵ ڕەد و بەدەلی عصام الدین و عبدالغفور و عبـدالحکیم و محرم ئەفەندیدا مەشغول دەبێ، نیهایەت ئەوەندە فێر دەبێ کە (دالی زید) بە چی (بۆرە) و (رائی عمـر) بـە چی (منصوبە) و (غلام بکر) بە چی (مکسورە)..

".. فەقێ دەبێ بە مەلا فەقەت مەحرومە لە حەدیس، بێ بەهرەیە لـە تەفسـیر، مـەعنای شـیعری عـەرەبی نازانێ، لە عیلمی تەبابەت بێگانەیە، لە ئیدارەی مەعیشەت عاجزە. یەعنی بە غەیری ئیمامی ئەمەلێکی نیە..."

لە شوێنێکی تری وتارەکەیدا نوسیویێتی:

"بۆ خاتری خودا ئەگەر هەزار کەس ماهی یەک بێچو بدا دەکاتە هـەزار بێچـو. بـەم هـەزار بێچـوە چ مودەڕیس، چ تاریخ شناس، موعەلیمی جوغرافیا پەیدا دەبێ، ڕۆژی دو ساعەت لە یەک جێدا چەند فـەقێ هەیـە جەمعیان دەکا و بە جەمعی ئەم دەرسە موفیدانـە بـە ئـەوان دەڵـێن. حەیفـە بـرای دینمـان نـەزانن مـەعنای حکومەت چیە، مەجلیسی مەبعوسان وەزیفەی چیە، دەوڵەت چیە و ئەگـەر موتلەقـە بـێ بـۆچی خراپـە، ئەگـەر مەشروتە بێ بۆچی چاکە؟ نەزافەت چیە، ئەگەر ئینسان محافەزەی نەزافـەت بکـا دەبـێ نەتیجـەی چلـۆن بـێ؟ فائیدەی تاریخ و جوغرافیا چیە؟ بۆچ دەبێ ئینسان لە عیلمی حقوق، لە عیلمی ئیقتیساد شارەزا بێ، سـەمەرەی چیە؟ قانون چیە، بە عەمەلی چی دێت؟ عیلمی زەراعەت بـۆچی چاکـە؟ ئەمانـە یـەک یـەک خەزنەیـە، کیمیایـە. ئیمڕۆ پیاوێک کە موتەلیع بێ بە سەر ئەمانە تەئمینی ئیـدارەیخۆی دەکـات. بـرای دینـی لـە ئـەو ئیسـتیفادە دەکات. فکری ئیسلام منەوەر دەبێ. موحتاجی گاور نابێ. موتەمەدین دەبێ. دەژی نائیلی ڕەفاهـ و سـەعادەت دەبێ..."

لە شوێنێکی کەدا نوسیویێتی:

"بێینەوە سەر بەحسی منالەکان مەیل ناکا بە تەحسیل. حەقی هەیە چونکـە لـە مەکتـەب و لـە حـوجرە فەلەقە هەیە، لێدان هەیە، شەق و زللە هەیە..."

موبانی خ. (خەلیل خەیالی) لە ژ2 دا لە وتارێک دا کە بە کرمانجی لە ژێر سـەرناوی (زمـان و نـەزانیا کوردان) نوسیویێتی ئەڵێ:

"چەندی ورد ئەبمەوە لەوە تێ ناگەم مەلاکانی ئێمە، خوێندەوارەکانی ئێمـە، بـۆچی قسـەی خۆیـان بـە کوردی ئەکەن و لە مەدرەسەکان دا دەرس کە ئەخوێنن بە کوردی مەعنای لێ ئەدەنـەوە، وەختـێ کـە پێویسـت

بێ کاغەزەکانی خۆیان و بەڵگەکانیان بە عەرەبی یا بە فارسی یا بە تورکی ئەنوسن و بە کوردی ناینوسن؟... موتڵەق ئەبێ لەمەدا حیکمەتێک، سرێک، هەبێ کە ئێمە پێی نازانین. ئەگەر مرۆڤێ بە خێری دایک و باوکی خۆی ئەو حیکمەتە، ئەو سرە، بە ئێمە بڵێ، ئێمەیش بە منەتێکی گەورەی ئەزانین و لە سەر سەری خۆمانی دائەنێن و، لەو وردبونەوەیەش رزگار ئەبین.

"دەربارەی ئەمە هەرچی بڵێن و هەر هۆیەک نیشان بدەن بەرەدایی‌یە، بەرگەی هیچ شتێ ناگرێ، چونکە ئەمرۆ لە دنیادا ئەوەندە میللەت و قەوم هەیە (کە ئێمە هیچ کامێکیان بە باشی ناناسین) حەد و حسابی نیە بە زمانی خۆیان ئەخوێنن و ئەنوسن، کتێب دائەنێن و، لە مەکتەب و مەدرەسەی خۆیان دا تەعلیمی زارۆکی خۆیان ئەکەن...

"ئەمرۆ ئینگلیز، فرانسز، ئەڵمان، مسقۆف، ئیتالیا، بۆ هەر کوێ بچن، مەکتەب ئەکەنەوە، زمانی خۆیانیان فێر ئەکەن، سەبەبی ئەوە هەرچی‌یەک بێت بێت، لەوەدا فائیدەیەکیان بۆ میلەتی خۆیان بینیوە، ئەگەر فائیدەیان تێدا نەبینیایە، بۆچی ئەوەندە مەسرەفیان ئەکرد و ئەوەندە خۆیان زەحمەت ئەدا."

ئینجا ئەپرسێ:

"ئەوان عاقڵن یان ئێمە؟ لە وەڵام دا ئەڵێ:

"ئەوە موحەققەقە کە ئەوان لە ئێمە عاقڵترن و لە ئێمە شارەزاترن. سەد پیاوی ناوداری ئێمە لە بەر دەم زارۆیەکی حەوت ساڵەی ئەواندا ناوێرێ دەمی خۆی بکاتەوە و قسەیەک بکا. سەبەبی ئەوەش وەکو رۆژی رون ئاشکرایە، ئەوان زانان و ئێمە نەزانین...

دیسان ئەپرسێ:

"ئاخۆ ئەوان مرۆڤن و ئێمە مرۆڤ نین؟ لە وەڵام دا ئەڵێ:

"بەڵێ ئێمەش مرۆڤین، بەڵام دەرحەقی ئەو دەردانە بێ غیرەت و بێ هیمەتین... شێخ و مەلاکانمان بۆ ئێمە، نەخوازەڵا بۆ کچ و کورەکانمان، بۆ شوان و گاوانەکانمان، چ فکرێ ئەکەن و، ئێمە لەم نەزانیە چۆن خەلاس ئەکەن؟ حوکمی (طلب العلم فريضة على كل مسلم ومسلمة) چۆن جێ بە جێ ئەکەن؟ ئێستا ئەمانەوێ بزانین بۆ زو خوێندن و نوسینی کوردی فکری شێخ و مەلاکانمان چیە؟

بۆ سەلماندنی قسەکانی (قوتبی دەوران) شێخ عوبەیدوڵای شەمزینی و کاک ئەحمەدی شێخ و شێخ محەمەدی فەرسافی، بە نمونە ئەهێنێتەوە کە کتێبیان بۆ کورد بە کوردی داناوە. ئینجا تکا لە شێخ عەبدولقادری شەمزینی ئەکا کە خوێندنگەی کوردی بکاتەوە و، داوا لە مەلاکانی موسڵ، دیاربەکر، بتلیس، وان، ئەرزرۆم، بەغداد، سنە، سلێمانی، کەرکوک، خەرپەت، ئەکا بیرورای خۆیان لەو بارەیەوە دەربڕن.

موبانی خ. وتارەکەی بە شیعرێکی حاجی قادر کۆتایی پێ دێنێ کە ئەڵێ:

هەر کوردە لە بەینی کوللی میلەت | بێ بەهرە لە خوێندن و کیتابەت
بێگانە بە تەرجومەی زبانی | ئەسراری کتێبی خەلقی زانی
یەکسەر عولەما درشت و وردی | نایخوێننەوە دو حەرفی کوردی
ئوستادی خەتن لەم سیانە | وەک گەییە زبانی خۆی نەزانە

...

لە ژ2 دا (خەبات و خوێندن)

لە ژ3 دا (زمان)

لە ژ4 دا (تەعلیم و تەربیە)

### 2. 3. گەشە پێدانی کشتوکاڵ

لە ژ1 ی ڕۆژی کورد دا دیاربەکری نەجدەت لە ژێر سەرناوی (جوتکاری) دا بانگی کورد ئەکا بۆ ئەوەی بایەخ بە کشتوکاڵ بدەن، چاو لە فەرەنگستان بکەن بۆ فێربونی شێوەی نوێی کشتوکاڵ و مەکینە بە کار بهێنن و، منالەکانیان بخەنە بەر خوێندنی کشتوکاڵ.

لە ژ3 دا لە ژێر ناونیشانی (عەردی ئێمە) دا باسی زۆری ئەرز و ئاوی کوردستان و خێر و بەرەکەت، بەڵام دواکەوتویی و هەژاریی کوردستان ئەکا و، داوای پێشخستنی ئەکا.

### 2. 4. گەشەپێدانی تیجارەت

لە ژ1 دا سلێمانی عەبدولکەریم لە وتارێکیدا بە ناونیشانی (تاڵ و شیرین) نوسیوێتی:

"تو خودا با هەمو بە یەک دەفعە ئیقراری گوناحی خۆمان بکەین و بڵێین: بە خودا بێ ئیتیفاق و پڕ لە نیفاق و شیقاقین. هەمو کەس نائیل بو بە نیعەمی مەعاریف. بو بە وەستای مەعاریف. لە ناو تاریکی جەهل دا نەجاتی بو. بە نوری مەعریفەت سەراپا شەعشەعەدار بو. عالەم و ئادەم لە ئەو موستەفید بون. بە واسیتەی عیلم و فنون و مەعریفەت حائیزی هەمو ئەوسافی حەسەنە بو هەم بە ساحیبی دنیا بو. چونکە لە سایەی قوەی حاکمەوە، چونکە لە بەر حال و ئیستیقبالی، چونکە لە بەری بەهرەی عیلم موتەلیع بو، لە سەبری ئەوزاع و ئەحواڵدا دەزانێ تیجارەت چلۆن دەکرێ. دەزانێ ماڵ چ وەقت تەرەقی و تەنەزول دەکا. دەزانێ ئەگەر ماڵێک بفرۆشێت بە پارەی ئەو ماڵە چی دەکڕێت. غایە و مەقسەدی خۆی بە سەهل دەزانێ لە بەر ئەوە زو بە زو دەبێ بە ساحێبی میلیۆن. وەک لای ئێمە وەقتی خۆی حەسر ناکاتە سەر چشتێ. مەسەلەن هەزار لیرەی هەیە ساڵ دوازدە ماهـ بەو هەزار لیرە موجەڕەد توتن ناکڕێت و لە زەرفی یەک ساڵ دا بە قازانجی ئەو ماڵە ئیکتیفا ناکا، چونکە عیلمەن، فەنەن، عورفەن، مەبنای تیجارەت دەزانێ سێ چشتە. ئەگەر ئەو سێ چشتە نەبێ هەرگیز تیجارەت قابیل نابێ:

"ئەوەل ئیعتیبارە. ئەگەر ئیعتیبار نەبێ تیجارەت مەفقودە. چونکە زۆر کەس هەیە لە ئوموری تیجارەت بە غایەت ماهیرە فەقەت سەرمایەی نیە. زۆر کەس ساحیب پارەیە فەقەت لە ئوموری تیجارەت هیچ نازانێ. ئەگەر پارەی ئەم بە ئەو نەدەین ئەم سەروەتە بێ عەفوا، ئەم پارەیە بێ سەمەرە لە ناودا دەڕوا چ جەمعیەتی بەشەریە، چ حکومەت موستەفید نابێ. ئەم نەوعی چشتانە موتەعەلیقە بە هەیئەتی عومیە.

"دوەم ئەمنیەتە. ئەگەر تەریق ئەگەر مەملەکەت ئەمین و ئومان نەبێ، هەر کەس لە تەداروکی نانی شەو عاجز دەبێ. ئەو هەیئەتە کە ئیمڕۆ جەمعە بە سەرگەردانی بە پەرێشانی ئیمراری وەقت دەکا. نیهایەت مەجبور دەبێ هیجرەت بکا لە وەتەن. لە کەسوکار مەحروم دەبێ هەر ڕۆژە بە لایە ئیلتیجا دەکا. لە بەر حەسرەت و غەمی دنیا دەبێ ساحیبی سیل و دیق.

"سێیەم سورعەتە. لە ئوموری تیجارەت دا مەسئەلەی سورعەت مەوقیعی بلندە. ئیمڕۆ دو توجار دەڕۆن بۆ مسقۆف. پیاسەی ماڵ وەک فسولی ئەربەعە متەنەویعە ئان بە ئان تەبەدول دەکا. "

ئینجا دێتە سەر باسی پێکهێنانی کۆمپانیای هاوبەش بە سەرمایەی تێکەڵاوی دەوڵەمەندەکان و ئەنوسێ:

"زۆر چشت هەیە کە بە سەرمایەی یەک شەخس ممکن نابێ. مەسەلەن ترەموای مجەڕەد بە پارەی من نایێتە وجود، دەبێ ئەهالی متەفق بێ مشتەرەکەن دروستی بکا. شەریکەت ئەنواعی هەیە، مەسەلەن (قۆلکتێف) کە عەینەن وەک شەرکەتی مفاوەزە وایە. مەسەلەن من چەند ماڵ و موڵکم هەیە، زەیدیش چەند ماڵ و موڵکی هەیە، هەمو دەیکەین بە سەرمایە، ماڵ دەکڕین و دەفرۆشین. دوەم (قومانديت) کە عەینەن لە قۆلکتێف

تەشەعوب دەکا، مەسەلەن من و زەید چەند ماڵمان هەیە، لە ئەو ماڵ و موڵکە خەلیتین. بەکر و خالیدیش دێن ئەوانیش یەکێ سەد لیرە سەرمایە دائەنێن دەبن بە شەریکی ئێمە، فەقەت فەرق هەیە لە بەینی ئێمەو ئەواندا، ئەوان مجەڕەد بە قەدەری سەرمایەی خۆیان کە دوسەد لیرەیە موتەزەڕیر و مونتەفیع دەبن، ئێمە بە غەیری سەرمایەی نەقد لە ماڵدا مشتەرەکین، مەسەلەن ئەگەر من ئیفلاسم کرد و سەرمایەم بۆ ئەو قەرزە کافی نەبو، موڵکم دەفرۆشن لە پارەی ئەو موڵکە قەرزم ئەدا دەکرێت. سێیەم (ئەنۆنیم) کە ئەم شەرکەتە لە هەمو لایە تەعمیمی کردوە، مەسەلەن ترەموای دروست دەکەن لە کەرکوکەوە تا سلێمانی، موحتاجە بە سەدهەزار لیرە، سەنەداتی حیسە دەکەنە دەرەوە، هەر حیسەی یەک لیرە، سەدهەزار حیسە دەکا، مشتەری بۆ ئەم حیسانە لە چینەوە تا ماچین تالب زهور دەکا و ئیشتراکی دەکا، لە زەرفی دو ساڵدا تەماشا دەکەیت کە ترەموای دروست کرا، با فکری خۆمان سەرفی ئیختیلاتی و مەشغوڵی مەجلیس و دیوەخانان نەبین، خۆمان ئیسڵاح بکەین، خۆمان تەعمیر بکەین، وەئیلا مەحو دەبین"

هەر سلێمانی عەبدولکەریم لە ژ4 دا لە وتارێکی کەدا کە بە ناونیشانی (هەڵاتنی ڕۆژی ئیقبال) نوسیوێتی، داوا لە پارەدارەکانی کورد ئەکا یەکبگرن و، کۆمپانیای بازرگانی دابمەزرێنن و، بە سەرمایەی تایبەتی خۆیان پرۆژەی ئابوری و پەروەردەیی جێبەجێ بکەن کە هەم قازانجی خۆیانی تێدایە و هەم قازانجی وڵات و، ئەڵێ:

"بەڵێ ئەربابی حەمیەت هاتنە جۆش، موتەفیکران هاتنە خرۆش، بە قوەی عیلم و عیرفان، عەهد و پەیمانیان بەست و وتیان دەبێ وەک خەڵق ئێمەش محافەزەی خۆمان بکەین و بڵێین بەڵێ ئێمەش قەومی کوردین. پایەدار بن کوردی موئەسیسانی جەمعیەت و مەکتەبی ئیبتیدائی کوردی بەغدا، خۆیان کرد بە مەنبەعی شوکری کورد..."

لە شوێنێکی کەدا ئەڵێ:

"ئیمڕۆ فەرز بکەین کە یەگانە چارەی تەرەقی ئیسلام ڕەبتی مەملەکەتی ئیسلامە بە ئیسلام. ڕەبتی مەمالیک مەعلومە کە بە واسیتەی نەقلیە وەک شەمەندوفێر دێتە وجود فەقەت حکومەت بێ پارەیە، لیاقەت و قابلیەتی دروستکردنی ئەو شەمەندوفێرەی نیە، ئەهالی بۆ ئەم خدمەتە موقەدەسە و هەم بۆ تەوسیعی تیجارەتی خۆیان ئەگەر ئەوی ئیقتیداری مالیەی بێ، هەم لە بەر حەمیەتی وەتەنی هەم بۆ تەوسیعی تیجارەتی دێن جەمع ئەبن، شیرکەتێ عەقد ئەکەن، مەسەلەن ئەو شەمەندوفێرە بە دو ملیۆن لیرە قابیلە بێتە وجود. ئەوانەش سەرمایەی ئەو شیرکەتە ئەکەن بە دو ملیۆن و تەوزیعی ئەکەن بە سەر پارەدارا. نیهایەت دو ملیۆن لیرە جەمع ئەکەن بەو پارەیە ئەو شەمەندوفێرە دروست ئەکەن. زاتی ئەسحابی ئەو سەرمایە بە قەدەر ئەسلی سەرمایەکەی خۆی لە نەفعی ئەو شەمەندوفێرە مونتەفیع دەبێ. قیاس لە سەر ئەمە تەعمیمی مەعاریفیش وەهایە. مەسەلەن چەند کەسانێ جەمع ئەبن مەکتەبێ بە ڕوخسەتی حکومەت گوشاد ئەکەن. بە پارەی خۆیان موعەلیمان جەلب ئەکەن. فەرز بکەین کە مەسرەفی ئەم مەکتەبە سەد لیرە بێ، واریداتی ئەم مەکتەبە بە گوێرەی ئەو مەسرەفە دێتە وجود. مەسەلەن ئعلان دەکرێت کە ئەم مەکتەبە لەیلییە، نانی، ئەلبیسەی ئەو تەلەبە کە داخلی ئەم مەکتەبە دەبێ هەموی لە سەر مەکتەب ئەبێ، بە شەرتێ کە ئەو تەلەبە ساڵی چوار سەد یا پێنج سەد تارانی ئەبێ بدا. تەماشا دەکەی لە زەرفی دو ساڵا ئەو مەکتەبە ئیلا ماشەڵا واریدات ئەدا لە عەینی زەمانا ئەو کەسانە کە موئەسیسی ئەو مەکتەبە بون ئستیفادە ئەکەن، چونکە ئەمەش نەوعە تیجارەتێکە..." ئینجا خوێندنگە ئەهلیەکانی ئەستەموڵ بە نمونە ئەهێنێتەوە.

هەر لەم وتارەدا باسی نەزانینی ڕێوشوێنی بەڕێوەبەرایەتی (ئیدارە) ئەکا و هۆیەکەی ئەگێڕێتەوە بۆ (بێ عیلمی) و، باسی هەندێ لە عالمەکانی کوردستان ئەکا و ئەڵێ:

"... ئەگەر بە ناحیە مودیری تەعین بکرێ میلەت بە قورا ئەباتە خوارەوە چونکە ئیدارە چیە نازانێ. خۆلاسە چارەی نەجاتی ئێمە مەعاریفە. مەعاریفیش بە قسەی وشک نابێ. مەلاکان هیمەت بکەن ئەوەلەن، نەحو و صەرف بە کوردی دروست بکەن. سانیەن، هەمو ئیتیفاق بکەین و خەلقی ئیقناع بکەین کە لە هەمو قەزایەک، لە هەمو ناحیەیەک، مەکتەبی ئیبتیدائی و روشدی گوشاد بکەین و ئەو نەحو و صەرفە بە ئەولادی وەتەن تەدریس بکەین. لە پاش ئەمە کە مەعاریفمان نەختێ ئیسلاح بو، تەشەبوس بە صەنایع بکەین. ئەوی ئەبێتە مەبعوس واجیبە لە سەری ئەوەلەن مەکتەبێکی صەنایع گوشاد بکا چونکە کوردستان ئەگەر بڵێم لە صنعەت مەحرومە موبالەغە ناکەم..."

## 2. 5. بابەتی ئەدەبی

### 2. 5. 1. چیرۆک

فوئاد تەمۆ لە ژ1 دا چیرۆکێکی نوسیوە.

لە ژ2 دا دریژەی پێ داوە. ماوێتی بەڵام تەواوی نەکردوە. ئەوی لەم چیرۆکەدا سەرنج رائەکێشێ پاکی و پاراوی زمانەکەیەتی.

لە ژ4 دا بابی رەوشۆ (سالح بەدرخان) یش چیرۆکێکی بڵاوکردۆتەوە. ئەم چیرۆکانە بە کرمانجی نوسراون وەکو سەرەتای چیرۆکنوسی لە ئەدەبی کوردیدا نرخی مێژویی‌یان هەیە.

### 2. 5. 2. شیعر

لە ژ1 دا چەند شیعرێکی نالی لە ژێر ناونیشانی (دیوانی شاعیری شەهیر حەزرەتی نالی) و شیعرێکی سیاسی‌ی فازیل موخلیس لە عەشیرەتی ملی لە ژێر سەردێری (خوێندن و خەبات) دا و.

لە ژ2 دا شیعرێکی شێخ رەزا لە ستایشی کاک ئەحمەدی شێخدا و.

لە ژ4 دا زێوەر لە سلێمانی‌یەوە شیعرێکی بۆ ناردون کە ستایشی رۆژی کوردە.

هەر لە ژ4 دا ئەکرەم ناوێک یش بە کرمانجی سەرو شیعرێکی بە ناونیشانی (بەری و نها) بڵاوکردۆتەوە. عەبدوڵڵا زەنگەنە لە رۆژی کورد، ئامادەکردن و لێکۆڵینەوەی عەبدوڵڵا زەنگەنە، بنکەی ژین، سلێمانی، 2005، ل91 دا گومان ئەکا ئەم ئەکرەم ناوە، ئەکرەم جەمیل پاشا بێ.

خەلیل خەیاڵی لە ناو نوسینەکانی خۆیدا چەردەیەکی باشی لە شیعرە نەتەوەیی‌یەکانی حاجی قادر و، سالح بەدرخان یش بەشێکی باشی لە دیباچەکەی مەم و زین بڵاوکردۆتەوە.

## 3. لە روی هونەری رۆژنامەوانی‌یەوە

### 3. 1. زمانەکەی

بەشە کوردی‌یەکەی رۆژی کورد وتار و شیعری بە هەردو لەهجەی کرمانجی سەرو و کرمانجی‌ی خوارو تێدایە. پێ ئەچێ زۆری وتارەکانی کە بە لەهجەی خوارو نوسراون (سلێمانی عەبدولکەریم) نوسیبنی. بەڵام چەندین نوسەر بەشدار بون لە نوسینی وتارەکانی کە بە کرمانجی سەرو نوسراون. سەرەڕای ئەوەی وشەی بێگانەی زۆریان تێکەڵاوە، بەگشتی زمانەکەیان رەوانە، بەڵام ئەوانەی بە کرمانجی سەرو نوسراون زمانەکەیان پاراوتر و کەمتر وشەی بێگانەیان تێدایە، هەڵەی چاپ هەندێکیانی شێواندوە.

### 3. 2. روخسارەکەی

ڕۆژی کورد بە پیتی عەرەبی و بە ڕێنوسی فارسی نوسراوە، ئەگەرچی خۆی جۆرێ لە ڕێنوسی تـازەی داهێناوە و، لە ژ2 و 3 دا بڵاوی کردۆتەوە بۆ ئەوەی خەڵک بە کاری بهێنن، بەڵام خۆیان کاریان پێ نەکردوە و بڵاویش نەبۆتەوە.

هەر 4 ژمارە قەوارەیان وەکو یەکە و، 23.517.3 x سم ە. هەر ژمارەیەکیش جگە لە بەرگەکـەی 32 لاپەڕەیە. هەمو لاپەڕەکانی 2 ستونی تێدا نوسراوە. سەردێڕی بابەتەکان بە پیتی گـەورەتر نوسـراون و، لـە هەندێ ژمارەیدا لە سەروی باسەکاندا یا لە کۆتاییدا نەخش و نیگار هەیە.

ل1- 18 ی ژ1 ی تورکی و ل19 - 32 کوردی و،
ل1- 20 ی ژ2 ی تورکی و ل21 - 32 کوردی و،
ل1- 15 ژ3 ی تورکی و ل16- 32 کوردی و
ل1- 16 ژ4 ی تورکی و ل17 - 32 کوردییە.
سەربەرگی ژ1 ی بە وێنەی سەلاحەدینی ئەیوبی و،
سەربەرگی ژ2 ی بە وێنەی کەریم خانی زەند و،
سەربەرگی ژ3 ی بە وێنەی حسێن کەنعان پاشای بەدرخان و
سەربەرگی ژ4 ی بە وێنەی شاری ئەرزرۆم رازێنراوەتەوە.

ئەو بابەتانەی بڵاوی کردونەتەوە بە زۆری وتارن، لە گەڵ هەندێ شیعر و چیرۆک. ریپۆرتـاجی تـێدا نیە. هەواڵی تێدا دەگمەنە. یەکێ لە هەواڵەکانی لە ژ2 دا بە تـورکی و بـە کـوردی بـڵاوی کردۆتـەوە هـەواڵی کۆچی دوایی حسێن کەنعان پاشای بەدرخانییە.

### 3. 3. بڵاوبونەوەی

نوســەرەکانی ڕۆژی کــورد تێکــەڵاون لــە کــوردی ناوچــە جیاوازەکــانی کوردســتان. لــە بــەر ئــەوە جەریدەکەیان لە سەرانسەری کوردستاندا، بە هەردو بەشی عوسمانی و قاجارییەوە، بڵاوبۆتەوە. بۆ نمونە:

- سەرداری موکری لەو نامەیەدا کە لە موکریانی کوردستانی ئێرانەوە بۆ هەتاوی کوردی نـاردوە لـە ئەستەموڵ، باس ئەکا کە ڕۆژی کوردی پێ گەیشتوە.
- زێوەر شیعرێکی بۆ ناردون، ئەوانیش بە ناونیشانی (لە سلێمانییەوە هاتوە) بڵاویان کردۆتەوە.

### 4. جێگەی لە ڕۆژنامەوانیی کوردیدا

ڕۆژی کورد وەکو یەکێ لە پێشەنگەکانی ڕۆژنامەوانی لە چەند لایەنــەوە جێگەیــەکی تایبــەتی هەیــە لــە مێژوی ڕۆژنامەوانیی کوردیدا:

یەکەم،

وەکو هۆیەکی گرنگی بڵاوکردنەوەی هۆشی نەتەوەیی.

دوەم،

بۆ تێگەیشتن لە جۆری بیرکردنەوەی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیریی هەڵبژاردەی کوردی ئەو قۆناغە.

سێیەم،

وەکو سەرچاوەیەکی باوەڕپێکراو بۆ زانینی چالاکیـەکانی یەکـەمین ڕێکخـراوی خوێنـدکارێ کـورد (حێڤاتا هێڤی فەقێ کوردان).

## 8. 4. هەتاوی کورد



صاحب امتیاز
ومدیر مسئول :
بابانه عبدالعزیز

آثار نه نوسری نادریتو
عدد : ۱

# هتاوكرد

تاریخ تأسیسی :
غرۀ ذی القعده
۱۳۳۱

درج اولنمیان آثار اعاده اولنمز
ژمار : ۱

۲۳ ذی القعده سنه ۱۳۳۱ شمدیلك آیده بر نشر اولونور ۱۱ تشرین اول سنه ۱۳۲۹



بابان امراسندن عبدالرحمن پاشا




آبونه بدلی :
سنه‌لکی پوسته اجرتیله
برابر ۳۰ ، آلتی آیلغی
۱۷ غروشدر .

# هتاو کرد

سالی تی حق پوستی ۳۰
شش مه ۱۷ غروشه

عدد : ۱۰ | صاحب امتیاز ومدیر مسئول: بابانه عبدالعزیز | ژمار : ۱۰

۹ شعبان ۱۳۳۲ | شیمدیلك اون بش گونده برنشر اولنور | ۲۰ حزیران ۱۳۳۰


تلو مشایخ عظامندن و کرد مبعوثین کرامندن شیخ محمد نصرالدین افندی حضرتلری

زی شیخان کران تلو وزی مبعوثان کردان حضرت شیخ محمد نصرالدین افندی

## 8. 4. هەتاوی کورد

### 1. هەتاوی کورد

### 1. 1. دەرچونی

(هتاو کرد: هەتاوی کورد) لە دوای راگرتنی (روژ کـرد: رۆژی کـورد) دەرچـوە. ئـەمیش وەکـو رۆژی کورد لە لایەن (جڤاتا هێڤی فەقێی کوردان: جەمعیەتی هێڤی تەلەبەی کوردان) دەرکراوە.

صاحیبی ئیمتیاز و مدیری مەسئول بابان عەبدولعەزیز (عەبدولعەزیز بابان) بوە.

تا ئیستا ژمارەکانی 1 و 2 و 3 و 4- 5 کە لە یەک بەرگ دا دەرچون و، ژ10 ی دۆزراوەتەوە.

ژ1 ی لە 23 ی زیلقەعیدەی 1331 ی کۆچی، 11 ی تشرینی ئەوەلی 1329 ی رۆمی، بەرامبـەر 24 ی تشیرینی یەکەمی 1913 لە چاپخانەی (رەسملی کیتاب) و،

ژ2 ی لە 4 ی موحەڕەمی 1332 ی کۆچی، 21 ی تشرینی سانی 1329 ی رۆمـی، بەرامبـەر 22 ی تشرینی دوەمی 1913 لە چاپخانەی (رەسملی کیتاب) و،

ژ4- 5 ی بە یەکەوە لـە 27 ی جیمـادی ئاخـەری 1332 کـۆچی، 10 ی مایسـی 1330 ی رۆمـی، بەرامبەر 23 ی مایسی 1914 لە چاپخانەی (نەجمی ئیستیقبال) و،

ژ10 یش لە 9 ی شـەعبانی 1332 ی کـۆچی، 20 ی حـوزەیرانی 1330 ی رۆمـی، بەرامبـەر 3 ی تەموزی 1914 لە چاپخانەی (نەجمی ئیستیقبال) چاپ کراوە.

لە ژ10 دا کە هەتاوی کورد یەکەم ساڵی تەمەنی تەواو کردوە بـەم جـۆرە نوسـیوێتی: "رۆژناڤـەی مـە سال عەوەلی یکی دقەدێنە

"رند دەرکەتنی سالی تێ ل سەر هیمەت و غیرەتێ کوردا مایە.

"ل رویی دنێ تەنێ رۆژناوەکی کوردا هەیە، ل رەغبەت کرن، ئابونە بون ل سەر حمو کـوردارا فـەرزە. ئابونمان سالی چو، حەوجا کوبونا بنیرن سالی تـێ ژ رۆکـی بـەری قیمـەتی وی بشـێنن. ل هـەڤ ئـانین ژ خودێ، رەغبەت ژ حەمیەتی کوردا، خەبات ژ مە جوانی کوردا." واتە:

"رۆژنامەکەمان ساڵی یەکەمی تێ ئەپەڕێنێ

"باش دەرچونی ساڵی دێ لە سەر هیمەت و غیرەتی کوردان ماوە.

"لە روی دنیا کورد تەنیا رۆژنامەیەکی هەیە، برەو پێدان و ئابونە بونی لە سەر هـەمو کـوردان فـەرزە. ئابونەی ساڵی رابوردو، پێویست ئەکا کۆبۆنی بنێرن. ساڵی دێ لە پێشەوە نرخەکەی بنێرن. بە جێ هێنان لە خودا، برەو پێ دان لە حەمییەتی کوردان، خەبات لە ئێمەی لاوانی کورد."

هەر لە هەمان ژمارەدا لە ژێر سەردێڕی (ئیعتیزار) دا بە کرمانجی نوسیوێتی: "لە بـەر هـەنێک سـەبەب رۆژنامەکەمان دوا کەوت، هیوای عەفو لە خوێنەرەکانمان ئەکەین و لە ساڵی دوەمیەوە باش دەرکردنی ..."

تا ئیستا ئاگاداریەک لە بەر دەس دا نیە کە ئاخۆ دوای ئەم ژمارەیـەی، دەیـەمین ژمـارەی، (هـەتاوی کورد) راوەستاوە یان بەردەوام بوە.

### 1. 2. ئامانجی

(هەتاوی کورد) هەمان ئامانجی رۆژی کوردی هەبوە. بڵاوکراوەیەکی بازرگانی نـەبوە بـۆ دەسـکەوتی دارایی و بۆ قازانجی مادی دەرکرا بـێ، بـەڵکو خـاوەنی پـەیامی نەتـەوەیی بـوە. هـەوڵی داوە بـۆ هوشـیار کردنەوەی کۆمەڵانی خەڵک و، هاندانیان بۆ خوێندن و فێربون، بـۆ بازرگـانی و کشـتوکاڵ و پیشەسـازی و هونەر، بۆ نوسینەوەی مێژوی کورد و، ئەدەب، بۆ رێکخستنی فەرهەنگ و رێنوس و رێزمانی کوردی.

### 1. 3. نوسەرەکانی

هەتاوی کورد بە تورکیی عوسمانی و بە هەردو لەهجەی کوردی نوسراوە.

نوسەرانی بەشی تورکی:

د. عەبدوڵا جەودەت، کەرکوکلی نەجمەدین، مەولان زادە رەفعـەت، بـاب نـاجو، م. خ. (خـەلیل خـەیاڵی)، خەرپوتلی ح. ب. تبلیسی شەهاب مالدور، سلێمان ئاصەف

نوسەرانی بەشی کوردی:

م. خ. (خەلیل خەیاڵی)، زەهاوی زادە ا. م، بەنی ئەردەڵانی ا م، محەمەد نورەدین ماردینی، زێوەر.

پێم وایە (زەهاوی زادە ا. م.) و (بەنی ئەردەڵانی ا. م.) نازناوی (محەمەدی میهـری) یـە کـە کـوردێکی سنەیی بوە. لە ئەستەموڵ قانونی خوێندوە، پاشـان بۆتـە پـارێزەر و رۆژنامـەوان. دوای برانـەوەی یەکـەمین جەنگی جیهانی، لە ئەستەموڵ ئیمتیازی گۆڤاری (کوردستان) ی وەرگرتوە.

### 1. 4. سەرچاوەی دارایی

سـەرچاوەی دارایـی هـەتاوی کـورد وەکـو هـەمو بڵاوکـراوە کوردیـەکانی پـێش خـۆی سـەرمایەی دەرهێنەرەکانی و، ئابونەکانی بوە.

لە ژ2 دا نوسیوێتی:

(ساڵی هەفت دە قرۆشە، شەش مەهـ بە نەهـ قرۆشە) و دانەی بە 40 پارە بوە.

بەڵام لە ژ4- 5 دا لە ژێر سەرناوی (شەرایتی ئیشتیرک) دا نوسیوێتی:

(ساڵی 30 قرۆشە، شەش مەهـ 17 قرۆشە). بەم پێیە ئابونەکەیان زیاد کـردوە، رەنگـە ئـەم گۆڕینـە پێوەندی بە زیادکردنی دەرچونیەوە بوبێ.

هەتاوی کورد هەندێ (ئیعلان) ی بڵاوکردۆتەوە.

## 2. بابەتە کوردیەکانی

### 2. 1. بڵاوکردنەوەی هوشیاریی نەتەوەیی

بەنی ئەردەڵانی ا. م. لە وتارێکدا بە ناونیشانی (خەفتن بەسە لەمە زیاتر - بۆ سنەییەکان) بە لەهجەی سنە نوسیویێتی:

"فرمێسکی چاوم وەک لافاوی بەهار ئەپەڕێ، بە سەر دەموچاوما تێتە خوارەو. دڵم وەختە بتۆقێ. رەگ و ریشەم هاتگەسە لەرزە. بە ئاواتم جگێ زوتر گیانم دەرچێ. تاوێ زوتر لە ناو ئەم ئاگرا دەرچم.

"وەلێ هەی هاوار! هێشتا تەمامە بمێنم. هێشتا گەرەکمە منیش لەم دنیا ئاواتێکم هەس بیوەمە سەر. تاریکی بەرچاوم لاچێ. من کوردم، ئەرێ کوردم موسوڵمانم. ئەشێ وەک ئەمانە کۆمەڵ خۆیان گەیانگەسە لای ژورگە مەدەنیەت، تەکامول، منیش بیگەیێنم. چاوم بکەفێ بە (دار الفنون) ی کورد، بە شەمەندوفەری کورد، بە بەرزۆبونە کورد، (بیگرە جەریمەی بکە!) نەمێنێ، لە برسا مناڵمان نەفرۆشگێ، لە هەژاریا کوچەگەل ئەسەموڵ پڕ نەوێ لە بۆیەچی، لە حەماڵ. لە جیای پەنجا هەزار حەماڵ و بۆیەچی پانصەد قوتاویمان لە مەرکەز مەدەنیەتا بوێ، بخوێنێ، صنعەت فێر بوێ. وڵات خۆمان هەزار ئەوەنەی تر ئینسانی تیا جێگە ئەوێتۆ، ئێمە ... فرەمان لە وڵاتگەلا ئەخولێتۆ، لە ناو سپیا ئەپرتوکێ.

"جێگەیەک وەک سنە بەو گەورەییە، قوتاوخانەیەکی تیا نیە بە تەرزی جەدید، خودای تەعالا جێگەی بەو جۆرە قەشەنگ و ئاودار و میوەداری بە ئێمە داگە، بە کەسی نەداگە، کەچی نە ماکینەێ، نە فابریقەیەکی تیا نیە. ئەم گشت مەلا و شیخگەلمانە وەک داری وشک دانیشتگن، ناکەن بێژن بەم ئەهالیە هەژارە خودا وای فەرموگە، پێغەمبەر وای فەرموگە، ئێوە بەمجۆرە دامەنیشن، پول گردۆ بکەن، ماکینە بێرنە وڵاتەکەی خۆتان، وێڵ ئەملاو ئەولا مەون. ئەوەنە هەناسەم دا دوکەڵ کەفتە ناو زکم.

"هەر جۆگە و جێگەێکی کەوا سور و و سوێر بێ

"جێی جۆششی گریانی منە و خوێنە ڕژاوە

"مەلا و شێخەکان ئێمە لە مزگەوتگەلا وەعزیان بدایە بۆ جاهیلەکان، بیانوتایە: ماڵ یەکتری خواردن حەرامە، بڕۆن بخوێنن، فەن فێر بون، صنعەت فێر بون، ئیمرۆ ترس ئەوە نەئەما (بەیاخ گاور) بێتە ناو شار موسوڵمان، باخصوص کورد وایە پێ نەئەهات. ئیسەیچە مەلا و شێخ بنێرن لە ئەسەموڵا موعەلیم موسوڵمان بوەنە وڵات خۆیان، مناڵ بنێرنە ئەسەموڵ بخوێنن، صنعەت فێر بون. مەتبەعە بسێنن، زوان خۆیان ئیسلاح بکەن. با لەمە زیاتر نەکەفینە خوار گشت میلەتێکەوە.

ئێمە لە سەرمان وتنە!"

لە ژ1 دا شیعرێکی زێوەر کە لە سلێمانییەوە پێی گەیشتوە بە ناونیشانی (زەمانی هوشیاریە) بڵاوکردۆتەوە. زێوەر ئەڵێ:

خوابی خەرگوشی هەتا کەی؟ وەعدەی بێدارییە
دوشمنی خۆت و مناڵت ئەژدەهای بێکارییە
وا بە جێ ماوی لە خێڵ، ناگەیتێ کوێستانی موراد
کوردە سادەی غیرەتێ! غیرەت نەوەی دینداریە
چاو لە موچە و تورەکانەی میرەی دائیم ئەی زەلام!
مایەی دنیا و دینت کەسب و صنعەتکارییە
سەد غرامافۆن فیدای هۆهۆی جوتیارێ بکە
جقەی شاهی بە پەنجەی خدمەتی جوتیارییە

...
بەسیە شۆربا خواردنی ناو تەکیەکان و خانەقا
ڕو لە دەرگاهی تەوەکول، بێ سەبەب بێ عارییە
...
مەغریبی باری گەیاندە مەنزڵی ئەمن و ئەمان
تۆش لە نێو قوڕدا چەقیوی، عەیش و نۆشت زارییە

لە ژ3 دا دیسان زێوەر لە سلێمانییەوە شیعرێکی تری بە ناونیشانی (بۆ گەورەکانی کورد) بۆ ناردون، تێیدا ئەڵێ:

دنیا کە مەقامێکە دەبێ ڕو لە فەنا بێ
سا ئەو کەسە زۆر مەردە کە مەشغوڵی سەخا بێ
...
ئەملاکە بەسە، قەدرە بەسە، حورمەتە بەستە
با نەوبەتی جەلبی نەزەری خەلقی خودا بێ
کەوتوینەتە ژێر باری جەهل و عەتالەت
با هیمەتی ئێوە سەبەبی دەفعی بەڵا بێ
میلەت هەمو، بێ جوت و بە بێ قوت و ڕەشوڕوت
ماکینەیی بۆ بێنە هەتا کامی ڕەوا بێ
سوختە، هەمویان سوختن و بێ نان و کیتابن
بابی (نصر) با بە دەستی ئێوە کرا بێ
...
خێرت کە لە بۆ میلەت و دەوڵەت نیە، غافڵ!
نەفعی چیە ئەستونی دەوارت لە سەما بێ

لە ژ4- 5 دا لە بەشە تورکییەکەیدا (کرد طلبه هیوی جمعیتی بیاننامەسی) و بابەتێکی لە سەر لقی لۆزانی جڤاتا هێڤی بڵاوکردۆتەوە. باسی خوێندنی زانکۆ و بەشەکانی و خەرجی لە زانکۆکانی سویسرا ئەکا. لە بەشی کوردیدا بەیانەکەی جڤاتا هێڤی بە هەردو لەهجە بڵاوکردۆتەوە. لە بەر گرنگی ناوەڕۆکی بەیانەکە لێرەدا هەموی ئەنوسمەوە:

"بەیاننامەی جەمعیەتی تەلەبەی هێڤی کورد

"لە زەمانی قەدیمەوە کورد بە شەرەف ژیاوە و، هیچ کوردێ نیە بە شەرەفی پێشو موفتەخیر نەبێ، ئەوەندە هەیە ئینسان ئیفتیخار بە میلەت کردنی و خۆشەویستنی میلەتی کیفایەت ناکا. لە سەر ئینسان لازمە خۆشەویستنی بە فیعل ئیسپات کا. بەڵێ کورد لە پێش دا زۆر پیاوی گەورەی پێ گەیانوە بە ماڵ و بە ڕۆح خدمەتی دین و دەوڵەتی خۆی کردوە. ئەمما لە گەڵ ئەمەش لە ناو میلەتانی ئیسلام دا لە دوایی ماوە. کورد ڕۆژ بە ڕۆژ تەدەنی دەکا و یەواش یەواش ئەو قودرەت و مەهابەتی پێشوی مەحو ئەبێتەوە و، دێتە حاڵێکی وا خدمەتی ئیسلامێتی پێ ناکرێ. حەمو ئیقراری ئەو حەقیقەتە بکەین: کورد بە عەکسی میلەتانی کەوە، یەعنی هەمو میلەتان ڕویان لە تەرەقییە، کورد ڕوی لە تەدەنییە. قابیلی ئینکار نیە چەند ساڵ لەمەوپێش مەلای چاترمان هەبو لە ئیستە. ئەو حاڵە ئیسپاتی ئەوە ئەکا کە کورد دائیمەن خەتوەئەندازی تەدەنییە. ئەمڕۆ دەمی

هەرچی کەس بکەیەوە ئەڵێ کورد وەحشیە. واقیعەن ئەم ئیسنادە ناحەقە. مەعـەمافیهی لـەم زەمـانی تەرەقیـیـە میلەتێ کە حەز بکا لە دائیرەی ناموسا بێ..... سەعی بکا، لە تەرەقی حازر نصیبەدار بێ. زاتـەن ئیسـلامیەت ئامیرە بۆ تەحصیلی عیلم، بۆ سەعی کردنی تەرەقی. زۆری کوردان لە بەر بێ تەحصـیلی ئـەرکانی ئیسـلامیەت بە تەواوەتی نازانن. وەرن براکان گشت پێکەوە بڵێین جاهیلین و، بـە ئـەم جەهالەتـە موحەقـەق بـزانن زەرە دێنن بۆ ئیسلامەتی. ئەمە بزانین ئەمڕۆ بۆ مودافەعەی ئیسلامیەتی تەنها سـیلاح فائیـدە نـادا، وەقتـێ فائیـدی ئەدا لە گەڵ عیلم و مەعریفەت، صنعەت و تیجارەت بێ. ئەمڕۆ حەمو میلەتێ لە جیهەتی صنعەت و تیجـارەت و زەراعەت و فەن تەرەقی کردوە. ئێمە بۆ گەینە میلەتانی کە لازمە شەو و ڕۆژ سەعی بکەین. ئەگەر بـۆ ڕەفعـی جەهالەتمان هیمەت نەکەین، لێمان موحەققەق بێ عاقیبەتمان وەخیمە.

"ئەم نوقتەیە لازمە لە دیقەت دوری نەکـەین و بـە ئـەو گوێرەیـە سـەعی بکـەین. شـەبابی کـورد ئـەم نوقتەیەی دەرک کرد و، بە ئەو گوێرەیە دەسی کـردە سـەعی کـردن. حـەمو میلـەتێ لـە پـێش دا بـۆ تـەرەقی میلەتیان جەمعیەتیان کردوە و بە ئەو سایەوە تەرەقییان کردوە. ئێمەش بە موسـاعەدەی حکومـەت، بـە نـاوی (جەمعیەتی تەلەبەی هێڤی کورد) جەمعیەتێکمان تەشکیل کـرد. دو سـاڵە زۆر بـە زەحمـەت ئـەم جەمعیەتـەمان ئیدامە کرد و، مەقسەدی ئەم جەمعیەتە ئەوەیە کە عەرزتان ئەکەم:

- سەعی کردن بۆ تەدوین کردنی لیسان و ئەدەبیاتی کورد.
- لە کوردستان مەکتەب و مەدرەسە کردنەوە.
- بە مناڵی فەقیری کورد تەحصیلی عیلم و صنعەت و بیانخاتە مەکتەب.
- لە کوردستان جامیە، تەکیە، مەدرەسە، مەکتەب، ئیتامخانە، خەستەخانە تەئسیس کردن.
- خۆلاسە سەعی کردن بۆ عیلم و صنعەتی کوردان.
- "سەعی لە ئێمە، تۆفیق لە خوا.

"براکانم! موندەرەجاتی مادەکـان زۆر بـە ئەهمیـەتن، چونکـو حـەمو سـاڵ تەلەبەیـەکی زۆر دێـت بـۆ ئەستەنبوڵ ... ئەو بێچارانە ئیستراحەتیان چاک نابێ. لە ئەستەنبوڵ، لـە مەملەکـەتانی کـەش تەلەبـەی کـورد زۆرە، چونکو یەکتری ناناسین، معاوەنەتی یەکتری ناکەن. لە بەر ئەوە زۆر دوچاری مەشەققەت ئەبن. بینـا لـە سەر ئەمە تەحصیلیان چاک نابێ. لە بەر ئەوە جەمعیەت مەشغوڵی یەکتری ناسینی تەلەبەی کورد ئەبێ. حـەمو میلەتێ لیسانێکی هەیە. بەو لیسانە قسە ئەکا، ئەنوسێ. کورد لە پێش دا بۆ نوسین و بۆ قسە کـردن لیسـانی هەبو، مەعەلتەئەسوف ئیستە ئەو لیسانەی لە فکرەوە چوە، مەگەر لە خاریجی مەملەکەت چەنـد دێـیـە مـاوە بـە لیسانی کوردی قسە بکا، ئەو قسانەش لە دائیرەی قەواعید نیە. لەم عەسرە بە لیسـانێکی غەڵـەت هـیچ نایەتـە وجود.

"لە بەر ئەوە جەمعیەت سەعی بۆ جەمع و تەبعی لیسانی کوردی ئەکا.

"لە ئەوەڵەوە گوتوبومان سەبەبی سەفالەتی کورد جەهلە، لە بەر ئەوە جەمعیەت مەکتەب بۆ منـاڵی کـورد ئەکاتەوە. خۆلاسە جەمعیەتمان بە تەمایە کورد لە جەهالەت قورتار بکا. لە زوڵمەتەوە بۆ نوریـان ببـا. غایـەی ئێمە ئەمەیە تەرەقی کردن بە کورد. واصیل بون بەو غایە زۆر زەحمەت نیـە. ئـەمما تـەوەقوفی بەسـتوە سـەر فیداکاری کوردان. حەتا ئیستا نەبینراوە خیتابی میلەتی خۆیان بکەن، ئێمە ئەوا خیتابی ئێـوە ئەکـەین: ئـەی عولەما و مەشایەخ و ئومەرای کورد! مەعروزاتمان ئێوە لە ئێمە چاتری ئەزانن. بینا لە سەر ئەمە ئێمە جورئەت ناکەین ڕێگە پیشانی ئێوە بدەین. عولەمای کورد ئەمڕۆ وەزیفەیەکی دینیە و میلیەیان هەیە، کـە ئـەو نیفـاق و شیقاقە لە ناو کوردایە هەڵی بگرن (سید القوم خادمهم) ڕەئیسی قەوم ئەوەیە کە خدمـەتی میلـەتی خـۆی بکـا. (گوسفند از برای چوبان نیست/بلکە چوبان از برای خدمت اوست) عولـەما بـە مـەزمونی ئەمـە عەمـەل بکـا،

کوردی مەزڵوم لەم حاڵە قورتار ئەبێ. ئەی عولەما و ئومەرا دۆغری بڵێین: موقەدەراتی میلـەتی کـورد لـە دەس ئێوەیە، معاوەنەت کردنی کورد لە موقتەزای نەجابەت و فەزیلەتتانـە. ئەگـەر ئێـوە حـەز بکـەن کـورد قورتـار ئەکەن. ئەوە ساحەیەکی واسیع هەیە بۆ سەعی کـردن بـۆ کـورد. ئـەوە جەمعیـەتێکی حـازر هەیـە کـە نـاوی جەمعیەتی تەلەبەی هێڤی کوردە. ئێکە خەلاسی کورد تەوەقوفی بەستوە سەر حەمیەتی ئێـوە. ئەگـەر تەنـەزولی مەکتوب نوسین ئەکەن سەری زەرفەکە بەم نەوعە بنوسن:

"استانبولده

"شهزاده باشنده کرد طلبه هیوی جمعیتی"

لە ژ1 دا محەمەد نورەدین ماردینی لە وتارێکی درێـژدا بـە ناونیشـانی (هـەرە دور وەرە خـۆش)، کـە پەندێکی کۆنە، کورد هان ئەدا واز لە خو و رەوشـتی خـراپ بهێـنن، واز لـە تـالان و راووروت بهێـنن و، بـۆ تەرەقی و تەعالی خۆیان جەهد بکەن و، ئەڵێ:

"ئەمڕۆ ئەگەر لە گوندی ئێوە مەکتەب هەبوایـە نەئەگەیشـتن بـەم حاڵـە. دوەم، ئێـوە پێویسـتیتان بـە زەراعەت و جوت و تەوسیعی عەمارەت و ئاواکردنەوەی ئەرازی و، سێیەم، ئاویتنی عیناد و تەعەسوب و نیفاق و هجوم و غارەت و تالانکردنی یەکتری..." داوا ئەکا هەم بۆ دنیای خۆیـان و هـەم بـۆ ئاخیرەتیـان سـەعی بکەن و هێرش ئەکاتە سەر (صۆفی غەیرە صافی) کە بۆ ساختەکاری و حیلەبازی خۆیان کردۆتە صۆفی.

لە ژ2 دا م. خ. لە ژێر سەرناوی (دەردی کوردان) دا نوسیوێتی:

"نازانم لە بەر چیە؟ لە دنیادا چەندە میلەت هەیە هەمو بـۆ پێشـەوە چـون و رۆژ بـە رۆژ بـۆ پێشـەوە ئەچن. لە نـاو ئەوانـەدا کـوردی رەبـەنی بەلـەنگاز بـە تـەنیا، سـەرەڕای مێرانـی و جـوامێری و غیـرەت، بـە پاشکەوتویی ماونەوە و رۆژ بە رۆژ بۆ پاشەوە ئەچن.

"پێم وایە کە هەر میلەتە لە وەختی خۆیدا هوشیار بۆتەوە، موحتاجی قەومەکەی خـۆی بینیـوە، زو بـە زو لە چارەی گەڕاوە، هەرچی لە دەستی هاتبێ کردویەتی و ئەیکا، کورد ... ماوە کە هیچ جارێ هوشیار بـون و پێشکەوتنی نەهێناوە بە بیری خۆیدا.

"ئەگەر هوشیاری و پێشکەوتنی بە بیری خۆدا بهێنایە، تا ئیستا وەکـو میلـەتانی تـر خـاوەنی زمـانی خۆی ئەبو، لە سەرەتاوە بە زمانی خۆی کتێبی دائەنا، بە زمانی خۆی ئەیخوێند و ئەینوسی.

"هەمو دنیا ئەزانێ کە قەومی بێ زمان وەکو مرۆڤێکی کەڕ و لاڵ ناتوانێ هیچ بڵـێ. ئەگـەر مـەلا و فەقێی کوردان ئەو غیرەتەی کە لە زمانی غەریبان دا کردویانە و ئەیکـەن، صـەدیەکی ئـەوەیان دەرحـەقی زمانی کوردی بکردایە، ئەمڕۆ لە ناو خەلقیدا بێ زمان و بێ مەعاریف نەئەبوین، هـەمو کـەس تانـەی لـێ نەئەدایـن.

"کورد لە بەر بێ زمان و خوێندن و نوسین ئەوەندە بە نەزانی ماوەتەوە کە میلەتی خۆی، باووبـاپیری خۆی، جنسی خۆی، وڵاتی خۆی نازانێ. مەلاکانیان شیرەتان لەوان ناکەن. دائیمەن بە دوای خراپی یەکتریدا ئەگەڕێن. چاویان دنیا و حاڵی دنیا نابینێ. نەزان ئەوە خـۆی نەزانـە، زاناکانیشـیان لـە زمـانی خۆیـان بـێ خەبەرن. لایان وایە کە زمانی هەمو میلەتانی عالەم لە ئاسمانەوە هاتوە، هی ئێمە بە تەنیا لە ئەرز دەرهاتوە. لە کاتێک دا زمانەکەی ئێمە لە گشت زمانی عالەم چاکترە و بە رەحـەتی دێتـە نوسـین و خوێنـدن. ئـەدەبیاتمان هەیە بەڵام بە هۆی نەزانی ئێمەوە بێ رەواج ماوە..."

بۆ سەلماندنی قسەکانی دو شیعری مەلای جزیری نوسیوە. لە کۆتـایی شـیعرەکانی مـەلای جزیـریدا نوسیوێتی:

"مەلای جزیری کە مەشهورە و خاوەن ناوە دیوانێکی گەورەی هەیە لە دیوانی حافزی شیرازی چاکترە. فەقەت فائیدەی چی کە کورد کوێرن نابینن دائیمەن چاویان لە ماڵی خەلقیە..."

لێرەدا شیعرەکەی حاجی قادر دەربارەی مەلای جزیری و عەلی حەریری و ئەحمەدی خانی و فەقێ تەیران ئەنوسێ. ئینجا ئەڵێ:

"ئەم بەیتی دەها پاک بخوێنن و جارێک لە فەساحەتی بنۆڕن، لە گەڵ زمانی خەلقی قیاسی بکەن، ئەگەر کەموکوڕییەکی تێدایە نیشانمان بدەن، ئەوسا چیتان ئەوێ بیڵێن ... خاوەنێتی لە زمان و بەیت و شاعیر و مەلای خۆتان بکەن، لە ناو خەلقیدا خۆتان لەم بێ غیرەتییە خەلاص بکەن. زمان تەرجومانی جەوهەری میلەتانە، بێ زمان هیچ ناکرێ، ئەمە موحەققق بزانن. مەکتەب و مەدرەسە کە لە کوردستان بکرێتەوە بێ زمانی کوردی پێش ناکەوێ و منداڵەکانمان لەم نەزانییە رزگار نابن. لە ڕێی خوادا، بۆ غیرەتی موسوڵمانی، لەمڕۆ بە دواوە بە زمانی خۆتان بخوێنن و بنوسن. حەقاتا هێڤی بۆ ئەم مەبەستە تێ ئەکۆشێ. وشە چاک ئەکا، صەرف و نەحوی کوردییان داناوە، چاوەڕێی غیرەت و هیمەتی کوردانن. لە خەڵقی رابوردو عیبرەت بگرن، ناوێکی باش لە دنیادا بە جێ بهێڵن..."

دیسان شیعرێکی درێژی نەتەوەیی حاجی قادر کە سەرەتاکەی بەمە دەس پێ ئەکا:

"خەسرەو و کەیقوباد و ئەسکەندەر وەکو کیسرا و کاوس و قەیسەر

ئەنوسێتەوە و داوا ئەکا گوێی لێ بگرن.

### 2. 2. بابەتی ئەدەبی

لە ڕۆژی کورد و هەتاوی کوردا ژمارەیەکی زۆر لە شیعرە سیاسییەکانی حاجی قادری کۆیی بڵاوکراوەتەوە. ئەشێ ئەم دو غەزەتەیە بە کۆنترین و باشترین سەرچاوە دابنرێ بۆ ساغکردنەوەی شیعرە سیاسییەکانی حاجی قادری کۆیی.

لە ژ1 یدا م. خ. لە کۆتایی وتاری (ژ مەزنی کوردان رایە) ئەم قەسیدەیەی حاجی نوسیوە:

وا دیارە رەسم و قانونێکی دەوران دادەنێ کوردی ئێمەش گەرمێن و کوێستان دادەنێ

...

هەروەها شیعرە درێژەکەی حاجی بە ناونیشانی (شاعیری بابان و سۆران) کە سەرەتاکەی بەم جۆرە دەس پێ ئەکا:

شاعیری کۆن و تازەی کوردان کە لە تیعدادی عاجزە ئینسان

ئەوی خۆم دیومە یانەخۆ ئەسەری ئەمەیە بۆت دەڵێم بە موختەسەری

...

ئەم شیعرەی ناو هەتاوی کورد لە گەڵ ئەوەی کە تا ئیستا لە دیوانەکانیدا بڵاوکراوەتەوە لە چەند رویەکەوە جیاوازی هەیە:

یەکەم،

لە پاش و پێش خستنی هەندێ لە بەیتەکانیدا. ئەوەی هەتاوی کورد لە ریزکردنی بەیتەکانیدا (مەنتیقی) ترە لە هی دیوانەکەی.

دوەم،

هەندێ لە وشەکانی جیاوازن.

لە کۆتایی ئەم شیعرەدا م. خ. نوسیوێتی:

"ئەڤا شاعیری بابان و سۆران ئەوە کو حاجی قادر ئانیە نەزمی، شاعیری کوردی دی ژی گەلەک هەیـە، یەک بە یەک تەحقیق بکەن و بنویسن. ژ بۆ تەرجومەی حالی وان کتێبەک چێکرن لازمە. غیرەت و مێرانی‌یـا کوردێتی ناهێلێ کو مەزنێ مە بێ ناڤ و نیشان بمێنن، خەلق تەعنان لمە بدە، ژ نزانی‌یا مە باس بکە."

هەتاوی کوردیش لە ژێر سەردێڕی (پاڕانەوە لە حەمیەتمەندانی کورد) لە بن هەمان بابەتدا نوسیویێتی:

"شاعیری گەورەی کوردان حاجی قـادر نـاوی هـەمو شـاعیری کـوردانی لـەم قەسـیدەیا دەرج کـردوە. ئێمەیش بە ناوی خودا سوێن ئەدەین کە ئاساری ئەم زاتانە بـە لای هـەر کەسـێکەوە هەیـە بینێرێـت بۆمـان تاوەکو گردی بکەینەوە و هەمو کوردێکیش لێی ئیستیفادە بکات و کوردیش بەم سـایەوە شـیعر و شـاعیری خۆی بناسێت."

لە ژ2 دا بە ناونیشانی (قەسیدەی کوردیە ئەسەری مەحوی ئەفەندی سلێمانی) (لە وەصفی رۆژا) و (لـە وەصفی شەودا) لە گەڵ (غەزەل) ی (بە نوری بادە کەشفی زوڵمەتی تەقوا نەکەم چیبکەم؟) بڵاوکردۆتەوە.

هەر لە هەمان ژمارەدا م. خ. بە ناونیشـانی (دەردی کـوردان) بـە هەنـدێ لێدوانـەوە دو قەسـیدەی مـەلای جزیری و، چەند شیعرێکی حاجی قادری بڵاو کردۆتەوە، لەوانە شیعرە درێژەکەی کە بەم جۆرە دەس پێ ئەکا:

خەسـرەو و کـەیقوباد و ئەسـکەندەر وەکـو کیسـرا و کـاوس و قەیسـەر

...

هەروەها ئەو شیعرەی تری کە بەم جۆرە دەس پێ ئەکا:

خۆ دەزانن سولالەی ئەکرادلێرەوە بگرە تا دەگاتە قوباد

لە ژ3 دا لە (ئەشعاری مەرحوم نالی) 3 غەزەلی بڵاوکردۆتەوە، کە سەرەتای یەکێکیان بەم بەیتە دەس پێ ئەکا:

دڵ سیاسەنگ نەبێ مایلی خاکی وەتەنە

خاڵی لەعلی حەبەشە، ساکینی بوردی یەمەنە

لە ژ10 دا: شیعرێکی مەلا ئەحمەدی جزیری کە بۆ پێغەمبەری وتوە. مەرسیەیەک بـە کرمـانجی. بـاب ناجۆ م. خ. تەرجومەی شیعرێکی تـورکی بـە کرمـانجی. لـە کەرکوکـەوە لـە سـاداتی بەرزنجـە تـاهیر فوئـاد شیعرێکی لە ستایشی هەتاوی کوردا بۆ ناردون. دیاربەکری فکری نەجدەت (دلماین)

### 2. 3. بابەتی دینی

ئەو سەردەمە بە هۆی ئـەو شـەڕ و شـۆڕانەی کـە توشـی دەوڵـەتی عوسـمانی بـو، بـابی عـالی بەشـێکی قەڵەمڕەوی عوسمانی لە دەس دا. دەوڵەتانی مەسیحی چاویان بڕی بوە میراتی پیاوە نەخۆشەکە. ئەمـە هەسـتێکی دوژمنانەی لە ناو رۆشنبیرانی عوسمانی‌دا دروست کردبو، سەرەڕای ئەمەیش قوڵکردنەوەی نـاکۆکی نێـوان کـورد و ئەرمەن و کردنیان بە گژ یەکتری‌دا، بە تایبەتی کە ڕێکخراوە ئەرمەنی‌یەکان ناوچەیەکی فراوانـی کوردسـتانیان بە نیشتمانی نەتەوەیی خۆیان دائەنا، هەستی ئیسلامەتی لە ناو رۆشنبیرانی کوردا بە هێـز کـرد بـو. نوسـەرانی هەتاوی کورد لە زۆری نوسینەکانیان‌دا شانازی بە ئیسلامی بونی خۆیان و کوردەوە ئەکەن.

لە ژ1 لە (ژ مەزنی کوردان رایە) م. خ. نوسیویێتی:

"گەلی شێخ و مەلا و ئاغای کورد! هەر شتە لازمە کە لە ئـەوەل دا فکـری لـێ بکاتـەوە، کـاتێ قـەوما و خراپ بو چاککردنی زەحمەتە. لە بەر ئەوە بە حوکمی ئـەمری خـودای تـەعالا عەمـەل بکـەن، ئـەو نـەیاری و دوژمنایەتی‌یە پیسەی لە ئەنجام دا ئەبێتە سەبەبی نـەمانی موسـوڵمانەتی و کوردایـەتی، لـە نـاو خۆتـان دا لا ببەن. وەکو برا بن، سەیری نەیارەکانتان بکەن ئەوان چۆن تێ ئەکۆشن ئێوەش وەها تێ بکۆشن." ئینجا دو ئایەتی قورئان و حەدیسێکی پێغەمبەر بۆ بەهێزکردنی ناوەڕۆکی وتارەکەی تەرجومە ئەکا.

لە ژ2 دا نەجمەدین کەرکوکی لە ژێر سەرناوی (وەعز) دا لە سەرەتای وتارەکەیدا رەخنـە لـە مـەلاکانی کوردستان ئەگرێ و، بە نەزان و نەشارەزایان دائەنێ و، خۆی ئایەتێکی قورئانی بە درێژی لێک داوەتەوە.

لە ژ3 دا قازی زادە مستەفا شەوقی لە سابڵاخەوە (تەرەقی دینمان دەوی) ئەکاتە سەردێڕی وتارەکەی و نوسیوێتی:

"چەندێک لەوەی پێش بە واسیتەی رۆژنامەی هەتاوی کورد لە خسـوس فائیـدە و مەنفەعـەتی مەکتـەب چەند سەترێکم عەرز کرد بون. ئاغایانی موحتەرەم عەرزی ئێمەیان قبـوڵ فـەرمو. وا دیـارە کـە ئەلحەمـدولیلا حەمیەتی کوردان هاتۆتە جۆش. مەخسوس شوکر دەکەین.

"ئێمە کە موسوڵمانین ئیعانە کردنی یەکترمان لە سەر لازمە و حـەتا پێغەمبـەر (ص) فەرمویـەتی: (مـن نفس علی اخیه کربة من کرب الدنیا نفس الله کربة من کرب یوم القیامة) یەعنی: کەسێک لە سەر برای خـۆی، مەتلەب برای موسوڵمانە و چونکە هەمو موسوڵمان پێکەوە بران (انمـا المومنـون اخـوة)، غـەمی دنیایـە دەفـع دەکا، خودا غەمێکی قیامەتی لە سەر هەڵدەگرێ و، خودا ئیعانەی عەبدی دەکـا مادەمـەکی ئـەو ئیعانـەی بـرای موسوڵمانی خۆی بکا...

"مولاحەزە فەرمون، چەند ساڵ پێشتر لە شاری سابڵاغێ و ئەترافی وی، بە چ جۆرێک عیلم و فـەزل دە تەرەقیدا بو، چەند مەلای وەکو: عەلی تورجانی، مەلای پێنجوینی و مەلای پیرەباب و مەلا وەسیم، بە وجـودی خۆیان عالەمیان موزەیەن فەرمو بو. چەند کەس لە ئەهلی تەریقەت و لە پیرانی دڵڕوناک بە ئیرشـادی خۆیـان رەونەقیان بە دینی ئیسلامی دابو، دەگەڵ تەئەسوفی حاڵی حازر لە هەزار فـەقێیان مەلایـەکی وا و، لـە هـەزار موریدان پیرێکی وا نابێ. بۆچی؟ چونکە وەقت هەتا دێ خراپتر دەبێ، بەڵام ئایا ئێمە لە موقابیلی ویدا نابێ حەرەکەتێک بکەین؟ دەبێ هەروا مەئیوس و نائومێد بین؟ ئایا بە خراپی ئـەو دەمـی تـەکلیفی شـەرعیمان لـە سەر وەلا دەچێ؟

"رجاو لێ دەکەم، چلۆن کرمانجانی لادێ کە لـە هـەزاریان دویـان بـە تـەواوی فاتیحـە و نـوێژێ نـازانن، دروستە پێیان بڵێی موسوڵمان؟ عولەمای ئێمە ئەگەر ئەمر بە مەعروفیان لە کن واجیبـە، بـۆچی بـە بـێ وەی کـە ئاغایەک ساڵی سەد تەغار گـەنمان نـەدابێ، تـا فاتیحـە و نوێژیـان پـێ بڵـێن. دیـارە کـە ئـەوان کـەمتر فکـری پاشەرۆژیان هەیە، کرمانجی فەقیر زو مردویان، بە ئیستیلاحی خۆیان، بە بێ چەقۆ دەمرن و تەلقینیان دانادرێ.

"ئێمە هیچ نالێین کە عیلمی دنیایە بخوێنن، دەگەڵ ئەوەش وا مەکەن کە عیلمی دینیشمان لە دەسـت بـڕوا. ئەرمەن ئیستا ئینجیلیان بە کوردی تەرجومە کردوە. تو خودا ئەی ئەهلی ئینساف دیقەت بفەرمون، کوردێـک کـە نەزانێ محەمەد کێ بوە و لە کوێ وەفـاتی فـەرموە؟ شـەریعەت چیـە؟ چلـۆن دەتـوانێ دینـی خـۆی راگـرێ و لـە موقابیلی واعیزی فەرەنگییان، کە بە زبانی لوسیان شەیتان هەڵدەفریوێنن، هەڵنەخەڵەتێن؟

"ئایا ئەگەر زەمانە وا دەوام بکا ئێمە چیمان لە خەڵکی دنیایە زیادترە، کە بە دو- سێ پشـتان دەگەنـە موسوڵمانان بۆ خۆشیان کافرن؟ لە یەکێکیان پرسی: نێوت چیە؟ دەڵێ: نیقۆلا، نێوی باپیرت؟ پەترۆس، نێوی بابی باپیرت؟ دەڵێ: ژۆرژ، نێوی باپیری باپیرت چیە؟ دەڵێ: محەمەد. دەگەڵ ئەوەی کە سێ پشـتی پێشـویان موسوڵمان بوە ئەوێستا کافرن.

"عیلاجی ئەو دەردە دو کەلیمەیەو بەس: کتێبی شەرعی بە کوردی تەرجومە بکـرێ. ئیـبن حەجـەرێکی، فەقێی فەقیر پاش بیست ساڵ خوێندنی نایزانێ، چ عەیبێکی هەیە بە کوردی تەرجومە بکرێ و، بە دو سـاڵان ئەو فەقێ فەقیرە فێری بێ؟ مەقسەدی ئێمە ئەوەندەیە..."

لە ژ10 دا (نهج الانام الكردي) لە نوسینی مەلا خـەلیلی سـعردی، بڵاوکردۆتـەوە. ئـەم نامیلکەیـە پێـنج (روکن) مکەی باوەڕی ئیسلام بە کرمانجی رون ئەکاتەوە.

**3. لە ڕوی هونەری ڕۆژنامەوانی‌یەوە**

**3. 1. زمانەکەی**

هەتاوی کورد بە تورکی عوسمانی و کوردی دەرچوە. بە تیپی عـەرەبی و بـە ڕێنوسـی فارسـی چـاپ کـراوە. جاروبـار بزوێنیـان بـەکارهێناوە. بەشـی کـوردی تێکـەڵاوە لـە هـەردو لەهجـەی سـەرو و خـوارو. نوسەرەکانی خەڵکی شوێنی جیاجیای کوردستانن. لە نـاو ئەوانـەدا دیاربـەکری، خـەرپوتی، مـاردینی، وانـی، سنەیی، سلێمانی، کەرکوکی، تێدایە. لە چەندین وتاردا ئەوە دوبارە کراوەتەوە کە پێویسـتە ڕێزمـانی کـوردی دابنرێ، ڕێنوسەکەی چاک بکرێ، ئەدەبی کوردی پێش بخرێ. کوردی بکرێ بە زمـانی خوێنـدن. هەرچەنـدە وشەی زۆری بێگانەیان بەکارهێناوە، بەڵام بە گشتی زمانەکەیان ڕەوانە.

**3. 2. ڕوخسارەکەی**

سەربەرگی ژ1 ی بەوێنەی ئەورەحمان پاشای بابان و،

سەربەرگی ژ2 بە وێنەی خێزانێکی کوردی شام ڕازێنراوەتەوە.

سەربەرگی ژ4- 5 وێنەی تێدا نیە، بەڵام (مندرجات و تیا نوسراو) ی تێدا بڵاوکراوەتەوە.

سەربەرگی ژ10 ی وێنەی (ژ شێخانی گرانی تلـو و ژ مەبعوسـانی کـوردان حـەزرەتی شـێخ محەمـەد نەصرەدین ئەفەندی) تێ دایە.

ژ1 ی 32 لاپەڕەیە، ل1- 16 تورکی و ل17- 32 کوردی‌یە.

ژ2 ی جگە لە بەرگەکەی ئەمیش 32 لاپەڕەیە، ل1- 19 تورکی و ل20- 32 کوردی‌یە.

ژ4- 5 پێکەوەن، جگە لە بەرگەکەی 16 لاپەڕەیە، ل1- 10 تورکی و ل11- 16 کوردی‌یە.

ژ10 ی جگە لە بەرگەکەی، ئەمیش 16 لاپەڕەیە، ل1- 9 تورکی و ل10- 16 کوردی‌یە.

زۆری لاپەڕەکانی دو ستون و، جارو بار هەندێکی یەک ستونی تێدا نوسراوە، بە تایبەتی لاپـەڕەکانی پێشەوەی. حەرفی سەردێڕی وتارەکان درشتترن لە حەرفی مەتنـەکانی. ئەگـەرچی ئەوسـا هێشـتا ڕێنوسـێکی تایبەتی بە زمانی کوردی نەبو، بەڵام هەڵەی چاپی زۆری تێ کەوتوە.

قەوارەی هەتاوی کورد وەکو قەوارەی ڕۆژی کوردە.

بەشی زۆری بابەتە کوردیەکانی وتارن. ڕیپۆرتاجیان تێ دا نیە. هەنـدێ هـەواڵی بـڵاو کردۆتـەوە، بـە تایبەتی لە بەشە تورکی‌یەکەیدا. هەندێ لە وتارەکانی مودانی خ. کە بیروبۆچـونی خـۆی تێکـەڵاو کـردوە بـە شیعرەکانی حاجی قادر، ئەشێ بە لێکۆڵینەوەی ئەدەبی دابنرێن.

**3. 3. بڵاوکردنەوەی**

ئەستەموڵی ئەو سەردەمە پایتەختی دەوڵەتی عوسـمانی بـوە، مەڵبەنـدی ڕۆشـنبیری و پێـک گەیشـتنی شارستانێتی خۆرئاوا و خۆر هەڵات بوە. (هەتاوی کورد) گەیشتۆتە زۆر جێگـا، لەوانـە بەغـداد و سـلێمانی و کەرکوک لە خواروی کوردستانی عوسمانی و، موکریان لە کوردستانی ئێران.

بانگی کورد کە لە بەغداد دەرچوە لە ژ4 یدا بە خۆشی‌یەوە هەواڵی دەرچـونی بـڵاو کردۆتـەوە و، بـە ستایشەوە باسی ئەکا و، داوا لە خوێنەرەکانی ئەکا ببن بە ئابونەی. هەتاوی کوردیش لـە ژ3 یدا بـە بۆنـەی دەرچونی بانگی کوردەوە وتارێکی بە تورکی نوسیوە.

لە سلێمانی‌یەوە زێوەر و، لە کەرکوکەوە لە ساداتی بەرزنجە فوئاد تاهیر شیعریان بۆ ناردوە.

لە ژ3 دا (باپیری، محەمەد حسێن خانی سەرداری موکری، کە حاکمی ساباڵخ بوە، پیرۆزبایی بۆ هەتاوی کورد ناردوە ئەڵێ:

"ئاقای من! چاوم کەوت بە ڕۆژنامەی هەتاو وا بزانە کە هەمو دنیایان دا بە من، چونکە تا ئیستە ئەو میلەتە، کە لە پێشدا، لە هەمو میلەتان مەشهورتر و ئازاتر بو، ئەوڕۆ بەدبەختی روی تێ کردوە و بەدبەختی‌یان گەورەترە، ئەدەبیاتمان نەبو، منداڵی ئێمە کە بیانخوێندایە دەبو بە زمانی فارسی یا تورکی بخوێنن، شوکری خودا کە ئەمڕۆ لە ئەسەری قەڵەمی جەوانانی غەیوری ئێمە، دو ڕۆژنامە بە زبانی کوردی چاپ دەکرێ. لە سەر هەمو کوردان لازمە قەدری ئەو زاتە گەورانە بزانن و بە هەمو تەرزێ لە پێشرەفتی ئەو مەقسودە موقەدەسە، کە ئەو دو وجودە موحتەرەمە عەبدولعەزیز بەگ لە پێشیان کەوتوە کۆمەک بکا، بەڵکو ئینشائەڵا کوردیش بێتە عەرەسەی تەمەدون و، بە زبانی خۆی نەشری مەعاریف و، تەئلیفی کتێب و، تەئسیسی مەداریس بکا، تا لەوە زیاتر لە خەوی غەفلەت دا نەمێنن. خواهیش و تەمەنا لە ئەو دو زاتە موحتەرەمە دەکەم، هەمو مانگان ڕۆژنامەی (هەتاوی کورد) و (ڕۆژی کورد) ڕەوانە بکەن، کە چاوم بە تەماشا کردنی ئەوان رون دەبێتەوە.

"قیمەتی ئابونەم ڕەوانە کرد، لە حاجی زەینەلعابدینی تەورێزی وەرگرن. ئینشائەڵا لەوە بە دواوە ئیعانەش دەنێرم. بە گیان و دڵ بۆ هەمو حەدەس حازرم."

لەو هێرشەدا کە ئۆردوی عوسمانی لە یەکەمین جەنگی جیهانی‌دا کردیە سەر کوردستانی ئێران، سەرداری موکری لە گەڵ چەند گەورەپیاوێکی کوردا، گرت. تورک تاوانباریان کردن بەوەی کە لە گەڵ روسیا ڕێک کەوتون، روس یارمەتی ئەمان بدا دەوڵەتی کوردی دابمەزرێنن، ئەمانیش یارمەتی روس بدەن لە شەڕدا دژی عوسمانی. بەو توهمەیە هەمویان هەڵواسین.

هەر لەو ژمارەیەدا وتارێکی قازیزادە مستەفا شەوقی، کە ئەویشی هەر لە موکریانەوە پێ گەیشتوە، بڵاوکردۆتەوە.

## 4. جێگەی لە مێژوی ڕۆژنامەوانیی کوردی‌دا

ئەم ڕۆژنامەیە هێشتا هەمو ژمارەکانی لە بەر دەس دا نین. هێشتا وتارە تورکی‌یەکانی نەکراون بە کوردی، تا لە هەمو رویەکەوە، گشت لایەنە، هەڵ بسەنگێنرێ. بەڵام تەنیا لێکۆڵینەوەی بابەتە کوردیەکانی ئەم و گۆڤارەکانی هاوزەمانی ئەم: (ڕۆژی کورد) و (بانگی کورد) ئەمان گەیەنێتە ئەو باوەڕەی کە لەو سەردەمەدا کورد لە هەڵسانەوەدا بوە. هۆشی نەتەوەیی لای هەڵبژاردەی کورد لە خەمڵین و گەشانەوە دا بوە. هەڵبژاردەی کورد خەریکی خۆ ڕێکخستن و سازدانی مەلا و شێخ و میر و مەزنەکانی کورد بون، بۆ دانانی ڕێگە و شوێنی پێشکەوتن لە بوارەکانی خوێندن و فێربون و، چاککردنی ژیانی خەڵک و، کاروباری بازرگانی و، کشتوکاڵ و، پیشەسازی و، ماکینەدارکردنی وڵات دا.

دەرچونی (کورد تەعاون و تەرەقی غەزەتەسی) و (کوردستان) و (ڕۆژی کورد) و (هەتاوی کورد) و (بانگی کورد) قسەی ئەوانە بە درۆ ئەخاتەوە کە ئەڵێن ئەم زمانەی ئیستا ئێمە پێی ئەنوسین ئینگلیز دای هێناوە و سەپاندویەتی بە سەر کوردا، چونکە کاتێ ئەم غەزەتانە دەرچون و، بەم لەهجەیە نوسینی تێدا بڵاو کراوەتەوە، هێشتا ئینگلیز نەهاتبونە ئەم وڵاتەوە.

یەکەمین جەنگی جیهانی، هەروەکو کارەساتی بە سەر زۆر لە میلەتانی دنیا هێنا، ماڵی کوردیشی وێران کرد. کە دەوڵەتی عوسمانی تێکەڵاوی ئەو جەنگە بو، کورد بێ ئەوەی دەستی لە هەڵگیرسانی‌دا هەبێ، وڵاتەکەی بو بە مەیدانی شەڕێکی سەخت و، ڕۆڵەکانی ڕاپێچی مەیدانەکانی جەنگ کران و، زۆریان نەگەڕانەوە. هەمو ئەو پرۆژانەی کە هەڵبژاردەی کورد، بۆ ڕاپەڕاندنی کورد و پێشکەوتنی کوردستان دایان نابو، لە ناو تەپوتۆزی جەنگدا ون بون.

## 8. 5. بانگی کورد: یەکەم بڵاوکراوەی کوردی لە عیراقدا

عدد : ۱ | بازار | ژمار : ۱

صاحب ومدیر مسئولی
بابان: جمال‌الدین

آدرس :
تسهیل امور اداره‌سی



بدل اشتراك
سنه‌لكی قرق بش آلتی
آیلغی یكرمی بش
غروشدر

سالی چل وپنج شش مانکی
به بیست وپنج قروش

مسلکمزه متناسب مقالات نافعه‌یه ستونلر آچیقدر

۲۶ کانون ثانی ۳۲۹ — شمدیلك اون‌بش کونده برنشر اولنور — ۱۲ ربیع الاول ۳۳۲

مندرجات



تیانوسراوه



نسخه‌سی التمش پاره‌در

آداب مطبعه‌سنده طبع اولنمشدر

جمعه ایرتسی



هراون بش کونده برنشر اولنور

مندرجات:




۲٤ - مارت - ۳۳۰ متالیك

٦

آداب مطبعه‌سی

## 8. 5. بانگی کورد: یەکەم بڵاوکراوەی کوردی لە عیراقدا

### 1. عیراق و سەرەتاکانی ڕۆژنامەوانی

پێش یەکەمین جەنگی جیهانی دەوڵەتێک نەبو بە نـاوی عیراقـەوە. عیراقـی ئیسـتا پێکهـات بـو لـە 3 ولایەتی جیاواز: ولایەتی بەغداد، ولایەتی موسڵ و ولایەتی بەسرا، کە هەر یەکەیان بە جیا بەسترا بو بە بابی عالیەوە لە پایتەختی دەوڵەتی عوسمانیدا.

یەکەمین ڕۆژنامە لە بەغداد (الزوراء) والی بەغداد، ئازادیخوازی گەورەی عوسمانی، مەدحـەت پاشـا، بـە تورکی و عەرەبی دەریکردوە.

ژ1 ی الزوراء ڕۆژی سێشەمە، 5 ی ڕەبیعولئەوەلی 1286 کۆچی بەرامبەر 16 ی حوزەیرانی 1869 زاینی دەرچوە. ئەمە بە سەرەتای لە دایکبونی ڕۆژنامەوانی دائەنرێ لە عیراق دا. حکومەتی عیراقیش هەر ئـەم بۆنەیەی کردوە بە ڕۆژی جەژنی ڕۆژنامەوانی لە عیراق دا.

الزوراء 49 ساڵ ژیاوە و بەردەوام بوە تا داگیرکردنی بەغداد لـە لایـەن ئینگلیـزەوە لـە ڕۆژی 11 ی ئازاری 1917 دا. لە دەرچونیەوە تا ڕاوەستانی 2606 ژمارەی لێ دەرچوە. ڕۆژنامـەی ڕەسـمیی حکومـەت بوە بۆ بڵاوکردنەوەی هەواڵ و قانون و فەرمان و بڕیارەکانی.

دوەمین جەریدە (الموصل) بوە لە 1303 ک/1885 ز دا لە شاری موسڵ حکومـەت بـە تـورکی و بـە عەرەبی بڵاوی کردۆتەوە. الموصل ڕۆژنامەی ڕەسمیی ولایەتی موسڵ بوە. بڵاوکردنـەوەی بـەردەوام بـوە تـا 1918 کە ئینگلیز لە کۆتایی یەکەمین جەنگی جیهانیدا موسڵی گرت.

سێیەمین جەریدە (البصرة) کە لە 9 ی جیمادی ئاخەری 1307 ک/1889 ز لـە بەسـرا بـە تـورکی و عەرەبی دەرچوە، ئەویش هەر جەریدەی ڕەسمیی ولایەتی بەسرا بوە. بەردەوام بوە تا لـە سـەرەتای یەکـەمین جەنگی جیهانیدا لە 1914 دا ئینگلیز بەسرای گرت.

تا ساڵی 1908 لەو 3 ولایەتەدا، کە دوای یەکەمین جەنگی جیهانی دەوڵەتی عیراقیـان لـێ پێکهێنـرا، تەنیا ئەم 3 ڕۆژنامەیە دەرئەچون کـە، هـەر سـێکیان حکومـەت دەری ئـەکردن. سـاڵی 1908 کـە شۆڕشـی مەشروتە بو، دەستور (قانونی ئەساسـی) ڕاگەیـەنرا. تـا ئـەو کاتـە ڕۆژنامـەکانی ئەسـتەموڵ ئـەبو پێشـەکی نوسینەکانیان بیەن بۆ سانسۆری حکومەتی تەماشای بکا دوای ڕەزامەنـدی ئـەو ئینجـا بۆیـان هـەبو بـڵاوی بکەنەوە. ڕۆژنامەکان هیچ جۆرە ئازادییەکیان نەبو. دوای ڕاگەیانـدنی شـۆڕش ڕۆژنامـەوان و نوسـەرەکانی

ئەستەموڵ کۆبونەوە بڕیاریان دا چیتر نوسینەکانیان نەنێرن بۆ سانسۆر و، ڕۆژنامەکانیان بـە ئـازادی بـڵاو بکەنەوە.

دوای 1908 لە ئەستەموڵ و لە سەرانسەری ولایەتەکانی عوسمانیدا ڕۆژنامەوانی زۆر پـەرەی سـەند. هەر لە ولایەتی بەغـداد لـە سـاڵانی 1908- 1918 دا 51 جەریـدە و 20 گۆڤـاری جۆراوجـۆری ئـەدەبی، کۆمەڵایەتی، ڕۆشنبیری، دینی، سیاسی، گاڵتەجاڕی، بە تورکی و عەرەبی و فارسی و کوردی بڵاو کراوەنەتەوە، کە یەکێکیان (بانگی کورد) بوە. لە بەسرا 16 و لە موسڵ یش 6 بڵاوکراوە دەرچون.

### 2. بانگی کورد

عبدالرزاق الحسني لە ل35 ی (تاريخ الصحافة العراقية) دا ئەڵێ:

"ئەم گۆڤارە بە هەردو زمانی تورکی و کوردی لە بەغداد جەمالەدین بابان دایمەزرانـد بـۆ ئـەوەی هـەر 15 ڕۆژ جـارێ دەربچـێ. ژمـارەی یەکـەمی لـە 12 ی ڕەبیعولئـەوەلی 1332 ک/8 ی شـوباتی 1914 ز دەرچوە. ژمارەی لاپەڕەکانی 24 بو بە قەوارەی نیوە. دوای دەرچونی پێنجەمین ژمـارەی ڕاوەسـتا بـە هـۆی هەڵگیرسانی ئاگری یەکەمین جەنگی جیهانی و چونی دامەزرێنەرەکەی بۆ بە جێ هێنانی ئەرکی سـەربازی و، مەعنای (بانگی کورد) بە عەرەبی (نداء الكرد) ە."

ساحێب و مدیری مەسئولی بانگی کورد: بابان جەمالەدین بوە. ئیستا ژ1 و 3 و 4 ی ئەم گۆڤـارە لـە بەر دەس دایە.

جەمال بابان (1893- 1965)، حقوقی لە بەغداد خوێندوە. لـە بیسـتەکان دا ماوەیـەک حـاکم و، لـە سیەکاندا چەند جارێک لە پارلەمانی عیراق دا نائیب و، لە سییەکان و چلەکان و پەنجاکان دا چەند جارێـک بۆتە وەزیر.

ژ1 ی بـانگی کـورد لـە 26 ی کـانونی سـانی 1329 ڕۆمـی، 12 ی ربیعولئـەوەلی 1332 ک/8 ی شوباتی 1914 و، ژ3 ی لـە 1 ی مـارتی 1330 ی ڕۆمـی و، ژ4 ی لـە 24 ی مـارتی 1330 ی ڕۆمـی دا دەرچوە. هەر 3 ژمارەی کە لە بەر دەس دان لە چاپخانەی (آداب) لە بەغـداد چـاپکراون. ئـەم 4 ژمارەیـە بـە سەر یەکەوە 96 لاپەڕە بون.

### 2. 1. نوسەرەکانی

ئەم گۆڤارە بە تورکی عوسمانی و بە کـوردی (کرمـانجیی خـوارو) دەرچـوە. بابەتـە تورکیـەکانی لـە بابەتە کوردیەکانی زۆرترە.

ئەوانەی لە بەشی تورکیدا نوسینیان بڵاوکردۆتەوە: شكرى الفضلي، جمال الـدين بابـان، بابـان حقـى بك، فكري، سليمان توفيق، م. ک، خاكى بغدادى، رضوان بهشتي، ک. س، خطيـب زاده عطـا اللـه، كمـال زاده اکرم، بون. جگە لە جەمالەدین بابان کە خاوەنی گۆڤارەکە و زۆری بەشە کوردییەکەی بە ئیمزای خۆیەتی، دو کەسـی تـر بـە نـاوی بەهەشـتی و، صـدقی دو وتـار و، عـارف صـائیب و زێـوەریش دو شـیعریان تـێدا بڵاوکردۆتەوە.

### 2. 2. بابەتەکانی

بانگی کورد وەکو لە سەروتاری یەکەمین ژمارەیدا نوسیوێتی تـوخنی جـەرەیاناتی سیاسـی ناکـەوێ، بەڵکو ئیعلانی حەرب لە سەر عیلەتی موزمین: جەهالەت ئـەکا و، هـەوڵ ئـەدا خـۆی تـەرخان بکـا بـۆ عـیلم و

عیرفان و، بۆ پەروەردە کردنی فیکری و کۆمەڵایەتی کورد، بۆ ئەوەی قەومی کورد لە عائیلەی عوسمانیدا ئەندامێکی زیندوی بەهێز و ڕۆشنبیر بێ.

لە بەشە تورکی‌یەکەیدا شوکری فەزڵی (1882-1926) لە هەر 3 ژمارەدا بابەتی مێژویی بە تورکی لە سەر مێژوی کورد نوسیوە. شوکری فەزڵی یەکێ لە ڕۆشنبیرە ناسراوە گەورەکانی ئەو سەردەمە بوە. لە بواری ڕۆژنامەوانیدا کاری زۆری کردوە. بە عەرەبی و بە تورکی و بە فارسی وتاری زۆری نوسیوە. بە کوردی شیعرێکی بۆ شێخ مەحمود نوسیوە کە بە یەکێ لە شاکارەکانی ئەدەبی کوردی دائەنرێ. هەروەها شەڕە شیعری زۆری لە گەڵ شێخ ڕەزای تاڵەبانی کردوە.

ئیسماعیل حەقی بابان، ڕۆشنبیرێکی ناسراوی ئەو سەردەمەی عوسمانی بوە، مامۆستایەتی زانکۆ و مەبعوسی کردوە، وتارێکی بە ناونیشانی (کورد و کوردستان) نوسیوە. بەر لە بڵاوکردنەوەی وتارەکەی مردوە.

جەمال بابان لە هەر 3 ژمارەدا وتاری تورکی نوسیوە، یەکێکیان لە سەر (کورد و کشتوکاڵ) بوە. نوسەرێکی تری (خاکی بەغدادی) یە لە ژ1 دا لە سەر (بەغداد و بەغدادی‌یەکان) و لە ژ3 و 4 دا لە سەر (محیط معنوی) و، (بەهەشتی) لە سەر (اخلاق عمومیە) ی نوسیوە. هەروەها هەندێ شیعری تێدایە.

لە بەشە کوردیەکەیدا وتارەکانی تەرخان کردوە بۆ پیشاندانی ڕێگەی تەرەقی مەعاریف، زەراعەت، تیجارەت، عەدالەتی ئیجتیماعی، ئەو دو شیعرەش کە بڵاوی کردۆتەوە هەر بۆ هاندانی کوردە لەم بوارانەدا.

## 3. بابەتە کوردیەکانی

### 3. 1. تەرەقی‌ی مەعاریف

صدقی لە ژ1 دا لە وتارێک دا بە ناونیشانی: (حسی مەعاریف، فکری تەرەقی لە ناو کوردان) دا، داوای گۆڕینی سیستەمی خوێندن و پرۆگرامەکانی ئەکا. داوای خوێندنی زانستی نوێ و هاوچەرخ ئەکا، داوای کردنەوەی خوێندنگای ئەهلی ئەکا و، نوسیوێتی:

"کەسێ کە بە ئەحواڵی کوردستان واقیفە لای مەعلوم دەبێ کە میلەتی کوردان بە قەد میلەتەکانی کە موحیبی مەعاریفن. بەڵکو موحیبەتی مەعاریفیان لە ئەقوامی سائیرە زیاترە، چونکە ئەمڕۆ لە کوردستانا لە هەر شارێ چەند مەدرەسەیان بینا کردوە، بۆ ئەو مەدرەسانەش مودەریسیان تەعین کردوە، لە غەریب و غورەبا چەند تەلەبەیەکیش لەو مەدرەسانە خەریکی تەحصیلی عیلمن. خواردن و لیباسیانیش لە تەرەف ئەهالی‌یەوە دەدرێ. هەر فەردێک لە کوردان لای وایە خدمەتی ئەهل و تەلەبی عیلم فەرزە. شایەد کەسێ لە حەق تەلەبەیە بێ حورمەتی ئیزهار بکا بە دەفعەیە ئەهالی ئەو جێگایە ئەو کەسە تەنفیر دەکەن، بە هەموییانیش سەرزەنشی دەکەن.

"ئیستا بەم ئەحواڵەیان سابیت بو کە کوردان موحیبەتی مەعاریفیان هەیە و بۆ خاتری تەرەقی‌ی عیلم و مەعاریف هەرچی لازمە دەیکەن. ئەم مەسئەلەیە موصەدەقە، فەقەت حەیف، سەد هەزار حەیف، کە لەم سەعی‌یە، لەم فیداکاری‌یە، هیچ ئیستیفادەیە نایەتە وجود. فەقێ‌ی قوڕبەسەر لە دایک و باوک و مەملەکەتی خۆی مەحروم دەبێ، ئیختیاری غوربەت و زەحمەت دەکا، دێت بۆ تەحصیلی عیلم، دە پانزە ساڵ تەحصیل دەکا، نیهایەت دەزانێ کە (نصر فعلی ماضی‌یە) و (ینصر فعلی مضارعە) ئیستیفادەی ئەوەل و ئاخری لەمە زیاتر نابێ. ئەسبابی ئەمەش حەمو عەدەمی وجودی وەسائیتی سەعی‌یە. مادامکی کوردان ئەوەندە مەیلی تەرەقی‌یان، موحیبەتی مەعاریفیان، هەیە، عولەماکانیان، دەوڵەمەندەکانیان، سەعی بۆ ئەمە بکەن، لە گەڵ ئەو کیتابانەش کە لە ناو کوردستاندا مەشهورە و لەوانە زیاتر نیە، لازمە کە عیلم و مەعاریفی دەوری حازرمانیش تەحصیل بکەن و، بزانن کە ئیستیقبال چیە، شەرەفی مازی چیە، ئیحتیاجاتی زەمانەکەمان بە چ دەرەجەیەکە؟

"ئینسان لازمە بە موجیبی زەمانە حەرەکەت بکا. کوردان هەزار ساڵ لەمەوپێش بە چ حاڵێ بون، ئـەمڕۆش ئەو حاڵەیان محافەزە کردوە. لە ئەجدادیان چی‌یان دیوە، چی‌یان بیستوە، ئەوانە تا ئیستا جاری، باقی‌یـە. لایـان ئەم عاداتانە وەکو ئیعتیقادێکی دینی وایە لە عەقلیان دا ئەوەندە نفوزی ئیجرا کردوە کە مەنعی ئـەو فکـرە باتیلـە سەعی‌یەکی زۆر، مودەتێکی دەوێ. حاڵ وایە کە نازانن بەشەرییەت بە سایەی تەرەقی بوە ئەو چشتە. ئـەو فکـرە کە ئەمڕۆ قبوڵ و ئیجرای دەکەن، سبحەینێ بە نەوعێکی کە تەجەلی دەکـا و فکـری کـە قبـوڵ دەکـەن، چونکـە لـە حەیاتا تەوەقوف نیە. جەمعیەت هەمو ڕۆژێ تەکامول دەکا و زەمانە کۆنانە ڕابورد. ئەوانی کە سـەعی ناکـەن بـە نیسبەت ئەوانە کە سەعی دەکەن لە پاشەوە دەمێنن و بە دەرەجە دەرەجە ڕێیان دەچێ بۆ دیاری عەدەم.

"بینا لە سەر ئەمە بۆ کوردان لازمە: کە علومی جەدیـدەی دەوری حازرمـانیش تەحسـیل بکـەن. وەکـو میلەتەکانی کە جەهد و غیرەت دەکەن ئێمەش جەهد و غیرەت بکەین، تاکی لە موجاهەدەی حـەیات دا مـەغلوب نەبین. ئومێد دەکەم لە مودەتێکی قەلیل تەرەقی بکەین چونکە عالمە تازەکانمـان هاتونـە غیـرەت (خـوا لێ‌یـان ڕازی بێ) ئەوەتا خەریکی سـەعیین. ئـیش ماوەتـەوە دەوڵەمەنـدەکانمان، ئـەربابی عیلممـانیش لـە جەریـدەی (بانگی کورد) دا ڕێگەی حەرەکەتمان پێ نیشان دەدەن والله الموفق."

جەمال بابان، بە چاولێکەری کوردەکانی ئەستەموڵ کە (جڤـاتی هێڤـی) و (نشـر معـارف جمعیتـی) ان دامەزراندوە و، خوێندنگەی کوردی‌یان بۆ منالآنی کـورد کردۆتـەوە، داوای دامەزرانـدنی کۆمـەڵێک ئـەکا کـە مشوری کردنەوەی خوێندنگەی نوێ بخوات. لـە ژ 3 دا لـە ژێـر سـەردێری (وەقـت و نەقـد) کـە پاشـماوەی ژمارەی پێشویەتی و، ئیستا ئەو ژمارەیە لە بەر دەس دا نیە، نوسیوێتی:

"مودەتێ لە مەوپێش، ئەو کەسە کە چەند قرۆشێکی بو دەیتوانی تاجیر بـێ و تیجـارەت بکـا، فەقـەت ئەمڕۆ ئەوانە کە لە ئەحواڵی پیاسە، لە حەوادیسی ڕوزمـەڕە و، لـە حـاڵ و ئـەتباعی مشـتەری‌یەکان خەبـەردار نەبێ، ئیقتیداری تیجارەتی نابێ، ئەگەر بیکاتیش لـە زەرفـی مـودەتێکـی زۆر کـەم، ئیعلانـی ئـیفلاس دەکـا و مەحکومی مەوتی مەعنەوی دەبێ.

"لە بەر ئەمە ئەم نەوعە ئینسانانە مەجبور فێـری قـەوانینی ئیقیصـادیە و تیجاریـە و عیلمـی جوغرافیـا بون. خۆلاصە ئەمڕۆ ئینسان هەر چیە دەبێ بێ، هەرچیە دەکا بکا، مەجبوری سـەعی وکۆششـی زۆر چشـتێ بوە، چونکە لەمەوپێش ئەو ئیشانە کە بە ئاسانی دەکرا ئەمڕۆ موحتـاجی سـەعی‌یەکی زۆر بـوە. بـەڵی وایـە! دوێنێ دەیانگوت کە (وەقت) نەقدە، حاڵبوکی ئەمڕۆ دەڵێن (وەقت) نەقد نیە حەیاتـە. حەقیقـەتیش وایـە، ئـەو وەقتانە کە ڕادەبورێ، لە عومرمان فەوت دەبێ.

"مادامکە وەقتەکەمان ئەگەر بە زیلەت بێ، ئەگەریش بە سەعادەت بـێ، هـەر ڕادەبـورێ، هـیچ نـەبێ بـە صورەتی زۆر چاک ئیستیعمالی بکەین، کە لەو وەقتە فائیدەیە بێتە وجـود، وە لـە عومرەکـەمانیش سـەعادەتێ حاصل بکەین.

"لاکین ئێمە حەیف، سەد هەزار حەیف، کە بە وەقتەکەمان، نەکو بە قەدەر حەیات، بـە قـەدەر نەقـدیش، ئەهمیەتی پێ نادەین.

"ئەو میلەتە کە ئەم حەقایقانە تەقدیر دەکا ئەلبەت و ئەلبەت تەرەقی دەکا.

"مەسەلەن ژاپۆنیا، ئەم قەومە پچوکە چی بو؟ بە خودا هیچ نەبو. فەقەت بە سـایەی سـەعی و تەقـدیری قیمەتی وەقتەکەیان دەوڵەتێکی عەزیمی وەکو ڕوسیەی شکان و تارومار کرد.

"مەسەلەن ئینگلتەرە، ئەمانەش وەکو ئێمە ئینسانن، فەقەت بۆچی ئەو نەوعە ئیختیراع و ئیجادە کە بـە سایەی عەقل و فکریان دەیهێننە وجود ئینسانان شێت دەکـا و حـەمو کەسـێ مـەجبوری تـەعزیم و تەقـدیری شەخصی‌یان دەکەن.

"بەڵێ ئەمانەش لایەنقەتیع سەعی دەکەن. وە وەقتەکەیان بە خۆڕایی فەوت ناکەن. بۆیە نائیلی ئەم سەعادەت و قودرەتە بون بەو دەرەجەیە کە سیاحێ دەچێتە ئینگلتەرە، لەو جێگەیە چاوی بە سەرایەکی زۆر موتەنتەن و مودەبدەب دەکەوێ، لەو وەقتەش ئینگلیزێ رادەبورێ، لێی دەپرسێ: ئەم جیگەیە چیە؟ کابراش لە بەر ئەوە کە سانیەیە لە وەقتەکەی بە خۆڕایی نەچێ پاردۆنێکی پێ دەڵێ و دەچێ. ئەمجا بۆچی ئەمانە تەرەقی، ئێمەش حەتاکو بێ تەدەنی نەکەین.

"لە گەر ئەمەش من ناڵێم وەکو پیاوێ لە سەر منارەیە خۆی بخاتە بیرێ، وا سەعی بکەین. هیچ نەبێ وەقتەکەمان تەقسیمی چەند قیسمێ بکەین و بە گوێرەی ئەو قیسمانەش حەرەکەت بکەین. یەعنی هەمو کەسێ وەقتی سەعی، وەقتی خواردنی، وەقتی خەوی، وەقتی عیبادەتی لای مەعلوم بێ.

"فەقەت دەڵێن کە بە چی سەعی بکەین و کێ سەوقی تەحصیلمان بکا؟ بەڵێ ئەمەش راستە. زاتەن ئێمەش لە بەر ئەمەیە ئەوەندە هاوار و داد و بێدادمانە، دەڵێین: لە بەغدادا جەمعیەتێ گوشاد بکەین، کە بە تەشویق و کۆششی ئەم جەمعیەتە لە حەمو جێگەیە مەکتەبێ گوشاد بکرێ و، قەومی کوردان لەم جەهالەتە تەخلیص بکا. دە بزانین کێ لە کوردان سەرهەڵگری نائیلی ئەم شەرەفە عەزیمە دەبێ؟ فەقەت حەیف کە ئەم خدمەتە بە کەسێ بە دو کەس ناکرێ. ئەگەر وا بوبوایە لە بەغدادا زۆر کەسانێ هەیە کە دیدەدۆز ئینتیزاری ئەم خدمەتەیە. ئەمە انجق بە سەعی و تەشەبوسی جەمعیەتێکی زۆر دەبێ، چونکە بە بێ سەعی هیچ چشتێ ناکرێ، چونکە خوداوەندی تەعالا (لیس للانسان الا ماسعی) ی فەرموە. فاعتبروا یا اولی الابصار."

### 3 .2. تەرەقیی زەراعەت و تیجارەت

جەمال بابان، داوای پێشخستن و گەشە پێدانی کشتوکاڵ و بازرگانی ئەکا بەوەی کۆمپانیای هاوبەشی کشتوکاڵ و بازرگانی دابمەزرێنن، داوا ئەکا دەوڵەمەندەکان لەو کۆمپانیایانەدا کۆببنەوە، مەکینەی کشتوکاڵ لە دەرەوە بهێنن و کاری پێ بکەن و بە کرێی بدەنەوە. سەبارەت بەم باسانە لە ژ1 دا لە ژێر سەردێڕی (قسەی خۆبەخۆیی) دا نوسیوێتی:

"ئەی کوردان موحتەرەمان!

"ئەمرۆ زەمانەکەمان زەمانی سەعی و غیرەتە. هیچ کەس ناتوانێ موقابیلی ئەم دو قوەتە راوەستێ. لە بەر دەم سەعی و مەراما بەخت مل چەوت دەکا. ئەو میلەتە کە تابیعن بە قانونی تەکامول بەرە بەرە (پەکەین) ئەگەر عەزم و مەرام بکەن مەوجودیەتی خۆیان محافەزە دەکەن. لاکین ئەو میلەتەی کە ئەم دو قوەتەی نەبێ هەرچی دەکا بکا، خۆی بکوژێ، مومکین نیە، زەمان ئەوە دادەرزێنێ و مەحوی دەکا. بە موجیبی قانونی تەکامول ئەو کەسە کە تابیعی موقتەزای زەمان نابێ و لە عادەتی کۆنی خۆیان ئیسرار دەکا فەلاح نابێ.

"مەعاریف، کە بو محافەزەی وەتەن ئەساسە و، نیشانەی شەرەفی میلەتە، بۆ هەمو کەسێ فەرزە کە سەعی بۆ تەرەقی ئەمە بکا، لاکین بەو شەرتە کە تابیع بە تەرەقیاتی زەمانە بێ.

"دیقەت بفەرمون! ئەمرۆ هیچ میلەتێک نیە کە بە ئیقتیداری خۆی تەرەقی نەکردبێتن. ئەمانە کە تەرەقی‌یان کردوە، لە حەمو چشتێک تابیعی موقتەزەیاتی زەمانە بون، ئەمجا تەرەقی‌یان کردوە.

"مەسەلی مەشهورێک هەیە، دەڵێن: ئەگەر زەمانە تابیعی تۆ نابێ، تۆ تابیعی زەمانە بە! دەزانن ویردی زبانی ئێمە چیە دەڵێن: ئێمە کوردین دەخلمان چیە لەم تەرحە عەجاییاتە، پارویەک نان دەخۆین و شوکری خوا دەکەین. بەڵێ برادەر، ئەم قسەیە راستە، ئینسان لازمە شاکیر و قانع بێ، فەقەت شەرتیشە کە سەعی بکا و جاهیل نەمێنێ و موحتاجی کەس نەبێ. خوداوەندی تەعالا چۆن کە فەرمویەتی شاکیر و قانع بن واش فەرمویەتی سەعی بکەن و عالم بن، جاهیل نەمێنن. چونکە ئینسان بە سەعی دەبێتە ئینسان. ئێمە کوردەکان،

ئەساسەن ئیقتیداری سەعی‌مان هەیە، موتەحەمیلی حەمو جەور و جەفاین، لاکین تەشەبوسمان نیە. دە فـەرمون لە ناو ئەم کوردستانە عەزیمە کەسێکم پیشان بدەن کە ئەم پیاوە تەشەبوسـی چشـتێکی کـردوە، کـە لـە ئـەو چشتە یا خۆی یا ئەفرادی میلەتی یا جەماعەتی ئیستیفادەی کردبێتن.

"حاصڵی عاجز مەبن با راستی بڵێم: ئێمە کە کوردین، لە جوتیاری و فەلاحی زیاتر هیچمان لـە دەسـت نایەت. فیلحەقیقە لە دنیادا لە زوراعی و فەلاحی و توجاری چاتر هیچ صنعەتێ نایەتە فکـر، فەقـەت ئێمـەمانان ئەم صنعەتەش بە تەواوی نایکەین.

"جوتیارێکی قوڕبەسەر، هاوین و زستان، لە بەر ئەم بەفر و باران و هەتاوە، هەر لـە سـبحەینێوە تاکـە ئێوارە، هەر هۆهۆیەتی، جوت دەکا، درەو دەکا، هۆلە دەکا، نیهایەت سەری ساڵ یـا نیـو وەزنـە گـەنم و جـۆی دەست ئەکەوێ یا ناکەوێ، فەقیرە بەمەش خەریک دەمێنێ عەجەبا بیخوا یا بۆ تۆمی ساڵی کە هەڵی گرێ.

"ئەگەر سەعی بکەین و واز لەم تەمەڵیە بێنین، ئەڵبەت شیرکەتێ تەئسیس دەکەین کە بە واسـیتەی ئـەم شیرکەتە، هەم زەراعەتمان، هەم تیجارەتمان تەرەقی بکا و ئیحتیاجمان بە هیچ کەس نەمێنێ.

"ئیستا ئێمە بەم حاڵەش رازی بـوین. مـادام کـە هـەمومان زوراعـین، فـەلاحین، مـەلاکین، هـیچ نـەبێ دەوڵەمەندەکانمان گردۆبن و ماکینەیەکی زەراعەت بهێـنن، کـە بـە سـایەی ئـەم ماکینەیـە نـە ئەوەنـدە توشـی زەحمەت دەبن، نەش ئەوەندە وەقتمان بە هەوا دەچێ، کە ئیشمانیش تەواو بو بە یەکێ کە بـە موقابیـل پـارە دەدەرێ بە زەمان، ماکینەکەش هەر ماکینەیە.

"ماکینە هێنان وەکو بزانن ئەوەندە مەسرەف و زەحمەتی نایەوێ. بە قیسـت دەیفرۆشـن، پارەکەیشـی بەرە بەرە دەدرێ، یەکێکیشی بە مانگانە دەیهێنن حەتاکو فێری ئیستیعمالی دەبن.

"ئێوە تەصەور مەکەن کە بێ ئیتیفاق چشتێ بێتە وجود. مەسەلەن فـەرز بکـەین ئـەمڕۆ پیـاوێ هـەزار قڕانێکی هەیە، مەعلوم کە بەم هەزار قڕانە هیچی پێ نـاکرێ، فەقـەت چەنـد کەسـێ لـە گـەریا ئیتیفـاق بکـا و سەرمایەیە دانێ بە مودەتێکی قەلیل، لاکین بە شەرتی سەعی، دەبێتە تیجارێکی گەورە. ئەگەر ئیتیفاقی لە گـەرا نەکەن ئەو قوڕبەسەرەش نیهایەت مەجبور ئەبێ ئەو پارەیە بخوا، سەفیل بمێنێ.

"بینا لە سەر ئەمـە لازمـە کـە دەوڵەمەنـدەکانمان، تیجارەکانمـان، عالمـەکانمان، دەسـت بدەنـە دەسـتی یەکتری، سەعی بۆ تەرەقی مەعاریف و زەراعەت و تیجارەت بکەن، کە بـەم واسـیتەیە هـەم ئـەفرادی میلـەتمان تەخلیصی نەفسی خۆی لە جەهالەت دەکا، هەم پارویەکی نانی راحەتی دەخوا.

"وە ئیللا موستەحەقی لەعنەتی ئەحفاد و لایقی عیتابی باوک و باپیرمان دەبین."

### 3 .3. عەدالەتی ئیجتیماعیە

لە سەردەمی عوسمانی‌یەکاندا گەندەڵی بەڕیوەبەرایـەتی لـە نـاو فەرمانگـەکانی حکومـەتدا گەیشـتۆتە ئەوپەڕی. بـەرتیلخۆری و دزی و دەسـتدرێژی کردنـە سـەر مـاف و سـامان و مـاڵی هاوولاتی‌یـان لـە هـەمو جێیەکـدا بڵاو بوە. جیاوازی چینایەتی کۆمەڵی دابەش کردبو بە سەر هەژار و دەوڵەمەندا. چینە هـەژارەکان لەوپەڕی هەژاری و کەساسی و بەشخوراویدا بون. یەکێ لەو بابەتانەی لە ناو (بانگی کـورد) ا بـەدی ئـەکرێ داوای جێبەجێکردنی جۆرێکە لە دادی کۆمەلایەتی و چاککردنی باری گوزەرانی چینە هەژارەکان.

جەمال بابـان لـە ژ1 دا لـە ژێـر ناونیشـانی (یـاری) دا کـە مەبەسـتی (یاریـدە و یارمـەتی دانـە) نوسیوێتی:

"یاری دان وەزیفەیەکی دینی و ئیجتیماعی‌یە، لە بەر ئەمـە فـەرزە کـە ئینسـان یـاری تـەرەقی تـەور و تەبیعەت و تەئمینی عومر و سەعادەتی موحتاج و سەفیلەکان بدا.

"ئەمڕۆ لە دنیادا فەقیر و سەفیلەکان عەدەدێکی زۆر گەورەیان تەشکیل کردوە. ئەوانەی کە لە هەرا و بگری حەیات دا دەشکێن و، لە پەیداکردنی نانی ئێوارەشیان عاجزن. بە نیسبەتی ئەو تالعدارانە کە عومرێکی زۆر خۆش و جوان رادەبوێرن، زۆرترن.

"بەرامبەر کەیف و شادمانی دەوڵەمەندەکان، فەقیرەکان شەو و رۆژ خەریکی ئاهـ و فەریادی ئیحتیاج و سەفالەتی خۆیانن.

"پارەدارەکان، بە دەر لە ئیحتیاجی خۆیان کە لە باڵاخانەی زۆر شیرین و عومرێکی لەتیف رادەبوێرن و لە ژیاندن لەزەت دەبینن، فەقیرەکان ناتوانن خانویەکی کۆن و خراپ پێکەوە بنێن.

"خۆلاسە لە مابەینی ئەم دو قیسمە مەخلوقاتە فەرقێکی زۆر گەورە هەیە.

"بە واسیتەی ئەم فەقیری و ئیحتیاجیە زۆر کەس مەحکومی مردن بوە، چونکە ناگەن بەو موساعەدە و موعاوەنەتی هاوجنسی خۆیان، بە هەژاری عومر رادەبوێرن، لە پاشا موحتاجی ئەوانە بۆ ئاخیرەت دەنێرێ. لە بەر ئەمە لازمە کە پارەدارەکان فکر بکەن کە ئەم سەفیلانەش هەروەکو خۆیان ئینسانن و موحتاجی معاوەنەتن، تاکو بێنە مەرحەمەت، باوەشی شەفەقەت و مەرحەمەتی خۆیان بۆ ئەم نەوعە سەفیلانە بکەنەوە. لە بەر ئەمە بەم یاری دانە (وەزیفەی ئیجتیماعی) دەڵێن.

"یاری دان بەوە ناڵێن کە لە کۆڵانێ یا لە بازاڕێ توشی سواڵکەرێ دەبن و دە پارەیەکی پێ ئەدەن. ئەم یاری دانە بۆ بەشەریەت نەکو موعاوەنەت بەڵکو باعیسی زەرەر دەبێ، چونکە ئەو دە پارەیە دەرد و ئالامی ئەو سەفیلە سوک ناکا و سەبەبی خەلاس بونی سەفالەتی نابێ. ئەم موعاوەنەتە بەڵکو سەبەب بۆ کەسی تر کە داخلی ئەم صنعەتە رەزیلە و سەفیلە دەبێ. زۆر سواڵکەر هەیە کە لە ئێوە و لە زۆر کەسی تر دەوڵەمەندترە لە گەڵ ئەمە واز لە سواڵکەری نایەنێ، چونکە لای خۆی لەم صنعەتە راحەتتر نیە. حەتا زۆر کەس هەیە خۆیان عەلیل و بە سەقەت پیشان ئەدەن تاکو پارە قازانج بکەن.

"کەواتا ئەم وەزیفەی معاوەنەتی خۆمان بە چ نەوعێک بە جێ بێنین؟

"ها بەڵێ بە دو نەوع بە جێ دەهێنرێ: ئەوەلی، سەعی و کۆشش کردن چاکبونی ئەخلاقی هاوجنسمان. دوەمین، تەئمینی ئیستراحەت و سەعادەتی بەنی نەوعمان.

"چونکە فەقیرەکان بە واسیتەی فەقیری و هەژاری لە تەداروکی مەعیشەت و ئەسبابی تەربیەی ئەخلاقی‌یان عاجزن. ئەم معاوەنەتە هەم بۆ خۆیان هەم بۆ جەمعیەتی بەشەری‌یە فائیدەیەکی زۆری هەیە. لە بەر ئەمە نەتیجەی ئەم فەقیری‌یە کە زۆر لە ئینسانان مەجبور دەبن کە ئیشی خراپە بکەن.

"دوەمین، کە یاری دانی ئیستراحەت و سەعادەتی بەنی نەوعمانە، ئەمەش هەروەکو معاوەنەتی تەکامولی ئەخلاق وایە، لازمە بە هەر صورەتێ بێ ئەوانە کە لە ئیحتیاجی خۆیان پارەی زیادتریان هەیە معاوەنەتی ئەبنای جنسی خۆی بکا کە بەم واسیتەیە هەم لە دنیادا هەم لە ئاخیرەت دا مەسعود دەبێ."

لە ژ 4 دا لە ژێر ناوی (عەدالەتی ئیجتیماعیە) دا نوسیویێتی:

"عەدالەتی ئیجتیماعیە، لە هەرچی جەمعیەتێ، لە هەرچی عونصورێ دەبێ بێ، حورمەت گرتنی حقوقی ئینسانیەی بەشەری‌یەتە.

"بەشەری‌یەت لەو وەقتەوە هاتۆتە وجود ئەم حەقیقەتەیان تەسلیم و هەر فەردیانشی نائیلی حقوقێکی زۆریان کردوە.

"چونکە هەر قەومێ، هەر فەردێ، بۆ خاتری محافەزە و صیانەتی حقوقی خۆی، مەجبوری حورمەتی حقوقی هەمو کەسێکە. فەقەت ئەم مەجبوریەتە قەتعەن مەحدود نیە و نابێ. شەخصێ، کە مەنسوبی دەوڵەتێ یاخود قەومێ دەبێ، ئەو شەخصە نەکو بە ئەفرادی ئەو دەوڵەتە، ئەو قەومە، بە هەرچی دەوڵەتێ مەنسوب دەبێ

ببێ، حەز ئەکا گـاور بـێ، فـەرهەنگ بـێ، مـادام کـە ئینسـانە، مـەجبوری ریعایـەت و حورمـەتی حقـوقی ئـەو شەخصەیە. چونکە ئەمە لە ئیجاباتی حقوقی ئینسـانی‌یەیە، چونکـە هـەمو ئینسـانێ فیترەتـەن مەزهـەری زۆر حقوقی بوە.

"لە گەر ئەمەش بەعزێ حقوقی هەیە ئەوە مەحدودە. مەسـەلەن عوسـمانلی‌یە انجـق لـە وەتـەنی خـۆیدا مالیکی حەقی ئینتیخابە، لە ئینگلتەرەدا ناتوانێ ئەم حەقە ئیستیعمال بکا، چونکـە هـەر شەخصـێ لـە وەتـەنی خۆیدا مەسئولە.

"عەدالەتی ئیجتیماعیە لە 3 نوقتەی ئەسیاسیەدا ئیجمال دەکرێ:

"1. ئەمنیەتی شەخصیە: چۆن کە حەمو کەسێ ئارەزوی تەئمینی حەیاتی خۆی هەیـە، واش مـەجبوری تەجاوز نەکردنی حەیاتی ناسە. حەمو شەخصێکیش ئەم ئیشتیاقەی هەیە. زاتەن لـە بـەر ئـەم مەقصـەدەیە کـە ئینسانان لە حاڵی جەمعیەتا ئەژین و موتەحەمیلی حەمو تەکالیف و ئەوامیر بون.

"2. حوریەتی هەم جنسانە: مەعلومە کە حەمو ئینسانێ حورە، لە فکر و حەرەکاتی خـۆیدا سەربەسـتە (فەقەت خاریجی قانونی هەیئەتی ئیجتیماعیە و بەشەریە نەبێ). بینائەن عەلەیهی، کەسێ حەقی موداخەلەی فکـر و حەرەکاتی کەسی تری نیە، لازمیشە نەبێ.

"3. حەقی تەمەلوک: تەبیعی‌یە هەر کەسێ بە قەدەر ئیقتیداری خۆی ئەلبەت مڵکێکی، چشـتێکی، دەبـێ. لە بەر ئەمە حەز ئەکا، ئەو مڵکەی، ئەو ماڵەی، مەعروزی تەجاوز نەبێ. حەمو شەخصێکیش مەجبوری ریعایەتی ئارەزوی ئەو شەخصەیە. چونکە ئەم ئارەزوە موتەقابیلە. لە مقاوەلەیـە دەکـا کـە لـە مابـەینی ئینسـانان عەقـد کرابێتن، حەمویان مەجبوری ئەحکامی ئەو مقاوەلەیەن، کە بەم مقاوەلەیـە ئـەربابی حقـوق (مقاوەلـەی ضـمنیە) دەڵێن.

"فەقەت ئینسان موجەرەد بە ریعایەتی ئەم حقوقانـە وەزیفـەی ئیجتیماعیـەی خۆیـان بـە تـەواوی ئیفـا ناکەن چونکە ئەم وەزیفەیە هەر لە (عەدالەت) عیبارەت نیە. چاک بـون، ئیشـتیراکی مەصـائیبی هـەم جنسـان، معاوەنەتی بیکەسەکان. ئەمانەش لە ئەساساتی وەزیفەی ئیجتیماعیەن. فەقـەت گـەورەی وەزائیفـی ئیجتیماعیـە چاک بون و عادل بونە.

"ئینسان لە مانە بە هیچ مەعزەرەتێ خۆی تەخلیص ناکا، فەقەت (معاوەنەت) وا نیە بە جێ هێنانی ئەمـە ئیجرای موقتەزای شەفەقەتە فەقەت بە جێ نەهێنانیشی موجیبی مەسئولیەت نیە. لاکین لای من ئـەو کەسـە کـە ئیقتیداری هەیە و معاوەنەتی هەم جنسی خۆی ناکا بێ ویجدانە، بێ حەمیەتە.

"چونکە عەدالەت ئەفرادێ مەجبوری تەجاوز نەکردنی حقوقی کەسێکی تر ئەکا، فەقەت معاوەنەت وا نیە ئەوە ئەمری یاری هەم جنسان ئەکا. ئەو کەسە کە موحتاجی معاوەنەت بێ ئەگەر نائیلی یاری نەبێ، مەجبوری تەعەروزی حقوقی شەخصی تر دەبێ، کە ئەم حەرەکەتە وەزیفەی عەدالەت تارومار ئەکا.

"بینائەن عەلەیهی منیش بەم واسیتەیە، بەم موناسەبەتە، ئەربابی ئیقتیدارەکانمان دەعـوەتی یـاری دانـی بێکەسەکان دەکەم، کە ئەوەش کوردە، جەهلی کوردە، وەحشەتی کـوردە، بـێ مـەوقیعی کـوردە، بـێ ئەهمیـەتی کوردە."

## 3. 4. ئەدەبیات

بـانگی کـورد لـە شـیعری شـاعیرەکانی پێشـو، لـە ژ1 دا چەنـد شـیعرێکی نـالی و لـە ژ4 دا شیعرێکی مستەفا بەگی کوردی بڵاوکردۆتـەوە. بـەڵام لـە شـیعری شـاعیرەکـانی هاوچـەرخی دو شـیعری بڵاوکردۆتەوە.

لە ژ3 دا (صائیب زادە: سلیمانیەلی محەمەد عارف) لە بەشی (ئەدەبیات) دا نوسیوێتی:

عالەمێ مەشغولی فیکر و کورد خەریکی وەحشەتە
خواردنم زوخاوی جەرگە، من لە داغ ئەم حەسرەتە
ئەمڕۆ دەورێکی ترە، مەیدانی عوشرەت تەنگ بوە،
وەقتی سەعی و غیرەتە هەنگامی بەزلی هیمەتە
خەتوەئەندازی تەرەقی بین لە ساحەی ئاسیا
چونکە ئەوروپا ئەڵێن کورد مایلی هەر وەحشەتە
کەسبی عیلم و مەعریفەت مەقبولی خودا و پێغەمبەرە
رەهبەری فەوزی دو عالەم مایەی صەد حورمەتە
بۆ تەرەقی موڵک و میللەت ئیتیحادمان واجیبە
صەرفی غیرەت چاکە، با غەیبی نەکەین ئەم فرصەتە
هەرچی لایق بێ بە گەورە ئەو بەجێ بێنین بە دڵ
بۆ وەتەن هەر لازمی شەئنی ئەوە ئەم خدمەتە
بۆ تەعالی شەئنی خۆمان هەر لە گەورە تا بچوک
جەهد و سەعی و ئیهتیمام وەڵڵا فەرزی زیممەتە
مەحفەزەی دین و شەریعەتمانە خۆ خاکی وەتەن
ئاوەدانی ئەو بە زۆری عیلم و فەن و صنعەتە
ئیش ئەگەر وابێ وەتەن نورانی و مەعمور ئەبێ
رستگاریمان ئەبێ ئێمەش لە دەست ئەم زوڵمەتە
دوشمنی عیلم و مەعاریف خانەمان وێران ئەکا
زۆر خراپ و موهلیکە دەرمانی کەین ئەم عیللەتە
بانگ وەک بانگی شەرعی عالەمێ هوشیار ئەکا
کولی سەترێکی نەسیحەت، نوقتەشی هەر حیکمەتە
(بانگی کورد) جدەن حەکیمی خەستەگی ئەم قەومەیە
با لە خوابی غەفڵەت و وەحشەوت خەبەرمان بێتەوە
پایەدار بێ تا قیامەت بۆ شفای ئەم میلەتە
حاڵ و ئەوزاعی زەمانە تەعنە، دەرسی عیبرەتە

لە ژ4 دا (سلیمانیەلی: زێوەر) لە ژێر سەردێڕی (بۆ شاگردانی مەکتەب) دا شیعرێکی درێژی بڵاوکردۆتەوە، لێرەدا بۆ نمونە چەند بەیتێکی ئەنوسمەوە:

ئەی گوڵی گەڵزاری دین، ئەی نەونیهاڵانی چەمەن
ئەی لە مەعنادا بە قیمەت، یەک بە یەک دوڕی عەدەن
...
شێربەچەی بێشەی جەلادەت سەر لە لانت هەڵبڕە
سەیری ئەترافت بکە یەکبارە راوی تۆ دەکەن
...

ئەی جەوانانی وەتەن! ئەی روکنی پاکی مەملەکەت!
دەرسی تاریختان کە خوێند، جوغرافیا دیقەت بکەن!
...
تۆش ئەگەر فرسەت لە دەست دەی دەبیە مەملوکی کەسێ
شەو چرا هەڵگر دەبی، رۆژیش دەشۆی جام و لەگەن
...
خواجە ئامیر، ریحلە قەلعە، دوشمنت جەهلە ئەتۆش
وەک موحاریب دەفعی کە ئەم دوشمنە بۆ جیسم و تەن
...
شەو عەلاوەی رۆژ بکەن بۆ خوێندن و بۆ مەعریفەت
لەحزەیە غافل مەبن هەرگیز لە تەعلیماتی فەن

ئەم دو شیعرەی عارف صائیب و زێوەر لە روی ئەدەبی‌یەوە رەنگە نرخێکی ئەوتۆیان نەبێ، بەلاّم لە باری کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری‌یەوە دو شیعری باشن. لاوەکان هان ئەدەن بۆ خوێندن و فێربـون و کـارکردن و، بە جێ نەمان لە کاروانی پێشکەوتنی گەلان.

**4. لە روی هونەری رۆژنامەوانی‌یەوە**

**4. 1. زمانەکەی**

لە بەر ئەوەی ئەم گۆڤارە یەکەم بڵاوکراوەی چاپکراوی کوردی‌یە لە عیراق و لە کوردستانی عیراقدا، بە سەرەتای رۆژنامەوانی‌ی کوردی دائەنرێ لە عیراقدا. هەر لە بەر ئەوە هەوڵم داوە زۆری وتارەکـانی بـۆ ئێـرە رابگوێزم. لەمەیش دو مەبەستم هەیە:

یەکەم،

شارەزا بون لە جۆری کوردی نوسینی ئەو سەردەمە و بەراورد کردنی لە گەڵ هی ئێستا.

دوەم،

شارەزا بون لە جۆری بیرکرنەوەی رۆشنبیرانی ئەو سەردەمە و تێگەیشتن لە بیروبۆچونەکانیان.

زمانی نوسینەکانی بانگی کورد ئەگەر بەراورد بکـرێ لـە گـەڵ زمـانی بڵاوکراوەکـانی ئەسـتەموڵ دو جیاوازی تێدا بەدی ئەکرێ:

یەکەم،

کوردی‌یەکەی بانگی کورد بە تـەنیا لەهجـەی کرمـانجی‌ی خـواروی گرتۆتـەوە، لـە کاتێـکدا ئەوانـەی ئەستەموڵ هەردو لەهجە سەرەکی‌یەکەی تێدایە.

دوەم،

بانگی کورد هەندێ جار لە نوسینەکانیدا رێزمـانی بێچـوە لەهجەیـەکی بـەکارهێناوە، لـە سـەر زمـانی کوردی ئاسایی رەوان نیە، وەکو: بیکاتیش لە باتی بیشی‌کات، لیباسیانیش لە باتی لیباسیشیان، هەمویانیش لە باتی هەمویشیان، ئەربابی عیلممانش لە باتی ئەربابی عیلمیشمان، هەر فەردیانیش لە باتی هـەر فەردێکیشـیان، عەقد کرابێتن لە باتی عەقد کرابێ. هەندێ جاریش لە باتی وشەی (لە گەڵ) وشەی (لەگـەر) و لـە بـاتی وشـەی (هەمو) و (حەمو) ی بەکارهێناوە.

ئەم جۆرە وشە و ڕێزمانە کە هی ناوچەیەکی پچوکی گەرمیان، بە تایبەتی هی کفرییە، تا ئیستایش لە قسەکردندا ماوە بەڵام لە نوسیندا بەکارنەهێنراوە.

ئەم شتە پچوکانە بە هیچ جۆرێ لە نرخی نوسینەکانی بانگی کورد کەم ناکەنەوە. بە تایبەتی چونکە ئەمە یەکەمین هەوڵدانی کوردە لە ولایەتەکانی بەغداد و موسڵ دا بۆ کردنی کوردی بە زمانی رۆژنامەوانی و خوێندن.

## 4. 2. روخسارەکەی

بانگی کورد بە پیتی عەرەبی و بە رێنوسی فارسی چاپ کراوە. هەر ژمارەیەکی 24 لاپەڕە بوە. هەمو لاپەڕەیەکی دو ستونی تێ دا چاپ کراوە. سەردێڕی وتارەکانی بە پیتی درشتتر لە هی مەتنەکانی نوسراوە. نەخش و نیگار و وێنەی تێدا نیە. لە سەر بەرگی ژمارەکانی پێڕستی باسەکانی لە ژێر وشەی تورکی (مندرجات) و وشەی کوردی (تیا نوسراوە) دا بڵاوکراوەتەوە. بەوەدا ئەتوانرێ بە ئاسانی بابەتەکانی پۆلێن بکرێ.

بانگی کورد جگە لە وتار، هەندێ هەواڵ و دەنگوباسی بڵاوکردۆتەوە، لەوانە هەواڵی مردنی ئیسماعیل حەقی بابان و عاسم بەگی بابان و، هەڵبژاردن لە هەندێ ناوچەی عیراق.

ئابونەکەی وەکو نوسیوێتی: "ساڵی چل و پێنج، شەش مانگی بە بیست و پێنج قرۆش" بوە.

بانگی کورد لە چاو هەندێ لەو گۆڤارانەی کە هاوزەمان لە گەڵ ئەو لە بەغداد بە زمانی عەرەبی و تورکی دەرچون لە دواوەیە.

## 4. 3. بڵاوبونەوەی

پێ ئەچێ رۆشنبیرانی کورد لە بەغداد و ئەستەموڵ ئاگایان لە یەکتری هەبوبێ و پێوەندییان لە گەڵ یەکتری بە هێز بوبێ.

لە دوا لاپەڕی ژ1 ی بانگی کوردا لە ژێر سەردێڕی (اجتهاد) ا بە تورکی ئاگاداری خوێندەوارەکانی ئەکا کە دکتۆر عەبدوڵا جەودەت لە ئەستەموڵ حەفتەنامەیەکی ئیجتیماعی، ئەدەبی، ئیقتیصادی دەر ئەکا و، داوا لە خوێندەوارەکانی ئەکا بین بە ئابونەی.

لە دوا لاپەڕەی ژ4 یشیدا لە ژێر سەردێڕی (هتاو کرد) بە تورکی باسی ئەوە ئەکا کە گەنجەکانی کورد لە ئەستەموڵ بۆ خزمەتی تەربیەی فکریە و ئیجتیماعیە هەتاوی کوردیان دەر کردوە، بە (زۆر نەفیس و ئیستفادەلی) بە ناسینی ئەدا و، داوا لە خوێندەوارەکانی ئەکا بین بە ئابونەی.

(هەتاوی کورد) یش لە ئەستەموڵ لە ژ4- 5 یدا لە ژێر سەردێڕی (بانک کرد) دا بە تورکی هەواڵی بڵاوبونەوەی (بانگی کورد) ی لە بەغداد راگەیاندوە. بە ستایشەوە باسی ئەکا و، داوا لە خوێندەوارەکانی ئەکا بین بە ئابونەی.

## 5. جێگەی لە رۆژنامەوانیی کوردیدا

گرنگی بانگی کورد لەوەدایە کە یەکەمین رۆژنامەی کوردییە لە عیراقدا. ئەمە بە سەرەتای نوسینی کوردی دائەنرێ لە ناوچەکەدا. جگە لەوەیش بە هۆی لێکۆڵینەوەی ناوەرۆکی وتارەکانیەوە ئەتوانرێ جۆرێ بیرکردنەوەی هەڵبژاردەی کوردی ئەو سەردەمە، لە کێشە و گیروگرفتەکانی کۆمەڵی کورد و رێگەی چارەسەر کردنیان، بخوێنرێتەوە.

بانگی کورد زۆر بیری نوێی دەربارەی خوێندن و پەروەردە، خوێندنگەی ئەهلی، کاروباری ئابوری، بازرگانی و پێکهێنانی کۆمپانیای بازرگانی، کشتوکاڵ و هێنانی ماکینەی کشتوکاڵ، دادی کۆمەڵایەتی، دامەزراندنی رێکخراو، هێناوەتە کایەوە، کە بۆ ئەو سەردەمە هەموی تازە و بە سود بون و، بناغەی کۆمەڵێکی شارستانی‌یان دائەنا.

# رۆژنامەوانیی کوردی

# لە ساڵانی یەکەمین جەنگی جیهانیدا

## 9. ڕۆژنامەوانیی کوردی لە ساڵانی یەکەمین جەنگی جیهانیدا

## 9. رۆژنامەوانیی کوردی لە ساڵانی یەکەمین جەنگی جیهانیدا

### 1. خاکی کوردستان: پامالی جەنگ

لە 1 ی ئابی 1914 دا یەکەمین جەنگی جیهانی هەڵگیرسا. سەرەتا ئەڵـەمانیا و نەمسـا لـە لایـەک و روسیا و بریتانیا لە لایەکی ترەوە لە شـەڕدا بـون. زۆری نەخایانـد زۆربـەی وڵاتـانی ئـەوروپی گرتـەوە و، دەوڵەتی عوسمانییش دایە پاڵ ئەڵەمانیا و تێکەڵاوی شەڕ بو. کوردستانی ئـەو سـەردەمە دابـەش کرابـو بـە سەر تورکیای عوسمانی و ئێرانی قاجاری دا. کوردستانی ئیستای عیـراق و ناوچـە کوردنشـینەکانی سـوریا بەشێک بون لە دەوڵەتی عوسمانی. ئەگـەرچی حکومـەتی ئێرانـی بـە رەسـمی بێلایـەنی خـۆی لـەو جەنگـەدا راگەیاند، بەڵام هیچ لایەکی جەنگەکە رێزی ئەم بێلایەنییەی نەگرت.

کورد بێ ئەوەی دەست یا دەسکەوتی لە هەڵگیرسـانی جەنگەکـەدا هـەبێ، هـەردو بەشـی عوسـمانی و قاجاریی نیشتمانەکەی بون بە مەیدانێکی گەرمی لەشکرکێشـی و شـەڕ و پیکادانـەکانی سـپاکانی عوسـمانی، روسیا و ئینگلیز. عوسمانی کە بو بە لایەنێکی سەرەکی جەنگ، هێزی مرۆیی سەرانسـەری وڵاتەکـەی سـازدا و، هەرچی توانای چەک هەڵگرتنی هەبو راپێچی مەیدانەکانی جەنگی کـرد. ئـەو داوودەزگـا رۆشـنبیرییانەی کورد لە ئەستەموڵ و بەغداد دای مەزراند بون، هەمویان تێکچون.

لە ساڵانی جەنگدا، لە قەڵەمڕەوی عوسمانی و قاجاریدا هیچ جەریدەیەکی کوردی دەرنەچوە. بـەڵام لـە دەرەوەی دەسەڵاتی ئەوان، لە قـاهیرە (کوردسـتان) و لـە بەغـداد (تێگەیشـتنی راسـتی) دەرچـون. یەکـەمیان، نەتەوەپەروەرێکی کورد بۆ داکۆکی لە مافی نەتەوەیی کورد و، دوەمیـان، دەسـەڵاتی ئینگلیـز وەکـو بەشـێ لـە پرۆپاگاندەی جەنگ دەری کردوە.

### 2. جەریدەی کوردستان

کوردستان خولی سێیەمی هـەمان کوردسـتانی قـاهیرە (1898- 1902) و، کوردسـتانی ئەسـتەموڵ (1909) بوە. ئەمجارەیشیان لە بەر ئەوەی لە قەڵەمڕەوی عوسـمانیدا نـەیان توانیـوە دەری بکـەن. سـورەیا بەدرخان روی کردۆتە قاهیرەی پایتەختی میسر.

ژ1 ی سیێەمین خولی (کوردستان) لە 15 ی زیلقەعیدەی 1335 ک/12 ی ئەیلولی 1917 ز و،
ژ11 ی لە 15 ی رەبیعی سانی/28 ی کانونی دوەمی 1918 ز دەرچوە.

لە هەمو ژمارەکانی‌دا لە ژێـر نـاوی ڕۆژنامەکـەدا نوسـراوە: (پـازدە رۆژا جـارەکی دەردکـەڤێت قنجیـا کرمانج را دخەبتێت جەریدەیی کرمانجایە: پـانزە ڕۆژ جارێـک دەرئـەچێ، بـۆ چاکـەی کـورد تـێ ئەکۆشـێ، جەریدەی کوردانە)

ناونیشانەکەی وەکو خۆی نوسیوێتی: (جهێ نڤیساندنێ مصر القاهرة عولبەک پۆسـتەیی 580: جـێی نوسینی میسر قاهیرە. سنوقی پۆستە 580)

نرخـی دانەیـەکی 1 قەمـەری و، بـۆ یـەک سـاڵ 150 قەمـەری و، بـۆ شـەش مانـگ 80 قەمـەری بوە.

## 2. 1. بڵاوکەرەوەی

لە بن سێیەم ستونی دوالاپەڕەی هەمو ژمارەکانی‌دا نوسراوە: (مـدیر مەسـئول: ئەحمـەد ئـازیزی). ئەم ناوە ناوی نهێنی ئەحمەد سورەیا بەدرخان بوە. سورەیا و جەلادەت و کامەران 3 برا بـون و، کـوڕی ئەمین عالی کوڕی بەدرخان پاشا و، برازای مەدحەت میقـداد بـەگ و عەبـدولڕەحمان بـەگی بڵاوکـەرەوەی کوردستان، بون. بنەماڵەی بەدرخان پاشا کە لە باووباپیرەوە میری جزیـرە و بۆتـان بـون بـە بنەماڵـەی (عەزیزان) ناسراون.

وەکو لە سەر وتـاری ژ1 دا دەرئەکـەوێ دوای ئینقیلابـی عوسـمانی (1908) کـە بەدرخانی‌یـەکان لـە زیندان ئازاد کراون و لە دەربەدەری گەڕاونەتەوە ئەستەموڵ، سورەیا بـەگ ڕۆژنامـەی (کوردسـتان) ی وەکـو خولی دوەمی یەکەمین ڕۆژنامەی کوردی لە ئەستەموڵ دەرکردوە. بەڵام کاتێ کە مەحمود شەوکەت بەگ ئەچێتە ئەستەموڵەوە و دەس ئەگرێ بە سەر دەسەڵاتدا تاوانی کۆنەپەرستی بە پاڵ سورەیا بەگ ئەدەن و، ئەیگرن و ئەیخەنە زیندانەوە، ڕۆژنامەکەیش دائەخەن.

## 2. 2. ئامانج لە دەرکردنی

لە سەروتاری ژ1 دا بە ئیمزای دەستەی نوسەران ئامانجی لـە دەرکردنـی کوردسـتان بـەم جـۆرە رون کردۆتەوە: "لە یەکەم ڕۆژی شەڕدا ئەمانوت ئیستا کاتی ئەوە نیە لە دەوڵەتی خۆمان شتێک داوا بکەین. مادەم ئەو لە گەڵ نەیاران لە شەڕدایە ئێمە دەنگی خۆمان دەرناخەین. ئیمڕۆ ئەبینین کە شەڕ خەریکە کۆتایی بێـت. ئێمە باش ئەزانین کە ئەگەر کەسێک بیەوێ هەقی خۆی بسێنێت پێویستە خۆی ئاشکرا بکـات. دەری بخـات کە شایانی ئەو هەقەیە. لە بەر ئەوەیە کە ئێمە ئەمڕۆ دەنگی خۆمان دەرئەخەین.

"هەمو دەوڵەتان ئەڵێن کە هۆی شەڕکردنی ئێمە ئەوەیە: کە هەمو خەڵک، پچوک گەورە، هـەقی خۆیـان بستێنن. خۆیان ببەن بەڕێوە. ئەگەر ئێمە لە ئیستاوە دەنگی خۆمان دەرنەخەین، نەڵێین ئێمەش هەقمان هەیـە، پاشان لەو ڕۆژەدا کە هەقی خەڵکیان دا، بە ئێمە شتێک نادەن.

"لە بەر ئەمەیە کە ئێمە ئەمڕۆ ڕۆژنامەی کوردستان دەرئەکـەین. تـا ڕێی کـوڕانی میـری ئێمـە: (میـر بەدرخان) بگرین و، بۆ سەندنی هەق و ئازادی کوردان تێ بکۆشین."

## 3. بابەتەکانی

### 3. 1. بابەتی سیاسی

ڕەنگە کوردستان لە هەمو جەریدە و غەزەتەکانی پێش خۆی ئاشکراتر و وردتر، باسی مافی نەتـەوەیی کورد و، جۆری ڕێکخستنی پێوەندی کوردستان و حکومەتی ناوەندیی عوسمانی کردبێ.

کوردستان لە ژ1 ی دا لە ژێر سەرناوی: (عەدەم مەرکەزێتی و موختارییەتی ئیدارەیی) دا نوسیویێتی:

"کاتێ مەشروتیەت راگەیەنرا هەمو خەڵک وایان زانی کە ئیتر رۆژ رەشی ناهەقی تەواو بو، رۆژی راستی لە وڵات دا هەڵات. زۆر خەڵکی عاقڵ وتیان چاکەی وڵات لەوەدایە کە واز لە هەمو شتە کۆنەکان بهێنین، دەوڵەت بە تەقلیدێکی نوێ دابمەزرێنین. زۆرترینی ئەو خەڵکانە وتیان کە بۆ چاکەی وڵات پێویستە واز لەم مەرکەزییەتە بهێنین کە هۆی هەمو خراپییەکە، عەدەم مەرکەزییەت بۆ وڵات قبوڵ بکەین. هەندێ خەڵکی تر وتیان بۆ چاککردنی وڵات عەدەم مەرکەزییەتیش بەس نیە، موختارییەتی ئیدارەیی پێویستە.

"شەڕی 31 ی مارت هەڵگیرسا. جەمعیەت (مەبەستی جەمعیەتی ئیتیحاد و تەرەقییە) ئەمەی بە فرسەت زانی دەستی وەردایە هەمو کاروبارەکانی دەوڵەتەوە. خەڵکی عاقڵ و راستی رەوانەی حەبس و نەفی کرد. هەمو باسێکی چاککردنی وڵاتی داخست.

"جەمعیەت وتی کە ئیتر کەس ناتوانێ دەمی بکاتەوە. دەستی کرد بەوەی هەمو خەڵکی وڵات بە زۆر بکا بە تورک. تا بتوانێ ئەمە بکا دەستی کرد بە ناحەقی کردن لە هەمو خەڵک.

"شەڕی کوردستان، حوران، ئەرناوت و شەڕی تری ناو بەینی وڵاتییان، هەموی لەم ناراستییەوە پەیدا بون و، بونە هۆی ئەوەی لە شەڕی بالقان دا شەرمەزار ببین و لە دەستی بدەین. تا ئێمە باش بزانین جەمعیەتی ئیتیحاد و تەرەقی لە وڵاتی ئێمەدا چی خراپە ئەکەن و ئەیانەوێ بە زۆر هەمو خەڵک بکەن بە تورک، بەسە ئەم فکرێ بکەین لە حاڵی دەوڵەتانی ئینگلیزی، ئالمانی، ئەمەریکایی، ئاوسترییایی لە لایەک و، لە لایەکی کەوە حاڵی دەوڵەتانی موسقۆفی، چینی، فرانسزی، ئیتالیانی. چوار دەوڵەتی یەکەم وڵاتی خۆیان بە عەدەم مەرکەزێتی، موختارییەتی ئیدارەیی بەڕێوە ئەبەن، ئەوانی تر کاروباری وڵاتەکانیان بە مەرکەزێتی و موتلەقێتی بەڕێوە ئەبەن.

"بەم پێیە بەسە تێ بگەین کە مەرکەزێتی نەک هەر بۆ دەوڵەتێکی وەکو هی ئێمە باش نیە کە دانیشتوانەکەی تێکەڵاوە، بە ڵکو بۆ ئەو وڵاتەیش کە خەڵکەکەی یەکە.

"ئەگەر سەرنجی کرمانجێ، تورکێ، عەرەبێ، رۆمێک بدەین و جارێک لە حاڵی ئەوان بفکرین، ئەزانین کە بۆ وڵاتی ئێمە مەرکەزییەتی ئیدارە باش نیە. لە نێوان ئەم خەلکەدا دژایەتی ئەوەندە گەورەیە، بە لامانەوە سەیرە چاوی گەورەکانی دەوڵەت ئەوە نابینن. کاتێ دەوڵەتی عوسمانی دامەزرا دەوڵەتێکی مەزن بو، هۆی ئەوەش ئەوە بو بە ئوسوڵی زەعامەت و تیمار کاروباری وڵات بە رێوە ئەچو. لەو رۆژەوە ئوسوڵی مەرکەزییەتی قبوڵ کرد وڵات تێکچو.

"لە رۆژی راگەیاندنی مەشروتیەتەوە هەتا ئەمرۆ ئەوەندە خراپی بە سەر وڵاتدا هات، هەموی بیری جەمعیەت بو، ئەو بیرەش ئەوەیە کە هەمو خەڵک بە زۆر بکەن بە تورک. جەمعیەت نایەوێ ئەم خراپییە ببینێ، دیسان هەوڵ ئەدا بمانکا بە تورک. پێش ئەوەی بڵێین عەدەم مەرکەزییەت و موختارییەتی ئیدارە کامیان بۆ ئێمە پێویستە، باسی عەدەم مەرکەزییەت ئەکەین کە چیە و، موختارییەتی ئیدارە بە چ شێوەیەکە؟"

ئینجا بە زنجیرە لە ژ10 بە شارەزاییەوە ئەم باسە تاوتوێ ئەکا و، بە شێوەیەکی زانستی (نەناوەندێتی: عەدەم مەرکەزییەت) و (ئۆتۆنۆمی: موختارییەتی ئیداری) رون ئەکاتەوە. نمونە لە دەستور و قانونی چەندین وڵات ئەهێنێتەوە، وەکو فەرەنسە، ئەڵمانیا، نەمسا. باسی جۆری بەڕێوەبردنی داگیرەکانی بریتانیا و فەرەنسە ئەکا و ... لە کۆتایی دوا وتاری ئەم بابەتەدا لە ژ10 دا نوسیویێتی:

"دەوڵەتێک کە دانیشتوانی لە یەک ئایین و لە یەک نەتەوەن نەناوەندێتی بەسە تا خەڵک کاروباری خۆی بە باشی جێبەجێ بکات. بەڵام دەوڵەتێک کە دانیشتوانی لە روی ئایینی و نەتەوەییەوە تێکەڵن نەناوەندێتی بەس نیە، پێویستە ئۆتۆنۆمییان پێ بدرێ.

ئینجا لە ژێر سەرناوی (لە موختارییەت و عەدەم مەرکەزییەت کامیان بۆ ئێمە لازمە؟) ئەپرسێ و خـۆی وەڵام ئەداتەوە: "ئەگەر ئێمە چاو بە وڵاتانی بێگانە و وڵاتی خۆمان دا بگێڕین ئەبینین لە وڵاتی ئێمـەدا هـیچ شتێ چارەی دەردی ئێمە ناکا جگە لە موختارییەتی ئیدارەیی.

"عەدەم مەرکەزییەت بە تەنیا بۆ ئێمە بەس نیە. ئێوە پێمان مەڵێن ئێمە زیادەڕەوی ئەکـەین کـە ئـەڵێین عەدەم مەرکەزییەت بۆ ئێمە بەس نیە. لە عەدەم مەرکەزییەتدا دیسان حکومەتی مەرکەزی ئەتوانێ دەس بخاتـە کاروباری وڵاتەکەی ئێمەوە.

"ئێمە کرمانج، لە حکومەتی ئەستانبوڵ ئەوەندە خراپی و ناکەسیمان دیوە، لـە پاشـا و نـازری مـەزنی عوسمانی ئەوەندە درۆمان دیوە، کە ئیتر ناتوانین قبوڵ بکەین کە ئەو مرۆڤانە تێکەڵاوی کاروباری وڵاتەکـەی ئێمە ببن.

"گەورەپیاوانی عوسمانی ئەڵێن ئەترسین ئەگەر موختارییەتی ئیدارە بە کرمانج بدەین، لە پاشـا ئـەوان ئیستیقلالی خۆیان ئیعلان بکەن.

"ئێمە بەوانە ئەڵێین کە کرمانج قەت ناخوازن لە حکومەتی عوسمانی جـودا بـبن. بـۆ ئـەوەی لـە گـەڵ ئەوانـدا بمێننەوە کرمانج لە هەمو کاتێکا و لە هەمو جێیەکا یارمەتی عوسمانییان داوە هـەمو شـتێکیان قبـوڵ کردوە تا لەوان جیا نەبنەوە. ئێمە ناڵێین کە ئێمە نامانەوێ لە وان جیا ببینەوە بە هۆی ئەوەی حەز لە تـورک ئەکەین، ئێمە هەمو شتێک قبوڵ ئەکەین، هەمو فیداکارییەک ئەکەین بۆ ئەوەی لە گەڵ عوسمانیدا بمێنینەوە لە بەر ئەوەیە کە ئێمە ئەزانین ئەگەر ئێمە لە عوسمانی جیا ببینەوە بۆ ئێمە باش نیـە. ئێمـە بـاش ئـەزانین کـە ئەگەر ئێمە لە حکومەتەکانی ئەوروپا تەنیا بمێنین ئەو دەم مردنی ئێمەیە.

"ئێمە دیسان ئەڵێین کە ئەگەر حکومەتی عوسمانی دیسان لە سەر عینـادی و ناحـەقیی خـۆی بمێنـێ، نایەوێ حەقی موختارییەتی کرمانج قبوڵ بکا ئێمەش ئیتر ئەڵێین: یـا هـەرۆ یـا مـەرۆ، ئـەوەی کـە ئێمـە بـە عوسمانییەوە گرێ ئەدا ئەیشکێنین، خەبات بۆ ئیستیقلالی خۆمان دەس پێ ئەکەین.

"مرۆڤ ئەتوانێ بڵێ ئەگەر ئێمە ئەمە بکەین ڕەنگە مردنی ئێمەی تێدا بێ. بەڵێ ئەمە مردنی ئێمە بـێ، ئەرێ لازمە ئێمە ئەوەش بزانین کـە مـردن سـەد جـار خۆشـترە لـەم حاڵـەی کرمـانج تـابیعی پیـاوی وەکـو عەبدولحەمید و وەکو تەلعەت و ئەنوەر بێ.

"ئێمە با بمرین بۆ سەندنی حەق و ناموسی میللەتەکەمان."

ئەم وتارانە بە کوردی نوسراون لە هەمان کات دا بە تورکییش بڵاوکراونەتەوە.

### 3. 2. بایەخدان بە مێژوی کورد

لە ژ1 دا لە ژێر ناونیشانی: (خبرکی دو) نوسیوێتی: "تا نەتەوەیەک خۆی لە بیر نەکات، شـتی باشـی باپیرانی فرێ نەدات، پێویستە بزانێت تا ئەو ڕۆژە چۆن بەرێوە چون، چییان کردوە، چۆن بون. نەتەوەیـەک کە ئەم شتانە نەزانێت وەک منالێک وایە کە نەزانێت باوک و دایکی کێن، لە چ ماڵێکە، خۆی لـە بیـر ئـەکات، وردە وردە نەتەوایەتیی خۆی ون ئەکات.

"کورد تا ئەمڕۆ خۆی لە بیر نەکردوە. خەڵکی عەشائیر لە منالییەوە لە دایکـی خۆیـان وەک چیـرۆک ئەبیستن باپیرانیان چی بون، لە کوێوە هاتون، چۆن بەرێوە چـون؟ خـەڵکی شـار ڕەوشـتی خۆیـان لـە بیـر کردوە، لە تورک و عەرەب ڕەوشتیان وەرگرتوە.

"تا ئەمڕۆ کەسێک نەینوسیوە کورد لە کوێوە هاتون، چ مرۆڤێک بون، چۆن بەرێوە چون. ئێمـە بـاوەڕ ناکەین کە کورد وەک هەمو خەڵک خۆی نەناسیبێت. لە گەڵ ئەوەش دا کتێب کە لە بەر دەست دا نەبێت ئێمـە

ناتوانین لەم رۆژی شەڕەدا بۆ هەمو شوێنێک نامە بنوسین. لە بەر ئەوە ئێمە ناتوانین ئیستا وەک ئەمانەوێت کتێب بنوسین. بەڵام ئێمە کتێبێکمان دی بە زمانی فارسی نوسراوە لە بارەی کوردەوە، لە کوێوە هاتون، چۆن بەرێوە چون.

"ئەم کتێبە ئەوەندە باشیش نیە. هەمو شتێک بە راستی و تەواوی ناڵێت. بەڵام ئێمە وتمان لە هیچی نەبو باشترە. لە بەر ئەوە ئێمە لە هەر ژمارەیەک دا بەشێکی ئەم کتێبە ئەنوسین. ئەم کتێبە ساڵی 1050 ی عەرەبی شەرەف خان کوڕی شەمسەدین خانی بدلیسی، جێگای بەهەشت بێت، بە دەستی خۆی نوسیویتی. ساڵی 1860 ی فەرەنگی لە شاری پەترۆگراد ڤلادیمیر ڤلیامینۆڤ زیرنۆڤ چاپی کردوە. بەر لەوەی دەست بهاوینە کتێبەکە، پێویستە بۆ گیانی شەرەف خان فاتیحەیەک بنێرین چونکە ئەم کتێبەی بۆ خەڵکی خۆی نوسیوە. رحمة الله علیه رحمة واسعة."

لە ژ2- 11 لە هەمو ژمارەیەکیدا بەشێکی لە شەرەفنامە، کە لە بنەڕەتدا بە فارسی نوسراوە، بە کرمانجی و، لە ژ2 - 10 بە تورکی بڵاوکردۆتەوە.

## 3 .3. نامەی خوێنەران

لە ژ3 دا کاغەزێکی (مەلا ا. کامی) کە لە (جامیعەی ئەزهەر) ەوە هاتوە بڵاوکردۆتەوە، ئەڵێ: کورد لە چوار ملیۆن زیاترن بەڵام لە ناو گەلاندا کەس باسیان ناکا، کاتێ میلەتان ئەژمێرن ناڵێن کوردیش هەیە و حەقی هەیە. سەبەبی ئەمەش ئەوەیە کورد بێ تاریخ و بێ جەریدەیە، ئیشی دنیا و سیاسەتی عالەم نازانن. ئینجا باسی دەرکردنی رۆژنامەی کوردستان و دامەزراندنی رێکخراوێک ئەکا کە بۆ مەزنی و بڵندی کورد تێ ئەکۆشێ. داوا ئەکا کورد مەکتەب بکەنەوە و، بە زمانی خۆیان بنوسن و کتێب دابنێن و، وڵاتی خۆیان لە دەس خەڵکی کە دەربهێنن و خۆیان ئیدارەی بکەن. ئەو رێکخراوە لە گەڵ ئەوروپاییەکان گفتوگۆ بکا تا بزانن لە دنیادا کوردیش هەیە و داوای حەقی خۆی ئەکا.

ئەو رێکخراوەی ئەم باسی ئەکا ئەبێ هەمان (حیزبی سەربەخۆیی کوردستان) بێ کە بارەگاکەی لە قاهیرە و ئەحمەد سورەیا بەدرخان سکرتێری بوە و، راستەوخۆ دوای کۆتایی جەنگ چەند نامە و یادداشتی بۆ کاربەدەستانی بریتانی نوسیوە.

لە ژ4 دا (عەبدولستار ئەلکوردی) لە کاغەزێکی کەدا ئەویش باسی پێویستی کردنەوەی مەکتەبێکی ئیبتیدائی بۆ خوێندنی کوردی و، چاککردنی حەرفی نوسین و، دانانی کتێبی صەرف و نەحو و، دەرکردنی رۆژنامە ئەکا. دامەزراندنی جەمعیەتی کوردی بە کارێکی باش دائەنێ.

لە ژ6 دا کاغەزێکی (مەلا کرمانج ا. کامیل) ی بڵاوکردۆتەوە. ئەمیش باسی خوێندن و نوسینی کوردی و کردنەوەی خوێندنگا ئەکا، دو بەیتی شیعرێکی حاجی قادر بە نمونە ئەهێنێتەوە، ئەڵێ:

هەر کوردە لە بەینی کولی میلەت  
بێ بەهرەیە لە خوێندن و کیتابەت  
میلەتی بێ کتێب و بێ نوسین  
غەیری کوردان نیە لە روی زەمین

ئینجا ئەڵێ ئەگەر شەڕ و عەداوەت و شیقاق و نیفاق لە ناو ئێمەی کوردا نەبوایە، خوێندن و نوسینمان بە کوردی بوایە، هەمو کورد لە گەڵ یەک رێک بونایە، بێگومان ریاسەتی عالەم ئەکەوتە دەس کورد. بۆ پشتیوانی لە قسەکانی شیعرەکەی ئەحمەدی خانی ئەڵێتەوە:

گەر دی هەبویا مە ئیتیفاقەک
فیکرا بکرا مە ئینقیادەک
ڕۆم و عەرەب و عەجەم تەمامی
حەمیان ژ مەرا دکر غولامی
تەکمیل دکر مە دین و دەولەت
تەحصیل دکر مە عیلم و حیکمەت

ئەڵێ: بەڵام ئێمە: مەلا و مەشایخ و شاعیر و فەقیران چی بکەین، شتێ بـە دەسـتی ئێمـە نیـە، عـار و عەیب ئەمیر و حاکمی کوردان ئەگرێتەوە، ئەم بەیتەی خانی ئەڵێتەوە:

ناموسە لە حاکم و ئەمیران
تاوان چیە لە شاعیر و فەقیران

لە ژ7 دا میر ئەحمەد ئازیزی وەڵامی مـەلا کرمـانج ا. کـامیلی داوەتـەوە. ئـەمیش سـوچی دواکـەوتنی کـورد ئەخاتە ئەستۆی مەلا و شاعیرەکان چونکە خەڵک هوشیار ناکەنەوە، بۆ سەلماندنی قسەکانی نمونـە بـە میـر حسـێن کەنعان و میر عوسمان، کە دو کوڕی بەدرخان پاشا بون، ئەهێنێتەوە کە 25 سـاڵ لەوەوبـەر چونـە جزیـرەی بۆتـان تورکیان لێ دەرکرد، شەڕیان دژی عەبدولحەمید ڕاگەیاند، کەچی کورد لە بەر ناکۆکی ناوخۆی لایەنی تورکیـان گـرت، پاش چەند مانگ شەڕ تورک هەردو میریان گرت و هێنایانن بۆ ئەستەموڵ حەپسیان کـردن. ئینجـا ئەپرسـێ: ئـەم بێ ئیتیفاقی‌یە لە کوێوە دێ؟ سوچی کێ‌یە؟ من ئەڵێم سوچی مەلایە، هی شاعیر و عالمە.

لە ژ8 دا (ع. کوردی) بە ناونیشانی (دوخازم چەند کالکلا بکەم) ئەڵێ:

میلەت کە لە عەناصیری موختەلیف پێک هاتبێ، بڵند بونی ئەو میلەتە بە یەکبونی زمـان و بـە یـەکبونی قانون نیە، بەڵکو بە یەکبونی مەنفەعەت ئەبێ. نمونە بە سویسرا ئەهێنێتەوە کە لە 25 کانتۆن پێک هـاتوە و، هەر کانتۆنێکیش سەربەخۆیە لەوانی کە و قانونی تایبەتی خۆی هەیە.

لە ژ9 و 10 دا دو نامـەی (مـەلا تـەها جزیـری) بڵاوکردۆتـەوە. نـاوەرۆکی نامـەکانی ئـەمیش وەکـو کاغەزەکانی ترە.

### 3.4. هەواڵەکانی جەنگ

(ژ شەڕێ چ دەقەومێ) گۆشەیەکە لە ژ1 و 2 و 3 تەرخان کراوە بـۆ هەواڵـەکانی جـەنگ، دوای ئـەوە ئیتر ئەم گۆشەیە بـە کرمـانجی نـەماوە، بـەڵام هـەمان گۆشـە بـە تـورکی (خلاصـە اخبـار حربیـە: کورتـەی هەواڵەکانی جەنگ) لە 1- 10 بەردەوام بوە.

لەم گۆشەیەدا بە کورتی دەنگوباسی مەیدانە جیاوازەکانی یەکەمین جەنگی جیهـانی نوسـیوە، هـەواڵی شکانەکانی ئۆردوی عوسمانی لە مەیدانەکانی جەنگ دا باس کردوە و، ئۆباڵەکەی خستۆتە ئەسـتۆی سـەرانی ئیتیحاد و تەرەقی.

لە ژ11 دا هەواڵی ڕێکەوتنی ڕوسیای سۆڤێتی و ئەڵمانیای بڵاو کردۆتەوە.

### 4. لە ڕوی هونەری ڕۆژنامەوانی‌یەوە

### 1.4. زمانەکەی

کوردستان بە دو زمانی کوردی و تورکی‌ی عوسمانی نوسراوە. بەشە کوردی‌یەکەی هەموی بە زاراوەی جزیرەی بۆتانە. هەر 11 ژمارە لاپەڕەی یەکەمی بە کوردی‌یە و، لە هەندێ ژمارەی‌دا هەمو لاپەڕەی دوەمـی و،

لە زۆری ژمارەکانیدا ستونێ یان نیو ستونی لاپەڕەی دوەمی بە کوردیە، ئەوی تری تورکیە. ئەوەی سەرنج رائەکێشێ هەندێ جار لە باتی حەرفی کاف قافی بەکارهێناوە، وەکو: (قوڕ: کوڕ) و (قوشتن: کوشتن) و (قانتۆن: کانتۆن).

### 4. 2. شێوە و روخساری

هەمو ژمارەکانی 4 لاپەڕەن، بە قەوارەی 28.5 x 41 سم. هەر لاپەڕەیەک 3 ستونی تێدا نوسراوە. لە بن سێیەمین ستونی چوارەمین لاپەڕەی هەمو ژمارەکانیدا نوسراوە: (مطبعة ابي الهول بجوار دار الكتب الخديوية لصاحبها عثمان فهمي).

کوردستان وێنە و نەخشە و سەردێڕی درشتی تێدا نیە، بەڵام لە روی چاپ و رێکخستنی بابەتەکانی و دابەشکردنی ستونی لاپەڕەکانیەوە، رۆژنامەیەکی جوانە و، هاوتای رۆژنامەکانی هاوزەمانی خۆی ئەبێ.

زۆری بابەتەکانی وتاری سیاسیە، تەنانەت وتارە قانونی و کۆمەڵایەتیەکانیشی بۆ مەبەستی سیاسی نوسراون. وتارەکانی بە ناوەرۆک دەوڵەمەند و بەنرخن. هەواڵ و دەنگوباسی زۆری مەیدانەکانی جەنگی تێدایە. هەروەها نامەی خوێنەران. بابەتی ئەدەبی تێدا نیە.

### 5. جێگەی لە رۆژنامەوانیی کوردیدا

کوردستان لە هەلومەرجێکی مێژویی گرنگ دا دەرچوە. لە سەردەمێکدا بوە کە ئەنجامی جەنگ خەریک بو دەر ئەکەوت. لە لایەکەوە بریتانیا و فەرەنسە و روسیا بە نهێنی رێککەوتنی سایکس- پیکۆ یان ئیمزا کرد بو، میراتیەکانی دەوڵەتی عوسمانییان لە ناو خۆیاندا دابەش کرد بو، لە لایەکی ترەوە پرنسیپەکانی ویلسن، سەرکۆماری ئەمەریکا، مژدەی ئازادبونی بە گەلانی ژێردەستەی تورک دابو. کوردستان لەو کاتەدا هاتۆتە مەیدانەوە بۆ داواکردنی مافی نەتەوەیی کورد.

کوردستان پێش تەواوبونی جەنگ راوەستاوە. هۆی راوەستانی دیار نیە. بەڵام دوای جەنگیش سورەیا لە چالاکی سیاسی نەکەوتوە. بە ناوی (سەرۆکی پارتی سەربەخۆیی کوردستان) دوە چەند نامە و بیرخەرەوەی بۆ کۆنفرەنسی ئاشتی و کاربەدەستانی ئینگلیزی نوسیوە داوای سەربەخۆیی بۆ کوردستان ئەکا.

### 6. ئینگلیز و رۆژنامەوانی لە عیراقدا

### 6. 1. رۆژنامەکانی بەسرا

لە 22 ی تشرینی 1914 هێزی ئینگلیز لە بەسرا دابەزی و داگیری کرد. ئەو دەم لە پاڵ (مطبعة الولاية) ی موڵکی حکومەتدا، 3 چاپخانەی ئەهلی یش لە بەسرادا هەبون. ئینگلیز دەستیان بە سەر هەر چواریاندا گرت و، کەوتنە دەرکردنی پەخشەیەکی رۆژانەی ئینگلیزی و عەرەبی. لەم پەخشەیەدا هەواڵی مەیدانەکانی جەنگ لە رۆژهەڵات و رۆژئاوادا، بڵاو ئەکرایەوە. پاش ماوەیەک ئەم پەخشەیە کرایە (جريدة يومية سياسية ادبية مصورة: جەریدەیەکی رۆژانەی سیاسی ئەدەبی وێنەدار)

سەرەتای ساڵی 1915 کاربەدەستانی ئینگلیز کەوتنە بڵاوکردنەوەی (Basra Times). ئەم رۆژنامەیە بە 4 زمانی: عەرەبی، ئینگلیزی، فارسی، تورکی ئەنوسرا. چونکە دەسەڵاتی ئینگلیز دوای برانەوەی جەنگیش هەر لە بەسرا مایەوە، ئەم رۆژنامەیەش ماوەی 5 ساڵ بەردەوام بو.

**6.2. ڕۆژنامەکانی بەغداد**

هێزەکانی ئینگلیز لە 11 ی ئازاری 1917 دا چونە ناوشاری بەغدادەوە و داوودەزگای عوسمانی‌یان لێ دەر کرد.

لە 4 ی تەموزی 1917 دا کاربەدەستانی ئینگلیز ڕۆژنامەی (العرب) یان دەرکرد. لە ژێر ناوەکەیدا نوسرا بو: (جريدة يومية سياسية اخبارية تاريخية ادبية عمرانية عربية المبدأ والغرض).

نوسەرە ناسراوەکانی بەغداد لەم ڕۆژنامەیەدا بەشدار بون، وەکو: باوە ئەنستاس ماری کەرمەلی، شوکری فەزلی، عەبدولحسەین ئەلئیزری، جەمیل زەهاوی، کازم دوجەیلی، مەهدی بەصیر.

لە 1 ی تشرینی یەکەمی 1917 یشدا کەوتنە بڵاوکردنەوەی پەخشەی وێنەداری (صدى الحقيقة) بە عەرەبی کە تەرخان کرابو بۆ وێنە و هەواڵەکانی جەنگ. بەڵام لە 23 ی حوزەیران دا ئەمیان ڕاگرت و، (الملحق المصور لجريدة العرب: پاشکۆی وێنەداری جەریدەی عەرەب) یان لە باتی ئەو بڵاوکردەوە.

کاربەدەستانی ئینگلیز بڕیاریان دا لە سەری ساڵی 1918 ەوە 3 ڕۆژنامەی تر دەربکەن، ئەوانەش: (بەغداد تایمس: Baghdad Times) ڕۆژانە بە زمانی ئینگلیزی، (ایران) حەفتانە بە زمانی فارسی، (تێگەیشتنی ڕاستی) حەفتانە بە زمانی کوردی.

ڕۆژنامەی (العرب) لە ژمارەی ڕۆژی 7 ی کانونی دوەمی 1918 دا لەم بارەیەوە نوسیوێتی:

"هەرئەوەندە پێی تورک لەم خاکە پیرۆزە بڕرا سروەی بەیان گیان و بیری خەڵکی فێنک کردەوە، لەکۆت و زنجیر قوتار بون و لەم وڵاتەدا بزوتنەوەیەکی ڕوناکبیریی... ئەوتۆ دەستی پێکرد کە قەت لەوێنەیمان نەدیوە مەگەر ئەوە نەبێ لەرێگەی مێژووەوە دەرحەق سەردەمی ئاوەدانی عەباسی‌یان بیستومانە.

"تورکان ڕۆشتن و لەپیسی بەولاوە هیچیان بەجێ نەهێشت بونیان بیرخاتەوە... ئەوان دوو ڕۆژنامەیان هەبو (زورا) کە تورکی و هی میری بو (الزهور) کە ئۆرگانی کۆمەڵێ زۆردار و تاوانبار بو. هەردوکیان چ لەڕوی ڕێبازەوە چ لەروی زمان و شێوازەوە نزمترین ڕۆژنامەی جیهان بون.

"بەڵام ئیمرۆ کار بەجۆرێکی تر بەڕێوە دەبرێ. هەرئەوەندە تورکان ڕۆشتن ئەم ڕۆژنامەیە (واتە العرب) دەرچو. لە گەڵ هەڵهاتنی ڕوی ساڵی نوێی 1918 یش لە بەغدا سێ ڕۆژنامەی تر کەوتنە دەرچون: یەکێکیان ناوی تایمسی بەغدایە، ڕۆژانە و ئینگلیزی زوبانە. دوەمیان (تێگەیشتنی ڕاستی) و سێیەمیان (ئێران) ە ... ئەم سێ ڕۆژنامەیە هی ئەو نەتەوانەن کە لەم شارە دەژین: عەرەب و ئینگلیز، کورد و فورس. دەوڵەتی بەریتانیا هەمو نەتەوەیە هان دەدا بۆ دامەزراندنی هەر شتێ بیر و ئاواتی دەربڕێ. سوپاس بۆ یەزدان کە دەوڵەتێکی پێ بەخشین چۆن پێویستە کار وا دەنرخێنێ و ڕێگەی هەموان دەدا بەهەوای خۆیان، تاخوا دەڵێ بەس، بنوسن."

**6. 3. تێگەیشتنی ڕاستی**

لە 1 ی کانونی دوەمی 1918- 27 ی کانونی دوەمی 1919 لە بەغداد بە زمانی کوردی و بە ڕێنوسی فارسی و بە حەرفی عەرەبی بە 4 لاپەڕە و بە قەوارەی 36 × 24 سم دەرچوە. لە ژێر ناوەکەی دا نوسراوە: (ڕۆژنامەیەکی سیاسی و ئیجتیماعی و خادیمی یەکبون و سەربەستی کوردانە). بە هەموی 67 ژمارەی لێ دەرچوە. مێجەر سۆن سەرپەرشتی و بە هاوکاری شوکری فەزڵی دەری کردوە. سەرەتا حەفتەی 2 ژمارە و دواتر حەفتەی 1 ژمارەی لێ دەرچوە. ئەم ڕۆژنامەیە کاربەدەستانی ئینگلیز وەکو بەشێ لە پروپاگاندەی جەنگ دەریان کردوە. کە جەنگ کۆتایی هاتوە ئەمیش راوەستاوە. گەلێ باس و بابەتی ئەدەبی، سیاسی، مێژویی، شیعری شاعیرەکانی کوردی تێدا بڵاوکراوەتەوە.

ژماره ( ٦ ) ١٩ کانون ثانی ١٩١٨ | سی شمه | ٦ ربیع ثانی ١٣٣٦ سالی یکم

بو ناو مملکت بوده‌ره‌وه
روپیه روپیه
بو ١٠٠ ژماره ٦ ٨
بو ٥٠ ژماره ٣ ٤
قیمتی هر ژماره‌یی آنه یکه

# تی که یشتن راستی

مخابره‌له گل اداره‌خانه روژنامه
دبی بکری ژماره ١٢٨/٩
نوسینه‌یی که موافق مسلکمان
بی دینوسین اگر نه‌یی نایکه‌ریینوه
هر هفته دوجار دەردچی : له بغداد

روژنامه‌یکی سیاسی واجتماعی وخادمی یك بون وسرفتی کرده

بقیهٔ نطق لوید جورج

دولتان مرکزی هیشتا پی دنکن . وهر چند حکومتان محارب وبی طرف، دیانبزوینن لم شره جییان دوی پیأتی نا کن ، وخبریان پایمه ندا که درحق بیاجیکه فکریان چیه . اوی له‌اخبار مهمهٔ شروط صلح دفامریتوه امه یه که : المانیا له داوا کردنی مستعمره کانی خوی واز ناهینی . له امه‌ش وادرا کوی که فکر ادارەی خو بخوی اقوام هیچ دمیینوه . چونکه له لفظ ( بی ضم ملك وبی پاداش حرب ) معنای اداره خو بخوی وسربست ماوه اقوام نافامریتوه . دولتان مرکزی دبی تی بکن که تا حقیقت عصر حاضر تواوو زورچاك تزانن دركای صلح کردنوه هیچ ممکن نیه . وقت معاهدهٔ ( ویانه ) روبی دزمانیکی زوری بسردا‌ییر بو . امرو ایمه نا توانین یادی بمستقبل ( اوروپا ) و ( مدنیت ) بکین ومقدرات سیاسیه او بمعاهدانی که نتیجهٔ مذاکراتیکی کورتی ، پر فیل وظلم وغرضیشی محافظه‌ی‌او پادشاه یا او امته بی بسپیرن ، اوروپای تازه دبی له سر اساسیکی محکمی حق وعدالت بنابکری که مستقبلی له پریشانی محفوظ بی ، معاهدەی صلحی که امضا کننده کانی بو احترام شرطه کانی همو فداکاری که لازمه اختیاری نکن البته لوکاغذه بقیمترنابی که له سری دنوسری ،

له برامه امرو اول طلب انکلتره ومتفقکانی کراندن استقلال تواو ( بلجیکه ) بی سیاسی واقتصادیه وبژاردنی او ضررانه که بشاره کانی کیشت . ام ضمانه لپاداش حرب سال ١٨٧١ ناکا که بنالمانی ورکیرا ولمه‌ش مقصد مان اوه نیه که پاداش حرب له دولتی بستینین وبیکیکی تری بدین . بلکو ایمه دمانه‌وی اوکسانه بکرین که کونه اساس قوانین اوروپا وحق تعویض ضرردان بجی بینین . چونکی بی ام دوانه صلح حقیقی ممکن نابی .

طلب دوم : کراندنوەی ( صربیه ) و ( قره طاغ ) واراضیٔ ( فرانسه ) و ( رومانیا ) و ( ایتالیا ) یه چونکی اول شرطی آشتی لم جیکانه لشکر کیشانوه‌یه وپاداش ضرر دانوه‌یه .

ایمه له سرامه ین که هتاماوین دست فرانسه‌ی دیموقرات بکرین وحق اوخراپیانه بکین که له سالی ١٨٧١ به فرانسزکان کیشت چونکی دو مملکت لو جوی کرایه ده وبی آرزوی خلقه کی بایمپراتوری المانیا درا وله برام غدره ( اوروپا ) نیو عصر بی اسایش ما .

امه محققه که تا هر کسی بحطلبی خوی نکا امور عالم له سر محور خوی ناکری وکس آشتی وراحتیکی عمومی چاوپی نا کری . له مه خراپترچیه که دولتی بزرور لشکر موقت خوی حق اقوامی تربلینه ژیر پی ،

تی که یشتن راستی

کسانی که معاهدەی ( ویانه ) یان امضا کرد همو وکلای پادشاهان بون ، مرخص امت نبون . وله برامه او قرارانه که درا همو مغایر آرزوی اقوام وعناصر بو بویه زمانیکی دریژ راحت اوروپای سلب کرد . بلی او طرزه ادارەی قدیمه که له پیش سالی ١٧٨٩ بو تواو اعاده نکرایه‌وه . تنها چوار مملکت المان وحکومت ( پاپا ) نبی شاره کان المانیا و ( وندیك ) و ( جنوه ) وحکومات کلیسا همو حال اصلی محافظه نکرد . وبسر حکومتان ترحابش کران .

**چەند تێبینی‌یەک**

1. 1. د. کەمال فوئاد ژ1- 11 ی خولی سێیەمی (کوردستان) ی ساڵی 1998 لە سلێمانی سەرلەنوێ لە گەڵ پێشەکی‌یەکدا چاپ کردۆتەوە.

1. 2. شێرزاد عەبدولکەریم وتارە تورکی‌یەکانی ئەم جەریدەیەی کردوە بە کوردی. بنکەی ئەدەبی و روناکبیری گەلاوێژ بە ناونیشانی (کوردستان: یەکەمین رۆژنامەی کوردی) بڵاوی کردۆتەوە. بەڵام ئەوەندە هەڵەی چاپی تێ کەوتوە هەندێ وتاری شێواوە.

2. ژمارەکانی رۆژنامەی (تێگەیشتنی راستی) لە بەر دەسدا نین*. بەرگێکی ئەم رۆژنامەیە لە کتێبخانەی ئەنستاس ماری کەرمەلی‌یەوە گەیشتۆتە کتێبخانەی (مەتحەفی عیراقی). د. کەمال مەزهەر لە بەر ئەو بەرگە لێکۆڵینەوەیەکی بە نرخی نوسیوە و، لە کتێبێکدا بڵاوی کردۆتەوە. سەرچاوەی زانیاری‌یەکانی ئێمە ئەو کتێبەیە. بڕوانە:

د. کەمال مەزهەر ئەحمەد: (تێگەیشتنی ڕاستی: شوێنی لە رۆژنامەنوسی کوردیدا)، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغداد، 1978.

*** دوای چاپی یەکەمی ئەم کتێبە، بنکەی ژین بۆ بوژاندنەوەی کەلەپوری بەڵگەنامەیی و رۆژنامەگەری، تێگەیشتنی راستی کۆ و چاپ و بڵاوکردۆتەوە.**

# بەشی دووەم:

# چەند لاپەڕەیەک لە مێژوی ڕۆژنامەوانیی کوردی

# ساڵانی نێوان دو جەنگی جیهانی

# 1938 –1918

**ناوەندەکانی ڕۆژنامەوانیی کوردی دوای یەکەمین جەنگی جیهانی**

# 1. ئەستەموڵ

## 1. 1. کوردەکانی ئەستەموڵ

له 30 ی تشرینی یەکەمی 1918 ز دا دەوڵەتی عوسمانی ئاگربڕی لەگەڵ دەوڵەتانی هاوپەیمانی یەکەمین جەنگی جیهانی ئیمزا کرد. ئەستەموڵ کەوتە ژێر دەسەڵاتی ئینگلیزەوە. ئینگلیز جۆرێ لە ئازادیی سیاسی و رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی بۆ خەڵک دابین کرد. ئەستەموڵ گەورەترین ژمارەی هەڵبژاردەی کوردی لێ بو. بە دەیان کەسایەتی سیاسی، سپایی، قانونی، دینی و کۆمەڵایەتی تێدا کۆبوبوەوە، بە تایبەتی لە بنەماڵە ناسراوەکانی شەمزینان، بەدرخان، بابان.

لە سەردەمی جەنگدا، سەرکۆماری ئەمریکا، ویدرۆ وێلسن پرەنسیپەکانی خۆی، بە موافەقەتی هاوپەیمانەکانی بڵاوکردبوەوە، کە یەکێکیان سەلماندنی مافی ئازادیی بڕیاردانی چارەنوسی گەلانی نەتورکی ناو دەوڵەتی عوسمانی بو. لەو کاتەدا کوردەکانی ئەستەموڵ ئومێدێکی گەورەیان بە هاوپەیمانەکان بوە کە مافی نەتەوەیی کورد دابین بکەن. دوابەدوای راگرتنی جەنگ، هەڵبژاردەی کورد لە ئەستەموڵ کەوتە چالاکی جۆراوجۆری سیاسی، دیپلۆماسی، رۆشنبیری و کۆمەڵایەتی.

### 1. 1. 1. پێکهێنانی رێکخراوی سیاسی

له ژ2 ی 9 ی کانونی سانی 1919 ی (کوردستان) دا سەید محەمەدی شێخ عەبدولقادر (ساڵی 1925 ئەمیش لەگەڵ باوکی لە دیاربەکر لە سێدارە درا) لە ژێر ناوی: (انباء ابناء الوطن) واتە: (دەنگوباسی رۆڵەکانی نیشتیمان) دا بە عەرەبی وتارێکی نوسیوە تێیدا ئەڵێ:

"ئێستایش دەوڵەتانی ئەوروپا بڕیاریان داوە ئەنجومەنێ لە پایتەختی فەرەنسەدا پێکبهێنن بۆ باسی ئەو کارە گرنگانەی پێویستن، لەوانە کە بە واتەوات بڵاوبۆتەوە، نیازیان هەیە چارەنوسی کوردستان کە بریتیە لە 6 ولایەتەکەی ئەرزرۆم و سیواس و دیاربەکر و مەعمورەتولعەزیز و بەتلیس و وان... بێ ساردی بڕیار بدەن...

"هەمو عولەما و وزەرا و ئومەرا و توجار و پیشەکاران لە کوردە نەجیبەکان بە سەرۆکایەتی... شێخ سەید عەبدولقادری کوڕی شێخ سەید عەبدوڵڵا، لە ئەندامانی مەجلیسی ئەعیان، کۆبونەوە و کۆمەڵەیەکیان پێک هێنا کە ناوی (جەمعیەتی کوردستان)ە بۆ لێدوان و هەوڵی ئەوەی لەم روەوە گرنگە... "

ڕێکخراوی (جڤاتا بلندی‌یا کوردستان) کوردستان تەعالی جەمعیەتی کە بە سەرۆکایەتی شێخ عەبدولقادری شەمزینی دامەزرا، ڕێبەرایەتی کوردەکانی ئەکرد و، لەبەردەم حکومەتی عوسمانی و، لە بەردەم نوێنەرانی هاوپەیمانەکاندا بە تایبەتی لە بەردەم حاکمی بریتانی‌دا لە ئەستەموڵ و، لە بەردەم کۆنفرەنسی ئاشتی‌ی پاریس‌دا نوێنەرایەتی کوردی ئەکرد. ئەم ڕێکخراوە سەرەتا هەمو کوردەکانی ئەستەموڵی سەرەڕای جیاوازی بیروبۆچون و ناوچە و ناکۆکی بنەماڵەیی لە خۆی کۆ کردبوەوە. بۆ ڕێکخستنی کاروباری ڕۆشنبیری و پیشەیی خوێندکاران و ژنان هەندێ ڕێکخراوی تری دامەزراند.

ئەم یەککگرتوییەی کورد زۆری نەخایەند، لە پاڵ ڕێکخراوی (جەمعیەتی تەعالی کوردستان: جڤاتا بلندی‌یا کوردستان) دا چەند ڕێکخراوی سیاسی تر دامەزران، لەوانە: (جەمعیەتی تەشکیلاتی ئیجتماعیە) بە سەرۆکایەتی ئەمین عالی بەدرخان، (پارتی دیمۆکراتی کورد) بە سکرتاریەتی مەمدوح سەلیم بەگ.

### 1. 1. 2. پێکهێنانی ڕێکخراوی ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی

لەو ماوەیەدا چەند ڕێکخراوێکی ڕۆشنبیری و پیشەییان پێک هێنا، لەوانە: ڕێکخراوی خوێندکاری (جەمعیەتی هێڤی فەقێی کوردان) یان دامەزراندەوە، جەمعیەتی هێڤی ساڵی 1912 ز لە ئەستەموڵ دامەزرابو، بەڵام بە هۆی جەنگەوە لە چالاکی کەوت بو.

بۆ کردنەوەی خوێندنگە و بڵاوکردنەوەی خوێندەواری و چاپی کتێب، ڕێکخراوێکی ڕۆشنبیری و پەروەردەییان بە ناوی (تەعمیمی مەعاریفی جەمعیەتی) دوە پێک هێنا.

بۆ بایەخدان بە کاروباری ئافرەتان ڕێکخراوێکی تایبەتیان بۆ ئافرەتانی کورد بە ناوی (قادینلەر تەعالی جەمعیەتی) دوە دروست کرد. بێگومان ئەمە لە چاو هەلومەرجی کۆمەڵایەتی ئەو سەردەمەدا، هەنگاوێکی شارستانی گەورە بوە.

### 1. 1. 3. تەقەلای دیپلۆماسی

جڤاتا بلندی‌یا کوردستان دەسەڵاتی دا بە جەنەراڵ شەریف پاشای خەندان کە بە نوێنەرایەتی کورد گفتوگۆ لەگەڵ دەوڵەتانی ئەوروپی بکاو، بۆ سەلماندنی مافی نەتەوەیی کورد لە کۆنفرەنسی ئاشتی پاریس‌دا بەشدار بێ.

(ژین) لە سەر بەرگی ژ25 ی وێنەی شەریف پاشای چاپ کردوە و، لە لاپەڕەی 9 دا هەمان وێنەی دوبارە کردۆتەوە. لە ژێری‌دا بە کوردی و تورکی نوسیویێتی: "هەیئەتا کو ل پاریسێ‌دا حەقی کوردان و کوردستانرا خدمەتێ دکە، رەئیسێ وان جەنابێ شەریف پاشا".

شێخ عەبدولقادری شەمزینی و خۆی و هەندێ لە هاوکارەکانی، چەند جارێ کاربەدەستانی ئینگلیزییان لە ئەستەموڵ بینی و، لەسەر مافەکانی کورد و پاشەڕۆژی کوردستان گفتوگۆیان لەگەڵ کردون.

لە هەمان کاتدا چەند جارێ گفتوگۆیان لەگەڵ کاربەدەستانی عوسمانی کردوە.

### 1. 1. 4. دەرکردنی ڕۆژنامە

لە دوای ڕاگرتنی جەنگ، کوردەکانی ئەستەموڵ کەڵکیان لەو ئازادییە وەرگرتوە کە بۆیان ڕەخساوە. ئیجازەی دەرکردنی چەند ڕۆژنامەیەکیان وەرگرتوە:

### 1. 2. کاتنامە کوردیەکانی ئەستەموڵ

#### 1. 2. 1. ژین (1918– 1919)

ژ1 ی لە 17 ی تشرینی دوەمی 1918 دا، واتە 17 رۆژ دوای راگەیانـدنی ئـاگربڕی مـودروس و، ژ25 ی، لە 2 ی تشرینی یەکەمی 1919 دا لە ئەستەموڵ دەرچوە. لە ژ1- 20 حەمزە (حەمزە موسکی) صاحیبی ئیمتیاز و مدیری مەسئولی بوە، لە ژ21 بە دواوە مەمدوح سەلیم بۆتە صاحیبی ئیمتیاز و مدیری مەسئولی.

لە ژێر ناوەکەیدا بە تورکی نوسراوە: (غەزەتەیەکی حەفتانەیە. مەجموعەیەکی تورکی- کوردیە بۆ باسی دین، ئەدەبیات، ئجتماعیات و ئیقتیسادیات).

تا ژ34 ی بە شێوەی گۆڤار دەرچوە. دوای ئەوە هەر مەمدوح سەلیم کردویەتی بە رۆژنامە. لەم کتێبەدا لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆ لە سەر (ژین) هەیە.

لەم بەشەدا لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتی لەسەر ئەم غەزەتەیە نوسراوە.

#### 1. 2. 2. کوردستان (1919–1920)

ساحیبی ئیمتیازی محەمەد میهری و سەر موحەڕیری ئەوراسی زادە (محەمەد شەفیق) بوە. ژ1 ی لە 31 ی کانونی دوەمی 1919 دا و، ژ19 ی لە 27 ی مارتی 1920 دا لە ئەستەموڵ دەرچوە. بە تورکی عوسمانی و، بەهەردو لەهجەی خوارو و سەروی کرمانجی و، هەندێ وتار و شیعری بە عەرەبی و فارسی تێدایە. بەمجۆرە بە تورکی خۆی بە ناسین داوە: (حەفتەنامەیەکی سیاسی، ئیجتماعی، ئەدەبی، عیلمیە).

ئەوەی تا ئیستا زانراوە، ئەمە چوارەمین غەزەتەی کوردیە بە ناوی (کوردستان) ەوە دەرچوبێ.

جاری یەکەم (1898- 1902 ز) کە میقداد مەدحەت بەدرخان لە قاهیرە، دەستی کرد بە بڵاوکردنەوەی.

جاری دوەم (1908) کە سورەیا بەدرخان، دوای سەرکەوتنی ئینقیلابی عوسمانی، لە ئەستەموڵ دەری کردوە.

جاری سێیەم (1917) دیسان کە سورەیا بەدرخان، لە قاهیرە دەستی کرد بە بڵاوکردنەوەی.

تا ئیستا هەمو ژمارەکانی نەدۆزراونەتەوە و نازانرێ چەندی لێ دەرچوە.

لەم بەشەدا لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتی لەسەر ئەم غەزەتەیە نوسراوە.

#### 1. 2. 3. بڵاوکراوەی تر

لەم ماوەیەدا هەندێ کتێب و نامیلکەی ئەدەبی و ئاینی بە کوردی لە ئەستەموڵ بڵاو کراوەتەوە، لەوانە: (ئەنجومەنی ئەدیبان) ی ئەمین فەیزی، (مەم و زین) ی ئەحمەدی خانی، (عەقیدا) مەلا خەلیلی سیعرتی، (عەقیدا) مەلا ئەحمەدی خانی، (گازیدا وەلات) و(پیەسی مەمی ئالان) و (عەقیدا کوردان) ی عەبدولڕەحیم ئەفەندی.

### 1. 3. کۆتایی چالاکی

هەڵبژاردەی کوردی قورسایی چالاکیەکانی خۆی خست بوە ئەستەموڵ. تا ئەندازەیەکی زۆر کوردستانی چۆڵ کرد بو، لە کاتێکدا مستەفا کەمال کوردستانی کرد بو بە ناوەندی چالاکیەکانی خۆی و، لەوێوە هەوڵیدا دەس بە سەر هەمو تورکیادا بگرێ. بە سەرکەوتنی مستەفا کەمال چالاکی کوردەکانی ئەستەموڵ کۆتایی هات. بگرە زۆریان بە یەکجاری پەرەوازە و دەربەدەری وڵاتان بون، دواتریش هەندێکیان لە سێدارە دران.

# 2. سلێمانی

## 2. 1. سلێمانی دوای یەکەمین جەنگی جیهانی

### 2. 1. 1. شێخ مەحمود: لە نێوان تورک و ئینگلیزدا

لە دەمە دەمـــی بـــڕانەوەی یەکەمـــین جەنگـــی جیهـــانیدا، کە نیشـــانەکانی شـــکانی تـــورک و سەرکەوتنی بریتانیا لە دەرکەوتـندا بـو، هەلـومەرجی شـاری سـلێمانی و دەوروبەری زۆر خـراپ بـو. زۆری دوکان و بازاڕ و خان و خانو و کاروانسـەرا و حەمـام و مـزگەوت و قوتابخانەکـانی وێـران بوبـون. وەکـو هەندێ سەرچاوە ئەگێڕنەوە: لە 3 کەسـی دانیشـتوانی سـلێمانی، 2 کەسـی فەوتـا بـون، تەنیـا 1 کەسـی بە زینـدویی مـابو. هێزەکـانی بریتانیـا خـوارو و ناوەڕاسـتی عیراقیـان گـرت بـو، هەڵئەکشـان بەرەو موسـڵ. هێزەکـانی عوسـمانی لە بەردەم پێشـڕەوی ئینگلیـزدا ئەشـکان و ئەکشـانەوە. شـێخ مەحمـود ناسـراوترین کەسایەتی سیاسی و دەسەڵاتداری نـاوچەی سـلێمانی بـو، لە سـاڵانی جەنـگدا 2 جـار هێـزی موجاهیـدینی کوردی برد بو بۆ بەشداری شەڕ. جارێکیان بۆ قوڵی پێنجوین بۆ بەرهەڵستی هێزی روس و جارێکی تر بـۆ بەرهەڵستی ئینگلیز لە شوعەیبیە.

شێخ مەحمود شـارەزای زوڵـموزۆری کاربەدەسـتانی عوسـمانی بـو. هەروەهـا پرنسـیپەکانی وێلسـنی سەرکۆماری ئەمریکی سەبارەت بە سەلماندنی مافی ئازادی چارەنوسی گەلانـی نەتـورکی نـاو ئیمپراتـۆریەتی عوسمانی بیست بو.

کە هێزی ئینگلیز لە 7 ی مایسی 1918 دا گەیشتە کەرکـوک، شـێخ مەحمـود نـامەی بـۆ نوسـین، بەڵام هێزەکانی ئینگلیز لە 24 ی هەمان مانگدا لە کەرکوک کشـانەوە. نـامەکەی شـێخ مەحمـود، لە بـاتی ئەوەی بگـاتە شـوێنی مەبەسـت، کەوتە دەسـت تـورک. لەسـەر ئەوە شـێخ مەحمودیـان گـرت و حـوکمی ئیعدامیان دا. لەو کاتەدا باری تـورک گـلا بـو، لە ئیعـدام کردنـی شـێخ مەحمـود نەک هـیچ قازانجێکیـان نەئەکرد، بەڵکو ئەبـو بە هـۆی نەڕەزایـی زۆرتـری خەڵـک لە تـورک. عەلـی ئیحسـان پاشـا، سـەرکردەی لەشکری تورک، شێخ مەحمودی بەخشی. کە کاربەدەستانی تورک سلێمانی‌یـان بەجـێ هێشـت، کاروبـاری ناوچەکەیان بە شێخ مەحمود سپارد.

رەوتی شەڕ وەکو دیار بو بە قازانجی ئینگلیز و بە دۆڕانی عوسمانی تەواو ئەبـو. لە 25 ی تشـرینی یەکەمی 1918 دا هێزی ئینگلیز گەیشتە کەرکوک. ئەگەرچی لە 31 ی تشـرینی یەکەمـی 1918 دا شـەڕ لە نێوان عوسمانی و ئینگلیز دا راگیرا، بەڵام هێزەکانی ئینگلیز بەرەوژور پێشڕەوییان کـرد. لە 10ی تشـرینی دوەمـی 1918 دا چـونە نـاو شـاری موسـڵەوە، بەمەیـش هەر 3 ولایەتەکەی عراقیـان خسـتە ژێـر دەسـتی خۆیانەوە.

شـــێخ مەحمـــود دوای پرســـکردن و راوەرگرتنـــی کـــۆمەڵێ لە پیاومـــاقوڵانی ســـلێمانی و ســـەرۆکی عەشیرەتەکانی دەوربەری، نامەیەکی بۆ کاربەدەستانی ئینگلیز نوسی، بە دەستەیەکی نوێنەرایەتی‌دا ناردی بـۆ کفری. شێخ لە نامەکەی‌دا داوای لێ کردن کە گەلی کوردیش لە ریزی گەلانی ئازاددا دابنێن و نوێنەری خۆیـان بنێرن بۆ سلێمانی. بریتانیا ئەودەم گەورەترین زلهێزی دنیا بو.

### 2. 1. 2. شێخ مەحمود: حوکمداری کوردستان

کاربەدەستانی بریتانی بە گەرمی پێشەوازییان لەم نامەیە کرد. کۆلۆنێل ویلسن حاکمی عامی عیراق، بە نوێنەرایەتی حکومەتی بریتانی، مێجەر نۆئێلی نارد بۆ سەردانی شێخ مەحمـود لە سـلێمانی. مـێجەر نۆئێـل لە کفرییەوە بە رێ کەوت بەرەو داریکەلی و لەوێوە بۆ سلێمانی. بە درێژایی رێگا خەڵک وەکو نـوێنەری هێـزی

ئازادییەخش و خۆشی هێن، پێشـوازی گەرمیـان لـێ کـرد. لە سـلێمانی لە 17 ی تشـرینی دوەمـی 1918 لە کۆبونەوەیەکی جەماوەریدا کە زۆری سەرۆکی عەشیرەتەکانی ناوچەکە و دانیشتوانی سلێمانی تێیدا بەشـدار بون، نۆئێل بە ناوی حکومەتی بریتانیی‌یەوە، شێخ مەحمودی بە حوکمداری کوردستانی جنوبی ناساند. نۆئێل خۆی بو بە موستەشـاری سیاسـی حوکمـدار و، چەنـد ئەفسـەرێکی تـری بریتـانیش بـۆ مەشـقی لەشـکر و کاروباری بەڕێوەبەرایەتی لە سلێمانی دانران. ئەم هەنگاوەی بریتانیا دو کێشەی لە دوای خۆی بە جێ هێشت کە هەتا ئێستایش گەلی کورد لە عیراقدا بە دەستیانەوە گیری خواردوە:

کێشەی یەکەم:

ئینگلیز وڵاتێکی بە ناوی کوردستانەوە ناسـی، بەڵام سـنوری جوگرافیـایی ئەو کوردسـتانە کوێیـە؟. ئەوسا هیچ دەوڵەت، یـا حکـومەت، یـان داوودەزگـایەک هێشـتا بە نـاوی عیـراقەوە نە هەبـو، نە دامەزرابـو. کوردستانی جنوبی وەکو ئەوسا پێی ئەوترا، بەشێکی لەسەر ولایەتی موسڵ و بەشێکی لەسەر ولایەتی بەغـداد بو. ئینگلیز شێخ مەحمودی بە حوکمـداری کوردسـتانی جنـوبی ناسـی، بەڵام سـنوری جـوگرافیـیان دیـاری نەکرد. شێخ مەحمود لە سلێمانی و ناوچەکانی دەوروبەریدا مایەوە، دەسەڵاتی حوکمڕانی نەگەیشتە هەولێـر و بادینان و گەرمیان.

کێشەی دوەم:

ئینگلیـز مـافی گەلـی کـوردی لە سـەر بنچینـەی حوکمـدار و حوکمـدارێتی ناسـی، بەڵام حوکمـدار و حوکمدارێتی چیە و، تەعریفـی قـانونی و سیاسـی و بەڕێـوەبەرایەتی ئەم زاراوانە چـین؟. ئینگلیـز ئەم وشـە نائاشنایەی هێنایە کایەوە، لە کاتێکدا زاراوەیەکی لەو بابەتە لە قانونی دەستوریی عوسمانی یان ئینگلیـزیدا نەبو.

ئەم دو کێشەیە کە بون بە هۆی تێکچونی پێوەندی شێخ مەحمـود و ئینگلیـز و هەڵگیرسـانی شـەڕ و شۆڕش، دواتر لە هەمـو گفتوگۆکـانی کـورد و حکومەتەکـانی عیـراقدا رەنگیـان داوە. سـنوری جـوگرافی کوردستان کوێیە و مافەکـانی نەتەوەی کـورد لە عیـراقدا، تەنیـا رۆشـنبیری و بەڕێـوەبەرییە، ئۆتۆنـۆمی‌یە، فیدراڵی‌یە، یان کۆنفیدراڵی‌یە، بە دیاری نەکراوی مایەوە.

### 2. 1. 3. شێخ مەحمود: دیلی ئینگلیز

شـێخ مەحمـود لە هەڵسـەنگاندنی هێزەکـانی خـۆی و هێزەکـانی بریتانیـادا، هەروەهـا لە هەڵبژاردنـی تاکتیکەکانی جەنگ و کات و شوێنی روبەڕوبونەوەکەدا بە هەڵەدا چو. لەبەرئەوە شـەڕەکەی دۆڕانـد و، رۆژی 18 ی حوزەیرانی 1919 بە بریندار لە دەربەندی بازیاندا بە دیل گیرا. لە بەغداد لە دادگایەکی ئینگلیزی-دا، حوکمی هەڵواسینی درا.

شێخ مەحمود مادەی 12 هەمی پرنسیپەکانی وێلسن کە بەڵێنی مافی ئازادی بڕیـاردانی چارەنوسـی بە گەلانی نەتورکی ژێر دەسەڵاتی عوسمانی دابو، کرد بە بنچینەی دیفاع لە خۆی و لە ناقانونی بونی دادگاکەی. لەندەن حوکمی ئیعدامی شێخ مەحمودی پەسەند نەکرد و گـۆڕیـان بـۆ: ئەبەد و دورخسـتنەوەی بـۆ یەکـێ لە جزیرەکانی هیندستان، کە ئەوسا کۆلۆنی‌یەکی بریتانی بو.

هێزی ئینگلیز سلێمانی داگیر کرد و، خۆی لە رێگەی ئەفسەرەکانیەوە راسـتەوخۆ کەوتە بەڕێـوەبردنی کاروباری ناوچەکە. مێجەر ئێدمۆندس کە ئەفسەری سیاسـی هێـزەکە بـو، بـو بە حـاکمی سیاسـی کـاتـی سلێمانی.

**2. 1. 4. مێجەرسۆن: حاکمی سلێمانی**

مێجەرسۆن، کە دوای مێجەر نۆئێل کرا بو بە مستەشاری سیاسـی شـێخ مەحمـود، بەرلەوەی شـەڕ لە نێوان هێزەکانی شێخ مەحمود و ئینگلیزدا بقەومێ، بە ئیجازە سلێمانی بە جێ هێشت بـو، دوای داگیرکردنـی، گەڕایەوە و بو بە حاکمی سیاسی سلێمانی.

مێجەرسۆن، سەردەمێک بە خۆگۆڕین لە کوردستان ژیا بو. زمانی کوردی بە قسـە و نوسـین ئەزانـی، شارەزای مێژو، ئەدەب، زمان، شار و دێهات و خێڵەکانی، لەوەش گرنگتر شارەزای مێنتاڵیتەیتی، کورد بو.

**2. 1. 5. یەکەمین چاپخانە لە سلێمانی**

سۆن، ئەو کاتەی بو بە حاکمی سیاسی سلێمانی، چاپخـانەیەکی لە سـلێمانی دامەزرانـد. ئینگلیـز ئەم (پیاوەتی!) یەی بە تەنیا لەگەڵ سلێمانی نەکردوە، هەمو (لیوا) کانی ئەو زەمانەی کە دوایـی (دەوڵەتـی عیـراق) یان لێ دروست کرد، سەرو چاپخانەیان لێ دامەزراند، ئەوەی سلێمانی لە هەمویان پچوکتر و کۆنتر بوە.

سۆن، پیاوێکی دڵسۆزی سیاسەتی دەرەوەی دەوڵەتە کۆلۆنیـالی‌یەکەی بـوە، ئەو دەوڵەتەی ئەو زەمـانە ئەوەندە فراوان بوە ڕۆژ لە ئاڵاکەی ئاوا نەبوە. سۆن بۆ هەر مەبەسـتێ ئەم چاپخانەیـەی هێنـابێتە سـلێمانی، ئەنجامەکەی بەوە شکایەوە ڕۆشنبیرانی سلێمانی ئەم چاپخانەیەیان کرد بە بنـاغەی دامەزرانـدنی قوتابخـانەی ڕۆژنامەوانی‌ی سلێمانی و، زیندو هێشتنەوەی زمانی کوردی و، سەرەنجام بـڵاو کـردنەوەی هۆشـی نەتەوەیـی کورد.

بە دوای پێشکەوتن‌دا کە سۆن دایمەزرانـد، ڕۆشـنبیرانی سـلێمانی سـەرەڕای بـاری نـاهەمواری پـڕ لە شەڕوشـۆڕ و بۆردمـان و چـۆڵکردن، بەردەوام بـون لەسـەر دەرکردنـی ڕۆژنـامە و بەدوای یەکـدا (بـانگی کوردستان، ڕۆژی کوردستان، بانگی حەق، ئومێدی ئیستیقلال) یان دەرکرد.

**2. 2. ڕۆژنامەکانی سلێمانی**

**2. 2. 1. پێشکەوتن (پیشکوتن)**

ژ1 ی لە 29 ئەیلولی 1920ز دا دەرچوە. ژ118 ی لە 27 ی تەموزی 1922 ز دەرچـوە. 4 لاپـەڕە بوە، (32-20 x سم). هەموی بە کوردی نوسراوە. دەسەڵاتی ئینگلیـزی دوای بەدیلگرتنـی شـێخ مەحمـود و داگیرکردنی سلێمانی، بە هاوکاری ڕۆشنبیرانی ئەو سەردەمە، دەری کردوە.

لەم بەشەدا لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆ لەسەر (پێشکەوتن) نوسراوە.

**2. 2. 2. بانگی کوردستان (بانک کوردستان)**

ساحیبی ئیمتیاز و مدیری مەسئول و سەر موحەڕیر: مستەفا پاشای یـامڵکی و مـوحەڕیری کـوردی و فارسـی: عەلـی کەمـال و م. نـوری بـون. ژ1 ی لە 2 ی ئـابی 1922 ز دا و ژ13 ی لە 3 تشـرینی دوەمـی 1922 لە سلێمانی دەرچوە. خۆی بەمجۆرە بە ناسین داوە: (علمی، ئیجتماعی، ئەدەبـی، غەزەتەیەکـی حـوڕ و سەربەستی میللیە. هەفتەی جارێک دەردەچێ). هەندێ ژمارەی 4 و هەندێکی 6 لاپەڕە بوە، (32-20 x سم). وتارەکانی بە کوردی و تورکی و فارسی نوسراون.

مستەفا پاشا لەبەرئەوەی لە کابینەکەی شێخ مەحمودا بوە بە ڕەئیسـی مەعـاریف (وەزیـری پەروەردە)، وازی لە غەزەتەکەی هێناوە، بەڵام دوای ئەوەی شێخ مەحمود لە ئەنجامی هێرشی ئاسمانی و زەمینی بریتانیادا سلێمانی بە جێ ئەهێڵێ، مستەفا پاشـا لێـی جیـا ئەبێـتەوە و، دەس ئەکـاتەوە بە دەرکردنـی. ژ14 ی بـانگی

کوردستان لە 8 ی حوزەیرانی 1923 لە سلێمانی و، ژ14- 1 ی لە 28 ی کانونی دوەمی 1926 و ژ14- 2 ی لە 15 ی شوباتی 1926 و ژ14 - 3 کە دوا ژمارەیەتی، لە 1 ی نیسانی 1926 دا لە بەغداد دەرچوە.

لەم بەشەدا لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆ لەسەر (بانگی کوردستان) نوسراوە.

## 2. 2. 3. ڕۆژی کوردستان (روز کوردستان)

سەر موحەڕیر و مدیری مەسئول: م. نوری و موحەڕیر: عەلی کەمال بوە. بەمجۆرە خۆی بە ناسین داوە: (سیاسی، ئەدەبی، ئیجتماعی، غەزەتەیەکی رەسمیە، هەفتەی جارێک دەردەچێ)، 4 لاپەڕەیە، (32 x 20 سم) ە.

ژ1 ی لە 15 ی تشرینی دوەمی 1922 دا و ژ 15 ی کە دوا ژمارەیەتی، لە 3 ی مارتی 1923 دا دەرچوە. زمانی حکومەتەکەی شێخ مەحمود بوە. بە هۆی پەلاماری ئاسمانی و زەمینیەوە بۆ سەر سلێمانی، راوەستاوە.

لەم بەشەدا لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆ لەسەر (ڕۆژی کوردستان) نوسراوە.

## 2. 2. 4. بانگی حەق (بانک حق)

بە هۆی هێرشی بریتانیەوە شێخ مەحمود ناچار بو لە سلێمانی بکشێتەوە. بەڵام لەگەڵ خۆی چاپخانەکەی برد و، لە ئەشکەوتی جاسەنە لە ناوچەی سورداش دایمەزراند، (بانگی حەق) ی پێ دەرکرد.

ژ1 ی لە 8 ی مارتی 1923 دا و ژ3 ی کە دوا ژمارەیەتی، لە 12 ی نیسانی 1923 دا دەرچوە. بەمجۆرە خۆی بە ناسین داوە: "سیاسی، ئەدەبی، ئیجتماعی، غەزەتەیەکی رەسمیە لە قەرارگاهی عمومی ئۆردوی کوردستان تەبع دەکرێ".

هێزی ئینگلیز پەلاماری ناوچەکەی دا، ئەشکەوتی جاسەنەی گرت و چاپخانەکەی گێڕایەوە بۆ سلێمانی.

لەم بەشەدا لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆ لە سەر (بانگی حەق) نوسراوە.

## 2. 2. 5. بانگی کوردستان (خولی دوەم)

## 2. 2. 6. ئومێدی ئیستیقلال (امید استقلال)

هێزی ئینگلیز لە پاش چەند حەفتەیەک لە سلێمانی ئەکشێتەوە. هێزی شێخ مەحمود سلێمانی ئەگرێتەوە. بەڕێوەبەرایەتی کوردی دەس ئەکاتەوە بە بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەیەک بە ناوی (ئومێدی ئیستیقلال) ەوە.

ژ1 ی لە 20 ی ئەیلولی 1923 ز و
ژ25 ی کە دوا ژمارەیەتی، لە 15 ی مایسی 1924 دا دەرچوە.
ژ1- 3 ئەحمەد سەبری،
ژ4 - 13 رەفیق حیلمی و

ژ14- 16 حسێن نازم، سەرنوسەری بون.

ژ17- 25 ناوی کەسی لەسەر نیە.

هێـزی هاوبەشـی ئینگلیـزی و عیراقـی بە هاوکـاری هێـزی ئاسـمانیی بریتـانی پەلامـاری سـلێمانی ئەدەنەوە. ئەیگرنەوە و بە یەکجاری ئەیبەستنەوە بە حکومەتی عیراقەوە. ڕۆژنامەکەش ڕائەوەستێ.

لەم بەشەدا لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆ لەسەر (ئومێدی ئیستیقلال) نوسراوە.

### 2. 2. 7. بڵاوکراوەکانی تر

سلێمانی لەو سەردەمەدا تەنیا یەک چاپخانەی حکـومەتیی پچـوکی لـێ بـوە. ئەویـش لەو هەلـومەرجە نائارامەدا کاری کردوە. جگە لە ڕۆژنامەکانی سلێمانی، کاروباری حکومەتیشی پێ جێبەجێ کراوە.

ژمـارەیەکی کەم نـامیلکە و کتێـب بڵاوکراونـەتەوە وەکـو: نـامیلکەی (تەعلیمـی تـاقم) کە بـۆ مەشـقی سەربازەکانی ئۆردوی کوردستان نوسراوە، (دیوانی ئەشعاری مەحوی) کە عەلی کەمال باپیر کۆی کردۆتەوە.

## 3. ورمێ

### 3. 1. جوڵانەوەی سمکۆ

پێش هەڵگیرسانی یەکەمین جەنگی جیهانی، سمکۆی سەرخێڵی شکاک، ناسراوترین کەسـایەتی کـورد بو لە ئێران دا. سمکۆ و ئێلی شکاک لە ناوچەی ورمێدا ئەژیان. عەبـدولڕەزاق بەدرخـان بە یـارمەتی سـمکۆ، کۆمەڵەی جیهاندانی دامەزراند و لە خوی قوتابخانەیەکی کوردی کردەوە. لەو پڕۆژانەدا کە بە دەستیەوە بو بۆ هەڵگیرساندنی شۆڕش و ڕزگارکردنی کوردستان، پشتێکی بە سمکۆ ئەستور بو.

لە ساڵانی جەنگـدا، سمکۆ ماوەیەک پشتیوانی لە عوسمانیەکان کـرد، بەڵام دواتـر هەوڵـی دا خـۆی لە ڕوداوەکان دور ڕابگرێ. کاتێ ڕوس ناوچەکەیان داگیر کرد سمکۆیان لەگەڵ چەنـد کەسـایەتیەکی کـورد دور خستەوە. پاش ماوەیەک ڕێگەیاندا بگەڕێتەوە ناوچەکەی خۆی.

بەر لە شۆڕشی ئۆکتـۆبەر (1917) سـمکۆ لەگەڵ سـەید تەهـای شـەمزینی (جەمعیەتـی ئیستخلاصـی کوردستان) یان دامەزراند و، پێوەندیان لەگەڵ ڕوسیا کرد بۆ ئەوەی گفتوگۆ بکەن لەسـەر هاوکـاری کـورد و ڕوس لە شەڕدا دژی عوسمانی. بەرامبەر بەوەی ڕوس یارمەتی کورد بدا بۆ ڕزگاری.

دوای تەواو بونی جەنگ بۆشایی دەسەڵات لە ناوچەکەدا دروست بو. سمکۆ کە هێزێکی چەکداری ئازا و شارەزای هەبو، هەوڵی دا ئەم بۆشاییە پڕ بکاتەوە و، دەسەڵات بگرێتە دەس. بۆ ئەو مەبەستە توشـی شـەڕ و پێکادان بو لەگەڵ هێزەکانی ئێران و، لەگەڵ ئاسوریەکان. ماوەیەک دەستی بە سەر ناوچەکەدا گرت، شـاری ورمێ و بەشێکی موکریان کەوتنە ژێر دەسەڵاتی. لەو ماوەیەدا لە ورمێ هەوڵی دەرکردنی ڕۆژنامەیەکی داوە.

### 3. 2. کورد (ورمێ، 1921)

تەنیا سەرچاوەی کە باسی ڕۆژنامەی کورد ئەکات، کتێبێکە بە ناوی: (محمـد تمـدن، اوضـاع ایـران در جنگ اول یا تاریخ رضائیه، تهران، چاپ اسلامیه، 1350).

محەمەدی تەمەدون لە ورمێ خاوەنی چاپخانە بوە. ئازەریەکی شیعەی دژی سمکۆ و جوڵانەوەی کـورد بوە. سمکۆ بە کەرەستەی چاپخانەکەی ئەو چاپی کردوە و، وێنەی بەشی سەرەوەی ڕۆژنامەکەیشی لەو کتێبەدا بڵاو کردۆتەوە.

تەمەدون لە (ل369) ی کتێبەکەی دا نوسیوێتی:

"ڕۆژێکیان شێخ عەبدوڵڵا (لە کەسانی تێگەیشتوی سمکۆ و لە خزمانی سەید تەها) هاتە لام و، لەناو قسەکانیدا دەریخست ئاغا (واتە سمکۆ) لەبەرچاوێتی بە هۆی نەبونی بڵاوکراوە لە ڕەزائیە ئەم نوقسانیە نەهێڵێ و، لە ڕەزائیەش ڕۆژنامە بڵاوبکرێتەوە، ئایا بە ڕەئی ئێوە بە چ قەوارە و تیراژێ ئەتوانرێ ڕۆژنامەیەک لەم شارەدا بڵاوبکرێتەوە، کە هەم سەنگین و هەم جوان بێ و، هەم جێگەی سەرنجدان بێ؟ نوسەر لە وەڵامی شێخ عەبدوڵڵا دا وای رون کردەوە: بە داخەوە حەرفەکانی چاپخانەکەمان زۆر کەمە و، بۆ چاپی ڕۆژنامە بەس نیە. شێخ عەبدوڵڵا وەختێ ئەم وەڵامەی بیست، زۆر تێکچۆ و گۆڕا، منیش ترسام و هەستم بە هەڵەکەی خۆم کرد و وتم: ئەگەر لەگەڵ کرێکارەکانی دامەزراوەکەی خۆمان تەقەلا بدەین لەوانەیە کەموکوڕیەکانی نەهێڵین و چاپی ڕۆژنامەکە مومکینە، بەڵام ئەبێ زەحمەتی زۆر بکێشین تا کەرەستەی پێویست ئامادە بێ. لێرەدا قیافەتی شێخ عەبدوڵڵا گۆڕا و وەڵامی نەدایەوە. هەرچەندە ئەو بەڵێنی ئەدا کە هەقدەستی کرێکارەکان و کارکەرانی ڕۆژنامەکە بدا، بەڵام نەدەکرا لەو ڕۆژانەدا بڕوا بە قسەی کورد بکەی. لەبەر ئەوەی یاخیبون لە فەرمانی سمکۆ لەو هەلومەرجەدا یاری کردن بو بە گیان، پاش دو سێ ڕۆژ هەڵاتم...
"

لە دوای ڕاکردنی تەمەدون، سمکۆ ڕۆژنامەکەی بڵاوکردۆتەوە. تەمەدون لە شوێنێکی تری کتێبەکەیدا نوسیوێتی:

"تابلۆی (چاپخانەی تەمەدون) یان لابرد بو، لە جێگەی ئەو تابلوی (چاپخانەی غیرەت) یان لێ دانا بو. ڕۆژنامەیەکیان بە زمانی فارسی و کوردی بڵاو کردبوەوە. تەنیا بە ناوی ڕۆژنامەی هەفتەیی کورد لە ژێر ناوی (ڕۆژی کورد، شەوی عەجەم) کە دوایی تر بە ناوی (ڕۆژی کورد) و دوایی تر تەنیا بە ناوی (کورد) بڵاو کرد بوەوە.

"ژمارەی یەکەمی لە 12 ی مانگی شەوالی 1340 دا بە موديریی محەمەد تورجانی بڵاو کراوەتەوە."

تائێستا دانەی هیچ کام لەو ڕۆژنامانەی تەمەدون باسیان ئەکا، نەکەوتۆتە بەردەس لێکۆڵەرەوەی کورد. ئەوەی ڕۆژنامەکەیشی دەرکردوە، دوای گەڕانەوەی لە جامیعەی ئەزهەر، بە ناوی مەلا محەمەدی قزڵجی‌یەوە لە بەغداد نیشتەجێ بوە، دەیان ساڵ خەریکی مەلایەتی و دەرس وتنەوە بوە و هەرگیز خۆی نەکردوە بە خاوەنی ئەم باسە.

## 4. کاتنامە کوردیەکان: لێکۆڵینەوەی تایبەتی

### 4. 1. ژین

برنجی سنه — ۷ تشرین ثانی ۱۳۳٤ — عدد ۱



هفته‌لق غزته‌در

سنه‌لکی ۲۲۰ غروشدر، آلتی آیلغی ۱۲۰ غروشدر

ممالک [اجنبیه] ۲٤۰ غروشدر، نیف سال ۱۳۰ »

مسلکمزه موافق مقالات مع‌الممنونیه درج اولنور.

درج اولونمیان مقاله‌لر اعاده ایدلمز

دین، ادبیات، اجتماعیات و اقتصادیاتدن بحث ایدر تورکجه کوردجه مجموعه‌در

مندرجات



نسخه‌سی ٥ غروشدر

نجم استقبال مطبعه‌سی

## 1. هەلومەرجی دەرچونی

لە کۆتایی تشرینی یەکەمی 1918 ز دا، نوێنەری دەوڵەتی عوسمانی لە مودروس ڕێککەوتنی ئاگربڕی جەنگی لەگەڵ نوێنەری بریتانیا ئیمزا کرد، هێزی بریتانی چوە ناو ئەستەموڵەوە.

کوردەکـانی ئەسـتەموڵ بە هیـوای بەڵێنـی هاوپەیمانەکـان و، مـادەی 12 ی ڕاگەیانـدنەکەی وێلسـنی سەرکۆماری ئەمریکا، کە بەڵێنیان دابو بە گەلانی نەتـورکی ژێـر دەسـەڵاتی عوسـمانی دوای کۆتـایی هـاتنی جەنـگ مـافی ئـازادیی بڕیـاردانی چارەنوسـیان بـۆ بسـەلمێنن، کەوتـنە چـالاکی سیاسـی، ڕۆشـنبیری و کۆمەڵایەتی. (جەمعیەتی تەعالی کوردستان: جڤاتا بلنـدیـا کوردسـتان) بە سـەرۆکایەتی شـێخ عەبـدولقادری شەمزینی دامەزرا.

جەمعیەتی تەعالی کوردستان لە سەرەتادا هەمو کوردەکانی ئەسـتەموڵی، سـەرەڕای جیـاوازی نـاوچە و بنەماڵە و بیروبۆچـونی سیاسـی لـێ کـۆ بوبـوەوە. پێوەنـدیـان لەگەڵ دەسـەڵاتی ئینگلیـزی لە ئەسـتەموڵ دامەزراندو، دەسەڵاتیان دا بە شەریف پاشا لە کۆنفرەنسی ئاشتیی پـاریسدا بە نـاوی کـوردەوە گفتوگـۆ و، داوای سەلمەندنی مافی نەتەوەیی کورد بکا.

ئەندامانی جەمعیەت غەزەتەی (ژین) و دواتر غەزەتەی (کوردستان) یان دەرکرد. چەند ڕێکخراوێکیـان بۆ خوێندکاران و ئافرەتان و پەخشی کتێب و خوێندنی کوردی دامەزراند.

### 1. 1. دەرچونی

ژ1 ی لە 17 ی تشرینی دوەمی 1918 دا، واتە 17 ڕۆژ دوای ڕاگرتنی یەکەمین جەنگی جیهانی و ژ25 ی لە 2 ی تشرینی یەکەمی 1919 دا لە ئەستەموڵ، دەرچوە.

ژمارەکانی 1- 20 حەمزە (حەمزە موکسی) صاحیبی ئیمتیاز و مدیری مەسئولی بوە.

لە ژ21 ەوە وە مەمدوح سەلیم بۆتە صاحیبی ئیمتیاز و مدیری مەسئولی.

لە لای ڕاستی ناوەکەیدا بە تورکی و لە لای چەپیدا بە کوردی نوسراوە: "سالەک 220 قروشە. نیڤ سال 130 قروشە."

لە ژێر ناوی کوردی (ژین) دا نوسیوێتی (حیات)، ئینجا بە تورکی بەمجۆرە خۆی بە ناسین داوە:

"هفتەلق غزتە"
"دین، ادبیات، اجتماعیات و اقتصادیاتدن بحث ایدر تورکجە - کوردجە مجموعە در"
ژین تا ژ 34 ی گۆڤار بوە، لەوە بە دواوە بەشێوەی ڕۆژنامە دەرچوە.

## 1. 2. ئامانج لە دەرکردنی

لەسەر دیوی ناوەوەی بەرگی یەکەم بە تورکی لە ژێر سەرناوی: (مەقصەدمز: ئامانجمان) نوسیویێتی: "ژین بۆ مەنفەعەتی مادی دەرناچێ، ئامانجی بڵاوکردنەوەی زانینە لەسەر ژیانی مێژوی کورد، مافە نەتەوەییەکانی، ئەدەبیات و کۆمەڵایەتی کە چەند سەدەیە پشتگوێ خراوە. بە باوەڕی ئێمە بۆ ئەوەی نەتەوەی کوردیش جێگەی شیاوی خۆی لەناو کۆمەڵگای گەلاندا بگرێ، ئەبێ خەباتێکی ئەوتۆی بۆ بکرێ، کە لەگەڵ تێکەیشتنی ئێستادا بگونجێ. ئەزانین ئەم تەقەلایەی ئێمە خەباتێکی زۆر سەختی ئەوێ. بەڵام کاتێ کە ئەم ئەرکە گرانەمان گرتە ئەستۆ بە راستی ئومێدمان بە یارمەتی و کارئاسانی مادی و مەعنەوی نەتەوەی کورد بو، کە لە پێناوی نیشتمان و گەلەکەیدا، هەمیشە بە قبوڵکردنی گەورەترین فیداکاری ناسراوە. سەرکەوتنیش لە خواوەیە."

## 1. 3. نوسەرەکانی

ژمارەیەکی زۆری ڕۆشنبیرانی ئەوسای سەرانسەری کوردستان کە لە ئەستەموڵ ژیاون، لە ژین کۆبونەتەوە. بە وتار و شیعر، بە زمانی تورکی و کوردی، لاپەڕەکانیان دەوڵەمەن کردوە.

### 1. 3. 1. نوسەرانی بەشی تورکی

ئەم زاتانە نوسەری بەشی تورکی ژین بون:

کوردیی بتلیسی، کەمال فەوزی، شەفیق ئەرواسی، حەمزە موکسی، مەمدوح سەلیم، عەبدولڕەحیم ڕەحمی هەکاری، یوسف زیا، کامەران عالی بەدرخان بۆتانی، حلمی سیوەرەکی، ئیحسان نوری، سولەیمانیەلی تەوفیق (پیرەمێرد بە ئیمزای جیا جیا نوسیویێتی، لەوانە: سولەیمانیەلی ویداد، سولەیمانیەلی مەحمود نەژاد، م. نەژاد. ویداد و نەژاد ناوی کوڕەکانی پیرەمێرد بون)، عەبدولعەزیز یامڵکی، ئەمین فەیزی، ئیبراهیم حەیدەری و نەجمەدین حسێن.

### 1. 3. 2. نوسەرانی بەشی کوردی

بەشە کوردیەکەی ژین کەمترە لە بەشە تورکیەکەی. ئەمە بۆ ئەو کاتە شتێکی ئاساییە. ئەوانەی لەم بەشەدا نوسیویانە خەڵکی شوێنی جیاوازی کوردستان بون و، هەریەکەیان بە لەهجەی خۆی نوسیوێتی.

لەناو ئەوانەدا عەبدولڕەحیم ڕەحمی هەکاری، کە ئەندامی دەستەی نوسەرانی ژین بوە، لە هەمویان زیاتر بەرهەمی هەیە. بەرهەمەکانی جۆراوجۆرن: شیعر و وتار و چیرۆکی شانۆی نوسیوە. بە تورکی یش چەند وتارێکی بڵاوکردۆتەوە.

قازی زادە مستەفا شەوقی بە چەندین وتار و شیعر بەشداریەکی دیاری هەیە. جگە لەمان: حیلمی سیوەرەکی، محەمەد میهری بە شیعر و بە وتار و، قازی لەتیف، زاخۆیی، ع. سابیت، دیاربەکری فکری نەجدەت، لاهوتی خانی کرماشانی، تەنیا بە شیعر بەشدار بون.

## 2. بابەتەکانی

### 2. 1. سیاسی

کورد هیوایەکی زۆری بە بەڵێنی هاوپەیمانەکان هەبوە.

لە ژ6 دا (ع. رەحمی: عەبدولڕەحیم رەحمی هەکاری)، کە لە دەستەی نوسەران (هەیئەتـی تەحریـریە) ی ژین بوە لە ژێر سەردێڕی (حالی مەیی حازر) دا نوسیویێتی:

"ئەم کورد د ناڤ عوسمانیان دا صادقتر ژ هەمی میلەتان دەرکەتـن. مە مـالێ خـۆ، جـانێ خـۆ، هەمـی تشتێ خۆ د رێیا وی میلەتی دا. مە رۆژەکی ئیختیلالەک، بێ ئیتاعەتیەک نەکر. دایما ئەوان چی ئەمـر کـر مە ئەمرێ وان ب جی ئینااند. حەتا ڤێ حەربێ دا ئەم کـورد ژ بەر حەربـێ، ژ بەر هیجرەتـێ، ژ بەر سـەفالەتێ، ژ هەمیان پەرێشانتر بون. لاوێد مە د عەسکەرێ دا شەهید بون، مالێد مە یەغما بون. وەلحاصل ژ هەمی میلەتـان خودان زەرەرتر دەرکەتن.

"مەعلومێ وەیە، هون هەر رۆژ غەزەتـان دخـوینن. تـالعێ حەربـێ ئەم مەغلـوب دەرخسـتن. ئەم لەسـەر وەعدا رەئیس جمهورێ ئەمریقایێ ویلسون مە دەعوا صولحێ کـر، یـانی موتـارەکە گـرێ دا، ژ بەر مە بولغـار موتارەکە کر بو، پاشێ مە ئاوستریا و ئالمان ژی موتارەکە کر، دەمەک دنیا ژ حەماما خـوینێ دەرکەت هەمـی کەس نەفرەت ژ یەکدو کوشتنێ کر، هەر کەس ژ تەرەفێ خۆ ئەسبابێت سەعادەتا ئینسـانی فکـر کـرن. ژوان هەمیان فکرا ویلسون دروستترە. لەورا ئەو دبێژت هەر میلەت دڤێت بە سەری خۆ شۆلێ خـۆ چـێ کەت. کەس خۆ تێکەڵ شۆلا یا دی نەکەت. یانی میلەت موقەدەراتـا خـۆ ب دەسـتێ خـۆ حەل کەت، چـی میلەتـێ د خـۆدا دبینت بلا بتە حکومەتەک. لەسەر ڤێ فکرێ ئەم وێ دبینن (عەرەب، جهو، فلە، گورجی...) هەر یەکێ ژ بۆ خـۆ حکومەت چێکرن. نها شۆلا خۆ ب دەستێ خۆ چێ دکەن.

"بەلێ! ئەم کورد حەتا نها مە حس نەکر ژ بەر دەستێ حکومەتا تورکـان دەرکەڤـن، یـانی ژ مەنزومـا عوسمانیان دەرکەڤن.

"نها ئەم تەماشا دکەن ویلسون دبێژت جهێ تورک نەبی نادەنە عوسمانیان. حـال ئەوە کـو لە جهـێ مە دبێژنێ (کوردستان) غەیری دو سێ مەئموران، ئەو ژی ژ بەر مەئموریەتێ هاتنە جی بونە، بل وانا چو تـورک چونینن.

"وەکی تورک چونینن، ما ئەرمەنی، مخەین، هندی ئەرمەنی نە، میقدارێ سەدان پێنجی مە نینە. مخەیـن ژی سەدان دو ب زۆر تەشکیل دکەت. پاش هنگـی ژ غەیـری کـوردان چـو میلەتـی دی چـونینن. وەکـی وەیە کوردستان حەقێ کوردانە، ژ غەیری کوردان حەقێ کەسێ تێ نینە.

"صـەد حەیـف مە حەتـا نهـا خـۆ نەدایە زانـین. ئەوروپـا مە نـاس نـاکن و مە وەهـا مەزن نـزانن و کوردستان تێکەل ئەرمەنیان دزانن حەتا هندەک خودان غەرەز مە ژ ئەرمەنیا زانت.

" وەکی مە خۆ دابا زانین لازمێ سەعی و غیرەتا گەلەک نەبو، ب هیمەتا هندەک مە دێ حەقێ خۆ دابـا زانین (ئەم ژ صەدەدا خۆ دەرکەتن قصورێ نەفکرن).

"بەلێ حەقێ کوردانە کوردستان، ژ غەیری کوردان چو کەس خودان حەق نینە د کوردستانێ دا.

"فکرا ویلسون ژی حەقەک دایە مە کو ئەم د کوردستانێ ببـنە خـودان. ئەگەر ئەم نەبـنە خـودان، قەت شوبهەن نەکن، ئەرمەنی بت صەدان دەهێت مە دێ بنە خودانێ کوردستانێ و وەلاتێ مە دێ ژ خۆ بستینن.

"وەکی وەیە چی مەزن، چی بچوک، هەمی میلەت بە وەزیفا خۆ بزانت و دەست شـۆلێ بـکەت. وەختـێ وەستانێ نینیە وەختێ خەباتێ یە. خودێ موعین بت."

ئیحسان نوری سەرکردەی دواتری شۆڕشی ئاگری، لە ژ15 دا وتارێکی بە تورکی لە ژێـر سـەردێڕی: (پرنسیپەکانی وێلسن و کورد) دا نوسیوە، ئەویش بە هیوای بەڵێنەکەی وێلسنە.

لە ژ21 دا دادوەر ئەردەڵانی لە شیعری (هەمومان) دا دەڵێ:
"ژێر دەستەیی لە بۆ کورد شینە، زیلاتە،
بۆچی لە ژێر ئەمری خەڵقی بمێنین، ئەسیر ببین؟
ئەقوام بە ئەمری حەزرەتی ویلسون خەلاص بوە
سەربەستە، حورە، وێڵە لە زنجیری ئاسنین".

ژین لەسەر بەرگی ژ25 ی‌دا وێنەی شـەریف پاشـای چـاپ کـردوە و، لە لاپەڕەی 9 دا هەمـان وێـنەی دوبارە کردۆتەوە و، لە ژێری‌دا بە کوردی و تورکی نوسیوێتی:" هەیەتا کـو ل پاریسـێ دا حەقـی کـوردان و کوردستانرا خدمەتێ دکە، رەئیسێ وان جەنابێ شەریف پاشا".

لەبەرئەوەی زۆری وتارە سیاسیەکانی ژین تورکیە، بۆ ئەوەی لێکـۆڵەری کـورد کەڵکـی لـێ وەربگـرێ، پێویستە وتارە تورکیەکانی بکرێتە کوردی و، کوردیەکانیشی بهێنرێتە سەر ڕێنوسی نوێ.

### 2 .2. ئەدەبی

ژین بایەخێکی زۆری بە لایەنی ئەدەبی داوە، بە هەردو زمان شیعر و پەخشانی ئەدەبی بڵاوکردۆتەوە.

ع. رەحمی، پیەسـی کـوردی (مەمـی ئـالان) ی لە دو پەردەدا لە ژ15و 16 دا نوسـیوە کە رەنـگە ئەمە یەکەمین شانۆنامەی کوردی بێ.

ع. رەحمی، لە زۆربەی ژمارەکانی‌دا بە زاراوەی کرمانجی سـەرو (لەهـجەی هەکـاری) شـیعری سیاسـی نوسیوە. هەروەها قازی زادە مستەفا شـەوقی بە زاراوەی کرمـانجی خـوارو (لەهـجەی موکریـان). ڕەحمـی بە وەزنی خۆماڵی و شەوقی بە وەزنی کلاسیکی. ئەگەرچی شیعرەکانی رەحمـی لە وەزن و قـافیە و نـاوەرۆکـدا، جـۆرێ لاسـاییکردنەوەی حـاجی قـادری کـۆیی تـێ‌دایە، بەڵام شـیعرەکانی هەردوکیـان لە روی شـێوە و ناوەرۆکەوە، نوێکاری جوانیان تێ‌دایەو، هەتا ئێستایش تامی خۆش و نرخی ئەدەبی‌یان ماوە.

ژین بۆ ناساندنی ئەدەبی کوردی بە خوێندەوارانی تورک، هەندێ لە بەرهەمـی شـاعیرەکانی چەرخـی رابوردوی کردۆتە تورکی.

مـحەمەدی میهـری (هەنـدێ نمـونەی لە ئەدەبیـاتی کـوردی) هەڵبـژاردوە. بە ئیمـزای (م. م) لە ژ2 دا نمونەیەکی لە شیعرەکانی نالی و، لە ژ7 دا نمونەیەکی لە شیعرەکانی خۆی کردۆتە تورکی.

پیرەمێردیش بە ناوی جیا جیاوە بە زمانی تورکی، شـیعری خـۆی و، وتـاری سیاسـی و، تەرجـومەی بەرهەمی کلاسیکی‌ی شاعیرانی کوردی بڵاوکردۆتەوە.

لە شیعری کلاسیکی‌دا، لە ژ6 دا لە ژێر ناوی: (مەکتـوبی مەنـزوم) دا تێکسـتی کـوردی (گیـانم فیـدای سروەکەت...) ی نالی بە شیعر بە هەمان وەزن و قـافیە کـردەوە بە تـورکی و، لە ژ10 دا شـیعرێکی فارسـی مەولانا خالیدی بە پێشەکیەکی درێژەوە بڵاوکردۆتەوە و لە هەمان کاتـدا کردونـی بە تـورکی. بە پێشـەکیەکی درێژەوە (گڵکۆی تازەی لەیل) ی محەمەد ئاغای دەربەند فەقەرەی نوسیوەتەوە و کردەوە بە تورکی. لە شیعری

خۆیشی لە ژ5 دا شیعرێک و لە ژ8 یشدا شیعرێکی تری بڵاوکردۆتەوە. هەردوکی بە تورکی هۆنیـوەتەوە. لە ژمارەکانی 4 و 7 و 8 یشدا چەند وتارێکی تورکی نوسیوە.

لاوی رەشید، لە زنجیرەیەک وتاردا لە ژمارەکـانی 3 و 4 و 5 و 7 و 8 دا، دەیـان پەنـدی پێشـینانی کوردی بە تەرجومەو لێکدانەوەوە بڵاوکردۆتەوە.

ژین بە تورکی نوسیوێتی (لە ئەدیبانی بەرێزی کوردستانی ئێران شـاعیری شـوهرەت شـیعار لاهـوتی خانی کرمانشانی)، لە ژ23 و ژ25 دا دو شیعری سیاسی نوسیوە.

لاهـوتی لە هەردو شـیعردا بـاس لە ئێرانـی بـونی کـورد ئەکـا و، داوای لـێ ئەکـا لەگەڵ ئێـران یەک بگرێتەوە. لە ئێران ئەبولقاسمی لاهوتی کە کوردی کرماشان بوە، پیاوێکی بە ناوبانگ بوە. ئەفسەری پۆلیس و هەڵگری بیری چەپی رادیکاڵ بوەو، بەو بیروباوەڕە شیعری شۆڕشگێڕانەی بە فارسی زۆرە. بە هێزەکـانی پۆلیس ویستی لە تەورێز کودەتا بکا و دەسـتی بەسـەر هەنـدێ خـانوی حکـومەتیدا گـرت، بەڵام هێزەکـانی حکـومەت چـونە سـەری و شـکاندیان و، لە ئێـران هەڵات، سـەرەنجام لە یەکـێ لە کۆمارەکـانی شـورەوی گیرسایەوە. تا مرد لەوێ بو.

بەم دو شیعرەیدا دەرئەکەوێ کە لاهوتی:

یەکەم، لە دانانی شیعری کوردیدا بە توانا بوە.

دوەم، پێئەچێ شارەزای ئەدەبی کوردی بە تایبەتی هی گۆران بوبێ.

بۆ زیندوکردنەوەی ئەدەبیاتی پێشوی کورد، لە ژ1 و 5 دا دو شیعری نەتەوەیی حاجی قـادری کـۆیی و، لە ژمارەکانی 1 و 6 و 23 و 25 دا چەند شیعرێکی نـالی و لە ژ9 دا دو شـیعری مەحـوی و، لە ژ12 دا شیعرێکی ئەحمەدی خانی و شیعرێکی سیاپۆش و، لە ژ14 دا شیعرێکی ئەحـمەدی جزیـری و، لە ژمارەکـانی 20 و 25 دا دو شیعری شێخ رەزای تاڵەبانی بڵاوکردۆتەوە.

### 2. 3. مێژویی

لە ژ16 و 17 دا، لاوی رەشـید بە تـورکی لەسـەر شۆڕسـی سـاڵی 1913 ی مەلا سـەلیم لە بتلـیس وتارێکی نوسیوە. رەنگە ئەمە یەکەمین سەرچاوەی دەستی یەکەم بێ کە باس لەو شۆڕشە بکا. شۆڕش شـکا، مەلا سەلیم و هاورێکانی پەنایان بردە بەر کۆنسوڵگەی روسیا لە بتلیس. چەند مـانگێ لەنـاو کۆنسـوڵگەکەدا مانەوە. کە یەکەمین جەنگی جیهـانی هەڵگیرسـا، تـورک هەڵیکوتـایە سـەری و، مەلا سـەلیم و هاورێکـانی لە کۆنسوڵگە دەرهێناو، لە مەیدانێکی گشتی شاری بتلیسدا لە داری دان.

لە ژمارەکانی 9 و 11 و 13 و 15 و 18 دا عەبدولعەزیز یاملکی لەسەر میرایەتـی بابـان، بە تـورکی زنجیرەیەک وتاری نوسیوە. هەندێ زانیاری تازەی، لە چاو ئەو زەمانەدا، داوەتە زانین.

لە ژ23 و 25 دا ئەمین فەیزی لە سەر تواناى جەنگی و زانستیی بابانی نوسیوە.

لە ژ25 دا بابەتێک لە سەر محەمەد ئاغای کەلهۆکی نوسراوە، پێئەچێ لە (شەرەفنامە) وەرگیرابێ.

### 2. 4. هەواڵی رۆشنبیری

لە ژ3 دا سپاسی ئەو رۆژنامە تورکییانەی کردوە کە بە بۆنەی دەرچونی (ژین) ەوە پیرۆزباییـیان لـێ کردون، لەوانە: حادثات، ترجمان حقیقت، یکی کون، تصویر افکار، وقت، یکی استانبول، انقلاب، اجتهاد.

لە ژ11 دا هەواڵـی دەرچـونی (کوردسـتان) ی بڵاوکـردۆتەوە، لە زۆری ژمارەکـانیدا بانگەشـەی بـۆ کردوە. لە ژ25 دا هەواڵی دەرچونی ژ 14 ی (کوردستان) ی نوسیوە.

هەواڵی چەند چاپکراوێکی کـوردی بڵاوکـردۆتەوە لەوانە: هەواڵـی دەرچـونی کتێبەکـانی ع. ڕەحمـی، دیوانی شیعری (گازیا وەلات) و، پیەسی (مەمی ئالان) و، (عەقیدا کوردان).

وەکو مژدە هەواڵی لە چاپدانی (مەم و زین) ی ئەحمەدی خانی نوسیوە.

لەناو ژیـندا هەواڵـی دامەزرانـدنی ڕێکخـراوی هێڤـی خوێنـدکاران و ئافرەتـان و دەزگـای پەخـش ئەخوێنینەوە.

## 3. نرخی بەڵگەیی

ژین تا ڕادەیەکی باش چالاکی کوردەکانی ئەو ماوەیەی ئەسـتەموڵی لە ڕوی دامەزرانـدنی ڕێکخـراوی جیا جیای کوردیەوە تۆمار کردوە و، لەو ڕووەوە سەرچاوەیەکی بە نرخی زانیاریی دەستی یەکەمە.

جەمعیەتی کوردستان (جەمعیەتی تەعالی کوردستان):

لە ژ10 دا، کورد تەعمیمی مەعاریف جەمعیەتی بەیاننامەسی و،

لە ژ20 دا، کورد قادینلەری تەعالی جەمعیەتی و،

لە ژ21 و 22 دا، کورد تەلەبە هێڤی جەمعیەتی بەیاننامەسی، بڵاوکردۆتەوە.

## 4. لە ڕوی هونەری ڕۆژنامەوانییەوە

### 4. 1. شێوەی

ژین لە شێوەی گۆڤـاردا لە (نجـم اسـتقبال مطـبعە سـی) چـاپ کـراوە، هەر ژمـارەیەکی 16 لاپەڕە و لە شـێوەی کتێـب دایە. هەمـو جـار لە لاپەڕەی یەکەمـیدا بابەتەکـانی ژمـارەکە و نـاوی نوسـەرەکانی نوسراوە. بە ناوەڕۆک دەوڵەمەن و بە ڕوخسار قەشەنگە. هیچی لە گۆڤارەکـانی هاوزەمـانی خـۆی کەمتـر نیە.

### 4. 2. ڕێنوسی

ژین بە ڕێنوسی فارسی و عەرەبی نوسراوە. هەسـتی بە نەگونجـانی ڕێنوسـی عەرەبـی بـۆ نوسـینی کوردی کردوە. وەکو هەوڵـێ بـۆ چارەسـەرکردنی ئەم گـرفتە، لە ژ19 دا ڕێنوسـێکی پێشـنیار کـردوە لەگەڵ دەنگەکانی زمانی کوردیدا بگونجێ. بۆ ئەوەی خوێندەوارەکانی ئاشنا بکا بەو حەرفانە، لە هەمـو ژمارەکـانی دواتردا دوبارەی کردونەتەوە. ع. ڕەحمی هەندێ لە شیعرەکانی خۆی بەم ڕێنوسە نوسیوە.

### 4. 3. زمانەکەی

زمانی گۆڤارەکە تورکی عوسمانی- کوردی بوە. کوردیەکەی تـێکەڵاوە لە کرمـانجی سـەرو و خـوارو. بەشی زۆری وتارەکانی تورکین، بەڵام هەمویان ڕۆشنبیرانی کورد نوسیویانن. زۆری وتارە سیاسـیەکانی بـۆ داکۆکیە لە کێشەی کورد. زۆری وتارە ئەدەبیەکانی بۆ ناساندنی ئەدەبی کوردیە بە تورک.

وتارە کوردیەکانی ئەگەرچی بە لەهجەی نـاوچەیی نوسـراون، بەڵام ڕەوان و بـۆ تێگەیشـتن ئاسـانن. لێرەدا چەند نمونەیەک ئەنوسمەوە:

لە ژ1 دا قازی زادە مستەفا سەرەتای قەسیدەکەی (هاواری دایکێ) بەم پەخشـانە ئەدەبـیە، بە لەهـجەی موکریان، دەس پێ ئەکا:

"سـبەینێیەکێ زو، هەوا سـاو و ڕۆژ تـازە سـەری هێنـا بـوە دەرێ. گونـدێکی روخـاو لە دورەوە، سەحرایەکی واسیع، دە نێویدا شەقامەرێیەک بۆ لای ڕۆژئاوایە دەڕۆیی. لە قەراغ ڕێگایەکی چۆمێکی بە خوڕ دەهات. روی سەحرا بە گیای شین کراسـێکی مەخـمەری لە بەر کـرد بـو لەوێ کـوردێکی جـوان هەیـکەل بە خەواڵویی راکشا بو. لەسەر سەری بە سیمایەکی ماتەمداری و بە جەبینـی ئەصـیلی دەردەدار، ژنێکـی کـوردی پیر بە ئەو مەقامانە خەریک بو کە لە خەوی هەڵستێنێ:... تاد"

لە ژ9 دا ع. رەحمی لە ژێر ناوی (وەلات) دا، بە لەهجەی هەکاری، نوسیوێتی:

"ئیرۆ کە د قەلبێ مە حەمیان ئەڤینیەک هەیە، ئاگرەک هەیە، کو ئەم دائیما ب ڤێ عەشقێ، ب ڤێ عەڤینێ، د سۆژن، د قەلن و ژ بەر ڤێ ئاگرێ ئەم نە خودان مالن، نە خودان حەیاتن، وەلحاصل حەمـی تشـتێ خـۆ ئەم حازرن دڤێ ڕێی دا بدەن.

"ئەو چی عەشقە، چی ئەڤینێیە؟

"ئەلبەت ئەو ئەڤینیا وەلاتە!... تاد"

لە ژ16 دا کوردیی سیوەرەکی لە ژێر سەرناوی (گازندەک) دا، بە لەهجەی سیوەرەکی، نوسیوێتی:

"ژ مرا دبێژن کە ب کرمانجی مەقالە بنڤیسنینی. ل سەر کیژان زڤـانێ کرمـانجی؟ زڤـانێ کرمـانجی نە یەکە کە. خەلکێ سلێمانی زڤانێ هەکارییان نزانە، دوملی کرمانجی نزانە، خیلافێ وی ژی راسـتە. ئەز و هەمـو کوردان دخوازن کە یەک زڤانێ مە هەبێ، هەر کەس ب وی زڤانی بخوینی، بنڤیسینی. ڤا شوغلا ل سـەر پیـێ جوانێ کوردان هێشتیە. برا وان بشوغلن. ئەزێ ل ڤیرا دە ب برایێ خۆیە کرمانج را گازندە بکەم..."

لە کوتایی وتارەکەیدا ئەڵێ:

"فەقەت کەسێ کی میلەتا من ژ خەوا درێژ راکە تـونینیە. ئیشـتە ئەو شـوغلا مـوهیم (جڤاتـا بلنـدییـا کوردستان)، (ژین) و (کوردستان) و جوانێ وان هەلگرتیە.

"گەلی کرمانجا!

"ئەز گازی و هاوار دکەم و دبێژم کە:

"ڕێیا کی ئەم هەیا نوکا لێ چون پێشیا وێ ژێرزەمینە. مە، وە، گشکان ب چاڤێ خۆ دیـت. ڤەگەرێـن، ڤەگەرێن. ژ وێ ڕێیا خوار و چەپی و مرنێ شون دا ڤەگەرین! ژ مە را ئیتیفاق لازمە. فاعتبروا ایها الاخوان!"

لە ژ18 دا دادوەر ئەردەڵانی کە ڕەنگە نازناوی محەمەد میهری بێ، لە ژێر سەرناوی (چۆن بکۆشـین؟)، بە لەهجەی ئەردەڵانی نوسیوێتی:

"لە پـاش پێـنج سـاڵ هەناسەکێشـان و برسـی و تینـویی، ئـاخری خـۆم گەیانـدەوە نـاو برادەرانـی کۆمەڵپەروەر و وەتەندۆس. من لە ژێر ئەم بارە ناهەموارەدا هەمو چشتێکم لە فکـر چوبـوەو، حەتـا لە ژیـانی خۆن هەراسان بوبوم. ئەم گوت خدایا لە پاش ئەم ئاگرە کورد چی لێ دێت؟ لە مـاردین و موصـلەوە تـاوەکو ئەستەموڵ هەمو کێو و بەرد پڕ بوبو لە موهاجیری کورد. یەکێ بەردی ئەشکان، یەکێ خاکی هەڵئەکەن، یەکـێ باری ئەکێشا، هەمو روتوقوت. هەر ئەمندە نەبو زۆری لە برسا ئەمرد و ئەبوە خۆراکی قەل و گورگ.

"ئۆف! کام دڵ لە پێش ئەم مەنزەرەی بەردبـرژێنەدا نـاتوێتەوە؟ کـام چـاو لە بەرابەر ئەم سـەفالەت و رەش بەختیەدا پڕ لە فرمێسک و ئاگر نابێت؟

"ئاخ ئەم بەختە رەشە!... تاد"

## 5. شوێنی لە مێژوی ڕۆژنامەوانیی کوردیدا

ژین و کوردستان کە دوا بە دوای ڕاگرتنی یەکەمین جەنگی جیهانی بە جوتــە لە ئەســتەموڵ دەرچــون، چەندین بەڵگە و هەواڵ و وتــار و لێــدوانی سیاســی، مێژویــی، ڕۆشــنبیری گرنگیــان تێدایــە. لەبەر ئەوە بــۆ لێکۆڵینەوەی مێژوی ئەو قۆناغە بەهادار و پڕ بایەخن. بەڵام هیچ کــام لەمــانە دوای تێپەڕینــی ســەردەمەکەیان، کارێکی ئەوتۆیان بــۆ ســەر هــۆش و بیــری سیاســی و ڕۆشــنبیری خوێنــدەواری کــورد نەبــوە و دەورێکــی ئەوتۆیان نەبوە لە گەشەپێدانی بیری سیاسی و ڕەوتی ئەدەبــی و ڕۆشــنبیری و ڕۆژنامــەوانیی کــوردا. نەک لەبەر ئەوەی ئەم بڵاوکراوانە بە ناوەڕۆک دەوڵەمەند نین، بەڵکو لەبەر ئەوەی:

یەکەم:

لە ئەســتەموڵ دەرچــون و ئەســتەموڵیش لەو کــاتەدا لە سەرانســەری تورکیــا و کوردســتان دابــڕا بــو. ئەستەموڵ لە ژێر دەستی ئینگلیزدا و ولایەتە کوردیەکانی تورکیاش لە ژێر دەستی مستەفا کەمالدا بوە.

دوەم:

هەر ئەو زەمانە کە دەستی مستەفا کەمال گەیشــتۆتە ئەســتەموڵ، ســەرەڕای ئەوەی زمــان و چــالاکیی کوردی قەدەغە کردوە، هەمو ژمارەکانی ئەم بڵاوکراوانەشی بە جۆرێ لەناو بردوە کە تا ساڵی 1985 ز کەس هیچ ژمارەیەکی لە هیچ کتێبخانەیەکی گشتی یا تایبەتی دا نەدیوە. تەنانەت تــا ئێســتایش هەمــو ژمارەکانیــان نەدۆزراونەتەوە.

## چەند تێبینییەک:

1. محەمەد ئەمین بۆز ئەرسەلان ژمارەکانی 1- 25 ی (ژین) ی هێناوەتە سەر رێنوسی لاتینی. بە لێکۆڵینەوەیەکی درێژەوە لەگەڵ ئەسڵیەکانیدا لە ئۆپسالا (سوید) سالانی 1985-1987 سەر لە نوێ لە 5 جلد دا چاپی کردۆتەوە.
2. شێرزاد کەریم بەشێکی باشی لە وتارە تورکیەکانی کردۆتە کوردی. سدیق سالح دایرشتۆتەوە و ئامادەی کردوە و لە حەفتەنامەی (ئالای ئازادی) و لە هەندێ گۆڤاردا بڵاوی کردۆتەوە، لێرەدا لیستێکی بڵاوئەکەینەوە:

(حەیدەری زادە ئیبراهیم: دەمەتەقێیەک، ژ7 ی ژین) و، (کوردێک: کوردان نەخەوتن، ژ7 ی ژین) لە ژ 15 ی 1999 و،

(کۆمەڵەی تەعالی ژنانی کورد، مەمدوح سەلیم بەگ، ژ20 ی ژین) لە ژ 2 ی تەموزی 1997 ی (گەلاوێژی نوێ، سلێمانی) دا و،

(لاوی رەشید: بە سەرهاتێکی مێژو: راپەڕینی بدلیس بە سەرکردەیی مەلا سەلیم، ژ61 ی ژین) لە ژ 4 ی حوزەیرانی 1998 ی (هەزارمێرد، سلێمانی) دا و،

(حیلمی سیوەرەکی: پەندی پێشینان لە کوردەواریدا، ژین) لە ژ 13 ی زستانی 2000 ی (کەلەپوری کورد، سلێمانی) دا بڵاوکراوەتەوە.

(کامەران عەلی بەدرخان: کوردستان و کورد، ژ9 ی ژین) لە ژ230 ی 1 ی 5 ی 1997 و،

ئیحسان نوری: (پرنسیپی ویلسن و کورد، ژ15 ی ژین) لە ژ231 ی 15 ی 5 ی 1997 و (لیستەیەک بە ژمارەی خانو و دانیشتوانی کورد و ئەرمەنی لە ویلایەتی وان بە پێی نوسراوی سالی 1889، ژ15 ی ژین) لە ژ232 ی 1 ی 6 ی 1997 و،

(کەمال فەوزی: بۆ منداڵە هەتیو و بەدبەختەکانی نیشتمانە بەفرینەکەمان، ژ16 ی ژین) لە ژ260 ی 22 ی 12 ی 1997 و، چاپی مەم و زین کۆتایی هات، ژ17 ی ژین لە 22ی 9ی 1997 و

(کەمال فەوزی: گوندێکی بێ مانگ، ژ20 ی ژین) لە ژ238 ی (14 ی 7 ی 1997 و، (کەمال فەوزی: دەردی وەڕس نەبون، ژ24 ی ژین) لە ژ 239 ی 21 ی 7 ی 1997 و، (چی لە کۆچ پێکراوانی کورد ماوە، ژ13 ی ژین) لە ژ233 ی 9 ی 6 ی 1997 و، (کرێکاری کورد لە ئەستەموڵ، ژ25 ژین) لە 263 ی 2 ی 2 ی 1998 و،

(نەجمەدین حسێن: لاوانی کورد ریاکار نین، ژ23 ی ژین) لە ژ 243 ی 18 ی 7 ی 1997 و،

(بەزاندنی سنوری فەرمانبەری، ژ24 ی ژین) لە ژ 261ی 5 ی 1 ی 1998 و،

(مێژویەک و بەختەوەر کردنێک، ژ24 ی ژین) لە ئالای ئازادی، سلێمانی، ژ253 ی 27 ی 10 ی 1997 و، (محەمەد ئاغای کەلهۆکی، ژ25 ژین) لە ژ29 ی 9 ی 1997 و، (عەزیز یاملکی: بە بۆنەی کۆڕی کۆمەڵەی تەعالی ژنانی کوردەوە، ژ25 ی ژین) لە ژ 245 ی 8 ی 9 ی 1997 و، (ئەمین فەیزی: توانایی جەنگاوەری کوردانی بابان، ژ23 ی ژین) لە ژ 236 ی 30 ی 6 ی 1997 و، (ئەمین فەیزی: توانای پیشەسازی و زانستی کوردانی بابان، ژ25 ی ژین) لە ژ 235 ی 23 ی 6 ی 1997 ی (ئالای ئازادی، سلێمانی) دا بڵاوکراونەتەوە.

هەروەها هەندێ هەواڵ و کورتە بابەتی تری وەرگێڕاوە و لە هەمان حەفتەنامەدا بڵاوبونەتەوە.

(لاوی رەشید: پەندی پێشینان لە کوردەواریدا، ژمارەکانی 3 و 4 و 5 و 7 و 8 ی ژین) وەرگێڕانی: شێرزاد کەریم. ب. لاس. لە ژ 9 ی تەموزی 2000 ی (پەیڤین، سلێمانی) دا بڵاوکراوەتەوە.

3. (رۆژنامەڤانی، هەولێر، لە ژ6_ 7 ی پایز و زستانی 2001 - 2002) دا دۆسیەیەکی تایبەتی بۆ (ژین) تەرخان کردوە، چەندین باس و بابەتی لە سەر بڵاوکردۆتەوە، بەڵام ئەوەی جێگەی سەرنجە هیچ ئیشارەتێکی بەم وتارە تەرجومەکراوانە نەداوە.

## 4. 2. پێشکەوتن

هموشنیك

و پیشکوتن

ده نوسری

—

.. کی به آنه یکه

# پیشکوتن

سیبر

حفتهٔ جاریك دردهچیت

کریار

بوهموشو یێك

به ٣ مانك یك

به شش مانك دو

به سالیك چوار روپیه دهدا

اعلان یا ایشیکی خوی

له برهٔ دواییدا دهنوسریت

بودیر ٣ آنه دهسینریت

سال ٣ ژماره ١١٨ [ پنجشنبه ] ٢ ذی الحجه ١٣٤٠ ٢٧ جولای ١٩٢٢


انتخابی اعضای تازه بو شار

له اعضای محترمهٔ مجلسی لوا که له طرفی شاری سلیمانیه وه منتخب بون ابرامه دهیان استعفایان کردوه عن قریب بو ام دو جی یه انتخاباتی تازه دهکریت .

ابرایش نهووی خوی جناب حاجی ابراهیم اغا نهیتوانیوه له مجلس دا دوام بکات له بغداده وه استعفای کردوه و جناب عبد الفتاح چلبی افندی ابرامه که توشی ناساغی بوه بو قبول کردنی استعفای مراجعت به حاکم سیاسی کردوه . مع التأسف حاکم سیاسی هردو استعفای قبول کرد .

بو نامزدبونی . و بو رأی دان له لایی مجلس لواوه ترتیبیکی تازه دانراوه و مواد و تفصیلاتهکی بواسطهٔ ایرهٔ بلدیه وه به همو کرهکی شاردا بلاوده کریته وه استهٔ نامی اوانه که حق رأی یان هیه قیدده کریت وهچکسیك حق رأی هیه لازمه چاوی لی بیت که ناوهکی له استهٔ له خوی داکیرابی .

§

## رویتر

اظهارات مندوب سوویت له لاهی

لندن ٩ تموز — له بیانیك ورکیراوه که وا دهچیته عقله وه له نشریاتی امرو که مجلس صادری کردوه له پارس درده کویت که کراسین له قسه کردن لکل میر فلیب لوید کریم دا تصریحی کردوه که او نشریاتی رسمی یه مندوب سویت له لاهی دریکردوه به لغو دهژمیرریت و هیچ ایشی پی ناکریت . له رأی تایبتی خویی . که ممکنه دانهوهی صدی نود له املاك مخصوص الزی دانرا بو خارج . ولو مندوبهکان رسماً الحاح یان دهکرد بو تسلیم نهکردنی أوه .

.................................

## اصرار روسیه

مندوبهکان روس اصرار دهکن له طلبی خویاندا که قرضیکیان بدرنی پیش اوهکه جوابیکی نهائی بدهنهوه له خصوص قرض و دانهوهٔ اوه که واجبه لسر روس اعترافیان پی بکات .

## حوالی روژ هلات

جمعیت یاریدهری منکوبی انادول

لهوهدس کومایك تشکلی کرد لهژیر ام عنوانهدا غایهیان اوهیه که اعانه کوبکنهوه بو اوانه که منکوب و توشی بلابون له انادولی . صندوقی بچوك لبر هی درکی دانرا .

—

## 1. یەکەمین چاپخانە لە سلێمانی

لەوکاتەدا چاپخانە نە لە سلێمانی و نە لە هیچ جێیەکی تری کوردستانی جنوبیدا نەبو. لەبەر ئەوە پیت ڕێکخەر و لێزانی چاپخانەیش نەبو. سۆن 3 کەسی خوێندەواری قایل کرد کە فێری ئەم هۆنەرە ببن و کار لە چاپخانەکەدا بکەن، ئەوانیش: شێخ مەجیدی شێخ عارف، ئەدیب عەزیز و محەمەد زوهدی بون.

تەنیا یەک جار پێشکەوتن هەواڵی یەکێ لە کارکەرانی چاپخانەکەی بڵاوکردۆتەوە. لە ژ86 ی 15 ی دێسەمبەری 1921 دا نوسیوێتی:

"ڕۆیشتن: لە مئمورانی چاپخانە جەنابی عەبدولمەجید ئەفەندی لەم ڕۆژانەدا بۆ کڕین و تەواو کردنی حروف و لەوازیماتی چاپخانە چوە بۆ بەغداد. بەم نزیکانە بە موەفەقێتی و بە ئەشیای چاپەوە هاتنەوەی ئومێد دەدەین".

سۆن بەم چاپخانەیەو بەم چەند کرێکارە کاروباری ڕەسمی و حکومەت و پێشکەوتنی چاپ ئەکرد. چاپخانەکە بچوک و بە دەست کاری ئەکرد. سۆن بۆ هەر مەبەستێ ئەم چاپخانەیەی هێنابێ، خزمەتێکی گەورەی بە زمان و ڕۆشنبیریی کورد کرد. تا ساڵانێکی درێژ هەمو ڕۆژنامەکان و هەمو کتێب و بڵاوکراوەکانی سلێمانی، بەم دەزگایە چاپ ئەکران.

## 2. دەرچونی

ژ1 ی، لە 29 ی نیسانی 1920 و،

ژ118 کە دوا ژمارەیەتی لە 27 ی تەموزی 1922 دا دەرچوە.

ژ1- 96 ی 4 لاپەڕەیە و ژ97 - 118ی 6 لاپەڕە.

حەفتانە بە ڕێک و پێکی بە قەوارەی 32 20 x سم دەرچوە. بە حەرفی عەرەبی و بە ئیملای فارسی نوسراوە.

لەسەر ناوی پێشکەوتن نوسراوە: " سلێمانی"

لە ژێر ناوەکەیدا نوسراوە " حەفتەی جارێک دەردەچێ!"

لە لای راستی نوسراوە:

"هەمو شتێک بۆ پێشکەوتن دەنوسرێ"

"یەکی بە ئانە یەکە"

لە لای چەپی نوسراوە: "کڕیار بۆ هەمو شوێنێک بە 3 مانگ یەک بە شەش مانگ دو بە ساڵێک چوار روپیە دەدا"

" ئیعلان یا ئیشێکی خۆیی لە پەڕەی دوایی دا دەنوسرێت. بۆ دو دێڕ 3 ئانە دەسێنرێت"

سەروتاری یەکەمین ژمارەی بە: (لە هەمو ماکینەیەک باشتر ماکینەی چاپ) ە دەس پێ ئەکا و ئەنوسێ:

"ئینجا ئیمەیش وەختمانە کە هەنگاوی زل زل بهاوین. چونکە لە پانایی پێشکەوتن زۆر لە.. حکومەتی ئەمڕۆیش وامان باڵ دەگرێ کە بتوانین بە باڵیش بفڕین. ئەمڕۆ وەختێکە لە سایەی حکومەتەوە بۆ هەمو پێشکەوتنێ هەوڵ بدەین.

ئەوەی نازانین زانستەکانمان بۆمان بنوسن. چاپ ئەکرێت و هەتا دنیا بمێنێت ئەمێنێت...دەسا وەختە وەختی پێشکەوتن و لێخۆڕینە، لێخۆڕین، لێخۆڕین، لێخۆڕین، بە شکو بگەین بە هەوار."

لە دوا لاپەڕەی ژ1 دا (بۆ زانینی هەمو) نوسراوە:

"هەچکەس ئیشێکی بو بە پێشکەوتن بۆ دائیرەی سیاسی بنوسێت.

"هەچ کەس بۆ چاکی و باشی شتێکی چاکی بە بیر دا بێت بینوسێت، بە باش زاندرا چاپ دەکرێت.

"هەچکەس ئیشێکی خۆی بێ چۆنی دەوێت بینوسێت بە پارە بۆی چاپ دەکرێت. پێشکەوتن".

مێجەرسۆن تا ژ46 ی کە بە ئیجازە کوردستانی بە جێ هێشتوە و ئیتر نەگەڕاوەتەوە، خۆی سەرپەرشتی نوسینەکانی ڕۆژنامەکەی کردوە. هەندێ لە وتارەکانیشی خۆی نوسیونی. بەم بۆنەیەوە لە پێشکەوتنی ژ46 ی 10 ی مارچی 1921 دا نوسراوە:

"جەنابی مێجەرسۆن دو ساڵ زیاترە کە خەریکی خزمەتی ئەم وڵاتە بو. ڕۆژی شەمو 5 ی ئەم مانگە بە ئیزنی 6 مانگ لە سلێمانی بزوت. تەشریفی فەرمو بۆ لۆندرە.

"هەمو کەس ئەیزانێ بۆ بەرزبونەوەی ئێمە و وڵاتمان چەن هەوڵی داوە و چۆن تێ دەکۆشا، لەم سەفەرە درێژە هەموان ساغی و سەلامەتی و خۆشی ئەو صاحیبەمان دەوێت.

"لە جێگای جەنابی مێجەرسۆن، جەنابی مێجەر گۆلد سمیس بۆ حاکمی لیوای سلێمانی تەشریفی هێناوە. لە هەوەڵی ئەم مانگی مارتەوە دەستی کردوە بە ئیش. جەنابی مێجەر گۆلد سمیس لەمەوپێش حاکمی حلە و خانەقین و هەنێ جێگای تر بوە."

مێجەر گۆلد سمیس حاکمی سیاسیی سلێمانی، سەرپەرشتی ڕۆژنامەکەیشی کردوە. مستەفا مەزهەر کە یەکێ بوە لە ڕۆشنبیرە ناسراوەکانی سلێمانی و، دواتر بۆتە بەڕێوەبەری مەعاریفی (پەروەردە)ی سلێمانی، هاوکاری مێجەرسۆن و دوای ئەو هی مێجەرگۆلد سمیس بوە، بۆ بەرێوەبردنی نوسین و سەرپەرشتی چاپ و کۆکردنەوەی ئابونەکانی.

پێشکەوتن، وەکو سەرەتای کاروانی نەپساوی ڕۆژنامەوانیی کوردی لە سلێمانی، بگرە لە کوردستانی عیراق دا، ئەهێنێ لە چەند لایەنی جیا جیاوە لێکۆڵینەوەی پوخت و درێژی لەسەر بکرێ.

## 3. لایەنی ڕۆژنامەوانیی پێشکەوتن

### 3. 1. لە روی سیاسیەوە

پێشکەوتن دوای ڕوخانی حوکمدارێتی کوردستان و گیرانی شێخ مەحمود و حوکمڕانیی ڕاستەوخۆی ئینگلیز، لە لایەن مێجەرسۆنەوە کە حاکمی سیاسیی سلێمانی بوە، دەرچوە. ئینگلیز ئەیویست ئەم ناوچە نائارامە ئارام بکاتەوە و ڕای گشتی دانیشتوانی بە لای خۆیدا ڕابکێشێ، زەمینەی بەستنەوەی لە ڕوی سیاسی، ئابوری و بەڕێوەبەرایەتییەوە بە بەغدادی پایتەختی عیراقەوە، خۆش بکات.

هێشتا ئەمیر فەیسەڵ نەهاتبو بۆ عیراق و نەبوبو بە مەلیک، پێشکەوتن کەوتبوە ستایشی. شان بە شانی رۆژنامەکانی بەغداد بە شان و باڵیدا هەڵئەدا و زەمینەی هێنان و (بەیعەت) پێکردنی خۆش ئەکرد.

## 3. 2. هونەری رۆژنامەوانیی

### 3. 2. 1. لە روی روخسارەوە

لە روی شێوە و رێکخستنەوە ناتەواوە. هەمو لاپەڕەیەکی دو ستونی تێدا نوسراوە و، هەمو لاپەڕەکانی و هەمو ژمارەکانی لە یەک ئەچن. بە دەگمەن پێڕەوی خاڵبەندی کردوە. وێنە و کلێشە و حەرفی گەورەی بۆ مانشێت و سەردێڕ تێدانیە. لاپەڕەکانی دابەش نەکراوە بەسەر بابەتی جیاواز و، هەواڵی ناوخۆ و دەرەوەدا. وتار و ریپۆرتاج و هەواڵ و شیعر و چیرۆک و مێژو تێکەڵاوە. جاری وا هەیە شیعر ستونی یەکەمی لاپەڕەی یەکەمی گرتوە و جاری وا هەیە سەروتار لە لاپەڕەکانی ناوەوەدایە. هۆی ئەمەیش دو شتە:

یەکەم، چاپخانەکە پچوک و سەرەتایی بوە.

دوەم، شارەزایی نوسەر و پیت رێکخەری رۆژنامەکە لە بواری رۆژنامەوانیدا کەم بوە.

### 3. 2. 2. لە روی ناوەرۆکەوە

ئەگەر هەواڵ بە کۆڵەکەی هەرە گرنگی رۆژنامە دابنرێ، ئەوا پێشکەوتن یەکێ لە رۆژنامە سەرکەوتوە دەوڵەمەندەکانی ئەو سەردەمەیە. هەواڵی ناوخۆی سلێمانی و دەوروبەری، هەواڵی بەغداد و ناوچەکانی ناوەڕاست و خواروی عیراق، هەواڵی شۆڕشی ساڵی 1920 (سەورەی عشرین) ی جنوب، شۆڕشی ئیبراهیم خانی دەلۆ، هاتنی مەفرەزەی تورک بۆ رەواندز، هەواڵەکانی تورکیا و ئێران و میسر، هەواڵی بۆلشەویک و روسیای سۆڤێتی، هەواڵی جیهان. ئەمانە کە لە سەرچاوە تایبەتەکانی خۆیان و، ئاژانسی رۆیتەر و، رۆژنامەکانی بەغداد و ئەستەموڵ و لەندەن وەرگیراون، لە چاو زەمانەکەیدا هەواڵی تەڕ و تازە بون.

جگە لە هەواڵ چەند ریپۆرتاجی گرنگی تێدایە لەسەر هەڵبژاردنی ئەنجومەنی سلێمانی و شارەکان، لە سەر کۆبونەوەی ئەشرافی سلێمانی لەگەڵ حاکمی سلێمانی و گفتوگۆ و، را وەرگرتن لەسەر پاشەڕۆژی سیاسیی کوردستان.

هەروەها ئاماری ورد لەسەر نفوسی سلێمانی و قەزا و ناحیەکانی و دەرامەت و خەرجی دەزگای بەرێوەبەرایەتی.

## 3. 3. سەرچاوەی دارایی

لە لای راست ناوی رۆژنامەکە نوسراوە:

هەمو شتێک بۆ پێشکەوتن دەنوسرێ. یەکێ بە ئانەیەکە. لە لای چەپیشی نوسراوە: کرێار بۆ هەمو شوێنێک بە 3 مانگ یەک بە شەش مانگ دو بە ساڵێک چوار روپیە دەدا. ئیعلان یا ئیشێکی خۆیی لە پەڕەی دواییدا دەنوسرێت، بۆ دو دێڕ 3 ئانە دەسێنرێت."

پێشکەوتن لە لایەن دەزگای حکومەتی ئینگلیز و لە چاپخانەی حکومەت چاپ کراوە. بودجەی رۆژنامەکە ئەوان دابینیان کردوە. زۆری موچەخۆرە گەورەکان و سەرۆکی عەشیرەت و بازرگانە ناسراوەکانی ناوچەی سلێمانی و دەوروبەری کراون بە ئابونەی رۆژنامەکە. هەمو ژمارەیەکیش چەند ئیعلانێکی تێدا بوە. لەگەڵ ئەوەیشدا لە چەند ژمارەدا داوای دانی ئابونەکەی لە بەشدارەکانی ئەکا و، کەسانی خۆی ناردوە بۆ کۆکردنەوەی.

لە ژ26 دا نوسیویێتی: "بۆ خـزمەت کڕیارەکـان: ئەوانەی بـۆ 6 مانـگ پـارەی پێشـکەوتنیان داوە لە ژمارەی 25 ەوە پارەکەیان تەواو بوە. هەچکەس دەیەوێت بە ڕێکی پێشکەوتنی بۆ بچێت، بۆ چەنی تـر حەز دەکات، بە پارەدان ناوی خۆی تازە بکاتەوە. ئەوانەیش هێشتا پارەیان نەداوە، یا هەر بـۆ 3 مانـگ داویـانە، چییان لەسەر ماوە بینێرن. تکا دەکەم مەهێڵن پاش بخرێت. مستەفا"

لە ژ33 دا نوسیوێتی: "بۆ کڕیارەکان: ئەوانەی هێشتا پارەیان نەگەیانوە تکادەکەم لەمە زیـاتر پاشـی نەخەن. ئەوی پێشـکەوتنی بـۆ دەچێـت خـۆی دەزانـێ حسـابی چـۆنە. پێویسـت نـیە یەکە یەکە بنوسـرێتە خزمەتیان. کێ چی لە سەرە بینێرێت. مستەفا."

لە ژ43 دا نوسیوێتی: "بۆ کڕیارەکان: ئەوانەی بۆ 3 یا بۆ 6 یان بۆ 9 مانـگ پـارەی پێشـکەوتنیان داوە، دەمێکە پارەکەیان بڕاوەتەوە. ئەوی بۆ 3 مانگ پارەی داوە لە ژمارە 13 ەوە، ئەوی بۆ 6 مانگ پـارەی داوە لە ژمارەی 25 ەوە، ئەوی بۆ 9 مانگ پارەی داوە لە ژمـارە 37 ەوە قەرزدارە. تکـا دەکەم ئەوی پـارەی پێشکەوتنی لە خزمەتا هەیە بینێرێت. مستەفا."

لە ژ51 دا نوسیوێتی: "تکایە وا ساڵ تەواو دەبێ. ئەوانەی پارەی پێشکەوتن و ئیعلانیـان لە خزمەتـا هەیە، تکا دەکەم کەرەمی بفەرمون، تا حسێبی ساڵی ڕابـوردو لەگەڵ سـاڵێکی تـردا تـێکەڵ و پـێکەڵ نەبێـت. مستەفا"

لە ژ54 دا نوسیوێتی: "بۆ خزمەت کڕیارەکان: ساڵی پێشکەوتن هەتا ژمـارە 52 بـو. لە ژمـارەی 53 ەوە ساڵی تازەیە. تکـا دەکەم هەچـکەس پـارەی سـاڵی ڕابـوردوی لە خزمەتـا هەیە لەگەڵ هـی سـاڵی تـازەدا بینێرن. مستەفا"

لە ژ56 دا نوسیوێتی: "بۆ کڕیارەکان: ئەوەتەی ساڵی تازەی پێشکەوتن داهاتوە هێشتا بۆ ساڵی تازە پارەتان کەرەم نەفەرموە. هی ساڵی ڕابوردویش هێشتا لای هەنێک ماوە. مستەفا"

لە ژ65 دا نوسیوێتی: "بۆ خزمەت کڕیارەکان: بۆ کەرەم فەرمونی پارەی ساڵی تازەی کڕیارەکان هەتا ئێستا شتێکی وایان نەگەیانوە. تکامان وایە ئەوی پێشکەوتنی بۆ دەچێت خۆی حسـێبی خـۆی دەزانـێ چ لە هی ساڵی ڕابوردو و چ لە هی ساڵی تازە. ئەوی لە خزمەتیا هەیە کەرەمی بفەرموێت و بینێرێت. پ"

لە ژ74 دا نوسیوێتی: "بۆ خزمەت کڕیارەکان: هەنـێ لە کڕیارەکـان پـارەی پێشـکەوتنیان لە خزمەتـا ماوە، لوتفەن بۆ کەرەم کردنی هیمەت بفەرمون. مستەفا".

لە ژ114 دا نوسیوێتی: "بـۆ خـزمەت کڕیارەکـان: لە ژمـارە 104 ەوە دوایـی دوەم سـاڵە. ئەوانە کە هێشتا لە حەقی دوەم ساڵ پارەیان لە خزمەتدا ماوە، لەگەڵ هی سێیەم سـاڵدا، وە ئەوانە کە هێشـتا لە حەقـی سێیەم ساڵ هیچیان نەداوە تکا دەکەین زو ئابونەکانیان بگەیەنن بە ئیدارە. پێشکەوتن".

گیروگرفتـی ئـابونە وەکـو سـەرچاوەیەکی دارایـی، لەو سـەردەمەوە کێشـەیەکی بەردەوامـی ژیـانی ڕۆژنامەوانیی کوردی بوە. چونکە ڕۆژنامەوانی نەبـۆتە دەزگـا و دامەزراو، هەمیشـە بە دەس ئەم کێشـەیەوە ناڵاندویەتی.

## 4. داخستنی

لەو کاتەدا کوردستان زۆر نائارام بو. چەکـداری کـورد لە زۆر شـوێن بەرەنگـاری هێزەکـانی ئنگلیـز ئەبونەوە و بۆسەیان بۆ ئەنانەوە. لە چەند جێگا ئەفسەری ئینگلیز کـوژرا. مەفرەزەیەکـی حکـومەتی تورکیـا گەیشت بوە ڕەواندز و، لەنـاو خێڵەکـانی کـوردا لایەنگـری زۆریـان پەیـدا کـرد بـو. دەسـەڵاتی ئنگلیـز بـۆ

سەلامەتی خۆیان و ئارامکردنەوەی ناوچەکە و دەرکردنی هێزی تورک، بڕیاریان دابـو خۆیـان بـۆ مـاوەیەک بکشێننەوە و دەسەڵات لە ناوچەکە بدەنە دەست پیاوماقوڵانی سلێمانی، تا شێخ مەحمـود لە مەنفـاوە ئەگـاتەوە کوردستان.

هەر بۆ ئەو مەبەستە، ڕێگایان دا بە حاجی مستافا پاشـای یـامڵکی کە جەنەراڵێکـی خانەنشـینکراوی ئۆردوی تورک و تازە گەڕابوەوە سلێمانی، ڕێکخراوێک بە ناوی (جەمعیەتـی کوردسـتان) ەوە دابمەزرێنـێ و غەزەتەیەک بە ناوی (بانگی کوردستان) ەوە دەر بکات.

لە ژ118 ی 27 ی جولای 1922 دا، لە ژێر سەردێڕی (پێشکەوتن) دا نوسیوێتی:

"غەزەتەی پێشکەوتن کە هەتا ئێستا لە سلێمانی چاپ و نەشـر دەکـرا ئەمە ئـاخر نوسـخەیەتی. ئیتـر لەمەولا دەرناچێـت. ئەوانە کە پـارەی ئابونەیـان لەسـەر دائیـرەی پێشـکەوتن هەیە وا ناویـان و میقـداری پارەکەیان دەرج و دەور کرایەوە بۆ دائیرەی بانگی کوردستان. ئەگەر پێیـان خۆشـە لەگەڵ ئەوان دا حسـێبی خۆیان بکەن.

"خۆ ئەگەر ئەم تەرتیبەیان لا باش نیە جوابمان لێ بگێڕنەوە پارەکە بدرێتەوە بە خۆیان."

## 5. پۆلێنی هەواڵەکانی

### 5. 1. هەواڵی ناوخۆی سلێمانی

پێشکەوتن لە هەواڵی ناوچەی سـلێمانی و دەوروبەر بتـرازێ، هەواڵـی ناوچەکـانی تـری کوردسـتانی عیراقی بە دەگمەن بڵاوکردۆتەوە. هەواڵەکانی بە زۆری باس لە دروستکردن و چاککردنی ڕیگاوبانی بەسـتنی سلێمانی بە دەرەوە، هەواڵی شارەوانی و پاککردنەوەی کۆڵانەکانی ناو شار و، موسـابەقەی ئەسـپ سـواری و هەواڵی دزی و کوشتنە.

### 5. 2. هەواڵی تورکیا و کەمالیەکان

بە دەگمەن ژمارەیەکی هەیە کە هەواڵی تورکیای عوسمانی یا تورکیای کەمالی تێدا نەبـێ. هەواڵەکـانی ژیرانە هەڵبژێردراون و ژیـرانەش داڕێـژراون. بـۆ ئەوەی کـار لە بیـروڕای گشـتی خوێنـدەوارەکانی بکـا و، تورکیا بە تایبەتی کەمالیەکانیان لە لا ڕەش ببێ. لەو کاتەدا هێشـتا چارەنوسـی ولایەتـی موسـڵ بە لایەک دا نەکەوت بو. تورکیای کەمالی ولایەتی موسڵی بە بەشێکی لە جیـابونەوە نەهـاتوی ئـەرزی وڵاتەکەی دائەنـا و داوای ئەکرد بگەڕێتەوە بۆ تورکیـا. بەهانەکەیشـی لەم داوایەدا ئەوە بـو، کە ولایەتـی موسـڵ بە شـەڕ داگیـر نەکرابو، بەڵکو دوای ئیمزا کردنی ڕێککەوتنی ئاگربڕ هێزی بریتانی تێی چو بو. ئینگلیزیش ئەیویست بیکا بە بەشێ لەو دەوڵەتەی کە تازە بە ناوی عیراقەوە خەریکی دامەزراندنی بو.

### 5. 3. بۆلشەویک

بە دەگمەن ژمارەیەکی پێشکەوتن دەرچـوە هەواڵـی ڕوسـیای سـۆڤێتی و بۆلشـەویکی تـێدا نەبـێ. لە سەردەمی جەنگـدا، ڕوسیای قەیسەری هاوپەیمانی ئینگلیز بو. هێزەکانی هەر دو لا بە تەما بون لەسەر ئەرزی عیراق یەک بگرنەوە.

هێزەکانی ئینگلیز بەسرایان گرت بو بەرەو ژور هەڵئەکشان. هێزەکانی ڕوسیای قەیسەری یـش لە لای سـەرەوە گەیشـتبونە ڕەوانـدز و، لە ڕۆژهەڵاتەوە گەیشـتبونە خـانەقین. لەو دەمـانەدا شۆڕشـی ئۆکتـۆبەر بە

سەرکردایەتی لینین قەوما. هێزەکانی روسیا لە هەمو شەڕگەکان کشانەوە و رێککەوتنە نهێنیەکـانی سـایکس_ بیکۆیان ئاشکرا کرد. رژێمی سۆڤیەتی بو بە گەورەترین مەترسی بۆ سەر وڵاتانی سـەرمایەداری و، وڵاتـانی ئەوروپی بە دوژمنی ژمارە یەکی خۆیان دائەنا.

بریتانیا کە هێزی سەرەکی ناو دنیای سەرمایەداری بو، بە هەمو رێگەیەک هەوڵی رێبڕینـی تەنیـنەوەی بیروباوەڕەکانی شۆڕشی ئۆکتـۆبەر و گەمـارۆدان و روخانـدنی ئەدا. یەکـێ لە هەوڵەکـانی شـێواندنی بیـری کۆمۆنیزم و بەدناوکردنی بۆلشەویک بو. لە چوارچێوەی ئەم سیاسەتەدا هەمو ژمارەیەک هەواڵـێ یـا زیـاتری بڵاو کردۆتەوە، بە نیازی پیشاندانی لایەنی تاریک و خراپی رژێمی روسیای سۆڤێتی.

### 5. 4. هەواڵی عیراق

فەیسەڵ هێشتا لە سوریا بو، پێشکەوتن هەواڵەکانی بڵاوئەکردەوە و هەوڵی ئەدا لە بەردەم فەرەنسـا و عەرەبەکانی عیراقدا پاکانە بۆ ئەم بکا، لەو شکانەی لە سوریا بە سەری هات بو. پاشتر زەمیـنەی بـۆ خـۆش ئەکرد کە گەلی عیراق بـیکەن بە مەلیکـی خۆیـان. هەواڵەکـانی سـەورەی عشـرینی بە شـێواوی و بـۆ ئەوەی ناحەزانی ئینگلز لەناو کوردا دڵی خۆیان بەم روداوە خۆش نەکەن و نەبێتە هاندەرێک بۆ راپەرینی ئەوانیش، لە گەورەیی شۆڕشەکەی کەم ئەکردەوە، باڵادەستی هێزی ئینگلیز گەورەتر و شەڕی شۆڕشـگێرەکانی پچـوکتر ئەکردەوە. شۆڕشەکەی وەکو جوڵانەوەیەکی دواکەوتوی جەردەیی پێشان ئەدا. دڵڕەقی هێزەکـانی ئینگلیـزی نە ئەشاردەوە. بۆ چاو ترساندنی خەڵک، بەئاشکرا باسی بۆردومان و ویرانکردن و گوللەباران و کوشـتن و ئاو لێ بڕین... ئەکا.

### 5. 5. هەواڵی کۆڕ و کۆمەڵە ناوەدەوڵەتیەکان

### 5. 6. هی تر

جگە لەوانە، زۆر هەواڵی جۆراوجۆری وڵاتانی دنیای بڵاوکردۆتەوە.

## 6. لایەنی زمان

زمـانی کـوردی ئەگەرچـی لە چەنـد سـەدە لەوەو پێشـەوە، شـیعری پـی هـۆنراوەتەوە. لە سـەدەی نۆزدەهەمیشدا، هەندێ باسی دینیی عەقیدەی ئیسلام و مەولودنامەی پێغەمەر و باسی مێژویی پـێ نوسـراوە، بەڵام نە لەنـاو خەڵـکدا بەکارهێنـانی بـاو بـوە، نە لە نـاو داوودەزگاکـانی حکـومەتیشدا زمـانی رەسـمی بەکارهێنان بوە. تا دامەزراندنی حکومدرایەتی کوردستان، بە سەرۆکایەتی شێخ مەحمـود لە سـلێمانی، ئەوسـا ئیتر یەکەم هەنگاو نرا بەرەو ئەوەی زمانی کوردی ببێتە زمانی خوێندنگا و دادگا و داوودەزگای حوکمڕانی.

حوکمـدارێتی یەکەمـی شـێخ مەحمـود زۆری نەخایانـد. لە سـەرەتای تشـرینی یەکەمـی 1918 تـا حوزەیرانی 1919ی خایاند، لەو کاتەدا سلێمانی هێشتا وێـرانە بـو. تـازە لە کارەسـاتی گرانـی و قـاتوقڕی یەکەمین جەنگی جیهانی دەرچو بو. دانیشتوانی سلێمانی دو لە سێی فەوتا بو، سێیەکی مابو. زۆری دوکـان و خان و خانو و مزگەوتەکان بوبون بە کەلاوە. باری ئابوری بـازاڕ و کشـتوکاڵ، بـاری ژیـان بە گشـتی زۆر خراپ بو. لەبەرئەوە هەڵساندنەوەی باری ئابوری و ئابینکردنی لایەنی کەمی ژیان، بوبون بە خەمی پلە یەکی کاربەدەستان و خەڵک.

لەو سەردەمەدا لە هەمو کوردستانی جنوبیدا کە وەکو ئەوسا پێیان ئەوت، چاپخانەیەک نەبو. تەنیـا لە سـلێمانی خوێنـدنگایەکی روشـدی عەسـکەری و خوێنـدنگایەکی مـوڵکی هەبـو. ئەویـش بە هـۆی جەنـگەوە

هەڵوەشا بو. تەقینەوەی ناکۆکی لە نێوان شێخ مەحمود و دەسەڵاتی ئینگلیزدا، بو بە سەر باری خراپی دۆخی ناوچەکە.

کە ئینگلیز سلێمانی داگیر کرد، لە داوودەزگاکانی حکومەتی سلێمانیدا، کوردی، زمانی رەسمی بەکارهێنان بو. بەڵام ئەو داوودەزگایەی سەردەمی شێخ مەحمود هەڵوەشێنرایەوە و ئینگلیز سەرلەنوێ خۆی داوودەزگایەکی تازەی تێدا دامەزراند. زۆری رۆشنبیر و خوێندەوارەکانی سلێمانیی لەم دەزگایەدا جێ کردەوە. کوردی کرایە زمانی نوسینی نامەکاریی رەسمیی نێوان دائیرەکان. دەرکردنی (پێشکەوتن) یش ئەم بڕیارەی چاکتر جێگر کرد. ئەگەرچی کەرکوک و موسڵ یش لە ژێر دەسەڵاتی راستەوخۆی حاکمە سیاسیەکانی ئینگلیزدا بون، بەڵام بەکارهێنانی کوردی هەر لە سلێمانیدا قەتیس ما، نەتەنیەوە بۆ ناو شاری کەرکوک و ناوچە کوردنشینەکانی موسڵ لە بادینان. ئینگلیزیش نەیکرد بە زمانی رەسمی لەو شوێنانەدا.

نوسینی زمانی کوردی تازە خەریک بو زمانی ئەپڕژا. هێشتا رێنوسێکی تایبەتی خۆی نەبو. بە رێنوسی فارسی و عەرەبی ئەنوسرا. زمانەکەیش هێشتا لە باری رێزمانەوە نە خەملا بو. لە باری دارشتنەوە پڕی بو لە وشەی تورکی، عەرەبی، فارسی.

**(پێشکەوتن) کە هاتە مەیدانەوە خزمەتێکی گەورەی بە زمانی کوردی کرد:**

یەکەم:

لە چەسپاندنی زمانی کوردیدا وەکو زمانی نوسینی رۆژنامەوانی و رەسمیی لە دائیرەکانی حکومەتدا.

دوەم:

لە هەوڵدانیدا بۆ بژارکردنی زمانی کوردی لە وشەی ناقۆڵا و نائاشنای بێگانە. هەر دو کار، بەرهەڵستی زۆری هەبو. تەنانەت لە ناو رۆشنبیرانی کوردیش دا هەبون، کە ئەم هەنگاوەیان پێ باش نەبو.

لە ژ5 ی 27 ی مەی 920 دا یەکێ بە ناوی ئەحمەد، نوسیویێتی:

"بێینە سەر مەقسەد، وا دیارە کە ئەربابی نوسین جەنابیان خەریکن کە بە جارێ زبانی کوردی لە زبانی فارسی و عەرەبی روت بکەن. بە جارێ سادە و ئازادی بهێڵنەوە، ئەمەش لە پڕا مومکین نابێ. لەبەر ئەمەی زبانی کوردی تەحرێک و نمونەیەکە و بۆ عەرەبیش عادەتا بوە بە موحتاج موحتاجی، خصوص زبانی عەرەبی زۆر دەوڵەمەندە، هەروا بە دەسوبردی ناتوانین ئیستیغنای لێ بکەین. هەرچەن ئەمە ئینکار ناکرێ، ئەمرۆ لە کورد و عەشایری کوردەواری خۆمان کە جنوبیە، زبانیان هەیە زۆر سادە و ئازادە. ئەگەر ئەربابی خۆی بگەڕێ و لێکی باتەوە، نزیکی ئیمکان دەبێ کە ئەمەندە ئیحتیاجی نەنوێنین. سەربەخۆ زبانی ئێمەش رەنگ و شکلێک بە جوێ بۆ خۆی پەیا بکا، بەڵام ئەو زەرافەت و ئەو جیناس و حەلاوەتەی کە هەیە تێک دەچێ نامێنێ. ئەمە لازمە نەک وا بە دەسوبردی.

"بە مانوکردنی فکر و هۆش، بە تەدریج زبانی خۆمان رێگای نوسین و وتنی بدۆزێتەوە و بە حەق خۆشی بکات. زاتەن دەبێ لەمەولا ئەربابی فەزیلەتیش حەمییەتەن هەوڵ بدا بۆ ئەم زبانە، وەکو زبانەکانی کە ئەساس و قاعیدەی بۆ بدۆزێتەوە و داینێ بۆی.

"لەبەر ئەمەی زبانی ئێمە زۆر لە دوا ماوەتەوە کە زۆریش ئستیعدادی پێشکەوتنی هەیە، وام نیاز و رجایە، وا دەمودەست بە یەکجارەکی زبانەکەمان دەستی لێ نەدرێ. هیچ نەبێ قیاس لە زمانی عوسمانی بکەین، ئەو بەو کۆهنەییە و بەم هەمو هیمەتەوە کە لێی کرا، ئەدەبیاتیشی بەم دەرەجەیە کە تەرەقی کردوە، جارێ هەر لە ئەسارەتی فارسی و عەرەبی خۆی پێ رزگار نەکرا."

لە ژ6 ی 3 ی جـونی 920 دا (م...) لە سـەروتاری رۆژنـامەکەدا لە وەڵامـی ئەم وتـارەدا لە ژێـر سەردێڕی: (بۆ خۆوڵاتیەکان بە حەمویەتی و بۆ ئەحمەد بەگ بە تایبەتی) نوسیویێتی:

جاری پێشو لە پێشکەوتن دا لەسەر زمانی کورد شتێک درێـژە درا بـو: کـە ئەم زمـانە بە جارێـک لە عەرەبی و فارس ڕوت نەکرێت و ناکرێت.

بەڵێ خۆ دیـارە لە پرێکـدا کەس نابێـت بە کورێـک، بەڵام ئەوەی لە دەسـت بێـت و بکرێـت بـۆچ نەکرێت.

"وادەزانم ئەو نوسینانە کە عەرەبی و فارسی تێکەڵە، ئەگەر بڵێم زۆر کەسی وا هەیە کە تێی ناگا، درۆ نەبێت.

"وەک لە فەرمـودەکەی ئەحـمەد بەگ دا ئەم دێـڕەی تیـا نوسـرا بـو: (ئەو زەرافەت و تەراوەتە، ئەو جیناس و حەلاوەتە) ئێوە بن و خوا، ئەمە کەی کوردیە؟ یەکێ لە عەرەبی زۆر شارەزا نەبێ لەمە چۆن دەگات؟ کوێخا و پیاوماقوڵەکانمان یەکە یەکە ئەمانەیان لێ بپرسنەوە باش دەرئەکەوێت کە درۆ نـاکەم. ئەو جـوانی و باشی و خۆشیە کە بۆ عەرەبی و فارسی دادەنرێـت، لەبەر ئەمەیە کە زۆر بێـژراوە و بـاش چـۆتە مێشـکەوە، ئەگینا کورد لە فارسیش کۆنترە. ئەگەر باش تەماشای فارسـی بکرێـت تیـا دەر ئەکەوێـت کە لە کـوردی زۆر وەرگرتوە، چونکە نوسینمان بە کوردی نەبو... زمانەکەمان پاش کەوت.

"بەڵێ براویش بەوە دەکرێت، بێتو زمانەکەمان ڕوت بکرێت لەوانی تر، بۆ ئەمڕۆی ئێمە گرانە، بەشکو زۆریش گرانە. ئەگەر ئێمە ئەم گرانیە لەسەر خۆمان فرێ بدەین، لە (رابوردوانە) کە ئەم گرانیەیان بۆ بە جـێ هێشتوین بێ جێتر دەکەین، چونکە بە یەکجاری دەیکوژێنینەوە، ئەوانەی پاش ئێمە دەکەون لێیـان ون دەبـێ، ئیتر بۆیان نادۆزرێتەوە.

خۆ دیارە چ لە ناو عەرەب و چ لە ناو عەجەم، لە ناو کورد و تورک، شـت بـۆیە دەنوسـرێت کە حەمـو کەس بتوانێ تێی بگات. هەچکەس بەو زمانە کە ئەیەوێت شتێکی نوسی کە حەمو کەس تێ گەیشت و توانی لە زمانێکی تر کەم یا هیچی تێکەڵ نەکرد، بۆچ ناشرینە؟.

"ئێوە دەڵێن جارێ بۆ ئەو زمانە رەنگێک برێژرێت ئینجا دەستی لـێ بـدرێت. بەڵـێ باشـە. بەڵام ئەم دەست لێ دانە روخانن نیە، بەشکو نەهێشتنی دڵـۆپەی عەرەبـی و فارسـیە هەتـا لە تـوانین دا بـێ کـون و قوژبنیشی بگیرێت."

لە ژ10 ی 1ی جولای 920 دا قەرەداغی مستەفا لە وتارێکی بێ سەردێڕدا نوسویێتی: "دەبێ زۆر پـێ خۆش بین کە دەوڵەتی فەخیمەی بریتانیا بە کوردستانی ئێمە ئەم ئیمتیازەی داوینێ: نوسین و خوێنـدنەوە و معامەلاتی رەسمیەمان بە زبانی خۆمان بێ، بەڵام پێشکەوتنی ئەم زبانی ئـێمەیە چەنـد شـتێکی دەوێ لە سـەر هەموان ویستەنیە هەوڵی بۆ بدەین.

1. بۆ جیا کردنەوەی قسەی ساغ و ناساغ وەکو زبانەکانی تر صەرفێکی دەوێ...
2. چونکە ئەم زبانە شێوەیەکی جیاوازی نیە، فێر بون و پێڕاهاتنی خوێندنەوەی بە شێوەی نوسـینی فارسی و عەرەبی بۆ هەندێ کەس گـرانە. بەڵام ئەگەر چەنـد کەسـێ لە ئەهلـی زانسـت و بیـردار خەریـک بـین مـومکینە شـێوە نوسـینێکی بـۆ دانـێن بە چـاودێری حکـومەتەوە لە مەکـتەب و قوتابخانەکانا بە جێ بێنرێت، زۆر زو هەمو کەس فێری دەبێ...
3. هەمو ئیشێ بە چاودێری حکومەت رەنگ دەگرێ... "

پێشکەوتن و نوسەرەکانی گوێیان نەدایە ڕەخنە و ناڕەزایی. لە سەر ڕێبازی خۆیان ڕۆیشتن. لە ژ27 ی 28 ی ئۆکتۆبەری 920 دا پێشبڕکێیەکی ئەدەبی ساز کردوە و (بۆ زانین) ێکی بڵاوکردۆتەوە. بۆ ئەوەی خوێندەواری ئێستا ڕێنوس و ڕێزمان و شێوەی داڕشتنی نوسینی ئەوسا و ئێستا بەراورد بکا، بە هەردو جۆر لێرەدا ئەینوسمەوە:

**بە ڕێنوسی ئەوسا:**

"پیشکوتن خوی و کوملی لوساوە کە حز بە ژورکوتن و پیشکوتنی زمانی کوردی خومان دەکات. وا هیە کە نوسینی کوردی بکریت و بانکی اوانە دەکات کە حز لە نوسین دەکن.

1. بە 3 رنک پارەی داناوە بو کرینی ام نوسینە کوردیە بو (1) پنجاروپیە بو (2) 35 روپیە بو (3)بیست و پینج روپیە.
2. هتا رۆژ 10 نومبر 920 ام نوسینە وردەکیرریت."

**بە ڕێنوسی ئێستا:**

"پێشکەوتن خۆی و کۆمەڵی لەوساوە کە حەز بە ژورکەوتن و پێشکەوتنی زمانی کوردی خۆمان دەکات. وا هەیە کە نوسینی کوردی بکڕێت و بانگی ئەوانە دەکات کە حەز لە نوسین دەکەن.:

1. بە 3 ڕەنگ پارەی داناوە بۆ کڕینی ئەم نوسینە کوردیە بۆ یەکەم 50 ڕوپیە، بۆ دوەم 35 ڕوپیە. بۆ سێیەم 25 ڕوپیە.
2. هەتا ڕۆژی 10 ی نۆڤەمبەری 920 ئەم نوسینە وەردەگیرێت."

ئەنجامی پێشبڕکێ و دابەشکردنی خەڵاتەکانی بەم جۆرە بڵاوکردۆتەوە:

"نوسینە کڕیاریەکان: لە ژ27 و 28 ی ئۆکتۆبەری 920 ی پێشکەوتن دا وتبومان کە نوسینی کوردی دەکڕین. ئەوانەی کە نوسینیان خستبوە ئەم بازاڕی پێشکەوتنەوە لە 11 ئەم 3 یانەی کەوا چاپ کراوە بە باشتر بینرا، چونکە 8 مکەی تر لە کتێب و بیستنی وەرگیرا بو، وەک ئەمانە کە هەر بە بیرا هاتوە چاک نەبینرا، چونکە وەرگرتن وەک خۆرێکخستن و داهێنان گران نیە. ئازایی زیاتر لەوەدایە کە پیاو بە بیری خۆی ڕێکی خات نەک لەم و لەوی وەرگرێت.

"ئەو 3 یانە کە کڕران:

"یەکەمینیان، باسی جوت و گایە کە م. نوری وتویەتی، 50 روپیە وەردەگرێت.

"دوەمیان، بۆچڕوکی زەکی سائیبە، 35 روپیە وەردەگرێت.

"سێیەمیان، ڕۆژەوەبونێکی محەمەد جەمیلە، 25 روپیە وەردەگرێت.

"جوت و گاکەی م. نوری چونکە بە شیعر داپناوە، دیارە ئازایی زیاترە لە بەر ئەوە پێش دوانەکەی تر کەوت. پێشکەوتن"

لە ژ42 ی 10 ی فێبریوەری 920 دا نوسیویێتی:

"جاران وا بە بیردا دەهات کە کوردی نانوسرێت و ناخوێنرێتەوە. کەچی دەرکەوت کە باش دەنوسرێت و دەخوێنرێتەوە، بەڵام وەک زمانەکانی تر لە پێشەوە ماندویەتییان تیا کێشاوە ئینجا بوە بە شتێک و جێگا و شوێنێکی باشی گرتوە. ئەمیش ماندویەتی دەوێت بۆ ئەمە کە جوانتر و باشتر بنوسرێت و بخوێنرێتەوە و جێگایەکەی بەرزتر بکرێتەوە. جا ئەویش لە سەر خۆڵاتیەکان، لە سەر بیردارەکان و کوردە پەتیەکان کە یەک بگرن چی پێویستە بکرێت، کام لای ناتەواوە تەواو کرێت بۆ ئەو شتانەی کە وتنی لەگەڵ نوسینا جیاوازە... شتێک ڕێک خرێت و دانرێت..."

لە ژ44 ی 24 ی فێبریوەری 921 دا، م. نوری لە سەر: (لە یەکچونی حروف؟) نوسیوێتی. لە کێشەی ئەو حەرفانە ئەدوێ کە بە دو جۆری جیاواز ئەخوێنرێنەوە.

لە ژ87 ی 22 ی دێسمبەری 921 دا، رەسول ناجی کە رۆشنبیرێکی کۆیی بوە و لەو کاتەدا لە موسڵ فەرمانبەر بوە، لە وتارێ دا لە ژێر سەرناوی: (زمانی خۆمان لە بیر نەچێ) دا، نوسیوێتی:

"صەدایەک لە شەهری موصل: لە تاریخی تشرینی ئەوەلی 921 ی غەزەتەی (العراق) وەهای دەنوسـێ: بۆ تەدریساتی لیسانی عەرەبی لە لای حکومەتی عەرەبیە لە سلێمانی مەکتەبێک تەشکیل دەکرێت.

سەبەب بەم خەبەرە عەجەلە بۆ مەنعی ئەم مەکتەبە حسـیاتی میللیەمـان کەوتە حەرەکەوە. وەقـتەن کە لە دیاری کوردستان، بە ناوی ئیسلامیەت لە قەدیم دا کە تەحصیلی عەرەبی ئیتیخاز کرا بو، لە گەلێک مەملەکەتانی کورد ناوی کوردی شۆرا و، لە پاش ئەمە وەکو تورکەکان مەملەکەتانی ئێمەیان ئیستیلا کرد هەمیسـان زمـانی کوردی لە بەعزێ جێگا ون کرا و حەتا قەومی کورد بەم دەرەجە هاتوە لە قەومی عەرەب پـرس بـکەن: (کـورد ماعندهم لسان) و، تورک هەمیشە دەبێژن: (کوردلردە لسـانی رسـمی یوقـدر) ئەسـبابی ئەمەش ئەساسـەن ئەم حکومەتانەی لە وەقتی خۆی دا ئیجرای حوکمدارییان لە سەر حکومەتی کورد کرد، مەیـدانیان نەدا بەم مـیللەتە کە تەحصیل بە زمانی خۆیان بکەن.

لەبەر ئەم بەعزە تەقەلوبات و تەغیرات کە لە حەق میللەتی کورد لەمەوپێش ئیجـرا کـرا، قەومـی کـوردی بەستەزمان قەومیەتی خۆیان لە بیر کرد و بۆ ئیستیقبالی خۆیان نەیانتوانی سەعی بکەن. لە سایەی حکومەتی موعەزەمەی بریتانیا ئەمڕۆ قەومی کورد چاوی خۆیان کردۆتەوە. لەمەودوا ئەیەوێ حوڕ بژی و حاکمیەتی هیچ میللەتێکی تر قبوڵ ناکەن. قەومی کورد مالیک بە زمانی خۆیەتی. لە باتی ئەمە مەکتەبی عەرەبـی لە وڵاتەکـانی ئێمە تەئسیس بکرێ، تەدریساتی ئینگلیزی بۆ ئێمە لازمترە... "

ئەم وتارەی رەسول ناجی مشـتومڕێکی زۆری نـاوەتەوە لە نێـوان کۆنەپارێزەکـان و نوێخوازەکـاندا. قەرەداغی مستەفا لە ژ89 و 90 دا لە ژێر ناوی: (باسی تەدریساتی عەرەبیە) دا، داکۆکی لە خوێنـدنی زمـانی عەرەبی ئەکا لەبەرئەوەی زمانی قورئان و دینی ئیسلامە و ئەڵێ: (چونکە ئەکسەری خەڵـق وای تـێ دەگەن کە ئەمە لە عەلەیهی عالەم و علومی عەرەبیەیە، هەریەک بە دەنگێ و لە هەر لایە بە رەنگێ تەنقید کـرا، بەڵام دیـارە ئەو زاتانە کە لە موتەفەکیرینی قەومی کوردن مەقسەدیان هەر دەلالەت و رەهنمایی محافزەی حقوق و هەویەتی کورد بوە، خودا نەکردە نابێ مەقسەدیان تەعەسوب و مومانەعەتی تەدریساتی عەرەبیە بێ...".

م. نـوری لە ژ91 دا لە سـەر رەسـول نـاجی هەڵئەداتـێ و بەرپەرچـی قەرەداغـی ئەداتەوە. لەمە زۆر توندتر، نوسەرێکی کە بە بێ ناو لە ژمارەکانی 92 - 100 بە وتارێکی درێژ بە زنجیرە لە ژێر نـاوی: (بـێ زمان - بەسەزمان) دا، بەرپەرچی بیانوەکانی قەرەداغی داوەتەوە و داکۆکی لە خوێندنی کوردی ئەکا.

لەو قۆنـاغەی ژیـانی کـوردا لەنـاو ئەو گـۆڕانەی بە سـەر نەخشـەی سیاسـی نـاوچەکەدا هـات بـو، چەسپاندنی زمانی کوردی گرنگیەکی زۆر گەورەی هەبـوە. لە نـاوچەکەدا چەنـدین دەوڵەت- نەتەوەی تـازە لە دامەزراندندا بون. فارسی زمـانی نەتەوەیـی ئێـران و، تـورکی زمـانی نەتەوەیـی تورکیـا و، عەرەبـی زمـانی نەتەوەیی عیراق و سوریا و لوبنان و حیجاز و میسر بو. زمان بو لەو سەردەمەدا، لە پلەی یەکەمدا ناسـنامەی نەتەوەیی گەلانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی دیاری ئەکرد. نەتەوە پەرستە شۆڤێنیەکانی تورک و فـارس و عەرەب

بونی نەتەوەی کوردیان نەئەسەلماند، چـونکە سـەربەخۆیی و یەکێتـی زمـانی کوردیـان نەئەسـەلماند. تـورک ئەیان وت کوردی زمان نیە، تێکەڵاوە لە تورکی و عەرەبـی و فارسـی، فـارس ئەیـان وت کـوردی لەهجەیەکـی ناوچەیی ئێرانی خاوێنە، عەرەبیش ئەیان وت کوردی زمان نیە چونکە پیی نەنوسراوە و تیکەڵاوە لە وشـەی عەرەبـی و زمانەکـانی تـر. لەبەرئەوە رۆشـنبیرانی کـورد هەوڵیـان ئەدا، ئەم بیـانوانە بە درۆ بـخەنەوە و بیسەلمێنن کوردی لەهجەیەکی ناوچەیی ئێرانی یا زمانی تێکەڵ و پێکەڵی بێ سەروبەر نـیە، بەڵکـو زمـانێکی رەسەنی سەربەخۆیە. بۆ ئەوەیش هەوڵیان ئەدا کە زمانی کوردی پاک بکەنەوە لە وشـەی بێگـانە، رێنـوس و رێزمانەکەی رێک بخەن. ئەمەیش ئەرکێکی نەتەوەیی پیرۆز بو.

بـونی وشـەی زۆری بێگـانە لە زمانەکـانی تـورکی و فارسـیدا بـۆ ئەوان بە کەمایەسـی دانـەئەنرا و خۆیشـیان ئەوەیـان بە خەوش دانـەئەنا. هەرچەنـدە هەردو دەوڵەت کـۆڕی زمـانەوانیـیـان دامەزرانـد بـۆ بژارکردنی زمانەکانیان، بەڵام هەرگیز نەیانتوانی زمانەکانیان پاک بکەنەوە.

رۆژنامە هەرە گەورەکانی تورک ناوەکانیان عەرەبی بـو: مـیللەت، حـورییەت، جمهـورییەت... هەروەهـا ناوی زۆر لە رۆژنامە گەورەکانی ئێرانیش هەر عەرەبی بو: حبل المتین، اطلاعات، شفق سرخ، صـور اسـرافیل، چونکە ئەوان خاوەنی دەوڵەتی خۆیان بون، هیچیان ئەمەیان بۆ بناغەی زمانەکانیان بە لاوازی و بـۆ شـکۆی نەتەوەییـیان بە نەنگی دانەئەنا، راستیەکەیشـی ئەم جـۆرە وەرگـرتن و خواسـتنە زمـان دەوڵەمەن ئەکـا نەک لاواز، کەچی ئەوان چونکە کورد خاوەنی دەوڵەتی خۆی نەبو، ئەمەیان بە بەڵگەی نەسەلماندنی سەربەخۆیی و رەسەنیـی زمانی کوردی دائەنا.

## 7. لایەنی ئەدەبی

جگە لە مستەفا مەزهەر (م. م) کە لە دەرکردنی رۆژنـامەکەدا یاریـدەی مـێجەر سـۆنی ئەدا، ژمـارەیەکی زۆر لە نوسەر و شاعیرەکانی ئەوسای سلێمانی بەشداریی نوسینیان کردوە و بەرهەمەکانیـان لە پێشـکەوتندا بڵاوکردۆتەوە، لەوانە: شێخ نوری شێخ ساڵح (م. نوری)، جەمال عیرفان (ج. ع)، ئەحـمەد حەمـدی سـاحێبقران، مستەفا سائیب (زەکی سائیب)، زێوەر بێخود، ئەسیری، سەعید کابان (سەعید سـدقی)، رشـید کابـان (رەشـید زەکی)، تۆفیق وەهبی، تۆفیق فایەق، مستەفا قەرەداغی، سەعید فەوزی، عەونـی (عەونـی حـاجی گـورون)، شـێخ محەمەد خالیصی تاڵەبانی، رەفیق حیلمی، عەلی باپیر ئاغا (عەلی کەمال)...

پێشکەوتن دەسەڵاتی داگیرکەر دەری کردوە. لەبەرئەوە هەندێ لەوانەی کە بـاس و بابەتیـان بـۆ نوسـیوە سڵیان کردۆتەوە و بە ناوی خواستراوەوە بڵاویان کردۆتەوە، بە تایبەتی ئەوانە کە تانە و تەشـەریان تێدایـە بـۆ لایەنگرانی شێخ مەحمود و ناحەزانی ئینگلیز. لەو سەردەمەدا زۆری خوێنـدەوارەکان، تەنـانەت سـەرۆکی هـۆز و خێڵەکان دابەش بون بە سەر دو ئوردوگای دژی یەکتریدا: یەکێکیان، لایەنگری ئینگلیز بـوە وەکـو گەورەتـرین هێزی دنیا و خاوەنی شارستانێتی نوێ. ئەویتریان، لایەنگری تورک بوە وەکو دەوڵەتێکی ئیسلامی کە بۆ گـاڵتە پێکردن بە جلخوار ناویان بردون. ئەم ناکۆکیە لە بیروبۆچون و هەڵوێستی خەڵکدا رەنگی داوەتەوە.

### 7. 1. پەخشان

یەکێ لەو بابەتانەی پێشکەوتن دایهێنا بـو، گفتوگـۆیەکی دو قـۆڵی کـورت بـو لە ژێـر نـاوی (قسـەی پروپوچ) و هەندێ جار بە (پ. پ) و هەندێ جار بە (قلی بلی) ئەیانوسی.

لەم بابەتەدا باسەکانی رۆژ بۆ مەبەستی سیاسی، بە زمانی گاڵتە و لاقرتێ و پەند ئەنوسـرا، توانجیـان لەم و لەو ئەگرت و هەوڵیان ئەدا هەندێ شت و هەندێ کەس لەبەرچاوی خەڵک سوک بکەن و، هەندێ جـار لە

سـنوری ئەدەب دەرئەچـون. بـابەتەکە لە ژێـر نـاوی خواسـتراوی (س. ف)، (ع. و ئەوی تـر)، (ح. ف.) دا بڵاوکراونەتەوە.

نوسینی پەخشان تازە دەستی پێ ئەکـرد، جگە لە دارشـتنی هەواڵ و ریپۆرتـاج، وتـاری جۆراوجـۆر لەسەر کشتوکاڵ و بازرگـانی و خوێنـدەواری، هەنـدێ نوسـینی تـری تـێدا بڵاوکـراوەتەوە ئەچێـتە خـانەی پەخشانی ئەدەبـیەوە. لەوانە: سـکاڵای کـوردێ. جەمـال عیرفـان لە ژ90 دا (لە دو سـیمای تەزاددا سـیاحەتی خەیالیە) و لە ژمارەکانی 94 و 96 دا (حەقایق) ی نوسیوە. لێرەدا بەشێ لە دو سـیما.. بە ئـیملا و ئینشـای ئەو زەمانە وەکو خۆی ئەنوسمەوە:

"وکو چون حەقیقەتی مەحض مجهوله عیبـارته لە حـس و خیـال. خیـالیش فکـریش بعضـا عبـارەتە لە حەقیقەت و بلکو هر عین حقیقته.

"من دەلیم چون سیاحتی جسمانی هیە، بە فکر و حسیش سیاحت دەبی و قابله. سیاحت حس و فکـر اه ای حسی ناسوتسوز و لاهوتی نوازی شرق. ای سـبب عطالـت و مـانع تکامـل مـادی. ای جنـاح شـیعر و اساطیر. مولد رومی و خیام و نالی."

عەبدوڵڵا گـۆران کە ئەوسـا صـەبری بە نازنـاوی خـۆی هەڵبـژاردوە، دوایـی بە گـۆران ناوبـانگی دەرکرد، پەخشانێکی رۆمانسی لە ژێر ناوی: (ئەسـەفی مـازی و ئەندێشـەی ئیسـتقبالم) دا بە دو ئەڵـقە لە ژمارەکانی 61 و 62 دا بە ئیمزای (شاگردی مەکتەبی هەلەبجە، لە هۆزی کاتب فارسی: عەبدوڵڵا صـەبری) بڵاوکردۆتەوە، رەنگە ئەمە یەکەم بەرهەمی بڵاوکراوەی بێ، هەر لەوساوە نیشـانەی بەهـرەوەری و لێهـاتوی پێوە دیار بوە.

### 7. 2. چیرۆک

نوسینی کوردی هێشتا لە سەرەتادا بو. هـونەری چیـرۆک نوسـین نە بوبـو بە بـاو. لە پێشـکەوتندا هەندێ نوسین بڵاوکراوەتەوە کە ئەگونجێ بە هەوڵی سـەرەتایی نوسـینی کـورتە چیـرۆک دابنـرێ. هەنـدێ نوسینی تریش بڵاوکراونەتەوە لە قاڵبی حیکایەتدا دارێـژراون. هەنـدێ لەمـانە بـۆ مەبەسـتی سیاسـی و بـۆ تانەدان لەم و لەو نوسراون. لەوانە:

لە ژ4 دا (تەمەع چاوبرسی)،

لە ژ5 دا (چۆنە بزانین)،

لە ژ13 دا (کاروان لەگەڵ گوێدرێژ) ی م. س. ع،

لە ژ30 دا (بۆ چروک) ی زەکی سائیب و، (رۆژەوەبونێک) ی جەمیل سائیب.

لە ژ34 دا (حەقایەتی پشت کێوی قاف) ی م. ع. ن و، (بەیاخی جلدرو) ی م. ئەنوەر.

لە ژ50 دا (موفلیس و بێکار) ی س.

لە ژ53 دا (حیکایەتی پیاوی زۆرزانی پارە کەم و نەزانی پارەزۆر) ی ئادەم زادە قابیل.

پێشکەوتن بایەخی زۆری بە وەرگێران داوە. چەند داستانێکی لە ئەدەبی جیهانیەوە کردۆتە کـوردی و، بە زنجیرە بڵاویکردۆتەوە لەوانە:

-لە ژ54 ەوە (لعبت ئەرمەن) بە چەند ئەڵقەیەک،

-لە ژ59 ەوە (نات پینکرتون، گەڕان لە خەودا)،

-لە ژ78 ەوە (کۆڵانێک لە فەنتەنە ئەرز) ی ئەلکساندەر دۆماس.

**7. 3. شیعر**

کورد بە گشتی ئالودە و شێفتەی شیعرن، بە تایبەتی ئەو کاتەی شیعر هێشتا تەنیا سەرچاوەی ئەدەب بو، رۆمان و چیرۆک و پەخشانی ئەدەبی هێشتا لە ئەدەبی کوردیدا دانەهات بون. لەگەڵ ئەوەیشدا پێشکەوتن ژمارەیەکی کەمی لاپەڕەکانی خۆی بۆ شیعر تەرخان کردوە.

لە پێشکەوتندا شیعری شاعیرانی چەرخی رابوردو، وەکو نالی و سالم و کوردی و مەحوی و مەولەوی و شێخ رەزا نابینرێ. هی شاعیرانی هاوچەرخیش ناو بە ناو لە چەند ژمارەیەکدا جارێک بڵاوکراوەتەوە، لە کاتێکدا ئەو سەردەمە نەوەیەک شاعیری مەزن و ناودار لە سلێمانیدا ژیاون.

م. نوری کە یەکێ لە شاعیرە بە تواناکانی ئەو سەردەمە و یەکێ لە نوێکەرەوەکانی شیعری کوردی بوە، سەرەتای دەست پێکردنی بڵاوکردنەوەی شیعرەکانی لە ژ10 ی پێشکەوتندا بە ستایشی دەرچونی رۆژنامەکە و چاپخانەکەی دەست پێ ئەکا، ئەڵێ:

"ئەم مژدە خۆشە، خەو بوە یا گوێم زڕایەوە
یا راستە پەردەی تەرەبە هەڵدرایەوە؟
یا ئەنجومی تەرەقی کوردە تلوعی کرد
یا نوری مەعریفەت لە وڵاتا پژایەوە
ناگەهـ نیدا لەغەیبەوە هات و وتی بڵێ:
(پێشکەوتن) ە لە مەملەکەتا دەنگی دایەوە"
تا ئەڵێ:
"واتێ مەگەن کە مەتبەعە بێ قەدر و قیمەتە
کارێزی عیلم و مەعریفەتی پێ ژیایەوە
بنوارە نوری مەعریفەت و لەمعەی کەمال
بەم مەتبەعەی حکومەتە چۆن شەوقی دایەوە."

لە چاو شاعیرەکانی تردا م. نوری لە هەمویان زیاتر بەرهەمی بڵاوکردۆتەوە. شیعری (جوت و گاشتێکی چاکە) کە لە پێشبڕکێی نوسینی کوردیی پەتیدا یەکەم بوە و 50 رۆپیەی بە خەڵات لەسەر وەرگرتوە، لە ژ30 دا بڵاوکراوەتەوە.

لە ژمارەکانی 33 و 78 و 79 و 81 و 82 و 99 و 114 دا چەند غەزەلی ئاشقانە و،
لە ژ41 دا (موسەدەس لەسەر نیوە شیعرێکی فارسی سوڵتان سەلیمی ئەوەل) و،
لە ژ51 دا (حیکایەت). ئەمانەی لەسەر شێوەی کۆن هۆنیوەتەوە.
لە ژ76 دا (ئیستیقبال بۆ تازە پێگەیشتوەکان) و،
لە ژ92 دا (تەفەکور: تەرجومە لە رەجایی زادە ئەکرەم بەگەوە) جۆرێک لە تازەکردنەوەیان تێدایە.

زێوەر، کە بە هۆی تێکچونی هەڵومەرجی سلێمانییەوە لەگەڵ خێزانەکەی شێخ مەحمود دا ئاوارەی دیوی ئێران بوبو، پاش چەند حەفتەیەک بەرگەی ئەو ژیانە ناگرێ و ئەگەڕێتەوە سلێمانی. بە مامۆستا دائەمەزرێتەوە. یەکەمین شیعری لە ژ20 دا و، دوای ئەوە لە ژمارەکانی 23 و 52 و 81 و 83 و 113 دا بڵاوکردۆتەوە. هەندێ لەم شیعرانەی بە ناوی: شاگردی مەکتەبی نمونەی سەعادەت محمد فائق (کە کوڕی گەورەی بوە) بڵاوکردۆتەوە.

عەلی کەمال باپیر لە ژ6 دا بە (یادی نالی) شیعرێک و، هەندێ غەزەلی ئاشقانە و هەندێ شیعری نیشتمانی، لە ژمارەکانی 26 و 76 و 101 و 110 و 116 دا و،
حەمدی لە ژ32 دا وتاری (باسی زوراعەکان و توجارەکان) و، چەند شیعرێکی تری لە ژمارەکانی 110 و 114 و،
بێخودیش چەند شیعرێکی لە ژمارەکانی 105 و 107 و 112 دا بڵاوکردۆتەوە.

لە ژ4 دا بۆ یەکەمین جار شیعرێکی ڕەفیق (بۆ تەزکیری خاتراتی شاعیری شیرین مەقالی کورد حەزرەتی نالی توحفەیە) لە پێشکەوتندا نوسراوە. لە ژ7 یشدا دیسان شیعرێکی تری (بە یادی نالی) نوسیوە. ڕەفیق ئەبێ ڕەفیق حیلمی بێ. لە ژ9 دا ڕەئوف شیعرێکی بڵاوکردۆتەوە و، لە ژ19 یش دا غەزەلێکی تر.

کاتب زادە عەبدولفەتاح وەهبی کە دیارە شیعری یەکەمی ڕەئوفی بەلاوە جوان بوە، لە ژ22 دا (نەزیرە) یەکی لەسەر داناوە. محەمەد ڕەشید (ڕوشدی) لە ژ38،
جەمال عیرفان لە ژ88،
سەعد فەوزی لە ژی 104،
عیصامەدین لە ژ؟ و،
عەونی لە ژ112 دا هەریەکەیان شیعرێک و،
کەرکوکی (ئەسیری) لە ژ 118 دا، دو شیعری بڵاوکردۆتەوە.

یەکێ لەو شیعرانەی کە مشتومڕی خوڵقاندوە. شیعرێکی (خالص) ە کە لە ژ50 دا بڵاویکردۆتەوە. لە سەرەتاکەی دا ئەڵێ:

"چۆن دەزانم خوا بەراستی حەقە یەک نیوەی دوە
ئەی سلێمانی دەزانم تۆیش پەیت پێ بردوە
دەنگی دەف، نوکەی دڕۆی صۆفی لە تەکیە و خانەقا،
ئیستەکەیش ماوە یا خو ئاشبەتاڵیان کردوە؟"

تا ئەڵێ:

"چاک لەفێڵیان تێگەیشتم، زو لە ناویان دەرپەڕیم،
بەندوباوم پێ نەدەکرا، دامە بەر شەق ئەو خوە"

خالص کە نازناوی شیعریی شێخ محەمەدی کوڕی شێخ ڕەزای تاڵەبانی بوە، بەم شیعرەی زۆر کەس، بە تایبەتی لایەنگرانی شێخانی تەکیە و خانەقای توڕە کردوە. ئەحمەد ناوێک بە شیعر و بە توڕەبونەوە لە ژ51 و 52 ی پێشکەوتندا وەڵامی ئەداتەوە، لە سەرەتاکەیدا ئەڵێ:

"ئافەرین ئەولادی دەروێش! فیکری چاکت کردوە
دەرپەڕینت لێ موبارەک، مەسلەکی نوێت گرتوە"

لە کۆتاییدا ئەڵێ:

"با بە کوردی پێت بڵێم یا شێخ لەباتی گشت کەسێ
ئەم قەوانی تازەیە بە خودا حەیاتی بردوە

تۆبەکە لەم حاڵە ئیتر، تەرکی ئەو ئەتوارە کە،
با لە کورتی ئینتیهای بێ، لادە لەم خوڵق و خوە!"

زۆری ئەو شیعرانەی لە پێشکەوتندا بڵاوکراونەتەوە، ئەگەرچی هەندێکیان هی شاعیرە گەورەکانی ئەو سەردەمەن، بەڵام نرخێکی ئەدەبی یا سیاسی‌یان نیە، هەنـدێ لەو شـاعیرانەیش، کە شـیعریان لە پێشـکەوتندا بڵاوکردۆتەوە، کەسانی گومناو و بێ شوێنەواری ئەدەبین.

## 8. بابەتی جۆراوجۆر

### 8. 1. کشتوکاڵ

چەندین وتاری لەسەر توتن و لۆکە و بەروبومی تر بڵاوکردۆتەوە. زمانێکی دەوڵەمەندی هەیە:

لە ژ3 دا دەربارەی (کوللە و لە ناوبردنی)،

لە ژ9 دا (زەراعەت و تیجارەت، م. م)،

لە ژ15 دا (فەنی زەراعەت، م.)، لە ژ16 دا (زراعەت)

لە ژ32 دا (لۆکە، عەولهادی)، لە ژ33 دا (توتن)،

لە ژ43 دا (توتن، تۆفیق فایەق)،

لە ژمارەکانی 44 و 45 دا (توتن و دوارۆژی، ع. ه)،

لە ژمارەکانی 46 و 47 و 48 و 49 و دا (چاندنی لۆکە)،

لە ژ53 دا (زەراعەتی لۆکە)،

لە ژمارەکانی 64 و 65 و 68 و 70 دا (توتن، جەمال عیرفان)،

لە ژ81 دا (توتن) لە ژمارەکانی 87 و 88 و 89 دا (توتن لە بەغا نرخی شکاوە، م. نوری) و

لە ژ90 دا دیسان (توتن، رەمزی).

### 8. 2. تیجارەت

لە بابەت بازرگانیەوە:

لە ژ16 دا باسێکی لە ژێر سەردێری (تیجارەت، م) و،

لە ژ47 دا باسێکی کەی بە ناونیشانی (تیجارەت گیانی وڵاتە) بڵاوکردۆتەوە.

### 8. 3. صەناعەت

لە ژ3 دا موراجەعەت بە حەمیەتی میلیە لە سلێمانی‌دا (مەکتەبی صەنایع بە قەڵەمی تۆفیق وەهبی)،

لە ژ5 دا (صنعەت، بازنی ئاڵتونە لە دەستا صنعەت.م)،

لە ژ8 (مەکتەبی صەنایع، محەمەد ناجی) و

لە ژ12 (عەقڵ و صنعەت بە بێ مامۆستا نابێ، م. س. ع).

### 8. 4. ژیانی کۆمەڵایەتی

لە ژ5 دا (ژن بە ژن دان و شیربایی یاخود کچ فرۆشتن، سەعید ئەدیب)،

لە ژمارەکانی 6 و 7 دا (ژن هێنان و تەشکیلی عائیلە، ع. م)، (زیافەت)،

لە ژ10 دا (جواب لە وتنی ع. م لە لایەن عیزەتەوە)، (لادێیی و بەقال، سەعید زەکی)،

لە ژمارەکانی 12 و 13 دا (بـۆچی دوا کەوتـوین، ع. و ئەوی تـر)، (کـورد و میوانپەرسـتیان، کـاپتن هۆلت)

لە ژمارەکانی 20 و 21 دا (عەقل و زانست، ع.)،

زێوەر لە ژ22 دا (بۆچی دەوڵەمەند نابین؟)،

لە ژ23 دا (لە شەرعا هاوکوفی بێ حیکمەت نیە) و

لە ژ45 دا ئەحـمەد حەمـدی (ئەحـوالی فەقە و تەڵەی نـاو مەزادخـانە) ی لەسـەر دەسـبڕینی هەنـدێ لە بازاڕییان بڵاوکردۆتەوە.

## 8. 5. گەندەڵیی بەڕێوەبەرایەتی

لە ژ2 دا (بەرتیل و دیاری)، بۆ خزمەت قائیمقام و مدیرانی کیرام رجای مەخصـوص، م. فەزڵـی)، (بـلە جاف، حاکمی سیاسی چەمچەماڵ کاپتن هۆلت) و

لە ژ12 دا (بەرتیل نەمێنێ چاکە) ی بڵاوکردۆتەوە.

## 8. 6. پەروەردە و خوێندن

لە ژ3 دا (خوێندن مدیری مەرکەزی چەمچەماڵ، عەلی کەمال)،

لە ژ8 دا (ژن و پیاو و خوێندن، ع. هادی)، (عیلم و سـەروەت کامیـان چـاکە؟ م. م)، س.ز) (خوێنـدن، ت. فایەق)،

لە ژ15 دا (ڕاستی -چەوتی م. م)،

لە ژ18 دا (مەکتەب و خوێندن، رەشید زەکی)،

لە ژمارەکانی 63 و 64 دا (مەدرەسە و مەکتەب، رەشید زەکی) و

لە ژمارەکانی 73 و 74 و 75 دا (موتالەعەی ئاساری ئەدەبیە، رەشید زەکی)، بڵاوکراونەتەوە.

## 8. 7. وەرزش و ڕابواردن

وەرزش نیشانەی ژیانی شارستانییە و، بەشێکی پێویستی ژیانە.

لە ژمارەکانی 58 و 60 دا باسی (ئەسپ تاودان) و،

لە ژ104 ی 20 ی ئیپریلی 1922 دا ڕیپۆرتاجێکی لەسەر سـەیرانی گەڕەکـی دەرگەزێـن لە سـلێمانی بەم جۆرە نوسیوە:

"ڕۆژی یەک شـەمە لە تەرەف گەڕەکـی دەرگەزێـنەوە سـەیرانێک ڕێـک خرابـو. ئوصـولی قەدیـم بـۆ ئینتیزامی سەیرانەکە تەتبیق کرا. پادشاه و چەند نازرێک و شـەهبندەرێک دانـرا بـو. لە مەعـیەت پادشـاهدا سوارە و پیادە چەند تاقمێک و، لەمعیەت شەهبندەریش دا چەند فەڕاش و فەڕاشباشیەک بە جلـی ڕەسـمـیـیەوە تەرتیب درابو. پادشاه، غەیری 50 نەفەر عەسـکەری پیـادە و 10 نەفەر سـوارە 4 نەفەریـش حەربەدار کە بە جلێکی سوری وەک خوێنەوە دایم لە ژور سەریەوە ئەوەستان لە مەعیەتیا هەبون. پادشاه سەعیدی دەوڵەت بو، صەدری ئەعزەم ڕەشیدی حاجی فەتـاح، نـازری حەربـیە حەمە نەجیبـی حـاجی مەحمـود و، نـازری خـاریجیە فەرەجی حەمەی سمایل و نازری مالیە ئەحـمەدی دایەنەکە بـو، شـەهبندەریش عەبـدولڕەحمانی خـامە بـو. بـۆ تەزیینی ئەم ئاڵایەش چەند بەیداخێک و تەپڵێکی ئیفلاتونی و دو بزن و حوشترێک و دو ئینسـانی کـڵاو و

دارایيش پێک هێنرا بو. ئاڵا لە گەرەکی دەرگەزێنەوە بەم تەرتیبە بە دەهۆڵ و زورناوە ڕویان کردە دەشت و، لە جادەی هەڵەبجەوە هاتنەوە ناوشار.

| | |
|---|---|
| سەرەی هەوەڵ | سوارەی مەعییەت |
| دوای ئەوان | پیادە |
| دوای ئەوان | حەربەداران |
| دوای ئەوان | پادشاه (بە سواری و جلی رەسمیەوە) |
| دوای ئەوان | فەڕاشانی ئێرانی |
| دوای ئەوان | شەهبندەر بە سواری و جلی رەسمیەوە |
| دوای ئەوان | بزن، حوشتر، ئینسان دارای باوکە و تفاق و سائیرە |

بە جادەدا هاتنە دەشتی سەرا. لەوێ دا هەر بەو تەرتیبە صەفیان بەست و فۆتۆغرافیان دەرهێنرا. پاش ئەوەیش بە هەمو بازاڕدا و لەوێوە ڕۆیشتن بۆ ئاشی بیەکانی قرگە.

"لەناو بازاڕ و کوڵان دا فەڕاشانی شەهبندەر گیروداریان بە گەلێ کەس خستبو و، حوکم و زەبرێکی باشیان ئەنواند. لە جێی سەیرانەکە حەوت چادری گەورە و دەوارێک هەڵدرا بو.

"ئەهالی، ئەشراف، لە مەئمورانیش بۆ ئەو ڕۆژە و بۆ ڕۆژی دوایی دەعوەت کران.

"وەزعیەت و رابواردنی دەشتیش بە خۆشی بەسەرچو. پادشا حوکمی ئەدا و نازرەکانی پەسەندیان ئەکرد و پۆلیس بە جێی ئەهێنا. 6 پۆلیسی ڕەسمی حکومەت درابوە مەعیەت پادشاوە، شەهبندەریش زەبروزەنگی خۆی بە هەمو کەس ئەنواند، شاربەدەرکردن و جەریمە و فەلاقە و لە کوت دان لای شاهبەندەر زیاتر بو. مەعە مافیهی لە هەمو کەسێکدا نەشئەیەک هەبو وە هیچ کەس بە غەرەز لەگەڵ کەس دا نە ئەجوڵایەوە.

"ڕۆژی سێشەمە لە ساعەت پێنج و حەوتەوە ئالا ڕێکەوت و هاتەوە بۆ شار."

### 8. 8. پرسیاری دینی

مێجەرسۆن بۆ هەندێ کاروباری شەرعی پرسیاری ئاراستەی مەلاکانی سلێمانی کردوە. پرسیارەکەی خۆی و وەڵامەکانی ئەوانی لە پێشکەوتندا بڵاوکردۆتەوە.

لە ژ25 دا پرسیارێ لە (قازی ئەفەندی) لەسەر قومار و

لە ژ26 دا وەڵامی قازی سلێمانی ئەحمەد موختار،

لە ژ31 دا پرسیارێ لە سەر تەڵاق و

لە ژ33 دا وەڵامی مەلاکان و، لە ژ38 دا پرسیارێ لەسەر خەزێنەی حەمام و دەرکردنی غوسلی لەش و

لە ژ40 دا وەڵامی مەلاکانی، بڵاوکردۆتەوە.

مێجەرسۆن پێویستی بەم فتوا شەرعیانە نەبوە، ڕەنگە ئەوەی کردبێ بۆ ئەوەی پێوەندی لەگەڵ مەلاکانی سلێمانی کە پێشەوای دینیی خەڵک بون، دابمەزرێنێ.

### 8. 9. پرسە

پێشکەوتن هەواڵی مردنی هەندێ لە کەسایەتییە ناسراوەکانی داوە، وەکو:

لە ژ17 دا هەواڵی مردنی حەمە ئاغای حاکمی شاری کۆیە و شیعرێکی فارسی سەعید فەوزی بەم بۆنەیەوە و،

لە ژ49 دا هەواڵی مردنی مستەفا پاشای باجەڵان و،

لە ژ52 دا هی مەلا مەحمودی مەزناویَ و،
لە ژ54 دا هی مەحمود پاشای جاف و،
لە ژ78 دا هی عەبدوڵڵا بەگی حسێن ئەفەندی بڵاوکردۆتەوە.

**8. 10. تەندروستی**

لە ژ6 دا لە سەر (پاک و تەمیزی)،
لە ژ27 دا لە سەر (تاعون)،
لە ژ38 دا لەسەر (خەزێنەی حەمام و راستەبازاڕ)،
لە ژ57 دا لە سەر (صیحەتی هەمو) و
لە ژمارەکانی 97 و 103 یشدا لەسەر (ئاوڵە و کوتان) ی نوسیوە.

## 9. لایەنی مێژویی

### 9. 1. وەرگێڕانی سەفەرنامەی ریچ

لە ژ19 ەوە، لە ژێر ناوی: (صەد ساڵ لەمەوپێش) دا بە زنجیرە دەستی کردوە بە بڵاوکردنەوەی سەفەرنامەکەی 1820 ی ریچ. سەرەتاکەی بەم جۆرە نوسیوە:

"صەد ساڵ لەمەوپێش، قۆنسولوسێکی ئینگلیس لە بەغداد ناوی میستەر ریچ بو، لەبەر ئەمە کە نەختێک ناخۆشی بو، سەفەرکردنی کوێستانی بە باش زانی. بە قسەی هەنیَ لە مەئمورەکانی بەغداد، لەبەرئەوەی هەتا ئەو رۆژە هیچکەس لە مەئموری ئینگلیس بە خزمەت پاشاکانی سلێمانی نەگەیشتبو، سەفەری سلێمانی بە چاک دی. لە پاشا سەفەرنامەیەکی نوسیوە کە لێرەدا دەینوسینەوە.

"رۆژی 5 ی مایس گەیشتە دەربەندی بازیان لەوێوە لەسەر نوسینی خۆی دەلێم، وا دەڵێت:

"ساعەتی 9 ی ئالافرانکە لە بەیانیدا گەیشتینە دەربەند لە بەردەمیا خانێکی پچوک هەیە و لەناو دەربەند کەلاوەیەک هەیە کە جێگا هۆدە و چاڵی ئاوی تیا دیارە... "

### 9. 2. وەرگێڕانی شەرەفنامە

لە ژ24 ەوە، سەبارەت بە مێژوی کورد (شەرەفنامە) ی کردۆتە کوردی.

سەرەتا کەی بەم جۆرە دەس پیَ کردوە:

"خوا چاکتری دەزانیَ بەڵام شەرەف خان کوڕی شەمسەدینی بدلیسی 332 ساڵ لەمەوپێش لە شەرەفنامە دا وای فەرموە:

"لە نەسەبی کوردان قسەی جیا جیا زۆرە. لەوانە هەنێک لەسەر ئەوەن کە لە وەختی زوحاکی ماران، کە پێنجەم سوڵتانی پێشدادییانە، لە پاش جەمشید لەسەر تەختی سەڵتەنەتی ئێران و توران و زیاتری دنا جێگای گرد... "

دوای ئەم ئەڵقەیە لە ژێرناوی: (رەوشی کوردان) دا، بە زنجیرە کەوتۆتە بڵاوکردنەوەی شەرەفنامە.

شەرەفنامە کە یەکێکە لە گرنگترین سەرچاوەکانی مێژوی کورد، بۆ یەکەم جار مەلا مەحمودی بایەزیدی کردویەتی بە کرمانجی. بەڵام تا ئەم ساڵانەی دوایی کەس هەواڵی نەئەزانی و بە چاپ نە کراوی مابوەوە. دوای ئەو، رۆژنامەی کوردستان (1898 - 1902) چەند بەشێکی لیَ کردوە بە کرمانجی و، ئەمەی پێشکەوتن سێیەمین هەوڵدانە بۆ وەرگێڕانی بە کوردی.

### 9. 3. نرخی بەڵگەیی

لەو مـاوەیەدا کە پێشـکەوتنی تـێدا بڵاوکـراوەتەوە، زۆر ڕوداوی گرنـگ لە کوردسـتان و ڕۆژهەڵاتـی ناوەڕاستدا ڕوی داوە. کۆنفرەنسی ئاشتیی پاریس بەسترا و ڕێککەوتننامەی سیڤەر بڵاوکـرایەوە. ئینگلیـز بڕیاری دا دەوڵەتێک بە ناوی عیراقەوە لە ولایەتەکـانی بەغـداد و موسـڵ و بەسـرا لە ژێـر مانـداتی خـۆیدا، دروست بکا. سەورەی عشرین ڕوی دا، لە ئەنجامی ئەوەیشدا حاکمی عامی عیراق گۆڕا، حکومەتێکی ئەهلی لە عیراقدا دروست کرا. کۆنفرەنسی قاهیرە بەستراو ئەمیر فەیسەڵی کوڕی شەریف حسێن بۆ مەلیکاتی عیـراق دیاری کرا. ئەمیر فەیسەڵ هێنرایە عیراق و کرا بە مەلیک. بەڵام خەڵکی سلێمانی بەیعەتیان پێ نەکرد. تورک کە ئەیویست ولایەتی موسڵ بخاتە ژێر دەسەڵاتی خـۆی، مەفرەزەیەکـی بە هانـدان و دەسکێشـیی هەنـدێ لە سەرانی کورد نارده ڕەواندز و، چـالاکی دژی کاربەدەسـتانی ئینگلیـز لە کوردسـتاندا پەرەیسـەند. چەنـدین ئەفسەری بریتانی کوژران. دەسەڵاتی سیاسیی ئینگلیز بڕیاری دا سلێمانی بداتە دەسـت ئەنجـومەنی شـار و خۆیان بکشێنەوە. هەندێ لەم ڕوداوانە لە ڕۆژنامەکەدا ڕەنگیان داوەتە. لەو بارەیەوە نرخێکی مێژویی گەورەی هەیە کە لێرەدا بە پۆلێنکراوی ئەیاننوسمەوە.

### 9. 3. 1. چارەنوسی کوردستان

ژ4 ی 20 ی مەی 920 لە ژێر سەردێڕی: (مەجلیسی ئاشتی) دا نوسیویێتی:

"لە مەجلیسـی ئاشـتی پـاریس دا دانـراوە کە حـوکمی سـوریە بە دەسـت فەرەنسـەوە بێـت. حـوکمی فەلەستین و عیراق بە دەست ئینگلیسەوە بێت. عیراق عیبارەتە لە ولایەتی بەصرە و بەغـداد و موصـل. شـارە گەورەکانیشی ئەمانەن: بەصرە، بەغداد، موصل، کەرکوک، سلیمانیە، ئەربیل، سامەڕە، دلێم، بەعقـوبە، خـانەقین، کەربەلا، نەجەف، حلە، کوت ئەل ئیمارە، عەمارە، دیوانیە، ناصریە، قورنە و ئەوانی تر."

لەم هەواڵەدا دروستکردنی دەوڵەتێ لە ولایەتەکانی: موسڵ و بەغداد و بەسرا، بە ناوی عیراقەوە لەژێـر حوکمی ئینگلیـزدا و، لکانـدنی کوردسـتانی جنـوبی بەم دەوڵەتەوە، واتە دیـاریکردنی چارەنوسـی سیاسـیی کوردستان بە بێ پێچ و پەنا نوسراوە.

ژ6 ی 3 ی جونی 920 لە ژێر سەردێڕی: (حدودی عوسمانی) دا کە ئەبـێ مەبەسـتی لە پەیماننـامەی سیڤەر بێ، بابەتێکی بە ناڕونی و تیکەڵ و پێکەڵی بەم جۆرە نوسیوە:

"لای ڕۆژئـاوای کە ئەوروپـایە دەریـاچەی تەرقـوس لەگەڵ اسـترانجە_ چتـالجە دەبـێ بە هـی عوسمانی.

"لای ڕۆژهەڵات، جارێ حدودی ناو عوسمانی و ئەرمەنی لە وڵاتی تەرابـزون، ئەرزرۆم، بتلـیس، وانەوە لە ژێر تەماشاکردنە لەگەڵ گەورەی ئەمەریقا، جەنابی ویلسن، عوسمانی، ئەرمەنـی، لەگەڵ ئیمزاادانەرەکـانی تـر بڕانەوە (نەتیجە) ی ئەم قسە لێ کردنەیان دەوێت و قبوڵیانە، لای خوارو (جنوب) لە دەم نەهـری جەیحـونەوە هەتا بوزانتی عوسمانیە، عەنتاب، ئورفە، جزیرەی ئیبن عومەر، وە لە وێوە بـۆ گاورتـاغی کە حـدودی ئێـرانە، ئەمانە هی عوسمانی نیە، لە عوسمانی بە دەرە، ئیزمیر لە ژێر حوکمی دەوڵەتی یۆنانی دەبێ. حـدودی ئیزمیـر تەخمینەن ئەکەوێتە ئاق حەصار و ئودەمش.

"شـروت بـۆ ئەسـتانبول: ئەسـتانبول هەرچەنـد بە دەسـت عوسـمانیەوە دەمێنێـتەوە، بەڵام دەوڵەتـی عوسمانی ئەگەر بێتو بێوەفایی لە بەجێ هێنانی شەرتی ئاشتی بکـات، ڕەنـگ هەیە ئیختیـاری ئەسـتانبولی بە دەستەوە نەمێنێت.

"لە بۆ بوغاز و ئاوەکانی بەحری سیاه و بەحری سفید، قۆمیسیۆنێکی تایبەتی دادەنرێت. ئیشی ئەم قۆمیسیۆنە ئەمەیە کە هاتوچۆ لەم ئاوانەدا بۆ حەمو کەس، چ لە وەختی شەڕدا چ لە ئاشتیدا، کراوە و بێ مومانەعەت بێ.

"مەحکەمەیە کە لەم ناوەدا هەیە، بۆئەوانە کە تورکن بە قانونی عوسمانی، بۆ یۆنانیەکان بەقانونی یۆنان. جگە لە ئەمانە هەچکەس لە مەحکەمەی قۆنسلۆس و شابەندەرخانەی خۆیان دا محاکەمە دەکرێن.

"کوردستانی ژورو، وەک وان، باش قلعە، خەرپوت و ئەوانیتر، 6 مانگ لەپاش تەماشاکردنی شەرتی ئاشتی قۆمیسیۆنێک لە لای دەوڵەتی فەرەنسە وئیتالیا و ئینگلیس لە ئەستانبول دادەنیشێت. ئەم قۆمیسیۆنە دەیانەوێت کە تەرتیبێکی وەها دامەزرێنن، بۆ ئەمە کە ئەهالی ئەوناوە و ئەو وڵاتانە کە لای دەوڵەتی عوسمانی دەمێننەوە، وە لە ئەویش دا ژمارەی کورد لە هی تر زیاترە، حکومەتێکی وەهایان ببێ کە لە ئیشوکاری ناوخۆیان، ئەهالی شتێک هاوبیر بێ لەگەڵ حکومەت دا. بۆ ئەمەیش کە ئەوانەی کورد نین یەکجاری (محفوز) بپارێزرێن، قۆمیسیۆنێکی تریش دادەنیشێت لە ئینگلیس و فەرەنسە و ئیتاڵیا و ئێرانی و کورد. ئەگەر لە ساڵێک دا، پاش دانانی ئەم نەوعە حکومەتە و لە پێش ئەوەی ساڵێک تەواو بوبێ، خەڵقی کورد لەو شوێنانە کە لە سەرەوە نوسراوە، لای مەجلیسی دوەل بنوێنن، باس بکەن و بە مەجلیس بسەلمێنن کە قسە و وتنیان بە تەواوی لەسەر بیر و خەیاڵی حەمویانە، کە ئەهالی هەمو حەز دەکەن لە عوسمانی جیا بنەوە. وە لەپاش لێکدانەوە و چونە بنج و بناوانی، مەجلیسی دوەل زانییان کە ئەم ئەهالیە ئەتوانن حکومەتی خۆیان بێ نوقسانیەت و بە تەواوی تەمەدون بە خێو و ئیدارە بکەن و جیابونەوە لە عوسمانی هەم بە شایستە بزانن، وە لەو وەختەدا دەوڵەتی عوسمانی دەست کێشانەوە لەو جێگایانە قبوڵ بکات، بەڵام کە ئیش گەیشتە ئێرە بە جیا مقاوەلەی ناو عوسمانی و دوەلی موشتەریکە لە پاش تێ وردبونەوە (تحقیقات) و درێژەدان (تفصیلات) بە یەکێتی (بە اتفاق) ی دەوڵەتی عوسمانی و دوەلی موشتەریکە لە (شروط متفرقە) ئیمزا دەکرێت، ئەگەر هەروەها ئەم (اقداماتە) خەریک بونە بەجێ هات و قبوڵکرا و کوردستانی عوسمانی لە عوسمانی جیابوەوە، ئەو کوردانە کە لە ولایەتی موصلە بەو شە رت و دانانە (ترتیبە) حەمو بەیەکەوە لای مەجلیسی دوەل بنوێنن کە حەمو بە تەواوی ئەمانە پێیان خۆشە و دەیانەوێت بکەونە ژێرحوکمی کوردستانی ژورو وەک وان، باش قەلعە، مەعمورەتولعەزیز، خەرپوت... بێ کە بێژراو، لە وەختێکدا کە حکومەتی ئەو کوردستانی ژوروە ببێ و دامەزرا بێ، دوەلی موشتەریکە نواننی (اظهاری) ئەوانەیش چاودێری (ملاحظة) دەکات."

ژ54 ی 5 مەی 921 لەژێر سەردێری: (کوردستان) دا نوسیۆیتی:

"بۆئەمە کەبیری ئەهالی سلێمانی و کوردستان چۆن تێگەیشتون و موقەدەراتی کوردستان چۆن بێ پێیان خۆشە و بە باشی دەزانن بۆ خۆیان بزانرێت و، وەختێ کە جەنابی حاکمی سیاسی تەشریفی چوە بەغداد بیگەیەنێت بە مەندوب ئەل سامی و، بۆ بەرزبونەوەی کوردستان هەوڵ بدرێت، ڕۆژی 26 ی ئەپریلی 1921 جەنابی حاجی حەسەنی نەورەس ئەفەندی و، عەزەمی بەگی بابان و، حاجی سەعید ئاغا و، حاجی مەلا سەعید ئەفەندی و، محەمەد ئاغای عەبدولرەحمان ئاغا و، عەبدولکەریم ئەفەندی عەلەکە، دەعوەت کرانە ماڵی حاکم. عەزمی بەگ لەبەر نەخۆشی و حاجی مەلا سەعید ئەفەندی لە شار نەبو، ئەو دوانە تەشریفیان حاضر نەبو، بەڵام ئەوانی تر تەشریفیان چو، لە پاش قسەو گفتوگۆیەکی تەواو وایان نوان: کە لەگەڵ حکومەتی عیراق دا موناسەبەتێک و یەکێتیەکیان ببێ، بەڵام چونکە کوردستان زۆر پێویستی یارییە و تەماشاکردنە، دەبێ شتێکی وا بکرێت کە حکومەتی عیراق زۆر یاریەی کوردستان بدا، بۆ ئەمە کە کوردستان باش ئاوا و زیندوبێتەوە، وە هەتا نەختێک فێری ئیدارەو خۆ بە خێوکردن دەبێ، هەمو چتێک و ئیشوکارێک لە ژێر تەماشاکردنی مەئموری موفەخەمەی ئینگلیسی دا بێ."

ژ55 ی 12 ی مەی 921 نوسیوێتی:

"وەک لە خـوارەوە نووسـراوە تەلێـک لە لایەنـی جەنـابی مەنـدوب ئەلسـامیەوە بە هەمـو لایەک دا بڵاوکرایەوە:

"حەزرەتی مەندوب ئەلسامی سیر پێرسی کـۆکس صـاحیب خەریکـی تێفکرینـی تەشـکیلاتی دوارۆژی ئیدارەی حکومەتی قەزاکانی کوردیە کە لە ناو سنوری عیراقن.

"لەلایەنی مەندوب ئەلسامی نوێنراوە، کە لە هەنێ شوێن ترس هەیە کە نەکو پێشکەوتن و ئیستیفادەی کورد بە واسیتەی یەکێتـی لەگەڵ حکـومەتی بەغـداد زەرەردار بێـت، لەبەر ئەمە هەنـێ ئەشـخاص تەرەفـداری ئیستیقلالی کوردن.

لەگەڵ ئەمەیش زانراوە کە گەورەکانی کورد حاڵی بون کە رەوابیتی تیجارەت و ئیقتصادی وڵاتەکەیـان لەگەڵ بەغداد و عیراق پێکەوە بەستراوە، لە زەحمەت و زەرەری جیاواز بون لە عیـراق بـێ خەبەر نـین. لەبەر ئەم ئەحواڵە حەزرەتی مەندوب ئەلسامی حەز دەکات کە هەتا مومکن بێت لەم خصوصەوە لە ویسـتنی ئەصـلی میللەتی کورد موتەلیع بێ.

"ئەگەر یەکێتی لەگەڵ حکومەتی عیراق بە باش ببینن، حەزرەتی مەندوب ئەلسامی حـازرە بـۆ جێبەجـێ کردنی ئەم ئیشە، سفارشی خوارو بە مەجلیسی وکەلای بەغداد بکات:

مادەی 1:

لە خصوص قەزاکانی کوردی لیـوای موصـل، کە لە ژێـر نەزارەتـی حکـومەتی ئینگلـیس دا هەن، لیـوایەکی بچـوک، عیبـارەت لە قەزای زاخـۆ و عەقـرە و، دهـۆک دابمەزرێنرێـت. ئەم لیـوا بچـوکە لە ژێردەستی موتەسەریفێکی ئینگلیس دەبێت. موئەقەتەن قائیمقامانیشی ئینگلس دەبن. هەتـا کـورد یـان عەرەبێ کە کوردی بزانێ و لایقی ئەم مەئموریەتە بدۆزرێتەوە. ئەم لیـوا بچـوکە کە هەمـو مەسـەلەیەکی عەدلیە و مالیەی عمومەن لەژێر دەستی حکومەتی عیراق دەبێت، بە پێ ی قاعیدە مەبعوسان لەم لیـوایەوە ئەنێررێت بۆ بەغداد. بەڵام بۆ ئیشی حکومەتیی تر قائیمقامەکان بە موتەسـەریفی خۆیـان مـراجەعەت بکەن، هەڵبژاردنی مەئموران لە پاش پرسیارێ لە گەورەکانی ئەو جێگایە لە لایەنـی حەزرەتـی مەنـدوب ئەلسامیەوە ئەکرێت.

مادەی 2:

جەنابی مەندوب ئەلسامی تەقەلا بدات کە لە قەزاکانی هەولێر و کۆیە و رەوانـدز صـاحیب مەنصـەبانی ئینگلیس لە دەوائیری حکومەت دا دابمەزرێنرێت. وە ئینتیزامێک بکـات بـۆ ئەمە کە لە پـێش تەعـین کردنـی مەئمـورانی ئەو جێگایـانە ویسـتنی ئەهـالی تەماشـا بکرێـت. لەمەودوا بە پێـی تەوافـوقی مەوقیـع تەفصـیلات دابنرێت.

مادەی 3:

لە لیوای سـلێمانی دا موتەصـەریفێک لەگەڵ مەجلیسـی لیـوا دەبێـت. موتەسـەریف لە لایەنـی مەنـدوب ئەلسامیەوە تەعین بکرێت و موستەشاری ئینگلیسـی لەگەڵ دەبێـت هەتـا وەختێـک کە موتەسـەریفێکی کـورد دادەنرێت حاکمی سیاسی ئینگلیس لە جێی ئەو ئیش دەبینێت. موتەسەریف لەگەڵ مەجلیسـی لیـوا مـوخەیەر بێت یەکسەر موکاتەبە لەگەڵ مەندوب ئەلسامی بکات. لە پاش مەشوەرەت مەندوب ئەلسامی لەگەڵ موتەسەریف و مەجلیسی لیـوا و مەجلیسـی وکەلای بەغـداد ئیختیـاراتی لازمەی تـریش بۆموتەسـەریف و مەجلیسـی لیـوا دابنرێت.

قائیمقامەکانی ئینگلیس بن هەتاکو کوردی لایق و موناسیب دەدۆزرێنەوە.

مادەی 4:

حەزرەتــی مەنــدوب ئەلســامی حەزرەتــات کە ئەم خەبەرە بڵاوبکــرێتەوە، وەک لەلایەنــی مەبعوســانی ئینگلیس و عوسمانی لە قۆنفراسی لونــدەرە دا، ئومێــد نــوانراوە تەعەلوقــاتی دۆســتانە لە بەینــی ئینگلــیس و حکومەتی عوسمانیی ئەنقەرە زو دابمەزرێتەوە. لەبەر ئەمە هەچ وەختێک ئەوضاعی مەملەکەت موساعەدە بکات لەشکری ئینگلیس لە زاخــۆ و دهــۆک و عەقــرە بگەڕێــتەوە و، وەهــا قەرار دراوە کە لەبــاتی ئەمە لەشــکرێکی عەسکەری کورد لەگەڵ صاحیب مەنصەبانی ئینگلیس موستەخدەم بکرێت. وەهــا ڕادەپەرمورێــت کە لە ئەهــالی ئەو ئەترافە میقداری کافی لەم لەشکری (لیوی) دا خزمەت بــکەن. بەم واســیتەی موفیــدە ئیزهــاری ڕەزامەنــدی خۆیان بکەن لەم تەجویزاتەی حەزرەتی مەندوب ئەلسامی کە بۆ خاتری نەفعی ئەوان دەکرێت.

وەهــا دەناســرێت کە ئەم عەســکەری لیــوایە هەر بــۆ پاراســتن و ئەمنــیەت و ئاسایشــی داخلــیە. مەسئولیەتی موداففەعەی هجوم لە دەرەوە عائید بە حکومەتی ئینگلیسە."

ژ56 لە ژێر سەردێڕی: (تاقیکردنەوەی بیر) دا کە مەبەستی ئەو ریفراندۆم (ئیســتیفتا) یە یە کە لەنــاو دانیشتوانی سلێمانی دا کراوە بۆ ئەوەی ڕەئی خەڵک وەربگرن کە: ئاخۆ لایان باشە بخــرێنە ســەر دەوڵەتــی عیراق یاخود لایان باش نیە؟. ڕیپۆتاجێکی بەم جۆرەی نوسیوە:

"ئەو تەلغرافە کە جەنابی مەندوب ئەلسامی لە بەغدادەوە نوسیبوی، جاری پێشو لە پێشــکەوتن دا چــاپ کرا، بەجیاوازیش ئیعلان کرا بو. بۆ ئەمە کە بیری خۆولاتیەکان چــۆنە و مــادەی 3 یەمــی ئەو ئیعلانەیــان لا باشە یان نا؟ ئیعلانێکی تریش کرا کە لە رۆژی14 ی مەی دا، دوصەد و ئەوەندە کەسە بانگ کــرانە دائیــرەی سیاسی. لە ساعەت 6 ی رۆژەوە هەتا ساعەت 11 بیری ئەهالی وەرگیــرا. بەو ڕەنــگە، کــاغەزی ڕەئــی کە هەر یەکی دو خانە بو لە خانەیەکدا لام باشە و لە خانەیەکی تردا لام باش نیە بەقەد (بانگ) کراوەکان چــاپ کــرا بو. هەچکەس دەچوە دائیرەی سیاسی کاغەزێکیان لەوانە ئەدایە خزمەتی. جا بە بیــری خــۆی لە بەرامــبەر لام باشە یان لام باشنیە چەپ و راستێکی دەرکرد و کاغەزەکە بە پێچراوەیی دەخــرایە نــاو قوتــویەکی داخــراوی پۆستەوە. لە پاش کردنەوەی قوتوەکە کاغەزەکان جیــا کــرایەوە و 158 کــاغەزی لام بــاش نــیە و 32 ی لام باشە چەپ و راست کرابو.

"بۆ ئەمەی بیری هەمو شاریەکان بزانرێت هەر ئەو رۆژە بۆ شەوێ بە پیێ ئیعلان لە مزگەوتــی گەورە و خانەقای مەولانا و خانەقای مەلا عەلی و خانەقای مەشوی و مزگەوتی سەید حەسەن و کە نیشتەی جولەکان، خەڵقی گەڕەک لە ساعەت یەکی شەوەوە هەتا دو کۆبونەوە.

"هەر گەڕەکێ موختاری خۆی لەگەڵ دو مەئمور و دو پۆلیسی بــۆ دانرابــو. پــاش کۆبــونەوەی ئەهــالی پرسیاریان لێ دەکرا ئایەکو مادەی سێیەمی ئەو ئیعلانەتان لا باشە یان نا؟ بە پــێی نوانــدنی بیــری ئەهــالی، پاش ژماردن بیری هەمو گەڕەکەکان دەرکەوت کە 1315 کەس باش نیە و 92 یش باشەیان وتوە.

"بیری قەزا و ناحیەکان هێشتا ماوە.

"لەو ئیعلانە کە کراوە نوسراوە جگە لەم بیر وەرگرتنە، هەر بیست کەس یا زیاتر دەتــوانن بە مەزبەتە بیری خۆیان بگەیەنن کە چییان لا باشە بۆ وڵات".

بەم جۆرە زۆرینەی دانیشتوانی سلێمانی پێیان باش نەبو بخــرێنە ســەر عیــراق، چــونکە ئەیانویســت سەربەخۆ بن. شێخ سەلام لەسەر ئەم (لام باشە و لام باش نیە) یە شیعرێکی بە ناوبانگی هەیە، بەنــاو جنێــو بە هەندێ لەوانە ئەدات کە دەنگیان بۆ لام باشە داوە، هەر لە بەر ئەوە نەخراوەتە دیوانە چاپکراوەکەیەوە.

ژ59 ی جونی 921 نوسیویێتی:

"هاتنەوەی جەنابی حاکمی سیاسی لە بەغداد: جەنابی حاکمی سیاسی سلێمانی کە بۆ تەحقیق کردنی مەسئەلەی دوارۆژی سلێمانی چو بوە بەغداد بۆ چاوپێکەوتنی حەزرەتی مەندوب ئەلسامی، رۆژی 5 ی ئەم مانگە تەشریفی هێنایەوە بۆ سلێمانی لەبەر نواندنی هەمو ئەهالی سلێمانی حەزرەتی مەندوب ئەلسامی وای دامەزراندوە کە هەتا 3 ساڵ ئیدارەی حکومەتی سلێمانی لە هی عیراق جیاواز بێت، لە پاش رابوردنی ئەو 3 ساڵە دیسانەوە فرسەتێکی تر بە ئەهالی ئەم لیوایە ئەدرێت کە بە تەحرێکی قەتعی بیری خۆیان بڵێن کە ئایا یەکێتی لەگەڵ حکومەتی میللی بەغداد بەباش دەزانن یان نەء. پاش جەژن هەتا دەست بڕوات، زو مەجلیسی ئیدارە بۆ لیوای سلێمانی دادەنرێت واشی دەبینن."

لە ژ66 ی رۆژی 28 ی جولای 1921 دا لەژێر سەردێڕی: "رۆژی چوارشەمە" دا نوسیویێتی:

"لە ژمارەی 60 ی پێشکەوتن دا نوسرابو: هەمو مانگێک هەوەڵ و سێیەم رۆژی چوارشەموان جەنابی حاکمی سیاسی وەختی عەسر لە ماڵەوە دادەنیشێت، هەچکەس بیەوێت تەشریف بباتە ماڵی جەنابی حاکم بۆ چاوپێکەوتنی. لەسەر ئەو قاعیدەیە رۆژی چوارشەمەی رابوردو 20 ی مانگ بە قەد 30 کەسێک لە ئەشرافی شار تەشریفیان چوە ماڵی حاکم.

لە ژ65 ی پێشکەوتن دا بە سەرلەوحەی (عیراق و ئەمیر فەیسەڵ) ئەو بەیانات و ئیعلاناتە کە کرا بون دیسان لەو کۆمەڵەدا باسی کرایەوە. لە لایەنی جەنابی حاکمەوە پرسیاریان لێ کرا:

"ئایا کو لیوای سلێمانی بۆ مەلەکییەتی ئەمیر فەیسەڵ رەئی ئەدەن یان نا؟

"ئەمیر فەیسەڵ بۆ مەلەکییەتی عیراق بە باشی ئەزانن یان نا؟

"لە لایەنی کۆمەڵەوە جواب درایەوە:

"چونکە لیوای سلێمانی جیاوازە لە حکومەتی عیراق، پێویست نیە رەئی بدەن بۆ دانانی مەلیک. لەبەردوری لە ئێمەوە کردەوە و چۆنیەتی (حەزرەتی ئەمیر فەیسەڵ) یش نەناسراوە. جا لەبەر ئەوە بۆمان نیە لەم روەوە بدوێین."

بەم جۆرە دانیشتوانی سلێمانی بەیعەتیان بە مەلیکێتی ئەمیر فەیسەڵ نەکرد.

### 9. 3. 2. چارەنوسی سلێمانی

لە ژ2 ی 6 ی مەی 920 دا نوسراوە: "17 ی ئەپریلی 920 رۆژی شەمە سەعات 10 مەجلیسی شار لە ژێر ریاسەتی جەنابی حاکمی سیاسی دا کۆبونەوە:

رەئیس، جەنابی حاکمی سیاسی

ئەعزا، رەئیسی بەلەدیە بیکباشی عەبدوڵڵا بەگ

بیکباشی تۆفیق وەهبی بەگ

تیجار میرزا فەرەج

حاجی ئیبراهیم ئاغا

خواجە یونتوب

ئەوانەی کە لە ژێرەوە نوسراوە، خوێنرایەوە و قسەی لەسەر کرا بە باش دانرا:

1.بە ئیجارە دانی بارانە کە لە لای بەلەدیەوە لە نوقتەکان دەسێنرێ...

2. پارەی دەلاڵی باری تیجارەتی بە ئیجارە دان...
3. گۆڕینی حوقەکان بە کیلۆ...
4. دانی پارەی ملْک...
5. بۆ چاک و باشی حەمو روخاندنی ئەو خانوانەی لەسەر ڕێگان و نزیک روخانن...
6. پاراستن و ئاودانی ئەو چنارانە کە تازە رواندویانە...
7. روناککردنەوەی شار بە چرا...
8. عەرزوحاڵی حەمامچیەکان...
9. دانانی موهەندیس بۆ بەلەدیە بۆ خاتری ئەمە کە خەریتەیەکی ڕێک و باشی شار بگرێ و بۆ ئەمەی حمو کەس شەقام بزانێ...

لە ژ4 ی 20 ی مەی 920 دا نوسراوە:

"مدیری سورداش ئیسماعیل حقی ئەفەندی کرا بە مدیری سەنگاو. مدیری سەرچنار عەبدولمەجید ئەفەندی کرا بە مدیری تانجەرۆ. مدیری تانجەرۆ عەبدولڕەحمان ئاغا کرا بە مدیری قەرەداغ. مدیری قەرەداغ عەونی ئەفەندی کرا بە مدیری سەرچنار.

"خۆ حەمو دەیزانین کە مەئمور هەر وەک لە ئیشێکدا نامێنێت لە شوێنێکیش دا نامێنێتەوە. ئەمڕۆ لێرە مانگی بە دو صەد ڕۆپیە مدیرە سبەینێ لە شوێنێکی تر بە سێ صەد روپیە دەبێ بە مدیر. ئیشێکی باش دەکات و لە پڕێکدا گەورە دەکرێت. یا لە شوێنێکی ناخۆشەوە دەچێتە شوێنێکی خۆش و لە شوێنێکی خۆشەوە دەچێتە شوێنێکی ناخۆش، هەر تەماشای ئیشەکەی کرد، مانگانەکەی کەم بێ یا زۆر، جێگاکەی خۆش بێ یا ناخۆش، هەر تەماشای ئیشەکەی دەکرێت و چاک بێت و خراپ هەر بە ڕۆژی خۆی دەگات. بۆ ئەم و ئەو نەهاتوە کە مەئمورێک لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر نێررا، بڵێن ئەمە لە پێش چاو کەوتوە یا عەزل بوە:

"بۆچ مێجەر گرینهاوس صاحیب کە لێرە ڕۆیشت عەزل بو؟ کە ئێستا حاکمی کرمانشاهە.

" کاپتن ماسترسن صاحیب کە ڕۆی و بو بە حاکمی خانەقین ئەمە بە عەزلی دادەنرێت؟.

"کەپتان هۆلت صاحیب هاتە شوێن کەپتان بۆند صاحیب بو بە حاکمی چەمچەماڵ، بەوە کەپتان بۆند صاحیب عەزل بو؟ یا خوا نەخواستە ئەمانە لە پێش چاوی حکومەت...

"ئەوەندە بزانن کە بەم قسە پڕوپوچانە ژان لە سک دەرناچێت. لە جیاتی ئەمە خەریکی شتێکی چاک بن. وە بە خۆڕایی وەخت لە دەست نەدرێت چاکە.

"ئەوانە کە خەریکی قسەکردن لە ئەم و ئەو دەبن، بێجگە لە ژان کردن هیچی تریان بۆ نامێنێتەوە.

"ئەگەر باش تەماشا بکرێت و لێک بدرێتەوە خۆمان ئەوەندە خراپەمان هەیە، خەریکی چاک کردن و گۆڕینی ئەو کردەوانە بین، نامان پرژێتە سەر هیچی تر."

لە ژ18 ی 26 ی ئۆگستی 920 دا لە ژێر ناوی (گۆڕین) دا نوسیویتی:

"مدیری پۆلیس حاجی ئاغا بو بە مودیری قەرەداغ. مدیری قەرەداغ محەمەد فوئاد بو بە مدیری تانجەرۆ. مدیری تانجەرۆ عەونی ئەفەندی بو بە مدیری پۆلیس. مدیری سورداش ئەحمەد بۆ مانگێک کە تەماشای هەنێ ئیشی خۆی بکات ئیزنی وەرگرتوە، کاتب تەحریری بەلەدیە کرا بە وەکیلی ئەحمەد بەگ. لە جێگای ئەحمەد عەبدولحەمید ئەفەندییش فەخری بەگی مەئمور مالی پێشوی ماوەت دانراوە."

لە ژ43 ی 17 ی فێبریوەری 921 دا لە ژێر ناوی (مدیرەکان) دا نوسیوێتی:

"حسین نازم ئەفەندی بو بە مدیری مەرگە. مدیری مەرگە جەمال بەگ بو بە مدیری سەرچنار. مـدیری سەرچنار عەونی ئەفەندی لە دائیرەی جەنابی حاکمی قەزا ئیش دەبینێ. مدیری سورداش ئەحمەد بەگ بـو بە مدیری قەرەداغ. مدیری قەرەداغ حاجی ئاغا بو بە مدیری تانجەرۆ. مدیری تانجەرۆ محەمەد فوئاد بەگ بو بە مدیری سەرچنار. مدیری سرۆچک ئیسماعیل حەقی ئەفەندی بو بە مدیری سورداش."

لە ژ44 ی 24 ی فێبریوەری 921 دا:

"هەواڵ: مدیری سورداش ئەحمەد بەگ کە کرابو بە مدیری قەرەداغ وازی هێنا نەچو. لە جێگـای ئـەو عەونی ئەفەندی بو بە مدیری قەرەداغ"

"هەواڵی مەئمور: جەنابی عەبدولرەحمان ئاغای ئەحمەد پاشا بو بە قایمقایمی شارباژێڕ. جەنـابی ڕەزا بەگ بو بە حاکمی قەزا. جەنابی عەلی ئەفەندی کاتبی موهەندسخانە لە مەولا لە جێگای جەنـابی عەزیـز خـان ئیش دەبینێت. خوا لە هەمویان پیرۆز بکات."

لە ژ35 ی 23 ی دێسەمبەری 920 دا نوسراوە:

"سلێمانی: خەڵقی ئەم لیوایە چە لەبەر گەورەیی لیواکە چە لەبەر ئاگا لە یەک نەبون ئەوەنـدە شـارەزای تەرتیبی حکومەتی نین. ئێستا بێ جێم نەزانی کە هەنێک لەمە بدوێم.

"ئیش بەدەستەکان ئەمانەن: حاکمی لیوا، لە پـاش حـاکمی لیـوا شـەش نەفەر حـاکمی قەزاکـان بەم ڕەنـگەیە: حـاکمی چەمچەمـاڵ، حـاکمی ڕانـیە، حـاکمی هەڵەبـجە، حـاکمی قەڵادزە و پـژدەر بـابەکر ئاغـا، حاکمی قەزای سلێمانی، حاکمی شارباژێڕ ڕەزا بەگ. یەکێکـیش ئەحـمەد بەگـی عوسـمان پاشـا قایمقـامی هەڵەبجەیە.

"20 مدیر ناحیە 97 لە مالیەدا 35 لە ڕێژی 27 لە گومرگ، 12 قازی 8 کورە مـالیە لە قەزاکـان 13 مەئمورماڵ 108 لە ئەجزای حکومەت 367 زەبتیە 439 عەسکەر لەگەڵ زابت 77 پۆلیس 8 موهەندیس 21 فەڕاش بەهی ئەم لاو ئەو لاوە ئەوانەی خەریکی ئیشـی حکـومەتن 1349 نەفەر کە 15 ئینگلـیس و 1034 کورد و 10 هندین. مانگـانەی ئەمـانە لە سـاڵێک دا نۆصـەدو نەوەدو حەوت هەزار و شـەش صـەدو پەنجـا (997650) روپیەیە.

لە ژ38 ی 13 ی جەنیوەری 921 دا بە ئیمزای (سۆن) نوسیوێتی:

"ڕەئیسی بەلەدیە:

"ساڵی پار بەلەدیە کەم هەوڵی نەدا بو ڕاستەی بازاڕ کە لە زستان دا بەشکو پاک بمێنێتەوە.

"لە وەختی ڕەئیسی غەفور ئاغا دا هەموی چەوڕێژ کرا و جۆگەلەیشـی بـۆ کـرا، ئەمسـاڵ دیسـان زۆر تێک چۆتەوە و قوڕی زۆرێش کۆ بۆتەوە، مەجلیسی بەلەدیە لە بیریانا هەیە سـەر لە نـوێ خەریکـی ڕاسـتەی بازاڕ ببنەوە، بەڵام دەبێت ببێژرێت کە تێک چون و خراپـی بـازاڕ لە هـاتوچۆی وڵاغ و وڵاغـدار بەبـارەوە و فڕێ دانی لاسکە سلق و توێکڵە هەنار و شـێلم و ئـاغزە جـگەرە... و شـتی تـرەوەیە. ئەمـانە کـۆ دەبێـتەوە بەربەستی ڕایی بونی ئاوی باران دەکات ئاویش کە وێستا لەگەڵ کوتانەوەی پەیدا دەبـێ بە قـوڕ و لیتەیەکـی زۆر بێگەن و پیس و چەپەڵ و ئەگەر وا نەکرێت ڕەنگە ڕاستەی بازاڕ چاک و ڕێک ببینرێت.

"دەبێت وڵاغی باری و گوێدرێژ و وڵاغی سـواری ڕێگـای هاتوچۆیـان نەدرێـت، لە کۆڵانەکـانی پشـت بازاڕەوە هاتوچۆ بکەن، هەتا پڕ کردن و ڕێکخستنەوەی تەواو دەبێ.

"ئەهالی خۆیان و هەمو دوکاندار بە تایبەتی دەبێ چاودێری بکەن و ورد ببنەوە ئەوەندە پەڕ و پیت و شت نەهاوێژنە گوزەرەوە.

"ڕاستە کە بەلەدیە بیر و توانای ئەم ئیشەی شتێک هەیە بە قەد خۆی بەڵام هەتـا ئەهـالی چـاودێری و موساعەدە نەکات شتی وا بە تەواوی چاک نابێت."

ژ76 ی 6 ی ئۆکتۆبەری 1921 نوسیوێتی:

"مەجلیسی ئیدارە:

"وەک لە لایەنی جەنابی مەندوب ئەلسامیەوە نووسراوەتەوە، ئیزن دراوە بۆ دانانی مەجلیسی ئیـدارە لە سلێمانی.

"بۆ ئەعزای ئەم مەجلیســە بە بیـری ئەهـالی چـوار لە ئەهـالی هەڵـدەبژێرێت چـواریش لە مەئمـورانی حکومەت و چوار لە ئەهالی قەزاکان دادەنرێت کە هەموی ئەکاتە 12 هەتـا چەن ڕۆژێکـی تـر بـۆ دانـانی ئەم مەجلیسە چی پێویست بێ دەکرێت و مەجلیس دادەنرێت."

ژ77 ی 13 ی ئۆکتۆبەری 1921 نوسیوێتی:

"مەجلیسی تایبەتی بۆ لیوای سلێمانی

"وەک لە نوسخەی پێشوی پێشکەوتن دا بەیان کراوە بۆ مەجلیسی لیـوای سـلێمانی لە لایەنـی ئەهـالی شاری سلێمانیەوە چوار ئەعزا هەڵدەبژێردرێت. ئەوا بۆ هەڵبژاردنی ئەو چوار ئەعزایە ڕۆژی یەکشەمو 16 ی ئۆکتۆبەر تەعین کراوە. هەر وەک بۆ ئینتیخابی ڕەئیسی بەلەدیە تەرتیب کراوە، ئەو کەسانە کە خانوەکانیـان قیمەتی لە لایەنی بەلەدیەوە بە هەزار ڕوپیە زۆرتر دانرابێت، بۆ دائیرەی سیاسی بانگ دەکـرێن یەکە یەکە کە هاتنە دائیرە لیستەیەکی ئەو کەسانە کە بۆ ئەعزایەتی مەجلیس بە باش زانراوە دەدرێتە دەسـتیان. ئیحتیمـالە کە ئەولیستە عیبارەت ئەبێ لە 30-_ 40 ناو. تەکلیفی بانگ کراوەکان ئەمەیە کە لەو ئیسـمانە چـوار کەس هەڵبژێرن بۆ ئەعزایەتی کە لە لایان بە باش بینرا. لە پاشـا لە تەنیشـت نـاوی ئەو چـوار کەسـانە، لە جـێی مەخصوصیدا کە لەو لیستەدا چاپ دەکرێت، ڕاست و چەپێک بنوسن و کاغەزەکەی بـخەنە نـاو صـندوق. هەر وەک جاری پێشو کرا.

"جگە لە چوار ڕاست و چەپ، نابێت هیچ ئیمزا یان شتی تر لە سەر کاغەزەکە بنوسرێت. ئەو وەقتە کە هەمو بانگ کراوەکان هاتن ڕاسـت و چەپـی ئەوانە کە ناویـان لە لیسـتەکەدا هەیە دەژمێردرێـت و ئەو چـوار کەسە کە ڕەئی زۆرتریان بۆ درابێت دەبن بە ئەعزای مەجلیس."

ژ87 ی 22 ی دێسەمبەری 921 نوسیوێتی:

"جەنابی حاکمی سیاسی سلێمانی مێجەر گۆلدسمیس ڕۆژی 17 ی دێسەمبەر لە بەصرە سـواری پـاپۆڕ بوە چۆتەوە بۆ ئینگلتەرە، لە ئاخری زستان دا یەتەوە بۆ سلێمانی."

ژ101 ی 30 ی مارچی 922 نوسیوێتی:

"هـاتن: حـاکمی سیاسـی جەنـابی مـێجەر گۆلدسـمیس صـاحیب کە مەئـزونەن تەشـریفی چوبـوەوە ئینگلتەرە، دوێنێ کە 29 ی مانگ بو تەشریفی هاتەوە بە خێر هاتنی دەکەین."

ژ118 ی 27 ی جولای 922 نوسیوێتی:

"ئینتیخابی ئەعزای تازە بۆ شار:

لە ئەعزای مەحتەرەمەی مەجلیسـی لیـوا کە لە تەرەفـی شـاری سـلێمانیەوە مـونتەخەب بـون، لەبەر ئەمە دوانیان ئیستعفایان کردوە عەن قەریب بۆ ئەم دو جێیە ئینتیخابی تازە دەکرێت.

"لەبەر ئیشـزۆریی خـۆی جەنـابی حـاجی ئیبـراهیم ئاغـا نەیتوانیـوە لە مەجلـیس دا دەوام بکـات لە بەغدادەوە ئیستیعفای کردوە و جەنابی عەبدولفەتاح چەلەبی ئەفەندی لەبەر ئەوەی کە توشی ناساغی بـوە بـۆ

قبوڵ کردنـی ئیسـتعفای مـوراجەعەتی بە حـاکمی سیاسـی کـردوە. مەعەلتەئەسـوف حـاکمی سیاسـی هەردو ئیستیعفای قبوڵ کرد.

"بۆ نامزەد بـون و بـۆ رەئـی دان لە لایەنـی مەجلیسـی لیـواوە، تەرتیبێکـی تـازە دانـراوە و مەواد و تەفصیلاتەکەی بە واسیتەی دائیرەی بەلەدیەوە بە هەموو گەڕەکی شاردا بـڵاو دەکـرێتەوە وە لیسـتەی ئەسـامی ئەوانە کە حەقی رەئیان هەیە قەید دەکرێت و هەچ کەسێک حەقی رەئی هەیە لازمە چاوی لێ بێت کە نـاوەکەی لە لیستی محەلەی خۆی داگیرا بێ."

## 9. 3. 3. نائارامی کوردستان

## 9. 3. 3. 1. ناوچەی سلێمانی

ژ9 ی 24 ی جونی 920 نوسیوێتی:

"رۆژی 14 ی جون شێخ قادر، شێخ غەریب و تۆفیق قادر لەگەڵ محەمەد فەتاح، رەوانەی بەصـرە کـران بۆ ناردنە هیندستان."

ژ65 ی 21 ی جولای 921 نوسیوێتی:

"ئیعلان

"لە بەر ئەمە لە ناو شاردا هەنێ قسەی درۆ بڵاو کراوەتەوە وا موناسیب بینرا کە ئیعلانی خوارو بـڵاو بکرێت:

"هێشتا حکومەت هیچ نیەتی نیە بهێڵێت شێخ مەحمود بێتەوە بۆ عیراق یا کوردستان.

"شێخ عەبدولقادر و شێخ غەریب و سەید ئەحمەد ئێستا لە بەغدادن و لەوێ یش دەمێنن."

ژ21 ی 16 ی سەپتەمبەری 920 نوسیوێتی:

"لە ئەولاد و نەتەوەی مەرحوم شێخ عوبەیدوڵڵای شەمزینان، جەنابی سەید تەها ئەفەنـدی، دوسـێ رۆژ لەمەوبەر بۆ چاوپێکەوتنی حاکمی سیاسیی دەربەندی رانیە تەشریفی لە دەربەند بوە، لەگەڵ حـاکمی شـەهری قەلعەدزە جەنابی بابەکر ئاغا تەشریفیان چوتە کۆیە بـۆ چـاوپێکەوتنی حـاکمی کـۆیە. جەنـابی سـەید تەهـا ئەفەندی تەشریف دەباتە ئەربیل و موصل بۆ چاوپێکەوتنی حاکمانی ئەوێ."

ژ22 ی 23 ی سەپتەمبەری 920 نوسیوێتی:

"هەورامان: چەن رۆژ لەمەوبەر بە تەحریکی هەنێ لە دوژمنەکانی خان بەهادور عادلە خـانم لە ئەلەبـجە، چەن نەفەرێک بە شەو جەسارەتێکی وایان کرد کە چەن تفەنگێکیان نا بە خـانوەکەیەوە. چـونکە دەسـتبەجێ دەرکەوت کە ئەمانە لە ئەهالی دزڵی بون. سبەینێ بەیانی دو تەیارە لە بەغدادەوە هێنرا چـونە سـەر هەورامـان ئاوایی باراماوە و بەڵخە بە بۆمبا بە تەواوی خراپ کران تا ئەم لاتولوتـانە نەختێـک تەئـدیب بـبن. لە پاشـا جەعفەر سوڵتان و شێخ عەلادینی بیارە لەگەڵ محەمەد بەگ و ئەوانـی تـر هـاتنە لای حـاکمی ئەلەبـجە داوای بەخشین و عەفو دەکەن لە لایەنی دزڵیەکانەوە."

ژ117ی 20 جولای 922 نوسیوێتی:

"لەندەن 5 ی تەموز، میسـتەر چەرچـل جـوابی ئەو پرسـیارەی دایەوە کە لە مەجلیسـی عەوام دا لێیـان کرد. وتی مەعلوماتێکی تری مست نەکەوتوە لە لایەنی کاپتن ماکانت و کاپتن بۆندەوە کە کەریمی فەتاح بەگی هەمەوەند لە 18 ی حوزەیران دا کوشتی، بەڵام لەم روەوە لەگەڵ مەندوب ئەل سامی عیـراق دا موخـابەرە هەر

هەیە. عەسکەری لیوای کە قوماندانیان زابتانی بریتانیە معـاوەنەتی قـوەی هەوایـی (تەیـارە) دەکەن بـۆ نـازڵ کردنی عیقاب بۆ سەر جورمدارەکان. ئەوی موتەعەلیقە بە مەسئولیەتی حکومەت لە لایەنـی پاراسـتنی ئەمینـی، حکومەت لە وەختی قبوڵی ویصایەتەوە بۆ عیراق، محافەزەی تەرتیباتی کردوە بە ئیعتیمادی موراقەبەی سیاسی بە واسیتەی حاکمە سیاسییەکان و روئەسای عەشایەر، چونکە کوردەکان ئیتاعەتی مەلیک فەیسەڵیان نەکردوە. بەڵام ئومێدم وایە وەختێ کە ئیمزای شەرائیتی سوڵح لەگەڵ تـورک کـرا، تەرتیبـاتێکی وابکرێـت کە کـورد و عەرەب یەک بن لەگەڵ مەلیک فەیسەڵ دا بە رەزای هەردوکیان."

## 9. 3. 3. 2. شۆڕشی ئیبراهیم خانی دەلۆ

لە ژ18 ی 26 ی ئۆگستی 920 دا نوسراوە:

"کەرکوک، 23 ی ئۆگستی 1920: عاصـی حسـێن عوبێـد کە لە جەبەل حەمـرینەوە هـاتبو، گەڕایەوە شوێنی خۆی لەوێ ئارامی گرت.

"هەمو مەشایخی تاڵەبانی مەجلیسێکیان گـرت و مەزبەتەیـان نـارد بـۆلای حکمـی سیاسـی کەرکـوک، راستی و یەکێتی خۆیان نیشان دا، وە حەز بەمە دەکەن ئەو 5 ئاواییەی نزیک لەیـلان کە ویسـتیان تاڵەبـانی بەدناو بکەن تەمێ بکرێن."

لە ژ19 ی 2 ی سەپتەمبەری 920 دا نوسراوە:

"هەواڵ، 26 ی ئۆگستی 1920: ئیشی بەعقوبە بە تەواوی بڕایەوە و کەس دیار نیە. عەسکەر هاتۆتە قەرەغان کە ئەم لای قزلڕەباتە. دوێنێ نیوەڕۆ عەسکەری کەرکوک چونە لەیلان 3 دێیـان بە تەواوی سـوتان و تێک دا. چەن دزو جەردەیان گرت.

"27 ی مینهو: لەشکری عەسکەر لە کرندەوە گەیشتنە قزلڕەبات، کە لەگەڵ ئەو عەسکەرەی لە بەغدادەوە هاتۆتە بەعقوبە، یەک بگرن.

"28 ی مینهو: عەسکەر دوێنێ لە تاوغ بزوتن. لە ناو ڕێگـادا چـونە ئـاوایی رەفـعەت بەگـی داودە. لە پاش ساعەتێک شەڕ رەفعەت بەگ خۆی و سوارەی رایـان کـرد. ئـاوایی و دەغڵـودان، درەخـت و باغیـان، بە تەواوی سوتان کە هیچیان نەماوە. لە پاشا چـونە تـوز. هەنـێ داودە لەوێ بـون رایـان کـرد. سـبەینێ رو لە کنگربان دەکەن عەسکەر.

"29 ی مینهو: ئەمڕۆ ئاوایی تریان لە توز سوتان. شـێخ حەمیـدی تاڵەبـانی لەگەڵ سـوارەکانی خـۆی هاتۆتە لای حاکمی کەرکوک. پیاویشی ناردۆتە ناو زەنگنەو داودە."

"تەل هاتوە

"31 ی ئۆگستی 1920: ئەمڕۆ حاکمی کەرکوک لەگەڵ عەسکەردا چـۆتە کفـریەوە. ئەو عەشـائیر و سوارەی کە خراپەیان لەو ناوە دەکرد، هەمویان رایان کرد.

"31 ی ئۆگست: رەفعەت بەگی داودە خۆی و 3 کەسی تر رایان کردۆتە عەجەم."

لە ژ20 ی 9 ی سەپتەمبەری 920 دا نوسراوە:

"هەواڵ، 2 ی سـەپتەمبەری 1920: بـۆ ئاگـاداری عەسـکەری هنـدی لە کفـری دانـراوە. سـوارەکانی تاڵەبانی خەریکی سوتانن و شوێن کەوتنن. قەرەتەپە ئارام بوە.

"حاکمی کەرکوک خەریکی ڕێکخستنی ئیشوکاری حکومەتە و، چونەوە توز کە شەرتی تەسلیم بـون بە ئەوانەی کە بێ جێییان کردوە، بدا، چونکە دەخالەتیان ویستوە."

لە ژ21 ی 16 ی سەپتەمبەری 920 دا نوسراوە:

"کفری: ناحیەکانی قەرەتەپە و زەنگنە دیسان دانراپەوە و مدیر لە مەرکەزی خۆی دانیشتوە.

"ئەوی لە ئاوایی دەلۆ بو، لەگەڵ هەنێ لە ئاواییەکانی تر نزیک کفری بە تەواوی سوتا و تاڵان کران لە لایەنی حکومەتەوە."

لە ژ23 ی 30 ی سەپتەمبەری 920 دا نوسراوە:

"کەرکوک، 25 ی سەپتەمبەری 1920: جەریمەی 35 هەزار روپیە و 130 تفەنگ لە سەر داودە دانرا.

"شاری توزیش لەبەرئەمە تێکەڵی ئیشی خراپە بوبو 17500 روپیە جەریمە کرا.

"فارس بەگی بەیات بەخشرا بە جەریمەی 3 هەزار روپیە و 20 تفەنگ.

بەیاتی تر ئێستا نابەخشرێت.

"ئیبراهیم خانی دەلۆیی رایکردوە. خۆی گەیانۆتە عەشیرەتی عەززە لەوێ ون بوە."

لە ژ24 ی 7 ی ئۆکتۆبەری 920 دا نوسراوە:

"کفری، 29 ی سەپتەمبەر: ئەو ئاواییانەی دەلۆ کە لە قەزای کفرییە سوتانران. ئەهالیشی لاکەوت. کوێخاکانی دەلۆ هەمویان گیراون. باریان کردۆتە ناو عەرەبی عەززە.

"کفری، 30 ی سەپتەمبەری 1920: رێگای ئاسن لە کنگربانەوە تا بەغداد لە ئەمڕۆوە ئیش دەکات."

لە ژ37 ی 6 ی جەنیوەری 921 دا نوسراوە:

"کەرکوک: تەلغرافێ لە کەرکوکەوە هاتوە کە ئیبراهیم خانی دەلۆ لە (تل شرف) نزیک توز وەفاتی کردوە. دیار نیە راستە یا نا."

### 9. 3. 3. 3. مەفرەزەی تورک لە رەواندز

ژ68 ی 11 ی ئۆگستی 921 نوسیوێتی:

"رەواندز: رۆژی 1 ی ئۆگستی 1921 کۆمەڵێکی بچوک لە چەتەی تورک گەیشتە رەواندز. دەربەندی باتازیان گرت. حکومەت بۆ دەرکردنیان و بۆ ئەمنی و ئاسایش چی پێویست بێ لە ئیقدامات دەیکات.

"رانیە: رۆژی 3 ی ئۆگست لەو وەختەدا کە سوارەی حکومەت تەمای گرتنی فەتاح بەگیان کردوە بەرامبەریی سوارەکانی کردوە. لەو روەوە فەتاح بەگ کوژراوە."

"تورکەکان لە رەواندز

"ئەو هەواڵەی کە لە لایەنی هاتنی کۆمەڵێک تورک بۆ رەواندز لە صەحیفەی سێیەم چاپ کراوە دەبێ بە تەعەجوبی هەنێ کەس لە بەر ئەمە کە لە حەقیقەتی ئەم مەسئەلەیە حاڵی نین.

"جارێ لەم روەوە ئیزتیراب بێ جێیە. ئەم کۆمەڵە لە 60 پیاو زیاتر نیە، هەرچەن بە دەمپاراوی دەڵێن کۆمەکمان بۆ دێت. ئەوانە کە هەواڵی شکاننی لەشکری میللیونی ئەناتۆلی دەخوێننەوە بۆیان دەردەکەوێت کە حکومەتی میللی ئەنقەرە ئیتر قوەتیان نەما، کە بتوانن کۆمەڵێکی کەمیش بۆ ئەم کۆمەڵی تورکە بنێرنە رەواندز. ئەمەیش بە تەواوی زانراوە کە نزیک رەواندز هیچ عەسکەری تری عوسمانی نیە.

"موحەققەقەن هەنێ پیاوخراپ لە لاتولوت وەک نز و جەردە و هی تر مولحەق بون بەوان، بەڵام لەبەر فیشاڵ و تەعەهودی بێ مەعنا کە لە لایەنی ئەوانەوە بڵاو دەکرێت بۆ ناو عەشایەری گەورەی کن رەواندز، کەس تەفرەی نەخواردوە و یاریدەیان نادەن. ئەم پیاوخراپانە هەرچەن بە دەنگێکی بەرز داوای حقوقی میللی و ئیستیقلال و پاراستنی دین دەکەن، بەڵام هەر مەقسەدیان تاڵان و ڕوتکردنەوەی ئەهلی مەملەکەتەو هیچی تر.

"حکومەت بۆ دەفعی ئەم تورکانە چی لازمە دەیکات. قەت ناهێڵێت شتێکی وەها بقەومێت کە ببێ بە زەحمەت بۆ پێشکەوتن و بەرزبونەوەی مەملەکەت وەک لەم دوساڵەدا لە گرانی و قەحتی گەورەوە گەیشتنە دەرەجەیەکی باشی دەولەمەندی و ئاسایش."

ژ69 ی 18 ی ئۆگستی 1921 نوسیوێتی:

"ڕانیە و ڕەواندز

"ڕۆژی 13 ی ئۆگست جەنابی حاکمی سیاسی لەگەڵ عەسکەری سواریی لیوای سلێمانی گەیشتە ڕانیە. لە ڕۆژی 14 ی مانگ دا کۆمەڵێکی عەشایەری کن ڕەواندز کە نزیک 250 سوار بون لەگەڵ چەتەیەکی پیادە کە جلی ڕەسمیی تورکیان لە بەردا بوە ڕویان کردۆتە ڕانیە. لە پاش شەڕە تفەنگ عەسکەری سواری سلێمانی ئەوانیان شکان و بڵاوەیان پێ دان.

"وا دەزانرێت کە لە عەشایەری ڕەواندز 4 کەس کوژران و 3 بریندار بوە. لە پشدەری کە لەگەڵ عەسکەری سواریی سلێمانی بون یەکێ برینداربوە. لە پاش ئەمە لە قەزای ڕانیە دا هیچی تر ڕوی نەداوە.

"حاکمی سلێمانی تەلغرافی هاتوە دەنوسێت کە عەشایەری ڕەواندز ڕۆیشتنە ماڵی خۆیان. لە قەزادا ئەمینی دامەزرا و قایم بۆتەوە."

### 9. 3. 3. 4. هەواڵی سەورەی عشرین

لە ژ9 ی 24 ی جونی 920 دا نوسراوە:

"ڕۆژی 21 ی جونی 1920 لە والیی بەغدادەوە

"لە بەغداد ئیعلان کراوە

"چونکە زانراوە کە هەنێ کەس خۆیان خەریک ئەکەن بۆ داخستنی هەنێ درۆی تایبەتی، کە ئینگلیس عەسکەری خۆی لە عیراق ئەکاتە دەرەوە و چۆڵی ئەکات. وە درۆی تریش بۆ ئەمەی کە ئەوانەی کەم بیر و نەزانن تەفرە بخۆن توشی زەحمەت و زۆر بین.

"لەبەر ئەوەی من (سێر ئارنۆلد تالبۆت ویلسن ک. سی. ی. ی- سی. س. ای- سی.م.ک- د.س.و- حاکمی عامی عیراق) ڕەسمەن خەبەر ئەدەم بە حەمو کەس، چونکە دەوڵەتی ئینگلیس بە حوکمی (مەجلیسی ئاشتی دوەل) مولتەزیمە بۆ ئاسایشی ناو عیراق کە حوکمی ئەو بە ئەم دەوڵەتە سپێرراوە و پاراستنی عیراق لە دوشمنی دەرەوە، بە هیچ کلۆجێ بیری نیە نەفەرێکی عەسکەری لە عیراق بکاتە دەرەوە. جگە لەمەیش دەبێ وەک پێشو لەشکرێکی تەواو لە حەمو ڕەنگێک کە بەشی ئیشی خۆی بکات رادەگرێت. وە بزانن لە حەمو وەختێکدا کە پێویست بێ چ بۆ ڕێکخستنی ئیشوکاری ناوەوە، چ بۆ بەرامبەری و نەهێشتنی هی دەرەوە، ئەو لەشکرەی ڕاگرتوە کە یاریەی مەلیکە بدات".

ژ11 ی 8 ی جولای 920 لە ژێر سەردێڕی: (ئەی مردوی درۆتان مرێ) دا نوسیوێتی:

"دەمێکە زۆر زۆر دەمێکە ئەم منجە منج و ورتە ورتانە دەبیەم، ئەڵێن حکومەت لێرە نامێنێ. هەروا بزانن دەرچو، بە جێی دەهێڵێت. کەلوپەلیان لە پێشەوە ڕۆی. عەسکەریان لە عیراق نەما. هەرایە. دەست کرایەوە بە شەڕ.

"حاکم ڕۆیی یا ئەڕوات. ئەمانی تریش دەڕۆن. هەروا بزانە پاشا بە لەشکریەوە گەیشت. بەم تەرحە ئێران و توران تێکەڵ ئەکرێ. لە چل و پێنج هەزار ئاش ئەکەن و شەش و فشێکی ناماڵنەوە."

لە ژ15 ی 5 ی ئۆگستی 920دا نوسراوە:

"عیراق: رۆژی 31 ی جولای عەسکەر شوێن عەرەبەکانی لای حللەوە کەوتن چەن سەعاتێک شەڕ بـو. عەرەبەکان رایان کرد. کە رۆژ بوەوە 149 لاشەی عەرەب نێژرا. دیل و برینداریکی زۆریش گیرا. کـوژراو و بریندار کە عەرەبەکان لەگەڵ خۆیان دا ڕفانویانە نەزانراوە چەن بوە.

"لە جەربوعیە دیسان پەلاماری عەرەبەکان دراوە. وا شکاون و راو نراون.

لەو شەوەدا پیا رانەگەیشتون کوژراوی عەرەبەکان بژمێرن."

لە ژ16 ی 12 ی ئۆگستی 920 دا نوسراوە:

"لای فورات: عەسکەر شوێن عەشایەری کن جەربـوعیە و حلـلە کەوتـون. ئەو دێهـاتی کـن رۆژهەڵاتـی حللەیە کە عەرەبی عاصی تیا بوە هەموی سوتانرا. ئەهالی خۆیـان دا بە دەسـتەوە. لە مەحمـودیە کە دەرکەوت کۆمەڵێ عەرەب لە نزیک هەن عەسکەریان شوێن خرا. لە پاش نیو سەعات عەرەبەکان رایـان کـرد. برینـدارو کوژراویان بە جێ هێشت."

"بەصرە: چوار ئالای تەواو لەگەڵ تۆپخانە و شتی تر لە لەشکری شەشەم گەیشتنە بـەصـرە. دوا بەدوا ئەوی تر ئەم لەشکرە یەت."

لە ژ17 ی 19 ی ئۆگستی 920 دا نوسراوە:

"بەغـداد، لە بەغـداد لەلایەنـی قومانـدانی عەسـکەری بەم تەحـرە ئـیعلان کـراوە، 12 ی ئۆگسـتی 1920 : لە مـانگی رەمەزانەوە هەتـا ئێسـتا هەنـێ کەسـی رقـداری بیرخـراپ کردویـانە بە عـادەت هەمـو رۆژێکی جومعە مەولود دەکەن و رێک دەخەن کە لە پێش چاو بزانرێت بۆ دینە. هەرچەن دیـارە کە بیـری ئەمەیە دڵی خەڵک زەهراوی بکەن کە کردنی قەباحەت بدەنـە پـاڵ حکومـەت و ئـەمینی و ئینتیـزام تێـک بدەن.

"بۆ ئەمە کە کەس نەتوانێ بەهانە بگرێت و بڵێت حکومەت صوحبەت و هاتوچۆی سیاسی ناو مەخلوق دەگرێت و ناهێڵێت. تائێسـتا حکـومەت چـاوی پۆشـی بـو لەم ئیشـانە. بەڵام ئێسـتا کە تەواو دەرکەوت ئەم نەرمـی و ئازادییەیـان بە حەرام دا و خەڵـق تەفـرە دەخـۆن بەزمـانی ئەم موفسـیدانە. لە مەودوا ئەم تەحـرە کۆمەڵانە نابێ و ناکرێت و، گردبونەوەی خەڵق بۆ باسی ئیشوکاری سیاسی هەر وەک بە قـانونی عوسـمانی ئەمە نابێ بێ ئیزنی حاکمی عەسکەری بغدادیش نابێ ببێ. تەعقیبات و موجازاتی ئەمە زۆر زۆر گران دەبـێ. مەحکەمەی عەسکەری یە بـۆ پرسـیاری ئـەم ئیشـە لـە بەغـداد دانـراوە. هەچـکەس تەحریکێکـی کردبـێ لەو مەحکەمەیەدا مەحکوم دەبێ.

"13 ی ئۆگست: وەک مەحکەمەی عەسکەرییە تەحقیقی حاڵی موفسید و موتەحەریک دەکات، ئەمـڕۆ 4 کەس مەحکوم بون. بە تفەنگ پێوەنان کوژران.

"لای فورات، 13 ی ئۆگست: لە کن حللە، موسەیەب، مەحاویل، ئەشـقیا بڵاوبـونەوە و نەمـاون. نزیـک مەحمودیە شوێنیان کەوتن 50 کەس لە عەرەب کوژرا.

"14 ی مینهو: عەسکەریان ناردە هنـدیە. ئەو عەشـائیرانەی کە ئیختیشاشـیان کردبـو، ئاویـان لێبـڕا، ناهێڵن ئاویان بۆ بچێت.

"14 ی مینهو: حکومەت ویستی یوسف سویدی، غەفار ئەبتمەن، عەلی بازرگان و ئەحمەد داود بگرێت. لەمانە ئەحمەد داود گیررا و نێررا بۆ هندستان.

"14 ی مینهو: لە لەشکری شەشەم عەسکەرێکی زۆر گەیشتە بەصرە و بەغداد.

"14 ی مینهو: چەن کەسێکی کە لە بەغداد مەحکوم بون و کوژراون."

لە ژ18 ی 26 ی ئۆگستی 920 دا نوسراوە:

"بەغداد، 16ی ئۆگستی 920: عەرەب لای مەحمودیە حەزیان بە دەخالەت کردوە. میرزا محەمەد تەقی کەربەلا لە لایەنی عەشائیری نەجەف، کوفە، دیوانیە، وە ئەوانی ترەوە ویستویەتی کە یەکێ لە بەغداد بچێتە کەربەلا بۆ دانانی شروتی دەخالەت. لەبەرئەوە (کەرەنێل هاول نازری مالیەی عیراق) چۆتە کەربەلا بۆ دانانی شروتی دەخالەت.

"17 ی ئۆگست: شەمەندوفێر لە سبەینێوە، وەک پێشو، هەمو رۆژ ئیش دەکات بۆ هەڵگرتنی رێبوار و باری تیجارەتی لەناو رێگای حلە و بەغداد.

"22 ی ئۆگست 1920: میرزا محەمەد تەقی موجتەهید کە زۆرپیر و داکەوتبو و دەمێکە نەخۆشە، رۆژی 17 ی مانگی ئۆگست وەفاتی کرد لە کەربەلا.

"22 ی مینهو: دوێنێ لە دەوری بەعقوبە لە تەیارەوە بۆمبای زۆریان بەسەر عەرەبەکانی ئەو ناوەدا رژانوە."

لە ژ21 ی 16ی سەپتەمبەری 920 دا نوسراوە:

"شەهرەبان، 10 ی سەپتەمبەری 1920: لەپاش پرسیارو لە بنجوبناوان گەیشتن دەرکەوت هەنێ لە خەڵقی شەهرەبان خیانەتیانکردوە لە وەختی شێواننی عەرەب. لەبەر ئەمە چەن کەسێک لە خەڵقی شەهرەبان کە هاوملی ئەم قەباحەتە بون ئیعدام کران و جەریمەیەکی گران خرایە سەر شەهرەبان."

لە ژ24 ی 7 ی ئۆکتۆبەری 920 دا نوسراوە:

"سێرپێرسیی کۆکس: جەنەراڵ سێر پێرسی کۆکس رۆژی 15ی ئەم مانگە گەیشتە بەغداد. دەستی کرد بە حکومەتی عامی عیراق.

"نوتقی سێرپێرسی کۆکس: لە گەورە گەورەی بەغداد کۆمەڵێک هاتن نۆ چاوپێکەوتنی حاکمی عام. لە پاش ئەمە کە بە خێر هاتنیان کرد. سێرپێرسی کاکس وتی: دەوڵەتی ئینگلیس منی ناردوە بۆ حکومەتی عیراق کە لەگەڵ ئەهالی عیراق مەشوەرەت بکەم، بۆ ئەمە کە حکومەتی عەرەب بۆ عەرەبەکان لە ژێر حوکمی حکومەتی ئینگلیس رێک بخەم. من بۆ ئەم ئیشە هاتوم. بەڵام هەتا دوزمان و موفسیدان بە تەواوی نەکوترێن دیارە هیچ شێک ناکرێت. لەبەر ئەوە دوایی خۆتان بە دەست خۆتانەوەیە."

لە ژ28 ی 4 ی نۆڤەمبەری 920 دا نوسراوە:

"بە دەستەوەدانی کەربەلا: چەن کەسێک لە کەربەلا دانرابون رۆژی 23 گەیشتنە خزمەت حاکم.

"بەخشینی خەڵقی کەربلا بەم رەنگەیە:

1. لە 24 سەعاتدا 17 پیاو کە لە کەربەلا هەن بدرێن بە حکومەت.

2. لە 3 رۆژدا 4 هەزار تفەنگ و 400 هەزار فیشەک، ئەگەر کەمتریان دا لە جیاتی تفەنگێک 20 لیرە و فیشەکێک روپیە یەک بدەن.

3. هەرچی ماڵی حکومەتی چەپاو کراوە زو بیدەنەوە و غەرامەتیش جگە لەمانە بدەن.

4. سەرنەوانن بە هەرچی حکومەت دەیکات.

5. پەنا بە خاوەن قصوری تر نەدرێت.

6. ئەگەر لەو وەختانەدا کە لە 1 و 2 دا دانراوە بە جێ نەهێنرا، عەسکەر دەچێتە سەر کەربەلا. وەکیلی کەربەلاییەکان ئیتاعەتیانکرد بە مانە."

"نەجەف: رۆژی 20 ی ئۆکتۆبەر کاغەزێک بە ئیمزای هەمو مەلا و گەورەی نەجەف گەیشت. وێستاون بە هەر رەنگێک حکومەت دایبنێت، ئیتاعەت بکەن و بیدەن هەر جەزایەک بێ قبوڵیانە."

له ژ29 ی 11 ی نۆڤەمبەری 920 دا نوسراوە:

"بەغداد: لەسەر خواهشی حاکمی عام نەقیبی بەغداد قبوڵی کردوە کە کۆمەڵێ و دائیرەیەکی لە (پۆلەتێک و بیری) دەوڵەتی ئینگلیس دا دانرێت. بە یارییەی ئەوانەی کە حاکمی عام خۆی هەڵیان دەبژێرێت. لەسەر پێویستی عەسکەرییە ئیشوکاری عیراق بە جێ دەهێنێت. تا وەختێ کە (کۆمەڵ) لە لایەنی خەڵقەوە دادەنرێت.

"ئەوانەی کە ئێستا بۆ (قابینە) دانراون ئەمانەن:

| | |
|---|---|
| نازری داخلیە | سەید تالب پاشای نەقیب |
| نازری مالیە و محاسبە | ساسۆن ئەفەندی حسقیل |
| نازری محافەزە | جەعفەر پاشا ئەل عەسکەری |
| نازری عەدلیە | حەسەن ئەفەندی پاچەچی |
| نازری ئەوقاف | مستەفا ئەفەندی ئالوسی |
| نازری مەعاریف و صحیە | عیزەت پاشا |
| نازری تیجارەت | عەبدوللەتیف پاشا مەندیل |

"ئەوانەی کە لە وێدا بێ ئیشێکی تایبەتی دادەنیشن ئەمانەن: حەمدی پاشا بابان، عەبدولمەجید ئەفەندی شاوی، ئەحمەد پاشا زوهێر، عجیل پاشا عەلی. محەمەد سەیهود ئەمیر بغیلە، سەید هادی قەزوینی، عەبدولرەحمان پاشا حەیدەری، عەبدولغەنی ئەفەندی کوبە، داود ئەفەندی جستاقانی، عەبدولجەبار پاشای خەیات، فەخری ئەفەندی جەمیل زادە.

"ئەم دەسگا و بەرە و حکومەتە، دەخلی بەسەر کوردستانەوە نیە."

له ژ 47 ی 17 ی مارچی 1921دا نوسراوە:

"حلە: لە رۆژی 12 ی مانگی فێبریوەریدا جەنابی قوماندانی لەشکری ژمارە 17 ی حلە جەنابی شێخ ادعی الجریان، شێخی عەشیرەتی ئەبو سوڵتانی بانگ کردە لای خۆی بۆ سەر زیافەت. ئەم زیافەتە بە تایبەتی بۆ نواننی تەشەکورو مەمنونیەتی حکومەت لە یاریە و فیدایی جەنابی شێخ ادعی الجریان وەقتی ئیغتیشاشی هاوینی پاردا بوە. مەجلیس لە بەرامبەر قەلعەی حلە کۆبوەوە و هەنێ لە ئەشرافی شاری حلە وەک سەید محەمەد عەلی قەزوێنی و شێخ عمران الزمبور (لە عەشیرەتی بەنی عجیل) حازر بون. جەنابی قوماندان لە تەقریری بە خێرهاتن دا تەشەکوری حکومەتی نوان لە ئیشوکارە ناسراوەکان بۆ جەنابی شێخ ادعی وتی زۆر پێم خۆشە کە لەم مەجلیسەدا جەنابی شێخ عمران الزمبور و زۆر ئەشرافی تریش کە لە وەقتی هەراو هوریادا لەگەڵ حکومەت یەکێتی‌یان ئەکرد حازرن. خزمەت و خۆشەویستی ئەوانیش لە لایەنی حکومەتەوە بە تەواوی ناسراوە و لە بیر ناچێت. جەنابی شێخ ادعی لە جوابێکی کورت دا منەتبایی کرد بۆئەم حەقناسین و ئیکرامی حکومەتی‌یە لە پاش زیافەتەکەدا رەسمی ئەو هەموانە کە لەوێ کۆبونەوە گیرا."

پێشکەوتن هەر لەو ژمارەیەدا هەواڵی کۆنفرەنسی قاهیرەو، بەشداری کاربەدەستە بریتانیەکانی عیراق و وەفدی عیراقی بەم جۆرە بڵاو کردۆتەوە:

"جەنابی والی بەغداد سێرپێرسی کوکسی صاحیب:

"رۆژی بیست و دوەمی مانگی پێشو جەنابی والی بەغداد، سێرپێرسی کوکس صاحیب، لەگەڵ قوماندانی هەمو عیراق، سێرئیلمەر مالدین، لە بەغداد بزوتن رۆیشتنە قاهیرە بۆ باس و قسەکردن لەگەڵ ئەعزا و وەزیرە تایبەتەکان کە بۆ چاودێری ئیشوکاری میصر و بەیتەلمەقدیس و عیراق و کوردستان لە لوندرەوە دانراون. ئومێد وەها دەکرێت کە جەنابی میستەر چەرچڵیش (رەئیسی ئەم وەزیرانە) بۆ چاوپێ کەوتن و قسەکردن لەگەڵ ئەم هەیئەتە بێتە قاهیرە.

جەنابی ساسۆن ئەفەندی وەزیری مالیە و، جەنەرال جەعفەر پاشا وەزیری حەربیەی حکومەتی بەغـداد، لەگەڵ جەنابی والی پێکەوە چون."

لەم کۆنفرەنسە دا بڕیار درا دەوڵەتێ بە ناوی عیراقەوە دروست بکەن و عەرشی عیـراق بە فـەیصـەڵی کوڕی شەریف حسێن ببەخشن و، جەیشێک بۆ پاراستنی ئەم حکومەتە لە خەڵکی وڵاتەکە دروست بکەن.

ژ58 ی 2 ی جونی 1921 نوسیوێتی:

"تەلغرافـێ کە لە بەغـدادەوە هـاتوە: ئەمە نوسـخەی عەفـوی عمـومی‌یە بەوپـێ یە کە لە لایەنـی حەزرەتی پادشاهی بریتانیـاوە ئەمـر صـادر بـوە جەنـابی منـدوب السـامی ئیعلانـی دەکـات ئەمە عەفـوی عمومی‌یە بۆ مـوجریمینی سیاسـی دەسـتی پـێ دەکرێـت لە 30 ی مایسـەوە بەو پـێ یە کە لەلای خـوارو نوێنراوە:

"هەوەڵیـان عەفـوی ئەوانە کە لە هەرای 1920دا بـون، جـورمێکی وایـان لەسـەر بـێ کە پـێچەوانەی حکومەت بوبێ.

بە پێی موساعەدە بەرەڵاکردنی حەپس و ئەوانە کە گیراون و، ئیزن بۆ ئەوانە کە لە فیرار دان بێـنەوە و، هیچ ترسیان لەسەر نیە کە محاکەمە دەبن، جگە لەمانە:

1. ئەو نەفەرانە کە بە ئـوجرەت لە دائیـرەی حکـومەت دا ئیشـیان دەکـرد و لە هەراکەیشـدا هەبـون، ئەوانەیش هەچ کەس بەپێی خزمەت و ئیستیحقاقی تەماشای دەکرێت.

2. ئەو نەفەرانە بە پێی تەعەدا و کردەوەیان پرسیان لەسەرە لەو جورمانەی کە کردویانە و، ئێسـتا لە عەدالەت ڕایان کردوە.

أ. شێخ ضاری و کوڕانی خمیس و سلیمان سرب و سلومی کوران مجبای، دهام کوری فرحـان، ئەمـانە هەمو لە عەشیرەتی زەوبەعن. هەمو موتەهەمن بە کوشتنی کولونیل لیچمن یا تەحریک بۆ کوشتنی.

ب. جمیل بەگ و حمید ئەفەندی دیبوتی، موتەهەمن بە تەحریک و یەکسەر کوشتنی یوزباشـی بـالو و مولازم ستیوارت و ئیش بە دەستانی تری حکومەت لە تەلعفەردا.

ج. جاسم المصیلی لە عەشیرەتی مەهدوجە، موتەهەمە بە کوشتنی یوزباشی بریکل.

د. محمد مەلا محمود لە الباهاشا موتەهەمە بەکوشتنی مولازم براور فیلد. حسن العبد و جاسـم العـود لە عەشیرەتی بەنی تەمیم کە موتەهەمن بە کوشتنی میستر بوکانن.

هـ. ناصر کوری اریضیر و علو الجاسم و کوڕی درهدی و، ئەو سیانە کە موتەهەمن بە کوشتنی هەنـێ ئەسیری بریتانی.

و. بسبوس کوڕی محاوی و نعمە کوڕی دمدنیە، هەردوکیان لە عەشـیرەتی جەوابیـرن و مـوتەهەمن بە کوشتنی هەنێ زابتی تەیارە.

ز. فالح کوڕی حاجی سفر العجویب لە عەشیرەتی جەوابیـر و مـوتەهەمە بە کوشـتنی مـولازم هـدکر و پێنج لە عەسکەری بریتانیا لەسەر پاپۆڕی کووین فلای.

"بەندی دوەم:

"ئەمە لە حەقی ئەوانەیە کە لە هەرای سـاڵی 1920 دا دەخلیـان نـیە، بەڵام قەباحەتیـان هەیە و ڕایـان کردوە لەبەر هەنێ شتی وا موتەعەلیقە بە جورمی سیاسی کە لە پێش ئەو هەرایە دا کراوە؛

"جەنابی مەندوب ئەلسامی خەریکە بۆ ئەمە کە شتێک بۆ ئەوانیش بکرێت، وە لەم عەفوە بەشیان ببـێ، بەڵام تەماشای ئیشی هەر کەسێک بەجیا دەکرێت.

هەچ کەس بەپێی کردەوەی خۆی.

"ئەوەی دەیەوێت رەسمەن داوای عەفو بکات، موراجەعەت بە نزیکترین مەئموری ئینگلیس یـا جەنـابی مەندوب ئەلسامی بکات.

"لازمە بزانرێت ئەم ئیعلانە بـۆ ئەوانە نـیە کە لە پـاش تەواو بـون و ئیقـدامات لە عەسـکەر لە سـاڵی 1920 دا خراپەیان کردوە و هێشتا لە فیراردان.

پ. ز سیر پێرسی کۆکس مەندوب ئەلسامی"

لە هەمان ژمارەدا هەر لە ژێر ئەم راگەیاندنەدا (بۆ زانین) یَکیان بە ناوی پێشکەوتنەوە بڵاو کردۆتەوە، نوسوێتی:

"لە لایەنی ئەو ئیعلان و تەلغـرافەی حەزرەتـی مەنـدوب ئەلسـامیەوە کە لەم نوسـخەیەدا چـاپ کـراوە، جەنابی حاکمی سیاسی سلێمانی کە ئێستا لە بەغدادە، بۆ خسوس شێخ مەحمود لەگەڵ مەندوب ئەلسامی قسـە و باسی کردوە، حەزرەتی مەندوب ئەلسامی بەردانی شێخ مەحمود قبوڵ ناکات."

## 9. 3. 5. هێنانی ئەمیر فیسەڵ

ژ15 ی 5 ئۆگستی 1920 نوسیوێتی:

"گرتنی شام بەم تەرحە بو:

"24 ی جولای پێش نیوەڕۆی هەڵسان رویان کردە شاری شـام. وەختـی رۆژئـاوا لە نزیـک شـامەوە توشی لەشکری شەریف دەبن. لەوێ ئەم لەشکری شەریفە بێ تەقریب دەشکێن 8 سەعات شەڕیان بوە. ئەمیـر فەیصـەڵ و عەشـایەرێ کە لەگەڵ لەشـکرەکە بـون هەمـوی رایـان کـردوە. 9 تـۆپی گەورە و 25 مەترالـۆز و جبەخانەی زۆریان بە جێ هێشتوە. کوشتن و لەشەڕ پاشکەوتن بۆ لەشکری ئەمیر فەیصـەڵ بـوە. عەسـکەری فەرەنسا رۆژی 25 ی جولای چۆتە شامەوە."

ژ17 ی 19 ی ئۆگستی 1920 لەژێر سەرناوی (ئیشی سوریە بە دەست چەوت و چەپەڵەکانەوە تێک چو) نوسیوێتی:

"رۆیتەر لە لەندەنەوە وەک لە خوارەوە دەنوسێ:

" ئەو راپۆرتانە کە لە سوریەوە گەیشتوە، لە پێش شکاننی لەشکری ئەمیر فەیصەڵ وا دیاری دەدات کە ئەمە بە بوختان کردنی چەن کەسێکی لاساری، خۆویستی، میللەت تێکدەری، چەوت و چەپەڵی فیتنەباز بوە.

"لە پێش داواکەدا چەن ئیش و شتێک، لەنـاو حکـومەتی لوبنـان و بەیـروت و تەرابلـوس لە لایەک و، حکومەتی ئەمیر فەیصەڵ لەلایەکی ترەوە، هەبو.

"لەم ئیشانە دوانیان موهیمترە لە هەمو: هەوەڵیـان جەردە و چەپـاو خـاکی حکـومەتی فەرەنسـا. دوەم نەهێشتنی بانقە نۆتی فەرەنسا لە خاکی شام.

"ئیشەکەی هەوەڵیان چەند مانگێکە دڵگرانی پێک هێناوە لەبەر دوژمنایەتی ناو (دروز__ مارونی) چەپاو و کوشتنێکی زۆر بو، زۆر جار تاقمە جەردە لە دەرەی (بکعە) تێپەڕی حدودیان کـرد بـوە خـاکی حکـومەتی فەرەنسا. خراپەی زۆریان کردبو بە بیری ئەمە کە قەباحەتی خۆیان بدرێتە پـاڵ تەبەعەی فەرەنسـا و لەسـەر ئەوان حلێب بکـرێ. ئەم ئیشـانە زۆر پەڵەی سـەن لە وەختێکـا کە عەسـکەری ئینگلـیس کـول (حـول) کە لە فەلەستینە چۆڵیان کرد، لە مانگی ئۆکتۆبەردا هەندێ هەرا بو بو لە ناو ژاندرمەی فەرەنسا و (بـدوی، فضـل) و شێخی ئەوان کە شێخ محەمەد فوئاد چەند جارێک بروای کرد بو لە روی (مـرج عبـور) ناشـرینی بکـات. هەر ئەوساتەی کە عەسکەری ئینگلیس لای ژوروی فەلەستینی چۆڵ کرد، شێخ محەمەد فوئاد وەها تێپەڕی حـدودی

کرد تا شاری (سور) کە لەسەر لێوی بەحری سپیە تاڵان و چەپاوی دەکرد هەروەها لە (حسبیە، فوس، انصاریە).

"لەبەر ئەمە حکومەتی فەرەنسا مەجبور بو کە شک بکرێت لە بیری حکومەتی شام، چونکە ئەم ئیشانە بە هیچ کلۆجێک لە لایەنی حکومەتی شامەوە پێشی نەدەگیرا لەبەر ئەوەی ئەمانە راجیع بە ئەمیر فەیصەڵ خۆی بو، کەس حەقی نەبو. بەڵام دەرکەوت کە مەئموران تەواو کەمتەرخەمی دەکەن. بەشکو حەزیان بەم ئیشانە دەکرد و بە باشیان دەزانی هەرچەن ئەمیر فەیصەڵ خۆی بەهیچ کلوجێک رەزای بەم تەرحە کردەوانە نەبو.

"داوایەکی تر ئەمەیە کە لە لایەنی شەمەندوفێری ناو (ریاک) و (حەلەب) بو. ئەم رێگا ئاسنە لەکۆنەوە هی هاوبەشی فەرەنسا بو وەک ئیمتیازێ دەوڵەتی عوسمانی دابوێ. هەرچەن ئێستا دەوڵەتی فەرەنسا داوای داگیری ئەم رێگا ئاسنەشی نەدەکرد، بەڵام داوای ئەوەی دەکرد: کە عەسکەری خۆی بەم شەمەندوفێرە بنێرێتە لای ژورو، لەبەر ئەمە کە رێگای عەینتاب و مەراش بەدەست مستەفا کەمال پاشاوە بڕا بو. لەم ئیشەدا هەرچەن ئەمیر خۆی تەواوی هاورێیەتی و یاریەدانی بو. بەڵام دیسان مەئموران بە تەحرێک نەهێشتن و کردەوەی بێ جێیان کرد، کە دوایی بو بە دانانی دڵگرانیەکی تەواو. بەکورتی ئیش گەیشتە رادەیەک ژەنەراڵ گۆرۆ دەبوو (ئولتیماتوم) بدا بەم شەرتە:

1.نەهێشتنی تێپەڕی حدود و خراپ کردنی خەڵق.

2. جەزا و جەریمە و تەمێ کردنی پیاوی خراپ.

3. رەواجی بانقەنۆتی فەرەنسا.

4. کردنەوەی رێگا بۆ عەسکەری فرەنسا لە رێگای ریاک، حەلەب.

5. حکومەتی شام حوکمی مەجلیسی ئاشتی بەینی دوەل قبول بکات بۆ ئەوەی کە حکومەتی شام لەژێر حیمایەی فەرەنسایە.

"لە وەختێ کە ئەم قسانە دەکرا، ئەمیر فەیصەڵ خۆی و وزەرا و گەورە گەورە ئەو پیاوانە کە چاکە و خێری میللەتیان دەویست و، لە پێش چاوی میللەت ماقوڵ بون، وەک عەلی رەزا پاشا ئەلریکابی و عەبدولرەحمان شابەندەر و نوری سەعید و ئەوانی تر لێکدانەوە و تێفکرین و خەریک بونێکی تەواویان دەکرد کە رێگایەک بدۆزنەوە بەینی ئەم دو حکومەتە تێک نەچێت، بەڵام بە کردەوەی ئەو کەسانەی کە دڵرەق و خۆپەرست و سەرگەرم و شەڕانی و میللەت تێکدەربون، خەریک بونیان بێ جێ مایەوە.

"... لە پاش گەیشتنی ئولتیماتوم هەتا دوا دەقیقەیش ئەمیر فەیصەڵ لەگەڵ وەزیرەکانی خەریک بون کە چارەیەک بدۆزنەوە کە خەڵق نەکەوێتە بەڵای شەڕەوە. دیسان خەریک بون و تێ فکرینیان لەلایەنی ئەو موفسیدانەوە تێکدرا. چونکە هەر لەو ساتەدا کە دوا مەشوەرەتیان دەکرد، لەشکری فەرەنسە دیسان وەستا بو کە دوایی مەشوەرەتەکە ببینن. ئەو دەستەی خۆپەرست و میللەت تێکدەرانە، بێ ئیزن و ئاگا لێبونی ئەمیر فەیصەڵ، کۆمەڵێکیان لە سەرسەری و فرومایە گرد کردەوە، بەبێ ئیزن و ئاگا لێبونی ئەمیر، خۆیان دا بەسەر لەشکرەکەی فەرەنسەدا. خەریکی شەڕبون، بە بیری ئەمە کە ئەمیر فەیصەڵ واتوش و تێکەڵ بکەن کە رێگای چونە دواوەی نەمێنێ. بە ناچاری لەشکری فەرەنسە خەریک بو شکانێکی بێ تەقریبی دا لەمانە و، لەشکری ئەمیر کە بە مەجبوری هاتە شەڕەوە هەروا شکانی خوارد، بە رەنگێکی وا کە ئەمیر فەیصەڵ خۆی پێی لێنا کە شکان و سەر شۆڕی ئەم حکومەتە لە دەست دوژمنی دەرەوە نەبو، بەشکو لە دەست دوژمنی ناوەوە بوە و، ئەم عیمارەتی حکومەتیە کەمن و وزەرام چەند ساڵێکە بە ماندوبون خەریکی بینا کردنی هەین، بە رۆژێک بەدەستی خۆمان تێکمان دا.

"بیری رۆژهەڵاتی و رۆژئـاوایی لە ئیشـوکاری حکـومەتی و تەمەدون لە هەنـدێ نوقـات دا نەختـالێکی تەفاوت هەیە. بەڵام پیاوانێ کە بیردار و لە پێشەوە هەن، لە چاکی و رێگای ئەصلی، هەمو یەکن.

"ئەمەیشـیان دەبـێ لە پـێش چـاوبێ کە لە پـاش ئـەوەی دەوڵەتـی ئینگلـیس لە هەوەڵ رۆژی شـەڕی گەورەدا گەنمی ناردە مەکە بۆ حاجیەکان و لەگەڵ شەریف و کوڕیا زۆر ئاشـنایی و دۆسـتایەتی و یەکێتییـان هەبو.

"هەروەک لای سەرو باس کرا، تا وەختـێ ئینگلـیس لە فەلەسـتین بـو لەبەر دۆسـتی نـاو ئینگلـیس و حکومەتی شەریف، هیچ ناخۆشی نەکەوتە ناویان. بەڵام لە پاش رۆیشتنی ئینگلیس ئەم ئیشانە سـەری گـرت، حەیفێ ئەم پیاوە گەورەیە، وەک ئەمیر فەیصەڵ بێ کە چاکبیر و دلڕون و باشە بەدەست ئەو موفسـیدانە بـێ تەقریبانەوە خراپ بوە.

"دەبێ تێ فکرێت کە فەرەنسە خۆیان دیسان لەم ئیشە وەها گەیشتون، کە لەپاش گرتنی حەلەب و شام ئیعلانیان کرد کە ئێمە هەرچەند دەبـو ئەم ئیشـە بکەیـن، دیسـان ئەمیرێتـی ئەمیـر فەیصـەڵ قبـوڵ دەکەیـن. رێکخستن و چاککردنی ئەم زەوی و شوێنانە بە هاورێیەتی خـۆی دەبـێ ببـێ، چونکـە دەیـزانین کـە خـۆی حەزی بە خراپەی میللەت نەبێ، بە هەمو تەحرێک لە دواییدا، هەرچی بـێ هەمـو دەیـزانن و قبـوڵی دەکەن، کە هـیچ لەمە زیـاتر لە کـیس ئەهـالی نەدەچـو، کە بە دەسـت ئەو موفسـید و خراپـانە بـوە کە لە هەوەڵەوە هەر پێچەوانەی بیر و ویستنی مەبعوس و سەرکردەی خۆیان کرد."

ژ63 ی 7 ی جولای 921 نوسیوێتی:

"گەیشتنی ئەمیر فەیسەڵ بە بەصرە

"24 ی حوزەیران: تەلغراف لە مەندوبی خاصەوە هاتوە کە رۆژی پێنجشەمە وەختێ ئێوارێ سـاعەتی 5 ی ئینگلیسی گەیشتە بەصرە، وا دانرا کە بەیـانی جـومعە لە پـاپۆڕ بێـتە دەرەوە. بەڵام بەو تەحـرە نەکـرا ساعەتی 6 هاتە دەرەوە.

پێش ئەوە کە بێتە دەرەوە لە پاپۆڕ چونە پاپۆڕ بە پیریەوە قوماندانی بریتانیا و موستەشـاری داخلـیە و مشاویری موتەصەریفی بەصرە ناجی بەگی سویدی و جەعفەر پاشای وەزیر و شێخ ئەحمەد ئەفەنـدی شـێخ داود و کۆمەڵێکی تر لە بەغدادی و بەصرەیی سەلامیان لە حەزرەتی ئەمیر و هاوڕێکانی کرد.

"لە پاشـا حەزرەتـی ئەمیـر هـاتە دەرەوە تەماشـای قشـونی بریتانیـای کـرد. لە پاشـا یەکـێ لە قوتابیەکـانی مەکتەبـی بـەصـرە نـوتقێکی بەخێرهـاتنی حەزرەتـی ئەمیـری خوێنـدەوە. لە پاشـا سـواری ئۆتۆمۆبیل بو لەگەڵ موستەشاری داخلیە. ئەوانیش کە چوبون بە پیریەوە سواری ئۆتۆمبیل بـون لە دوای ئۆیۆمۆبیلەکەی حەزرەتی ئەمیرەوە کەوتنە بـزوتن. لەم لا و ئەو لای رێگـا دەسـتە دەسـتە ئەهـالی وەسـتا بون بەخێرهاتنی حەزرەتی ئەمیریان دەکرد. هەتا گەیشتە ئەو ماڵە کە موتەسەڕیف بۆی حـازر کـرد بـو. پـاش نـوێژی خەوتنـان دەسـتە دەسـتە ئەهـالی چـونە زیـارەتی. حەزرەتـی ئەمیـر بە رویەکـی خـۆش و زەردەخەنە مەحەبەتی دەنوان.

"لەوانە کە چونە زیارەتی شێخ کازم دوجەیلی نوانی کە مەلیکێتی عیراق هەر بۆ حەزرەتی ئەمیـر لایەقە چونکە خزمەتیان بۆ عەرەب لە دەمێکەوە بە ناوبانگە.

"حەزرەتی ئەمیر جوابی دایەوە کە شوکری هەموتان دەکەم کە ئەمەندە ئەزیەتتان کێشـاوە لە هـاتن دا. وە لە خوام دەوێت هەمو لا موەفەق بکات بۆ شتێکی وا خێری وڵاتـی تیـا بـێ. ئەگەر بە خزمەتـی عەرەب بە ناوبەنگین ئەمە واجبێکە بە جێ هێنراوە. ئەمڕۆیش گەورە و بچوکمان نیە لە سەر هەمـوە خەریـک بـن. مـن بچوکترین خادمم بۆ شەعبێک.

"لە هەمو لایەکەوە چەپڵە لێ درا: بژی ئەمیر فەیصەڵ، بژی ئەمیر فەیصەڵ. بژی (جلالة الملک فیصل) بێژرا."

"24 ی حوزەیران، بەصرە: حەزرەتی ئەمیر شەو ڕو دەکاتە نەجەف دە ئۆتۆمۆبیل حازر بکەن. ناجی

"بەصرە، 29 ی مانگ بەیانی حەزرەتی ئەمیر دەگاتە ئیستاسیۆنی بەغداد."

"قوتابی مەکتەبەکانی بەغداد گورج دەکرێن بۆ چونە پیری ئەمیر فەیصەڵ:

"ڕۆژی 22 ی جون نازری مەعاریف کۆمەڵێکی گرت بۆ گورج گرتنی قوتابی مەکتەبەکان بۆ چونە پیر ئەمیر فەیصەڵ."

"کۆمەڵی موصل بۆ چونە پیری ئەمیر فەیصەڵ:

وازانراوە کە کۆمەڵێک لە موصل خۆیان حازر کردوە بچنە بەغداد بە پیر ئەمیر فەیصەڵەوە."

"ئەو شوێنانەی کە لە بەغدادا ئەڕازێنرێتەوە لە ئیحتیفالی ئەمیر فەیصەڵ دا:

"تاقی نەصر دادەمەزرێت وەک لای خوارو:

"1. لە سەری کۆڵانی صالحیە لە کەرخ.

2. لە سەر جیسری مۆد لە کەرخ.

3. لە سەر جیسری مۆد لە رەصافە.

4. لەو شوێنە کە جادەی جیسری مۆد و شەریعەی تازە یەک دەگرێت.

5. لە شەریعەی تازە نزیک مزگەوتی مەرجان.

6. لە شەریعەی تازە نزیک جیسری پێشو.

7. لە سەر جادەی ئەکمەکخانە.

8. لەو سەری ئەم جادەیە. ئەم تاقانە بە تەحریکی ئێجگار جوان ئەڕازێنرێتەوە. بۆ ڕازانەوەیان چەن زانستێک دانراوە. لە 2 ی جولایەوە دەست دەکرێت بە ڕازانەوەیان."

ژ65 ی 21 ی جولای 1921 نوسیوێتی:

"عیراق و ئەمیر فەیصەڵ:

"ئەم مەقالەیە عیبارەتە لە تاریخی موختەصەری ئەو وقوعاتی سیاسی‌یە کە لە پاش تەشریف هێنانی ئەمیر فەیصەڵ لە لایەنی حکومەتی بریتانیاوە و، قبوڵ بونی داوای ئەو بۆ تەخت و تاجی عیراق، قەوماوە.

"ئەوەڵەن، مەجلیسی وزەرای بەغداد کاغەزێکیان نوسیوەتە خزمەت حەزرەتی مەندوب ئەلسامی و ئیستیدعایان کرد بو کە قانونی ئوصولی هەڵبژاردنی مەبعوثان زو صادر بکرێت تاکو هەڵبژاردن و ئینتیخابی مەبعوثان کتوپڕ بکرێت.

"حەزرەتی مەندوب ئەلسامی جوابی دایەوە و تێیانی گەیانوە کە صادر بونی قانونی ئوصولی ئینتیخاباتی مەبعوثان هەر لەبەر ئیشکالاتی داهێنانی تەرتیباتی دوارۆژی قەزاکانی کوردی تەئخیر بوە کە هەنێ لەوان ئیرتیبات لەگەڵ عیراق لایان باش نەبوە. لاکین ئەگەر مەجلیسی وزەرا قبوڵ بکەن کە قەزاکانی کوردی، بێ ئەم شەراکەتە هیچ تەئسیری بێت لەسەر قەراری ئاخری ئیستیقبالی کوردستان، مەئزون بە شەراکەتی ئەم ئینتیخابە بین، ئەوسا دەستبەجێ ئینتیشار کردنەوەی قانونی ئوصولی هەڵبژاردنی مەبعوسان هیچ مومانەعەتی نیە. لاکین حەزرەتی مەندوب ئەلسامی ئەمەشی نوسیوە کە وەزارەتی داخیلە وەها خەبەریان دابو کە ئەقەلەن موهلەتی 3 مانگ لازمە بۆ تەواوکردنی ئینتیخابی مەبعوسان و بۆ کۆکردنەوەی مەجلیسی مەبعوسان. وە ئەگەر ئەوان (یەعنی مەجلیسی وزەرا) ئەیانەوێت زوتر بگەنە نەتیجە لازمە کە خۆیان تەجویزاتی لازمە پێشنهاد بکەن.

"لە پاش وصـولی ئەم کـاغەزە لە مەجلیسـی وزەرادا بە بـێ ئیعتیـراز قەرار درا کە ئەمیـر فەیصـەڵ بە پاشای عیراق بناسرێت.

"لە جوابی ئەم قەرارەدا، حەزرەتی مەندوب ئەلسامی وتی پێش ئەمە کە تەصـدیقی ئەم قەرارە بـکەم لام وا موناسیبە کە رەئی عمومی مەملەکەت بزانرێت، وە ئێستە بە پێی ویستنی حەزرەتی مەندوب ئەلسامی سـێر پێرسی کوکس صاحیب ئیعلانی خوارەوە بڵاوکرایەوە:

"ئیعلان

"لەبەر ئەمە کە لە جەلسەی یانزدەهەمی جولای مەجلیسی وزەرادا لە لایەنی حەزرەتـی رەئـیس وزەراوە تەجویزی ولایەتی عمومی ئەعزای مەجلیس قبوڵ کراوە، کە بەو شـەرتە حکـومەتی مەشـروتیەت بێـت، ئەمیـر فەیصەڵ بە پادشاهی عیراق تەعـین و ئـیعلان بکرێـت و، لە بەر ئەمە کە بە پـێی موقتەزەیـاتی ئوصـولی ئەم قەرارە بۆ تەصدیقی حەزرەتی مەندوب ئەلسامی نێـردراوە، حەزرەتـی مەزکـور ئەگەرچـی یەقینـی هەیە کە ئەم قەرارە ئینعیکاسـی حەقیقـی عمـومی عیـراقە، هەمدیسـان بە فەرزی خـۆی دەناسـێت، لە پـێش ئەمە کە خـۆی تەصدیقی بکـات، رەزایەتـی عومـومی مـیللەت تەحصـیل بکرێـت، بەم سـەبەبە لە مەجلیسـی وزەرا خواهیشـی نواندوە، کە ئەوان بە وەزارەتی داخلیە تەبلیغ بکەن بۆ ئیجـرای ئیقـداماتی لازمە بـۆ زانینـی رەئـی و بیـری میللەت.

"وەسائیلی گرتنی رەئی میللەت لە پاش موهلەتی موناسیب ئیعلان دەکرێت."

"حەزرەتی مەندوب ئەلسامی بە حاکمی سیاسی سلێمانی ئەمری داوە بە میلەتی کوردی لیـوای سـلێمانی تـێ بگەیەنرێـت کە مەئـزونن و بە کەیفـی خۆیـان ئەتـوانن شـەریکی ئەم رەئـی نوانـدنە بـبن و هەرچـی لەوخسوسەوە (یەعنی لە خسوس شەریکی رەئی نواندن بون یا نەبون) بە موناسـیب بـزانن هـیچ تەئسـیر و دەخلی نابێت بە سەر تەرتیبات و ئینتیزاماتی دوارۆژی حکومەتی ئەم لیوایە. وەها زانراوە کە کـاغەزی رەئـی رەسمی لە پاش چەند رۆژی تر بگاتە سلێمانی."

ژ67 ی 4 ی ئۆگستی 921 نوسیوێتی:

"ئەمیر فەیصەڵ

"رۆژی 25 ی جـولای، حەزرەتـی ئەمیـر فەیصـەڵ تەشـریفی چـو بـۆ رومـادی کـۆمەڵێکی گەورە لە عەشیرەتی دلێم چون بە پیریەوە. لە چونی ئەمیر زۆر خۆشحاڵییان نواندوە."

ژ69 ی 18 ی ئۆگستی 1921 نوسیوێتی:

"ئەمیر فەیصەڵ:

"وەک لە ئەخباری موختەلیف دەزانرێت ئیحتیمالە کە حەزرەتی ئەمیر فەیصەڵ لە لایەنی عمـومی ئەهلـی عیراقەوە بە پادشاە هەڵ بژێررێت.

لە بەصرە و تکریت و موصل دا بە یەکێتی بیری هەمو بە پادشاە قبـول کـرا هەرچەن نەتـیجەی رەئـی گرتنی عموم هێشتا رەسمەن ئیعلان نەکراوە بە پێی ئەو خەبەرە کە هەمو رۆژێک لە غەزەتەکانی عیـراق دا لە خصوص مەحەبەتی ئەهلی عیراق بۆ حەزرەتی ئەمیر چـاپ دەکرێـت ئەم قیاسـە بـێ جـێ نـیە کە بیلـئەخەرە ئەیکەن بە پادشاهی خۆیان."

ژ71 ی 1 ی سەپتەمبەری 1921 نوسیوێتی:

"مەلیکی عیراق ئەمیر فەیصەڵ

"رۆژی 23 ی ئۆگستی 1921 رەسمی چونە سەر تەختی حکومەتی عیراق بو ملیک ئەمیر فەیصەڵ لە سەرای بەغداد ئیجرا کرا. لەوێ دا بە قەد هەزار کەس لە ئەشـرافی عیـراق و بەغـداد و صـاحیب مەنصـەبانی

ئینگلیس و حەزرەتی مەندوب ئەل سامی سێر پێرسی کۆکس و قوماندانی عمومی حازر بون بە پـێی قاعیـدە تۆپ هاویژرا. لە لای پادشاهی ئینگلیسەوە تەلێکی موبارەکبادی بۆ حەزرەتی مەلیکی عیراق هاتوە."

ژ74 ی 22 ی سەپتەمبەری 1921 نوسیوێتی:

"وەزیرە تازەکان لە بەغداد

"ئەو تەلە کە لە بەغدادەوە هاتوە دەڵێت کە حەزرەتی نەقیبی بەغداد بە وەزیری ئەعزەم و، حامی رەمزی بەگ بە وەزیری داخلیە، سویدی ئەفەندی بە وەزیری عەدلیە، نـای ئەفەنـدی سـویدی بە وەزیـری مەعـاریف، تەعین کراون."

ژ78 ی 20 ی ئۆکتۆبەری 1921 نوسیوێتی:

"مەلیک فەیصەڵ لە موصل

"حەزرەتی ئەمیر فەیصەڵ ڕۆژی 10ی مانگ ساعەتی 12 ی زەوالی گەیشتە موصل. العراق"

ژ79 ی 27 ی ئۆکتۆبەری 1921 نوسیوێتی:

"چونەوەی حەزرەتی مەلیک فەیصەڵ بـۆ بەغـداد: ڕۆژی دوشـەمو 17 ی ئۆکتـۆبەر حەزرەتـی مەلیـک فەیصەڵ پاش سەفەری موصل و سامەڕە گەیشتۆتەوە بەغداد. حەزرەتی مەلیک ڕۆژێک لە سامەڕە و هەفتەیەک لە موصل ماوە و لە هەر دو جێدا هەمو ئەهالی لە هاتنی مەلیکی خۆیان زۆر زۆر کەیف خۆشی و مەسەڕەتیان نواندوە لە وەقتی عەودەتدا لە ئیستاسیۆنی بەغداد دا هەیئەتێکی موعتەبەر کە حەزرەتـی مەنـدوب ئەلسـامی و قوماندانی عمـوم میسـتەر ایـامر هالـدین و ئەغـلەب وەزیرەکـان و ئەشـرافی گەورەی بەغـدادی تیـا بـوە بـۆ ئیستیقبالی حەزرەتی مەلیک حازر بون. تاقمێکی عەسکەری مل عەرەب یش لەگەڵ مۆسـیقایەکی ئینگلیـزی بـۆ ئیحترامی مەلیک لە ئیستاسیۆن ڕاوەستابون."

ژ85 ی 8 ی دێسەمبەری 1921 نوسیوێتی:

"تەشریف فەرمونی مەلیکی عیراق بە مونتەفیک

"تەلغرافی ناصریە بە تاریخی 21 ی تەشرینی دوەم هاتوە کە مەوکیبی مەلەکی گەیشـتە سـوق دوێنـی سەعات 12 و 20 دەقیقە پاش نیوەڕۆ گەلێ لە جەماعەتی ئەهلی بە شـەوق ئیسـتیقبالیان کـرد هەتـا کەنـاری نەهر. هەمو لا نیشانەی سرور و کەیف خۆشیان نوان لەم نیعمەتی زیارەتە، مەقەڕی جەلالەتـی ڕازا بـوەوە بە تاقی نەصر و بە بەیاخی وەتەنیە کۆمەڵ و قەتاری ئەشراف صەف بەست بون سوارە پۆلیسیش لای ڕاست و چەپیان گرت بو ئەوانە لە ناصریەوە بۆ حەرەسی مەلەکی هاتبون. وەختێ کە جەلالەتی تەشریفی بردە سـەرای ئەوێ بە قەد صەد کەس موشەڕەف بون بە موقابەلەی زاتـی ملـوکیە پـاش ئەو موقـابەلەیە قـاوەڵتیەکی فـاخر ئامادە کرا ئەوانە لە مەوکیبی مەلەکیدا بون و وەک ئەشراف و زابتی بریتانیا بی حازر بون. پـاش قـاوەڵتی نەقلی فەرموە خانوی حکومەت بە شەوکەت و عەزەمەتێکی گەورە ئەو ڕۆژە لەگەڵ گەورە ئەشـراف و شـیوخی قەبائیل ڕای بوارد، ئێوارێ بە صورەتی خصوصی تەناولی تەعامی فەرمو."

ژ86 ی 15 ی دێسەمبەری 1921 نوسیوێتی:

"جەمعیەتی کەرکوک لە بەغدادا

"لەو ڕۆژەوە کە رەئی عمومی دراوە بیری صاحیب رەئی لە کەرکـوک وا بـوە کە جەمعیەتـێ بچێـتە بەغداد بۆ خـزمەت مەلیـک و مەنـدوبی سـامی لەم ڕۆژانەدا جەماعەتێـک لە ئەعیـان و ئەفاضـلی کەرکـوک تەئلیف کـراوە و چـوە بـۆ بەغـداد لە 30 ی مـانگی رابـردودا گەیشـتونەتە بەغـداد موشـەڕەف بـون بە زیـارەتی حەزرەتـی مەلیـک، مولاقاتیشـیان لەگەڵ حەزرەتـی مەنـدوب ئەلسـامی بـوە، بە قەد هەفـتەیەک لە بەغداد دەمێننەوە."

ژ91 ی 19 ی جەنیوەری 1922 نوسیوێتی:

"هەواڵی بەغداد

"لە بەینی دو مەلیک دا، صاحیب ئەلجەلالە مەلیک فەیصەڵی ئەوەل و مەلیک جۆرجی پێنجەم بە تەلغراف موبارەکبادی ساڵی تازەیان کردەوە. حەزرەتی مەلیک فەیصەڵ تەلغرافی لای خواروی نووسیوە:

"بۆ مەلیک جۆرج بە مناسەبەتی سەری ساڵەوە!

"بە مناسەبەتی حلولی ساڵی تازە بە ئیخلاصی قەلبی تەبریکات تەقدیمی جەلالەتتان و جەلالەتی مەلیکە و ئەعزا و ئەوەی مەلەکی دەکەم. تەمەنای زیادی سەعادەتی ئەهالی بریتانیا، تۆفیقیان لە ژێر حوکمی جەلالەتی مەجیدتان دەکەم. بە عینایەتی خوای تەعالا ئەمەلم وایە ئەم ساڵی تازەیە فاتحی عەهدێکی تازەی وابێت کە خۆشەویستی و یەکێتی بەینی بریتانیا و ئومەتی عەرەب بە عمومی و بۆ عیراق بە تایبەتی تیا زیاد بێ.

"جوابی صاحب الجلالە مەلیک جۆرج ئەمەیە:

بە ئەصالەت لە جیاتی خۆم، بەوەکیلی لە جیاتی جەلالەتی مەلیکەو، عائیلەی ملوکیەوە، شوکری جەلالەتتان دەکەم لەسەر موراسەلەتان بە مناسەبەتی ساڵی تازەوە من لام مەوسوقە کە ساڵی تازە بە خێر و ئیقبال دێت بەسەر شەعبی ئێوەدا، بە صەحیحی رەغبەتم وایە کە عەلاقەی خۆشەویستی ئێستا دەوامی ببێ و زیاد بکا، گەورەیی ئەحکامی لەسەر ئەحکام بۆ لەمەولا."

لە هەمان ژمارەدا

"دیاری حکومەتی بریتانیا

"عەسکەری خۆولاتی عیراق

"تێ گەیشتووبن کە حەزرەتی مەلیکی بریتانیا دو بەتاریە تۆپی شاخی بە هەمو تەداروکاتیەوە، وەک هیستر و شتی تر بێ، بە دیاری ناردویەتی بۆ حکومەتی عیراقی. فائیدەیە کە جەیشی عیراقی لەم دیاریەوە مستی دەکەوێت پێویست نیە بەیان بکرێت. لە مانگی تەموزی رابردووەوە بۆ فێر بونی تۆپچێتی شاخی وەزارەتی دیفاع صنفێکی کردۆتەوە. ئێستا پیاوی وا حازرە کە ئەم تۆپانە بە کار بهێنێت. هیچ شک نیە، لەم کەرەمەی حکومەتی بریتانیا شەعبی عیراقی، بە تایبەیت وەزارەتی دیفاع، مەسرورن و بە بەرز بونەوەیەکی جوانی دەزانن. چونکە عەسکەری خۆولاتی وەک ئێستا ئیستیفادەی لێ دەکەن، بۆ لەمەولایش عەلامەتی مۆفەقێتیە. ئێمە تەبریکی جەعفەر پاشا دەکەین بۆ ئەم دیاریە. ئەمینین کە شەعبی عیراقی موافیقن، نەک بە پێی قیمتی مادی، بەڵکو دەلیلە کە حکومەت و حەزرەتی مەلیکی بریتانیا رەغبەتی تەواویان هەیە بۆ یاریە و بەرزکردنەوەی حکومەتی عیراقی بە هەمو تەحرێک.

"رەئیسی وزەرا کە بە دیاریەکەی زانی، بە ناوی ئەهالیەوە بە حەزرەتی مەندوب ئەلسامی گەیان کە منەت و تەقدیری ئەهالی بە حەزرەتی مەلیکی بریتانیا عەرز بکرێت."

ژ103 ی 13 ی ئەپریلی 922 نوسیوێتی:

"مەلیکی عیراق لە تەیارەدا

"حەزرەتی مەلیک سواری تەیارە بو سەعات نۆ و چارەکی بەیانی. رۆژی جومعە سەعات دە و چارەک گەیشتە رومادی کۆمەڵێک لە ئەهالی ئیستیقبالیان کرد. شێخ عەلی سلێمان و زۆر لە شێخی قەبائیل و مەئمورانی حکومەت لە پێش ئیستیقبالچیەکانەوە بو، ئیستیقبالێکی زۆر جوان کرا پاشا تەشریفی فەرموە ئەو جێگایە کە بۆ ئیسراحەت رێک خرا بو، شێخ عەلی سلێمان قاوەڵتیەکی فاخیری کرد بو، حەزرەتی مەلیک و مەندوب ئەلسامی و ئەوانی لەگەڵیان بو پاش قاوەڵتی ئەو ناوە گەڕان تەماشای ئەو مەنازیرە جوانەیان کرد، سەعات سێ و نیو سوار بونەوە سەعات چوار و چارەک گەیشتنەوە پایتەخت (بەغداد)"

ژ111 ی 8 ی جونی 922 نوسیوێتی:

"قوماندانی عومومی ئینگلیس لە عیراق

"لەندەن 23 ی مایس، سێر جۆن سالمۆن دەبێ بە قوماندانی عومومی عیراق وەزیفە دەگرێتە دەست لە هەوەڵی تشرینی ئەوەڵ دا."

"لە مەجلیسی عەوامی بریتانیادا مەسئەلەی حیمایە لە عیراق

"لەندەن 23 ی مایس، میستەر چەرچل لە مەجلیسی عەوامدا ئەوەی بە درۆ خستەوە کە حەزرەتی مەلیک فەیصەڵ و وزەرای عیراق خەبەریان بە سێر پێرسی کوکس داوە کە ئەهالی عیراق ئینکاری قبول کردنی حمایەی بریتانیا لە عیراق دەکەن. میستەر چەرچل وتی: قەتعی ئیمتیازات لە مەنابیعی نەوت نەبوە لە ئیحتلالی بریتانیاوە ئەمەیشی وت کە شەریکەی نەوتی تورک داوای حقوقی خۆی لە مەنابیعی نەوت دەکات هی پێشتر."

ژ112 ی 15 ی جونی 1922 نوسیوێتی:

"مەسئەلەی عیراق لە مەجلیسی عەوامی ئینگلتەرە

"لەندەن 30 ی مایس، مەندوبی حەزرەتی مەلیک فەیصەڵ حەداد پاشا لە وەختی قسەدا لەگەڵ ڕەوانەکەری رۆیتەر تەصریحی کردوە صعوبەتی تەواو کەوتۆتە موزاکەرەی موعاهەدە لەگەڵ بریتانیادا لەبەرئەوەی رازی نین بە ویصایەتی ئێستا، هەمو لا رەغبەتیان هەیە بە یاریەدان لەگەڵ بریتانیادا، بەڵام مەلیک و ئەهالی دەیانەوێت موعاهەدەیەکی وا لە بەینی هەردولا عەقد بێ کە بە صورەتێکی واضح ئیستیقلالیەتی عیراق ئیعتراف بکرێت."

"لەندەن 31 ی مایس، میستەر چەرچل لەسەر پرسیاری کنورسی جوابی دایەوە کە حکومەتی بریتانیا لە مالیەی ئیمپراتۆریە شتێک نادا ئەگەر مەصاریفی حکومەتی عیراقی لە واریداتی زیاتر بو.

"لەو وەختەوە چونە عیراق هەتا ئێستا هەمو مەصاریفێکی ئۆردوی عیراقی و لیوی لە مالیەی ئیمبراتۆریە دراوە.

"میستەر هرمسورث لە لایەنی قوەتی جنوبی ئێرانەوە وتی کە ئەم قوەتە بەم نزیکانە داخل دەبێ ئەمجاریش لە مەجلیسی عەوام داوا دەکرێت ئیختیاری دانانی مەصرەفیان بۆ بکرێت."

ژ113 ی 22 ی جونی 922 نوسیوێتی:

"کەمیی بودجەی عیراق

"کەمی بودجەی ئێستای عیراق بە حەوت ملیون روپیە تەقدیر کراوە. وەزیری مالیە ساسۆن ئەفەندی، وەزیری داخلیە تۆفیق بەگ خالدی، وەزیری پێشوی عەدلیە ناجی بەگ سویدی، لە ئیش بە دەستانی دائیرەی حەزرەتی مەندوب ئەلسامی میستەر سمول و موستەشاری عەدلیە میستەر داویدسن، وەکیلی موستەشاری مالیە میستەر سوان بە صیفەتی سکرتێری عیبارەتن لە مەجلیسێک بۆ ئەوەی کە وەسیلەیەک بدۆزنەوە بۆ زیادی واریدات و کەم کردنەوەی تەخصیصاتی هەنێ مەئمور، پێرێ هەوەڵ جار لە وەزارەتی داخلیە کۆبونەوە."

ژ118 ی 27 ی جولای 922 نوسیوێتی:

"موعاهەدەی عیراق لە مەجلیسی عەوام دا:

"لەندەن 11 ی تەموز، میستەر چەرچل لە مەجلیسی عەوامدا وتی بە تەواوی ئیتیفاق نەکراوە لەسەر هەمو مەوادی موعاهەدەکە نیەتی عەقد کراوە لەگەڵ حکومەتی عیراقدا بەڵام موزاکەرە بۆ ئەم خصوصە لەسەر تەسریعی ئینتهائیە. ئەمەل وایە مەجلیس تەفصیلات بدا. یا لە پاش مودەیەکی کورت وەختێ کە ئیمزای معاهدە کرا دەدرێت بە پارلەمان. ئەمەیش وایە پاش هەفتەیەک یا دە رۆژ ئەوە تەواو بێ ئەگەر شتێکی وا

نەیەتە رێ مەنعی بکات. لە ئیشەکەدا هەندێ نوقتەی تر هەیە حکومەت سـەعی دەکـات مـوافقەت لە بەینـی ئەم نوقتانە و رەغبەتی ئەهالیدا بە سورعەتی مومکینە بیێ. صورەتێکی موعاهەدەکە دەدرێت بە عیصـبەت ئەلئـومەم، ئەویش بۆ ئەو تەعەهودانەیە کە حکومەتی بریتانیا گرتیە سەر خۆی.

"چەرچل لە لایەنی واجبی ناردنی موعاهدە بۆ مەجلیسـی تەئسیسـی پـێش ئیمـزا کـردن وتـی ئومێـد ناکرێت لە عیصبەت ئەلئومەم مەنعی تەصدیقی موعاهدە بکات چونکە نەتیجەی باش دەبێـت لە هەمـو ئەحـوالی ویصایەت دا.

"لەسەر پرسیارێ جـوابی دایەوە کە عەرەب داوای لەغـوی ویصـایەت دەکەن بەم تەلەبەیـان مەسـئولیەت دەخەنە سەر بریتانیا ئەمەیشی وت کە عەرەب کەلیمەی ئینتداب (ویصایەت) دەکەرهێنن لە بەر ئەوە حەقیقەتـێ کەلەم کەلیمەیەدا هەیە هی فائدە نایزانن."

## 10. شوێنی لە مێژوی رۆژنامەوانیی کوردیدا

پێشکەوتن شوێنێکی گرنگ و بەیەخداری لە مێژوی رۆژنامەوانیی کوردیدا هەیە.

پێشـکەوتن سـەرەڕای ئەوەی تۆمـارێکی گرنگـی روداوەکـانی ئەو سـەردەمەی کوردسـتان و عیـراقە، ئەتوانین بڵێین ئەم رۆژنامەیە بو کە بەردی بناغەی قوتابخانەی سلێمانی لە رۆژنامەوانی کوردیدا دانا.

پێشکەوتن 118 ژمارەی لێ دەرچوە، تا ئەندازەیەکی باش بە رێکوپێکی و لە کاتی دیاریکراوی خۆی دا دەرچوە. بە دوای پێشکەوتن دا لە سـلێمانی بـانگی کوردسـتان، رۆژی کوردسـتان، بـانگی حەق، ئومێـدی ئیستیقلال، ژیانەوە، ژیان، دەرچون، هەمویان لە قەوارە و چاپ و رێنوس و زمان و رێکخسـتنی لاپەڕەکـان دا لاسایی پێشکەوتنیان کردۆتەوە. ئەمەیش شتێکی سەیر نیە، چونکە پێشکەوتن ئەگەرچی دەسەڵاتی ئینگلیز لە سلێمانی دەری ئەکرد، بەڵام رۆشنبیرە نیشتیمانپەروەرەکانی سلێمانی دەوری کاریگەریان هەبـوە لە نوسـین و رێکخستنیدا، هەر ئەوانیش نوسەری سەرەکی بون لە رۆژنامەکانی دوای ئەودا.

### چەند تێبینییەک:

1. دەربارەی یەکەم چاپخانە لە سلێمانی بڕوانە:

د. کەمـال مەزهەر: چمکێـک لە مێـژوی یەکەم چاپخـانەی کـوردی لە شـاری سـلێمانی، کتێبـی: چەنـد لاپەڕەیەک لە مێژوی گەلی کورد، بەشی یەکەم، بەغداد. 1985

2. عەلی ناجی کاکە حەمە ئەمین عەتار و سیروان بەکر سامی، ساڵی 1998 لە هەولێـر سـەر لە نـوێ وێنەی هەمو ژمارەکانی (پێشکەوتن) یان لەگەڵ پێشەکی و پێڕستی ناوەرۆکی رۆژنامەکەدا چاپ کردۆتەوە.

## 4. 3. بانگی کوردستان

صاحب امتیاز و مدیر مسئول
مصطفی پاشا

محرر تورکی
رفیق حلمی

محرر کوردی و فارسی
علی کمال و م. نوری

بو همو شتیك مراجعت
به صاحب امتیاز اکری

بو خارج بدل آبونه‌ی
٣ مانگی دو ٦ مانگی چوار
سالیکی ٨ روپیه‌یه
اعلانات به دو دیر
٥ آنه ده‌بیتریت

# بانگ کردستان

(زمان گورزو دم رابوردو ایستا پالوان علمه)
(سلاح دسته صنعت بارقهٔ تیغ - سنان علمه)

نسخه‌یکی به ٢ آنه

علمی ، اجتماعی ، ادبی ، غزته‌یکی حر و سربست ملی‌یه
هفتهٔ جاریك دردچی

٢ آغستوس
١٩٢٢

سال ١ ژماره ١ [ چوارشمه ] ٨ ذی‌الحجه ١٣٤٠ ٢ آغستوس ١٩٢٢

## جژنه قربانه

تقرب و حلول ام جژن قربان مبارکه که بو همو ملت اسلام موجب فیض و رحمته بانك کردستان بواسطهٔ ام روزه مبارکه‌وه بو همو افراد جمعیت و بو اهل کردستان له یزدان پاك تمنا و نیاز نجات و مسعدت و عرض جژنه پیروزی دکات .

بانگ کردستان

اول روژ جژن قربان پاش نو یژی جژن اعضایان دائمی جمعیت کردستان له مال جناب حاجی مصطفی پاشادا اجتماع دکن . بو جژنه پیروزی لکل یکتر لو وخته‌دا تشریف فرمون همو افراد جمعیت کوردستان رجا کین .

∴

## جمعیت کردستانه

لسر مراجعتی جناب سعادتمآب حاجی مصطفی پاشای میرلوای ارکان حرب متقاعد و له سر مأذونیت و مساعدهٔ رسمی حکومت سیاسیٔ سلیمانی له طرف بعضی ارباب حمیت و افاضل و منورانه‌وه قرار درا که له سلیمانی جمعیتیکی کورد تشکل بکا . بو امه چند روژی لوپیش اسامی علما و مشایخ و اشراف و سائر منوران و اهل کسبه به ترتیب حروف هجا داخل دفتر کرا و روژی جمعه ٢١ تموز ٩٢٢ پاش نویژی نیوه‌رو له مزکوت سید حسن مفتی‌دا کرد بونه‌وه . له طرف جناب مصطفی پاشاوه نطقیکی افتتاحی دایر به مقصد وغایهٔ ام اجتماعه خوینرایه‌وه سامعین که بیستیان غایهٔ ام فکره بو ترقی و تعالی ملت و وطنه به کمال افتخار تبولیان فرمو .

بلاو کردنه‌وهٔ ام فکره‌یش به‌واسطهٔ ام غزته‌یه‌وه‌یه که حکومت امتیازی داوه به جناب مصطفی پاشا و ایستا هفتهٔ جاریك دردچی . امید وایه انشاالله بواسطهٔ همت ارباب حمیته‌وه ترقی بکات ذاتاً همو شتیك ورده ورده زیاد اکات .

صاحب امتياز و مدير مسئول
و سر محرر
مصطفى پاشا

محرر كردى و فارسى
على كمال و م . نورى

اعلانات بديريك
٣ آنه ده سينريت

بوداخل شهر ولوا بدل آبونه
٣ مانك دو ٦ مانك چوار
ساليكى ٨ روپيه يه

بو همو شتيك مراجعت
به صاحب امتياز اكرى

بوخارج اجرت پوسطه
علاوه ده‌كرى

# بانگ كردستان

(زمان گورزو وم رابوردو ايستا پالوان علمه)
( سلاح دسته صنعت بارقهٔ تيغ و سنان علمه )

تاريخ انتشار
٢ آغستوس ١٩٢٢
سليمانى

علمى ، اجتماعى ، ادبى ، غزته‌يكى حر و سربست ملى يه
هفتهٔ جاريك دردچى

نسخه‌يكى به ٢ آنه ده‌فروشرى

سال ١ ژماره ١٣ [ جمعه ] ١٢ ربيع الاول ١٣٤١ ٣ تشرين ثانى ١٩٢٢

## حضرت حكمدار معارف برور

له او روژه‌وه كه حضرت حكمدار كردستان تشريفى مباركى هيناوه‌ته سليمانى شو و روژ بو آسايش داخلى و امن و استراحت اهالى سعى فرمووه فقط له همو شت زياتر چونكه كردستان احتياجى به معارف و تا ايستا حقيقتاً له محيط سليمانى دا مكتبيكى موافق و تشكيلاتيكى مناسب نبووه و له اصول تدريسدا تا ايستا كس مشغول نكراوه . حضرت حكمدار وك بو دوايرتر ارادهٔ فرموبو ؛ بومعارفيش تشكيلاتيكى چاك ومستعجلى اراده كردبو . له سر امه له طرف رياست معارف كردستانه‌وه له نفس سليمانى‌دا له ژير ادارهٔ مدير رفيق حلمى افندى كه حقيقتاً له اذكياى شبان وطنه مكتبيكى اعدادى حوت صنفى ( ٣ صنفى رشديه‌يه ) به ناو مبارك حضرت حكمدار يعنى ( اعدادى محمودى) و مكتب رشديه‌يكى جوى به ناوى جناب سپهسالار شيخ عبد القادر افندى‌يه‌وه يعنى ( رشديهٔ قادريه ) و دو مكتب ابتدائى به‌ناوى مخدومان حضرت حكمداره‌وه ( رؤفيه ) و ( لطيفيه ) تشكيل و به‌و نوعه‌يش بو نام زانيان مساعده فرمورا . حقيقتاً ام اراده و همت عالى‌يه بو عموم كردستان موجب شكران و امتنانه و به سبب ام تشكيلات مستحسنه‌وه له طرف همو معلمان مكتبه‌كان مضبطه‌يك تشكر و دعا بو حضرت حكمدار كه نيرراوه بو ادارهٔ بانك كردستان عيناً اوا له زيره‌وه درج كرا . و بانك كردستان به زبان صداقت عرض تشكرات له خذمت حضرت حكمدار معارف پرور دكا .

صورت مضبطه
بو مقام سامى رياست معارف تقديم

به واسطهٔ تصديق تشكيلات تازى معارفه‌وه حسيكى علوى كه حضرت حكمدار كردستان دام شوكته درحق به مكاتب لطفاً و تنزلا ابرازى فرمووه حقيقت مافوق همو حسيكى عالى‌يه . ايرو له سايهٔ ارادهٔ و فرمان اعليحضرت حكمداره‌وه تشكيلات مكاتب موافق

## 4. 3. بانگی کوردستان

### هەلومەرجی دەرچونی

دەرچونی بانگی کوردستان هاوزەمان بو لەگەڵ چەند ڕوداوی گرنگدا. کاربەدەستانی ئینگلیز خۆیان ڕاستەوخۆ کاروباری ناوچەکەیان بەڕێوە ئەبرد، بەڵام تا ئەهات بارودۆخی ناوچەکە زیاتر ئەشێوا و، بەرەنگاری چەکدارەکانی کورد زیاری ئەکرد. شەڕ و پێکادان لەگەڵ هێزەکانی ئینگلیز لەملا و ئەولا ئەقەوما و، ئەفسەرانی ئینگلیز ئەکەوتنە بۆسەی پارتیزانەکانی کوردەوە، ئەکوژران و هێزەکانیان ئەشکان. تورک کە داوای ولایەتی موسڵی ئەکردەوە، مەفرەزەیەکی نارد بوە ڕەواندز و خەریکی هاندانی سەرانی کورد بو دژی داگیرکەرانی ئینگلیز، کێشەی گەورەیان بۆ دروست کرد بون.

دەسەڵاتی ئینگلیزی بۆ ئەوەی ناوچەکە ئارام بکاتەوە و بەر لە تەشەنەکردنی نفوزی تورک و کشانی هێزەکانی بگرێ، ئەیویست کورد هێمن بکاتەوە. لەو ماوەیەدا مستەفا پاشای یاملکی کە جەنەراڵێکی خانەنشینی سپای عوسمانی و یەکێ لە کوردپەروەرە چالاکەکانی ئەستەموڵ بو، تازە گەڕابوەوە کوردستان.

پێشکەوتن لە ژ76 ی 6 ی ئۆکتۆبەری 1921 دا لە ژێر ناوی (هاتنەوە) دا نوسیوێتی: "جەنابی حاجی مستەفا پاشا یەک دو مانگ لەمەوپێش لە ئەستەنبولەوە هاتبوە بەغداد. لە بەغدادیشەوە تەشریفی هاتۆتەوە ئێرە. شەوی 3 شەمە 4 ی مانگ گەیشتە سلێمانی. بە ناوی خۆوڵاتیەکانەوە بە خێرهاتنی دەکەم. پ"

مستەفا پاشا هەندێ بیر و بۆچونی تازە و هاوچەرخی بۆ پێشخستنی جوڵانەوەی کورد لە سەردا بو. دەسەڵاتی سیاسی ئینگلیز لە سلێمانی ڕێگەیاندا هەم ڕێکخراوێک بە ناوی (جەمعیەتی کوردستان) ەوە دابمەزرێنێ و، هەم ڕۆژنامەیەک لە باتی (پێشکەوتن) بە ناوی (بانگی کوردستان) ەوە دەربکا. بەم بۆنەیەوە پێشکەوتن لە ژ118 ی 27 ی جولای 1922 دا لە ژێر سەردێری: (جەمعیەتی کوردستان- بانگی کوردستان) دا نوسیوێتی:

"لەم ڕۆژانەدا بۆ خزمەتی وڵات و بەرزکردنەوەی مەعاریف جەمعیەتێک بە ناوی جەمعیەتی کوردستانەوە لە سلێمانی تەشەکولی کردوە. بە ناوی بانگی کوردستانەوە ئیمتیازی غەزەتەیەکیش وەرگیراوە، کە ئەم جەمعیەتە ئیدارەی دەکات و، جەنابی حاجی مستەفا پاشا مدیری مەسئولێتی. ئەو غەزەتەیە لەمەولا هەفتەی جارێک دەردەچێت."

**1. 1. دەرچونی**

بانگی کوردستان 13 ژمارەی لێ دەرچوە.
ژ1 ی لە 2 ی ئابی 1922 دا و
ژ13 ی لە 3 ی تشرینی دوەمی 1922 دا دەرچوە.
هەر بە قەوارەی پێشکەوتن و بە هەمان شێوە، بە 6 لاپەڕە بڵاوکراوەتەوە.
لە ژێر ناوی ڕۆژنامەکەدا نوسراوە:
"زەمانی گورز و ڕم ڕابورد و ئێستا پاڵەوان عیلمە
"سیلاحی دەستە سنعەت باریقەی تیغی سەنان عیلمە
"عیلمی، ئیجتماعی، ئەدەبی، غەزەتەیەکی حوڕ و سەربەستی میللیە.
"هەفتەی جارێک دەردەچێ."

ساحیبی ئیمتیاز و مدیری مەسئول: مستەفا پاشا و، محرری کوردی و فارسی عەلی کەمال و م. نوری و، محرری تورکی ڕەفیق حیلمی بو.

لە ژێر دواستونی دوا لاپەڕەیدا نوسراوە: "لە چاپخانەی حکومەت لە سلێمانی چاپ کرا"

لەو ماوە کورتەدا کە ئەم 13 ژمارەیەی بانگی کوردستان تێدا دەرچوە، 3 گۆڕانی سیاسیی گەورە بە سەر سلێمانیدا هاتوە:

یەکەم:

ئیمتیازی غەزەتەکە لە کاربەدەستانی ئینگلیز وەرگیراوە، چونکە لەو کاتەدا ئەوان سلێمانییان بەڕێوە ئەبرد، ژمارەکانی 1- 5 لە کاتێکدا دەرچون کە هێشتا ئینگلیز لە ناو سلێمانیدا دەسەڵاتدار بو.

دوەم:

سەردەمی کشانەوەی ئینگلیز لە سلێمانی و دروستبونی بۆشایی دەسەڵات تا گەڕانەوەی شێخ مەحمود، ژمارەکانی 6- 8 لەم ماوەیەدا دەرچون.

سێیەم:

ژمارەکانی 9- 13 لە دوای گەڕانەوەی شێخ مەحمود، حوکمداری کوردستان دەرچون.

**1. 2. ئامانجی**

مستەفا پاشا لەو دوانەدا کە بە بۆنەی دامەزراندنی جەمعیەتی کوردستانەوە لە مزگەوتی سەید حەسەن داویێتی، ئامانجی جەمعیەتی کوردستان و بانگی کوردستانی بەم جۆرە ڕون کردۆتەوە:

"(السلام و علیکم) ئەی قەومی قەدیمی پەهلەوی! گوێ بگرن لە بانگی کوردستان! ئەم بانگە بۆ خەبەرداری هەمو کوردانە. بۆ هوشیاری شێرانە. بۆ بیستنی باوک و دایکانە. گوێ بگرن ئەم بانگە چی تیایە؟ ئەم هاوارە بۆ چیە؟ هەمو هەفتەیەک گوێی لێ بگرن بزانن ئاخری چیە؟ قسەی پڕوپوچی کۆڵانان، درۆ هەڵبەستنی ڕێژگاوان بەسیە. تەماشای عالەم بکەن لە صنعەت و مەعریفەت دا لە ئێمە پاشکەوتوتر کێ هەیە؟ کاڵایەکمان نیە بۆ سەتری عەورەتمان کافی بێ. دەرزی و دەزویەکمان نیە کە دەستکردی وڵاتمان بێ. نیشانەی عەزەمەت و خانەدانییش کە ئێستا عیبارەت لە شەکر و چایە ئەوانیش هی کوردستان نیە لە جێگایانی تر دێن. پارچە کاغەزێ کە بۆ نوشتەی چەور و شیرینی بێ ئەویش لە فەڕەنگستانەوە دێت. لە صەدا چوارمان تیا نیە کە کاغەزێ بۆ کەسوکاری و سرێکی مەحرەمی بۆ عائیلەی خۆی بنوسێ. مشکی و مێزەرمان لە ئێران و فەڕەنگستان، گورونی گوڵ ئۆقەییمان لە هندستان، عەبای گەورە گەورەی نازدارمان لە عەرەبستان، کفنی مردومان لە ئەوروپاوە، مەلۆتکەی منداڵمان لە ئەمریقاوە دێت.

"وەلحاصل لە هەمو چشتێک مەحرومین، لە حەوادیسی عالەم بێ خەبەرین، ئەمە هەمو سەبەبی بێ علمی-یە، لە فنونی جیهان بێ بەهرەین، لەگەڵ ئەمەیش دا هەر یەکتری تەنقید و، هەر کەس ئیش بکا لە پێش بەینێ نەتیجەی لەبەر جەهل و حەسودی ئەو ئیشە بە خراپی تەئویل دەکەین.

"ئەی برادەرانی کوردان! وەرن گوێ لە بانگی کوردستان بگرن، بزانن چی لێ حاصل دەبێ، چی سەمەرەیەک دەدا، حوسنی نیەت و برادەری سەبەبی سەرفرازیە، نیفاق و غەیبەت باعیسی پەرێشانی و روسیاهیە. گوێ بگرن لە بانگی کوردستان دەڵێ: (زەمانی گورز و رم رابورد...) هەر کەس فکرێکی چاکی هەیە و بۆ ئەولادی وەتەن و میلەت بە خێری دەزانێ بە پیاوەتی ئاشکاری کا تا لە دائیرەی عیلم و ئەدەب دا بخوێنرێتەوە. قسەی پرو پوچی شەوان ببڕێتەوە ئەوا بانگی کوردستان دەست پێ کرا ئەوا پەند و ناصیحی برادەری بە ئاشکاری نوسرا."

عەلی کەمال باپیر ئاغا کە یەکێ بوە لە نوسەرەکانی، لە ژ1 دا لە ژێر سەردێڕی (بانگی کوردستان) دا ئەویش هەوڵی رونکردنەوەی ئامانجەکانی داوە، نوسیوێتی:

"لە نەتیجەی سەعی و کۆششێک دا کە لە تەرەف جەنابی رەئیسی جەمعیەتی کوردستانەوە واقیع بوە، حکومەتی سیاسی سلێمانی بۆ نەشری غەزەتەی (بانگی کوردستان) موساعەدەی فەرمو.

"مەقصەد لەم غەزەتەیە چونکە رەهبەری و خزمەت بۆ قەومی کوردانە لەسەر هەمو کوردێک لازمە ئەم غەزەتەیە بخوێنێتەوە و بە دڵ گوێی لێ بگرێ.

"مەعلومە کە هەچ قەومێک غەزەتەیەکی نەبێ نە کەس لە فکر و خەیاڵی ئەو قەومە و نە ئەو لە ئەنجامی کاروباری خۆی تێ دەگا و ئەو وەقتە لەناو قەومانی دنیا بێ نام و نیشان دەمێنێتەوە.

"بینائەن عەلەیهی بۆ سەرفرازی میلەتی کوردستان لە پێش هەمو شتێکا لازمە رەغبەت بەم غەزەتەیە بدرێ. چونکە غەزەتەیەکی میللی و تەرجومانی ئەفکار و خادیمی قەومی کوردانە."

## 1. 3. سەرچاوەی دارایی

لای راستی رۆژنامەکە نوسراوە: "ئیعلانات بە دو دێڕ 5 ئانە دەسێنرێت.

لە لای چەپ یشی نوسراوە: "بۆ خاریج بەدەلی ئابونەی 3 مانگی دو 6 مانگی چوار ساڵێکی 8 روپیەیە" و (نوسخەی بە 2 ئانە) بوە.

ئەم غەزەتەیە ئەهلی بوە، خاوەنەکەی و نوسەرەکانی پارەی چاپیان دابین کردوە. عەلی کەمال لە ژ1 دا نوسیوێتی: " مەصرەفی چاپ کردن و سایرەی ئەوەل نوسخەی ئەم غەزەتەیە لە تەرەف ئەعزایانی دائیمی جەمعیەتی کوردستانەوە تەئمین کرا و، ئەم ئەوەل نوسخەیەی تەبەڕوکەن و مەجانەن تەوزیع و تەقدیمی برادەرانی وەتەن دەکرێ. فەقەت لەبەر ئەمە کە حکومەت پێشینەن داوای مەصرەفی چاپ کردنی ئەم غەزەتەیە ئەکات رجا و تەمەنا ئەکەین کە حەمیەتمەندانی وەتەن هەر یەکی ئابونەی 3 یا 6 مانگ پێشینەن بنێرن و بۆ قەید کردنی ناویان موراجەعەت بە موحەڕیری غەزەتە شێخ نوری ئەفەندی بفەرمون.

"ئومێد ئەکەین هەمو کوردزبانێک بە ناوی مەحەبەتی وەتەن و زمانی خۆیەوە بە ئابونە قەید بێ و بۆ کرینی ئەم غەزەتە میللیە رەغبەتی کامیلە بنوێنێ."

جگە لە ئابونە، سەرچاوەیەکی تری دارایی‌یان ئیعلان بوە، بە تایبەتی ئیعلانی دائیرەی ئیجرا و تاپۆ. رەنگە دواتر کە حکومەتی کوردستان دامەزراوە و هەواڵ و ئیرادەکانی حوکمدار لەمدا بڵاو کراونەتەوە، حکومەت کورتی بودجەکەی چارە کردبێ.

### 1. 4. نوسەرەکانی

هەڵبژاردەی ڕۆشنبیرانی ئەو سەردەمەی سلێمانی، بە وتار و شیعر لە نوسینی بانگی کوردستاندا بەشدار بون، لەوانە: شێخ نوری شێخ ساڵح، ڕەفیق حیلمی، عەلی کەمال باپیر، زێوەر، بێخود، ئەحمەد حەمدی ساحێبقران، ئەحمەد موختار جاف، ئەحمەدی فەوزی، عەبدولقادر حیشمەت، زەکی سائیب (مستەفا سائیب).

## 2. بابەتەکانی

### 2. 1. سیاسی

لە شیکردنەوەی ناوەرۆکی بابەتە سیاسیەکانیدا چەند شتێ تێبینی ئەکرێ:

### 2. 1. 1. ڕێبازی سیاسی

بانگی کوردستان ڕێبازێکی سیاسیی دیاریکراوی هەبوە. دژی ئەوە بوە کوردستان بنوسێنرێ بە عیراقەوە. هەروەها دژی ئەوە بوە بخرێتەوە ژێر دەستی تورک. لەگەڵ پێکهێنانی دەوڵەتی کوردستانی سەربەخۆ بوە، بە پشتیوانی و یارمەتی ئینگلیز.

لە ژ2 دا لە ژێر ناونیشانی (ئەڵێن هەیئەتی ناصیحە لە بەغدادەوە دێت) نوسیویێتی:

لەم ڕۆژانەدا شایعەیەک هەیە دەڵێن هەیئەتی ناصیحە لە بەغدادەوە دێت بۆ کوردستان.

1. تێ ناگەین ئەم هەیئەتە بە ئەمری کێ دێت، بە تەنسیبی چ کەسانێ ڕێک خراوە؟

2. نازانین ئەمانە کە دێن نەصیحەتی چیمان دەکەن؟

3. ئەگەر مەقسەدیان ئەمە بێ نەسیحەتمان بکەن تابیعی عیراق بین، وەختی خۆی (لام باش نیە) بێژراوە. وە فکری کوردایەتی هەتا بێت ڕەگ دادەکوتێ و (بانگی کوردستان) لەگەڵ مەعاریف بۆ تەرەقی و تەنویری کوردان سەعی و کۆشش دەکات. "ئینجا لەبەر ئەمە نازانین ئەم هەیئەتی ناصحەیە دێن چی دەڵێن"

لە ژ7 یشدا لەژێر ناونیشانی "مژدە بۆ لام باشەکان" دا نوسیویێتی:

"لەم ڕۆژانەدا شایعەیەکی غەریبی تر هەیە کە لە ئەفواهی خەواص دەوران ئەکات. دەڵێن: لە بەغدادەوە 16 زەوات تەشریف دەهێنن بۆ سلێمانی گۆیا ئیمتیازی بەعزێ مەعادینیان وەرگرتوە یاخود وەری دەگرن و، گۆیا ئەم کەسانە لە سلێمانیەدا چونکە ئوتێل، ڕیستۆران و سائیرە نیە لە ماڵی (لام باشە) کان میهمان دەبن. ئێمە ئێستا بۆ مەراسیمی خۆشئامەدی هیچ نانوسین تا بزانین ڕاستە یا نا. فەقەت ئەحوالی کوردستان بەم نەوعە، کەوا دەبینین بە موعەلەقی ماوە، مڵکی ئەم قەومە، مەعادینی مەکشوفەی بە قیمەتی ئەم میلەتە کێ دەیفرۆشێ؟ بە کێها دەدرێ؟ ئەگەر مەعادین خەڵوز و نەوتە خودا لە دوکەڵی ئەمانە ڕوڕەشی بە هیچ لایەک نەدا، ئەگەر زیو و ئاڵتونە (وتکوی بها...) ئەوانەی کە حەزی پێ دەکەن لە حوکمی ئەم ئایەتە کەریمەیە مەحفوز بن!.

ئەمە دوعای بانگە، بۆ ئەو میهمانانە تا سەری ئەم مانگە."

بەکارهێنانی ڕستەکانی لام (باشە) و (لام باش نیە) لەو دو بابەتەدا، ئیشارەتە بۆ ئەو (ئیستیفتا) یەی کاربەدەستانی ئینگلیز لەناو دانیشتوانی سلێمانیدا کردی، بۆ وەرگرتنی ڕەئی خەڵک کە ئاخۆ ئەیانەوێ ناوچەکەیان بخرێتە سەر عیراق یا نا. ئەوانەی ئەیانویست بخرێتە سەر عیراق (لام باشە) و ئەوانەی نەیانئەویست بخرێتە سەر عیراق (لام باش نیە) کە بە چاپ لە سەر کاغەز نوسرابو، ئەخستە ناو سنوقی دەنگدانەوە. لەو (ئیستیفتا) یەدا ژمارەیەکی زۆر کەم نەبێ کە بە قازانجی عیراق دەنگیان دا، ئەوانی کە هەمویان لایان باش نەبو ناوچەکەیان بخرێتە سەر عیراق.

**2. 1. 2. سەرلێشێوانی سیاسی**

لەو سەردەمەدا بیروبۆچون و هەڵوێستی سیاسیی رۆشنبیر و سەرانی کورد بەرامبەر تورک و ئینگلیز جیاواز بوە. هەندێکیان پێیان وابوە کە ئینگلیز گەورەترین و پێشکەوتوترین هێزی دنیایە ئەبێ دۆستایەتی لەگەڵ ئەو بکرێ و، هەوڵ بدرێ بە یارمەتی ئەو، کورد دەوڵەتی خۆی دابمەزرێنێ. هەندێکی تر لایان وابوە کە ئینگلیز کافرە و دوژمنی کوردە، ئەبێ پشت بە تورک ببەسترێ و پێوەندی دینی کورد بە تورکەوە ئەبەستێتەوە. بۆ گاڵتە پێ کردن بە لایەنگری تورکیان وتوە (جلخوار). هەندێکی تریش پێیان وابوە ئابوری کوردستان بەستراوە بە بەغدادەوە، لە بەر ئەوە باشتر وایە بخرێتە سەر عیراق.

(جەمعیەتی کوردستان) و (بانگی کوردستان) نەیانتوانیوە رایەکی گشتی یەکگرتو سەبارەت بە مافی نەتەوەیی کورد و هەڵبژاردنی رێگەی بە دەسهێنانی و، دیاریکردنی دۆست و دژوژمنەکانی لە ناو کوردا، یا هیچ نەبێ لە ناوچەی سلێمانیدا، دروست بکەن. جۆرێ لە سەر لێشێوان زاڵ بوە بە سەر بیروڕای خەڵکیدا. ئەم سەر لێشێوانە لەم گفتوگۆیەدا ئەخوێنینەوە کە لە ژ5 دا، لە ژێر سەردێڕی (موجادەلەی ئەفکار: ئەفکاری موتەنەویعە، حسیاتی موتەلەوینە) دا نوسیوێتی:

..."

ح: کورە نازانم بڵێم چی. ئەڵێن چوار ئەعزا بۆ مەجلیسی لیوا تەعین ئەکەن. ئەم ئەعزایانە، وەکو خەڵق ئەڵێن، ئەمان دەن بە عەرەبەکان. خۆ بە خوا ئەگەر ئەمە راست بێ شتێکی خراپە.

م: گوایە بۆچی خراپە؟

ح: لەمە خراپتر چی تر هەیە. عەرەب خۆی موحتاجی معاوەنەت و ئیرشادی یەکێکی ترە، ئێمە بدرێین بە ئەو چۆن دەبێ؟ ئیستیعارە لە موستەعیر چۆن دروستە؟ سواڵ لە سواڵکەر چۆن قابیلە؟...

م: بە خوا من بزانم بمانـدەن بە عەرەب شتێکی زۆر باشە چونکە خۆت ئەیزانی ئێمە معامەلاتی تیجاریەمان لەگەڵ ئەوانە. هەرچی توتنمان هەیە ئەچێ بۆ ئەوێ. شەکر و چا و کوتاڵیش لەوان ئەکڕین."

لەبەشێکی تری ئەم گفتوگۆیەدا نوسیوێتی:

ش: کورە نازانم بە ناخێرم ئەمساڵ نەمزانی دەستم دایە ئەو خان و دوکانانە کە تەواویان بکەم و نەجاتم بێ، کەچی لە بەر بەلادیە نە خشتی سور، نە گەچ، نە قسڵ، دەست ناکەوێ.

م: ئەحاماڵت وێران بێ! یەکێ داوای عەرەب، یەکێ بەم بستە ئەرزەوە داوای حقوقی میلیەی خۆی ئەکا، یەکێ پرۆپاغەندە بۆ تورک ئەکا، کەچی تۆ هەر لەسەر فاکوفیکی خۆتی."

س: کە هات بێ سەلام فێسەکەی لە سەری داگرت، دانیشت وتی ئەوە باسی چی ئەکەن؟

م: باسی خۆمان ئەکەین.

س: لە پاش موکالەمەیەکی زۆر وتی: باوکی باوکم ئێوە هیچ نازانن هەر لە خۆتانەوە قسە ئەکەن. ئێمە ئیسلامین. تورک دەوڵەتێکی ئیسلامە هەرچی ئەوەی خۆش نەوێ کافرە. لەسەر ئێمە وا لازمە دایمەن هەر تورکمان بوێ چونکە وەلی نیعمەتی قەدیممانن.

م: ماشەڵڵا ئەی عەرەب ئیسلام نین هەر تورک ئیسلامن خوا کە فەرمویەتی (انما المؤمنین اخوة) هەر مەقسودی تورکە نەوەڵڵا مەقسەدی عەرەبیشە.

و: لەوێوە رابورد کە گوێی لەم قسانە بو راوەستا.

س: دەوامی لەسەر قسەکانی کرد و ئەیوت: تورک میلەتێکی جەسور و ئازایە بزانە لەم رۆژانەدا چۆن سمکۆی مەحو کردەوە."

ئەم سەر لێشێوانە بەردەوام بوە تا گەڕانەوەی شێخ مەحمود. شێخ مەحمود پێش گەڕانەوەی، لە بەغداد لەگەڵ مەندوبی سامی بریتانی و لەگەڵ مەلیک فەیسەڵ دانیشتوە و گفتوگۆی کردوە. هەرچەندە تا ئێستا ئاگادارییەکی ئەوتۆ لەسەر ئەم گفتوگۆیانە لە بەر دەسدا نیە، بەڵام بێگومان ئینگلیز بۆیە ڕێگەی بە شێخ مەحمود داوە بگەڕێتەوە کوردستان بۆ ئەوەی ئاسایش بگێڕێتەوە بۆ وڵات، ئەو هێزەی تورک کە لە ڕەواندز جێگر بوبو و، دەربکا. مێجەر نۆیل لەگەڵ شێخ مەحمود هاتۆتە سلێمانی.

شێخ مەحمود بەسەر ئەو سەر لێشێوانەدا گەڕایەوە. هەردو ئۆردگای سەر بە ئینگلیز و سەر بە تورک دەوری شێخ مەحمودیان دا، هەر لایەک ئەیویست بە لای خۆیدا ڕایکێشی.

### 2. 1. 3. ئینگلیز و نەوتی کوردستان

پێ ئەچێ تێگەیشتنی سیاسی سەران و ڕۆشنبیرانی کورد لەو سەردەمەدا سادە و ساکار بوبێ. ئاگادارییەکی زۆر و قوڵیان دەربارەی کاروباری ناوچەیی و جیهانی نەبوە و، ئاگایان لێ نەبوە بریتانیا لە پشتی پەردەوە چ پیلان و تەگبیرێکی گێڕاوە بۆ دیارکردنی چارەنوسی سیاسیی کوردستان، بە تایبەتی هی کوردستانی عیراقی ئێستا کە هێشتا بە لێڵی ماوەتەوە.

مستەفا پاشا کە جەنەراڵێکی سپای تورک و، پیاوێکی دنیادیدە و، ڕۆشنبیێکی شارەزا و، ماوەیەکی درێژ لە ئەستەموڵ ژیا بو، خۆی ئامادە کردبو بۆ ئەوەی لە ژیانی سیاسیی کوردا دەورێکی کاریگەر بگێڕێ، لە ژ10 دا لە ژێر سەردێڕی: (ئینگلیس سلێمانی بۆچی دەوێ؟)، بەمجۆرە سیاسەتی بریتانی بەرامبەر بە کورد شی ئەکاتەوە:

"ئەم دەوڵەتە بە سەبەبی موڵکی ئەسڵی ئەورووپایی خۆی کە وەکو جەزایری بریتانیا بێ قەرالیەت بو، یەعنی حوکمدارێکی زۆر نامدار بو، فەقەت بە سەبەبی موستەملەکاتیەوە باخسوس لە سایەی ئیستیلای هندستانەوە کە لە هەموو خسوسەوە لە جیهاندا بە ئەوەڵێن قیتعە حسابی دەکرێ، ئیمپراتۆری یەعنی شەهنشاهی بۆ حاصل بوە. ئیستا ئەم ئیمپراتۆریە بۆ محافزەی ئەحواڵ و عەزەمەتی خۆی، هەر سیاسەتێ کە لازم بێ، هەر تەشەبوسێ کە موناسیب بێ، مەجبورە بیکا. چونکە تەئمینی محافزەی هیندستان بۆ ئەمە کە نەکەوێتە ژێر ئیحتیمالی تەهلوکە، ئینگلیز بە گژ هەمو شتێکا دەچێ، هەمو فیداکاریە دەکا. حەتا پێی مومکین بێ هەرچەند دەربەندی کۆهی قاف (کە یەعنی قەفقاسیا) و دەربەندانی شیمال و شەرقی ئەفغانستان وەکو هیرات و سائیرە بێ، هەموی بە عەسکەری ئینگلیس ئیشغال دەکا.

ئەم جێگایانە بۆ ئیحتیاجی پارە و ئینتیفاعی سائیرە نابێ، ئەم ئیحتیمالات و تەصەوراتە هەر بۆ محافەزەی عروسی هندستان، یەعنی بۆ بەقای ئیمپراتۆری ئینگلیسانە.

"سلێمانیەیش کە لە کوردستانی جنوبیدا نوقتەیەکی موهیمی سەوقەلجەیشیە، لە نەزەری ئاورووپایی و ئاسیایدا ئەهمیەتی ئینکار ناکرێ."

دوای درێژەپێدانێکی بێ هودە سەبارەت بە ڕونکردنەوەی گرنگی عیراق لە پاراستنی سەلامەتی ڕێگەی نێوان بریتانیا و هندستاندا، لە بەشێکی تری وتارەکەیدا ئەڵێ: "ئێستا کە مەعلوم بو و دەزانین تەهدید و محافەزەی عیراق بە کوردستانی جنوبیەوەیە چونکە کوردستان لە شاخی ئاگری... هەتا خانەقین، یەعنی نزیک بە جیبالی لوڕستان، هەمو ئەم شاخ و داخە کە هەمو بە قەومی کوردەوە مەسکونە، لە مەواسیمی ئەربەعەدا، هەر مەنتیقەی سلێمانیە کە بۆ عبوری صنوفی سەلاسە موساعید بێ، ئیستیلای یا خود بە هەر نەوعێکی تر بێ لە ژێر تەئسیری نفوزی ئینگلیس دا بونی بۆ ئەو قەومە لازم بینرا و، ئەغلەبی ئیحتیمال بۆ ئەمە هاتبونە سلێمانی.

"گەرچی کوردستانی جنوبی ئەوی لە دنیادا ئیستا بە قیمەتە وەکو مەعادینی نەفت، خەڵـوز و سـائیرە زۆری هەیە، فەقەت ئەڵبەتە وەکو هندستان، ئوسترالیا، ترانسڤال،... عیراق و سائیرە بـۆ ئینگلـیس فەوائیـد و مەنفەعەتی مادی و مەعنەوی نابێ. فەقەت لە بەر موتالەعاتی پێشو بۆ تەسبیت و تەحکیمی نفوزیان لە عیراق دا سلێمانی زۆر موهیمە."

ئەگەرچی لە کۆتایی وتارەکەی دا نوسـیویێتی (مـاوێتی) بەڵام باسـەکەی لەو کـاتەدا تەواو نەکـردوە. لە ژ14 دا کە دوای جیـابونەوەی لە شـێخ مەحمـود دەری کـردوە، رونتـر بۆچونەکـانی دەرئەبـڕێ و ئەنوسـێ: "مەمالیک و موستەملەکەی بریتانیا ئەوەندە زۆرە، ئەوەنـدە بە ویسـعەتە، ئینگلیـز ئیحتیـاجی ئەمـەی نیـە کـە مەسەلەن بۆ تەرفیهی ئەحوال و بۆ تەفاخوری خۆیان ئیحتیاجی بە ناردنی مەئمورین بـێ بـۆ کوردسـتان، یـا خود چاوی لە تەقوتۆقی گوێزی هەورامان وە یا حەسرەتکێشی دوکەڵی توتنی خەڵقی بەبـان بێـت! فەقەت ئەم حکومەتە حەز بە دراوسێ یەک، بە ئاشنایەک دەکا کە بە قسەی بەدخواهانی خۆی فریفتە نەبن..."

ئەو قسانە نیشانەی ئەوپەڕی بێ ئاگایین لە روداوەکانی ئەو رۆژگارە. لە ساڵانی جەنگ دا بریتانیـا و فەرەنسا و روسیا بە نهێنی رێککەوتبون میراتیەکانی دەوڵەتی عوسمانی لەناو خۆیاندا دابەش بکەن. سایکس (نوێنەری ئینگلیز)، پیکۆ (نوێنەری فەرەنسا)، سازانۆف (نوێنەری روسیا) دوای زنجیرەیەک گفتوگۆی نهێنـی گەیشتنە رێککەوتنێک کە لە مێژودا بە (رێککەوتنی سایکس- پیکۆ) ناسراوە، بـۆ دابەشـکردنی میراتیەکـانی دەوڵەتی عوسمانی. لەو دابەشکردنەدا بەشی زۆری کوردسـتانی تورکیـای ئێسـتا بەر روسـیا و، کوردسـتانی عیراقی ئێستا بەر فەرەنسا و، شام و فەلەستین بەر ئینگلیز کەوت بو.

ساڵی 1917 کە شۆڕشی ئۆکتۆبەر لە روسیا سەرکەوت، هەمو ئەو سەودا و پەیمـان و رێککەوتنانـەی روسیای قەیسەری بە نهێنی لەگەڵ دەوڵەتانی تر دژی میلەتان کردبونی، لینین ئاشـکرای کـردن و دەسـتی لـە هەمو دەسکەوتەکانی روسیا هەڵگرت.

لە ناو ئەو رێکەوتنانەدا رێکەوتنی سایکس-_ پیکۆ بو کە لینین ئاشکرای کردو، دەستی لە بەشـەکەی روسیا هەڵگرت و، گەلانی دنیای ئاگادار کرد کە دەوڵەتانی ئیمپریالیستی چۆن بە نهێنی پیلانیان لێ ئەگێڕن.

دوای بڕانەوەی جەنگ کە دەوڵەتە براوەکان کۆبـونەوە بـۆ دابەشـکردنی دەسـکەوتەکان، لەبەر ئەوەی ئینگلیز گرنگیی نەوتی کوردستانی خواروی ئەزانـی، لە کۆبـونەوەیەکی هاوبەشـی سـەروەزیرانی فەرەنسـی کلیمانسۆ و، سەروەزیرانی بریتانی لوید جۆرج دا، لوید جۆرج توانی کلیمانسۆ هەڵخەڵەتێنێ، شام و ویلایەتـی موسڵیان بە یەک گۆڕیەوە. شام درا بە فەرەنسا، ولایەتی موسـڵ یـش، کە بەشـی زۆری کوردسـتانی عیراقـی ئێستای بە کەرکوکەوە ئەگرتەوە، درا بە ئینگلیز.

لەو کاتەدا کە مستافا پاشا ئەو وتارانەی نوسیوە، ئەم باسانە هیچیان نهێنـی نەبـون، بەڵکـو هەمویـان ئاشکرا بون، رۆژنامەکانی ئەو سەردەمە بە ئاشکرا هەرای زۆریان لە سەر ناوەتەوە. تەنانەت جەمال پاشا (کە عەرەب بە السفاح ناوی ئەبەن) بۆ ئەوەی شەریف حسێن لە شۆڕش دژی تورک و لە هاوکاری لەگەڵ ئینگلیـز پەشیمان بکاتەوە، وێنەیەکی ئەم رێککەوتننامەیەی بۆ ناردوە.

### 2. 1. 4. ئینگلیز و چارەنوسی کوردستان

لە ئەنجامی شۆڕشی بیست (ثورە العشرین) دا، ئینگلیز هەندێ گۆڕینی لە سیاسـەتی خـۆیدا کـرد. لە جێی کۆلۆنێل ویلسن، حاکمی عامی عیـراق، سـێر پێرسـی کۆکسـی نـارد. کـۆکس، (عبـدالرحمن النقیـب) ی راسـپارد کە وەزارەتێکـی خۆمـاڵی لە کەسـایەتیە ناسـراوەکانی عیـراق پێـک بهێنـێ. نەقیـب وەزارەتەکەی

دامەزراند. سنوری ئەم وەزارەتە هەمو عیراقی ئەگرتەوە، بەڵام لەبەر ئەوەی هەلومەرجی سلێمانی نائاسایی بـو، وە لەو ئیستیفتایەدا کە کرا دانیشتوانی سلێمانی بە (لام باش نیە) وەڵامیان دابوەوە، بەڕێوەبردنی کاروبـاری سلێمانی لە ژێر سەرپەرشتیی ڕاستەوخۆی حاکمی عامی عیراق و دواتر مەندوبی سامیدا مایەوە. بە تـایبەتی چونکە لەو کاتەدا پەیمانی سیڤەر هێشتا نە مرد بو.

لە کۆنفرەنسی قاهیرەدا کە کاربەدەستانی ئینگلیز، بۆ بڕیاردانی چارەنوسی ناوچە داگیرکراوەکـان، لە شوباتی 1921 دا بەستیان و، چەرچل وەزیری کاروباری کۆلۆنیەکـان خـۆی سەرپەرشـتی کـرد و نـوێنەری عیراق ئامادەی بو، بڕیـار درا ئەمیـر فەیسـەڵ بکـرێ بە مەلیکـی ئەو عیـراقەی کە لەو کـاتەدا عەبـدوڕەحمان ئەلنەقیب سـەرۆوەزیرانی بـو. ئینگلیـز لە ولایەتەکـانی بەغـداد و بەسـرا و موسـل پێکـی هێنـا بـو. هەر لەو کۆنفرەنسەدا بڕیار درا عیراق بۆ پاراستنی خۆی (جەیش) دابمەزرێنێ. ئەگەرچی چارەنوسی کوردیش یەکـێ بو لەو مەسەلانەی باس کـرا، بەڵام بیـروڕای چەرچـل لەگەڵ کـۆکس و کاربەدەسـتە ئینگلیزەکـانی تـر کە لە عیراقەوە چوبون بۆ بەشداری لە گفتوگۆکانی کۆنفرەنس دا یەک نەبو، لە بەر ئەوە چارەنوسی کورد بە لێڵـی مایەوە.

تورک لە سەر ولایەتی موسل لەگەڵ ئینگلیز نـاکوک بـو. لەبەر ئەوەی موسـل بە شـەڕ و لە سـەردەمی جەنگدا نەگیرابو، بەڵکو ئینگلیز دوای راگرتنـی جـەنگ داگیـری کربـو، تـورک داوای ئەکـرد بـدرێتەوە بە تورکیا. ئینگلیزیش ئەیویست لە دەستی خۆیدا بمێنێتەوە و ببێ بە بەشێ لە دەوڵەتی تازە دامەزراوی عیراق. کاتێ شـەڕ لە نێـوان شـێخ مەحمـود و ئینگلیـزدا هەڵگیرسـا و شـێخ دور خـرایەوە بـۆ هندسـتان، بەشـێ لە چەکدارەکانی عەشیرەتەکانی کورد خۆیان بە دەستەوە نەدا، درێژەیان دا بە شـەڕی پـارتیزانی دژی ئینگلیـز. تورک ویستی کەڵک لەم ناکۆکیە وەربگرێ. لە سەر داوای هەندێ لە سەرانی عەشایەری کورد، مەفرەزەیەکیـان نارد بۆ ڕەواندز. هاتنی ئەم مەفرەزەیە ورەی دوژمنەکانی ئینگلیزی بەرز کردەوە و، چالاکیـیان زیـادی کـرد. لە چەند جێگایەک ئەفسەرانی ئینگلیز کوژران. لە چەنـد جێگـایەک لە شـەڕدا شـکان. ئـارامی و ئاسـایش لە ناوچەکەدا نەما. بۆ ئارامکردنەوەی ناوچەکە و دەرکردنی مەفـرەزەکەی تـورک، ئینگلیـز بیـری لە هێنـانەوەی شێخ مەحمود کردەوە.

ئەم کارەیان بە چەند قۆناغێ ئەنجامدا. لە بانگی کوردستاندا ئەمە بە باشی ئەبینرێ. لە پـێشدا شـێخ مەحمودیان لە هیندستانەوە هێنایە کوێت. چەند مانگێ لەوێ گلیان دایەوە. ڕێگەیان بە شێخ قادری برای شـێخ مەحمود دا کە لە بەغداد دەس بەسەر بو، بگەڕێتەوە بۆ کوردستان. لە سەرەتادا بۆ گوندی داریکەلی ئینجا بـۆ سلێمانی. شێخ مەحمودیشیان لە کوێتەوە هێنایە بەغداد.

بانگی کوردستان لە ژ3 دا بە تورکی هەواڵی گەیشتنی شێخ قادری لە بەغدادەوە بۆ گوندی داریکەلی نزیک شاری سلێمانی بڵاو کردۆتەوە.

لە ژ5 دا بە کوردی هەواڵی هاتنی شێخ قادری بۆ شاری سلێمانی نوسیوە.

لە ژ7 دا نوسیوێتی:

"صورەتی تەلغەرافنامەی کە جەنابی شێخ عەبدولکەریم ئەفەندی بۆ خدمەت جەنابی جەلالەتمەئاب شـێخ عەبدولقادر ئەفەندی ناردوە:

" بۆ جەنابی شێخ عەبدولکەریم

"یەومی چوارشەمبە لە کفری 13 ی ئەیلولی 338

ئەمرۆ شێخ مەحمود و شێخ غەریب دەگەنە بەغداد بە ئەوەلین فرصەت بۆ کفری حەرەکەت دەکەن، بەڵام لە پێش بزوتن بۆ بەعزێ ئیش لازمە مەنـدوب ئەلسـامی مشـاوەرەی لەگەڵ بکـات. هەتـا خەبەری ترتـان بـۆ

ئەنێرم ئینتیزاریتان لە کفری پێویستە. هەچ وەختێک شێخ مەحمود بۆ کفری حەرەکەت دەکات، خەبەرتـان بـۆ ئەنێرم. حاکمی سیاسی مێجەر گۆلد سمیس"

لە ژ5 دا هەواڵێکی لە ژێر سەردێڕی: (تەبشیرات، 9 ی موحەرەمی 1341) دا بەمجۆرە بڵاوکردۆتەوە:

"بۆ موقەرەراتی کوردستان مودەتێکە جەنابی حاکمی سیاسـی سـلێمانی لەگەڵ مەنـدوبی سـامی و، ئەم زاتەیش لەگەڵ لۆندەرە مەشغوڵی موخابەرەن.

جەنابی مەندوبی سامی ئێستا جەنابی گۆلد سمیسی مەئزون و مفەوز فەرموە:

"کە بە عومومی ئەهلی سلێمانی خەبەر بدات عەن قەریب مەیدانیان دەدرێـت بـۆ حەل کردنـی مەسـئەلەی تەشکیل کردنی حکومەتێک بۆ کوردستان، یەعنی بە سەربەستی فکری خۆیان دەرمیان بـکەن و، بـۆ حصـولی ئەم نیەتە خێرە جەنابی مەندوبی سامی لەگەڵ حکومەتی ئینگلتەرە خەریکی موخابەرەیە تاکو تەرتیبێکی باش دابنرێت و لەم رۆژانەدا بە ئەهالی تەبلیغ و تەقدیم دەکرێت.

"جەنابی شێخ مەحمود ئەفەندی لەگەڵ شێخ محەمەد غەریب ئەفەندی لە کـوێتەوە بـۆ بەغـداد نەقلیـان لە تەرەف حکومەتی موفەخەمەی بریتانیاوە موساعەدە کراوە. بانگی کوردستان"

لە ژ6 دا لە ژێر سەردێڕی (ئیعلانی رەسمی) دا شێخ قادر ئەم هەواڵەی بڵاوکردۆتەوە:

"مەعلومتان بێ کوردستان رۆژی لێ بوەوە. حکومەتی بریتانیـا لە مەمـالیکی خۆیـا ئیعلانـی کـردوە بە قەراری ئەوروپا ئیدارەی موستەقیلەی کوردستان تەودیـع بە جەنـابی شـێخ مەحمودیـان کـردوە و، بە نیـابەت جەنابی شێخ قادر ئەفەندی تەعیین کردوە. وە بۆ تەحکیمی حـدود کە کفـری و کەرکـوک و هەولێـر تەسـبیت کراوە. بۆ ئەمە هەمو کوردێ لازمە شادی و ئیعلانی ئازادی بکا. عەبدولقادر"

لە ژ13 دا لە بەیانێکدا کە (ریاسەتی ئەمنیەتی عومومیە) نوسیوێتی:

"... هەتاکو جەنابی مەنـدوبی سـامی دەوڵەتـی فەخـیمەی بریتانیـا کە لە بەغـدادە، هەروەکـو وەعـدی فەرموە، موافیقی خەریتە عمومی لیوا و قەزایانی کوردستان ئیلحاق ئەفەرموێت، ئەوسـا بە ئیـرادەی حەزرەتـی حوکمدار، دامە شەوکەتوهو، لە کەرکوک و ئەربیل و زاخۆ و عەقرە و عەمادیە و دهۆک و سەلاحیە و خانەقین و سایری بیلادی کوردستان، ریجالی موحتەرەمە دەعوەت و تەشکیلاتێکی دایمی ئیجرا ئەکرێ..."

ئەم هەواڵانە کە بۆ کورد خۆش و شادی هێنەر بون، هەندێکیان گەشبینییەکی بێ بناغەیان تێدایە. بۆ نمونە ئەوەی لە بەیانەکەی (ریاسەتی ئەمنیەتی عومومیە) دا باس کـراوە، هەرگیـز و لە هـیچ بەڵگەیەکـی بریتانیدا باس نەکراوە. تەنانەت ئەو هەواڵانەی بانگی کوردسـتان بە زمـانی کاربەدەسـتانی ئینگلیـزەوە بـڵاوی کردونـەتەوە، هەمویـان خۆیـان دایـان رشـتونەتەوە. هـیچ کامێکیـان تەرجـومەی وردی دەقە ئینگلیزیەکەی نیە.

### 2. 2. پەروەردە و فێرکردن

یەکێ لە داواکانی هەمو رۆشنبیرانی ئەو سەردەمە، کردنەوەی خوێندنگە و بڵاوکردنەوەی خوێنـدەواری بوە.

لە ژ2 دا زەکی سائیب (مستەفا سائیب) لەسەر (مەسئەلەی مەکتەب کردنەوە) ی نوسیوە. پێ ئەچـێ لەو کاتەدا تەنیا پۆلی یەکەمی ناوەندی هەبوبێ، لەبەر ئەوە کەسوکاری خوێنـدکارەکان بڕیاریـان داوە بـۆ درێـژە پێدانی خوێندن منداڵەکانیان بنێرن بۆ بەغداد. زەکی باسی تەجروبەی خۆی و هاورێکانی ئەکا لە کەرکوک و، بە توندی ئەچێ بە گژ ئەو بیرەدا و، داوا ئەکا حکومەت بە یارمەتی خەڵک لە سلێمانی پۆلی نـوێی ناوەنـدی بکاتەوە، بۆ ئەوەی خەڵک ناچار نەبن منداڵەکانیان بنێرن بۆ شوێنانی دور لە سلێمانی.

له ژ5 دا عەلــی کەمــال (تەربــیەی ئەولاد) دوای ئەوەی باســی دواکەوتــویی پرۆگرامــی خوێنــدنی مزگەوتەکان ئەکا، گلەیی لەو باوکانە ئەکا کە یارمەتی منداڵەکانیان نادەن خوێندن تەواو بکەن و بۆ خوێنـدنی بەرزتر بچنە وڵاتان. لە کۆتایی وتارەکەیدا نوسیوێتی:

"لە ئەم مەعروزاتە سوئی تەفاهوم حاصل نەبێ، بەندە هـیچ وەقتــێ نـاڵێم خوانەخواسـتە تەحصـیلی مـزگەوت خراپە، فەقەت لام وایە لە مزگەوتانیش دا بۆ ئەمەی کە تەلەبەکانمان تەحصیلێکی باش و موختەصەر ببیـنن، ئوصـولی جەدیدەیش تەعقیب بکرێ و، وەکو لە میصردا لە جامیعەی ئەزهەریدا تەحصیل دەکرێ، تەحصـیلی ئوصـولی عەرەبـیە و دینیەیش دیسان وا تەدریس بکرێ، وە یا خود ساڵێ دو سێ فەقێی زیـرەک و گەنـج بـۆ ئیکمـالی تەحصـیل بـۆ میصر بۆ جامیعی ئەزهەری بنێررێ تا لە کوردستان دا عولەمای بافکر و موتەفەنین زۆر بێ."

هەوڵی دڵسۆزانی خوێندن و پەروەردە سەری نەگرتوە تا شێخ مەحمود گەڕاوەتەوە سلێمانی و کابینەی حکومەتەکەی دروست کردوە، مستەفا پاشـا لەو کـابینەیەدا بـوە بە رەئیسـی مەعـاریف (وەزیـری پەروەردە)، ئەوسا چوار خوێندنگە دامەزرێنراوە.

لە ژ13 دا لە ژێر سەرناوی (حەزرەتی حوکمداری مەعاریفپەروەر) دا نوسیوێتی:

"... حەزرەتی حوکمدار وەک بۆ دەوایری تر ئیرادەی فەرمو بو، بۆ مەعاریفیش تەشـکیلاتێکی چـاک و موستەعجلی ئیرادە کرد بو. لەسەر ئەمە لە تەرەف ریاسەتی مەعاریفی کوردستانەوە لە نەفسی سـلێمانیدا لە ژێر ئیدارەی مودیر رەفیق حیلمی ئەفەندی، کە حەقیقەتەن لە ئەزکیای شوبانی وەتەنە، مەکتەبێکی ئەعـدادی 7 صنفی (3 صنفی روشدیەیە) بە ناوی موبارەکی حەزرەتی حوکمدار یەعنـی (ئەعـدادی مەحمـودی) و مەکتەبـی روشدیەیەکی جوێ بە ناوی جەنابی سپەهسالار شێخ عەبدولقادر ئەفەندیەوە یەعنی (روشـدیەی قـادریە) و دو مەکتەبی ئیبتیدائی بە ناوی مەخدومانی حەزرەتی حوکمدارەوە (رەئوفیە) و (لەتیفیە) تەشکیل و بەو نەوعەیش بۆ نام نرانیان موساعەدە فەرمورا..."

**2. 3. ئەدەبی**

بابەتە ئەدەبیەکانی بە زۆری شیعرن.

زێوەر 3 شیعری تێدا بڵاوکردۆتەوە:

لە ژ1 دا (موبارەک بادی) کە پیرۆزباییە لە دەرچونی بانگی کوردستان و،

لە ژ9 دا شیعرە نیشتمانیەکەی (ئەی وەتەن چەند خۆشەویسـتی رۆحـی شـیرینی منـی) کە کـراوە بە سرودی خوێندنگاکان و،

لە ژ11 دا (حیکایەتی مەنزومە) کە باسی گەندەڵی بەڕێـوەبەرایەتی سـەردەمی عوسـمانی و خراپـی کاربەدەستەکانیان ئەکا.

رەفیق حیلمی 2 شیعری تێدا بڵاوکردۆتەوە:

لە ژ1 دا بە فارسی پیرۆزبایی دەرچونی بانگی کوردستان ئەکا،

لە ژ2 دا شیعرێکی نیشتمانی بە کوردی بە ناونیشانی (بۆ کوردان) نوسیوە.

ئەحمەد موختار جاف 2 شیعری تێدا بڵاوکردۆتەوە:

لە ژ3 دا بە کوردی و

لە ژ4 دا بە فارسی، هەر دو شیعری بە بۆنەی دەرچونی بانگی کوردستانەوە نوسیوە.

بێخود لە دوای ئاڵۆزانی هەلومەرجی سلێمانی چۆتە کەرکوک دانیشتوە. بەڵام کە هەواڵی گەڕانەوەی شێخ مەحمود بڵاوئەبێتەوە، ئەگەڕێتەوە سلێمانی.ئەمیش 2 شیعری تێدا بڵاوکردۆتەوە:

لە ژ6 دا شیعرێکی بۆ شێخ مەحمود داناوە کە لەو کاتەدا لە کوێت دەسبەسەر بوە. لە سەرەتاکەیدا ئەڵێ:

عومرێکە سیەهرۆژ و پەرێشانی کووەیتم
ئاشوفتە وەکو توڕڕەیی خوبانی کووەیتم
لە جێیەکی تردا ئەڵێ:
خەڵقینە لە بەر گەوهەری تاجی سەری کوردە
قوربانی موحیتی عەرەبستانی کووەیتم

لە ژ8 یش دا شیعرێکی تری بە فارسی لە ستایشی پێغەمبەردا نوسیوە.

م. نوری لە ژ3 دا شیعرێکی بە فارسی بۆ بانگی کوردستان،
فایەق زێوەر لە ژ7 دا لە سەر مەعاریف،
عەلی کەمال لە ژ8 دا شیعرێکی لە ستایشی شێخ قادری حەفیدا،
عەبدولقادر حیشمەت لە ژ2 دا شیعرێکی بۆ پیرۆزبایی بانگی کوردستان،

ئەمیر لە ژ13 دا شیعرێکی تورکی بڵاوکردۆتەوە. جگە لەمانە چەند شیعرێکی تێدایە ناوی شاعیرەکەی نەنوسراوە.

لە ژ8 دا ئەحمەد فەوزی (خوش امدی حضرت شێخ مەحمود دام اجلاله)، شیعرێکی نوسیوە، لە سەرەتاکەی دا ئەڵێ:

شوکرەن لیللا، مژدە بێ وا نوری ئیمان هاتەوە
ئەرشەدی ئەولادی حەیدەر، شێری یەزدان هاتەوە
لە کۆتاییدا ئەڵێ:
جەژنی کوردستانە قوربان، مەوقعی قوربانیە
چۆن بە قوربانی نەبم وا فەخری کوردان هاتەوە

ناوەرۆکی ئەم شیعرانە بە گشتی نیشتمانی و پەروەردەیی و، هاندەرانەن. بابەتی زۆریان پیرۆزبایی کردنە لە دەرچونی غەزەتەکە و، دەربڕینی خۆشیە بە بۆنەی گەڕانەوەی شێخ مەحمودەوە. بە کێشی کۆنی کلاسیکی عروز هۆنراونەتەوە. ناوەرۆکەکانیان دوبارەن، پڕن لە وشەی ناقۆڵای بێگانە. زۆریان نرخێکی ئەدەبی ئەوتۆیان نیە. بەڵام لە روی سیاسیەوە بە بەشێ لە بانگەوازی هوشیاری نەتەوەیی دائەنرێن.

جگە لەم شاعیرانە، مستەفا پاشا خۆیشی جار و بار شیعرەکانی خۆی تێدا بڵاوکردۆتەوە. شیعرەکانی یاملکی ئەگەرچی دو بەیتن و بە ناوەرۆک پێشکەوتنخوازن و، بە مەبەستی هاندانی کورد دایناون، بەڵام لە روی هونەریەوە سەرکەوتو نین و، بە زۆری لە دروشمی خۆپیشاندان و کۆبونەوە ئەچن.

### 2. 4. بابەتی جۆراوجۆر

ئەو چاپخانە پچوکەی کە لە سلێمانیدا هەبوە فریای دابینکردنی هەمو پێویستیە رۆشنبیریەکانی نەکەوتوە. لەبەر ئەوە م. نوری لە ژ3 دا وتارێکی درێژی لەسەر گرنگی (ماکینەی چاپ) نوسیوە و لە کۆتاییدا ئەڵێ:

"لازمە لە تەرەف غیرەتمەندانی مـوحتەرەمی وەتەنەوە بـۆ هێنـان و کڕینـی مـاکینەیەکی چـاپ قسـور نەکرێ. لە حەمیەتمەندانی ئەهالی موحتەرەمەی کوردستان وا ئومێد دەکەم بە ناوی مەنفەعەتی میلەتەوە هـیمەت بۆ هێنانی ئەم ماکینەیە بکرێ. ئەمەیش تەکلیفێکی ئەوەندە گران نیە کە لە هەمـو کەس هەڵنەسـێ. بەنـدە بـۆ ئەم ئیشە خێرە دەلالەت و تەشەبوس ئەکەم هەر کەس بە قەدەری ئیقتیدار و هیمەتی خۆی معاوەنەت بفەرمون بە ناوی میلیەت و کوردیەتەوە ئیستیراحام ئەکەم".

ئەم وتارە زەمینەی خـۆش کـردوە بـۆ ئەوەی لە نـاو ڕۆشـنبیران و بازرگـان و پیشـەکار و سـەرانی خێڵەکاندا، دەس بکەن بە کۆکردنەوەی پیتاک بۆ کڕینی چاپخانەیەکی نوێ و گەورەتر لەوەی هەبوە.

## 3. نرخی بەڵگەیی

بانگی کوردستان تۆمارێکی باوەڕپێکراو و دەستی یەکەمی چەندین ڕوداوی گرنگ و بەڵگەی مێژوییە، کە سەرچاوەیەکی بە نرخن بۆ لێکۆڵینەوەی مێژوی کورد و عیراق لەو قوناغەدا. بۆ کەسـێ بـیەوێ لە مێـژوی سیاسی ئەو قۆناغە بکۆڵێتەوە، بەڵگەکانی ناو بـانگی کوردسـتان بـۆ بەراورد کردنـی لەگەڵ بەڵگەکـانی نـاو ئارشیفی بریتانیا و ناو ئارشیفی عیراق، تۆمارێکی یەکجار بە سودن، لەوانە:

### 3. 1. جەمعیەتی کوردستان

لە ژ1 ی‌دا باسی دامەزراندنی جەمعیەتی کوردستان و کۆبونەوە بۆ هەڵبژاردنی دەسـتەی بەڕێـوەبەری، بەم جۆرە تۆمار کردوە:

"جەمعیەتی کوردستان

"لە سەر موراجەعەتی جەنابی سەعادەتمەئاب حاجی مستەفا پاشای میر لیوا ئەرکان حەربـی موتەقاعیـد و، لە سەر مەئزونیەت و موساعەدەی ڕەسمی حکومەتی سیاسی سلێمانی لە تەرەف بەعزێ ئەربابی حەمـیەت و ئەفازیل و منەوەرانەوە قەرار درا کە لە سلێمانی جەمعیەتێکی کـورد تەشـکیل بکـا. بـۆ ئەمە چەنـد ڕۆژ لەمەو پێش ئەسامی عولەما و مەشایخ و ئەشراف و سائیری منەوەران و ئەهلی کەسـەبە بە تەرتیبـی حروفـی هیجـا داخلی دەفتەر کرا و ڕۆژی جومعە 21 ی تەموزی 1922 پاش نوێژی نیـوەڕۆ لە مزگەوتـی سـەید حەسـەنی مفتی‌دا گردبونەوە. لە تەرەف جەنابی مسـتەفا پاشـاوە نـوتقێکی ئیفتیتـاحی دایـر بە مەقصـەد و غـایەی ئەم ئیجتیماعە خوێنرایەوە، سامعین کە بیستیان غایەی ئەم فکرە بۆ تەرەقی و تەعالی مـیلەت و وەتەنە بە کەمـالی ئیفتیخار قبوڵیان فەرمو.

"بڵاوکـردنەوەی ئەم فکـرەیش بە واسـیتەی ئەم غەزەتەیەوە کە حکـومەت ئیمتیـازی داوە بە جەنـابی مسـتەفا پاشـا و ئێسـتا هەفتـەی جارێـک دەردەچـێ. ئومێـد وایە ئینشـائەڵا بە واسـیتەی هیمەتـی ئەربـابی حەمیەتەوە تەرەقی بکات زاتەن هەمو شتێک وردە وردە زیاد ئەکات.

"بۆ تەماشاکردنی ئەم غەزەتەیە و سائیری ئوموری ئیداری ئەم جەمعیەتە لە تەرەف حوزوری کیرامەوە لە ژێر ڕیاسەتی پاشای موشار ئیلەیهی‌دا 13 کەس بۆ ئەعزایەتی ئینتیخاب کران...

...

"ئیتر ئومێدمان وەهایە کە بۆ تەرەقـی و تەعـالی وەتەن و مـیلەت هەمـو لایەک تـێ بکۆشـین و ئەگەر قصورێک ببینرێ بە بێ ئەمەی لەم لاو لەولا بەحس و تەنقید بکرێ پیاوانە خەبەر بە جەمعیەت بدرێ تا وەکو بە پێی ئوصولی جەمعیەت ئەو مەسئەلەیە، فەورەن داخلـی مـوزاکەرە بکـرێ و نەتـیجە بە واسـیتەی غەزەتەوە ئیعلان بکرێ.

"لەم خصوصــەوە وا بــزانم لەمە زیــاتر بەســتی مەقــاڵ زائیــدە ئەمە قــانونێکی تەبیعــیە کە لە عەصــری یازدەهەمی هیجریەوە و یەعنی لەو تاریخەوە کە غەزەتە پەیدا بوە هەر قەومێ رەغبەتــی بە مەعــاریف و بە ئەم واسیتە موقەدەسە کردبێ بە تەدریجی تەرەقی کردوە و ئەگەر وەکو ئێمە مابێتەوە لەناو ئەقوامی موتەمەدینــەدا بێ نام و نیشان ماوەتەوە بینائەن عەلەیهی لە سەرمان لازمە کە بۆ تەرەقــی و تەعــالی کوردســتان رەغــبەت بەم واسیتەیە بدەین کە بۆ تەرەقی عیلم و مەعاریف فەئلی خێرە.

"باقی تۆفیق لە خودا و معاوەنەت و غیرەت لە ئەربابی حەمیەت تەمەنا دەکەین."

بەم پێیە (بانگی کوردستان) زمانی (جەمعیەتی کوردستان) بوە. بەڵام پێناچێ ئەم جەمعیەتە دەورێکــی ئەوتۆی لە ژیانی سیاسیی سلێمانیدا گێرا بێ. جگە لەو کۆبونەوەیەی کە دەســتەی بەرێــوەبەری هەڵبــژاردوە، هیچ چالاکیەکی تری بە دی ناکرێ، بە تایبەتی لە دوای کشانەوەی ئینگلیز و ئینجا گەڕانەوەی شــێخ مەحمــود، ئیتر باسی جەمعیەت لە کایەدا نەماوە.

### 3. 2. کشانەوەی ئینگلیز لە سلێمانی

لە ژ6 ی 18 ی ئەیلــولی 1922 و ژ7 ی 22 ی ئەیلــولی 1922 دا ریپۆرتــاجێکی درێــژ لە بــارەی کشانەوەی ئینگلیز و پێکهێنانی مەجلیسی میللی لە سلێمانی بەمجۆرە نوسراوە:

"بیدایەتی ئینقلاب و ئینتباە بۆ کوردان

"رۆژی 5 ی ئەیلولی 1922 سبحەینێ زو، جەنابی جەلالەتمەئاب حەفید زادە شێخ عەبدولقادر ئەفەندی، لەگەڵ ئەعزای مەجلیسی لیوا کە عیبارەت بێ لە مستەفا پاشــا، حەمە ئاغــای عەبــدورەحمان ئاغــا، عەبــدولفەتاح چەلەبی، مەجید ئەفەندی حاجی رەسوڵ ئاغا و، لە ئەشــراف ئەحــمەد بەگ تۆفیــق بەگ، بە تەزکەرە لە تەرەف حاکمی سیاسیەوە بۆ جێگای تەیارەکان کە لە کەنار شارەوە دەعوەت کران. زاتەن رۆژێــک لەوە پــێش شــەش تەیــارەی گەورە هــاتبو. ئەم زاتــانە لە ژێــر چادرێــکدا گردبــونەوە. ئەترافــی مەوقیعــی تەیــارە بە زنجیــرەی نۆبەتچی عەسکەری محافەزە کرا بــو. لە ئەهــالی مەمــلەکەت بــۆ ســەیر جەمعێکــی غەفیــر وەســتابون. لە هــیچ لایەکەوە بە قەدەر زەڕەیەک ئاساری بێ نەزاکەتی نەبو.

"حاکمی سیاسی مێجەر گۆلد سمیس متەوەجیە بە هەمومان وتی: (بیناء بە ئەمرێک، کە لە بەغدادەوە لە مەندوبی سامی وەرم گرتوە، ئێستا ســلێمانی تەخلــیە دەکەیــن. عەســکەر، پــۆلیس، ئەســلیحە، جبەخــانە، پــارە، ئەرزاق و سائیرە، هەمو لە جێی خۆیانــا تەرکمــان کــرد. بــۆ ئیــدارەی خۆتــان فکــر بــکەنەوە و، ئەمە کلیلــی خەزێنەیە تەسلیم بە کێی بکەم؟ وتی: (کێ بە رەئیسی مەجلیستان ئینتیخاب دەکەن؟ هەمو حــازرون وتیــان: (جەنابی شێخ قادر ئەفەندی ئێســتا موناســیبە، فەقەت لازمە ســاعەتی ئەوەل جەنــابی شــێخ مەحمــود ئەفەنــدی بێتەوە ئێرە، تا ئیدارەی ئومور تەئمین بکرێ.)

"لەسەر ئەمە گەلێ گفتوگۆ بو. لە تەرەف ئەعزاکان بەعــزێ ســوئال و جــواب کــرا. حــاکمی سیاســی لە جوابی هەمــودا ئەمەی وت: (وەقتــی قســە نــیە ئــێمە ئێســتا دەڕۆیــن. ئێــوە فکــری ئیــدارەی خۆتــان بــکەن. مەجلیستان هەیە. ئەعزاکان حازرن. مادام کە شێخ عەبدولقادر ئەفەندیتان بە رەئیسی مەجلیس قبــوڵ کــرد و، ئیعتیمادتان پێی هەیە بۆ ئیدارەی هەمو ئومورتان، بۆ محافەزەی ئاسایشتان، بە قەراری مەجلیس ئیش بکەن. ئێمە بە موجیبی ئەمری قەتعی کە وەرمان گرتوە هەرچی مەئموری ئینگلیزە دەبێ سلێمانی تەخلیە بکات.)

لە پاش ئەم قسانە حاکمی سیاســی خــۆی و معــاون و قومانــدانی عەســکەری ئینگلیــز لەگەڵ حــازرون ویداعیان کرد و، هەیئەت جێی تەیارەی تەرک کرد و، عەودەتیان کردەوە بــۆ شــار. لە پــاش ئەمە مەئمــورانی ئینگلیز بە تەیارە دەســتیان کــرد بە حەرەکەت. ئەم مولاقــات و خیتــامی رۆییــنی ئینگلیــزە لە ســەعات یەکــی

ڕۆژەوە هەتا سەعات شەشی ڕۆژ دەوامی کرد. فەقەت ئەم تەئەخورە بۆ ئینتیزاری هاتنی مێجەر نۆیلی حاکمی سیاسی هەڵەبجە و مەناتیقی جاف بو. کە ئەو نەهات ئەمان حەرەکەتیان کرد. ئەعزاکانی مەجلیس، لە ژێر ریاسەتی جەنابی شێخ عەبدولقادر ئەفەندیدا، هەر ئەو ڕۆژە سەعات پێنج لە دائیرەی حکومەت دا گردبونەوە، چونکە ئەمنیەت بە ئینتیزامی عەسکەرەکە بو، لە تەرەف مستەفا پاشاوە تەنبیهات و ئیختاراتی لازمە بە هەیئەتی عەسکەریە کرا. هەمو زابتان و عەسکەر، هەتا تەشەکولی حکومەتێک، لازم بو محافەزەی میلەت و وەتەن و عەلەلخسوس بۆ ئەسلیحە و جبەخانە و خەزێنە، هەمو عەهد و میساقیان کرد. بۆ شەو و ڕۆژ دەوریە و سائیرە تەرتیب کرا. هەمو ئەو ڕۆژە ئینتیزام و هیمەتی عەسکەریە و فەتانەتی زابتەکانیان مەشهودی عامە بو. وە لە داخل و ئەترافی شاردا ئاسایش محافەزە کرا.

"ڕۆژی دوەم هەمەوەند کەریمی فەتاح بەگ، محەمەد ئەمین ئاغای فەقێ قادر، لەگەڵ فەقێ محەمەدی حاجی، کە ڕەئیسی ڕشەوەندە، لەگەڵ کوڕانی کاک عەبدوڵا عەزیز خاڵە و ئەتباعیان، داخلی سلێمانی بون.

"جەنابی سیادەتمەئاب حاکمی سەنگاو، شێخ عەبدلقادری ئەفەندی و مەخدومی موحتەرەمی جەنابی شێخ مستەفا لەگەڵ ئەتباع و ئەعوانیان، لە پێشتر زاتەن واریدی سلێمانی و مەشغولی محافەزەی ئەمن و ئاسایش بوبون.

"ڕۆژی سێیەم، کە ڕۆژی جومعە بو لە بەینی بەعزێ ئەهالی دا و، بە خسوس لە ئەفواهی هەمەوەند، کە لە تەرەف ڕانیەوە هاتبونەوە، هاتنی عەسکەرێکی بێ شوماری تورک لەگەڵ تۆپ و مەترالیۆز و، سوارێکی زۆر کە لە دوکانەوە دێن بۆ سلێمانی، دەورانی دەکرد. گەرچی ئەهالی سلێمانی و هەمو کوردستان، سەبەب بە رابیتەی دینیەوە، لە ئاوازەی هاتنی ئۆردوی تورک مەمنون بونیان تەبیعیە، فەقەت شایانی تەعەجوب ئەوانەی لە موقابیلی ئەو خدمەتانە کە بویانە بۆ ئینگلیس، نایلی سەروەت و ئیکرام بون و، لە زەمانی ئینگلیزدا خۆیان بە موقەڕەبین و فیداکارانی حکومەتی بریتانیا نیشان دەدا، ئەو ڕۆژە بۆ سیتری ماسەبەقی ئەحوالی خۆیان لە میلەت، وە یا بۆ ئینتیقام لە موعاریزانیان بو ئەمانە کە ئەکرا حکومەتێکی کوردی یاخود تورکی تەشکیل بکا لەمیش دا بۆ خۆیان جێیەک بگرن، بە دەرەجەیەک خەریک بون، هەر کەس باوەڕی نەکردایە بە هاتنی 8 هەزار مەوجود پیادە و سواری و هەزاران تۆپ و مەترالیۆزی تورکی، وە یاخود بە دڵێکی ساف بیوتایە کوا لە کوێن؟ توخودا با ئێمەیش بیزانین! ئیتر ئەو بەد خواهانە، ئەو دوشمنی هەم وەتەنانە، ئەو مەنفەعەت پەرستانە، بە جوهەلایان دەوت (تەماشا کەن! فلان ئیسلامێتی ناوێ، حەز بە گاور دەکەن، بە هاتنی تورک ناکەن) و هەمفکری خۆیان بۆ ئیختیلال تەشویق دەکرد. لەو وەختەدا بو کە نوێژی جومعە بو بە ئەمری جەنابی شێخ قادر ئەفەندی، وجوهــ و ئەعیان و منەوەرانی مەملەکەت لە دەروژوری دائیرەی سیاسی دا بە ئیزدیحامێکی عەزیم ئیجتیماعیان کردبو. تەزەکوری 3 مەسئەلە دەکرا. کە بۆ ئەم مەسئەلەیە هەر کەس بە ئیجتیهادی خۆی بە نوسین یاخود بە زبان فەقەت ئاشکرا هەر فکرێ بەیان بکا قەتعەن لە یەکتری دڵگیر و دەرحەق بە یەک ئەبەدەن مەغلوبی ئەغرازی شەخسیە نەبن و، هەمو بە قەراری ئەکسەریەت تابیع ببن.. بۆ ئەمە سەد دەفعە بەقورئان و بە ئایات سوێند خورا بو، لە پێش ئەم سوێندەیش دا هەر ئەو ڕۆژە کە ئینگلیزەکان سلێمانیان تەخلیە کرد، بە قەراری مەجلیس کە چەند کەسی تر لە وجوهی مەملەکەت لە خاریجی ئەعزایانی مونەتەخەبەی میلی لە مەسلەحەت ئیحزار کرابون، تەئمیننامەیەکیان نوسی و ئیمزایان کرد، کەس لەگەڵ کەس غەرەزی شەخسی تەعقیب نەکات و صیرف بۆ مەنافیعی میلەت و وەتەن سەعی بکرێ و، لە بەینا هیچ تەحریکاتێ نەبێ.

"لە پێش شروعی ئەم موزاکەرەیەدا، جەنابی شێخ قادر ئەفەندی لەگەڵ ئیعتینا بۆ خەلافەتی ئیسلامیە دایر بە قەومیەت و میللەت، بەعزێ کەلیماتی مەعقولی بەیان فەرمو.

"ئەو 3 مەسئەلەیە کە موزاکەرە کرا ئەمانە بون:

1. تەشکیلی حکومەت بۆ کوردستان.
2. قبول و ئیستیقبال کردنی عەسکەری تورک.
3. هەر کەس دەیەوێ ئارەزوکردنی حکومەتی ئینگلیز بە سەراحەت وتن.

"ئەوانە کە لە سوێند و تەئمیناتێ کە زیکرمان کرد موشتەرەک بون، هیچیان بە سەراحەت قسـەیەکیان نەدەکرد، فەقەت بۆ ئەمە کە ئەفکاری وجوهـ و منەوەران لە نەزەر یار و ئەغیـارا مەعلـوم ببـێ و، ئەکسـەریەت بزانرێ لە تەرەف مسـتەفا پاشـاوە دەفـتەرێ تەلەب کـرا کە هەر کەس فکـر و ئیجتیهـادی خـۆی بنوسـێ تـا ئیمزاکان مەعلوم و جەمع بکرێ و ئەوی نوسین نـازانێ بە واسـیتەی موئتەمینـانێ سـەبتی دەفـتەر بکـا. ئەم تەکلیفاتە هیچ فائیدەمەنـد نەبـو. حـاکمی قەزا، رەزا بەگ کە لە زەمـانی ئینگلیـزا لە ئینتیسـاب بە جەمعیەتـی کوردستان تەحریری ئیستیعفای کردبو و، لەم رۆژانەدا یەعنی لە پاش رۆینی ئینگلیـز، بینـا لە سـەر شـایعەی هاتنی 8 هەزار عەسکەری تورک، لە نەزەری بەعزێ ئەشخاسا، خۆی زۆر بە تەرەفـداری تـورک خواهیشـگەر نیشان دەدا، هەڵسایە سەرپێ وتی: (لەسەر کاغەز بۆچی بنوسـین هـیچ کەس تەرەفـداری هـاتنەوەی ئینگلیـزە دەس هەڵبرێ بزانین). نەتیجەیەک حاصڵ نەبو.

"لە پاشا دیسان رەزا بەگ بە ئاوازێکی بڵند وتی: (کێ کوردی دەوێ دەس هەڵبـرێ) غەیـری خـۆی و چەند کەسێکی مەحـدود نەبـێ، بە جـارێ گەورە و بچـوک بە شـیدەت دەسـتیان کـرد بە ئەم ئـاوازە: (لەگەڵ خەلافەت و ئیسلامیەت مەعلومە. هەر بژی کوردستان، حکومەتی کوردستان) و بە جارێ چەپڵەیـان لـێ دا و لە حەسرەت دا ئاو لە چاویان دەهات و وتیان: (حکـومەتی میللـیمـان دەوێ، حکـومەتی کوردسـتانمان دەوێ) لە پاشا رەزا بەگ وتی: (من هێشتا سوئالم تەواو نەکردوە).

"مستەفا پاشا لەو وەقتەدا چونکە لە مەجلیس دەرچونی لازم بینی بو لە رەئیس موساعدەی تەلەب کـرد فکری خۆی بڵێ و وتی: (مادام کە لە سەر کاغەز فکر نانوسرێ، ئەکسەریەت چلۆن مەعلوم دەبـێ؟ فکـری مـن لەگەڵ رابیتەی خەلافەت و ئیسلامیەت بۆ سەلامەتی وەتەن، تەشکیلی حکومەتی میللی کوردیە، هەر کەس فکری لەم مەرکەزەدایە بە ئاشکار بیڵێ وە یا بینوسێ!) لەگەڵ ئەمە هەرچـی مـوعتەبەران و منەوەرانـی کوردسـتان و حازرون بون، غەیری 3 - 4 کەس، هەمـو بە جارێـک ئەم فکرەیـان پەسـەند و بە ئـاوازەی مەسـروریەتیانە دائیرەکەیان پڕ کرد.

"لە سەر ئەمە رەزا بەگ وتی: (ئەمانە منداڵن، بە قسەی ئەمانە چۆن دەبێ؟) مسـتەفا پاشـا لە جـوابیدا وتی: (تۆ بۆچی فکری خۆت بە موافیق قەرار نانوسی یاخود بە ئاشکار نایڵێی) دو سێیەکـی تریـان وتیـان ئەمە بە ئاشکاری نابێ بەیان بکرێ و، ئیسمی ئێمە لە سەر دەفتەر و کاغەز نـابێ بنوسـرێ. جەنـابی حەفیـد زادە سەید عەبدوڵڵا ئەفەندی هەرچەند کاغەز و دەفتەری هێنایە پێشـەوە و تەکلیفـی نوسـینی فەرمـو فایـدەی نەبو. لە ئەم ئەسنایەدا کابرایەکی روتەڵە، بە واسیتەی قومیسەر حیلمی ئەفەندیەوە تەقدیم بە مەجلیس کـرا و، وتی (قسە لە ئەم پیاوە وەرگرن زۆر موهیمە!) کابراکە وتی: (ئەوا ئێستە لەشکرێکی زۆری تورکتـاقم تـاقم، تابور تابور، پیادە و سواری گەیشتە شیوی ئاودار کە نزیکی شارە، خۆم چاوم پێکەوت. هاتوم خەبەر بدەم).

"لەسەر ئەمە جەمعیەت بڵاوبونەوە و هاتنە دەرەوە هەتـا بـزانن ئەم لەشـکرە چـیە. مسـتەفا پاشـا بـۆ محافەزەی ئاسایشی مەملەکەت و ئیتیخازی تەرتیبات بە عەسکەرەکان ئەمری کرد لە ژێر قومانـدەی زابتەکـانی خۆیان دا گرد ببنەوە هەتا مەعلوم بێ چیە. لە ئەم وەختەدا مستەفا پاشـا لە تەرەف کەریـم بەگـی فەتـاح بەگ رەئیسی هەمەوەند و ئەعوانیەوە کتوپڕ گیرا و، هەر لەو ئانەدا و لەو جێگەیەدا قۆمیسـەر حیلمـی ئەفەنـدی کە لەگەڵ چەند پۆلیسێک نزیکی کەریم بەگ بون، مستەفا پاشایان بەزۆر برد و حەپسیان کرد.

"لەسەر ئەمەی کە مستەفا پاشا حەبس کرا، وە حەبس کردنی ئەم زاتە بێ مەعلوماتی رەئیسی مەجلیسی میللی بو کە ئەسبابی لە نوسخەی ئاتیە دەبێژرێ. هەمو ئەشرافی ساحێب حەمیەت و هەمو منەوەرانی مەملەکەت، کەوتنە تەلاشەوە و، نزیک بو کە گەلێ وقوعاتی غەیر مورزیە روبدا. جەنابی شێخ عەبدولقادر ئەفەندی مودیری سەنگاو، لەگەڵ شێخ مستەفا ئەفەندی مەخدومی، جوهد و جدی کوللیان کرد. ئەلحەمدولیلا بەبێ ئەمەی کە وقوعاتێ روبدا هەر ئەو رۆژە ئێوارە بەرەڵا بو و، پاشای موشار ئیلەیهی لە بەردەم سەرادا لە تەرەف جەمعی غەفیری منەوەران و وەتەنپەروەران بە شادمانیەکی عەزیم ئیستیقبال کرا. لە پاشا هەر ئەو شەوە لە تەرەف عەسکەری و پۆلیسەوە ئینتیزام و تەرتیبێکی باش دامەزرا. مەملەکەت کەوتە حاڵی ئاسایش و سکونەوە و، ئەلحەمدولیلا ئێستا ئەحواڵ چاکە. ئەم خەبەری مستەفا پاشایە کە گەیشتە روئەسا و بەگزادەکانی جاف و پشدەر بۆ هەمویان موجیبی ئەسەف بو کە ئەمە چە موعەمایەک و چە تەحریکاتێ بوە."

لە ژ7 دا پاشماوەی ئەم ریپۆرتاجە بەمجۆرە تەواو کراوە:

"مابەعدی نوسخەی پێشو

"رۆژی چوارەم، کە رۆژی شەمە بو لە تەرەف جەنابی رەئیسی مەجلیسی میللی جەلادەتمەئاب شێخ عەبدولقادر ئەفەندییەوە بۆ خەبەر وەرگرتن لە جەنابی شێخ مەحمود ئەفەندی، لە بەر ئەوەی کە خەتی تەلەغرافی سلێمانی-چەمچەماڵ و کەرکوک تەخریب کرابو، بە ئوتومبیل جەنابی سەید ئەحمەد ئەفەندی هەنجیرە بۆ کەرکوک رەوانە کرا. ئەم زاتە چونکە لە نەزەر هەمەوەندیشەوە مەعروف و ناسراو و موحتەرەمە بە سەلامەتی گەیشتە کەرکوک.

"رۆژی شەشەم، جەنابی سەید مەحەمەد ئەفەندی رەئیسی جەباری لەگەڵ ئەتباعی خۆیان لە چەمچەماڵەوە و، جەنابی محەمەد ئاغای کوڕی عەلی ئاغای پشدەر لە قەلعەدزەوە، تەشریفیان هاتە سلێمانی. هەمویان لە تەرەف جەنابی شێخەوە مەزهەری ئیلتیفات و ئیعتزاز بون.

"رۆژی هەفتەم، کە رۆژی دوشەمە بو بەگزادەکانی هەمەوەند بە وەسیلەی ئەو مەئموریەتانەوە کە لە تەرەف جەنابی شێخەوە بۆیان تەخسیس کرابو رۆینەوە بۆ قەزای چەمچەماڵ و سورداش. ئیسم و مەئموریەتیان لە پاشا دەنوسرێ.

"رۆژی هەشتەم، جەنابی سەید ئەحمەد ئەفەندی هەنجیرە لە کەرکوک بە ئوتومبیل گەڕابوەوە بۆ سلێمانی و ئەم خەبەراتەی هێنا:

"(جەنابی شێخ مەحمود ئەفەندی لە کوێتەوە حەرەکەتی رەسمیەن تەعین کردوە و، ئینگلیسەکانیش کە لە سلێمانی رۆیون لە کەرکوک گردبونەوە و، ئاسایش و ئەمنیەتی کەرکوکی حکایە دەکرد و، ئەو قسانەی کە ئینگلیسەکان لێیان پرسی بو نەقڵی دەفەرمو."

"جەنابی شێخ عەبدولقادر ئەفەندی، بۆ رێ نەدان بە ئەحواڵی بێمەعنا و محافەزەی ئینتزامی شار، ئەمری فەرمو بو کە کەس بەسیلاحەوە بەشاردا نەگەڕێ. لەسەر ئەم ئەمرە عەسکەر لە عەشایر و ئەهالی هەر کەسێکیان بە سیلاحەوە بگرتایە سیلاحەکەیان لێ دەسەند و خەنجەریش بوایە یا دەیان شکاند یا دەیان هێنا تەسلیم بە ئامیری خۆیان دەکرد. بەم تەشەبوساتانە حەقیقەتەن ئینتزامی مەملەکەت مەشهود و بۆ بەعزێ مەقاصیدی جاهیلانە راهی فرسەت مەسدود بو.

"ساداتی بەرزنجەیش کە تەشریفیان هاتبو بۆ خزمەت جەنابی شێخ ئەوانەی کە لازم بون هەر یەکێ بە مەئموریەتی تەکلیف و تەعین کران. بۆ محافەزەی کاروان و رێگای بەغداد شێخانی تیمار و جەنابی شێخ عەبدورەحمانی دارئاغا مەئمور کران. حەقیقەتەن مەئموریەتی ئەم زاتانە بەجێ و بۆ عموم موجیبی مەسەرەت

بو. ئەم چەند شەوانە بە واسیتەی سوارانی خۆی بۆ محافەزەی ئاسایشی ئەترافی شار هیمەت و غیرەتی جەنابی شێخ مستەفا ئەفەندی کوڕی شێخ عبدولقادر ئەفەندی سەنگاو ئینکار ناکرێ.

"رۆژێک لە پاش رۆیشتنی ئینگلیسەکان لە سلێمانی، بۆ تەحقیقی شایعەی هاتنی عەسکەری تورک کە لە دەمی چەند کەسێک دا دەوەرانی دەکرد، جەلادەتمەئاب شێخ قادر ئەفەندی، عەبدوڵڵا ئاغای موعتەمەدی خۆیان بۆ تەرەفی سورداش و دوکان ناردبو. رۆژی 3 شەمبە عەودەتی کردەوە و تەکزیبی ئەو هەمو حەوادیساتە، کە بە مەقسەد، لە تەرەف بەعزێ ئەشخاسەوە تەسنیع و ئەعزام کرابو دەکرد.

"وە بینا لە غەزەتەی نەجمە لە کەرکوکەوە و غەزەتەی بەغدادیش تەخلیە کردنی سلێمانی لە تەرەف ئینگلیزەوە مەعلوم بو، کە کوردان وەقتی ئیستیفادەیان و کۆششی ئیستیقلالی میلییان هاتوە. لەبەر ئەمە بە تەنسیبی وجوە و ئەعزایانی مەجلیس وەکو بەیداغێک کە لە پێش وەقعەی جەنابی شێخ مەحمود ئەفەندی دا مەوجود بوە، هەر ئەو نەوعە ئیحزار و لە مەواقیعی لازمەدا هەڵ بدرێ. بەنابەرین رۆژی 15ی ئەیلولی 338 پاش نوێژی جومعە لە حەوشی مزگەوتی گەورەدا عەساکیری مەوجودە و شاگردان مەکتەب و ئەشراف و وجوهی ئەهالی مەملەکەت و روئەسای مەوجودەی عەشائیر، سەفبەستەی ئیحترام بون، لەژێر بەیداغەکانی میللی کوردستان کە هەڵکرابون. بەعزێ ئەدعیەی خەیریە و نوتق خوێنرایەوە و، بە ئەو ئیحترامە لەسەر دەوایری حکومەت و قشڵەی عەسکەری بەیداغەکان بە تەعزیماتێکی لازمە نەصب کران. لە پاش سەلام و دوعا جەنابی شێخ با کەمال تەعزیم و تەفخیم بۆ دەوڵەتخانەی خۆیان کە خانەی موقەدەسی حەزرەتی کاک ئەحمەد (قودس سرە) عەودەتی فەرمو. وە لە سەر ئەمەیش تۆپ ئەنداخت کرا بۆ ئیعلانی مەسروریەت لە ژێر بەیداغەکان دا لە تەرەف عەساکیرەوە، لەگەڵ عەهد و پەیمانی سەداقەت چەند دەسرێژێکی تفەنگ کرا. خودا لە کوردستانی موبارەک بکات."

## 3. 3. گەڕانەوەی شێخ مەحمود بۆ کوردستان

کە گەڕانەوەی شێخ مەحمود بۆ سلێمانی نزیک بۆتەوە، بانگی کوردستان بۆ ئەوەی هەستی هاوولاتیەکانی ببزوێنێ، لە ژ7 دا نوسیوێتی:

"لە وەقتێکا جەنابی سەعید زەغلول پاشا کە لە مەسئەلەی میللیەت لە میسر گرتیان و بە حەبسی بردیان لە پاشا کە عەودەتی کردەوە عەرەبەکان و ئەهالی میسر عومومەن چون بۆ ئیستیقبالی و بە سەر شان و سەر هەڵیان گرت بە ئەو نەوعە ئیحتیرامە داخڵی شار بو.

"حەزرەتی حوکمدار جەنابی شێخ مەحمود ئەفەندی کە لە سەر عەینەن مەسەلە گیرا و 3 ساڵ و نیوە حەبسە ئێستا تەشریف هێنانەوەی نزیکە. بزانین میلەتی کورد بە چ نەوعێک ئیستیقبالی ئەکەن؟ ئیحتیرامی ئەگرن؟ و لە حەقی موشار ئیلەیهی بە چ حیس و حورمەتێک خۆیان نیشان ئەدەن؟"

بە بۆنەی گەڕانەوەی شێخ مەحمود بۆ سلێمانی ژ9 ی 8 ی تشرینی ئەوەلی 1922 ئەم ریپۆرتاجەی بە بێ ناونیشان نوسیوە:

"رۆژی 16ی ئەیلولی 1922 لە ئەفواهی ناس دا دەبێژرا کە لە سلێمانی دا وەکو لە زەمانی ئەوەلی حوکمداریی حەزرەتی شێخ دا بو، لە موخالیفان جەمعیەتێکی خەفیە کە تەشەکولی کردوە، ئەم بەیداخانە کە هەڵواسراوە دەیهێننە خوارەوە و خۆیان بەیداخێکی مەخصوص لە جێگای ئەوان هەڵواسن و، گۆیا بە واسیتەی قوەتێکەوە کە دێت لە شاردا بەعزێ زەواتی مەعروفە و منەوەرە ئیتلاف دەکەن و، عەسکەری تورکیش گۆیا ئالای، فیرقە فیرقە، لە دوکان لە ئاوی زێ پەڕیونەوە بۆ بەری سورداش (کە لە سلێمانیەوە 10 سەعات دورە) حەتا جەمعیەتێکی مەخصوصەیش کە لە مێژە مەشغوڵی سنعەتی پروپاگەندە

(یەعنی فڕوفێڵ) بو بۆ ئیستیقبالی قوماندانی عەسکەری تورک کە ناوی خۆی ناوە (ئویزدەمیر پاشا) نێرراوە و، حەتا بۆ سواربونیشی ئەسپێکی زۆر چاک (فەقەت نەوەکو لە ماڵی موستەقبیلەکان بێ، بە ئەمانەتی لە غەیرە خوازراوە) ڕەوانەکرابو، وە دەیانوت بۆ دەعوەت بەناوی ئەهلی سلێمانیەوە زۆر کاغەز تەسنیع و تەرتیب و بەدزیەوە بۆ جانیبی ئەو ئوزدەمیرە کە لە ئەم کاغەزانە و لە ئەم ئیستیقبال و دەعوەتانە غەیری ئەو کەسانی مەزکورەلئەحوال لە ئەوەڵا کەسی تر خەبەردار نەبو. لە ئەفواهی ناس دا شایعە هەبو گوایە لەگەڵ ئەم ئیستیقبال و دەعوەتە (لیستە) یەعنی دەفتەرێک کە ناوی زۆر کەسانی موستەحەق بەکوشتن یا بە ماڵ تاڵان کردن یا بە حەبسی پازدە ساڵی مەحکوم کردن تێدا نوسرابو. دەبێژرا ئەم ڕۆژە و ڕۆژی 17ی ئەیلولی 922 بەم نەوعە شایعاتە و، بۆ قسە بردن و درۆ و دەلەسە ڕێکخستن فڕکوهوڕی دایمی ئەو معهودانە بۆ ماڵان وا دەوامی دەکرد کەسێ کە لە قەدیمەوە بەم عادەتە فێر نەبوبێ و نەی دیبێ غەیرەز ئەمە کە (یا ستار) بخوێنێ شتی تری بە خاتردا نەدەهات.

"لەتەرەف وەزیفەداران و بیلخسوس بە واسیتەی سوارەکانی جەنابی سیادەتمەئاب شێخ مستەفا ئەفەندی مەخدومی شێخ عەبدولقادر ئەفەندی سەنگاو و، ڕەشادەت و سیادەتمەئاب شێخ عەبدولکەریم ئەفەندی زادە شێخ محەمەد ئەفەندی و، جەنابی شێخ عەبدوڕەحمانی دارا ئاغا، ئاسایش داخلی ئەترافی شار محافەزە دەکرا.

"فەقەت لەبەر ئەم تەسنیعانە، یەعنی هەڵبەستنی درۆ و دەلەسە و تەزویراتی مەعلومە لە داخلی شاردا با خسوس ئەربابی سەروەت ئەمنیەتی دڵیان نەمابو و، بۆ قایم کردنی شتومەکیان بە دزیەوە خەریک بون. فەسوبحانەڵا! لە چ زەمانێکاین؟ بە زاهیری ئیفتیخار بە ئیسلامیەت و مەردی دەکەین، لەبەر ئیختیلافی ئەفکارێکی بێ ئەهمیەت، برای دینی لە برای دینی ئەمنیەتی نەماوە و، لە موقابیل یەکتری مەشغوڵی تەرتیباتی دوشمنانەین.

"شەوی 3 شەمە، 12ی ئەیلولی 922 بینا بە ئیرادەیەک کە لە تەرەفی ئەشرەف جەنابی جەلادەتمەئاب حەزرەتی حکومداری کوردستان، شێخ مەحمود، (دامە شەوکەتوهو) گەیشتبو، حەزرەتی شێخ قادر ئەفەندی، مستەفا پاشا و جەنابان عوسمان پاشا زادە عیزەت بەگ و، عەبدولڕەحمان ئاغا زادە محەمەد ئاغا و، تۆفیق بەگ زادە ئەحمەد بەگی، بۆ مولاقات و ئیستیقبالی حەزرەتی حوکمدار بە ئوتومبیل بە ڕێگای چەمچەماڵ و کەرکوک دا ڕەوانەی کردن بۆ سەلاحیە.

"ئەو جەمعیەتە خەفیەیە کە لەمەوپێش بەحسمان کرد گۆیا لەبەر ئەمە کە خەبەریان بیست حەزرەتی حوکمدار شێخ مەحمود لە بەغداد حەرەکەتی فەرموە و عەنقەریب تشریف ئەهێنێتەوە بۆ سلێمانی، هەرچەند سێ چوار ڕۆژ بێدەنگ بون و لە درۆکردن بە زاهیری فەراغەتیان کرد، فەقەت ڕۆژی 24 ی ئەیلول چونکە حەرەکەت فەرمونی حەزرەتی حوکمدار مەعلوم نەبو و ئەو زەواتانەش بە ئەمر چو بون بۆ سەلاحیە نەهاتنەوە، ئەو جەمعیەتە خەفیەیە دوبارە شایعەیان خستە شارەوە کە گۆیا ئەم هەیئەتە کە لە سلێمانیەوە بۆ مولاقات و ئیستیقبالی حەزرەتی حکومدار چون بۆ کفری، بردویانن بۆ بەغداد و بەعزێ دەیان وت حەبسیان کردون.

"وە بەناو بازاڕدا چەند کاغەزێکیان بڵاوکردەوە کە گۆیا ئەم کاغەزە لە تەرەف قوماندانی عەسکەری تورکەوە بۆ ئەشراف و موعتەبەرانی سلێمانی نوسراوە، کە هیچ خەوف نەکەن هەمو ئیسلامن و تورکیش ئیسلامە بچن ئیستیقبالیان بکەن و مەزبەتەیان بدەنێ بیانهێنن بۆ سلێمانی و لە سورەتی کاغەزێکدا کە ئەو قوماندانی تورکە بۆ جەنابی عەباس ئاغای مەحمود ئاغای ڕەئیسی پشدەری نوسی بو تێی دا بەیان کرا بو کە ئەگەر ئەهالی سلێمانی بە ئیحتیرام عەسکەری تورکیان قبوڵ و ئیستیقبال نەکرد بە واسیتەی قوەتی

پشدەرەوە سەتوەتی حکومەتی تورک نیشانیان بدە و، ئەگەر مستەفا پاشا و هەمپاکانی حەیەن دەر دەست بکرێ روتبەی پاشایی لە مەجلیسی میلی ئەنقەرەدا بۆت ئەستێنم و لە کاغەزێک دا کە (ئوزدەمیر پاشا) بۆ قوماندانی مەفرەزەکەی دوکانی نوسی بو ئەمری دابو کە لە سلێمانی ئیدارەی عورفیە بکات.

"لەبەر ئەمە کە ئەهالی تێگەیشتن تورکەکان هەروەکو پێشو ئەفکاری خوێن رشتن و ئیعدام کردنی کوردانیان لە دەماغ دا ماوە و بەڵکو زیادی کردوە ئەکسەر لە تەرەفدارەکانی تورک لە ترسی رۆح پەشیمان بونەوە بە دزیەوە ئەمجا لە عەلەیهی تورک ئەدوان. فەقەت لە بەر ئەمە کە دەیان وت سەعاتێکی تر دەگەنە شار جورئەتیان نەدەکرد بە ئاشکار لە عەلەیهی‌یان بین.

"رۆژی 25 ی ئەیلولی 922 پاش نیوەڕۆ جەنابان: عیزەت بەگی عوسمان پاشا، ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ و، محەمەد ئاغای عەبدوڕەحمان ئاغا کە چو بون بۆ سەلاحیە بە ئوتومبیل گەڕانەوە داخلی سلێمانی بون و، لەگەڵ ئەواندا بەعزێ ئومەرا و زابتانی کورد کە لە بەغداد بون و، ئیسمیان لە نوسخەی پێشودا نوسرا بو، ئەوانیش بە ئەمری حکومدار تەشریفیان هێنایەوە بۆ سلێمانی و خەبەریان دا کە حەزرەتی حکمدار بە سواری ئەسپ لە رێگای قادرکەرەمەوە تەشریفی دەچێ بۆ داریکەلی لەسەر ئەمە درۆ و دەلەسەی تازەیشی کوژایەوە.

"ئەمجا تەرەف تەرەف لە هەمو لایەکەوە و حەتا ئەوانەیش کە ئەم درۆو دەلەسەیەیان تەرتیب و بڵاوئەکردەوە دەستیان کرد بە عەلەیهیداری تورک و ئیزهاری دۆستی بە موخالیفانی خۆیان. وە ئەوانەی کە چون بۆ ئیستیقبالی حەزرەتی حکومدار بە شەرەفی زیارەت و پابۆسی نایل بون.

"لە داخلی شاردا بە ئەمری جەنابی رەئیسی مەجلیسی میللی شێخ عەبدولقادر ئەفەندی بۆ ئیستیقبالی حەزرەتی حوکەمدار تەرتیباتی لازمە ئیجرا و، یەکێکی لە بەر دەرگای ماڵی حەزرەتی حوکمدار، یەکێکی لەبەر دەرگای تەلغرافخانە، یەکێکی لەبەر دەرگای مزگەوتی گەورە، یەکێکی لە بەر جادەی وەیس لە خاریجی شارەوە چوار تاقی زەفەر دروست کرا و، بەگوڵ و رەیحانە و ئەنواع شتی جوان تەزیین کرا و، بالای هەمویان بە بەیداخی شیرینی کوردستان رازانرا بو.

"رۆژی شەمبە 30 ی ئەیلولی 922 کە خەبەری حەرەکەت فەرمونی حەزرەتی حکومدار لە داریکەلیەوە گەیشت، لە ئەمبەر و ئەوبەری ئەم چوار تاقی زەفەرەدا عەسکەری پیادە و شاگردانی مەکتەب، کە ئەم شاگردانە یەکی بەیداخێکی کوردستانیان بەدەستەوە بو، سەفبەستەی ئیحتیرام بون و، هەمو دوکان و بازاڕ داخرا. ئەهالی مەملەکەت و عەشایەرو قەبایل بە سواری و پیادەیی، تا دو سەعات رێگا، کۆمەڵ کۆمەڵ، بە ریزە لەسەر رێ دا وەستابون.

"سەعات شەش و نیوی رۆژ حەزرەتی حکومدار گەیشتە شار. دەرحاڵ تۆپ ئاگر درا و، لە تەرەف عەساکیر و شاگردانی مەکتەبەوە رەسمی سەلام ئیجرا کرا و، شاگردەکانی مەکتەب گۆرانی میللی‌یان دەخوێندەوە. لەسەر بانی ماڵانەوە ژنان و منداڵ هەمو گەڵا و گوڵیان ئەخستە خوارەوە. گوڵبارانی حەزرەتی حکمداریان دەکرد. لە دوایی دا کە تەشریفی گەیشتە دەوڵەتخانە، لەپاش ئەمە کە 10 دەقیقە ئیسراحەتی فەرمو بو، تەشریفی لە دەرگای ئۆدەی مەخسوسی حوکمداریەوە هاتە دەرێ. عمومی سادات و عولەما و ئەشراف و ئەهالی و مەئمورین و سائیرە کە لەو حەوشە واسیعەدا، بە ریز دانیشتبون هەڵسانە سەرپێ. حەزرەتی حوکمدار بەرابەریان وەستا و، بە سەلام ئیزهاری ئیلتیفاتی فەرمو. لەو وەقتەدا جەنابی خەتیب ئەفەندی بۆ دەوامی ئیقبال و موەففەقیەتی حەزرەتی حوکمدار خوتبەیەکی خوێندەوە.

"حەزرەتی حوکمدار دایر بە ئەمە کە بۆ تەرەقی کورد و کوردستان بە هەمو نەوعێ سەعی ئەفەرموێت و، بۆ خزمەتی میلەت بە جان و دڵ حازرە، نوتقێکی پڕ مەعانی و شیرینی فەرمو. لەپاش ئەمە تەشریفی چوەوە ئۆتەی مەخسوسی حوکمداری و لە تەرەف بەلەدیەوە بەعمومی حازرون شەربەت، قەهوە، تەقدیم کرا.

"لەدوای 15 دەقیقە لەپێشا سادات و مەشایخ، لەدوایی دا ئەشراف و موتەحەیزانی مەمـلەکەت، لەپاشـانا تیجاران و دایرە بە دایرە مەئمورین بۆ زیارەتی قبوڵ فەرموران و لەتەرەف تەشریفاتچی مەخسوسەوە تەقدیم کران ئەم زیارەتە هەتا سەعات 9 ی ڕۆژی دەوامی کرد.

"وە نزیکی هەزار سـواری عەشـایەر کە لە خـزمەت حەزرەتـی حوکمـدار دا لە سـەلاحیەوە هـاتبون بە تەرتیب دەستە دەستە بۆ ئەو جێگایانە کە لە پێشەوە بە ئەمـری جەنـابی جەلالەتمەئـاب شـێخ قـادر ئەفەنـدی بۆیان ئیحزار و مەعلوم کرابو نێران و، ئەسبابی ئیستراحەتیان تەئمین کرا.

"ئەو زاتانەی کە لە سەلاحیەوە، لە گەرمیانی کوردستانەوە لە خزمەت حەزرەتی حوکمـداردا تەشـریفیان هاتوە بۆ سلێمانی ئەمانەن:

"ڕەئیسی عەشیرەتی جەباری سەید محەمەد.

"ڕەئیسی عەشیرەتی داودە ڕەفعەت بەگ و، عەزیز ئاغای عەباس ئاغا و عەلی ئاغا.

"ڕەئیسی عەشیرەتی زەنگەنە عەلی ئاغای حەسەن ئاغا و، غەفور ئاغای جاسم ئاغاو، حەمە ئاغای کەریم ئاغا.

"ڕەئیسی عەشیرەتی بەیات سلێمان بەگ و، فارس بەگ و محەمەد حەسون بەگ.

"ڕەئیسی عەشیرەتی هەمەوەند ئەمین ئاغای ڕەشید ئاغا و، عەزیز خەسرەو ئاغا، یونس ئاغای مەحمود خزرو، برایشی جەوهەر ئاغا.

"شێخانی قەرە حەسن، شێخ قادری شێخ ڕەزا و، سەید عەلی و، شێخ ئەمـین و، شـێخ نەجیـب و سـەید خەلیل ئاغا.

"لە ڕوئەسای عەشیرەتی پشدەر، جەنابی عەباس ئاغای سەلیم ئاغا و، حەسەن ئاغای مودیری قامیش و، محەمەد ئاغای عەلی ئاغا، زاتەن لەمەوپێش هاتبونە سلێمانی ئینتیزاری تەشریف هێنانی حەزرەتی حوکمداریان دەکرد.

"وە ڕۆژێ لەپاش تەشریف هێنانەوەی حەزرەتی حوکمدار، شـێخ مـحەمەد و، شـێخ سـاڵح، مەخـدومانی مەرحوم شێخ سەعید ئەفەندی گۆپتەپە، تەشریفیان هات بۆ سلێمانی و نایلی زیارەتی حەزرەتی حوکمدار بون.

"جەنابی حوکمدار لە بەغداد دا لەگەڵ حەزرەتی مەلیکـی عیـراق و جەنـابی مەنـدوبی سـامی، لە حینـی مولاقاتیا زۆر ئیحتیـرام گیـراوە بەعـزێ زابتـانی کـورد، بینـا بە خواهشـی خۆیـان و موسـاعەدەی جەنـابی حوکمدار، بۆ ئەمە کە لە کوردستان دا خزمەت بکەن، لە بەغدادەوە لە خزمەتیا بۆ سەلاحیە هاتبون.

"حاکمی سیاسی پێشوی ئەلەبجە و جاف جەنابی مـێجەر نۆیـل کە ئەکسـەری عەشـایەری کوردسـتان دەیناسێ و خۆیشی بە خێرخواهی کوردان ناسراوە، بە سیفەتی نوماینـدەگی، یەعنـی واسـیتەی موخـابەرە لە بەینی حکومەتی کوردستان و حکومەتی ئینگلیسا بێ. بینا بە تەلەبی جەنابی حوکمدار ڕەفاقەتی کردەوە. ئەم زاتە لەگەڵ حکـومەتی کوردسـتانا هـیچ مـوداخەلەیەکی نـیە و، عـادەتەن وەکـو قونسلوسـێکی ئەجنەبـی‌یە تـا نەتیجەی موزەکەرە دێت، لێرایە میهمانمـانە. بە واسـیتەی ئەم میهمـانەوە ئومێـد دەکەیـن لە بەینـی ئینگلیـز و عەرەب و کوردا تەوافقێکی چاک حاصل بێ. حەزرەتـی حوکمـدار یەک دو ڕۆژ کە لە سـەلاحیە دا بـو، لەگەڵ ڕوئەسای بەعزێ موزاکەرەی دەفەرمو و لە ئەسەری ئیلتیفاتی بۆ ڕوئەسـای عەشـایەر و ئەشـرافی کەرکـوک و جێگایانی تر بەعزێ لوتفنامەی تەحریر و ئیرسال فەرمو.

"لە بەگزادانـی جـاف جەنابـان کەریـم بەگـی فەتـاح بەگ و، حەمیـد بەگ و، ئەحـمەد موختـار بەگ، تەشریفیان هاتە سەلاحیە. بە شەرەفی زیارەتی حەزرەتی حکمدار موشەرەف بون و، بۆ ئەمەی کە لە کەلارەوە لە پاشا بێن بۆ سلێمانی ڕوخسەتیان تەلەب کرد و عەودەتیان فەرمو. لە مودەتی ئیقامەتی حەزرەتـی حوکمـدار

و ئەتباعی لە سەلاحیەدا ئیبرازی خلوس و میهمان نەوازی خانەدانی سەلاحیە وەکو جەنابی سەید موحسین ئاغا و، بابان زادە جەمیل بەگ و، سەید عومەر ئاغا و، سەید قادر ئاغا و، حاجی رەشید ئاغا، حەقیقەتەن شایانی تەقدیر و شوکرانە. خودا ئەم نەوعە خانەوادانە دایمەن زیاد بکات.

"حەزرەتی حوکمدار لەگەڵ کولی ئەتباع و رۆئەسای عەشایەری موستەقبیلە، کە لە سەلاحیەوە حەرەکەتی فەرمو، ئەوەل شەو لەناو داودە لە دێی عەزیز ئاغا عەباس ئاغا، شەوی دوەم لە قادرکەرەم لە ماڵی جەنابی رەشادەتمەئاب شێخ عەبدولکەریم ئەفەندی دا، شەوی سێیەم لە مەملەحەدا، شەوی چوارەم لە داریکەلی لە دەوڵەتخانەی خۆیانا ئیسراحەتیان فەرمو. لە ئەم رێگایانە، باخسوس لە داریکەلی، لە بەر موستەقبیلانی سلێمانی و ئەترافی ئیزدیحام گەرچی زۆر بو، فەقەت ئەسبابی ئیسراحەتی هەمو تەئمین کرابو.

"رۆژی شەمبە 30 ی ئەیلولی 338 سبحەینێ پاش هەتاوکەوتن لە داریکەلی حەرەکەتی فەرمو و، نیوەرۆ سەعات 6 و نیو هەروەکو لە سەرەوە عەرزمان کرد (بالیمن والاجلال) بە ئیستیقبال و ئیحتیرامێکی فایقەوە داخلی سلێمانی بو. لە سەلاحیەوە تا سلێمانی هەمو رۆژ چەند تەیارەیە دەهات لەگەڵ جەنابی مێجەر موخابەرەی تەئمین دەکرد. ئێستا لە سلێمانی دا مەجلیسێکی عومومی تەشکیل کراوە (رۆئەسای مەزکورەی عەشایەریش داخڵن) بۆ تەسبیت و تەئمینی بەعزێ خسوساتی ئیستیقلال موزاکەرە دەکرێ، کە نەتائیجی موزاکەرات و موقەرەراتی مەجلیس، بە واسیتەی جەنابی مێجەر نۆیل، بۆ بەغداد بۆ مەندوبی سامی بنوسرێ و، جوابی وەرگیرێ. جەنابی مێجەر لە موقابیلی دائیرەی پۆلیس، لە خانویەک دا کە وەقتی ئینگلیسەکان موفەتیشی گومرگی تیا بو، دانیشتوە و، ئەسبابی ئیسراحەت و محافەزەی لە هەمو خسوسێکەوە بە ئەمری عالی ئەشرەف حوکمدار تەرتیب و تەئمین کراوە. داخڵی مەملەکەتیش ئێستا لە ئەلحەمد ئاسودەگیە".

## 3. 4. دەقی ئیرادەی حوکمداری و ملوکانە

لە ژ10 ی‌دا دەقی ژمارە 1 و 2 و

لە ژ12 ی‌دا دەقی ژمارە 3 ی ئیرادە حوکمداری‌یەکانی حوکمداری کوردستان دەربارەی پێکهێنانی یەکەمین کابینەی کوردستان و جۆری بەڕێوەبردنی کاروباری حکومەتی کوردستانی جنوبی، بڵاوکراونەتەوە:

"صورەتی ئیرادەی عەلیەی حەزرەتی حوکمداری

"عەدەد:1

"18ی صەفەرەلخەیری 1341،-9 ی تشرینی ئەوەلی 1922

"لە مەملەکەتی سلێمانی دا نوسرا لە مەحمود ئیبن سەعید بۆ کافەی میلەتی کورد

"لە پاش تەلەبی سەعادەت و مەغفیرەت لە بارەگاهی ئەحەدیەت، بۆ ئەم میلەتە مەزڵومەی خۆمە ئیعلان ئەکەم کە لەبەر بەعزێ ئەسباب و عەواریزی سیاسیە مودەتێکە لە خزمەتی ئەم میلەتە صادقە کوردە دور و مەهجور مابوم.

ئیمرۆ لە سایەی خودا و روحانیەتی مستەفا (صلعم) و هیمەتی ئەجداد و لە سایەی نیاز و تەزەروع و قوەتی ئەم میلەتە صادقەوە گەیشتمە ئەم رۆژە موقەدەسەی کە موەفەقەت هاتومەوەو لە ئیمرۆوە دەستم کردوە بە تەدویری پەروانەی حکومەت و محافەزەی مەوجودیەت و ئیستیقلالیەتی کوردستان. ئومێد و ئارەزو ئەکەم هەموتان بەیەک غایە و مەسلەک و بێ فاصیلە سەعی بۆ دەوامی ئەم رۆژە و کۆشش بۆ تەعالی ئەم میلەتە ئەکەن. کورد، وەکو یەک عائیلە موتەفیقەن و موتەحیدەن لەگەڵ من دا بۆ تەحکیم و دەوامی ئەم حەقە صەریحەیە کە دەستمان کەوتوە لازم و فەرزە سەعی و غیرەت بکەن.

"ئەی میلەتم؛ ئەمین بن کە زامنـی سـەعادەت و مـوەفەقیەتی ئەقـوام ئیتیحـاد و ئیتیفـاقە و، میلەتـێ کە خوێنی ڕشتبێ بۆ حەقی خۆی قەتعیەن مەحروم و ئەسیر نـابێ و قەراری عـالەمی مەدەنیەتـیش ئەمەیە کە هەر قەومێ و هەر عونصورێ خۆی بە خۆی ئەبێ ئیدارە بکات. ئەوەڵەن ئێمە کە میلەتی کوردین، سـانیەن بـۆ ئەم غایەیە قوربانیەکی زۆرمان دا، بە ئەو شەرتە کە یەک دڵ و یەک زبان و یەک وجود بین بە ئیزنی خودا هـیچ کەس زەفەرمان پێنابـا و، منـیش تـا ئـاخر قەتـرە خـوێن و مـاڵی خـۆم و ئەولاد و ئەتبـاعم بـۆ سـەعادەتی ئێوەصەرفم کردبو و تیکرار ئەیکەم.

"هیمەت لە ئێوە موەفەقیەت لەخودا.

حکمداری کوردستان مەحمود"

"صورەتی ئیرادەی عەلیەی حەزرەتی حوکمداری

"عەدەد:2

"19 ی صەفەرەلخەیری 1341.10 ی تشرینی ئەوەلی 1922

"لە مەملەکەتی سلێمانی دا نوسرا.

"بۆ تەشکیلاتی حکومەتی کوردستان نەصب و تەعیینی ئەم زاتانەم لە قابینەی حکومەتدا موناسیب دی.

| | |
|---|---|
| سپەهسالار | شێخ قادر |
| ڕەئیسی داخلیە | شێخ محەمەد غەریب |
| ڕەئیسی مالیە | عەبدولکەریم عەلەکە |
| ڕەئیسی مەعاریف | میرلیوا مستەفا پاشا |
| ڕەئیسی شەرع و عەدل | ... |
| ڕەئیسی گومرگ | ئەحمەد بەگی فەتاح بەگ |
| ڕەئیسی نافیعە | محەمەد ئاغای عەبدولڕەحمان ئاغا |
| ڕەئیسی ئەمنیەتی عومیە | سەید ئەحمەد بەرزنجی |

موفەتیشی عومی حکومەتی کوردستان میرلیوا صدیق ئەلقادری پاشا

"هەر کەسە مەقام و وەزیفەی خۆیم پێ سپاردن و ئیرادە ئەکەم دەرحاڵ دەسـت بە تەدویـری مـاکینەی حکومەت بکەن.

"ومن الله التوفیق

**حوکمداری کوردستان**

**مەحمود"**

...

"ئیرادەی حوکمداری

"عەدەد:3

"24 صفر 1341، 15 تشرین اول 1922

"پایتەختی حکومەتی کوردستان لە سلێمانی دا نوسرا

"ئیرادەم کرد بە ئیفای مەوادی ئاتیە

1. بیلعموم روئەسا هەفتەی دو رۆژ، دوشەنبە و پێنجشەنبە، پاش نیوەرۆ ساعەت لە هەشتەوە تا ساعەت دە ئەبێ لە دائیرەی خصوصی خۆم دا ئیجتیماع بکەن. بۆ عەرز و حەلی مەسائیلی موهیمە و ئومـوری حکومەت.

2. لە ئەحوالی فەوقەلعادە و عیندەلحاجە هەر رەئیسێ و لە هەر وەقتێکا حەقی مولاقـاتی لەگەڵ مـن دا هەیە.

3. بیلعموم روئەسا لە خصوصات ئاتیەوە ئەبێ تەرتیبات و تەنزیماتی دەوائیری خۆیان عەلەلعەجەلە ئیجرا بکەن.

أ. مونتەزەمەن وەکو ماکینە دەوام کردن لەسەر وەزیفە.

ب. حەرەکەت کردن لە هەر جیهەتێکەوە بە موافیقی پرۆغرامێکی مونتەزەم بێ کە رەئیسی دائیرە تەرتیبی کردبێ.

ج. تەنسیقات بە موافیقی ئەحوال و واریداتی مەملەکەتەکە.

د. لە هەر دائیرەیەکا ئیلغای وەزیفەی معاونێتی.

ه. تەرجیحەن ئیستیخدام کردنی ئەربابی صەداقەت و عیفەت و ئیستیقامەت.

"لە پاش تەرتیب و تەشکیلی ئەم نەوعە ئیجرائاتانە ئەبێ جەداویل و ئەوراقی تەقدیم بکرێ.

4. بە ئینتیخاب و تەرتیبی عمومی روئەسا ئەبێ بۆ هەمو دائیرەیەک تەرتیباتی ئانیە ئیجرا و بەعدەهو عەرزی تەصدیقی بکەن و لەپاش تەصدیق ئیعلان بکرێ وەکو قانون:

أ. بۆ عمومی دەوائیری مولکیە و عەسکەریە قادرۆنامەیەکی مونتەزەم موفەصەل.

ب. دروستکردنی لیستەیەکی معاشاتی عمومیە کە لە نەفەرەوە هەتا نازر، هەمو روتەب و وەزائیفی عەسکەریە و مولکیەی حاوی بێ و بە موجیبی قادرۆکە بکرێ.

ج. لە هەردو جیهەتەکەوە ئەحوالی واریدات و لیاقەتی مەملەکەتەکە ئەساس ئیعتیبار بکرێ.

5. تەقسیمی وەزائیف و دەرەجەی صەلاحیەتی مەقاماتی عالیەی حکومەت بەر وەجهی ئاتی نوسراوە:

أ. ریاسەت ئەلروئەسا. حەقی نەزارەتی بەسەر عمومی روئەساوە هەیە. روئەسا لە هەر ئەمرێکی موهیم دا مجبوری ئیستیشارەی ئەون. ریاسەتی مەجلیسی روئەسا بە خۆی عائیدە.

ب. سوپەهسالار. بیلعموم مەسائیلی حەربیە و عەسکەریە راجیعی ئەو مەقامەیە.

ج. ریاسەتی داخلیە. بیلعموم موتەصەریف، قائیمقام و مودیریەتەکان و موتەصریفیەتی مەرکەز، بەلەدیە و تاپۆ، لە ژێر صەلاحیەتی ئەم دائیرەدایە و موەقەتەن دائیرەی صحیە کە عیبارەتە لە خەستەخانە.

د. ریاسەتی مەعاریف. بیلجوملە ئومـوری مەعاریف و هەرچی تەرتیباتێ کە ئیجاب بکات لەم خصوصەوە راجیع بە ریاستی مەعاریفە.

ه. ریاسەتی نافعیە. تورق و مەعابیر، پۆستە و تەلغراف، موهەندیسخانە و ئەعمالاتخانە، اورمان و زەراعەت، راجیع بە ریاسەتی نافیعەیە.

و. ریاسەتی شەرعیە و عەدلیە. بیلجوملە مەحاکیمی شەرعیە و عەدلیە، مەحاکیمی صوڵح و مەحاکیمی مونفەریدە، ئیستیناف، تەمیز، دائیرەی ئەوقاف، بە غەیرەز وەقفی ئیتعامی مەساکیین، راجعی ئەم ریاسەتەیە.

ز. ریاسەتی ئەمنیەتی عمومیە. محافەزەی داخلی دەوائیر، پۆلیس و ژاندرمە و دەوائیری ئیستیتلاعات، یەعنی مەرکەز و مولحەقاتی حکومەتی کوردستان عائیدی ئەم ریاسەتەیە.

ح. موفەتیشی عمومی حکومەت. لە سەر بیلجوملە دەوائیرو مەقاماتی حکومەت دا مانگی دەفعەیەک

حەقی تەفتیش و، لە ئەم خصوصەوە صەلاحیەتی پێ بەخش کراوە و عیندەل ئیقتیزا، بە ئیرادەی عەلیە، لە هەر وەقتێکا حەقی تەفتیشی هەیە.

ط. ریاسەتی مالیە. بیلجوملە ئوموری مالیە، حکومەت و خەزینە، راجیع بە ریاسەتی مالیەیە.

6. لەپاش ئیعلان و تەعمیمی ئەم ئیرادە نامەیە هەرچی ئوصول و تەرتیبات کە لە سابیقەوە مەرعیولئیجرا بوە مەفسوخە.

7. بیلجوملە مەئمورین لە نەفەرەوە تا نازر ئەبێ لە هەر جیهەتێکەوە بە قەدەر زەڕەیەک تەکاسول و عیجز لە وەزیفەی خۆیان نەهێنن و ئەدنا خەتایەک وە یا موسامەحەیەک و یاخود بێ قانونیەک لەهەر کەسێکەوە کە زاهیر بو یاخود دەرک بکرێ بیلا تەفریق موبتەلای ئەشەدی جەزای ئەکەم و عیبرەت ئەلعالەمین ئەنواعی موجازاتی شەدید لە حەقیان ئیجرا ئەکەم.

8. هەر مەئمورێ، بیلا تەفریقی دەرەجە و مەقام، ئەبێ خۆیان بە خزمەتکاری میلەت بزانن و لەگەڵ هەر فەردێکی میلەت دا ئەبێ بە حیلم و موسامەت و نەزاکەت معامەلە بکەن ئەدنا دڵ شکێنیەکی غەیر قانونی موجیبی عیقاب ئەبێ و هەر نەوعە خدمەت و مولایەمەتێ بۆ جەلب و تەتییبی خاتری ئەفرادی میلەت ئیجرا بکرێ. فەقەت تیکرار ئیقاز ئەکەم کە لە قانون بە دەر نەبێ.

**حوکمداری کوردستان**

**مەحمود".**

...

### 3. 5. شێخ مەحمود: لە حوکمدارەوە بۆ مەلیکی کوردستان

لە تشرینی دوەمی 1922 ەوە لە نامەکاری و فەرمانەکانیدا لە باتی (حوکمداری کوردستان) ئیتر (مەلیکی کوردستان) ی نوسیوە. بانگی کوردستان هەواڵی ئەم گۆڕینەی باس نەکردوە. سەیر ئەوەیە بۆ یەکەم جار شێخ مەحمود لە ئیعلانێکدا ئەم وشەیەی بەکارهێناوە دەربارەی دزی و راووڕوت دەری کردوە و، لە ژ13 ی 3 ی تشرینی سانی 1922دا بڵاو کراوەتەوە، کەوا وەکو خۆی لێرەدا ئەینوسمەوە:

"ئیعلانی رەسمی

"بۆ عمومی ئاغا و کوێخا و ئەهالی دێهاتی کوردستان

"دزی و جەردەیی و سائیری موعامەلاتی بێ شەرعی و بێ مەعنا لەم رۆژەدا لە هەمو وەختێ زیاتر عەیب و گوناهە، چونکە ئەمرۆ رۆژی برایەتی و دۆستی و خزمەتی دین و میلەتە. بە تەحقیق بزانن ئەم نەوعە حەرەکاتە بێ مەعنایە نەتیجەی هەر نەدامەت و پەشیمانی‌یە.

"لە حدود و سنوری هەر دێهاتێ دزی و جەردەیی و سایرە روبدات بەو دێهاتە تەزمین ئەکرێ و ئەهالی ئەو جێگایانە تەجزیە ئەکرێ، فاعیلەکەشی کە دۆزرایەوە بە نەوعێ تەجزیە ئەکرێ کە بێ بە عیبرەت بۆ خۆی و بۆ هەمو عالەم و حەتا تەیارەش سەوق ئەکرێتە سەر ئەم نەوعە جێگایانە کە بۆمبارەمانیان بکات. لەبەر ئەوە ئیتر ئەبێ واز لەم حەرەکات و معامەلاتە بێنن. لازم بو لە پێشەوە بۆتان ئیعلان بکرێ.

**29 ی 10 ی 922**

**مەلیکی کوردستان**

**مەحمود**

## 4. لە روی هونەری رۆژنامەوانییەوە

### 4. 1. شێوە و روخساری

قەوارە و شێوە و روخساری وەکو پێشکەوتن وایە. لە هەمان چاپخانەدا چاپ کراوە. هەمو لاپەڕەیەکی دو ستونی تێدا نوسراوە. بە دەگمەن پێڕەوی خاڵبەندی کراوە. بابەتەکانی سەروتار، وتار، هەواڵ، ریپۆرتـاج، شیعر... تێکەڵ و پێکەڵە و بە رێکوپێکی بە سەر لاپەڕەکانی دا دابەش نەکراون.

### 4. 2. زمانەکەی

بانگی کوردستان بە 3 زمان باس و بابەت و شیعری تێدا نوسراوە، بە کوردی و فارسـی و تـورکی. بابەت و شیعرە فارسی و تـورکییەکانیشـی هەر دەربـارەی کـورد و کـوردایەتین. کـوردییەکەی بە لەهـجەی سلێمانی نوسراوە. شێوەی دارشتن و رێنوسی هەندێ لە هـەواڵ و نوسـینەکانی لاواز و نـاقۆڵان. بـۆ نمونـە بڕوانە دارشتن و رێنوسی ئەم ئاگادارییەی کە لە ژ1 دا بڵاوکراوەتەوە:

"اول روژ جژن قربان پاش نویژی جـژن اعضـایان دائمـی جمعیـت کردسـتان لە مـال جنـاب حـاجی مصطفی پاشادا اجتماع دکن. بو جژنە پیروزی لکل یکتر لـو وەخـتەدا تشـریف فرمـون همـو افـراد جمعیـت کوردستان رجا اکین."

### 4. 3. هەواڵ

بانگی کوردستان پڕێتی لە هەواڵ و دەنگوباسی ناوخۆ و ناوچەکە و جیهان. سەرچاوەیەکی دەوڵەمەند بۆ ئەوانەی لە مێژوی سیاسی ئەو قۆناغە ئەکۆڵنەوە.

### 4. 3. 1. هەواڵی ناوخۆ

ژمـارەیەکی زۆری هەواڵـی جۆراوجـۆری نـاوخۆی تێدایـە. بە تـایبەتی هەواڵـی هـاتنی سـەرانی خێـڵ و هۆزەکـانی سـلێمانی و کەرکـوک و گەرمیـان بـۆ سـلێمانی بە تـایبەتی دوای گەڕانەوەی شـێخ مەحمود.

لە ژ3 دا بە ناونیشانی (گەرما) نوسیوێتی:

"حەرارەتی ئەم هاوینە بە شیدەت بو شەوان مێشولە زۆر بـو و ئێسـتایش وایە ژنێـک و منـداڵێک لە شیدەتی گەرمادا لە کەناری شار مردون لە پیـاوە قەدیمەکانمـان بیسـتوە لەمەوپـێش لە مـودەی گەلـێ سـاڵەوە گەرمای وا نەبینراوە. لە کەرکوک و موصل دەرەجەی حەرارەت لە سێبەردا گەیشتوە بە 34 - 44 سـانتیغراد و چەند کەسێک لە ئەو شارانەدا و لە صەلاحیەیش دا لە گەرمانا مردون."

لە ژ8 دا بەمجۆرە هەواڵی گەڕانەوەی ئەفسەرانی کوردی بڵاوکردۆتەوە:

"تەشریف: بیکباشی ئەرکانی حەرب تۆفیق وەهبی بەگ و بیکباشـی خالیـد سـەعید بەگ و یوزباشـی رەشید ئەفەندی و مولازم ئەمین ئەفەندی و مولازم عەزیز حیکمەت ئەفەندی و مولازم عەبدولعەزیز ئەفەنـدی و مولازم رەواندزلی ئەمین ئەفەندی لە بەغدادەوە رۆژی دوشەمبە 25 ی ئەیلـولی 922 تەشـریفیان هێنـاوە بـۆ سلێمانی عەرزی بە خێر هاتنیان ئەکەین. بانگی کوردستان."

لە هەمان ژمارەدا باسی گەیشتنی (جەنابی سەعادەتمەئاب میر لیوا صدیق پاشا) ئەکا.

### 4. 3. 2. بۆمبارانی کوردستان

دوای گەڕانەوەی شێخ مەحمود تورکخواکان چالاکیيان زيادی کردوە. هێـزی ئاسـمانیی بريتـانی بـۆ چاوترساندنیان پەلاماری زۆر جێگەی داوە. زيانی مادی و گيانی پێ گەياندون.

لە ژ9 ی 8 ی تشرينی ئەوەلی 1922 دا هەواڵی بۆمبارانی کۆيە و.

لە ژ10 ی 15 ی تشرينی ئەوەلی 1922 دا هەواڵی بۆردومانی ناوچەی شێخ بزەينی و.

لە ژ11 ی 20 ی تشرينی ئەوەلی 1922 دا هەواڵێ بۆردومانی رانيە و.

لە ژ12 ی 27 ی تشـرينی ئەوەلـی 1922 دا هەواڵـی بۆردومـانی مەرگە و قەڵادزە و دەوروبەری رانيەی بڵاوکردۆتەوە.

### 4. 3. 3. هاتوچۆی کاربەدەستانی ئينگليز

لە ژ6 دا نوسيوێتی:

"مەئمورانی ئينگليز: وەکو بيستومانە مەئموران و هەيئەتی عەسکەری ئينگليز لە سلێمانيەوە چـون بـۆ کەرکوک نازانين فکريان چۆنە. بانگی کوردستان"

لە ژ9 دا لە ژێر سەردێڕی (مێجەر نۆيل) دا نوسراوە:

"وەکيلی مەندوبی سامی عيراق کە لە بەغدادەوە لە خزمەت حەزرەتی حکومداری کوردستان دا هات بـو بۆ سلێمانی شەوی جومعە 6 ی تشرينی ئەوەلی 1922 لەگەڵ چەند زاتێ بـە ئۆتۆمۆبێـل چـو بـۆ کـەرکوک بزانين کەی عەودەت دەکا خودا خێرمان بۆ بکا"

لە ژ10 دا نوسراوە:

"وەکيلی مەندوبی سامی دەوڵەتی فەخيمەی بريتانيا جەنابی مێجەر نۆيـل کە لە کەرکـوکەوە بە تەيـارە تەشريفی بۆ بەغداد چو بو لە مودەتی غەيبوبەتی‌دا کەپـتن چەپـمەن (حـاکمی سـابيقی چەمچەمـاڵ) وەکـالەتی دەکرد. رۆژی 9 ی تشرينی ئەوەلی 922 بە تەيارە عەودەتـی فەرمـوەوە بـۆ سـلێمانی وەکـيلەکەی بە تەيـارە رۆيشتەوە بۆ کەرکوک."

لە ژ12 دا نوسراوە:

"وەکيلی مەندوبی سامی مـێجەر نۆيـل 23 ی تشـرينی ئەوەلـی 338 لە کەرکـوکەوە بـۆ سـلێمانی بە تەيارە عەودەتی کردوە و، لەگەڵ کاپيتان چەپمەن بە شەرەفی زيارەتی حەزرەتی حوکمـدار موشـەڕەف بـون و ئێوارە بۆ کەرکوک ديسان بە تەيارە رۆيەوە."

وەک دەرئەکەوێ کاربەدەسـتانی ئينگليـز چەنـد جـارێ هـاتوچۆی سـلێمانی و، گفتوگۆيـان لەگەڵ شـێخ مەحمـودکردوە، بەڵام بـانگی کوردسـتان لە سـەر نـاوەرۆکی گفتوگۆکـان هيچـی نەنوسيوە.

لەو ماوەيەدا شێخ مەحمود کابينەی پێک هێنا. لە باتی حوکمدار خۆی بە مەليکی کوردسـتان راگەيانـد. نەک هەر تورکی لە کوردستان دەرنەکـرد، بەڵـکو پێوەنـدی بەهێـزی لەگەڵ دامەزرانـدن و، بە لای ئوردوگـای تورکخوازەکان‌دا دايشکاند. ئينگليز لە شێخ مەحمود نائومێد بون.

### 4. 3. 4. هەواڵی جوڵانەوەی سمکۆ

حاجی مستەفا پاشا بەر لەوەی بـانگی کوردسـتان دەربکـا، بە نهێنـی سـەردانی سـمکۆی کـرد بـو لە بارەگاکەی خۆی‌دا لە چارێ لە ناوچەی ورمێ لە سەر سنوری ئێران - تورکيا.

لەو کاتەدا سمکۆ دەسەڵاتێکی زۆر و ناوچەیەکی فراوانی کوردستانی ئێرانی لە بەردەسدا بو. بـانگی کوردستان بە کوردی و فارسی هەواڵی جوڵانەوەکەی سمکۆی بڵاوکردۆتەوە و لێدوانی لە سەر نوسیوە و، بـۆ پشتیوانی لە سمکۆ بەرپەرچی هەندێ لە رۆژنامەکـانی ئێرانـی داوەتەوە. ئەشـێ وەکـو سـەرچاوەیەکی بـاش کەڵکی لێ وەربگیرێ.

### 4. 3. 5. هەواڵی جیهان

ژمارەیەکی باش دەنگوباسی جیاوازی دنیای تێدا بڵاوکراوەتەوە. رەنگە بـۆ ئەوسـا بە کەڵـک بـوبن، بەڵام ئێستا نرخێکی ئەوتۆیان نەماوە.

### 4. 4. ریپۆرتاج

چەندین ریپۆرتاجی گرنگی تێدا بڵاوکراوەتەوە، لەوانە:

لە ژ1 یدا ریپۆرتـاج لە سـەر دامەزرانـدن و کۆبـونەوەی جەمعیەتـی کوردسـتان بـۆ هەڵبژاردنـی بەرپرسەکانی. لە (3. 1.) ی ئەم باسەدا نوسراوەتەوە. لە ژ4 یدا ریپۆرتاج لە سەر ئەحوالی زابتانی کورد لـە تورکیا. لە ژ6 دا ریپۆرتاج لەسەر کشانەوەی ئینگلیز لە سلێمانی و دامەزراندنی مەجلیسی میللـی و ئەو کێشـە و ناکۆکی‌یانەی لەو ماوەیەدا قەوماون. لە (3. 2.) ی ئەم باسەدا نوسراوەتەوە.

لە ژ9 یدا ریپۆرتاج لەسەر گەڕانەوەی شێخ مەحمود بۆ کوردستان و، باسی پێشوازی و هـاتنی گەورە و سەردارەکانی کورد بۆ سلێمانی. لە (3. 3.) ی ئەم باسەدا نوسراوەتەوە.

## 5. جێگەی لە رۆژنامەوانی‌ی کوردیدا

بانگی کوردستان راستەوخۆ دوای پێشکەوتن دەرچوە. بە هەمان دەزگای چاپ و، بە هەمـان قەوارە و، بە هەمـان شـێوە و روخسـار، بەڵام بـۆ ئامـانجێکی جیـاواز و بە نـاوەرۆکێکی جیـاواز و، لە هەلـومەرجێکی سیاسی‌ی جیاوازدا بڵاوکـراوەتەوە. زۆری ئەو نوسـەر و شـاعیرانەی لە پێشـکەوتندا بەشـداری‌ی نوسـینیان کردوە، لە بانگی کوردستان یشدا بەشدارییان کردوە. ئەتوانین بانگی کوردستان لە هونەری رۆژنامـەوانی‌دا بە میراتگرەوەی پێشکەوتن دابنێین.

بانگی کوردستان جگە لەوەی دەورێکی کاریگەری هەبوە لە قوڵکردنەوەی هۆشی نەتەوەیی کوردیدا و، لە بڵاوکردنەوەی بیروڕای نـوێدا و، لە تۆمـارکردنی چەنـدین بەڵـگەی مێژوییـدا، ئەگەر ئەوە بسـەلمێنین کە قوتابخانەی رۆژنامەوانی‌ی سلێمانی، لە مێژوی رۆژنامەوانی‌ی کوردیدا، قوتابخانەیەکە خاوەن سیمای تـایبەتی خۆیەتی و، دەورێکی گرنگی لە مێژوی سیاسـی و ئەدەبـی و رۆشـنبیری و کـۆمەڵایەتی کـوردا گێـڕاوە، ئەوا بانگی کوردستان، بە یەکێ لە پێشەنگە دامەزرێنەرەکانی ئەم قوتابخانەیە دائەنرێ.

**تێبینی:**

جەمـال خەزنەدار سـاڵی 1974 هەمـو ژمارەکـانی (بـانگی کوردسـتان) ی لە بەغـداد سـەرلەنوێ، بە پێشەکی و ناوەرۆکی ژمارەکانیەوە، چاپ کردۆتەوە.

## 4. 4. رۆژی کوردستان

صاحب امتیاز و مدیر مسئول
م . نوری

محرر
علی کمال

اعلانات بدیریك
۳ آنه ده سیغریت

بدل آبونه
۳ مانك یك ٦ مانك دو
سالیکی چوار روپیه یه

همو شتیك مراجعت
به مدیر مسئول اکری

بو خارج اجرت پوسطه
علاوه ده‌کری


# روژ کوردستان


تأریخ انتشار
۱۵ تشرین ثانی ۱۹۲۲
سلیمانی
سیاسی ، ادبی ، اجتماعی ، غزته‌یکی رسمی یه
هفتهٔ جاریك دردچی

نسخهٔ به آنه یك — نسخهٔ به آنه یك

سال ۱ — ژماره ۱ — [ چوارشمه ] ۲۵ ربیع الاول ۱۳٤۱ ۱۵ تشرین ثانی ۱۹۲۲


## بانگ کوردستان — روژ کوردستان

صاحب امتیاز غزتهٔ بانگ کوردستان جناب حاجی مصطفی پاشا ابر مشغلت وظیفهٔ رسمیه استعفای کرد .

انتشاری ام غزته‌یه لواقعا بو کورد و کوردستان فایکی خیربو یعنی بانك کوردستان نتیجه‌ی روژ بو .

ابر استعفای مومی الیه امتیاز و ادارهٔ غزتهٔ روژ کوردستان با ارادهٔ حضرت جلالت ملك کوردستان دام شوکته بم ناوه‌وه تودیعی بنده کرا .

بلی نتیجهٔ بانگی که بو طلوع فجریکی استقبال ادری روژه .

او بانگه بانگی بو که بو صبحیکی سعادت ادرا ام روژه روژیکه که له الحمد قوم نجیب کورد له سایهٔ همت و اقدامات خدا پسندانهٔ ملوکانه‌وه نایل سعادت و استقلالیت خوی بو .

خدا ام روژ و روژ کردستان له همو ملتی کورد مبارك بکا .

مدیر مسئول
م . نوری

غزتهٔ العراق له نسخهٔ ۷۳۸ دا به‌عنوانی « منشور حزب الحر العراق » و له ۷٤۳ دا به‌عنوانی « مجلس ادارهٔ کردستان » چند شتیکی نوسیبو کوته بر چاومان کویا حزب حر عراق طلب محافظهٔ همو حقوق و حدود طبیعیه‌ی عراق له حکومتی خویان کردوه . کردستانیش به ناوی لوای سلیمانی داخل کردوه چونکه مربوطیت تجارت و اقتصادیاتی له کل بغداد زوره . و هم مجلس رؤسای کردستانی به ناوی مجلس ادارهٔ کردستان داوه‌ته قلم . ام مطالعاته که لم غزته دا درمیان کراوه راستی جای تعجب و تأسفه چونکه به خیالی هیچ اربابی وجدانیکدا نابی که شخصیکی منور امنده له حق و حد خارج بی . ایمه هیچ امیدمان نه‌کرد که دراوسی یکی محترم خومان پی له همو حقوق و مناسبات هزار سالهٔ ام دو حکومت و ملته بنی له جیاتی — رابطهٔ مبارکیانی و ترویج آمال و افکارمان تجاوز حدود و حقوقمان بکات . او کسانه که ام نوعه قصانه اکن بی شبهه دشمن وطن و ملت عربیه و حضرت جلالت ملك

سرمحرر و مدیر مسئول
م . نوری

محرر
علی کمال

اعلانات بدریك
٣ آنه ده سیغریت

بو داخل بدل آبونه
٣ مانك یك ونیو ٦ مانك سه
سالیکی شش روپیه یه

بو همو شتیك مراجعت
به مدیر مسئول اکری

بوخارج
٣ مانك دو شش مانك چوار
سالیکی هشت روپیه یه

# روژکوردستان

تاریخ انتشار
١٥ تشرین ثانی ١٩٢٢
سلیمانی
سیاسی ، ادبی ، اجتماعی ، غزته‌یکی رسمی یه
هفتهٔ جاریك دردچی

نسخه‌ی به آنه یك — نسخه‌ی به آنه یك

سال ١ — ژماره ١٥ — [ شنبه ] — ١٥ رجب ١٣٤١ — ٣ مارت ١٣٣٩

## عبرت

له ماضیماندا چه نوعه حیاتیکمان رابواردوه البته همو ایزانین افنای حیات ، ترکی سعادت و منافع خومانمان کرد و بو محافظهٔ و منی تعرض اجانب له حدود و خاکی خاتی به نام دیانه‌ته‌وه چند کسانمان به واسطهٔ ام محافظه و آکاهداری‌یه‌وه له حرب عمومیدا شهید و فوت بو حال حاضریش هیشتا زورمان له‌بر تعزیه تبدیلی قیافتی نکردوه . چند ژن بیوه‌ژن ، و چند منال یتیم ، و چند هزاران خانومان له بناغه‌وه به جاریك محو بوته‌وه . و هر بو واسطه‌یه‌وه تفیاتی کرانیش له لایك رابوری . له پاش ام همو فلاکت و سفالته چیمان دست کوت ؟

چند وختیکیش لمو پیش که صرفی اوقاتمان کرد له خواندن و نوستن بولاوه چیمان قازانج کرد ؟.

لم دو جهته وکو بوم معلوم بوه له دسی دسی و پاشکوتن زیاتر هیچمان نه‌دی . و بو خاتی نه‌بی بو خومان خیریکمان نه‌دایه‌وه ایستابش حقوقمان نادریتی . امرو

[illegible]

حکومتیکیان بو تشکیل کراوه . که‌چی : ایمه له‌کل ام روژه مقدسه و ام فرصته کوره‌یه‌دا که دستمان کوتوه و وکیل مدعی که ادعامان بو اکا لامان وکو [خره‌کویز] وایه . معلومه که ١٣٤١ ساله سلالهٔ طاهرهٔ نبویه [ صلعم ] حرمتیان و اطاعتمان و ناو مبارکیان روژی دؤ نه یاد و تلاوت له سر مسلمانان فرضه .ــ

بالخاصه ، خاندان حضرت [ کاك احمد شیخ ] قدس سره که له کوردستاندا متوطنن و بو ام قوم کورده‌یش مایهٔ فخرو له همو وختیکدا مجبور اطاعتیانن وا نجیب خاندان و مقدساتی کوردستان بون امرو که حفید زاده (حضرت ملك محمود اول ) زیده شوکته بو احیایی دیانت و بو زیندو بونه وهٔ ناو قومیت له کوردستاندا چند صدمهٔ کورهٔ به مرامات و ایستایش چنده خریکه ؟ !

تعقیبی ام غایه یش تنیا منفعتی شخصی و تزیید شرف عائله ی نیه . چونکه شرف ذاتی خویان نه به سلطنته وه‌یه و نه به حکومته وه‌یه . صاتیك رابواردنی پیشویان

# ڕۆژی کوردستان

## 1. هەلومەرجی دەرچونی

ڕۆژی کوردستان ڕاستەوخۆ بە دوای بانگی کوردستان‌دا دەرچوە. ئەگەر بانگی کوردستان غەزەتەیەکی (حورِ و سەربەستی میلی) ی کەرتی تایبەتی بوە، ئەوا ڕۆژی کوردستان زمانی رەسمیی حکومەتی کوردستان بوە. م. نوری (شێخ نوری شێخ ساڵح) لە سەروتاری یەکەم ژمارەی‌دا نوسیوێتی:

"صاحێبی ئیمتیازی غەزەتەی بانگی کوردستان جەنابی حاجی مستەفا پاشا لە بەر مەشغەڵەتی وەزیفەی رەسمیە ئیستیعفای کرد. ئینتیشاری ئەم غەزەتەیە لە واقیعا بۆ کورد و کوردستان فەئلێکی خێر بو، یەعنی بانگی کوردستان نەتیجەی ڕۆژ بو. لە بەر ئیستیعفای موما ئیلەیهی ئیمتیاز و ئیدارەی غەزەتەی ڕۆژی کوردستان با ئیرادەی حەزرەتی جەلالەتی مەلیکی کوردستان، دامە شەوکەتوهو، بەم ناوەوە تەودیعی بەندە کرا."

مستەفا پاشا لەو کابینەیەدا کە شێخ مەحمود دایمەزراند، کرا بە رەیسی مەعاریف (وەزیری پەروەردە). بەڵام هۆی ئەم گۆڕینە بە تەنیا (مەشغەڵەتی وەزیفەی رەسمیە) ی مستەفا پاشا نیە، بەڵکو هۆیەکی سیاسی لە پشتەوە بوە. لەو سەردەمەدا لایەنگرانی شێخ مەحمود دابەش بون بە سەر دو ئۆردوگادا، ئۆردوگایەکیان لایەنگری هاوکاری بون لەگەڵ ئینگلیز و، ئۆردوگایەکیان لایەنگری هاوکاری بون لەگەڵ تورکیای کەمالی کە بۆ گاڵتە پێ کردن بە(جلخوار) ناویان بردون. مستەفا پاشا لەوانە بو کە زۆر بە تۆندی دژی تورکخواکان و، لایەنگیری هاوکاری بو لەگەڵ ئینگلیز. تەنانەت کاتێ ئینگلیز سلێمانی چۆڵ کرد و بۆشایی دەسەڵات دروست بو، کەریم بەگی فەتاح بەگی هەمەوەند کە دژی ئینگلیز و لایەنگیری تورک بو، مستەفا پاشای گرت. ئەگەر هەوڵی زۆری شێخ قادری حەفید و پیاوماقوڵانی سلێمانی نەبوایە، تەسلیمی ئۆزدەمیری ئەکرد. شێخ مەحمود کەوتبوە ژێر کارتێکردنی جلخوارەکانەوە. باوەڕی بە ئینگلیز و لایەنگرانی نەمابو. کەوتبوە پێوەندی و نامەکاری لەگەڵ ئۆزدەمیر لە ڕەواندز.

مستەفا پاشا ڕۆشنبیرێکی هاوچەرخ بو. دوای دەیان ساڵ دوری لە وڵات گەڕابوەوە. نە شێخی تەریقەت و نە سەرۆکی عەشیرەت و نە کوێخای دێ بو. خۆی بە تەنیا بو دەستوپێوەندی نەبو، لە بەر ئەوە نفوز و دەسەڵاتی نەبو.

بڵاوکـردنەوەی ڕۆژی کوردسـتان هاوزەمـان بـو لەگەڵ ڕاگەیانـدنی مەلیکـایەتی شـێخ مەحمـود و، تێکچـونەوەی لەگەڵ ئینگلیـز و، سـەردانی سـمکۆ بـۆ سـلێمانی و، کۆنفرانسـی لـۆزان و باسـی چارەنوسـی سیاسی ولایەتی موسڵ و، بۆردومانی سلێمانی و چۆڵکردنی و، هاتنەوەی ئینگلیز و کاربەدەستانی عیراقی.

دوای گەرانەوەی شێخ مەحمود بۆ کوردستان، ناکۆکی لە نێوان ئەو و ئینگلیزدا سەر لە نـوێ دروسـت بوەوە. ئینگلیز شێخ مەحمودی هێنابوەوە بۆ ئەوەی ناوچەکە هێور بکاتەوە و، نفوز و هێزی تـورک دەر بکـا و نفوزی ئینگلیز بهێنێتەوە کوردسـتان و، نـاوچەکە ببەسـتێتەوە بە دەوڵەتـی تـازە دامەزرێنـراوی عیـراقەوە. کەچی ئەم مەلیکایەتی کوردستانی ڕانەگەیاند و، ئەیویست قەڵەمڕەوەکەی فراوانتر بکا و، بناغەی کوردسـتانی سەربەخۆ دابنێ و، پێوەندی لەگەڵ تورک دروست ئەکرد و، نامەی بۆ یەکێتی سۆڤێتی، دوژمنی گەورەی دنیای سەرمایەداری، ئەنارد.

## 1. 1. دەرکردنی

ژ1 ی لە 15 ی تشرینی دوەمی 1922 و

ژ15 ی کە دوا ژمارەیەتی لە 3 ی مارتی 1923 دا دەرچوە.

ساحێبی ئیمتیاز و مدیری مەسئول م. نوری، موحەڕیر عەلی کەمال.

لە ژێر ناوی ڕۆژنامەکەدا نوسراوە:

"تاریخی ئینتیشار 15 ی تشرینی سانی 1922، سلێمانی

"سیاسی، ئەدەبی، ئیجتیماعی، غەزەتەیەکی ڕەسمیە

"**هەفتەی جارێک دەردەچێ**"

بە بۆنەی دەرچونی ئەم ڕۆژنامە نوێیەوە حەمـدی سـاحێبقران، کـە ئەوسـا وەزیـر بـوە لە حکـومەتی کوردستاندا، چوارینەیەکی پیرۆزبایی بۆ ناردون، ئەڵێ:

شوکری خودا ئەکەم کە گەیشتینە وەقتی چاک

تا شەو نە ڕۆی، بانگی نەدا، نەبوە ڕۆژی پاک

سوبحان بەو زیایەوە سەدی سکەندەری

ئەترافی کوردی گرتوە ئەم ڕۆژە پاکە پاک

غەزەتەکانی پێشکەوتن و بانگی کوردستان کە پێش ئەم دەرچون، ڕۆژی بڵاوبونەوەیان هەمو بە ساڵی زاینی و کۆچی نوسراوە، بانگی کوردستانیش لە ژ1 یدا پێڕەوی ئەم نەریتەی کـردوە. بەڵام لە ژ2 بە دواوە، ساڵی کۆچی و لە باتی ساڵی زاینی ساڵی ڕۆمی نوسیوە، کە ئەو سەردەمە تورک بە کاریان هێناوە. دور نـیە ئەم گۆڕینە مانایەکی سیاسی هەبوبێ.

## 1. 2. نوسەرەکانی

جگە لە شێخ نوری کە بەشی زۆری وتارە سیاسیەکانی خۆی نوسیونی، عـارف سـائیب لە ژمارەکـانی سەرەتادا چەند وتارێکی سیاسی بە پێزی تێدا بڵاوکردۆتەوە. بەڵام وەکو لە ژ7 دا لە ژێـر نـاوی (تەعـین) دا نوسراوە: "لە ئەزکیـا و ئەربـابی ئیقتیـدار عـارف سـائیب ئەفەنـدی تەعـین بـوە بە کاتـب سـانی ئیـدارەی تەحریراتی ملوکانە." دوای ئەوە ئیتر لە نوسین دور کەوتۆتەوە. جگە لەم دو نوسەرە، ئەحمەد خواجە (خواجە ئەفەندیزادە)، عەزیز حیکمەت، سەعید زەکی، هەندێ وتاریان تێدا نوسیوە.

بەشێکی گرنگی لاپەڕەکانی رۆژی کوردستان بۆ شیعر تەرخان کراوە.

له ژمارەکانی 2، 11، 13 دا ئەحمەد فەوزی 3 شیعر و،
له ژ2 دا حەمدی شیعرێک و
له ژ3 دا عەلی کەمال شیعرێک و
له ژ9 دا م. نوری و عەلی کەمال پێکەوە شیعری وا موبەدەل بو و
له ژ5 دا م. نوری بە کوردی شیعری عەسکەر و
له ژ8 دا بە فارسی شیعرێکی تر و
له ژ10 دا بابەعەلی زادە نوری شیعرێک و
له ژ14 دا ئەحمەد موختار جاف بە سکالایەک، بەشدار بون و
له ژمارەکانی 2 و 3 دا 2 شیعری درێژی تورکیی رەفیق حیلمی و،
له ژ14 دا شیعرێکی درێژی تورکیی عەبدالقادر قەدری بلاوکراونەتەوە.

ناوەرۆکی شیعرەکان بە زۆری سیاسی و پەروەردەیی و ستایشی مەلیکی کوردستانە.

### 1. 3. سەرچاوەی دارایی

یەکـێ لە سـەرچاوەکانی دارایـی غەزەتەکە ئـابونە بـوە. بەلام هەمـو ژمارەکـانی ئیعلانـی تـێدا بلاوکراوەتەوە کە ئەمیش سەرچاوەیەکی گرنگی پارە پەیدا کردن بوە.

## 2. بابەتەکانی

### 2. 1. خولیای سەربەخۆیی

رۆژی کوردستان وەکو لە ژێر ناوەکەیشیدا نوسراوە، رۆژنامەیەکی رەسمی بوە. زمانی حکـومەتەکەی شێخ مەحمود و نوێنەرەوەی بیرورا سیاسیەکانی بزوتنەوەکەی بـوە، بـۆ داکـۆکی لە مـافی ئـازادیی کـورد و سەربەخۆیی کوردستان. بە ئاشکرا نوسیوێتی کە ئەوان نایانەوێ کوردستانی جنوبی بخرێتە سەر عیـراق و، نایانەوێ لەگەل عەرەبدا لە چوارچێوەی یەک دەولەتدا پێکەوە بژین.

ئەوەی لە کوردسـتاندا روی ئەدا لەگەل ویسـتی کاربەدەسـتانی ئینگلیـز و دەولەتـی تـازە دامەزراوەی عیـراق و رۆژنامەکـانی بەغـداد نە ئەگونجـا. لە سـەرەتاوە دژی راوەسـتان و ئەیانویسـت سـلێمانی وەکـو (لیوایەک) بخرێتە سەر عیراق. لە ژ1 یدا عـارف سـائیب بەرپەرچـی رۆژنـامەی (العـراق) و حیزبـی حـوڕی عیراقـی داوەتەوە و، داکـۆکی لە سـەربەخۆیی حکـومەتی کوردسـتان و سـنوری جوگرافیـایی کـردوە و، لە سەرەتای وتارەکەیدا نوسیوێتی:

"غەزەتەی العـراق لە نوسـخەی 738 دا بە عینـوانی (منشـور حـزب الحـر العراقـي) و لە 743 دا بە عینوانی (مەجلیسی ئیدارەی کوردستان) چەند شـتێکی نوسـی بـو، کەوتە بەرچاومـان گۆیـا حیزبـی حـوڕی عیراقی تەلەبی محافەزەی هەمو حقوق و حدودی تەبیعیەی عیراقی لە حکومەتی خۆیان کردوە. کوردستانیشـی بە ناوی لیوای سلێمانی داخل کردوە چونکە مەربـوتیەتی تیجـارەت و ئیقتیسـادیاتی لەگەل بەغـداد زۆرە. وە هەم مەجلیسی روئەسای کوردستانی بە ناوی مەجلیسی ئیدارەی کوردستان داوەتە قەلەم."

پاش ڕاگەیاندنی مەلیکایەتی فەیسەڵ، چەند کەس لە سیاسیەکانی عیراق ویستیان حزبی سیاسی دابمەزرێنن، مەلیک فەیسەڵ ئەمەی پێ باش نەبو، وەزارەتی ناوخۆ دەستی دەستی پێ ئەکردن، بەڵام ئەوان هەر کۆڵیان نەدا. وەزارەتی ناوخۆ هەوڵیدا حیزبێ دروست بێ، یار و نەیاری حکومەتی تێدا کۆ ببێتەوە. ئەمە سەری نەگرت و داواکارانی پێکهێنانی حیزب کۆڵیان نەدا و، بەردەوام داوایان لە وەزارەتی کاروباری ناوخۆ ئەکرد ڕێگەی دامەزراندنی حیزبیان پێ بدرێ. سەرنجام وەزارەتی ناوخۆ لە 2 ی ئابی 1922 دا ڕێگەی کارکردنی بە (الحزب الوطني العراقي) و لە 19 ی ئابی 1922 دا ڕێگەی بە (حزب النهضة العراقية) دا. ئەم دو حیزبە نەیاری حکومەت بون و ڕەخنەیان لێ ئەگرت. لە بەرامبەر ئەوەدا وەزارەتی ناوخۆ لایەنگرەکانی حکومەتی هاندا ئەوانیش حیزبێ پێک بهێنن. لە 3 ی ئەیلولدا (الحزب الحر العراقي) یان دامەزراند. حیزبەکەی حکومەت لە بەر ئەوەی کەسی ئەوتۆی لێ کۆ نەئەبوەوە، بە پێچەوانەی دو حیزبەکەی ترەوە، لە بەر ئەوە فەرمانیدا بە سەرۆکی دەزگای بەڕێوەبەرایەتی لیواکانی عیراق کە فەرمانبەرانی حکومەت لەم حیزبە کۆ ببنەوە.

ژ1 ی جەریدەی (العراق) کە عارف سائیب بەم وتارەی وەڵامی داوەتەوە، لە 1 ی حوزەیرانی 1920 دا لە بەغداد لە جێگەی جەریدەی (العرب) کە دەسەڵاتی ئینگلیز دەری ئەکرد، دەرچوە. ئەگەرچی (رزوق داود غنام) خاوەنی بوە، بەڵام لە هەمان چاپخانەدا چاپ کراوە کە (العرب) ی لێ چاپ کراوە و، ئەویش چاپخانەیەک بوە کە دوای داگیرکردنی بەغداد دەستی بە سەردا گیرا بو. (العراق) تا 1946 بەردەوام بوە.

عارف سائیب لە درێژەی وتارەکەیدا نوسیوێتی:

"ئەم موتالەعاتە کە لەم غەزەتەدا دەرمیان کراوە راستی جای تەعەجوب و تەئەسوفە چونکە بە خەیاڵی هیچ ئەربابی ویجدانێک دا نایە کە شەخسێکی منەوەر ئەمەندە لە حەق و حەد خاریج بێ. ئێمە هیچ ئومێدمان نەئەکرد کە دراوسێیەکی موحتەرەمی خۆمان پێ لە هەمو حقوق و موناسەباتی هەزار ساڵەی ئەم دو حکومەت و میلەتە بنێ، لە باتی راسیمەی موبارەکبایی و تەرویجی ئامال و ئەفکارمان تەجاوزی حدود و حقوقمان بکات. ئەو کەسانە کە ئەم نەوعە قسانە ئەکەن بێ شوبهە دوشمنی وەتەن و میلەتی عەرەبیە و حەزرەتی جەلالەتی مەلیکی عیراقن، چونکە ئەم قسانە لەم رۆژەدا کە مەسئەلەیەکی حەیات و مەمات بە دەستەوە دڵی دۆست و برادەرێکی وەکو ئێمەی پێ رەنجیدە ئەبێ.

"ئەگەر بە نەزرەی ئینصاف تەماشای راست و چەپ و ئیستیقبالی خۆیان بکەن، لێیان مەعلوم ئەبێ کە تەشەکولی حکومەتی کوردستان لە هەمو خصوصێکەوە صەد هەزاران خێر و خۆشی بۆ عیراق تێدایە و بەڵکە دەوامی ئیستیقلال، بەقای مەوجودییەتی عیراق هەر بە واسیتەی بەقای حکومەتی کوردستانەوەیە، لە بەر ئەوە لە سەر هەردو میللەتی ئیسلامیەی مجاویرە کە حقوق و موناسەباتی هەزار ساڵەیان پێکەوە و هەمیشە وەکو برا ژیاون، لازمە بۆ محافەزەی ئیستیقلال و حقوق و حدودی تەبیعییەی یەکتری بە جان و جگەر ئیقداماتی دۆستانە صەرف بکەن.

"تاریخی عالەم و جوغرافیای تەبیعی شایەدێکی عادلە کە میللەتی کورد لە روی زەمین دا هەمو وەختێ نام و نیشانی بوە و، هەمیشە ماددەتەن ئیسپاتی مەوجودییەتی میللیەی خۆی کردوە. هیچ وەختێ لە مەعاریف، صەنایع، تیجارەت، حقوقی بەشەرییەت، لەوازیمی ئینسانییەت، مەدەنییەت، ئەرازی، نفوس و سائیرە لە ئەمسالی خۆی زیاتر نەبوبێ کەمتر نەبوە. ئەگەر ئەزکیای عەرەب تەماشای ئیستاتستیقی ئەم چەند ساڵەیان بکردایە لام وایە ئەمەندە بێ لوتفیان قبوڵ نەدەکرد و بەم نەوعە شوڵیان لێ هەڵ نە دەبڕی. قانون و دەستوری سەربەستی ئەقوام ئەمڕۆ لە دەماغ و رۆحی هەمو فەردێ لە ئەفرادی میللەت دا نەقشی بەستوە.

نیعمەتی حقوق و حدود کە لە مەجلیسی ئەقوام دا بە عەدالەت بەش کراوە، ئێمەیش حیصـەمەندین و بـۆ دەوام و بەقای ئەم حیصەیە بە مەوجودییەتی مادییە و مەعنەوییەمان لەوازیمی فیداکاری بە جێ دێنین."

هەر عـارف سـائیب لە ژ3 دا هـاتۆتەوە وەڵام و بە ناونیشـانی (دیسـان حیزبـی حـورِی عیراقـی) نوسیوێتی:

"بە تاریخی 8 ی رەبیعەلـئەوەل 341 و 316 ژمـارە جەریـدەی (دیجـلە) لە (نجـمە) وە ئیقتیباسـێکی کردوە..."

ژ1 ی جەریدەی (دیجلە) لە 25 ی حـوزەیرانی 1921 دا لە بەغـداد دەرچـوە. رۆژنـامەیەکی رۆژانەی سیاسی بوە. خاوەنەکەی پارێزەر (داود السعدي) و سەرنوسەرەکەی (رشید الهاشمي) بوە. ئەو کاتەی ئینگلیـز خەریکی پێکهێنانی دەوڵەتی عیراقی بوە، دیجلە لایەنگری دامەزراندنی رژێمی جمهوری بوە. ئەم جەریـدەیە لە ساڵی دوەمی‌دا داخراوە.

(نجمة كركوك) لە 15 ی کانونی یەکەمی 1918 بە زمانی عەرەبی لە لایەن داگیرکەرانـی ئینگلیـزەوە لە کەرکوک دەرچوە. پاشان کراوەتە زمانی تـورکی و، دوای دامەزرانـدنی عیـراق بـۆتە رۆژنـامەی رەسـمی حکومەت. دوای 10 ساڵ لە دەرچون وەستاوە.

زێوەر لە ژ9 دا لە ژێر سەردێری: (کوردستان ماڵی کوردانە) نوسیوێتی:

"ئەم دەستورە لە ئامریقاوە دامەزراوە کە پێی دەڵێن (مونرۆئە) یەعنی ماڵی خۆم هـی خـۆمە. کەس حەقی تەجاوزی نیە بەو قاعیدەیە هەمو ئەوروپاییەکانیان لە ئامریکا ئیخراج کـرد. بەو قاعیـدەی (ئامریقـا ماڵی ئامریقاییە) صاف خۆیان مـانەوە حکومەتیـان تەشـکیل کـرد. سـەروەتیان زۆر کـرد. تەرەقییاتیـان موحەیەرەلعقول بو. ئامریقای دێو و درنج نەبون، جن و شەیاتین نەبون، بەشەر بـون، بە سـەعی بـون، بە ئیقدام بون.

"قاعیدەی موسەلەمەی مەنتیقە کولی ئینسانێ قابیلولعیلمە، کە قابیلی عیلم بێ قـابیلی تەرەقـیە. مەگەر کورد ئینسان نیە؟ بەشەر نیە؟ جێگای نیە؟ رێگای نیە؟ حاشا هەموی هەیە. ئینسانی عالم و کـامیلی زۆرە. منەوەرانی کورد ئەمـرِۆ لە شـەرق و غەرب مەوجـودە. ئـێمە لە سـەر جێگـا لەوەرێ قبـوڵ نـاکەین غەیـری ساحێبی خۆی حەیوانی لێ بدا، بۆ ئەم هەمو باغ و باغاتە و شـاخ و شـاخاتە، ئەم مێـرگە رەنگینـانە، ئەم مێرغوزارە نەخشینانە، چۆن قبوڵ بکەین غەیرە روی تێ کا و بە هەوەسـی خـۆی جێگامـان پـێ ئیحسـان بفەرموێ. حاشا ئەوی هۆشی بێ ئەمە قبوڵ ناکا و، دەڵێ: کوردستان ماڵی کوردانە. چونکە ئەم مـوحیتەی کوردە کە بە قەدەر دەوڵەتـی ئیسـپانیا ئەبـێ، هەمـو میلەتێکـی یەک زبـانن، یەک دیـنن، یەک مەزهەبـن، تەشەکولاتی صورەتیشیان یەکە، ئیدیعای حیمـایەی ئەقەلیـات نـاکەین، ئیـدیعای مەوجـودیەتی کیتلەیەکـی عەزیم لە ئیسلام ئەکەین.

"ئێمە وەک هیچ قەومێک نین، لە هەمو شتێک دا یەکین و فەردێکی غەیرەمان لە ناوا نـیە، تـاق و لـۆقە جولەکە یا کلدانیەک بێ لە ئێمە کوردترە و، لە ئێمە زیاتر ئیستیقلالیەتی حکومەتی وەتەنی‌یان ئەوێ. کەوابـێ کەس حەقی نیە تەجاوزی حەقی مەشروعمان بکات: (کوردستان ماڵی کوردانە، ساحێب ویجـدانیش هەمـوی لە لۆزانە) وەک دین و مەزەب، ئایین و زبانمان یەکە، قسەشمان هەموی وایە: (کوردستان ماڵی کـوردانە، حەرامە لە بێگانە)."

لێرەدا دو باس پێویستیان بە رونکردنەوە هەیە:

یەکەم:

سەرکۆماری ئەمریکا مۆنرۆ سـەرەتایەکی داهێنـا کە ئەمریکـا دەس نەخـاتە کاروبـاری ئەوروپـاوە، لە بەرامبەر ئەوەدا دەوڵەتانی ئەوروپاش دەس وەرنەدەنە کاروباری ئەمریکاوە. لە پێوەندیەکانی ناو دەوڵەتـاندا ئەمە بە سەرەتای مۆنرۆ ناسراوە. زێوەر لە (مۆنرۆئە) مەبەستی ئەم سەرەتایە بوە.

دوەم:

روداوەکان پێچەوانەی خۆشباوەڕیەکانی زێوەریان سـەلماند، دەریـان خسـت (هەمـو ئەوانەی لە لـۆزان بون ساحێب ویژدان نەبون) و، کوردیان فەرامۆش و مافەکانیان پێشێل کرد.

رەنگە یەکێ لە بەهێزترینی ئەو وتارانەی کە بۆ داکۆکی لە مافی نەتەوەیی کورد لە رۆژی کوردسـتاندا نوسرابێ، ئەو وتارە بێ کە شێخ نوری لە ژ10 دا لە ژێر سەرناوی (قسەی ناحەق رەد ئەکـرێتەوە) لە وەڵامـی رۆژنامەی (العراق) ی عەرەبی بەغدادی و (نجمة) ی کەرکوکیدا نوسیوێتی:

"هەرچەند تێ ئەفکرم و ورد ئەبمەوە لە غەزەتەی دراوسێکانمان دا مەعەلتەئەسوف تەصـادوفی مەقـالەی هیچ موحەرڕیرێکی حەقگۆ و حەقیقەتپەرستم نەکرد کە بێ تەرەفانە بنوسێ و حەقیقەت ئیهمال نەکا.

"بیلعەکس ئەوی کە حەق و حەقانیەت بێ چاوی لێ ئەقوچێنن و هەرچی بادابـاد سـتونی غەزەتە رەش ئەکەنەوە.

"صیرف بۆ تەمەتوعی زاتیە، یا بۆ تەعقیبی غایە و ئامـالی واهـی ئەیـانەوێ موحیـت، میلـیەت، عیـرق، لیسان، راستی مەوجودیەتی کوردستان بە خۆڕایی ئیهمال و پایەماڵ بکەن و، لەم عەسری بەخشایشی حقوقـدا ئەم میلەتە قەدیمە بە قسە بێ بەش و مەحروم بکەن. کە ئەمەش زۆر موشکیلە چـونکە تـاریخ، جوغرافیـا، بەو خاصیەتانەی کە لە سەرەوە وتمان کورد و کوردستانی لە میلەل و موحیتی سـائیرەی جیـا کـردۆتەوە، کەچـی لەگەڵ ئەمەش دا بەو رەنگە کە عەرزتان ئەکەم، ئیهمالی حەقیقەت ئەکرێ.

1. لە غەزەتەیەکی نجمەدا کە تاریخی 5 ی کانونی سانی 339 بو، دیم ئیقتیباسـی لە غەزەتەی العـراق ەوە کرد بو لە ولایەتی موصل دا کوردستانی تەنها بە سلێمانی داوەتە قەڵەم.

2. وتویەتی لە ولایەتی موصل دا 60 هەزار نفوس عەرەبی تێدایە و جنوبی موصلیش کامیلەن عەرەبە.

3. ئەو تورکمانەی کە لە ولایەتی موصل دایە زۆر کەمن و عەلاقەیان بە کـورد و کوردسـتانەوە نـیە و بەڵکو کوردەکانیش ئەصلەن تورکن.

4. سلێمانی کە ئەڵێن بەیعەتی بە مەلیک فەیصەڵ نەکردوە تەکزیبی ئەکەین.

"ئێمە یەعنی هەمو میلەتی کورد بە هەمو مەوجودیەتمـانەوە ئەم بەیـانەتە هەڵبەسـتراوە کە ئەسـنادی لە بەعزێ پیاوی گەورە و ساحێب ویجدان ئەدەن، بە کولی رەد ئەکەینەوە:

1. لە ولایەتی موصل دا کوردستان بە تەنها سـلێمانی دراوەتە قەڵەم وانـیە بـیلعەکس غەیـری قەسـەبە مولحەقاتی موصل کامیلەن کورد و کوردستانە. عەقرە، زاخۆ، دهۆک، بارزان، عیمادیە، ئەربیل، کەرکوک، کفـری و سائیرە و مولحەقاتی ئەمانە و عەشایەری ئەترافیان چین و بە چ زبانێک قسە ئەکەن؟

2. غەیری قەسەبەی موصل کە لە چاو ئەم ولایەتەدا ئەقەلیەت تەشکیل ئەکا، هیچ مەوقیعێکـی تـر شـک نابەم کە کورد نەبێ و غەیری حوریەت و ئیستیقلالیەتی خۆی ئارەزوی تەبەعیەتی هیچ قەومێکی تر بکا.

3. ئەو تورکانەی کە لە ولایەتی موصل دا ساکنن و بە تورک ناو براون عیرقەن، ئەخلاقەن، تەبیعەتەن، کورد و داخلی خەریتەی کوردستانن، لە بەر ئەوەی کە عەلاقە و مەربـوتیەتی موحیتەیـان لەگەڵ کوردسـتان دا هەیە هیچ قوەتێ جیای ناکاتەوە.

4. لە وەقتی خۆی دا بۆ تـابیعیەت و عەدەم تـابیعیەتی سلێمانی بە عیـراق لە سـەر ئەوراقـی مەتبـوع رەسمەن لە تەرەف حکـومەتی فەخـیمەی بریتانیـاوە لە هەمـو ئەفـرادی ئەهـالی پرسـیار کـرا هـیچ کەس ئەم بەیعەتەی لا باش نەبو. لە پاشا بۆ ئەم موختاریەتە دو ساڵ مۆڵەت بە سلێمانی درا دیسان لە پاش ئەم مودەتە هەر لامان باش نەبو و ئەم کەیفیەتە لە حکومەتی عیراق مەعلومە زۆر تەعەجوب ئەکەم ئەو مـوحەرپرانە چـۆن تەکزیبی حەقیقەت و قەڵەمیان ئەم نەوعە شتانە ئەنوسێ.

"لە ولایەتی موصل دا لیسان کە تەعەددوی پەیدا کردوە واسیتەی ئەمەیە:

"تاریخەن سابیتە کە ئەم موحیتی کوردستانە بە واسیتەی هجومی غەرب بۆ شەرق و شـەرق بـۆ غەرب، موتەمادیەن مەمەڕ و مەعبەری ئۆردوی ئەقوامی شەرق و غەرب بوە و تولی مودەت لێـرەدا مـاونەوە، لە مـودەی ئیقامەتیان دا بیلتەبع ئیختیلاتیان لەگەڵ کوردەکان دا کردوە.

"ئەوانەی کە سـاکینی دەشـت و ئەرازییەکـی موسـەتەح بـون لە بەر ئەوەی کە زیـاتر لە مەسـکونی شاخەکان ئیختیلاتیان لەگەڵ کراوە بە مروری زەمان زبانیان تێکەڵاوی یەکتری بوە، فەقەت ئەوانەی کە لە شاخ و داخدا مەسکونن تا ئەمڕۆ کامیلەن محافەزەی زبانی خۆیان کردوە.

"عەرەبی‌یش کە قیسمەن لە کوردستان دا موکـالەمەی پـێ ئەکـرێ ئەسـبابی چـیە؟ مەعلـومە کە لە زهوری ئیسلامیەت دا تەعەسـوبی دیـانەت لەنـاو ئیسـلام دا چەنـد زۆر بـو. لەگەڵ ئەوەش دا مەرکەزی خەلافەتی عەباسیەکانیش بەغدا بو کە لەگەڵ کوردستان دا موناسەبەتێکی زۆری ئیقتیسادی و موحیتی-یان هەیە. بەم رەنگە زبانی عەرەبی و تـورکی لە بەغـدادەوە و نـازانم لە کوێـوە وردە وردە سـیرایەتی کـردە کوردسـتان و ئەتـوانم بڵـێم لە شـەرقی دیجـلەوە هەتـا ئـاراس بە ئیعتبـاری ئەسـاس کـورد و کوردستانە.

"کەوابو بۆ ویجدانی ئەو موحەرپرە، ئەو ساحێب مەعلوماتە موتەئەسیفم کە موقـابیلی بەداهەت خیلافـی حەقیقەت قەڵەم بێنێتە سەر کاغەز.

"ئێمە میلیەتمان ئیدراک و ئیفهام کـردوە لە بەر ئەوە محـافەزەی ئەم حەقە مەشـروعەیە هەر ئەکەیـن و خیلافـی حەق بەیـانەت ئەگەر ببینـین رەدی ئەکەیـنەوە. وە ئەم حەقە لە حکـومەتی فەخـیمەی بریتانیـا داوا ئەکەین."

## 2.2. باسی کۆنفرەنسی لۆزان

سەرکەوتنی مستەفا کەمال لە دەرکردنی هێزەکانی یۆنان و، بە دەسهێنانی دۆستایەتی روسیای سۆڤێتی و، بێلایەنکردنی ئیتاڵیا و فەرەنسا، دەستگرتنی بە سەر زۆری ولایەتەکانی تورکیادا، بریتانیـای ناچـار کـرد بیر لە پێداچونەوەی سیاسەتی خۆی بکاتەوە بەرامبەر بە تورکیای نوێ. مستەفا کەمال ئامادە نەبو مل بدا بۆ جێبەجێکردنی پەیمانی سـیڤەر. لە 21 ی شـوبات تـا 14 ی ئـازاری 1921 کۆنفرەنسـی لەنـدەن بەسـترا. نوێنەری حکومەتەکەی مستەفا کەمـال کە ئەنـقەرەی کـرد بـو بە پـایتەختی خـۆی و نـوێنەری حکـومەتەکەی سوڵتان محەمەدی شەشەم کە لە ئەستەموڵ دائەنیشت، بانگ کرا بون بـۆ ئەم کۆنفرەنسـە. بریتانیـا داوای لە نوێنەری حکومەتەکەی مستەفا کەمال کرد کە لەو کاتەدا زۆری قەڵەمڕەوی تورکیای هێنا بـوە ژێـر دەسـەڵاتی خۆیەوە، پەیمانەکە ئیمزا بکەن، بەڵام ئەوان ئامادە نەبون ئەمە قبوڵ بـکەن. بەڵکـو تورکیـا داوای گێـڕانەوەی موسڵی ئەکرد. کۆنفرەنسی لەندەن بێ ئەوەی بگاتە ئەنجامێکی سەرکەوتو کۆتایی هات، بەڵام لەم کۆنگرەیەدا تورک تێ گەیشـت کە بریتانیـا شـلە بـۆ بەسـتنی پەیمـانێکی نـوێ لە بـاتی پەیمـانی سـێڤەر و بریتانیـاش تێگەیشت کە تورک ئامادەیە بۆ قۆناغێکی نوێی لە یەک گەیشتن.

لە 22 ی تشرینی دوەمی 1922 دا کۆنفرەنسی یەکەمی لۆزان بە ئامادە بونی نوێنەری تورکیای کەمالی دەستی پێ کرد. ئەگەرچی بریتانیا و هاوپەیمانەکانی لەم کۆنفرەنسەدا پەیمانی سیڤەریان بە تەواوی پشت گوێ خست، بەڵام نەگەیشتنە رێککەوتن.

لە 23 ی نیسانی 1923 دا کۆنفرەنسی دوەمی لۆزان دەستی پێ کرد. ئەمجارەیان گەیشتنە رێککەوتن. پەیمانێکیان بەست کە بە (پەیمانی لۆزان) ناسراوە، بەڵام کێشەی موسڵ بە چارەسەر نەکراوی مایەوە. لەمادەی 2 ی ئەو پەیمانەدا هەردولایان پێکهاتن لە سەر ئەوەی لە گفتوگۆیەکی دو قۆڵی دۆستانەدا کێشەکە بە لایەک دا بخەن. خۆ ئەگەر لە ماوەی 9 مانگ دا نەیانتوانی لە سەر چارەنوسی موسڵ رێک بکەون، ئەوا کێشەکە بخەنە بەردەم کۆمەڵەی گەلان، بۆ ئەوەی ئەو دوا بڕیاری لە سەر بدا.

رۆژی کوردستان بایەخێکی تایبەتی داوە بە کۆنفرەنسی لۆزان. هەم هەواڵەکانی کۆنفرەنسەکەی بڵاوکردۆتەوە، هەم لێدوان و وتاری لەسەر نوسیوە. ئەگەر لە کۆنفرەنسی ئاشتی پاریس دا جەنەراڵ شەریف پاشا نوێنەرایەتی کوردی ئەکرد، ئەوا ئەم جارەیان لە کۆنفرەنسی ئاشتی لۆزاندا کورد هیچ ئامادەبونێکی نەبوە. سەرچاوەکانی ئاگاداری و زانیاریەکانی (رۆژی کوردستان) تەنیا رۆژنامەکان، بە تایبەتی رۆژنامەکانی عیراق بوە.

رۆژی کوردستان فریای کۆنفرەنسی یەکەم کەوتوە، بەڵام فریای هی دوەمی نەکەوتوە، چونکە ژ15 ی کە دوا ژمارەیەتی، لە 3 ی مارتی 1923 دا دەرچوە. واتە پێش دەسپێکردنی کۆنفرەنسی دوەمی لۆزان کە لە 23 ی نیساندا بوە.

لە ژ2 دا کە لە 22 ی تشرینی دوەمدا دەرچوە 2 هەواڵی لە بارەی لۆزانەوە نوسیوە:

یەکەمیان:

لە ژێر سەردێڕی: (کەمالیەکان قبوڵی مەجلیسی صولحی لوزانیان کردوە) دا ئەڵێ: "ئەستامبول 30 ی تشرینی ئەوەل، کەمالیە(کان) موافقەتیان کردوە کە مەجلیسی صولح لە لۆزان ئینعیقاد بکا. غەزەتەکان زۆر ئەهمیەت ئەدەن بە قبوڵ بونی رەئفەت پاشا بۆ حزوری شاهانە و موشەرەف بون و زیارەتی بە قەدەر چوار سەعات. وەها یەقین بوە کە نفوزی شەخسی و مەوقیعی زاتی شاهانە زیاتر کەسبی قوەتی کردوە."

دوەمیان:

لە ژێر سەردێڕی: (فکری ئامریقا لە حەق مەجلیسی لۆزان) دا، ئەڵێ: "پاریس 31 ی تشرینی ئەوەل، لە سەر دەعوەت کراوی ئامریقا بۆ لۆزان سەفارەتی ئامریکا جوابێکی موفەصەلی نوسیوەتەوە لەم جوابەدا بە محافەزەی جەمعیاتی خەیریە و شەعائیری دینیە و بە حیمایەتی ئەقەلیات وەکو حقوقی میلەتە پچکۆلەکان وە یا میلەتێک کە حەسەبەلمەجبوریە لە داخلی حکومەتێکی غەیرەدا مابێتەوە و حوریەتی تامەی تیجارەت و سەربەستی و کۆمەڵەکانی ئەستامبول و سیاسەتی سەربەستی بیحار، ئیقراری کردوە."

لە ژ4 دا رایگەیاندوە: "عەسکەری جەعفەر پاشا: عەسکەری جەعفەر پاشا بۆ حەلی بەعزێ مەسائیلی عیراق تا دو مانگ لە لۆندەرە ئەمێنێتەوە." مەبەستی جەعفەر عەسکەری کە لەو کاتەدا وەزیری جەنگی حکومەتی عیراق بوە، لە چونی بۆ لەندەن ئاگاداری و بەشداری بوە لە کۆنفرەسی لۆزاندا، بە تایبەتی بۆ داکۆکی لە کێشەی موسڵ لە بەرامبەر داواکاری تورکیادا.

لە ژ5 دا نوسیوێتی: "حدودی تورک لە ئەوروپا: لوزان 27 ی مینهو، مەجلیسی لۆزان لە زەرفی هەفتەیەک دا حدودی تورکیای لە ئەوروپادا دانا نەهری مریج بو بە حدود."

لە ژ6 ی 27 ی کانونی ئەوەلی 1338دا، خاوەنی غەزەتەکە م. نوری لە ژێر سەردێڕی (ولایەتی موصل لە لۆزان دا) نوسیوێتی:

"لەم رۆژانەدا لە بەینی مورەخەسی تورک و عەرەب دا لەسەر ولایەتی موصڵ مونازەعە و موناقەشە جەرەیان ئەکا.

"وە دیسان لە مەجلیسی لۆزان دا مومەسیلێک بەناوی ئاسوری و نەستوری لە ویلایەتی موصڵ دا ئیدعای حکومەتێکی موستەقیلە ئەکا.

"ولایەتی موصڵ کە بە ئیعتیباری عمومی کوردن، بە ناوی میلیەتەوە مودافەعە وە یا غەصبی ئەم ولایەتە بۆچی لە تەرەف ئەقوامی سائیرەوە تەلەب بکرێ؟

"ئێمە غافڵ و عاتل و بە وەتەن و موڵکی خۆمان بێگانە تەبیعی عالەمیش چاوی لە وەتەن و مڵکمان بڕیوە.

"هەتا دوێنێ مەعزەرەتێکی وەلەو نامەقبوڵیش بێ بۆمان، فەقەت ئەمڕۆ عەلا مەلئناس خەریکی تەئسیسی حکومەتین و، خەریکین لە بەینی ئەقوام دا ئیسپاتی مەوجودیەت بکەین. نابێ گەورە و بچوک، بەرامبەر بە حقوقی مەشروعەی خۆمان، ئەوەندە لاقەید بین.

"تورک، عەرەب وە یا ئاسوری حەقی دەعوایان لە ولایەتی موصڵ دا مەوجودیەتێکی قەلیلی قەومیەتیانە. یەعنی نە تورک نە عەرەب، لەمەدا مودافەعەی نەفسی وەتەنی خۆیان نیە، بیلعەکس حیرسی جاە وە یا رەفاهی قیسمێکی قەلیلی جنسی خۆیان تەلەب ئەکەن. ئەگەر مەجلیسی ئەقوام ئەم نەوعە موتالەباتە مەشروع بزانێ، ئایا مودافەعەیەکی حقوقی کورد لە تەرەف ئێمە واقیع بێ چۆنی تەلەقی ئەکا؟ ئێمە ناتوانین جوابی ئەمە بدەینەوە چونکە دەرحەق بە موقەدەراتی کوردستان لە فکری مەجلیسی لۆزان بێ خەبەرین. یەعنی ئەو حکومەتانەی کە مورەخەسیان ناردۆتە لۆزان، لە پرۆژەیان دا حکومەت وە یا قەومیەتێکیان بۆ کورد تەسەور کردوە یان نا؟ موحافەزەی ئەقەلیات تەشمیلی کورد کراوە یان نا؟

"ئەڵبەتە خەیر! چونکە ئەم موناقەشاتە لە میلیەت زیاتر لەسەر ئەرازییە کە لە بەینی تورک و عەرەب دا تەرجیحەن لازمە بە کامیان تەسلیم بکرێ. بەحسی محافەزەی ئەقەلیاتیش، دائیر بە تەشکیل حکومەتێکی نەستوریە، ناوی کورد مەعەلتەئەسوف هەر مەوزوعی بەحس نیە. دیارە مەجلیسی لۆزان لەمەدا حەقیەتی؛ چونکە لەسەر ماڵێکی بێ ساحێب و بێ حیس شەڕ بکرێ، دیارە زەرەر و نەفعی ئەو ماڵە تەسەور ناکرێ. ئەگەر لە بەینی مونازعین دا ئیتیلاف حاصل بێ مەسئەلە حەل ئەکرێ. ئەم نوقتەیە زۆر بە ئەهمیەت ئەخەینە بەر نەزەری زیمامدارانی ئومور و ئیدارەمان. وە ئەم فرسەتە بە ئەهمیەتە عەرزی میلەتی کورد ئەکەین.

"ئەمڕۆ کە سوڵح خەریکی تەقەڕورە و، میلەتی کوردیش بۆ تەئسیسی حکومەتێک لەگەڵ حکومەتی بریتانیادا خەریکی موزاکەرەیە لازمە ئەم نوقتەی حەیاتیەیە زۆر بە وزوح حەل و فەسل بکرێ.

"تاکو بە خۆرایی تەفرە نەخۆین و گولە بە سێبەر و خەیاڵەوە نەنێین.

"تەلەبی ئێمە لە مەجلیسی لۆزان موحافەزەی ئەقەلیات نیە، مودافەعەی حەقی حەیاتی میلەتێکی گەورەی سەربەخۆی ساحێب وەتەنە.

"زاتەن دائیر بە تەشکیلی حکومەتێکی کوردیە وەقتی خۆی لەسەر موزەکەرەیەک کە لە تەرەف کورد عەلی پاشا زادە نامیق بەگەوە بە مەجلیسی سان ریمۆ تەقدیم کرابو لە مەجلیسی مەزکوردا دور و درێژ ئیستیقلالیەتی کوردستان مەوزوعی بەحس کرابو. مەعەلتەئەسوف لە بەر ئەوەی کە تالعی سولحی عمومیی موساعەدەی نەکرد و، لەو مەجلیسە دا سولح تەقەڕوری نەکرد لەبەر ئەوە مەسئەلەی کوردستانیش مەسکوت عەنهو مایەوە. ئەمجارە لە مەجلیسی لۆزان ئومێد وا دەکەین کە کوردستانێکی موستەقیل لە

داخلی حدودێکی جوغرافی و تەبیعی دا بۆمان تەشکیل بکا و، هەمو نەوعێ حقوقی مەشروعە و حەقی حەیاتیەمان بداتێ."

هەر لە ژ6 دا م. نوری لە وتارێک دا بە ناونیشانی (ولایەتی موصل لە بەینی 3 دا) نوسیوێتی:

"لە خسوس عەرەبیەت و مەنسوبیەتی موصڵ بە عیراق لە تەرەف غەزەتەکانی بەغدادەوە تا ئێستا موختەلیف مەقالات نوسراوە.

"لە بەینی مەندوبی تورکیا و مەندوبی عیراق جەعفەر پاشای عەسکەری لە مەجلیسی لۆزان دا بەر وەجهی ئاتی موباحەسە جەرەیان ئەکا.

"مەندوبی تورکیا ئەڵێ: لەبەر ئەوەی کە موصڵ و مولحەقاتی عەرەب نیە بیلعەکس ئەکسەر سەکەنەیان کوردە ئەبێ ویلایەتی موصڵ بدرێتەوە بە تورکیا.

"مومەسیلێکی ئاسوری ئەڵێت: لە بەر ئەوەی کە موصڵ بە ئیعتیباری ئەساس ولایەتێکی ئاسوریە ئەبێ حکومەتێکی موستەقیلەی ئاسوری لەوێ دا تەشکیل بکرێ.

"لە جوابی ئەم ئیدیعایانەدا جەعفەر پاشای مەندوبی عیراق ئەڵێت: ئەم ئیدیعایانە ئیدیعایەکی باتڵ و بێ دەلیلە. بەڵێ مولحەقاتی ویلایەتی موصڵ کامیلەن موڵکی کورد و میلەتی کوردە. موافیقی موعاهەدەی سیڤەر، کە لە بەینی دوەلی حولەفادا کراوە، ئیستیقلالیەت و ئیدارەیەکی سەربەخۆیی دراوە بە کوردستان، ئێستا خۆیان حکومەتێکی مونتەزەمیان تەشکیل کردوە. "حەتا حکومەتی عیراق کە کوردستانی موسڵی بە جوزئێکی عیراق حساب کردبو، بۆ قبوڵ و عەدەم قبوڵی تابیعیەتی عیراق ساڵێک مودەتیان بۆ تەخسیس کرا، لەپاش موروری ئەم مودەتەش کوردستان دیسان تەبعیەتی عراقیان نەکرد لەبەر ئەمە بە ئیتستیحسالی حەقی قەومیەت و میلەتی خۆیان نائیل بون. حاڵی حازر یەک وجود بۆ ئیدامەی حەیاتی موستەقیلەی خۆیان سەعی و کۆشش ئەکەن.

"ئەلئان بە حکومەتێکی موستەقیلەی کوردیە ئەناسرێن و مەلیکیان (مەلیک مەحمود ئەوەلە) ئەمجا لەبەر ئەمە هیچ حکومەتێک حەقی تەلەب و پایەماڵ کردنی حقوقی ئەم میلەتەی نیە.

"مەسئەلەی نەفسی قەصەبەی موسڵ دەمێنێتەوە، ئەمانیش عەرەب و موتەحیدی حکومەتی عیراقن و جوزئێکی غەیر مونفەصیلەی عیراقن و، خۆیان بە بەختیار ئەزانن کە لە ژێر نفوزی مەلیکی عیراق دا بن.

"ئەمجا مەندوبی تورک ئەڵێت: بە نەزەرەی سەوقەلجەیشی و جوغرافیاوە ئەم مەنتیقەیە بۆ تورکیا لازمە.

"لەم جوابەدا مەندوبی عیراق ئەڵێت: ئەگەر ئەم ئەحوالی جوغرافیایە بۆ تورکیا ئیحتیاجێک نیشان بدا، بۆ عیراق زیاتر نیشان ئەدا، کەوا بێ عیراق لەم خسوسەوە بۆچی ئیستیفادە نەکا؟ ئەگەر وەزعیەتی جوغرافیا مەوزوعی بەحس بکرێ حدودی عیراق لە موسڵیش تەجاوز ئەکا. هەتا ئەگاتە ماوەرای جەزیرەی ئیبن عومەر و، ئەگەر بە ئینساف تەدقیق بکرێ تاریخیش بۆ ئەمە شاهیدە. لە (العراق) هوە.

"لەم موباحەسەو موکالەمەیەدا وا دەرئەکەوێ کە لە سورەتی دائمیا لەسەر لاکی ئێمە شەڕە. ئێمەش کە ساحێب حەقین و موڵکی وەتەنە حەقی مەشروع و سەریحی ئێمەیە، لە عالەم بێ خەبەر، بە هیچ سورەتێ مودافەعەی حەقی خۆمان ناکەین.

"ئیستیرحام لە زیمامدارانی ئومور و ئیدارەمان ئەوەیە کە حقوقی کوردستان فەرامۆش نەکرێ و لە لۆزان ئەم حەقە داوا بکرێ، چونکە:

"ئەمڕۆ ڕۆژێکە زۆر نازک و فرسەتە، هەمو ئانێکی ئەم زەمانە ئەوەندە بە قیمەتە کە جەبری مافاتی قابیل نیە.

"ئەمرۆ رۆژێکە کە موقەڕەراتی هەمو میلەتێکی ساحێب حەق لەو مەجلیسە دا مەوزوعی بەحس ئەکرێ و هەمو قەومێ نائیلی ئامالی موقەدەسەی میلیەتی خۆی ئەبێ.

"ئەمرۆ رۆژێکە کە ئەگەر بە غەفلەت رابیوێرین موقـابیلی هەمـو سـانیە یەکـی دەبـێ دە سـاڵ عەزاب و ئەسارەت بکێشین.

"ئەمرۆ رۆژێکە سبحەینێ هەرچەند بە مازی ناوی ئەبەین بـەڵام بـۆ ئێمـە ئیسـقبالێکی رونـاکی تـێدا تەئمین ئەکرێ.

ئەمرو رۆژێکە کە نابێتەوە، ئەگەر لەم رۆژەدا فەرامۆش بکرێین، ئەبەدیە عەزابێکی لایەتەناهیە.

"ئەمرۆ رۆژێکە کە بۆ ئیسـتیردادی حەقـی قەومـیەت و میلـیەت، لە هەمـو قەومێکـی سـاحێب ئیـدراک، یەکێک بۆ ئیسپاتی حەقی مەشروعیان موتلەقەن ئەچێتە ئەو مەجلیسەوە، حەتا چێـویش بنێـین بە ورگیـانەوە هەر ئەچن.

"ئەمرۆ رۆژێکە حەق ئیسپات ئەکرێ و ناحەق قبوڵ ناکرێ.

"کەوا بێ حقوقی خۆمان بۆ دەستی خۆمان نەدرێ، مەسئەلەیەکی مەشهوری کوردیە تا ماڵ راوەستا بـێ مزگەوت حەرامە. (فانتبهو)."

لە ژ9 دا چەند هەواڵێکی بڵاو کردۆتەوە:

"موصل و تورکیا: ئەو ئیستاتستیقەی کە بریتانیا کە بە نیسـبەت عەدەدی سـوکانی تـورکی موصـلەوە داویە تەئسیرێکی زۆری کردوە.

"لۆزان 19، مەرەخەسی تورکیا لە نەتیجەی ئەو موزاکەراتە کە لە خسوس موصلەوە جەریانی کـرد بـو، هێشتا جوابی نەداوەتەوە. لێرە ئەم تەئخیرە ئیدیعا لە خسوس موصلەوە زۆر زەعیف ئەبینرێ.

"تورکیا لە خسـوس ئەقەلیـاتەوە فکـری ئیئتیلافـی قبـوڵ کـردوە: لـۆزان 14 مینهـو، موسـتەنەد بە ئەساساتی ئەو ئیتیفاقەی کە لەگەڵ مجاویرەکانیان کردویە حکومەتی تورکیا قبوڵی فکری دوەلی ئیئتیلافـی کردوە.

"موەفەقیەتی لۆرد کیرزن لە لۆزان: بینا لە سەر موزاهەرەتی مومەسیلی فرەنسـە و ئیتالیـا و لەسـەر سەباتی خۆی لە مەجلیسی لۆزان دا موەفەقیەتی ئیحراز کردوە. عیصمەت پاشـا حـورپەتی ئەقەلیـاتی قبـوڵ ئەکا.

"مەرەخەسی حیجاز لە لـۆزان: مەرەخەسـی مەلیکـی حیجـاز دقتـۆر نـاجی عصـیم گەیشـتۆتە لـۆزان و مـوزەکەرەیەکی داوە بە لـۆرد کیـرزن دەڵـێ مـوڵکی حیجـاز جمهـوریەت نـیە بـیلعەکس زەمـانی حـورپەت و ئیستیقلالیەتی میلەتی عەرەب حلولی کردوە."

لە ژ14 دا هەواڵی (ئینقیتاعی مەجلیسی لۆزان) ی نوسیوە:

"لـۆزان 4 ی مینهـو: لە بەر ئەمە کە عیصـمەت پاشـا ئیمتیـازاتی حوکـامی ئەجنەبـی رەد کـردۆتەوە موزاکەراتی لۆزان ئینقیتاعی هات. مەرەخسەکان لەگەڵ لۆرد کیرزن بە شەمەندەفەر لە لۆزان جیا بونەوە."

### 2. 3. هەواڵ

هەواڵەکانی جۆراوجۆرن. هەندێکیان هەواڵـی نـاوخۆ و هەنـدێکی تریـان هـی دەرەوەن. سـەرچاوەی هەواڵەکـانی نـاوخۆ ئەبـێ داوودەزگاکـانی حکـومەتی کوردسـتان و سـەرچاوە تایبەتیەکـانی خۆیـان بـوبێ. سەرچاوەی هەواڵەکانی دەرەوەیش بە زۆری (نجمە) بوە، زۆرجاریش ئاماژەی بەمە کردوە.

**2. 3. 1. تەبشیر**

یەکێ لەو هەواڵە گرنگانەی کە بڵاویکـردۆتەوە ئەوەیە کە لە ژ7 ی 30 کـانونی ئەوەلـی 1338ڕۆمـی (1922) دا لە ژێر ناوی (تەبشیر) دا نوسیوێتی:

"بینا بە تەلغرافێ کە لە مەرەخەسی کوردستان لە بەغـدادەوە هـاتوە جەنـابی کەپتـان چەپـمەن وەکیلـی مەندوبی سامی بە ناوی حکومەتی مەتبوعەیەوە تەبریکی ئیستیقلالیەتی کوردستانی کردوە.

"ئێمەیش تەبریک و ئیعلانی ئەم سەعادەتە موبارەکەی قەومی کورد ئەکەین. وە لە موقابیلی ئەو لوتـف و مەرحەمەتە کە حکـومەتی فەخـیمەی بریتانیـا دەرحەق بەم مـیلەتە پچکـۆلەی کـوردە عەرزی تەشـەکورات و مەمنونیەتی حکـومەتی فەخـیمەی بریتانیـا ئەکەیـن. وە ئومێـد و ئیسـتیرحام ئەکەیـن کە لەمەولاش لە هەمـو خسوسێکەوە بۆ تەرەقی و تەعالی کوردستان هەمراهی و موعاوەنەتمان بفەرموێت.

"30 ی کانونی ئەوەلی 338 مەلیکی کوردستان مەحمود"

لەم هەواڵە مەبەستی ئەو ڕاگەیانـدنە هاوبەشـەیە کە حکـومەتی بریتانیـا و عیراقـی لە 24 ی کـانونی یەکەمـی 1922 دا بڵاویـان کـردۆتەوە و، لە هەنـدێ سـەرچاوەدا لە بەرئەوەی لە کریسـمس دا دەرچـوە، بە (ڕاگەیاندنی کریسمس) ناویان بردوە، ئەمەیش دەقەکەیەتی:

"حکومەتی خاوەن شکۆی بریتانیا و حکومەتی عیراق، دان بە مافی ئەو کـوردانەدا کە لە نـاو سـنوری عیراق دا ئەژین، بۆ ئەوەی حکـومەتێکی کـوردی لەو سـنورانەدا دابمەزرێـنن و، هیـوادارن کە تـاقمە کـوردیە جیاوازەکان، بە زوترین کات، لە ناو خۆیان دا بـگەنە ڕێککەوتنێـک لەسـەر شـێوەی ئەو حکـومەتەی خۆیـان ئارەزوی ئەکەن و لەو سنورەدا کە ئەیانەوێ درێژ ببێـتەوە و، دەسـتەیەکی نـوێنەرایەتی بەرپـرس بنێـرن بـۆ بەغداد بۆ باسی پێوەندیە سیاسی و ئابوریەکانیـان لەگەڵ حکـومەتی خـاوەن شـکۆی بریتانیـا و حکـومەتی عیراق."

ئەوەی جێگەی سـەرنجە هەواڵەکە دەقـی ڕاگەیانـدنەکەی نەنوسـیوەتەوە، بەڵکـو کە ئەم دو دەقە لەگەڵ یەک بەراورد ئەکرێ، هەندێ جیاوازی تێدا ئەبینرێ.

**2. 3. 2. هەڵکردنی بەیداخی کوردستان**

شێخ مەحمود، بۆ ئەوەی ناوچەکە ببەستێتەوە بە حکومەتی کوردسـتانەوە، لە دەزگـای بەرێـوەبەرایەتی ناوچەکەدا کەوتۆتە ئاڵوگۆڕ. هەندێ لە قایمقامەکانی کە لە سەردەمی ئینگلیزدا دانرا بون گۆڕی بە لایەنگرانی خۆی، بە تایبەتی شێخەکانی خزمی.

بەگزادەکانی جاف لە هەڵەبجە، ئەوانەیان کە عادلە خـانم سـەرۆکایەتی ئەکـردن، ئەگەرچـی بە روکەش دۆستایەتی‌یان بۆ شێخ مەحمود دەرئەبڕی، بەڵام لە ناکۆکی نێوان ئینگلیز و شێخ مەحمـودا پشـتیوانی‌یـان لە ئینگلیزد ئەکرد و، نەیانئەویست هەڵەبجە بخرێتە ژێر دەسەڵاتی شێخ مەحمودەوە. ئینگلیز کاتی خۆی ئەحمەد موختار جافی بە قایمقامی هەڵەبجە دانا بو.

لە ژ4 دا هەواڵی هەڵکردنی بەیداخی کوردستانی لە هەڵەبجە بەمجۆرە ڕاگەیاندوە:

"لە کاغەزێ کە لە ئەلەبجەوە هاتوە: حەزرەتی رەئیسی داخلیەی کوردستان جەنابی شێخ محەمەد غەریب ئەفەندی کە بۆ ڕێکخستنی ئیشوکاری ئەم قەزایە تەشریفی هێنا بو لە پـاش مواصـەلەت فەرمـونی بە ئەلەبـجە بەگزادەی جاف و هەورامان و ئەهالی داخل و خاریج بیلعموم حازر بون، بەیـداخی موبـارەکی ئیسـتیقلالیەتی کوردستان هەڵکرا و نوتق ئیراد کرا.

"لە سەعادەت و یومینی ئەم ڕۆژە موقەدەسە لە هەمو لایەکەوە ئەسەری شادمانی و سرور ئەبینرا.

"خودا بە دەوامی ئیجلال و شەوکەتی حەزرەتی مەلیکی موعەزەم مەلیک مەحمودی ئەوەل هەمو لایەک موەفەق بیلخێر بکات. ئامین. رۆژی کوردستان"

شێخ مەحمود گومانی لە ئەحمەد موختار کردوە هاوکاری ژێر بە ژێری ئینگلیز بکا، لە بەر ئەوە گرتویانە. لە ژ14 دا پاکانەیەکی بە شیعر بۆ شێخ مەحمود نوسیوە و تکای ئازاد کردنی لێ ئەکا، بەم جۆرە دەستی پێ کردوە:

صەبا عەرزی خلوص و بەندەگیم و هەم دوعاخوانی
بیە بۆ خدمەتی شاهی موحیتی گشت سلێمانی
بڵێ قوربانی تۆ بم، ئەی صەلاحەدینی ئەیوبی!
بە زۆری پەنجە وەک حەیدەر، بە سیما یوسفی سانی
ئەبێ ئەم قەومە ئەمرۆ شاد و خەندان و سەناگۆ بن
کە چونکە تۆ شەهنشاهـ و رەئیسی جەمعی کوردانی
لە دەست کافر نەجاتمان بو بیحەمدیلاهی وەلمینهو
لە سایەی دەست و تیغ و هیمەتت تۆ شێری یەزدانی
ئینجا ئەڵێ:
لە پاش ئەم ئیحتیرامەتە بڵێ بەو شاهی دەورانە
چ جورمێکی هەیە ئەحمەد کە کردوتە بە زیندانی
ئەگەر شایەد لە خدمەتتا خرابەی ئەو بوە سابیت
بە لوتفی خۆت عەفوی کە، چونکە هەر خۆت ساحێب ئیحسانی
کە جورمێکی نیە تا کەی لە حەبسا دانیشێ قوربان
لە تەنهایی لە فکری چۆتەوە ئادابی ئینسانی
ئەگەر داوای کەفیلی لێ ئەفەرموی حازرە یا خود
مەلیک تەئمین ئەکا سەد جار بە ئایین و بە ئیمانی
هەتا مردن وەکو بەندە لە خدمەت شاهی کوردستان
حەیاتی خۆی فیدا کا بۆ هەمو ئەمرێک و فەرمانی
من ئەم حەبسەم لە لا فەخرە بە شەرتێ سەروەری کوردان
لە حەق ئەم بەندەیەی خۆیە بمێنێ لوتفی جارانی
...

بە ئیمزای (ئەحمەد موختار ئەوسا قایمقام ئێستا مەحبوس) کۆتایی بە شیعرەکەی هێناوە.

لە ژ5 یش دا لەسەر چەمچەماڵ نوسیوێتی:

"مەفرەزەی عەسکەریە و پۆلیس کە لە مەرکەزی حکومەتی عەلیەی کوردستانەوە بۆ چەمچەماڵ ئیعزام کرا بون بە سەلامەتی و موەفەقیەت گەیشتونە ئەوێ و بەیداغی موبارەکی کوردستانیان لەوێ هەڵکردوە. ئەمرۆ ئەم بەیداغە موبارەکە لە ئافاقی بازیانیش دا تەمەوج نمای مەهابەت و حورمەتە.

"خودا ئەم بەیداغە موبارەکەمان بەردەوام ئەکات."

لە ژ7 دا هەواڵی هەڵکردنی بەیداخی کوردستان لە رانیە بەمجۆرە راگەیاندوە:

"ئیعلان: مەفرەزەی عەسکەر و پۆلیس کە لە پایتەختی کوردستانەوە بۆ قەزای رانیە ئیعزام کرا بون، لە پاش ئەوە لە لایەنی عمومی روئەسا و ئەشراف و موعتەبەران و مەئمورینی حکومەتەوە ئیستیقبالێکی زۆر

موحتەشـەم کـران، بە کەمـالی عیـزەت و حـورمەتەوە داخلـی مەرکەزی ڕانـیە بـون و، بەیـداغی موبـارەکی کوردستانیان لەوێ هەڵکردوە. ئەلحەمدولیلا ئەو بەیداغە عەزیزە ئەمڕۆ لە موحیتی ڕانیە تەمەوج نمای ئـورمەت و هەیبەتە."

شێخ محەمەدی کوڕی شێخ ڕەزای تاڵەبانی (خالیصی) لەو سەردەمەدا قایمقامی ڕانیە بوە، شێخ مەحمـود قایمقامێکی تازە بۆ ڕانیە دائەنێ، کە لەشکر قایمقامی نوێ ئەبەن بۆ ڕانیە دەس بکـا بە کـار، مـاڵی قایمقـامی کۆن، واتە ماڵی خالیصی، تاڵان ئەکەن. پاشان شێخ مەحمود کە ئەمە ئەبیستێ ئەنێرێ بە دوای خالیصـیدا بـۆ ئەوەی دڵنەوایـی بکـا. خالیصـی پـۆزش ئەهێنێـتەوە لە هـاتن. بەڵام شـعرێکی بـۆ ئەنێـرێ کە بە یەکـێ لە شاکارەکانی شیعری کوردی دائەنرێ. لە سەرەتاکانیدا ئەڵێ:

لە پاش دامان و پا ماچکردن و عەرزی دوعا خوانی
وەرپین دەس پێ ئەکا بەچکەی گەماڵی پیری گەیلانی
ئەڵێ: بۆچی دەرت کردم؟ ئەگەر پاست نەکەم بە خوا
هەمو چەڵتوکەکەت ئەخوا بەرازی قوتبی ڕەبانی
...
لە لای تۆ وەک یەکن، بێ فەرقن لە خزمەت تۆ
شەهێن و حاجی لەقلەق، شێر و ڕێوی، مورشید و جانی

ئەم شیعرەی خالیصی و شیعرەکەی ئەحمەد موختار جاف لەسەر یەک وەزن و یەک قافیەن.

دور نیە تاڵان کردنی خالیصی لەسـەر ئەو شـیعرەی بـێ کە لە ژ50 ی (پێشـکەوتن) دا دژی تەکـیە و خانەقا و دەروێشایەتی بڵاوی کردبوەوە، کە تێدا ئەڵێ:

چۆن دەزانم خوا بە ڕاستی حەقە یەک نیوەی دوە
ئەی سلێمانی دەزانم تۆش پەیت پێ بردوە
دەنگی دەف، نوکەی درۆی صۆفی لە تەکیە و خانەقا،
ئیستەکەیش ماوە؟ یاخو ئاشبەتاڵیان کردوە؟

## 2. 3. 3. کوژرانی جەمال عیرفان

لەم ماوەیەدا جەمال عیرفـان کە ڕۆشـنبیرێکی پێشـکەوتنخواز و نوسـەرێکی زانـا بـو، لە نـاو شـاری سلێمانیدا کوژرا. جەمال عیرفان چەندین وتاری فەلسەفی، ئابوری، کۆمەڵایەتی، لە ڕۆژنـامەی (پێشـکەوتن) دا بڵاوکردبوەوە. وەکو ئەڵێن بە فیتی یەکێ لە مەلا کۆنەپەرستەکانی سلێمانی لەسەر بیری ئازاد کوژراوە. ڕۆژی کوردستان لە ژ5 ی دا لە چوارچێوەیەکی ڕەش و لە ستونی یەکەم و لە لاپەڕەی یەکەمـیدا لە ژێـر سـەرناوی: (ضیاعێکی گەورە) دا نوسیویتی:

لە ئەزکیـا و منەوەرانـی وەتەن عیرفـان زادە جەمـال بەگ شـەوی چوارشـەمەی رابـوردو 13/12 ی کانونی ئەوەلی 338 لە تەرەف ئەشخاسی مەجهولەوە دەسترێژێکی لێ کرا دو گولله ئیصابەتی کـرد پـاش 3 سەعات وەفاتی کرد. حەقیقەتەن زیاعی ئەم زاتە بۆ کوردستان مـوجیبی تەئەسـور بـو. بە نـاوی ئەشـراف و عمومی ئەهالی مەملەکەتەوە لە عائیلەی موحتەرەمەیان بەیانی تەعزیەت و تەمەنای تەسلیەی ئەکەین."

هەرچەندە شێخ مەحمود ئاگای لەم کارە نەبـو، بەڵام چـونکە لە بکوژەکـانی نەکـۆڵیەوە و نەپێچـایەوە گلەیی هاتە سەر. زۆر لە ڕۆشنبیرەکانی کە لە دەوری شێخ مەحمود کۆبوبونەوە، تەرە کرد.

**2. 3. 4. جۆراوجۆر**

هەندێ لە هەواڵەکانی کە لە ژ1 و 3 دا نوسراوە، بریتیە لە (ئیرادات). باسی ئەو ئیرادانەیە کە شێخ مەحمود مەلیکی کوردستان بۆ تەعینکردنی کاربەدەستانی دەری کردون.

هەندێکی تریشی وەکو لە ژ1 و 6 دا لە ژێر ناوی (تەشریف) دا نوسیویە، باسی گەڕانەوەی ئەفسەرانی کورد و هاتنی سەرانی خێڵەکانە بۆ سلێمانی.

ژمارەیەکی زۆر هەواڵی جیهانی تێدایە، رەنگە بۆ ئەو سەردەمە باش و بە کەڵک بوبن، بەڵام بۆ رۆژگاری ئەمرۆ نرخێکی ئەوتۆیان نیە.

**2. 4. ریپۆرتاج**

یەکێ لەو بەڵگە گرنگانەی لەم رۆژنامەیەدایە، وێنەی ئەو بروسکانەیە کە لە نێوان سمکۆ و شێخ مەحمودا ئاڵوگۆڕ کراون، بە تورکی و بە کوردی لە ژ7 دا بڵاوکرونەتەوە.

لە سەرەتاکەیدا نوسراوە:

"بە تاریخی 9 ی رەبیعولئەوەلی 341 و ژمارە 70 ی غەزەتەی ستارەی ایران موخالیفی حەقیقەت بەعزێ نەشریاتی کرد بو، بۆ تەسحیحی ئەفکاری عمومی سەرداران و منەوەرانی کورد مەجبور بوین موخابەراتێ کە لە بەینی حەزرەتی مەلیکی کوردستان و جەنابی سمکۆ و سەید تەها دا جەرەیانی کردوە دەرج و نەشری بکەین..."

بە دوای ئاڵوگۆڕی ئەم بروسکانەدا، سمکۆ سەردانی شێخ مەحمودی کردوە لە سلێمانی. لە ژ8 ی 10 ی کانونی سانی 1338 دا ریپۆرتاجێکی لە سەر ئەم سەردانە نوسیوە. وەکو نمونەیەک لە ریپۆرتاجی ئەو سەردەمە لێرەدا ئەینوسمەوە:

"قەهرەمانی کوردستان

"حەزرەتی ئیسماعیل ئاغای سمکۆ

"هەفتەی لەمەوپێش جەنابی تاهیر ئەفەندی سەرکاتبی حەزرەتی ملوکانە بە قوەتێکی سواریەوە تەشریفی حەرەکەتی کرد بۆ ئیستیقبالی حەزرەتی قەهرەمانی کوردستان جەنابی ئیسماعیل ئاغا.

"رۆژی 7 ی کانونی سانی 39 کە جەنابی ئاغا قۆناغی نزیکی سلێمانی بوەوە حەزرەتی رەئیس ئەلروئەسا جەنابی شێخ قادر ئەفەندی کە لە مەعیەتی موبارەکی دا قومانداني تابوری ژاندرمە بە قوەتێکی زۆرەوە، کولی ئەشرافی مەملەکەت مەوجود بون، بۆ ئیستیقبالی حەرەکەت فەرمابو و، نزیکی مەنزڵی تەشریفی چو بە پیریەوە.

"رۆژی 8 ی کانونی سانی 39 عمومی دەوائیری حکومەت تەعتیل کرا. ئەهالی دوکانیان هەڵگرت. عمومی ساداتی کیرام و مەئمورانی عەسکەری و مولکی و روئەسا و ئەشراف و منەوەران و ئەهالی موحتەرەمە بۆ مەراسیمی ئیستیقبال نزیکی نیو سەعات بە سواری و بە پیادە حەرەکەت و رویان کردە رێگای ئیستیقبال و ئینتیزار.

"جەنابی رەئیسی داخلیە، لەگەڵ جەنابی کاپتن چەپمەن وەکیلی فەخامەتی مەندوبی سامی دا بە ئوتومبیل و، سایری روئەسای حکومەت قیسمەن بە سواری، قیسمەن بە ئوتومبیل، تا ساعەتێ رێگا ئیستیقبالیان کرد. هەرچی روئەسای عەشایەری کە لە سلێمانی حازر بون هەر کەسە بە خۆی و دەستە و دایرەیەوە بە سورەتێکی مونتەزەم و جیاواز داخلی مەراسیمی ئیستیقبال بون.

"لە پاش تەرتیب و تەنزیمی ئەم مەراسیمە، گەرونەی حەزرەتی جەلالەتی مەلیکی موعەزەم (دامە شەوکەتەهو) ساعەت لە شەشی کوردی لە شارەوە نزیکی نیو ساعەت ڕێگا بۆ ئیستیقبالی تەشریفی فەرمو. وە لە جێگای مەخسوس ئینتیزار و ئیسراحەتیان فەرمو.

"کە تەشریفی موبارەکی حەزرەتی ئاغای نامدار نزیک بوە لە ریاسەتی قوماندانی قیوای ملی دا، عمومی قەتاعات سواری میللی ملوکانە ساعەتێ ڕێگا لە شار دور تا کەناری شار لە هەردو لای ڕێگادا سەفبەستەی ئیحتیرام و سەلام بون و عەرزی تەعزیمات و تەبریکیەتیان کرد.

"لە پاش قەدرێ کە حەزرەتی ئاغای نامدار لەگەڵ جەنابی ئەحمەد ئاغای برای موحتەرەمی و سایری خزمان و مەعیەتی موبارەکی و روئەسای کیرام و زیلئیحتیرامی عەشیرەتی پشدەر جەنابی بابەکر ئاغا و جەنابی عەباس ئاغا و سایری روئەسای پشدەر و مەنگوڕ و ئوجاغ لە خزمەت جەنابی رەئیس ئەلروئەسا حەزرەتی شێخ قادر ئەفەندیدا بە تەواوی نزیکی مەوقیعی مەخسوسی جەلالەتی حەزرەتی مەلیک بونەوە. ئەوسا گەردونەی حەزرەتی تاجداریش تۆزێ چوە پێشەوە. هەر دو تەرەف دابەزین. موسافەحە و بەیانی خۆشئامەدی و تەبریکات و لەوازیمی موحیبەت و حورمەتی فەوقلعادە لە هەر دو جیهەتەوە بەجێ هێنرا. وە با ئیرادەی ملوکانە حەزرەتی ئاغای موحتەرەم لە گەردونەی مەخسوسەی ملوکانەدا ئەخزی مەوقیعی فەرمو، وە لە خزمەت حەزرەتی مەلیکدا گەڕانەوە بۆ شار.

"ئومەرا و زابتان و عەساکیری مەنسورەی کوردستانیش کە لە خاریجی شاردا بە سورەتێکی مونتەزەم سەفبەستەی ئیحترام و سەلام بون، راسیمەی تەعزیمات و سەلامیان ئیفا و کولی گۆرانی وەتەنی خۆشیان خوێندەوە و دوعای تەرەقی و موەفەقیەتی حکومەت و میلەتی کوردیان کرد. لەتەرەف جەلالەتی حەزرەتی مەلیک و حەزرەتی ئاغای نامدارەوە تەفتیشی عەسکەرەکان کرا و یەکە یەکە مەزهەری سەلام بون.

"لە دوایی دا بە عمومی عەودەت کرایەوە بۆ خانو و مەوقیعی مەخسوسی حەزرەتی ئاغای موحتەرەم و لە بەر دەرگا تەوەقوفیان فەرمو لەوێ دا هەمو شاگردانی مەکتەب بە سورەتێکی ڕێک و پێک لە سەفی حورمەت و ئینتیزاردا راوەستان. کولی گۆرانی و ئەشعاری کوردی وەتەنی بە تەئسیریان خوێندەوە کە دڵی سامعینی ئەکرد بە ئاو.

"لە تەرەف یەکێ لە شاگردانی مەکتەبەوە بە موناسەبەتی ئەو ڕۆژە موبارەکە و ئەو زاتە موحتەرەمەوە نوتقێکی جوان و رەوان خوێنرایەوە، کە عەرزی خۆشئامەدی حەزرەتی ئاغای نامدار، دوعای بەقای موەفەقیەت و تەرەقی حەزرەتی مەلیک و میلەتی کورد بو.

"لەم ئیستیقبالە مونەتەزەمە و لەم مەنزەرە موحتەشەمە عادەتەن عالەمی کوردیەت و قەومیەت ئیحیا بوەوە. لە پاش دا موسافرینی موحتەرەمە لە خزمەت حەزرەتی جەلالەتی مەلیک دا تەشریفیان چوە مەقامی خسوسی خۆیان.

"حەقیقەت ئەم ڕۆژە ڕۆژێکی تاریخی و زۆر موقەدەسە. ئێمە ناتوانین دەرکی مەعالی و مەدح و سەنای و خەدەماتی وەتەن پەروەرانە و ئیقداماتی فیداکارانەی حەزرەتی ئاغای نامدار بکەین. لاکین بە ناوی عمومی میلەتی کوردەوە عەرزی خۆشئامەدی و تەبریکاتی حەزرەتی ئەم قەهرەمانی کوردستانەوە و رەفیقاتی موحتەرەمی ئەکەین و، بە تەشریف هاوردنیان ئیعلانی مەسار و ئیفتیخار و سەعادەت و موەفەقیتی هەمو قەومی کورد لە بارەگاهی کیبریا ئیستیرحام ئەکەین. (ڕۆژ کوردستان)"

سمكۆ لەو كاتەدا لە هەلومەرجێكی دژواردا بو. دوای ئەوەی لەشكری ئێران هێرشی كرد بوە سەر و شكاند بوی و بارەگاكەی داگیر كرد بو، چوبوە سنوری توركیا. لەوێش لەشكری تورك هێرشێكی شەوانەیان كرد بوە سەری، بە پەلەپڕوزێ خۆی دەرباز كرد بو. بەڵام كوڕەكەی و گەنجینەكەی و كەلوپەلەكانی كەوتبوە دەس تورك. خۆی هات بوە ناو كوردستانی عیراقەوە، پێوەندی لەگەڵ ئینگلیز كرد بو. بۆ بینینی كاربەدەستانی ئینگلیز هات بوە نزیك هەولێر. لەو كاتەدا پێوەندی شێخ مەحمود و ئینگلیز تێك چو بو. ئینگلیز بەڵێنی هیچ هاوكاریەكیان بە سمكۆ نەدابو، بەڵام رایان سپارد بو نفوزی خۆی لە لای شێخ مەحمود بەكاربهێنێ بۆ ئەوەی لە دۆستایەتی تورك دوری بخاتەوە. سمكۆ كە هاتە سلێمانی لە باتی ئەوەی شێخ مەحمود لە دۆستایەتی تورك پەشیمان بكاتەوە، خۆیشی لەگەڵ تورك كەوتە گفتوگۆ بۆ ئەوەی كوڕەكەی ئازاد بكەن و كەلوپەلە گیراوەكانی بۆ بگێرنەوە. ئینگلیز كەوتە هەڕەشە لە شێخ مەحمود و لە خەڵكی سلێمانی و، داوای لە سمكۆ كرد بۆ ئەوەی توشی زەرەر و زیان نەبێ، سلێمانی بە جێ بهێڵێ.

لەو ریپۆرتاجەدا دور و نزیك باسی ئەم هەواڵانەی تێدا نیە. تەنانەت باسی ئەوە ناكا كە سمكۆ بۆچی هاتۆتە سلێمانی و، گفتوگۆكانی لەگەڵ شێخ مەحمود چی بوە و، بۆچی وا بە پەلە سلێمانی بە جێ هێشتوە، لە كاتێك دا هەر لەو ژمارەیەدا كە ئەم ریپۆرتاجانەی تێدا بڵاوكراوەتەوە، سوپاسنامەی سمكۆی بەمجۆرە بڵاوكردۆتەوە:

"لە سەر دەعوەت و ئیرادەی حەزرەتی جەلالەتمەئاب مەلیكی كوردستان و سەید ئەلسادات، جەنابی مەلیك مەحمودی ئەوەل (دامە شەوكەتەهو) بە كەمالی شەوق و شەتارەتەوە بۆ كەسبی شەرەفی زیارەتی حەزرەتی مەلیكی موعەزەم هاتمە سلێمانی.

"لە هەمو خسوسێكەوە مەزهەری تەوەجوهات و عینایاتی حەزرەتی ملوكانە بوم، لە بەر ئەوە بەهەمو مەوجودیەتمەوە عەرزی تەشەكور و ئیفتیخار ئەكەم و، لە شێوەی ئینسانیەت و حسیاتی قەومیەت پەروەرانەی كە لە مەراسیمی ئیستیقبال دا لە تەرەف جەنابی رەئیسەلرونەسا و ساداتی كیرام و رونەسا و مەئمورانی عەسكەری و مولكی حكومەت و ئەشراف و مەنەوەران و ئەهالی كوردستانەوە دەرحەق بە شەخسی من رەوا بینرابو كولی موتەشەكیر و موفتەخیرم، بەلكو هەر فەلاكەت و ئەزیەتێ كە لە رێگای خزمەتی ئازادی و خەلاسی ئەم میلەتەدا بەسەرما هاتوە لەبیرم چۆتەوە، بە واسیتەی رۆژی كوردستانەوە بەیانی مەمنونیەت و مەسروری لە هەمو برادەرانی كوردی سلێمانی ئەكەم. خودا هەمو لایەكمان موەفەق بكات. سمكۆ"

## 2. 5. بابەتی جۆراوجۆر

لە ژ8 دا لەسەر گرنگی (ماكینەی چاپ) نوسیوێتی:

"... عەرز و بەیانە میلەتێ مەتبوعاتێكی نەبێ كە بێ بە واسیتەی ئیسپاتی زبان و مەوجودیەتی میلیەی ئەو میلەتە لە ناو میلەل و ئەقوامی سائیرە بۆ ئەوە ناشێ پێی بڵێیت میلەت.

"ئەو میلەتە ئەگەر موتەعەدید ماكینەی چاپی بو ئەتوانێ لە هەمو نەوع عیلم و فەنێ تەئلیفات وە یا تەرجومە بكات و چاپ بكرێ، وەلائەقەل لە هەفتەیەك دا 3 دەفعە غەزەتەی پێ دەر بكا..."

لەو ماوەیەدا دەس كراوە بە كۆكردنەوەی پارە بۆ دابینكردنی سەرمایەی كڕینی دەزگای چاپ، هەر لەم ژمارەیەدا ناوی بەشێ لەوانەی بڵاوكردۆتەوە كە پارەیان داوە بۆ ئەم مەبەستە.

زێوەریش لە ژ12 دا بۆ پشتیوانی لەم پرۆژەیە بە ناونیشانی (ماکینەی مەتبەعە) وتارێکی نوسیوە. لەگەڵ ئەو پرۆژەیەدا داوای کردنەوەی مەکتەبی صەنایعی کردوە.

عەزیز حیکمەتیش لە ژ14 دا لە ژێر ناوی (صەنایع) دا داوای کردنەوەی مەکتەبی صەنایعی کردوە. هەر دو وتار داوا ئەکەن خەڵک بیکاتەوە.

سەعید زەکی کە مامۆستا بوە لە خوێندنگەی قادری لە ژ11 دا لە سەر (تەربیە و تەدریسی منداڵان) ی نوسیوە و، لە ژ13 یش دا (ئیحتیاجمان چیە).

لەو کاتەدا گفتوگۆی لۆزان لە ئارا بوە. تورک داوای هەڵوەشاندنەوەی کاپیلاتسیۆنی کردوە. م. نوری بۆ رونکردنەوەی ئەم باسە وتارێکی لە تورکیەوە کردوە بە کوردی لە ژ15 دا بڵاوکراوەتەوە.

## 3. لە روی هونەری رۆژنامەوانییەوە

رۆژی کوردستان بە شێوە و قەوارە وەکو پێشکەوتن و بانگی کوردستانە. بە هەمان چاپخانە و بە هەمان حەرف چاپ کراوە. کارکەرانی چاپخانەکە هەر ئەوانەی پێشو بون. زۆری نوسەرەکانیشی هەمان نوسەرانی رۆژنامەکانی پێش خۆی بون. گرنگیی رۆژی کوردستان لەوەدایە کە درێژەی بە کاری رۆژنامەوانی داوە و، نەریتی رۆژنامەوانی چەسپاندوە.

## 4. بۆردومانی سلێمانی و راوەستانی رۆژی کوردستان

لە 24 ی شوباتی 1923 دا هێزی ئاسمانی بریتانی، چەند بۆمبایەکی لە نزیک سلێمانی بەردایەوە. هەروەها (ئیعلان)ێکی چاپکراویشی بە ئیمزای (مشاویری کەرکوک) کە مێجەر ئەدمۆنس بوە، بەسەر شاردا بڵاوکردەوە. لە ئیعلانەکەدا نوسیوێتی:

"... لە دڵی حەزرەتی مەندوبی سامیدا نیسبەت بە صەداقەت و راستکاری ئەولیای ئومـوری سلێمانی شک پەیدا بوە، لە بەر ئەمە بە واسیتەی ئەم ئیعلانە حەزرەتی مەندوبی سامی ئەمر دەدات کە لە پاش وصولی ئەم ئیعلانە دەستبەجێ، بە بێ موسامەحە یان ئیعتیزار، شێخ مەحمود ئەفەندی و ئەعزای مەجلیسی لیوا بە رێ-ی کەرکوکەوە بێنەوە بەغداد..."

ئینجا کەوتۆتە هەڕەشە و نوسیوێتی:

"ئەگەر لە ئەسنای پێنج رۆژ لە تاریخی ئەم ئیعلانەوە شێخ مەحمود ئەفەندی و ئەعزای مەجلیسی لیوای سلێمانی بە عەزمی بەغداد بە کەرکوک نەگەیشتون سەتوەتی حکومەتی بریتانیە ئیزهار و ئیجرا دەکرێت..."

شێخ مەحمود ئامادە نەبوە بچێ بۆ بەغداد. ئینگلیزیش هەڕەشەکەی خۆی جێبەجێ کردوە و کەوتۆتە بۆمبارانی سلێمانی. رۆژی 2 و 3 ی مارت فرۆکەکانی هێزی ئاسمانی بریتانی سلێمانییان بۆردومان کرد. لە ژمارە 15 دا کە لە 3 ی مارتی 1923 دا دەرچوە، بەم بۆنەیەوە بە ناونیشانی (تەخلیەی سلێمانی) نوسیوێتی:

"وەقتێ کە حکومەتی ئینگلیس سلێمانی تەخلیە کرد ئەهالی خاریج و داخل لە پاش ئەوەی کە خەبەری ئەو واقیعە کتوپڕەیان زانی تا مانگێکیش کەس نەیئەزانی چیە و لە بەر چی بو وە بۆچی تەخلیە کرا. لەمەدا چ سرێک، چ سیاسەتێک هەیە؟

"بەهەر نەوعێ و هەر تەشەبوسێ بو تا ورود و مواصەلەتی حەزرەتی مەلیک لە تەرەف جەنابی شێخ قادر ئەفەندیەوە ئاسایشی عمومی تەئمین کرا.

"لە پاش مواصەلەتی حەزرەتی مەلیک وەزعییەتی مەمـلەکەت خـرایە شـکڵێکی حکـومەتیەوە. ئەم شـکڵە فەوقەلمەئمولە لە سایەی هیمەتی خودا پەسندانەی حەزرەتی مەلیکەوە ئەمە پێنج شەش مـانگە دەوام ئەکـا و، لە زەرفی ئەم مودەتەدا بۆ تەرویجی ئامالی حکومەتی ئینگلیز و تەشکیلی حکومەتێکی کوردییە لێرەوە موتەعەدید هەیئەت، مورەخەص بۆ کەرکوک و بۆ بەغداد بۆ موزاکەرە رۆیشـتون و هـاتون و ئەم مـوحیتە دائـیمەن بـۆ رۆژێکـی وا، یەعنـی بـۆ تەشـکیلی حکـومەتێکی کـوردییە، چـاوەڕوانی لـوتفی حکـومەتی ئینگلیـز بـون و، موتەمادییەن سەعی بۆ ئیدامەی دۆسـتایەتی حکـومەتی ئینگلیـز کـردوە، کەچـی مەعەلتەئەسـوف موقابیـل بەم دۆستایەتیە حکومەتی ئینگلیز ئەم میللەتە مەزڵومە بە بۆمباردومان تەهدید و تەخویف ئەکا. تێناگەین مەعنـای چیە و لە بەر چیە؟

"عەجەبا حکومەتی فەخیمە لە تەرەف کوردێکەوە تەهدید کرا کە ئێرەی تەخلیە کرد، یا خود موقابیل بە خۆی هیچ قوەتێ لە کوردستان دا شک ئەبا کە مودافەعەیەک بکا؟

"ئەگەر غەیری حورییەت و ئازادی میللییەی خۆمان، دەعوایەکی ناحەقمان لێ واقیـع بـوە باشـە، وەئـیلا ژن، منداڵ، فەقیر و خانوی ئەم میللەتە گوناهی چیە کە بۆمباردومان ئەکرێ؟

"یا خود حکومەتی فەخیمەی ئینگلتەرە لە خوێنڕشتنی ئەم میللەتە چ ئیستیفادەیەک ئەکا؟ تێ ناگەین."

هەلومەرجی سلێمانی بە تەواوی شێوا. شێخ مەحمود بۆ ئەوەی بیانوی ئینگلیـز ببـڕێ لەگەڵ هێـزەکەی بەیانیی زوی رۆژی 4 ی مـارت کشـایەوە بـۆ نـاوچەی سـورداش. چاپخانەکەیشـی گـوێزایەوە ئەشـکەوتی جاسەنە. ئیتر رۆژی کوردستان لە دەرچون کەوت. ئینگلیز بە تەنیا بە بۆمبـارانی سـلێمانی دانەکەوت، بەڵکـو هێزی زەمینیشی ناردە سەری. رۆژی 28 ی مایسی 1923 هێزی بریتانی چوە ناو شاری سلێمانیەوە.

## 5. جێگەی لە رۆژنامەوانیی کوردیدا

رۆژی کوردسـتان جـگە لەوەی تۆمـارێکی بە نرخـی روداوەکـانی سـەردەمی خـۆیەتی، رەنگـدانەوەی بیروبۆچونی هەڵبژاردەی کورد و ئاواتەکانیانە لە بواری سەربەخۆیی سیاسـی و، پێشـکەوتنی کـۆمەڵایەتی و ئابوری و پەروەردەییدا.

ئەمـیش، کە سـێیەمین رۆژنـامەی سـلێمانیە، یەکـێکە لە پێشـەنگە دامەزرێنەرەکـانی قوتابخـانەی رۆژنامەوانیی سلێمانی.

**تێبینی:**

جەمال خەزنەدار سەرلەنوێ هەمو ژمارەکانی (رۆژی کوردستان) ی لە بەغداد چاپ کردۆتەوە

## 4. 5. بانگی حەق

اعلانات به دیریك
۳ آنه دسیتریت
تاریخ تأسیسی




بوهموشتیك مراجعت به
قرارگاهی عمومی دکریت
۲۸ مارت ۱۳۳۹

ناشکی به طوپ و بومبا سر افرازه بانگ حق

سیاسی ، ادبی ، اجتماعی ، غزته‌یکی رسمیه له قرارگاهی عمومی
اردوی کوردستان طبع دکری

غایه و املی استحصالی حقوق کوردانه

| سال ۱ | ژماره ۱ | پنجشمبه | ۲۸ مارت ۱۳۳۹ | ۱۱ شعبان ۱۳۴۱ |
|---|---|---|---|---|


بسم الله الرحمن الرحیم

[ انما المؤمنون اخوة ]

۱ — له بیاننامه‌ی پیشو که به تأریخ ۸ مارت ۱۳۳۹ نوسرابو ، دور و دریژ بیانمان کردبو که ایمه مقصد و غایه‌مان سعادت و سلامتی اسلام و قوم نجیب کورده ، ایمه به دو رابطه برای یکین ، اولا اسلامین ، ثانیا همو کوردی . ام دو رابطه‌یه ایمه‌ی وها یکدل و یك امل کردوه که هیچ کس به هیچ لونی ایمه له یك جوی ناکاته‌وه ، له عزم و مجاهدات ملیه‌ی خومان فراغت ناکه‌ین .

۲ — وقتی که طیاره‌ی انکلیز شمار سلیمانی به بومبا بومباردمانی کرد و مال ومندال وعیال بی‌گناه و بی دسته‌لاتی ام ملته معصومه‌ی آگر باران کرد ، ماهیت و معنای مواعید و معاونتی انکلیز به تواوی معلوم بو . ام ظلم و وحشتیه له عصر مدنیته‌دا بو معنای انسانیت و بشریت شائبه‌یکی قبیح خونریزانه‌یه . ام بخایمه مسئولی ، احتمال بعضی مامورین انکلیز که تابع هوا و هوس و سوء اجتهادات سقیمه‌ی خویان بون ، امه البت زمان حسابی ده‌بینی ، ام بخایمه که وا بسر شار

اعلانات به دیریك ۳ آنه دسیتریت

تاریخ تأسیسی ۸ مارت ۱۳۳۹

بوهموشتیك مراجعت به قرارگاه عمومی دكریت





ناشکی به طوپ و بوسیا سر افرازه بانك حق

سیاسی ، ادبی ، اجتماعی ، غزتهیکی رسمی به له قرارکاه عمومی
اردوی کوردستان طبع دکری

غایه واملی استحصالی حقوق کوردانه

سال ۱    زماره ۳    پنجشمبه    ۱۲ نیسان ۱۳۳۹    ۲۶ شعبان ۱۳٤۱


## تبریك رمضان مبارك

به شرف حلول ( شهر رمضان الذی انزل فیه القرآن ) [بانك حق] تبریك همو عالم اسلام دەکا . خوا ملت کورد وکو اقوام سائره له جهل و اسارت سر افراز و به کمال سرور و موفقیت نائل آمال ملیهٔ خوی وحقوق سیاسیه ومدنیه بکا . آمین بحرمت سید المرسلین .

---

## بو قوماندان مفرزهٔ هشتم پیاده

۱ — طرف طرف مراجعت به ایمه دکری که هیئتیکی مدافعهٔ ملیه تشکیل بکن ، لسر آرزو و مراجعات متوالیەی ملت کورد ام هیئته ذاتاً له خویەوه تأسیس کردوه .

۲ – هتا ایسته له طرف صاحبیکی غیرت و مروت ۷۰۰۰ و له طرف ذاتیکی ترەوه ۳۰۰۰ روبیه و له طرف ذاتیکی ثالث و رابع هر یکی باری شکر به ناوی اوردو و مجاهدین و قوای ملیەی کوردستان تبرع کراوه ام ذواته نشر و اعلانی ناوی خویان موافق نەبینی ، له طرف ارباب خویەوه معلومه ، اعمال صالحه بی‌مکافات نابینی خوا ام ملته اسلام و کورده بگەینی به حق و استقلال خوی .

۳ – بو مجلس وکالت مدافعەی ملیه تعلیماتیك گیرایه قلم صورتی به پچراوەیی روانه کرا . ایمه اساساً بو استراحت و سعادت اسلام و کورد ترجیح همو مشکلاتیکمان کردوه لسر ایمه واجبه همو آرزوایکی ملت اسلام و کورد بجی بهینین لبرامه ایوەیش به موجب ام تعلیماته بکونه فعالیت .
[ وما النصر الا من عندالله ] .

باش قوماندان و ملك کوردستان

محمود

## 1. هەلومەرجی دەرچونی

2 ی مارتی 1923 فڕۆکەکانی هێزی ئاسمانی بریتانی هاتنە سەر سلێمانی. هەندێ بۆمبیان هاوێشت، بەڵام لەبەر خراپیی هەوا نەیانتوانی کارەکانیان بە تەواوی ئەنجام بدەن.

3 ی مارت، هێزی ئاسمانی بریتانیا ناوشاری سلێمانی بۆمباران کرد. لەو رۆژەدا دوا ژمارەی کوردستان دەرچوە.

4 ی مارت، رۆژێک دوای بۆمباران، بەیانی زوو شێخ مەحمود سلێمانی بە جێ هێشت. لەگەڵ هێزەکەی روی کردە ناوچەی سورداش. لەگەڵ خۆی چاپخانەکەی هێنا بو، لە ئەشکەوتی جاسەنە دایمەزراند.

28 ی مارت، ژمارەی یەکەمی (بانگی حەق) لە ئەشکەوتی جاسەنە دەرچو.

## 2. دەرچونی

لە ژێر ناوی رۆژنامەکەدا نوسراوە:

"ناشکێ بە تۆپ و بۆمبا سەرئەفرازە بانگی حەق

"سیاسی، ئەدەبی، ئیجتیماعی، غەزەتەیەکی رەسمیە، لە قەرارگاهی عمومی ئۆردوی کوردستان تەبع دەکرێ

"غایە و ئەمەلی ئیستیحصالی حقوقی کوردانە"

ژ1 ی لە 28 ی مارتی 1339 و

ژ3 ی لە 12 ی نیسانی 1339 لە ئەشکەوتی جاسەنە چاپ کراوە.

ژ1 و 3 هەر یەکەی 2 لاپەڕەن. ژ1 پاشکۆیەکی هەیە دواتر چاپ کراوە، لە ژ3 دا دوبارە کراوەتەوە. ناوەرۆکی هەر دو ژمارە رێنمایی جەنگیە، شێخ مەحمود بۆ هێزەکانی نوسیوە.

## 3. ناوەرۆکی

### 3. 1. ناوەرۆکی ژمارە 1:

"بسم الله الرحمن الرحيم

"(انما المؤمنون اخوة)

1. لە بەياننامەی پێشو کە بە تەئریخی 8 ی مارتی 1339 نوسرابو، دورودرێژ بەیانمان کردبو کە ئێمە مەقسەد و غایەمان سەعادەت و سەلامەتی ئیسلام و قەومی نەجیبی کوردە. ئێمە بە دو رابیتە برای یەکین، ئەوەڵەن ئیسلامین، سانیەن هەمو کوردین. ئەم دو رابیتەیە ئێمەی وەها یەکدڵ و یەک ئەمەل کردوە کە هیچ کەس بە هیچ لەونێ ئێمە لە یەک جوێ ناکاتەوە، لە عەزم و موجاهەداتی میللیەی خۆمان فەراغەت ناکەین.

2. وەقتێ کە تەیارەی ئینگلیز شاری سلێمانی بە بۆمبا بۆمباردمان کرد و ماڵ و منداڵ و عەیالی بێ گوناه و بێ دەسەڵاتی ئەم میللەتە مەعصومەی ئاگرباران کرد، ماهیەت و مەعنای مەواعید و موعاوەنەتی ئینگلیز بە تەواوی مەعلوم بو. ئەم زوڵم و وەحشەتە لەم عەصری مەدەنیەتەدا بۆ مەعنای ئینسانیەت و بەشەریەت شائیبەیەکی فەجیع و خوێنڕێژانەیە. ئەم فەجایعە، مەسئولی ئیحتیمال بەعزێ مەئمورینی ئینگلیز کە تابیعی هەوا و هەوەس و سوئی ئیجتیهاداتی سەقیمەی خۆیان بو، ئەمە ئەڵبەت زەمان حسابی دەبینێ. ئەم فەجایعە کەوا بە سەر شاری (ل2) سلێمانی هاتوە وە ئەم تەجاوزە هێشتا بە سەر دێهاتی ئەم میللەتە هەژارە دەکرێ، ئێمە بۆ نەشر و ئیعلانی فەراغەت ناکەین. حکوماتی موتەمەدینە ئەمە نەگرێتە سەمعی ئیعتیبار ئەڵبەت ڕۆژی (غيرة الله) دێتە غەلەیان، قەهری مونتەقیمی ئیلاهی تەجەلای سەتتاری عیوبی بەصیرەت و عیبرەت دەبێ. (ولا تحسبن الله غافلا عما يعمل الظالمون).

3. بەڵێ! بەعزێ مەئمورانی ئینگلیز لە خصوص کوردستانی جنوبی سیاسەتێکی زۆر سەقیمیان گرت. مەقسەد و ئەمەلی ئەمانە، ئەم کوردە مەزڵومە ئەم عونصوری ئیسلامە، قەهر و تەدمیر (بکەن). حاڵ بوکی کورد، عەزم و ئیمانیان قایمە، لەڕێی ئیسلامیەت و سەعادەتی خۆی لە هیچ فیداکارییەک لانادا. ئەلحەمدولیلا بێ قوەت و بێ قودرەت نین، عەزم و ئیمانی کورد، بە عەون و عینایەتی باری، بەدخواهان و موناففقین مەئیوس و سەرنگون ئەکا (ولا تحزن ان الله معنا).

4. ئەمڕۆ ڕۆژی غیرەتە، ڕۆژی مروەتە، ئۆردوی کوردستان بە قوماندان و هەیئەتی زابتان و ئەفرادیەوە ئیلتیحاقی منیان کرد. تەرەف تەرەف موجاهیدینی شار و قیوای میللیەی ئەکراد لە ئیحزاراتێکی متەوالی دا خەریک و مەشغوڵن. ئێمە هەتا ڕۆحمان لە بەدەنمان مابێ بۆ ئیستیخلاص و ئیعتیلای ئیسلام و میللەتی کورد بە عەزم و ئیمانێکی تەواو سەرفی ئیجتیهاد و مەقدەرەت ئەکەین. پشتمان بە خوا و روحانیەتی حەزرەتی فەخری کائینات قایمە (حسبنا الله ونعم الوكيل، نعم المولا ونعم النصير).

5. ئەهلی شاری سلێمانی و تەوابیعی و هەمو قەومی کورد ئەمین و موتمەئین بن کە ئێمە لە سەر سەعادەت و خێری ئەوانین. بە قسەی بەعزێ مونافیقین و بەدخواهان، ئیسلام و کورد ئیغفال نەبن. هیچ وەختێ ئێمە بۆ میللەتی خۆمان زەرەرمان نابێ. ئەگەر بەعزێ بەدخواهان و خود پەسەندان بە زمانی ئێمەوە مەعلومات فرۆشی و قسەی پڕوپوچیان کرد باوەڕیان پێ مەکەن. ئەم نەوعانە لە خۆتان دور بخەنەوە. ئەمانە کە بەم تەرحە بە ئیفسادات تەعقیبی مەنفەعەتی شەخسیەی خۆیان دەکەن موستەوجیبی نەفرەت و جەزان، لە ئۆردوی کوردستان دا جێی ئەم نەوعانە نییە.

6. وەکو حیسسم کردوە ئەهالی لە تەشکیلاتی چەتەی ئێمە کەوتونەتە شوبهەوە. موجیبی شوبهە و تەرەدود هیچ نیە. ئەم چەتانە بۆ موخالیفین و موتەمەڕیدینی حقوقی کورد تەشکیل کراون. دەکەونە فەعالیەت،

ئەم چەتانە قیسمەن عەیان و قیسمەن مەجهول و پەنهان، غـایە و ئەمەلـی ئەم چەتـانە عەینـی غـایە و ئەمەلـی ئۆردوی کوردستانە، مەعتوفی سەعادەت و ئیستیخلاصی قەومی کوردانە.

ئینشائەڵڵا قەریبەن فەوز و نەصرەتی ئیسلام و کورد خۆی دەنوێنێ، تەوفیقـات لە خوداوەنـدی عـالی-یانەوەیە، خوا لەسەر حەق و خێری ئیسلام و کورد لامان نادا و موەفەقمان بکا ئامین!

**باش قوماندان و مەلیکی کوردستان**
**مەحمود"**

لەگەڵ ژ1 دا پاشـکۆیەکی بڵاوکـردۆتەوە بە ناونیشـانی (عەلاوەی جەریـدەی بـانگی حەق ژمـارە 1) ئەویش هەر ڕێنمایی شێخ مەحمودە. ئەمە دەقەکەیەتی:

"تەعلیماتە بۆ هەیئەتی مودافەعەی میللی‌یە

1. (تعاونوا علی البر و التقوی) صدق الله العظیم

2. هەیئەتی مودافەعەی میللیە مەجهولە، زەواتی ئەم هەیـئەتە یەکتـریش ناناسـن، هەمـو میللەتـی کـورد ئەعزای ئەم هەیئەتەیە.

3. ئەم هەیـئەتە مەجلیسـێکی وەکـالەتی هەیە. ئەم مەجلیسـە ڕەئیسـی قەدەملـی یوزباشـی سـەید عەبدوڕەزاق ئەفەندی، قوماندانی مەفرەزەی هەشتەم. ئەعزاکانی: مستەفا ئەفەندی حاجی حەمە سەعید قۆمیسەر و وەکیلی زابت ئیبراهیم ئەفەندیە، کاتبی ئەم هەیئەتە شوکری ئەفەندی کوڕی کەریمی عەلەکە ئەفەندیە.

4. ئەصحابی تەبەروع ناو و شوهرەتیان داخڵی دەفتەری تەبەڕوعات نـاکرێ، لە دەفـتەری تەبەڕوعـات ژمارەی موتەسەلسیل وەزع ئەکرێ، تەبەڕوعات لەژێر ئەم ژمارەیەدا قەید و تەسبیت ئەکرێ. ئەوی ئارەزو بکـا لەگەڵ ئەم ژمارەدا ناو و شوهرەتی خۆی قەید ئەکا.

5. موقابیلی تەبەڕوعات موتەلەقەن لە تەرەف مەجلیسی وەکالەتی مـودافەعەی میللـیە مەقبوزێـک ئەدرێ. لەم مەقبوزە ئیسم و شوهرەتی دەنوسرێ و نومروی موتەسەلسـیلی دەبـێ. ئەم مەقبـوزە بە دەسـت ئەصـحابی خێرات و تەبەڕوعاتەوە دەمێنێ بن قوچانی ئەم مەقبوزە کە لە مەجلیس وەکالـەت ئەمێنێتـەوە نـاوو شـوهرەتی حاوی نابێ، نومروی موتەسەلسیلی لەسەر دەبێ.

6. بەم صورەتە کە معاملە کرا، ئەسحابی تەبەڕوعات دەرەجەی حەمییەت و مورووەتیان لە ژێر نـومروی موتەسەلسیلی خۆیانا عیندەلئیجاب نەشر و ئیعلان دەکرێ. کە لەم ئیعلانە ئەسـحابی خەیـرات ناویـان مەعلـوم نابێ، لاکین لەخۆی کەیفیەت مەعلوم دەبێ.

7. بۆ ئۆردوی کوردستان و موجاهیدین و قیوای میللیەی ئیسلام و میللەتی کورد هەمـو شـتێک تەرک و تەبەڕوع ئەکرێ، وەکو: پارە، ئەسپ، ئێستر، ئەسلیحە، جبەخانە، جامانە، کڵاو، کراس، دەرپێ، قوماشی جـل، چاکەت، پانتۆڵ، دولاق، گۆرەوی، کەوش، سوخمە، بەتانیە، کلیم، مسقالی، چیت، دەستەسـڕ، هەتـا دەرزی، دەزو، شەکر، چایی، کاوڕ، بەرخ، ڕۆن، برنج، ساوەر، نیسک، نۆک، ئارد، جۆ، پاچ، بێڵ، خاکەناز... الخ.

8. تەبەڕوعـات لە تەرەف مەجلیسـی وەکـالەتەوە وەردەگیـرێ و دەخـرێتە ئەنبـار. بە پێـنج ڕۆژ دەفعەیەک مەجلیسی وەکالەت دەفتەرێکی تەبەڕوعات تەنزیم و تەقدیمی مەقـامی بـاش قومانـدانی ئـۆردوی کوردستان ئەکا.

9. لە تەرەف مەجلیسی وەکالەتەوە دەفتەرێکی مونتەزەمی تەبەڕوعات و، قەیدێکی ئەنبـار بـێ خەتـا و سەهو تەرتیب و تەنزیم ئەکرێ، ئەمە لە ژێر مەسئولییەتی ڕەئیس و کاتبە، ئەعزاکان لە ئەعزای فەعالە مەعدودە.

10. ئەمڕۆ ڕۆژی غیرەتەڕۆژی مورووەتە، چاکە و خراپەی ئەمڕۆ گوم نابێ، لە دنیا و ئاخیرەت حسابی دەبینرێ. (فمن یعمل مثقال ذرة خیرا یره ومن یعمل مثقال ذرة شرا یره) صدق اللە العظیم

**باش قوماندان و مەلیکی کوردستان**
**مەحمود"**

### 3. 2. ناوەرۆکی ژمارە 3:

12 ی نیسان، ژمارەی سێیەمی (بانگی حەق) هەر لە ئەشکەوتی جاسەنە دەرچوو. ژ3، سێ بابەتی تێدایە:

یەکەمیان:

پیرۆزباییە بە بۆنەی جەژنی ڕەمەزانەوە.

دوەمیان:

ڕێنمایی شێخ مەحمودە بۆ قوماندانی مەفرەزەی هەشتەمی پیادە.

سێیەمیان:

ئەو ڕێنماییانەیە کە لە ژ1 دا وەکو پاشکۆ بڵاوی کردونەتەوە. دیارە لەبەر گرنگی ڕێنماییەکان لێرەدا دوبارە چاپ کراوەتەوە.

"تەبریکی ڕەمەزانی موبارەک

"بەشەرەفی حلولی (شهر الرمضان الذي انزل فیه القرآن) بانگی هەق تەبریکی هەمو عالەمی ئیسلام دەکا. خوا میللەتی کورد وەکو ئەقوامی سائیرە لە جەهل و ئەسارەت سەرئەفراز و بە کەمالی سرور مۆفەقیەت نائیلی ئامالی میللیەی خۆی و حقوقی سیاسیە و مەدەنیە بکا. ئامین بە حورمەتی سەیدولمورسەلین.

"بۆ قوماندانی مەفرەزەی هەشتەمی پیادە

1. تەرەف تەرەف موراجەعەت بە ئێمە دەکرێ کە هەیئەتێکی مودافەعەی میللیە تەشکیل بکەن، لەسەر ئارەزو و موراجەعاتی موتەوالیەی میللەتی کورد ئەم هەیئەتە زاتەن لەخۆیەوە تەئەسوسی کردوە.

2. هەتا ئێستە لە تەرەف ساحێبێکی غیرەت و مورووەت 7 هەزار و لە تەرەف زاتێکی ترەوە 3 هەزار ڕوپیە و لەتەرەف زاتێکی سالیس و ڕابیع هەر یەکێ بارێ شەکر بە ناوی ئۆردو و موجاهیدین و قیوای میللیەی کوردستان تەبەڕوع کراوە. ئەم زەواتە نەشر و ئیعلانی ناوی خۆیان موافیق نەبینی. لە تەرەف ئەربابی خۆیەوە مەعلومە. ئەعمالی صالیحە بێ موکافات نامێنێ. خوا ئەم میللەتە ئیسلام و کوردە بگەیەنێ بەحەق و ئیستیقلالی خۆی.

3. بۆ مەجلیسی وەکالەتی مودافەعەی میللیە تەعلیماتێک گیرایە قەڵەم، صورەتی بەپێچراوەیی ڕەوانە کرا. ئێمە ئەساسەن بۆ ئیستراحەت و سەعادەتی ئیسلام و کورد تەرجیحی هەمو موشکلاتێکمان کردوە. لەسەر ئێمە واجیبە هەمو ئارەزویەکی میللەتی ئیسلام و کورد بەجێ بهێنین. لەبەر ئەمە ئێوەیش بە موجیبی ئەم تەعلیماتە بکەونە فەعالییەت (وما النصر الا من عند اللە).

**باش قوماندان و مەلیکی کوردستان**
**مەحمود"**

تــا ئێســتا ئەم دو ژمــارەیەی دۆزراونەتەوە. هەر یەکەی دو لاپەڕەیە. فەرمــان و رێنماییەکــانی (بــاش قوماندان و مەلیکی کوردستان _ مەحمود) ە بۆ خەڵکی کوردستان و بـۆ هێزەکـانی دەربـارەی خـۆڕاگرتن و بەرهەڵستی هێزی داگیرکەر. ئەوە یەکەمین جار بو لە کوردستاندا جـوڵانەوەیەکی شۆڕشـگێڕانە چـاپ ببـاتە شاخ بۆ دەرکردنی رۆژنامە. بێگومان ئەمە لە لایەکەوە پێشکەوتنی جـوڵانەوەی کـورد دەردەخـا و، لە لایەکـی ترەوە گرنگی رۆژنامە لە خەباتی کوردا پیشان ئەدا.

## 4. کوژرانی عارف سائیب

لەم هەلومەرجە ئاڵۆزاوەدا، یەکێ لەو ئاغایانەی لەگەڵ هێزەکەی شێخدا بو، تەقەی لە عارف سـائیب کـرد و کوشتی. عارف سائیب پیاوێکی رۆشـنبیر، شـاعیرێکی کـورد پەروەر و نوسـەرێکی سیاسـی بەتوانـا بـو. سـکرتێری شـێخ مەحمـود و یەکـێ لە باوەڕپێکراوەکـانی بـو. وەکـو ئەڵـێن نامەکـانی شـێخ مەحمـود بـۆ کاربەدەستانی سۆڤێتی ئەم نوسـیونی. ئەمە دوەمـین رۆشـنبیری کـورد بـو لە سـەردەمی حـوکمڕانیی شـێخ مەحمودا بەبێ تاوان بکوژرێ، بێ ئەوەی بکوژ سزا بدرێ.

## 5. کشانەوەی شێخ مەحمود لە سورداش

ئەو کارانەی شێخ مەحمود لەم قۆنـاغەدا کردنـی: کشـانەوەی خـۆی لە شـار و، رێکخسـتنەوەی هێـزە چەکدارەکانی لەسەر بنچینەی دەس پێ کردنی جەنگی پارتیزانی و، پێکهێنانی رێکخراوی نهێنی بۆ پشتیوانی لە پارتیزانەکان و، پێوەندی لەگەڵ یەکێتی سۆڤێتی و تورکیای کەمـالی، ئەبـو سـاڵی 1919 بیکـردایە. ئەگەر ئەوسا لەباتی ئەوەی بچێ لە دەربەندی بازیان دابمەزرێ و شەڕی (جەبهەیی) لەگەڵ هێزی ئینگلیز بکـا، وەکـو ئێستا ئەم ستراتیجە سیاسی- جەنگی‌یەی دابنایە و، جەنگی پارتیزانی دژی هێزەکانی ئینگلیز بکردایە، لەوانە بو بتوانێ هەندێ لە مەرجەکانی خۆی بەسەر ئینگلیزدا بسەپێنێ و، هەندێ دەسکەوتی سیاسـی بـۆ کـورد بە دەس بهێنێ. بەڵام لەو بارودۆخەدا ئەمە ئیتر درەنـگ بـو. تەرازوی هێـز و هەلـومەرجی نـاوچەکە بە تەواوی گۆڕا بون. سیاسەتی بریتانیا لەسەر ئەوە ساغ بوبوەوە کە دەوڵەتی عیراق دابـمەزرێ و، کوردسـتان بخـرێتە سەری.

## 6. گێڕانەوەی دەزگای چاپ بۆ سلێمانی

لەو ماوەیەدا فڕۆکەی ئینگلیزی بە دوای شێخ مەحمود و هێزەکەیەوە بو. بەردەوام بۆمبارانیان ئەکـردن و، هێزی زەمینی‌یشی خۆی بۆ لەشکرکێشی بۆ گرتنەوەی سلێمانی و رەواندز ئامـادە ئەکـرد. شـێخ مەحمـود لەژێر گوشاری هێرشی ئاسمانیدا ناچار بو ناوچەکە بەجێبهێڵـێ و روبکـاتە نـاوچە سـنوریەکانی پێنجـوین. نەیتوانی یا نەیویست چاپخانەکە لەگەڵ خۆی بگوێزێتەوە، لە ئەشکەوتەکەی جاسەنەدا بەجێ ما.

هێزی ئینگلیز گەیشتە ناوچەی سورداش. هێزەکانی شێخ کشانەوە. ئینگلیز ئەشـکەوتەکەی جاسـەنەی داگیر کرد و دەستی گرت بە سەر کەلـوپەلی نـاو ئەشـکەوتەکەدا. چاپخانەکەشـیان گـرتەوە و بردیـانەوە بـۆ سلێمانی.

## 4. 6. بانگی کوردستان (خولی دووەم)

مدیر مسئول و سرمحرر
مصطفی پاشا

اعلانات بدیریك
۳ آنه ده سیزریت

بو همو شتیك مراجعت
به مدیرمسئول دکری

# بانگ کردستان

بوداخل شهرو لوابدل آبونه
۳ مانك ۱ روپیه ونیو ٦ مانك
۳ سالیکی ٦ روپیه یه

بو خارج اجرت پوسطه
علاوه ده کری

( زمان کورز و رم وابوردو ایستا پالوان علمه )
( سلاح دسته صنعت بارقهٔ تیغ و سنان علمه )

تاریخ انتشار
۲ آغستوس ۱۹۲۲
سلیمانی

علمی ، سیاسی ، ادبی غزته یکی ملی یه
هفتهٔ جایك دردچی

نسخه یکی به یك آنه دفروشری

سال ۱ | ژماره ۱٤ | جمعه | ۲۳ شوال ۱۳٤۱ | ۸ حزیران ۱۹۲۳

بانك کردستان

له بر بعض اسباب وموانع له پاش نسخه ی ( ۱۲ )
وامان مناسب زانی بو که تعطیل نشریات بکه ین ایستا
مستعیناً بالله غزته ی بانك کردستان کوته وه ساحهٔ انتشار
و چونکه لم روزان معلومه دا له اطرف مطبعه دا
مواضبط و انتظام لازم نه بو بو له حروفات مطبعه دا
نقصان پیدا بو وه تا تهواو کردنی او نقصانه مجبوری
غزته کان هر چوار صحیفه دردچی فقط امه یش متوقفه
به معاونت و همت حیتمندان وطن .

سلیمانی

ام مملکت بی بخته له ظرف چند روژیکدا اونده
تحولات وعجایباتی چاو پی کوت که نومیدی بو قوم کرد
عاره کسی که نه ختی غیرت وطنیه ی بیت و خبردار له
اثار مدنیت وله طرز کذرانی اغیار بیت ، بی شبهه لم
احوال ایمه دلخون ده بیت چونکه فکر ایمه و حتی همو
کردستان بر سعادت و پیشکه وتن کردان بو و بو امه یش
به زبانیکی مناسب به صووتیکی لایق نیاز و تمنا کردن بو
له وانه ی که حظ به مدنیت ده کن و آزادی قومان غیره یان
دهوی به راستی و تو دو ساله هاوار ده کم و به وانه ی که
هوشیان هیه ده بیژم و درد ده ریژم له جهاندا ایستا
هر حکومت فخیمهٔ بریتانیایه ، و قوم آزاد انکلیزه
که آزادی وخو کرد کردنه وه ی کوردانی له لا پی ویست بی
و هر اوه که معاونت کردستانی پی بکری و له ظرف دو
۳ ساعتدا به امدادی مظلومانی کردانا بکا .

ممالك و مستملکه ی بریتانیا اونده زوره اونده
به وسعته انکلیز احتیاجی امه ی نیه که مثلا بو ترفیه
احوال و بو تفاخر خویان احتیاجی به ناردنی مامورین
بی بو کردستان یاخود چاوی له تق و توق کوزی
هاورامان ویا سرتکش دوکل تونون خاقی ببان بیت !
فقط ام حکومته حظ به دراوسه یك به آشنایك دکا که
به قسه ی بدخواهانی خوی فریفته نه بن ضرر به
سیاست خوی نکا و له نظر یاران و اغیار خویدا بو
سطوت و خیرخواهی خوی نه نکی نه بی ، مثلا امه
دوساله له کل ام همو همراهی و خیرخواهی یه که درحق

## 1. هەلومەرجی دەرچونی

هێزەکانی ئینگلیز، ئاسمانی و زەمینی بەردەوام بون لە راونانی شێخ مەحمودا. شێخ مەحمود و هێزەکانی لە سورداش کشانەوە، رویان کردە ناوچەی پێنجوین. هەندێ لەوانەی لە پێشتر هاوپەیمان و هاوکاری بون، ململانێیان لەگەڵ ئینگلیز بە شەڕێکی دۆڕاو ئەزانی، وازیان لە شێخ مەحمود هێنا، لەوانە: شێخ قادری حەفید (برای شێخ مەحمود)، مستەفا پاشای یاملکی، ساڵح زەکی ساحێبقران، ئەحمەد حەمدی ساحێبقران، تۆفیق وەهبی...

8 ی مایسی 1923 فڕۆکەی ئینگلیزی بەیاننامەی بە سەر شاری سلێمانیدا بەردایەوە. خەڵکی ئاگادار کرد کە ئینگلیز هێز ئەنێرێ بۆ سلێمانی و داوای لێ کردن بەرگری نەکەن.

14 ی مایس هێزی زەمینی ئینگلیز لە کەرکوکەوە گەیشتە چەمچەماڵ.

15 ی مایس بە فڕۆکە چەند نامەیەکیان بەردایەوە بە سەر شاری سلێمانیدا. داوایان لە هەندێ لە سەرانی سلێمانی کرد بچنە سەرچنار.

16 ی مایس هێزی زەمینی ئینگلیز گەیشتە سەرچنار. مێجەر ئەدمۆنس لەگەڵ پیاوماقوڵانی سلێمانی لە سەرچنارەوە بەرەو سلێمانی بەڕێ کەوتن.

ئەدمۆنس لە سلێمانی، ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگی بە سەرپەرشتیاری هەمو دائیرەکانی حکومەت و، شێخ قادری برای شێخ مەحمودی بە لێپرسراوی ئاسایشی گشتی دانا.

29 ی مایس، سەروەزیرانی عیراق عەبدولموحسین سەعدون و سەبیح نەشئەت، بە فڕۆکە هاتنە سلێمانی. لەگەڵ ئەشراف و پیاوماقوڵانی سلێمانی کۆبونەوە.

2 ی حوزەیران، مەندوبی سامی بریتانی، هێنری دوبس هاتە سلێمانی.

## 2. دەرچونی

مستەفا پاشای یاملکی سەرلەنوێ دەستی کردەوە بە بڵاوکردنەوەی بانگی کوردستان. ژ14 ی لە 8 ی حوزەیراندا دەرکرد.

## 3. بابەتەکانی

لەم ژمارەیەدا باسی سەردانەکەی عەبدولموحسین سەعدون بۆ سلێمانی و، هاتنی مەندوبی سامی، سێر هێنری دوبس ئەکا. هەروەها ڕیپۆرتاجێکی لەسەر خۆپیشاندانی هێزەکانی ئینگلیز نوسیوە.

## 4. ڕاوەستانی

ئینگلیز بۆ ئەوەی توشی شەڕ و زەرەری گیانی نەبێ، نەیئەویست هێزی زەمینی لە سلێمانی بهێڵێتەوە. حکومەتی عیراقیش هێشتا هێزێکی ئەوتۆی نەبو بتوانێ لە سلێمانی بمێنێتەوە و بیپارێزی لە هێرشی هێزەکانی شێخ مەحمود.

مەلیک فەیسەڵ و عەبدولموحسین سەعدون، هەوڵێکی زۆریان لەگەڵ کاربەدەستانی ئینگلیز دا بۆ ئەوەی وایان لێ بکەن ماوەیەک لە سلێمانی بمێننەوە تا ئەوان هێزی تەواو پێکەوە ئەنێن. بەڵام ئینگلیز سور بون لە سەر هەڵوێستی خۆیان. ڕۆژی 17 ی حوزەیران کشانەوە. لەگەڵ ئەوان 2 هەزار کەسێ لە خەڵکی سلێمانی ڕۆیشتن، لەوانە مستەفا پاشای یاملکی. بانگی کوردستان لەو ماوەیەدا لە سلێمانی هەر ئەو ژمارەیەی لێ دەرچو.

## 4. 7. ئومێدی ئیستیقلال

# امید استقلال

مدیر مسئول
خواجه افندیزاده
احمد صبری
به دیریك
۳ آنه ده سپیرینت
وهمو شتیك مراجعت
به مدیر خزنه دکری

بدل آبونه
به ۳ مانك دو روپیه
به شش مانك ٤ پوخالیك
هشت روپیه یه
اعلانات
به دیریك ۳ آنه دهسپیرینت

خدایا بسه ایترلابری دیجور اضمحلال ؛ طلوعی بی بکه خورشیدوزی پاك استقلال
له کل خولیای هجرت به سرچوم وشیرینم ؛ دمسا توبه وساله آه . ای امید استقلال

تاریخ انتشار
۲۰ ایلول ۳۳۹
سلیمانی

سیاسی ، ادبی ، اجتماعی خزنه‌یکی رسمی یه
هفته جاریك دره‌چی

نسخه‌یکی جیلک آنه دارونیری

( سال ۱ ) ( ژماره ۱ ) ( پنجشنبه ) ۹ صفر الخیر ۳٤۲ ۲۰ ایلول ۳۳۹

## سلطان سابق تورکیا عفو اکری

استانبول ۲۲ منه — له برامه معساهده نامة ( صه‌ور یان امضا کردوه سلطان سابق تورکیا له کل صدر اعظم پیشو داماد فرید پاشا له عفوی عمومی که له پاش اکال معاهده‌نامه اعلان اکری استفاده ناکن و شامل اوان نابی له انقره‌وه وها خبر دراوه .—

لیمه سا ۳۰ اغستوس و ۸۳ ژماره مواد معاهدهٔ

### لوزان و لاحقه کان

### اتفاقنامهٔ تخلیهٔ اراضی تورکیا

### حدود عراق

بغداد تایمس — له المقطم وه وه‌ر بکرتوه له خصوص تخلیهٔ اراضی تورکیا و حدود عراق و وضعیت تازة بو خازه‌کان له مواد معاهدهٔ لوزان و لاحقه کان ارائة که مفیده له‌ژیره‌وه نوسرا . —

اوه که امضایان کردوه مرخص حکومت ایتالیا و فرانسه و بریتانیا ( که ایسته بعض اقسامی اراضی تورکیا له ژیر اشغالیانایه ) و مرخص مجلس وطنی انقره که له کل مایت خویاندا به هم اهلی ارزو اکن صلح ده مرجع بکری بو اتخاذ تدابیرانیه موافقتیان کردوه .

## تخلیهٔ اراضیهٔ که اشغال کراوه

— له اعتبار او وقته وه که حکومت تورکیا به واسطة او مرخصانه وه که له استانبولن تبلیغ حکومت متحدهٔ کردوه به معاهدهٔ لوزان و ذ حقه‌کانی قبول کراوه اردوی دول متحده ابی دست بکا به تخلیه کردنی او اراضیه که له ژیر اشغالیاندایه و ام مسئلهٔ تخلیه یه شامل سه ساق قعه ، بحر مرمره و بوغاز استانبول و عائد قوای عسکریه و بحریهٔ ایتالیا ، فرانسه و اینکلتره .

۲ — تخلیه ای له شش هفته دا تواو بکری .

۳ — له اثنای تخلیه دا او اشیایانه که ثابت بوه هی تورکیان و او اشیای منقوله و غیره منقولهٔ تورکیایه که حال حاضر بدست موظفین اشغالیه وه یه ابی تسلیم بکرته وه بماهدهٔ عمومیهٔ تورکیا مسئلهٔ مصادره و وضعیت و انواعی امانه نخو اکات . و او وقته که معاملهٔ وضعیت رفع اکری لو خصوصه وه ضبطنسامه‌یك تنظیم اکری او ضبطنامه‌یه له مقام صندا دبی موظفین اشغالیه او اموال و اشیای تورکیایه که دراوه به شرکت عثمانی یه و اشخاص سائره به تواوی اعادة اکنه وه او قرض و معاملاته که له بین موظفین اشغالیه و اشخاص عادیه دا کراوه مطابق شرائط خوی تسویه اکری .

اعلانات
به اعتباری
پینج کلمه دریك
۳ آنه ده سینریت
بو همو شتیك مراجعت
به مطبعه دکری
نسخه‌ی به آنه‌یکا

# امید استقلال

سیاسی ، ادبی ، اجتماعی ، غزته‌یکی رسمی‌یه
هفتهٔ جاریك درده‌چی

بدل ابونه
به ۳ مانك روپیه و
نیویك به شش مانك
۳ به سالیك شش روپیه‌یه
بو خارج اجرت پوسطه
علاوه ده‌کری
تاریخ انتشار
۲۰ ایلول ۳۳۹
سلیمانی

سال ۱ ژماره ۲۵ (پینجشنبه) ۱۱ شوال ۳۴۲ ۱۵ مایس ۱۳۴۰


له غزته‌ی نجمه‌وه :

تصدیق معاهده‌نامهٔ لوزان

معاهده‌نامهٔ لوزان له‌پاش تصدیقی له مجلس عوام و لورده‌کان‌دا له طرف قرالیشه‌وه تصدیق کرا .

فرانسه و یونان

حکومت فرانسه رسماً به جمهوریتی حکومت یونان اعتراف کرد .

---

خبرات بغداد

سوء قصد

له نزیك محل اقامتیان له طرف دو شخصی قیافت سویل دستریژیك کراوه شیخ عدای الجریان و شیخ سلیمان البراك مبعوثان عشایر حله له قول و قاچیان‌دا زور خراپ برینـدار بون . اوانهٔ که مظنون بون دردست کراون .

له پاش تحقیقات بعضاً تخلیـه کراوه و اوانهٔ که مدخلدار نین برلا اکرین .

---

سیاست پارطیه‌کان و بولشویك

اعضاکانی فرقهٔ وطنی دیموقراط و فرقهٔ ملت له تفلیس دردست کراون .

له بغداد غزتهٔ «استقلال» و شعب له انتشـار غزته منع کراون .

علماکانی عراق له ایرانه‌وه گیشـتنه‌وه بغداد و له طرف رئیس‌الامنا صفوت پشا و اشراف و علماوه استقبالیان کراوه .

مسئلهٔ موصل

بو مذاکرهٔ موصل له ۳ مایسدا له استامبول عقد و سـرپرسی کوکس ممثلی بریتانیا و بەپی خبر موثوق طه افندی هاشمی به مرخص عراق تعـین کراوه شایەهٔ بستوه .

مفتش اداری کرکوك میجر ادمونس به وعدهٔ شش مانك ماذونیت چوته‌وه بو لوندره .

---

خبرات داخلی

به پی معلومات اهالی له سر تشبثات و مراجعت احمد بك عثمان پاشای البجه بو محافظه و منفعتی شخصی خوی به هردسایس وحیله بازیك بو مقداریك سواری له حکومت بریتانیا سندبو .

به واسطهٔ ام قوتوه خریکی غدر و تعرضاتی اهالی بو له سـر اوه عموم اهالی اطراف و عشائر مجبوراً قیامیان

## 1. ئومێدی ئیستیقلال

### 1. 1. هەلومەرجی دەرکردنی

عەبدولموحسین سەعدون، سەروەزیرانی ئەوسای عیراق، لەسەردانەکەیدا بۆ سلێمانی لەگەڵ نوێنەرانی خەڵک کۆبوەوە. عیراق هێشتا هێزێکی وای پێکەوە نەنابو بتوانێ لە سلێمانی‌دا بمێنێتەوە و لە هێرشی هێزەکانی شێخ مەحمودی بپارێزێ. سەعدون و مەلیک فەیسەڵ و کاربەدەستانی تری عیراق چەندی تکایان لە کاربەدەستانی ئینگلیز کرد کە لە سلێمانی بمێننەوە کەڵکی نەبو. هێزەکانی ئینگلیز کە سلێمانی‌یان گرت بو، بۆ ئەوەی توشی شەڕو زەرەری گیانی نەبن، ئەیانویست سلێمانی بەجێ بهێڵن و شار تەسلیمی هێزەکانی عیراق بکەن. بەڵام عیراق خۆی هێشتا هێزێکی وای نەبو بتوانێ لە بەرامبەر هێرشی هێزەکانی شێخ دا ڕابوەستێ.

17 ی حوزەیران، هێزی ئینگلیز لە سلێمانی کشایەوە. لەگەڵ ئەوان دو هەزار کەسی خەڵکی سلێمانی شاریان بەجێ هێشت، هەندێکان چونە کەرکوک و هەندێکیشیان بۆ بەغداد رۆیشتن. لەوانە هەندێکیان لە هاوکارانی پێشوی شێخ مەحمود بون.

18 ی حوزەیران، بەرایی هێزەکانی شێخ مەحمود چونەوە ناوشاری سلێمانی.

11 ی تەموز، شێخ مەحمود خۆی هاتەوە ناوشاری سلێمانی و دەسی کرد بە رێکخستنەوەی کاروباری بەڕێوەبەرایەتی. هەر لەو ماوەیەدا دەس کرا بە دەرکردنی ئومێدی ئیستیقلال.

### 1. 2. دەرکردنی

ژ1 ی لە 20 ی ئەیلولی 1339 رۆمی و

ژ25 ی کە دوا ژمارەیەتی، لە 15 ی مایسی 1340رۆمی‌دا دەرچوە.

لە ژ1 - 3 مدیری مەسئول ئەحمەد خواجە،

لە ژ4 - 13 سەرنوسەر رەفیق حیلمی،

لە ژ14- 16 حسێن نازم و

لە ژمارە 17- 25 ناوی سەرنوسەرەکەی نەنوسراوە.

ئومێدی ئیستیقلال بەمجۆرە خۆی بەناسین داوە: "سیاسی، ئەدەبی، ئیجتیماعی، غەزەتەیەکی رەسمی‌یە، هەفتەی جارێک دەردەچێ"

ناوەکە خۆی لە خۆیدا مەغزایەکی قوڵی هەیە و، لەژێر ناوەکەشیدا ئەم شیعرەی شێخ نوری نوسراوە:
"خودایا بەسیە ئیتر لابەری دەیجوری ئیضمیحلال
طلوعی پێ بکەی خورشیدی ڕۆژی پاکی ئیستیقبال
لەگەڵ خولیای هیجرت بەسەرچو عومری شیرینم
دەسا نۆبەی ویصالە، ئاهـ ئەی ئومێدی ئیستیقلال

### 1. 3. نوسەرەکانی

کـە ئومێـدی ئیسـتیقلال دەرکـراوە خـواجە ئەفەنـدی زادە ئەحـمەد صـەبری (ئەحـمەد خـواجە) مـودیری مەسـئولی بـوە. بەڵام لە ژ3 دا هەواڵـی گـۆڕینی ئەحـمەد خـواجە بە ڕەفیـق حیلمـی بەم جـۆرە بڵاوکراوەتەوە:

"... کاتبی حەزرەتی ملوکانە ئەحمەد صەبری ئەفەندیش هەرچەند بۆ تەرەقی وەتەن و میللەتـی کـورد سەعی کردوە و فیداکارەو، غایەو ئامالی صیرف بۆ سەعادەتی کوردە مەعەلئەسف لەبەر کوسرەتی مەشـغەلەتی ئەسـڵی لە مـودیریەتی غەزەتەکەمـان ئیسـتیعفای کـردوە. لەبەر حەمـیەت و غیرەتـی وەتەنـیەی و ئەهلـیەت و ئیقتیداری بۆ عەلاوەی وەزیفەی ئەسڵیەی مودیریەتی ئومێد ئیستیقلالیش با ئیرادەی ملوکانە دیسان تەودیعـی موما ئیلەیهی: ڕەفیق حیلمی ئەفەندی کرا و، موباشەرەتیی فەرموە.

"خـوا هەمیشــە مــنەوەران و فیــداکارانی میللەتــی کــوردو خزمەتگــوزارانی لەســەر خێــر مــۆفەق بکات."

لە ژ14 ەوە حسێن نازم جێگەی ڕەفیـق حیلمـی گرتـۆتەوە. لەم بـارەیەوە لەژێـر سـەرناوی (ئیفـادەی مەخصوصە) دا نوسیوێتی:

"ئوموری تەحریریە و مودیریەتی غەزەتەی ئومێدی ئیستیقلال بە ئەمری حەزرەتی ملوکانە تەوجیهـ بە بەندە کرا. موجەڕەد بۆ ئەمەی کە ڕێگەیەکی سـالم و بێتەرەفـی و ئـازادە لە شـەوائیبی مەقاصـید و مەئـاریبی شەخصی تەعقیب بکرێ، بەناوی مەنافیع و سەلامەتی وەتەنیەوە دەرعوهدەم کرد."

بەڵام لە ژ17 دا بەمجۆرە وازهێنانی حسێن نازمی ڕاگەیاندوە:

"لەبەر مەشغەلەتی وەزیفەی ئەسلی خۆی مودیری غەزەتە جەنابی حسێن نازم ئەفەنـدی لە ڕۆژی 20 ی کانونی سانی 39 لە ئیشوکاری غەزەتە ئیستیعفای کرد.

"ئەم غەزەتەیە غەزەتەیەکی حکومەتیـیە، لە تەرەف هەرچی کەسێکەوە مەقالەیەک کە بۆ وەتەن و مـیلەت مەنفەعەت بێ بۆ دائیرەی مەتبەعە بنێررێ مەعەلمەمنونیە لەپاش سانسۆری لە تەرەف مەئموری خۆیەوە یا تەبع وە یا ئیعادە ئەکرێتەوە. ئومێدی ئیستیقلال"

## 2. بابەتەکانی

### 1.2. خولیای سەربەخۆیی

ئەگەرچی زێوەر لە حکومەتەکەی شێخ مەحمودا کاربەدەستێکی گەورە نەبوە، بەڵکو تەنیا مامۆسـتایەکی ئاسایی بوە لە یەکێ لە خوێندنگەکانی ئەوسای سلێمانیدا، کەچی لە ژ13 دا وتـارێکی سیاسـی بەناونیشـانی (کـوردیش حەقـی ژیـانی هەیە) بڵاوکـردۆتەوە، بە چـاکی ئامـانجی جـوڵانەوەی کـوردی لەو قۆنـاغەدا ڕون کردۆتەوە. ژیرانە پێشبینی کردوە کە ئەگەر کوردیش مافەکانی نەسەلمێنرێ ئاسایش و ئارامی ناوچەکە تێـک ئەچێ. لەبەر گرنگی وتارەکە لێرەدا هەموی ئەنوسمەوە:

"عەسری حازر کە بە عەنعەناتی تاریخی هەر قەومێ ئیسپاتی مەوجودیەتی خۆی دەکا، دەچێتە ریزەوە، هەوڵ و تەقەلای تەرەقی دەدا، لە مەدەنیەت بەحس دەکا، میلەتە پچوکەکانیش وایان لە خۆیان کردوە (ردەاست هر مگسی خویش را بفر همای).

"لە حەربی عومومی‌دا موتەفەقین و ئیئتیلاف هاواریان دەکرد ئەم شەڕە گەورەیە بۆ نەجاتی میلەتی پچوکە. هەر لە ئەسنای شەڕدا لەهستان ئیستیفادەی کرد، لیتوانیا، ئۆقرانیا نائیلی ئازادی بون. تورکستان، گورجستان، ئەرمەنی حەقی ژیانیان پەیدا کرد، تورک، عەرەب، عەجەم، موسەوی، سەربەستی خۆیان تەئمین کرد. تەنها قەومی کورد مایەوە کە کەس بە چاوی مەرحەمەت تەماشای نەکرد. یەکێ بە ناوی ئیسلامیەتەوە، یەکێ بەناوی تیجارەتەوە دەیەوێ ئەم میلەتە مەزڵومە بخاتە ژێر باری ئەسارەتەوە.

"ئەگەر سوئال لە ئەهلی ویجدان و مەدەنیەت بکرێ کە ئایا کوردیش حەقی ژیانی هەیە یا نی‌یە؟ تەبیعی جوابی ئەم سوئالە هەر ئەوە دەبێ کە بڵێ: کوردیش حەقی ژیانی هەیە! بەڵێ حەقمان هەیە. ئێمەش بەشەرین، حەز بە ئازادی دەکەین، حەز بە حکومەت دەکەین، بۆچ حەقی خۆمان نەدرێتێ؟

"فەرزەن ئێمە هیچ تاریخێکمان نیە، هیچ پیاوی مەشهورمان نیە، هیچ حکومەتمان نەبوە، هیچ ئاساری قەدیمی مان نیە، قەومێکین هەر بە گرمەو ناڵەی رەعدی تۆپی حەربی عمومی وەکو قارچک لەسەر شاخان هەڵتۆقیوین، هاتوینە مەیدان، ئەمڕۆ ئیسپاتی مەوجودیەت دەکەین (ابی الله ان اسمه بام ولا اب) لە ئالی هاشم (مەلیک مەحمودی ئەوەل) پێشەوامانە، فیداکارمانە، زاهیرەن تەنهایە مەعنەن حەوت ملیۆن کورد موعینە و تەماشای سیاسەتی دەوڵەتەکان دەکەن. عەجەبا ئەوەی بەناوی ئیسلامیەتەوە کوردی لازمە، هەر بەو ناوەوە کورد ئیدیعای ئەو بکا و، بە قانونی ئەویش عەمەل بکا، ئایا ئەو دەبێ بە تابیعی کورد؟ حاشا. بە نیصفی قابینەیشی لە کورد تەشکیل بێ رازی دەبێ؟ حاشا. وە ئەو کەسەی بەناوی تیجارەت و ئیقتیصادەوە مەربوتیەتی کوردستانی دەوێ، هەر بە عەینی ئیدیعا کوردستان مەربوتیەتی ئەو تەلەب بکا قبوڵە؟ حاشا سومە حاشا. کەوابێ مەقسەد هەر ئەوەیە کورد لە ژێر باری ئەسارەتا بمێنێ.

"... نەفعی ئەم برادەرانی دینیەمان لەوەدایە کوردیش بە تەنها حەقی ژیانێکی ببێ. ئایا تورک موحارەبەیەکی ببێ دو سێ هەزار کڵاش لە پێی رەش و روت سەوقی جەبهەی حەرب کاو، هەر چەند کەسێکیان تەسلیمی محەمەد چاوەشێ بکا، ئەوە چاکترە یا دو سێ ئاڵا عەسکەری موجەهەزی...حکومەتێکی ئیسلامیەی کورد بەناوی ئیسلامیەتەوە بۆ معاوەنەتی ئیشتیراکی غەزا بکا؟ سانیەن بۆ قەومی عەرەب، لەباتی تەلەبەی کورد رو بکەنە دارلفنونی عیراق، حەربیەی عیراق، توبیەی عیراق، یا هەر جاهیل بین و... نەفعمان بۆ خۆمان و دراوسێشمان نەبێ، تەبیعی سەربەست بین ئیستیفادەی عیراق زیاترە، چونکە عیراق ئەوروپای ئێمە دەبێ، نەفعی ئیقتیصادی و سیاسی زیاتر دەبێ.

"حالی حازر میلەتی کورد لە صەد یەکێکی لە دنیا تێ گەیشتوە بە ئیستیرحام تەلەبی حەقی میلیەت دەکەن بەرە بەرە ئەم فیکرە تەعمیم دەکا لە صەدی بێ بە دە ئیستیرحام دەبێ بە ئیختیلال ئەوسا نە تورک، نە ئیران، نە سوریە، نە عیراق ئاسایشی تیا نامێنێ. ئاگری ئیختیلال تەوەسوع دەکا، ئیحتیمالە سیرایەتی ئەم ئاگرە بۆ مەنافیعی سیاسیەی ئەوروپایش زەرەری بێ، بینائەن عەلەیهی وا لازمە ئەمرۆ کوردیش مەسرور بکرێ، چونکە ئەویش میلەتێکە حەقی ژیانی هەیە."

لە ژ18 دا بە ئیمزای (سلێمانی) بە ناونیشانی (بۆ دور وڵاتیەکان) نوسیوێتی:

"ئەی برادەرانی دور وەتەن!

"مودەتێکە لەبەر ئینقیلابات و تەبادولاتی زەمانە لێم دور کەوتونەوە. من بە شەو و بە ڕۆژ بـۆن ئەکەم و چـاو ئەگێـڕم و گـوێ هەڵ ئەخەم، نە بـۆن و دەنگـی پـێ و نە وجودتـان ئەبیـنم. لە خزمەتـی ئەم وەتەنە موقەدەسەتان دور کەوتونەوە. ئەمڕۆ ڕۆژی میللیەتە لەناو ئەقوام و میلەلی جیهـاندا نـاوی ئەسـارەت حەک، بە سەربەستی تەبدیل کرا.

"ئەو میللەتە تازە لە ئەسارەت نەجاتی بوە، ئیستیقلالیەت ناشـکورن. هێشـتا بەسـەر میلەلـی سـائیرەدا داوای حاکمیەت ئەکەن. زۆر قەوم کە نە ناوی وەتەن و نە نـاوی میللەتـی خۆیـان بە تەواوی ئەزانـی، ئەمـڕۆ ساحێبی ئیستقلالیەتن.

"چ وەختێ کورد بێ نام و نیشان بوە؟

"ئەگەر فکـر بکەیـنەوە لە مـودەی ئەم 5-6 سـاڵەدا چ شـێلان و گەردابـێکم دی و، ئیسـتایش بە بۆمباردومان چەند هەزاران بیرو خەندەقم لێ هەڵکەندرا؟ ئەلبەتە ویجدانتان قبوڵ ناکا هەر لەژێر ئەم ئەسارەت و فەلاکەت و تەخریباتی بۆمباردومانەدا بمێنمەوە. وەتەنی خەلقی بە ئیسـتیقلالیەت و، بەم واسـیتەیە بە بـاغ و باغات و ڕێگەی شەمەندوفەر و تەرەقی تیجارە و تەوسـیعی مەعـاریف تەزینـی ئەکەن. کەچـی ئـێمە دائـیمەن بەبۆمبا تەخریب و بە ناڵەی تۆپ تەهدید و بە بەیاننامەی ڕەسمی تەخویفمـان ئەکەن. پـارچەی بۆمبـا چەنـد هەزاران تیقلانی مەعصوم و حەیواناتی بێ گوناهی پارچە پارچە کرد؟ چ ویجدانێ قبوڵی ئەم وەقعە جانسـۆزە ئەکات؟ بۆچی داوای مڵکانەی ئەملاکی خۆمان بکەین ناحەقیە؟ وەختی ڕاوەستان نیە ڕجا ئەکەم بۆ ئیدیعای حقوق بە یەک دەنگ هاوار بکەین! سلێمانی".

لە ژ23 دا لەژێر سەردێڕی (جوابی غەزەتەی العراق) دا نوسیویێتی:

"غەزەتەی العراق، سلێمانی بە جوزئی موتەمیمەی عیراق نیشان داوە. موئەیـدی ئەم ئیجتیهـادە ئـێمە هیچمـان بـۆ نادۆزرێتەوە. زۆر ئارەزو ئەکەین العراق موناسەبەتی ئیرتیباتی لە بەینی کورد و عەرەب دا چیە بۆمان ئیزاح بکا.

"واقیعەن هەردولا بەشەرن و هەم هاودینن، فەقەت حاڵەتی عونصوریە و خصوصیەی ئیجتیماعیە زۆر لە یەکی دور خستوینەوە. بەڵێ واقیعەن موناسەبەتی فیتری مان هەیە، لاکین موجانەسەتی ئیجتیماعیە، ئەخلاقـیە، لیسانیەمان نیە. لە صەد یەک لە زبانی یەکتر حاڵی نـابین، لەم حـاڵەدا ئەم موشـارەکەتی حەیاتیەمـان لەگەڵـێ جیهەتەوە ناقابیلی تەئلیفە. حەتا دو سێ ساڵ لەمەوپێش حکومەتی فەخیمەی بریتانی ئەم جیهەتەی خسـتە بەر ئەزەرەوە بۆ ئیرتیبات و عەدەم ئیرتیبات ئیستیمزاجی فکری کردین کە ئیلتیحاقمان بکات بە عیراق، بە کـولی جەواب درا (لەلامان باش نیە) و قبوڵ نەکرا. لەسـەر ئەوە حـاکمی سیاسـی مـێجەر گۆڵـد سـمیس بە ئەمـری جەنابی فەخامەتی مەندوب ئەلسامی بۆ محافەزەی قەومیەتی خۆمان وەعدی داینێ، نازانین ئەمڕۆ چ حـاڵەتێکی ئیداری و ئیجتیماعی ئەم حەقی حەیاتی‌یەی ئێمەی ئیسقات کردوە.

"ئەلحال ئەمڕۆ دەستوری ئەوزاعی کەونیە ئەم حەقە لە ئێمە غەصب ناکا مادام قەومیەت و عونصـوریەت رابیتەی میلیەی پچڕاند. ئێمەش قەومێکی سەربەخۆین ئیختیلافی عونصـور و لیسـان و حەیـاتی تاریخیەمـان زۆر چاک دیارە. لەم تەقسیمات و تەوزیعاتی حقوق و حەیاتەدا قبوڵی مەحرومیەت نـاکەین. وە هـیچ سـاحێب ویجدانێکیش ئەم مەحرومیەتی حقوقی میلیەمان قبـوڵ ناکـات. ئەم مەحـرومیەتە ڕاسـت و ڕاسـت تەعەروز بە عیزەتی نەفسی قەومیە و لە خصوص غەصبی حقـوقی صـەریحەی میلیەمـانەوە شـەرەفی حکومـاتی مـوعەزەمە عەلاقەدارەو، زاتەن ئێمە خۆشمان هیچ وەقتێ بۆ محافەزەی حەقی قەومیەت جەبانەت نانوێنین. مادام حکومەتی فەخیمەش لە وەقتی خۆی دا لوتف و وەعدی سەربەخۆی و محافەزەی قەومی‌ی پێ ئیلتیفـات کـردوین، ئەلـبەت ئەمڕۆش مەیدان بە غەصبی حقوقی قەومیەمان نادا و نامانخاتە ژێر زنجیری ئەسارەتی قەومێکـی تـرەوە. بـۆ ئەمە لە ڕوی هەمو عالەمی مەدەنیەتا پرۆتستۆی ئەم ئیرتیباتی ناحەقە ئیعلان ئەکرێ."

پێ ئەچێ لەوکاتەدا کەسێکیان نەبوبێ بە عەرەبی وتار بۆ رۆژنامەکەیان بنوسێ، بۆیە بە کوردی وەڵامی رۆژنامەیەکی عەرەبییان داوەتەوە، لەکاتێکدا وەڵامی رۆژنامەی تورکی بە تورکی و، هی فارسییان بە فارسی نوسیوە.

لە ژ14 دا حسێن نازم کە لەو کاتەدا مدیر مەسئول و سەرموحەڕیر بوە، لە ژێر سەردێڕی (بۆ ئەو زەواتانەی کە حائیزی قودرەتی تەحریریەی عەرەبیەن)، ئەم ئاگاداری‌یەی بڵاوکردۆتەوە:

"وەکو لە ئەوەڵەوە لە ئیفادەی مەخصوصەدا بەیانم کردوەکە خۆم لەبەر ئەمە کە ئیقتیداری تەحریریەی عەرەبیەم نییە راجیع بە ئەربابی موقتەدیرەی خۆی ئەکەم لوتفەن لەم خصوصەوە موافیق بە مسلەکی غەزەتەکەم درێغی معاوەنەت مەفەرمون."

## 2. 2. داکۆکی لە شێخ مەحمود

زۆر کەس ئەوسا و، ئێستایش هەندێ کەس لۆمەی شێخ مەحمودیان کردوە و ئەکەن لەسەر ئەوەی شێخ مەحمود نەیتوانیوە لەگەڵ ئینگلیز بگاتە رێکەوتن و، وڵات دور بخاتەوە لە بۆردومان و وێرانی. زۆرجار ئۆباڵی تێکچونی حکومەتی کوردی‌یان خستۆتە ئەستۆی ئەو. ئومێدی ئیستیقلال بۆ داکۆکی لە شێخ مەحمود و بەدرۆخستنەوەی ئەم قسانە، چەند جارێ وتار و لێدوانی نوسیوە. لە ژ2 دا لەو بارەیەوە نوسیوێتی:

"بۆ تەرەقی و سەعادەتی قەومی کورد حەزرەتی مەلیکی کوردستان، مەلیک مەحمودی ئەوەل (زێدە شەوکەتوهو) توشی چ فەلاکەت و کەشمەکەشێکی زەمانە بو، هەمو کەس ئەیزانی قبوڵی ئەم هەمو مەشەقەتەیش بۆ هیچ مەنفەعەتێکی شەخصی خۆی نیە. ئەتوانم ئیسپاتی بکەم کە لە وەختی سەعادەت دا چ ئیدیعایەکی کردوە لە وەخی ئەسارەت و ناخۆشیش دا عەینی ئیدیعا و ئیسپاتی کوردیەتی وەجانەن و و مالەن داوای حقوقی کوردی کردوە و محافەزەی خاکی کوردستانی کردوە و ئەکات. وە ئەم غایە و ئامالەیش لە تەرەف حکومەتی موعەزەمەوە و حەتا میلەلی ئەجنەبیەوە تەقدیر کراوە... موستەقیمەی زۆر وەعدی قەوی دراوەتێ، فەقەت مەعەلئەسەف لە تەرەف بەعزێ زەواتی موحتەرەمەی قەومی خۆمانەوە زۆر خیانەتی دەرحەق کراوە و بون بە باعیسی تەئخیری ئەم خەبەرە. ئومێد ئەکەین کە ئەوانیش بە تەواوی پەشیمان بینەوە و حکومەتی موعەزەمە ئیتر بە ئیفسادات بێ لوتفی نەفەرموێت و تەئخیری سەعادەتی ئێمە نەکات."

لە ژ5 دا ئەحمەد صەبری لە وتارێکی درێژدا نوسیوێتی:

"وەتەنی کورد لە عەسری حازردا زۆر بەختیارە. ئەمڕۆ بۆ رەفاهـ و سەعادەت و بۆ ئازادی و سەربەستی قەومی کورد حەزرەتی مەلیک مەحمودی ئەوەل کە بە جان و بەمال سەعی ئەکاو، بۆ تەرەقی و تەئمینی ئیستیقبال و ئیستیقلالی ئەم میلەتە تێ ئەکۆشێ لە مەنفەعەتی عمومی زیاتر هیچ غایە و مەقسەدێکی نیە بۆ هەمو کوردان مایەی سرور و تەشەکوراتە لە رێی سەعادەتی میلەت و وەتەنی کوردا ئەو سەبات و مەتانەتەی کە ئیبرازی کردوە لە تاریخی عەسری حازردا بە ئاوی ئاڵتون بنوسرێ کەمە. ئیستیقامەتی فکری مەعلومی هەمو کەسە و ئەم فکرە بۆ مەنفەعەتی شەخصی ناکا سەعادەت و شەرەفێکی موەقەتیشی مەتلوب نیە چونکی بۆ تەئمینی سەعادەتی شەخصی ئەملاک و سەروەتی خۆی کافیە. بینائەن عەلەیهی مەعلومە کە غایەو مەقسەدی هەر تەرەقی و تەعالی و تەئمینی ئیستیقبالی میلەتە. ئیمڕۆ رۆژی فرسەتە هەمو قەومێ نائیلی ئامالی خۆی بو هەر ئێمە ماوین. لەسەر هەمو برادەران و منەوەرانی کورد فەرزە کە بە یەکدڵ و یەکصەدا هاوار بکەین و بەقەلبێکی صاف و بێ غەش تەعقیبی غایەو مەقسەدی حەزرەتی مەلیکی کوردستان بکەین. فرسەتە ئیمڕۆ."

لە ژ16دا لە وتارێکی بێ ناو نیشاندا نوسراوە:

"ئەمڕۆ هەرچی کورد و ساحێب ویجدانە وا ئەزانم لەلایان مەعلـوم و مـوحەققەق کە حەزرەتـی مەلیکـی کوردستان، مەلیک مەحمودی ئەوەل، نە لە جاهـ و ئیقبال و نە لە مال و مەنصەب مەحرومە، ئەساسـەن سـەوقی حەمیەت و تەعەصـوبی میلـیەت بە فیـدای مـاڵ و جاهــ و ئیسـتیقلال و ئیستیخلاصـی ئەم میلەتـی نەجیـبەیە مەجبوری کردوە. تەئمینات ئەکەم لەم ڕێ یەدا هەر معامەلەیەکی بە سەرهات و بۆ ئەم مەقسەدە هەر فەلاکەتێکی دی بە عەینی سەعادەتی ئەزانی ئومێدەوارین لە نەزەری هەمو کورد و ساحێب ویجـدانێک دا ئەم فیـداکاریەی گوم نەبێ و بە شەرەفی ئەم جیهاد و فیداکاریەی ئیفتیخار بکا...

"ئەمڕۆ هەمو قەومێک بۆ ڕەفاهـ و حقوق و سەعادەتی خۆی سەعی و ئیجتیهـاد ئەکـا کە ڕەئـی خـۆی بگرێتە ژێر دەست و لەژێر ئەسارەت خەلاس بێ...

"ئێمە لەرێی حقوق و ئیستیقلالیەتی تامە و سەربەخۆیی کوردو کوردستان بەجان و دڵ سەعی ئەکەین و بە هەمو صورەت و وەسیلەیەک تەشەبوساتمان کردوەو ئەیکەین ئێستایش ئومێدمان قەتع نەبـوە. وە لەگەڵ هەمو دراوسێکانمان دەمانەوێ کە بەدۆست و بە خۆشـوەقتی و بەخۆشەویسـتی چـاک رابـوێرین و بە هەمـو نەوعێ معاوەنەت و حەقی دراوسێتی بەجـێ بهێنـین، فەقەت بە شـەرتێ ئەویـش قەدرو قـیمەت و حقوقمـان بە تەمامی بناسێ و ئیعتیرافمان پێ بکا، چونکی ئێمە میلەتێکین زیلەت قبوڵ ناکەین و بۆ محـافەزەی شـەرەفمان مەعەلئیفتیخار حەیاتی خۆمان بەخت ئەکەین.

"ئەی برادەرانی عەزیـزو جەنگـاوەری کـورد! حەزرەتـی مەلیکـی کوردسـتان (دامە شـەوکەتوهو) ئەمە مودەتێکی زۆرە لەسلێمانی بە هەمو عەزم و قودرەت و بەرۆح و بەماڵ بۆ ژیان و وەرگرتنـی حقـوقی کـورد و کوردستان سەعی فەرموە و قەتعیەن قسوری نەکردوە."

زێوەر لە ژ18 دا بە ناونیشانی (دوعای خالیصانەم) شیعرێکی لە ستایشی شێخ مەحمـودا نوسـیوە کە بەراستی دوعایەکی بەسۆزی دڵسۆزانەی رۆشنبیرێکی دڵپاکە ئەڵێ:

"بمێنێ موئەیەد خودایا، ئیلاهی
بەشەوکەت، بە حورمەت مەلیک نام و جاهی
لەسەر تەختی عالی نەبینم زەوالی
بلند بێ جەلالی ئیلاهی ئیلاهی
لەهەرچی بەڵا بێ لە دڵخۆشی لابێ
ببێتە گوڵستان ڕێی چاهـ راهی
عەدووی جاهی، دوچاری بەڵا بێ
هەمیشە موزەفەر بمێنێ سپاهی
مەلەک خەسڵەت، تۆی حەساری هەمو کورد
حەقیقەت لە بۆ میلەت خۆت پەناهی
لە تەعجیزی میلەت و لە عسیانی یەک یەک
مەڕەنجێ! ببەخشە گوناهکار گوناهی
لە یەکڕەنگ نەخوڵقاوە گوڵزاری عالەم
گوڵی زەردو سورە، جەلایە گیاهی
عەدووت شەرمەسارە چ موسلیم چ کافر

لە روتا بە دەس تاکو نەکرێ کولاهی
حقوقت نەپرسن ئەگەر ئەوروپایی
بسوتێ بینای مەحکەمەی سولحی لاهی
دەمێ بو بە ئومێدی ئەم رۆژە بوم
ببینم بە کوردی ئەوامیر نەواهی
شوکر دیم ئەوی ویستم، ئەما تەواوی
ببینم، لە بۆ کورد تەواوی رەفاهی

بێگومان زێوەر بۆ دانانی ئەم شیعرەی بەرتیلی لە کەس وەرنەگرتوە، بەڵکو ئەمە نمونەیەکی پایەی بڵندی شێخ مەحمودە لە دڵ و دەرونی دڵسۆزانی کوردا لەو هەلومەرجە ئاڵۆزەی ئەو رۆژانەدا کە ئینگلیز ئەیویست شێخ مەحمود بشکێنێ و کوردی لێ بتەکێنێتەوە.

لە ژ20 یشدا محەمەد عارف (عورفی) بە ناونیشانی (قەسیدەی مەدحیات و دوعای خالیصانەم) شیعرێکی درێژی لە ستایشی شێخ مەحمودا نوسیوە، سەرەتاکەی بەم جۆرە دەس پێ ئەکا:

لەسایەی مەقدەمی شاهێ کەنوری عیلم و عیرفانە
بەهەشتی عەدنە کوردستان، مەقامی حورِ و غیلمانە
لەشوێنێکی تریدا ئەڵێ:
مەلیک مەحمود کە زوبدەی ئالی ئەحمەد، مەرجەعی ئافاق
شەهی والا نەسەب، نوری دو دیدەی جوملە ئەقرانە
لە بۆ ئیسلامی کوردستان پەناهو پشت و پەرژینە
چراغی مەجلیسی یارانی دین، شەمعی شەبوستانە

## 2. 3. هەواڵ

## 2. 3. 1. هەواڵی کوردستان

### 2. 3. 1. 1. دامەزراندنەوەی دەزگاکانی بەڕێوەبەرایەتیی حکومەتی کوردستان

لە ژ1 دا هەواڵی پێکهێنانەوەی دەزگای بەرێوەبەرایەتیی حکومەتی کوردستانی بەم جۆرە بڵاوکردۆتەوە:

"تەشکیلاتی تەدویری ئوموری مەملەکەت بەرەئی مەجلیسی عمومی ئەکرێ، کە ئەم مەجلیسە لە ژێر ریاسەتی نائیب ئەلحکومەدا تەشەکول ئەکات وە حەسەب ئەللزوم حەزرەتی مەلیکی موعەزەم لە حزوری خۆی دا ئیجتیماعیان پێ ئەکات.

"ئەم مەجلیسە عیبارەتە لە روئەسای دەوائیر و ئەشرافی مەملەکەت کە لە ژێرەوە نوسراوە:

"ئەعزای تەبیعی: رەئیسی داخلیە شێخ محەمەد غەریب. رەئیسی مالیە و گومرگ سەید ئەحمەد ئەفەندی. رەئیسی مەحکەمە مەعروف ئەفەندی. رەئیسی تیجارەت و مەعاریف و نافیعە حاجی مەلا سەعید ئەفەندی. قوماندانی عەسکەر رەزا بەگ.

"ئەشراف و مونتەخەبی ئەهالی: حاجی مەلا سەعید ئەفەندی. محەمەد ئاغای عەبدورەحمان ئاغا. محەمەد بەگی قادر پاشا. حاجی ئەحمەدی حاجی کەریم. مەلا حسێن ئەفەندی. حاجی ئیبراهیم ئاغا. حاجی ئەمینی حاجی عەزیز. حاجی رەحیم. حەسەن بنەوشی.

"تەرتیباتی دائیرەی ملوکانە: یاوەر و سەرکاتب جەنابی سەید ئەحمەد ئەفەندی. کاتب جەنابی ئەحمەد صەبری ئەفەندی. زابتی ئامیر جەنابی ملازم ئەوەل ماجید ئەفەندی. قوماندانی بلوکی مەعیەت جەنابی محەمەد ئەفەندی.

"هەیئەتی نودەما: لە پاشان ئەکرێ.

"مەئموری مەصاریفاتی دائیرەی ملوکانە: شەریف ئاغا.

"مودیری موسافیرخانە: سەعید ئاغا.

"سەرخەدەمە: شەمسەدین."

هەر لەم ژمارەیەدا بەم بۆنەیەوە بە ئیمزای (کورد) نوسیوێتی:

"تەرتیبات و تەشکیلاتی حازرە بۆ محافەزەی حقوقی میللیەیە

"هەر بەم حاڵە بە ئومێدی ئیستیقلال بۆ حەقی حەیات و ئیحیای خاکی پاکی موقەدەسی کوردستان خۆمان فیدا و تا ئاخر نەفەسمان سەعی و کۆشش ئەکەین.

بە موخاصیمانمان تەبشیر ئەکرێ."

لە ژ19 دا هەواڵی (مەجلیسی مەبعوسانی عیراق) ی بەمجۆرە بڵاوکردۆتەوە:

"سامەرە، کازمیە، بەغداد، بەعقوبە، ئەربیل و کۆیە، بۆ مەجلیسی مەبعوسانی عیراق ئەعزایان ئینتیخاب کردوە."

بەڵام لە ژ22 دا دەربارەی دانانی چەند کەسێ بە نوێنەری سلێمانی لەو مەجلیسەدا، مەزبەتەیەک بڵاوکراوەتەوە کە ژمارەیەکی زۆر لە: ئەشرافی مەملەکەت، عولەمای کیرام، توجاری مەملەکەت، بازرگان، ساداتی کیرام، موسەوی مەملەکەت، کەوشدروی مەملەکەت، بەقاڵی مەملەکەت، ئاسنگەری مەملەکەت، ئیمزایان کردوە ئەڵێن:

"وەکو لە جەرائیدی ئەلعیراق و سائیری بەغداد دا خوێندراوەتەوە گۆیا بۆ لیوای سلێمانی عیزەت بەگی عوسمان پاشا و، ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ و، میرزا فەرەج و، محەممەد بەگی فەتاح بەگی جاف، بیلا ئینتیخاب بە مەبعوس تەعین کراون. ئەمە تەصادوفی غەریبە. بە قەوانینی ئەساسیە مەبعوس بە ئینتیخاب تەعین کردن حقوقی میللییەیە. فەقەت نازانین چۆن ئەم زەواتە بە بێ مەعلوماتی میللەت بە مەبعوس ناسراون وا بزانین ئەمانە بە تەعین مەئمورییەتی مەبعوسییان تەوجیە کراوە...

"ئێمە ئەگەر مەبعوس ئینتیخاب بکەین بۆ تەئمینی حقوقی میللیە و ئیکمالی نەواقیصی داخلیمان لە ناو خۆمان دا لە خۆمان بە ئوصولی ئینتیخاب ئەو کەسانە کە شەرائیتی قانونیەیان تیا مەوجود بێ ئینتیخاب ئەکەین. ئەمڕۆ ئەم وەزیفەیە هەتا ئینکیشافی حەقیقەت و تەسلیمی حقوق و مەوجودییەتمان، تەودیعی مەجلیسی میللیمان کردوە.

"وەکو وتمان چونکە ئەم مەبعوسانە بە ئینتیخابی ئێمە نەکراوە ئیعتیمادیشمان پێیان نیە. لە موقەڕەرات و تەعەهوداتیشیان عەلاقەدار نین."

"ئیعتیزار: لە نوسخەی هەفتەی رابوردوی ئومێدی ئیستیقلال دا کە بە تاریخی 10 ی نیسان و ژمارە 22 لە خصوص مەبعوسانی سلێمانی کە بەعس کرا بو لەو میانەدا حەفیدزادە شێخ قادر ئەفەندی لە بەر حاڵەتی رەمەزان سەهوەن داخل نەکرا بو."

دوای دانانی فەیسەڵ بە مەلیکی عیراق، لەسەر داوای ئینگلیز ئەبو هەڵبژاردن بکرێ بۆ دروستکردنی ئەنجومەنی دامەزرێنەر کە ئەبو 3 کار ئەنجام بدا:

یەکەمیان:
قانونی ئەسایی (دەستور) بۆ عیراق دابنێ.
دوەمیان:
پەیماننامەی بریتانی عیراقی پەسەند بکا.
سێیەمیان:
موقەرەرات قانونی هەڵبژاردنی ئەندامانی ئەنجومەنی گەل دابنێ.
لە 27 ی ئازاری 1924 دا ئەنجومەنی دامەزرێنەر یەکەمین کۆبونەوەی لە بەغداد کرد، ئەگەرچی لە سلێمانی هەڵبژاردن نەکرا بو، چونکە سلێمانی لە ژێر دەسەڵاتی حکومەتی کوردستان و هێزەکانی شێخ مەحمودا بو، نەک حکومەتی عیراق و هێزەکانی مەلیک فەیسەڵ. کاربەدەستانی ئەو سەردەمە فێڵێکیان دۆزیەوە، هەڵبژارنێکی روکەشیان لە کەرکوک ئەنجام دا و 5 کەسایەتی ناسراوی سلێمانییان دانا بە نوێنەری سلێمانی. ئومێدی ئیستیقلال ناهەقی نەبوە کە (ئیعتیماد) ی پێیان نەبوە و (لە موقەرەرات و تەعەهوداتیشیان عەلاقەدار) نەبوە، چونکە ئەمانە لەو ئەنجومەنەدا هیچ قسەیەکیان بە قازانجی گەلی کورد و مافە نەتەوەییەکانی نەکردوە.

### 2. 3. 1. 2. لێبوردنی گشتی

لەگەڵ کشانەوەی ئینگلیزدا، خەڵک دابەش بون بە سەر دو بەشدا: ئەوانەی کە شەڕیان لەگەڵ ئینگلیز پێ باش نەبوە و بە کارێکی دۆڕاویان داناوە و بێزار بون لە بۆردومان و چۆڵکردنی چەند جارەی سلێمانی و، ئەوانەی کە لایەنگری شێخ مەحمود بون. کە ئینگلیز سلێمانی چۆڵ کردەوە، تاقمی یەکەم کە وەکو ئەدمۆنس ئەڵێ دو هەزار کەسێ بون، بە کۆمەڵ کوچیان کردوە بۆ کەرکوک و بەغداد و تاقمی دوەم ماونەتەوە. ئەم روداوە لە ئومێدی ئیستیقلالدا باس کراوە. سەرەتا (مەجلیسی میللی) داوای لە مەلیکی کوردستان کردوە لێبوردنی گشتی بۆ ئەوانە دەربکا کە رۆیشتون و، مەلیکیش لە سەر داوای ئەوان لێبوردنی بۆ دەرکردون.
لە ژ4 دا نوسیوێتی:
" قەراری مەجلیسی میلی و عەفوی عالی ملوکانە
"بۆ حزوری عەدالەت دەستور شەوکەتمەئاب حەزرەتی مەلیکی کوردستان (دامە ئیجلالەهو)
"ژمارە 5
"قەراری مەجلیسی میلی وایە ئەوانەی لە بەر خەوفی بۆمباردومان وە یا بەعزێ ئیش کە خیلافی حقوقی وەتەن بێ کردویانە موجریمن قیسمەن بە عائیلەوە فیراریان کردوە بۆ کەرکوک و بەغداد و مەواقیعی سائیرە بۆ ئەمە کە بێنەوە مەسکەن و مەئوای خۆیان حەزرەتی شەوکەتمەئاب عەفوی عومومی صادر بفەرموێ لە سەر قەراری مەجلیس عەرز کراوە. ئیتر ئەمر ئەمری جەلالەتمەئابە.
فەرمان.
"8 ی تشرینی ئەوەلی 339
"رەئیسی مەجلیسی میلی و رەئیسی داخلیە غەریب"
شێخ مەحمود بەم جۆرە وەڵامی داوەتەوە:
"بۆ جەنابی رەئیسی مەجلیسی میلی
"جوابی 8 ی تشرینی ئەوەلی 338 (راستەکەی 339 یە و بە هەڵە نوسراوە) و ژمارە 5 ی قەراری مەجلیسە

"ئەوانەی کە لەبەر خەوفی بۆمباردومان وە یاخود لەبەر ئەفعالی خۆیان سوئی زەنیان بۆ حاسل بوە و بە واهیمە بە ماڵەوە هیجرەتیان کردوە غەیرەز ئەوانە کە لە ئەشکەوتەوە فیرار بون من عەفوم ئیعلان کرد بون لە سەر تەکلیفی ئێوە و غایەی خۆم ئەمجارەیش عەفوەکەیان تیکرار ئەکەمەوە چونکە مەعلومی جیهانە ئەم فیداکاریە کە هەتا ئێستا ئیقتیحام کراوە صیرف بۆ تەرەقی و سەعادەتی ئەم میلەتەیە غەیری ئەم جیهەتە مەشروعە نەبێ هیچ ئەمەلێکی تر تەعقیب نەکراوە.

"وا لازم ئەکا ئەمانەیش بۆ حاصل بونی ئەم تەرەقی و سەعادەتە و نەجاتی خۆیان بە قەدەر ئێمە سەعی بکەن و هەمو بێنەوە سەر جێگە و ڕێگەی خۆیان و مەشغوڵی دۆزینەوەی ڕێگەی سەعادەت و کەسابەتی خۆیان بن. بەم صورەتە تیکرار ئیعلانی بکەنەوە.

10 ی تشرینی ئەوەلی 339 مەلیکی کوردستان مەحمود

لە ژ 5 دا ڕەفیق حیلمی لە ژێر سەردێڕی (بۆ وەتەن جوداکان) دا نوسیوێتی: لە نوسخەی پێشودا قەراری مەجلیسی میللی و عەفوی عالی ملوکانە کە دەرحەق بە بەعزێ وەتەن جوداکانمان سەرەف سادر بووە نەشر کرابوو ئێمە بە حسابی خۆمان لەم قەرار و ئیرادەیە زۆر موتەحسیس بوین چونکە مەعلتەئەسوف لە موفادی ئەمانە وا دەردەکەوێ کە ئێمە یەعنی ئەفرادی ئەم میللەتە پاشکەوتوە لە وەزیفە و حیمیەت و وەتەن پەروەریدا زۆر ئیهمال و تەکاسولمان نواندوە. لەفزی ملەوەس خیانەت دەرحەق بە ئەولادی ئەم وەتەنە موقەدەسە ئیستعمال ناکەم، فەقەت مەعەلتەئسوف گەلێ ئەحوال و خسوسیات بۆ ئەوانەی کە موفریت بن مەیدان بە ئیستعمالی ئەم لەفزە غەڵتریش ئەدا ئیحتمالی ئەو وەتەن جودایانە لەم شائیبەیە بەری بن، مەعسوم و خێری خوای وەتەنی خۆیان بن غایەیان تەرەقی و تەعالای میللەت بوبێ لەبەر ئەمە لە پێش ئیعتای حوکم لازمە ویژدانانە موحاکەمەی حەرەکەتەکەیان بکەین. وەکو لە ئیرادەکەدا پێیان فەرموراوە ئەوانە ئەگەر لە ترسی بۆمبا ڕایان کردبێ معەلتەئەسوف زۆر حەرەکەتێکی بێ مەعنایان کردوە چونکە هەر ئەو کەسانە کولی یەکێکیان خزم و کەس و کاریان تا ئەمڕۆ ئەم مەملەکەتەی هەنگاوێ بەجێ نەهێشتوە لە ڕێی تەحەققوق ئامالی میللەتدا ئیلتیحامی هەموو نەوعە فەلاکەتێکیان کردوە، ئەوانیش ئەگەر هەر شەخسی خۆیان مەتڵوب... ئەگەر لە سەعادەت و فەلاکەت و میللەت و مەملەکەتی خۆیان موشتەرەک دەبینی لازم بوو لێرەدا تا تەوەزوحی وەزعیەت... بکردایە ئەگەر مەملەکەت مەسعود بوو لەو سەعادەتە حیسەی خۆیان ئیدراک و ئەگەر بەدبەختیش بوو مەهما ئەمکەن بۆ ئیعادەی سەعادەت و بەختیاری سەعی و یاخود لەگەڵ میللەتدا موشتەرەکەن فەلاکەت و ئیدراکی مەملەکەتیان بکردایە، ئەگەر لە ترسی بۆمبا و یا تەجاوزاتێکی خارجی ڕایان نەکردوە و داخلی مەملەکەت نارازی بوون بە حەسەب ئەمە کە خۆیان لە... میللەت عەدا کرد دیسان لازم بوو بە کەمالی جەسارەت و... بە سورەتێک کە لە نەزەر رەئس کارەکان و... وە بلخاسە لە نەزەر میللەتدا حوسن زەنیان تەسدیق بکرێ تا دەیان توانی جەرەیانەکە بخەنە دائیرەیەکی مەعقول و مەنتقی مەیدانیان نەدایە بە فەلاکەت و بەدبەختی. ئیحتمال بوو ئەمەیش نەفەرمون کە گوێیان لێ نەگرتن ئەمەیشان قبوڵ نیە چونکە کە قسەی حەق و حوسن زەن مەوجود و ئاشکار بوو موتلەقەن ڕۆژێک دەبێ کە ئیعتباری پێ بکرێ و سەربکەوێ نیهایەت ئەوەندە هەیە لە حالی ئاوادا ئیسبات و مەتاعبێکی جدی لازمە. سەباتیش بە وجود غایەیەکی موەزەح و مەقبولەوە قائمە هەموو بێ سەباتیەک لەبەر نەبونی غایە حاسڵ دەبێ غایەیش کافی نیە تا موەزەح و مەقبول نەبێ غایەی موەزەح مەعنای ئەمەیە تێکەڵ و پێکەڵ نەبێ یەعنی موتەعەلیق نەبێ بە ئەحوال و شەرائتەوە لە هەموو ئەحوالێکدا بیلا قەید و شەرت شکڵ و شەمائلی خۆی بکا چونکە ئەگەر وەکو دارتاشەکانی خۆمان تابع نەشەوا بین ئەو کەرەستەیەی بە دەستمانەوەیە ناتوانین بە قەتعی بڵێن کە چی لێ دروست ئەکەین.

لەمەیش مەقسەد ئەمەیە کە وەستا ماهر نەبووە ئەو کەرەستەی بە دەستیەوەیە موافقی ئارەزوی خۆی پـێی ئیستعمال ناکرێ نەشوای چونی دارتاشی ئەوەی لێ حاسڵ دەبێ.

سانیەن: وەکو عەرزمـان کـردن ئەو غـایەیە دەبـێ مەقبـولیش بـێ چـونکە لەگەڵا و زەل تەوەسـول بە دروست کردنی سەفینە بکرێ موفەقیەت حاسڵ نابێ، بینـائەن عەلەیهـی غـایە لازمە مەقبـولیش بـێ ئینجـا لەم تەتویل مەقالەدا مەقسەد ئەوەیە ئەو زاتانە کە مەملەکەتیان بەجێ هێشتووە ئەگەر بەم نەوعە ساحێب غـایەیەکی مەقبول بوون بۆچی ڕۆیشتن عەجەبا بە سەباتێکی جوزئی دەقاقی ئەم ڕۆژە مەسعودەیان پـێش نەئەخسـت... موحەققەق هەم پێشیان ئەخست و هەم بەعزێ ئەحـواڵیش کە مەعلئەسـەف لەبەر سـوء تەفـاهوم حاسـڵ بـووە رووی نەئەدا عەلاوەی ئەمانە وەزیفەی وەتەنیە خۆیان ئیکمال و نائل سـەعادەت و شـەرەفێکی گەورە دەبـون، فەقەت مەغرور بە حوسن زەن ئەو دڵشکستانە جەسارەت دەکەم کە بڵـێم ئەوانە کە بەعزێکیـان لـێ ئیستسـنا بکرێ باقیان غایەیەکی موەزەح و مەقبولیان نەبووە و لەبەر ئەمە نە خۆیان پێ مەعلـوم کـراوە و نەتوانیویـانە کە لە مەملەکەتدا ببن بە عامل جەرەیان و ئینقلابات. بینائەن عەلەیهی لە پێش هەموو شـتێکدا لازمە کە نەفسـی خۆیان تەختیەی ئەم قەرار و شناسانەیەی میللەت بە کەمالی ئیفتیخار تەلەقی بـکەن حەزرەتـی مەلیـک دەرحەق بەوان فیلحەقیقە عاتفەتی ئیبراز فەرموە لە... مازیەی خۆیان بە مەسئول بـزانن زۆر حەرەکەتێکـی مەقبـول و مەردانە ئیبراز ئەکەن لە سەر ئیرادەی ملوکانەیش مەملەکەت سینەی حـورمەت و شـەفقەتی بـۆ ئەوانە گوشـاد دەکا بۆ تەلافی ما فات شاب کردنیان موجەب خەشنەوەی میللەت و دەلیـل وەتەن پەروەری ئەوانە. چـونکە ئەم حوسن زەنە کە حەقیان ئیبراز کراوە لازمە حوسن تەفتیش بکرێ ئەلحەمدولیلا ڕۆژی سـەعادەت و سـەلامەتی وەتەن بە تەواوی تەقەڕوبی کـردوە لە ڕەغـم ڕەقیبـان مـیللەت نائـل دەبـێ، لەم ڕۆژی سـەعادەتەدا ئەوانەی کە ئیشتراکی فەلاکەتیان نەکردون دیسان لەگەڵ ئێمە موشـتەرەکەن موەدبونیـان موافـق شـان حیمـیەت و وەتەن پەروەری دەبینین.

## 3. کاروباری دارایی

یەکێ لەو هەواڵانەی بڵاوی کردۆتەوە، هەوڵدانی حکومەتی کوردستان بـوە بـۆ ڕێکخسـتنی کاروبـاری دارایی:

لە ژ19 دا لە ژێر سەرێری (پولی تازەی کوردستان) دا نوسیوێتی:

"ریاسەتی مالیە قیمەتی یەک و هەشت ئـانەیی و، بـۆ تـاپۆ پێـنج روپیەیـی، پـولێکی تـازەی ئیحـداس کردوە. ئەم پولانە لە سەر زەمینی سەوز وەکو نمونەی چاپکراوە وەهایە. "لە ژێر ئەم هەواڵەدا وێنەی پولەکەی چاپ کردوە.

لە ژ20 دا نوسیوێتی:

"پولی کوردستان: ئەمڕۆ پولی چوار روپیەیـی و روپـیەو نیـوی و یەک روپیەیـی تەبـع کـرا و خـرایە مەوقیعی تەتبیقەوە."

لە ژ20 دا لە ژێر سەردێری (تەشەبوساتی مالیە) دا نوسیوێتی:

"لە پاش دروستکردنی پول رەئیسی مالیە بە جدی خەریکی تەداروکی میقدارێکی زۆر ئاڵتونی سکەدار و بێ سکەیە کە لە سنوق دا بە تەئمینات دای بنێ و بە موقابیلی ئەو ئاڵتونە بەنقەنۆت چاپ بکـات و بیخـاتە مەوقیعی تەتبیقەوە."

### 2. 3. 1. 4. ڕێوشوێنی پاراستنی ئاسایش

ژ1 "ئیرادە: لە ئەتباع و خزمەتکار و مەئموورانی مـن هەر کەس غەدر وە یـا نـاحەقیەکی کـرد بـیلا تەرەدود بە سەربەستی بێت موراجەعەت بەدیوانی حەرب بکا ئەمرمـان بە دیـوانی حەرب داوە ئەگەر کەسێک بە ناحەق غەدر لە میلەت و ئەهالی بکات بە جەزای شەدید موجازات بکرێ. مەلیکی کوردستان مەحمود"

ژ1 "ئیعلان: مەئمورانی دەوائیر لەمەودوا ئەبێ لە ساعەتی 1 ی بەیانەوە تا ساعەتی پێنج و لە سـاعەتی 7 ەوە تا ساعەتی دەونیوی ڕۆژ ئەبێ لە دائیرەدا لەسەر وەزیفەی خۆیان ئیفای وەزیـفە بـکەن. هەر مەئمـورێ پێچەوانەی ئەم دەوام و ئیعلانە حەرەکەت بکا قیستەلیەومی ئەبڕرێ و حەتا تەجزیەش ئەکرێ.

لە ژ20 دا نوسیویێتی:

"ئیعلان: بۆ هەر جێگایەک و لە تەرەف هەر شەخسێکەوە کاغەزێ بنوسـرێ لازمە ئیتیـدا لە دائیـرەی پۆلیسـخانەدا تەماشـای بکـرێ و پـولی لـێ بـدرێ ئەوجـا ڕەوانە بکـرێ و هەر کەس موخـالیفی ئەم ئەمـرە حەرەکەت بکا جەزای ئەدرێ."

هەر لە ژ20 دا نوسیویێتی:

"ئیعلان: لە ئەهالی ئێران و سائیری خاریجی موحیتی سلێمانی لە قیسـمی غورەبـا هەر کەس و لە زیمنـی هەر ئیشـێکا ئەمـڕۆ کە لە وڵاتـی سـلێمانی مـوەقەتەن ئیقـامەتی کـردوە لە زەرفـی هەفتەیەکـدا هەر کەس لازمە موراجەعەت بە موختاری ئەو مەحەلەیە بکا و ئیسم شوهرەت و صەنعەت و مەحەلی ئیقامەتی خـۆی بەیـان بکـات و ئەسڵەن خەڵقی کوێشە بۆ موختاری مەحەلەی بەیان بکات شایەد ئەگەر تەئخیر بێ موجازاتی ئەدرێ. پۆلیسخانە"

لە ژ22 دا نوسیویێتی:

"ئیعلان لە تاریخی 16 ی نیسانی 340 ەوە هەتا 10 ڕۆژی تر هەر موهاجیرێک کە هەیە لە سلێمانی بۆ پاس موراجەعەت نەکات بە پۆلیسخانە لە پاش ئەوە لە تەرەف مەئمورەوە قـۆنترۆڵ دەکـرێ هەر کەسـێک بێ پاس گیرا بە شیدەت تەجزیە دەکرێ. بۆ مەعلومات ئیعلان کرا. دائیرەی پۆلیسخانە."

### 2. 3. 1. 5. ڕێکخستنەوەی خوێندنگاکان

لە ژ3 دا هەواڵی دانانی ڕەفیق حیلمی بە موديری ئەعدادی نوسیوە:

"جەنابی ڕەفیق حیلمی ئەفەندی کە مودەتێک لەمەوپێش لەبەر ئەحوالی صحیەی غەیبوبەتی کرد بۆ 20 ڕۆژێکە تەشریفی هاتەوە. هەرچەندە لیاقەت و فیداکاری موما ئیلەیهی بۆ هەمو وەزائیفی مـوهیمە کـافیە، بەڵام لەبەر ئەوەی کە مەکاتیبی مەرکەز لە ئینقلابی ئەخیـر دا یەکجـار پەرێشـان و بـێ سـەروپا بـو، بـۆ تەنـزیم و ئیسلاحیان هەمدیسان موديریەتی مەکتەبی ئیعدادی تەودیع کرا. زاتەن لە پێش ئینقیلاب دا لە سـایەی غیـرەت و هیمەتی ئەم زاتەوە مەکتەبەکەمان حەقیقەتەن واصلی مەرتەبەی کەمال بوبـو. ئومێـد دەکەیـن کە ئەمجـارە بە نەوعێـک صـەرفی هـیمەت بفەرمـون کە مەعاریفمـان لە حەدی مەتلـوب دا تەرەقـی و ئەم عەیبـی پاشـکەوتنی مەعاریفەیشمان نەمێنێ."

### 2. 3. 1. 6. گفتوگۆ لەگەڵ ئینگلیز و عیراق

لە ژ2 دا ئەم نامەیەی (مەجلیسی میلی) کە بۆ شێخ مەحمودی نوسیوە بڵاوکردۆتەوە:

"بۆ حزوری حەزرەتی مەلیکی موعەزەم (دامە شەوکەتوهو)

قەراری مەجلیسی میلی وایە حەزرەتی مەلیک (دامە شەوکەتوهو) بە صورەتێکی عاجیل، بە هەر نەوعێ خۆی تەصویبی ئەفەرموێت، بۆ سەلامەتی وەتەن و میلەت، تەئمینی موخابەرە و موناسەبەت و رابیتەی حیمایە لەگەڵ حکومەتی بریتانیا و دۆستی لەگەڵ حکومەتی عیراق دا بکات.

"ئیتر ئەمر ئەمری ئولولئەمرە فەرمان.

رەئیسی مەجلیسی میلی و رەئیسی داخلیە غەریب"

شێخ مەحمود لە وەڵامی ئەم نامەیەدا نوسیوێتی:

"بۆ جەنابی رەئیسی مەجلیسی میلی و رەئیسی داخلیە

"جوابی 22 ی ئەیلولی 339 و 1 ژمارەیە

"لەو رۆژەوە کە هاتومەتەوە بۆ سەلامەتی وەتەن و میلەت تا ئێستا بۆ تەئمینی رابیتە و موناسەبەت لەگەڵ حکومەتی بریتانیا و دۆستی لەگەڵ عیراق دا زۆر موخابەرە جەرەیانی کردوە و لە موخابەرات پاش نەکەوتوین. ئومێد ئەکەم بەم زوانە نەتیجەی خێر و موەفەقیمان دەست کەوێ. مەلیکی کوردستان مەلیک مەحمود"

لە ژێر ئەم نامەکارییەی مەجلیس و شێخ مەحمودا بە ئیمزای (کورد) نوسیوێتی:

"قەومی کورد لە غایەی سەربەستی بە واسیتەی حکومەتێکی حەمیەتمەنەوە زیاتر هیچ غایەیەکی تر تەعقیب و ئارەزو ناکات و خصومەت و عاجزی لەگەڵ کەس دا نیە. وە دائیمەن چاوەڕێی لوتف و معاوەنەتی گەورەترمان ئەکەین. فەقەت ئەوانەی کە کوردن و خائینی وەتەنن ئینشائەڵا پاک ئەکرێنەوە. لە پێش هەمو ئارەزویەکماندا ئومێدمان وایە کە ئەو غایەیەمان و ئەو حقوقی مەشروعەیەمان پێ بەخش بفەرموێ. ئێمە هەر سەعادەت و سەلامەتی وەتەنمان ئەوێ و ئارەزوی خزمەتکاری ئەکەین."

پێ ناچێ هیچ پێشکەوتنێ لە گفتوگۆی کورد و ئینگلیزدا روی دابێ، بەڵکو بە پێچەوانەوە بۆ کەمکردنەوەی دەسەڵاتی شێخ مەحمود و تەسککردنەوەی قەڵەمرەوی، قەزا و ناحیەکانی سلێمانییان لە شاری سلێمانی دابڕیوە. هەڵەبجە و چەمچەماڵ خراونەتە سەر کەرکوک و رانیە خراوەتە سەر هەولێر.

لەو ماوەیەدا هەڵبژاردنی گشتی لە بریتانیا کراوە. ئاڵوگۆر لە دەسەڵات دا بوە. (لەیبەر) هەڵبژاردنی بردۆتەوە. بەم بۆنەیەوە (ئومێدی ئیستیقلال) لە ژ17 دا نوسیوێتی:

"قابینەی عەمەلە

"مەتبوعاتی دنیا بە موناسەبەتی چونە سەر ئیقتیداری قابینەی عەمەلە لە ئینگلتەرە هەر یەکێ بە نەوعێ تەنقید وە یا بەیانی فکر و بیلخاصە بەعزێ میلەل ئیزهاری ئومێد ئەکەن. بیلخاصە عالەمی شەرق وا ئومێد ئەکا کە بە واسیتەی ئەم قابینەیەوە نائیلی رەفاه و، لە ئیستیبداد هیچ نەبێ نەختێک رستگار ئەبێ. تەصدیق کردنی ئیدارەی بۆلشەویکی لە تەرەف قابینەی تازەوە ئەم ئومێدە تەقویە ئەکا. حاصلی عالەمی جیهان لە قابینەی تازە صولح و سەلامەت و سەعادەت و ئەمنیەت ئومێد ئەکا. عەجەبا ئێمە کە چنگێ خاک و مشتێ بەشەری بێچارەین ئەتوانین تەمەنا وە ئومێد لە قابینەی تازە بکەین کە هیچ نەبێ ئەگەر لەمەولا بۆمبارددومان کراین بە بۆمبای تۆزێ پچوکتر تەلەف بکرێین؟

"ئەم ئومێدە وە یا تەمەنایەمان شایانی تەعەجوب نیە، چونکە پێنج ساڵ زیاترە لە هیچ بەشەرێکەوە، حەتا لە عیرقی و هاوزمانی خۆمانەوە، لە خیانەت و تەجاوز بەو لاوە هیچ حیسی مەرحەمەتێکمان نەدیوە. فەقەت بە نەزەر پرۆغرامی عەمەلە و دەعوای موحیقی ئێمە ئەبێ زۆر ئومێدواری بین لە ئینسانیەتپەروەری قابینەی تازە. ئومێدی ئیستیقلال "

لێرەدا دو شت پێویستی بە رونکردنەوە هەیە:

یەکەم:

لە لێدوانی رۆژنامەکەدا نوسراوە: "... ئەتوانین تەمەنا وە یا ئومێد لە قابینەی تازە بکەین کە هیچ نەبێ ئەگەر لەمەولا بۆمباردومان کراین بە بۆمبای تۆزێ پچوکتر تەلەف بکرێین؟" هێزی ئاسمانی بریتانی، بە شایەتی ئەدمۆنس (ل 313 "کرد و ترک و عرب") کە خۆی لە بۆردومانی کوردستاندا بەشدار بوە، بۆ یەکەمین جار لە مێژوی جەنگدا هەندێ بۆمبای لە کوردستان تاقی کردۆتەوە قورساییەکەی 220 پاوەند بوە، کە قورسترین بۆمبای ئەو سەردەمەی تفاقی جەنگ بوە لە هەمو دنیادا.

دوەم:

چەند وشەیەکی ئەوروپایی بە تورکی کراوی بەکارهێناوە، کە لە زمانی کوردیی ئەم سەردەمەدا نائاشنایە، وەکو: بۆمباردومان، مەبەستی بۆمبارانە.

قابینەی عەمەلە، مەبەستی (لەیبەر کابینێت) واتە ئەنجومەنی وەزیرانی پارتی کار (لەیبەر پارتی) ی بریتانیە.

### 2. 3. 1. 7. بۆمباردومان

هێزی ئاسمانیی بریتانی بەوپەڕی دڵڕەقیەوە بۆردومانی ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی حکومەتی کوردستانیان کردوە. ئەدمۆنس کە یەکێ بوە لە کاربەدەستانی ئەو سەردەمەی ئینگلیز و بارەگاکەی لە کەرکوک بوە، خۆی (ل 306 ی "کرد و ترک و عرب" دا) دان بەوەدا ئەنێ کە لە رۆژی 20 ی ئەیلولی 1922 دا گەیشتۆتە کەرکوک، رۆژی 26 ی نیسانی 1924 بە ئیجازە بە جێی هێشتوە. لەو 585 شەوەی کە لەو ناوچەیەدا بوە 225 شەوی لە دەرەوەی بارەگا رەسمیەکەی کەرکوکی بە سەر بردوە، لەوەیش 43 رۆژی بە ئاسمانەوە بوە، خەریکی نۆڕینی ناوچەکە و هەڵبژاردنی ئامانجی لێدان و بۆردومان بوە.

ژیانەوە لە ژ8 ی 24 ی تشرینی ئەوەلی 1924 دا نوسیوێتی:

" مەدالیە بۆ حەرەکاتی کوردستان:

"لۆندەر 8 ی مینهو (واتە 8 ی تشرینی ئەوەلی 1924)، مەدالیای خەدەماتی عمومیە درا بە قواتی مارشاڵ سالمۆند، قوماندانی هەوائی، بۆ حەرەکاتی عەسکەریە کە لە کوردستان لە 19 ی مارتەوە هەتا 18 ی حوزەیرانی ساڵی رابوردو ئیجرای کردوە."

ئومێدی ئیستیقلال هەواڵی هەندێ لەم پەلامارە ئاسمانی‌یانەی فرۆکەکانی بریتانیای بڵاوکردۆتەوە:

"بۆمباردومان: لە 12 ی مارتدا بە 5 تەیارە ئاوایی حەمەی سان ئەحمەد کە لەو بەر سیروانە بۆمباردومان کراوە. لە تەیارەکان یەکێکیان سقوتی کردوە.

"لە 16 ی مارتدا لە سلێمانیەوە لە ئیستیقامەتی شارەزورەوە تەقینی 20 - 30 بۆمبا بیستراوە و مەحەلی بۆمباردومان هێشتا مەعلوم نەبوە."

لە ژ21 دا نوسیوێتی:

"بۆمباردومان؛ 27 ی مارتی 340 کە موصادیفی رۆژی پێنجشەنبە بو 4 تەیارە قەرەچەتان و 4 یش گردەبۆری لە ساعەتی 3 ی رۆژدا سەعاتێک و پێنج دەقیقە بۆمباردومانی کردوە و لە عەینی رۆژدا. وە لە عەینی رۆژدا ساعەتی هەشت و نیو 3 تەیارەی تر عەوداڵان و ئەو ئەترافەشی بۆمباردومان کردوە."

لە ژ25 دا لە ژێر ناونیشانی (خەبەراتی داخلی) دا نوسیوێتی:

"بە بێ مەعلوماتی ئەهالی، لە سەر تەشەبوسات و موراجەعەتی ئەحمەد بەگی عوسمان پاشای ئەلەبجە بۆ محـافەزە و مەنفەعەتـی شەخسـی خـۆی، بە هەر دەسـایس و حیلەبـازیەک بـو، میقـدارێک سـواری لە حکومەتی بریتانیا سەند بو.

"بە واسیتەی ئەم قوەتەوە خەریکی غەدرو تەعەڕوزاتی ئەهالی بو، لەسەر ئەوە عمومی ئەهالی ئەتراف و عەشائیر مەجبورەن قیامیان کـرد و تەعەڕوزی ئەو قـوەتە و ئەحـمەد بەگیـان کـرد بـو و تـا شـاری ئەلەبـجە تەعقیبیان کرد بو.

لە پاش ئەم وەقعەیە موفەتیشی کەرکوک مێجەر ئەدمـۆنس بە 3 تەیـارەوە ئەچێـتە ئەلەبـجە لە حینـی تەیران دا تەیارەکەی کە مێجەر ئەدمۆنسی تیا بوە سقوتی کرد بو. خۆی دەسـتی شـکا بـو و ماکینیسـتەکەی سەری شکا بو بە دو تەیارەکەی تر ڕۆیشتبونەوە بۆ ئەلەبجە و تەیارەکەی تر بە شـکاوی لە ئەلەبـجە بە جـێ دێڵن. وە خانمی عوسمان پاشا بۆ محافەزەی هەمو شتێکی خۆی جافرستانی (راسـتەکەی جافرسـانە) هێنـاوە بـۆ ئەلەبـجە و، زاتەن ئەو قـوەتە سـوارەیەی کە لە نـاو ئەلەبـجەدایە سـوارەکانیان بە تەمـەعی ئـولاغ و سیلاحەکانیان لە خۆیان تەقسیم کردوە.

"ڕۆژێک لە سەر قومار کردن ئەچن بە گژ یەکتریدا لەو شەڕەدا دو پیاوی جافرستان برینـدار بـون و جافرستان لەگەڵ کوڕەکانی عاجزی بوە لە سەر ئەوە... ئەفراسیاب بەگ ڕۆیشتۆتەوە بۆ هەورامان."

ئەدمۆنس لە (ل 340 -341 "کرد و ترک و عرب") دا باسی ئەم سەردانەی هەڵەبجە و شکانی یەکـێ لە فڕۆکەکانیان ئەکا.

**2. 3. 1. 8. پرسە**

لە ژ12 دا لە ژێر سەردێڕی (ئیرتیحالی موئسیف) نوسیوێتی:

"بەینێکە ون بوە حادیسە وا خۆی نواندوە
کانونی سینە ئاگری تێدا گەشاندەوە
دقتۆر حسێن، شەهیدی هونەرپەروەری و ئەدیب
بادی ئەجەل چراغی حەیاتی کوژاندەوە

"دقتۆر حسێن ئەفەندی باباجان کە حەیاتێکی مەدیدی لە عالەمی تەبابەتا سەرف و تەقریبەن چل سـاڵ بو وجودی وەقفی خزمەتی بەشەریەت کرد بو لەم چەند ڕۆژانەدا بۆ زیارەت لە کەرکوکەوە حەرەکەت دەکا بـۆ سلێمانی لە ئەسنای ڕێگا بە سائیقەی تەجاوزی سن نەخۆش ئەکەوێ و شەوی مواصەلەتی لە سـلێمانی عـازمی داری جینان ئەبێ، حەقیقەتەن وەفاتی بۆ قەومی کورد لە زایعاتی مەعـدودە. حەزرەتـی بـاری مەرحـوم نـائیلی مەغفەرەت و عائیلەی کەدەردیدەیشی مەزهەری سەبری جەمیل بفەرموێ."

ئەم پرسـەنامەیە پـارچەیەکی ئەدەبـی جـوانە، بەڵام لەبەر بەکارهێنـانی وشـەگەلی بێگـانە، ڕەنـگە لای خوێندەوارانی ئەم زەمانە تامێکی نەبێ.

لە ژ16 شدا هەواڵـی کـۆچی دوایـی یەکـێ لە کەسـایەتیەکانی شـاری سـلێمانی بە (زیـاعێکی گەورە) بڵاوکردۆتەوە.

**2. 3. 2. کێشەی موسڵ**

لە ژ3 دا نوسیوێتی:

"لە مەجلیسی لۆزان دا مەسئەلەی موصل

"لە مەجلیسی لۆزان دا ئەو موسـائەلەی کە لە بەینـی ئینگلیـز و تورکیـا دا مەوجـود بـو بە مـوافەقەتی تەرەفەین و بە موافەقەتێکی عەزیمی تورک حەل و فەصل کراوە. مەسئەلەی موصل و حـدودی عیـراق لە پـاش ئینفازی مەوادی موعاهەدە بە 9 مانگ لە بەینی هەر دو حکومەتا حەل دەکرێ وەکو لە مەتبوعـاتی ئەجنەبـی‌دا موتالەعە کراوە وا مەعلوم ئەبێ کە سەبەبی موخالەفەت لە سەر نەفسی شاری موصلە کە عەرەب ئیدیعای ئەکات و ئەو ئەرازیەیە کە بە کورد مەسکونە و ئەکسەریەتی عەرەب نیە کە لە بەینـی تـورک و ئینگلیـز دا مـوجیبی نیزاعە و بیلخاصە مەسئەلەی نەوتی موصلە کە تـورک ئیـدیعای حیصـەیەکی ئەکـات وەهـا مەعلـوم ئەکـات کە حکومەتەین هەتا ئێستا لەم جیهەتانەوە فکر و قەراری قەتعی‌یان نەدابێ فەقەت ڕێککەوتنیان زیاتر مەئموله."

لە ژ6 دا نوسیوێتی:

"میعادی موزاکەرە دەرحەق بە موصل

"نەزەر بە تەلغرافێک کە جەریدەی البلاغ بە صورەتی خصوصیەوە لە ئەسـتانبوڵ وەری گرتـوە تۆفیـق بەگ میرئالای بوە بە رەئیسی جەمعیەتی ئەو تورکانە کە مەئمورن بۆ موزاکەرەی موصل. لە پاش حازر بونی هەیئەتی ئینگلیز لە 25 ی تشرینی ئەوەل دا موزاکەرە دەست پێ دەکا."

لە ژ10 دا وتاریکی لە غەزەتەی (الامل) ی موسڵ هوە وەرگرتوە، بە ناونیشانی (موسـڵ کلیلـی شـەرقی ئەوسەتە) ئەڵێ:

"غەزەتەی (لازی فرانسز) کە لە پاریس ئینتشار ئەکا نوسیویەتی ولایەتی موسڵ چونکە واقیـع بـوە لە سەر نەهری دیجلە و سیلسـیلەی جیبـالی کوردسـتان، بەرەن و نەهـرەن بە بەغـداد، هنـد، ئێـران، کوردسـتان، ئەنادۆل و بە سوریە مەربـوتە و، بە واسـیتەیەوە بـۆتە کلیلـی شـەرق ئەوسـەت، تەهلـوکەیەکی عەسـکەری کە مومکینە تەهدیدی بیلادی عیراق بکـا لەو شـاخانەوە زهـور ئەکـا، کە ئیمتیـدادی ئەو شـاخانە لەسـەر شـکڵی نیصف دائیرەیەکە لە شیمال و شەرقی سەحرای ولایەتی موسڵ. لە نوقتەی عەسکەریشـەوە موسـڵ نـوقتەیەکی مقاوەمەی مەرکەزیەیە چونکە هەدەفی یەگانەی نەزەری موهـاجمین بـۆ سـەر شـاری بەغـدا تەشـکیل ئەکـا. لە حەربی عمومی (1915- 1916 میلادی) دا تورکیا و ڕوس و ئینگلیـز مەقسـەدی یەگانەیـان ئەمە بـو کە بە واسیتەی ئەو 3 سیلسلە جیبالەی لە شیمال و شەرقی موسڵ واقیعن، ئەم ولایەتە لە جەبهەی قەفقـاس و تـوران جیا بکاتەوە.

"بە واسـیتەی ئیتیصـالی ئەم ولایەتە بە عەجەم و کوردسـتانەوە و، بە واسـیتەی دو ڕیگـای مـوهیم کە عەرەبانەی نەقلیەی پیا ئەڕوا، وەکو دەربەندی (قوتور) لە تەریقی وان و تەبرێز و ڕێگای (زاغرۆس) لە ڕێگـای هەمەدان و بەغدایە. دیسـان ئەم ولایەتە لە نوقـاتی مـوهیمەی سـەوقەلجەیشـی مەعـدودە. فیلواقیـع لەم شـاخە بەرزانەدا گەلێ ڕێگای سەختی تر هەیە کە کاروان و هێستری پیـا ئەڕوا، فەقەت لە مەرمەڕی ڕەوانـدز و شـنۆ بەو لاوە لە هـیچ ڕێگـایەکی دا عەرەبـەی پیـا نـاڕوا. لەبەر ئەمە ئـۆردوی ڕوس و تـورک هەر لەم ڕێگـایەوە هجومیان بۆ یەکتر ئەکرد.

"موتەخەسیس ئەگەر تەماشای خەریتەی ئەم مەوقیعە بکەن، ئەبینن کە هەر کەسێک ئارەزوی زەبت کردنـی عیراق و هیندستان بکا، بە هەمە حاڵ ئەبێ ئێران و کوردستان بکا بە ئوسەلحەرەکاتی خۆی. بۆ ئەمەیش شـاری موسـڵ لە پـێش هەمـوو شـتێک دا نەزەری دیقەتـی ڕیجـالی عەسـکەریە جەلـب ئەکـا. لەبەر ئەمە بـۆ محـافەزەی شارەکانی عیراق لە قیوای هەوائیە و ناریەی دوشـمن موسـڵ یەگـانە مەرکەزی هجـوم و مـودافەعەیە. وە زاتەن لە حەربی عمومی‌یش دا ئەترافی موسڵ بوبـو بە سـەبەبی مـوراقەبە و هجـومی شـەدیدی ئـۆردوی ڕوس و تـورک، چونکە ئەم جێگایە لە بەینی ئێران و کوردستان و مەمالیکی شیمالیەی سائیرەدا مەوقعێکی موهیم بو.

"کە وەقتێکی تورک لە ئێران و کوردستان دا تەقەدومی کـرد و، گەیشـتبوە سـاوجبلاق، روسـەکان بـۆ حیمایەی مەناتیقی دۆستەکانی خۆیان و، حیمایەی تـەبرێز، ئورومیـە و جولفـە و ئازەربایجـان، لـە مـەواقیعی موهیمەدا مقاومەت و تەعەروزی قوەتی ساوجبلاقی تورکیان ئەکرد، کە ئەم مەوقیعانەش عیبارەت بو لە ختـوتی تەقەروبیەی ولایەتی موسڵ.

"حکومەتێک ئەگەر ولایەتی موسڵی بە دەستەوە بێ خسوسەن ئۆرودیەکی مونەزەم و مـوجەهەزی ببـێ و، بە پارەی خۆی رێگای شەمەندوفێری بۆ بکا، عمومی شەرقی ئەوسەت ئەگرێتە ژێر دەستی خۆی.

"هەر لەبەر ئەم نوقتە موهیمە چەند دەوڵەتێک بە قەراری (سان ریمۆ) قەراریـان دا کە ولایەتـی موسـڵ نابێ لە عیراق جیا ببێتەوە، ئەگەرچی دراوسێیەکانی شیمالیەمان ویستیان نفوز و ناوی سابقیان لە موسڵ مان دا تیکـرار ئیعـادە بـکەنەوە بە حەسـەبی ئەوەی کە 6 صـەد سـاڵە حـاکمی بـون، بـۆ ئەوەیە کە ئینگلیـز لە هیندسـتان دا و فەرەنسـزیش لە سـوریەدا تەهدیـد بـکەن. وە لە شـارەکانی قەفقـاس و تاتـار و عەجەم دا تەئسیسی نفوزیان بۆ مومکین بێ.

"زاتەن روسیاش بۆ ئەوەی کە تەئسـیر لە هندسـتان بکـا دیسـان هەر ئـارەزوی موسـڵی ئەکـرد. ئەم دراوسێیەشمان هەر ئەیویسـت کە بە واسـیتەی ئیمتیـازی (نەوتـەکەوە) مونـازەعەیەکی گەورە بخـاتە بەینـی حکوماتی غەربیە. فەقەت چونکە حەق و حەقیقەت ئەم مەتالیبە ناحەقەی خستە مەیدانی عەدل و ئینسافەوە، بـۆ حکومەتی... نیهایەت مەعلوم بو کە ئەم حەقە بۆ عیراقیەکـان مەسـئەلەیەکی حەیـاتی و سیاسـییە، ئـێمەش وا دەزانین کە بە حەسەبی جنسیەت و سیاسەت و عەسکەری و ئیقتیصادیاتەوە شاری موسڵ ئیلاماشائەڵا بوە بە جوزئێکی لایەنفەکی عیراق."

## 2. 3.3. موعاهەدەنامەی لۆزان

لە ژ1 دا هەندێ لە مادەکانی پەیمانی لۆزانی بڵاوکردۆتەوە و نوسیوێتی:

" لۆزان و لاحیقەکانی:

"ئیتفاقنامەی تەخلیەی ئەرازی تورکیا

"حدودی عیـراق" بەغـداد تـایمس، لە المقطـم دوە وەریگرتـوە. لە خصـوص تەخلـیەی ئەرازی تورکیـا حدودی عیراق و وەزعیەتی تازەی بوغازەکان لە مەوادی موعاهەدەی لۆزان ولاحیقەکانی، ئەوانەی کە موفیدە لە ژێرەوە نوسراوە:

"ئەوانەی کە ئیمزایـان کـردوە مورەخەسـی حکـومەتی ئیتاڵیـا و فەرەنسـا و بریتانیـا (کە ئێسـتا بەعزێ ئەقسامی ئەرازی تورکیا لەژێر ئیشـغالیانایە) و مورەخەسـی مەجلیسـی وەتەنـی ئەنـقەرە کە لەگەڵ میلەتی خۆیـان دا بە هەمئـاهەنگی ئـارەزو ئەکەن صـولح تەسـریع بکـرێ بـۆ ئیتیخـازی تەدابیـری ئـاتیە موافەقەتیان کردوە.

"تەخلیەی ئەو ئەرازیەی کە ئیشغال کراوە

1. لە ئیعتیباری ئەو وەقتەوە کە حکومەتی تورکیا بە واسیتەی ئەو مورەخەسـانەوە کە لە ئەسـتەنبوڵن تەبلیغی حکومەتی موتەحیـدەی کـردوە کـە موعاهـەدەی لـۆزان و لاحیقـەکانی قبـوڵ کـراوە، ئـۆردوی دوەلـی موتەحیدە ئەبێ دەست بکا بە تەخلیە کردنی ئەو ئەرازیەی کە لە ژێر ئیشغالیاندایە. ئەم مەسـئەلەی تەخلـیەیە، شامیلی چەناق قەلعە، بەحری مەرمەرە و، بوغازی ئەستانبول و، عائیدی قوای عەسکەریە و بەحـریەی ئیتالیـا و فەرەنسا و ئینگلتەرەیە.

2. تەخلیە ئەبێ لە شەش هەفتەدا تەواو بکرێ.

3. لە ئەسنای تەخلیەدا، ئەو ئەشیایانە کە سابیت بـوە هـی تورکیـان و ئەو ئەشـیای مەنقـولە و غیـرە مەنقولەی تورکیایە، کە حاڵی حازر بە دەست موەزەفینی ئیئتـیلافەوەیە ئەبـێ تەسـلیم بکـرێتەوە. موعـاهەدەی عمومیەی تورکیا مەسئەلەی موصادەرە و وەزعیەت و ئەنواعی ئەمانە لەغو ئەکـات. وە ئەو وەقـتە کە معـامەلەی وەزعیەت ڕەفع ئەکرێ لەو خسوسەوە زەبتنامەیەک تەنزیم ئەکـرێ. ئەو زەبتنـامەیە لە مەقـامی سـەنەدا دەبـێ. موەزەفینی ئیشغالیە ئەو ئەموال و ئەشیای تورکیایە کە دراوە بە شیرکەتی عوسمانیە و ئەشخاسی سـائیرە بە تەواوی ئیعادە ئەکەنەوە. ئەو قەرز و معامەلاتانە کە لە بەینی موەزەفینی ئیشغالیە و ئەشخاسی مادیە دا کراوە موتابیقی شروتی خۆی تەسویە ئەکرێ.

4. بە موجیبی ئەو موتارەکەی ئیتفاقنامەیە کە لە 30 ی تشرینی یەکەمـی 1918 دا لە مـودارس عەقـد و هەتاوەکو ئێستا مەقبول بوە ئەو وەسائیلی حەربیە یە کە عائید بە حکومەتی عوسـمانی بـو، وە زرەهلـی سـوڵتان سەلیمیش داخڵە، هەموی ئەسلیحە و موهیمات و سائیرە بە تەواوی بۆ حکومەتی تورکیا ئیعادە ئەکرێتەوە.

5. مـودەتی تەخلـیە کە لە دوەم مـادەی ئەم ئیتفاقنـامەیەدا بەیـان کـراوە، بـۆ ئیتفاقنـامەی عەسـکەری (مـودانیە) کە لە تشـرینی ئەوەلـی 1922 دا عەقـد کـراوە مەعمـول ئەبـێ. مـوەزەفینی تـورک و ئیئتـیلاف موشتەرەکەن تەدابیری لازمە ئیتیخاز ئەکەن کە لە زەرفی ئەم مودەتەدا ئیجتیناب بکەن لە هەمو واقیعاتێـک کە حدوسی مومکن بێ. لە ئەسنای تەخلیەدا مەسائیلی سائیرە کە وقوعی موحتەمەلە، بە شەرتێ موەزەفینی تـورک موافەقەت بکەن، حەل و فەصلی عائیدی موەزەفینی ئیئتیلاف ئەبێ.

6. حکومەتی تورکیا قبوڵی کردوە تەبەعەی ئەو حکومەتـانە لە ئەحکـام کە ئینتیزاریـان نەکـردوە بـۆ تەتبیقی موعاهەدەی سوڵح و ئیمزایان کردوە کە ئیسـتفادە بـکەن لە ئەحکـامی مـادە (69، 77، 72، 91) و ئەو مودەتە موعەیەنەیە کە لە مادەی (72، 91) دایە مولاحەزەی ئەو ناکرێ کە چـونکی دەسـت پـێ نەکـراوە خیتامی هاتوە.

"نجمە 3 ی ئەیلولی 339 ژمارە 831

"حکومەتی تورکیا تەعەهود ئەکات کە عادەتی ئەحکامی مادە (137، 138، 140) بکا و ئەم مەوادە لە جێی مەوادی (75، 81، 87، 12، 13، 157) معاهەدەی پێشو دانراوە.

"حدودی عیراق و تورکیا

7. حکومەتی تورکیا، ئینگلیز ئینتزاری ئەمە ئەکەن کە ئەو موعاهەدەیە بخـرێتە مەوقیعـی تەتبـیقەوە و موافیقی مادە (3، 20) تەحدیدی حدود بکرێ.

"لەم خسوسەوە هەردولا تەعەهود دەکەن کە قیامی هیچ حەرەکەتێ نەکەن کە وەزعیەت تەبەدول بکا. ئەم دو حکومەتە فەقەرەی ئەوەلی مادە (3، 20) کە لە خصوص مـوزەکەرەی حـدودی عیـراقەوەیە دەیـخەنە نەزەر ئیعتبـار و، لە پـاش خیتـامی تەخلـیە بە پـێی ئەحکـامی فەقەرەی ئەوەل دەسـت ئەکەن بە مـوزاکەرە (کە بە موافەقەتی هەردولا خراوەتە نۆ مانگ)."

غەزەتەکە دوای ئەم باسە لێدوانێکی کورتی لە ژێر سەردێڕی (غەرائیب) بەمجۆرە نوسیوە:

"بۆ تەئمینی ئیستقلالیەتی قەومی کورد لە بیدایەتی حەربی عمومیەوە تا ئێستا دە هەزار قوربـانی دا و، بێ حساب تالانی ڕۆیی. ئێستا بێ مەعلوماتی میللەت ئەم دو حکومەتە مەشغوڵی پیلانـی قـوت دانـن. ئەلـبەتە عەدالەت ڕێگەی خۆی ئەدۆزێتەوە. خودا کەریمە."

لە ژ18 دا نوسیوێتی:

"لە مەجلیسی لۆردەکان دا موعاهەدەنامەی لۆزان

"لۆنـدرە 20 ی شـوبات: موعاهەدەنـامەی سـولحی تورکیـا تەصـدیقی لایحەیەکـی ئەمـڕۆ لە تەرەف لۆردەکانەوە قیرائەت و تەصدیق کرا و بـۆ خوێنـدنەوەی دوهەم ڕۆژی 28 شـوبات وەقتـی مـوعەیەن تەعـین کراوە."

لە ژ19 دا نوسیوێتی:

"موعاهدەی لۆزان

"مەوادی موعاهەدەی لۆزان دەفعەی سانیە تەدقیق و لە مەجلیسی ئەعیانی ئینگلـتەرە تەصـدیق کـرا. لەم مەجلیسەدا لۆرد کـورزون گـوتی ئینگلـتەرە لازمە تەماشـای رابـوردو نەکـات و بە نەزەر دۆسـتێکی قەدیـم و موتەفیقێکی تازە هەمو ئارەزوی تورک جێبەجێ بکات."

لە ژ20 دا نوسیوێتی:

"موعاهەدەی لۆزان لە مەجلیسی لۆردەکان دا

"لۆندرە 6 ی مینهو: سێهەمین موعاهەدە نامەی لۆزان خوێنراوەتەوە بـۆ تەصـدیق حەواڵەی مەجلیسـی مەبعوسان کراوە."

لە ژ21 دا نوسیوێتی:

"ئیتالیا و موعاهەدەنامەی لۆزان

"ڕۆما 21 ی مینهو: حکومەتی ئیتالیا موعاهەدەی لۆزانی تەصدیق کرد."

لە ژ25 دا نوسیوێتی:

" لە غەزەتەی نجمەوە:

"تەصدیقی موعاهەدەنامەی لۆزان

"موعاهەدەنـامەی لـۆزان لە پـاش تەصـدیقی لە مەجلیسـی عەوام و لۆردەکـان دا لە تەرەف قەرالیشـەوە تەصدیق کرا."

**2. 3. 4. هەواڵی عیراق**

لە ژ4 دا نوسیوێتی:

"تەشریف: جەنابی نـوری سـەعید پاشـای وەکیلـی نـازری حەربـیەی عیـراق تەشـریفی هـاتۆتەوە بەغداد."

لە ژ6 دا نوسیوێتی:

"تایمس بەغداد: سەفەری حەزرەتی مەلیکی عیراق

"لە 7 ی ئەم مانگەدا حەزرەتی مەلیکی عیراق لەگەڵ جەنابی ئەمیر زەید و یاوەری ملوکانە و بەعـزێ لە وزەرای فیخام تەشریفی چۆتە موصل."

لە ژ9 دا نوسیوێتی:

"تەنەزوهی مەلیک

"مەلیکی عیراق لەگەڵ ئەمیر زەید و لەگەڵ ئەرکانی مەعیەتی دا چـوە بـۆ تەنەزوهــ. نیەتـی کـردوە کە خەرابەی نەمرود و مەزروعەی حەرف و زیبانیـا و دیـر ئەلخـزر و بەعـزێ قەزای شـیمالیەی موصـڵ زیـارەت بفەرموێ."

لە ژ12 دا نوسیوێتی:

هاشمی و ریاسەتی وزەرا

"الامل: مەحافیلی وەتەنیەی حکومەتی عیراق وەها ئارەزو ئەکەن کە ریاسەتی وزەرا تەوجیهی یاسین پاشا هاشمی بکەن کە ئێستا موما ئیلەیهی نازری مواسەلات و ئیشغالە."

"قابینەی تازەی عیراق

"بۆ تەعینی رەئیسی قابینە هێشتا رەسمەن خەبەرێک وەرنەگیراوە فەقەت بەپێی خەبەرێک کە لە مەنبەعێکی مەوسوقەوە وەرگیراوە پاشای هاشمی و شێخ صالح باش ئەعیان و نەقیب زادە سەید محێدین ئەفەندی نامزەدن بۆ ئەم ریاسەتە."

لە ژ 13 دا نوسیویێتی:

"قابینەی تازەی عیراق

"الامل: لە مەنبەعێکی مەوسوقەوە خەبەر وەرگیراوە کە قابینەی عیراق لە زەواتی ئاتیە تەشکیل دەکا:

| | |
|---|---|
| "رەئیسی وزەرا و نازری حەربیە | جەعفەر پاشای عەسکەری |
| "وەزیری داخلیە | عەلی جەودەت بەگ |
| "وەزیری نافیعە | سەبیح نەشئەت بەگ |
| "وەزیری مەعاریف | رەزا ئەلشەبیبی |
| "وەزیری مالیە | موحسین شلاش |
| "وەزیری عەدلیە | قازی موصڵ ئەحمەد فەخری ئەفەندی |
| "وەزیری ئەوقاف | شێخ صالح باش ئەعیان |

"وە خەبەر وەرگیراوە کە جەنابی جەعفەر پاشای عەسکەری لە موسلەوە حەرەکەتی کردوە و گەیشتۆتە بەغداد."

لە ژ25 دا نوسیویێتی:

"خەبەراتی بەغداد

"سوئی قەسد

"لە نزیک محەلی ئیقامەتیان لە تەرەف دو شەخسی قیافەت سقیل دەسرێژێک کراوە. شێخ عەدای ئەلجەریان و شێخ سلێمان ئەلبەراک، مەبعوسانی عەشایەری حلە لە قۆڵ و قاچیان دا زۆر خراپ بریندار بون. ئەوانەی کە مەزنون بون دەردەست کراون. لە پاش تەحقیقات بەعزەن تەخلیە کراوە و ئەوانەی کە موداخلەدار نین بەرەڵا ئەکرێن."

بایەخی بە هەواڵی رۆشنبیری داوە، سۆراخی رۆژنامەکانی عیراقی کردوە،

لە ژ6 دا نوسیویێتی:

"نەشری غەزەتە: شاعیر و فەیلەسوفی شەهیر جەنابی مەعروف ئەلرەصافی ئەفەندی بە ناوی (الامل) ەوە لە بەغداد جەریدەیەک نەشر دەکا موەفەقیەتی تەلەب دەکەین."

لە ژ25 یش دا نوسیویێتی:

"لە بەغداد غەزەتەی (استقلال) و (شعب) لە ئینتیشاری غەزەتە مەنع کراون."

### 2. 3. 5. هەواڵی تورکیا

ئومێدی ئیستیقلال چەردەیەکی باش هەواڵی تورکیای بڵاوکردۆتەوە. کەم ژمارەی هەیە کە هەواڵێک یا چەند هەواڵێکی تورکیای تێدا نەبێ. زۆر جار رۆژنامە بۆ کارکردن لە بیروڕای گشتی خەڵک هەواڵ

هەڵئەبژێرێ، ئەمیش هەر وەهای کردوە. زۆری هەواڵەکانی بۆ خۆشناو کردنی ناوی مستەفا کەمال و جوانکردنی تورکیای کەمالیە. لەو کاتەدا مستەفا کەمال وەکو قارەمانی جەنگی رزگای و دامەزرێنەری تورکیای نوێ بە رێزێکی زۆرەوە سەیری کراوە. تەنانەت زۆر لە کوردەکانی تورکیاش هاوکاری زۆر و کاریگەریان کرد، ئەوسا هێشتا روی راستەقینەی بۆ کورد ئاشکرا نەبوبو.

لە ژ1 نوسیوێتی:

"سوڵتانی سابیقی تورکیا عەفو ناکرێ

"ئەستانبوڵ 22 ی مینهو: لە بەر ئەمە موعاهەدەنامەی سەڤەریان ئیمزا کردوە، سوڵتانی سابیقی تورکیا لەگەڵ صەدری ئەعزەمی پێشو داماد فەرید پاشا، لە عەفوی عمومی، کە لە پاش ئیکمالی موعاهەدەنامە ئیعلان ئەکرێ، ئیستیفادە ناکەن و شامیلی ئەوان نابێ. لە ئەنقەرە وەها خەبەر دراوە."

"رۆیشتنەوەی عەسکەری ئیئتیلاف لە تورکیا

"عەدنان بەگ لە وەکالەتی حکومەتی تورکیاوە تەبلیغی کردوە بە مورەخەسەکانی ئیئتیلاف لە ئەستانبوڵ کە موعاهدەی لۆزان لە 23 ی ئاغستۆسی 331 دا رەسمەن خیتامیان هاتوە و ئەو رۆژە مەبدەئی مودەتی تەخلیەیە.

"24ی مینهو: بە پێی ئەو تەلغرافە کە لە ئەستەنبوڵەوە هاتوە شەوی 24 ی مینهو هەوەڵ دەفعە 3 پاپۆڕی ئینگلیز ئەو عەسکەرانە نەقڵ ئەکا کە دەستیان کردوە بە تەخلیە و زو بە زو تەخلیە تەواو ئەکرێ و، بەپێی خەبەرێک کە هەر لەو تاریخەدا لە ماڵتەوە هاتوە درید نوّتی رۆیاڵ سوفرین و پاپۆڕەکانی بەحری موحیتی ئەتلەسی چونەوە بۆ لۆندرە."

لە ژ2 دا مشتومرێکی رۆژنامەوانیی نێوان رۆژنامەکانی تورکیا و ئێرانی بڵاوکردۆتەوە. کابرایەکی پان تورکیست باسی تورکایەتی ئازەریەکان ئەکا، ئەوانیش وەڵامی ئەدەنەوە، نوسیویانە:

"... ساڵی رابوردو کە موقارین بو بە فتوحاتی کەمالیەکانەوە دەرودیواری تەهران بە صورەتی کەمال پاشا تەزیین کرا بو، عرێوی هەلهەلە و شادی فارسەکان تا بابی عالی ئەڕۆیشت.

"ئەوەل دەوڵەتێ کە بە نامی ئیسلامیەتەوە حکومەتی غەیرە رەسمیی مستەفا کەمال پاشای ناسی ئێران بو. ئەوراق و صەفەحاتی جەرائیدی ئێران بخوێنیتەوە غەیرەز یەک پارچە ئیحساساتی موەدەتئامێز شتێکی تر نابینین. ئێمە ئیتیحادی ئیسلاممان لە نوقتەی نەزەری مەزهەبیەوە تەلەقی کرد بو بێ عینوانی شیعە و سونەیەتی... نەمانزانی ئیتیحادی ئیسلام بە ئیتیحادی تورک تەبدیل دەبێ و لە ئەوەل وەهلەدا ئێران ئەکات بە هەدەفی خۆی."

لە ژ3 دا نوسیوێتی:

"بەینی ئێران و تورک: عەسکەری تورک لە ئازەربایجانەوە تەجاوزی حدودی ئێرانیان کردوە. مەتبوعاتی ئێران ئەم حەرەکەتەی تورک تەقبیح ئەکەن هەرچەند بۆ تەخلیەی ئەو نوقاتە ئێران تەلەبی کردوە فەقەت تورک تەخلیەی نەکردوە قوماندانی ئازەربایجان چوە بۆ تەهران."

لە ژ4 دا نوسیوێتی:

"ئەو تورکانەی کە لە خاریجی تورکیادان: نازری داخلیە لە حکومەتی محەلیە دا ئیعلامی کردوە کە ئەو تورکە موسافیرانەی دەگەڕێنەوە بۆ تورکیا غەیری ئەوانەی کە لە بێروت، سوریە، جەزائیری بەحری سفیدەوە دێنەوە بە بێ ئیزن لە حکومەتی ئەنقەرەوە هاتنەوەیان جائیز نیە."

"حەوادیسی تورکیا و رەعایای ئەجنەبی: حکومەتی تورکیا مەنعی کردوە کە ئەجنەبی داخلی ئەستانبول نەبن و لەوێوە سەفەر نەکەن حکوماتی بولغار، رۆمانیا، یۆنان، صرب، ئیسپانیا، بەلچیقایش لە

ئینتیقامی ئەم قەرارە وا مەنعیان کردوە کە رەعیەتی تورک بچێتە نـاو مەملەکەتـی ئەوان لەبەر ئەمە رەعایـای تورکیا مەجبور بون بۆ چونە ئەورۆپا بە ئیتالیا وە یا بە فرانسەدا بڕۆن."

"عەباس حیلمی پاشا لە ئەستانبول دا: ئاستانە، جەریدەی اقدام دەڵێ لە پاش ئەمە کە لە تەرەف دوەلـی موتەفیقینەوە ئەستانبول تەخلیە کرا عەباس حیلمی پاشا لە ئەستانبول دا ئیقامەت دەکا."

"شیرکەتی جیستەر و بوساتی لە تورکیا: ئاستانە، لە خصـوص سـەفەر کردنـی مومەسـیلی قومپانیـای جستر بۆ ئامریقا خەبەرێ گەیشتۆتە ئەنقەرە. ئەم شیرکەتە کە موجیبی مقاوەلە مەجبورن لە ئەوەلـی تشـرینی ئەوەل دا موباشەرەتی بە دروستکردنی خەتی شەمەندوفەری بەینی سێواس و سامسۆن بکەن."

لە ژ6 دا نوسیویێتی:

"زیارەتی خەلیفەی ئیسلام

"ئەستانبول 28 ی ئەیلولی 339: ئەمڕۆ جەنەراڵ هارینغتون و لەیـدی هـارینغتون بـۆ ویـداع چـونە خزمەت خەلیفە و زیارەتیان کردوە.

"خەلیفەی عەزەمەتمەئاب قیتعەیەک فۆتۆغرافی بە دەسـتی خـۆی ئیمـزا و بە لەیـدی هـارینغتون ئیهـدا فەرموە."

"قوماندانەکانی ئیئتیلاف لە ئەستانبول دەڕۆن

"ئەستانبول 1 ی تشرینی ئەوەلی 339: ئەو پرۆتۆقۆلەی کە دائیر بە تەخلـیەی ئەسـتانبولە لە تەرەف صەلاحەدین عادل بەگ قوماندانی عەسکەری ئەستانبول و قوماندانەکانی ئیئتیلافەوە ئیمـزا و تەخلـیە ئیکمـال کراوە تورکەکان لە خصوص زو تەخلـیە کردنـی ئاسـتانبول و لەبەر ئەوەی لە ئەسـنای تەخلـیەدا هـیچ نەوعە وقوعاتێک روی نەداوە زۆر مەمنون بون قوماندانەکانی ئیئتیلاف لە میان مەراسـیمی تەشـییعیەدا سـبحەینێ لە ئەستانبول دەڕۆن جەنەراڵ هارینغتونیش بـۆ سـەفەر حـازر بـوە لە ئەسـنای حەرەکەت دا دوننمـای بریتانیـا موشار ئیلەیهی تەشییع دەکا و لە پاشا ئەستانبول بە جێ دەهێڵێ."

"جەنەراڵ هارینغتون لە ئەستانبول ڕۆیشت

"ئەستانبول 2 ی مینهو: بە بەیاخی تورکیا و ئیتالیا و فەرەنسـە و بریتانیـا مەراسـیمێکی تەشـییعیەی زۆر مودەبدەب بۆ جەنەراڵ هارینغتون ئیجرا کراوە موشار ئیلەیهی لە ئەسنای ویداع دا غەرقی ئیحتیرامـات و تەعزیمات بوە.

ئەکابیری ریجالی تورکیا لەو ئەسنایەدا گەلـێ دەسـتە گوڵیـان بە حەرەمـی جەنەراڵ لەیـدی هـارینغتوم ئیهدا کردوە."

"جمهوریەتی تورکیا

"جەریدەکان وایان ئیستیخبار کردوە کە حکومەتی تورکیا مونقەلیب بوە بە جمهوریەت."

لە ژ 7 دا نوسیویێتی:

"خەبەراتی تورکیا

"موازەنەی مالیە

"لە موازەنەی مالیەدا مەصاریفی حکومەتی تورکیا بە 120 ملیۆن لیرە و ئیرادی بە 90 ملیـۆن تەقـدیر کراوە یەعنی 30 ملیۆن لیرە نوقصانی بوجەی هەیە."

"ئۆردوی تورک

لە میزانیەی حکومەتـدا عەدەدی ئـۆردوی تـورک بە 100 هەزار نەفەر ئیعتبـار و ئەنەیـش بە 3 قـۆڵ ئۆردو تەقسیم کراوە مەرکەزی قۆڵ ئۆردوەکانیش ئەستانبول، ئەدرنە و ئەنقەرە دەبێت."

"تورکەکانی روسیە و خەلیفە
"تورکە موسوڵمانەکانی روسیە جەنابی عەبدولمەجید خانیان بە خەلیفە ناسیوە."
بەحریەی تورکیا: ئەمیرال عارف پاشا لە تەقریرێک دا کە داوێتی 84 زابتی بەحری بۆ تەقاعود و 21 زابتی بۆ تەحدیدی سن سەوق و نەلەبی دەرەجەیەک تەرفیعی 60 زابتی کردوە."
لە ژ10 دا لە سەر (ئەبدە بۆ عیصمەت پاشا) نوسیوێتی:
"لە غەزەتەی وەتەن: ئەهالی مەلاتیە کە هەمشەهری عیصمەت پاشان قەراریان داوە کە لە ناوەراستی شاردا ئەبیدەیەک بۆ عیصمەت پاشا دروست بکەن. میقداری ئیعانە گەیشتۆتە 5790 لیرەی تورک.
"قەزای ئۆتۆمۆبیل
"توحید افکار: ئەستانبول-لە مابەینی ئەستانبول و بیشکتاش لە بەر موصادەمەی دو ئۆتۆمۆبیل بوزباشی سورەیا بەگ و رەئیسی ئەرکانی حەرب ئەمیرال بریستول و قائیمقام مۆرتون کە لە ناو ئۆتۆمۆبیلەکان دا بون موتەئەسیرەن وەفاتیان کردوە مەراسیمی جەنازی کان لە شاری ئەستانبول دا بە صورەتێکی موتەنتەن و فەوقەلعادە ئیجرا کراوە."
"مەدالیەی کەمالیە
"ایلری: مەئمورینی زەربخانەی ئەستانبول مەدالیەیەکی ئاڵتونیان تەقدیمی مستەفا کەمال پاشا کردوە لە روی ئەوەلی رەسمی موشار ئیلەیهی و لە روەکەی تری کەلیمەی مستەفا کەمالیان حەک و تەرسیم کردوە."

یەکێ لەو هەواڵانەی بڵاوی کردۆتەوە نیشانەی بیری فراوان و شارستانییانەی بەڕێوەبەرانی رۆژنامەکەیە سەبارەت بە سەروەریی یاسا. پێئەچێ ئەو هەواڵانەیان بە ئەنقەست بۆ رۆشنکردنەوەی بیری خەڵک بۆ بڵاوکردنەوە هەڵبژاردبێ. لە ژ10 دا لە ژێر سەردێری (مستەفا کەمال پاشا لە خوار قانونەوەیە) نوسیوێتی:
"عەلی فکری بەگ مەبعوسی دەرسیم گوتویە: مستەفا کەمال پاشا لە فەوقی قانونەوەیە بینائەن عەلەیهی وا لازم ئەکا کە لە هەردولا ئینتیخاب بکرێ. لە بەر ئەمە غەزەتەی (ایلری) بە سەر لەوحەی (قانون لە فەوقی هەمو کەسێکەوەیە) مەقالەیەکی نەشر کردوە و لە پاش بەست و بەیانێکی زۆر لە خصوص ئەم فکرە بێ مەعنایەی عەلی فکری بەگەوە بەیانی تەئەسوفی کردوە بیلخاصە دەڵێت زۆر موتەعەجیب بوین کە لە ناو مەبعوسان دا زاتێکی وا هەیە."
لە ژ12 دا نوسیوێتی:
"العراق: عەلاقاتی سیاسیە لە بەینی حکومەتی مەجارستان و حکومەتی تورک تەئسیسی کردوە موسیۆ پۆتی تەعین کرا بە سەفیری تورکیا. سەفیری مومائیلەیهی لە تەرەف حکومەتی اورمەوە قبوڵ کراوە قەریبەن حەرەکەت دەکا بۆ ئەنقەرە.
"العراق: حکومەتی ئەنقەرە لەگەڵ حکومەتی ئامریقا قەریبەن دەست دەکەن بە موزاکەرە لە خصوص مەسائیلی تەبەعەی تورک کە لە ئەسنای حەرب دا لە ئامریقا بون و تەبەعەی ئامریقا کە لە وەقتی حەرب دا لە ئەستانبول بون."
"حەوادیسی تورکیا
"لە موخبیری مەخصوصەوە: جمهوریەتی تورکیا
"تورک جمهوریەتی ئیعلان کرد جەنابی مستەفا کەمال پاشا بە رەئیسی جمهور، عیصمەت پاشا بە رەئیسی هەیئەتی وەکیلە، کازم پاشا بە وەکیلی مودافەعەی میلیە، فەوزی پاشا بە وەکیلی عەمەلە و مەزاهیب، فەرید بەگ بە وەکیلی داخلیە و حەسەن فەهمی بەگ بە وەکیلی مالیە، ئینتیخاب کراون."

"ئەخباراتی تورکیا

"جەرائیدی ئەنقەرە دەڵێن: لە سەر ئیلحاحی وەزیری داخلیە ئەمر صادر بـو بـۆ عەفـوی 25 کەس لەو 150 کەسەی کە لە مەعیەتی سوڵتان وەحیدەدین دایە فەقەت ناوی ئەمانە مەعلوم نەکراوە.

"قانونی ئەساسی تورک

"تەلغرافێک کە لە ئەنقەرەوە بۆ غەزەتەی ئاهەنگ هاتوە دەنوسێ جەنـابی مسـتەفا کەمـال پاشـا خـۆی حازر کردوە نوتقێکی درێژ لە مەجلیسی وەتەنیدا بدا دائیر بە تەعـدیلی ئەو مەوادانەی کە مەجلیسـی میلـی لە قانونی ئەساسیدا ئیحداسیان کردوە.

"حدودی تورکیا لە سوریە

"غەزەتەی اقشـام دەڵـێ لە تەرەف قـۆمیتەی تەحدیـدی حـدود لە جیهەتـی سـوریەوە قەرار دراوە کە لە بەینی تورکیا و فەرەنسەدا خەتی جزیرە و رەئسەلعەین بە حدود قبوڵ بکرێ. یەکـێ لە مـوحەڕیرینی العـراق لەگەڵ مسیۆ کوریللی مولاقات و لەم خصوصەوە موما ئیلەیهی ئیسـتیمزاجی کـردوە مومـا ئیلەیهـی دەڵـێ ئەم حدوده لە تەرەفەینەوە موافیق نەبینراوە چونکە بۆ مەنعی شـەقاوەت بەینـی جزیـرە و رەئسـەلعەین ئـۆردوی هەردو تەرەف لە سەر ئەم خەتە ئیتیحادیان مومکینە."

لە ژ13 نوسیوێتی:

"لە تورکیا ئیتیهامی خیانەت

"توحید افکار دەڵێ: مەجلیسێکی حەربی عەسکەری لە ئیستانبوڵ ئینعیقادی کـردوە لە ئەوەل جەلسـەدا روئیەتی ئەو دەعوایانەی کردوە کە لە عەلەیهی ئەوانەی بەخیانەت موتەهەمن ئیقامە کـراوە. تـا ئێسـتا عەدەدی ئەم موتەهەمانە گەیشتۆتە 150 کەس."

"ئەحواڵی تورکیا

"الامل: لەغو کردنی مەحاکیمی شەرعیە

"جەریدەی یکی کون دەڵێ: مەجلیسی وەتەنی کەبیر لەغو بونی مەحکەمەکانی شەرعیەی تەصدیق کـرد. وەزارەتی عەدلیەیش لە تەعمیمێکدا کە ئیصداری کـردوە جەوازی داوە بە مەحـاکیمی نیـزامیە بـۆ روئیەتـی ئەو دەعوایانەی کە تا ئەمڕۆ لە مەحاکیمی شەرعیەدا روئیەت کراوە."

"موعاهدەی تورک و ئەرمەن

"یکی کون دەڵێ: موزاکەرە بۆ عەقدی موعاهەدەی تـورک و ئەرمەن تەفـویز بە مسـتەفا شـەرەف بەگ کراوە، چونکە بۆ موعاهەدەی بەینی تورک و ئەرمەن لە مەجلیسی لۆزان دا وەقت موساعید نەبوبو."

لە ژ14 دا نوسیوێتی:

"خەبەراتی تورکیا

"غەزەتەی سـتارەی ایـران ئەڵـێ: ئەمە کە ئێـران بە عەجەم ناوبردنیـان بە ئیسـتیخفاف ئەزانـن حکومەتی ئەنقەرە قەراریداوە کە لەمەودوا لە ئیصتیلاحاتی رەسمی و تەعبیراتـی خسوسـیەدا هەر ئێـران و ئێرانی بنوسرێ و بیێژرێ، حکومەتی ئیرانیش لەمەودوا لەجیاتی عوسمانی حکـومەتی تـورک ئیسـتیعمال بکەن."

"لە تورکیادا ئیصتیلاحی موتەسەڕیفی بو بە والێتی

"غەزەتەی توحید افکار دەڵێ: تەعبیری موتەسەریفیەت لە تورکیـادا لەغـو کـرا لە جیـاتی موتەسـەریف تەعبیری والیەتی ئیستیعمال ئەکرێ."

"سوفەرای ئەجنەبی مەرکەزیان نەقل ئەکرێ بۆ ئەنقەرە

"غەزەتەی العراق ئەڵێ: چونکە ئەنقەرە مەرکەزی حکومەتە لەسەر قەراری حکومەتی ئەنـقەرە سـوفەرای ئەجنەبیش نەقلی ئەنقەرە ئەکرێن و جێگایەکی مەخسوسیان بۆ تەئمین کراوە."

"حکومەتی ئەنقەرە مەحکەمەی ئیستیقلال بۆ ئەستانبوڵ ئەنێرێ

"دەری سـەعادەت 9 ی مینهـو: مەجلیسـی وەتەنـی بە نـاوی مەحکـمەی ئیسـتیقلالەوە هەیئەتێکـی بـۆ ئەستانبول نـاردوە. ئەم مەحـکەمەیە موتەهەمـانی خیـانەتی وەتەنـی محـاکمە ئەکـا. چـونکە لە ئەسـتانبول لە خسوس مەسئەلەی خەلافە بەعزێ موناقشە وقوعی بوە. لەمەدا وا دەرئەکەوێ حکـومەتی ئەنـقەرە هەر کەس لە مەسئەلەی خەلافەت قسە بکا قەهر و تەدمیری ئەکـا. بە نەزەر خەبەرێکـی ئەخیـرەوە لەم خسوسـەوە غەزەتەی اقدام و تەنین داخراون و موحەرێرەکانیش دەردەست کراون."

لە ژ15 دا نوسیوێتی:

"لە نجمەوە تەلسز تەلغرافی تورکیا

"بۆ رەبت کردنی ئەنقەرە بە ئەستانبوڵ کە ئیحداثی تەلسزیک بکـرێ هەیئەتێکـی ئەڵمـان گەیشـتوەتە ئەنقەرە."

"تورکیا لەگەڵ پۆلۆنیا ئیتیفاق ئەکا

"وارشـۆ: لە خسـوس تیجـارەتەوە تورکیـا و پۆلۆنیـا لە لـۆزان دا ئیتیفاقێکیـان واقیـع بـوە. ئەم ئیتیفاقنامەی سەداقەتە مەجلیسی پۆلۆنیاش بە ئیتیفاق تەسدیقیان کردوە."

"لە ستارەی ایران ەوە

"نیهایەتی تەخلیەی ئەستانبول

"ئەنقەرە 16 ی مینهو: ئاخر پاپۆرانی حەربی ئیئتیلافیون لە ئەستانبوڵ چۆتە دەرەوە."

ئیجرائاتی مەحکەمەی ئیستیقلال

"ئەستانبول 14ی مینهو: مەحکەمەی ئیستیقلال لـوتفی فیکـری بەگـی لەگەڵ ئەکـرەم بەگـی یوزباشـی تەوقیف کردوە."

لە ژ17 دا نوسیوێتی:

"موصل

"موصل: لەپاش گەیشتنی یوسف کەمال مومەسیلی تورکیا کە چوە بۆ لۆندەرە تەعلیمـات بە موشـار ئیلەیهـی دراوە کە مەسـئلەی موسـڵ ئەو بەحسـەیە بە 9 مانـگ لەپـاش تەخلـیەی ئەسـتەمول لە قیـوای موتەفیقین."

"سوئی قەصد بە مستەفا کەمال پاشا

"مستەفا کەمال پاشا کە وەختێ لە ئیزمیر لەگەڵ عائیلەی خۆیدا بە ئیسراحەت مەشـغوڵ ئەبـێ یەکێـک تەلەبی مولاقاتی رەئیسی جمهوری تورکیا ئەکا و داخلی ئەو مەوقیعە ئەبێ و غەفڵەتەن بۆمبایەک ئەهاوێتە لای موشار ئیلەیهیەوە. تەصادوفی نەکردوە و ئەو شەخسە فیراری کردوە."

"موعاهەدەی تورک و مەجارستان

"دەوڵەتی تورکیا بە کەمالی عەجەلە لەگەڵ موتەحیدینی سابقیا مەشغوڵی ئیستیقراری رەوابیتی سیاسـی و تیجارەتییە. عەهدنامەی بەینی تورکیا و مەجارستان لە ئەستامبول ئیمزا کراوە. وە سەفیری مەجارسـتان لە عەزیمەتدایە بۆ ئەنقەرە. حەسەن فەهمی بەگ رەئیسی مـالیە ئیسـتیعفای کـردوە. وەهـا دیـارە لەبەر کەسـری بودجە ئیستیعفای کردبێ."

"موعەلمینی فەرانسەوی بۆ عوسمانی

"دەوڵەتـی عوسـمانی بە حسـەین ڕەقیـب سـەفیر ئەمـری داوە کە بـۆ 16 مـوعەلیمی فەرانسـەوی بـۆ مەداریسی عوسمانی موزاکەرەیەک بکا. جەریـدەی تـان ئەم مەوزوعەی حوسـنی تەلەقـی کـردوە کە گۆیـا ئەم ئیقـدامە بـۆ تەحکیمـی ڕشـتە مـودەتێکە کە فەرانسـە و عوسـمانلی چـوار قەرن پـێکەوە مەربـوت ئەبـن. لە غەزەتەکانی ئێرانەوە"

"لە ئەستانبول مومەسیلی بریتانیا

"لوندەر 31 مینهو: لە تەرەف حکومەتی بریتانیاوە ڕۆنالد... تەعین بوە بە مومەسیلی ئەستانبول."

لە ژ18 دا نوسیوێتی:

"تورکیا و فەرەنسە

"غەزەتەی ئەسـتانبول ئەنوسـێ لە خسـوس تەسـدیقی موعـاهەدەی لـۆزان لە موعـامەلە مودەتکـارانەی حکومەتی فەرەنسـە تورکیـا بەیـانی مەمنـویەتی کـردوە. غەزەتەی ایلـری، تورکیـا و فەرەنسـە لەگەڵ یەکتـرا تەئیمینی سەداقەت بکا و بەڵکو موتەفیق بونیان بە قەلبێکی سەمیمانەوە تەمەنا ئەکەین. نوسیویەتی."

"تورکیا و ئاوستریا

"ئەستەمول: موزاکەرەی بەینی تورکیا و ئاوسـتریا تەواو بـوە. ئەو موعاهەدەنـامەیە کە لە سـەداقەت و مەوەدەت دا تەواو بوە بەم نزیکانە لە تەرەف هەردو حکومەتەوە ئیمزا ئەکرێ."

"مەجلیسی عەسکەری تورکیا

"ئەستانبول 18 ی مینهو: لە ئیزمیر لە ژێر ڕیاسەتی عیسـمەت پاشـا لە بەینـی قومانـدانە گەورەکـانی تورکیادا مـوزاکەرەیەکی خەفـی جەرەیـانی کـردوە. لەم مـوزاکەرەیەدا بیلجـوملە مەسـائیلی خـارجی و داخلـی موزاکەرە کراوە."

"لە بەینی ئەستانبول و پاریس پۆستەی هەوایی

"بۆ هاتوچۆی پۆستەی هەوایی بەینی ئەستانبول و پاریس مـوزاکەرەی تـازە کـراوەتەوە. لە نیهـایەتی شوبات دا لە بەینی بروکسل و پاریس دا پۆستەی هەوایی دەست بەئیش دەکا.

لە ژ19 دا نوسیوێتی:

"لە تورکیا دا مومەسیلی تازەی بریتانیا

"میستەر لاندسای کە یەکێکە لە معاونانی وەزارەتی خارجیەی ئینگلتەرە مەئمـولە تەعـین بکرێـت بـۆ مومەسیلی تورکیا. میستەر لاندسای لە وەقتی خۆی دا لە میسردا وەکیلی نازری مالیە بوە."

"ئەستانبول 26 ی مینهو: لە سەر ئەمە لە تەرەف تورکەوە موداخەلەی مەکاتیبی ئەجنەبـیە کـراوە کە لە داخلی تورکیا مەوجودە. ئیتالیا، فەرانسا و ئینگلتەرە، موشتەرەکەن ئیعتیرازیان کردوە.

"پولی تازە لە تورکیا

"پولێکی تازە کە ڕەسمی کەمال پاشا و پردێکی ڕوخاو و ڕۆژێکی هەڵهـاتوی تێدایـە لە تورکیـا تەبـع کراوە. ئەم پولانە قیمەتیان 7 غرۆش و نیوە."

"نوتقی مستەفا کەمال پاشا

"ئەستانبول 1 ی مارت: مستەفا کەمال پاشا ئیمڕۆ نـوتقێکی داوە لەم نـوتقەدا بەحسـی سیاسـەتی خاریجی و داخلی کردوە و لزومـی تەفریقـی سیاسـەت و دینـی بەیـان و زەرورەتـی تەوحیـد و تەنزیمـی عەدلیە، ئوسولی تەعلیمی، تەسریح کردوە و ئیزاحی مەنافیعی جمهوریەت و مەنعی موسـکیراتی بـۆ تورکیـا کردوە. لە پاش ئەمە گوتـویەتی لەمەولا وەزعیەتـی مـالیە ڕۆژ بە ڕۆژ چـاکتر دەبێـت و، ئەو ئەحـواڵی کە هەتا ئێستا زاهیرەن موبهم بوە ئیمڕۆ وا ئینکیشافی کرد و، بەیانی لەغوی ڕیاسـەتی ئەرکـانی حەربـیە و

مەشیەختی ئیسلامیەی لە مەجلیسی وکەلادا کرد. ئەم نـوقتە لە تەرەف فیـرقەی ئەحـرارەوە زۆر مەزهەری تەقدیر بو."

"تەبعیدی خانەدانی ئالی عوسمانی

"لە غەزەتەی الاستقلال کە لە بەغداد دەرئەچێت خەبەرێکمان خوێندوەتەوە کە گۆیا حکـومەتی ئەنـقەرە قەراری داوە خانەدانی عالی عوسمان کامیلەن لە مەملەکەتی تورکیا دەربکات. خەلیفەی حازری و وەلـی عەهـدی، داخلی ئەم قەرارەن. الاستقلال دەنوسێت خەلیفە و وەلی عەهد و سائیری ئەعزای خـانەدانی ئـالی عوسـمان... حەرەکەتن فەقەت مەعلوم نیە رو دەکەنە چ لایەک."

لە ژ20 دا نوسیوێتی:

"لە بەینی تورکیا و ئەڵمانیا

"بۆ رابیتەی سیاسی لە مابەینی ئەڵمانیا و تورکیا سەفیری ئەڵمانیا (هرفرتباغ) گەیشتوەتە ئەستانبول. لە بەینی تورکیا و ئەڵمانیا ئیتیفاقنامەیەکی سەداقەتی ئیمزا کراوە."

لە ژ21 دا نوسیوێتی:

"تەخلیەی مەحبوسینی ئەستانبوڵ

"بە مـــوجیبی خەبەراتێــک کە لە ئەســتانبولەوە دراوە چەنــد کەســانێک کە لە تەرەف مەحـــکەمەی ئیستیقلالەوە حەبس کرابون لە تەرەف مەجلیسی گەورەوە تەخلیە کراون."

"لە ئیزمیردا مەجلیسی عەسکەری

"لە ژێر ریاسەتی مستەفا کەمال پاشادا مەجلیسێکی عەسکەری گەورە دانراوە. لەم مەجلیسەدا لە تورکیا 30 قومانــدانی عەســکەری ئیشــتیراک ئەکـات. مەقســەد لە دانــانی ئەم مەجلیســە، لە زەمـانی رابــردودا ئەو حەرەکـاتی حەربـیە کە کرابـێ تەماشـای ئەکەن قارشـی بەمە بە نەزەر نـوقتەی فەنەوە رەئـی و فیکـر بەیـان ئەکەن."

لە ژ23 دا نوسیوێتی:

"لە تورکیا دا چی هەیە

"لوندەر 3 ی مینهو: لە ریاسەتی رەئیس و موفەتیشی قیوای هەوائیەی تورکیـا هەیئەتێکـی تەیـارەچی تورکیا بۆ فێربونی فەنی تەیارەی بریتانیا سەفەریان کردوە بۆ ئینگلـتەرە و، فێربـونی سـەفائین بە جـودا لە ریاسەتی ئیلهامی نـافیز بەگ دا لە لونـدەرەدا بـۆ لای هەیئەتێکـی بەحـری کە هەیە. وە لە تەلەغرافێـک کە بە تاریخی 4 ی مینهو کە هاتوە موافیقی قەراری مەجلیسی ئەنقەرە لەسەر ئەو مەقاوەمەتی کە کردویەتی مەعاشـی صەلیفەی سابیق قەتع کراوە.

"لەسەر تەلەبی رەئیسی داخلـیە لە داخلـی خەتـی سامسـون دا و لە مەنتـیقەی شـەرق دا بـۆ خسوسـی شەرائیتی ئیقامەت لە لایحەدا وا بەیان کراوە، عەرەب و گورجیان لە خاریجی ئەستانبول و ئەو مەنتیقـانەی کە واقیع و لە پشت حدودی سوریە و گورجستانە، ئیقامەتیان مەنع کراون. ساکین هەر وڵاتێک بێ لەنـاو تـورک دا لە سەد دە زیاتر نابێ تەجاوز بکات، لاکین کوردەکان لەمە موستەسنان."

"خەلیفە عەبدولمەجید خان موەقەتەن لە سویس دادەنیشێ

"تریتە: سوئال لە عەبدولحەمید خان کـرا کە لەفرانســە دادەنیشـێ یـا لە ئیتالیـا جـوابی دابـوە کە محەلی ئیقـامەتی خەلـیفە هەتـا لە مەجلیسـی عـالەمی ئیسـلاما تەقریـر ئەکـا ئێسـتا مـوەقەتەن لە سـویس دادەنیشم."

هەواڵەکـانی ئومێـدی ئیسـتیقلال لە بـارەی تورکیـاوە، سـەرکەوتنی مسـتەفا کەمـال و دامەزرانـدنی جمهـوریەتی نـوێی تورکیـا و، هەڵوەشـاندنەوەی سـەڵتەنەتی عوسـمانی ڕون ئەکەنەوە. ئەگەرچـی هێشـتا سەرکوتکردنی ئاشکرای جوڵانەوەی کورد دەستی پێ نەکردوە، بەڵام مسـتەفا کەمـال کۆتـایی هێنـا بە هەمـو چالاکیەکانی سیاسی، ڕۆشنبیری، کۆمەڵایەتی... کوردەکانی ئەستەموڵ.

**2. 3. 6. هەواڵی ئێران**

لە ژ10 دا باسی هاتنی شای ئێرانی نوسیوە:

"شاهی ئێران لە بەغداد

"لە 8 ی مانگی جاری لە سەعات شەشی ڕۆژا جەلالەتمەئاب شاهی ئێران تەشریفی واصلی بەغداد بـوە. لە عەینی ڕۆژ لە ساعەت نۆ جەنابی مەندوب ئەلسامی بیلزات لە ئەستاسیۆنی شەمەندوفێر شاهی جەلالەتمەئابی زیارەت کردوە. لە تەرەف مەلیکی عیراقیشەوە جەنابی جەودەت بەگـی سـەریاوەر و، لە ئومەنـا جەنـابی داود بەگی حەیدەری و، بە نـاوی پـایتەختەوە جەنـابی سـەبیح نەشـئەت بەگ ئەمینـی شـەهر زیارەتیـان کـردوە. حەزرەتی شاهـ لە پاش شەوێک ئیستراحەت بە ئوتومبیلی زاتیەی متەوەجیهی سوریە بـوە. قەسـدی زیـارەتی ئەوروپای هەیە. لە ئەسنای حەرەکەتـا دو ئوتـومبیلی زرەهلـی لە عەقەبـیەوە حەرەکەتـی کـردوە. سـەرکاتب و یاوەری فەخامەتی مەندوب ئەلسامی تاوەکو دلێم تەشیعیان کردوە. ئەم مەراسیمی تەشریفیە لە تەرەف جەنـابی قونسلوسی بەغدادی دەوڵەتی عەلیەی ئێرانەوە ئیجرا کراوە."

لە ژ17 دا نوسیوێتی:

"تەیارە لە ئێران

"حکومەتی ئێران لە فابریقەکانی فرانسە شەش تەیارەی کڕیوە و گەیشـتۆتە (بوشـیر) و بـۆ تەعلیمـی زابتانی ئێران چەند تەیارەچیەکیشیان تەرفیق کراوە."

لە ژ19 دا نوسیوێتی:

"جمهوریەتی ئێران

"عمومی غەزەتەکانی ئێران بۆ تەئسیسی جمهوریەت و بۆ خەلعی شـاهـ بە شـیدەت پروپاغانـدە دەکەن. عولەما و موجتەهدینی ئێرانیش بۆ تەئسیسی جمهوریەت تالبن. ئیحتیمالی ئەم مەسـئەلەیە حەواڵەی مەجلیسـی مەبعوسان دەکرێت."

"تاج و مجەوهەراتی ئێران

"حکومەتی ئێـران بـۆ تەمدیـدی خەتـی شـەمەندوفێر قەراری داوە لەگەڵ بەعـزێ ئەشـیای قیمەتـداردا مجەوهەراتی تاجی ئێران بفرۆشێت."

لە ژ20 دا نوسیوێتی:

"حەرەکەتی شای ئێران

پاریس 4 ی مارت: شاهی ئێران گەیشتۆتە پاریس. ئەسبابی چـونی ئەمەیە عەلاقەدارە بە جمهـوریەتی ئێرانەوە."

"جمهوریەتی ئێران

"تەهران 15 ی مینهو: بۆ مەقسەدی ئیعلان کردنی جمهوریەت ئەمڕۆ ئێـوارێ لە تەهـران دا ئیجتیمـاع کراوە. لە هەمو لایەکی ئێرانەوە بۆ تالب بونی جەمهوریەت تەلەغراف دراوە بە تەهران."

لە ژ21 دا نوسیوێتی:

"ئەحواڵی ئێران

"تەهران 17 ی مینهو: حەرەکەتی جمهوریەت رۆژ بەرۆژ زیاد و بڵاو دەبێتەوە. وە لە مەجلیسی ئێران دا جەمعیەتی تەرەقی پرۆغرامی داوە بە غەزەتەکان بۆ خەڵعی شاه و ئیعلان کردنی جمهوریەت. (قومیتە) کان لە عەینی فکردان. روئەسا و نازرە کۆنەکان لەگەڵ ئەشراف و ئەعیان دا مەجلیسێکی گەورەیان لە سەرای شاهی دا تەشکیل کرد، هەمو تالبی جەمهوریەت بون. وە عائید بەم جمهوریەتە بەیاننامەیەکی زۆریان بڵاو کردۆتەوە."

لە مەجلیسی مەبعوسانی ئێران

"تەهران 17 ی مینهو: ئەم هەفتەیە لە مەجلیسی مەبعوسان دا بەعزێ مەبعوس لە سەر مەسئەلەی ئیعتیمادنامە هەرایەکی گەورە و بێ ئینتیزامیەک وقوعی بوە. چونکە موقابیلی مومەسیلی دو پارتی قسەی خراپیان بە یەکتری گوتوە."

لە ژ22 دا نوسیوێتی:

"وەلی عەهدی ئێران سەرای خۆی تەرک ئەکات

"تەهران 22 ی مینهو: وەلی عەهد سەرای شاهی تەرک و، لە خاریجی شەهر ئیقامەتی کردوە. بە موناسەبەی ساڵی نەورۆز ئەمساڵ وەکو ساڵان مەراسیمی سەلاملغ ئیجرا نەکراوە. لە مەعیەتی ئاغا جەمال دا لە تەبەقەی عەوام ئەوانی کە موعاریزی جمهوریەتن کۆمەڵێ ئەهالی هجومیان کردۆتە ناو مەجلیسی میلەت بە زۆر چونە ژورەوە. بەعزێ تەرەفدارانی جەمهوریەت لە مەبعوسەکانیان داوە (تادایون) و روفەقای موتالەعەنامەیەکیان داوە بە مەجلیس. لەم موتالەعەنامەیەدا لە هەمو تەرەفێکی ئێرانەوە وەها تەلغراف نوسراوە جەمهوریەت ئیدیعا کراوە. ئیعلان ئەکرێ ئیختیلال دەردەچێ. موناقەشەی تەلەب کراوە و هەروەکو بەیان دەکرێ قەرار دراوە:

1. تەبدیلی شکڵی ئیدارە.

2. تەنقیحی قانون و شکڵی ئیدارەی تازەی میلەت و، بۆ ئیدارەی میلەت کە رێک بکەوێ وەزعی قالبێک بکرێ.

3. نەتیجەی فەعالیەتی مەجلیس نەشر بکرێ. وە لە پاش موناقەشەیەکی دورودرێژ لە 22 ی مارتی 340 دا ئەم موناقەشەیە بخرێتە قەرارەوە."

لە ژ24 دا نوسیوێتی:

"رەئیس نوزاری ئێران رەزا خان

"تەهران 9 ی مینهو: رەئیس نوزاری ئێران هەرچەندێ لە قابینەی ئێران ئیستیعفای کردوە. لاکین تیکرار بە واسیتەی هەیئەتێکەوە بۆ سەر قابینەیەتی بۆ تەهران بانگ کراوەتەوە."

هەواڵەکانی ئێران لە چاو هەواڵەکانی تورکیادا زۆر کەمترن. بەڵام ئەمیش باس لە سەرکەوتنی رەزا خان ئەکا.

## 2. 3. 7. هەواڵی جۆراوجۆر

لە ژ18 دا لە سەر (عیراق و قابینەی عەمەلە) نوسیوێتی:

لە مەجلیسی ئەعوام دا لە میستەر ماکدونالدیان پرسیوە مەسائلی عیراق حەل کرا یا نەء؟ سیاسەتی قابینەی تازە و کۆن دەرحەق بە ئێراق یەک ئەبن یا نا؟ مەساریفاتی بریتانیا لە عیراق چەندە؟

"جەواب: بریتانیا لە خسوس تەعەهوداتی ویصایەتەوە ئیعتینا ئەکا بۆ حەل کردنی وەزعیەتـی عیـراق. حکـومەتی عەرەبـیە تەقـویە ئەکـا و لەو زەمـانەی کە تەعینـی کـردوە بـۆ ڕشـدی عیـراق زیـاتر لە عیـراق دا نامێنێتەوە. ئەمساڵ 3900000 لیرەی ئینگلیزی لە خەزێنەی بریتانیاوە بۆ عیراق سـەرف کـراوە. فەقەت لە ساڵی ئاتیەدا ئەم مەسرەفە تەنقیص ئەکرێ.

"لە مەجلیسی ئەعوام دا دائیـر بە مـوافەقەتی بریتانیـا لە سـەندنی تەعـویزات لە ئەڵمانیـا بەرامـبەر بە سوئالی کە لە میستەر ماکدونالد کراوە هەرچەنـد مومـا ئیلەیهـی جـوابی مـوافەقەتی داوە بە شـیدەت سـەدای موخالەفەت و ئیعتیراز واقیع بوە."

لە ژ21 دا لە سەر (مەجلیسی مەبعوسانی بریتانیا) نوسیوێتی:

"لۆندرە: ئەمڕۆ ئەوەڵ ڕۆژێـکە کە هەیئەتـی قـابینەی عەمەلە لە حـزوری مەجلـیس دا ئیزهـاری وجـود ئەکەن. لاکین لە حەرەکات و ئەوزاعیان دا بە کـولی عەلامەتـی هەیەجـان و ئینقـیلاب نەبینـراوە. لە ئیبتیـدای دەست کردن بە موزاکەرە ڕەئیسی وزەرا حـازر نەبـو. بالـدروین، لە پـێش سـەفی موخـالفین قەراری گرتبـو. وزەرای سابیق کە لە حیزبی لیبرال بون لە ژێر داڵانی هەیئەتـی دەولەتەکـان مەوجـود بـون. مورەخەسـەکانی عەمەلە لە مەوقعێ کە مەخسوسی جوابدانەوەی وزەرا بۆ هەڵسان ئیزهاری مەسەرەت و شادمانیان ئەکرد.

"تاقمی محافیزکار قیافەتی موخالەفەتیان پۆشی بو دەستبەجێ شروعیان بە سوئالی ئیختیلافئامێز کـرد. والیش کە وەزیری مالیەیە، بە مەخسوسـی لە تەرەف ئەحـرار و موحافیزکـاران لە خسـوس دەوامـی سـاحێب مەنسەبان و ئەفرادی سابیق مەعروزی هجوم بە شـیدەت بـون. لە جـواب دا... پرۆفیسـۆر بێـرت ڕیتشـارت، وەهای ئیزهار کـرد کە بـۆ جیهەتـی خەلاص بـونی غانـدی شـەرائیتی مـوقەرەرە تەعـین کـراوە و، وەزیـری هیندستان ئیختیاری کامیلەی بە حکومەتی هیندستان داوە، لە پاش ئەمە کە مەشورەت بە حکومەتی بۆمبای وە هەر جیهەتێ ئیجاب ئەکا بکرێ.

"میستەر رامس ماکدونالد، لە میانی نوتقی خۆیا ئیزهاری کرد کە مـن بە هـیچ وەجهێـک بە واسـیتەی موخالەفەتی موخالفین ئیستیعفا ناکەم. لە پاش ئەمە لە خصوص ئەفکار سـولح پەروەرانـی عەمەلەوە ئیزهـاری منەتـداری بە موناسـەبەتی گـرتنە ژێـر دەسـتی ئیـدارەی حکـومەتی عەمەلە خـۆی لە معـامەلاتی موخالیفـان ئەپارێزێ".

## 2. 4. بابەتی جۆراوجۆر

لە ژ9 دا ڕەفیق حیلمی بە تورکی وەڵامی وتارێکی ژ 855 ی (نجمە) ی داوەتەوە.

لە ژ17 دا بە ناوی ڕۆژنامەکەوە بە تورکی وەڵامی ژمارەی ڕۆژی 15 ی شوباتی (نجمە) ی داوەتەوە.

لە ژ20 دا بە فارسی جوابی ڕۆژنامەی (شفق سرخ) ی ئێرانی داوەتەوە. (شـفق سـرخ) نوسـیوێتی کە شێخ مەحمود لە ترسی فڕۆکەکانی ئینگلیز، خێزانەکەی ڕەوانەی سنور کردوە، خۆیشی لە کون شـاخ دا خـۆی شاردۆتەوە. لە سەر ئەمە لۆمەی ڕۆژنامەکە ئەکا.

لە ژ23 دا (جوابی غەزەتەی العراق) ی داوەتەوە.

بەرپەرچدانەوەی ئەم ڕۆژنامەیە، بە زۆری بۆ داکۆکی بوە لە مافی کورد بۆ سەربەخۆیی.

لە ژ8 دا ڕەفیق حیلمـی لە کۆتـایی وتارێـک دا لە ژێـر سـەردێری (حکـومەتی میلـیە فائیـدەی چـیە؟) نوسیوێتی:

"... بینائەن عەلەیهی حال هیچ نیە، مەقسەد ئیستیقباڵە، لازمە ئەمڕۆ لە سلێمانیدا مەتبوعـات و ئەفکـار فەوقەلعادە سەربەست بێ و هەمو تێگەیشتوانی میلەت بیلا قەید و شەرت سەربەستـیان تەئمین بکرێ حەتا لە

تەحتی ریاسەتی جەنابی مەلیک دا بە پرۆغرامێکی قەتعی و فائیدەبەخش جەمعیەتێکی ئەحرار تەشـەکول بکـا بـۆ خـاتری ئەمەی کە هەم بـۆ ئـاتی سـیلاحی موبافەعەمـان بـێ و هەم ئیـدارەی مـوتلەقە و موسـتەبیدانە لە مەملەکەتمانا غەیرە قابیلی تەشەکول بێت..."

## 3. لە روی هونەری رۆژنامەوانییەوە

### 3. 1. شێوە و روخسار

ئومێدی ئیستیقلال وەکو غەزەتەکانی پێش خۆی: پێشکەوتن، بانگی کوردستان، رۆژی کوردسـتان، بە هەمـان شـێوە و روخسـار و بە هەمـان دەزگـای چـاپ و حەرف و، بە هەمـان قەوارە دەرچـوە. لەگەڵ ئەوان جیاوازیەکی نیە.

### 3. 2. زمانەکەی

زۆری وتارەکانی ئومێدی ئیستیقلال بە کـوردیە، بەڵام هەنـدێ جـار بە زمـانی فارسـی و تـورکی‌یـش وتاری بڵاوکردۆتەوە بە تایبەتی بۆ وەڵامدانەوەی هەندێ لەو رۆژنامەنەی بەم دو زمانە دەرچون.
کوردیەکەی تەنها لەهجەی سـلێمانیە، بەڵام زۆر جـار نـارەوان و نـاخۆش و وشـەگەلی نـاقۆڵای عەرەبـی تـێ ئاخنراوە و، رێنوسەکەی بۆ خوێندنەوە ئاسان نیە. زۆر کەم پێرەوی خاڵبەندی کردوە.

### 3. 3. گیروگرفتی تەکنیکی

پێئەچێ بە هۆی ئاڵوگۆری دەسەڵات و بۆردومانی سلێمانی و چۆڵکردنی، دەزگای چاپەکە خراپ بوبێ و، هێزی ئینگلیز کە سلێمانی بە جێ هێشتوە هەندێ پارچەی لـێ دەرهێنـاوە، لە بەر ئەوە توشـی گیروگرفـت بون.

لە ژ1 دا نوسیوێتی:

"لەم ئینقیلابی ئەخیرەدا لەبەر ئەمەی بەعزێ ئەقسامی ماکینەی چـاپ سـەقەت کرابـو مـودەتێکە غەزەتە ئینتیشاری تەعتیل بوبو. ئەمجارە بە واسیتەی سەعی و هیمەتی چەنـد وەسـتایەکەوە چـاک کـرا وە بیمینهـو تەعالا موباشەرەتی بە نەشرەی غەزەتە کرایەوە و بە ئارەزوی هەمو برادەرانـی کـورد هاوارمـان بە واسـیتەی ئومێدی ئیستیقلالەوە رەفع و ئیعلان ئەکەین. ئومێدی ئیستیقلال لە بەر ئەوەی نەشـرەی حەقـیقەت و مـودەعی حقوقی میلیەی عەرزی ئیفتیقار و بۆ معاوەنەتی هەمو خەبەردار ئەکـا لـەم خصوصـەوە عەرزی تەبشـیر ئەکەم. ئەحمەد صەبری"

لە ژ16 دا نوسیوێتی:

"ئیعتیزار: لەم بەینی پێشودا مـاکینەی مەتـبەعە چەپەڵ بوبـو لەبەر ئەوە تەئخیـری ئینتیشـاری غەزەتە کراو، پاککرایەوە ئەمجارە بیمینهو تەعالا دەست بە ئینتیشار کرا."

لە ژ18 دا نوسیوێتی:

"ئیعتیزار: لە بەر کوسـرەتی مەشـغولیەت ئەمجـارە غەزەتەکەمـان پـێچەوانە تەبـع کـراوە. ئیسـتیرحام ئەکەین لە قارئینی کیرام کە قسورمان عەفو بفەرمون."

## 4. شوێنی لە مێژوی ڕۆژنامەوانیی کوردیدا

ئومێدی ئیستیقلال لە ڕۆژگارێکدا دەرچوە کە ململانێی سیاسی - چەکدار لە نێوان جولانەوەی سەربەخۆییخوازی کورد و، دەسەڵاتی داگیرکەری ئینگلیز و عیراقدا، چۆتە قۆناغی شەڕ و پێکدادانەوە. سیاسەتی ئینگلیز بەرامبەر کوردستانی جنوبی ئاشکرا بو کە ئەیەوێ کوردستانی جنوبی بە یەکجاری بخرێتە سەر مەملەکەتی تازە دامەزراوی هاشمی، جولانەوەی نەتەوەیی کورد بە سەرکردایەتی شێخ مەحمود ئەیویست بەرهەڵستی ئەم پیوەلکاندنە بکا. کوردیش لە ناو خۆیدا بوبو بە چەند بەشەوە، بەشێکی گرنگی کە چەندین کەس لە هاوکارانی پێشوی شێخ مەحمودیان تێدا بو، نائومێد بون لەوەی ئینگلیز شتێ بۆ کورد بکا و تێگەیشتن چارەنوسی کوردستان بە عیراقەوە گرێ ئەدرێ، بە لای ئینگلیز و عیراقدا کەوتن.

ئومێدی ئیستیقلال ڕۆژنامەی ڕەسمیی حکومەتی کوردستانی جنوبی بوە، بیروبۆچونی دەستەی سەربەخۆییخوازانی کوردی دەربڕیوە.

## 5. جێگر بونی نەخشەی سیاسیی ناوچەکە

### 5. 1. تورکیا: دامەزراندنی جمهوریەتی تورکیای کەمالی

حکومەتی تورک هەمو یانە و رۆژنامە کوردیەکانی ئەستەموڵی داخست و، هەمو چالاکیەکی سیاسی، کۆمەڵایەتی، رۆشنبیری... کوردی قەدەغە کرد. بەوپەڕی توندوتیژیەوە کەوتنە پەلاماردانی کورد. زنجیرەیەک شۆڕشی خوێناوی 1924 و 1925 و 1927- 1931 و 1936 روی دا. تورک لەم روداوانەدا بە هەزاران کوردی کوشت و بە هەزاران گوندی وێران کرد. چەند ملیۆن کوردی راگواست بۆ دەرەوەی کوردستان و تورکی لە جێگەی ئەوان نیشتەجێ کرد. سیاسەتی رەسمیی حکومەتی تورکی بەرامبەر کورد، تواندنەوەی کورد بو لە ناو نەتەوەی تورکدا. مستەفا کەمال ویستی نەتەوەی دەوڵەت دروست بکا.

لە ساڵانی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا چاپەمەنی و رۆژنامەوانیی کوردی لە تورکیا رێگەی نەدراوە و نەبوە.

### 5. 2. ئێران: دامەزراندنی دەوڵەتی شاهنشاهی پەهلەوی

دوای ململانێیەکی زۆر لە نێوان شای قاجار و رەزاخانی سەرداری سپا و مەشروتەخوازان و جمهوریخوازان، سەرەنجام رەزا خان سەرکەوت و بو بە شای ئێران. رژیمێکی دیکتاتۆریی خوێناوی دامەزراند، رەزا شا وشەی (ئێران) ی کرد بە ناوی رەسمی وڵات و دەوڵەت. ئەویش بە چاولێکەری مستەفا کەمال کەوتە هەوڵی دامەزراندنی دەسەڵاتێکی ناوەندی و تواندنەوەی هەمو گەلانی ئێران لە ناو نەتەوەی ئێرانیدا، ویستی نەتەوەی دەوڵەت دروست بکا. بە سەدان کەسایەتی کوردی گرت و دوریخستنەوە بۆ زیندانەکانی دەرەوەی کوردستان، بەکارهێنانی زمان و فەرهەنگی کوردی قەدەغە کرد. زمانی کوردی بە لەهجەیەکی زمانی فارسی دائەنرا، بە زمانێکی سەربەخۆ نەئەناسرا. لە ساڵانی ئەم لێکۆڵیەوەیەدا چاپەمەنی و رۆژنامەوانیی کوردی لە ئێران رێگەی نەدراوە و نەبوە.

### 5. 3. عیراق: دامەزراندنی مەلیکایەتی هاشمی

#### 5. 3. 1. پێکهێنانی یەکەم حکومەتی عیراقی (1920)

ساڵی 1920 دەسەڵاتی ئینگلیز لە بەغداد، داوای لە کەسایەتیەکی دینیی عیراق کرد وەزارەتێکی خۆماڵی بۆ حوکمی عیراق پێک بهێنێ. ئەورەحمان نەقیب وەزارەتی پێک هێنا. پاش ماوەیەک ئینگلیز ئەمیر فەیسەڵی کوڕی شەریف حسەینی بانگ کرد بۆ عیراق. وەزارەت بەیعەتی پێ کرد و (ئیستیفتا) یەکی

روکەش بۆ بەیعەت کردنی گشتی بە مەلیکێتی فەیسەڵ لەناو خەڵکدا ساز کرا. لەو کاتەدا جوڵانەوەی نەتەوەیی کورد لە عیراقدا، بە تایبەتی لە ناوچەکانی سلێمانی و کەرکوکدا بە هێز بو، نەیانئەویست بچنە ژێر حوکمی عیراقەوە، بەڵکو ئەیانویست دەوڵەتێکی کوردییان هەبێ.

ئەم کێشەیە ئەگەرچی ئینگلیز لە لای خۆیەوە بە لایدا خست بو، بەڵام لە لای کورد بە تایبەتی لای شیخ مەحمود و هاوبیرەکانی، هێشتا بە لادا نەکەوت بو. دوای زنجیرەیەک شەڕ و پێکدادان لە نێوان هێزەکانی کورد و ئینگلیز و عیراقدا، هێزەکانی ئینگلیز و عیراق سلێمانییان داگیر کرد. سلێمانی بە رەسمی کرا بە یەکێ لە لیواکانی عیراق و موتەسەڕیفێکی بۆ دانرا.

ئەگەرچی شێخ مەحمود و هاوکارەکانی هەر لە شۆڕشدا مانەوە و بەرەنگاریی هێزەکانی عیراق و ئینگلیزیان ئەکرد، بەڵام ئیتر هەلی پێکهێنانی دەوڵەتی کوردی لە کایەدا نەما بو، چارەنوسی کوردەکانی کوردستانی جنوبی بە یەکجاری بەسترا بە دەوڵەتی تازە دامەزراوی عیراقەوە. ئینگلیز لە عیراقدا ویستی نەتەوەی عیراق (الامة العراقية) دروست بکا.

## 5. 3. 2. مافەکانی کورد لە دەوڵەتی تازەدا

ئێران و تورکیا دو دەوڵەتی دێرینی ناوچەکە بون، بەڵام عیراق دەوڵەتێکی تازە دامەزراو بو. رێژەی کورد لە چاو دانیشتوانی هەمو ئێران و، رێژەی کورد لە چاو دانیشتوانی هەمو تورکیا، ئەگەر بەراورد بکرێ لەگەڵ رێژەی کورد لە چاو دانیشتوانی هەمو عیراقدا، دەرئەکەوێ کە رێژەی کورد لە عیراقدا زۆر زیاترە. ئەمە سەرەڕای ئەوەی ئەگەر ئەوەش بهێنینە بەرچاو کە زۆرایەتی عەرەبی عیراق بە مەزەب شیعەو زۆرایەتی کوردی عیراق بە مەزەب سوننەن و، ئەمیر فەیسەڵ و دەزگای حوکمڕانیەکەیشی سوننە بون، دەرئەکەوێ کە ئەمیر فەیسەڵ تا چ ئەندازەیەک پێویستی بە کورد بوە بۆ ڕاگرتنی هاوسەنگی شیعە- سوننە لە عیراقدا.

جگە لەوەیش، عیراق تا 1931 لە ژێر ئینتیدابی بریتانی دا بو، دەسەڵاتی ئینتیداب بەڵێنی لە عیراق وەرگرت بو لە بەرامبەر ئەوەدا کورد بخرێتە سەر عیراق، عیراق سەرەنجام سەربەخۆیی وەربگرێ، ئەبێ رێزی مافەکانی کورد بگرێ.

ئەم دو فاکتەرەی بۆ کوردەکانی عیراق رەخسا بو، بۆ کوردەکانی ئێران و تورکیا و سوریا نەڕەخسا، لە بەر ئەوە کورد لە عیراقدا هەر لە سەرەتاوە هەندێ مافی رۆشنبیری (لەوانە مافی رۆژنامەوانی و سەلماندنی قانونیی بەکارهێنانی زمانی کوردی لە خوێندنگا، دادگا و دائیرەکان دا) و، مافی بەڕێوەبەری (لەوانە بەشداری لە پارلەمان و وەزارەت و پایە بەرزەکانی دەزگاکانی حکومەتدا) وەرگرت، کوردی پارچەکانی تر لێی بێ بەش بون.

## 5. 3. 3. کاتنامە کوردیەکانی عیراق

### 5. 3.. 3. 1. لە سلێمانی

#### 5. 3. 3. 1. 1. ژیانەوە (1924 – 1926)

ژ1 ی لە 18 ی ئاغستۆس (ئاب) ی 1924 دا و،

دوا ژمارەی 56 لە 14 ی کانونی سانی 1926 دا دەرچوە.

لە ژ1 یدا بەمجۆرە خۆی بە ناسین داوە: "ئەم غەزەتەیە غەزەتەیەکی حکومەتیە هەفتەی جارێک دەردەچێ"

بە 4 لاپەڕە لە چاپخانەی بەلەدیە لە سلێمانی دەرچوە.

لەم بەشەدا لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆ لەسەر (ژیانەوە) نوسراوە.

**5. 3. 3. 1. 2. ژیان (1926 – 1938)**

ژ1 ی لە 21 ی کانونی دوەمی 1926 دا، واتە راستەوخۆ دوای راگرتنی (ژیانەوە) و وەکو درێژەکێشانی ئەو دەرچوە. لە ژ1 دا بەمجۆرە خۆی بە ناسین داوە: "ئەم غەزەتەیە غەزەتەیەکی سیاسی، ئەدەبی، ئیجتیماعیە، هەفتەی جارێک دەردەچێ" بە 4 لاپەڕە لە چاپخانەی شارەوانی چاپ کراوە.

تا ژ81 ی 13 ی 9 ی 1927 محەمەد ئەدیب عەزیز و،

لە ژ82 ی 20 ی 9 ی 1927 تا ژ259 ی 4 ی 9 ی 1930 عەلی عیرفان و،

تا ژ321 ی 30 ی 4 ی 1932 حسەین نازم و،

لە ژ322 ی 19 ی 5 ی 1932 ەوە کە حسەین نازم ئەمرێ تا ژ406 ی 14 ی 8 ی 1934 پیرەمێرد بەڕێوەبەر و بەرپرسی بوە. لەم ژمارەیە بە دواوە پیرەمێرد چاپخانەکەی لە شارەوانی بە کرێ گرتوە، ئیمتیازی رۆژنامەکەشی لای حکومەتی بەغداد بۆ خۆی وەرگرتوە.

لە ژ406 ی 14 ی 8 ی 1934 تا ژ553 ی 10 ی 3 ی 1938 پیرەمێرد، بە سەربەخۆیی، بەڕێوەبەر و بەرپرسی ژیان بوە، بەڵام موتەسەڕیفی ئەوسای سلێمانی بەهانەی بە پیرەمێرد گرتوە و (ژیان) ی داخستوە.

ژیان تا ئەو کاتە بە تەمەنترین رۆژنامەی کوردی بوە.

لە بەرگی دوەمی ئەم کتێبەدا لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆ بە ناونیشانی (ژیان... بە تەمەنترین رۆژنامەی کوردی 1926- 1938) بڵاوئەبێتەوە. پێشتر، ساڵی 2002 چاپی یەکەمی بڵاوکراوەتەوە.

**5. 3. 3. 1. 3. زبان (1937 – 1941)**

رۆژنامەیەکی حەفتانە بوە. شارەوانی سلێمانی دەری کردوە، ساڵح قەفتان بەڕێوەبەر و بەرپرسی بوە.

ژ1 ی لە 11 ی ئەیلولی 1937 دا و

ژ94 ی لە 18 ی کانونی دوەمی 1941 دا دەرچوە.

ئەم رۆژنامەیە لە لایەن شارەوانیەوە دەرکراوە بۆ بەربەرەکانی رۆژنامەی (ژیان) ی پیرەمێرد.

**5. 3. 3. 1. 4. زانستی (1938)**

گۆڤارێکی زانستی و ئەدەبی و هونەری و مێژویی و ئابوری بوە، ساڵح قەفتان خاوەن و بەڕێوەبەری بوە. ژ1 ی لە 25 شوباتی 1938 دا دەرچوە.

**5. 3. 3. 1. 5. بڵاوکراوەی تر**

سلێمانی تەنیا چاپخانەیەکی لێ بوە کە رۆژنامەی ژیانی پێ چاپ کراوە. لە بەر ئەوە توانای لە چاپ دانی کتێب کەم بوە. هەندێ کتێب لە (چاپخانەی ژیان) چاپکراون بە زۆری لە بەرهەمەکانی پیرەمێرد بون.

**5. 3. 4. قوتابخانەی رۆژنامەوانیی سلێمانی**

سلێمانی لە چاو شارەکانی تری کوردستاندا، شارێکی تازەیە، ساڵی 1784 دروستکراوە. سلێمانی نە مینای دەریایی و، نە سەرە رێگای بازرگانی و، نە ناوەندێکی گرنگی کشتوکاڵ و ئابوری بوە. دروستکردنی سلێمانی بە تایبەتی لەو شوێنەدا زۆرتر هۆی سیاسی و جەنگی لە پشتەوە بوە. سلێمانی هەر زۆر زو بۆتە ناوەندێکی سیاسی و، ناوەندێکی خوێندن و رۆشنبیری. بە دەیان مزگەوتی تێدا کراوەتەوە و بە سەدان مەلا و مودەڕیسی باشی بۆ هێنراوە.

سەرەتای شیعری کوردی بە لەهجەی کرمانجی خوارو لە 3 کوچکەی قوتابخـانەی بابـان: نـالی، سـالم، کوردی و، نوسینی کوردی بە لەهجەی کرمانجی خوارو لە عەقیدەنامەکەی مەولانـا خالیـد و لە مەولودنـامەکەی شێخ حسێنی قازیـیەوە دەس پێ ئەکا.

کردنەوەی خوێنـدنگەی دەوڵەتـی‌ی لە دوا چـارەکی قەرنـی نـۆزدەهەمدا، لە پـاڵ مـزگەوت و مەدرەسـە دینیەکاندا، دەروازەیەکی تـری بـۆ خەڵکـی سـلێمانی کـردەوە بە روی رۆشـنبیری نـوێدا. بە رێـکەوت نـیە: یەکەمین سەرنوسەری رۆژنامەی سیاسی‌ی یەکەمـین ڕێکخـراوی کـوردی لە ئەسـتەموڵ سـلێمانیەلی توفیـق و، خاوەنی گۆڤاری رۆژی کورد عەبدولکەریم سلێمانی و خاوەنی گۆڤاری هەتـاوی کـورد عەبـدولعەزیز بابـان و، یەکەمین دیپلۆمات کە مەسەلەی کوردی خستە بەردەم کۆڕ و کۆمەڵە ناودەوڵەتیەکان شـەریف پاشـای خەنـدان بو. یەکەمین حکومەتی کوردی لە سلێمانی دامەزرا و، یەکەمین چاپخانەی کـوردی لە خـواروی کوردسـتاندا و یەکەمین رۆژنامەی کوردی لە کوردستاندا لە سلێمانی بڵاوکرایەوە و، یەکەمین لێکۆڵینەوەی زانسـتی‌ی میـژوی کورد، دوای شەرەفخانی بتلیسی، ئەمین زەکی و، یەکەمین دانەری سـەرف و نەحـوی کـوردی سـەعید صـدقی کابان و دانەری یەکەم رێزمانی کوردی تۆفیق وەهبی بوە.

لە بەر ئەوە شـتێکی سـەیر نەبـو کە سـلێمانی یەکـێ لە ناوەنـدە چالاکەکـانی کـوردایەتی و، یەکـێ لە ناوەندە رۆشنەکانی رۆشنبیری و رۆژنامەوانی‌ی کوردی بێ.

لە سلێمانی‌دا کاروانێکی بێ پچڕانی رۆژنامەوانی لە سەرەتای بیستەکانەوە بە پێشـکەوتن و، دوای ئەو بە ریز بە بانگی کوردستان، رۆژی کوردستان، بانگی حەق، ئومێدی ئیسـتیقلال، ژیـانەوە، ژیـان، زبـان، زانسـتی... دەستی پێ کرد، چوارچێوەی قوتابخانەیەکی تایبەتی رۆژنامەوانی دامەزراند کە تا ئەمڕۆیش بەردەوامە.

### 5. 3. 4. 1. سیماکانی قوتابخانەی سلێمانی

1. بژارکردنی زمانی کوردی لە وشەی بێگانە
2. هەوڵدان بۆ داهێنانی رێنوسی نوێ
3. نوێکردنەوەی شیعر و ئەدەب
4. داواکردنی ئازادی‌ی ئافرەت
5. داوا کردنی مافی نەتەوەیی کورد
6. پشتیوانی‌ی بزوتنەوەی نەتەوەیی کوردی‌ی بەشەکانی تر

### 5. 3. 3. 2. لە بەغداد

### 5. 3. 3. 2. 1. دیاری‌ی کوردستان

ژ1 ی لە 11 ی مارتی 1925 دا و

ژ16 کە دوا ژمارەیەتی، لە 11 ی مایسی 1926 دا لە بەغداد بە کوردی و عەرەبی و تورکی، دەرچوە.

خۆی بەمجۆرە بە ناسین داوە: "دیاری‌ی کوردستان جارێ هەتـا جێـژن پـانزە رۆژ جـارێ دەرئەچـێ، رۆژنامەیەکی ئیجتیماعی و ئەدەبی و مصەوەرە، هەفتەی جارێ دەرئەچێ"

ساحێبی ئیمتیاز و سەر موحەڕیری ساڵح زەکی ساحێبقران و، نوسەری بەشی عەرەبی خەلەف شـەوقی داودی و، نوسەری بەشی تورکی د. محەمەد شوکری سەگڤان و، مودیری ئیدارەی رەشید شەوقی بوە.

لەم کتێبەدا لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆ لە سەر (دیاری‌ی کوردستان) نوسراوە.

**5. 3. 3. 2. 2. بانگی کوردستان (خولی سێیەم، 1926)**

ژ14- 1 ی لە 28 ی کانونی دوەمی 1926 دا و،
ژ14- 2 ی لە 15 ی شوباتی 1926 دا و،
ژ14- 3 ی لە 1 ی نیسانی 1926 دا دەرچوە.

لە ژ14- 1 دا بەمجۆرە خۆی بە ناسین داوە: "غەزەتەیەکی سیاسی، ئەدەبی و فەنی‌یە هەفتەی جارێک دەرئەچێت"

مودیری مەسئول و سەر موحەڕیر مستەفا پاشای یاملکی و، موحەڕیر مستەفا شەوقی و، مودیری ئیدارە کەریم ڕۆستەم بوە.

**5. 3. 3. 2. 3. بڵاوکراوەی تر**

لە بەغداد هەندێ بڵاوکراوەی تر دەرچوە. ئەگەرچی هەندێ لە نوسەران لە ریزی گۆڤاردا ریزیان کردون، بەڵام لە بەر ئەوەی مەرجەکانی کاتنامەیان تێدا نیە ئەوانە بە گۆڤار و رۆژنامە دانانرێن. چونکە خاوەنی ئیمتیاز و سەرنوسەر و ناونیشانی دائیمی شوێنی دەرچونی تێدا نیە، لە دەرچونیش دا کاتی دیاریکراوی رۆژانە و، هەفتانە و، مانگانەیان نەبوە. تەنیا یەک ژمارەیان لێ دەرچوە، ئیتر وەستاون. رەنگە راستتر وابێ ئەم جۆرە بڵاوکراوانە بە (کەشکۆڵ) یان (ئەنتۆلۆجی) ناو ببرێن، چونکە کۆکراوەیەکی تێکەڵاوە لە بابەتی جۆراوجۆر لەوانە:

*** پەیژە**

ساڵی 1927 لە بەغداد دەرچوە. لە ژێر ناوەکەیدا نوسراوە: "ئەدەبی، ئیجتیماعیەیە بە کوردی بۆ کوردایەتی ئەدوێ. دانەری مستەفا شەوقی"

*** یادگاری لاوان**

ساڵی 1933 لاوانی کورد لە بەغداد بڵاویان کردۆتەوە، شیعر و بابەتی ئەدەبی و رۆشنبیریە، 80 لاپەرەیە.

*** دیاری لاوان**

ساڵی 1934 لاوانی کورد لە بەغداد بڵاویان کردۆتەوە، شیعر وبابەتی ئەدەبی و رۆشنبیریە، 102 لاپەرەیە.

جگە لەمانە چەندین کتێبی کوردی لە بابەتی جۆراوجۆر لە بەغداد بڵاوکراونەتەوە، لەوانە:

زنجیرەی کتێبەکانی کوردی - مەریوانی، لە ناویاندا دیوانەکانی نالی، کوردی، سالم.

تەرجومەی کوردیی کتێبی دەرسی خوێندنگە سەرەتاییەکانی عیراق بۆ ئەوەی لە خوێندنگە سەرەتاییەکانی کوردستاندا بخوێنرێن.

هەر لەو ساڵانەدا چەند کتێبێ لە بەغداد بڵاوکراونەتەوە کە پێوەندی‌یان بە مێژوی کورد و زمانەکەی و رێزمان و رێنوس و ئەدەبی کوردیەوە هەبوە. ئەمانە دورێکی گرنگیان هەبوە لە قوڵکردنەوەی هۆشی نەتەوەیی لاوانی کوردا. لەوانە، کۆمەڵە شیعری حاجی قادری کۆیی و، (دەستوری زمانی کوردی) تۆفیق وەهبی و، (خولاصەیەکی تاریخی کورد و کوردستان) ی محەمەد ئەمین زەکی کە (نەخشەی کوردستان) یشی لەگەڵ چاپ کراوە.

**5. 3. 3. 3. لە ڕەواندز**

**5. 3. 3. 3. 1. زاری کرمانجی**

خاوەن و مدیری سەید حسێن حزنی موکریانی و، مدیری ئیدارە عەبـدولڕەحمان (گیـوی موکریـانی) بوە.

گۆڤارەکە بەمجۆرە خۆی بە ناسین داوە: "کۆڤارێکی ئیجتیماعی، تاریخی، فەنی، ئەدەبی، مانگیە"

ژ1 ی لە 25 ی مایسی 1926 دا لە ڕەواندز لە چاپخانەی زاری کرمانجی بە قەوارەی 28 20 x سم و، هەندێ ژمارەی بە 20- 24 لاپەڕە و هەندێکی تری بە 12- 16 لاپەڕە، دەرچـوە. ئەم گۆڤـارە ئەگەرچـی ئەبو مانگانە دەربچێ، بەڵام تا ساڵی 1932 بە هەموی 24 ژمارەی لێ دەرچـوە. ژ24 ی لە 23 ی تەمـوزی 1932 دا دەرچوە.

زۆری بابەتەکانی حزنی موکریانی نوسیونی. تێکەڵاوە لە باسی مێژوی کـورد، ئەدەبـی، دەنگوبـاس، شیعر.

تا ساڵی 1932 حکومەتی عیراق هەمان یاسای چاپەمەنی عوسمانی جێبەجێ ئەکرد کە سـاڵی 1913 دانرا بو. بەڵام ساڵی 1933 پارلەمانی عیراقی یاسایەکی نوێی چاپەمەنی دانا.

مادەی دوەمی یاسای چاپەمەنی عیراقی ئەڵێ:

"هەمو چاپکراوێ ئەبێ بەڕێوەبەرێکی بەرپرسی هەبێ، ئەم مەرجانەی تێدا بێ:

1. عیراقی بێ.

2. 25 ساڵی تەمەنی تەواو کردبێ.

3. بە تاوانی ناسیاسی و گوناحی شەرەف شکێن حوکم نەدرابێ.

4. لە خوێندنگەیەکی بەرز دەرچـوبێ، ناوبـانگی بـاش بـێ، بـۆ چـاپکراوی دینـیی ئیسـلامی ئەبـێ ئیجازەی وتنەوەی دەرسی هەبێ.

5. فەرمانبەر نەبێ و ئەندامی ئەنجومەنی گەل نەبێ.

6. شوێنی دانیشتنی هەبێ لەو شوێنەدا چاپکراوەکەی لێ دەرئەچێ دیاری ئەکا."

وەکو ئەدمۆنس لەو بیبلـۆگرافیەدا نوسـیویێتی کە بـۆ چـاپکراوی کـوردی لە نێـوان سـاڵانی 1920- 1936 دا کردویەتی ئەڵێ لە بەر ئەوەی حزنی بڕوانامەی بەرزی نەبو، نەیتـوانی ئیمتیـازی زاری کرمـانجی بە پێی یاسای تازەی عیراقی نوێ بکاتەوە و درێژە بە دەرچونی بدا.

**5. 3. 3. 3. 2. بڵاوکراوەی تر**

حزنی بەو چاپخـانەیەی لە ڕەوانـدز بە نـاوی (زار کرمـانجی) وە دایمەزرانـد بـو، چەنـدین کتێبـی مێژویی، ئەدەبی، هونەری چاپ کردوە، لەوانە: کتێبە مێژوییەکانی خۆی دەربارەی کورد و نادرشـا، شـاهەکانی زەند و، حوکمدارانی بابان و، میرانـی سـۆران... بڵاوکراوەکـانی زاری کرمـانجی بەشـداریەکی کاریگەریـان کردوە لە بڵاوکردنەوە و قوڵکردنەوەی هۆشی نەتەوەیی لاوانی کوردا.

**5. 3. 3. 4. لە کەرکوک**

**5. 3. 3. 4. 1. کەرکوک**

عیراق ئەیویست لە ژێر منداتی بریتـانی دەربچـێ و سـەربەخۆیی وەربگـرێ، بـۆ ئەوەش ئەبـو بـۆ کۆمەڵەی گەلانی بسەلمێنێ کە ئەو بەڵێنانەی بە کوردی داوە جێبەجێی کـردون. لە هەمـان کـاتدا پەیمـانێکی

نوێ لەگەڵ بریتانیا ببەستێ. ساڵی 1930 کاتێ حکومەتی عیراق دەستی کرد بە گفتوگۆ لەگەڵ ئینگلیز بۆ نوێکردنەوەی پەیمانی عیراقی - بریتانی، چالاکەکانی کورد کەوتنە جوڵان، چونکە عیراق بە تەما نەبو لە پەیمانە تازەکەدا باسی دابینکردنی مافی نەتەوەیی کورد بکا. ئەمە ناڕەزاییەکی زۆری لە ناو گەلی کوردا خوڵقاند. حکومەتی عیراق بۆ ئەوەی نیاز پاکی خۆی بۆ کورد بسەلمێنێ و جوڵانەوەی ناڕەزایی کورد خاو بکاتەوە، لەو دەوروبەرەدا هەندێ مافی کوردی سەلماند. لەوانە نیوەی رۆژنامەی حەفتەیی کەرکوکی کرد بە کوردی.

حکومەت کە بە مەبەستی خۆی گەیشت و ترسی لە هەراو هوریای کورد نەما، لە زۆری ئەو هەنگاوانەی بە قازانجی کورد نا بوی، پەشیمان بوەوە. بەشی کوردیی رۆژنامەی کەرکوکیش بە پێی ئەو سیاسەتە داخرا.

تا ئیستا ژمارەکانی کەرکوک لە بەر دەسدا نین. لە بەر ئەوە زانیارییەکی ئەوتۆ لە بەر دەسدا نییە. رەنگە باوەڕپێکراوترین سەرچاوە ئەو بیبلۆگرافیایە بێ کە ئێدمۆندس بۆ بڵاوکراوە کوردییەکانی عیراقی دەرکردوە لە نێوان ساڵانی 1920- 1936 و، لە گۆڤاری (کۆمەڵەی شاهانەی ئاسیای ناوەندی) دا بڵاوی کردۆتەوە. ئێدمۆندس لە ریزی بڵاوکراوەکاندا ژمارە 10ی داوەتێ و نوسیویێتی:

"10. کەرکوک (پەخشەی شارەوانی)

کەرکوک، قەبارەی لاپەڕەکانی جیاواز بوە. لە ژ302 ی 2 مایسی 1930 تا ژ 354 ی 29 ی مایسی 1931 بە قەبارەی 711.¾ x ئینچ چاپ کراوە. 53 ژمارەی، بابەتی کوردی ئەوەندەی بابەتی تورکی تێدایە."

### 5. 3. 3. 4. 2. بڵاوکراوەی تر

هیچ بڵاوکراوەیەکی کوردی لێ چاپ نەکراوە.

### 5. 3. 3. 5. لە هەولێر

### 5. 3. 3. 5. 1. روناکی (1935– 1936)

ژ1 ی لە 24 ی 10 ی 1935 دا و

ژ11 کە دوا ژمارەیەتی لە 16 ی 5 ی 1936 دا لە هەولێر دەرچوە.

لە ژ1 دا خۆی بەمجۆرە بە ناسین داوە: "کۆوارێکی هەفتەیی علمی ئیجتیماعی ئەدەبی کوردیە"

مودیری مەسئول محامی محەمەد شیت مستەفا و، سەرنوسەری حسەین حوزنی بوە.

لەم کتێبەدا لێکۆڵینەوەیەکی سەربەخۆ لە سەر (روناکی) نوسراوە.

### 5. 3. 3. 5. 2. بڵاوکراوەی تر

هیچ بڵاوکراوەیەکی کوردی تری لێ چاپ نەکراوە.

## 6. شام

دوای تێشکانی شۆڕشی 1925 ی کوردەکانی تورکیا، حکومەتی تورکیای کەمالی بەوپەڕی توندوتیژییەوە کەوتە سەرکوتکردنی جوڵانەوەی نەتەوەیی کورد. سیاسی و رۆشنبیر و سەرانی عەشیرەتەکانی کورد کەوتنە ژێر گوشارێکی سەختەوە. هەندێکیان لە سێدارە دران، هەندێکیان گیران و، هەندێکیان پەرەوازی وڵاتانی دراوسێ: عیراق، ئێران، سوریا بون.

سوریا ئەوسا لە ژێر ئینتیدابی فەرەنسیدا بو. دەسەڵاتی فەرەنسی چاوپۆشی لە نیشتەجێ بـون و، چـالاکی هەندێ لەم کوردانە ئەکرد. ساڵی 1927 تێکۆشەرانی کوردی تورکیا لە ناو خۆیاندا کەوتنە پێوەندی و بیرکـردنەوە لە ڕێگای ڕزگاری. تا ئەو کاتە تێکۆشەرانی کورد دابەش بوبون بە سەر چەند ڕێکخراوی سیاسیدا.

مەمدوح سەلیم، کە ڕۆشنبیرێکی ناسراو و، خاوەنی گۆڤار و دواتر ڕۆژنامەی تورکی- کوردی (ژین) و، سکرتێری پێشوی پارتی دیمۆکراتی کورد بو، لەگەڵ حیزبی داشـناقی ئەرمەنـی ڕێـک کەوت بـو کە کـورد و ئەرمەن پێکەوە خەبات دژی تورکیای کەمالی بکەن، هاوکاری یەکتری بکەن بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانیان.

لە ئەنجـامی ئەو پێوەنـدی و گفتوگۆیـانەی کوردەکـان لەنـاو خۆیـاندا کردیـان، گەیشـتنە ئەوەی کە نوێنەرانی هەمو ڕێکخراوە سیاسیەکانی کوردستانی تورکیا و، کەسایەتی ناسراو و، سەرانی عەشایەری کورد، کۆنگرەیەک ببەستن بۆ پێکهێنانی یەک پارتی سیاسی کە هەمو تێکۆشەرانی کورد لە تورکیا کۆبکـاتەوە، بـۆ درێژەدان بە خەباتی ڕزگاریخوازی. لە تشرینی دوەمـی 1927 دا لە مـاڵی فاهـان پاپازیـان، کە یەکـێ بـو لە سەرکردەکانی حیزبی داشناقی ئەرمەنی، لە (بحمدون) لە لوبنان کۆبونەوە.

لەم کۆبونەوەیەدا کۆمەڵێ لە کەسایەتیە سیاسیە ناودارەکانی کورد بەشدار بون، لەوانە: جەلادەت عـالی بەدرخان، دکتۆر محەمەد شوکری سەگڤان، مەمدوح سەلیم، حاجۆ ئاغا سـەرۆکی عەشـیرەتی هەڤیرکـان، بـوزان شاهین و مستەفا شاهین لە سەرۆکەکانی عەشیرەتی بەرازان، ئەمین ئەحمەد سـەرۆکی عەشـیرەتی ڕمـان. زۆر لەوانەش کە نەیانتوانی لەم کۆبونەوەیەدا بەشدار بن، وەکو عەلی ڕەزای کوڕی شێخ سـەعید، ئیحسـان نـوری، لەگەڵ ئەوان هاودەنگ بون.

پاش 5 ڕۆژ کۆبونەوە و گفتوگۆ بڕیاریاندا هەمـو ڕێکخراوەکـانی تـر هەڵبوەشـێننەوە و، حیزبێکـی سیاسی بە ناوی (خۆیبون) وە دابمەزرێنن، درێژە بدەن بە شۆڕش تـا دوا سـەربازی تـورک لە کوردسـتان دەرئەکەن. بۆ ئەمەش لە ڕوی سیاسیەوە بڕیاریـاندا پێوەنـدی دۆسـتایەتی لەگەڵ ئێـران و عیـراق و سـوریا دابمەزرێنن، لە ڕوی جەنگیەوە یەکێ دابنـرێ بە سـەرکردەی گشـتی هێـزە چەکـدارەکانی شـۆڕش، ناوەنـدی شۆڕش لە یەکێ لە چیاکانی کوردستاندا دابمەزرێنێ.

سەرکردایەتی خۆیبون، ئیحسان نوری کە ئەفسەرێکی هەڵکەوتو بو، هەڵبـژارد بە سـەرکردەی گشـتی هێزەکانی شۆڕش. ئەویش چیای ئاگری (ئارارات) ی هەڵبژارد بۆ بنکەی سەرکردایەتی شۆڕش.

سەرکردایەتی خۆیبون لەناو خۆیاندا وا ڕێککەوتن کاتێ کە شۆڕش لە ڕۆژهەڵاتی تورکیا هەڵگیرسـا، ئەمانیش لە سنوری سوریا - تورکیاوە پەلامار بدەن و، شۆڕش لە خوارویدا هەڵگیرسێنن.

سەرکردایەتی خۆیبون لە حوزەیرانی 1930 دا لە حەلەب کۆبونەوە بۆ ئەوەی گوشار لە سەر ئـاگری کەم بکەنەوە، کە لەو کاتەدا کەوتبوە بەر هێرشیکی زۆر گەورەی ئۆردوی تـورک. بڕیاریـاندا شـەوی 4/3 ی ئاب لە 6 لاوە دەس پێ بکەن. بـۆ ئەو مەبەسـتە ئاگـاداری دەسـەڵاتی فەرەنسـیەشـیان کـرد. ئەو سـەرۆک عەشیرەتانەی بەڵێنیان بە خۆیبون دابو هاوکارییان بـکەن و بەشـداری ڕاپەڕیـن بـبن، پەشـیمان بـونەوە و، بەڵێنەکەیان بە جێ نەهێنا. لەبەر ئەوە سەرکردەکانی خۆیبون: جەلادەت بەدرخـان، ئەکـرەم و قەدری جەمیـل پاشا، حاجۆ ئاغا، عوسمان سەبری... گەڕانەوە سوریا. دەسـەڵاتی فەرەنسـی بـۆ ئەوەی دوریـان بخـاتەوە لە سنور، بە دەسبەسەری بردنی بۆ دیمەشق.

ئێران و یەکێتی سۆڤێت کە هاوسـنوری چیـای ئـاگری بـون، بـۆ داخسـتنی ڕێگاوبانەکـان هاوکـاری تورکیان کرد. شۆڕشی ئاگری بەرگەی هێرشی تـورکی نەگـرت، تێکشـکا و، سـەرکردەکەی پەنـای بـردە بەر ئێران. تورکەکان بە درنـدانەترین شـێوە کوژانـدیانەوە و کەوتـنە سـزادانی بە کـۆمەڵی خەڵـک، بە هەزاران کەسیان کوشت و، بە سەدان ئاواییان کاول کرد.

خۆییبون وەکو رێکخراوێکی سیاسیی نیمچە نهێنی درێژەی بە کـاری سیاسـی و راگەیانـدن دا. بەڵام ئەو جەزرەبە کوشندەیەی تورک لە جوڵانەوەی کوردی سرەواند بـو، سـەرکردەکانی لەوە نائومێـد کـردن لەو نزیکانەدا بتوانن شۆڕش بکەن، یان بە ئازادی بگەڕێـنەوە بـۆ تورکیـا. لەبەر ئەوە شـامیان کـردە مەڵبەنـدی خۆیان و، بیریان لە رێگایەکی تری خزمەت بە جوڵانەوەی کورد کردەوە کە ئەویش مەیدانی رۆژنامەوانیی و بڵاوکردنەوە بو.

### 6. 1. هاوار

میر جەلادەت بەدرخان، سەرۆکی خۆییبون، ئیمتیازی دەرکردنی هاواری وەرگرت. تێکـڕا 57 ژمـارەی بە سێ قۆناغ، لێ دەرچوە. بەم شێوەیە:

ژ1 ی لە 15 ی 5 ی 1932 تا ژ23 ی لە 25 ی 7 ی 1933 دا،
ژ24 ی لە 1 ی 4 ی 1934 تا ژ26 ی لە 18 ی 8 ی 1935 دا،
ژ27 ی لە 15 ی 4 ی 1941 تا ژ57 ی لە 15 ی 8 ی 1943 دا.

هاوار لە سەرەتادا بە حەرفی عەرەبی و لاتینی چاپ کراوە. دوایی هەموی بوە بە لاتینی.

### 6. 2. بڵاوکراوەی تر

لەپاڵ گۆڤاری هاواردا چەند بڵاوکراوەی تری کوردی لە شام بڵاوکراوەتەوە لە ژێـر نـاوی (کتێبخـانەی هاوار) دا. ئەم کتێبخانەیە وەکو دەزگایەکی پەخش کاری کردوە.

**چەند تێبینییەک:**

1. دەربارەی ژیان

ژیان لەبەر ئەوەی تا ئەو کاتە بە تەمەنترین رۆژنامەی کوردی بوە، تۆمارێکی گرنگی روداوەکـانی ئەو کاتەی کوردستان و عیراق و، باس و بابەتی ئەدەبی، کۆمەڵایەتی، رۆشنبیری، پەروەردەیی، زانستی، کەلەپوری نەتەوەییە...

لێرەدا من خۆم لە قەرەی لێکۆڵینەوەی نەدا، چـونکە مامۆسـتایان رەفیـق سـاڵح و سـدیق سـاڵح کە لە بواری رۆژنامەوانیدا هەردو پسپۆڕی بە توانان، خەریکی ئامادەکردن و لێکۆڵینەوەین.

بە هیوای تەواوکردنی کارەکانیان.

2. بیبلۆگرافیای ئەدمۆنس:

A BIBLIOGRAPHY OF SOUTHERN KURDISH, 1920 - 1936, BY C. J. EDMONDS, Journal of the Royal Central Asian Society, VOL. XXIV, JULY, 1937, PART III

3. دەربارەی خۆییبون و شۆڕشی ئاگری بڕوانە:

3. 1. محمد ملا احمد، جمعية خويبون و العلاقات الكردية–_ الارمنية، كاوا للنشر والتوزيع. اربيل، 2000.

3. 2. کۆنێ رەش، جمعية خويبون 1927 ووقائع ثورات ارارات 1930، تقديم ومراجعة د.عبـدالفتاح البوتاني، مؤسسه موكرياني للطباعة والنشر، مطبعة خەبات دهوک.

3. 3. روهات الاكوم، خويبون وثوره اكرى، مراجعة شكور مصطفى، منشورات كاوا، اربيل، 1999

3. 4. كاوه بيات، شورش كردهاى تركيه و تاثير ان بر روابـط خـارجى ايـران 1310-1307 ش، تهران، نشر تاريخ ايران، 1374.

4. دەربارەی هاوار

4. 1. هاوار لە سوید و هەولێر سەرلەنوێ چاپ کراوەتەوە.

4. 2. ڕۆژنامەڤانی، لە ژ5 ی کۆتایی ئابی 2001 دا، دۆسیەیەکی تایبەت بە (هاوار) ی بڵاوکردۆتەوە کە چەندین لێکۆڵینەوەی لەسەر هاوار تێدایە. بۆیە بە پێویستم نەزانـی هـیچ لێکـۆڵینەوەیەکی زیـادی لەسـەر بنوسم.

## 7. کاتنامە کوردییەکان: لێکۆڵینەوەی تایبەتی

7. 1. ژیانەوە

بو همو شتیك مخابرات بناوی
چاپخانەوە اكری

اعلانات
بە دیریك ٣ انە،دە سیتریت

تاریخ انتشار
١٨ اغستوس ١٩٢٤ سالیانی
نسخەی بە آنەیكە

# ژیانەوە

ام غزتەیە غزتەیكی حكومتیە
هفتە جاریك دردچی

بدل ابونە
بە ٣ مانك روپیە و نیویك
بە شش مانك ٣ روپیە
بە سالیكی شش روپیە یە

لە ٣ مانك كمتر ابونە قید ناكری

بو خارج اجرت پوسطە
علاوە دەكری
نسخەی بە آنەیكە

سال ١    ژمارە ١    ( دوشنبە )    ١٧ محرم ١٣٤٣    ١٨ اغستوس ١٩٢٤


لبر بعضی خصوصات ناوی غزتەكان تبدیل كرد بە مناسبت احوال و ماجرایك كە بسری هاتوە عنوان « ژیانەوە » مان بمناسب زانی چونكە حقیقتاً انتشار م‌چارە ژیانەوەیە . امید اكین كە لەلایی همو كسیكەوە مظهر قبول بی و انشاالله و تعالی پی و قدم بو همو افراد ام ملتە بە خیر و سعادت ابی .

---

## ژیانەوە

چاو بكەنەوە بروانن ام ملتە مظلومە ام چندە زویە ام توزە كوردەچی دی و چی بە سرهات و توشی چی بو امە اكر زریف ورد بكریتەوە هموی لە تی نكیشتن و نەزانینەوە بو هموی لە روی اوەوە بو كە اوی ایشی اكرد هر هول و تقەلای نفسی خوی بو هر وای نفسی نفسی بو كس بو كسی تر هولیكی نەادا آخری نتیجة امە كیشتە درجەیك كەوكو درختی و كو كیایك كە بی آو بمی نی تەوە و هالاوی كرم بسریا بچی هموی هل پروزی هل قرچی خریك وشك بون بی وامان لی هاتوە . ایستا كەوا خوا رحمی كرد . دروی خیرمان لی كراوەتەوە و ریكای روناكان پی نشان دراوە اجار فرصتە وخت بە قیمتە مسا قوربانە نورة هول و تقلایە وختی تی كوشینە بهمو لایك هول بدەین ام درختە ام كیایە هل پروزاوە بژینتەوە زندو بیتەوە لمودوا هر كسە بە قدر زانین و توانین خوی اكر هول ندا و تی نەكوشی لەدست اروا،لە كیس اچی دیسانەوە پارچە پارچە مكونەوە هر یكە شوین كلاویكی لار نكەوی اكر ورد بینەوە تی كیشتین كەدنیا چە باسە ام قصە پر و پوچانە ام خیالانە همو خاوە همو قوربسری و مال ویرانیە همو بی نتیجە یە لەآخریدا بەرە بەرەوای لی یت بجاری همو محو ابیتەوە .

اجارەیش عرضتان اكم بو خاطری خوا همو چاومان هیە تجربەمان دیوە پس شوین كلاوی لار بكوین همو یك بكرین و چیمان بو چاكە هول بو اوە بدین دیسانەوە عرضتان اكم چیمان بو چاكە بو اوە هول بدەین بجاری تی بكوشین واز لبر و اوبر بهینین آوی خرایە بومان لە خومانی دور بخینەوە و خومانی لی لادین بە همو هیز و قوت خومان بلاماد شتی چاك بدەین بلكو انشاالله بژینەوە سر بكوینەوە و زندو بینەوە .

---

هر كس داواكر آبونەیە لطفاً بومان بنوسی تاكو قید بكری هرنوعە مقالەیك كە لە لایی هر كسیكەوەبی

# ژيانه‌وه

بوهمو شتيك مخابرات بنارى
اداره‌خانه‌وه اكرى

اعلانات
به‌ ديريك ٦ انه نه‌نوسريت

تأريخ انتشار
۱۸ اغستوس ۱۹۲٤ سالانى
نسخه‌ى به آنه‌يكه

ام غزته‌يه غزته‌يكى سياسى ، ادبى ، اجتماعى‌يه
هفته جاريك درده‌چى

بدل ابونه
به ۳ مانك روپيه و نيو يك
به شش مانك ۳ روپيه
به ساليكى شش روپيه يه
له ۳ مانك كمتر ابونه قيد ناكرى

بو دره‌وه بدل ابونه
حو روپيه و نيوه
نسخه‌ى به آنه‌يكه

سال ۲ ژماره ٥٦ ( پينجشنبه ) ۲۸ جماذى الاخر ۱۳٤٤ ۱٤ كانون ثانى ۱۹۲٦


تكايكى — تابيتى —

معلوم همو لايكه « ژيانه‌وه » له‌پيش همو شتيكدا خادم افكار ملت كورد ، و مفكورهٔ كوردايتى‌يه. له‌رى ام امله دا و بو كيشتن بم غايه مقدسه تصور ناكم له‌هيچ مانعه‌يك صل بكا ، هرچى وظيفه‌يك كه ترتب بكاته سه‌رى به كمال خواهش اجراى اكا و كرديتى ، خذمتى همو كورديكى كردوه بو بلاو كردنه‌وه و نشرى اودنكانه‌ى كه‌به‌جدى و صميمى له‌اعماق قلوب كورده‌كانه‌وه بوترق و پيشكرتنمان صدور كردوه . به كمال افتخار وسائط و دلالتى كردوه ، حاصلى « ژيانه‌وه » كورده ، بو كورد ورقپاره‌يكى به قيمت ، بااهميت ، و غزته‌يكى بى‌هاوتايه خدمات مسبوقه‌ى له‌نظر همومان‌دا شكرايه ، بناء عليه بو همو كورديكى حقيقى و جدى لازمه و حتى ئتوانم ليم واجبه كه به دل و به كيان خذمتى بكا ، و بو رواج و دوامى هرچى له‌دستدابى له كردنى قصور نكا .

جا بهم مقدمه‌يه‌وه عرض همو محب ژيانه‌وه و كرياراني محترمى اكم كه بو اوه‌ى ام دليله مان بمينى و بتوانى خوى بژيينى معاونتى بفرمون كه معاونته‌كه‌يش عبارته له‌و سالانه‌يه كه‌بوى تخصيص كراوه و اوه‌يش مقداريكى زور جزئى تشكيل اكا . اكر ارزو بكرى همو‌كس اتوانى به‌بى كرانى اوحقه بدانى . بناء‌عليه‌اوه‌ى كه خوى به‌قرضداوى ژيانه‌وه ازانى‌وعرضى‌كراوه به‌بى وقت فوتاندن به‌ناوى اداره‌خانه‌وه روانه‌ى بفرموى . بو ژيانه‌وه به معاونت عداكرى !...

---

خبرات هلبجه

« حفله يكى تبريكيه له مژدهٔ قرار عصبة الامم له خصوص محافظه كردن حدود ولايت موصل وحقوق كورد »

دوينى كه ۱۸-۲۱-۲٥ روژجمعه بو ، ناكاه له آفاق البجه‌دا غلغله يكى سرور هلسا مژده‌يكى خوش نباو هو اى معطرى كوردستانا ، بواسطهٔ تلغراف بى‌تله‌وه شرفورودى كرد . ام مژده‌يه دوا يك بو كه حياتيكى تازه وابدى، بخشى به‌عموم عراق ، و بالخاصه به ملت كورد . أم ملته مظلومه ، كه‌هتا ايستا به‌دست ظلم‌وتغلب توركه‌كانه‌وه أى‌نالان ، له‌پريكا خبريكى و اخوش اثرى بوبى و ابدى نجات درابى له‌دست تورك وحقوقى‌محافظه كرابى ، وله‌و غائله عظيمه كه سبب فوتاندنى مادى و معنوى ملت‌بو خلاص بوبى ، عجبا مژده له‌مه خوش‌تر مبشرتر ايت ؟

## 1. ژیانەوە

ئەگەرچی هێشتا چارەنوسی ولایەتی موسڵ لەناو کۆمەڵەی گەلاندا بە لایەکدا نەکەوتبو، کۆمەڵەی گەلان، بۆ بە لاداخستنی ئەم کێشەیە، بە تەمای ناردنی دەستەیەکی لێکۆڵینەوە بو بۆ ناوچەکە. بریتانیا بڕیاری دابو داوودەزگای کوردی بپێچێتەوە و سلێمانی‌یش بکا بە لیوایەکی دەوڵەتی تازە دامەزراوی عیراقی ژێر سایەی عەرشی هاشمی. جەیشی تازە دامەزراوی عیراق بە یارمەتی هێزی ئاسمانیی بریتانیا پەلاماری سلێمانی، پایتەختی حکومەتی کوردستانی جنوبی دا. دوای چەندین جار بۆردومان، مەلیک مەحمود و هێزەکەی بە یەکجاری سلێمانی‌یان چۆڵ کرد. هێزی عیراقی و ئەفسەرانی ئینگلیز ڕۆژی 18 ی تەموزی 1924 هاتنە سلێمانیەوە. لە دەشتی کانی ئاسکان بارەگای (فەرمانـدەیی ناوچەی ڕۆژهەلات: آمریة المنطقة الشرقیة) یان دامەزراند. کەوتنە ڕێکخستنەوەی کاروباری بەڕێوەبەرایەتی ناوچەکە و، سلێمانی کرا بە لیوایەکی. دەزگای بەڕێوەبەرایەتی تازەی سلێمانی کە لە ژێر چاودێری موفەتیشی ئیداری ئینگلیزیدا کاری ئەکرد، بڕیاری بڵاوکردنەوەی حەفتەنامەی (ژیانەوە) ی دا.

لە ژێر ناوی ڕۆژنامەکەدا نوسراوە:

"ئەم غەزەتەیە غەزەتەیەکی حکومەتی‌یە، هەفتەی جارێک دەردەچێ"

بەڵام لە ژ19 ەوە نوسراوە:

"غەزەتەیەکی سیاسی، ئەدەبی، ئیجتیماعی‌یە، هەفتەی دو جار دەردەچێ"

ژ1 ی لە 18 ی ئابی 1924 دا و

ژ56 ی کە دوا ژمارەیەتی، لە 14 ی کانونی دوەمی 1926 دا دەرچوە. ئیتر ناوی ڕۆژنامەکە گۆڕاوە بۆ ژیان.

سەیر ئەوەیە ژیانەوە خۆی بە درێژەپێدانی ڕۆژنامەکانی پێش خۆی داناوە. لە بەشی سەرەوەی یەکەم ستونی یەکەم لاپەڕەی یەکەم ژمارەیدا نوسیویێتی: "لە بەر بەعزێ خصوصات ناوی غەزەتەکەمان تەبدیل کرد بە موناسەبەتی ئەحوال و ماجەرایەک کە بە سەری هاتوە عینوانی (ژیانەوە) مان بە موناسیب زانی چونکە حەقیقەتەن ئینتیشاری ئەم جارە ژیانەوەیە. ئومێد ئەکەین لە لایەنی هەمو کەسێکەوە مەزهەری قبوڵ بێ و ئینشائەڵا و تەعالا پێ و قدومی بۆ هەمو ئەفرادی ئەم میلەتە بە خێر و سەعادەت ئەبێ."

**1. 1. هۆی بڵاوکردنەوەی**

ژیانەوە، حکومەتی سلێمانی کە ئینگلیز ڕاستەوخۆ سەرپەرشتی کردوە، دەری کردوە. ئەرکی سیاسـی ژیانەوە ئەوە بو کە کورد حاڵی بکا، هیچ قەوارەیەکی سیاسی، بەڕێوەبەرایەتی یـا قـانونی تـایبەتی‌یـان پـێ ڕەوا نابینرێ، بەڵکو بەشێک ئەبن لە عیراق و، ئەبێ بین بە هاووڵاتی عیراقی.

**1. 2. سەرنوسەر و نوسەرەکانی**

لە ژ28 ی 26 ی حوزەیرانی 1925 دا لە ژێر سەرناوی: (بۆ کرپارە موحتەرەمەکانمان) نوسیوێتی:

"ئەم غەزەتەیە، کە هەتا ئێستا لە بەر بەعزێ ئەسباب و ئەحوال مەوانیع بە ڕێکوپێکی دەرنەئەچـو و، لە بڵاوبونەوەدا درەنگ و زویی بە سەر ئەهات و، دڵی کرپارەکانیش لەم ئەحواڵانە عاجز و سەغڵەت ئەبو، هەمـو لە بەر ئەوە بو کە ئیدارەیەکی مونتەزەمی نەبو وە لە ژێر ئیدارە و نەزارەتی یەکێک دا بە ڕێکـی دەرنەئەچـو. لەبەر ئەوە توشی ئەم ئەحواڵانە ئەبو. فەقەت وا لە ئیعتیباری ئەم ژمارەیەوە ئیـدارەکەی درایە دەسـت جەمیـل صائیب ئەفەندی. ئەویش مەغرور بە لوتف و فیداکاری هەمو کوردەواریەک ئیدارەی غەزەتەکەی قبوڵ کـردوە. ئەم غەزەتەیە، ئەگەر تەقدیری بکەین، پێ بزانین بۆ رابردو ئەو دوای هەموو کورد و کوردسـتان شـتێکی زۆر بە نرخ و بەقیمەتە. وە واسیتەیەکی قازانج و باشە خزمەتی عیلم و مەعریفەت ئەکات، بۆ تیجارەت و صـنعەتی ئەم کوردەواریە هەوڵ ئەدات، ڕێگەی گەورەی بەرزیمان پـێ نیشـان ئەدات، تەرجومـانی هەمـو ئەحواڵێکمـانە، لەبەرئەوە لە هەمو کوردێک رجا ئەکەین کە هەر کەس بە قەدری ئیمکان و تـاقەت یـارمەتی غەزەتەکە بـدات و، غەزەتەکەش بتوانێ خۆی بژێنێ. غەزەتەکەمان بۆ هەمـو مەقـالەیەک کە عیلمـی، فەنـی، ئیجتیمـاعی، ئەخلاقـی، ئەدەبی، ئیقتیصادی، صیحی بێ یەعنی تۆزێ بۆنی خزمەتی وڵات و کوردەوارییەکەی لێبێت بە مەمنونی قبـوڵ و چاپی ئەکات رجامان وایە لە تەرەفی هەمو کوردێکەوە غەزەتەکەمـان تەقـدیس و تەقـدیر بکـرێ و یـارمەتی بدرێ ئیتر تەشەبوس لە ئێمە و تەوفیقات لە خواوەیە."

لە ژ37 ی 27 ی ئاغستۆسی 1925 دا، جەمیل سائیب لە ژێر سەرناوی (مەعزەرەت) دا نوسیوێتی:

"لە بەر ئەمەی ئەحواڵی صحییەم موسـاعید نـیە مەعەلئەسـەف لەمەودوا خزمەتـی موبـارەکەی غەزەتەی ژیانەوەم پێ بە جێ ناهێنرێ. لەم خصوصەوە زۆر موتەئەسیر و مەحزونم کە تەرکی ئەم وەزیـفە موقەدەسـەیە ئەکەم. خوا بکا ئەم غەزەتەیەمان هەربژی چونکە ئومێدی زۆرمان بەم غەزەتەیە هەیە. جەمیل صائیب."

لە ژ38 ی 3 ی ئەیلولی 1925 دا م. ئەدیب نوسیوێتی:

"لە بەر موساعید نەبونی ئەحـواڵی صـحیە دەسـت کێشـانەوەی جەنـابی جەمیـل صـائیب ئەفەنـدی لە ئوموری تەحریریەی ژیانەوە لە غەزەتەی هەفتەی ڕابوردودا بەیان کرا بـو. زۆر موتەئەسـیف بـوین. جـددەن شایانی تەقدیر و لایەقی سەنایە کە موما ئیلەیهی لەم مودەتەدا بە کەمالی ئیفتیخار و لە دائیرەی ئنتیزام دا ئەم وەزیفە موقەدەسە میلـیەی بە جـێ هێنـاوە. ئـێمە لە وەتەن و میللیەتـپەروەریی جـدییەی ئەم زاتە مـوحتەرەمە ئەمینین. بینائەن عەلەیهی موەفەقیەت و ئیعادەی صیحەت و عافییەتی لە خوا تەمەننا ئەکەین.

"بۆ ئەمەی ژیانەوە لە ئەنزاری خوێندەوارانی کیرام گوم نەبێ و دائیمەن لە ساحەی ئینتیشاردا بـێ و، ژیانەوەیەک بێ ڕۆحی میللەت بژێنێتەوە و، خزمەتـی ئامـال و ئەفکـاری میللیەمـان بکـا مەغـرورەن بە لـوتفی قاریئینی موحتەرەمەوە ئوموری تەحریرەکەمان دەرعوهدە گرت. ئومێد ئەکەین وەکو چۆن تا ئێستا حەفـتە بە حەفتە مونتەزەمەن بڵاوکراوەتەوە لەمەودوایش حەفتە بوێر نەکات و، لە دەرج و نەشری حەوادیس و خەبەراتی خۆش و موافیق قسور نەکرێ. رجا ئەکەین کە ئەزکیا و پێگەیشـتوانی وەتەن بە مەقـالاتی موفیـدەی خۆیـان ژیانەوەمان برازێننەوە و فەرامۆشی نەکەن. غایەمان پێشکەوتنە... تەوفیق ڕەفیق بێ. م. ئەدیب ".

م. ئەدیب، محەمەد ئەدیب عەبدولعەزیزە کە لەو کاتەدا لە چاپخانەکەی شارەوانی‌دا پیت ڕێکخەر بوە، بەڵام لە ئیعدادیەی عوسمانی خوێندویەتی و خوێندەوارێکی بە توانا بوە. م. ئەدیب لە بەڕێوەبردنی ڕۆژنامەی ژیانەوەدا تا دوا ژمارەی جێگەی جەمیل سائیبی گرتۆتەوە.

ئەم ڕۆژنامەیە ئەگەرچی حکومەت بۆ مەبەستێکی سیاسی دیاریکراو دەری کردوە، بەڵام هەڵبژاردەی ڕۆشنبیرانی کورد لە سلێمانی ئەم هەلەیان بە چاکترین شێوە قۆستۆتەوە بۆ دەربڕینی بیروبۆچونەکانی خۆیان و، لاپەڕەکانی ڕۆژنامەکەیان کردۆتە مەیدانی بڵاوکردنەوەی هۆشی سیاسی و، بانگەشەی یەکگرتن و خوێندەواری و، پێشخستنی ژیانی ئەدەبی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری. جگە لە جەمیل سائیب و محەمەد ئەدیب، چەندین کەسی کە بەشداری نوسینەکانی بون، لەوانە: م. نوری (شێخ نوری شێخ ساڵح)، مەحمود جەودەت، ڕەشید نەجیب، عەلی عیرفان، مستەفا شەوقی، زێوەر، فائیق زێوەر، کەریم سەعید، سەعید فەوزی، عەبدولواحید مەجید (ع. و. نوری). چەند کەسێکی تر بە ناوی عەبدولمەجید، عیزەت، ڕەواندزی، حەسەن کوردستانی، ئەمین کوردی کە ئێستا ناناسرێنەوە.

مستەفا سائیب، برای جەمیل سائیب، ئەگەرچی ناوی بە ئاشکرا بە هیچ وتارێکەوە نیە، بەڵام وەکو لە بەرگێکی ژیانەوەدا بە خەتی خۆی هەندێ تێبینی لەسەر تۆمار کردوە، ئەویش یەکێ بوە لەوانەی چەندین وتاری تێدا نوسیوە. هەروەها دەیان شاعیری ئەو سەردەمە.

### 1. 3. سەرچاوەی دەرامەتی

ژیانەوە، وەکو لە ژێر ناوەکەی‌دا نوسراوە، ڕۆژنامەیەکی حکومەتی بوە، بۆ مەبەستێکی سیاسی دەرکراوە و لە چاپخانەی حکومەت، کە دوایی دراوە بە شارەوانی، چاپ کراوە. نوسەرەکان و پیت ڕێکخەرەکانی فەرمانبەری حکومەت بون و، لە لایەن حکومەتەوە دانراون، لە بەر ئەوە ڕۆژنامەکە بە تەنگ قازانجەوە نەبوە. لەگەڵ ئەوەیش‌دا هەوڵی داوە بە پارەی دو سەرچاوەی ئابونە و ئیعلان مەسرەفی خۆی دابین بکات.

ئابونە: لە لای چەپی سەروی لاپەڕەی یەکەمی نوسراوە: "بەدەلی ئابونە: بە 3 مانگ ڕوپیەو نیوێک، بە شەش مانگ 3 ڕوپیە، بە ساڵێکی شەش ڕوپیەیە. لە 3 مانگ کەمتر ئابونە قەید ناکرێ. بۆ خاریج ئوجرەتی پۆستەی عەلاوە دەکرێ. نوسخەی بە ئانەیەکە."

ئەوانەی ئابونە بون لە ژیانەوە بە زۆری فەرمانبەرەکانی حکومەت، تاجیرەکان، سەرانی عەشایەر بون. ئەمانەیش بە دەگمەن تێیاندا بوە بە ئارەزوی خۆی بوبێ بە ئابونە، بەڵکو هەمویان لەسەر داوای گەورە کاربەدەستانی سلێمانی بون بە ئابونە. زۆر جار ئابونەکان خۆیان لە دانی پارەی بەشداری بواردوە، دوایان خستوە یان هەر نەیان داوە. ڕۆژنامەکە داوای ئابونەکەی لێ کردون.

تیراژی ڕۆژنامەکە کەم بوە، هەرگیز لە هەزار دانە، بگرە لە چەند سەد دانەیەک، تێ نەپەڕیوە. دوکانی ڕۆژنامەفرۆشی لەو سەردەمەدا ئەگەر هەیشبوبێ زۆر کەم بوە.

ئیعلانات: لە لای ڕاستی سەروی لاپەڕەی یەکەمی نوسراوە: "ئیعلانات: بە دێڕێک 3 ئانە دەسێنرێت." نرخی یەک دانەی ڕۆژنامەکە 1 ئانە بوە، بەڵام نرخی 1 دێڕ ئیعلان 3 ئانە، واتە 3 قاتی نرخی ڕۆژنامەکە بوە.

ئیعلانەکان هەمویان هی داوودەزگا حکومەتیەکان بون، بە تایبەتی تاپۆ، دادگا، فەرماندەیی جەنگی ناوچەی ڕۆژهەڵات. کەم وا بوە ئیعلانێکی ئەهلی تێدا بڵاو کرابێتەوە. بۆ نمونە هەندێکیان لێرەدا ئەنوسمەوە.

لە ژ21 ی 19 ی مارتی 1925 دا ئەم ئیعلانەی بڵاوکردۆتەوە:

"ئیعلان: بۆ ئیعاشەی عەسکەر و ئالیکی حەیوانات کە لە مەنتیقەی شەرقیە لە سلێمانی‌دا مەوجودە لە ئیعتیباری ئەوەلی مانگی نیسانەوە هەتاکو شەش مانگ موتەعەهید پێویستە، بە ئەمری وەزارەتی حەربیەی حکومەتی عیراق هەر کەس بۆ ئەم تەعەهودە تالبە لە ئیعتیباری ئەمڕۆوە موراجەعەت بە دائیرەی عەسکەری بکا لە سلێمانی و شەرائیتی تەعەهود تێ بگا. وە موناقەسات دەبێ هەتاکو ڕۆژی بیست و شەشەمی مانگی مارت تەواو ببێت. هەر کەس تالبە حالەن موراجەعەت بە جیهەتی عەسکەریە بکات. بۆ زانینی هەمو کەس ئیعلان دەکرێ.

**ئامێری مەنتیقەی شەرقیە**
**عەلی ڕەزا بەگ ئەلعەسکەری"**

### ئیعلانی دادگا

لە ژ24 ی 9 ی نیسانی 1925 دا نوسراوە:

"ئیعلان: خانویە کە واقیع لە مەحلەی گۆیژە کە بە تاپۆ ملکی ئەمین کوڕی کەریم خەڵقی مەحلەی مەزکورەیە و 3 تەرەفی بە ڕێگا و تەرەفێکی بە خانوی ئەحمەدە کەچەڵ مەحدودە و موشتەمەلە بە فەوقانی هەیوانێک و پشت هەیوانێک و سێدەرییەک و گەنجینەیەک و تەحتانی دو ئۆتە و سەرتەنور و داڵان و حەوشەیەک. مەحکەمەی شەرعیەی سلێمانی"

لە ژ48 ی 12 ی تشرینی سانی 1925 دا نوسراوە:

"ئیعلان: بۆ ئیزالەی شیوعی ئەو خانوە کە لە مەحەلەی گۆیژە واقیعە و لە تەرەف مودەعی ئەحمەد کوڕی مارف حاجی سەعیدەوە لە عەلەیهی وارسانی مەعروف مەلیک ئیقامەی دەعوا کراوە لە وارسانی مەرقوم حەمە کوڕی عارف لەبەر ئەمە کە تەحەقوقی کرد محەلی ئیقامەتی مەجهولە لە تاریخی ئەم ئیعلانەوە هەتاوەکو 6 ی کانونی ئەوەلی 925 ڕۆژی یەکشەنبە ئەگەر مەرقوم لە مەحکەمەی صولحی سلێمانی ئیسپاتی وجود نەکات محاکەمە لە حەقی بە غیابی ئیجرا ئەکرێ و لەبەر ئەمە ئەم ئیعلانە واقیع بو.

9 تشرینی سانی 925

مەحکەمەی صولحی سلێمانی"

لە ژ4 ی 15 ی ئەیلولی 1924 دا نوسراوە:

"ئیعلان: دیوانی مەرحوم مەحوی شاعیری مەشهور لە ئیدارەی ژیانەوە مەوجودە نوسخەی بە 1 ڕوپیە ئەفرۆشرێ. ژیانەوە ".

پێئەچێ دیوانەکەی مەحوی کڕیاری کەم بوبێ، چونکە ئەم ئیعلانە لە چەندین ژمارەدا دوبارە بۆتەوە.

ئیعلانێکی تر:

"هەر کەسێ تالبە بە ئابونەی غەزەتەی (نجمە) ی کەرکوک قەید بکرێ لوتفەن موراجەعەت بە ئیدارەی ژیانەوە بکات. ژیانەوە"

### ئیعلانی ئەهلی

لە ژ3 ی 1 ی ئەیلولی 1924 دا نوسراوە:

"ئیعلان: پولی مالیە، کاغەزی عەرزوحاڵ و غەزەتەی ژیانەوە ئەفرۆشم. لە قەیسەری نەقیب عەتار حەمە ئاغا"

## 2. لایەنی سیاسی

ژیانەوە لە پلەی یەکەمدا بۆ مەبەستی سیاسی دەرکراوە، لەبەر ئەوە ئەم لایەنەی زاڵە بەسەر لایەنەکانی تریدا. ژیانەوە سەرچاوەیەکی گرنگی دەستی یەکەمی روداوەکانی ئەو سەردەمەی کوردستانی جنوبی، بە تایبەتی ناوچەی سلێمانییە. چەندین بەڵگە و چەندین هەواڵی گرنگی تێدا بڵاو کراوەتەوە کە یارمەتی مێژونوس ئەدەن بۆ رونکردنەوەی هەوڵی تێکۆشەرانی کورد و، سیاسەتی ئینگلیزی بەرامبەر پرسی کورد. لێرەدا بۆ نمونە بە پۆلێنکراوی هەندێکیان ئەنوسمەوە.

### 2. 1. داگیر کردن و دەس بە سەراگرتنی سلێمانی

ژیانەوە، لە دوای داگیرکردنی سلێمانی، هەواڵ لە هاتنی گەورە کاربەدەستانی عیراق و بریتانی ئەدا و، چەند دەنگوباس و ریپۆرتاجێکی لەو بارەیەوە بڵاوکردۆتەوە.

لە ژ4 ی رۆژی 15 ی ئەیلولی 1924 دا ئەم هەواڵەی بڵاوکردۆتەوە: (تەشریف و عەودەت) ی "فەخامەتی وەزیری داخلیەی عیراق عەبدولموحسین سەعدون بەگ و حەزرەتی میجەر یولی موستەشاری داخلیە، رۆژی پێنجشەمە 11 ی ئەیلول، بە تەیارە تەشریفیان هاتە سلێمانی و، رۆژی دوایی بە ئۆتۆمۆبیل عەودەتیان فەرموەوە."

لە ژ6 ی رۆژی 3 ی تشرینی یەکەمی 1924 دا ریپۆرتاجێکی لە سەر (تەشریف) ی وەزیری هێزی ئاسمانیی بریتانی، بە بۆنەی داگیر کردنی سلێمانییەوە بەم جۆرە نوسیوە:

"رۆژی دوشەنبە 29 ی ئەیلول، فەخامەتی وەزیری تەیرانی بریتانیا لۆرد تۆمسن و بەعزێک زەواتی موحتەرەمە بە تەیارە تەشریفیان هات، لە پێش تەشریفی مومائیلەیهیمدا عمومی رونەسای عەشایەر و ئەشراف و مەئمورین و توجاری مەملەکەت لە لایەکەوە، لە لایەکی ترەوە قسمێک پۆلیسی سواری و قیتعەیەکی عەسکەرییەی پیادە صەفبەستەی ئیحتیرام و حازری ئیحتیفال بون. لە پشت صەفی ئەم زەواتەوە ئەهالی بە کەمالی سرور و دڵخۆشی گرد بوبونەوە. فەخامەتی لۆرد زۆر بە شاشەت سەلامی لە هەمو خەڵقەکە کرد و بە سواری تەشریفی هاتە شار. دوبارە لە بەر دەرگای سەرا ئەهلی شار بە سرورێکی فەوق ئەل عادە ئیستیقبال و بە خێرهاتنیان کرد. دەرگای سەرا بە داری گوڵ و رێحانە و ئەنواعی لقە درەختی میوەدار تەزیین و، هەر لە دەرگای خوارەوە بە داڵان و هەیوان و ژورەکانەوە، سەراپا بە فەرش نەفریش کرا بو. فەخامەتی وەزیر بە ناو ئەم هەمو سرور و خۆشئامەدیەدا تەشریفی سەرکەوتە سەرێ و، دەستە دەستە رونەسا و ئەشراف و مەئمورین و توجاری قبوڵ کرد و، فەوق ئەل عادە بە تەوازع و نەزاکەت بە نیسبەت مەسلەک و ئەفکاریانەوە لەگەڵ هەمویان گفتوگۆی کرد و دەستی هەمویانی گوشی. لە پاش چەند سەعاتێک ئیستراحەت فەخامەتی وەزیر دیسان بە ناو خواحافیزی هەمو ئەهالیدا تەشریفی بە تەیارە حەرەکەتی فەرمو.

"لە رونەسای پشدەر جەنابی بابەکر ئاغای سەلیم ئاغا و بایز ئاغا، بابەکر ئاغای هۆمەر ئاغا، عەبدوڵڵا ئاغای عەزیزئاغا، رەسوڵ ئاغای پیرۆت ئاغا، ئەحمەد ئاغای جوامێر ئاغا، خزر ئاغای بابەکر ئاغا و ئەمین بەگ و، لە رونەسای مەنگوڕ سلێمان ئاغا و حەسەن ئاغا و، لە بەگزادەکانی جاف عەبدولکەریم بەگی رەئیسی جاف و لە ئەشراف و توجاری مەملەکەت حاجی سەعید ئاغا و حاجی مەلا محێدین، حاجی ئاغا فەتحوڵڵا، محەمەد ئاغای عەبدولرەحمان ئاغا، ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ، سەید عەبدوڵڵا ئەفەندی حاجی سەید حەسەن، ئەحمەد بەگی فەتاح بەگ، حاجی ئەحمەدی حاجی کەریم و حاجی ئەمین و، عمومی رونەسای دەوائیر و مەئمورین لە مەراسیمی ئیستیقبال و ئیحتیفال دا حازر بون.

"لە ئەسنای مەراسیمی ئیستیقبال و ئیحتیفال دا فەعالییەت و هیمەتی دائیرەی پۆلیس و دائیرەی بەلەدیە زۆر موجیبی شوکران و مەمنونییەت بو.

"شەویّ بە شەرەفی ئەم تەشریفە لە جێگای تەیارەوە شەش حەوت فیشەکی هەوایی بە ئاسماندا هاوێژرا، وەکو ئەستێرە لە ئاسمانا ئەکشا، ئەهالی ئەو شەوە عادەتەن لایان وەکو جەژن وابو."

لە ژ9 ی ڕۆژی 31 ی تشرینی دوەمی 1924 دا ڕیپۆرتاجێکی تری دەربارەی (قدوم) ی مەندوبی سامی، بەمجۆرە نوسیوە:

"حەزرەتی ئەشرەف مەندوب ئەل سامی ڕۆژی یەکشەمە 16 ی تشرینی سانی بە تەیارە تەشریفی هێنایە سلێمانی، لە وەقتی مواصەلەتیدا عمومی ئەشراف و موتەحەیزان و توجار و مەئمورین و قیتعەیەکی گەورەی عەسکەر و قیتعەیەک پۆلیسی سواری و پیادە و عمومی کەسەبە و ئەصناف و ئەهالی لە جێگای تەیارە صەفبەستەی ئیستیقبال و ئیحتیرام بون، فەخامەتی مەندوب بە ناو پۆلی ئەهالیدا و بە ناو هەمو سرور و کەیفخۆشی ئەهالیدا تەشریفی بە ئۆتۆمۆبیل هاتە دائیرە. لە بەردەرگای دائیرەکەدا قەڵەباڵغیەکی تر زۆر بە گەرم بە خێر هاتنیان کرد و تەلەبەی مەکتەب بە شیعرێکی زۆر خۆش عەرزی خۆشئامەدییان کرد.

"فەخامەتی مەندوب، لە پاش قەدەرێ ئیسراحەت، بە پێی تەرتیبی خوارەوە زەواتی موحتەرەمەی قبوڵ فەرمو بۆ دیدەنی:

"ئەشراف: جەنابی محەمەد ئاغای عەبدولرەحمان ئاغا، جەنابی ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ، جەنابی عیزەت بەگی عوسمان پاشا، جەنابی ئەحمەد بەگی فەتاح بەگ، جەنابی عەبدولرەحمانی ئاغای ئەحمەد پاشا، جەنابی سەید عەبدوڵڵا ئەفەندی حاجی سەید حەسەن، جەنابی غەفور ئاغا، جەنابی محەمەد بەگی قادر پاشا.

"توجار: جەنابی حاجی ئاغا فەتحوڵڵا، جەنابی حاجی مەلا محێدین، جەنابی حاجی ئیبراهیم ئاغا، جەنابی حاجی ساڵحی خەفاف، جەنابی حاجی ئەمینی کاکەحەمە، جەنابی مەلا سەعیدی شاڵی، جەنابی حاجی قادری خەفاف.

"مەئمورین: عمومی ڕوئەسای دەوائیر، عەسکەرییە.

"عەسکەرییە: جەنابی قوماندانی عەسکەرییە و عمومی ئەرکان و ڕوئەسای عەسکەرییە.

"لە دواییدا جەنابی ئەحمەد موختار بەگ قائیمقامی هەڵەبجە، حەمە سەعید بەگ مودیری خورماڵ و، ئەحمەد بەگی ڕیشێن و، ئەحمەد بەگی حەمە ساڵح بەگ و، سلێمان خان مدیری تانجەرۆ و، لە دوای ئەوان جەنابی سەید ئەحمەدی حاجی مامەند و، شێخ نەجیب و، شێخ ڕەزا و، شێخ محەمەد و، شێخ عەلی، نائیلی زیارەتی فەخامەتی مەندوب بون.

"حەزرەتی ئەشرەف دەستە دەستە زەواتی موحتەرەمەی زۆر بە تەوازع و سرور قبوڵ و، لەگەڵ هەمو دەستەیەک دا فەوق ئەل عادە بە نەزاکەت و تەئەنی گفتوگۆ و، بەیانی مەمنونییەتی لە حوسنی ئیستیقبال و خزمەتکردنی ئەهلی مەملەکەتەکە فەرمو.

"فەخامەتی مەندوب ڕۆژی دوایی بە سواریی بە ناو بازاڕدا گەڕا و زیارەتی خەستەخانە و گومرک و بەلەدیە و مەکتەب و دائیرەی پۆلیس و مەحکەمەی فەرمو.

"وە ڕۆژی 18 ی تشرینی سانی فەخامەتی مەندوب بە ئیحتیفالێکی گەورە تەشریفی بە تەیارە عەودەتی فەرموەوە."

لە ژ24 ی 9 ی نیسانی 1925 دا ڕیپۆرتاجێکی لە سەر هاتنی وەزیری موستەعمەرات نوسیوە:

"ڕۆژی 4 ی نیسانی 925 کە تەصادوفی شەمەی دەکرد زەواتی موحتەرەمەی کە ئیسمیان لە ژێرەوە دەرج کراوە بە تەیارە تەشریفیان فەرموە سلێمانی:

"میستەر ئامری، وەزیری موستەعمەرات

"لیفتننت کۆلۆنێل سێر ساموئیل هەوەر وەزیری تەیەران

"گروب کاپتن برنەت معاونی مدیری ئیجرائات و ئیستیخباراتی قیوای هەوائیە

"کاپتن والاس سکرتێری خاصی وەزیری موستەعمەرات بۆ مەجلیسی مەبعوسان

"میستەر بلوک سکرتیری خاصی وەزیری طیران

"میستەر اجکومب سکرتێری خاصی وەزیری مستەعمەرات

"بە موناسەبەتی تەشریف هێنانی ئەم زەواتە ئەشراف و روئەسای دەوائر و توجاری موعتەبەری سلێمانی دەعـوەت کرابـوون بـۆ چـاوپێکەوتنی حەزراتـی موشـارئیلەیهیم، دەسـتە دەسـتە ئەم خەڵـقە تەشریفیان فەرموە دائیرەی حکومەت و لە تەرەف زەواتی مـوحتەرەمەی بـاڵاوە بە کەمـالی حـورمەت و بەشاشەت قبوڵ کران، لە پاش راسیمەی قبوڵ و قەدەرێک ئیستیراحەت دیسانەوە تەشریفیان فەرمـوەوە و جێگای تەیارە و حەزرەتی موتەسەرپف و موفەتیشی ئیـداریـیش تـاکو جـێی تەیـارەکە تەشـیعیان فەرمون و سواربون و رۆیشتنەوە. سلێمانی بە تەشـریف فەرمـونی ئەم زەواتە موشـەرەف و دڵ فـرەح بوون."

لە ژ26 ی 14 ی مایسی 1925 دا نوسراوە؛

"هاتن: رۆژی جومعەی ڕابوردو 8 ی مایسی 925 سەعات 4 ی عەرەبی حەزرەتی فەخـامەتی ڕەئـیس ئەل وزەرا جەنابی یاسین پاشا ئەل هاشمی بە تەیارە تەشـریفی فەرمـوە سـلێمانی. هەر ئەو رۆژە سـەعات لە 10 ی عەرەبـی ئەشـراف، عولەمـا، روئەسـای دەوائیـر و توجـارانی مەمـلەکەت لە دائیـرەی حکـومەت لەگەڵ حەزرەتی موشار ئیلەیهیدا مولاقاتیان کرد و ئەو شەوە لە ماڵی حەزرەتی موتەسـەرپف میـوان بـو صـبحەینێ بەیانی بە تەیارە تەشریفی عەودەتی کردەوە بۆ بەغداد."

ســەردانی وەزیــری هێــزی ئاســمانی و وەزیــری موســتەعمەرات و، مەنــدوبی ســامی بریتــانی و، سەروەزیرانی عیراق، نیشانەی گرنگیی سەرکەوتنی هێزەکانی عیراق و بریتانیایە لە داگیرکردنی سـلێمانیدا. مەبەســتیان لەم هاتوچۆیــانە جێگیرکردنــی دەســەڵاتی حکــومەتی عیــراق و، ســەپاندنی کاربەدەســتانی بەڕێوەبەرایەتی تازەی سلێمانی بوە.

شێخ مەحمود بە نهێنی لەگەڵ تورک پێوەندی دامەزراند بو. ئینگلیز بەمەی زانی بـو. بە تـایبەتی دوای ئەوەی پۆستەیەکی نامەکاریی شێخ مەحمود و تورک ئەکەوێتە دەسـتی. تـورک گـرتنەوەی سـلێمانی‌یـان پـێ خۆش نەبوە. لە ژ1 دا ژیانەوە ئەم هەواڵەی بڵاوکردۆتەوە:

"وەزعیەتی تورکیا لە خصوص گرتنەوەی سلێمانیەوە

"ئەستەموڵ: حکومەتی ئەنقەرە ئیشـغالی سـلێمانی بە ئیشـێک ئەژمێـررێ کە تەمـاس لەگەڵ ئەحـوالی حازرە ئەکا و لە مەقاماتی سیاسـیەدا حسـیاتێکی وای تەولیـد کـردوە کە ئینگلـتەرە قەت تەرتیبـاتی خـۆی لە خصوص مەسئەلەی موصلەوە ناگۆڕێ و بۆ قایم کردنی جەمعیەتی ئومەم تەشەبوس ئەکا."

### 2 .2. دوژمنایەتی شێخ مەحمود و جوڵانەوەکەی

شێخ مەحمود کە ئاڵای سەربەخۆیی کوردستانی هەڵگـرت بـو، چەنـدین تـاقمی پـارتیزانی سـاز دابـو شەڕیان لەگەڵ هێزەکانی عیراق و بریتانیا ئەکرد، وەکو مەترسیەکی راستەقینە ما بـو. ئەنجـومەنی وەزیرانـی عیراق پارەیەکی زۆری بۆ کوشتنی تەرخان کرد بو، بە هێزی پیادە و بە فڕۆکەیش هەمیشە بە دوایەوە بـون.

ئەیانویست لە ڕوی سیاسی‌یەوە سوکی بکەن و، لەبەر چاوی خەڵک بیشکێنن و، خۆی وەکو ڕێگر و شۆڕشەکەیشی وەکو یاخیبونێکی چەتەیی پیشان بدەن.

لە ژ3 ی 1 ئەیلولی 1924 دا لە ژێر ناوی (ئاخۆ) نوسیوێتی:

"... ئاخۆ بیر بکەینەوە تێ ئەگەین کە فرسەتێ بۆ ئەم میللەتی کوردە هەڵکەت بو هێشتا لە دنیادا بۆ هیچ میللەتێک ئەمە ڕێک نەکەوتبو. هەروا لە پڕێ بوین بە کورێ. فەقەت ئێمە چونکە بە پێی خۆی هاتبوە بەردەممان قەدرمان نەزانی و لە خۆمانمان تێک دا و لە خۆمان شێوان. ئەوەتە بەم دەردە چوین کە دیمان.

"ئاخۆ ئەمجارە هیچ چاومان کراوەتەوە و تێ گەیشتین کە ئەمە هەر بۆ خزمەتی فکری بەعزێ زاڵم و بێ ئیصاف ئەم نیعمەتە بە قیمەتە گەورەیەمان لە کیس خۆمان دا، وە ئەم هەمو مصیبەت و فەلاکەتە بە دەستی خۆمان بە سەر خۆمانا هێنا؟

"ئاخۆ ئەمە بۆچی بۆ ئەم ئیشە خۆمان لە خۆمان تێک دا یا نە؟ حکومەتێکی گەورەی وەکو بریتانیا لەو پەڕی دنیاوە خوا بۆی ناردین لە وەختێکی زۆر تەنگوچەڵەمەدا هات گەیشتە فریامان. هەمو هێشتا لە بیرمانە و لەبەر چاومانە کە ئەم خەڵقە هەمو ئەو وەختە لە گیانەڵادا بون. لە پڕێکا خوا ئەم دەلیلە خێرەی بۆ ناردین. وردە وردە بوژانـدینیەوە، بەرە بەرە ژیانـدینیەوە و، حەقێکی زۆر گەورە و خۆسەویستی داینێ و ڕێگەیشی نیشان داین. فەقەت ئێمە قەدرمان نەزانی ئەوسا لە خۆمان تێک دا. لە پاش بەینێ کەوتینەوە هاوار هاوار و ئەم لا و ئەو لا. وتمان: ئەگەر بێتو خوا ئەمجارە دیسانەوە دەوری خێرمان لێ بکاتەوە ئیتر بە هەمو هێز و تینی خۆمان ئەیگرین و، تا گیانمان تیا بمێنێ بەری نادەین و، بە تەواوی قەدری ئەزانین. خوا کارێکی کرد لە پاش بەینێ ئەو ئاواتە خۆشەویستەمان دیسانەوە هاتەدی. لە ئەوەڵ جار خۆشتر و باشتر درایەوە دستمان. ڕێگەی ڕاستمان پێ نیشان درا. کەوتینەوە خۆشی خۆشی و هەڵقون و داقون و سەربەرزی فەرەحی، کەچی هەر ئەوەندەی پێ نەچو ئەمجارەیش وتمان: گەزی چی و چاوی چی؟ چەند کەسێکی بێ دین، بێ ئینصاف، نەخوێندەوار، تێنەگەیشتو، کەوتنە ناوەوە ئیشەکەیان شێواند. عالەمێکیان بە قڕ دا. خوێنی چەند کەسێکیان بە ڕژان دا. ئەم میللەتە ئەوی لە باپیرە گەورەیەوە بۆی بەجێ مابو لە کیسی چو. عالەمێ تەفر و توانا بون. هەر کەسە پەڕیە قوژبنێکەوە دەربەدەر کەوتنەوە. نە قەدر ما نە حورمەت. ئەوەی بەناز و نیعمەت پەروەردە بوبو جگەر سوتاو و دڵ بڕژاوی خۆی و ماڵ و منداڵی لە کۆلانی مەملەکتان سوک و بێقەدر مانەوە. هەمو بەردەل بەرد و تونـاوتون کەوتن. وار و وێخی خەڵق بە قوڕا چو. چەند بێ گوناه و مەعصوم خوێنی ڕژا. چەند وجودی بە قیمەت بە ناحەق لە ناو چو و، چەند منالی نەبەکام لەبار دایکی چو. چەند فەقیر و هەناسە سارد لە ژێر داردا شەت و کوت کرا. یەک بون بە خوێنە خوێی یەکتری. چەند پیاوی دیندار دینی نا بە طاقەوە. چەند شالی سەوز و مێزەر و پرچ لەگەڵ گوڵنکەی چەفتە تێکەڵ بو. خەو و خواردنی هەڵگیرا. نەوعێ زوڵم و غەدر بینرا کە لە هیچ تەئریخێک دا کەس ناتوانێ وەکو ئەوەی بدۆزێتەوە.

"ئاخۆ ئەمە بۆچی بو؟ ئەمە بۆ داوای حقوقی ئەم میللەتە قوڕ بە سەرە بو؟ بۆ گەورەیی و بەرزی کورد و کوردایەتی بو؟ بۆ زیندو کردنەوەی دینی ئیسلام بو؟ بۆ خۆشی و ڕەحەتی مەملەکەتەکە بو؟ نە وەڵڵا، نە بیللا، نە تەڵڵا. پیاو لەمانە هەر ناوێکی لێ بنێ تەریق ئەبێتەوە.

"ئەمە هەر بۆ لیرەی زۆرگرد کردنەوە بو. ئەمە هەر بۆ گێز و گوڵنکەی چەفتە بو. ئەمە هەر بۆ کەوای گدرونی گوڵ باتمانی حەوت ڕەنگ بو. خوێنی موسڵمانان لەم لاو لەولا کە ئەڕژا هەمو بۆ خەنەی دەست و پەنجە و بۆیەی سەر و سمێڵ بو. ئەم میللەتە قوڕبەسەرە کەی ئەیویست وای بۆ بکرێ تا وای لێ بکرێ. ئەم عالەمە ئەیەوێت لە سایە و پەنای عەدالەت و ڕەحەتی‌دا بحەسێتەوە. ئەم خەڵقە کە لە دنیادا هەوڵ و تەقەلا ئەدا،

بۆ رەحەتی و خۆشی هەوڵ ئەدا. بۆ زوڵم و زۆر تێکۆشینی ناوێ کە سەر و ماڵ و جاه و شەرەف و پیاوەتی چو ئیتر دنیای بۆچیە؟

"ئاخۆ ئەمجارە لەپاش ئەمانەیش چاو ناکەینەوە، عەقڵ ناگرین، هۆش و بیرمان نایەتەوە بە بەرمانا، کە دنیا چ باسە و بۆچی وامان لێ بە سەر هات؟ ئەم میللەتانەی تر هەمو بە عەقڵ و زانین خەریکی ژیاندنی خۆیانن. هەر یەکە و واسیتەیەکی باشیان بۆ خۆیان دۆزیوەتەوە. بەو واسیتەیە خۆیان بە رەحەتی و سەحەتی ئەبەن بەرێوە. هەر ئیشێ کە بۆ خۆیانی ئەکەن بە عەقڵ و تەرتیبی ئەکەن. سەربەخۆ تێ هەڵناچن. باری ئەوانە ئەبینن کە لە لای سەرومانەوە لە ئاسمان هەرچی بیانەوێ ئەیکەن. لە ناو ئاودا، لە ژێر ئەرزدا، بۆ خۆیان هەڵ ئەسوڕێن. هەمو ئیشێکی خۆیان پێک ئەهێنن. ئاخۆ ئێمە ئەگەر هەوڵ و تەقەلا بدەین، هیچ نەبێ ئەتوانین لە سەر ئەم بستە ئەرزە، بە رەحەتی بۆ خۆمان ئیشێکی خۆمان بکەین؟ لە جیاتی ئەم هەمو شتە خراپانە خەریکی ئیشێکی باش بین.

"ئەم دنیایە بە واسیتەی خوێندن و زانینەوە گەیشتونەتە مەقصودی خۆیان. ئێمەش با نەختێ خەریکی خوێندن و زانین و فێر بونی شتی باش بین. هەوڵ بۆ تیجارەت و زەراعەت و کەسابەت و ئەم نەوعە شتە چاکانە بەین. شتێ کە زەرەرمان بێ با نەیکەین و بۆ قازانج و نەفعی خۆمان بگەڕێین. ئەو شتەی کە باعیسی نەگبەتی و فەلاکەتی ئەم عالەمەیە هەوڵ بدەین بۆ لەناو بردنی. لادانی ئەوەی چاکە روی تێ بکەین و پڕ بە چنگ بیگرین.

"با بزانین لەمەودوا چاومان ئەکەینەوە ئاخۆ؟"

لە ژ5 ی 26 ی ئەیلولی 1924 دا نوسیوێتی:

"هەواڵی جەردەکان: مودەتێک بۆ شێخ مەحمود و جەردەکانی مەعییەتی لە تەعجیزاتی بەعزێ فەقیر و فوقەرا و، روتکردنەوەی ڕێبوار و کاروان و تالانکردنی کۆنە ئەلبیسەی زوراع و شوان و سەرو پۆتەڵاکی ئافرەتی ئاواییەکان و، تەحریکی بەعزێ عەشایەر بۆ جەردەیی و فەساد خەریک بون. فەقەت لە سایەی تەدابیر و هیمەتی حکومەتەوە لە هەمو تەشەبوساتێکدا دوچاری زەربە و خەسارات و یەئس بون. قیسمێکی زۆریان عەرزی دەخالەتیان بە حکومەت کردوە و ئێستایش هەمو رۆژێ پەیدەرپەی بۆ عەرزی ئیتاعەت موراجەعەت بە حکومەت ئەکەن. ئومێدی قەوی وایە کە بە ئیزنی خوا حکومەت بەم زوانە رەگ و ریشەیان لە بن دەربهێنێ.

"وامان بیستبو کە بەعزێک لە دەستەی جەردەکان ئەیانوت ئێمە بۆ چاوپێکەوتنی ئەهالی فەقیر لە ئاسایش و مەحفوزیەتدا هەمو سەروەت و مەوجودەتمان فیدا ئەکەین، فەقەت لە موعامەلەی ئەم جارانە کە کردیان تێ ناگەین مەرامیان چی بو. ئیحتیمالە ئێمە بە سەهو بیستومانە. شائیعە وابو کە ئەیانوت وەتەنەکەمان خۆش ئەوێ... عەجایب.

"ئێمە وا فێر کرابوین کە وەتەن خۆشویستن مەعنای موحافەزە و معاوەنەتە و نەفرەت و عەداوەت موجیبی ماڵوێرانی و موصیبەتە."

لە ژ21 ی 19 ی مارت 1925 دا لە ژێر سەرناوی: (حیشمەتمەئاب مەلیکە درۆزنە) دا بە بێ ئیمزای نوسەر، نوسیوێتی:

"بیستومە بەینێک خۆت خزاندبوە دێی (کەندە سورە). هەرچەند ئەو دێیەم نەدیوە بەڵام دیارە کوێستانە. بەفری زۆری لێ باریوە. مەعلومە ئێوەیش وجودی نازکتان ناخەنە بەرسەرما. خۆت دەکێشیتە خەڵوەتخانەی ملوکانە. ئومێد ئەکەم لەوێدا کە بە تەنها مابیتەوە، دێو و جنۆکەکانت لێ دورکەوتەوە، سەرت بخەیتە بەینی هەر دو ئەژنۆتەوە. تۆزێ ئەم ئەحوالەی خۆت و ئەو ئەوزاعەی میللەت کە پیشانت دان لێک بدەیتەوە. نەختێ نەفرەت لە خۆت بکەیت و ئەگەر ویجدانت بێ هەنێکیش بگریت. چونکە رەنگە لەوێدا

بێتەوە بیرت کە میللەتی سلێمانی و حەتا هەمو میللەتی کورد بە کەمالی ئیشتیاق لەژێر ریاسەتی جەنابتانا ئیستیرحامی ئیستقلالیەتیان کرد و، حکومەتی بریتانیش رەحمی بە فریادی میلەت کرد، موجریمێکی وەکو تۆی لە هندستانەوە عەفو کرد و، بە رەئیسی مەجلیسی میللی هێناتیەوە بۆ سلێمانی، ئیستیقبالی میللەتێکی قەدیمی ساحێب شەرەفی تەودیع کردیت. رەنگە لەوێ‌دا بێتەوە بیرت کە هەمو میللەتی کورد بە تەواوی کەیف و روخۆشی هاتن بە پیرتەوە و تاقی زەفەریان بۆ دروست کردیت، کچە مەعسومەکانیان بەو دەست و پەنجە نازکانەیان گوڵبارانیان کردیت.

"رەنگە لەوێ‌دا بێتەوە بیرت هەموو منالآنی بێ‌گوناهی مەکتەب بە گۆرانی حەزین و پارانەوەی گریان هاتن بە پیرتەوە تەمەنای روناکی پاشەڕۆژیان لێ کردیت.

"دیسان رەنگە لەوێدا لێکی بدەیتەوە کە ئەو پەنجە نازکانەی کە تۆیان پێ گوڵ باران ئەکرد لە سایەی ناوچەوانی تۆوە کەس نازانێ هەر زەڕە و پارچەیەکی کەوتۆتە کوێ ئەو منالە مەعسومانەی کە تەمەنای ئیستیقبالیان لێ کردیت ئێستا کێ چوزانێ لەناو چ شیوێکا لە برسا مردون.

"ئەو دەنگە بەرزانەی کە بێ پەروا هاواری حقوقیان ئەکرد ئێستا مەعلوم نی‌یە بە گڵی سەفالەتی چ وەڵاتێکا نوساون.

"ئەو سیما نەجیبانەی کە پیلانی موەفەقیەتی کوردستانیان رێک ئەخست ئێستا کێ چوزانێ لە چایخانەی کام مەملەکەت سەفیل و پەرێشان کەوتون ئنجا لەو خەڵوەتخانەیەدا کە ئەمانەت لێک دایەوە ئومێد ئەکەم لە پاش میقدارێک گریان و قوڕ پێوان بە ناوی سەلامەتری ئەم میللەتەوە دەمانچە مانهیرەکەت دەربهێنی بە فیشەکێک خۆت بکەیت بە قوربانی ئیستیقبال و ئاسایشی ئەم میللەتە.

"فەقەت هەیهات، ئەو سەویەیە، ئەو عیرفانە، ئەو عالی جەنابی‌یە، لە تۆدا نی‌یە. تۆ ئێستایش واز لەم میللەتە هەژارە ناهێنیت یان بە جەردەیی یان بە دزی یان بە ئەنواعی تەشقەڵە دیسان میللەت ئەروتێنێتەوە. نازانم بە چ سەڵاحیەت و ناوی کام دینەوە ئێستایش داوای تەکالیفیان لێ‌ئەکەیت.

"توخوا جار بە جار لە دڵی خۆتا هیچ تەریق نابیتەوە لە هەر جێگایەک قاتڵێک، قەرزدارێک، دزێک، حیزێک، هەبو هەموت لە خۆت کۆکردەوە و ناوت نا فیداکار و لە پارەی خەڵقی سلێمانی دەوڵەمەندت کردن و کەچی هەر تێگەیشتویەکی مەملەکەتەکە تۆی سەوقی سەر چاکە بکردایە وەکو مەڕ لەماڵی خۆیدا سەرت بڕی. توخوا هیچ لێکی نادەیتەوە چەند سەد هەزار روپیەت لە ماڵی قوڕبەسەرەکان دەرخواردی ئەم و ئەوی ناموبارەک دا کەچی دو رۆژ کە پارەت نەدانێ بەرەڵایان کردیت و بێ شەرم و حەیا بەناو ئەم میلەتە جەرگبڕاوانەدا دەسورێنەوە ئەمجار بزانە ئەوانەی کە لە دەورتن هەمو وەهان و لەوان خراپترن. ئیتر بەسە تێ بگە واز لەم شێتێتیە بهێنە لە کەلی شەیتان وەرە خوارەوە میللەت کەڵکی پێوە نەماوە لەمە زیاتر مەیان روتێنەرەوە و دەرخواردی دز و حیزەکان یان مەدە. ئیسترحامی عەفو بکە. زاتەن ئەوەندە پارەی فەقیر و هەژارت پێکەوە ناوە وەکو شاە ئەتوانی هەر رۆژێک لە پایتەختی حکومەتێ رابوێری. ئیستیقلالیەتمان لە تۆ ناوێ و شەڕمان لێ لادە. (مرا بخیر تو امید نیست شر مرسان) ئیتر شەقاوەت لەمە زیاتر جینایەت بەسە رێ وشوێنێ کە خوا و پێغەمبەر بۆی داناوی ئەو رێیە بگرە یا خواو پێغەمبەر ئینتیقامی ئەم میللەتە هەژارەت لێ بسێنێ بەسە بەس"

لە ژ36 ی 20 ی ئابی 1925 دا دەمەتەقێ‌یەکی هەڵبەستراوی بە زمانی دو کەس لە پیاوەکانی شێخ مەحمودەوە نوسیوە:

"گفتوگۆیەکی دو پیاوی شێخ مەحمود کە لە شاخی هەورامان کردویانە، بە تەلسزی ڕەشەبا وەرگیراوە، فەقەت چونکە بە کەری بارەدارا هاتوە، درەنگ گەیشتۆتە ئێرە.

ع: خەبەرات چیە؟

م: نازانی عەسکەرەکە گەڕایەوە شار. شار عەسکەرێکی زۆری تیایە. ئیستاسیۆن، بۆ تەیارە، بۆ زرێلی، دروست ئەکەن. لە هەمو لایەکەوە نوقتە دائەنێن. حکومەت لە هەمو خسوسێکەوە خەریکی کاروباری سلێمانی-یە. وا ئەزانم سلێمانی بەم زوانە تەرەقی ئەکات.

ع: کورە تۆ ئەمە شێت بوی؟ ئەڵێی چی دوێنێ شـێخ بە هەمـو خەڵـقەکەی وت و تەئمینـاتی دانـێ کە ئەمڕۆ سبەینێ حکومەت سلێمانی چۆڵ ئەکات و خۆمان ئەچینەوە ناوی. ئەبێ هەتا 9 ی ئاغستۆسـی 1925 سلێمانی چۆڵ بکرێ.

م: بە خوا نەمزانی ئەمەندە تێنەگەیشتویت. تۆ ئەڵێی لە مەکتەبی حقوق خوێنـدومە کەچـی هـیچ تـێ ناگەیت. حەیفێکم بۆ ئەو مەصرەفەی لە مەکتەبی تۆدا کراوە. ئاخر ئەسبابی چیە حکومەت سلێمانی چۆڵ بکا؟ بۆچی ئەمە گاڵتەی مناڵانە؟

ع: بێ قەزا بی چوزانم ئەی دوێنێ شێخ بۆچی وای فەرمو؟

م: پێم نەگوتی جاهیلی! تێناگەیت ئەی شێخ وا نەڵێ بە چی خـۆی بژێنـێ. ئەگەر ئەم کەر و گـایە بەم هاش و هوشە ئیغفال نەکات چۆن شوێنی ئەکەون؟

ع: بە خوا راست ئەڵێی من هەتا ئێستا تێ نەگەیشتبوم. فەقەت نازانم ئەم ئەحـوالەی ئـێمە نەتـیجەی بەچی ئەگات و ئێمە بۆ چە غایەیەک سەعی ئەکەین؟

م: کورە ئەمە مەسەلەیەکی مەعلومە. وەزیفەی ئێمە هەر کەر فڕانـدن و راووڕوتە. نەتـیجە لە برسـانا لە سەفالەت دا مەحو ئەبینەوە. خۆمان کەر کرد کە بوین بە رەفیقی ئەم پیاوە. ئەو بە ئێمەی وت بـۆ کـوردایەتی سەعی ئەکەین. میللەتەکەمان سەربەست ئەکەین. ئەیخەینە ئیستراحەتەوە. کەچی کـابرای تـایەن هەر خەریـکە میللەتەکە بڕوتێنێتەوە و بە هەمو رەنگێ مەحویان بکاتەوە.

ع: بە خـــوا ئەگەر ئەم هەمـــو ئەزیـــیەت و مەشـــەقەتە کە ئەیبینـــین بـــۆ کـــوردایەتی بـــوایە هەر باش بو.

م: بە خوا بزانم تۆ قەت عاقڵ نابی. ئێمە کە لە ژێر ئیدارەی تورکا بـوین، هەتـا ئینگلیـز نەهـاتبو بـۆ ئێرە کاممان فکری کوردایەتی و ئیستیقلالیەتمان لە سەرا بو. هەمو ئینگلیز فێری کردین. ئەمڕۆیش هەر ئەوە بە عومومی بۆ هەمو بەشەر، خسوسەن بەزەیی بە کوردانـا بـێ و هەمـو غایەیەکمـان بە واسـیتەی ئەوەوە یەتە جێ. کە ئێمە شەڕی لەگەڵ دا بکەین و بچین بە گژیا چۆن موەفەقی ئامالی خۆمان ئەبین. بە دەسـتی خۆمـان ئاگر ئەنێین بەماڵی خۆمانەوە.

ع: بێ قەزا بی دیسانەوە ئینگلیز ئینگلیزت لێ گرتینەوە. بە خوا وابزانم لەم خسوسـەوە فکـری شـێخ موصیبترە. ئەو خۆی لەگەڵ حکومەتی تورک رێک خستوە، شوکر حکـومەتێکی ئیسـلامە بەزەیـی بە میللەتـی ئیسلام دا دێتەوە. بەم زوانە ئیستیقلالیەتمان بۆ تەئمین ئەکـات. ئەمانخـاتە رەحەتـیەوە. ئەوسـا بـۆ خۆمـان حکومەتێکی موستەقیل ئەبین.

م: ترحێو... دیسانەوە دەستت کرد بە قسەی قوڕ و بێ مەعنـا. بە چ ڕو و حەیـایەکەوە نـاوی تـورک ئەهێنی. رەنگە خەبەری کوردستانی شیمالی نەزانی؟ بەر بێ خەبەران کەشکەک صەلەوات!

ع: بۆچی چ بوە؟ ها وایە راست ئەکەیت دوێنێ شتێکم بیست فەقەت گوێم نەدایە.

م: ئینجا بزانە کە تۆ هیچ فکرێکت نیە. چۆن ناوی کوردایەتی بێتە پێشەوە ئینسان گـوێی نـاداتێ و مەراقی ناکا باخسوس ئێمە کە بە درۆی خۆمان گۆیا بۆ کوردایەتی سەعی ئەکەین.

ع: رجا ئەکەم بەسم تەکدیر بکە. ئەم مەسەلەیەی کوردستانی شیمالیەم بۆ بگێڕەرەوە.

م: تورکەکان قەتلوعامی کوردەکانیان کردوە. لە پەنجا هەزار کەس زیاتر ژن، منداڵ، پیاویان کوشـتوە. پیاوی وەکو شێخ عەبدولقادر و کوڕەکەی و چەند هەزار کەسی ناوداریان لە ناو بردوە.

ع: بۆچی وایان لەم کوردانە کردوە؟

م: تەبیعی لە سەر کوردایەتی بوە. ئەڵـبەت نـاوی کوردایەتییـان هێنـاوە. لە ڕقانـا وایـان لـێ کـردون. ئێستایش ئەو قەتلوعامە دەوام ئەکات لافاوی خوێنی هاوجنسەکانمان دیجلە و فوراتی سور کردوە.

ع: چی بە سەر چیەوەیە. ئێمە بە تەماین ئەو ئیستیقلالیەتمان بۆ بسێنێ کەچی مەحومان ئەکاتەوە.

م: باوکم لە ئەوەلەوە پێم نەگوتی کە ئێمە فکرێکی قۆڕمان هەیە. ئەمرۆ لە ئینگلیز زیـاتر کەس بەزەیـی بە ئێمەدا نایەت. بە خوا ئەگەر لە سەر ئەم عەقـڵە بمێنیـتەوە دەسـت لە گونـان درێژتـر مەحـو ئەبیـنەوە. ئەگەر درۆ ناکەین و سەعادەتی میللەتەکەمان ئەوێ لازمە شوێن فکرێکی باش بکەویـن. فەقەت جـددەن تەئمینـت دەکەم مـام شێخ نە بۆ کوردایەتی نە بۆ ئیسلامیەت سەعی ئەکا، هەر بۆ زوڵم و ڕوتاندنەوە لە میللەتە فەقیرەکەی ئەکات.

ع: بە خوا راست ئەڵێی. خۆزگە نەمردمایە لە دەست شێخ و تورک نەجاتم بوایە.

م: نا خۆزگە تۆوی جلخوار لەم وڵاتە هەڵگیرایە چونکە ئەمە هەموی فەسادی ئەوانە.

هۆزی حسەن مەولانی"

ئەمە تەجروبەیەکە بۆ هەمـو ئەوانەی (موهـاتەرات) ئەکەن و، جنێـو بە سـەرکردەکانی ئیسـتای کـورد ئەدەن و، لە ئەوروپای مەڵبەندی ئازادی و پێشکەوتندا، لە باتی ئەوەی بەشداری بکەن لە ڕەوتـی پێشـکەوتنی داوودەزگاکانی حکومەتی کوردستاندا، وتـاری لەم بابەتـانە ئەنوسـن. ئێسـتا شـێخ مەحمـود وەکـو یەکـێ لە گەورەترین و بەرێزترین سەرکردەکانی سەدەی بیسـتەم نـاو ئەبـرێ، ئەوانـیش کە نوسـەر و کـوڕ و نەوەی نوسەرانی ئەو بابەتانەن، شەرم ئەکەن خۆیان بکەن بە خاوەنی نوسینەکانیان.

لە ژ29 ی 10 ی تەموزی 1925 دا نوسیوێتی:

" تەبلیغی رەسمی

"قیوای عەسکەری حکومەتی، کە لە مەعییەتـی کۆلۆنێـل کـامرون دان، وە لە چوارتـا کە مەرکەزی قەزای شارباژێڕە، لە ڕۆژی 24 ی مانگـا خەبەریـان زانـی: کە بەعـزێ لەو ئەشـقیایانەی، کە حەز نـاکەن حکـومەت تەئەسوس بکات لەم وڵاتەدا، چونکە مەنعی جەردەیی کـاروان، تەزیقـی فەلاح و جوتیـار و فەقیـر و فـوقەرا و ڕاوڕوتیـان لـێ دەکـرێ، لە دێی کەنـارو و مـڕانە کۆبـونەوە. قیسـمی زۆریـان مەنسـوبی فیـرقەی شـیلانەی عەشیرەتی پشدەر بون و، بەعزێکیشیان مەنسوبی جافەتی چوچانی کۆنە پۆشی و، بەعـزێ عەشـایەری عـادی تر بون، وە بەعزێ جەردەی تر وەکو کەریمی فەتاح بەگ و شێخ مەحمود و سائیرە، ئیلتیحاقی ئەوانیـان کـرد بو. لە ڕۆژی 25 ی مانگا حکومەت لە چوارتاوە قیسمێ لە عەسکەرەکەی نارد کە بزانێ ئەم جەردانە لە کوێن. لە دێی کەنارو دۆزیانەوە و دەریان کـردن لەو دێیە، لە پـاش تەخریبـی دێیەکە... ئەگەڕێـتەوە بـۆ چوارتـا ئەوانیش خۆیان ئازاد کرد و بە هەڵمەت هاتن بۆ نزیک چوارتا بە دوایانا و لەو دەورە کۆبونەوە هەوڵیان دا شەڕ لەگەڵ قوەی حکومەتی بکەن. جەردەکان میقدارێکی زۆریـان جبەخـانە هاویشـت فەقەت تەبیعـی لە پـاش چەند سەعاتێ شکان و رایان کرد و عەسکەرەکان بە چاوی خۆیان 25 لاشـەی کوژراویـان زیـاتر دی و لەمە زیاتریان لێ بریندار کراوە.

"بـۆ سـبحەینێ تەیـارە ئەو دێیـانەی کە جەردەکـان پەنایـان بـۆ بردبـو بومبارەمـانی کـرد و، هەمـو پشدەریەکان رایان کردەوە جێگای خۆیان، چوار کەس لە خانەدانی پشدەریش کوژراوە. عەسکەری حکومەتی دیسان چونەوە کەنارو ئەو جەردانە کە تیا مابو دەریان کردن.

"یەکێ لە جەردەکان کە لە شاری سلێمانی عەسیە و ناوی شێخ مەحمودە لە تەرەف مدیری شـیوەکەڵ کە محەمەد رەشید ئاغایە تا حـدودی ئێـران تەعقیـب کـرا. ئەڵـێن گوایـا کەریمـی فەتـاح بەگ هێشـتا لەو کـونە شاخانەدا خۆی شاردۆتەوە.

"شایەنی شوکر و زیکرە کە:

"لەگەڵ ئەم هەمو شەڕ و تەعقیبی جەردانەدا تەنها 3 نەفەر عەسکەر و 2 نەفەر چەتە کـوژراوە. ئەوانەی کە ئارەزوی ئەمنیەت و ئاسایش دەکەن ئەبێ تەشەکوری ئەم عەسکەرانەی حکـومەت بـکەن بـۆ ئەوەی کە ئەم جەردانەیان لەم حدودە دەرکردوە."

"ژیانەوە ئێمە بە ناوی هەمو میللەتـی ئەم وڵاتەوە عەرزی تەشـەکورێکی زۆر و بـێ ئەنـدازە تەقـدیم و هەمو وەختێ تەمەنای موەفەقیەتی وا و لەمە گەورەتریان ئەکەین و ئینشائەڵا موەفەق ئەبن و ئەم میللەتەیش بە واسیتەی ئازایی و هیمەتی ئەوانەوە لە دەست جەردە و ئەشقیا نەجاتی ئەبێ و بۆ خۆی ئەحەسێتەوە."

لە ژ31 ی 16 ی تەموزی 1925 دا نوسیوێتی:

"لە پاش موەفەقیەتی چوارتا

لە پاش موەفەقیەتی گەورەی شەڕی چوارتا کە لەگەڵ ئەشقیاکاندا کرا عەسکەریەکانی مەعیەتی جەنـابی کەرەنێل کامرون بە کەمالی مـوەفەقیەت حەرەکەتیـان کـرد بـۆ نـاحیەی پێنجـوێن چەنـد رۆژێـک لەو نـاوەدا جەولانیان کرد. لەو رێگە و بانەدا 3 کەس لە ئەشقیاکان کە تەسادوفی عەسکەرەکەیان کردبو کوژرا بون. لەو سنور و حدودەدا لە ئەشقیا ئەسەرێ نەماوە. ئۆردوەکە رۆژی جومعەی رابردو 10 ی مانگ بە کەمالی سـام و هەیبەت بە سەر ناحیەی سرۆچک دا هاتنەوە بۆ سلێمانی. یاخوا بەخێر بێنەوە هەر موەفەق بن."

لە ژ36 ی 20 ی ئاغستۆسی 1925 دا نوسیوێتی:

"دەخالەت: لەم رۆژانەدا عەباس ئاغای مەحمود ئاغا دەخالەتی بە حکومەت کرد و تەئمینـاتی تەواوی دا کە خۆی و ئەتباعی لەمەولا حازربن بۆ ئیجرای هەمو ئەوامری حکومەتی و لەمەولا ئیتاعەیەکی موتڵەقەیان ببێ و قەتعیەن عەلاقە و موناسەبەتیان لەگەڵ ئەشقیا و شێخ محمود نەمێنێ."

لە ژ52 ی 10 ی کانونی ئەوەلی 1925 دا نوسیوێتی:

"بەیاننامەیە کە لە تەرەف صاحێبی ئیمزای خـوارەوە بـۆ ئەهـالی قەرەداغ نێـراوە حەرفـیەن تەقـدیمی ئەنزاری خوێندەوارانی کیرامی ئەکەین:

"بۆ عمومی کوێخا و ئیختیارانی دێهاتی ناحیەی قەرەداغ عەرز ئەکەم:

"عەزیزان سەلام لە عمومتان ئەکەم. لە پاش عەرزی سەلام ئەم دو سێ کەلیمەیە عەرزتـان ئەکەم خۆتـان مەعلوماتتان هەیە، چوار سەد ساڵ لە زەمانی حەزرەتی شێخ ئیسمائیلی ولیانەوە (قـدس سـرە) هەمـو نـاحیەی قەرەداغ بەپیر و موریدی و بە موڵکایەتی و بە حکومەتی لەژێر دەستی ئێمەدا بـوە. حەتـا حکـومەتی تورکیـا غەیرەز ماها مەئموری تری لە سەر قەرەداغ تەعین نەکردوە. وەقتێ حەربی عمـومی بە موتـارەکە ئەم ولایەتـی موصلەی تەرک کرد، ناحیەی سەنگاو و قەرەداغی دا بە دەستی ئێمەوە. ئەمە دە ساڵە بۆ دیانەت و مـودافەعەی وەتەن خوێنی خۆمان ئەرژێنین. تا حاڵ دە دەفعە خانەوێران و دەربەدەر بوین. ئەمین بن تا خودا قوەت بـدا دەستبەردار نابم. تەوەکول بە خودا. باز ئەمساڵ لەسەر تەحریکات و تەزویراتی بەعزێ نـامەرد و موناقیقـاتی ئینگلیز خـواهـ ئەم فەلاکەتە عەزیـمە بە سـەرمانا هـات. لە خۆتـان مەعلـومە حـاجەت بە بەیـان ناکـا غەیـرەز دەربەدەری و فەلاکەت، قیمەتی سێ ملیۆن لیـرە حکـومەتی ئینگلیـز زەرەری لە ئـێمە داوە و، ئەز خوێشـانمان هاکەزا. سەبەب بە حقوقی قەدیم و ئیسلامیەت موداخەلەی ئێوەم نەکرد. وتـم مـادام خۆمـان دوچـاری فەلاکەت بوین با ئەم خەڵقە بمێنێـتەوە چـاکە. خۆتـان مەعلوماتتـان هەیە هەردو سـەرچنار و ئەلەبـجە و شـارباژێر و

پێنجوین ئەمە پێنج ساڵە هەرچی واریداتێکیان ببێت تەسلیمی ئێمەی ئەکەن. سەری یەک زەرە موخالەفی ئەمری صاحبی جەنابی شێخ مەحمود ئەفەندیان نەکردوە. لە ناوی ئەم میللەتی کوردستانەدا ئێوە ناوی خۆتان ناوە چی؟ لە عەلەم زیاترن؟ نەء. لە عەشیرەتی جاف ساحێب دەست ترن؟ نەء. فیکر و خەڵقی ئەوەل لەسەر دەرکەن تاکە خودا ئیسلامتان بکات. حەیات بمانەد ئینشائەڵڵا ئەم وڵاتە بە ماڵی ئینگلیز و عەرەب نابێ.

"خولاصە بۆ تەحصیلاتی واریداتی عمومی موناسیبم نەزانی کە بە لەشکرێکی زۆرەوە خۆم بێم. ئەوا برادەران و فەرزەندان با دەفتەری عوشر ڕەوانەم کرد. بیلا خودگیری و بە قیل و قال عوشری زەخیرە و شینایی و توتون بە تەواوی تەسلیمی بکەن. شایەد موخالەفەت بکەن وە یا کەسانێ وا بە مەرقەدی پەدەرم تا خودا قوەتمان بدا ئەز مەحوکەردەنش قصور ناکەین و، دێهاتی سادات ئەحواڵێکی بەسەر هاتوە ئینشائەڵڵا دو قات حەق ئەسێنم. ئیتر گوناهی خۆتان بە گەردەنی خۆتان. لازمە تەبلیغی نامەتان عەرز بکەم وە ئەلسەلام.

"ئیدارەی مەئموری قەزای قەرەداغ و قوماندانی عموم سواری... غەریب"

"جواب بۆ کاغەزی شێخ حەمە غەریب کە بۆ هەمو کوێخای دێهاتی قەرەداغی نوسیوە:

"ئەم کاغەزەی سەرەوە هەروەکو لورەی چەقڵێک وایە کە لە خاریجی ئاواییەوە بێت.

"چ وەقتێ حکومەتی تورک وە یا بریتانیا قبوڵی ئەوەی کردوە ناحیەکەی لە تەرەف ئەمانەوە کە ناوی خۆیان ناوە شێخ وا قوت بدرێ و تەزیق بکرێت؟

"لە چ زەمانێکدا شێخان خسوس شێخ حەمە غەریب ساحێبی سێ ملیۆن لیرە بو؟ ئەگەر ئەم میقدارەشیان بوبێت بی شوبهە بە زۆر لە فەقیر و فوقەرایان سەندوە و دیارە ئەم پارەیە حەرامە.

"زۆر چاک مەعلومە کە شێخ مەحمود لە پاش ئەوەی بو بە دز و جەردەیەکی عادی، شەو جەردە بێ حەیاکانی ئەنارد بۆ ئەوەی نانی فەلاح و جوتیارە قوڕ بەسەرەکان بدزن و لە پاشا بە کەرەکانیانەوە رایان ئەکرد بۆ ئێران. ئایا ئەمە شتێکە فەخری پێوە بکرێت؟ ئەمەیە معامەلەی حاکمێک کە خەرج بسێنێت؟

"لە هەمو کەسەوە مەعلومە کە حکومەتی ئینگلیز نایەوێ لە کوردستاندا هیچ شتێکی خەڵق ببرێت و مەیدانی کەسیش نادا کە دزیان لێ بکات، هی شێخ مەحمودیش.

"ئەما حکومەتی ئینگلیز بە نەوعێکی وەها موحافەزەی حقوق و عادات و دیانەت و لیسانی کوردی کردوە کە لە هیچ مەملەکەتێکی موجاویرەدا (کە بە کوردی مەسکونە) وەها نەکراوە.

"ئیتر ئەی عەزیز شێخ مەحمود ئەو سەرینە بنێرە ژێر سەری خۆت کە هەمو کەسێ ئەزانێ تۆ لەشکرێکی زۆرت نیە. ئیلا تەنها تاقمێکی بێ دینی قاتیل نەبێت ئەگینا بۆچی وا دورا و دور لە ئێران دانیشتون پەساپۆرتتان نیە بۆ تورکیا بچن، یەعنی بۆ ئەو مەملەکەتە کە وای پیشان ئەدەن معاوەنەتان بکات.

"بۆ چ نازانن دەمێکە تورکەکان دەرکی ئەوەیان کردوە کە سەعادەتی مەملەکەتەکەیان وا مومکینە کە ئەشخاسی وەکو ئێوەو مانانی تیا نەبێت. بینائەن عەلەیهی سلێمانیش ئەتوانێ ئەوە دەرک بکا."

لە ژ56 ی 14 ی کانونی سانی 1926 دا ئەم ئاگاداریە بڵاوکراوەتەوە:

"ئیعلان: مەحمود ئەفەندی ڕەئیسی بەلەدیەی سلێمانی بە صیفەتی مومەسیلی بەلەدیەی سلێمانی لەسەر حەفیدزادە شێخ مەحمود کوڕی شێخ سەعید لە مەحکەمەی بیدایەتی سلێمانی ئیقامەی دەعوای کرد تەڵەبی تەحصیلی 10064 روپیە و 38 لیرەیکرد کە لە وەختی خۆی دا ئەم پارەیە لە تەرەفی ئەهالی سلێمانییەوە بۆ جەلبی ماکینەیەکی تەبع تەبەڕوع کرابو و لە تەرەفی شێخ مەحمودەوە غەصب کراوە لەبەرئەمە کە مودەعی عەلەیهی محەلی ئیقامەتی مەجهولە بنائەن عەلەیهی بۆ موحاکەمە 30 ی کانونی سانی 1926 ڕۆژی دوشەمە سەعات پێنجی عەرەبی تەعین کرا. لە وەقتی موعەیەن دا ئەگەر مودەعی عەلەیهی خۆی بیلزات حازر نەبێ وە یا

وەکیلێکی موصەدەق بۆ مەحکەمەی بیدایەتی سلێمانی نەنێرێ، بە پێی ئوصول، موحاکەمە لە حەقی بە غیـابی ئیجرا دەکرێ. مەحکەمەی بیدایەی سلێمانی."

## 2. 3. لکاندنی کوردستانی جنوبی بە عیراقەوە

لە ژ20 ی 9 ی مارتی 1925 دا دەربارەی دانانی یەکەمین موتەسەڕیفی عیراق لە سلێمانی نوسراوە:

"رۆژی 7 ی مارتی 1925 لە خانەدانی سـلێمانی و لە مـنەوەران و مەعـاریفپەروەرانی کـورد جەنـابی ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ بە موتەسەڕیفی سلێمانی تەعین کرا. بەم موناسەبەتەوە بە حزوری عومومی ئەشراف و روئەسای دەوایر لە تەرەف جەنابی کەپتان چەپمەنەوە ئەم نوتقە جوانە بە کوردی خوێندرایەوە:

"حەزرەتی کیرام!

"ئەمـڕۆ ئێـوە لە تەئریخـی خۆتانـا گەیشـتونە مەرتەبەیەکـی مـوهیم و، مـن فەوقەلعـادە مەسـرورم کە وەزائیفی موتەسەڕیفیەت دەور ئەکەمەوە بۆ یەکێ لە عونصوری خۆتان.

"لازم ناکا بۆ من باس لەو ئینقیلاباتە بکەم کە دیوتانە، فەقەت ئومێدم وایە کە ئەهلـی لیـوای سـلێمانی ئێستا لەسەر رێگای روناک بن و مەشەقەت و ئەزیەتـی زەمـانی رابردوتـان لەنـاو سـەعادەت و ئیسـتراحەتی ئیستیقبال دا لە فکر بچێتەوە.

"جەنابی ئەحمەد بەگی تۆفیـق بەگ زۆر چـاک ئەناسـن و لام وایە کە صـورەتی ئینتیخـابی جەنـابی ئەحمەد بەگ بۆ موتەسەڕیفی، لای کوردانی لیوای سلێمانی موافیق و موصیبە.

"ئەمینم کە حیاتی شەخصیە هەرچی بێ بەرتەرەف ئەکرێ و هەموتان لە ئیدارەدا بە عەینـی صـەداقەت و ڕاستی کە لە زەمانی بوحران و خەتەردا لەگەڵ منا کردوتانە معاوەنەت و تەقویەی ئەفەرمون.

"وە ئەمینم کە جەنابی ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگیش لە ئیدارە و موعامەلەدا زۆر مونصیف و بـێتەرەف ئەبێ و بۆ تەطبیقی عەدالەت دەرحەق بە هەمو کەسێ، سەعی ئەفەرموێ. ئێستا وەختی ئەوە هـاتوە کە نیزاعـی جوزئی و بێ ئەهمـیەت بەرتەرەف و، کوردەکـانی لیـوای سـلێمانی بـۆ تەئمینـی سـەعادەت و ئیسـتراحەت و ئیستیقبال پێکەوە سەعی بکەن، ئێوە ئێستا ناوێکی چاکتان بـۆ خۆتـان دانـاوە کە لازمە زۆر بە دیـقەت رای بگرن، کە نەسلی ئـاتی بـۆی ئیسـپات ببـێ کە ئێـوە بناغەیەکتـان بـۆ تەئریخـی تەرەقـی تەئسـیس کـردوە. بەعزێکتان رەنگە ئەم تەرەقیە زۆر بە سست و هێواشـی بزانـێ، فەقەت لازمە ئینسـان بزانـێ ئیمپراتـۆری بە رۆژێک تەئسیس ناکرێ.

"موقابیل بەوەی کە ئەمڕۆ تەشریفتان هاتوەتە ئێرە تەشەکورتان ئەکەم و بە دڵ تەبریکتان ئەکەم.

"سامعین بە کەمالی مەسـروریەت چەپەڵەیـان لـێدا و لە عەقەب ئەوەوە جەنـابی موتەسـەڕیف ئەحـمەد بەگیش نوتقێکی تریدا و لە تەلەبەی مەکتەب عەبدولقادر ئەفەندی نوتقی ئاتی بە حزوری زەواتـی مـوحتەرەمە خوێندەوە صورەتی عەینەن دەرج کرا:

"ئەی زەواتی موحتەرەم!

"لە هەمومانەوە مەعلومە کە لق و پۆپی درەختەکانی باخی وەتەنەکەمان لە ژێر هەرەسی بەفر و سەرما و زوقمی زستانی حادیسات و لافاوی ئینقیلاب و بە میقرۆبی زوڵم و ئیستیبداد بە نەوعێ وشک بوبون ئومێدی ژیانەوە و ئیعادەی حەیاتیان لێ نەدەکرا. هەتا لوتف و مەرحەمەتی حکـومەتی فەخـیمە وەک شـنە شـنی بـای وەعدە لەم دەمەو بەهاردا روی تێ کردن، سەرلەنوێ ژیانەوە و تەراوەتی حەیات کەوتەوە وجودیـان، گـۆپکەی سەر پەلیان پشکوت، چونکو لە خانەدان و ئەشرافی وڵاتەکەمـان، لە منەوەرانـی مەمـلەکەت، لە وەتەنپەروەرانـی کورد جەنابی سەعادەتمەئاب ئەحمەد بەگ (دامە تەوفیقاتوهو) بە موتەسەڕیفی لیواکەمان تەعیـین فەرمـورا. لەو

خصوصەوە باخی ئامالی میللەت و مەملەکەت بەیەک دەفعە زیندو بوەوە. وەمینبەعد ئومێد دەکەین لە سایەی عەدالەتی حکومەتی فەخیمەدا جەنابی موتەسەڕیفی غەیور، تەرەقی بە مەعاریفمان بدا.

"ئیتر بە ناوی مەنسوبینی مەعاریف شوکرانی لوتفی حکومەتی فەخیمە و تەبریکی جەنابی موتەسەڕیفی ئەکرەمی دەکەین.

"هەر بژی حکومەتی فەخیمە و حکومەتی عیراق!

"هەر بژی موتەسەڕیفی تازەمان!

"بژی میللەتی کورد! تەلەبەی مەکتەبی سلێمانی، عەبدولقادر حیشمەت"

لە ژ 28 ی 26 ی حوزەیرانی1925 دا لە ژێر سەرناوی (ئینتیخابی مەبعوس) دا نوسیوێتی:

"ڕۆژی چوارشەمە 24 ی مانگ ئینتیخابی مەبعوس تەواو بو لە نەتیجەدا: محەمەد ساڵح بەگی محەمەد عەلی بەگ بە 145 ڕەئی، میرزا فەرەجی حاجی شەریف بە 137 ڕەئی و، ئەمین زەکی بەگی بیگباشی ئەرکان حەرب بە 125 ڕەئی، ئەحمەد بەگی عوسمان پاشا بە 110 ڕەئی، بۆ مەبعوسی لیوای سلێمانی ئینتیخاب کران و دانران. ئەم زەواتە موحتەرەمانە، کەوا بۆ مەبعوسی لیواکەمان هەڵ بژێرراون، بە ناوی هەمو میللەتەوە عەرزی تەبریکیان ئەکەین و، بەدڵ و بەگیان دوعای موەفەقیەتیان تەقدیم ئەکەین. ئومێدمان وایە کە ئینشائەڵڵا ئەم وڵاتە بە واسیتەی هیمەت و سەعی ئەم زەواتە موحتەرەمەوە زۆر شتی باش و چاکی بۆ ببێ و بچێتە ریزی وڵاتانەوە. زاتەن ئەمەل و ئومێدی زۆر زلی ئەم وڵاتە بەستراوە بە نەتیجەی سەعی و هیمەتی ئەمانەوە. سا خوا تەوفیقیان بدا ئامین."

لە ژ 44 ی 15 ی تشرینی ئەوەلی 1925 دا لە ژێر سەرناوی (هاتن) دا نوسیوێتی:

"لە موقتەدیرینی عەدلیە حقوقپەروەر جەنابی جەمالەدین بەگی بابان بە حاکمی مونفەریدی مەحکەمەی سلێمانی و، جەنابی شێخ مستەفا ئەفەندی قەرەتاغی بە قازی و، جەنابی ساڵح زەکی ئەفەندی بە باشکاتبی عەدلیە و، کاتب زادە جەنابی فەتاح ئەفەندی بە کاتبی شەرعیە، تەعین کراون. ڕۆژی چوارشەمە 14 ی مانگی جاری بۆ موباشەرەت بەم وەزیفە تازەیەیان تەشریفیان هێناوەتە سلێمانی، لە پاش عەرزی تەبریک و بە خێرهاتن تەمەننای موەفەقیەتیان ئەکەین."

لە ژ 45 ی 22 ی تشرینی ئەوەلی 1925 دا لە ژێر سەرناوی (ئیعلان) دا نوسیوێتی:

"ئیعتیبارەن لە ڕۆژی 14 ی تشرینی ئەوەلی 925 وە لە لیوای سلێمانیدا مەحکەمە تەشەکولی کردوە. ئەم مەحکەمەیە صەلاحیەتی بینینی هەمو دەعوایەکی (صولح، بیدایەت، شەرعیە، جەزا، کوبرا) ی هەیە. وە بە پێی قانون هەمو موحاکەماتیش بە ئاشکرایی ئەبینرێ، هەمو کەسێکیش بە کەمالی سەربەستی (بە ئەو شەرتەی کە ریعایەت بە ئادابی موحاکەمە بکات) ئەتوانێ لە محاکەمەت دا حازر ببێ، وە گوێ لە محاکەمات بگرێ. حاکمی مونفەریدی سلێمانی"

لە ژ 53 ی 17 ی کانونی ئەوەلی 1925 دا نوسیوێتی:

"بۆ ئەوە دائیر بە سیاسەتی سوئی تەفاهوم حاصل نەبێت و بۆ ئەوە هەمو کەس حەقیقەتی لێ مەعلوم بێت و بتوانن لەو هەمو درۆ و دەلەسە تەفریقی بکەن کە لە تەرەف بەعزێ ئەشخاصەوە کە ئەیێتە مانعی تەرەقیی وڵاتەکەیان بڵاو ئەکرێتەوە وا لە ژێرەوە عەینەن صورەتی کاغەزی فەخامەتی مەندوب ئەلسامی دەرج ئەکەین کە لەم بەینەدا بۆ شێخ مەحمود نوسراوە:

"دیوانی فەخامەتی موعتەمیدی عامی عیراق

"بەغداد 4 ی تشرینی سانی 1925

"بۆ شێخ مەحمود

"مـودەتێ لەمەوپـێش کـاغەزی ئێـوە بە تـاریخی 20 ی ئاغسـتۆس بە واسـیتەی موفەتیشـی ئیـداری سلێمانیەوە گەیشت.

"لە خصوص ئیفاداتی سیاسیەوە کە لەو کاغەزەدا بەیانتان کـرد بـو جـواب هەر ئەمەیە: کە حکـومەتی موعەزەمی بریتانیا قەرار و عەزمی قەتعیی کردوە کە ئەبێ کوردستانی جنوبی لە داخلەی مەملەکەتی عیـراق دا بمێنێتەوە. مەعەهازا بە نەزەری ئەهمیەت تەماشای ئەوە کراوە کە مەئمورینی کوردی بۆ تەعـین بکرێـت و بـۆ معامەلاتی ڕەسـمی‌یە و تەدریسـاتی مەکاتیـب زبـانی کـوردی ئیسـتیعمال بکرێـت، کە ئەمە لە ئیستیقبالیشـدا ریـاعەت ئەکرێـت. مەعلـومە کە چ حکـومەتی ئێـران و چ حکـومەتی تورکیـا لە هـیچ زەمانێـک دا ئەم نەوعە ئیمتیازاتەیان بە کوردەکان نەبەخشیوە. وە لە ئێوەیشـەوە مەعلـومە کە حکـومەتی تورکیـا ئێسـتا دەرحەق بە کوردەکان سیاسەتێکی ئێجگار زاڵمانە و ئیعتیسافکارانە تەتبیق ئەکا و بۆ مەحو پایە مـاڵ کردنـی دیـانەت و زبان و مەنافیعی کوردەکان سەعی ئەکا. ئێستا کوردەکانی عیـراق بە واسـیتەی ئەو ئیلتیفـات و مەرحەمەتەوە کە لە حکومەتەوە دەربارەیان ئەکرێت لە هەمو کوردەکانی سائیری مەمـالیکی تـر مەسـرورتر و خۆشـحاڵترن، لەبەر ئەوە تەحریکاتی ئێوە بۆ عەشائیری کوردی بە زدی حکومەت ئەبێتە باعیسی بەڵای عەزیـم بە سـەریانا. وە تەشەبوساتی ئێوە بەرامبەر بە قوەی حکـومەتی بریتانیـا، کە موئەیـدی عیـراقە، بـێ فایـدە و بـێ عەبەس ئەمێنێتەوە. ئەگەر لە حەرەکاتی ئێستاتانا عیناد و دەوام بکەن، لە نەزەری عالەم دا شەرەفتان زائیـل ئەبێـت و، هەروەکو دزێکی عادی تەماشاتان ئەکرێت و عاقیبەت دوچاری فەلاکەت و مصیبەتی عەزیم ئەبن.

"ئێستایش وەکو جاران حازرم بۆ ئەوەی ئێوە قبوڵ بـکەمە بەغـداد و ئیحتیرامـی شـەرەف تەئمینـات ڕابگرم و لە خصوص موستەقبەلەوە موزاکەرەتان لەگەڵ بکەم.

"وە ئەگەر لە پاش هاتن ئارەزوتان کرد بۆ جێگـای خۆتـان عەودەت بـکەنەوە تەعەهـود ئەکەم مـانعی عەودەتتان نەبم ئەگەر فکـری مولاقـاتی منتـان هەیە ئەبـێ زو بـێن چـونکە ڕۆژی سـێەمی کـانونی ئەوەل بە روخصەتی 3 مانگ ئەچمەوە بۆ لۆندەر.

هینری دوبس مەندوبی سامیی عیراق"

"بێینەوە سەر بەحسی ئەخلاق و ئەتواری حەقیقی شێخ مەحمود و تاقمە جەردەکەی، وا دیارە فەخامەتی مەندوبی بە هیچ صورەتێ بۆ ئیغفال نەکراوە. وە ئەخباری فەخامەتی مەندوبی سامی زۆر سادە و بەسیتە.

"عەلاوەتەن ئێمە بە تەواوی مەئزون کراوین بەوەی کە بڵێین شێخ مەحمود ئایا ئەم تەکلیفە بە قـیمەتە قبوڵ بکا وە یا تەرجیحی ئەوە بکا کە حەیاتی خۆی لە خەجاڵەتی‌دا خیتام پێبێنێ؟ یەک شت هەیە کە مەعلـوم و موحەققەقە، ئەوەیش ئەمەیە کە بە قەتعی جـارێکی تـر بە شەخصـێکی وەهـا ئیعتیبـار نـاکرێ کە وەزائیفـی حاکمێک ئیفا بکا. ئەگەر بێت و خۆی وە یا هەر کەسێ لە تەرەفدارەکانی خەیاڵی ئەوە بکەن کە جـارێکی تـر ئەبێتەوە بە حاکمی سلێمانی، دوی کڵاوی بابردو ئەکەون."

زۆر هەبون وایان ئەزانی کە شێخ مەحمـود لە بەر تونـدڕەوی ئـایینی نەیتوانیـوە لەگەڵ ئینگلیـز ڕێـک بـکەوێ و، دەوڵەتـی کوردسـتان دابمەزرێنـێ. بریتانیـا سـتراتیجی دانـراوی خـۆی هەبـوە بـۆ کـارکردن لە ناوچەکەدا، نە لەگەڵ ئامانجەکەی شێخ مەحمودا ڕێکەوتوەو نە لە توانای شێخ مەحمودا بوە بیگـۆڕێ. وەڵامـی ڕەسمیی بەرزترین دەسەڵاتی ئینگلیز لە عیراقدا بۆ شـێخ مەحمـودی سـەرکردەی شـۆڕش و داواکـاری مـافی نەتەوەیی کورد، ئەمە بوە:

"لە خصوص ئیفاداتی سیاسیەوە، کە لەو کاغەزەدا بەیانتان کرد بـو، جـواب هەر ئەمەیە: کە حکـومەتی موعەزەمەی بریتانیا قەرار و عەزمی قەتعیی کردوە کە ئەبێ کوردستانی جنوبی لە داخـڵەی مەملەکەتـی عیـراق دا بمێنێتەوە."

## 2. 4. کێشەی موسڵ

هێزەکانی بریتانیـا دوای راگرتنـی شـەڕ لەگەڵ عوسـمانی، هێشـتا موسـڵیـان داگیـر نەکردبـو، بەڵام پێشڕەویان کرد تا موسڵیشیان گرت، تورک ئەمەی نەئەسەلماند. کاتێ مستەفا کەمال کاروباری گرتە دەسـت، داوای گەڕانەوەی ولایەتی موسڵی ئەکرد وئینگلیزیش ئەیویست لەگەڵ ولایەتەکانی بەغداد و بەسرا لێکی بـدا و دەوڵەتی عیراقیان لێ دروست بکا.

ئەم کێشەیە بە چارەسەرنەکراوی مـایەوە. بـە گفتوگـۆی دۆقـۆڵی تـورک و ئینگلیـز نەتـوانرا بە لادا بخرێ. لەبەر ئەوە خرایە بەردەم کۆمەڵەی گەلان. کـۆمەڵەی گەلان دەسـتەیەکی تـێکەڵاوی نـارد بـۆ ئەوەی لە نزیکەوە هەلومەرجی ولایەتی موسڵ ببینن و بیـروڕای دانیشـتوان وەربگـرن و، ئەوانـیش بیـروڕای خۆیـان لەسەر ئەوەی ولایەتی موسڵ بدرێتەوە بە تورکیا یان بخرێتە سەر عیراق، بدەن بە کۆمەڵەی گەلان بـۆ ئەوەی دوا بڕیاری لێ بدا.

زۆری هەڵبژاردەی کورد لەو سەردەمەدا تێگەیشتون کە ئینگلیز رێـگەی دامەزرانـدنی دەوڵەتـی کـوردی نادا، لە بەر ئەوە (اهون الشـرین) عیراقیـان پـێ باشـتر بـوە، بە تـایبەتی کە لەو کـاتەدا تورکیـای کەمـالی بە دڕندانەترین شێوە خەریکی سەرکوتکردنی کوردەکانی تورکیا بوە.

رەشید نەجیب لە ژ 18 دا نوسیوێتی:

"ئەگەر سەرفی نەزەر لەمانەش بکەین و بێینە سەر باسی میلیەت هەمو کەس دەیزانـێ کە ئەکسـەریەتی ولایەتی موصل کورد و عەرەب تەشکیل ئەکا. ئەوە بـێ شـوبهەیە کە عەرەبەکـانی ولایەتـی موصـل لە عیـراق زیاتر هیچ شتێکی تریان ناوێ، بێینەوە سەر کوردەکانی ئەو ولایەتە، ئەگەر بە پێی ئامالی خۆیان حکـومەتی کوردیە تەشکیل نەکرێ و، کوردستانی سەرەوە کە ئیستا لە ژێر پێی تورکی زاڵمـا ئەنـاڵێنێ نەجـات نەدرێ، بێ شک و شوبهە ئیتیحاد لەگەڵ عیراق دا تەرجـیح دەکـا لە بـونە خزمەتکـاری تـورک. ئەمەیـش لە نـوقتەی ئیقتیصادیات و تیجارەت و محافەزەی مەوجودیەتی میللیەی کورد شتێکی لازم و صـەریحە. وە هـیچ کوردێـک نیە دەفعەیەکی کە بیەوێ بچێتە ژێر بەندی ئەسارەت و ئیستیبدادی تـورکەوە، چـونکە ئەوسـا هەر سـەروەت، ئیقتیصادیات، تیجارەتمان مەحو نابێتەوە، بەڵکە ناموسی میللی، مەوجودیەتی قەومیەمان، ئەکەوێتە تەهلوکەوە و دەفەوتێ."

ژیانەوە بە وردی دوای هەواڵەکانی کێشەی موسڵ کەوتوە. بۆیە سەرچاوەیەکی گرنگە بۆ زانینـی زۆر لە روداوەکانی ئەو سەردەمە.

لەو سەردەمەدا لە موسڵ رێکخراوێک دروست کراوە بە ناوی (جەمعیەتـی مـودافەعەی حـدود) وەوە بـۆ ئەوەی لای کۆمەڵەی گەلان هەوڵ بدا موسڵ بخرێتە سـەر عیـراق. ئەم هەواڵە لە ژ15 دا بـڵاو کـراوەتەوە. لە پاشکۆی ژ15 دا لە ژێر ناوی: (عەلاوەی غەزەتەی ژمارە 15 ی ژیانەوە) دا نوسیوێتی:

"بـۆ مـودافەعەی وەتەنـی مـوعەزەز و موحـافەزەی حـدودی حـازرەی ولایەتـی موصـل تەظـاهرات و تەشەبوساتێکی وەتەن پەروەرانە کە لە تەرەفی عمومی عیراقیەکان و بیلخاصـە لە تەرەف ئەهـالی و جەمعـیەت مودافەعەی موصلەوە ئیجرا کراوە موجیبی سرورێکی عەزیم و مەداری تەشەکور و ئیفتیخاری عمـومی ئـەهـالی

سلێمانی بـو. بـۆ ئەم وەزیـفە وەتەنـیە و حقـوقی مەشـروعەمان کە مـودافەعەی بکەیـن مـورەکەب لە عمـومی ئەشراف، عولەما، سادات، توجار، زوراع و سائیری صـفوفی ئەهـالی بەنـاوی جەمعیەتـی مـودافەعەی وەتەنەوە جەمعیەتێکی گەورە تەشەکولی کرد غـایە و ئەسـاس مەقصـەدی ئەم جەمعـیەتە موحـافەزەی حـدودی ولایەتـی موصلە کە جوزئێکی لایەنفەکی عیراقە. بۆ تەئمینی ئەم غایە و مەقصدە هەمو نەوعێ سەعی تەشـەبوس کـردن جەمعـیەت بە وەزیفەیەکـی ئەساسـی عەد ئەکـا و لەم خصوصـەوە لە تەرەف هەر جەمعـیەت و هەر فەردێکـی عیراقەوە هەر تەشەبوسات و ئیقداماتێ واقیع ببـێ لە تەرەف جەمعیەتـی ئـێمەوە نـائیلی موظـاهراتی مـوتلەقە ئەبێ."

لە ژ 16 پرۆگرامی جەمعیەتی مودافەعەی وەتەن و ناوی دامەزرێنەرەکانی بەمجۆرە بڵاوکراوەتەوە:

"ئەساسی پرۆغرامی جەمعیەتی مودافەعەی وەتەن لە سلێمانی

مادەی

1. ئەم جەمعیەتە بە ناوی جەمعیەتی مودافەعەی وەتەن تەشەکول ئەکا.

2. ئەسـاس و غـایەی ئەم جەمعـیەتە مـودافەعەی وەتەن و حـدودی حـازری ویلایەتـی موسـڵە کە لە موتەمیماتی عیراق مەعدودە.

3. ئەفرادی ئەم جەمعیەتە خۆی بە کوردێکی عیراقی ئەناسێ و وەتەن و مەملەکەتەکەیان لەگەڵ ولایەتی موسڵدا بە جوزئێکی لایەنفەکی عیراق عەد دەکات.

4. بـۆ تەئمینـی ئەم غـایەیە کە لە مەوادی سـەرەوە زیکـر کـراوە و کافیـل و زامـنە بـۆ سـەلامەت و سەعادەتی وەتەنیە و عمومیەمان بە هەمو نەوعێ سەعی و تەشەبوس کـردن و عینـدەل ئیجـاب تەحریـرەن وە شەفاهەن بۆ مەقاماتی رەسـمیە مـوراجەعەت و ئەفکـاری عمـومیە بـۆ ئیفـای ئەم مەقسـەدە تەنـویر کـردن بە وەزیفەیەکی ئەساسیە بۆ خۆمان عەد ئەکەین.

5. لە داخڵی ئەم پرۆغرامەدا بۆ نەشری ئەفکار و تەمسـیلی هەیئەتـی عمـومیەی جەمعـیەت و بـۆ عەرز کردنی ئەفکـار و حسـیاتی جەمعیـات بە مەقامـاتی لازمە لە ئەعـزای جەمعـیەت هەیئەتێکـی دائـیمە لە تەرەف ئەفرادی جەمعیەتەوە بە رەئی خەفی و ئەکسەریەتی ئارا ئینتیخاب و تەشکیل کرا.

"لە داخلی ئەم پرۆغرامەدا کە لە سەرەوە نوسراوە ئەعزایەتی ئەم جەمعیەتەمان قبوڵ و دەر عوهدە کرد.

"بە کەمالی مەسروری بەیانی ئەکەین کە ئەم پرۆغرامە و تەشکیل کردنی ئەو جەمعیەتە لە سـلێمانیدا لە تەرەف حکومەتەوە تەسدیق کرا."

لە ژ 17 ی 23 ی شوباتی 1925 دا لە ژێر ناوی (بەیاننامە) دا نوسیویێتی:

"ئێمە کە ئەفرادی ئەم وەتەنەین و لە ئەشراف و موتەحەیزانی کـورد ئەژمێـرێین بە ئیتیفـاقی عمـومی عولەما، سادات، ئەشراف، توجـار، زوراع بـۆ مـودافەعەی وەتەنەکەمـان، بیلئینتیخـاب جەمعیەتێکمـان تەشـکیل کردوە، غایە و مەقصەدی ئەم جەمعیەتە و عمومی تێگەیشتوانی میللەت ئەمەیە: کە ئەم ئەحوال و فەلاکەتانە کە لەمەوپێش چاومان پێی کەوت دەفعەیەکی تر نەیبینینەوە. ئەو زوڵم و موعامەلە بێرەحمانە کە لە تورکەکانمـان دی، هەمو زۆر چاک ئەیزانین لە حەربی عمومی دا سولس و بەڵـکە نیصـفی میللەتەکەمـان لە برسـانا مـردن و هەزاران لە ئەفرادی میللەتەکەمان بێ گونـاه و بـێ جـورم ئیعـدام کـران. مەزاڵیمـی تـورک ئەمـرۆ لەگەڵ ئەو وەختەیشدا قیاس ناکرێ. هەزار قات زیادی کردوە.

"ئێمە ئەمانەوێ ئەم میللەتەی ئێمەش، وەکو میللەتانی تر، لەمەولا بە رەحەتـی و ئیسـتیراحەت ئیمـراری حەیات بکا و، تیجارەت و زەراعەت و ئیقتیصادیاتی مونتەزەم و سەربەست جەریان بکا. زاتەن لە عمومیشەوە مەعلومە کە هەمو موعامەلاتی تیجاریە و ئیقتیصادیەی ئێمە، لەبەر ئەوە بەعیراقەوەیە، بێ عیراق ژیانمان نـابێ.

لە داخلی ئەم فیکر و مەقصەدەدا کە مەنافیعی عومیەی تێدایە، ئومێد ئەکەین هەمو ئەفرادی میللەت بە کەمالی فیداکاری معاوەنەت و تەعقیبی سلکی ئێمە بکەن و، هەر کەس لە داخلی ئەم پرۆغرام و غایەیە فیکر و مولاحەزاتێکی باش و جوانی بێ لوتفەن بەیانی بفەرموێ و، ئێمەیش مەعەل مەمنونیە قبوڵی ئەکەین. هەر کەس غەیری ئەم فیکرەیە غایە و مەقصەدێکی تر تەعقیب بکا لە نەزەر جەمعیەت و عمومی میللەتی کوردا بە خائینی وەتەن و دوشمنی میللەت عەد ئەکرێ.

"19 ی شوباتی 925

جەمعیەتی مودافەعەی وەتەنی سلێمانی"

لە سلێمانی ئەم کۆمەڵە دامەزرا بۆ ئەوەی لە بەردەم کۆمیتەی لێکۆڵینەوەی کۆمەڵەی گەلاندا، هەوڵ بدەن سلێمانی بخرێتە سەر عیراق و نەدرێتەوە بە تورکیا.

یەکێ لەو بابەتە گرنگانەی ژیانەوە بڵاوی کردوۆتەوە (صورەتی موتەرجەمەی راپۆری هەیئەتی حدود کە تەقدیمی جەمعیەتی ئەقوام کراوە) دەربارەی (مەسئەلەی حدودی بەینی تورکیا و عیراق بە موجیبی قەراری 30 ی ئەیلول 1924) ئەم راپۆرتەی بە زنجیرە لە ژ42 ەوە تا ژ53 بڵاو کردۆتەوقە.

پێش ئەوەی بڵاوکردنەوەی راپۆرتەکە تەواو ببێ، بریاری کۆمەڵەی گەلان دەرچوە و ناکۆکیەکەی بە قازانجی بریتانیا بە لادا خستوە و ولایەتی موسڵی داوە بە عیراق.

ژیانەوە لە پاشکۆی ژ53 ی 17 ی کانونی ئەوەلی 1925 دا بریارەکەی کۆمەڵەی گەلانی لە ژێر سەرناوی (مولحەقی ژیانەوە ژمارە 53) بەم جۆرە بڵاوکردۆتەوە:

"قەراری عیسبەتول ئومەم لە خسوخ مەسئەلەی موصلەوە

لە جنوەوە بۆ فەخامەتی مەندوب ئەلسامی بەغداد

رۆژی 16 ی کانونی ئەوەلی 1925

مەجلیسی عیسبەت ئەل ئومەم ئەم پاش نیورۆیە بە ئیجماعی ئارا موافیقی ئاتی قەراری حەلی دا.

مادە:

1.حدودی بەینی تورکیا و عیراق موافیقی خەتی برۆکسل ئەبێت کە لە مەجلیسی برۆکسلدا لە 29 ی تشرینی ئەوەڵی 1924 دا قەرار درابو.

2. مەجلیس، دەعوەتی حکومەتی بریتانیا دەکات کە بە پێی ئەو موعاهەدەیە لەگەڵ عیراق هەیانە و لە تاریخی 27 ی ئەیلولی 1924 دا لە تەرەف مەجلیسەوە تەسدیق کراوە موعاهەدەیەکی تر بکا بۆ دەوامی ئینتیداب بە سەر عیراقدا بۆ بیست و پێنج ساڵی تر. وە ئەم موعاهەدەیە تەسلیمی عیسبەتول ئومەم بکا.

مەگەر کە لە پێش ئینقازی ئەم مودەتەدا عیراق خۆی لە مەجلیسی عیسبەتول ئومەمدا تەمسیل بکا موافیقی مادەی یەکی قانونی مەجلیسی عیسبەتول ئومەم.

ئەگەر لە زەرفی شەش مانگدا ئیجرای ئەم ئیتیفاقە ئیقتران بە مەعلوماتی عیسبەتول ئومەم بکا ئەو وەقتە مەجلیس ئیعلانی ئەکا کە ئەمە قەتعیە و نیهائیە. ئەو وەقتە ئەو تەدابیرە بەیان ئەکا کە موقتەزیە بۆ تەئمینی خەتی حدودی سالیف و زیکر.

3. حکومەتی بریتانیا دەعوەت ئەکرێ بۆ ئەوەی کە لە داخڵی صەلاحیەتی ئینتیدابی خۆیدا تەئمینی ئاسایشی کوردەکانی عیراق بکا. تەئمیناتێک کە لە بابەت ئەو شکلی ئیدارەی مەحەلیەوەیە کە لە تەرەف لوجنەی تەحقیقاتەوە لە خیتامی راپۆرتدا تەوصیە کراوە.

4. حکومەتی بریتانیا دەعوەت ئەکرێ کە لە داخلی سەڵاحیەتی ئینتیدابی خۆیدا هەتا مومکین ئەبێ ریعایەتی ئەو ئیقتراحانە بکا کە لە تەرەف لوجنەی تەحقیقاتەوە بەیان کراوە لە بابەت تەدابیری تەئمینی تەسهیلات و سەعی بۆ مساوات لە بەینی عمومی عەناسری مەوجودەدا، وە کەزا لە بابەت تەدابیری تیجاریەوە کە لە تەوسیەیەکی مەخسوسەی راپۆرتەکەدا بەیان کراوە."

لە ژ54 دا وتاری لە سەر ئەم باسە نوسیوە و، ریپۆرتاجی درێژی لەسەر ئەو ئاهەنگانە بڵاوکردۆتەوە کە بەم بۆنەیەوە کراون.

## 3. لایەنی ئەدەبی

### 3. 1. چیرۆک

لە ژ28 ی 26 ی حوزەیرانی 1925 دا لە ژێر سەرناوی (لە خەوما) نوسراوە:

"لە تەرەف شەخصێکەوە خەوێکی زۆر عەجائیب و غەرائیب بینراوە. ئەم خەوە حەیات و ئیدارە و رابواردنی چەند ساڵێکی ئەم وڵاتە ئەنوێنێ. گەلێ ئەسراری خوێناوی وەحشیانە دەر ئەخات. زۆر ئەحوالی خصوصی ئەخاتە بەرچاوی ئەم عالەمە. جارێ لە پێشەوە حەفتەی بەعزێک لەو خەوە لەم غەزەتەیەدا دەرج ئەکەین. لە نوسخەی پاش ئەم نوسخەیەوە ئینشائەڵا دەستی پێ ئەکرێ. لە سەر هەمو کەسێ لازمە هەتا دوا کەلیمەی زۆر بە دیقەت بیخوێنێتەوە و هەتا نەتیجەی وازێ لێ نەهێنێ."

لە ژ29 - بە زنجیرە ئەم نوسینە بڵاوکراوەتەوە. ئەو کاتە بێ ئیمزا بڵاوکراوەتەوە. بەڵام زانراوە کە نوسەرەکەی جەمیل سائیبە و دوای گۆڕینی ناوی رۆژنامەکەیش بە (ژیان) هەر بەردەوام بوە، بەڵام هەموی بڵاونەکراوەتەوە.

جەمیل سائیب کە عارف سائیبی برای و جەمال عیرفانی ژنبرای، بە بێ تاوان و بە بێ ئەوەی بکوژەکانیان سزا بدرێن، لەو روداوانەدا کوژرا بون، چیرۆکێکی لە ژێر ناوی (لە خەوما) لەسەر سەردەمی حوکمی شێخ مەحمود بە زنجیرە بڵاوکردوە.

لە خەوما بە یەکێ لە هەوڵە سەرەتاییەکان دائەنرێ بۆ نوسینی چیرۆکی هونەری.

### 3. 2. شیعر

ژیانەوە بایەخێکی زۆری بە شیعر داوە. کەم ژمارە هەیە شیعری تێدا نەبێ. ئەوانەی شیعریان تێدا بڵاو کردۆتەوە:

سەعید فەوزی لە ژ3 و 4 و 19 و 25 دا،
ئەحمەد موختار لە ژ6 دا،
مستەفا (وافی) لە ژ6 دا،
عەلی کەمال لە ژ7 و 9 و
هاواری وەتەن لە ژ14 و 18 و لە ژ 25 و 26 و 51 دا،
ع. هادی لە ژ12 دا،
م. نوری (گریەی خوسران) لە ژ12 و
کەرکوکی لە ژ43 و 44 و
شینی شەهیدانی کورد لە ژ47 دا،

زێوەر (شەماڵی شاخی شیمال) لە ژ30 دا،

م. ڕاسخ لە ژ25 دا،

محەمەد فەرەج لە ژ32 دا و،

فایەق عەبداللە لە ژ33 دا و،

محەمەد ئەفەندی تەلەبەی مەکتەب لەسەر بڕیاری کۆمەڵەی گەلان لە ژ54 دا شیعری بڵاوکردۆتەوە.

لە ژ19 ی 2 ی مارتی 1925 دا شیعرە بە ناوبانگەکەی حاجی قادری کۆیی کە دژی داوودەزگای عوسمانی نوسیوێتی بڵاوکردۆتەوە:

حاکمی ڕێگری مەعمورەیە، قازیی دزی ڕۆژ

وەزەرای و وکەلای گورگە، ڕەعییەت گەلەیە!

هەروەها لە ژ41 دا شیعرێکی تری بڵاو کروەتەوە.

### 3. 2. 1. نوێکردنەوەی شیعر

لەو سەردەمەدا چەندین شاعیری بە توانا لە سلێمانی بون، لەوانە: بێخود، حەمدی، زێوەر، عەلی کەمال باپیر. بێخود و حەمدی هیچ شیعرێکیان تێدا بڵاونەکردۆتەوە. لە ناو ئەوانەدا م. نوری ڕێچکەی نوێکردنەوەی شیعری کوردی گرتوە، لە هەندێ لە شیعرەکانیدا ڕەنگی داوەتەوە. لە ژ12 دا لە (گریەی خوسران) دا ئەڵێ:

بگری! ئەی شاعیری ناتەوان بگری!

مرد لە ڕۆحی منا هەمو ئامال

بێخودانە کفن بە دۆش مەلال

ئەگەڕێ سەرسەری پەری خەیاڵ

لە ژ14 دا لە (هاواری وەتەن) دا ئەڵێ:

دوێ شەو لە خەو دیم کە ژنێ موشفیق و مەعسوم

هاواری کرد: من وەتەنم، مادەری ئێوەم

ئەیفەرمو بە حوزنێکەوە زۆر عاجز و مەغموم

هەم داری سەمەردارم و هەم لەززەتی میوەم

### 3. 2. 2. شیعری سیاسی

بابەتە سیاسیەکانی شیعرەکانی ناو ژیانەوە لە چەند تەوەرێکدا ئەخولێنەوە: خۆشەویستی ڕۆمانسیی نیشتمان، پروپاگاندە بۆ عیراقی بون، دژایەتی شێخ مەحمود، ستایشی حکومەتی بریتانیا و کۆمەڵەی گەلان، هاودەردی لەگەڵ شۆڕشگێڕانی کوردستانی تورکیا.

خۆشەویستیی ڕۆمانسیی نیشتمان و ئامۆژگاری بۆ خوێندن و زانین.

عەلی کەمال 6 شیعری لە ژ7 و 9 و 18 و 26 و 51 بڵاوکردۆتەوە. لە ژێر سەردێڕی (هاواری وەتەن) دا شیعرێکی درێژی نوسیوە، لە سەرەتاکانیدا ئەڵێ:

ئەمشەو لە خەوا من بە دیهی وەتەنم دی
زۆر جوان و بەشوش و فەرەح و شۆخ و شەنم دی
مەسرور و تەڕ و تازە، پڕ غەنەج و فەنم دی
خۆش عیشوە وەکو ئاهوی چین و خوتەنم دی
پرسیم چیە ئەم خۆشی و ئەم زەوق و صەفایە
ئەم شادی و شەوق و تەرەبی بێ حەد و غایە؟
فەرموی کە لەمەوپێش منی بێچارە ئەسیر بوم
بەینێ بو بە دەس جەور و جەفای تورکەوە پیر بوم
بێ مایە و بێ سەروەت و بێ حاڵ و فەقیر بوم
مەبهوت و پەرێشان و خەفەتبار و زویر بوم
ئیستا کە خەلاص بوم لە جەفا و وەحشیەتی تورکەکان
ئازادم و خۆشوەقت وەکو غونچەی خەندان

ئەم جۆرە شیعرە کە بۆ مەبەستی سیاسی و دەربڕینی هەستی نەتەوایەتی هۆنراوەتەوە، زۆرتر لە شیعری دڵداری ئەچێ تا سیاسی. شاعیر کە باسی نیشتمان ئەکا، وا ئەزانی لەگەڵ ژنێکی راستەقینە ئەدوێ.

لەو شیعرەیدا کە لە ژ51 دا بڵاوی کردۆتەوە ئەڵێ:
"دەڵێن پێم بۆچی هەر بەحسی روخی خوبانە گوفتارت
سەراپا پڕ لە وەصفی دولبەرە دیوانی ئەشعارت
لە میللەت بدوێ! چاکە بکەی تەبدیلی ئەتوارت
(کەمالی) مەگرە گوێ ئەم قەولە، هەر تۆ چاکە رەفتارت
لە میلیەت دەبێ وەختێ بدوم حەقی کەلامم بێ"

م. نوری لە ژ13 و 14 دا دو شیعری بڵاوکردۆتەوە، ئەتوانین بە سەرەتای هەوڵدانی نوێکردنەوەی شیعریان دابنێین لە لایەن شێخ نوریەوە.

دو شیعری نەتەوەیی حاجی قادری کۆیی لە ژ19 و 41 دا بڵاوکراونەتەوە.

سەعید فەوزی لە ژ1 و 4 و 19 و 25 دا 4 شیعری بڵاوکردۆتەوە. لە شیعرەکەی ژ19 دا ئەڵێ:
بۆ ژین ئەگەڕێم، خەڵقە ژیانم لە عیراقە
بێ پەردە ئەڵێم ئەمن و ئەمانم لە عیراق
بەغدایە لە بۆ ئەم وەتەنە بابی مورادە
جێی سەرفی خوری و توتنەکانم لە عیراقە
چی لێ ئەکەی ئەم سەعلەبە، ئەم ماز و کەتیرە
ئەینێریە کوێ؟ شێتەکە نانم لە عیراقە
پرسیم لە ئەمین ئەم جلە جوانانە لە کوێ دێ

شێت نیم، وتی، یاهو من ئەزانم لە عیراقە
خۆ سەروەتی بەغدایی نەبێ ئەمرێ لە برسا
ئەتوانی بڵێی رۆحی رەوانم لە عیراقە
با جنسەکەشم کورد بێ، ئەمما کوردی عیراقم
حامی وەتەن و شاهی زەمانم لە عیراقە
ئەم رابیتەیە مەعنەویە شێتیش ئەزانێ
پیرێکی وەکو غەوسی جیهانم لە عیراقە
فەوزی چیە بەینێکە فۆنۆغرافی خەیاڵت
بێ دەنگە وتی: گیانە قەوانم لە عیراقە

پیرەمێرد کە تازە گەڕابوەوە کوردستان، ئەویش هەروەکو جەمیل سائیب بە هۆی کوشتنی عارفی خوشکەزایەوە دڵبریندار بو، شیعرە بە ناوبانگەکەی کە دژی شێخ مەحمود دایناوە بە بێ ئیمزا بڵاوکراوەتەوە:
"لە گوێم دێ دەنگی لای لایەی وەتەن دایک جگەر سوتاو
دەرێژێنێ بە سەر وێرانەکەی خوێناوییا خوێناو"
تا دەگاتە ئەوەی ئەڵێ:
" شەوێ دەست ئەهرەمەن کەوت خاتەمی موڵکی سلێمانی
کەچی میر و گزیری پێ ئەکرد قەدری وەها زانی"

بەڵام پیرەمێرد زۆر زو هەڵوێستی خۆی لە شێخ مەحمود راست کردۆتەوە. لە تۆڵەی ئەم شیعرەیدا شیعرێکی تری بۆ داناوە کە بە یەکێ لە شاشیعرەکانی دائەنرێ، لە سەرەتاکەیدا ئەڵێ:
"ئەبێ بەخشندە ملکەچ کا لە ئاستی موچەخۆری خۆی
سوراحی سەر فرو دێنێ بۆ پیاڵە کە تێ کا بۆی... تاد"
پیرەمێرد بە درێژایی تەمەنی رێزێکی تایبەتی بۆ شێخ مەحمود هەبوە. هەرچەند لە رۆژنامەکانیدا ناوی هێنا بێ بە رێزێکی زۆرەوە باسی کردوە.

شێخ عەبدولخالقی ئەسیری بە ئیمزای (کەرکوکی) لە ژ43 و 44 و 47 دا 3 شیعری بڵاوکردۆتەوە. دو لەم شیعرانەی بۆ دەربڕینی هاودەردیە لەگەڵ شۆڕشی کوردەکانی تورکیا. لە ژ43 دا لە شیعرێکی بێ ناونیشاندا ئەڵێ:
کوردە وا فتوا دراوە بۆ جەوازی کوشتنت
لە ژ47 دا لە شینی (شەهیدانی کورد) ا ئەڵێ:
یا ڕەب چ مصیبەتێکە لە کوردانی ئێمە قەوما
لەم میلەتە مەزڵومە نە خۆراک و نە خەو ما

زێوەر بە بێ ئیمزا لە ژ30 دا،
م. راسخ لە ژ25 دا،
محەمەد فەرەج لە ژ32 دا،

ئەحمەد موختار لە ژ6 دا،

ع. هادی لە ژ12 دا و

وافی (مستەفا) لە ژ6 دا، هەر یەکە شیعرێکیان بڵاوکردۆتەوە.

فائیق عەبدوڵا لە مەدرەسەی کولیەی ئەعزەمیە (کە لە بەغداد بوە) لە ژ33 دا شـیعرێکی بڵاوکـردۆتەوە. ئەم فایەقە، هەمان شاعیرە کە دواتر بە ناوی (فـایەق بـێکەس) ەوە ناوبـانگی دەرکـرد. رەنـگە ئەمە یەکەمـین شیعری بڵاوکراوەی بێ.

وافی (مستەفا) لە ژ6 دا بە شیعرێکی درێژ کەموکوڕی زانستی و پێویستیەکانی وڵات ئەهۆنێتەوە و ئەڵێ:

مەفقودە فنون، دورە لەناو ئێمە کەمالات

بێ هۆش دەمرین ئاخری وەک پیری خەرابات

...

کوا مەکتەبی تیب، کوانێ حقوق، کوانێ صەنایع

چۆن سەعی بکەم فێری ببم عیلمی فەلەکیات

...

گەر مەکتەبی ئالاتی زەراعەت موتەخەصیص

مەوجود نەبێ چۆن فێری دەبم عیلمی نەباتات

...

شارێک وەکو ئێرە کە چەند گەورە و زۆرە

یەک مەکتەبی تێدا نیە بۆ دافیعی حاجات

### 3. 3. پەخشان

لە ژ21 ی 19 ی مارتی 1925 و ژ22 دا مەحمـود جەودەت لە ژێـر نـاوی: (ئینتیبـاه) دا بـابەتێکی نوسیوە، پێشەکی و پاشەکیەکەی هی خۆیەتی و، گۆرانیەکەیشـی لە فەرەنسـیەوە وەرگێـڕاوە. وەکـو نمـونەی پەخشان و وەرگێڕانی ئەو سەردەمە لێرەدا ئەینوسمەوە:

"ئینتیباه

"دوێنێ شەو، لە سکونەتی عەمیقەی نیوەشەودا لە ناو ژورەکەما، کە بە ڕۆشـنایی مەنـگ نیـوە ڕونـاک بوبوە و، بە نیەتی نوستن ڕاکشا بوم و، چونکە زۆر هیلاک و مـانگو بـوم ئەمویسـت زو خەوم لـێ بـکەوێ، فەقەت هەرچەندم ئەکرد و ئەکۆشا بە هیچ کلۆجێک خەو نەئەکەوتە چاوم، چونکە خەیاڵ و وەزعیەتی وەتەن و ئارەزوی تەئسیسی ئەمن و ئاسایشی تیادا موخەییلەی بە صورەتێک ئیستیلا کردبو، لە پاش مـودەتێکی زۆر کەم ئەوەی کە فکرم لێ ئەکردەوە عادەتەن بەچاو دەمبینی.

"لەم خەیاڵانەدا وا ئەهاتە پێش چاوم کە لە دەشتی وەیس دا ریش سپی، منداڵ، پیاوی قەیرە، ژن، کوڕ، کچ، حاصلی گەورە و پچوک، عەشامەتێکی ئەوەندە گەورە کۆ بوبـوەوە، کە تەشـبیهـ کردنـی ئەم قەڵەبـالغیە بە شارە مێلورەیەک جائیز بو. ئەم خەڵقەش، بە ئیعتیباری ئەکسەریەتەوە، پڕ چەک و سـیلاح بـون لەم دەشـتەدا، کە لەبەر ئینسان وەک بەحرێکی موتەلاتیم وابو، بە دەرەجەیەک سکوت و سکونەت حوکم فەرمابو کە ئینسان عادەتەن گوێی لە وزەی باڵە مێشولە دەبو. منیش لەکن گـردەکەی شـێخ محێـدینەوە لە نـاو ئەم عـالەمەدا خـۆم دەبینی، ناگەهان دەنگ و ئاهەنگ و گۆرانیەکی زۆر موئەسیرم هاتە بەرگوێ.

"لە ژ22 دا بەم جۆرە درێژەی بە باسەکەی داوە:

"گۆرانیەکە مەوزون و گفتەکەشی زۆر موهەیەج بو. چاوم هەڵبڕی کە تەماشام کرد ئەم گۆرانیە چەند سیلاح بەدەستێک کە لەسەر گردەکە بون ئەیانوت و، نەقەراتی ئەم گۆرانیە بە یەک ئاهەنگ لە تەرەف عومومەوە تیکرار ئەکرایەوە و، لە تەنیشت ئەم سیلاح بە دەستانەوە، چەند دایکێک کە هەریەکە منداڵێک لە باوەش دا، چەند باوکێک کە هەر یەکە دەستی منداڵێک بە دەستەوە، چەند منداڵێکی دە دوانزە ساڵ، چەند ژنێکی مێردار، چەند کچێکی چواردە ساڵ، لە سەر خەتێک بە تەرتیب ڕێک ڕاوەستا بون و، بە سورەتێکی حوزن ئەنگێز، جەسارەت بەخش، دەستە دەستە بە ریزە لە سەر ئەم گۆرانیە کە نەقەراتەکەی لە تەرەف عومومەوە تیکرار ئەکرایەوە دەوامیان ئەکرد.

"گۆرانیەکەم عەینەن لە بیر نەما فەقەت خوڵاسەی مەئالەکەی ئەمە بو کەوا عەرزی دەکەم

"دەستەی دلاوەرەکان: ئێمە دلاوەرانی کوردان بۆ تەئمینی سەعادەتی میللەت ئەوا هەوەڵ هەنگاومان هاویشت. ئالیهەی زەفەر بە مەسروریەت لە پێشمانەوە ڕەفعی مەوانیعی ئامالمان دەکات. بۆ ئیمحای زوڵم و تەعەسوب لە هەمو کوردستان دا تەپڵی بازی سوارانی جەنگاوەر دەستی کرد بە لێدان. ئەی دوژمنانی کوردستان ئەی زاڵمان و خونخواران بلەرزن. ئەمە میللەتە کە هەڵساوە. ئەی غەداران هەر لە ئێستاوە کفن بۆ خۆتان حازر بکەن.

"نەقەرات: مادەری وەتەنمان کوردستان ئیستمدادمان لێ دەکا، ئێمە کە ئەولادی ئەوین هاتین بە ئیمدادیەوە و عەزمان کرد کە نەجاتی بدەین و لە ڕێگای نەجاتی ئەودا بمرین.

ئێمە هەر بۆ خزمەتی ئەو دەژین و لە ڕێی ژیانی ئەودا مردن بە ژیان ئەزانین.

"سێ چوار دایک: ئەی دلاوەرانی وەتەن! قەتعیەن زەن مەکەن کە لە دیدەی مادەرانەی ئێمە بە حوزنێکی زەلیلانەوە فرمێسک بێتە خوارێ، چونکە ئێمە ئەزانین کە ئێوە دەستتان دایە تفەنگ، تەوفیق ڕەفیقتانە و، زەفەر یار و یاوەرتانە، لەبەر ئەمە لازمە هەر لە ئێستاوە زاڵمان و دوژمنانی کوردستان ئەشکرێزی مەزەلەت بن. ئەی جەنگاوەران ئێمە ئێوەمان هێنایە دنیاوە، لە بەر ئەمە حەیاتتان هی ئێوە نی‌یە، عائید بە وەتەنە. چونکە لە پێش ئێمەدا مادەر ئەوە.

"نەقەرات: سێ چوار باوک

"ئەی غەزنەفەران ئێوە کە قەلبتان بە رابیتەی ئەبەوەینەوە زەربان دەکا لە ساحەی جەنگ و جیدال دا ئێمەتان لە بیر نەچێتەوە. بۆ ئەوەی کە ڕۆحی ئێمە بە موەفەقیەتی ئێوەوە دائیمەن شادمان بێ لە هیچ شتێک سڵ مەکەن و، بە برینداری و شان و شەرەفەوە وەرنەوە سەر باڵینی ئیحتیزاری ئێمە و، بە دەستی خۆتان دیدەی نیگەرانی ئێمە لێک بنێن.

"نەقەرات: چەند منداڵێک

"نەتیجەی زەفەر کە تەئمینی سەعادەت و مەسەرەتی دلاوەرانی وەتەنپەروەر دەکا نەتیجەی ئامالی ئێمەیە. مردنێک، کە تەئمینی ژیانی ئەبەدی دڵی میللەتێک بکا یەگانە غایەی موقەدەسی ئێمەیە. ئەو ترسنۆکانەی لە ژێر باری حەیات دا دەناڵێنن لە ژیان نەگەیشتون. ئەوانەی کە لە ڕێی سەعادەت و ڕەفاهی میللەتی خۆیان دا ئیفنای حەیاتیان کردوە، هەر ئەوان ژیاون و ئەژین. هەوەڵ دەرسی ئێمە لە ئاغوشی مادەردا، لە سەر ریحلەی مەکتەب، ئەمە بو.

"نەقەرات: سێ چوار ژنی مێردار

"بڕۆن ئەی ڕەفیقان! دلاوەران! شەڕ جەژنی ئێوەیە. بڕۆن ئەی جەنگاوەران، بڕۆن هەتا بە موزەفەریەت ئەگەڕێنەوە. بۆ گوڵبارانی ئێوە و تەزیینی تاقی زەفەرتان ئێمەیش گوڵ ئەچنینەوە. ئەگەر دەستی

زوڵمی زەمانە چەند وجودێکی عەزیزی ئێوە ئەبەدیەن لە ئێمە جوێ بکاتەوە، ئێمەیش بە زەفەر و غالبیەتی ئێوەوە ئەبەدیەن ئەلاوێنینەوە و، فکری ئینتیقامی ئێوە بە صورەتێک تەلقین ئەو شێربەچانەی، کە لە باوەش و زکماندایە، دەکەین کە هەر قەترەیەکی خوێنی ئێوە ببێتە دەریایەک کە سەد هەزار زاڵمان غەرق بکات.

"نەقەرات: چەند کچێک

"ئێمە کە خوشکانی قەهرەمانین و هێشتا رابیتەی موقەدەسی ئیزدواج لامان مەجهولە ئەگەر لەگەڵ حەیاتی ئێمەدا نەوجەوانانی وەتەن ئارەزوی ئیشتراک بکەن لازمە بە چەهرەیەکی ئارایش و راویەی زەفەرەوە عەودەت بکەنەوە و بۆ ئیستیحسالی ئەم غایە موقەدەسە لەم شەڕە موبارەکەدا خوێنی خۆیان رژاندبێت.

"نەقەرات: تاقمی جەنگاوەران

"لە ژێر ئەم چەک و سیلاحەدا لە حزوری خوای عالەمیان و ئەم عەشاماتە و دایک و باوک و خوشک و برا و ماڵ و منداڵمان دا سوێند دەخۆین کە ریشەی زوڵم و زاڵمان بکێشینەوە و ئەمن و ئاسایش لەم کوردستانەدا تەئسیس و تەئمین بکەین.

"بەندە بە جامەیەکی زەرین فرۆشتەنییەوە کە بە ئەمانەت لام بێ نامەوێ خود نمایی بکەم بینائەن عەلەیهی دەرحەق ئەم گۆرانیە کە ناوی (گۆرانی عەزیمەتە) نەختێ عەرزی مەعلومات بەلازم ئەزانم.

"ئەم گۆرانیە لە تەرەف ژنە فرانسزێکەوە کە ناوی (ماری جوزیف شەنی) ە، وتراوە و لەناو فرانسزەکاندا بوە بە گۆرانیەکی زۆر مەرغوب و مەشهوری میللی. بەندە کە خوێندمەوە ئەم مەوزوعەم وەک فەورانی حسیاتی عموم کە لەم موحیتەدا بەرامبەر زوڵم و ئیعتیسافی شێخ مەحمود و تەبەعەی وە لە کوردستانی شیمالیدا بەرامبەر ئیستیبداد و وەحشیەتی تورک حاصل بوبێت وا هاتە پێش چاوم. وە فیکری مونەزیمەکەی، کە ئەساس تەشکیل دەکا، بە نەزەری ئەحوالی روحیە و تەمایولاتی خۆمانەوە نەختێ هەڵم گێڕایەوە و بە موقەدیمەیەکەوە عەرزم کرد لە تەرجومە کردنی غەرەزی ئەسڵیشم ئەگەر یەکێ لە شاعیرەکانمان مەوزوعەکەی لا چاک بو بە زمانی خۆمان نەزمی بفەرموێ تاکو لە تەرەف مناڵەکانی مەکتەبەوە بە گۆرانی بیێژرێ لام وایە ئەم هیمەتە هەمو هاوخوێن و هاوزمانمان خۆش حاڵ دەکا."

دواتر م. نوری ئەم بابەتەی کردەوە بە شیعر.

مەحمود جەودەت، لە ژ12 ی 9 ی کانونی سانی 1924 دا بە بێ ناونیشان وتارێکی لە کتێبێکی بێگانەوە وەرگرتوە. هەروەها لە ژ26 و 27 دا، (رێگای نەجات: هاوار مەعاریف رێگای نەجات) ی نوسیوە.

مەحمود جەودەت، ئەگەرچی لێرەدا ئەویش دژی شێخ مەحمودی نوسیوە و، بەراوردێکی نابەجێی زوڵم و زۆری شێخ مەحمود و حکومەتی تورکیا ئەکا، بەڵام مەحمود جەودەت ئەفسەرێکی کوردپەروەر و نوسەرو وەرگێڕێکی بە توانا بوە.

ساڵی 1930 دوای روداوی شەشی رەشی ئەیلول، کە شێخ مەحمود دەستی کردوە بە خەباتی چەکدار، ئەم ریزی جەیشی عیراقی بە جێ هێشت و چوە ناو شۆڕشەکەوە. لەسەر ئەوەی بەڕێوەبەری دائیرەیەک سوکایەتی پێ کرد سەبارەت بەوەی لە شۆڕشی کوردا بەشدار بوە، بەڕێوەبەرەکەی لەناو دائیرەکەدا کوشت، دادگا بڕیاری خنکاندنیدا. ساڵی 1937 لە بەغداد ئیعدام کرا و، تەرمەکەیان هێنایەوە بۆ سلێمانی.

# 4. پشتیوانی لە شۆڕشی 1925ی کوردەکانی تورکیا

## 4. 1. هەواڵەکانی تورکیا

### 4. 1. 1. هەواڵی حکومەتی تورکیا

ژیانەوە هەر لە سەرەتای دەرچونیەوە یەکێ لە کارەکانی شێواندنی وێنەی تورکیای کەمالی بوە بۆ ئەوەی لە بەر چاوی کورد رەش و دزێوی بکا، چونکە لەو کاتەدا تورکیا و ئینگلیز لە سەر مەسەلەی ولایەتی موسڵ ناکۆک بون. تورک داوای ولایەتی موسڵی ئەکردەوە، ئینگلیزیش ئەیویست بیخاتە سەر عیراق. بۆ ئەو مەبەستەیش ئیستیفتایەک لە ناو دانیشتوانی ولایەتی موسڵدا لە لایەن کۆمەڵەی گەلانەوە بە دەستەوە بو بۆ ئەوەی دانیشتوانی ناوچەکە رەئی بدەن کە ئاخۆ بخرێنە سەر عیراق یان بدرێنەوە بە تورکیا. سەرەڕای ئەمەش شێخ مەحمود، سەرکردەی جوڵانەوەی کورد لە عیراقدا کە لەو کاتەدا لە شۆڕشدا بو، دژی ئینگلیز و عیراق، پێوەندی لەگەڵ تورک دامەزراند بو، نوێنەریان هاتوچۆی یەکتری و نامەیان ئالوگۆڕ ئەکرد.

بەر لە هەڵگیرسانی شۆڕشی 1925 (ژیانەوە) دەیان هەواڵی لەسەر تورکیای کەمالی بڵاوکردۆتەوە. هەواڵەکانیشی زۆر زیرەکانە هەڵبژاردوە و داڕشتوە بۆ ئەوەی وێنەی کەمالیەکان و، رژیمەکەیان لە بەرچاوی خوێندەوارەکانی خراپ بکا. بۆ بزواندنی هەستی دینی و نەتەوەیی کورد چەند هەواڵی بڵاوکردۆتەوە، بۆ نمونە:

لە ژ1 ی 18 ی ئاغستۆسی 1924 دا کە تەنیا 4 لاپەڕە بوە 5 هەواڵی تورکیای نوسیوە:

"لە المفیدەوە هەواڵی تورک

"ئوسەرای تورک

"حکومەتی تورک خەریکی رێکخستنی هەیئەتێکە بینێرێ بۆ روسیە بۆ تەشەبوس کردنی ئیستیردادی ئوسەرای تورک.

"تورکیا و فرۆشتنی ئاساری خولەفا

"وەکیلی مالیە لە ئەنقەرە لە ئیزاحێکدا کە داوێتی تـوکزیبی هەمـو ئەو شـایعانەی کـردوە کە ئەیـانوت حکومەت نیەتی کردوە ئاساری خەلیفەکان بفرۆشێ و زەنی وا ئەچێ کە لە پـاش ئەم ئیـزاحە رەسـمیە هەمـو موناقەشات بە گەرمی لە بابەت ئەم مەسئەلەیەوە نیهایەتی دێ.

"باران و لافاو لە ئەستەموڵ

"لەم رۆژانەدا بارانێکی زۆر لە ئەستەموڵ باریوە و تەقریبەن بایی 500 هەزار لیرە زەرەری داوە."

"هەیئەتێک لە ئەستەمولەوە چوە بۆ مەجارستان و ئەڵمانیا بۆ ئینتیخابی موتەخەصیصینی زەراعەت کە لە وەزارەتی زەراعەت دا ئیسـتیخدام بکـرێن و بـۆ کڕینـی ئـالاتی زەراعەت کە بە سـەر فەلاحـان دا تەوزیـع بکرێ."

"وەکالەتی مەعاریفی ئەنقەرە قەرار و ئەمری داوە کە تەدریساتی مەکتەبەکانی ئیسرائیلیە کە فرانسـزی بو، مەنع بکرێ."

لە ژ2 ی رۆژی 26 ی ئـابی 1924 دا 8 هەواڵـی لەسـەر تورکیـا بڵاوکـردۆتەوە یەکێکیـان لە ژێـر سەردێڕی (ئیلتیجای عەسکەری تورک بۆ عیراق) دا نوسیوێتی:

"لە موصـڵەوە خەبەر هـاتوە کە نزیکـی 40 نەفەر عەسـکەری تـورک لەم رۆژانەدا لەبەر پەرێشـانی و موزایەقەی ئۆردوی تورک رایان کردوە و ئیلتیجایان کردوە بە عیـراق. هەرچـی ئیحتیـاجی پـێ دەفـع بکـرێ دەسیان ناکەوێ، لەگەڵ ئەوەیشا دائیمەن روت و قوت و پەرێشان بون.

"ئەهالی موصل بە چاوی خۆیان دییان کە ئەو عەسکەرە مولتەجییانە لە پارچە پەڵاسێک زیاتر هیچی تریان لە بەرا نەبوە و هەمو لەشیان بە دەرەوە بوە، زۆر کز و سەفیل بون، هەمو دڵیان بۆیان ئەسوتا. عەسکەرەکان هەمو غەبتە بە ئەهلی عیراق ئەبەن کەوا عومرێکی خۆش رائەبوێرن و خۆیان وتبویان بەم حاڵەوە ئێوە ئەهلی بەهەشتن و ئێمە ئەهلی جەهەنم.

"بە قسەی ئەوان ئەهالی ئەو جێگایانەی کە نزیکی حدودن لە تاوانا هەمو حەز ئەکەن بە تابیعیی عیراق، چونکە ئەو خۆشی و سەعادەتەی عیراق هەیەتی ئەوان نییانە. دایمە نەخۆشیان ئەهێننە خەستەخانەکانی عیراق کە لە سەر حدودە."

لە ژ3 ی 1 ی ئەیلولی 1924 دا لە ناو هەواڵەکانی تورکیادا نوسیویێتی:

"شەرق لە غەزەتەکانی غەرب دا

"خەتەری ئەحواڵی بەینی تورک و روس

"عەلاقاتی بەینی روس و تورک لە حاڵێکی خراپایە. لەم رۆژانەدا شایعە وا بوە کە حکومەتی مۆسقۆ داوای ولایەتی قارسی کردۆتەوە لە حکومەتی ئەنقەرە ئەساسی ئەم خەبەرە ئەوە بوە گوایە قوماندانی قوەی روسیە لەسەر حدودی قەفقاس بە قوماندانی تورکی وتوە قوەتەکەی تا مەسافەی کیلۆمەترێک بکێشێتە دواوە کە بەم کشانەوەیە جێگای لەوەر و چیمەنەکان کە لەو ناوەدایە بۆیان خاڵی بکرێت. قوماندانی روس هەڕەشەی لە قوماندانی تورک کردوە کە ئەگەر بە قسەی نەکا و نەڕوا دەستی لێ ئەداتە سیلاح و جوابی قوماندانی تورک ئەوە بوە کە هەر کەسێ تەجاوزی حدود بکا تەقەی لێ ئەکرێ."

دەنگوباسێکی کەی ئەم ژمارەیە:

"لە بەینی عەرەب و تورک دا

"لە ئەدەنە لە بەینی عەرەب و تورک دا هەرایەک قەوماوە و چەند کەسێکی تیا برینداربوە حکومەت موداخەلەی کردوە."

لە ژ4 ی 5 ی ئەیلول دا هەواڵێکی تر:

"لە المفیدەوە: قەزاوقەدەر لە ئەستەموڵ

"ئەستەموڵ 31 ی ئاغستۆس، مەخزەنی باروت لە مەقەڕی کوی ئاگری تێ بەر بوە و 15 کەس تەلەف بوە."

لە ژ5 ی 26 ی ئەیلول دا نوسیویێتی:

"مەکاتیبی یەهودیە

"بێجگە لەوەی تورکیا مەنعی ئەجنەبیەکانی کرد لە تەدریساتی غەیرەز تورکی لەم ئاخریەدا ئەمر کرا کە لە مەکتەبە یەهودیەکان دا تەدریساتی لیسانی عیبرانی نەبێ. هەرچەند ئەو مەکتەبانە هەیئەتێکیان ناردە لای وەزیری مەعاریفی تورکیا بۆ رجای گێڕانەوەی ئەم قەرارە مەجلیسی وزەرا بەحسی ئەم تەڵەبەی کردوە و لە نەتیجەدا قەراری دا کە رەدی بکاتەوە."

لە ژ6 دا 9 هەواڵی جیاجیای تورکیای بڵاوکردۆتەوە، لەوانە:

"ئیختیلال لە تەرابزون

"شیرکەتی ئیتالیا بەیانی کرد کە ئەحواڵ لە تەرابزون زۆر ناخۆشە و شەڕێک لە بەینی پۆلیس و موعاریزەکانی جمهوریەتی تورکی بێ دین دا واقیع بوە."

"والی حەکاری

"لەو وەقتەدا کە والی حەکاری عەلی رەفعەت بەگ و مەعیەتی ئەچون بۆ ئاوایی چال بەعزێک نەستوری لە کەمین دا بون دەسترێژیان لێ کردوە قەریبی 8 ـ 10 کەس بریندار بو، والی و چەند نەفەرێک کوژران."

"قانونی حقوقی عائیلە لە تورکیا

"قومیسیۆنی قانونی عائیلە قەراری دا کە هەر ژنێ مێردەکەی 2 ساڵ لێی غائیب ببێت بە موتەلەقە ئیعتیبار بکرێ."

چەند هەواڵێکی کە دەربارەی (تەوسیعی حدودی شیمالی عیراق) و، (لۆقەنتەی یەلدز) کە باسی ئەوە ئەکا حکومەت ئەم کۆشکە مێژوییەی سوڵتانی عوسمانی ساڵی بە 2 ملیۆن لیرە بە کرێ داوە بە کۆمپانیەک تا بیکەن بە ئوتێل. هەروەها باسی خەلیفەی لێخراو ئەکا کە لەبەر دەسکورتی ئەیەوێ بگوێزێتەوە کۆشکێکی پچوک لە نیس.

لە ژ7 ی 17 ی تشرینی یەکەمی 1924 دا لە ژێر سەردێڕی: (ئەخباری تورکیا: ئینقیلابێکی ئاتی لە تورکیا) نوسیوێتی:

"لە ئەناتۆڵ دا بە دزییەوە تەشەبوسات هەیە بۆ مەحوی جمهوریەتی تورکیە و دانانەوەی خەلافەت وەکو زەمانی پێشو، حکومەتی ئەنقەرە زۆر موقەدیمەی ئەم حەرەکەتەی کەشف کردوە و تێی گەیشتوە کە سەرکردەی ئەم ئیشە پیاوە گەورەکانی دین و ئۆردون و لە معاونە قەدیمەکانی سوڵتانن.

حکومەتی ئەنقەرە زۆر خەریکە بە تەنبهیات کە ئەم خەبەرە بڵاونەکرێتەوە و، تەنبیهی غەزەتەکانی کردوە، کە هیچ لەم بەحسە نەنوسن مەبادا ئەفکاری عومیە تێک بچێ. ئەسبابی زهوری ئەم حەرەکەتە لەغو کردنەوەی ئوصول و ئادابی دینیەیە لە مەملەکەت دا و، ئێستا پیاوە موتەدەینەکان موقابیل بە سیاسیەکان، بون بە موجیبی ئینقیلاب و، مەسلەکەکانی وەکو نەقشبەندی، مەولەوی، بەکتاشی بون بە جەمعیاتی ئینقیلاب و لە قەتل و فەساد قسور ناکەن.

"هەفتەی رابوردو حکومەت موەفەق بو بۆ دۆزینەوەی بەعزێ مەراکیزی ئەم ئیشانە و، گەلێ ئەوراقی موهیمی دەردەست کرد و، حاڵی بو کە حەرەکەتێکی گەورە بە دەستەوەیە بۆ وەرگێڕانی جمهوریەت و، رۆژی دوایی زۆر مەشایخی صاحیب تەریقەت و زابتانی ئۆردوی تەوقیف کرد کە لەم مەسئەلەیەدا ئیش بە دەست بون. بەعزێ زابتان ئیقراریان بە زۆر ئەسرار کرد. وا دیارە خەیاڵیان بوە بە دزیەوە ئۆردویەکی خەفی تەشکیل بکەن. لە بەر ئەوە حکومەت تەدابیری موهیمەی ئیتیخاز کرد بۆ مەحوکردنەوەی ئەم تەشەبوسە. بۆ حکومەت مەعلوم بوە کە ئەم ئیشە دەستی جەمعیەتی ئیتیحاد و تەرەقی تیا بوە و ئەمری دا کە ئەعزاکانی ئەم جەمعیەتە تەرد بکرێن، رەئوف بەگ و رەئفەت پاشا داخلن."

هەواڵێکی تری ئەم ژمارەیە:

"تێکشکانی 5 تەیارەی تورک

"گێژەلوکەیەک پەیدا بوە لە مەیدانی ئەیاستفانوس کە جێگای جوڵان و نیشتنەوەی تەیارەیە و 5 تەیارەی خست ئەمانە سیانیان لە ئیزمیرەوە هاتبون."

لە ژ8 ی 24 ی تشرینی یەکەمی 1924 دا 4 هەواڵی نوسیوە:

"هەواڵی تورک

لە ئەستەموڵ، 11 هەزار زابتانی ئیحتیاتی تورک جەمعیەتێکیان تەشکیل کردوە و تەرتیباتیان بۆ دامەزراندنەوەی مەرکەزەکەیان لە ئەستەموڵ داناوە و دو شوعبەیان بۆ کردۆتەوە یەکێکیان لە ئیزمیر.

مەقصەدی ئەصلی کارێکی وا بکەن لەگەڵ حکومەت کە تەدبیریان بۆ بکا مەعیشەتیان تەئمین بکرێ. حکومەت تەقدیری خزمەتی کرد بون و وەعدەی پێ دابون کە موکافاتیان بداتەوە فەقەت ئیشوکار ئەوەندە زۆر بو حکومەت نەیپەرژایە سەریان و ئیستا ئومێدیان هەیە کە حکومەتی تورک موکافاتیان بداتەوە."

"شەوی پێنجەمی مانگی رابوردو والی ئەستەموڵ نیوەشەو ئەمری دا بە عەسکەر و ژاندرمە کە بە شاری ئەستەموڵ دا بە سلاحەوە بسورێنەوە و هەمو تەجهیزاتی حەربیەیان لەگەڵ خۆیان بگێرن و هاتوچۆی ترامەوای و رێبواریان مەنع کرد. ئەهالی زۆر کەوتە تەلاشەوە. ئەمە 3 سەعات دەوامی کرد. سبحەینێ غەزەتەکان ئینتیشاریان کرد مەعلوم بو کە والی هەر بۆ مونـاوەرە و تێگەیشتنی حازری ئۆردوەکە ئەمەی کردوە."

هەواڵێکی کەی لە رۆژنامەی الموصل وەرگرتوە و لە ژێر سەردێری: (ئیختاری تورک بۆ سەر کوردە مئەوەرەکان) نوسیوێتیەوە:

"حکومەتی تورک کە دائیمەن تەرەصودی کوردە منەوەرەکان ئەکا شیدەتی دا بە موراقەبەی کوردە منەوەرەکانی دیاربەکر و ماردین. ئەڵێ ئێوە خەریکن لە تورکیا جوێ ببنەوە و خۆتان بخەنە سەر کوردەکانی عیراق و، وەکو ئەوان بە ئیستراحەت و حورییەت رابوێرن. حکومەتی دیاربەکر زۆر لە کوردە گەورەکانی نەفی کرد بۆ داخلە ئەناتۆل وەکو نەفی کردنی ئەرمەنی و رۆمەکانی ئەستەموڵ و عەرەبەکانی کلیکیا."

هەواڵێکی تری ئەم ژمارەیە:

"لە بەینی تورک و یۆنان دا

"ئەستەموڵ 13 ی مینهو، ئەمر درا بە 13 هەزار یۆنانی لە ئەستەموڵ دا کە بڕۆنەوە بۆ یۆنانستان. ئەگەر لە پاش تەواوبونی ئەم مودەتە بمێننەوە ئەفرادی پۆلیس دەریان ئەکا. قومیسیۆنی موبادەلی تەبەعەی تورک و یۆنان زۆری پێ ناخۆش بو."

لە ژ9 ی 21 ی تشرینی سانی 1924 دا چەند هەواڵێکی تورکیای نوسیوە. هەندێکیان پێوەندییان بە کێشەی موسڵەوە هەیە و، دویان پێوەندییان بە جوڵانەوەی کوردەوە هەیە. لە یەکێکیاندا هەواڵی هاتنی ئیحسان نوری بۆ بەغداد و ئەوی تریان باسی یاخیبونی کوردەکانی وان ئەکا لە تورک. هەروەها ئەم 2 هەواڵەیشی بڵاوکردۆتەوە:

"زەلزەلە لە ئەرزرۆم

"خەبەری زەلزەلەی ئەرزرۆم وەهایە کە زۆر فەجیع بوە و لە چوار قەزا هیچ ئاواییەک بێ زەرەر نەبوە زۆر لە ئەهالی بێ جێگا ماوە 114 کەس کوژراوە ئەهالی هێشتا هەر ئەترسن و زۆریان چونە سەر شاخەکان."

"ئینتیحار لە ئەستەموڵ

هیچ رۆژێک نیە کە لەبەر زەیقەتی مەعیشەت و بێ دەستی راپۆری دوسێ ئینتیحار لە تەرەف پۆلیسەوە نەدرێ."

لە ژ10 دا هەواڵێکی لە سەر گرژیی نێوانی تورک و ئێران و (سیاحەتی مستەفا کەمال پاشا) و (نەخۆشی عیصمەت پاشا) لەگەڵ ئەوانەدا ئەم دەنگوباسانەشی نوسیوە:

"لەغو کردنەوەی تەدریساتی دینیە لە تورکیا

"وەزارەتی مەعاریفی تورکیا لائیحەیەکی تازەی بۆ دەرسی مەکتەبە ئیبتیدائیەکان تەرتیب کردوە بە پێی ئەو لائیحەیە تەدریساتی دینیە لەغوە."

"دزی

"لە خەزێنەی بانقی عوسمانی لە ئەستەموڵ 40 هەزار لیرە دزراوە."

"وەفات

"زیا گوێک ئالب بەگ کە لە گەورەکانی ریجالی ئینقیلابی تورک بو وەفاتی کرد."

زیا گوێک ئالب بە ڕێچەڵـەک کـورد بـوە. هەنـدێ نوسـینی بە کـوردی هەیە و هەنـدێ لێکـۆڵینەوەی سۆسیۆلۆجی لەسەر کورد نوسیوە. بەڵام دوایی بو بە یەکێ لە تیۆریسیەنەکانی بیروباوەڕی تۆرانیزم.

هەواڵێکی تری ئەم ژمارەیە:

"جەمعیەتێکی خەفی

"پۆلیسی ئەستانبوڵ قۆمیتەیەکی ئەرمەنی و ڕۆمـی کەشـف کـرد کە ئەصـلی مەرکەزەکەی لە ئەتەنەیە و مەقسەدیان کوشتنی مستەفا کەمال پاشایە.

"پێنج ئەرمەنی کە تازە هاتونەتە ئەستەموڵ لەسەر ئەمە گیراون کەشف کراوە کە سـیلاح و بۆمباشـیان پێ بوە."

لە ژ13 دا نوسیوێتی:

"شایعە وایە لە ئەنقەرە کە مستەفا کەمال پاشا نیەتی هەیە ئیستیعفا بکا لە ریاسەتی جمهـوریەت و بـۆ خاتری ئەوە بێتە مەیدانی سیاسەتەوە لەگەڵ رەقیبەکـانی ببـێ بە رەئیسـی وزەرا و ئومێـد ئەکـرێ کە فەوزی پاشا ببێ بە رەئیسی جمهور."

"هەواڵی تورک

"قەسرەکانی سوڵتانەکان لە تورکیا

"لە ئەستەموڵ شایعە وایە کە تورکەکان نیەتیان هەیە قەسری سوڵتان مەحمـودی خـامیس کە مەشـهورە بە قەسری دۆلمەباخچە بفرۆشن. ئەم شایعە حسیاتی ئەهالی ئەستەمولی هێناوەتە غەلەیان.

"ئەو شیرکەتە کە ئەڵێن قەسرەکە ئەکرێ ئەیکا بە ئوتێل و باغچە بۆ یاری."

"ئیتیحادچیەکان زیندو ئەبنەوە

"غەزەتەی اقدام مەقالەیەکی درێـژی لە بـابەت کاروبـاری جەمعیەتـی ئیتیحـاد و تەرەقـی خەفـی نەشـر کردوە. خولاصەکەی ئەڵێ: ئیتیحادچیەکان بە دزیەوە دائیمەن تەشکیلاتیان زیاد و قـایمتر ئەکەن بـۆ خـاتری هەر وەقتێ وقوعاتێک لە مەملەکەتەدا روی دا فرسەتی لێ بزانن و ئیشی خۆیان بکەن.

"پارتی ئیتحادچیەکان تێ گەیشتون کە پارتی حکومەتپەروەرەکان زۆر زەعیف بـون بیلخاصـە لە ولایەتـی ئیزمیر و تەرەبزون و ئەرزرۆم دا لەبەر ئەوە لەو 3 ولایەتەدا خەریکن تەقویەی جەمعیەتی خۆیان ئەکەن.

"غەزەتەیەکی عصر کە لە ئیزمیر دەرئەچێ ئەڵێ لێرە ئینقیلابێک بە دەستەوەیە کە جەمعیەتی ئیتیحاد و تەرەقی سابیق زیندو بکاتەوە و محافەزەی مەوجودیەت و ئیستیقلال بە چاکی بکا."

لە ژمارەکانی داهاتودا کە ئیتر هەواڵی شۆڕشی کورد بڵاوبۆتەوە، ڕۆژنامەکە کەمتر بایەخی بە هەواڵـی تورکیا و زۆرتر بایەخی بە بڵاوکردنەوەی هەواڵی شۆڕشەکە داوە، وتـار و لێـدوانی سیاسـی درێـژی لە سـەر نوسیوە.

### 4. 1. 2. هەڵگیرسانی شۆڕشی کورد

پاش دەرکردنی هێزی یۆنانی لە تورکیا و سەرکەوتنی مستەفا کەمال لە جەنگی سەربەخۆییدا (هاوینی 1922) دەوڵەتانی هاوپەیمـان، پەیمـانی لۆزانیـان لەگەڵ تورکیـا ئیمـزا کـرد. مسـتەفا کەمـال نەک هەر ئەو

بەڵێنانەی کە بە سەرانی کوردی دابو لە بیری خۆی بـردنەوە، بەڵکـو کەوتە دانـانی رێوشـوێنی توانـدنەوەی کورد. هەمو ئەو رێکخراو و بڵاوکراوانەی کورد دایانمەزراند بون، داخست و، هەمو جۆرە چالاکیەکی کـوردی قەدەغە کرد. سەرانی کورد ئەوەیان بە ئاشکرا بۆ رون بوەوە کە مستەفا کەمال فێڵی لێ کردون.

خالید بەگی جبرانی کە سەرۆکی عەشیرەتی جبران و، دەرچوی خوێندنگەی جەنگیی حەمیدی بـو، وە یەکێ بو لە کەسایەتیە ناسراوەکانی کورد، ساڵی 1923 بە هاوکاری یوسف زیا بەگ کە لە میرەکانی بتلـیس و، ئەندامی پێشوی ئەنجومەنی نەتەوەیی گەورەی تـورک بـو، (جەمعیەتـی ئـازادی کورسـتان) ی دامەزرانـد. ئامانجی جەمعیەت سەربەخۆیی کوردستان بو.

هەنگاوەکانی حکومەتی تورک بۆ تواندنەوەی کـورد لە لایەک و، هەوڵـدان بـۆ جیـاکردنەوەی دیـن لە دەوڵەت لە لایەکی ترەوە، زەمینەی پەرەسەندنی جەمعیەتی خۆشتر کرد. شێخ سەعیدی پیران، شێخی تەریقەتی نەقشبەندی کە خاوەنی نفوزێکی زۆر گەورە بو لە ناو کوردەکانی تورکیادا، ئەویش بو بە یەکێ لە هاوکـارانی جەمعیەت.

جەمعیەت کەوتە ئامادەکردنی رێوشوێنی شۆڕشی چەکدار.

نەستوریەکانی هەکاری لە حکومەتی تورک یاخی بون. حکومەتی تورک فەرمانی دا بە ئیحسان نـوری کە فەرماندەی هێزێکی سەربازی بو لە (بەیت شەباب) بچێ بۆ دامرکانـدنەوەی ئەم شۆڕشـە. ئیحسـان نـوری پەیامێکی لە یوسف زیاوە پێ ئەگا بەڵام بە هەڵە لێی تێ ئەگا و، فەرمانی جوڵاندنی هێزەکەی بە هەل ئەزانـێ و، لە 4 ی ئەیلولی 1924 دا یاخیبونی هێزەکەی رائەگەیـەنـێ و، ئەچێـتە شـاخ. لەبەرئەوەی ئەم کـاتە کـاتی دیاریکراوی دەستپێکردنی شۆڕشـی بڕیـاردراو نەبـو، خـۆی بە تەنیـا ئەمێنێـتەوە و جـوڵانەوەکەی شکسـت ئەخوا. ئیحسان نوری لە پێشدا ئەچێتە سوریا کە ئەوسا لە ژێر ئینتیدابی فەرەنسیدا بو. دواتر پەنا ئەباتـە بەر عیراق، ئەوسا لەژێر ئینتیدامی بەریتانیادا بو، وە لەگەڵ تورکیا سەبارەت بە ولایەتی موسـڵ لە نـاکۆکیدا بو.

ژ9 ی 31 ی تشرینی دوەمی 1924 ی ژیانەوە، هەواڵی هاتنی ئیحسان نوری بەم جۆرە نوسیوە:
"ئیحتیفالی کوردەکان بە هاووڵاتییەکانیان

"فوزەلا و منەوەرانی کورد لە ئۆتێلی ئەلهیلال بە شەرەفی جەنـابی ئیحسـان بەگ و رەفیقەکـانیەوە کە لەم ئاخرییەدا تەشریفیان هاتوە، زیافەتێکیان دا. لەم زیافەتەدا، ئیعتیرافی سـەعی و جەهـدیان کـرا، کە لە خـزمەت کـوردا بەزلیـان کـردوە موقابیـل بە تورکەکـان، کە دائـیمەن خەریکـن ئەم عونصـورە مەحـو بکەنەوە."

دوای ئەم جوڵانەوەیەی ئیحسان نوری، حکومەتی تورک کەوتۆتە پەیجـوری دۆزیـنەوەی چالاکەکـانی کورد. خالید بەگی سەرۆکی جەمعیەتی ئازادی و یوسف زیا و چەند کەسێکی کەی لە کەسایەتیە ناسراوەکانی کوردستان گرتوە. گرتنی سەرکردەکانی جەمعیەت پلانەکەیان تێک ئەدا، لە چەند جێیەک پێکادان ئەقەمێ. پـێ ئەچـێ تـورک خـۆی ئەو وردە شـەڕانەی دروسـت کردبـێ بـۆ لەبـار بردنـی جـوڵانەوەکەی و، دۆزیـنەوەی سەرەداوەکانی.

دوای گیرانی خالید بەگ، شێخ سەعید ئەبێتە سەرۆکی جەمعیەتی ئازادی. جەمعیەتی ئازادی بڕیار ئەدا لە سەرەتای بەهاری 1925 دا شۆڕش لە کوردستانی تورکیا دەس پێ بکا. پێش ئەو کـاتە تـورک ئەکەوێـتە راونانی تێکۆشەرانی کورد، لە چەند شوێن شەڕ و پێکادان دەس پێ ئەکـا، پـێش ئەوەی خـۆ ئامـادە کردنـی شۆڕشگێڕان تەواو بێ، پێشوەخت شۆڕش دەس پێ ئەکا.

### 4. 1. 3. هەواڵی شۆڕشی کورد

لەسەر شۆڕشی 1925 ی کوردەکانی تورکیا سـەرچاوە زۆر لە بەر دەسدا نـیە، لێکـۆڵینەوەی تەواوی لەسەر نەکراوە. ژیانەوە سەرچاوەیەکی گرنگە بۆ زانینی دەنگوباسی شۆڕشی 1925 ی کوردەکـانی تورکیـا و، ئامانجی شۆڕشەکە و سەرکردەکانی و هۆی سەرنەکەوتنی. لەو کاتەدا کە کێشـەی موسـڵ هێشـتا بە لایەک دا نەکەوت بو، ئینگلیز چاوپۆشی لە ڕۆشنبیرانی کوردی عیراقی کردوە، پشتیوانی گەرم لەم شۆڕشە بکەن. بە مەیش ویستویەتی بە چاکترین شێوە کەڵک لە دەنگوباسەکانی ئەم شۆڕشە وەربگرێ بۆ وروژانـدنی هەسـتی دوژمنانەی دانیشتوانی کوردستانی جنوبی دژی تورک، بۆ ئەوەی لەو ئیستیفتایەدا کە بە دەستەوە بوە بکرێ بۆ زانینی بیروڕای دانیشتوانی ناوچەکە کە ئاخۆ ئەیانەوێ بخـرێنە سـەر تورکیـا یـان عیـراق، بە قـازانجی عیراق و دژی تورکیا دەنگ بدەن.

ژ9 ی 31 ی تشرینی دوەمی 1924 نوسیوێتی:

"کوردەکانی وان موقابیل بە تورک عصیان ئەکەن

"کوردەکانی ولایەتی وان موقـابیلی تـورک لە عصـیان دان. ئەسـبابی ئەمەیـش ئەوەیە کە لە خسـوس خەلعی خەلیفەوە لە نوقتەی نەزەری دینیەوە ڕەنجیـدە بـون، ئەسـبابێکی تـریش ئەوەیە کە تـورک زۆر کـۆنە عەسکەری مەرەخەسکراوی هێناوە لە خاکی کوردا لە جێگای ئەرمەنیەکان ئیسکانی کردون."

ژ19 ی 2 ی مارتی 1925 نوسیوێتی:

"ئاژانسی ڕۆیتەر:

"ئەستەمبول 24 ی 2 ی 25، خەبەرێکی ئەنقەرە بەیان ئەکا کە لە ئەغڵەبی قەزاکاندا قیـام و عسـیانی کوردەکان دەستی پێ کردوە. ئەمەش لەژێر ئیدارەی مەلا سەعید دایە کە تورکەکان ئەڵێن سـاحێب تەعەسـوبی دینی‌یە و مەقسەدی ئەوەیە کە خەلافەت ئیرجاع بکاتەوە.

"ئەم قیامە زاهیرەن بە پیلانێکی واسـیع تەرتیـب کـراوە و بە مەهـارەت و تەشـکیلاتێکی بـاش لەژێـر ئیدارەی زەواتی موقتەدیرەدا کراوە.

"ئیدارەی عورفی لە ولایەتەکانی حەکاری، ماردین، وان، بتلیس ئـیعلان کـراوە. وە ئەمـڕۆ خەبەر دراوە کە عاسیەکان خەرپوت، دیاربەکر، دەرسیمیان ئیشغال کردوە.

"ئەم مەلا سـەعیدە، کە ئیسـمی بەیـان کـراوە، مەشـهور مەلا سـەعیدە کە بە لەقەبـی (بەدیـع ئەلزەمـان) مەشهورە ئەم زاتە یەکێکە لە ئەجیلەی ڕیجال و میللەتپەروەرانی قەومی کـورد. زاتێکـی زۆر فازیـل، مـوقتەدیر، ساحێب عەزم و نفوزە. ئێسـتا کە ئەم قیـامە عمـومیە تەرتیـب کـراوە ئومێـد دەکەیـن کە ئینشـائەڵڵا ببـێ بە باعیسی نەجاتی کوردە مەزڵومەکان لە دەست مەزاڵیمی تورک و هەمومـان تەمەنـای ئەمە دەکەیـن کە خـوا لەم ئەمەلە موقەدەسەدا کە تەعقیبی ئەکەن موەفەقیان بکا و کوردە مەزڵومەکان لە دەست زوڵمی تورک ڕزگـار بـبن. ژیانەوە."

ئەم هەواڵە کە ژیـانەوە خـۆی دایڕشـتۆتەوە، ئەگەرچـی قسـەکانی تـورکی دوبـارە کـردۆتەوە، بەڵام هاودەردی لەگەڵ جولانەوەکە دەربڕیوە و پشتیوانی لێ کردوە و ستایشی ڕابەری جولانەوەکە ئەکـا. دیـارە لە سەرەتادا بە هەڵە وایانزانیوە کە ڕابەری جولانەوەکە مەلا سەعیدی بەدیع ئەلزەمانە، پاشان بۆیـان دەرکەوتـوە کە شێخ سەعیدە نەک مەلا سەعید، لە هەواڵەکانی دواتردا ئەم هەڵەیەیان ڕاست کردۆتەوە.

تورک بۆ ئەوەی بەرگی نەتەوەیـی و پێشـکەوتوانە لەبەر شۆڕشـەکە دامـاڵێ و، وەکـو جـولانەوەیەکی کۆنەپەرستانە لە بەرچاوی دنیا سوک و بەدناوی بکا، هەوڵی داوە شۆڕشەکە بخاتە قاڵبی ئەوەوە کە ئەمە بـۆ

هەڵوەشاندنەوەی سیستەمی جمهوری و گێڕانەوەی سەڵتەنەتی ئالی عوسمانە. ئەم بوختانەی کەمالیەکان بە شۆڕشەکەیان کردوە، لە پێشدا بە سەر ڕۆژنامەکانی دنیادا، لەوانە بە سەر ژیانەوەیش دا، تێپەڕیوە. سەیری ناوەڕۆکی ئەم هەواڵانە بکەن:

لە ژ20 ی 9 ی مارتی 1925 دا نوسراوە:

"قیامی کوردەکان و تەصریحاتی فەتحی بەگ لەو خصوصەوە

"ئەستانبوڵ: 25 ی شوباتی 1925، فەتحی بەگ، رەئیس وزەرای تورک، دوێشەو لە مەجلیسی میللی دا بەیانی کردوە، کە کوردەکانی شیمالی موباشەرەتییان کرد بە موقابەلەی حکومەت. لە وەختێکا کە مەئمورین و عەسکەری تورک بۆ دەردەست کردنی بەعزێ لە ئەتباعی مەلا سەعید ئەچن لە مەوقیعی (غەنج) کوردەکان چەند کەسێک لەو عەسکەرانەیان کوشتوە و قوماندانەکەشیان ئەسیر کردوە. لە پاشا فەتحی بەگ بەیاناتی مەلا سەعیدی لە مەجلیس دا خوێندۆتەوە کە مەزمونی ئەمە بوە: (خەلافەت ئیعادە بکرێتەوە و بە موجیبی شەریعەت عەمەل بکرێ و حکومەتی حازرە کە بە حکومەتێکی مولحید دانراوە لەغو بکرێت).

هەواڵێکی تری هەمان ژمارە ئەڵێ:

"کوڕی سولتان حەمید و تەختی کوردستان

"ئەستانبوڵ: 25 ی شوباتی 1925- لە تەلەغرافێکی ئەخیردا وەها بەیان دەکا کە مەلا سەعید لەوحەیەکی بە دیوارێکی موقابیلی سەرای حکومەتی دیاربەکردا هەڵواسیوە، لەوێ دا نوسراوە کە لە نیەتیانا هەیە یەکێک لە کوڕانی سوڵتان عەبدوڵحەمید ببێ بە مەلیک بۆ کوردستان و، وەهای بەیان کردوە کە قوەتی کورد لە دیاربەکرەوە دوانزە میل دورە."

لە ژ20 ی 9 ی مارتی 1925 دا نوسیوێتی:

"لە العالم العربیەوە: گەڕانەوەی عەسکەری تورک

"لە تەلەغرافێکدا کە لە تەرەفی موخابیری شیمالەوە هاتوە وەها بەیان دەکا، کە عمومی ئۆردوەکەی حکومەتی تورک کە لە حدودی تورکیا و عیراقدا مەوجود بو بە موناسەبەتی قیامی کوردەکانی شیمالی‌یەوە هەموی گێڕانەوە بۆ تەرەفی دیاربەکر."

"لە العراق ەوە: قیامی کوردەکان لە عەلەیهی تورکیا

"ئەستانبوڵ، 26 شوبات 1925، کوردەکان کە قیامیان کردوە دیاربەکر، مەلاتیە و ئەرغەنیان ئیستیلا و والی دیاربەکریان ئەسیر کرد.

"لە تەلەغرافێکی تردا کە لە ئەستانبوڵەوە هاتوە بە تەئریخی 26 ی مینهو: حکومەتی تورکیا ئەمری‌دا بە ئیحزار کردنی قیسمێک لە ئۆردوی ئەناتۆلی. ئەفرادی پێنج ساڵیان دەعوەت کردۆتە ژێر سیلاح. غەزەتەکانی تورکیا دەنوسن کە قیامی ئەم کوردانە بوە بە قیامێکی عومومی بۆ وەرگێڕانی جمهوریەتی تورکیا و ئیعادە کردنەوەی خەلافەت و سەڵتەنەت.

"دیسان لە تەلەغرافێکی تردا کە بە تەئریخی 27 ی مینهو لە ئەستانبوڵەوە هاتوە وا بەیان دەکا کە حکومەتی تورک پێنج سنف ئەربابی ئاستانی رەدیفی ئەوێ کە لەو ویلایەتانەن کە لە موحیتی کوردستانان دەعوەت کردۆتە ژێر سیلاح و وایش ریوایەت دەکرێ کە بۆ تەسکینی ئەم قیامە عیسمەت پاشا و یا کەمالەدین پاشا کە سەفیری تورکیایە لە بەرلین مەئمور بکرێ و ببێ بە قوماندانی ئەو ئۆردوە کە ئەنێررێ بۆ موقابەلەی کوردەکان. ئەربابی قیامەکە لەو بەیاننامانەدا کە تەوزیعیان کردوە بە عمومی ئەهالی دا نوسیویانە: (خەلیفە ئینتیزاری ئێوە دەکا. ئیسلام بەبێ خەلیفە نابێ. کوانێ شەریعەت؟ وە حکومەتی حازرەی تورک مقاوەمەتی دین دەکا. وە مولحیدێکیشن کە سەدی مەداریس دەکەن).

هەمان ژمارە ئەم هەواڵەیشی بڵاوکردۆتەوە:

"تەخسیسات بۆ ئۆردوی تورک: ئەستانبوڵ، 1 ی مارتی 1925، مەجلیسی وەتەنی ئەنقەرە تەسدیقی سەرف کردنی 265 هەزار لیرەی کرد بۆ مەساریفی قیسمێک لە ئۆردوی تورک بە موناسەبەتی قیامی کوردەکانەوە."

ژ20 ی 9 ی مارتی 1925 نوسیوێتی:

"لە العراق هوە: "تورک عاجزە لە دەست شیدەتی قۆمیتەی کورد ناتوانێ تەسکینی بدا و لەشکرەکەی لە حدودی شیمالیدا دەرباز ئەکا.

"لۆندەرە 26 ی مینهو: موحەڕیری سیاسی غەزەتەی دەیلی تەلەغراف وتویەتی: تورک حسابی قۆمیتەی کوردی لە مەنتیقەیەکی واسیعدا زۆر بە ئەهمیەت حساب کردوە. لێرە - لۆندەرە - موتەخسیسینی مەحفەلی سیاسی و عەسکەری لە شک و شوبهەدان کە تورک بتوانێ ئەم قوەتی کوردە هەڵکەنێ.

"حکومەتی تورک دو ساڵ لەمەوپێش قوەتێکی زۆری ناردبوە دەروی ڕەواندوز کە ئیرتیبات لە حدودی شیمالی عیراقدا پەیداکا ئەمساڵیش کە لوجنەی عیسبەتول ئومەم هاتە حدودی شیمالی دیسان قوەتێکی لەو حدودەدا لەسەر ڕێی دوەلی موتەفیقەدا گرد کرد بۆوە ئێستا کە ئەم قوەتەی لە حدود کوردا هەڵدەگرێ وە رادەکەن دەلیلی ئەوەیە کە دەفعی فیتنەی قۆمیتەی کوردی لە مەسئەلەی ڕەواندوز و هاتنی لوجنەی عیسبەتول ئومەمی لەلا موهیمترە.

"ئیستیلای دیاربەکر: لەپاش ئەمەی کە لە سەرەوە نوسیومانە تەلەغرافێ دیسان لە لۆندەرەوە بە تەئریخی 26 ی مینهو هاتوە دەڵێ: وەکو لە مەنابیعی غەیرە ڕەسمی خەبەر لە ئەستەمبوڵەوە هاتوە قۆمیتەی کورد شەهری دەرسیم و دیاربەکریان گرتوە، زاتەن لە پێش ئەمەیشدا خەریبوتیان گرتبو."

ژ25 ی 30 ی نیسانی 1925 نوسیوێتی:

"لە العالم العربی هوە: موکافاتی هەزار وە یاخود حەوت سەد لیرەی ئاڵتون بۆ ئەو کەسەی شێخ سەعید بە زیندویی وە یا بە مردویی دەردەست بکا.

"لەندەن 14 ی نیسان، غەزەتەی (دەیلی تەلەغراف) دەنوسێ:

"حکومەتی تورک بۆ ئەو کەسەی کە شێخ سەعید بە زیندویەتی دەردەست بکا 1000 لیرەی ئاڵتون موکافات وەعدەی داوە و، بۆ ئەو کەسەی بە کوژراوی بیگرێ 700 لیرەی ئاڵتونی مکافات داناوە.

"لە العراق هوە: ئەخباری ڕۆیتەر

"ئەستانبوڵ 15 ی نیسان، ڕەسمەن سابیت بو لە ئەنقەرەوە خەبەری دەردەست کردنی شێخ سەعید لە دێیەکا کە لە بەینی موش و فارتودا واقیعە و بە بێ ئەوەی مقاوەمەتێ ڕو بدا ئیعدام کرا.

"ئەستانبوڵ 15 ی مینهو: حکومەتی تورک ئەو هەزار لیرە موکافاتە کە بۆ گرتنی شێخ سەعید بە زیندویەتی وەعدی دابو تەئدیە کرد."

ژ27 ی 28 ی مایسی 1925 ئەم هەواڵەی بڵاوکردۆتەوە:

"نوتقی فوئاد بەگ، دوقتۆری دیاربەکری لە وەقتێکا تورک لە دیاربەکر هەڵیانواسیوە وتویەتی:

"ئەوەتی من خۆم ناسیوە خەو و خەیاڵم ئەمەیە کە لە ڕێی وەتەن دا بمرم، وا گەیشتمە ئەو ئارەزو و ئومێدە موبارەکە، بوم بە قوربانی وەتەنەکەم کە کوردستانە. قەومێکم لە دوای خۆمەوە بە جێ هێشتوە موتڵەق و موتڵەق ئینتیقام لە تورک دەسێنن و، لەم شوێنەدا کە منی تیا ئیعدام کرام بەیداخی ئیستیقلال هەڵدەکەن، ئەو وەختە ڕۆحم لە ئەعماقی ئەرزدا شاد دەبێ.

"ژیانەوە: نەمردوی ئەی وەتەنپەروەری مەزن لە دڵان دا دەژیت. ئینشائەڵڵا ئارەزوت بە جێ دێ، جێت خاڵی نابێ."

ژ28 ی 1 ی تەموزی 1925 نوسیوێتی:

"هەواڵی حدودی تورک و کورد: شایعەیەک لە حدودەوە هاتوە، کە شێخ عەبدوڵا کوڕی شێخ عەبدولقادری شەمزینان، فیرقەکانی هەرکی کۆ کردۆتەوە، سەر هاتی مەندان و، خۆجێی سەیدان، لەگەڵ عەشیرەتی گەردی کە قیسمەن لە تورکیادان و قیسمەن لە ئێران و، هجومیان کردۆتە سەر مەفرەزەی تورک کە لە شەمزینان و جولەمێرگ بوە و مەغلوبیان کردون قائمقامێک و دو دقتۆر و چەند زابتێکیان ئەسیر کردوە."

ژ29 ی 1 ی تەموزی 1925 نوسیوێتی:

"خەبەراتی تورکیا

"نوتقێک کە لەم ئاخیرەدا لە تەرەف عیسمەت پاشاوە دراوە بەیاننامەیەک کە لە تەرەف کەمال پاشاوە ئیسدار کراوە بۆ خسوس ئیتالی سەفەربەری ئۆردوی تورک بەیانی ئەکا کە تورک موقابیل بە تورکەکان و سائیر عەناسیری غەیری تورکیە ئەبێ بە تەمای چ نەوعە حسیات و موعامەلەیەک لە حکومەتی تورک بێ.

"عیسمەت پاشا خیتاب بەو قلوبە کە پێی ئەڵێن قلوبی تەوسیعی مەدەنیەتی تورکیە وتی:

"تورکەکان راستە و راست میللەتپەروەرن و، میللەتپەروەری یەگانە مەسلەکی ئیتیحادی ئێمەیە، عەناسیری سائیرە موقابیل بە ئەکسەریەتی تورک هیچ نفوز و ئیعتیباریان نیە، بەهەمە حاڵ ئێمە ئەبێ دانیشتوانی موڵکی خۆمان بکەین بە تورک، ئەوانەی کە زدی ئێمە و تورکپەروەریە مەحو بکەینەوە. ئەو خزمەتەی ئێمە لە وانەمان ئەوێ کە دانیشتوی موڵکی ئێمەن ئەوەیە کە ببن بە تورک و خەڵقی تریش بکەن بە تورک. ئەوان ئەڵێن ئێمە بۆ دین سەعی ئەکەین، باشە ئێمە ئەوانە مەحو ئەکەینەوە کە بە ناوی دینەوە مەقسەدی خۆیان تەرویج ئەکەن.

"مستەفا کەمال پاشا لە بەیاننامەکەدا دەڵێ ئەو موحاکەمەی مەخسوسە کە بۆ ئەم ئیغتیشاشە تەشکیل کراون دەوام ئەکا لە موحاکەمەی ئەوانە کە ئارەزوی ئیعادەی خەلافەت و تەرزی حکومەتی پێشو ئەکەن عەلاوەی ئیفادەی کردوە کە تەزییقات و تەئدیباتی شەدیدە کە بۆ ئیغتیشاشی کوردەکان ئیستیعمال کراوە بۆ ئەوانەی کە وەکو کوردەکان ئارەزوی جمهوریەتی تورک ناکەن و خیلافی تەرتیباتی حکومەتی تورک، کە بۆ کردنی کوردەکان بە تورک دانراوە، حەرەکەت ئەکەن جەزایەکی باشە.

"تورکەکان لەگەڵ کوردەکانی شیمالی زاخۆ زۆر موستەبیدانە و غەدارانە موعامەلەیان کردوە. هەمو مەلاکان و شێخەکانی عەشیرەتی گۆیانیان تەبعید کردوە و رەئیسی روحانیەکی نەسرانیەکانیان ئیعدام کردوە کە رەعیەتی ئاواییەکی عەشیرەتی گۆیانە.

"ئەمە لەو سیاسەتەیە کەلای سەرەوە عیسمەت پاشا بەیانی کردوە کە ئەڵێ تورکەکان ئەوانەی کە دین بۆ مەقاسیدی خۆیان بە ئالەت ئیستیعمال ئەکەن مەحو ئەکەنەوە."

لە ژ30 ی 10 ی تەموزی 1925 دا نوسیوێتی:

"رۆژی ماتەمی عومومی: تەبلیغاتێ کە لە خسوس شەهادەتی مەرحوم شێخ عەبدولقادر ئەفەندی شێخ عوبەیدوڵاوە کە لە تەرەف مەرکەزی عمومی جەمعیەتی تەعالی کوردستانەوە کراوە وا بەیان ئەکات کە رۆژی 24 ی ئایاری 1925 بکرێ بە رۆژێکی رەسمی بۆ شەهادەتی مەغفور بۆ هەمو کورد لە عالەمی کوردایەتی دا ناوی ئەو شەهیدە نەکوژێتەوە.

"ژیانەوە: فیلحەقیقە شەهادەتی فاجیعەی مەرحوم خۆی و کوڕی و تەبەعەی بەم سورەتی غەدارانە و زاڵمانە کە لە تەرەف تورکی خونخوارەوە کراوە بۆ هەمو عالەمی بەشەریەت و خسوسەن بۆ هەمو کورد و

کوردستان مەسئەلەیەکی یەکجار ناخۆش و نـاڕەحەتە. ئـێمەیش بە نـاوی هەمـو کـوردێکەوە ئیشـتیراکی ئەم حوزنی ئەلیمە و تەمەنای ئینتیقامی ئەو مەزڵومانە لە عەدالەتی بەشەریەت ئەکەین."

لە ژ31 ی 16 ی تەموزی 1925 نوسیوێتی:

"زوڵمێکی تری تورکەکان: لە غەزەتەی الموصل دا نوسـراوە کە نـافیز بەگ ناوێـک کە لەگەڵ مەرحـوم سەید عەبدولقادر ئەفەندی ئەعـزای مەجلیسـی ئەعیـانی پێشـوی عوسـمانی ئەمجـارە لە تەرەف تورکەکـانەوە ئیعدام کراوە یەکێ لە رەئیسـانی عەشـیرەتی خۆشـناوە، کە لە مـابەینی هەولێـر و کۆیسـنجاق دایە، ئەو زاتە نەجلی ئیسماعیل خۆرانلی‌یە.، ئەویش لە ئەولادە بە قیمەتەکانی خاکی پاکی کوردستانی عیراقـی بـوە، بـوە بە قوربانی غەدری تورکە خوێنخۆرەکان."

لە ژ38 ی 3 ی ئەیلولی 1925 دا لە ژێر سەردێڕی: (فەزیعەتی تورک) دا نوسیوێتی:

"مەحکەمەی ئیستیقلال قەراری ئیعدامی 15 کەسـی داوە کە بە عەلەیهـی جمهـوریەت دوانـدن مـوتەهەم بون و، بەعزێ کەسانی تر لە بەینی 5 ساڵەوە تا 15 ساڵ بە ئەشغالی شاقە مەحکوم کردوە و 19 کەسی تـر کە هەر لەو روەوە موتەهەم بون بە بەرائەتیان حوکمی داوە."

## 4. 2. شۆڕش لە زمانی سەرکردەکانیەوە

ژیانەوە 3 بابەتی لە سەر شۆڕشەکە تێدایە کە گرنگیەکی گەورەیان هەیە بـۆ رونکـردنەوەی ئامـانجی شۆڕشەکە و، بە درۆ خستنەوەی بوختانەکانی تورک:

یەکەمیان:

گفتوگۆیەکە کە لەگەڵ شێخ مەهدی برای شێخ سەعیدی پیران کراوە.

دوەمیان:

ریپۆرتاجێکە لەسەر هاتنی شێخ عەبـدوڵڵای کـوڕی شـێخ عەبـدولقادری شـەمزینی و گفتوگـۆی ئە و و موتەسەڕیفی ئەوسای سلێمانی.

سێیەمیان:

وتارێکی درێژە کە ئیحسان نوری بە تورکی نوسیوێتی و ئەمان کردویانە بە کوردی.

لە بەر بایەخی زۆری ئەم 3 بابەتە وا هەر سێکیان لێرەدا ئەنوسمەوە:

### 4. 2. 1. وتووێژ لەگەڵ شێخ مەهدی پیران

لە ژ51 ی 3 ی کانونی ئەوەلی 1925 دا نوسیوێتی:

"هـاتن: حەفـتەی رابـردو جەنـابی شـێخ مەهـدی ئەفەنـدی بـرای قەهرەمـانی حەرەکـات و قیـامی میللـی کوردسـتانی شـیمالی جەنـابی شـێخ سـەعید ئەفەنـدی تەشـریفی هێنـاوەتە سـلێمانی. لە تەشـریف هێنـانی زاتێکـی وا مـوحتەرەم و میللەتـپەروەر بە وڵاتەکەمـان جـدەن مـوفتەخیرین. عەرزی بەخێرهـاتنی ئەکەین.

"دائیر بە وەقعەی مەعلـوم لە نوسـخەی ئاتیـدا ئیزاحـات تەقـدیمی ئەنـزاری خوێنـدەوارانی کیـرام ئەکەین."

دیاریی کوردستان لە ژ13- 14 ی 5 ی مارتی 1926 دا نوسیوێتی:

"تەشریف: برای موحتەرەمی شێخ سەعید ئەفەندی رەئیسی قیامی کورد جەنابی شێخ مەهدی ئەفەنـدی و قەهرەمانی میلەت جەنابی سەید تەها ئەفەندی تەشریفیان هێناوەتە بەغداد. لە تەرەف ئەشراف و منەوەرانی میلەتی کورد لازمەی ئیحتیفالات و تەعزیماتی بە جێ هێنرا. عەرزی بەخێرهاتنیان ئەکەین."

لە ژ53 ی 17 ی کانونی ئەوەلی 1925 دا ئەم گفتوگۆیەی بڵاوکردۆتەوە، کە لە چەند لایەنەوە نرخی مێژویی هەیە:

**یەکەمیان:**

چونکە قسەی یەکێ لە سەرکردە مەیدانیەکانی جوڵانەوەکە و، برای رابەرەکەیەتی.

**دوەمیان:**

بە ئاشـکرا ئامـانجی شۆڕشـەکە بـاس ئەکـا کە ئـازادیی کـورد و سـەربەخۆیی کوردسـتانە نەک گێرانەوەی خەلافەت و سەڵتەنەت و شەریعەت، وەکو کاربەدەستانی تورک ئەیانوت.

**سێیەمیان:**

باسی دەوری رێکخراوی سیاسی جەمعیەتـی کوردسـتان و رۆشـنبیرانی کـورد ئەکـا لە ئامـادەکردن و بەرێوەبردنی جوڵانەوەکەدا.

**چوارەمیان:**

ناوی هەندێ لە بەشدارانی شۆڕشەکە و عەشیرەتەکانیان و ناوچەکانیـان ئەبـا، کە رادەی فراوانـی ئەم جوڵانەوەیە دەر ئەخا.

**پێنجەمیان:**

زۆر بە ژیرانە هۆیەکانی شکانی شۆڕشەکە باس ئەکا.

**شەشەمیان:**

سەرەڕای ئەو تێشکانە کارەساتئاسایە، بێ هیوایی و نائومێدی لە پاشەڕۆژی کورد پیشان نادا.

ئەمەیش تەواوی گفتوگۆکەیە:

"دائیر بە قیامی میللی کوردستانی شیمالی

"لە نوسخەی (51) ی رابردودا لە بەخێرهاتنی جەنابی شێخ مەهدی ئەفەندیدا نوسیبومان کە دائیـر بە وەقعەی مەعلوم نـوبزەیەک عەرز ئەکـرێ. لەگەڵ مومـا ئیلەیهیـدا مولاقـات کـرا لەبەرئەوەی وەختـی خـۆی لەم خسوسەوە دور و درێژ ئیزاحات و تەفسیلات دەرجی ستونی ژیانەوە کراوە، لێرەدا موختەسـەرەن بە دەرجـی ئیکتیفا ئەکەین:

"لە موما ئیلەیهی سەبەبی زهوری ئەم قیام و ئیختلالەمان سوئال کرد جەوابەن فەرموی: کورد قەومێکـی نەجیب و قەدیمە ئازایی و مەردایەتی مەعلومە. بە حسـیەی رەوابتـی دینـیە و ئیسـلامیە چەنـد سـاڵە لە ژێـر ئیدارەی ئیمحاکارانەی تورکدا ئەژین. فەقەت لەم ساڵانەدا کەوا ئەفکار و جەرەیانی میللـی کەوتـۆتە نـاوەوە و زوڵم و غەدری تورکەکانیش لە ئەندازە چوبـوە دەرەوە و لە دیـن لایـان دابـو بـۆ ئەمەی لەژێـر ئیـدارەی ئەم غەدرانەدا دەرچین ئەم قیامە کە دەمێکە لە تەسەوەردایە هاتە وجود. بە واسیتەی جەمعیەتـی کوردسـتانەوە، کە موقەدەراتی میللەتی بە دەستەوەیە، داوای حقوقی میللـیەی خۆمـان کـرد، نەیدا. بە حەرەکـاتی قیـامەی (بەیـت ئەلشەباب) وە دیسان داوای ئەم حەقەمان کرد هەر نەیدا. لەبەر ئەمە بە مەجبـوری و لە ناوەخـت ئەم قیـامە و ئیختیلالە دەستی پێ کرا.

"له موحیتی كوردستان دا چەند كەس و تا كوێ ئیشتیراكی ئەم حەرەكاتەیان كرد؟

"جەنابی شێخ سەعید ئەفەندی كە ئەم وەزیفە موقەدەسەیەی كەوتبوە عوهدەوە و فەرقی كرد كە ئەحواڵ زۆر خراپە ئیتر بە قەرارێكی قەتعی عەزمی كرد و دەستی دایە. لە (لیجە) (قەزایەكە لە شیمالی دیاربەكر) هەڵسا رو بە (پیران) كە شێخ عەبدولرەحیمی برامان لەوێ بو حەرەكەتی كرد. هەمو عەشائیر و قەبائیل لەو ناوەوە، وەكو عەشیرەتی توس ئەڵا، دونبول، بۆتین، مەستان، جبران و سائیرە بێ، ئیشتیراكی كرد و قوەتێكی زۆر گردبوەوە. شێخ عەبدول رەحیمی برام لە پیران، خۆم لە سەردی (مولحەقی لیجە) عەلی رەزا ئەفەندی لە مەلازگرد، خنس، بڵاتوت. شێخ عەبدولا، شێخ زیائەدینی برام لە (شوشار) ەوە بە خواهیشێكی فەوق ئەلعادە دەستی درایە.

گەلێ لە منەوەران و ریجالی كورد بەسەر ئەو قوەتەوە بو، لە مودەتێكی كەمدا ئەو ناوە لە توركەكان پاك كرایەوە و، بۆ سەر دیاربەكر حەرەكەت كرا. لەو وەختەدا دیاربەكر قوەتێكی گەورەی توركی تێدا بو وە بە تۆپێكی زۆر تەحكیم كرابو. هەرچەند جەنابی شێخ بە تەواوی موافەقەتی چونی سەر دیاربەكری نەكرد فەقەت لەبەرئەمەی كەوتبوە پشتمانەوە و بۆ ئەمەی ئەویش پاك بكرێتەوە مەجبوریەت حس كرا. مودەتی دە دوانزە رۆژ ئەترافی دیاربەكر موحاسەرە كرا. وەختێ بە چونە ناوشارەكە مۆفەقیەت حاصڵ بو، فەقەت لەو وەختەدا توركەكان بۆ كوژانەوەی ئەم قیامە لە ئیستیقامەتی قارس و تەرابزنەوە بە رێگای ئاسنی فرانسزدا كتوپڕ قوەتێكی زۆری رژاندە ئەو ناوە كە ئەم قوەتە نزیكەی 100 هەزار كەس ئەبو. ئێمە هەرچەندە جەمعیەت و پرۆغرامێكی بە ئەساسمان هەبو بەڵام چونكە وەكو توركەكان ئەركان حەربیە، هەیئەتی قوماندە و لەوازیماتێكی حەربیەی تەواومان نەبو مەجبور بە موحارەباتی چەتەیی بوین. بەرامبەر بە حەرەكاتی قوەتەكانی تورك قیسمێ لە قیوای میللیە كەوتە ئەسارەتەوە لەو میانەدا جەنابی شێخ سەعید ئەفەندی تەسادوفەن لەگەڵ قوەتێكی جوزئی لەگەڵیا ئەبێ لەپاش مقاوەمەتێكی دلێرانە گیرا. منیش لەگەڵ چەند كەسێك و برازایەكم ئیلتیجامان بە حدودی ئێرانەوە كرد.

"ئەم قیام و حەرەكاتە لە ژێر ئیدارەی كێ دابو؟

"بیلتەبع لە ژێر نفوز و ئیدارەی جەنابی شێخ سەعید ئەفەندی دا بو. وە لە رەئیسیكاردا گەلێ منەوەر و ریجالی كوردی تێدا بو بیلخاسە فەقێ محەمەد بوتیان بە عەقڵ و دیرایەتی و، محەمەد عەلی بە جەسارەت و فەعالیەتی و، حەیدەر ئاغا رەئیسی عەشیرەتی توس ئەڵا، عومەر ئاغا رەئیسی عەشیرەتی بۆتیا، حەسەن ئاغا رەئیسی عەشیرەتی مەستان، شێخ تاهیر ئەفەندی و مەلا مستەفا ئەفەندی خەڵقی لیجە، عەلی رەزا ئەفەندی و سائیرە لە واقیع دا لەرێی ئەم فیكرەدا و لەرێی ئامالی میللیەت دا سەعی و هیمەتێكی گەورەیان ئیبراز فەرموە.

"غایە بۆ ئەم ئیختیلال و قیامە چی بو؟

"میللەتی كورد وەكو عەرزم كردن قەومێكی نەجیب و قەدیمە و میللەتێكی بە عەزم و سەباتە هیچ وەختێ لە قەومی ئەولادی جەنگیزدا لە هیچ خسوسێكەوە حەقی تەفەوق و حاكمیاتیان بەسەرمانا نەئەدی وە بە خسوس لەم عەسری حازرەیشدا كە عەسری میللەت و قەومیەتە ئەمان ویست ئێمەش وەكو میلەل و ئەقوامی سائیرە تەمییز و حقوقێكی میللیەمان بێ."

"ئەسبابی عەدەم موەفەتیەتی ئەم ئیخلالە ئەبێ چی بو بێ؟

"ئەگەرچی جەنابی شێخ سەعید ئەفەندی گیرا، وە قیسمێ لە قیوای میللیە كەوتە ئەسارەتەوە فەقەت لەمە مەغلوبیەتی كورد و غەلەبی قەتعی توركی نابێ لێ ئیستیخراج بكرێ. لە پاش ئەوە ئەتوانم بڵێم لە چاو بێ ئەسبابی دا موەفەقیەت بەلای ئێمەوە بوە، چونكە ئەو قوەتە كە هێنرا بوە كوردستان بە قەدەر ئەو قوەتە ئەبو

کە ئۆردوی مونتەزەمی یۆنانی لە زەرفی پانزدە رۆژدا لە ئەناتۆڵی دەرپەڕانە دەرەوە، وە بەقەدەر ئەو قوەتە ئەبو کە لە ساڵی 1920 دا ئۆردوی میللی ئەرمەنی لە مودەتێکی کەم دا مەجبوری گەڕانەوەی کرد. بەم هەمو نوقسانیەت و بێ ئەسبابیەوە هێشتا ئێمە زۆرتر مودافەعە و ئیشمان پێ کرا. وە هەرچەند حاڵی حازر ئەم قیامە زاهیرەن نیهایەتی هاتوە و براوەتەوە، فەقەت لەبەرئەوەی ئەم فیکرە موقەدەسە لە دڵی هەمو کوردێک دا تەمەرکوزی کردوە و لێمان مەعلوم بوە دەفعەیەکی تر کورد و تورک پێکەوە ناژین، ئومێدم هەیە کە لە فرسەتێکدا تازە بکرێتەوە و، لەسەر حقوقی مەشروعەی میللیەی خۆمان موەفەق بین و، لەژێر باری زوڵم و غەدری ئەم لا دینیانە خۆمان دەربهێنین."

### 4. 2. 2. وتوێژ لەگەڵ سەعید عەبدوڵای شەمزینی

یەکێ لەوانەی کە لەگەڵ شێخ سەعیدا لە مەحکەمەی ئیستیقلالدا بڕیاری خنکاندنی درا، شێخ عەبدولقادری شەمزینی بو. شێخ عەبدولقادر کەسایەتیەکی کوردی بە ناوبانگ و دانیشتوی ئەستەمووڵ بوە. لەوێ گرتویانە و هێناویانەتەوە بۆ دیاربەکر بۆ بەردەمی دادگا. لەگەڵ خۆیدا سەید محەمەدی کوڕیشی خنکێنراوە، بەڵام کوڕێکی تری کە سەید عەبدوڵڵایە یەکێ بوە لە سەرکردەکانی جوڵانەوەکە. دوای شکانی جوڵانەوەکە روی کردۆتە عیراق.

گۆڤاری دیاریی کوردستان لەم روەوە لە ژ 10 یدا لە (ئەخباری پانزە رۆژ) دا نوسیوێتی:

"نەجلی موکەڕەم سەید عەبدولقادر ئەفەندیی مەرحوم، جەنابی سەید عەبدوڵڵا ئەفەندی لە بەغداد میوانی نەقیب بو، 12 ی تشرین ئەوەل بە ڕێی ئاسنا گەڕایەوە رەواندز، ئەکابیر و ئەعازیمی کورد رەوانەیان کرد، هەتا ئیستاسیۆن و حەرەکەتی شەمەندەفەر هەمو لە خزمەتیا بون."

لە ژ46 ی ژیانەوەدا ریپۆرتاجێکی لە ژێر ناوی: (تەشریف و هاتنەوە) دا دەربارەی سەید عەبدوڵڵا نوسیوە، کە ئەویش هەندێ لایەنی شۆڕشەکە و ئامانجەکانی رون ئەکاتەوە:

"رۆژی دوشەمە 5 ی مانگی تشرینی ئەوەلی 1925 موفەتیشی ئیداری سلێمانی جەنابی کەپتان لاین و لە پاش ئەو بە هەفتەیەک سەعادەتمەئاب جەنابی موتەصەریفی سلێمانی بۆ حەل و فەسڵی مەسئەلەی پشدەر بە قافلەی زرەهلی لە سلێمانیەوە بۆ ئەربیل حەرەکەتیان فەرمو. وە رۆژی چوارشەمە 21 ی تشرینی ئەوەل تەشریفیان هاتەوە. موخابیری غەزەتەکەمان بە مولاقاتی سەعادەتی موتەصەریف مەیسەر بوو لە ئەسنای مولاقات دا موشاهەداتی ئەم سەفەرەی لێ ئیستیفسار کرد. بەم نەوعە مەوادی ئاتی ئیزاح فەرمو کە لەوێ مەسئلەی پشدەر لە حزوری موتەصەریفی سلێمانی و ئەربیل و هەر دو موفەتیشی ئیداریدا پێک هات و حەل کرا.

"جەنابی موتەصەریفی سلێمانی لە ئەربیل لە ئەسنای ئیقامەتیا لەگەڵ نەجابەتمەئاب سەید عەبدوڵا ئەفەندی کوڕی مەرحوم شێخ عەبدولقادر ئەفەندی شەمدینان دا مولاقاتی بوە. زۆر نەجیب و خەلوق و منەوەر هاتۆتە پێش چاوی. لە مولاقات و موصاحەبەتی ئەو مودەتەدا موما ئیلەیهی بەیاناتی ئاتی عەرزی موتەصەریف کردوە:

"هەروەکو مەعلومە کوردستانی شیمالی بۆ تەئمینی حقوقی مەشروعەی خۆیان قیامێکی میللیان کرد و، لە گەلێ شوێنی کوردستانا ئیختیلالی میللی بو و، لە بەر بێدادی ئیدارەی تورک ئەو قیامە تا ئەهات شیدەتی ئەسەند. حکومەتی تورک بۆ ئەوەی ئەم مەسئەلەیە تەسکین بکا، لە هەمو تەرەفێکەوە قوەتێکی زۆری تەحشید کرد بۆ سەر کوردەکان. وە ئەو قوەتی تورکە لەو میقدارە زیاتر ئەبو کە لە حەربی ئەخیری یۆنان دا سەوقی

داروحەربی کرد بو. لەگەڵ ئەم زۆریەش مەرتەباتی عەسکەریەی و سیلاح و تەجهیزاتی لەسەر سیستەم و مۆدەی تازە بو. لەگەڵ ئەمەش دا کورد تا توانی مقاوەمەتێکی دلێرانەیان کرد.

"حکومەتی تورک هەر بەوە سەرفی نەزەری نەکرد ئەوی ریجالی کورد بو وە مومکین بو گرتی. زۆری لێ ئیعدام کردن. هەر بەو فکرە و بۆ تەسهیلی ئیجرای ئامالی خۆی مەرحوم شێخ عەبدولقادر ئەفەنـدی بـاوکی ئیعدام کرد. چ لە نوقتەی ئینتیقامی ئەم جەبهەتە و چ لە نوقتەی ئیشـتیراک بەو غـایەی عمـومیەیە لە جەبـهەی نەهریە و شەمدینانەوە سەید عەبـدوڵڵا ئەفەنـدی و تەبەعەی هجومیـان کـردە سـەر تـورک و مەرکەزی قەزای ئیشغال و قایمقامی ئەوێ حسێن نازم خەڵقی سلێمانی لەگەڵ فەتاحی ژنبرای شێخ مەحمود و میقـدارێ قـوەتی عەسکەریە ئەسیر ئەکا و بیگباشی ئیسماعیل حەقی بەگ ئەکوژێ.

"لەبەرئەوەی قائیمقام حسێن نازم ئەفەندی و مەرقـوم فەتـاح ئەفەنـدی کـورد ئەبـن، زۆر بە رەئـفەت و شەفەقەت معامەلەیان لەگەڵ ئەکا و ئیزنیان ئەدا، فەتاح ئەفەندیش تا حدودی ئێران سیلمەن رەوانەی ئەکـا. لە عەینی حاڵ دا فەتاح ئەفەندی هەر لە سنوری سەید عەبدوڵڵا ئەفەندی نەجاتی ئەبێ دەست دەکا بە پروپاغاندە دەرحەق بە موما ئیلەیهی و تەرغیبی دوشمنان بۆ سەر ئەوە.

"(ژیانەوە: ئەم خیانەتە نابێ بۆ فەتاح ئەفەندی بە شتێکی غەریب بزانرێت. زیـرا مـوقتەزای تەبیعەتـی ئەو پیاوە دەرحەق بە هەمو میللەتی خۆی خیانەتی ئاشکرایە. بیلخاسە لە لیوای سلێمانیەوە مەعلومە)

"هەروەکو لە سەرەوە بەیان کرا لەبەر ئەوەی قـوەتی تـورک یەکجـار و بـێ ئەنـدازە و زۆر بـو وە بە سیسـتەمی تـازە و مـوکەمەلی عەسـکەریە مـوجەهەز بـو وە کـوردی بـێ چـارە لە هـیچ لایەکەوە ئیسـتیناد و ئیمدادێکی نەبو، تورک خاتیمەی بەو مەسئەلەیە هێنا. وە خۆی لەگەڵ دو سەد ماڵی ئەتبـاعی مەجبـور بـو بـۆ موهاجەرەت بۆ حدودی عیراق.

"ئێستا هەرچی سەروەت و ماڵ و مڵکی هەیە لە تەرەف تورکەوە زەبت و موسادەرە کراوە.

"لە نیهایەتا ئەم چەند بەیاناتەشـی بـو کە کـورد ئەیتـوانی ئیسـتیفادە لە ئیختلالـی داخـلەی تـورک و حەربی یۆنان بکا و بەو سورەتە هەمو ئامالی میللیەی بە جێ بهێنێ، فەقەت حەمیەتی بەشەریە و دیـانەت مـانع بو، بیلعەکس زۆر معاوەنەتی تورکیان کرد و تورکیش ئەنواعی وەعدی بە کورد دابو.

"وە ئێستایش هەرچەن کـورد زاهیـرەن لە مقـاوەمەتی میلـیە مەجبـور بـون بە فەراغەت، بەڵام دائـیمەن موتەرەقیبی فرسەتی معاوەنەتێکن و مەعنەن خەریکی ئیستیحزاراتن، هەر ئەوەندە ئیسـتینادگاهێک ببیـنن ئەم مەسئەلەیە تازە ئەکەنەوە. جارێکی کە مومکین نابێ کورد و تورک پێکەوە بـژین. ڕۆژێـک ئەبـێ ئەم غـایەی موقەدەسەی کوردەواریە تەجەلی بکا و حاصڵ بێ. "موتەسەریف زۆر مەمنـون بـو لە دیـدەنی مومـائیلەیهی و، زۆر خۆشحاڵ بو لەگەڵ برایەکی کوردی خـۆی وا عـالی جـەناب 3 ڕۆژ پێکـەوە لە موهـاجەرەت و ئەم نەوعە موسـیبەتەی کە دیـوە هەرچەن زۆر موتەئەسـیف بـو، بەڵام ئومێـدەوارە کە ئینشـائەڵڵا بە نەتـیجە حقـوقی مەغسوبەی خۆی دەست بکەوێتەوە."

## 4. 2. 3. لێکۆڵینەوەکەی ئیحسان نوری

ئیحسان نوری کەسایەتیەکی دیار و ناسراوی کوردستانی تورکیـا بـوە، بـۆیە کە پـێش هەڵگیرسـانی شۆڕشی 1925 هاتۆتە عیراق بەرێزەوە پێشوازی لێ کراوە.

پێ ئەچێ ئیحسان نوری دو جار روی کردبێتە عیراق.

جاری یەکەم، پێش هەڵگیرسانی شۆڕشی 1925 ی کوردەکانی تورکیا.

جاری دوەم، دوای تێشکانی شۆڕشی 1925.

ئیحسان نوری کە هاتۆتە بەغدا، لێکۆڵینەوەیەکی بە تورکی لەسەر شۆڕشەکەی بڵاوکردۆتەوە. گۆڤاری (دیاریی کوردستان) لە ژ10 هەمی‌دا هەواڵی بڵاوبونەوەی ئەم لێکۆڵینەوەیەی لە ژێر ناوی (ئیعلان) دا بەمجۆرە نوسیوە:

"لە تەرەف ئیحسان نوری بەگ کە لە تێگەیشتوان و وڵاتپەروەرانی کوردە و ئەشرافی بتلیسە بە ناوی (کورد قیام ملیسی) کتێبێکی زۆر بە قیمەت نوسراوە، لە چاپ دراوە. لەم کتێبەدا ئەسبابی هەڵسانی کوردی شیمالی و ئەهمیەتی عەسکەرییەی بە تورکی بەیان ئەکا. بۆ هەمو کوردێ پێویستە ئەم ئەسەرە بخوێنێتەوە."

هەر ئەوسا لە ژ39 ی 10 ی ئەیلولی 1925 و لە ژمارەکانی 40 و 41 ی (ژیانەوە) دا، ئەم لێکۆڵینەوەیە بە زنجیرە لە ژێر سەرناوی: (قیامی میللی کورد و ئەهمیەتی عەسکەریەی) بە کوردی بڵاوکراوەتەوە.

"کورد کە لەناو صەحائیف و ئەعصاری تەئریخی بەشەر دا بێ دەنگ و بێ هەرا خۆی شاردبوەوە قیامێکی میللی خوێنین و، بە نیسبەت خوێنینەوە، قیامێکی بەشان و شەرەفی خستە ناو حادیساتی ئیجتیماعیە و وەقائیعی سیاسیەی عەصری بیستەمینەوە.

"ئەم قەومی نەجیب و قەدیمە کە بە ئازایی و قەهرەمانی مەتەوازیعانە، ئیشتیراکی حەیاتی حەشر و نەشری ئەعصاری قەدیمەی کردوە، ئەگەر باسی حاکمیەت و سەڵتەنەتی خۆی نەکا کە وا بە ناوی دراوسێکانیەوە ئەژمێررێ ئەتوانین بڵێین لەگەڵ مەحکومیەتی سیاسیەشی‌دا، هەتا ئەمڕۆ ئیستیقلالیەتی ویجدانیە و ئیجتیماعیەی خۆی تەسلیمی دەستی تەجاوز و تەحەکومی تورکی نەکردوە. لەم ساڵانەدا کە وا جەرەیانی میلیەت و قەومیەت کە بەشەر ئەگەیەنێ بە فەیز و فەلاح، رەواجی هەیە کورد ئیتر سەبری نەکرد کە لە ژێر ئیدارەی زاڵمانە و سیاسەتی ئیمحاکارانەی تورکە بێ رەحم و غەدارەکانا بمێنێتەوە.

"ئەو تورکانە کە لەم عەصری میللیەتەدا، کورد لە حەیاتی وەحشیانەی قرونی ئەوەلی دا بژێنن. ئەو تورکانە کە لە مەحکەمەکان دا بە زمانێکی ئەجنەبی کورد موحاکەمە ئەکەن و، لە جیاتی دەرمانێکی شیفا بەخش زەهریان ئەدەنێ. ئەو تورکانە کە بە ناوی بەدەلی رێگاوە بە ملیۆن پارە لە کورد ئەسێنن و. نەک شەمەندەفەر و ئۆتومبیل، رێگا و جادەی ئەرابەی عادیشیان بۆ ناکەن. ئەو تورکانە بەزمانی خۆی کورد لە خوێندن و نوسین مەنع ئەکەن، کە حقوقی تەبیعی هەمو میللەتێکە و عامیلێکی گەورەیە بۆ تەرەقی و سەرکەوتنی ئەقوام. ئەو تورکانە کە جیاکردنەوە و بە دەرکردنی روئەساو منەوەرانی کورد میللەت بێ فەهم و بێ ئیدراک ئەهێڵێتەوە. ئەو تورکانە کە بۆ دەوامی حاکمیەتی خۆیان تەفرەقە ئەخەنە ناو عەشایەرەوە و، لە جیاتی تەئمینی ئیستراحەت و خۆشی، بەم صورەتە وەزیفەی ئەصلی خۆیان بە دەنائەت سوئی ئیستعمال ئەکەن. ئەو تورکانە کە بەخۆیان ئەڵێن عونصوری ئەصلی و حاکم و صاحیب ئیمتیاز و، ئەفکاری شەنیعە دەرحەق بە عەناصیری سائیرە پەروەردە ئەکەن. ئەو تورکە خونخورانە کە بە ئاشکرا ئەیانەوێ کوردیش وەکو ئەرمەنی ئیمحا بکەنەوە و، لە وڵاتی خۆیان دەریان کەن و هەمو وەختێ ئەڵێن لەو ئەرمەنیانەی کە ئەیان وت (زو) رزگارمان بو، ئینجا مایەوە سەر ئەو کوردانەی کە ئەڵێن (لو). ئەو تورکانە کە لە غەیری تەعەروزی حقوق و سەلامەتی میللی، تەجاوەزی قەناعەت و ئیمانی کوردی ئیسلامیش دەکەن. کورد ئەوسا حسی کرد کە ئەو تەهەلوکە و ترسەی لەسەر رێگای سەر کەوتن و پێگەیشتنیانە ئەبێ لای بەرێ و، نیشاندانی مەوجودیەتی میللیەی خۆی تورکی دەعوەت کردە سەر رێگای عەدالەت و ئیعتیدال.

"ئایا لە حەربی عومومیا، وەیا لە دوای ئەوە لە حەربی تورک و یۆنانا، بە تەشەبوسێکی کەم مومکین بو کورد ئیستقلالیەت و حقوقی میللیەی خۆی بسێنێ؟ بەڵام لەبەر ئەوەی وەعدی درابویە، لە پاش موەففەقیەتی

تورک، ئارەزوی میللی بە جێ بهێنرێ و، لەبەرئەوەی کە کورد خەنجەر لە نەخۆش و بریندار هەڵکێشان لەگەڵ حسی مەردانەیا قابیلی تەئلیف نەئەبینی، لەو ئانە هەڵکەوتو و ئاسانەدا دەنگ و قیامی نەکرد و، حەتا زۆر زۆر یارییەی تورکیدا، لە بەر ئەوە کورد حەقی هەبو کە داوای زۆر شت بکا لەم حکومەتە تازەیە، کە وا بە یاریدەی خۆی بو بەم حکومەتە، کە نفوس و ئەرازی خۆی لەو زیاترە. جەمعیەتی کوردستان کە مەسئولیەت و موقەدەراتی ئیستیقبالی میلەتی بە دەستەوە بو داوای حقوقی خۆی لە حکومەتی تورک کرد نەیدایە. بە حەرەکەتی قیامەی (بەیت ئەلشباب) کە زۆر مەعنا و ئەهمیەتی هەبو، داوای ئەم حەقەی کردەوە، دیسان حکومەتی دەنییەی تورک بەرامبەر بەم داوا حەقە سونگی و بۆمبای نیشان دا.

لە ژ40 ی 17 ی ئەیلولی 1925 دا درێژەی بە بڵاوکردنەوەی داوە:

"کورد کە سەریعولتەئەسورە و، لە خولقاندنیا درەنگ قەراری شتێک ئەدا، وە کە قەراری دا موتلەقەن ئیجرای ئەکا، بۆ فیداکردن، ئەو ئەولادە قەهرەمانانەی کە بۆ سەندنەوەی ئامالی خۆی حازری کردبو، ئیتر تەرەدودی نەکرد. حکومەتی تورک کە لەم حەرەکاتە ئاگەهدار بو بۆ کوژاندنەوەی ئەمە روئەسا و منەوەرانی جەمعیەتەکەی گرت. جەنابی شێخ سەعید کە ئیتر ئەم وەزیفە گەورەیە کەوتبوە عوهدەی میللیە و دینیەیەوە، وە لەبەر ئەوەی کە فەرقی کرد حاڵ و ئەحواڵ زۆر خراپە، ئیتر بە عەزمێکی میللی و قەتعیەوە قەراری دا، کە دەنگی تۆپ و تفەنگ و بۆمبای تورکی زاڵم کە لە مەنتیقەی حەسەنانی دەنگی ئەدایەوە بێ دەنگی نەکا و بە زەروری ئەم قیامی میللیە لە پێش وەقتی خۆیا دەستی پێ کرا. ئەو قیام کردنە کە لە سەرچاوەیەکی لاهوتی فەرزانی وەرئەگرت لەگەڵ ئەو هەمو موقاوەمەت و مودافەعە قیناویەی لەشکری نۆیەمی ئەرزرۆم و هەشتەمی ئەرزنجان و حەوتەمی دیاربەکردا، هەرچی مەنتیقەیەک کە لەدەوری ئۆرفە، سیوەرک و چیاکانی قۆپ و سپیکور بو گرتیان. تورکەکان بە سایەی سیاسەتی جیاکردنەوەی کوردەکانەوە، کە زۆر بە صورەتێکی سەگانە و بە واسیتەی پرۆپاغاندەیەکی سامدارەوە ئیجرایان ئەکرد، تەئمینی عەدەم ئیشتیراکی، ئەو عەشایەرەی کە نزیک حدودی جنوب و شەرق بون و میللەت پەروەرەکان گوێیان نەدابویە، کرد. کوردەکان لێکیان نەدابوەوە کە فرانسز کە وا لە ئینقیلابی کەبیردا بە نەشرکردنی قانوننامەی حقوقی بەشەر، فکری حوڕیەت و نەجاتی بڵاوکردەوە و، بەسایەی ئەمەوە بۆ مەهدی حوڕیەت لە عەصری بیستەمی ئینسانیەت دا فریادی مەزلۆمان بخنکێنێ و، یاریدەی زاڵمان بدا و، بەم نەوعە ئیرتیکابی جینایەت بکا.

"حکومەتی ئەنقەرەش ئەم تەجەلیاتی خودا پەسەندانەی، ئەم دەست دانە سیلاحەی میللەتی کورد کە بە عەشق و ئیمانێکی میللی هاتبوە وجود، وای نیشانی عالەم دا، وە قیسمەن ئەفکاری عمومیەی ئەوروپای وا ئیغفال کرد کە ئەمە حەرەکەتێکی موهلیکی دینیە کە زادەی ویجدانێکی بێ شعورە.

بەم چەشنە تورک کە قیسمەن ئەفکاری عمومیەی ئەوروپای هەڵخەڵەتان و خستیە عەلەیهی ئەم قیامی میللیە و، کە لە ئارای ئەوروپا ئەمین بو هەرچی قوەتێکی لە غەرب و شیمال هەبوە لە ئیستیقامەتی قارص و تەرەبزون و سیواسەوە بەڕێگای ئاسنی فرانسزدا کتوپر رشتە کوردستان. ئەم قوەتە نزیک 80 -100 هەزار بو.

"کوردەکان هەرچەندە لەداخل دا جەمعیەت و پرۆغرامێکی بە ئەساسیان هەبو بەڵام وەکو تورک ساحێبی هەیئەتی قوماندە و ئەرکانی حەربیەیەکی مونتەزەم نەبو، لەبەرئەوە کوردەکان لە ئیبتیدای کاردا لزومیان نەبینی بو کە جەناحی قوەتەکەیان بخەنە سەرحدودی دو دەوڵەتی بێ تەرەفەوە و، لەبەرئەمە نەیان توانی بەرامبەر ئەو قوەتە موعەزەم و مونتەزەمەی تورک جەبهە تەشکیل و موحارەباتی مەوزیعی ئیجرا بکەن و، ئەساسەن بۆ موحارەبەیەکی وەهاش ئەو قودرەتی ئیدارە و ئەو لەوزیماتی حەربییەیان نەبو.

"بۆ ئەوەی نەتیجەی چاکی دەعوا و حەقەکەیان دەست بکەوێ کوردەکان مەجبوری موحارەباتی چەتە بون، کە ئەساسەن حەرەکاتی تورکیش وای ئیجاب ئەکرد، وا بەم صورەتە جوێ بونەوە بەرامبەر حەرەکاتی چەند قۆڵ ئۆردویەکی بەقوەتی تورک کە لە سەر ختوتێکی موتەقاریبە ئیجرا ئەکرا، قیسمێ لە قیوای میللیە کەوتە ئەسارەتەوە. هەرچەندە نەشریات و تەبلیغاتی تورکیش جێی باوەڕ نیە، بەڵام بە شایعەی ئەوان تەصادوفەن شێخ سەعیدش لە پرێک دا گیرا. لای ئەوانەی کە لە حەرب ئەزانن مەعلومە کە موحارەباتی چەتەیەتی هەرچۆنێ بێ وەکو حەربی مونتەزەم نیە. ئەو کەسانەی کە بەم نەوعە، حەرەکاتی میللیە ئیدارە ئەکەن باخصوص کە هەرچوار لایان گیرا بێ ناتوانن کە لە جێگایەکی وا دانیشن کە وەکو قەرارگای ئۆردویەکی ڕێک و پێک، دەنگی تۆپ و تفەنگی نەگاتێ.

لە ژ41 ی 24 ی ئەیلولی 1925 دا دریژەی بە بڵاوکردنەوەی داوە:

"ئەگەر ئیعدامی شێخ سەعیدی موعەزەم، قەهرەمانی میللی، وەیا ئەسیر بونی راستیش بێ، مەعنای غەلەبەی قەتعیەی تورکی لێ ئیستیخراج ناکرێ. هەرچەندە نامەوێ ئیزاحی ئەم قیامە فەوقولعادەی میللی کوردە، کە دەنگی لە هەمو ئەفکاری بەشەریەت دا بڵاوبۆتەوە، بکەم. بەڵام ئەمەوێ بۆ ئەوەی کەس لەم قیامی میللیە شتی خراپ لێک نەداتەوە، لە بابەت ئەهمیەتی عەسکەریەیەوە چەند قسەیەک بکەم.

"وەکو لە پێشەوە نوسی بوم مەنتیقەی ئیختیلال بەو 3 قۆڵ ئۆردوە دەوری گیرابو وە ئیشغال کرابو. ئەم 3 قۆڵ ئۆردوە کە لە 9 فیرقەی پیادە تەشەکولی ئەکرد، 27 ئالای پیادە و 9 ی تۆپچی و لە تەشکیلاتی سائیرەی عەسکەریە عیبارەت بو. ئەگەر ئەم قوەتە ئەو فیرقە سوارییانەی لە تەرەف قارس، جزیرە، نسێبین و ئەو قەتەعاتی پیادەیەش کە لە ئەیلولی پاردا بە ناوی تەجاوزی موصلەوە بۆ حەوالی سعرد، ماردین و میدیات هێنرا بو عەلاوەی بکرێ، بەقەدەر ئەو ئۆردوە ئەبو کە ئۆردوی یۆنانی بەو هەمو ڕێکی و وەسائیقی خارقولعادەی حەربیەیەوە لە زەرفی پانزدە رۆژدا لە ئەناتۆلی غەربی دەرکرد و هاویشتیە ناو بەحرەوە.

"ئەو قوەتی تورکە کە ئۆردوی میللی ئەرمەنی لە ساڵی 1920 لە تەرەف حکومەتی بە قوەتەوە تەجهیز و تەسلیح کرابو، وە تەیارەی باش و ئۆتۆمۆبیلی زرێهدار و وەسائیتی متەنەویەی حەربیەی هەبو، لە رۆژێک دا لە صاری قامیش و لە پاش مانگێ ئیستیراحەت بە تەجاوزێکی چوار رۆژی لە ئەلکساندەرپول پەرێشان و مەجبوری رەجعەتی کرد، لە 3 فیرقە پیادە و لیوایەکی سواری زیاتر نەبو.

"بەم نەوعە ئیختیلالپەروەرانی کورد بە واسیتەی بە قوەتیی تەشکیلاتی ئیختلالیە و، بە سایەی ئازایی تەبعی خۆیانەوە کە مەشهوری جیهانە، ئەو قوەتی تورکە کە بەقەدەر سێ و چوار ئەوەندەی ئەو قوەتە ئەبو کە پەلاماری ئەرمەنستانی دا و، بەقەدەر ئەو قوەتە ئەبو کە ئۆردوی یۆنانی ڕاڕفاندە ناو بەحرەوە لە مودەتێکی زۆر کەمدا تواندەوە، وە حکومەتی تورکی مەجبور بە ناردنی قوەتێکی 80 - 100 هەزار کەسی کرد. کورد لەو وەقتەدا، لە داخلی موفەتیشیەتی ئۆردوی سێیەم دا، دوانزدە ولایەتی لە تورکەکان گرتبو. مەعلومە نە تەیارەیەکی هەبو کە کەشف و ئەخباری سەوقیات و حەرەکاتی عەسکەریەی بۆ بکا و، نە هەیئەتێکی باشی ئەرکان حەربیە و قوماندەی هەبو، کە پلانی مونتەزەمی بۆ تەرتیب بکا بەرابەر بە حەرەکاتی تەعەروزیە و سەوقیاتی موعەزەمەی ئەرکانی حەربیەی تورک. لە پاش چوار مانگ مقاوەمەت، بڵاوبونەوەیەکی جوزئی میلەتی کورد کە ئەمرۆیش ئەم میللەتە هەمدیسان لەگەڵ عەینی قوەت دا موجادەلە ئەکات و، کە سەراپا جیدالێکی پڕ لە خاریقەیە، بە نەزەرێکی سەتحی و نوقسانێتی تەشکیلات وە یا بە ماهیەتی ئیختیلالێکی مەوزیع دا ببینن نیشاندانی ئەم جیدالە، لای من وایە گوناهێکە کە ویجدان، ئینساف و ئینسانیەت لە هەمو شتێ زیاتر تەعزیب ئەکا.

"بۆ ناو ئەو دیوارە ئەستورانەی سوری دیاربەکر کە واسیتەی عەسکەری حازریش لە روخاندن عاجزە و قەرارگاھ و قەتەعاتی قۆڵ ئوردەی شاردبوەوە کە هەمو لەوازیماتێکی هەبو، لە بە دەستەو خەنجەر هجوم و لە خۆهاویشتن بۆ ناو پارچەی بۆمبا، بەرامبەر ئاگری پیادە و شەستتیر و ماکینەی هالآوی بە هجومی مەردانەی ئەو قەهرەمانانەی کە لە حاڵی ئیستیحزاردا بە نیدای بژی کورد و کوردستان لە موقابەلەکردنیان گەورەتر بورهانێک بۆ ئیسپاتی علوویەت و قودسیەتی رۆحی میللی، حادیسەیەکی مادی تەسەور ناکەم. بە وەرنەگرتنی دەرس وعیبرەت لە ئیختیلالاتی عەرەب و ئەرناود کە زۆر حوزن ئەنگێز و بە قەدەر حوزن ئەنگێزییان بۆ تورک تەجارییێکی قیمەتدار بون، وە بە نەدۆزینەوەی چارەیەک بۆ ئەم دەردە ئیجتیماعیە کە زۆر بە سەراحەت دیارە، لە ئاقار گەورەیی و موبارەکی جیهادی میللی کورددا کەوا قەت نابڕێتەوە، بێ شوبهە ئەمڕۆ نەبێ سبەینێ، سبەینێ نەبێ دوسبەی، تورکەکان زەرورەتی تەسلیم بون و مل کەچ کردن حیس ئەکەن و، حەقە مەشروعەکەی ئیستا ئەبێ بیدەن بە کورد، ئەو وەقتە بێ ئیختیار ئەیدەن و، بە خیانەتی ئیمحای شەرەفی مازی خۆیان و مەنافیعی موستەقبەلەی سیاسیە و ئیقتیسادیەی تورکی بەدبەختەوە لە کەدار ئەبن و، لەگەڵ خۆیان دا شان و حاکمیەتی تورکیش ئەکوژێتەوە و ئەیمرێنن.

بیگباشی و موجاهیدی حەرەکاتی میللی کوردستانی شیمالی ئیحسان نوری"

دوای تێشکانی شۆڕشی 1925، تێکۆشەرانی کوردستانی تورکیا خۆیان لە رێکخراوی خۆییبونـدا رێکخست و بڕیاریاندا کە هەمو رێکخراوە کوردیەکانی تورکیا لەم رێکخراوەدا کۆ ببنەوە بۆ ئەوەی سەرلەنوێ شۆڕشی چەکدار دەس پێ بکەنەوە و، ئیحسان نوری، کە ئەفسەرێکی هەڵکەوتو و ناسراو بو، هەڵبژارد بە سەرکردەی شۆڕشەکە.

ئیحسان نوری چیای ئاگریی کردە بنکەی سەرکردایەتی. ساڵی 1927 جوڵانەوەی چەکداری دەس پێ کرد، تا ساڵی 1931 درێژەی کێشا، بەڵام ئەویش بە تێشکان کۆتایی هات.

### 4. 3. پشتیوانی ژیانەوە لە شۆڕش

#### 4. 3. 1. وتار و لێدوان

جگە لەو هەواڵانە بە دەیان وتار و لێدوان و ستونی نوسیوە، لەوانە:

لە ژ12 دا عەلی عیرفان (بۆچی بیرمان نەماوە)

لە ژ15 دا عەلی عیرفان (خەیاڵ پڵاو)

هەمان ژمارە کەریم سەعید (بۆچی جلخوارم)

ژ15 و 16 عیزەت (مەزاڵیمی تورکەکان لە بیر نەچێتەوە)

ژ17 عەبدولمەجید (کورد و تورک قەتعیەن پێکەوە ناژین)

ژ17 و 18 عەلی عیرفان (فەرقی ئیستا و ئەوسامان)

ژ18 رەشید نەجیب (ولایەتی موصل) و (تورک - کورد)

ژ19 م. نوری (تورک و کورد - گورگ و مەڕ)

ژ20 بێ ئیمزا (یادداشت)

ژ21 (لە العراقەوە: پشکۆی ئاگر لە تورکیا)

ژ25 (لە العراقەوە: بۆچی جەمعیەتی ئەقوام موداخەلەی موشکیلاتی کوردستان ناکا؟)

ژ26 (لە العالم العربیەوە: هاواری کورد، جەمعیەتی کوردستان و زوڵمی تورک لە نەزەر قانونی میلەل دا)
ژ29 موصل: رەواندزی (هاوارێک بۆ عالەمی مەدەنیەت)
ژ32 و 33 و 34 لە عەشیرەتی جبرانی ئەمین کوردی (هاوارێکی تر بۆ عالمی مەدەنیەت)
ژ35 موصل: رەواندزی (هاوارێکی تر بۆ شوهەدای کوردستان)
ژ39 و 40 و 41 ئیحسان نوری (قیامی میللی کورد و ئەهمیەتی عەسکەریەی)
ژ42 موصل رەواندزی (کورد و تورک)
ژ49 م. شەوقی (بێ ناونیشان)
ژ53 (دائیر بە قیامی میللی کوردستانی شیمالی)
ژ55 لە رەواندزەوە حەسەن کوردستانی (موهاجیری بێ ئەنصار)
ژ15 و 16 دا عیزەت لە ژێر سەردێڕی: (مەزاڵیمی تورکەکان لە بیر ناچێتەوە) نوسیوێتی:

"لەوساوە تورکەکان بە ئیغفالات و ئەنواعی حیلە و دەسایس هاتن موڵکەکەیان ئیستیلا کردین و کردینیان بە ئەسیر و تەبەعەی خۆیان، غەیری ئەمە ئیستیفادەیەکمان لێ نەدین و، ئاسارێکی باشیان بۆ بەجێ نەهێشتین و، لە غەیری تاریکی جەهالەت نەبێ روناکیەکمان نەدی. عەجەبا تورکەکان چ زوڵمێک ما لە وەتەنەکەمانا نەیکەن. ئەوەی بە ئێمە یان کرد ئەگەر حساب بکرێ و یەکە یەکە بیهێنمە بەرچاوتان لازم بە تەفصیلاتێکی زۆر ئەکا، لەبەر ئەمە دا واز لە موعامەلەی زەمانی پێشویان بێنین، بەعزێک موعامەلە و حەرەکاتی زەمانی حەربی عمومی‌یان بگێڕمەوە.

"وەقتێ حەربی عمومی دەستی پێکرد و، تورکەکان بە جەهالەتی ئیشتیراکیان کرد، لە پێش هەمو شتێکدا دەستبەجێ پەنجەی زوڵم و غەدریان خستە ناو جەرگمانەوە. بە ناوی تەکالیفی حەربەوە هەر وڵاغێک لە مەملەکەتەکەمانا بو، نەوەک موناصەفە و برابەشی بە کەرەتێ هەمویان لێ سەندین و، بەو وڵاغانە مەزبەتەیەک کە ئێستا لای زۆر کەسمان مەوجودە دایانێ. بێجگە لەوەیش بەناوی بەدەلی نەقدیەوە چوار جار پارە، بەمەیش ئیکتیفایان نەکرد، لە باتی خزمەتی ئینسان، ئەسپ، ئێستر، ئوشتر، گوێدرێژێک کە لێمان شاردبونەوە، ئەویشیان بەم بیانوەوە لێ سەندین. بەوەیش هەر صابیر بوین تەماعیان کردە پارە نەقدەکانمان. حیلەیەکیشیان بۆ ئەوە دۆزیەوە بانقنۆتێکی کە هیچ موقابیلێکی نەبو لە بانقا، تەبعیان کرد بە زۆر پێیان گۆڕینەوە بە نەقد. بەو نەوعە هەر نەقدێک کە لە وڵاتەکەمانا هەبو دەست والی، قوماندان و ساحێب نفوزەکانی تورک کەوت.

"هەمو ئەیزانین لەبەر زەکات و پێنج شەش دەفعە موبایەعە، هیچ ئەرزاقێک لە موحیتەکەمانا نەما و عالەم سەفیل بو، گرانیەکی بە شیدەت رویدا. لە پاش ئەو هەمو رەزالەتە و بێ ئیدارەییە، قوتێکی لایەموت، بە صورەتی قاچاخ، بە دزییەوە، بە پارەیەکی زۆر لە ئێرانەوە جەلبمان ئەکرد، ئەویشیان پێ رەوا نەئەبینین زەبتیان ئەکرد. غەیری ئەمانە خۆم بیلزات شتێکم دیوە عەرزتان ئەکەم، ژن و مێردێکی لادێی لە دەوری بازیان 3 کوڕیان عەسکەر بو لە جەبهەی حەرب، موحارەبە و موحافەزەی وەتەنی تورکەکانیان دەکرد." ماوێتی...

(هاوارێک بۆ عالەمی مەدەنییەت)

لە ژ34 ی 6 ی ئابی 1925 دا بە ئیمزای لە عەشیرەتی جبرانی ئەمین کوردی لە ژێر سەردێڕی (هاوارێک بۆ عالەمی مەدەنییەت) دا نوسیوێتی:

"بەناوی مەحکەمەی ئیستیقلالەوە تاقمێ جەلاد و قاتلیان گردکردۆتەوە ناردویانەتە دیاربەکر، لەو وەختەدا کە موحاکەمەی منەورەکانی کورد ئەگەر خۆم بیلزات لەناو گوێ گرەکاندا بوم و گوێم لە

موحاکەمەکەیان ئەگرت دکتۆر فوئاد، شێخ ئەیوب، شێخ عەبدولقادر ئەفەنـدی، کـوڕەکەی، کەمـال فەوزی، بەبـێ گوناح و قەباحەت هەروا ئەیان گرتن و ئەیان کوشتن. بە هەڵگرتنی مەحاکیمی شـەرعیە بە بەسـتن و گرتنـی مەداریسی عیلمیە، بە بەرەڵا کردنی ژنان لە ناو پیاوان دا، لە ناو کۆمەڵ و جێگای دانیشـتنی پیـاوان دا ژن و پیاو بەیەکەوە بون، خولاصە بەم نەوعە شتانە کوردیان عاجز کرد و دڵیان شکاندن، تەجاوزی دین و ئاینیـان کردن، کوردیش لەبەر ئەم حاڵەتانە هەستانە سەر پێیان و داوای حقوقی میلیە و دینەکەیان کرد ئەگینـا کـورد هیچ قەباحەتێکی تریان نەبو شێخ عەبدولقادر ئەفەنـدی، حـاجی موسـا بەگ کە لە نەوەی عەلادیـن پاشـا بـو، نفوزێکی زلیان لە کوردستان دا بو و، قوماندانی ئالاکانی جوبرانی خالید بەگ میـرالا، قومانـدانێکی گەورەی عەسکەری بو، میللەتی کوردی زۆر خـۆش ئەویسـت. شـێخ سـەعید، شـێخ شەمسـەدین خولاصـە مەشـایەخ و عولەماکانی تر هەمو لەسەر داوای ئەساساتی دین و ئایین بـو کە بە نـاحەق بەم دەردەیـان بـردن و لـەناویان بردن. لەگەڵ ئەمانیش دا کە ئەم هەمو ناحەقیەیان کرد حەقی کورد نـاتوانن مەحـو بـکەنەوە بە کوشـتنی ئەم زاتانە ناوی کوردایەتی کوێر نابێتەوە.

"ئەمین بن بزانن کە لە شەرق دا بۆ هەمو وەختێ ئەبـێ ئەو زاڵمـانە بـۆ حەرەکەتێکـی میللـی و دینـی کورد ئامادە و راوەستاو بن تورک ئەبێ تێبگەن کە هەر لەسەر ئەم زوڵم و وەحشیەتە کە ئارناودیان لێ چوە میصر، سوریا، حیجاز، یەمەن، عیراقیان لێپچڕا کوردیش هەر ئەبێ لەوان بتەکێتەوە و جیا ببێـتەوە لەمە زیـاتر چارەیەکی تر نیـیە" قسە هەزارە و دوانی بەکارە" کورد و تورک پێکەوە نابن، تێبـگەن ئەگەر زوڵـم تـۆپ و گولەی هەبێ حەقیش قولێکی هەیە ناشکێتەوە رویەکی هەیە ناکرێتەوە.

#### 4. 3. 2. شیعری هاودەردی

لە ژ30 دا شیعری (ئەی شیمال) ی زێوەر و،

لە ژ43 دا (کوردە وا فتوا دراوە) و،

لە ژ44 دا شیعرێکی تر و

لە ژ 45 دا (شینی شەهیدان) ئەسیری کەرکوکی بڵاوکردۆتەوە.

## 5. هونەری رۆژنامەوانی

### 5. 1. لایەنی تەکنیکی

دەزگای چاپی ژیانەوە موڵکی حکومەت بوە. بەڵام لە چاو سەردەمەکەی خۆیدا کۆن و دواکەوتو بـوە. سلێمانی ئەوسا هێشتا کارەبای تێدا نەبوە. بە دەست کار بە دەزگاکە کراوە. پیتی درشـت و ورد و، ئەسـتور و باریکی نەبوە، پیتەکانی هەموی یەک جۆرن، زۆر بە کەمی وا بوە هەنـدێ پیتـی (رقـعە) یـان بەکارهێنـاوە. لاپەڕەکانی مانشێتیان نەبوە. تەنانەت هەندێ لە وتارەکانیشی ناونیشانیان نیە.

وێنەی فۆتۆگراف یان وێنەی دەستی و کاریکاتێر و خەریتەی تێدا نیە.

دابەشکردنی ستونی لاپەڕەکان لە هەمو ژمارەکانیدا وەکو یەکە، هەمو لاپەڕەیەکی بە سـەر دو سـتونی وەکو یەک دا دابەش کراوە، بە دەگمەن پێڕەوی خاڵبەندی کردوە.

گـوێ نەدراوەتە دابەشـکردنی بـابەت و لاپەڕەکـان، وتـار و هەواڵ و ریپۆرتـاج و شـیعر تـێکەڵاو کراون. هەواڵەکانیشی چ ناوخۆ و چ هی هەندەران، بـێ گـوێ دانە هـیچ پێـوانەیەک بە دوای یەکـدا ڕیـز کراون.

### 5. 2. هەواڵ نوسین

#### 5. 2. 1. سەرچاوەکانی

ژیانەوە هەواڵنێر و پەیامنێری تایبەتی خۆی نەبوە. بەڵام سەرچاوەی هەواڵەکانی ژیانەوە لە چاو دواکەوتویی و ئاڵۆزاوی هەلومەرجی ئەو کاتەی سلێمانیدا تا ئەندازەیەک دەوڵەمەن بوە.

سلێمانی بە دەس کاربەدەستانی بریتانییەوە بوە. ئەوانیش ڕاستەوخۆ بەسترابون بە بارەگای مەندوبی سامییەوە لە بەغداد. بە تەلگراف و بە نامە لە هەواڵە گرنگ و پێویستەکانی بریتانیا و دنیا، بە تایبەتی هی کۆمەڵەی گەلان و ئەوەی پێوەندی بە عیراق و کێشەی موسڵەوە هەبوایە، ئاگادار ئەکران و لە ڕێگەی ئەوانەوە هەندێکی ئەگەیشتە ڕۆژنامەکە.

بۆ گێڕانەوەی هەندێ هەواڵ ژیانەوە ئیشارەتی بە دەزگای هەواڵنێری ڕۆیتەر داوە کە ئەوسایش وەکو ئێستا یەکێ لە هەرە گرنگترین دەزگاکانی دەنگوباس بوە. بەڵام پێ ناچێ خۆی ڕاستەوخۆ لە ڕۆیتەری وەرگرتبێ، بەڵکو پێ ئەچێ لە ڕۆژنامەکانی تری وەرگرتبێ.

وەکو بە ڕۆژنامەکەدا دەرئەکەوێ سەرچاوەیەکی تری ژیانەوە ڕۆژنامەکانی ئەوسای عیراق بوە وەکو: (العراق، الاوقات، البغدادیة، العالم العربي المفید، الموصل، نجمة کە هەواڵ و دەنگوباس و هەندێ جار لێدوانی لێ وەرگرتون. هەروەها شفق سرخ ی ئێرانی.

حکومەتی سلێمانی و دەزگاکانی بەڕێوەبەرایەتی و دادگاکانی سەرچاوەیەکی تری هەواڵ و باسەکانی بون.

#### 5. 2. 2. جۆری هەڵبژاردنی هەواڵەکان

ژیانەوە ڕۆژنامەیەکی ئاراستەکراو بوە، پەیامێکی سیاسی دیاریکراوی هەبوە. هەواڵەکانی بە گۆترە هەڵنەبژێراون و نەنوسراون، بەڵکو بە وریایی و زیرەکانە بۆ خزمەتی ئامانجی ڕۆژنامەکە هەڵبژێراون، بۆ نمونە:

ئەو هەواڵانەی لەسەر تورکیا بڵاوکراونەتەوە، بە زۆری ئەوانەن کە بۆ ریسوا کردنی تورکیای کەمالی و سوک کردنی لەبەر چاوی خەڵکی کوردستان هەڵبژێراون.

ئەو هەواڵانەی لەسەر شێخ مەحمود و شۆڕشەکەی نوسیویانن، بۆ شکاندنی شێخ مەحمود و زڕاندنی ناوی ئەو و، داماڵینی بەرگی سیاسی- نەتەوەیی لە جوڵانەوەکە و پیشاندانی وەکو یاخیبونی تاقمێ جەردە و ڕێگر.

ئەو هەواڵانەی لەسەر هاتنی سەرانی خێڵ و هۆزەکانی کورد بۆ سلێمانی نوسیویانن، لە لایەکەوە بۆ پیشاندانی پشتیوانی ئەوانە بوە لە حکومەتی عیراق و، لە لایەکی ترەوە بۆ ڕوخاندنی ورەی لایەنگرانی شێخ مەحمود و شۆڕشەکەی بوە.

#### 5. 2. 3. جۆری داڕشتنی

هەواڵەکان چەند جۆرێکن: هەندێکیان لە ڕۆژنامەی ترەوە وەرگیراون و کراون بە کوردی، هەندێکیشیان نوسەرانی ڕۆژنامەکە نوسیویانن و دایانڕشتون. لە داڕشتنی هەواڵەکاندا زۆر جار نوسەر بێلایەنی لە دەس داوە، بە جۆرێ دایڕشتوە کە خزمەتی ئامانجی سیاسی ڕۆژنامەکە بکا.

**5. 2. 4. بابەتەکانی**

**5. 2. 4. 1. هەواڵی عیراقی**

ژیانەوە چەردەیەکی باش هەواڵی داوودەزگاکانی حکومەتی عیراقی بڵاوکردۆتەوە. بۆ لێکۆڵینەوەی مێژوی ئەو سەردەمە تا ئێستایش نرخیان ماوە.

لە ژ1 ی 18 ی ئاغستۆسی 1924 دا سەبارەت بە یەکەمین وەزارەتی هاشمی (2 ی ئابی 1924-21 ی حوزەیرانی 1925) کە شەشەمین وەزارەتی عیراق بوە، نوسیوێتی:

"لە غەزەتەی (المفید) ەوە:

**"گۆڕانی قابینە**

"وەزارەتی جەعفەر ئەلعەسکەری پاشا ئیستیعفایان کردوە ئیرادەی ملوکانە صادر بوە کە وەزارەتی فەخامەتی یاسین ئەلهاشمی بەم رەنگە لە ژێرەوە نوسراوە تەشەکول بکات:

| | |
|---|---|
| وەزیری داخلیە | عەبدولموحسین سەعدون |
| وەزیری مالیە | ساسۆن حسقیل |
| وەزیری ئەوقاف | ئیبراهیم ئەلحەیدەری |
| وەزیری عەدلیە | رەشید عالی ئەلگەیلانی |
| وەزیری ئەشغال | موزاحیم ئەمین ئەلپاچەچی |
| وەزیری مەعاریف | شێخ محەمەد رەزا ئەلشەبیبی |
| وەکیلی وەزیری دیفاع | رەئیسەلوزەرا یاسین ئەلهاشمی |

لە هەمان ژ1 دا بەرنامەی وەزارەتی هاشمی بەمجۆرە بڵاوکردۆتەوە:

**"پرۆغرامی وەزارەتی هاشمیە**

"تەسریعی قانونی ئەساسی و قانونی ئینتیخابی مەبعوسان و ئیجرا کردنیان و جەمع کردنەوەی ئەعزاکان.

"هەوڵدان لەگەڵ دەوڵەتی حەلیفەی بریتانیا بۆ قبوڵکردنی مەسئولیەت و تێکۆشین بۆ ئیستیفادە لە مەرکەز و ئەهلی خیبرەی بریتانیا بۆ تەرەقی عیراق و تەتبیقی موعاهەدە بە کەمالی دیقەت... تاد"

هەر لە ژ1 دا "**مەجلیسی تەئسیسی عیراق**

وەکو لە جەرائیدی بەغداد دا خوێنراوەتەوە دەوری ئەمساڵی مەجلیسی تەئسیسی عیراق نیهایەتی هات و ئەعزاکانی هەر کەسە گەڕاوەتەوە بۆ شوێنی خۆی."

لە ژ22 دا دەربارەی بڵاوکردنەوەی دەستوری عیراقی نوسیوێتی:

"رۆژی 21 ی مارت کە شەمە بو تەصادوفی رۆژی ئیعلانی دەستوری عیراقی کرد بو. بەم موناسەبەتەوە عولەما و ئەشراف و موتەحەیزانی بەلدە بە تەزکەرەی مەخصوص لە تەرەف جەنابی موتەصەریف دەعوەت کرا بون و ئەوانیش ئیجابەتیان کرد بو. سەر لە بەیانی سەعات چوار ئومەرای عەسکەریە، عمومی ئەشراف، موتەحەیزان و رۆئەسای دەوائیر لە بەر دائیرەی حکومەت ئیجتیماعیان کرد و تاقمێکی پۆلیسیش صەفبەستەی ئیحتیرام بوبون. تەلەبەی مەکتەبیش لەگەڵ هەیئەتی موحتەرەمەی تەعلیمیەدا دەعوەت کرا بون. لە پاش ئیجتیماع لە تەرەف حەزرەتی موتەصەریفەوە نوتقێکی بەلیغ خوێندرایەوە کە صورەتی لە ژێرەوە دەرج کراوە.

...

"ئەم قانونی ئەساسیە، هەروەکو بیستوتانە پار لە لایەنی مەجلیسی تەئسیسی عیراقەوە، لە پاش تەصدیقی موعاهەدە، موزاکەرەیەکی زۆر و فکری باشی لێ کرا، مونتەها لە پاش تەعدیلاتێکی تەواو قبوڵ کرا. بیلتەبع مەزمونی ئەم دەستورەش مەعلومتان بوە و ئەبێ

"بێینەوە سەر ئەحواڵی خۆمان، ئێمە کە میلەتی کورد و لە لیوای سلێمانین، لەم قانونی ئەساسیە زۆر چاک ئیستیفادەمان کردوە. لیسانمان، حقوقمان، بە شان و شەرەف مەحفوز و موحتەرەمە، وە خدمەت و موساعەدەیەکی تەواو بۆ ئێمە هەیە. حەتا ئەتوانم بڵێم لە عەرەبی براکانمان زیاترێکە بەشمان وەرگرتوە. لە بەر ئەمە من بە نەفسی خۆم موقابیل بەم لوتفە جدەن تەشەکوری حکومەتی فەخیمەی بریتانیا و عیراق ئەکەم. وە هەر لەم جوملەیە هیمەتی ئەعزایانی مەجلیسیش سزاواری تەقدیر و تەحسینە."

موتەسەرپیفی ئەوسای سلێمانی، کە ئەم وتارەی خوێندۆتەوە، ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ بوە. لەو (مەجلیسی تەئسیسی) یەدا کە دەستور (قانون ئەساسی عیراقی) دانـاوە، ئەحمەد بەگ خۆی، محەمەد بەگی فەتاح بەگی جاف، عیزەت بەگی عوسمان پاشای جاف، شێخ قادری حەفید، میرزا فەرەجی حاجی شەریف، مەبعوسی سلێمانی بون.

لە ژ28 دا نوسیوێتی:

**"ئینتیخابی مەبعوس**

"رۆژی چوارشەمە 24 ی مانگ ئینتیخابی مەبعوس تەواو بو. لە نەتیجەدا محەمەد صالح بەگ محەمەد عەلی بەگ بە 145 رەئی، میرزا فەرەجی حاجی شەریف بە 137 رەئی و، ئەمین زەکی بەگ بیگباشی ئەرکان حەرب بە 125 رەئی، ئەحمەد بەگ عوسمان پاشا بە 110 رەئی، بە مەبعوسی لیوای سلێمانی ئینتیخاب کران و دانران، ئەم زەواتی موحتەرەمانە کەوا بۆ مەبعوسی لیواکەمان هەڵبژێرراون بە ناوی هەمو میلەتەوە عەرزی تەبریکیان ئەکەین و بە دڵ و بە گیان دوعای موەففەقیەتیان تەقدیم ئەکەین. ئومێدمان وایە کە ئینشائەڵڵا ئەم وڵاتە بە واسیتەی هیمەت و سەعی ئەم زەواتی موحتەرەمەوە زۆر شتی باش و چاکی بۆ ببێ و بچێتە ریزەی وڵاتانەوە. زاتەن ئەمەل و ئومێدی زۆر زلی ئەم وڵاتە بەستراوە بە نەتیجەی سەعی و هیمەتی ئەمانەوە سا خوا تەوفیقیان بدا ئامین."

ژ29 ی 1 ی تەموزی 1925 دا دەربارەی دوەمین وەزارەتی سەعدون (26 ی حوزەیرانی 1925- 21 ی تشرینی دوەمی 1926) کە حەوتەمین وەزارەتی عیراق بوە، نوسیوێتی:

**"گۆڕانی هەیئەتی وزەرا**

"بە پێی خەبەرێ کە تازە لە بەغدادەوە هاتوە هەیئەتی وزەرای عیراق گۆڕراوە و هەیئەتی تازە وەکو نوسراوە دانراون:

| | |
|---|---|
| عەبدولموحسین سەعدون بەگ | رەئیس وزەرا و وەزیری خارجیە |
| رەشید عالی گەیلانی | وەزیری داخلیە |
| رەئوف بەگ جادرچی | وەزیری مالیە |
| ناجی سویدی | وەزیری عەدلیە |
| صەبیح نەشئەت | وەزیری دیفاع |
| عەبدولحسین چەلەبی | وەزیری ئەشغال |
| حیکمەت سلێمان | وەزیری مەعاریف |
| حەمدی بەگ پاچەچی | وەزیری ئەوقاف |

"خوا بکەم پیّ و قدومی هەمو لایەکیان بۆ میلەتی عیراق بە خێر و سەعادەت بیّ و عەرزی تەبریکات و تەمەنای موەفەقیەتیان ئەکەین. لە ناو ئەم زاتی موحتەرەمانەدا صەبیح نەشئەت بەگ کە یەکیّ لە ئەعازیمی کوردە و مەبعوسی ئەربیلە لە دڵی هەمو کوردێک دا جێگایەکی زۆر بەرز و بە قیمەتی هەیە ئەمساڵ لەگەڵ هەیئەتی عیصبەتولئومەم دا کە بۆتەحدیدی حدودی شیمالی موصل تەشریفیان هاتبو جەنابی صەبیح نەشئەت بەگیش لە تەرەف حکومەتی عیراقیەوە مومەسیل بون."

لە ژ31ی 16 ی تەموزی 1925 دا نوسیوێتی:

"**کردنەوەی مەجلیسی میللی**

"بە پیّی خەبەریّ کە لە بەغدادەوە هاتوە رۆژی پێنجشەمە 16 ی تەموزی 925 موصادیفی 24 ی زیلحیجەی 1343 بە ئیرادەی ملوکانە مەجلیسی میللی عیراق گوشاد ئەکریّ. ئەم رۆژە رۆژێکە بناغەی سەعادەتی میلەتی عیراق دائەمەزرێنیّ و رێگەی فەلاح و صەلاح نیشان ئەدا، دڵ فەرەح ئەکاتەوە، چاو رون ئەبێتەوە، غونچەی ئومێد ئەگەشێنێتەوە. خودا بە گەورەیی خۆی ئەم رۆژە موبارەکەمان بۆ بە خێر بگێریّ و خۆشی و سەعادەتی زۆر بە سەرمانا ببارێنیّ ئامین."

تا ئەو کاتە حکومەتی عیراق دراوی تایبەتی خۆی نەبوە، لە بازاڕەکانیدا بە (روپیە) ی هیندی سەودا کراوە.

لە ژ45 دا سەبارەت بە داهێنانی دراوی تایبەت بە عیراق نوسیوێتی:

"داخلی: مەجلیسی مەبعوسان لێدانی سکەیەکی مەخصوص بۆ حکومەتی عیراق، وە بەعزیّ مەوادی شیرکەتی ئەصفەری موزاکەرە، وە لائیحەی قانونیە کە دائیر بە (ئیعتای موکافاتی نەقدیە بۆ عائیلەی ئەفراد و زابتان کە لە خدمەتی ئۆردوی عیراق دا شهید ئەبن) قیرائەت و قبوڵ کراوە."

### 5. 2. 4. 2. سەردانی سلێمانی

لە ژ17 ی 23 ی شوباتی 1925 دا نوسیوێتی:

"هاتن: رۆژی 21 ی شوبات لە روئەسای عەشیرەتی پشدەر جەنابی عەباس ئاغای سەلیم ئاغا و ئەمین بەگ عەزیز ئاگا و حەسەن ئاغای ئەمین بەگ و مەحمود ئاغای عەباس ئاغا لەگەڵ 40 سوارێک تەشریفیان هێنایە سلێمانی بۆ دیدەنی جەنابی موتەسەریف. جەنابی شێخ عەبدولقادر ئەفەندی قائمقامی قەرەداغ و شێخ مستەفا و شێخ کەریم کوڕانی لەگەڵ تاقمە سوارێکدا هەر بۆ زیارەتی جەنابی موتەسەریف تەشریفیان هێنایە سلێمانی، بە ناوی هەمو خۆولاتیەکەوە عەرزی بە خێر هاتنیان دەکەین."

لە ژ18 ی 26 ی شوباتی 1925 دا نوسیوێتی:

"هاتن: ئێوارەی 23 ی شوبات جەنابی حاجی شێخ عارف و شێخ یوسف و شێخ کاکە حەمەی برای شێخ یوسف و شێخ حەمە رەزای حاجی شێخ عارف و لە روئەسای هەمەوەند حەمە ئاغای کاک عبداللە و کوێخا حەسەن حەمە ئەمین و کوێخا گدرون گەبە و عەزیز ئاغای گولیجە رۆژی 24 لە بەگزادەی جاف جەنابی ئەحمەد بەگ قائیمقامی ئەلەبجە و حمید بەگ معاونی قائیمقامی ئەلەبجە و محەمەد بەگی فەتاح بەگ و داود بەگی حەمە سەعید بەگ و عەلی بەگی ئەحمەد بەگ و حەمە سەعید بەگی حەسەن بەگ و لە ساداتی ئەبا عوبەیدە جەنابی شێخ رەشیدی شێخ محەمەد و شێخ رەشیدی شێخ مەحمود و شێخ عیسامەدینی عەودالان لە روئەسای عەشائر و بەگ زادەی جاف زەواتێک کە ئیسمیان لە بالاوە عەرز کراوە تەشریفیان هێناوەتەوە سلێمانی. بە ناوی عمومەوە عەرزی بە خێرهاتنیان دەکەین. ژیانەوە."

مەبەست لە هاتنی ئەم کەسایەتیە خێڵەکی‌یانە بۆ سلێمانی، جۆرێ بوە لە (بەیعەت) بە دەسەڵاتی سیاسی تازەی سلێمانی.

**5. 2. 4. 3. هەواڵی رۆشنبیری**

لە ژ14 ی 2 ی شوباتی 1925 دا، هەواڵی گەڕانەوەی حاجی تۆفیق ی کە دواتر بە (پیرەمێرد) ناوی دەرکرد، بەم جۆرە نوسیوە:

"هاتن: جەنابی تۆفیق بەگی مەحمود ئاغا کە 23 ساڵە لە وەتەن دور کەوتۆتەوە شەوی 30 ی کانونی سانی 925 تەشریفی هاتەوە. مەملەکەتەکەمان بە قدومی ئەم زاتە زۆر مەسرور و پێخۆشحاڵە. بە ناوی هەمو خۆوڵاتێکەوە بە خێر هاتنی دەکەین. ژ"

لە ژ18 ی 26 ی شوباتی 1925 دا نوسیوێتی:

"غەزەتەی دیاری کوردستان: لە گەنجە منەوەرەکانی سلێمانی، قائیمقامی پێشوی عەقرە، جەنابی صالح بەگ، ئەمجارە بە ناوی (دیاری کوردستان) دوە غەزەتەیەکی ئیجتیماعی کوردی لە بەغداد نەشر دەکا. تەمەننای موەففەقیەت و تەبریکی دەکەین."

لە ژ43 ی 8 ی تشرینی ئەوەلی 1925 دا هەواڵی بڵاوبونەوەی ژمارەی نوێی گۆڤاری دیاریی کوردستان کە لە بەغداد دەرئەچو، نوسیوە:

"دیاریی کوردستان بە کەمالی مەمنونیەت و سرورەوە نوسخەی تازەی دیاری کوردستان کە لەم ئاخرییەدا دەرچوە موتالەعەمان کرد. پڕ لە مەقالاتی موفیدە و حەوادیسی تازەیە. بە ناوی برایەتیەوە دوعای موەففەقیەت و تەمەننای عومردرێژی ئەکەین. ژ"

لە ژ31 ی 16 ی تەموزی 1925 دا نوسیوێتی:

"مژدەیەکی خۆش وەکو لە غەزەتەکانی عیراقدا خوێندومانەتەوە لەپاش ئەمەی کە حەزرەتی ئەشرەف فەخامەتی مەندوبی سامی زیارەتی لیوای هەولێریان کردبو وایان بە موناسیب زانی بو کە لیوای هەولێر لەمەودوا لیسانی رەسمیەکەی کوردی بێ و بەم رەنگە لە مەجلیسی وزەرایشدا قەراری لەسەر دراوە و تەبلیغاتی رەسمی کراوە. ئێمە ئەوەڵەن خۆمان و دوەمینی لیوای هەولێر تەبریک ئەکەین کە زبانەکەمان لە دو لیوای عیراق دا بە زبانی رەسمی ناسراوە و معامەلە هەر بە زبانەکەی خۆمان ئەبێ ئەمە نیشانەی تەرەقی و سەربەرزی میللەتی کورد و رەفئەت و مەرحەمەتی حکومەتە. لەگەڵ تەشەکوری ئێمە تەمەنا ئەکەین ئەم سەعادەتە بە دەوامی روی لە زیادی بێت."

لە ژ31 ی 16 ی تەموزی 1925 دا نوسیوێتی:

"سینەما: لە تەرەفی جەنابی ئامیری مەنتیقەی شەرقیەی عەلی رەزا بەگ عەسکەریەوە لەم رۆژانەدا سینەمایەکی بچوک هێنراوە بۆ ئێرە و، لە جێگەی قشڵە کۆنەکە مەوقعێکیان بۆ تەرتیب داوە و رێکیان خستوە. حەفتەیەکە بە شەو ئیش ئەکات و، خەڵق ئەچن تەماشا ئەکەن و رائەبوێرن. ئەم زاتە لەگەڵ وەزیفەی موهیمەی عەسکەریشیانا بۆ خزمەتی وڵاتەکە وەکو نادی، سینەما کە هەمو ئاساری عیمرانن دریغی هیمەت نافەرمون. سەعی و هیمەتی واقیعەی باعیسی شوکرانە.

"وەکو بیستومانە بەلەدیەی ئێرەش فیکری وایە بنێرێ مەکینەیەکی گەورەی باشی سینەما بێنێ بۆ ئێرە و ئیشی پێ بکات و، لێرەشدا ئەسەرێکی عیمران و مەدەنیەت خۆی نیشان بدا. هەرچەند مەملەکەتەکەمان داخلیەن هێشتا لەپێش ئەوەدا موحتاجی گەلێ شتی ترە، فەقەت چونکە ئەوەیش عەلامەتێکی بەرزی و ئاوەدانیە بۆ مەملەکەتەکەمان، دیسانەوە هەر شتێکی خۆشە. ئومێد ئەکەین کە ئەم فکرە و فکری تری باشیش کە بۆ وڵاتەکە بە کەڵک بێت سەربگرێ و بچێتە سەر."

لە ژ32 یش دا ئەم (ئیعلان) ەی بڵاوکردۆتەوە:

"شەوی یەکشەمە سینەما بۆ مەنفەعەتی مەکتەب ئیش ئەکا. هەمو مەعاریفپەروەر و ساحێب حەمییەتی لازمە کە ئیشتراکی ئەم خەبەرە عەزیمە بکا و، ئەوانەی کە ئیشتراک دەکەن موراجەعەت بە مەکتەب بکەن بلیت وەربگرن."

### 5. 2. 4. 4. هەواڵی مردن

لە ژ6 ی 3 ی تشرینی ئەوەلی 1924 دا نوسیوێتی:

"وەفاتی موئسیف: ڕۆژی یەکشەمبە 28 ی ئەیلول خان بەهادور عادلە خانم لە ئەلەبجە بە ئەجەلی مەوعود وەفاتی کرد بە ناوی عمومەوە و زۆر بە ئەسەفەوە بەیانی تەعزیەت لە مەخدومانی موشار ئیلەیها ئەکەین و تەمەنناى ڕەحمەت و غیفران لە حەزرەتی باری تەعالا ئەکەین."

لە ژ51 ی 3 ی کانونی ئەوەلی 1925 دا دەربارەی مردنی ناودارێکی بە تەمەنی سلێمانی نوسیوێتی:

"زیاعێکی گەورە: لە موعتەبەرانی وڵات عەبدولفەتاح چەلەبی کە عومری درێژی بە زوهد و تەقوا و تاعەت رابواردبو بەیانی دو شەممە بە رەحمەتی خوا چو. مەرحوم چونکە لە ئەربابی کردەوەی چاکە و خێرات بو، نیاز ئەکەین کە مەزهەری عەفو و مەغفەرەتی ئیلاهی بێت. بۆ ئەفرادی عائیلەیی و بیلخاسە بۆ کوڕانی موحتەرەمی سەبر و سکون تەمەنا، وە فاتیحا بۆ ڕۆحی ئیتحاف ئەکەین."

### 5. 2. 4. 5. هەواڵی دادگاکان

ژ34 ی 6 ی ئاغستۆسی 1925 هەواڵەکانی دادگاکانی بەمجۆرە نوسیوە:

"موقەڕەراتی مەحکەمەی کوبرا:

"سەلیم کوڕی محەمەد ئەمین و فارس کوڕی ئاغا میر ئێرانی عەسکەر لە ڕێگە کە وەستا ساڵح ناوی وەستای خۆیانیان بە خەنجەر و بە تەور کوشتوە هەر یەک پانزە ساڵ ئەشغال شاقە مەحکوم کراون. لەمانە عەلی ڕەحیم ناو کە بەم جورمە موتەهەم بووە تەبریە بووە."

"موقەڕەراتی مەحکەمەی جەزای دەرەجە ئولای سلێمانی:

"نوری کوڕی کاکەی نەنێ خەڵقی مەحەلـەی گـوێژە بە حاڵەتی سەرخۆشی کە جونـدی عەبـد کـوڕی عرێبی ناوی شەتم کردوە بە پانزە ڕۆژ حەبسی بەسیت و پێنج روپیە جەزای نەقدی مەحکوم کراوە.

"حەمە سور کوڕی صالح خەڵقی مەحەڵەی گوێژە بە حاڵەتی سەرخۆشی لە بازاڕ گەڕاوە بە دە روپیە جەزای نەقدی مەحکوم کراوە.

"عەبدولرەحمان کوڕی مەلا قادر خەڵقی مەحەڵەی دەرگەزێن کە هەڕەشەی لە یوسفی چایچی کردوە بە پانزە ڕۆژ حەپسی بەسیت مەحکوم کراوە.

"لەبەرئەمە کە عارەقی خواردۆتەوە و بەو حاڵەوە لە بازاڕ گەڕاوە محەمەد کوڕی شێخ مستەفا کە بە حەمەی ئێنی مەشهورە بە هەفتەیەک حەبسی مەحکوم کراوە.

"توتنچی ئەحمەد کوڕی سەعید ساکینی مەحەڵەی گوێژە کە بە حاڵەتی سەرخۆشی مونازەعەی کردوە بە پێنج روپیە جەزای نەقدی مەحکوم کراوە.

"عەلی کوڕی ئەمین خەڵقی دێی سەرکان کە لە سەر شاخی تاریدەر بە تفەنگەوە لەسەر ڕێگای عەسکەر دانیشتوە بە سێ مانگ حەبسی شەدید مەحکوم کراوە.

"مەحمود کوڕی فەتاح خەڵقی دێی گێچینە کە لە لای شێخ مەحمودەوە بە تفەنگێکی یانزە تیری ئینگلیسیەوە هاتۆتەوە و خەبەری نەداوە و ئەو تفەنگەی ساڵێک لای خۆی داناوە بە شەش مانگ حەپسی شەدید مەحکوم کراوە.

"سەید محەمەد کوڕی سەید عەبدولکەریم کە ئەشیای ڕەزا کوڕی خەڵەف ناوی بەشەو دزیوە و لێی دەرکەوتوە بە ساڵێک حەپسی شەدید مەحکوم کراوە."

### 5. 2. 4. 6. ئاڵوگۆڕی فەرمانبەران

لە ژ28 ی 26 ی حوزەیرانی 1925 دا نوسیوێتی:

"تەعین و تەحویل

"**داخیلە**: جەنابی ئەمین بەگی حاجی عەزیز ئاغا بە قایمقامی شارباژێر، حەمە ڕەشید ئاغای ئیسماعیل ئاغا بە مدیری ناحیەی شیوەکەڵ، حەسەن ئاغای ئەمین بەگ بە مدیری ناحیەی ماوەت، محەمەد بەگی قادر پاشا بە مدیری ناحیەی سەرچنار، ئەورەحمان ئاغای ئەحمەد پاشا بە مدیری تانجەرۆ، حاجی عەبدولحەمید ئەفەندی حسین ئەفەندی بە مدیری ناحیەی سەنگاو تەعین و، حاجی ئاغای حەسەن ئاغا بۆ مدیری ناحیەی قەرەداغ تەحویل کراون.

"**مالیە**: سەعید ئەفەندی مدیر ماڵی قەرەتاغ نەقل کرا بۆ مدیر ماڵی مەرکەزی سلێمانی، محەمەد بەگی حاجی ڕەسول بەگ بە معاونی قائیمقام و مدیر ماڵی شارباژێر تەعین کرا، ئەدهەم ئەفەندی کە مەئموری ئەملاکی مەخسوسە بو بۆ ئەمەی داخلی جەیش بێ لەم چەند ڕۆژانەدا چو بۆ بەغداد، لە جێگەی ئەو ڕەفعەت ئەفەندی مدیرماڵی ئەلەبجە نەقڵ بو، بۆ جێگەی ئەویش صالح ئەفەندی مدیر ماڵی پێشوی دەربەندی ڕانیە تەعین بو. ڕەشید ئەفەندی ئەمین سندوقی ئەلەبجە بۆ مەئمور ماڵی ناحیەی قەرەتاغ تەحویل، لە جێگەی ئەو عارف ئەفەندی ئەمین ئەفەندی تەعین کرا. عەبدولقادر ئەفەندی مەئمور ماڵی قەرەتاغ نەقڵ کرا بۆ مەئمور ماڵی خورماڵ. بەهجەت ئەفەندی مەئمور ماڵی خورماڵ کرا بە مەئمور ماڵی ناحیەی سەنگاو، مستەفا ئەفەندی ئەحمەد ئەفەندی بە مەئمور ماڵی ناحیەی تانجەرۆ، مەحمود ئەفەندی محەمەد ئەفەندی کەریم ئاغا بە مەئمور ماڵی شیوەکەڵ، ڕەشید ئەفەندی حسین ئەفەندی بە مەئمور ماڵی ماوەت تەعین و ئیعزام کران.

"**مەحکەمە**: ئیبراهیم ئەفەندی قازی پێشوی شارباژێر تەعین بو بە قازی بۆ قەزای شارباژێر. شێخ مستەفا ئەفەندی شێخ نەجیب ئەفەندی بە قازی قەرەداغ. شێخ جەلالی موفتی شارباژێر بە کاتبی مەحکەمەی قەزای شارباژێر تەعین بو. ئەمانە هەمو چونە سەر وەزیفە و دەستیان کردوە بە ئیش خوا لە هەمو موبارەک بکا و موەفەقیان بفەرموێ ئامین."

لە ژ10 ی 28 ی تشرینی سانی 1924 دا نوسیوێتی:

"داخلی:

"عەودەت و تەشریف

"جەنابی مێجەر ئەدمۆنس کە مودەتێک بو تەشریفی بە ڕوخسەت چوبوەوە ئینگلتەرە عەودەتی فەرموەوە و، ڕۆژی 24 ی تشرینی سانی بە تەیارە تەشریفی هاتەوە سلێمانی و لە جێگای تەیارە زۆر بە حورمەت و صەمیمیەت لە تەرەف ئەشراف و مەئمورین و ئەهالیەوە ئیستیقبال کرا و، تەلەبەی مەکتەب بە شیعرێکی جوان بە خێرهاتنەوەیان کرد ڕۆژی 28 ی مینهو عەودەتی فەرموەوە کەرکوک."

لە ژ30 ی 10 ی تەموزی 1925 دا نوسیوێتی:

"هاتن و ڕۆیشتن:

ڕۆژی 3 ی مانگ میستەر جاردین وەکیلی موفەتیشی ئیداری سلێمانی تەشریفیان بە تەیارە چوەوە بۆ موصل خوا حافیزیان بێ. ڕۆژی 5 ی مانگ جەنابی کاپتن لاین کە موفەتیشی ئیداری هەولێرە لە جێگەی ئەو تەشریفیان بە تەیارە هات بـۆ ئێـرە. ئەم زاتەیەش بە حوسـنی ئیـدارە و ئیقتیـدار و مەهـارەتی فەوقلعـادە و خۆش خوڵقی و دیرایەتی زۆر لە هەمو عیراق دا ناسراوە و مەشـهور و مەعلـومە. ئومێـدمان وایە ئینشـائەڵڵا ئێرەیش لە سایەی ڕەفئەت و هیمەتی ئەم زاتەوە ئیستیفادەیەکی زۆر بکـات. بە نـاوی هەمـو لیـواکەوە عەرزی بەخێرهاتنی ئەمیان و خواحافیزی ئەویان ئەکەین. ژ"

## 5. 2. 4. 7. هەواڵی بۆلشەویک

لە ژ5 ىدا نوسیوێتی بۆلشەویک چل سەرکردە ئیعدام ئەکەن

"مۆسکۆ 5 مینهو: حوکمی ئیعدامی 40 سەرکردەی گورجستان بە گولە باران کرا و حوکمەکە فەورەن ئیجرا کرا، هێشتا ئیسمیان مەعلوم نیە. فەقەت ئەڵێن یەکێ لە ئـومەرا (بۆنکـۆی) کە سـەرکردەی موخـالیفینی بۆڵشەویک لە گورجیەکانە داخل بون."

لە ژ7 دا نوسیوێتی:

"فرۆشتنی ئاساری ڕوس

"وا زانــراوە کە حکــومەتی ســۆڤیەت تەمــایەتی بەعزێــک لە ئاســاری ڕوس کە لە مۆزەخــانەدایە بفرۆشــێ. غەزەتەی جۆرنــالی ریــوایەت ئەکـا لە غەزەتەی (ئیسڤێسـتا) وە کە لەگەڵ ئەمینــی مۆزەخـانەی گەورەی پێترۆغرادا دیدەنی کردوە ئەڵێ سۆڤیەتەکان قەراریان دا دەسـت بکەیـن بە فرۆشـتنی چـل هەزار عەنتیکە. و حکومەت مەزایەدنامەی مەخسوس ئەنێرێ بۆ ئەو ئەوروپاییانە کە مەراقـی عەنتیکەیـان هەیە و بۆئەو دەوڵەمەنـدانە کە لە ئەمریقـان و تەبلیغیـان ئەکـا کە حکـومەت لە هـیچ ئیخراجـاتی ئەو عەنتیکـانە ڕەسمی گومرک ناسێنێ.

"ئەمینی مۆزەخانەکە لای مەعلومە کە حکومەت بە واسیتەی فرۆشتنی ئەم عەنتیکانەوە چەنـد ملیۆنێـک دۆلار گرد ئەکاتەوە."

## 5. 2. 4. 8. هەواڵی دەرەوە

ژیانەوە هەندێ هەواڵی گرنگـی وڵاتـانی دەرەوەی بڵاوکـردۆتەوە. ژمـارەیەکی زۆر هەواڵـی تورکیـا و ئێران و ئەفغانستان و میسری نوسیوە.

لە ئێـران هەواڵـی نـاکۆکیی ڕەزا خـان و شـا و، پێکهێنـانی وەزارەت و، ڕێکخسـتنی بـودجەی... نوسیوە.

لە میسر بایەخێکی تایبەتی داوە بە جموجوڵی ئـازادیخوازی گەورە سـەعد زەغلـول و ململانـێی لەگەڵ ئینگلیــز. هەواڵــی دورخســتنەوەی، گرتنــی لایەنگرەکــانی، گفتوگۆکــانی لەگەڵ کاربەدەســتانی ئینگلیــز، دەستهەڵگرتنی لە وەزارەت... بڵاوکردۆتەوە.

لە مەراکـیش بـایەخێکی تـایبەتی داوە بە شۆڕشـی ریـف دژی داگیرکەرانـی فەرەنسـی. هەواڵەکـانی شۆڕشــەکە و ســەرکردەی و شــەڕەکانی بڵاوکـردوۆتەوە. جـگە لەوانە چەردەیەکـی بــاش هەواڵــی دەوڵەتە گەورەکانی بریتانیا، فەرەنسا، ئەڵمانیا، ئەمریکای نوسیوە کە بۆ سەردەمی خۆی گرنگ بون.

**5. 2. 4. 9. هەواڵ بۆ خۆشی**

ژ6 ی 3 ی تشرینی ئەوەلی 1924

"الموصل کە لە شط العرب ەوە وەری گرتوە

"نەتیجەی سەرخۆشی بە پێی ئیختیلافی جنس

وا مولاحەزە کراوە کە لە وەقتی سەرخۆشی دا فرانسز رەقس ئەکا، ئەڵمان گۆرانی ئەڵێ، ئیسپانیا قومار ئەکا، ئینگلیز خواردن ئەخوا، ئیتالیایی پێی موتەکەبیر ئەبێ، روس عیشق و حوبی پەیدا ئەکا، ئیرلاندەیی شەڕ ئەکا، ئەمریقایی نوتق ئەدا و نۆبی پێی بێدەنگ و مات دەبێ. فەقەت عیراقی ئەوەندە شەڕ و هەرا ئەکا هەتا لە قەرەغولخانە خەوی لێ ئەکەوێ."

ژ8 ی 24 ی تشرینی ئەوەلی 1924

"خەو هەروا ئەبینرێ

"لە غەزەتەکانی ئینگلیزی دا نوسراوە کە میستەر سورنتۆن جۆنس (لە غالی شیمالی) لە خەویدا خۆی خۆی سەرئەبڕی هەر بە دەم خەوەوە هەڵسا لەسەر مێزەکە چەقۆی گرت بەدەستەوە دەستی کرد بە بڕینی ملی خۆی، کە راپەڕی تەماشی کرد هەمو لەشی هەر خوێنە، دەست بە جێ ژنەکەی و کوڕەکەی بانگ کرد خەریک بو قسەیان لەگەڵ بکا تاقەتی نەما بو دەستی دایە قەڵەمەکەی نوسی کە (لە خەوما خۆم سەبڕی بو، کەچی کە هەڵسام تەماشم کرد حەقیقەت بو) لە پاش هەشتا دەقیقە روحی دەرچو."

لە ژ10 دا نوسیویێتی:

"بارانی رەش

"مودەتێک لەوەو پێش لە مەملەکەتێکدا لە ئینگلتەرە بارانی رەش باری بو. تەبیعیون لەمە موتەحەیر مابون. لە ساڵی 1889 یش دا لە نیۆرک چەند سەعاتێک بارانی رەش باری بو.

"بارانی سور

"بەڵام بارانی سور زیاتر واقیع ئەبێ لە ساڵی 1885 دا لە ئیرلەندە لە شاری کاستلی تەرزەیەکی سوری وەکو خوێن باری بو.

"بەفری رەش و سور

"فەقەت بەفری رەش لە شاخەکانی ئالپ زۆر بینراوە لاکین بەفری سور ئەغڵەب لە شاخەکانی تیرۆڵ و ئەڵمانیا و مەناتیقی مونجەمیدە واقیع ئەبێ. بەعزێ لە تەبیعیون ئەڵێن سەبەبی رەش بونی بەعزێ بەفری شاخەکانی ئالپ ئەو لم و غوبارەیە کە با لە سەحرای ئەفریقاوە بۆی ئەبا."

"عەجائیب و غەرائیب

"سەگێک لە ترسا توکی سەری سپی بوە

"ئەڵێن لە شاری جلفستد سەگێک کە ناوی (مت) بوە لەگەڵ ساحێبەکەیا لە ئۆتۆمۆبیلێدا بو وا هەڵکەوت ئۆتۆمۆبیلەکە وەرگەڕا. غەیرەز سەگەکە هەرچی تیا بوو مرد لە پاش مودەتێک تەماشایان کرد سەری سەگەکە کە جاران رەش بو ئێستا سپی بوە. ئەمە حەمل ئەکەنە سەر ترس و تەئەسوری سەگەکە."

**5. 3. وتار نوسین**

وتار یەکێ لە کۆڵەکە سەرەکیەکانی رۆژنامەیە، بە تایبەتی سەروتار. ئەو رۆژنامانەی لە رێگەی دەربڕینی رایەکی دیاریکراوەوە ئەیانەوێ کار لە بیروڕای گشتی خەڵک بکەن بە زۆری بە نوسینی وتار بە تایبەتی سەروتار ئەو کارە ئەکەن.

### 5. 3. 1. بابەتەکانی

زۆری ژمارەکـانی ژیـانەوە وتـاری تێدایـە. وتارەکـانی جۆراوجـۆرن، وتـاری: سیاسـی، ئەدەبـی، کۆمەڵایەتی، زانستی و، باسی کشتوکاڵ و خوێندن و پەروەردەیە.

بۆ نمونە زێوەر لە ژ30 دا دەربارەی خوێندن و پەروەردە نوسیوێتی:

"... ئەمڕۆ مەکتەبی سلێمانی عیبارەت لە 5 صنف 4 ی ئەوەلی و یەکێکـی ئیبتیـدائی مەوجـودی تەلەبە 110 و موعەلیم 6 و خەدەمە 1 و وە وەعدیان فەرموە کە لە ئیبتیدای سەنەی تەدریسات مەکتەبێکی ئـاخریش لە سلێمانیا بکرێتەوە. ئومێد ئەکەین کە حکومەتی عیراق لە سەر تەشەبوسات و غیرەتی مەبعوسـانی تازەمـان بمانخاتە ریزەی باقی لیواکانی عیراق. ئەحوالی سابیق فەرامۆش بکرێ. هەرچەند ئەم دو مەکتەبە حاڵی حازر بۆ منداڵەکانمان کافیە فەقەت لازمە کچەکـان و منـداڵە فەقیـرە بـێ بـاوک و دایکەکانیشـمان بـێ خوێنـدن و صنعەت نەمێننەوە وەکو لیواکانی تر مەکتەبێکی ئوناس و صەنایع بکرێتەوە."

### 5. 3. 2. جۆری دارِشتنی

ئەم وتارانە پڕن لە وشەی بێگـانە وەکـو عەرەبـی، فارسـی، تـورکی. هەنـدێ لەو وشـە عەرەبیـانەی بە کارهێنراون، زۆر جار بە مانا فارسی یان تورکیەکەی بەکار هێنراون نەک بە مانا عەرەبی‌یەکەی. تاک و توک وشەی زمانە ئەوروپاییەکانیش بەکارهێنراون.

نوسەرەکانی ئەم وتـارانە ئەوەنـدەی لە توانایـان‌دا بـو بـێ هەوڵیـان داوە مەبەسـتەکانیان بە ئـایەتی قورئان، حەدیس، قسەی نەستەق، شیعری فارسی، پەندی پێشینانی کوردی، بسەلمێنن و بە هێزی بـکەن. لەبەر ئەوەی خوێندەوارانی ئەو سەردەمە ئاشنایەتییان بەم زمانانە یان بە هەنـدێکیان هەبـوە، نوسـەری وتارەکـان ئەسڵی ڕستەکانیان بە بێ وەرگێڕانی کوردی نوسیوە.

لە ژ2 دا لە وتاری (مانـگ گیـران و سـلێمانی) دا، چەنـد ئـایەتێکی بەکارهێنـاوە: (لـیس للانسـان الا ماسعی) و، (و کل في فلك يسبحون)

لە ژ7 دا سەعید فەوزی لە وتاری سەرم سوڕماوە ئەمانەی بەکارهێناوە: من جد وجـد. سـاعتا لربـي و ساعتا لقلبي. ئایەت: هل يستوی الذين يعلمون و الذين لا يعلمون. حەدیس: ليس الرجل رجل الدنيا ولا الرجـل رجل الاخرى بل الرجل رجل الدنيا و الاخرى. شفتالو بيا به گلو.

لە ژ4 دا لە سەروتاری (ئەرێ) دا، چەند شیعرێکی فارسی بۆ سەلماندنی مەبەستەکەی نوسـیوە: (خـال محبوبان سياه و دانەی فلفل سياه/هر دو جانسوزند اما اين كجا و ان كجا) و، (من انچه شـرط بلاغسـت بـا تو ميگويم/تو خواه از سخنم پند گير و خواه ملال).

لە ژ49 دا مستەفا شەوقی لە وتارێکدا کە لەسەر کوردستانی تورکیا نوسیوێتی، لە 3 زمانی جیاوازەوە شتی وەرگرتەوە: ناونیشانی وتارەکەی بەم بەیتە فارسیە دەس پێ ئەکا: (مكن ز غصه شـكايت كه در طريـق طلب/به راحتى نرسيد انكه زحمتى نكشيد)، ئینجا لە زمانی عەرەبیەوە پەندی بە ناوبانگی: (فوائـد قـوم عنـد قوم مصائب. ومصائب قوم عند قوم فوائد) وەرئەگرێ و، دوای ئەوە دو پەندی پێشینانی کـوردی تێکهەڵکـێش ئەکا: (ئەوەی پێم ئەکرد خێرە، لێم بو بە گورگ و شێرە) و، (گیا لەسەر بنجی خۆی ئەڕوێ).

### 5.4. ڕیپۆرتاج نوسین

ژیانەوە چەندین ڕیپۆرتاجی پڕ لە زانیاری و پوختی سەرکەوتوی تێدایە، بۆ نمونە ئەو ڕیپۆرتاجانەی لە (2. 1.) و (2. 3.) ی سەرەوەدا نوسراون.

## 6. شوێنی لە مێژوی رۆژنامەوانیی کوردیدا

ژیانەوە لە قۆناغێکی سیاسیی گرنگدا دەرچوە. لە قۆناغێکدا کە ئەشێ بە نوقتەی وەرچەرخانی دابنێین لە مێژوی سیاسیی کوردستاندا.

لە کوردستانی عیراق، شێخ مەحمود بە تێکشکاوی کشایەوە شاخ و، هێزەکانی ئینگلیز و عیراق سلێمانییان داگیر کرد. سلێمانی، ئاگردانی داوای سەربەخۆیی کوردستان، ئیتر بە یەکجاری خرایە سەر عیراق. ئینگلیز ئاواتی کوردی سەبارەت بە کوردستانی سەربەخۆ خنکاند.

لە کوردستانی تورکیا، شۆڕشی شێخ سەعید بە دڕندانەترین شێوە دامرکێنرایەوە. تورک پلانی تواندنەوەی کوردی دانا. هەزاران کەس کوژران و دەربەدەر بون و سەدان ئاوایی وێران کرا و، سەدان هەزار کورد راگوێزران.

لە کوردستانی ئێران، سمکۆ ئەگەرچی هێشتا نە کوژرا بو، بەڵام جوڵانەوەی نەتەوەیی کورد شکستێکی وای خوارد بو، لە ئاسۆی نزیکدا تروسکاییەکی جێگەی ئومێدی لێ نەئەبینرا.

ژیانەوە تۆمارێکی گرنگی تێشکانی جوڵانەوەی نەتەوەیی کورد و بە ئاوات نەگەیشتنی ئەو قۆناغەیە. رۆشنبیرانی سلێمانی هەوڵیاندا لەم پەنجەرەیەوە باس و خواستی کوردایەتی جارێکی تر بهێننەوە سەر مێزی لێدوان.

ژیانەوە وەکو رۆژنامە سەرەڕای کورتیی تەمەنی و سەرەڕای دواکەوتویی دەزگای چاپەکەی، بە ناوەرۆک دەوڵەمەن و مەرجەکانی رۆژنامەی هاوچەرخی تێدایە. ئەمیش بەشداریەکی کاریگەری کرد لە زیاتر چەسپاندنی نەریتی قوتابخانەی رۆژنامەوانیی سلێمانیدا.

### چەند تێبینییەک:

1. عەبدوڵا زەنگەنە هەمو ژمارەکانی ژیانەوەی بە پێشەکی و لێدوانەوە لە هەولێر چاپ کردۆتەوە
2. دەبارەی شۆڕشی شێخ سەعید بڕوانە:

Robert Olsen, The Emergence of Kurdish Nationalism, 1880 - 1925, University of Texas Press, 1991

تەرجومەی فارسی:

رابرت اولسن، ترجمه ابراهیم یونسی: قیام شیخ سعید پیران، تهران، انتشارات نگاه، 1377

تەرجومەی کوردی:

رۆبێرت ئۆڵسن، تەرجومەی ئەبوبەکر خوشناو: شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران، سلێمانی، 2000

3. وتارەکەی ئیحسان نوری کاتی خۆی بە تورکی لە بەغداد چاپ کراوە. جەمیل بەندی رۆژبەیانی لەم ساڵانەی دواییدا جارێکی کە لە تورکیەوە کردویەتی بە کوردی و بڵاوی کردۆتەوە.

## 7. 2. دیاریی کوردستان



سال : ١ تاریخ تأسیسی : ١٥ شعبان المعظم ١٣٤٣ ژمارە : ١

خذ ما صفا دع ما كدر

تونە مردوی اسی صلاح الدین ایوبی نسب

هر بژی کرشاییت کورد لە فخر عرب

# دیاری کوردستان

## هدية كوردستان

## DIYARI-YI-KOURDISTAN

هفتەی جاری بەکوردی وعربی وتورکی دەر ئەچی

صاحب امتياز وسر محرر : صاحبقران زاده

١٥ شعبان المعظم چوارشه مو ١١ مارت ١٩٢٥ — ١٣٤٣

مطبعة دار السلام * بغداد



ل : ٢ تاریخ تأسیسی : ٥ ز شعبان المعظم ١٣٤٣ ژماره: ١٦

دیاری کردستان

هدیة کردستان

DIARY KOURDISTAN

صاحب امتیاز: صاحب قران‌زاده

Proprietor : S. Z. Sahibgran

طبعت بالمطبعة السريانية الكاثوليكية في بغداد

شوال ١٣٤٤ سه شنبه ١١ مایس ١٣٤٢ ـ ١٩٢٦

## 1. دیاریی کوردستان

شێخ مەحمود، دوای ئازاد کردنی لە دیلی کە گەڕایەوە کوردستان. ساڵح زەکی لە دەزگای حکومەتی عیراقدا کاربەدەست بو. وەزیفەکەی بە جێ هێشت و گەڕایەوە سلێمانی.

ژ1 ی (ڕۆژی کوردستان) بەم جۆرە لە (تەشریف) هێنانەوەی ئەدوێ: "بیکباشی جەنابی صالح زەکی بەگ کە یەکێکە لە ئەزکیا و وەتەنپەروەرانی کورد، لەمەوپێش لە عەقرە قائیمقامی مەلیک بو. مەحزەن بۆ خزمەتی وەتەن و میللەت ئیستیعفای کردوە و هەفتەیەک لەمەوپێش تەشریفی هێناوەتەوە سلێمانی. بەخێر هاتنەوەی دەکەین."

شێخ مەحمود کردی بە (قوماندانی عەسکەری کوردستان)، بەم بۆنەیەوە لە ژ3 ی ڕۆژی کوردستان دا سپاسنامەیەکی وەهای نوسیوە: "لە میژا (دەمێ بو) لە وەتەن و قەوم و برادەرانی عەزیزم دور و مەهجور بوم. شوکری خوا ناتوانم بە جێ بێنم کە منی لەم ڕۆژە پیرۆزەی سەربەخۆیی قەومی کوردا هێنایەوە سلێمانی، لە لوتف و مەرحەمەتی ئەشرافی مەملەکەت و موتەحیزان و برادەرانی وەتەن گەلێ مەسرور و موباهی بوم. لە دڕەنگ و زوییی ئیعادەی زیارەت تەماشای قصورم نەکەن، خوا لە هەمو لایە ڕازی بێ. بە واسیتەی ڕۆژی کوردستانیش عەرزی تەشەکورات و تەئییدی ئیحتیرامات دەکەم. قوماندانی عەسکەری کوردستان: صاحێبقران زادە صالح زەکی."

لە دوای بۆردومانی سلێمانی و چۆڵکردنی و کشانەوەی هێزەکان بۆ سورداش، شێخ مەحمود گومانی لێ کرد و گرتی. دوای ئازاد کردنی، لە شێخ مەحمود بە ڕەنجاوی جیا بوەوە و ڕۆیشتە بەغداد. ئیمتیازی بڵاوکردنەوەی (دیاریی کوردستان) ی وەرگرت.

## 2. دەرچونی

دیاریی کوردستان، ژ1 ی لە 11 ی مارتی 1925 و

ژ16 ی کە دوا ژمارەیەتی، لە 11 ی مایسی 1926 دا دەرچوە.

گۆڤارەکە 3 بەشە، لە پێشەوە بەشی کوردی، دوای ئەو بەشی عەرەبی، ئینجا تورکی. بە هەر 16 ژمارەکەی و بە هەر 3 زمانەکەی بە سەر یەکەوە 406 لاپەڕەیە. گۆڤارێکی وێنەدار بوە.

لاپەڕەی یەکەمــی بەرگەکەی خــراوەتە نــاو چوارچێــوەیەکی گەورەوە. لە ســەرەوەی چوارچێــوەکە نوسراوە:

سال: 1 تاریخی تەئسیسی: 15 ی شعبان المعظم 1343 ژمارە: 1

لە ناو چوارچێوەکەدا:

وێنەیەکی صەلاحدینی ئەیوبی کە لە لای راستی نوسراوە: (خذ ما صـفا) و، لـە لای چەپـی نوسـراوە: (دع ما كدر) و، لە ژێریدا ئەم بەیتە نوسراوە:

تۆ نەمردوی ئەی صەلاحەدینی ئەیوبی نەسەب

هەر بژی ئەی شاه بەیتی کورد، ئەی فەخری عەرەب

لە ژێر بەیتەکەدا بە کوردی و بە گەورەیی ناوی گۆڤارەکە (دیاریی کوردستان) و،

لە ژێریدا بە عەرەبی (هدية كوردستان) و،

لە ژێری ئەویشدا ناوەکەی بە حەرفی لاتینی و،

لە ژێر ئەویشدا نوسراوە: هەفتەی جارێ بە کوردی و تورکی و عەرەبی دەرئەچێ.

ئینجا صاحیبی ئیمتیاز و سەر موحەڕیر: صاحیبقران زادە

لەژێر چوارچێوەکەدا 15ی شعبان المعظم چوار شەمو 11 مارت 1925-1343

مبطعة دارالسلام - بغداد

لە دوا لاپەڕەیشیدا نوسراوە:

"دیاریی کوردستان

"هەفت ڕۆژنامەیەکی ئیجتیماعی و ئەدەبی و مصەوەرە، جارێ پانزە رۆژ جارێ دەرئەچێ.

"غایە و هەدەفی: تێگەیشتن و پێگەیشتنی میللەتە، خدمەتی ئینسانییەتە.

"موخابەرە: بۆ هەمو شتێ موخابەرە لەتەک ئیدارەخانە ئەکرێ.

"مەقالە: ئەوی بۆ خێـرو نـەفعی میلـەتی کـوردو ئینسـانیەت بـێ مەعەل مەمنـونییەت ئەنوسـرێ، ئەوی نەنوسرا ئەگەر داوا کرا ئەوە ئەدرێتەوە."

لە هەمو ژمارەکانیدا ئەم روخسارە دوبارە بۆتەوە.

رەشید شەوقی مدیری ئیدارە و نوسـەری بەشـی کـوردی و، خەلەف شـەوقی داودی نوسـەری بەشـی عەرەبی و، د. شوکری محەممەد صەگبان نوسەری بەشی تورکی بوە.

## 3. ئامانجی

خاوەنی گۆڤار لە سەروتاری یەکەمین ژمارەیدا لە ژێر سەردێڕی: (دێباچە) دا نوسیویێتی:

"لە پایتەختی حکومەتی فەخیمەی عیراقدا جەریـدەیەکی سیاسـی و یەومـی لازم بـو کە لیسـانی حـاڵی میللەتـی کـورد بـێ، ئەوەلەن بـۆ ئیمتیـازی رۆژنـامەیەکی سیاسـی و ئیجتیمـاعی و ئەدەبـی و ئیقتیصـادی ئیستیدعایەکم دابو، بە ناوی تەئمینات مڵکـم نـوان بـو، لاکـین قەوانـین و ئەوامیـری حکـومەت بـۆ نەشـری جەریدەی سیاسی دو هەزار رۆپیە نەقدی دیپۆزیتوی تەڵەب ئەکرد.

"بە ئیستیدعایەکی تر بە ناوی دیـاریی کوردسـتان ئیمتیـازی جەریـدەیەکی ئیجتیمـاعی و ئەدەبـی و مصەوەرم ئیستیرحام کرد. حکومەتی فەخیمە درێغ مەرحەمەتی نەفەرمو.

"هیچ شتێک نیە کە نەبێژرا بێ، هەرچی تازە رو بدا ئەوەیە کە لێمان گوم بوە لە بیرمان نەماوە...

"(دیاریی کوردستان) دیار دیار ئەگەڕێ، گوڵ و گوڵزار ئەپشکنێ، هەرچی دەست کەوت دەستە دەستە ئەیبەستێ، جستە جستە وەک دەستە گوڵ پێشکەش خوێندەواران و ئاشنایانی خۆی ئەکا.
"(دیاریی کوردستان) کوردی و عەرەبی و تورکی دەرئەچێ. بۆ فارسـیـیـش مەئـزونە پـڕی بکـاتەوە، ئینشائەڵلا ئەویش ئەبێ."

سیاسەتی حکومەتی عیراقی لە سەردەمی پاشایەتیدا ئەوە بو نە ڕێگەی دامەزرانـدنی حیزبـی سیاسـی بە کورد بدا، نە ئیمتیازی دەرکردنی ڕۆژنامەی سیاسی بداتێ.

## 4. بابەتەکانی

### 4. 1. ژیاننامە

بابەتێکی درێژی بە زنجیرە لەسەر ژیانی سـەلاحەدین بڵاوکـردۆتەوە. یەکـێ لە بـابەتە سـەرەکیەکانی دیاریی کوردستان، نوسـینی ژیاننـامەی گەورەپیـاوانی عیـراق و کـود و بڵاوکـردنەوەی وێنەکانیـانە. لەنـاو کاربەدەست و سیاسیەکانی عیراقدا، بیۆگرافی مەلیک فەیسەڵ، مەندوبی سامی بریتانیا سـێر هـانری دوبـس، مس گێرترۆد بێڵ، یاسین هاشمی، جەعـفەر عەسـکەری، نوسـیوە. لە کۆتـایی بیـۆگرافیەکەی ئەمەی دوایـیندا نوسیوێتی: "جەعفەر پاشا بۆ ئیستیقلالی میللەتی عەرەب و عیراق گەلێ خـدمەت و فیـداکاری بـوە، حەیـاتێکی قەهرەمانانە و وەتەنپەروەرانەی هەیە. کوردیش ئەزانێ، ئەصلەن کوردە، باوکی کە مستەفا بەگی میرالایەو لە کوردستان و عیراق دا بە مستەفا بەگی پەهلەوان مەشهورە خەڵقی ناحیەی قەڵاسێوکەیە."

لەناو گەورە پیاوانی کوردیشدا ژیاننامەی حسێن کەنعان پاشای بەدرخان، ئیبراهیم بەگی حەیـدەری و خانەوادەی حەیدەری، خالید بەگی بابـان، گەورەی هەڵسـانی کـورد: سـەماحەتمەئاب شـێخ سـەعید ئەفەنـدی، محەممەد ئەمین زەکی، ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگ، حازم بەگی ئال شـەمدین، سـەید ئەحـمەدی خانەقـا، ڕەشـید شەوقی، نوسیوە.

لە سەرەتای بیۆگرافی حسێن کەنعاندا نوسیوێتی: "جەنابی حسێن پاشـا... کـوڕی بەدرخـان پاشـای حوکمداری ئەخیری بۆتانە. پایتەختی حکومەتی بۆتان جزیرە بوە، ئێستایش قـوبە و ئەنقاضـی حیشـمەت و دەبدەبەی سەڵتەنەت و حکومەتی بەدرخانیان لە جزیرە، لە کەنـاری ئـاوی دیجـلەدا، لە دامێنـی چیـای جـودی، حەسرەتکێش و ئاواتەخوازی ئەیامی گوزەشتە و سەربەخۆیی میللەتی کوردە."

لە کۆتـایی بیـۆگرافی خالیـد بەگـی بابـان دا نوسـیوێتی: "بە یـادی حەزیـن و مەسـعودی پێشـو، بە ئاواتەخوازی سەربەخۆیی و حکومەتێکی گەورەی کورد سەری ناوەتەوە."

لە ژ13- 14 ی 5 ی مارتی 1926 دا وتارێکی لە ژێر سەردێڕی: (شێخ سەعد و قیـامی کوردسـتان) دا نوسیوە، لەبەر نرخی مێژویی لێرەدا وەکو خۆی دوبارەی ئەکەمەوە:

"کەس نەماوە ناوبانگی شێخ سەعیدی رەئیسی ئیختیلال و قیامی کوردسـتانی نەبیسـتبێ. ئەم خەبەرە نەوەک هەر لە ئاسیای غەربی، لە ئەقصای غەرب، لە ئەوروپا، لە ئەمریقا، لە هەمو دنیا دەنگی دایەوە.

لە جەرائیدی موختەلیفە رەسمی شێخ سەعید کێشرا، لەم ئیختـیلالە بەحـس کـرا.. لاکـین هەتـا ئێسـتا رەسمی شێخ سەعید و تەرجـومەی حـاڵی بە تەواوی نیشـان نەدرا. (المصـور) کە یەکە جەریـدەی میصـرە، لە ژمارەیەکیا رەسمی (مەلا سەعید ئەفەندی بەدیع ئەل زەمان) ی بە هی (شێخ سەعید) نواند بو. ئەم جارە (شـێخ عەلی رەزا ئەفەندی) ی کوڕی (شێخ سەعید ئەفەندی) کە لە عامیلان و روئەسای ئیختلالی کوردە هـاتە بەغـداد.

ئەم رەسمە کە لەم ژمارەدا کێشراوە عەینەن رەسمی شـێخ سـەعیدە و تەرجـومەی حالیشـی بە پـێی ئیفـادە و مەعلوماتی (شێخ عەلی رەزا ئەفەندی) نوسرا و، عەرزی خوێندەوارانی دیاریی کوردستان کرا.

"شێخ سەعید ئەفەندی کوڕی شێخ مەحمود ئەفەنـدییە. شـێخ مەحمـود دانیشـتوی دێی (کلـدار) بـوە. ئەوەڵەن لە (کلدار) لە پاش مـودەتێ لە (پـالو) ئیرشـادی فەرمـوە. کلـدار داخلـی نـاحیەی (مـنش کـرد) ە، ئەم ناحیەیە لە تەوابیعی وڵاتەتی (کنج) ە. ئەو ناوە هەمو کوردن و کوردزبانن. شێخ مەحـمەد ئەفەنـییـش کـوڕی شێخ عەلی ئەفەندیەیە و شـێخ عەلـی ئەفەنـدی لەو نـاوە بە (السـبتی الامـدی) مەشـهور بـوە. لە وەقتـی خـۆی تەریقەتی نەقشیەی لە حەزرەتی مەولانا خالیدی شەهرەزوری وەرگرتوە. ئیقتیباسی فیوزاتی کـردوە و بـوە بە یەکە خەلیفەی حەزرەتی مەولانا.

"شێخ سەعید ئەفەندی لە تاریخی 1285 ی هیجری لە پالو قەدەمنیهـادەی عـالەمی شـهود بـوە. دایکـی کچی شێخ عەبدوڵڵا ئەفەندیی خەلیفەی شێخ عەلی ئەفەندیی باپیریە. لە مەداریسی پالو و مـوش تەحصـیل و ئیکمالی عیلمی کردوە و ئیجازەی وەرگرتوە. لە علـومی شـەریعەدا ئوسـتاز و موتەخەصـیص بـوە. تەریقەتـی نەقشیەی لە باوکی وەرگرتوە. هەر لە زەمانی باوکیا خەلیفە بوە و دەستی بە تەدریس و ئیرشـادات کـردوە و فەزل و عیرفانی مەشهور بوە.

"تەبیعەتی شیعریەیشی هەبوە، بە کوردی و عەرەبی و فارسی و تورکی، ئەشعاری هەیە. شێخ مەحمـود ئەفەندی لە تاریخی 1316 لە خنس ئەمری خودای بە جێ هێناوە، مەرقەدی سـاعەتێ لە ڕۆژئـاوای قەسـەبەی خنس زیارەتگاهی خاص و عامە. شێخ سەعید ئەفەندی بە ئارەزو و بەیعەتی موریدان و خولەفـا و ڕوئەسـای عەشائیر لە جێی باوکی بوە بە پۆستنیشینی تەریقەتی عەلیەی نەقشیە. مودەتی حەیاتی بە ئیرشاد و تەدریس ڕابواردوە. فەصاحەتی، قوەی عیلمیە و ئیرشـادی، عیبـادەت و تەقـوای، مەوقیعێکـی زۆر بڵنـد و ڕۆحـانی پـێ بەخشیوە.

"دوانزە موجازی عیلم و 60 هەزار مورید و خەلیفەی بوە. ئەمانە بیلا قەید و شەرت تابیع و مونقـادی ئەمر و نەهیی شێخ سەعید بون. خۆی یەکێ بو لە خولەفای باپیری، لە گەلێ خولەفـای تریشـەوە موریـدان و تەوابیعی شێخ عەلی ئەفەندیی باپیری هەیە، ئەمانەش بە حەسەبی ئەمەی کە جێنشین و پۆستنشینی تەریقەی شێخ سەعید بو، دوبارە تەماشـای ئەمـر و نەهـیی ئەمیـان ئەکـرد. بەم جـۆرە تەقـریبەن 140 هەزار نەفـس موراجەعەتگاهی دین و دنیایان شێخ سەعید ئەفەندی بو.

"ئەوەل ژنی کچی شێخ ئەحمەد ئەفەندیی (چان) ە. چان دێیەکە لە تەوابیعی (جباقچور). شێخ ئەحمەد ئەفەندی خەلیفەی شـێخ عەلـی ئەفەنـدی بـاپیری شـێخ سـەعیدە. لەم ژنەی 3 کـوڕی: شـێخ عەلـی ڕەزا، شـێخ غیاسەدین، صەلاحەدینی هەیە، هەر سێکیان مەوجودن.

"ژنی دوەمی خوشکی خالید بەگی ڕەئیسی عەشـائیری (جبـران) ە. خالیـد بەگ لە مەکتەبـی حەربـیەی ئەستانبول لە قیسمی عەشـائیر دەرچـوە، لە تەشـکیلاتی حەمیـدیە و حەربـی عمـومی میرئـالای (کۆلۆنێـل) ی عەسکەری بو. پاش موتارەکە موەزەف بو و گەلێ خدمەتی بو. پێش قیامی شێخ سـەعید لە ئەسـنای تەوقیفـی یوسف زیا بەگی مەبعوسی بتلیس، خالید بەگ لە ئەرزرۆم غەفلەتەن گیراوە و سـەوقی بتلـیس کـراوە، لەوێ لە سەر مەسئەلەی میللیەت و کوردیەت ئەمیش نـراوەتەوە بە نیشـانەی تفەنـگ. ئینشـائەڵڵا موسـتەقبەلەن زیـاتر مەعلومات ئەدەین و ڕەسمی ڕیجالی ئیختیلالی کورد و ئەعازیمی میللەت بەرە بەرە عەرز ئەکەین. شـێخ سـەعید ئەفەندی لەم ژنەی تەنها کوڕێکی بچوکی هەیە.

"ژنی سێیەمی لە خولەفای باپیری کچی (شێخ عەلی ئەفەندی) ی دانیشتوی دێی (حاجی بەگ) ە. دێی حاجی بەگ لە تەوابعی (وارتو) یە. لەم ژنەش هەر کوڕێکی هەیە."

**4 .2. باسی ئەدەبی**

دیاریی کوردستان بایەخێکی تایبەتی داوە بە شیعر. چ هی شاعیرانی چەرخی رابوردو و چ هی شاعیرانی هاوچەرخی خۆی. لە زۆری ژمارەکانیدا چەند لاپەڕەیەکی بۆ شیعر تەرخان کردوە. تا ئەو کاتە دیوانی هیچ کام لە شاعیرە ناسراوەکانی کورد، جگە لە دیوانی مەحوی کە عەلی کەمال باپیر لە چاپخانەی حکومەت لە سلێمانی چاپی کرد بو، بڵاونەکراوەتەوە.

دیاری بایەخێکی تایبەتی بە شیعرە نەتەوەییەکانی حاجی قادری کۆیی داوە:

لە ژ1 و 2 دا بەهارییەکەی و،

لە ژ3 و 7 و 9 یدا شیعرە درێژەکەی سەبارەت بە شاعیرانی کوردستان و،

لە ژ7 یدا لە سەر مێژوی کورد و،

لە ژ11- 12 یدا دو شیعری بە ناونیشانی وجدی میللی و تەوحیدی باری و،

لە ژ13- 14 شیعرێکی تری، بڵاوکردۆتەوە.

لە ژ1 یدا لە ژێر بەهارییەکەیدا نوسیویێتی: "هەرچی فۆتۆگراف وە یا رەسمی حاجی قادری کۆیی هەیە رجا ئەکەین بە ئەمانەت بۆمان بنێرێ، زنکۆغرافی ئەگرین و لەم مەجموعەدا شکڵ و سیمای پێ نیشانی هەمو کورد و موحیبانی ئەدەب ئەدەین. لە پاشا بۆی ئەنێرینەوە، یاخود ئەگەر ویستی بە هەرچی قیمەتێ رازی بێ لێی ئەکرین. ئەوی لەم خسوسەوە مەعلوماتی هەیە دوبارە بە دو کەلیمە بۆمان بنوسێ زۆر مەمنونی ئەبین، گەلێ خێری ئەگا."

لە ژ7 یدا لە سەروی شیعرەکەیدا نوسیویێتی: "لە ژمارەی ئەوەل تاریخی میللەتی کوردتان پرسی بو، چەند شیعری (حاجی قادری کۆیی) بە دەست هات، لە کن من تاریخ لەوە باشتر نابێ. مەعلومە ئێمە ئیمانمان بە قورئان هەیە و، هەر کەسێکیش ئیمانی بە قورئان بێ ئەم تاریخە بە تاریخێکی صەحیح ئەزانێ، باقی پروپوچە." ئینجا دەس ئەکا بە نوسینەوەی "ئەو رۆژەی بە ئەمری حەیی مەننان- ئەو عالەمە پاکی بو بە تۆفان"

لە ژ11- 12 یدا نوسیویێتی:

"ئەشعاری حاجی قادر: مدیری ئیدارەی دیاریی کوردستان رەشید شەوقی ئەفەندی، هەرچی ئەشعار و مەعلوماتی حاجی قادری کۆیی لا بو لەگەڵ هی عەبدولرەحمان ئەفەندی سەعید ئەفەندی کردی بە یەک. هەردوکیان خەریکن هەموی لە چاپ ئەدەن. خودا ئەمسالی ئەم نەوعە برادەرانەمان بۆ زیاد بکا."

لە ژ10 یدا لە ژێر ناوی (دیوانی سالم) دا چەند هەواڵێکی ئەدەبیی نوسیوە لەوانە کە عەلی باپیر ئاغا شیعرەکانی سالمی کۆکردۆتەوە و "بە ناوی (مولحەقی دیاریی کوردستان) فۆرمە فۆرمە لە چاپ ئەدرێ..." و، "لە پاش دیوانی سالم، ئینشائەڵڵا ئەشعاری مستەفا بەگی کوردی و نالی لە چاپ ئەدەین" و، "ئاساری حاجی قادری کۆییش لە تەرەف رەشید شەوقی... قیسمەن کۆکراوە. بۆ تەلەبەیەکی حاجی قادر کە لە ئەستانبولە و، لە ماڵیا بە رەحمەتی خوا چوە، لەمەوپێش لە حەق مەتروکات و فوتۆغرافی مەرحوم کاغەزمان نوسی بو، هێشتا جوابمان وەرنەگرتوە... "

لە ژ16 دا هەواڵی بڵاوبونەوەی (کۆمەڵەی شیعری حاجی قادری کۆیی) ئەدا و ئەنوسێ: "ئەشعاری حاجی قادری کۆیی لە تەرەف عەبدولرەحمان ئەفەندی سەعید ئەفەندی چاپکەری بڵاوکرا 59 لاپەڕەیە. قیمەتی نیو روپیەیە. بۆ دەرەوە ئانەیە کرێی پۆستەی ئەخرێتە سەر. بۆ قوتابی لە هەمو جێ بێ شەش ئانەیە."

**لە ژ3 دا (غەزەلی مستەفا بەگ):**

"چێشتم ئەمڕۆ زەهری مار و ڕۆحی شیرینم نەهات
زەخمی کۆنەم هاتە ژان و مەرهەمی برینم نەهات"
لە بەیتێکی تریدا ئەڵێ:
"گۆی سەرم، چەوگانی میحنەت دایە بەر خۆی رای فڕاند
ئەلعەجەب بۆ شەهسواری خانەیی زینم نەهات؟"

لە ژێـریدا نوســیویێتی: "غەزەلیــاتی مســتەفا بەگ زۆر موئەســیر و مــوحریقە، لە غەرامیــات دا کەس نەگەیشتۆتە کوردی. غەزەلی ئیجتیماعی و میللـیشـی زۆرە و گەلـێ خۆشـە. ئاسـاری کـوردی وەک سـینەما تەرزی حەیات و لیباسی حوکمدارانی بابانمان یەنێتە پێش چاو. لەم غەزەلەیدا وەها دەنوێنێ کە ئەو زەمانە لە سلێمانی ئومەرا و زابتانی بابان پۆڵۆیان یـاری کـردوە... تەبیعـی ئەمـان لە ئینگلیزیـان وەرنەگرتـوە. ئەبـێ سەیاحینی ئینگلیز و ئەوروپا لە قەومی کورد پۆڵۆیان ئیقتیباس کردبێ."

لە ژ4 یدا لە (نمونەی ئەدەبیاتی کورد) ا هەندێ شـیعری کـوردی، نـالی، سـالم، مەولەوی، شـێخ ڕەزای هەڵبژاردوە و هەریەکەیانی بە چەند ڕستەیەکی خەست باس کردوە.

**وەکو نمونەی شیعری کوردی ئەمەی هەڵبژاردوە:**

"لاوی قەدلاولاوی من، گەر بێ بە ناز چاو هەڵبڕێ
وادەزانم شێخ لە من زوتر لە ئیمان وەرگەڕێ!... تاد"

لە ژێریشیدا نوسیویێتی: "کوردی، کوڕی مەحمود بەگی ئەحـمەد بەگـی صـاحێبقرانە. لە پێشـا لەقەبـی هیجری بوە. کوردی لە ئێران گەلێ مەشهورە و ئاساری مەتبوعەی هەیە. مۆری مستەفا بەگی کـوردی فەردێـک بوە بە حسابی ئەبجەد تـاریخی تەوەلـودی دەنـوێنێ، بەم موناسـەبەتەوە مـۆری کـوردی و مـۆری بـاپیری لە خوارەوە عەرزی خوێندەوارانی دیاریی کوردستان کرا:

"احمدم جد و پدر محمود و نامم مصطفی است
عبد معبود بحق و چاکر فخر زمان
شاه ملک نامداران احمد صاحبقران"

لە ژ8 یشدا غەزەلێکی تری نوسیوە کە ئەمە سەرەتاکەیەتی:
"جانا! وەرە لەم جەژنە بە قوربانی سەرت بم!

**وەکو نمونەی شیعری نالی ئەمەی هەڵبژاردوە:**

"لە دوگمەی سینە دوێنێ نوێژی شێوان
بەیانی دا سفیدەی باغی سێوان... تاد"
لە بارەی نالییەوە ئەڵێ:
"نالی، خەڵقی دێی خاکوخۆڵە، خاکوخۆڵ لە شارەزورە.

"نالی تەحسیلی لە قەرەداغ و سلێمانی ئیکمال کردوە. بۆ حەج چۆتە حیجاز لە حەق حەزرەتی فەخـری کائینات (صلی الله علیه وسلم) قەصیدەیەکی مەشهوری هەیە. لەوێوە چۆتە ئەستانبول، لە مەحافیل و مەجالیسـی شوعەرا و ئودەبای ئەوێ گەلێ فەتانەت و مەهارەتی نوانـدوە. لەوێ ئەمـری حەقـی بە جـێ هێنـاوە. مەرقەدی

موبارەکی لە اسکدارە. شیعری نالی زۆر خۆش و ئابدارە، گەلێ سنعەتکارانەیە. لە شـامەوە قەصـیدەیەکی 33 بەیتی ناردوە بۆسلێمانی، سالم بە 29 بەیـت جـوابی داوەتەوە، ئەم دو قەصـیدەیە ئەحـواڵ و وەزعیەتـی ئەو زەمانە دەنوێنن، گەلێ بە قیمەتن."

**وەکو نمونەی شیعری سالم ئەمەی هەڵبژاردوە:**

"ساقی لە پەردە دەرهات جامی شەرابی هێنا

دڵ خیرە ما لە حیرەت، مەه ئافتابی هێنا... تاد"

لە بارەی سالمەوە ئەڵێ:

"سالم ناوی عەبدولرەحمان بەگە، یەکێکە لە ئامۆزایانی مسـتەفا بەگـی کـوردی. غەزەلیـاتی سـالم گەلـێ ئەفکاری باکیرەی تێدایە، غەرامیاتی، هەجویاتی، مەشهورە."

لە ژ7 یدا شیعرێکی تری نیشتمانیی لە (مەدحی حەزرەتی عەزیز بەگی بابان) دا و،

لە ژ11- 12 یشدا (غەزەلی مەولانا- تەخمیسی سالم) ی بڵاوکردۆتەوە، کە قەسیدەیەکی بە ناوبـانگی مەولانا خالیدە لە دیاری غەریبی لە سەفەری هیندستاندا بە یادی نیشتمان وتویەتی.

لە بارەی مەولانا خالیدەوە نوسیوێتی:

"حەزرەتی مەولانا زیائەدین شێخ خالید، جافە، لە عەشیرەتی میکائیلیـیە، میکائیلی سـەیارە، لە ئەترافـی سلێمانی گەشت و گوزار دەکا.

"حەزرەتی شێخ لە مەداریسی ئەهلی سلێمانی و ئەترافی تەحصیلی بینیوە. تەشریفی چـوە بـۆ حەج. لە مەکەی موکەڕەمە زاتێک پێی دەڵێ: (بۆ تۆ فەیز و بەرەکەت لە تەرەف هیندستانەوە پەیـدا دەبـێ). لە پـاش گەڕانەوە لە سلێمانی، رۆژێ هنـدییەک یەتە لای. ئەو هنـدییە شـێخ هەڵ دەگـرێ، بە سـەر مـوڵکی ئێـران و ئەفغان دەیبا تا داخلی شاری (دلهی) دەکا.

"حەزرەتـی مەولانـا، لەوێ لە خـدمەت شـاه عەبـدوڵڵا کە یەکـێ بـوە لە ئەولیـای کـامیلین، تەریقەتـی نەقشبەندی وەردەگرێ، لە زەرفی 6 مانگ مەئزون دەبێ بۆ ئیرشاد.

"دەگەڕێتەوە سلێمانی، لاکین لەوێ ئیستراحەت ناکا، دەچێتە بەغداد، لەوێشەوە دەچێتە شام. حەزرەتـی مەولانا، لە علومی زاهیر و باتینا بەهرەدار و صاحیب ئیقتیدار دەبێ. مودەتی حەیاتی هەمو سەرفی تەدریس و ئیرشاد فەرموە.

"شیعر نەزم کردنی نەکـردوە بە مەسـلەک بـۆ خـۆی. لەگەڵ ئەمەش مەرتەبەی شـاعیرێتی لە مەرتەبەی سەعدی و حافز زیاتر نەبێ کەمتـر نـیە. دیـوانێکی زۆر بە قـیمەت و موحتەشـەمی هەیە، لە وەقتـی خـۆی بە ئیرادەی سوڵتان عەبدولمەجید خان لە چاپ دراوە، ئەگەر تەدقیق بکرێ صیدقی ئەم ئیفادەیە زاهیر دەبێ.

"حەزرەتی شێخ شیعری کوردی کەم وتوە، مەناقیبی کەشف و کەرامـاتی زۆرە، صـەیت و شـوهرەتی لە عالەمی ئیسلاما باهیر و زاهیرە، لە ئاسـار و تەواریخـی عوسـمانی لە بەینـی مەشـاهری ئیسـلام گەلـێ دەفـعە تەرجومەی حاڵ و مەناقیبی نوسراوە.

"لە شام ئەمری خوای بە جێ هێناوە. لە محەللەی صالحیە رۆحی پاکی دەفینی خاکی عەترنـاکە. ئەلئـان ئەحفادی و خولەفا و موریدانی لە شام، لە سـلێمانی، لە کوردسـتان، لە ئێـران، لە جیهـان خەریکـی تەدریـس و ئیرشادن."

**وەکو نمونەی شیعری مەولەوی ئەمەی هەڵبژاردوە:**

"یا خەلیل! دەخیل، کێ عادەت کەردەن؟
توشە وە دەر ماڵ کەریمان بوردەن؟... تاد "
لەبارەی مەولەوییەوە ئەڵێ:

"مەولەوی، ناوی سەید عەبدولڕەحیمە، خەڵقی هەورامـانە. لە مەشـایخی عیزامـی نەقشـبەندیە، خەلـیفەی حەزرەتی شێخ عوسمانی تەوێڵە بوە. زاتێکی بوزورگەوار و موتەقی، شاعیرێکی خۆشزبان و مەشهور بـوە. لە شوعەرای کوردا مەولەوی موقابیلی نیزامییە..."

لە ژ11- 12 دا (کلامی مولوی) و چەند شیعرێکی تری بە لێدوانەوە بڵاوکردۆتەوە.

**وەکو نمونەی شیعری شێخ رەزا ئەمەی هەڵبژاردوە:**

"میر بە صەد منەت هەناردی ئێسترێکی روت و قوت
چوار پەلی سست و سەقەت، ئەندامی هەروەک عەنکەبوت...تاد"
لە بارەی شیخ رەزاوە ئەڵێ:

"شێخ رەزا لە خانەدانی عەشیرەتی تاڵەبانیە. لە بازیان هاتۆتە دنیا. لە کەرکوک گەورە بـوە. چـوە بـۆ حەج و لەوێوە بۆ ئەسـتانبول. لە ئەسـتانبوڵ لە گەلـێ مەحافیـل و مەجـالیس دا بە زەکـا و قـودرەت، لیسـانی حازرونی مات و مەبهوت کردوە. یەکێ لەمانە نامیق کەمال بەگی مەشهورە.

"شێخ رەزا کوڕی شێخ عەبدولڕەحمان ئەفەندی تاڵەبانییە. شێخ عەبدولڕەحمان ئەفەندی لە مورشیدینی تەریقەتی قادریە، شێخێکی صاحێب نەزەر و شاعیرێکی شیرینزبان و پڕ هونەر بوە. شێخ رەزا بە چوار زبان شیعری هەیە. فەصاحەت و بەلاغەتی، زەرافەت و قـودرەتی، خـاریجی تەعـریفە. لە بەغـدا لە سـاڵی 1328 ی هیجری‌دا وەفاتی کردوە، لە جیواری حەزرەتی غەوس مەدفونە.

لە سەر کێلی قەبرەکەی ئەم دو بەیتە نوسراوە... "

لە ژ10 ی‌دا شیعری "ڕوم کردە بەزمی خاسی... " لە ژێر ناوی: (لەتائیفی شێخ رەزا) بڵاوکردۆتەوە.

زۆری ئەم شیعرانە بۆ یەکەم جار لێرەدا بڵاوکراونەتەوە، ئەو ئاگادارییانەی لەسەر ژیانی شاعیرەکان و شیعرەکانیان نوسیونی، لە چاو سەردەمی خۆی‌دا تازە و بەکەڵک بون.

لە بەرهەمی شـاعیرانی هـاوچەرخی خـۆی بـۆ یەکەمـین جـار، لە ژ2 ی‌دا بە ئیمـزای (ش) شـیعرە بە ناوبانگەکەی شوکری فەزڵـی کە بـۆ شـێخ مەحمـودی نوسـیوە، لە ژێـر سـەردێڕی: (غەزەل: لە وەقتـی خـۆی وتراوە) بڵاوکردۆتەوە:

"ئیش کە روی ئێستە لە هەورازە سەرەولێژی نەکەی
فیکری دوریشی دەوێ، هەر بە دوعا و نوێژی نەکەی!
گێرەشێوێنێ کە کای کۆنی بە بادا لە کنت
چاکە هەر لێی خوڕی سەیری دەم و کاوێژی نەکەی
سەرەتای ئیش هەمو یەکبونە، ئەویش نابێ هەتا
هەر برینێ کە لە دڵ دا بوە سارێژی نەکەی
حەیفە چاوێ کە جەفا کۆڵەوژی تێ‌دا شکاند
تۆ بە کلچێوکی وەفا عەینی گەلاوێژی نەکەی

قەومی بێ سەر نیە ئەمڕۆ لە هەمو عالەم دا
دەتەوێ تاجی سەر بی، بە هەوا گێژی نەکەی
شا، وەکو شایەکی شەترەنجە لە لای خەڵق ئەمڕۆ،
گەورە قانونە، قسەی کورت ئەمەیە درێژی نەکەی!"

ئەم شیعرە یەکێکە لە گەوهەرە ناوازەکانی ئەدەبی کوردی. لە کاتی بڵاوکردنەوەی‌دا شێخ مەحمود لە شاخ، لە شۆڕش‌دا بوە دژی هێزەکانی عیراق و بریتانیا.

هەندێ شیعر کە لە ستایشی گۆڤارەکە و خاوەنەکەی‌دا وتراون وەکو:

لە ژ6 ی‌دا سەعید فەوزی لە هەڵەبجەوە و، عەلی رەفیق لە کەرکوکەوە،

لە ژ7 ی‌دا سەید سلێمان ئەفەندی لە خانەقینەوە.

دەرچونی دیاری هاوزەمان بوە لەگەڵ تێشکانی شۆڕشی کوردەکانی تورکیا و، لەسێدارەدانی سەرکردەکانی و، ئاوارە بونی هەندێکی تریان دا. بۆ شینی شەهیدەکانی، دو شیعری بڵاوکردۆتەوە:

لە ژ7 ی‌دا شیعرێکی عەلی بەگی (سالار سەعید):

"لەو دەمەی تاقم لە دیداری عەزیزانی وەتەن

دائیمەن جوتم لەگەڵ غەم، هەمدەمی حوزن و میحەن... تاد"

لە ژ9 ی‌دا شیعرێکی تری 15 بەیتی عەبدوڵڵا لە رەواندزەوە، سەرەتاکەی وا دەس پێ ئەکا:

"ئاسمان حەقە بیلا خوێن بگرێنن بەر زەمین

بۆ قەزایا غەوسی سانی، پیری نەهری، قوتبی دین..."

دیاری لە ژێری‌دا نوسیوێتی:

"سەید عەبدولقادر ئەفەندی لە مەشاهیری ریجالی کورد و کیباری میللەتی ئیسلام بو، خوا صەبوری هەمو برا و خزمانی بدا و حەقی گوم نەکا هەر کەسێ کوژرا لە پێناوی تەعالی‌ی میللەتا

تۆ بە مردوی قەت مەزانە، تا قیامەت زیندوە!"

ئەسیری، لە ژ7 دا شیعری (ویجدانی عەصری) و،

لە ژ10 دا (عیلمە میللەت ژور ئەخا) و،

لە ژ11-12 دا (بە گورجی بجوڵە) ی بڵاوکردۆتەوە.

هەر لە ژ7 ی‌دا ئەحمەد موختار جاف شیعرێکی نیشتمانی‌ی و، حەمدی غەزەلێکی نوسیوە.

لە ژ13- 14 دا، ئەمیر (کە نازناوی شیعری‌ی ساڵح زەکی خۆیەتی) (حوبی میللی) و، محەمەد تۆفیق یش شیعرێکی بڵاوکردۆتەوە. ئەم شیعرەی محەمەد تۆفیق بە هی پیرەمێرد ئەچێ، ئەڵێ:

دوێنێ لە سەر چڵێکی گوڵێ بلبلێ گوتی
فەصلی بەهاری کوردە، نەما رۆژی نەگبەتی

تا لە کۆتایی دا ئەڵێ:

ئەویان لە عەرشی وەحدەتەوە سەرەفراز و ئەم
شاباشی پایتەختی دەکا نەقدی هیمەتی
باڵی هوما درێژە بە هەر لایەکا ئەگا
دوبەر، تەواوە، سێبەرەکەی پانە بەسیەتی

## 4. 3. هەواڵ

### 4. 3. 1. هەواڵی پارلەمان

مەجلیسی مەبعوسان و ئەعیان. ئینتیخابی مەبعوس (نائیب - مەبعوس - نارراو)

لە ژ2 ی‌دا لە ژێر سەرناوی (باس و خەبەرات) دا هەواڵێکی لەسەر (جەژن) ی ئیمزاکردنی دەستوری عیراق نوسیوە:

"ڕۆژی شەمو 21 ی مارتی 925 لە بەغدا جەژنێکی گەورە بو، ساعەت نۆ و نیوی زەوالی یەعنی چێشتەنگاو هەیئەتی وزەرا و موحافیز و موتەصەریفی شاری بەغدا و وەکیلی قوماندانی عمومی پۆلیس، بە ئیحتیفالێکی زۆر گەورە لە دائیرەی وەزارەتەوە (قانونی ئەساسیی حکومەتی عیراق) یان برد بۆ مابەینی هومایون، لە گوزەرگاهی ئەم مەوکیبەیە عەسکەر و پۆلیس و قوتابی و کەشافەی مەداریس و ئەهالی صەفبەستەی ئیحتیرام و سەلام بون

"حەزرەتی جەلالەتی مەلیک لە ساعەت 10 ی زەوالی بە قەڵەمێکی زێڕ قانونی ئەساسیی ئیمزا فەرمو، ئەم قەڵەمە نارراو بۆ موزەخانە، لەوێ هەڵئەگیرێ، ئەبێ بە ئەسەرێکی تاریخی بۆ عیراق.

"لە وەختی ئیمزای حەزرەتی مەلیک 101 تۆپ ئاگر درا.

"جەنابی مەندوبی سامی و ریجالی بریتانیا و کیبار و ئەشرافی مەملەکەت و میللەت هەمو بۆ عەرزی تەبریکات، زیارەتی مابەینی هومایونیان کرد.

"شەویش، ئەماکین و مەحافیل هەمو بە شوعلەی ئەلەکتریق و چرا رازانرایەوە، لە مزگەوتان مەولودی حەزرەتی نەبەوی خوێنرایەوە."

لە ژ7 ی‌دا لە ژێرسەردێڕی (ئینتیخابی مەبعوسان) دا نوسیوێتی:

"9 ی حوزەیرانی 1925_ 1341 ڕۆژی دوشەمو لە بەغدا و لە دەرەوە نوابی عیراق ئینتیخاب کرا. لەم نزیکانە کۆ دەبنەوە و دەست ئەکەن بە ئیش. ئێستە هەر ناویان عەرز دەکەین. ئینشائەڵڵا بەرە بەرە رەسمی هەمویان نیشان ئەدەین. خوا موەفەقیان بکا."

ئینجا بە ریز ناوی نائیبەکانی بەغداد، دیاله، دلێم، حلە، کەربەلا، کوت، ئەل ئیمارە ، دیوانیە، بەسرا، عەمارە، مونتەفیک، موسڵ، کەرکوک و ئەربیلی بڵاوکردۆتەوە. ئەوانەی دوایی بە مجۆرە بون:

"نوابی موصل: ارشد العمری، ضیا بک ال شریف بک، علی الامام، ابراهیم کمال، سعید جلبی الحاج ثابت، ثابت عبدالنور، حازم بک ال شمدین اغا، الشیخ نوری البریفکانی، هیبة الله افندی مفتی عقرة، الخوری یوسف خیاط، رؤف شماس الوس، اسحاق افرایم.

"نوابی کەرکوک: نشات بک، الشیخ حبیب افندی طالبانی، رفیق افندی خادم السجادة، سعید افندی صلاحیە.

"نوابی ئەربیل: صبیح نشات بک، داود بک الحیدری، یوسف ابراهیم افندی، اسماعیل بک، عبدالله مخلص بک."

لە داوێنی ئەم لیستەیەدا وتارێکی لەسەر (نائیب- مەبعوس: نارراو) نوسیوە

"لەبەر ئەمەی کە دیاریی کوردستان سیاسی نیە، لە حەق نەتیجەی ئینتیخابات موتالەعات و ئیجتیهادات نانوێنین. فەقەت بە ناوی هەیئەتی ئیجتیماعیەوە ئەتوانین نەختێ بەحس لە حقوقی ئیجتیماعی و ئەدەبی خۆمان بکەین."

بەهۆی هەلومەرجی تایبەتی سلێمانیەوە هەڵبژاردن لەوێ دوا کەوتوە.

لە ژ8 یدا ناوی (نوابی سلێمانی) یشی بڵاوکردۆتەوە: "رۆژی 24 ی حوزەیرانی 925 لە سلێمانیش مەبعوسان ئینتیخاب کرا. جەنابی محەمەد ساڵح بەگ محەمەد عەلی بەگ بە 145، میرزا فەرەج حاجی شەریف بە 137، محەمەد ئەمین بەگ بیگباشی ئەرکان حەرب بە 125، ئەحمەد موختار بەگ عوسمان پاشا بە 110 رەئی، بون بە مەبعوسی سلێمانی عەرزی تەبریکات دەکەین، لەسەر خێر و نەفعی مەملەکەت و میللەت موەفەق بن."

## 4. 3. 2. هەواڵی مەدرەسەی عەسکەری

لە ژ3 ی 13 نیسانی 925 دا ریپۆرتاجێکی وردی لەسەر دامەزراندنی جەیشی عیراقی لە ژێر سەردێڕی: (مەدرەسەی عەسکەری یاخود دار ئەل تەدریبی عەسکەری) نوسیوە، کە بۆ ئەمڕۆش نرخێکی مێژویی هەیە، ئەڵێ:

"لەساڵی 1921 هەیئەتێک لە عیراقەوە چو بۆ کۆمەڵ (موئتەمەر) ی شەرقی ئەوسەت کە لە قاهیرەدا کۆبوبوەوە، ئەم هەیئەتە کە گەڕایەوە عیراق بۆ رێکخستنی مەدرەسەیەکی عەسکەری تەڵەبنامەیەکیان دا بە هەیئەتی وزەرا.

"بە پێی پرۆغرامی حەربیەی سانت هێرست بە بەعزێ تەعدیلات پرۆغرامێکی تەدریس گیرایە قەڵەم. دەست کرا بە چاککردنەوەی قشڵەی سواری کە لەو لای قاپی ئیمامی ئەعزەمە.

"لە 1 ی نیسانی 1921 لە 20 زابت کۆمەڵێک دروست کرابو، ئەمانە لە قشڵە لە دائیرەی موشیرییەتی کۆن، هەتا مەدرەسە کرایەوە خەریکی باس و موزاکەرە بون.

"لە 15 ی تەموزی 1921 تەعمیراتی قشڵەی سواری تەواو بو، ئەم 20 زابتە قەیدی دەورەی ئەوەل بون.

"لە 19 ی تەموزی 1821 (بێگومان هەڵەی چاپە ئەبێ 1921 بێ) مەدرەسەی عەسکەریە رەسمەن گۆشاد کرا. ئەوەل دەفعە 7 بیکباشی 26 قەدەملی یوزباشی 17 یوزباشی 34 ملازم ئەوەل 72 ملازم سانی جەمعەن 156 ئومەرا و زابتانی داخلی مەدرەسەی عەسکەری بو.

"لە 1 ی تشرینی ئەوەلی 921 جەیشی عیراقی لزومی 27 زابتی بینی، 13 ی تشرینی ئەوەل 9 زابتی تۆپچی، 1 ی تشرینی سانی 921، 50 زابتی پیادە ئیلتیحاقی جەیشی عیراقی کرد. 13 زابت لە ئیمتیحان دەرنەچو.

"10 ی تشرینی سانی 921 دەورەی دوهەم کرایەوە. 51 زابتی روتبەدار و 50 زابتی بچوک هاتە دەورەی دوەم لە 1 ی کانونی سانی 922 زابتانی موتەباقی دەورەی یەکەمیش دابەشی جەیشی عیراقی کران.

"لە 3 ی کانونی سانی 922، 54 زابتی روتبەدار داخلی مەدرەسە بو، ئینجا تەلەبەی مەدرەسە لەسەر چوار صنف رێک خرا.

صنفی ئەوەل - دو قسم بو، قیسمێکی ئەو ئومەرایانە بون کە 1 ی تشرینی ئەوەلی 921، قیسمێکیشی ئەو ئومەرایانە بون کە کانونی سانی 922 هاتبونە مەدرەسە.

صنفی دوەم - ئەو زابتانە بون کە تشرینی سانی 921 هاتبونە مەدرەسە.

صنفی سێیەم - ئەو زابتانە بون کە تشرینی سانی 921 هاتبونە مەدرەسە.

لە شوبات و مارتی 922 ئوصول تەدریس و تەعلیم چاکتر خرایە کار، لەوانەی تشرینی سانی 921 هاتبونە مەدرەسە 9 زابت درا بە جەیش، 94 زابتی ما، ئەمانیش لە نیهایەتی مارت و نیسانی 922 دابەش کران.

"هەر لەم تاریخەدا دیوانی تەرجومە ئیلحاقی مەدرەسەی عەسکەریە کرا.
لە 3 ی کانونی سانی 927 دەورەی سێیەم کرایەوە، ئەمانە لە 23 ی ئاغستۆسی 922 دابەش کران.
"لە 4 ی نیسانی 922 بۆ ئومەرا و زابتانی قەرار گاهی عمومی دەورەی چوارەم کرایەوە هەتا 31 ی تەموزی 922 دەوامی کرد.
"لە 25 ی تشرینی سانی 922 دەورەی پێنجەم کرایەوە هەتا 27 ی کانونی سانی 923 دەوامی کرد.
"شوبات و مارتی 923 مەدرەسەی عەسکەریە خاڵی ما. مایسی 923 دار ئەل تەدریبی عەسکەری ئیحداس کرا.
"لە 23 ی مایسی 923 دەورەی شەشەم کرایەوە. لە 25 ی ئەیلولی 923 دەرچون.
"لە 3 ی تشرینی ئەوەلی 923 دەورەی حەوتەم کرایەوە هەتا 28 ی کانونی سانی 924 دەوامی کرد.
"لە 15 ی شوباتی 924 دەورەی هەشتەم کرایەوە هەتا 25 ی مایسی 924 دەوامی کرد.
"لە 2 ی حوزەیرانی 924 دەورەی نۆیەم کرایەوە هەتا 25 ی ئەیلولی 924 دەوامی کرد.
"لە 9 ی تشرینی ئەوەلی 924 دەورەی دەیەم کرایەوە لە 6 ی شوباتی 925 دەرچون.
"لێرەدا ئێمە هەر بەحسی ئەدواری پیادەمان کرد، چونکە لە تەک ئەم فۆتۆغرافە هەر پیادە عەلاقەدارە."

لەم ژمارەیەدا وێنەیەکی فۆتۆگرافی بڵاوکردۆتەوە لە ژێریدا نوسیویێتی: ئەمە ئەو زابتانەن کە لە دەورەی دەیەمی دار ئەل تەدریب دەرچون، لە ناوەڕاستیان ئامیری دار ئەل تەدریبی عەسکەری و معاونی و موعەلیمەکان دانیشتون."

## 4. 3. 3. هەواڵی هاتوچۆی پیاوە ناسراوەکانی کورد بۆ بەغداد

هەواڵی هاتوچۆی بازرگان و کەسایەتی سیاسی و دینیی و کۆمەڵایەتیی کوردی بۆ بەغداد نوسیوە، بەخێرهاتن و خواحافیزی لێ کردون.
لەو کاتەدا تازە شۆڕشەکەی شێخ سەعید، لە کوردستانی تورکیا، شکا بو.
هەندێ لە کەسایەتیە ناسراوەکانی ئاوارەی عیراق بون. دیاری، هەواڵی هاتنی نوسیون:
لە ژ7 دا لە ژێر ناوی (بەخێرهاتن) دا نوسیویێتی:
"لە منەوەرانی کورد و خانەدانی بتلیس جەنابی مەمدوح سەلیم بەگ تەشریفی هاتۆتە بەغدا میوانی شوکری محەمەد بەگی دوقتۆرە."
لە ژ10 دا لە (ئەخباری پانزە ڕۆژ) دا نوسیویێتی:
"نەجلی موکەڕەم سەید عەبدولقادر ئەفەندیی مەرحوم، جەنابی سەید عەبدوڵڵا ئەفەندی لە بەغداد میوانی نەقیب بو، 12 ی تشرینی ئەوەل بە ڕێی ئاسنا گەڕایەوە ڕەواندز، ئەکابیر و ئەعازیمی کورد ڕەوانەیان کرد، هەتا ئێستاسیۆن و حەرەکەتی شەمەندەفەر هەمو لە خزمەتیا بون."
لە هەمان ژمارەدا لە ژێر ناوی (ئیعلان) دا نوسیویێتی:
"لە تەرەف ئیحسان نوری بەگ کە لە تێگەیشتوان و وڵاتپەروەرانی کوردە و ئەشرافی بتلیسە بە ناوی (کورد قیام میلسی) کتێبێکی زۆر بە قیمەت نوسراوە، لە چاپدراوە. لەم کتێبەدا ئەسبابی هەڵسانی کوردی شیمالی و ئەهمیەتی عەسکەرییەی بە تورکی بەیان ئەکا. بۆ هەمو کوردێ پێویستە ئەم ئەسەرە بخوێنێتەوە."

هەر ئەوسا لە ژ39 ی 10 ی ئەیلولی 1925 و لە ژمارەکـانی 40 و 41 ی (ژیـانەوە) ی سـلێمانیدا ئەم کتێبە بە زنجیرە لە ژێر سـەرناوی: (قیـامی میللـی کـورد و ئەهمیەتـی عەسـکەریەی) کـراوە بە کـوردی و بڵاوکراوەتەوە.

لە ژ 13- 14 دا لە ژێرناوی (تەشریف) دا نوسیوێتی:

"برای موحتەرەمی شێخ سـەعید ئەفەنـدی رەئیسـی قیـامی کـورد، جەنـابی شـێخ مەهـدی ئەفەنـدی و، قەهرەمانی میللەت جەنابی سەید تەها ئەفەندی، تەشریفیان هێناوەتە بەغداد. لە تەرەف ئەشراف و منەوەرانـی میللەتی کورد لازمەی ئیحتیفالات و تەعزیمات بە جێ هێنرا. عەرزی بەخێرهاتنیان ئەکەین."

لە ژ11- 12 دا لە ژێر ناوی (خەبەرێکی ناخۆش) دا نوسیوێتی:

"وەک خەبەرمان زانیوە حکومەتی ئێـران قـوەتێکی نـاردۆتە سـەر ئەورامـان، چەک و سـیلاحیان داوا کردوە، ئەوانیش نەیان داوە، بوە بەشەڕ. لەسەر ئەمە بەینی جەعفەر سوڵتان و حکـومەتی ئێـران تێـک چـوە. کورد و فورس بران، برایەکی ئیرسی و تاریخین. دڵ نایەوێ بەینی ئەم دو براخاسە تێکچـێ و بـێ چەک و سـیلاح بمێنـێ، بە کەڵکـی یەک بەن. بـۆ یەک زۆر لازمـن. ئینشـائەڵڵا ئەم خەبەرە ئەصـلی دەرنـاچێ، ئەگەر ئەصلیشی بێ ئینشائەڵڵا حکومەتی عەلییەی ئێران برا لەبرا ناکا، ئەم بـرا بچـوکە وەک برایەکـی بە رەحـم و بوزورگەوار ئیدارە ئەکا."

## 4.4. خوێندن و خوێندنگە

لەو سەردەمەدا نەخوێندەواری زۆر بڵاو بو. بە دەگمەن خوێندەوار هەبوە. ئەمەیش کاری کردۆتە سـەر ئاستی هۆشیاریی سیاسی و کۆمەڵایەتی و نەتەوەیی و نیشتمانیی خەڵک. رۆشنبیرانی کورد لەو سەردەمەدا کردنەوەی خوێندنگە و بڵاوکردنەوەی خوێندەوارییان کـردوە بە یەکـێ لە خواسـتە هەرە پێویسـتەکانی ئەو قۆناغە. لەهەر کوێیەک هەلێکیان بۆ هەڵکەوتبێ ئەم داوایەیان دوبارە کـردۆتەوە. لە رۆژنامەکـانی سـلێمانیدا ئەمەیان بەردەوام نوسیوە. هەر کە یەکێ لە کاربەدەستانیان دیبێ مەسەلەکەیان لەگەڵ بـاس کـردوە. هەنـدێ لە نائیبە کوردەکانیشی چەند جارێ بە نوسین و زار ئەم داخوازیەیان خستۆتە بەردەم پارلەمانی عیراق.

دیارییش لە چەند ژمارەیەکیدا لەم بارەیەوە دواوە.

لە ژ6 یدا لە ژێر سەردێڕی: (مەعاریف و مەکتەب لە سلێمانی) نوسیوێتی:

"وەکو تێ گەیشتوین هەتا ئەیلول دەس لە مەکتەب و مەعاریفی سلێمانی نادرێ. فەقەت قەرار وایە کە لە ئەیلول دو مەکتەبی تیا بکرێتەوە. یەکێکی بە ئیعتیباری ئیبتیدائی و ئەوەلی شەش صـنفی دەبـێ، یەکێکیشـی ئیبتیدائی دەبێ. لە هەڵەبجەیش مەکتەبێکی ئیبتیـدائی دەکـرێتەوە. پـاش دو سـاڵی تـریش سـلێمانی بەڵکـوم مەکتەبێکی سانەوی هەڵدەگرێ.

"صەرفی نەزەر لە زەمانی سەربەخۆیی میللەتی کورد و حاکمیەتی بابان حەتا لە وەقتی عوسـمانییشـدا سلێمانی لە خسوس مەکتەب و مەعاریف ئیستیسنایەکی هەبو. وەقتێ روشدیەی عەسـکەریە تەنهـا کە خاصـی چەند ولایەتێک بو، بە حەسەبی ئەهمیەت و لیاقەتەوە سلێمانی نەزەری دیقەتی جەلـب کردبـو وە بە هـیمەت و دەلالەتی سەعید پاشای رەئیسـی شـورای دەوڵەت مەکتەبێکـی روشـدیەی عەسـکەریەی تیـا کرابـوەوە، گەلـێ زابتانی ئۆردو تەخصیص ئەم مەکـتەبە کـرا بـو وە گەلـێ فائیـدەی بوبـو. لە پـاش ئیعلانـی مەشـروتیەتیش ئیعدادیەکی مولکی هەبو.

"حکومەتی فەخیمەیش لە حەق مەعاریفی سلێمانی ئەلحەق درێغی عاتیفەت و ئەهمیەتی نەفەرموە. فەقەت لە بەدبەختی و کەم موبالاتی خۆمان چەند ساڵێکە لە مەملەکەتەکەمان روناکی عیلم و عیرفان نەمـا. شـاگردانی

پێشو هێلانەیان لێ روخا. هێچیان لە بیر نەما. منداڵەکانی تـریش لە بەر بـێ مەکتەبـی و بـێ شـوێنی پێیـان نەخوێندرا... جێگایانی تریان ئەوا دائیمەن پێش ئەکەون، ئەمانە کە گەورە بون ئەلبەت حەدی موصـاحەبە و موقایەسەی ئەمسالیان نابێ، هیچیان دەست ناکەوێ.

"ئۆباڵی ئەم بێ گوناهانە بە ئەستۆی ئێمەیە.

"یاخوا، ئەمرۆیش سەعید پاشایەکی ترمان تیا هەڵکەوێ و سلێمانی دوبارە سەرکەوێ."

لە ژ15 دا عەبە عەزیز هەولێری لە وتارێکدا بە ناونیشانی (قوتابخانە) ئەڵێ:

"سەربەخۆیی و بەختیاری بە عیلم و عیرفان، عـیلم و عیرفـانیش بە مەداریسـی ئیبتیـدائیە پێـک یەت. قوتابخانە ئەساسی بەرزبون و رزگاربونی هەمو میللەتێکە. لە مەمالیکی موتەمەدینەدا مەداریسی ئیبتیدائیە گەلـێ بە ئەهمیەت گیراوە، هیمەتی بۆ سەرف کراوە. بولغار، مەجار، یۆنان، صرب، بە مەداریسی ئیبتیدائیە تێ گەیی و پێ گەیی، لە فکرو وەتەنیەت و جنسیەت گەیی."

لە ژمارەکـانی 5 و 6 و 9 دا پیـرۆت لە سـلێمانیەوە بە زنجیـرە وتـارێکی لەسـەر: (ئـافرەتی کـورد: مەوقیعی ئیجتیماعی‌یان) سـەبارەت بە ئـازادی ئـافرەت نوسـیوە، داوای کـردنەوەی خوێنـدنگەی فێرکـردن و پێگەیاندنی ئافرەت لە وەزیری مەعاریف ئەکا. کۆتایی وتارەکەی بەمە دێنێ:

"ئێستا ئیستیرحام لە حەزرەتی مەعالی وەزیـری مەعـاریف دەکەیـن کە هـیچ نەبـێ بە پـێی لیواکـانی دراوسێمان تەماشای مەعاریفی ئێمەیش بفەرمـون. ئـێمە تەشـکیلاتێکی واسـیعمان نـاوێ. ئەمـرۆ مەکتەبێکـی ئیبتیدائی مونتەزەمی ئوناس بە ئێمە لازمە. دیسان حەزرەتی وەزیر تەئمین دەکەین ئەگەر بێت و مەکتەبێکـی کچان لە سلێمانی دا بکاتەوە، لە ئیستیقبالێکی نزیک دا گەلێ موعەلیماتی مومتازەی کورد بۆ عیراق پێ دەگا و سەمەرەی ئەم ئیشە خێرەی ئیقتیتاف ئەکا."

دیاریی کوردستان لە کۆتایی ئەم وتارەدا لێدوانێکی خۆی لە سەر نوسیوە ئەڵێ:

ئەم مەقالەیە لە مێژە بۆ ئیدارەخانە هاتبو. مەعەل ئەسەف لە بەر پاشکەوتنی ئەم ژمارەیە ئەمیش مابو.

"حەزرەتی فەخری کائینات (علیه اکمل التحیاة) فەرمویەتی: (طلب العلم فریضة علی کل مسـلم و مسـلمة) صدق رسول الله. یەعنی خوێندن و فێربون، چ پیاو چ ژن بۆ هەمو ئیسلام فەرزە. ئیسـلام، ژن و پیـاوی بـیلا ئیستیسنا دەبێ هەمو خوێندەوار بن.

"هـاواری پیـرۆت، هـاوارێکی زۆر بە جـێیە. لە حەق بـێ مەعـاریفی و مەغـدوریەتی کوردسـتان لە ژمارەکانی پێشویشمان دوا بوین. لە تەرەف ئەمین بەگ مەبعوسی سلێمانی و رەفیقـاتی لە حەق مەعـاریف و مەداریسی سلێمانی و ئەمسالی تەقریرێ بە ریاسەتی مەبعوسان درا، لە مەجلیسدا واقیفـانە و عالمـانە مـودافەعە کرا، گەلێ غیرەت و هیمەتیان نواند.

"حکـومەت قەراری وایە لە سـلێمانی مەدرەسـەیەکی کچـان دانـێ. شـایانی عیبـرەت و تەئەسـورە، لە پەیداکردنی دو موعەلیمە توشی موشکیلات دەبن.

ئەگەر کوردستانیش وەک جێیانی تـر لە وەقتـی خـۆی مەدرەسـەی کچـانی تیـا بـوایە ئەمـرۆ بـۆ دو مەعەلیمە موشکیلات روی نەئەدا.

"لە بەغداد دو مەعەلیمەی کوردییەل ئەصل هەیە. ئەمانە بە مودەتێکی زۆر کەم وەک دەستە خوشکەکانی سلێمانی‌یان کوردی قسـە ئەکەن، یەکێکیـان کچـی سـاڵح ئەفەنـدی مـولازمە، ئەوی دیـش لە ئەحفـادی مـوفتی زەهاویی مەرحومە. ئەگەر تەحقیقاتمـان واسـیعتر بکەیـن، لەو ئەولادە وەتەن جودایـانە کە بە نـوری عـیلم و مەعریفەتی جێیانی دی بەهرەمەندی شەرەف و حورمەت بون، گەلێ موعەلیمەی تریش پەیدا ئەبێ.

"لە حکومەت رجا ئەکەین، ئەم دو خوشکەمان بە معاشێکی کـافی و بـاش دەرحـاڵ ئیعزامـی سـلێمانی بفەرمون.

"لە ئەشراف و خەڵقـی سـلێمانیش تەمەنـا دەکەیـن کە قەدری ئەم دو ئەولادە گەورە و پێگەیشـتوەیان بگرن و ئەولادەکانیان پێ تەربیە بفەرمون و فەرمایشی خوا و پێغەمەرمان بە جێ بهێنن.

"نەوەک تەنها سلێمانی، هەولێر، کۆیە، رەوانـدز، بیلخاصـە مەحـاڵی بادینـان بـێ گونـاه و مەحـروم و تکاکارە، هەر بە هاوارە.. دڵمان بە غیرەت و ئەهلیەتی مەبعوسانمان خۆش و قائیمە. ئەوان لە هەمومان باشتر و شارەزاترن. میللەت پشتی وەکیل و براگەورەی خۆی بەر نادا، واز ناهێنێ، ئەویش ئەیەوێ بە قەدەر قەدر و قودرەتی خۆی بکا بە قەدر و قیسمەتی خۆی."

### 4. 5. گیروگرفتەکانی زمان و رێنوس

چەند کەسێکی شارەزا لە نوسین و لێدوانی ئەم باسەدا بە وتاری جیاواز بەشدار بـون، لەوانە: تۆفیـق وەهبی بە وتاری: (کوردیەکەمان بە چۆن حروفێک و چۆن بنوسین؟) و، ئیسماعیل حەقی شاوەیس لە کفریەوە بە وتارەکانی (نوسینی کوردی چۆن بێ؟) و، (ئیملای کوردی حروفاتی عەرەبی) و، (لاپەڕەی نوسینی تـازە و کوردی پەتی: لەنوسین و شێوەدا سـەربەخۆیی) و، حەسـەن کوردسـتانی لە رەوانـدزەوە بە وتـاری: (لە حەق نوسینی تازە).

### 4. 6. باسی سیاسی

لەبەر ئەوەی دیـاریی کوردسـتان، وەکـو خـۆی نوسـیویێتی سیاسـی نەبـوە، تـوخنی باسـی سیاسـی نەکەوتوە، بەڵام لە توێی هەندێ باس دا، تیرێکی هاویشتوە. لە ناواخنی وتارێکدا نوسیویێتی:

"مەعلومە کە موعەلیمانی کوردزمـان رەوانەی خـوارەوە کـران، لە جـێی ئەوان بـۆ کوردسـتان زمـان و حاڵنەزان ناردران..."

لە لێدوانێکی تردا نوسیویێتی:

"لەم عەصرەدا، لەم قەرنی مەدەنییەت و کەمالەدا، کوردی هەژار و بێکەس، هێشتا بە گـوللە، بە بۆمبـا، بە تەنـاف، بە برسـێتی، بە روتـی، بە هەژاری و کـوڵەواری، بە ئەنـواعی قەهـر و ئەلەم دەمـرێ، دەکـوژێ و دەنێژرێ... وەک شەکری خـاو لە نـاو سـوێراوی عمـومی و ئەبکەمیەتـی بەشـەرییەتی حـازرە و مـوتەمەدینە ئەتوێتەوە، ئەبێ بە بوخار، ئەگەڕێتەوە بەر بارەگاهی عەدل و ئیحتیشامی کردگار."

جگە لەم باسە سەرەکییانە هەندێ وتـاری جۆراوجـۆری تێدایـە لە سـەر: سـەرفترە، رەمەزان و جەژن، کولارە، مەتەڵ...

## 5. باری دارایی

سەرچاوەی دارایی دیاریی کوردستان سامانی تایبەتی خـاوەنەکەی و پـارەی فرۆشـتنی ژمارەکـانی و ئابونە و ئاگاداری بوە. گۆڤارەکە خۆی لە دوا لاپەڕەی هەمو ژمارەکانیدا بەمجۆرەی نوسیوە:

"کڕیاری: لە بەغدا سـاڵی بە 12، شـەش مـانگی بە 7، لە دەرەوە سـاڵی بە 15، شـەش مـانگی بە 8 روپیەیە. بۆ قوتابی و فەقێ، لە بەغدا ساڵی بە 10، لە دەرەوە بە 12 روپیەیە.

"بۆ مەمالیکی ئەجنەبیە، ئوجرەتی پۆستەی ئەخرێتە سەر.

"بۆ ئیعلانات، مشتەری لە تەک ئیدارەخانە پێک بەت."

لە ژ14 ی 21 ی تشرینی یەکەمی 1925 دا لە ژێر ناوی (رجا) دا نوسیوێتی:

"دەستگیر و یاریدەدەرمان خزمانە، جێرخواهان و ئاشنایانە، هیوامان هەر بە وانە و بە سەعی و غیرەتی خۆمانە. سەرمایەیەکی تر و پشتیوانێکی ترمان نیە. بۆ دەوام و گەورەبونی (دیاریی کوردستان) و نەفعی هەمومان ڕجا ئەکەین قیمەتی کڕیاری فەرامۆش نەفەرمون. بە پۆستەدا بینێرن. ئەوانەی کڕیار نین و جەریدەیان بۆ ناچێ داوابکەن، خۆیان گەورەیەتی بنوێنن، بۆمان بنوسن."

لە ژ16 دا لەژێر سەردێڕی: (بۆ هەمو برا و خزمان) دا نوسیوێتی:

"دیاریی کوردستان بە حەسەبی وەزعیەت و ڕەسم و نەفاسەتی مەسرەفی لە ئەمسالی گەلێ زیاترە. بۆ کەس زەرەری نەبوە. بۆ خێر و نەفعی میللەت و ئەمسالی تەئسیر و خزمەتی بوە. وەک دائیمەن گتومانە ئەمە هی خۆمانە، هیوامان هەر بەخۆمانە و بە غیرەتی برا و خزمانە. حسێن ئەفەندی تەحسیلدارمان بە عائیدات بۆ دەرەوە نارد زۆر ڕجا ئەکەین تەئخیری مەکەن. لە ژێر ژمارەی موتەسەلسیل، موقابیلی مەقبوزی مەتبوع و مەمهور بە ئیمزای صاحیبی ئیمتیاز و مۆری ئیدارەخانە، قیمەتی کڕیاری پێ کەرەم بفەرمون. سالانەی هەزار لاپەرەی بە پانزە ڕۆپیە زۆر نیە. قەناعەت و فیداکاری تیادایە. گەلێ مەسرەفی لێ کراوە مەسرەفی خۆی دەرنەهێناوە. مەتڵەبمان بۆ نەفع و خێری میللەت و مەملەکەتە. مان و گەورە بونی بە بە خێوکردنی وەجیبەی هەمومانە. بۆ ئەمە ئابونە بون و فەرامۆش نەکردنی سالانەی کافیە هیچی تری پێ ناوێ. ئەوەی بۆ خودا و خۆ بێ لە کیس ناچێ..."

## 6. بەشی عەرەبی

ئەهێنێ لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتی لە سەر بکرێ.

## 7. بەشی تورکی

ئەهێنێ لێکۆڵینەوەیەکی تایبەتی لە سەر بکرێ.

## 8. لە ڕوی هونەری ڕۆژنامەوانییەوە

لە ڕوی ناوەرۆکەوە، گۆڤارەکە دەوڵەمەندە بە باس و بابەتی جۆراوجۆر.

هەواڵی گرنگ و تازەی ئەوکاتە و ریپۆرتاجی ورد و بە نرخ و زانیاری مێژویی و ئاگاداریی باشی تێدایە.

لە ڕوی شێوەوە، دیاریی کوردستان خۆی خاوەنی چاپخانە و کارگەی زنگۆگراف نەبوە. ئەو 16 ژمارەیەش 4 چاپخانەی کردوە:

ژمارەکانی 1 و 8 ی لە (مطبعة دارالسلام) و،

ژ3 ی لە (المطبعة العصرية) و،

ژمارەکانی 10 و 11- 12 ی لە (مطبعة الفرات) و،

ژ 13- 14 و 15 و 16 لە (المطبعة السريانية الكاثوليكية في بغداد) چاپ کراون.

هەندێ ژمارەیشی ناوی چاپخانەی بە سەرەوە نیە.

بێگومـان ئەمە خـۆی کۆسـپێکی تەکنیکـی گەورە بـوە. تیپکارەکـانی چاپخـانەیش زمـانی کوردییـان نەزانیوە، ئەمەیش ئـەرکی بەرێوەبـەرەکانی گۆڤارەکـەی دژوارتـر کـردوە. لەگـەڵ هـەمو ئەوانـەیشدا ئاسـتی هونەری هۆڤارەکە نیشانەی شارەزایی و لێزانی‌یانە. ڕوخساری گۆڤارەکە و لاپەڕەکانی جوان ڕێک خـراون و ڕازێنراونەتەوە. وێنەکانی باش هەڵبژێردراون. زۆری لاپەڕەکـانی دوسـونی تـێدا نوسـراوە و کەمێکـی یەک ستون. لە چاو گۆڤارەکانی ئەو سەردەمەی بەغدادا، ئەم لەوان دواکەوتوتر نیە.

## 9. ڕاوەستانی لە دەرچون

پێئەچـێ دیـاری کوردسـتان بە هـۆی دامەزرانـی بەرێوەبەرەکـانی لە دەزگاکـانی حکـومەتدا، پەکـی دەرچونی کەوتبێ.

لە ژ15 دا نوسیوێتی:

"موفەتیشی مالیەی کوردستان

موحەڕیری عەرەبی دیاریی کوردستان جەنابی خەلەف شەوقی ئەفەندی لە ریاسەتی قەلەمی تەرجومەی سکرتاریەتی واریدات تەرفیعی کرد، کرابە موفەتیشی مالیەی کوردستان. موحەڕیری خۆمان مەدح نـاکەین، بەم ئینتیخاب و تەعینە موصیبە عەلاقە داران تەقدیر و تەبریک ئەکەین."

لە ژ16 ش نوسراوە:

"مدیری ئیدارەی (دیاریی کوردستان) رەشید شەوقی ئەفەندی

"رەشید شەوقی ئەفەندی کوڕەزای قادر ئەفەندی گەورەیە. (1894 م: 1310 هـ) لە سـلێمانی هـاتۆتە دنیا. لە روشدیەی عەسکەری سلێمانی و ئەعـدادیی عەسـکەریی بەغـداد و حەربـیەی ئەسـتەنبول تەحصـیلی بینیوە. لە ئۆردوی تورکیا لە بلوکی دوەم سواریی ئاڵای مزراقلی ملازم ئەوەل بوە. غیرەت و مرووەتی میللـیە و وەتەنیە، لە ساڵی 1921 دا لە وێوە هێنایەوە. مودەتێ بێ مەئموریەت و بێ بەش ما. موحیبەتی میللـیەی لـە سلێمانی خستیە ناو تەشـکیلاتی حکومـەتی کـورد، مـودەتێ لـە شـاخ و داخ مـا. لە ئەوەل ژمـارەوە یاریـدەی (هەیئەتی دیاریی کوردستان) ئەدا. حەقی خدمەتی بە سەر میللەتەوە هەیە. ئەمجـارە داخلـی دار ئەل تەدریبـی عەسکەری بو، بە ئیمتیحان ئەهلیەت و کیفایەتی نواند. بۆ سریەی ثالثی نەقلیەی جەیشی عیراقی تەعین کرا.

"(هەیئەتی دیاریی کوردستان) رەفیقێکی زۆر خۆشەویسـت و بە غیرەتـی گـوم کـرد. خۆزگـا قەومـی عەزیزی ئێمەش وەک میللەتانی تر ئەهمیەتی مەتبوعاتی فەرامۆش نەفەرموایە، یاریـدەی ئەم جەریـدەیە چـاکتر بدرایە، بەدەلی ئابونەی وەک هـی جەرائیـدی تـر پێشـەکی بنێـررایە وە یـا زۆر پـاش نەخـرایە، وە رەشـید ئەفەندی بمایە. مومائیلەیهی زابتێکی بە قیمەتە، سینەی حەمییەتی دەلیلی غیرەت و بەسالەتە. ئینشائەڵڵا جەیش و مەملەکەت گەلێ ئیستیفادەی لێ ئەکا."

سـاڵح زەکـی بەگـیش هەر لەو مـاوەیەدا لە دەزگاکـانی حکـومەت دا تەعیـین کـراوە، ئیتـر دەسـتی لە دەرکردنی گۆڤارەکە هەڵگرتوە.

## 10. بۆ مردنی ساڵح زەکی

ساڵح زەکی لە دەزگاکـانی حکـومەتی عیـراق دا دامەزرا، ئیتـر وازی لە پیشـەی ڕۆژنـامەوانی هێنـا. لە دەزگای بەڕێوەبردندا بەرزبوەوە تا گەیشتە پلەی موتەسەڕیفی لیوا. مـاوەیەک بـو بە موتەسـەڕیفی سـلێمانی، ساڵی 1944 مرد. ساڵح زەکی بەگ پایەیەکی کۆمەڵایەتی بەرێزی لەناو دۆست و ناسیاوەکانی و، لەناو کـۆڕ

و کۆمەڵە ڕۆشنبیریەکاندا هەبوە. پیرەمێرد بە بـۆنەی مـردنیەوە لە (ژیـن، ژ769 ی 28 ی کـانونی یەکەمـی 1944) دا ئەم هەواڵە کورتەی نوسیوە:

"شیوەن و ماتەم: شیوەنێکی وا کە بە هیچ نەشیدە و گریانێک داخی جۆش نابێتەوە و کـوڵی گریـان نانیشێتەوە. ساڵح زەکی بەگی ساحێبقران ڕۆیی، کۆچی کرد، هەوارگەی خێڵی سلێمانی وێران بو، ئەو شـوێنە پڕ نابێتەوە، ئای چ برینێکی بە ئێشە. سەرخۆشی لە هەمو شاری سلێمانی ئەکەین، لە پێش دا خۆم."

هەر پیرەمێرد لە (ژین، ژ772 ی 25 ی کانونی دوەمی 1945) دا لە ژێر سەردێڕی: (نێرگس و یادی صالح زەکی بەگ) دا ئەم وتارەی نوسیوە:

"ئەمڕۆ چڵێ نێرگسم دی و صالح زەکی بەگم کەوتەوە یـاد. صـاڵح زەکـی بەگ دوایـی گـوڵی بـاغی صاحیبقران بو لە زەکادا، لە سەخادا، لە وەفادا. مـن بەش بە حـاڵی خـۆم وێـنەی ئەوم کەم دیـوە. زۆرتـر کە پەسـندم کـرد لە پـێش دا رابیـتەی نەفسـانی بـو، ئەو خـاوەن خـوان و مـن نەوسـن، کە تێـرم خـوارد، لە موصاحەباتیا زەوقێکی ڕۆحانیم دی، ئینجا کەوتینە عالەمێکی ڕۆحانیەوە، بە ڕۆح و بەدڵ خۆشم ئەویست.

"کاتێ بە موتەصەڕیفی هاتە ئێرە ئەو سەردەمە (مەرد مەگرێزەکانی ئێمە) هەمـو جومعـان ئەچـوینە زەڵم و دواوان. جارێکیان ئەویش هات. لە ڕێوە چوینە توەقوت. لەوێوە هاتینەوە بۆ لای پـردەکەی زەڵـم. ئەو نێرگسە جارەی سەر ڕێگاکەی دی ڕاوەستا. لە ئۆتۆمۆبیلەکە هاتە دەرێ. پەلی مـن و کوڕەکـانی گـرت چوینە ناوەڕاستی ئەو نێرگسانەوە. باقەیەک نێرگسی کرد و لە ناو ئەو نێرگسانەدا ڕاکشـا و، بە دەسـتە نێرگسەکە چـاوی خـۆی داپۆشـی، وتـی: "خـۆزگە لە نـاو ئەم نێرگسـانە و لەم سـەرەڕێی ئێڵـی جـافەدا ئەنێژرام." دوای ئەوە سەری هەڵبڕی وتی: "کاکە توخوا تەماشای ئەم چەشم ئەندازە شیرینە و ئەم دەشـتە ڕەنگینە بکە، ئەستەموڵ کە بە بەهەشتی ڕوی زەمینی ناوئەبەن، لە ناوەڕاسـتی بیشـکتاش و نشـانتاش دا کۆشکێکی سوڵتان عەزیزی تیایە، لە نزیک ئەو باغچەیەکی فولیای تیایە پێی ئەڵێن قولیاترلاسی، بەهاران ئەم هەمو سەیرانکەرەی لـێ کـۆ ئەبێـتەوە لەو چـاڵەدا، ئەمە گـوایە بـۆنی فولیـا ئەکەن، ئەیکـرن دەسـکی ئەکەوێتە مەجیدیەک، دە وەرە ئەمە ببینە و ئەویش بیر بکەرەوە و، ئەم ڕوبارەیش بەم لەنجە و لارە ببیـنە و وڵاتی خۆت لە پێش چاو شیرین نەبێ."

"ئەیویست خدمەتی نیشتمانەکەی بکا زۆری لە دڵ بو. لە سەید صادق بەو لاوە دێ یەکی عەصری بینا بکا و فابریقەی شەکری تیا دابنێ. وە دەستی پێ کرد کە شار بگوێزێتەوە بناری گـۆیژە. ئەم دیـوی گـۆیژە بنێژێ بە باغ. ئێستا دەستی ناهەمواری دەوران لە دەمێک دا کە نێرگس چاوی کردەوە، چاوی لێـک نـا وەک نێرگسەکەی دەوری زەڵم. کوێر بێ ئەو چاوەی بە تۆ ڕون ئەبوەوە و تۆ بە بێ چاوی ئـەو چـاوت کـردەوە. بەڵام تۆ چی بکەی؟ تـۆ هەر ئەوەی کە لەو دەشـتەی هەزاران ئەردەشـێری سـەرەتا و نەڕەشـێری هەرەدوایـی وەک محەمەد پاشات دیوە و بە ڕێ کردوە و لەو چاوە جوانەتەوە فرمێسکێکت دانەڕشتوە، من وا بەو یـادەوە ئەگریم، کەوابێ من بە وەفاترم!"

گەلاوێژ لە ژ1 ی ساڵی 6 یدا بە بۆنەی کۆچی دوایی ساڵح زەکی بەگەوە نوسیوێتی:

"ئۆف ساڵی 944 چەند ساڵێکی شوم و ناهەموار بو. ئاخی (ناری) شاعیرمان لە دڵ دەرنەچـو داخـی (ع. و. نوری) ی ئەدیبی هات بە سەرا. دڵەی بێ ئارام ئەوەندەی تر ئـاگری تـێ بەر بـو، کەچـی ئەوەنـدەمان زانی کوتوپڕ خەم و مەینەتی ماڵئاوایی (ساڵح زەکی بەگ) یش بـو بە سـەر بـاری، ئیتـر دڵ چـۆن نەبـێ بە قەقنەس؟

"کوردی بێ چارە توشی دەردێکی وا گران بو کە بە زەحمەت لێی رسگار بێ، ئەویش مردنی ساڵح زەکی بەگە، کام ساڵح زەکی بەگ؟ ساڵح زەکی عەسکەری، ساڵح زەکی ئیداری، ساڵح زەکی عالم و ئەدیب، ئەو ساڵح زەکی بەگە کە ئەوەتی فامی کردبوەوە تا رۆژی کۆچی بە گیان و ماڵ لە پێناوی کوردا هەمو دەمێکە تاقەسوارەی مەیدان بوە، بە عەزم و ئیرادەی پۆڵایینی، خۆی لەبەر ئەم هەمو تەنگوچەڵەمەی زەمانە دا راگرت و نەیهێشت کەسیش بە دەردی بزانێ، ئەو بە ئێمەی زانی. داخی بە جەرگم ئێمە بەومان نەزانی تا لە دەستمان دەرچو، ئەوەندە هەیە ئەو خۆی رۆیی بەڵام قەدری نەرۆیی، چونکە بێجگە لە خزمەتکانی تری لە پێناوی کوردا، (دیاری کوردستان) ی لە دیاری کوردستانا بانگی دیاربونی ساڵح زەکی بەگ ئەکا.

ئێستە هەر ئەوەندەمان نوسی کە بە تەواوی تاریخی ژیانیمان وەرگرت، لە ئایندەدا دورودرێژ ئەینوسین."

گەلاوێژ لە ژ3 ی ساڵی 6 ی مارتی 1945 دا لە ژێر سەرناوی: "ئەدیبی بەناوبانگی کورد ساڵح زەکی بەگی ساحێبقران" دا ئەم وتارەی نوسیوە:

"کوڕی حسین بەگ کوڕی داود بەگ کوڕی مەحمود بەگی صاحێبقرانە. لە مارتی 1886 ی میلادی لە شاری هەڵەبجە هاتۆتە دنیاوە، لە 1894 دا دایکی مردوە، ساڵێک پاش ئەوە باوکیشی ڕێی حەقی گرتوە، حاجی عوسمان بەگی مامی دەستی کێشا بەسەریا و بردیە لای خۆی لە سلێمانی، لە عەینی ساڵی 1894 دا لە سلێمانی چوە مەکتەبی روشدیە، لە 1899 دا قوتابخانەی ئیبتیدائی لە سلێمانی دوایی هێناوە وە بۆ تەواوکردنی خوێندنی چۆتە بەغدا و لەوێ چۆتە ئەعدادیەی عەسکەریەوە، لە 1902 دا ئەو مەکتەبەشی تەواو کردوە، لە پاش گەلێ پاڕانەوە و تکا کردن لە مام و خزمەکانی توانیویە بیانهێنێتە سەر ئەوە کە بچێتە ئەستەموڵ بخوێنێت، هەتا بەسەر مەرامەکەی دا سەرکەوت و چوە ئەستەموڵ و لەوێ چوە مەکتەبی حەربیەوە، لە 1906 دا بە ملازمی دوهەم لە مەکتەب دەرچوە، 1907 دا ئیلتیحاقی فەیلەقی شەشەمی لە عیراقدا کردوە، لە کاتێکا کە مدیری شوعبەی معامەلاتی زاتیەی فیرقە بوە ئیشتیراکی شەڕی گەورەشی لە جەبهەی عیراقدا کردوە، لەوەختێکا کە یاوەری عەلی بەگ بوە لە شەڕی شوعەیبەدا برینێکیان لە شانی چەپی کردوە، هەروەها لە ئوردوی عوسمانلی دا ماوەتەوە و سەرکەوتوە هەتا بوە بە بیگ باشی، لە ساڵی 1921 دا وەزیفەی بە جێ هێشتوە و لە دیاربەکرەوە گەڕاوەتەوە بۆ عیراق.

"لەساڵی 1922 دا لە لایەن حکومەتی عیراقەوە کرا بە قائیمقامی ئاکرێ بەڵام پاش ماوەیەکی کەم وەزیفەی دایە دواوە و چوەوە بۆ سلێمانی لەوێ ئیلتیحاقی سەورەی کوردی کرد لەگەڵ شێخ مەحمود وە بو بە وەزیری جەنگی کوردستان، لە 1924 دا لە لایەن حکومەتی عیراقەوە ناچار کرا کە بگەڕێتەوە بۆ بەغدا و ببێ بە خانەشاری ئەوێ، لە ساڵی 1925 دا بە سێ زمان: کوردی، تورکی و عارەبی گۆڤاری (دیاری کوردستان) ی دەرهێنا، لە 1926 دا کرا بە مدیری ناحیەی قرانیە لە پاش شەش مانگ بە عەینی وەزیفە نەقڵی شارەبان کراوە، لە پاش ماوەیەکی کەم کە شارەبان کرا بە قەزا قائیمقامیەتی ئەوێی درایە، لە پاشان نەقڵی قەزای عەفەک و لەوێشەوە بۆ چەمچەماڵ نێررا، لە 1931 دا کرا بە معاونی یەکەمی مدیری داخلیەی عیراقی، لە 1933 دا کە وەزیفەکەیان هەڵگرت کردیان بە قائیمقامی کۆیسنجەق و ناردیان بۆ ئەوێ، لە 1934 دا بە عەینی وەزیفە نێررا بۆ عیمادیە، پاش 6 مانگ لە ئەیاری 935 دا کرا بەموتەسەڕیفی سلێمانی، لە پاش ساڵێک و 8 مانگ نەقڵی لیوای دیالە کرا، لە 1937 دا کرا بە رەئیسی تەسویە لە کەرکوک لەوێشەوە بە عەینی وەزیفە بۆ موصل لە موصلەوە بۆ تەسویەی ئەعزەمیە لە بەغداد لەوێوە بۆ کوت نەقڵ کرا، لە 1938 دا بۆ تەسویەی دیوانیە تەعین کرا، لە 1939 دا وەزیفەکەی هەڵگیرا، لە پاش 2 مانگ کرا بە موتەسەڕیفی هەولێر، لە مایسی 1940 دا بە تەقاعودی دەستی لە ئیش کێشرایەوە، لە پاییزی 1942 دا کرا بە موفەتیشی

ئیداری لە بەغداد. لەم ئیشەدا مایەوە تا لە 13ی کانونی یەکەمی 1944 ی میلادیدا کۆچی دوایی کرد و لە گۆڕستانی ئەعزەمیە لە بەغدا زۆر بە ئیحتیرامەوە نێژرا.

### "ساڵح زەکی بەگی عالم و ئەدیب

"ئەم ساڵح زەکی بەگەی کە باس کرا ساڵح زەکی‌یەکی ئیداری بو. بەڵام ئەگەر لاپەڕەی تاریخ هەڵبگێڕینەوە ساڵح زەکی بەگێکی عالم، ئەدیب، نیشتمان دۆست و شاعیرت بەرچاو ئەکەوێت غەیری پیاوەکەی پێشو، خاوەنی تەرجومە هەرچەند ئاساری چاپکراوی عیلمی زۆر بەرچاو ناکەوێت بەڵام لە کاتێکا کە بهاتایەتە قسەکردن ئەو وەختە دەرئەکەوت کە تا چ دەرەجەیەک لە هەمو ناحیەیەکی عیلمییەوە بەشی وەرگرتوە و ئوستادێکی دانشوەر بوە. لەسەر ئەو هەمو مەینەتی و ناهەمواریە دا کە بە سەری هاتبو هەمو دەمێک حەیاتی موتاڵا و قسەکردن لە مەسائیلی عیلمی‌یەوە بە لایەوە لە هەمو حەیاتێک خۆشتر و بە نرختر بوە. بە تایبەتی لە عیلمی تاریخ و سەرگوزەشتی ڕابوردواندا دەستێکی باڵای بوە.

"ئەگەر یەکێ بیەوێ ساڵح زەکی ئەدیب بناسێت بەسە بۆ تێگەیشتنی ئەو، ئەدیبی ساڵح زەکی بەگ سەیرکردنی دیاریی کوردستانی بە عیباراتی نەخشین و ڕەنگینی سێ زمان کوردی، تورکی و عارەبی ئەزانرێ کە تا چ پایەیەک خاوەنی تەرجومە لە ئەدەبیات و پایەی خۆشویستنی ئەدەبیاتا دەستی بوە و چ ڕەنجێکی لە پێناوی ئەدەبیات بە تایبەتی کوردی دا کێشاوە. بێجگە لەمانە بە عیباراتی پڕ مەعنا و نکاتی قیمەتداری هەمو دەمێک دانیشتوانی مەجلیسی خۆی سەرسام کردوە. خاوەنی تەرجومە لە قسەکردنی عارەبی، تورکی، فارسی و فەرەنسزی دا هەمو دەمێک بە کوڕی ئەو زمانانە ناسراوە. لە پایەی شاعیریشدا بنەماڵەی ساحێبقرانی بە بۆشی نەهێشتۆتەوە. کام بنەماڵە؟ ئەو بنەماڵەیە ئەگەر بوترێ زەوقی شیعر و بیری تیژ و فیکری بەرز لە مەیدانی شاعیریەتیدا لە پاشەڕۆکی ئەوانە هیچ دور نیە و درۆ نیە.

"ڕۆحی نیشتمانپەروەری ساڵح زەکی بەگ ئەو ڕۆحە بو. کە بیستی وا سەوراتی کوردی لە کوردستانا دەست پێ کراوە ژیانی خۆی و حەیاتی وەزیفەی هەمو خستە لاوە بۆ ئەوە. ئەویش وەکو بەرزتر کوردێک بە ئاواتی خۆی بگا. ئەو سەعاتەی بەلاوە خۆشبەختی بو کە زۆر هیلاک بوبوایە بە شوێن ئیشوکاری کوردێکا کە روی لێ بنایە. کە لێشیان بپرسایە بۆچی وا ئەکەی؟ ئەیوت: خۆ بۆ ئەوی ناکەم. بۆ خۆمی ئەکەم" ئەم قسەیە وامان پیشان ئەدا کە ڕۆحی هەمو کوردێکی بە ڕۆحی خۆی زانیوە.

"خاوەنی تەرجومە لە کاتی قسە کردنا زۆر هێمن و لەسەرخۆ بوە. تا بیری لە قسە نەکردایەوە نەیئەکرد. پیاوێکی هەتا بڵێیت سەخی تەبع و دڵفراوان و بە نان و خوان بوە. بەڵام هەتا ئەو ڕۆژەی سەری نایەوە هیچ ساتێک نەبو کە بەختی ناموافیقی لەگەڵیا ڕێکەوێت."

### تێبینی:

دیاریی کوردستان. ئامادەکردنی ڕەفیق ساڵح و. لێکۆڵینەوەی نەوشیروان مستەفا ئەمین و سدیق ساڵح. دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم. لە سلێمانی ساڵی 2001 سەرلەنوێ بڵاوی کردۆتەوە.

## 7. 3. روناکی: یەکەمین بڵاوکراوەی کوردیی شاری هەولێر

هەولێر پێنشەمە ٢٤ تشرین یەکەم ١٩٣٥ — ٢٦ رجب ١٣٥٤

( ساڵی یەکەم ) ژمارە ١

مدیری مسؤل
محامی
محمد شیت مصطفی
بو هموچتێک مخابەرە بەناوی
هەولێر خیوی زاد کرمانجی
(هەر نسخەیەک دە فلسە)



ROONAKI

گوڤارێکی هەفتەیی علمی اجتماعی ادبی کوردیە

بدل اشتراک پێشەکی بە
ساڵی بە ٧٥٠ فلسە
بودە رەوە اجرتی پوستەی دێتە سەر
اجرتی اعلانات
لەگەڵ ایدارەدا رێک دەکەوین


# ای روناکی !



ئاوەکەت جوانە وماشی ، پیروزەو روناکە ، هیواش هەر روناکە !...

ئەوە ئەدەب بەرزی بە بەرزیکی وا پیروزەوەی ، گەردی خرابی ، تەم وتاریکی نەزانین بارای گەیشتنی وهەڵپشتنی نیە پیتان .

بەتەمایین کە بەدرەوشینەوەتان ئەوەش نەهێڵن . وئەو زەنگە وتەمە کە (لە نەزانینەوە) دڵ و دماغی داگرتووە بەتیشکی دەرمان وزانست رو ماڵ و زاخاوی بدەن ایتر لە خاکی سوران ئەم دەرکە تنسات بپیروزنی وبو هەموان هەر بیبی روناکی زانست وژیان !...؟

دڵسوزێکی نزیک



# روناكى

فهرست




موصل لە چاپخانەى موصل حديثە چاپ كرا

٢٤ تشرين يكەم ١٩٣٥

## 1. روناكي

### 1. 1. دەرچونی

لە ژێر ناوی (روناکی) دا نوسراوە:

"کۆوارێکی هەفتەیی عیلمی ئیجتیماعی ئەدەبی کوردیە

"مدیری مەسئول پارێزەر شیت مستەفا

"بۆ هەمو چتێک مخابەرە بە ناوی هەولێر خێوی زاری کرمانجی"

خێوی زاری کرمانجی سەید حسێن حزنی موکریانی بوە.

ژ1 ی لە 24 ی تشرینی یەکەمی 1935 و

ژ11 ی کە دوا ژمارەیەتی، لە 16 ی مایسی 1936 دا دەرچوە.

هەر ژمارەیەکی 16 لاپەڕەیە. بە سەر یەکەوە هەموی 176 لاپەڕەیە.

ژمارەکانی 1 و 2 لە چاپخانەی (موصل الحديثة) و،

ژمارەکانی 3-بۆ 7 لە رەواندز و،

ژمارەکانی 8-بۆ 11 ی لە چاپخانە زاری کرمانجی لە هەولێر چاپ کراون.

هەموبابەتەکانی بەکرمانجی خوارو و، بە حەرفی عەرەبی و بە ئیملایەکی تێکەڵاو لە کوردی نوێ و فارسی نوسراوە.

### 1. 2. ئامانجی

لە سەروتاری یەکەمین ژمارەیدا ئامانجی روناکی لەژێر سەردێڕی:

(مەجەللەی روناکی و مەتبەعەی زاری کرمانجی) دا بەم جۆرە رون کردۆتەوە:

"ئێمەش بۆ گەیشتنە ئەو ئارەزوە کە خدمەتی عیلم و فەن و ئیقتیصاد و کۆبونەوە و یەکدی ناسین بکەین. وە وەکو لیواکانی دیکەی حکومەتی عیراق لە لیواکەمان دا مەتبەعەیەک و رۆژنامەیەک دابمەزرێنین، بە هۆ و پشتیوانی مەعاریفپەروەری و خێرخواهی و عیمران و ئاوەدانپەرستی و عیلم و فەن بەرزویستویی سەعادەتی ئەحمەد بەگ (مەبەستی ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگە کە لەو کاتەدا موتەسەڕیفی هەولێر بوە)

موتەصەریفی غەیوری خۆشەویستمان و بە یارمەتی نیشتمانخواهە ناودارەکانی کوردەوە موەفەق بوین بە وەرگرتنی ئیمتیازی نەشری مەجەلەی رونـاکی و دامەزرانـدنی مەتـبەعەی زاری کرمـانجی لە مەرکەزی لیـوای هەولێر (اربیل). ئومێد دەکەین کە ئەو مەتبەعە و مەجللەیە زۆر چاک خزمەتی یێکەتـی عیـراق و سەرخسـتنی ئەدەبیات و ئیجتیماعیاتی مـیللەت و ئیقتیصـاد و بەرزبـون و پێویسـتی لیـوا خۆشەویسـتەکەمان بکـا و بـۆ نیشتمانەکەمان سودمەند و بەهرەوەر بێ."

له دوا لاپەڕەی بەرگەکەیدا نوسیوێتی:

"روناکی رەوشت و دەستورێکی بەرزی هەیە رابردوی ئێستا دەناسێنێت بە رەهبەرێکی باش

"روناکی بە دڵێکی خاوێن بۆ یێکێتی عیراقی دەکۆشێ

"روناکی ئەدەبیات و زانستی کورد کۆدەکاتەوە

"روناکی بیرەوەری بۆ کورد دەکات

"روناکی رەوشت و خوی کورد تازە دەکاتەوە

"روناکی ناوی ناودارانی کورد بە خێو دەکا

"کـۆوارێکە لە ژمارەکـانی دا دیـوانی ئێسـتا و رابـردو و فەرهەنـگ و شـێوەی کـورد و زانسـتی ئیجتیماعیات نەشر دەکا."

ئەم دروشمانەی لە هەمو ژمارەکانی دا نوسیوەتەوە.

### 1. 3. نوسەرەکانی

جگە لە حوزنی، چەند کەسێکی تـر بەشـداری نوسـینیان کـردوە، لەوانە: س. ناکـام، مەحمـود فەهمـی هەمەوەند و، چەند قوتابیەک، لەوانە ئیسماعیل عەلی قوتابی حقوق، ف. م.، لە قوتابیانی متەوەسـیتەی هەولێـر جەمال ئەحمەد و یونس مستەفا عومەر.

روناکی لە هەولێر دەرچـوە. ئەوە یەکەمـین جـار بـوە بڵاوکـراوەیەک لەو شـارە دێـرینەدا بە کـوردی دەرچێ. کەچی جگە لە چەند کورتە وتارێکی شیت مسـتەفا کە مـدیری مەسـئولی گۆڤـارەکە بـوە، لە ژمـارەی یەکەم و دوەمدا بڵاوکراونەتەوە و، پێئەچێ ئەویش حوزنی بۆی تەئلیف کردبێ و، شـعرێکی بـێ فەڕی کـانی، هیچ نوسەر و شاعیرێکی هەولێری لەم گۆڤارەدا بەشداری نوسینیان نەکردوە.

### 1. 4. زمانی نوسینی

زۆری وتـار و بابەتەکـانی حـوزنی خـۆی نوسـیونی. نـاوی جیـاوازی بەکارهێنـاوە. هـەر خۆیشـی سەرپەرشتی چاپ و بڵاوکردنەوەی کردوە. لەم روەوە هیمەتێکی بێ وێنەی نواندوە.

ئەوەی بە وردی لە زمانی نوسینی روناکی بڕوانـێ، ئـەزانێ کە حـوزنی ئەگەرچـی موکریـانی بـوە و، هەندێ وشـەی موکریـانی بەکارهێنـاوە، بەڵام بە زاری موکریـانی نەی نوسـیوە. بەڵکـو پێـڕەوی ئەو زمـانی نوسینەی کردوە کە ئەو سەردەمە لە کوردستانی عیراقدا باو بوە.

حوزنی وتارنوسێکی بە توانا بوە. خەریکی یەک بابەتی تایبەتی نەبوە، بەڵکـو بـابەتی جۆراوجـۆری نوسیوە. لە نوسیندا ئوسلوبی تایبەتی خۆی هەبوە.

### 1. 5. باری دارایی

لە لای چەپی ناوی روناکی نوسراوە:

"بەدەلی ئیشتیراک پێشەکییە. ساڵی بە 750 فلسە. بۆ دەرەوە ئوجرەتی پۆستەی دێتەسەر"

پێئەچێ کێشەی ئابونەیان هەبوبێ، لە ژ10 ی 25 ی نیسانی 1936دا نوسیوێتی:

"پاڕانەوە و تکا و خواهیشت

"لەبەر ئەوە کە ئەم مەجەللـە جگە لە دراوی موشتەریکە موحتەرەمەکان چی رێگـایەکی دیـکەی نـیە بـۆ خۆژیاندن بە تایبەتی لە بەر موشتەریکە خۆشەویستەکان دەپاڕێینەوە بۆ ئەمە کە ئەم مەجەللـە ئیدارە بکرێ و نەکەوێ بەدەلی ئیشتیراکی ساڵانەمان پێ لوتف بفەرمون."

لە ژ11 ی 16 ی مایسـی 1936 دا لە وتـارێکیدا بەنـاوی: (فەیلەسـوف مەرحـوم جەمیـل صـدقی زەهاوی) دا نوسیوێتی:

"کتێبە چاپکراوەکانی ئێمە ئەمڕۆکە گەیشتۆتە 22 نوسخە و، چاردە جلد کتێبـی گەورەم نوسـراون و، حازرن و چاپ نەکراون، هەروا ماون. وە لە ئیحتیرام و نان، رۆژی صەد پایە سـەرەوژێرم نەک بەرەوژور. کە داوای حەقی نوسخەیەکی کتێب لە گەورەیەکی کـورد بکـرێ وەدەزانـێ سـواڵ (دەرۆزە) ی لـێ دەکـرێ، کە لە گەلێک جێگایان ڕویداوە. لە هەرە گەورەکانی کورد، لە عاصیمەیە داوای بەدەلـی ئـابونەی سـاڵێکی مەجەللـەی روناکی، کە 750 فلسە، لێ کـرا بـو، فەرمـو بویـان بە مەرقەدی بـاوکم فلوسـێکم نـیە بەڵام مانـگ بە مانـگ مومکینە بیدەم، ئەگەرچی 50 -60 دینار جیرە وەردەگرێ."

### 1. 6. داخرانی

د. کوردستان موکریانی، برازای حوزنی، کە سەر لەنوێ روناکی چاپ کـردۆتەوە و لێکـۆڵینەوەیەکی لە سەر نوسیوە، هەندێ لە یاداشتە دەسنوسەکانی حوزنی بڵاوکردۆتەوە. ئەڵێ روناکی بـۆیە داخـراوە چـونکە حوزنی ئامادە نەبوە ببێتە ئەندام لە (حزب الاخوة) ی رەشید عالی گەیلانیدا.

## 2. بابەتەکانی

### 2. 1. ئیجتیماعیات

حوزنی لە ژ1 دا لە ژێر سەردێڕی (کۆمەڵەی نەژاد و بنەچەکەی کورد) دا نوسیوێتی:

"قەوم و قەبیلە و میلەتێکی زل و زەلام و رەشید و ئازایەکی کە لە سەر زەوی پـان و بەرینـی حەوزی عولیای هەردو چۆمی فورات و دیجلە و ئەرازییەکی گەورەی ئێران و کێوی ئارارات و دەوروپشـتی ئەو زەوی و خاکانەیان کردۆتە نیشـتیمان و خـاوەن لەهـجە و دراوی یەکەتـی و پێکەوەیـی و رێکـی زبـان و شـێوە و رەوشت و خو و دەستوری ژیان و مەزهەب و کێش و مەوجودیەتێکی زۆر بەرزن، بە کورد ناو دەبرێن.

"بەڵام موحیتی جوغرافیایی نیشـتمانی ئەم مـیلەتە و بـروزی حەوادیسـی تـاریخی، لە خەصائیصـی و سەجایای قەومایەتی ئەوان دا گەلێک تەئسـیری بەخشـیوە و کـاریگەر بـوە. جـا ئەو تەئسـیراتە ئیختیلافـی خستۆتە شێوە و لەهجە و خو و دەستور و کیش و ئاینی ئەوانەوە. بەو ئیختیلافاتە شێوە و رەوشـتی کـورد کەمێک دوچار بە تێکەڵاوی و پشێوی بوە. سەرزەوی و خاکی نیشتمانەکەشیان توشـی دەستاودەسـتی و ئەم دیو و ئەو دیو پێ کردن کراوە. بەڵام جۆشبەختانە لە دوای تەحقیقاتێکی قوڵ و وردبونەوەیەکی زۆری زانا و تێگەیشتوەکانی ئینگلیس و ئەڵمان و فەرەنگساوی و ئەمریکان و بە تەقەلا و تێکۆشینیان، تۆزێ کە کەوتبـوە سەر تاریخی نەژادی کورد لابرا و، ئاسمانی دیریکیان لە هەور و دوکەڵی موتەعەصیب پەروەرانی بیانی پـاک

کراوە. ڕوی تاریخی نەژادی کورد ڕونـاک بـو و مشـتومالْ کـرا و بە سـەعی و کۆششـی پرۆفیسـۆررەکانی ڕۆژئاوا و بە هیمەت و غیرەتی ئەو زانا و دانشوەرانە دەبانی نەژادی لە ژەنگ و دلو و چلک خاوێن و زاخاو درا، جەوهەری گرانبەهایان ئاشکرا بو."

لە ژ2 و 3 دا دریژەی بە هەمان باس داوە و بیروڕای هەندێ لە ڕۆژئاواییەکانی نوسیوە.

لە ژ5 و 6 دا لە هەمان گۆشەدا نوسیوێتی (پێویستانی ئادەمیزاد چیە؟)

لە ژ9 دا (عەشایەری ڕەندی کورد ئیسکان بن چاکترە یان بە ڕەوەنـدی (رحـالە) بمێنـنەوە؟ حـوزنی نیشتەجێ کردنی عەشایەری پێ باشتر بوە لەوەی کە بە ڕەوەندی بمێننەوە.

جگە لە حوزنی خۆی، چەند کەسێکی تریش لەم گۆشەدا وتاریان نوسیوە.

لە ژ10 دا (گ. م) کە ئەبێ گیو بێ لەسـەر (مێـژوی ئەدەبیـاتی کـورد) و لە ژ11 دا ئیسـماعیل عەلـی (کردەوە تێ کۆشین) ی نوسیوە.

### 2. 2. ئیقتیصادیات

گۆشەیەکی تری گۆڤارەکە تەرخان کراوە بۆ باسی ئابوری.

لە ژ1 دا لە ژێر سەردیڕی (ئیقتیصادیاتی نیشتمانی کورد) دا نوسیوێتی:

"خاکێ کە نیشتمانی کوردە جێگایەکە جوان و خاوەند حاصلاتێکی زۆر و پیرۆز سەرزەمینێکە شین و خۆش و باصەفا و دڵ گوشاد و، هێنـدێکی زورگ و گـرد و دەشـت و کێـوی پـڕ گیـا و دار و دەوەن و پـڕ لێڕەوار و مێشە و جەنگەڵی سودمەنە، چۆم و ڕوبارانی زۆر و شایانی بەهرە لـێ وەرگـرتن و جنسـی خـاکی حاصڵخێز و موقتەزای هێنانە ڕوی فەلاحەتی گۆناگۆن وەکو دانەوێڵە و مەڕداری و ماڵات بەخێوکردن...

ئینجا ئەڵێ: "بە کەم تەقەلا و ماندوبونێک و مەسرەفێکی سوک واریداتێکی باشمان لەو خـاکە دەسـت دەکەوێت. لە دەشت و جێگا نەرمەکان دا دانەوێڵە و توتون وە لە چیا و کێوەکان دا مەڕ بە خێوکردن و دار و درەخت چەقاندن زۆر زو دێتە دەست."

"چتێکی دیکە کە ئیقتیصادیاتی نیشتمانی کوردی بە با داوە مەسئەلەی دەست تەنگـی و تەنگەتـاوی و بارگرانیە لە چیاکان دا و ئاویە لە دەشت و زورگەکان دا..."

لە ژ2 دا دریژە بە باسەکەی ئەدا و، باسی (سەلەم) ئەکا کە چۆن جوتیـاری هەژار بە هـۆی نەبـونیەوە (سەلەم) لە دەوڵەمەن ئەکەن و ئەبن بە ژێر باری قەرزی گرانەوە، بۆ چاری ئەوەیش نوسیوێتی:

"ئەگەر حکومەت چارەیەک لەوانە نەکات و چتێکی وەکو بانکی زەراعەتیان بـۆ دانەمەزرێنـێ مـیلەت لە قەرزاری ئەوانە ڕزگار نابێ و ئەهالی هەمو مەحو دەبنەوە."

### 2. 3. ئەدەبیات

#### 2. 3. 1. لێکۆڵینەوەی ئەدەبی

لە ژ1 دا حوزنی لە گۆشەی (ئەدەبیات) دا وتارێکی بە ناونیشانی (بەرزی و ناو) نوسـیوە. ئەحـمەدی خانی و حاجی قادر لەگەڵ شکسپیردا بەراورد ئەکا.

لە ژ5 دا دیسـان حـوزنی لەسـەر (ئەدەبیـات و ئاسـاری ئودەبـای کـورد) ی نوسـیوە. لەم وتـارەدا لە ئەحمەدی خانی و مەم و زین و،

لە ژ6 دا لە عەبدوڵا بەگی ئەدەب و،

لە ژ7 دا لە مەولەوی و،

لە ژ11 دا لە حاجی قادری کۆیی دواوە.

لە ژمارەکـانی 1 و 2 و 3 و 8 و 10 دا چەنـد بەشـێکی لە پێنجیـنە درێـژە بە ناوبـانگەکەی ئەدەب بڵاوکردۆتەوە. لە هەندێ ژمارەدا لاپەڕەیەکی تەواوی بۆ تەرخان کردوە. جێگەی پرسـیارە کە بـۆچی حـوزنی لەناو دیوانەکەی ئەدەبدا، ئەم شیعرەی بۆ بڵاوکردنەوە هەڵبـژاردوە؟ لە کاتێـک دا ئەم شـیعرە هەمـوی باسـی (جنس) ە.

لە شاعیرانی ناوداری هاوچەرخی خۆی، شعرێکی هیجری دەدەی کەرکوکی لە ژ8 دا کە بە فارسـی بـۆ شینی ئیسماعیل بەگی ڕەواندزی و، لە ژ10 دا شـعرێکی بێخـود کە بـۆ پیرۆزبـایی دروسـتکردنی دوکـان و بازاڕ بۆ ئەوقافی کۆیەی داناوە، بڵاوکردۆتەوە.

لە ژ2 دا شیعرێکی دڵدار کە بۆ روناکی داناوە و ڕەنگە ئەوە یەکەم شیعری بوبێ و

لە ژ8 دا 2 شیعری هەوری و

لە ژ11 دا پێنجینەیەکی کانی، بڵاوکردۆتەوە.

شیعرەکانی بە گشتی نرخێکی ئەدەبییان نیە.

### 2. 3. 2. لە نێوان پیرەمێرد و حوزنیدا

پیرەمێـرد لە (ژیـان، ژ460 ی 9 ی تشـرینی دوەمـی 1935) دا، لەژێـر سـەردێڕی (رونـاکی) دا بەم بۆنەیەوە لە لێدوانێکی کورت دا هەم پیرۆزبایی لێ کردوە و، هەم ڕەخنەی لێ گرتوە. نوسیوێتی:

"چاوەڕوانی (روناکی) بوین، خوا بیهێڵێ، چاوی رون کردینەوە. لە ژیان دا نوسی بومـان کە شـەوێکی بەهار لە هەڵەبجە دو بلبل بەرابەری یەکدی دەیان خوێند، من ئاواتی دو ڕۆژنامەم لێ خواستن و وا روناکیمان دانا بەو بلبلە کە لە هەولێرەوە ڕو بە ڕوی ژیان بخوێنێ، بەڵام لە پەردەی میللی و کـوردی دا، واز لە شکسـپیر و لێرچ و هارتمان و لیسباخ بێنێ، چاری دروست لە چاپ دانی بکا، چونکو ئەوی سەرپەرشتی دەکا، دەزانـین هێندە بە هونەرە دەتوانێ سنعەتی چاپ ئیجاب بکا، کەوابێ بۆچ غەڵەتی مەتبەعی ببێ؟"

پـێ ئەچـێ پیرەمێـرد مەبەسـتی لەو دو وتـارە بـێ کە حـوزنی لە ژ1 دا نوسـیونی. یەکەمیـان، (ئیجتیماعیات: کۆمەڵەی نەژاد و بنەچەکەی کورد) و دوەمیان، (ئەدەبیات: بەرزی و ناو).

پیرەمێرد بە بۆنەی ئەو وتارەوە کە حـوزنی لە ژ7 دا لەسـەر مەولەوی نوسـیوە لە (ژیـان، ژ 476) دا بابەتێکی لە سەر ئەنوسێ.

حوزنی لە ژ11ی 16ی مایسی 1936ی روناکیدا لە ژێر سەردێڕی (راسـتەکەی) بە گلەیـیەوە لەسـەر پیرەمێردی نوسیوە:

"ئوستازی فازیل، ئەدەبی عاقـل، فەیلەسـوفی گەورە، پیرەمێـردی کامیـل، رەئیسـی جەمعیەتـی زانسـت، رەهبەری لاوان، خاوەند نان و خوان، هەمشانی ماقول، بێ عیزەت و شان، تاقانەی سلێمانی، عـالمی زەمـان، بە پشت و بەهێز، مودیری ژیان، جەنابی حاجی تۆفیق بەگ. ویستم بەم دو کەلیمەیە دڵرەنجـیی خۆمتـان عەرز بکەم:

"ئەو قەوم و میلەتە بەختەوەر و خاوەند ئـیش و کـار و پیشـە و ئیختیراعـات و تەئلیفـاتە گەورانە کە ڕۆژنامە و مەجەلە و مەتبەعەی ڕێک کەوتو و چاکی بێ ژماریان هەیە، هەمو بۆ یەکتر پشـت و پەنـا و هێـز و دەست گرن و لە نێوانیان دا کەچی و خواری و ناکۆکی و هەڵمەت و پەلامار و خراپی یەکدی نابینـدرێ. هەر

کەس بە دڵێکی پاکەوە لەگەڵ ئیشوکار و تەئلیفات و تەتبیعاتی خۆی خەریکە و لە یەکتر وەریش نەگرن یەکدی نارەنجێنن و ڕۆحی خۆیان بە چتی پڕوپوچ موتەئەسیر ناکەن و هەمو بە یەکەوە بۆ ئامانجێک چون لە کۆشەوە و تەقەلا دان. هەر یەک بە تەئلیفاتی سودمەندەوە خەریک دەبن و بە مەقالەی بە کار و چاک ڕۆژنامەکەیان پڕ دەکەنەوە.

"ئێمە بە ناشوکر بێ هێشتا نەبوینە خاوەند مەتبەعە و ڕۆژنامەیەک کە وە کەمترین ڕۆژنامە و پیسترین مەتبەعەی میلەتە بێ جێ و ڕێگاکان بچێ و، هێشتا نەمانتوانیوە کتێب وە یا ریسالەیەک وەکو خەلق بێنینە وجود، وە هێشتا نەبوینەتە ساحێبی لاپەڕەیەک کە سودی تێدا بێ. لەبەر نیفاق و خۆخۆری و نەکیشان و حەسودی مەتبەعەکەی ئێوە هێشتا ئەو مەتبەعەیە کە مێجەرسۆن لە سلێمانی دایمەزراند و ماوە. وە مەتبەعەکەی منیش لەوە پتر کە بە نوکی قەڵەمی حەکاکی لە حەڵەب ڕێکم خستبو هیچم لەسەر زیاد نەکردوە و، هەر پەرێشان و بێ ئەساسە و روت و قوتە و بێ حروفات.

"لە بەر یەکتر خستن و پاڵ پێکەوەنان و ئەزیەت دانی یەکتر نەپەرژاوینە سەر تەئلیفات و مەتبوعاتێکی وا بەخیلی بە یەک ببەین و رەقابەتی یەکدی بکەین ئەگەرچی یەک دو ریسالەی بێ سەرو بەریش بڵاو کرابێتەوە لە مەجلیسی زانایان دا روی خۆ نواندنی نیە چی جێگای حەسودی پێ بردن بێ هێشتا ئێمە ڕۆحی زیندومان پێ ڕانەگیراوە چە جای مردو نەرەنجان. هێشتا نەگەیشتوینەتە پایەیەک بۆ سەرخستنی علم و ئەدەب هەڵمەت بەرینە سەر یەکدی و بۆ نەشری چتی بێ سود دڵی یەک ڕەنجیدە بکەین. حسەین حوزنی"

**2. 3. 3. چیرۆک**

لە ژ3 و 4 دا حوزنی (سەربهورد و مەتەڵ) ی نوسیوە کە باسی دڵداری ناپلیۆن ئەکا.

لە ژ4 ناپلیۆنی ڕەش لە (روز الیوسف) وەرگیراوە.

لە ژمارەکانی 7 و 8 و 9 و 10 و 11 دا، هەر لە بواری ئەدەبیدا داستانی (یەزدان دوخت: شەنگێکی پاکیزەی دلبەری هەولێری) بڵاوکراوەتەوە کە حوزنی لە عەرەبیەوە بە چەند ئەڵقەیەک کردویەتی بە کوردی.

حوزنی بەم پێشەکیە دەستی پێ کردوە:

"کتێبی یەزدان دوخت الشریفه الاربیلیه تەئلیفی ئوستازی فازیل مێژونوسی بەناوبانگ قس سلیمان صایغ موصلی کە ساڵی 1943 لە چاپ دراوە کەوتە بەر چاومان سەربهوردی ئیجتیماعی و میلی ئەو شەریفە هەولێریەمان بە کورتی نوسیوە، چونکە ئەمە یەکەمین مجلە و یەکەمین مەتبەعەیە لە وەتەنی ئەو شەنگ و شۆخە هەولێریەدا چاپ و بەکار براوە. ویستم بە ناوی و ڕەوشت و ڕەگەزی ئەو نازەنینە هەولێریە چەند دێرێک تەقدیم بە خوێندەوارانی موحتەرەم بکەم و لە شکلی ریوایەتێکی کورت دا بیخەمە بەر چاوان."

لە ژمارەکانی 7 و 9 و 11 دا محەمەد عەلی کوردی بەناوی: (نازدار، یان ژنی کورد لە لادێ) ڕۆمانێکی 100 لاپەڕەیی بە زنجیرە بڵاوکردۆتەوە. بە هۆی ڕاوەستانی گۆڤارەکە، ڕۆمانەکە تەواو نەکراوە.

### 2. 3. 4. فۆلکلۆر

روناکی بایەخێکی باشی بە فۆلکلۆر داوە. هەندێ سەرگروشتە و چیرۆکی پێشینان کە بە شێوەیەکی نوێ دارێژراون، بڵاوکردۆتەوە لەوانە:

لە ژ3 دا (چیرۆک: فاتم چونکی زاڵم بو، ئاخری ماڵی کاول بو)،

لە ژ10 دا (چیرۆک) ی (هەرچی دەکەی دوامینی رەچاو بکە)،

لە ژ3 دا لە ژێر سەردێڕی (چیرۆک) دا (بەندی لەشکری) بڵاوکردۆتەوە کە بەیتێکی بەناوبانگی ناوچەی سۆرانە،

لە ژ8 دا (بەیتی ئەورەحمان پاشای بابان) ی عەلی بەردەشانی بڵاوکردۆتەوە،

لە کۆتاییەکەی دا نەسیوێتی (ماویە) بەڵام تەواوی نەکردوە.

### 2. 3. 5. وەرگێڕان

روناکی بایەخێکی تایبەتی داوە بە وەرگێڕان. چەند بابەتی جۆراوجۆری ئەدەبی، کۆمەڵایەتی، زانیاریی گشتی وەرگێڕاوە. پێ ئەچێ زۆری ئەمانە لە عەرەبیەوە وەرگیرابن. جگە لەمانە:

لە ژ9 دا (رزگار بو) لە کتێبەکەی کاپتەن های (دو ساڵ لە کوردستان) کە بە ئینگلیزی نوسراوە، بەشێکی کەمی لە ژێر سەردێڕی (ئەوەل زیارەتم بۆ هەولێر) کردوە بە کوردی. هەرچەند لە کۆتاییەکەی‌دا نوسراوە (ماویەتی) بەڵام لە ژ11 دا درێژەی پێ نەدراوە و، ئیتر گۆڤارەکە دەرنەچوە.

### 2. 3. 6. بابەتی جۆراوجۆر

هەندێ بابەتی جۆراوجۆری بڵاوکردۆتەوە کە بۆ زیاد کردنی زانیاری گشتی خوێندەوار، باش و بە کەڵکن، لەوانە:

لە ژ1 دا (لە قەلبی ئەوروپادا دەوڵەتێکی ئیسلام) و (بزرکردنی دڵنیایی)

لە ژ2 دا (لە قەسری حەبەشستان دا ژیان)

لە ژ4 و 5 دا ژیانی مۆسۆلێنی، رابەری فاشی ئیتالی، باس ئەکا.

لە ژ5 و 6 دا (ئاگرپەرست) کە باسی ئاینی زەردەشتی ئەکاو،

لە ژ6 و 7 دا زبانانی گێتی (عالم) کە هەردوکیان لە لایەن ب. ج. تەرجومەی کوردی کراون.

لە ژ6 دا (ترسنۆکی مناڵان)

لە ژ7 دا فڕۆک (تەیارە)

لە ژ9 دا (چاپ) و کەشتی (نۆرماندی)

لە ژ10 دا (چەند کەلیمەیەک لە مێژوی وریابونەوەی ئەڵمان)

بە بۆنەی مردنی جەمیل صدقی زەهاوی یەوە دو وتاری نوسیوە:

لە ژ8 دا (سەربهوردی شاعیری فەیلەسوف جەمیل صدقی زەهاوی) و

لە ژ11 دا (فەیلەسوف مەرحوم جەمیل صدقی زەهاوی). وتاری دوەمی تەرخان کردوە بۆ بیرەوەری خۆی لەگەڵ زەهاوی کە لە شام دیوێتی.

لە ژ7 و 9 دا کانی دو مەتەڵی بەناوی (هەڵهێن) بە شیعر هۆنیوەتەوە و،

لە ژ 11 دا محەمەد جەمیل رۆژبەیانی بە شیعر وەڵامی داوەتەوە.

روناکی هەنـدێ لە پێویسـتیەکانی هەولێـری بـاس کـردوە و، هەنـدێ داواکـاری خسـتۆتە بەر چـاوی کاربەدەستان. بۆنمونە:

لە ژ2 دا لە (زانستی لە شارەکەمان دا بۆچی نەبێ؟) داوا ئەکا خوێندنگەیەکی شەوانە بـۆ لە نـاوبردنی نەخوێندەواری بکرێتەوە. هەر لەو ژمارەیەدا (موعەلیمێک بـۆ مەدرەسـەی متەوەسـیتە) ی نوسـیوە. داوا ئەکـا (مەعاریف) مامۆستایەکی دەرسی (تەبیعیات) بۆ ئەو خوێندنگەیە دابمەزرێنێ.

لە ژ5 یشدا لە (ئاغا دڵ رەنجیدە نەبێ حەقی قسەمە) دا، داوای قیرتاوکردنی شـەقام و ئـاواکردنەوەی باخچەکانی ناو شاری هەولێر ئەکا.

## 3. هەواڵ

### 3. 1. مەتبوعاتی تازە

لە ژ1 دا نوسیوێتی:

"ئومەرای سۆران: لە لایەن حسەین حوزنی موکریانی خێوی چاپخانەی زاری کرمانجی‌یەوە کتێبێک بە ناوی (میرانی سۆران) دوە تازە چاپ کراوە. بە کورتی دیریکی (ئومەرایانی کوردی سـۆران) ە نزیـک 120 لاپەڕەیەکە، کتێبێکی گەلێک سودمەندە."

"کوردستان: لەلایەن موعەلیمی تاریخ و جوغرافیای دەورەی دوەمـی مەدرەسـەی متەوەسـیتەی شـوعبەی ئەدەبی مەداریسەکانی خاکی ئێران علی اصغر شمیم همدانی‌یەوە بە فارسی کتێبێکی بە نـاوی کوردسـتان دوە لە تەورێز چاپ کراوە."

لە ژ2 دا هەواڵی ئەم 3 چاپکراوەی نوسیوە:

"لە چاپخانەی زاری کرمانجی رەواندز بە کـورتی تـاریخ (دیریـک) ی میرانـی سـۆران چـاپ کـراوە. تەئلیفی دیرک نویس حسەین حوزنی دانەیەکی بە 30 فلوسە."

"لە تەلەبەی حقوقی بەغدا لاوێکی کوردی بە کۆشەوە و غەیور جەنابی شاکیر فەتاح کتێبێکی بە کوردی بۆ شاگردانی مەکتەبی ئیبتیدائی تەئلیف کردوە وەکو دەبێژێ چاپ کراوە."

"موعەلیمی مەدرەسەی کۆیە جەنابی سەعید فەهیم (ئەلف و با) یەکی بە کوردی تەئلیف کرد بو، وابزانم بۆ چاپ و نەشری موافەقەت کراوە و لە چاپ دراوە."

لە ژ7 دا نوسیوێتی:

"لەلایەن جەنـابی رەفیـق حیلمـی بەگ مامۆسـتای مەکتەبـی متوەسـیتەی بەغـداوە کتێبێکـی حسـاب لەسـەر نەفەقەی خـۆی چـاپ کـردوە. بـۆ شـاگردانی ریـزی پێـنجەم و شەشـەم گەلێـک بـاش و سـودمەندە ئومێد ئەکەین بە هەوەس و خۆشی زۆر بیکـڕن تـاکو یەک دو تەئلیفـاتی دیـکەش بە دەسـتەوەیە زوبیخـاتە چاپەوە."

"جەنابی فازیل و عالم مەلا محەمەد قزلجی کتێبێکی (چل فەرمودەی پێغەمبەر) ی بە کوردی لە چاپ داوە گەلێک باشە و بە کەڵکە پڕ لە پەند و قسەی چاکە."

### 3. 2. پرسە

لە ژ7 دا لە ژێر سەردێری (زایعاتێکی گەورە لە هەولێر) دا باسـی کـۆچی دوایـی یەکـێ لە کەسـایەتیە ناسراوەکانی هەولێر ئەکا، نوسیوێتی: "لە گەورە و ئەشراف و سەرهاتی مەملەکەتەکەمان حـاجی سـەعید ئاغـا کوڕی تەها ئاغای گەورە ئێوارەی شەمە بە یەزدانی خودا شاد بو، بە راستی جێگەی ئەسەف و عاجزیە، خودا

سەبوری و شەکیبایی بدا بە برا و برازا و خزم و کەسوکار و عائیلە و ئەولادی مەرحوم. ئێمە بە دڵێکی پڕ غەمەوە ئیشتیراکی حوزن و ماتەمی کەسوکاری مەرحوم دەکەین."

لە ژ8 دا مەرسیەیەکی هیجری دەدەی کەرکوکی بڵاوکردۆتەوە کە بە فارسی بە بۆنەی کوشتنی ئیسماعیل بەگی رەواندزیەوە دایناوە. ئیسماعیل بەگ لە نەوەی میرانی سۆران و، گەنجێکی کوردپەروەر و، ماوەیەک نائیب بوە لە پارلەمانی عیراقیدا، بە هۆی ناکۆکیەکی عەشائیریەوە لە رێگەی هەولێر رەواندزدا کوژراوە.

### 3 .3. کۆمەڵایەتی

لە ژ2 دا نوسیوێتی:

"کاسی ئەحمەد چەلەبی دەباغ

"ئەحمەد چەلەبی دەباغ، بۆ موسابەقەی حەرەکاتی ریازە و تەشجیعی روحی ریازە لە زیو کاسێکی دروست کردوە ئەم کۆشەوەی ئەحمەد چەلەبی سوپاسی دەکرێ و شایانی مندەتداری و شوکرانەیە ئومێد دەکرێ گەورەکانی هەولێر هەریەک بە روحێکی موقەدەس و خاوێنەوە پشتیوانی ئەو جۆرە مەشروعانە بفەرمون. هەریەک لەگەڵ مەشروعێکی نیشتمانەکەیان دا خەریک بن زۆری پێ ناچێت خاکە پیرۆزەکەمان گەلێک سەردەکەوێت و رو لە عیمران دەکات."

لە ژ7 دا نەسیوێتی:

"یانەی صەلاحەدین لە بەغدا دەکرێتەوە

"لە لایەن گەورە ناودارەکانی کوردەکانەوە لە بەغدا بۆ کردنەوەی یانەی صەلاحەدین تەقەلا درا و نیزامی ئەساسی ئەو یانەیە لەگەڵ مەزبەتەیەک بە ئیمزای نۆ نائیب و ئەعیانێکەوە رۆژی شەمە 8 ی شوبات تەقدیم بە وەزارەتی داخلیەی جەلیلە کرا و، لەم رۆژانەدا کردنەوەی یانە لەلایەن وەزارەتەوە پەسەند فەرموراوە.

"ئەعیان ئەحمەد بەگ عوسمان، نایبی کەرکوک: دارا بەگ، شێخ فایەق تاڵەبانی، داود بەگی جاف، نایبی هەولێر: مەلا حەوێز ئاغا، میرانی قادر بەگ، حسین ئاغا مەلا، نایبی سلێمانی: حامید بەگی جاف، عەلی کەمال بەگ.

"ئەو کوردە موحتەرەمانە ئیمزایان کردو بەهۆی ئەوان و چەند گەورەیەکی دیکەی کوردەوە تەقدیم کرا ئومێد ئەکەین بەتایبەتی کورد و بەعمومی هەمو عیراقیەک لەو یانەیە سودمەند بن و پایەی یەکەمین بێ خۆشەویستی و یەکەنی لەنێوانی برا عیراقیەکاندا.

" هەرچەند بەراستی گەورەکان بۆ ئەو کارە بەخێرە زۆر ماندوبون و تەقەلایان دا. هەتا هاتە وجود بەڵام وائومێد ئەکرێ ئەو گەورە کوردانە لە روی دامەزراندنی یانە پتر تێبکۆشن بۆ سەرکەوتن و پێش خستنی ئەو یانەیە و لێی ساردنەبنەوە و هەروەکو لە سەرەتادا بە گەرمە پەلەیان کرد بۆ دامەزراندنی لە کردنەوەشیدا پتر هەست بفەرمون بۆ پایەداری راوەستان و بەردەوامی ئەو یانە پیرۆزە کەوا لەرێدا خۆیان ماندو کردو پارەیان تێدا بەخت فەرمو."

لە ژ7 دا هەواڵی گەڕانەوەی (حەجاج) ی نوسیوە:

"لە ئەهالی لیوامان چەند کەسێک کە چوبونە تەوافی (بەیتولڵاهەلحەرام، زادەهولڵاهو ئەلشەرەف) دەستەیەکیان بە سەلامەتی گەیشتنەوە هەولێر، ئەهالی بە دەف و دائیرە، بەشەرەف و ئیحتیرام پێشوازییان کردن، بە شادمانی و کەیف و سرور گەیاندنیانەوە ماڵی خۆیان. خودا حەجیان قبوڵ کا و، لە نێو ماڵ و منداڵیان دا بە خۆشی رای بوێرن. وە حاجیەکانی لە رێگادان بە ساغی و سەلامەتی بیان گەیننەوە ماڵی خۆیان."

### 3. 4. ئاوەدانکردنەوە

لە ژ8 دا چەند هەواڵێکی نوسیوە، لەوانە:

"دایرەی ئەشغاڵی لیواکەمان بۆ قیرەتاو و ڕێکخستنی ڕێگاوبان تێ دەکۆشێ و لە هەمو لایەکەوە خەریکە، ئەگەرچی ڕێگای نێوانی قوشتەپە و پردێ لە باران و تەڕوتوشی دا ڕێبوار توشی ماندوبون و کەمێک ناخۆشی ئەزیەتیش بهاتبانایە، بەڵام بەهیمەتی مولاحیزی ئەشغال و غیرەتکەشی موهەندیسەکان چاک کراوە و، شەورۆژ لەبن چاوەدێرییاندایە بۆ پاککردنەوەی تەقەڵا دەدرێ، ڕێبوار بەبێ ئەزیەت دێن و دەچن."

"دەشتی قەرەچوخ

"هەروەکو لە هێندێک جێگایانمان زانیوە لە زێ وە ئاو بۆ قەرەچوخ و ئەو خاکە پڕ پێز و حاصلاتخێرە ئاودێری کردنی لە دەست دایە. جۆگەیەکی گەورە لە زێ وە هەڵدەگیرێ دەبرێتە دەشتی قەرەچوخ، ئەو خاکە هەمو دەکرێتە ئاوی.

خودا بکات وابێ و دەشتی هەولێر و خوارەوەشی بە ئاوی هەردو زێ ئاوەدان و بخرێتە ریزی ئەو خاکانە کە لە چۆمە گەورەکان ئیستیفادەیان کردوە و چۆمێکیان بۆ هەڵبەستراوە."

"چاڵاوی ئیرتیوازی لە هەولێر

"ئەمە چەندێکە موهەندیسی بەتایبەتی خاکناس لە لایەن ئەشغالەوە ناردراوەتە هەولێر. لە شەرقی شیمالی قەڵای هەولێر چاڵاوێکی 130 ی فوت قوڵی هەڵقەندوە و گەیشتوەتە ئاوێکی باش. وەکو بیستومانە ئەگەر تورومپایەکی گەورەی هەبوایە ئەم چاڵاوە لە مودەتی 24 سەعات دا 600 هەزار گاڵۆن ئاوی دەدا، بەڵام ئەمرۆکە لە 150 کەمتر ئاو نادات و ئێستایش خەریکی هەڵقەندنی چاڵاوێکی دیکەن نزیک 80 فوتیان هەڵقەندوە.

"لە جێگایانی باوەڕ پێ کراومان زانیوە کە 4 چاڵاوی وا هەڵدەقەندرێ تاکو شارەکەمان لە ترسی بێ ئاویی ڕزگار بێ و، بۆ هەفتەی هاتو لە لایەن پیاوە گەورەکانی حکومەتەوە ڕەسمی گوشادی ئەو چاڵاوە دەکرێتەوە و، گەلێک لە گەورە پیاوەکان ئیشتیراکی ئەم ڕەسمی گوشادە دەکەن. لەم مەسئەلەیەدا شوکران و سوپاسی ئەو گەورە پیاوەی دەکەین کە بۆ مەسئەلەی ئاو کۆششی فەرموە."

لە ژ10 دا لەسەر (دوکان و بازاڕی ئەوقاف لە کۆیە) نوسیوێتی:

"لەلایەن سەید هادی مەئموری ئەوقافی کۆیە 64 دوکان و چاپخانەیەک و 4 سەکۆ لە سەر دەستوری تازە بە 475 دینار پێک هێنراوە. لە مانگی ڕەمەزانیساڵی 1354 ی هیجری دا کۆتایی هاتوە. شاعیری بە ناوبانگی کورد فەزیلەتی مەلا مەحمود (بێخود) شعرە جوان و شیرینە خۆشەکانی خوارەوەی پێدا هەڵگوتوە..."

## 4. ڕیپۆرتاج

### 1.4. ئاوی هەولێر

لە ژ2 ی 31 ی تشرینی یەکەمی 1935 دا ریپۆرتاجێکی لەسەر (ئاو و کارێزی هەولێر) نوسیوە:

"ئاو مایەی ژیانی هەمو گیانلەبەر و شینایی و دار و درەخت و خاکە بە جێگا مەعمورەیەک یەعنی (ئاوەدانی) یەک بە کوردی ئاو و دانە سەرەتا ئاویان کردۆتە بناغە بۆ (دانە) و دانە (حبوب) پێ دەگات. کەوا

بو راستە کە ئاو مایەی ژیان و جوانی شار و ئاوایی و زینەتبەخشی دار و درەخت و باغ و باغچەیە و سەبەبی پێ گەیاندنی گیانەوەرانە.

"بەراستی لیواکەمان یەعنی مەرکەزی قەسەبەی هەولێر لە بەر بێ ئاوی جێگای ترس و ئەندێشە و جێگای ئەوە بو لە بیر نەکرێ و هەمو دەمێک خەریکی بین، چونکو هەولێر تەنها کارێزێکی هەیە کە بە کارێزی میری دەناسرێ، ئەو کارێزەش گەیشتبوە ئەوە کە ئەهالی بترسن مەوجودی ئاوی لە هەفتەیەک دا بوبو بە 90 هەزار گاڵۆن و رو لە مزمی بو. ئەو میقدارەش شلوێ و قوڕاو بو.

"بەڵام بە کۆشش و تەقەلای خاوەند دیوانی هیمەت بەرزی خۆشەویستمان، بە مودەتێکی کەم ئاوی کارێزەکە 4 میقدار تەزایدی کرد و گەیشتە پایەیەکی وا کە ئیحتیاجمان دەفع بکات و لەترس و لەرزی وشک بونمان بپارێزێ.

"لەپێش ئەوەدا تەشریف بفەرمونە ئەستەمبوڵ و لە کەنار جۆبارە دڵگوشا و دەورەی گوڵ و گوڵزار و شیناوەردیە رەنگاورەنگە نەخشینەکانی ئەو خاکە دا جامی بلورینی نەشئە بەخشی پڕ لە ئاوی رون و زەلال لەسەر کەفی پیرۆزی دابنێ، هیمەت و غیرەتی فەرمو ئێمەی لە ترسی بێ ئاوی و تینو بون رزگار کرد و گوڵباغ و شیناوەردیەکانی نادی و حەوشەکان لە بێ ئاوی پارازتن و ئەهالیەکەی هەولێری دڵنیا فەرمو ئەوجار بۆ سەفەری خێریان حەرەکەتیان کرد.

"ئەمە هیچ شایانی حیرەت و تەعەجوب نیە کە شارێکی وشکەدێم و بێ ئاوی خاوەند تەنها کارێزێک تینو بمێنێ و لە بەر نەبونی ئاو نیگەرانی بکێشێت.

"بەڵام جێگای ئەسەف و حیرەتە باغچەی بەلەدیەی شارێکی خاوەند 16 کارێزی و کانی لە تینوا وشک ببێ و ماڵەکانی نێو شار تەنگانی بێ ئاوی بکێشن و دار و درەختەکانیان گەڵاڕێزانی تێکەوێ و قرچ هەڵێ و وشکەڵ بێ. ح. ح."

ئەم ریپۆرتاجە لەسەر کێشەیەکی ژیانیی شاری هەولێر، کێشەی کەمئاوی، نوسراوە. بابەتێکی خۆش و بەسودە، جێگەی پەژارە و بایەخ پێ دانی رای گشتیی دانیشتوانە، زمانەکەی رەوان و پاراوە، بەچەند رستەیەکی کەم زانیاریەکی باشی داوە بە خوێندەوار، بەڵام دو کەموکوری تێدا ئەبینرێ:

یەکەمیان:

ستایشی (خاوەند دیوانی هیمەتبەرزی خۆشەویست) یان ئەکا کە پێش ئەوەی بچێ بۆ گەشتی ئەستەمولٚ، کێشەکەی بۆ چارەسەر کردون، کەچی ناوی ناهێنێ.

دوەمیان:

باسی شارێکی تر ئەکا کە 16 کارێز و کانی تێدایە کەچی باخچەی شارەوانیەکەیان وشک بوە، دیسان ناوی ئەم شارەش نابا. بۆ خوێندەواری ئەو زەمانە ئەگەر ئەو کەسە ناسراو و ئەو شارەوانیە زانراو بوبێ، ئەوا بۆ خوێندەواری ئێستا کە ئەو ریپۆرتاجە ئەخوێنێتەوە، نەناسراو و نەزانراون.

### 4. 2. جەژنی خزمەتی وەتەن

لە ژ3 دا لە ژێر سەردێڕی (جەژنی خزمەتی وەتەن) دا نوسیوێتی:

"رۆژی خزمەتی وەتەن

"لە لیوای هەولێر

"رۆژی چواشەمو 30 ی تشرینی یەک مەئموران و ئەشراف و شورتە و جەیش و گەورەکان لە نادی هەولێر کۆبونەوە، کەشافەی مەکتەب و شاگردەکان لە لایەکەوە بەشەرقی وەتەنی گوتن راوەستان و، ئیرادەی

مەلەکی بۆ فەحسی نیهائی خوێندرایەوە. سەعادەتی موتەسەریفی غەیور ئەحمەد بەگ، بۆ خزمەتی عیلم و عیرفان و بۆ بەخێوکردنی وەتەن و بونە جوندی، خوتبەیەکی گەلێک بەرز و بە مەعنای خوێندەوە. ئەو رۆژە بۆ هەولێر رۆژێکی گەورە و میهر گیان و جەژنێکی زل و خۆشەویست بو.

"کۆی سنجاق

"رۆژی پێنجشەمە 31 ی تشرینی یەکەم سەعادەتی موتەسەریفی خۆشەویستمان بۆ ئیشتیراکی جەژنی وەتەنی تەشریفیان چونە کۆیەو لەژێر چاودێریاندا ئیرادەی ملکی دائیر بە فەحسی نیهائی خوێندرایەوە، لەلایەن بەعزێ ئەشخاسەوەش خوتبە خوێنراو نوتق درا."

"رواندز

رۆژی شەمە 9 ی تشرینی دوەم سبینە سەعات 10 لەبەر دەرکی مەکتەبی رواندز سەعادەتی قایم مەقام مراد بەگ و سریەک جەیش و دەستەیەک شورتی و ئەشراف و عولەمای شار و مەئمورانی قەزا و منداڵی مەکتەب کۆبونەوە، لە لایەن زابتی تەجنیدەوە ئیرادەی مەلەکی دائیر بە فەحسی نیهائی خوێندرایەوە، لەدوای ئەو سەعادەتی قایم مەقام نوتقێکی دا.

"مدیری مەکتەب فوئاد ئەفەندی خوتبەیەکی خوێندەوە، لەپاش ئەو منداڵێکی شاگردی مەکتەب بە دڵسۆزی نوتقێکی خوێندەوە، لەدوای ئەو مودەریس عەبدولکەریم ئەفەندیش بە عەرەبی خوتبەیەکی دورودرێژی خوێندەوە."

### 4. 3. سەردانی وەزیری ناوخۆ لە هەولێر

لە ژ4 دا ریپۆرتاجێکی لەسەر (تەشریف هێنانی وەزیری داخلیە بۆ هەولێر) بەمجۆرە نوسیوە:

"رۆژی شەمو 14 ی مانگی ئێستا سەعات 11 زەوالی سەعادەتی موتەسەریفی لیوا و رونەسای دەوائیر و ئەشراف و عولەما و مەشایخی شار و روئەسای عەشایری لیوا لە مەرکەزی لیواوە، بۆ پێشوازی فەخامەتی وەزیر رەشید عالی بەگ گەیلانی بۆ پردێ کە مونتەهای لیواکەمانە حەرەکەتیان فەرمو. سەعات دوازدە و نیوی زەوالی فەخامەتمەئابیان لە کەرکوکەوە مواسەلەتی پردێیان کرد.

زەواتی موحتەرەمینی موستەقبیلین بە کەمالی سرور و فەرەحەوە مەراسیمی پێشوازییان بەجێ هێنا. لەبەر ئەوە کە عمومی ئەهالی لیواکەمان ئومێدێکی زۆر قەوییان بە وەزارەتی حازرە هەیە کە بۆ تەرەقی مەعاریف و علوم و ئیقتیسادیات و ئیحتیاجیات و ئاوەدانی کردنەوەی مەملەکەتەکەمان بۆ ئاو هێنان و پێش خستنی تیجارەت و زراعەت لوتف بفەرمون، چونکە ئەم وەزارەتی موحتەرەمە موتەشەکیلە لە چوار زاتی باریزەی دەوڵەت، کە فەخامەتمەئابانی یاسین پاشا هاشمی و نوری پاشا سەعید و جەعفەر پاشا عەسکەری و رەشید عالی بەگ گەیلانیین کە هەر چواریان بە رەئیس ئەلوەزارەتی خزمەتی حکومەت و میلەتیان بە نیەتێکی خاوێنەوە بەجێ هێناوە و بەتایبەتی فەخامەتی رەشید عالی بەگ لە ئەجدادیەوە رابیتەیەکی کولیەی لەگەڵ کوردستان دایە، لە مەرحوم شێخ عەبدولعەزیزی ئاکرەوە خزمەتی ئەم میلەتە نەجیبەیان کردوە.

"میلەتی کورد پتر مەربوتیەتی روحانییان بە عایلەیی موقەدەسی گەیلانییەوەیە، هەروەکو میلەتی کورد پتر مەربوتیەتیان بەو عایلەوەیە و فەخامەتی رەشید عالی بەگ گەیلانی کە لەم سولالەی پاکەیە ئومێدەوارترن کە بە سونەتی ئابائو ئەجدادی خۆیان بە دڵێکی خاوێنەوە بۆ بەجێ هێنانی ئیحتیاجات و پێویستی دانیشتوانی ئەم وەتەنە خۆشەویستە کە کوردن هیمەت و جوهد بفەرموێت، بەو ئومێدە عمومی ئەهالی هەولێر

بە ئەسنافی موختەلیفەیەوە دەستە بە دەستە لە شاردا بۆ پێشوازی فەخامەت مەئابیان ئامادە و بە کەمالی سرورەوە چاوەنۆڕ بون.

"کەشافەی مەکتەب لە خاریجی شارەوە بە ریز بۆ رەسمی بەخێرهاتن بە نەشید خوێندنەوە و کەیف و سرور ریز بوبون، لە تەرەف ئامری حامیەوە حەرەسی شەرەف لەبەر دەرگای سەرادا راگیرا بون.

"فەخامەتی وەزیر و زەواتی موحترەمینی موستەقبیلین لە پردێ وە رو بە هەولێر حەرەکەتیان فەرمو. بە کەیف و شادمانی و سرورەوە گەیشتنە شار تەلەبەی مەکتەب و کەشافە رەسمی بەخێر هاتنیان بەجێ هێنا.

"فەخامەتی وەزیر بە ئەحواڵ پرسینی تەلەبە و ئەهالی روبەسەرا چون، لە هەمو لایەکەوە ئەهالی بە دەنگی هەر بژی وەزارەتی حازرە و فەخامەتی وەزیر کەیفیان کرد، لەپاش گەیشتنی فەخامەتی وەزیر بۆ سەرا عمومی عولەما و مەشایخ و ئەشراف و روئەسای عەشایر بە دەستە چونەلای فەخامەتی وەزیر و عەرزی بەخێرهاتن و ئیزهاری ئیخلاسمەندیان بۆ وەزارەتی حازرە کرد و گەڕانەوە.

"لەبەر ئەوە کە موتەسەریفی لیوا ئیحتیاجاتی میلەتی لە هەمو کەس چاکتر دەزانی و لە هەمو شئونێکا مەسئولە و چاکە و خراپەی وەتەن و میلەت لەو دەناسرێ و هەمو مەسائیلێکی لیوامان لە عوهدەی ئەودایە، ئومێدمان وایە بە ویجدانی خاوێن و نیەتێکی پاکەوە فەریزەی زیمەتی بەجێ هێنابێ و، فەخامەتی وەزیری لە هەمو ئیحتیاجاتێکمان ئاگادار کردبێ و پێی گوتبێ.

"شەوێ لە قەسری موتەسەریف بون. سبەینێ رۆژی یەک شەمە سەعات نۆی زەوالی پێش نیوەڕۆ هەمو ئەشراف و موحتەرەمینی شار و روئەسای عەشایرەکان بۆ بەڕێ کردنی فەخامەتی وەزیر هەتا گوێر بە بەزوک چون، عەشایرو روئەسای قەزای مەخمور بە دەستورێکی موحتەشەم بە سواری لە خاریجی مەرکەزی ناحیەی گوێر بۆ پێشوازی هەتا سەر زێ ریزیان بەستوە، فەخامەتی وەزیریان بە کەمالی سرورەوە بەڕێ کرد هەتا بە لیوای موصڵیان گەیاند."

## 5. لە روی هونەری رۆژنامەوانییەوە

ناوی گۆڤارەکە بە خەتێکی جوان، لەسەر زنجیرەیەک شاخ کە خۆری لێ هاتوتە دەر، نوسراوە.

لە لاپەڕەی یەکەمی بەرگی هەمو ژمارەکانیدا، فەهرستی ناوەرۆکی گۆڤارەکە نوسراوە. لە ژ7 ەوە لە بری وشەی فەهرست، پێرستی بەکارهێناوە.

هەمو لاپەڕەیەکی 3 ستونی تێدا نوسراوە. سەردێڕی وتارەکان بە حەرفی جیاواز و درشت چاپ کراون. زۆر کەم پێڕەوی خاڵبەندی کراوە. وێنەی فۆتۆگراف یا دەسکرد و کاریکاتۆری تێدا نیە. بابەتەکانی تا رادەیەک پۆلێن کراون. هەندێ گۆشەی دوبارە بۆتەوە.

## 6. شوێنی لە مێژوی رۆژنامەوانیی کوردیدا

ئەگەرچی هەولێر شارێکی زۆر کۆنە کە بە درێژایی زەمان بە ئاوەدانی مابێتەوە، لە چاو زۆر شوێنی دەوروپشتیدا هەمیشە ئارام و ئاسایشی تێدا بوە، دانیشتوانی قەڵاکەی زانا و رۆشنبیر و دەوڵەمەن و کاربەدەستیان تێدا هەڵکەوتوە، کەچی هەندێ لە نیشانەکانی شارستانێتی و پێشکەوتن، لەوانە چاپ و رۆژنامەوانی، درەنگتر گەیشتونەتە ئەوێ.

دانیشتوانی ئەسڵی هەولێر لەو سەردەمەدا بەزۆری بە تورکمانی دواون. پێیان وابوە تورکمانی زمانی ئەریستۆکراتیی پێشکەوتوی شار و، کوردی زمانی کرمانجی دواکەوتوی لادێییە. بۆیە گرنگی روناکی بە تەنیا هەر لەوەدا نیە کە یەکەم گۆڤاری کوردی یان یەکەم بڵاوکراوەی کوردییە لە نیوەی یەکەمی سەدەی

بیستەمیندا لەشاری هەولێر دا دەردەچوبێ، بەڵکو لەوەدایە لەناو دانیشتوانی هەولێردا (ئیعتیباری) بۆ زمانی کوردی، وەکو زمانێکی پێشکەوتوی خوێندن و نوسین، گێڕایەوە.

**تێبینی:**

د. کوردستان موکریانی وێنەی هەمو ژمارەکانی روناکی لە هەولێر بە پێشەکی و لێدوانەوە سەرلەنوێ چاپ کردۆتەوە.

## سەرەتا:

بەر لە ئیستا (مەبەست ساڵی 2004 ە) بـە چەنـد مـانگێ ئـەبو بـەرگی سـێیەم کـە مێـژوی ساڵانی 1938- 1958 ی رۆژنامـەوانی کـوردی ئەگرێتـەوە برۆیشـتایەتە ژێـر چـاپ و رێی بڵاوبونـەوەی نـاو خەڵکی بگرتایە، بەڵام روداوە سیاسی‌یە بومەلەرزە ئاساکانی ناوچەکـە نۆبـەبڕێی لـێ کـرد و، دوای خسـت. دواکەوتنەکە خێری پێوە بو. سەرچاوەی نوێی هاتە سەر و، ئاسۆیەکی فراوانتری بڵاوبونـەوەی لـە بـەردەمدا کرایەوە.

بەشی یەکەمی بەرگی سێیەم تەرخان کراوە بۆ رۆژنامەوانی‌ی نهێنی‌ی کوردی. رەنگە بە پەرت و بڵاوی لەم رۆژنامە و لەو گۆڤاردا جاروبار لێدوانێ، پەراوێزێ، یا کورتە باسـێ سـەبارەت بـە بڵاوکراوەیـەکی نهێنـی نوسرا بێ، بەڵام رەنگە ئەمە یەکەمین لێکۆڵینەوەی سەربەخۆ و فراوان بێ لەم بوارەدا. دڵنیام بـێ کـەموکوڕی نیە و، لە هەندێ جێگەدا بێتام و خام نیە، بەڵام ئەمە بەشێکە لە مێژوی گەلەکـەمان: مێـژوی سیاسـی، فیکـری، رۆشنبیری، کۆمەڵایەتی، ئابوری...

ساڵی 1939 لە مێژوی مرۆڤایەتی‌دا ساڵێکی شوم و سامناکە. هەمو نیشانەکان بەرەو ئەوە ئەچون کە هەلومەرجی سیاسی دنیا ئاڵۆز و تاریک و بە خێرایی بەرەو دۆزەخی جەنگ خلۆر ببێتەوە.

گۆڤاری گەلاوێژ لەو بارودۆخەدا هاتە کایەوە. یەکەمین ژمارەی لە کانونی یەکـەمی 1939 دەرچـوە و تا ئابی 1949 بەردەوام بوە. هاوزەمانی روداوەکانی جەنگ بوە. لە ژ8 ی س1 ی تەموزی 1940 دا، واتـە لە گەرمەی روداوەکانی جەنگەکەدا چیرۆکێکی لە بارەی چاپ و پەخشی رۆژنامەیەکی شۆڕشگێڕ بـە نهێنـی و دور لە چاوی پۆلیس بڵاوکردۆتەوە.

بە چاکم زانی سەرەتای ئەم کتێبە کە بۆ رۆژنامەوانی‌ی نهێنی‌ی کوردی تـەرخان کـراوە بـەم چیرۆکـە دەس پێ بکەم. ئاخۆ مێژوی رۆژنامەوانی‌ی نهێنی‌ی کوردی چەنـدە سەرگروشـتە و چیرۆکـی تایبـەتی خـۆی هەبێ؟

### رۆژنامە نهێنی‌یەکەی پلسودسکی

نوسینی: ولیام جونەس

لە رۆژێکی هاوینی 1893 دا کۆمەڵێکی بچوک لـە نیشـتمان پەرسـتەکانی پۆلۆنیـا زۆر بەدزیـەوە لـە یەکێ لە بێشە گەورەکانی نزیک ڤیلنادا کۆبونەوە. ئەمانە ئەندامی پارتی سۆسیالیستی یاسـاغکراوی پولەنـدە بون. نیازیان لە گردبونەوە قسە لەسەرکردن و تەگبیری دەرهێنانی رۆژنامەیەکی سۆسیالیسـتی بـو کـە بیـری سۆسیالیستی پێ بڵاوبکەنەوە لەناو کرێکارە پۆڵەندییەکانا. لەو وەختەدا ئیشێکی وا تا بڵێیت بە ترس و پـڕ خەتەر بو، سانسۆری روس زۆر بەتونگی ئیشی ئەکردو مەیدانی بڵاوکردنـەوەی چ رۆژنامەیـەکی پۆڵەنـدەیی نەئەدا و، ئەم چەشنە تەقەلایە جورمێکی زۆر گەورە بو بە پێی قـانون. سـەرای ئـەم هـەمو قۆرتانـە یـەکێ لـە گەنجە شۆڕشگێڕەکان، هاوڕێ ڤیکتۆر، ئەم فرمانە سەختە پڕ مەترسییەی گرتە ئەسـتۆی خـۆی و دای نـا کـە (روبوتنک- کرێکار) دەربهێنێ.

گورج لە دوای ئەم کۆبونەوەیە هاوڕێ ڤیکتۆر، کە زۆر لـە هـاوڕێ شۆڕشـگێڕەکانی هـەر بـەم نـاوەوە ئەیان ناسی، کەوتە تەقەلای ڕێکخستنی کاروباری دەرهێنانی ڕۆژنامەکە. خەڵکی لە مان ئاگادارتر و شارەزاتر ئەیان زانی کە ناوی فیکتۆر (دابرووویسکی) یە، بەڵام هەرگیز نەیان ئەزانی کە ناوی ڕاسـتی ئـەم بڵاوکـەرەوەو و، لەچاپدەر و نوسەر و دەرهێنەرە، جوزیف پلسودیسکی‌یە. هەروەها کەسیشیان ئەو مەتەڵەیان هەڵنەهێنا کـە چۆن بە قاچاغی مەکینەیەکی چاپی لە سنور پەڕانۆتەوە. هاوڕێی پۆڵەندیی کە لە لەندەن بون چاپێکی سـادەی بچوکیان بۆ نارد بو، بەڵام چۆن ئەمە گەیشتە پۆڵۆنیا، تا ئێستە کەس ئەمـەی وەرام نەداوەتـەوە. چاپەکـەیان ئەوەندە بەدڵ نەبو و، شۆڕشگێڕی لەم ئیشانەدا ئالیکاریان بە گومان بون لەوەی ئەم چاپە بە کـەڵکی نیـاز و ئامانجی ئەمان بێت. بەڵام هاوڕێ ڤیکتۆر لەوانە نەبو هیچ قۆرتێ لە ڕێی خۆی لای بدا.

لە ڤیلنا ناسیاوی لە گەڵ کیمیاگەرێکا پەیا کرد کە ناوی کازمیر پارنیوسکی بـو، ئـەم پیـاوە نیشـتمان پەرستێکی زۆر گەرم بـو و ئامـادە بـو کـە بەشـێکی زۆری دەوڵەتـە زۆرەکـەی فیـدا بکـات لـەڕێی یارمـەتی دۆستەکەیا. پارنیوسکی ئەجزاخانەیەکی، بە ناو، لە دێی بچوکی لینیسـکی‌دا دانـا، کـە نزیکـەی 20 میـل لـە نزیکترین ڕێی ئاسنەوە دور بو. وایان دانا کە ڕۆژنامەکە لێرە لە چاپ بدرێت، چونکە وایان بیر کردەوە کـە لە شوێنێکی وا دور لە ئاوەدانی دا کەس ئەوەی بە بیرا نایەت شوێن پێی کارێکی شۆڕشگێڕی هەڵگرێ.

لەپێنج ساڵی نەفی سیبیریایا، پلسودسکی، فێری گەلێ ئیش و کاری بەکەڵک بوبو بەڵام چاپ کردنـی ڕۆژنامەیە شارەزاییەکی تەواو و زانینێکی تایبەتی ئەویست، بۆیە بۆ یارمـەتی ئالیکارێـک وەکـو ڕۆژی ڕەش داما بو. کە والدیسلاوە گلوواسکی تایپۆگرافەر (Typographer) ی دۆزیەوە لە ناو خۆیانـا دایـان نـا کـە گلوواسکی ئەبێ لە ئەجزاخانەکە بژی.

لە 12 ی تەموزی 1894 دا یەکەم ژمارەی (روبوتنک) دەرچو، بە تایبەتی بچوکیان دەرهێنا بۆ ئەوەی بتوانرێ بە ئاسانی بـە دزیـەوە بـڵاو بکرێتـەوە بـێ ئـەوەی گومـانی پـۆلیس و جاسوسـی زۆری حکومـەت بوروژێنن. پلسودسکی سەرەڕای سەرپەرشتی کردن و نوسینی ڕۆژنامەکە کاروباری بڵاوکردنەوەشـی گرتبـوە ئەستۆی خۆی. لەمەدا پێویستی بە یارمەتی زۆر کـەس بـو، بەتایبـەتی هـی ژن کـە ئـەتوانن ژمارەیـەکی زۆر هەڵگرن بێ ئەوەی پێ بزانرێ.

پلسودسکی هەرچەندە زۆر زو ئەهاتە لینیسکی بۆ سەردانی چاپەکەی بەڵام ئەوەندە خـەریکی نوسـین بو نەی پەرژا کە هەستی ئەوە بکات کەوا گلووالسکی حەزی لە کارەکەری کابرای کیمیاگەر کردوە و، بـە خـۆ هەڵکێشانەوە باسی ئەو کارە نهێنی‌یەی بۆ کردوە کە لە ژوری پشت ئەجزاخانەکە دا ئەی بینی. ئەمـە کچـەی خستبوە سەر هەلەکە سەمایە کە وەختە بو بەجارێ نەک هەر فرمانەکەی پلسودسکی پەک بخا سـەری خۆشـی تیا لەناو بەرێت. پلسودسکی لە پاش گەلێ دەردی سەری توانی گلوواسکی لاس بدا کە کچەکە مـارە بکـات و بیبا بۆ ئۆرال و بەمە دەمکوتی بکەن.

دوای ئەمە پلسودسکی چاپەکەی گواستەوە بـۆ ڤیلنـا و لـەوێ چـوار سـاڵ بـێ وەسـتان ڕۆژنامەکـەی دەرکرد. قۆرتی هەرە گەورە لە ڕێی هاوڕێ ڤیکتۆردا کاغەز کڕین بو، چونکە هەرچی جەندرمە هەیـە ئاگـادار کرابون لەوە کە ڕۆژنامەیەکی نهێنی لە پۆڵاندە دەرئەچێ کاغەزێکی زۆر پێویست بو بۆ دەرکردنی (روبوتـک) کە لەم دواییەدا 35000 دانەی دوانزە لاپەڕەیی لێ بڵاو ئەکرایەوە. هاوڕێ ڤیکتۆر و هاوکارەکانی ڕۆژی 16 تا 18 سەعات ئیشیان ئەکرد، لە گەڵ ئەوەشا چاپکردنی نوسخەیەک ئیشی نزیکـەی دومـانگی ئەویسـت. لـە 1899 دا کە زۆر لـە یاریـدەرەکانی گیـران، پلسودسـکی چاپەکـەی گواسـتەوە (لـودز) بـۆ ئـەوەی خـۆی و فرمانەکەی لە ترس دورتر خاتەوە، کەچی بۆ بەدبـەختی، لـەم شـارە زلـە پـڕ کارخانـە و فابریقەیـەدا بـو کـە پلسودسکی کەوتە داوی پولیسەوە.

ڕۆژێک یەکێ لە یاریەدەرە هەرە چاکەکانی هەندێ کاغەز ئەکڕێ، ئەگەرچی میقدارێکی کـەمیش ئـەبێ، جەندرمە دوی ئەکەوێت، تا ئەیکا بە ماڵی پلسودسکیدا و لە سەری ڕائەوەستێ تا ئـەبینێ بـە دەسـتی بـەتاڵ دێتە دەرەوە.

لەپاش سەعاتێ ئەم ئەگیرێ و، شەوێ پلسودسکی و ژنەکەی لە دەنگی پێی پۆلیس و جەندرمـە راسـت ئەبنەوە لەخەو کەوا خەریک ئەبن بێنە ژوری نوستنیانەوە. راکردن لە توانادا نابێت چونکە چەند پۆلیسێک و قۆمیسەرێک بە دەمانچەوە تاقە درگـای ژورەکـەی لـێ ئـەگرن ئینجـا دەسـتی ئەکەنـە کەلەپچـەوە و خـۆی و چاپەکەی ئەبەنە پۆلیسخانە.

ئەمە داستانی قارەمانی ڕۆژنامەکەیە.

گۆڤاری (گەلاوێژ) کە ئەم بابەتەی بڵاوکردۆتەوە، ئـەگونجێ بابەتەکـە بـە چیرۆکێکـی سـادە، یـان بـە وتـارێکی ئـەدەبی یـان بـە گێڕانـەوەی هـەواڵێکی سیاسـی راسـتەقینە دابنـرێ، بـەڵام بخرێتـە خانـەی هـەر کامێکیانەوە، بۆ خوێندەواری ئەوسای کورد، بە تایبەتی بۆ ئەوانەی خەریک یا بـە تـەمای خـەباتی سیاسـی- شۆڕشگێڕانە بون، دەرسێکی گرنگ بوە.

فێربون لە تەجروبەی گەلانەوە هەمیشە سەرچاوەیەکی گرنگ و دەوڵەمەنی فێربونی دەرسی تازە بـوە. ئەم وەرگێڕانەی گەلاوێژ یش هەروا ڕێکەوت و بۆ سەرگەرمی نەبوە، بەڵکو ئەبێ مەبەستێکی سیاسی هەبوبێ، ئەگەرچی نە لەو کاتەدا و، نە دواتریش تا ساڵانێکی درێژ، تێکۆشەرانی کورد نـەیانتوانی تەجروبەیـەکی لـەو بابەتە لە بواری ڕۆژنامەوانیی کوردیدا ئەنجام بدەن. بەڵام زۆری نەخایاند ڕۆژی ڕۆژنامـەوانیی نهێنـیی چاپکراوی کوردی بۆ یەکەم جار لە کوردستانی ئێران هەڵات. بە دوای ئەویشدا لە کوردستانی عیراق سـەری دەرهێنا و، ئیبراهیم ئەحمەد خاوەنی ئیمتیازی گـەلاوێژ خـۆی بـو بـە یـەکێ لـە هـەرە چالاکـەکانی مەیـدانی ڕۆژنامەوانیی نهێنی.

## دوەمین جەنگی جیهانی و ڕۆژنامەوانیی کوردی

یەکەمین جەنگی جیهانی بە تێشکان و خۆ بەدەستەوەدانی ئەڵمانیا بڕایەوە. دەوڵەتانی براوەی جەنگ مەرجی قورس و گرانباریان بە سەر ئەڵمانیادا سەپاند. بە تایبەتی سەبارەت بە بژاردنی زیانـەکانی جـەنگ و کەمکردنەوەی چەک و هێزە چەکدارەکانی.

ساڵی 1929 تەنگوچەڵەمەیەکی سەختی ئابوری سەرانسەری دنیـای داگـرت. بـاری ئـابوریی زۆر لـە وڵاتان خراپتر بو، لەوانە ئەڵمانیا و ئیتالیا. ئەمەش زەمینەی زیاتر خۆش کرد بـۆ گەشـەکردنی بیروبـاوەڕی نازی لە ئەڵمانیا و فاشی لە ئیتالیا. لە یابان یـش نەزعـەی عەسـکەری زاڵ بوبـو. ئەیویسـت لەسـەر حسـابی ئەرزی دراوسێکانی قەڵەمڕەویی دەسەڵاتی فراوان بکات. ئەم دەوڵەتانە بە ئاشـکرا دوژمنایـەتی کۆمـۆنیزم و یەکێتیی سۆڤێتیان ئەکرد کە، دوژمنی هەرە گەورەی وڵاتانی سەرمایەداری بون. لە بەرامبەر ئـەوەدا وڵاتـانی ئیمپریالیستی چاوپۆشییان لە توندڕەوی و دەسدرێژییەکانیان ئەکرد.

ساڵی 1933 هیتلەر، پێشەوای پارتی نەتەوەیی سۆسیالیست (نازی) لە ئەڵمانیا دەسەڵاتی گرتـە دەس و بێ ئەوەی گوێ بداتە بەندەکانی خۆبەدەستەوەدان سەبارەت بە دروستکردنی چەک و دیاریکردنی ژمـارەی هێزەکانی، کەوتەوە ڕێکخستنەوەی سپای ئەڵمانی.

ساڵی 1935- 1936 مۆسۆلینی، پێشەوای پارتی فاشی کە، چەنـد سـاڵێ بـو لـە ئیتالیـا دەسـەڵاتی گرتبوە دەس، لە ئەفەریقا پەلاماری ئیسیوبیای دا.

ساڵی 1936- 1939 جەنگی ئەهلی لە ئیسپانیا هەڵگیرسا. جەنەراڵ فرانکۆ و فاشی‌یەکان حوکمیان گرتە دەس.

لە ئازاری 1938 دا هیتلەر، کە خۆی بە ڕێچەڵەک نەمسایی بو، نەمسای گرت و لکاندی بە ئەڵمانیاوە.

لە ئازاری 1939 یش‌دا چیکۆسلۆفاکیای گرت و ئیتالیا یش ئەلبانیای داگیر کرد.

لەم شەڕانەدا ئەڵمانیا بەهۆی تانک و فڕۆکەوە تاکتیکی نوێی جەنگی بەکارئەهێنا کە بە جەنگی بروسکە ئاسا یان بە جەنگی خێرا ناو ئەبرا.

بریتانیا و فەرەنسە بەرامبەر سیاسەتی فراوانخوازانەی ئەڵمانیا کەوتنە سڵەمینەوە و پەژارەوە.

گرژیی نێوان دەوڵەتان تا ئەهات زیادی ئەکرد و قوڵتر ئەبو. ڕێکخراوی کۆمەڵەی گەلان کە دوای یەکەمین جەنگی جیهانی بۆ بەلادا خستنی کێشەکانی نێوان وڵاتانی دنیا دامەزرابو، نەیتوانی هیچ کام لە کێشەکانی نێوان ئەو وڵاتانە چارەسەر بکا. یەکێتی‌ی سۆڤێت سەرەڕای هەمو ناکۆکی‌یە ئایدۆلۆجی‌یەکانی لە گەڵ ئەڵمانیای نازی، بۆ ئەوەی شەڕ لە خۆی دور بخاتەوە، ڕێکەوتننامەیەکی دەسدرێژی نەکردنە سەر یەکی لە گەڵ مۆر کرد.

لە 1 ی 9 ی 1939 دا ئەڵمانیا پەلاماری پۆڵۆنیای‌دا و داگیری کرد. ئەمە بو بە سەرەتای هەڵگیرسانی دوەمین جەنگی جیهانی. چونکە ئیتر ئیتالیا و فەرەنسە لەوە زیاتر لە وزەیان‌دا نەما بێدەنگ، وەکو تەماشاکەری ڕوداوەکان ڕابوەستن. بۆ ڕاگرتنی پەلهاویشتنی فراوانخوازانەی ئەڵمانیا، جەنگیان لە دژی ڕاگەیاند. بە دوای ئەوانیش‌دا ئەندامانی کۆمۆن وێڵس.

لە 9 ی 4 ی 1940 دا ئەڵمانیا پەلاماری دانیمارک و نەرویجی دا و لە 10 ی 5 ی 1940 دا پەلاماری لۆکسەمبۆرگ و هۆڵەندا و بەلجیکی دا و، هێزەکانی بەرەو دیواری ماجینۆ پێشڕەوی‌یان کرد و، گەیشتنە سەر کانالی ئینگلیزی. ئینگلیز ناچار بو هێزەکانی لە دنکرک بکێشێتەوە. فەرەنسە (هودنە) ی لە گەڵ ئەڵمانیا کرد و مارشال پیتان حکومەتێکی دەسنێژی ئەڵمانیای لە پاریس پێکهێنا.

لە 10 ی 6 ی 1940 دا ئیتالیا دایە پاڵ ئەڵمانیا و پێکەوە هێرشیان کردە سەر شوێنەکانی سپای بریتانی لە سەروی ئەفەریقا و لە یۆنان.

لە کۆتایی 1940 دا هەنگاریا و ڕۆمانیا و بولگاریا دایانە پاڵ ئەڵمانیا و، لە 22 ی 6 ی 1941 دا ئەڵمانیا بە یارمەتی ئیتالیا، هەنگاریا، سلۆڤاکیا، فینلەندە هەڵی کوتایە سەر یەکێتی‌ی سۆڤێت و، یەکێتی‌ی سۆڤێتیش تێکەڵاوی جەنگەکە بو.

وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا سەرەتا پێڕەوی سیاسەتی بێلایەنی ئەکر. بەڵام لە لایەکەوە مەترسی هەرەسهێنانی بریتانیا و، لە لایەکی ترەوە هێرشی لە ناکاوی یابان بۆ سەر بنکەی جەنگیی بێرل هاربەری ئەمەریکی، ئەمەریکای خستە ناو جەنگەی شەڕەوە.

دەوڵەتانی دنیا ئیتر بە کردەوە دابەش بوبون بەسەر دو بەرەدا. بەرەی هاوپەیمانەکان: بریتانیا، ئەمەریکا، یەکێتی‌ی سۆڤێت و لایەنگرەکانیان... و، بەرەی تەوەرە: ئەڵمانیا، ئیتالیا، یابان و لایەنگرەکانیان...

هەردو لایەنی جەنگ هەوڵیان ئەدا ڕاگەیاندن وەکو یەکێ لە چەکە کاریگەرەکانی جەنگی سایکۆلۆجی و جەنگی پڕوپاگەندە بۆ بەرزکردنەوەی ورە (مۆراڵ) ی ڕیزەکانی ناو خۆی و شکاندنی ورەی هێزەکانی دوژمن و بردنەوەی جەنگ بەکار بهێنن. لەوانە: هەمو هۆیەکانی بیستن و بینن و خوێندن، کە هەندێکیان زۆر لە مێژ نەبو داهێنرابون.

لەم جەنگە جیهانگیرەدا دەوڵەتانی ناوچەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بە تایبەتی ئەوانەیان کە بەشێکی نەتەوەی کوردیان تێدا بو، هەڵوێستان جیاواز بو:

## عیراق

هەلومەرجی عیراق هەر لە سەرەتای دامەزراندنیەوە لە ساڵی 1921 دا جیاواز بوە لە دەوڵەتانی دراوسێ. کورد، بەر لە دامەزراندنی دەوڵەتی عیراق، حوکمداری کوردستان و دواتر حکومەتی کوردستانی جنوبی دامەزراند و، زمانی کوردی لە بەشێکی کوردستاندا بوبو بە زمانی رەسمی و گۆڤار و رۆژنامەی پێ دەر ئەکرا.

بەر لە هەڵگیرسانی دوەمین جەنگی جیهانی، چەندین رۆژنامە، گۆڤار و کتێب بە زمانی کوردی دەرچو بون و، لە 1931 وە بە پێی (قانون اللغات المحلية) زمانی کوردی بوبو بە زمانی رەسمیی خوێندن و دادگا و دائیرەکانی حکومەت. لە سلێمانی رۆژنامەی (ژین) و، بەر لە جەنگ بە چەند مانگێ لە بەغدا گۆڤاری (گەلاوێژ) دەرئەچو.

بریتانیای گەورە، کە تا ئەودەم گەورەترین زلهێزی دنیا و یەکەم دەسرۆشتوی ناو عیراق بو، ئەو یش کەوتە بەکارهێنانی زمانی کوردی لە بەشێکی گرنگی راگەیاندنی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا:

لە بەغدا، بە هاوکاریی تۆفیق وەهبی بەگ و حسێن حوزنی موکریانی کەوتە دەرکردنی گۆڤاری مانگانەی (دەنگی گێتیی تازە).

لە یافا (فەلەستینی ئەوسا)، بە هاوکاریی گۆران، رەفیق چالاک و رەمزی قەزاز کەوتە بڵاوکردنەوەی بەرنامەی کوردی (رادیۆی کوردستان).

دەنگی گێتیی تازە و رادیۆی کوردستان، هەردوکیان بەشێ بون لە دەزگای زەبەلاحی پرۆپاگەندەی جەنگیی دەوڵەتی بریتانیای گەورە. لە گەڵ کۆتایی دوەمین جەنگی جیهانیدا بریتانیا پێویستی پێیان نەما. لە بەر ئەوە هەردوکیانی راگرت.

## ئێران

لە دوەمین جەنگی جیهانیدا ئەگەرچی بە رواڵەت بێ لایەنی راگەیاند بەڵام چالاکی بە قازانجی دەوڵەتانی تەوەرە، بە تایبەتی بە قازانجی ئەڵمانیا، لە ناو ئێراندا لە زیادبوندا بو. هاوپەیمانەکان ئەم مەترسییەیان کرد بە بیانو، بۆ ئەوەی رێگەی لۆجستیکیی نیوان یەکێتیی سۆڤێت و خەلیج دابین بکەن، لە لای سەرویەوە لەشکری سۆڤێت و لە لای خوارویەوە لەشکری ئینگلیز، پەلاماری ئێرانیان داو بێ بەرگریکردنیان رەزا شا یان ناچار کرد، بە قازانجی محەمەدی کوڕی دەست لە تەختی شایەتی هەڵبگرێ.

لەو ماوەیەدا بواری جۆرێ لە ئازادیی سیاسی و رۆژنامەوانیی لەسەرانسەری ئێراندا پەیدابو. لە تاران و هەندێ لە شارەکانی تر دەیان رۆژنامەو گۆڤاری ئازاد دەرچون. بەڵام هیچ رۆژنامە یا گۆڤار یا بڵاوکراوە نە لە تاران و نە لە هیچ شارێکی تر، بە موافەقەتی حکومەتی ناوەندیی تاران، بە زمانی کوردی دەر نەچوە.

ئەبێ هۆی ئەمە چی بێ؟

ئاخۆ قانونەکانی ئێران رێگەی دەرچونی چاپکراویان بە زمانی کوردی نەداوە؟

ئاخۆ هیچ کەس و تاقمێکی کورد، کە بە پێی قانونەکانی ئێران مەرجی پێویستیان تێدا بوبێ، داوای ئیجازەی دەرهێنانی رۆژنامەو گۆڤاری کوردییان کردوە و داواکەیان رەد کرابێتەوە؟

وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە پێویستی بە گەڕان هەیە بە ناو ئارشیفی لایەنە پەیوەندیدارەکانی حوکمەتی ئێراندا.

د. ئیسماعیل ئەردەڵان لە تاران ئیجازەی قانونیی دەرهێنانی ڕۆژنامەیەکی فارسی بەناوی (کوهستان) ە وە وەرگرتوە. لەم ڕۆژنامەیەدا باس و بابەت و لێکۆڵینەوە لەسەر هەلومەرجی سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئابوری، ڕۆشنبیری... کوردستان و، جوڵانەوەی نەتەوەی کورد بە فارسی نوسیوە، جاروبار شیعری کوردی و پەندی پێشینانی بە کوردی بڵاو کردۆتەوە.

ڕۆژنامەوانێکی بە توانای وەکو سەید حوسەین حوزنی، کە هەمیشە شانازی کردوە بە موکریانی بونی خۆیەوە، لە باتی ئەوەی لە بەغداد بێتە هاوکاری کاربەدەستانی بریتانی بۆ دەرکردنی (دەنگی گێتیی تازە) و، بەو هۆیەوە چەندین ناووناتۆرەی سوکی قبوڵ کردوە، بۆچی نەچۆتە تاران لەوێ هەمان کار ئەنجام بدات؟

یان کەسێکی وەکو عەلادین سوجادی کە ئەویش ڕۆژنامەوانێکی ناسراو بو بۆچی نەگەڕایەوە سنە یان تاران بۆ ئەوەی کارێکی وەها بکا؟

تۆ بڵێی، لە کاتێکدا هەمو ڕۆژنامەوانە ناسراوەکانی ئێران بە ئازادی لەو پەڕی چالاکیدا بون، ئەمانیان لە سێدارە بدایە؟

یان کاتێ موکریان بوە مەڵبەندێکی گرنگی ڕۆژنامەوانیی ئازادی کوردی بۆچی ئەمان، کە ڕۆژنامەوانیی شارەزاو خاوەن تەجروبە بون، هەر لە بەغداد مانەوە و نەگەڕانەوە زێد و نیشتمانەکەی خۆیان لەوێ خزمەت بە ڕۆژنامەوانیی کوردی بکەن؟

ناوچەی موکریان، وەکو هەرێمێکی بێلایەن، لە نێوان هێزەکانی بریتانیا لە لایەک و هێزەکانی یەکێتیی سۆڤێتدا لە لایەکی کەوە، مایەوە. لەو ناوچەیەدا بۆشایی دەسەڵات دروست بوبو، چالاکەکانی کورد، دوای ساڵانێکی درێژی چەوسانەوەی سەردەمی ڕەزا شا، کەڵکیان لەم بۆشاییەیە وەرگرت بۆ گەرمکردنی چالاکیی سیاسی و ڕۆژنامەوانی.

کۆمەڵەی ژ. ک دامەزرا و، کەوتە دانانی ڕێوشوێنی نهێنی (بڵاوکەرەوەی بیر) ی ڕێکخراوەکە و گۆڤاری (نیشتمان) ی دەرکرد. هەر لەو ساڵانەدا ناوچەکە گۆڕانی بنەڕەتی بە خۆیەوە دی. کۆمەڵەی ژ. ک گۆڕا بۆ حیزبی دیمۆکراتی کوردستان و، حیزبی دیمۆکرات، جمهوریەتی کوردستانی لە مهاباد دامەزراند. ئەم قۆناغە سەرەڕای کورتیی ماوەکەی قۆناغێکی دەوڵەمەندی کاروانی ڕۆژنامەوانیی کوردییە. لەم ماوە کورتەدا گۆڤاری نیومانگی کوردستان، ڕۆژنامەی ڕۆژە نەڕۆژی کوردستان، گۆڤارەکانی هەڵاڵە، هاواری نیشتمان، گڕوگاڵی مناڵانی کورد، دەرچون. بڵاوکراوەکانی ئەم قۆناغە، لەبەر چەندین تایبەتمەندی خۆی، ئەشێ ناوی بنرێ (قوتابخانەی ڕۆژنامەوانیی موکریان).

## تورکیا

کە لە یەکەمین جەنگی جیهانیدا بەشداری کرد و لە ئەنجامی ئەوەدا لەتوپەت بو، پەندی لەوە وەرگرت بو، لەم جەنگەدا لە سەرەتادا کە هێشتا ئەنجامەکەی دیار نەبو، بێلایەن ڕاوەستا. یەکێ لە هۆکانی ئەم بێلایەنییە، وەکو دوایی لە دۆکۆمێنتەکانی ئەڵمانیای نازیدا دەرکەوت، ترسی تورکیا بوە لەوەی یەکێتیی سۆڤێت و دەوڵەتانی هاوپەیمان یارمەتی کورد بدەن، کوردستان لە تورکیا جیا بکاتەوە و دەوڵەتی کوردی دروست ببێ.

تورک دانی بە بونی کوردا نەئەنا و بە تورکی شاخاوی دانەنان. کورد بێ بەش بو لە هەمو جۆرە مافێکی سیاسی و ڕۆشنبیری، لەبەر ئەوە لەناو تورکیا هیچ بڵاوکراوەیەکی کوردی: ڕۆژنامە، گۆڤار، کتێب... دەرنەچوە.

لەو سەردەمەدا بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد لـە تورکیـا، دوای ئـەو شکسـتە خوێناوییانـەی بـە سـەری هاتبو، هێشتا لە خامۆشییەکی تەواودا بو. چالاکەکانی کوردستانی تورکیا لە سوریا و لوبنـان گیرسـابونەوە، کەمتر چالاکیی سیاسی و زۆرتر چالاکیی رۆشنبیرییان ئەنواند.

## سوریا و لوبنان

هەردو وڵات لە ژێر ئینتیدابی فەرەنسیدا بون. حکومەتی فەرەنسە کـەوتبوە ژێـر دەسـتی ئـەڵمانیاوە، بەڵام مارشاڵ دیگۆڵ لە حکومەتەکەی پاریس هەڵگەڕایەوە، حکومەتی فەرەنسەی لە تاراوگە (منفی) دامەزرانـد. چالاکەکانی کورد، بە تایبەتی ئەوانەیان کە لە کوردستانی تورکیاوە چوبونە سوریا و لوبنان (حیزبـی خـۆیی بون) یان دامەزراند و، دوای تێشکانی شۆڕشی ئاگری نائومێد بون لەوەی بە خەباتی چەکدار بتوانن ئازادیی کوردستانی تورکیا بە دەس بهێنن، کەوتبونە خەباتی رۆشـنبیری: بوژاندنـەوەی زمـانی کـوردی، چـاککردنی ئەلف و بێ و رێنوسەکەی، بڵاوکردنەوەی گۆڤار و رۆژنامە و کتێب. سەرانی کـورد بەگشـتی پێوەنـدییان لـە گەڵ دەسەڵاتی ماندات (انتداب)ی فەرەنسی باش بو. ئەم پێوەندییە باشە یارمـەتی دان لـە سـاڵانی جـەنگدا کەڵک لە چاوپۆشی و توانای دەسەڵاتی فەرەنسی وەربگرن بۆ پـەرەپێـدانی چـالاکیی رۆشـنبیری کـورد، بـە تایبەتی چالاکیی رۆژنامەوانیی.

## هاوپەیمانەکان لە ماوەی جەنگدا

لە شام، هاوکاری میر جەلادەت بەدرخان یان کرد بۆ دەرکردنی (رۆناهی) و بوژاندنەوەی سـەرلەنوێی (هاوار).

لە بێروت، هاوکاری میر کامەران بەدرخان یان کرد بۆ دەرکردنی (رۆژانو) و (سـتێر) و، بـۆ پەخشـی رادیۆیی هەندێ پرۆگرامی ئەدەبی و فۆلکلۆری بە کرمانجی.

بڵاوکراوەکانی ئەم قۆناغەی شام و بێروت سەرەڕای کورتی تەمـەنیان، لـە بـەر چەنـدین تایبەتمەنـدی خۆی، ئەشێ ناوی بنرێ (قوتابخانەی رۆژنامەوانیی بەدرخان).

بەڵام چارەنوسی هەمو ئەمانـە لـە گـەڵ بـە لادا کـەوتنی چارەنوسـی جـەنگدا بڕیـاری لـێ درا و، لـە دەرچون کەوتن.

دوای ئەوەی سوریا و لوبنان سەربەخۆییان وەرگرت، ئەو پەراوێزە تەسکەی ئـازادی کـە لەسـەردەمی ماندات (انتداب) دا بۆ کورد رەخسابو، لە سەردەمی سەربەخۆییدا لێی سێنرایەوە.

دوەمین جەنگی جیهانی تەواو بو، ئەڵمانیاو ژاپۆن و هاوپەیمانەکانیان بە تێشکاوی خۆیـان دا بە دەستەوە. دەوڵەتانی براوەی جەنگ: ئەمەریکا، بریتانیا، یەکێتیی سۆڤێت.. کەوتنە کۆبونـەوە بـۆ رێکخستنەوەی دنیای دوای جەنگ. جەنگی گەرم بڕایەوە. جەنگێکی نوێ، لـە نێـوان هاوپەیمانـەکانی دوێنێدا، دەستی پێ کرد کـە لـە پێوەنـدی ناودەوڵـەتاندا بـە جـەنگی سـارد نـاوی دەرچـو. جـەنگی سارد، شێوەکانی لە شێوەکانی شەڕی کۆن جیـاواز بـو، ئـەگینا لـە تونـدوتیژی دوژمنایـەتیدا ئەگـەر گەرمتر نەبوبێ ساردتر نـەبو. لـە ئـەنجامی ئـەم شـەڕەدا دیسـانەوە دنیـا دابـەش بـوەوە بەسـەر دو ئۆردوگادا:

ئۆردوگای وڵاتانی سەرمایەداری بە سەرۆکایاتی هێزی تازە پێگەیشتوی ئەمەریکا.

ئۆردوگای وڵاتانی سۆسیالیستیی بە سەرۆکایەتی یەکێتیی سۆڤێت.

ناکۆکی ئایدۆلۆجی نێوان ئەم دو ئۆردوگایە لـە هـەمو مەیدانـەکانی ژیـانی مرۆڤایـەتیدا، لـە مەیـدانی جەنگی، سیاسی، ئابوری، ڕۆشنبیری.. دا بە قوڵی ڕەنگی دایەوە و، زۆر وڵاتانی دواکـەوتوی جیهـانی سـێیەم (لەوانە حکومەتی عیراق) بەربەرەکانی کۆمۆنیزمی کردە بیانویەکی قانونی بـۆ گـەمارۆدانی هـەمو جۆرەکـانی ئازادی سیاسی: ئازادی دەربڕینی بیروڕا، ئازادی ڕۆژنامەوانی، ئازادی کاری حیزبی...

لە چلەکانی سەدەی بیستەمەوە لە پرۆسـەی گەشـەکردنی ڕۆژنامـەوانی کـوردیدا 3 جـۆری جیـاوازی ڕۆژنامەوانیی پەیدا بون:

1. **ڕۆژنامەوانیی ئەهلی**

کە بە پێی قانونەکانی چاپەمەنی لە لایەن ڕۆژنامەوانی کوردەوە بڵاو کراونەتەوە. ئەم بوارە قانونیـیـە، تەنیا لە عێراقدا بۆ کورد رەخساوە، حکومەتەکانی ئێـران، تورکیـا و سـوریا، ڕێگـەی قانونیـیـان بـە گەشانەوەی ڕۆژنامەوانیی کوردی نەداوە.

2. **ڕۆژنامەوانیی نهێنی**

حیزبە سیاسیەکان کە قانون ڕێگـەی چـالاکی سیاسـی ئاشـکرای پـێ نـەداون، پـەنایان بردۆتـە بـەر پێکهێنانی ڕێکخستنی نهێنی و، بۆ بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕ و، بـۆ دەربڕینـی هەڵوێسـتی خۆیـان لـە روداوەکانی ناوخۆ و ناوچەیی و جیهانی، دەزگای چاپی نهێنییـان دامەزرانـدوە، زمانحـاڵی حیـزب و بەیاننامە و بڵاوکراوەی جۆراوجۆریان پێ دەرکردوە.

ڕۆژنامەوانیی نهێنیی کوردی، لە عێراق بۆتە بەشێکی گرنگی چالاکیی بزوتنەوەی نەتـەوەیی کـورد و بزوتنەوەی دیمۆکراتی و بزوتنەوەی کۆمۆنیستی. لە ئێران ناو بـە نـاو سـەری دەرهێنـاوە. بـەڵام لـە تورکیا و سوریا زەمینەی پەیدابونی ڕۆژنامەوانیی نهێنیی کوردی نەبوە.

3. **ڕۆژنامەوانیی بیانی**

لە ساڵانی دوەمـین جـەنگی جیهـانیدا بریتانیـا و، لـە سـاڵانی جـەنگی سـاردا وڵاتـە یـەکگرتوەکانی ئەمەریکا، بۆ مەبەستی سیاسیی خۆیان، بە زمانی کوردی گۆڤار و بڵاوکراوەیان پەخش کردوە.

ئەم جۆرە ڕۆژنامەوانیـیە هەر لە عیـراق ڕێگـەی پـێ دراوە. حکومەتـەکانی ئێـران و تورکیـاو سـوریا ڕێگەیان پێ نەداوە.

## 2. (ژ. ک) و رۆژنامەوانیی نهێنی

### 2. 1. نیشتمان

بژی سەروك و كورد و كوردستان و هیوا !




# نیشتمـــــــــان

گوواریكی كومەلایەتی ؛ ئەدەبی ؛ خوێندەواری و مانگی كوردیە

ژمارەی ـ١ سالی یەكەم پوش پەری ١٣٢٢ جولای ١٩٤٣

## آمانجی ایمە

ئەی برای كوردی خوشەویست :

كومەلەی ژ.ك بە پیچەوانەی هەمو بەر هەلست و قورت و چەلەمەییكی وەكو دوژ منـایەتی خوبەخو ؛ دوبەرەكی و خوخوری ؛ پول پەرستی و بیگانە دوستی كەلەر یگای پیش كەوتن و سەركەوتنی كوردا هەیە بەهەمو هیزو توانای خوی تی ئەكوشیت

## 1. نیشتمان

### 1. 1. دەرچونی

ژ1 ی ساڵی 1 ی لە پوشپەڕی 1322 ی هەتاوی، بەرامبەر تەموز (جولای) 1943 دەرچوە. 25 لاپەڕەیە.

ژ2 ی خەزەلوەری 1322 ی هەتاوی، بەرامبەر تشرینی دوەم (نۆڤەمبەر) ی 1943 دەرچوە. 25 لاپەڕەیە.

ژ3 - 4 ی سەرماوەز و ڕێبەندانی 1322 ی هەتاوی، بەرامبەر کانونی یەکەم (دێسەمبەر) ی 1943 و کانونی دوەم (جەنیوەری) ی 1944 دەرچوە. 36 لاپەڕەیە.

ژ5 ی ڕێبەندانی 1322 ی هەتاوی، بەرامبەر کانونی دوەمی (جەنیوەر) ی 1944 دەرچوە. 24 لاپەڕەیە.

ژ6 ی ڕەشەمەی 1322 هەتاوی، بەرامبەر مارت (مارچ) ی 1944 دەرچوە. 22 لاپەڕەیە.

ژمارەکانی 7 و 8 و 9 ی کە دوا ژمارەیەتی و بە یەکەوە لە یەک بەرگدان، لە خاکەلێوە و بانەمەڕ و جۆزەردانی 1322 ی هەتاوی بەرامبەر نیسان و مایس و حوزەیران (ئەپریل و مەی و جون) ی 1944 دەرچوە. 32 لاپەڕەیە.

لە ناوچەوانی سەربەرگی ژ1 دا هەردو حەرفی (J. k) ی لاتینی لە ناو بازنەیەکی خڕدا کە چەند تیشکێکی لێ بڵاو بۆتەوە و بە دەوری ئەو بازنەیەدا ئایەتێک و لە سەروی لاجانگی چەپیدا (بژی سەرۆک و کورد و کوردستان و هیوا) و، ئینجا لە ژێر وشەی (نیشتمان) دا بەم جۆرە خۆی بە ناسین داوە:

(بڵاوکەرەوەی بیری ژ. ک)

(گۆوارێکی کۆمەڵایەتی، ئەدەبی، خوێندەواری و مانگی کوردیە)

لە ژ2 دا (بژی سەرۆک و...) دوبارە نەنوسراوەتەوە. بەڵام لە هەر لایەکی ناوچەوانی لاپەڕەی سەربەرگدا بەیتێکی ئەم شیعرە نوسراوە:

بەختیارین، لە هەوەڵ، نێوی مەیان دانا کورد
ساحیبی غیرەتن ئەو قەومە وەکو ڕۆستەمی گورد
هەرکەسێ پەنجە لە پەنجەی مە دەدا، یا ڕەببی

دەست و پەنجەی بشکێ، پیلی لە بن ڕا ببێ ورد

لە ژ3 - 4 دا لە گۆشەی لای چەپدا بە وردی نوسیوێتی: (بژی کورد و کوردستان و کۆمەڵەی ژ. ک) ئینجا کلێشەکەی نیشتمان و لە ژێریدا وێنەی سەلاحەدینی ئەیوبی لە سەر بەرگەکەی چاپ کردوە و، لە ژێر وێنەکەدا ئەم شیعرەی شێخ رەزای نوسیوە:

عەرەب، ئینکاری فەزڵی ئێوە ناکەم ئەفزەلن ئەمما

سەلاحەدین کە دنیای گرت، لە نەسلی کوردی بابان بو.

ئەم وێنەیەی سەلاحەدین لە گۆڤاری (دیاریی کوردستان) ی بەغدادەوە وەرگیراوە.

لە ژ5 دا وشەی (الله) ی لە تەپڵە سەری لاپەڕەدا نوسیوە و لە گۆشەی چەپدا بژی کورد و کوردستانی گەورە. کلێشەکەی نیشتمان وەکو خۆی و، لە ژێر وێنەکەی سەلاحەدیندا شیعرەکەی سەربەرگی (دیاریی کوردستان) ی نوسیوەتەوە:

تۆ نەمردوی ئەی سەلاحەدینی ئەیوبی نەسەب

هەر بژی ئەی شاهی بەیتی کورد، ئەی فەخری عەرەب

لە ژ6 دا شیعرەکەی بەم جۆرە دەسکاری کردوە:

تۆ نەمردوی ئەی سەلاحەدینی ئەیوبی لەقەب

هەر بژیت ئەی فەخری کورد و حاکمی موڵکی عەرەب

## 1. 2. ئامانجی

لە ژ1 ی تەموزی 1943 دا لە ژێر سەرناوی (ئامانجی ئێمە) دا نوسیوێتی:

"ئەی برای کوردی خۆشەویست!

"کۆمەڵەی ژ. ک بە پێچەوانەی هەمو بەرهەڵست و قۆرت و چەڵەمەیەکی وەکو دوژمنایەتی خۆبەخۆ، دوبەرەکی و خۆخۆری، پولپەرستی و بێگانەدۆستی، کە لە ڕێگەی پێشکەوتن وە سەرکەوتنی کوردا هەیە بە هەمو هێز و توانای خۆی تێ ئەکۆشێت تا زنجیر و کەڵەمەی دیلی و ژێردەستی لە ئەستۆی نەتەوەی کورد داماڵێ، وە لەم کوردستانە لەت و کوتەی ئیستا کوردستانێکی گەورە و ڕێکوپێک بێنێتە بەرهەم کە هەمو کوردێک بە سەربەستی تیا بژێت.

"زۆر کەس وا لێک ئەدەنەوە کە ئەبێ نەتەوەی کورد بە زۆر و نیروی چەک لە دیلی رزگار بکرێت، بەڵام ئەوانە هەمو بە هەڵە چون و ڕێگای راستیان لێ ون بوە، چونکو چەک و تفاقی شەڕ کە لە چەنگ کوردایە لە بەرانبەر چەک و تفاقی شەڕی ئەمانەی بونە بەرهەڵستی سەربەستی ئێمە کار ناکات ئەبێ کورد بزانێت ئیمرۆ تفەنگ لە چاو گوللەپژێن و تۆپ و تانک و فرۆکە و... و... توقتوقەیەک زیاتر نیە تەنیا ڕێگایەکی ئەبێ کورد بەرەو سەربەستی پێیا بڕوا شەقامی شارستانێتیە، ئەم ڕێگایە راست و رەوان ئەچێتە ناو مێرگی ئازادی و سەربەستی.

"کۆمەڵەی ژ. ک بڕیاری داوە بۆ روناک کردنەوەی بیری نەتەوەی کورد و دۆزینەوەی هۆی چارەڕەشی و دواکەوتنی ئەم میلەتە بەستەزمان و بێ دەسەڵاتە لە هیچ فیداکاریەکی رو وەرنەگێڕێت ئەوا لە سەر بڕیاری هەیئەتی ناوەندی ئەم گۆوارە دەرئەچێت تا بەرە بەرە هەر چەوتی و ناڕەواییەکی لە ژیانی کوردا هەیە پیشانی بدا و ببێتە شارەزای نەتەوەی کورد لە ڕێگای سەربەستی و سەربەخۆئیدا."

**1. 3. نوسەرەکانی**

نیشتمان بە ئاشکرا نـاوی سەرنوسـەر و دەسـتەی نوسـەران و ئەدرەسـی شـوێنی دەرچـون و نـاوی چاپخانەی لە سەر نیە.

بابەتەکانی لە مەهاباد لە لای سەرکردایەتی ژ. ک کۆکراوەتەوە و ئامادە کراوە و ئەورەحمانی زەبیحـی بە دەستی بردویەتی بـۆ تـەورێز لـە چاپخانەیـەک کـە خاوەنەکـەی ئەرمـەنی بـوە چـاپ کـراوە. بـە نهێنـی هێنراوەتەوە بۆ مەهاباد و لەوێوە دابەش کراوە.

لەوانەی لە نیشتماندا بەشداری دیاریان کردوە:

**ع. بێژەن (ئەورەحمانی زەبیحی):**

بە وتارەکانی (رێککەون تا سەرکەون) و، (سەرکەوتن بە زۆر و کەمی نیە) و، (شـاعیری بـە ناوبانـگ وەفایی) لە ژ1 دا و،

(ئێمە و مەردم) لە ژ2 دا و،

(بۆچی نەگریم؟) لە ژ3 دا و،

(کورد لە حەیات ئینسکلۆپیدیاسی تورک دا) و، (فەلسەفەی ژیان) لە ژ5 دا و،

(بۆچی گەورەکانی قورەیش موسوڵمان نەدەبون) لە ژ6 دا و،

(کوردستان قوت نادرێ) لە ژ7- 9 دا بەشداری کردوە.

**ع. هەژار (هەژار موکریانی - هەژاری شاعیر):**

جگە لەوەی لە هـەمو ژمارەکـانیدا (دەمەتـەقێی دوکەسـیی) نوسـیوە، لـە ژ3- 4 دا شـیعری (مـەرامی کۆمەڵەکەم دینگە) ی بڵاوکردۆتەوە. (نیشتمان) ئەم بەیتەی لەم شیعرە، کە جۆرێکە لە هەڕەشە لـە نـەیارەکانی، وەکو یەکێ لە دروشمەکانی لە سەربەرگی ژ5 و 6 دا نوسیوەتەوە:

لە دەمبڕینی ئەوانەی لە کۆمەڵەم بەدگۆن

لە بار و تیژە، دەمی مو دەکا، مقەست و برینگم

لە ژ5 دا (جوجەڵەی نیشتمان) و،

لە ژ6 دا (دڵی دایک) و،

لە ژ7- 9 دا (دەمەتەقێی دو باز) ی بڵاوکردۆتەوە.

**م. ش. هێمن (هێمن موکریانی- هێمنی شاعیر):**

هەم وتاری بۆ نیشتمان نوسیوە و هەم شیعری تێدا بڵاوکردۆتەوە.

لە ژ2 دا وتاری (خۆت بناسە) و دوشـیعر (مەحکەمـەی مەنحوسـی ئیسـتیقلال) کـە باسـی شـەهیدانی 1925 ی کوردستانی تورکیا ئەکا و (کوردمو) و،

لە ژ3- 4 دا شیعری (ئاخافتنی خوشک و برایان) و،

لە ژ5 دا وتاری (ڕۆژی کارە) و شیعری (قەڵای نیشتمان) و (ئەمن دەیڵێم و بێباکم) و،

لە ژ6 دا وتاری (سکاڵایەک لە گەڵ نیشتمان) و شیعری (دەبێ من چۆن ببم مەسرور و دڵشاد) و،

لە ژ7- 9 وتاری (شێخ یوسف شەمسەدین بورهان) و (کـورد چـی دەوێ؟) و شـیعری (کـوردە گیـان خەونم دیت) ی بڵاکردۆتەوە.

**م. نادری (دڵشادی ڕەسولی):**

لە ژ3- 4 دا (بەهەشتی بەختیاری) و،

لە ژ5 دا (پیاوی چاک بە و مەیخوێنەوە) و،

لە ژ6 دا (کوردستان) وەرگێڕانێ لە ڕۆژنامەی اللواء بێروتیەوە و،

لە ژ7- 9 دا (کۆڤاری نیشتمان) و (سەربەستی یا مردن) و (خۆشبەختی) نوسیوە.

دڵشادی ڕەسولی پەخشاننوسێکی بە توانا بوە، ئەو سەردەمە گەلێ پەخشانی ئەدەبیی جوانی لە گەلاوێژدا بڵاوکردۆتەوە.

جگە لەمان، برای ڕاست (کاک ڕەحمانی موهتەدی)، ع. ساسان (وەهابی بلوریان)، م. فەڕوخ، م. ئاریا (مەنافی کەریمی)، م. بەیان، م. لاو (صدیقی حەیدەری)، م. ش. ئازەر (محەمەدی شاپەسەندی)، پشتیوان، ع. ڕاد (عەبدولرەحمانی ئیمامی)، م. ئیرەج، لە نوسینەکانی نیشتماندا بەشدار بون.

جگە لە هێمن و هەژار، چەندین شاعیری تر، شیعری هاندەرانەی سیاسی و کۆمەڵایەتی‌یان تێدا بڵاوکردۆتەوە.

لە شاعیرانی کوردستانی ئێران: م. حەریق (محەمەدی ئەسحابی)، قومری، م. عیشقی...

لە شاعیرانی کوردستانی عیراق: م. م. هۆشەنگ لە ژ1 دا، گیوی موکریانی (نادەم بە فەلەک) لە ژ2 دا، قانع (پایزی نیشتمان) لە ژ3-4 و (چوار) لە ژ5 دا و (ئەگەر مردم) لە ژ6 دا، فانی (حور بژی) لە ژ2 دا و (دەڵێم بیڵێم و ناوێرم) لە ژ3- 4 دا، تەخمیسی مەلا حەسەنی قازی لە سەر شیعری ئەحمەد موختار (ناڵەیی دڵ) لە ژ5 و 6 دا.

چەند شیعرێکیشی بە ناوی (شاعیرێکی بە ناوبانگ) و (بوێژێکی ناودار)، بە بێ ناو بڵاوکردۆتەوە.

نوسەرانی نیشتمان ئاگاداری بزوتنەوەی ڕۆشنبیریی کوردی بون لە دەرەوەی ئێران.

لە ژ1 دا بڵاوکردنەوەی شیعرێکی مەولەوی کە (پیرەمێردی سلێمانی لە کوردی هەورامانیەوە وەری گێڕاوەتە سەر لەهجەی موکوریانی) و شیعرێکی زێوەر و، ڕاگوێزانی باس و بابەت لە تاریخەکەی ئەمین زەکی و لە کتێبی ڕەفیق حیلمی و،

لە ژ3- 4 هەواڵی دەرچونی دەنگی گێتیی تازە لە بەغداد و، ڕاگوێزانی بابەت لە (ڕۆژانو) ی بێروتی... و،

لە ژ5 دا لێدوانی بێژەن لە وتارێکی پشکۆ کە لە گەلاوێژدا بڵاو بۆتەوە و،

لە ژ6 دا (بوێژێکی ناودار) کە ئەڵێ:

لە شەوقی (نیشتمان) و شوعلەی ئەستێرەی (گەلاوێژ) ە

برینی رووح و قەلب و قالبم فیلجوملە سارێژە

لە ژ2 دا هەواڵی کۆچی دوایی (عالمی بە ناوبانگ و نیشتمان پەروەر مەلا محەمەدی کۆیی) و، بڵاوکردنەوەی کۆمەڵە شیعری حاجی قادری کۆیی و مەلا محەمەدی کۆیی و، ڕازاندنەوەی ڕۆژژمێرەکانی بە شیعری شاعیرانی کوردستانی عیراق...

ئەمانە هەموویان نیشانەی ئەوەن کە نوسەرانی نیشتمان بە چاکی ئاگاداری بزوتنەوەی ڕۆشنبیریی کوردی بون. ئەمەیش لەو سەردەمەدا بۆ ئەوان کارێکی دژوار نەبوە:

یەکەم:

بە هۆی ڕێکخراوەکانی ژ. ک لە عیراق و پێوەندی زۆریان لە گەڵ کەسایەتی‌یەکانی کورد.

دوەم:

بە هۆی هەلومەرجی جەنگی جیهانی‌یەوە کورد جۆرێ لە ئازادیی هەڵسوڕان و، تێکەڵاوی یەکتری هەبوە.

### 1. 4. بڵاوکردنەوەی

نیشتمان، هەندێکی بە دەست بە ڕێگەی تۆڕی ڕێکخراوەکانی ژ. ک و، هەندێکی بە پۆستە دابەش کراوە. لە چاو خۆی‌دا زۆر بڵاو بۆتەوە و گەیشتۆتە زۆر گوند و شاری کوردستان و، زۆر پایتەختی دەوڵەتانی دنیا.

(ژین) لە سلێمانی، (گەلاوێژ) لە بەغداد، (ڕۆناهی) لە شام، (ڕۆژانو) لە بێروت، کە هاوزەمانی نیشتمان بون، بە ستایشەوە هەواڵی بڵاوبونەوەیان نوسیوە.

لە پێش بڵاوبونەوەی هەر ژمارەیەکی‌دا لە مەهاباد پرۆپاگاندەی بۆ کراوە و ئاگاداری بە دیواری شوێنە گشتی‌یەکان‌دا هەڵواسراوە.

### 1. 5. ڕاگرتنی

لە ژ2 ی نیشتمان‌دا ئەم (ئیعلان) ە بڵاوکراوەتەوە:

"ڕۆژنامەی هەفتەیی (مرۆ- Mirov) لە لایەن بێژەن 2 بەم نێزیکانە دەرئەچێت ئابونە تەنیا بۆ ئەندامەکانی کۆمەڵەیە"

پێ ناچێ هەفتەنامەی مرۆڤ دەرچوبێ. نیشتمان یش لە دوای ژ7- 9 کە هەرسێکیان لە یەک بەرگدا چاپ کراون ئیتر دەرنەچوە. بۆچی ڕاوەستاوە، لە کاتێکدا لەو ماوەیەدا ڕێکخراوەکانی ژ. ک پەرەیان سەندوە و لقوپۆپی لە زۆر شوێن‌دا بڵاوبۆتەوە و هێز و توانای لە چاو سەرەتادا زۆر زیادی کردوە و، قازی محەمەد، کەسایەتی بەڕێز و ناسراوی موکریان، سوێندی ئەندامەتی خواردوە و بە کردەوە بۆتە سەرۆکی ڕێکخراوەکە؟ هێشتا وەڵامی ئەم پرسیارە نەدراوەتەوە.

## 2. بیروبۆچونەکانی

### 2. 1. مەرامنامەی کۆمەڵە

کۆمەڵەی ژ. ک ئەگەرچی گۆڤاری نیشتمان و چەند کۆمەڵە شیعر و چەند ڕۆژژمێری بە چاپکراوی بڵاوکردۆتەوە، کەچی (مەرامنامەی کۆمەڵە)ی لە نامیلکەیەکی سەربەخۆدا بە چاپکراوی بڵاونەکردۆتەوە. تەنانەت ناوی خۆیشی بە تەواوی نەنوسیوە کە ئاخۆ مەبەستی لە حەرفەکانی ژ. ک چی بوە. مەبەستی لە حەرفی ژ ژیان یا ژیانەوە و لە حەرفی ک کورد یان کوردستان بوە؟ ڕەنگە بە ئەنقەست بۆ شاردنەوەی بیروبۆچونی ڕاستەقینەی خۆی ئەمەی کردبێ. هەندێ لە بەندەکانی بە پچڕ پچڕی لە دوتوێی نیشتمان‌دا بڵاوکردۆتەوە:

لە ژ5 دا لە ژێر سەرناوی (لە ناو کۆمەڵەدا) نوسیوێتی:

"بۆ وەڵامی هێندێک لە نەفام و تێ نەگەیشتوەکان بەندێکی مەرامنامەی کۆمەڵە دەنوسین:

"کۆمەڵەی ژ. ک لە سەر 4 کۆڵەکەی ئیسلامەتی، کوردایەتی، مەدەنیەت، سوڵح و ئاشتیخوازی، داندراوە و هەمو قانون و نیزامنامەکانی لە گەڵ شەریعەتی موقەدەسی ئیسلام تەتبیق ئەکرێ و ئینجا ئەخرێتە کار."

لە ژ6 دا لە ژێر هەمان ناونیشانی (لە ناو کۆمەڵەدا) نوسیوێتی:
چەند بەندێک لە مەرامنامەی کۆمەڵە

7. بە بۆنەی موتەدەین بونی بەشی زۆری نەتەوەی کورد بە دینی ئیسلام کۆمەڵە لە کوردستان تەنیا دینی موقەدەسی ئیسلام بە رەسمی دەناسێ و بۆ تەرویجی شەریعەتی خاوێنی ئیسلام و بە جێ گەیشتنی هەمو ڕێوشوێنێکی ئیسلامەتی تێ دەکۆشێ و لە گەڵ مونافیقان بەربەرەکانیەکی بە شیدەت ئەکا.

8. مەسلەکی کۆمەڵە دیموکراتیە و لەم پێناوەدا بۆ خۆشیی ژیانی بەشەریەت کۆششت ئەکرێت.

11. کۆمەڵە هەمو قەبیلە و عەشیرەتەکانی کورد بە چاوێک تەماشا دەکا و بۆ برایەتی هەموان کۆششت ئەکا. رەخنەگری و ئینتیقاداتی کۆمەڵە لە ئاکاری ئەوان تەنیا لە روی دڵسۆزی کوردایەتیەوەیە کە حەز بە لە ناوچونی ئاکارە و رەفتاری ناشیرین لە ناو کوردەواریدا دەکا."(نیشتمان، ژ6)

وەکو تێبینی ئەکرێ هیچ بەندێکی بڵاو نەکردۆتەوە بۆچونی کۆمەڵە بەرامبەر رژێمی ئێرانی و حکومەتی تاران و، جۆری چارەسەرکردنی کێشەی نەتەوەیی کورد لە ئێران دا، دەربڕێ.

### 2. 2. ژ. ک و ئیسلامەتی

نیشتمان لە ناوچەوانی سەربەرگی هەمو ژمارەیەکیدا ئایەتێکی قورئانی لە دەوری دروشمەکەی ژ. ک دا نوسیوە:

لە ژ1 دا (كم من فئة قليلة غلبت فئة كثيرة باذن الله)
لە ژ2 دا (ومن يتوكل على الله فهو حسبه)
لە ژ3- 4 دا (نصر من الله وفتح قريب وبشر المؤمنين)
لە ژ5 دا (تعاونوا على البر والتقوى)
لە ژ6 دا (ان الله يأمر بالعدل والاحسان)
جگە لە مانە:

**ئەورەحمانی زەبیحی** (ع. بێژەن) سکرتێری کۆمەڵە و نوسەری سەرەکی نیشتمان، لە ژ1 دا لە وتاری (سەرکەوتن بە زۆری و کەمی نیە) ئایەتی (كم من فئة قليلة) ی کردۆتە تەوەری وتارەکەی و، لە ژ6 دا لە وتاری (بۆچی گەورەکانی قورەیش موسوڵمان نەدەبون؟) نمونەی لە ژیانی پێغەمبەر و روداوەکانی سەردەمی دەعوەتی ئیسلامی هێناوەتەوە بۆ سەلماندنی بۆچونەکانی.

**دڵشادی رەسولی** (م. نادری) یەکێکی کە لە نوسەرانی سەرەکی نیشتمان و ئەندامی (هەیئەتی ناوەندی) کۆمەڵە لە ژ5 دا لە وتاری (پیاوی چاک بە و مەیخوێنەوە) ئایەتی (ان مع العسر يسر) کردۆتە بەڵگەی قسەکانی.

**هێمن** لە ژ6 دا لە وتاری (سکاڵایەک لە گەڵ نیشتمان) ئایەتی (هل يستوى الذين يعلمون والذين لايعلمون) ی بە شایەت هێناوەتەوە.

لە ژ2 دا لە وتارێکی بێ ئیمزادا (مایەی رزگارنەبونی ئێمە لە زنجیر و کەڵەمەی دوژمن چیە و کێیە؟ بۆچی پێش ناکەوین؟) ئایەتی (الملك يبقى مع الكفر ولايبقى مع الظلم) و،

لە ژ3-4 دا لە وتاری (ئالکول) ئایەتی (انما الخمر والميسر والانصاب والازلام رجس من عمل الشيطان فاجتنبوه لعلكم تفلحون) ی کردۆتە پشتیوانی باسەکانی.

ژ. ک وەکو لە بەندی 7 هەمی مەرامنامەکەیدا نوسیوێتی، لە سەر 4 کۆڵەکە دانـراوە، کـە ئیسـلامەتی یەکەمینیان بوە. ئەمەیش ئەگەڕێتەوە بۆ:

یەکەم:

(موتەدەین بونی بەشی زۆری نەتەوەی کورد بە دینی ئیسلام).

دوەم:

بۆ ئەوەی تۆمەتی شیوعی بون و، لە ئەنجامی ئەوەیشدا تۆمەتی کافری و بێدینی و دژایـەتی ئیسـلام، لە خۆیان دور بخەنەوە.

سێیەم:

زۆری سەرکردەکانی کۆمەڵە و نوسەرەکانی نیشتمان لای مەلا خوێندویانە. دور نیە ئەمە یەکێک بوبێ لە هۆکارەکان.

## 2. 3. ژ. ک و شیوعێتی

وتار و شیعرەکانی ناو نیشتمان جۆرێ لە لایەنگری بۆ یەکێتی سۆڤێت و، جۆرێ لە خۆشەویستی بـۆ سەرکردەکانی تێدایە:

**م. فەڕوخ:**

لە ژ1 دا (پەلامارەکەی ئەوساڵی ئەڵەمان لە روسیا) و،

لە ژ2 دا زنجیرەیەک وتار دەربارەی (ئینقیلابی گەورەی ئۆکتۆبەر) بەم سەرەتایە دەس پێ ئەکا:

"زوڵم و زۆر گەلێ بیری ئاگرین ئەخاتە مێشکی مەزڵومان. ئامادەیان ئەکا بـۆ هەڵایسـاندنی هـەرا و شۆڕشێکی وا کە دواییەکی ئەبەدی بەم جەور و ستەمە بێنن. 25 ساڵ لەمەوپێش نەتەوەکانی روسـیا لـە ژێـر چەنگالی بێ عەدالەتی چاردا کەوتبونە حاڵێکی زۆر لە حاڵی ئیمڕۆی قەومی کورد خـەراپتر. دەسـتەیەکی کـەم ئاغا و خاوەن سەرمایە بە نەوعێکی زۆر ستەمکارانە و وەحشیانە خوێنی 200 ملیۆن دانیشتوانی روسـیایان ئەمژی و ئەیانکردە شوشەی نائینسانەتیەوە. هیچ کەس خاوەنی ماڵی خۆی نەبو..."

لە ژ3- 4 و 5 دا درێژەی بەم وتارە داوە.

لە ژ6 دا لاپەڕەیەکی تەواوی تەرخان کردوە بۆ وێنەی لەنین و ئەم شیعرەی لە ژێردا نوسیوە:

باقیە ناوت ئەتۆ، گەرچی دەمێکە مردوی

نا لەنین! ماوی، هەتا رۆژی قیامەت زیندوی

لە دەمەتەقێکانی بایز و باپیر یشدا باسی سەرکەوتنەکانی روس بە سەر هیتلەردا دوبارە بۆتەوە.

ئـەو بەنـدەی مەرامنامەکـە و هـەمو ئـەو ئایەتانـەی کۆمەڵـە لـە نیشـتماندا نوسـیونی دادی نـەداون. دوژمنەکانی پرۆپاگاندەی (شیوعێتی) یان لە دژی کردوە. رەنگە بڵاوکردنەوەی ئـەم بابەتانـە یـش بیانویـەک بوبێ بە دەستیانەوە. تۆمەتی شـیوعێتی بـە پـاڵ کۆمەڵـەی ژ. ک دراوە. **ع. بێـژەن** لـە (ئێمـە و مـەردم) دا نوسیوێتی:

"چەند کەسێک لـەم بـێ مێشـکانە کـە کتێبـی دیـاری و ژمـارەی یەکـەمی نیشـتمانیان خوێنـد بـوەوە لایـەنگری و تـەمایلی ئێمـەیان بـە لای حکومـەتی سـۆڤێتیدا دی بـو گوتبویـان ئارمـانی کۆمـەڵی ژ. ک بڵاوکردنەوەی مەسلەک و باوەڕی کۆمۆنیزمە. ئەم قسەیە بێ شک لە سەرچاوەی تەبلیغاتی فاشیستەکانەوە ئاو ئەخواتەوە، دەنا ئێمە کۆمۆنیست نین ئەگەر کۆمۆنیست یش بین جێگای هیچ ئیعتیرازێک بۆ خەڵک نیە. لەم مەوزوعەدا هەیئەتی مەرکەزی کۆمەڵ بەیاننامەی رەسمی دەر ئەکات."

(نیشتمان، ژ2، ل 8 - 9)

بۆ ئەوەی ئەم تۆمەتە لە خـۆی دور بخاتـەوە ژ. ک لـە گۆشـەی (لـە نـاو کۆمەڵـەدا) بـەم بەیاننامەیـە بەرپەرچی داونەتەوە:

"بەیاننامەی ژمارە 322 ی ڕۆژی 25 ی مانگی سەرماوەزی ساڵی 1322

"بە ناوی یەزدانی گەورە و بەرزی بێ هاوتا

"هەمیشە بیروباوەڕی تـازە ئەبێتـە ئامـانجی تیـری بەربـەرەکانی خاوەنـدانی بیـری کـۆن و مێشـکە رزیوەکان.

"ڕۆژێکی ئێمە ئەم کۆمەڵەیەمان بنیاد نا دەمان زانی لەم دەستورە گشتی و تەبیعیـە رزگاربونمـان نیـە، درەنگ یا زو لە جەنگەی کارکردنا ئەبینـە نیشـانەی لۆمـە و تـوانجی هێنـدێک لـە کـوردە بـێ تەعەسـوب و کۆنەپەرستەکان، بەڵام نەمان دەزانی لە چ ڕێگایەکەوە پەلامارمان ئەدەن.

"بڵاوکردنەوەی چاپەکانمان (مەتبوعات) ئەم ئیشکالەی هەڵگرت، هێندێک لە خاوەندانی (مـال و مـەقام) کە پێشکەوتنی ئێمە و پاشکەوتنی خۆیان لە ریزێکدا ئەدیت دەستیان کرد بە پرۆپاغاندە کە کۆمەڵـەی ژ. ک کۆمەڵێکی شـیوعی (بۆلشـەویکی) ە و بـە نـاوی کوردایەتیـەوە کـار ئـەکا، بـۆ دروسـتکردنی هـەمو چەشـنە بەرهەڵستێک لە ڕێگای پێشوەچونی ئێمەدا بە هەمو هێزی خۆیان کۆششتیان کرد بەڵام بێ کەڵک و سود بو، چونکو مەردوم وەک ئەوان لێکیان دابوەوە نەزان و ناتێگەیشتو نەبون، ئێمەیان زۆر چاک ئەناسـی و ئـەیان زانی ئارمانی ئێمە خۆشی ژیانی هەمو کوردێکە.

"لە بەر ئەمە تیری ئەم برا خۆشەویست و کۆنەپەرستانە لە باتی جەرگی کۆمەڵەی ئێمە وە بەردی قبوڵ نەکردنی جامیعە کەوت و گەڕاوە بۆ سینەی پڕ کینەی خۆیان و دەستوپێوەندیان، لە ناو مەردوم دا بێ قەدر و ئیحتیرام بون. ئەمەیە دوایی تالوکە کردن لە کاران دا، ئەمەیە نەتیجەی بێ مێشکی و نەزانی.

"ئەم برا خۆشەویستانە دەبو بزانن کە چۆن هەتاو هەمیشە لە ژێر هەوردا نامێنێتـەوە هـەروەها درۆ و دەلەسەش لە باریدا نیە کە روی روناکی حەقیقەت و راستی بپۆشێت. ئێمە ئارەزومانە هـەرچی لـە توانایـاندا هەیە بۆ بەربەست کردنی پێشکەوتنی ئێمە کۆششت بکەن تا نەیروی مەعنەوی کۆمەڵەیان چاو پێ بکەوێت.

"بژی کورد و کوردستان بە سەربەستی و سەربەخۆئی

ا/ل. ب هەیئەتی ناوەندی کۆمەڵەی ژ. ک"

(نیشتمان، ژ3-4)

## 2. 4. ژ. ک و ئینگلیز

هەڵوێستی ژ. ک لە بریتانیـا ئـەتوانرێ لـەم دو لێدوانـەیدا بخوێنرێتـەوە کـە بـە بۆنـەی کردنـەوەی (رادیۆی کوردستان) لە یافا (فەلەستین) و دەرکردنی (دەنگی گێتیی تازە) لە بەغداد (عیراق) نوسیونی:

لە ژ3- 4 ی کانونی دوەمی 1944، لە ژێر سەرناوی: (ئیستگەی رادیۆی کوردستان) دا نوسیوێتی:

"ئەم چەند خواهیشتەمان لە گەڕێنەندە و کاربەدەستانی ئیستگە هەیە و تکای پێکهێنانیان ئەکەین.

"شەپۆلی 37 مەترونیوی چاک کار ناکات بگۆڕدرێ باشە.

"لە بەشی زۆری شارەکانی کوردستانا (بروسکە) بە ڕۆژ کار ناکا بەرنامەکان بخرێنە سەعاتێکی وا کە لە هەمو کوردستانا ڕۆژ ئاوا بوبێت.

"ئەگەر هیچ بەرهەڵست و پێشگرێک نەبێ لە سەرەتای هەمو بەرنامەیەکا، دەنا هەفتەی دو جار مارشـی کوردستان لێ بدرێ.

"ڕۆژنامەیەک بە ناوی (ڕۆژنامەی ئیستگەی رادیۆی کوردستان) هەفتەی جارێک دەربهێنرێ و بڵاوکراوەکانی هەفتەیی تێدا بنوسرێت.

"مۆسیقای بێ دەنگ و قەوانەکان کە لێ دەدرێن ئارەزوی دڵی هەمو گوێگرەکان پێک ناهێنن. مۆسیقای بە دەنگ و قەوانی لە هەمو رەنگیان بۆ لێ بدەن و بەین بەینە قەوانەکان بگۆڕن.

ا/ل. ب ئیدارەخانەی کۆواری نیشتمان"

(نیشتمان، ژ3- 4، ل 3)

هەر لە هەمان ژمارەدا بە بۆنەی دەرچونی (دەنگی گێتیی تازە) وە نوسیوێتی:

"ئەستێرەیەکی تازە لە ئاسمانی چاپەکانی کوردیدا

"جوانمێری و مەردوم دۆستی بەریتانیای گەورە

"کورد ماوەیەکی زۆر لە مێژە هەستی بە نەجابەت و مرۆڤ خۆشەویستی بەریتانیا کردوە ئەم حکومەتە گەورەیە بە درێژایی مێژوی ئیمپراتۆریتی خۆی هەمیشە پارێزگاری ئازادی و سەربەخۆیی و پەروێنەر و پێگەهێنەری نەتەوە پچوکەکانی گێتی بوە زۆر جاران وەکو ئەمجارەی ئیستا سەر حەقی نەتەوەیەکی پچوک بەرەنگاری نەتەوەیەکی زل و بێدادگەر و ستەمکار بوە ئاسایشی نەتەوەی خۆی لە پێناو ئاسودەیی مەردوم ناوە بە تایبەتی تیشکی ئەم هەتاوە داویە لە کوردی بێچارە و چارەڕەش و ستەمدیتو و حکومەتی بەریتانیا هەر جارە بە چەشنێک بۆتە هۆی پێشکەوتنی گەلی دواکەوتو و مەزڵومی کورد، بە راستی پێویستی خزمایەتی خۆی لە گەڵ ئێمە بە جێ گەیاندوە ئەمجارەش لە بالیۆزخانەی بەریتانی تیشکەی ئەستێرەیەکی روناک دەوشا کۆواری دەنگیی گێتیی تازەیان بە کوردیەکی زۆر پەتیی بۆ وە دەرخستین. ژمارەی یەکەممان خوێندەوە گەلێ هێژا و بە نرخە یەزدان یارمەتیدەری خۆی و خاوەنی بێت.

"بەڵام هەروەکو زاندراوە کورد تەماعیان زۆرە و بەمانە پڕ نابێت ئێمە لە حکومەتی بەریتانیای گەورە تکا ئەکەین هەروەکو لە (یافا) ئیستگەیەکی رادیۆی بە ناوی کوردستانەوە بۆ کردوینەوە و لە هەمو کوردستانا دەنگی داوەتەوە هەروەها رادیۆی لەندەنیش رۆژی سەعاتێک لە بەرنامەی خۆی بۆ زمانی شیرینی کوردی تەرخان بکا.

"بژی ئاڵاهەڵگری ئازادیی گیتیی بەریتانیای مەزن! نیشتمان"(نیشتمان، ژ3- 4، ل 26- 27)

دانانی رادیۆی کوردستان و دەرکردنی دەنگی گیتیی تازە، کە نیشتمان بەو خۆشبینیە زۆرەوە، هەواڵەکانی بڵاو کردونەتەوە، هیچیان لە بەر خاتری (خزمایەتی) کورد و ئینگلیز نەبوە، بەڵکو دو ئامراز بون بۆ (پرۆپاگاندەی جەنگ) و بەشێ بون لە دەزگای زەبەلاحی راگەیاندنی بریتانیای سەردەمی دوەمین جەنگی جیهانی. دوای تەواو بونی جەنگ ئیشیان بەم دو دەزگایە نەماوە. لە بەر ئەوە هەردوکیان پێچاوەتەوە.

## 2. 5. بۆچونێکی ناکۆک

لە ژ2 دا بە خەتێکی درشت و لە چوارچێوەیەکی دیاردا نوسیوێتی:

"ئەم جەنگەی سەرۆکی گەورەی کورد (مەلا مستەفای بارزانی) هەڵیایساندوە ئیختیلالێکی میللی کوردە"

مەبەستی لە ئیختیلالی میللی، شۆڕشی نەتەوەیی یا نیشتمانی بوە. بێگومان ئەمە پێچەوانەی بۆچونەکانی سەروتارەکەی نیشتمانە کە ئەڵێ: "زۆر کەس وا لێک ئەدەنەوە کە ئەبێ نەتەوەی کورد بە زۆر و نیروی چەک لە دیلی رزگار بکرێت، بەڵام ئەوانە هەمو بە هەڵە چون و رێگای راستیان لێ ون بوە..."

## 3. بابەتە سیاسیەکانی

نیشتمان بێ ناوی نوسەر بە ناونیشانی (تاران- ئەنکارا) نوسیویێتی:

"بێ گومان هەمو کوردێک ناوی ئەم دو شاربازێڕانەی بیستوە، بەڵام هێزێکی ئەم دو ناوە ئەیکەنە سەر بیر و ڕەوانی نیشتمانپەروەرانی کورد گەلێک دەگەڵ ئەم هەستە فەرقی هەیە کە کوردە (ماڵ و مەقام) دۆستەکان بۆیان پەیدا ئەبێ، لە کاتێکا کە لەم دو شاربازێڕانەی ئێران و تورکیا ئەدوێن. چونکو هەمو کوردێکی دڵسۆز و تێگەیشتو ئەزانێ کە لەم دو شارە زلەدا چلۆن چارەنوسی نەتەوەی بێ کەس و کەس بێگانەی کورد وەکو تۆپی پێ (فوتبۆڵ) یاری پێ ئەکرێت.

"چونکو گەنجە وریا و خوێندەوارەکانی کورد بە پێچەوانەی دراوپەرست و بێگانە دۆستەکان ئەزانن لە حاڵێکا کە تورکەکان ڕەگەزی کورد ئەبەنەوە سەر تورک... وە فارسەکان کە خۆیان دەگەڵ کورد بە یەک ڕەگەز دادەنێن-ئەم داوایەشیان ڕاستە- هێشتا حەقێکی پچوک بۆ ژیانی ئەم خزمە هەژار و لێقەوماوەی خۆیان قائیل نین. باش بیری لێ بکەنەوە. دەبێژن هیچ حەقێکمان بۆ تەسدیق ناکەن ئیستگەی رادیۆی تاران هەر لە بەیانەوە تا ئێوارە بە هەمو زمانێک، تەنانەت زمانی ئاسوری کە لە ئێرانا 20 یا 30 هەزار کەسێک ئەبن، دەچرێ بەڵام... لە خۆی قارە ڕۆژی سەعاتێک بە زمانی ئەم کوردانەی پێیان ئەڵێن ئێمە لە یەک ڕەگەزین بئاخێوێ. لە ئێرانا ئەرمەنی، ئاسوری، لە دەبستانا بە زمانی خۆیان ئەخوێنن. کۆوار و کتێب و ڕۆژنامە دەردەکەن، بەڵام کورد ڕەگەزی پاکی ئێرانی خزمی کاربەدەستانی شاربازێڕە گەورەکەی تاران حەقی نیە کۆوار و ڕۆژنامەی ببێت. نابێ بە کوردی بخوێنێت. کاربەدەستانی ئانکاراش بەڵکو گەلێ زیاتر کوردیان تەنگەتاو کردوە، وەکو بیستومانە هەر لەم دواییانەدا چەند کەسێکیان لە گەورەکانی کورد لە ناو بردوە.

"ئەمانە هەمو نەتیجەی خوار تێگەیشتن یا لە خۆ گۆڕینی کاربەدەستانی تاران- ئەنکارایە کە تێ ناگەن، یا خو باش نیە بزانن، مەسئەلەی کورد تا ساڵی 1919 بە مەسئەلەیەکی (محلی) جێگایی دەزاندرا بەڵام لەم ڕۆژەوە کە ژەنەراڵ شەریف پاشای بەدرخانی لایحەی مەشهوری خۆی تەسلیمی کۆنفرانسی ئاشتی کرد و داوای میللی کوردی خستە ئێسکی بەندەکانی 62، 63 و 64 پەیمانی (سیڤەر) ئیتر مەسئەلەی کورد بۆتە پرسیارێکی (بین المللی) و وازی لێ ناهێنرێ.

"چاک نیە تێ بگەن کوردێکی زنجیر پچڕێنەری کە چەند هەزار ساڵە زمانی خۆی ڕاگرتوە و زۆر کەم زمانی بێگانە تێیدا نفوزی کردوە بە تەنگەتاوکردنی ئەوان دەستی لێ هەڵناگرێ و زمانەکەی نابێ بە تورکی یا فارسی ئەگەر بە دزیش بێت لە بن کێوانیش دا بێ کۆوار و ڕۆژنامەی خۆیان دەردەهێنن.

"گۆیا مەسلەحەت نیە چاوێک بە دەستورەکەی ئەتلانتیک، کە لە دو دەرونی وەکو ئاوی ئۆکیانوسی ئاتلانتیک ساف و ڕونی سەرەک ڕۆزفێلت و میستەر چەرچل ڕا هاتۆتە سەر کاغەز و مارشاڵ ستالین پێشەوای دلێری سۆڤیەتستانیش تەسدیقی کردوە، دا بخشێنن و حاڵی بن کە حەقی ژیان دراوە بە هەمو نەتەوەیەکی پچوکی گێتی، کوردی دە ملیۆنی وا لەت و کوت نامێنێتەوە و حەقی خۆی داوا دەکا.

"بۆچی ئەبێ بزانن کە نەتەوەی کورد لە چەند ئاغا و سەردار عەشیرەتێک نەهاتۆتە بەرهەم کە بە دراو و درۆ هەڵیان خەڵەتێنن و بیانکەن بە گژ گەنجە نیشتماپەروەرەکانا. ئەگەر ئەم کاربەدەستانە تێ ناگەن ئەوا ئێمە بۆمان ئاشکرا کردن. خۆ ئەگەر وەکو ئێمە لێکمان داوەتەوە تێ دەگەن بەڵام لە خۆیان دەگۆڕن ئێمە قاقا پێیان پێ دەکەنین چونکو پیاو شێت نەبێ شت لە خۆ ناگۆڕێ و خۆ فریو نادا.

"ئێمە پارلەمانی تاران و ئانکارا وشیار دەکەینەوە کە بە چاکی لەم نوسراوەی ئێمە ورد ببنەوە و لە ڕۆژنامە و رادیۆدا وەڵامەمان بدەنەوە چونکو کاربەدەستانی تاران- ئەنکارا لە خۆیان ئەگۆڕن و خۆشیان و پارلەمان و نەتەوەکانیشیان فریو دەدەن کە پێیان ئەڵێن کوردستانێک لە گێتیدا نایەتە تەشکیل بون."

(نیشتمان، ژ3- 4، ل 30- 33)

له ژمارەی داهاتویدا له درێژەی ئەم باسەدا به ناونیشانی (بەغدا) نوسیوێتی:

"له ژمارەی پێشودا له ژێر ناوی تاران- ئانکارا هێندێک لەم جەور و ستەمەی کـه لـه لایـەن تـورک و ئێرانیەکانەوه له کورد کراوه نوسی بومان، داواشمان لێ کرد بـون کـه لـه رادیـۆ و رۆژنامـەکان دا وەڵاممـان بدەنەوه. بەڵام وەکو ئیداراتی ئێمه پێیـان راگەیانـدوین ئـەم دو حکومەتـه بێـداد و سـتەمکارانه لـه جیـاتی بیرکردنەوه لەم داوایەی ئێمه و پێکهێنانی، کەوتونه سـەروکاری دیتنـەوەی چاپخانـەی ژ. ک. ئێمـه مژدەیـان ئەدەینێ ئەگەر توانییان پێشی بڵاوبونەوەی تیشـکی هـەتاو بگـرن ئینجـا دەشـتوانن چاپخانەکـەی ئێمـەش ببیننەوه چونکو کۆمەڵی ژ. ک به هیمەتی گەنجانی وریای خۆی ئیستا له بەشی زۆری پارچەکانی کوردسـتان دەستی دەڕوا و دەتوانێ له کەمترین وەخت دا گـەورەترین شـت بـۆ دورتـرین جێگـەی کوردوسـتان رەوانـه بکات.

"ئەوا ئەوجارەش حکومەتی بەغدا وشیار دەکەینەوه که وەکو ئێران و تورکیا نەکا بزانێ کورد لـه 20 ساڵی دواییدا چەندیان بۆ حکومەتی عیـراق کـەڵک بـوه. چاکەیـەکی ئێمـه تـا ئیسـتا کردومانـه ئـەم هـەمو سەروەت له بەرانبەر و سەرچاوەی ئـابوری وڵاتەکـەمان داوەتـه دەسـتیان نـەوتی کـەرکوک وەکـو لـه خـاکی عەرەبەکان دا بێ ئیستیفادەی لێ دەکەن خەراپەمان نەدەنەوه داوای کوردەکان به چاکی تەماشا بکەن و بۆیـان پێک بێنن خۆیان نەکەنه نیشانەی تیری ئێمـه. ئەگـەر ئـەوانیش بیانـەوێ چاپخانـەی ژ. ک ببیننـەوه ئـەبێ وشترێک بێنن دەستی به کلکی بگرن رای بکێشن بیگەهێننه زەوی ئینجا ئەگەنه ئامانج.

"دیسان ئێمه دەمانەوێ تاران- ئانکارا و بەغدا وەڵامی ئێمه بدەنـەوه بـه رادیـۆ و رۆژنامـه. ئـەو کوردانەش که مەئموری دیتنەوەی جێگای چاپخانەی ئێمەن ئەگەر تا 24 سەعات دوای خوێندنـەوەی ئـەم ژمارەیه دەست لەم کاره بێ شەرەفانەیەی خۆیان هـەڵ نـەگرن وێنـه (عـەکس) و تـاریخی ژیانیـان چـاپ ئەکەین."

(نیشتمان، ژ5، کانونی دوەمی 1944، ل 23- 24)

ئەم دو وتاره و وتـاری دواتـر تـا ئەندازەیـەک بیروبۆچونـەکانی ژ. ک دەربـارەی کێشـەی کـورد و هەڵوێستی له حکومەتی ئێران و دەوڵەتانی تری ناوچەکه رون ئەکاتەوه، بەڵام چەند سەرنجێ هەڵئەگرێ:

یەکەم:

کێشەی نەتەوەیی کوردی وەکو کێشەی ئازادی به کارهێنانی زمان باس کردوه، نەک وەکو کێشـەیەکی سیاسی که جۆری پێوەندی کورد له گەڵ حکومـەتی ناوەنـدی و بەشـی کـورد لـه حکومـەتی ناوەنـدیدا رون بکاتەوه. ئەم باسه له بەنده بڵاوکراوەکانی مەرامنامەکەیشیدا نابینرێ.

دوەم:

ئەوه جاری دوەم بوه که باسی بەندەکانی پەیمانی سیڤەری کردوه، وەکو پەیمانێکی زیندو و کاریگـەر لێی دواوه، له کاتێکدا ئەم پەیمانـه هـەر زۆر زو مـردار بۆتـەوه و دوای ئیمـزا کردنـی پـەیمانی لـۆزان بـه یەکجاری له گۆڕ نراوه. شەریف پاشا یش بەدرخانی نەبوه. پێ ناچێ نوسەرانی ئـەم وتارانـه زۆر ئاگـاداری وردەکاری روداوەکانی مێژوی کورد بوبن.

سێیەم:

ئەمانیش وەکو زۆر له چالاکەکانی ئەو سەردەمەی بزوتنەوەی نەتەوەیی کورد هیوای گەورەیان له سەر راگەیاندنی ئەتلانتیک هەڵچنیوه. بۆیه به خۆشباوەڕییەکی زۆرەوه لەم وتارەدا باسی راگەیانـدنی ئـەتلانتیک کراوه.

چوارەم:
زمانی نوسینەکەی جۆرێ لە خۆ بایی بون و بە کەم گرتنی حکومەتەکانی ئێـران و تورکیـا و عیراقـی پێوە دیارە.

لە وتارێکی تریشیدا لە ژێر سەردێڕی (مۆسکوا، واشینگتۆن، لۆندۆن) دا نوسیویێتی:

"ئەوە هاواری هەمو کوردانە بۆ ئەو 3 دەوڵەتە گەورانە کە بۆ ڕزگاری و خۆشـبەختی گێتـی بـە شـەڕ دێن. کوڕ و باب و برای خۆیان بە کوشت (ئەدەن) تا کوڕ و باب و بـرای نەتـەوە پچوکـەکان یێـک شـاد و شوکر بن. زەوی و زاری کێڵدراو و پڕ حاسڵی خۆیان بە سوتان دەدەن و دەیکەنە پێشێل و، مـاڵ و منـداڵی خۆیان برسی دەکەن، تا دەشت و کێوی بەیار و ڕەقوتەقی ئەوان ببێتە کێڵگە و پێخوست نـەبو کـوڕو کاڵیـان تێر و تەسەل بن، ئەو هـەمو کارخانـە گـەورە و کۆشـک و باڵەخانـە ڕازاوە و ئاوەدانانـەی خۆیـان دەکەنـە نیشانگەی بۆمب و تۆپ و ئاور، وە بە تێکدان و وێرانبـونی دەدەن، بـە کـەم بـەرگی و بـێ خـانویی میلـەتی خۆیان ڕازی دەبن، تا دەزگای جۆلایی و خەرەک و ئاشی ئەوان بە ئارامی بگەڕێ و، جاو و بـوزو و ئـاردی ورد بۆ بەرگ و خواردەمەنی ئەوان ساز بکا و، بە کۆک و پۆشتەیی و دڵخۆشی دە کـوخ و خـانوە نـەوی و پچوکەکەی خۆیان دا بژین. ئـەو ڕەوشـتە لای ژوروی پیـاوەتی و ئینسـانیەت و بەشـەریەتە و، دەبـێ ببێتـە سەرمەشقی هەمو دەستڕۆییوێک.

"خشڵ و خۆڕازاندنەوەی پیاوان ئاکاری چاکە نەک بگرە و بەردە و زێڕ و زێوەر و دیمـەنی چـاک و دڵ و دەرونی پیس و خراپ، ئەو 3 دەوڵەتە گەورانە بڕیاریان داوە هەر بە چاوێک تەماشای گشت نەتەوەکان بکەن و نەهێڵن زۆردار بـێ زۆر بخـوا، هێـزدار بـێ هێـز قـوت بـدا و، ئـازادی و سـەربەخۆیی بـە تـەواوی نەتەوەکان ببەخشن.

"کوردیش کە یەکێک لە گەلانی بەشخوراو و زۆرلێکراوە لە سەر ئەو بڕیارە لە ئازادی و سەربەسـتی و ڕزگاری خۆی دڵنیایە، وە هێندی هەمو دنیا بەم بڕیارە دڵخۆشە و شانازی پێوە دەکا، چونکو هیچ میلـەتێ وا ژێرچەپۆکە و سوک و چروک و بەشخوراو نەبوە.

"دراوسێکانی ئێمە: تورک، عەرەب و فارس، ئێمەیان لە ناو خۆیان دا بەش کـردوە و، بـە چـاوی دیلـی و یەخسیری تەماشامان دەکەن و، هیچ چاکەیەکمان پێ ڕەوا نابینن و، لە هیچ خراپەیەک دەربارەمان خۆ ناپارێزن.

"بۆ ئەوەی وردە وردە لە ناو خۆیان دا بمانتوێننەوە نایەڵن بـە زمـانی خۆمـان بخـوێنین و بنوسـین، تەنانەت لە قوتابخانەکان دا دەبێ ئاخاوتنیشمان بە زمانی وان بێ، نایەڵن خۆ بە خۆ ڕێک بکەوین، ئەگەر دو کەس پێکەوە کۆ ببینەوە بە ناوی سیاسەت دەمانگرن و دەمانکوژن.

"خەریکن لە لای ئێوە کە بڕیاری ژیانی سەربەخۆتان بـۆ هـەمو نەتەوەیـەکی پچـوک داوە، ڕەگـەزمان بەرنەوە سەر خۆیان: بە تورک، عەرەب و فارسمان بناسێنن، تا هاوارمان نەگاتە پێشگای عەدالەتی ئێوە.

"خۆ ئێوەش دەزانن، مێژوش گەوایی دەدا، کە کورد نەتەوەیـەکی جیـاواز و بنەماڵەیـەکی سـەربەخۆ و پاکە. نە عەرەب، نە تورک و نە فارسە. نەدەشبینە هیچ یەک لەوانە.

"کورد بە هیچ بارێک لەو نەتەوانەی کە دە ژێر سایەی ئێوەدا ئازاد و موسـتەقیل دەژیـن کـەمتر نـین. تکامان وایە ئێمەش لە قەومانی تر هەڵ ناوێرن وە زیاد لەو هەمو نەتەوە گەورە و پچوکانە کوردان دڵشکاو و جەرگبڕاو نەکەن و ئاهونزولەی ئەو هەمو ژن و منداڵە بێکەس و هەژارانە مەهێننە سـەر خۆتـان. ئەوەنـدەش بزانن عەرەب و تورک و فارسەکانیش تێ بگەهێنن کە کورد چاویان کراوەتەوە و دەزانن زەمانی یەخسـیری و بەندەیی نەماوە، ئەو هەمو شەڕ و کوشتارە لە پێناو وشەی پیرۆزی (ڕزگاری- ئازادی) یە و، تازە ناچنـەوە

ژێر باری ئاغا و نۆکەریی هیچ کەس. هەرکەس بە تەمای داگیرکردنـی کوردسـتان بـێ، لازمـە سـەر و لەشـی سەربازانی خۆی و کوردان بکاتە پردەباز و کەشتی، تا لە زەریای خوێنی خـۆی و کـوردان بپەڕێتـەوە بـەری کوردستانی گەورە.

"کورد گەلێکی گەورە، دارای وڵاتێکی پڕ خێر و بەرەکەت، کە بە خوێن کڕاوە و پارێزراوە.

"رستەیەکی کوردی هەیە کە هەمو کورد باوەڕیان پێی هەیە و دەڵێن: (ژین وەک لێیان کردۆتـە هـەرا وا خۆش نیە، مردنیش وەک لێیان کردۆتە هەرا وا ناخۆش نیە)

"پێداویستە عەرەب، تورک و فارسەکان، چاک بیر لە داوای میللی ئێمە (کوردان) بکەنەوە و، چی دیکـە خۆمان لێ گێل نەکەن و لێمان نەبنە وشتری ناو پەمبو.

"دەستی ئێمە و داوێنی ئێوە، ئەی حکومەتە گەورە و دادپەروەرەکانی گێتی!"

(نیشتمان، ژ7- 9، نیسان - حوزەیرانی 1944، ل 5- 6)

لە وتارێکی تردا کە بێ ئیمزا بە ناونیشانی (مایەی رزگارنەبونی ئێمە لـە زنجیـر و کەڵەمـەی دوژمـن چیە و کێیە؟ بۆچی پێش ناکەوین؟) بڵاوکراوەتەوە، هەندێ لە برگەکانی لێ هەڵبژاردوە و بـە حـەرفی درشـت وەکو مانشێت دوبارە نوسیوێتیەوە، کە ئەبێ بۆچونەکانی ژ. ک رون بکاتەوە ئەڵێ:

"لە دونیای ئیمرۆدا ژیان بە یەخسیری و ژێردەستی هیچ ناهێنێ. میلەتێکی ژێردەستی ئەم و ئەو بێـت وەک هەتیوی بێ دایک و باب هەمیشە هەناسە سارد و رەنـگ زەردە. ئـەم هـەمو هـەرا و شـەڕە بـۆ ئـازادی هەڵاییساوە حکومەتی سۆڤێت ئەگەر ئازادی و سەربەستی نەتەوەکانی لە لایەن ئەڵمانەکانەوە نەخرابایـە ژێـر هەڕەشە و تەهدید هەرگیز شەڕی نەدەکرد و خوێنی لاوە ئازاکانی خۆی بە خۆڕایی بە رژاندن نەدەدا. نرخـی هەمو شتێک لەم دونیایەدا مەعلومە مەگەر نرخی ئازادی و سەربەستی.

"سەربەستی گەوهەرێکە بێ هاوتا کە لە بازاڕی جیهان دا بە خوێن تەسعیر کراوە.

"سەربەستی بۆ میلەت لە رادەی نان و ئاو دایە واتا چلۆن ئادەمیزاد بە بێ نان ناژێت هەروەها بـە بـێ ئازادیش ناتوانێ بژی.

"ئەم زنجیر و کەڵەمەی دیلی کە خراوەتە ئەستۆی نەتـەوەی بـە شـەهامەت و رەشـیدی کـورد سـەتحی ئەخلاقی ئەم قەومە ئازا و نەجیبەی زۆر هێناوەتە خوار.

"میلەتێکی لە گەڕانەوەی دە هەزار نەفەری یۆنانیەکان دا عەشیرەتەکانی بۆ محافەزەی نیشتمانی خۆیان شەڕێکی تاریخی و بە ناویان کرد، میلەتێکی لە تەواوی چەرخەکانی تاریخا بلیمەتی و ئەهمیەتی مەقامی خـۆی لە ژێر بەیداغی دلێری و ئازاییدا بە هەمو دونیا سابیت کردوە، ئیستا ملی لە بن نیری دوژمنا چەماوەتـەوە و عەشیرەتەکانی لە باتی تۆڵەئەستاندنەوە و ئینتیقام لە دوژمن خەریکی کوشتن و تـاڵانی یـەکترن. دوژمـن بـە ئەنواعی درۆ و دەلەسە هەڵی خەڵەتاندون و ئەیانکا بە گژ یەکا. ئەمەیە مایەی پێشنەکەوتنی ئێمە. ئەمەیە هۆی هەرە زلی دواکەوتنی کورد.

"ئەگەر پێتان خۆشە جارێکی تر ژن و منداڵتان توشی نارەحەتی و چارەڕشی نـەبن، ئەگـەر حـەز بـە خۆشی ژیانی دوارۆژی خۆتان و قەومی کورد ئەکەن، بە کوردی و بە کـورتی ئەگـەر ئەتانـەوێ دوای جـەنگ دیسان ناموستان نەخرێتەوە ژێر چەکمەی دوژمنی تینو بە خـوێنی کـورد، لـە بـاتی کوشـتن و تـاڵان کـردن خەریکی برایەتی و رێککەوتن بن تا بتوانن هەر شتێکی بێتە مایەی پێشکەوتنی کـاری قـەومی کـورد هـەڵی بگرن. کورد تەنیا بەم رێگەیەدا توانی دەربازبون لە هەمو جۆرە چارەڕەشی و نەکبەتیەکی بۆ دێتە بەرهـەم وە فریای داواکردنی ئەم حەقە ئەکەوێت کە معاهەدەی سیڤەر بۆی داناوە بە بـێ ئەمـەی کەسـێک بتوانێـت بێتـە

بەرهەڵستی ئەم داوا مەشروع و لێ نەپرسراوەمان. بێ شک ئەگەر لەم جەنگەدا کورد، هەروەکو دوژمنـانی بـە هەمو نەوعێک بۆ پەست کردنی تێ دەکۆشن، حەول نەدات و هەر دەسخەڕۆی دوژمنـی بـێ ئینسـاف و زاڵـم بێت، پاشەڕۆژێکی تاریکتر بۆ خۆی ئامادە دەکات.

"ئەی ڕوئەسای عەشایری دلێر و غەیوری کورد!

"کەمێک ورد ببنەوە و تۆزێک بیر لە حاڵی ئیمڕۆ و دوێنێتان لە دوێنێک دا کامتان لە هەموان گەورە و مەزنتر بو بەرانبەر بە مەئمورێکی خوێڕی حکومەت نەدەوێرا قسە بکات و زمانی لێ تێکەڵ دەبـو، ئیسـتا کـە خوا بەزەیی بە چارەڕەشی ئێمەدا هاتوە و زنجیری زوڵـم و سـتەمی دوژمنـی لـە شـان و پیلـی کـورد لـە دو پارچەی کوردستانی داگیرکراوی عیراق و ئێران داماڵیوە کارێکی وا مەکەن هـەوری قـەهر و غـەزەبی خـوای گەورە و بەرز گلێرەی نەگبەت و چارەڕەشی‌مان بە سەردا ببارێنێت چونکو (الملک یبقی مع الکفر ولا یبقی مـع الظلم) زوڵم چ دەربارەی بێگانە یا خۆمانە بکرێت خراپەی لێ دەوەشێتەوە، بناغەی کار تێک ئەدا، ئادەمیزاد لە ئاسمانی بەختیاریڕا دەخاتە ناو چاڵی چارەڕەشی و نەگبەتی. پاشەڕۆژتان لە بیر نـەچێت دونیـای ئیمـڕۆ و سبەینێ دونیای سەربەستی و ئازادیە. مردن گەلێ لە دیلی و ئێخسیری خۆشترە. تێکۆشن یاخۆ ڕزگار کەن و سەربەستی بستێنن یا بە جارێک بمرن.

"بژی کورد و کوردستان بە سەربەستی و سەربەخۆئی."

(نیشتمان، ژ2، ل 4- 8)

ع. **بێژەن** لە (ڕێک کەون تا سەر کەون) دا نوسیوێتی:

"تاریکەشـەوی دوای 17 و 18 ی مانـگ لـە پەنجـەرەی ژورەکـەما چـاوی پـێ بـڕی بومـە ئاسـمان. ئاسمانێکی پڕ لە ئەستێرەی سیس و گەش، ئاسـمانێکی هـەوراوی، ئاسـمانێکی شـین و ڕەش و چـاوەڕوانی دەرکەوتنی مانگم ئەکرد. چاوشارکێی ئەستێرەکان وەک کانیتیزورێکی چـالاک لـە هۆشـی بـردم تـاریکی و دیمەنی شیرینی ئاسمانیش خستبویانە حاڵەتێکی بیر و هۆشەوە وام ئەزانی ئەوا من باڵـدارێکی بچـوکم لـە ئاسمانی کوردستانا ئەسوڕێمەوە لە سەر گۆمی وان را بە سەر چیاکانی زاغرۆس دا فڕیمە سەر گـۆمی ورمـێ لە وێرا بە سەر خاکی موکوریان و ئەردەڵانا چومەوە کرماشان و لوڕستان و... و.. بەڵام لە هـەمو شـوێنێکی وڵاتەکەمانا هێندەم مەردمی بێگانە دیت سەرم سوڕمابو وتم بەڵکو ئەمانە میوانن تێ فکـریم لـە خانـەخێویش زیاترن ئینجا دوردۆنگ بوم بە خۆم گوت ڕێگام هەڵە کردوە و لە ئاسمانی کوردسـتان وە دەرکـەوتوم سـەرم هەڵبڕی چیاکانی تۆرۆس، ئەڵوەند، حەمرین یەک یەک وە بەر چاوم هاتن ئەیانگوت نا! ڕێگەت هەڵە نەکردوە ئەم ئاسمانەی تۆ تێیا ئەسوڕێیەوە ئاسمانی کوردستانە، ئەم چیا و کێو و دەشت و شیوانەی لە بـەر چـاوتن هەمو کوردستانە بەڵام ئەم بێگانانەی تۆ ئەیانبینی لە بەر دوبەرەکی و خۆخۆری ئێوە لە هـەمو ئـەو شـتانەی خوا بەخشیویە بە کوردستان کەڵک ئەسێنن ئەگەر پێت ناخۆشە بڕۆ بە نەتەوەکەی خۆت بڵێ سـەرکەوتن لـە ڕێککەوتنایە. ڕێک کەون تا سەرکەون!"(نیشتمان، ژ1، ل 6-7)

ع. **بێژەن** کۆتایی وتاری (بۆچی نەگریم؟) بەمە دێنێ:

"نە نە براکان، خۆشەویستەکانم وا گوێم لە ئاهوناڵەی نیشتمانە کە بە کڕوزانەوە پێم ئەڵێ: ڕۆڵە گیان گریان کاری پیرێژنانە، تا دەرگای مردن و مراندن لە سەر پشتانە، شیوەن و زاری ئیشی ناپیـاو و پەسـتانە. خۆ ئێمەش خۆمان بە لاوێکی ئازا ئەزانین و مەعنای بەزین نازانین، کەوابو با بچینە سـەر چیـا بڵێنـدەکانی نیشتمانمان، بە گەوایی ئەوان، پەیمانێکی برایەتی ببەستین کە وەکو ئـەم چیایانـە زەنگـین و سـەنگین و بـە خوێنی جەرگمان ڕەنگین بێ، بۆ گەلی هەژاری کورد دوایی هێنی ژیانی نەنگین بێ، ببێتە یارمەتی دەری ئێمـە بۆ مردن و مراندن لە ڕێگای ڕزگاریدا."(نیشتمان، ژ3-4، ل 26)

**پشتیوان**، کە ئەبێ یەکێ لە سەرکردەکانی ژ. ک بێ (تکا لە کوردە ناودارەکانی ئیستا) ئەکا و ئەڵێ:

"ئەی سەردار عەشایر و پێشەوایانی کورد!

"ئەورۆ رۆژێکە سەروماڵ دەپێناو راگرتنی حقوقی کورد و کوردستانی گەورە ئەرجێکی نیە. مـردن لـە رێگای ئازادی بە شەرافەت گەلێک خۆشترە لە ژیانی ژێردەستی و ئەسارەت.

"دیسان لەو کوردانەی کە بونە هۆی دوبەرەکی قەومی کورد و وەکو فریزو رەگیان لە بـاغ و بێسـتانی بەختی کورد هاڵاندوە و سیس و بێ بەریان کردوە تکا دەکەم دەست لەم کارە پەستە هەڵگرن حەیفە با بـاغی کوردایـەتی وا زەرد و بـێ رەنـگ نـەبێ. چـەنگالی شـێری بێشـەی لانـی کوردسـتان بـۆ دەرهێنـانی رەگـی خواروخێچی وان زۆر بە هێز و لە بارە."

ئینجا هەڕەشەیان لێ ئەکا و ئەڵێ:

"بە تایبەتی نەتەوەیەکانی کۆمەڵی ژ. ک وشیار دەکەمەوە کە رێگا هەتڵە نەکەن و پێیان وا نـەبێ ئـەم کۆمەڵەی ئێمە گاڵتەیە. سەری گۆشتینی خۆیان لە مستی ئاسنینی ئێمە بپارێزن.

"بژی کورد و کوردستانی گەورە و کۆمەڵەی ژ. ک"

(نیشتمان، ژ6، ل 12)

لە وتارێکی بێ ناوی نوسەردا، لە ژێر ناوی (تەماع) دا نوسیوێتی:

"هۆیەکی زلی دواکەوتنی کورد تەماع و پولپەرستیە...

"ئەی ئاغاوات و سەردار عەشیرەتەکانی کورد! ئێوە بن و خودا ئـەم تەماعـە (کـە بـە یـەقینی رۆژێـک ئەبێتە هۆی ماڵوێرانی خۆتان) فڕێ دەن تا سەربەخۆئی کوردستان وە دوا نەکەوێت."(نیشتمان، ژ1، ل 3)

لە کورتە وتارێکی تردا بە ناونیشانی (بۆ گەنم کڕ)

"ئەی گەنم کڕ! ئەی مایەی گرانی و تەنگی و چەڵەمەی وڵات، ئەی باعیسی سەختی ژیانی دەسکورت و هەژارەکان، ئەی ئاور تێ بەردەری قەیسەری خەڵک بۆ دەسرۆکەی خۆت، تۆ ئەبێ بزانیت:

"ئاهوناڵەی نیوەشەوی داماو و برسیەکان کە بە هۆی گەنم کڕینی تۆ کەوتۆتـە تەنگانـە وەک دوکـەڵی چێشت و شیوی تۆ لە هەمو کاتێکا بەرەو دەرگای ئاسمان هەڵ ئەکشێت ئەم ئاهوناڵە بە تـین و تـاوە هێنـدە ناکێشێ ئاوی هێمنی سەبری خوا دێنێتە جۆش و ئەی کا بە هەڵمێک کە لە بـەر ئاسـمانی بـەخت و ئیقباڵـت ئەبێتە هەورێکی رەشی بە ترس هەر بەم زوانە لەم هەورە رەشە کە وەکو چـارە و بـەختی هەژارانـە تـەرزە و گلێرەی نەکبەت و چارەڕەشی بە سەر خۆت و ژن و منداڵت دا بە وێنەی بارانی بـەهاری ئـەبارێت لـە بڵێنـدی بەختیاریا ئەتخاتە چاڵی بێ بەختی ئەوسا هەمو کەس تێ ئەگەن کە سـکاڵای هـەتیوی، بـێ دایـک و بـاوکی، برسی و رەشوڕوت چۆن قەهر و غەزەبی خوا ئەدا بە سەر گەنم کڕا.

"ئەی گەنم کـڕ چـۆن دامـاو و بـێ دەسـەڵاتەکانت توشـی برسـێتی کـرد خـوا مـاڵ و منداڵـت بخاتـە برسێتی."(نیشتمان، ژ1، ل 17)

زمانی وتارەکانی تەڕ و پاراو و پاکن، داڕشتنی رستەکانی جـوان و پتـەون، هـەم رێزمانەکـەی و هـەم رێنوسەکەی بە گشتی لە ژێر کارتێکردنی ئەو زمانە باوەدا بون کە لەو سەردەمەدا لە عیراق گەلاوێژ و ژیـن و دەنگی گیتیی تازەیان پێ نوسراوە.

ناوەڕۆکی هەنــدێ لــە بابەتــەکانیان زۆرتــر لــە (وەعــزی مــەلا) و (نەســیحەتی ریشســپی) و (دوعــا و پاڕانەوەی پیاوچاکان) ئەچن، بۆ دواندنی هەستی سادە و سۆزی بــە جۆشــی خوێنــەر، تــا بــە شــیکردنەوەی زانستیی دیاردە کۆمەڵایەتیەکان و ئەنجامگیری سیاسی روداوەکانی ناوچەکە و جیهان.

## 4. گۆشەکانی

### 4. 1. گەنجینەی ئەدەبیات

نیشتمان بایەخێکی زۆری داوە بە شیعر، بە تایبەتی شیعری سیاسی. رەنگە هۆی ئەمــەیش ئــەوە بــێ کە:

یەکەم:

دو کەس لە نوسەرە سەرەکیەکانی شاعیری هەڵکەوتوی بە توانا بون و، زەبیحــی خۆیشــی جاروبــار شیعری داناوە.

دوەم:

رادەی نەخوێندەواری لە ناو دانیشتوانی ئەو سەردەمەی کوردستاندا زۆر بەرز بــوە. لــە نــاو کۆمــەڵی نەخوێندەواردا شیعر، بە تایبەتی بۆ مەبەستی سیاسی، لە پەخشان ئاسانتر و زوتــر بــڵاو ئەبێتــەوە و لــەبــەر ئەکرێ.

کاریگــەریی شــیعرەکانی نیشــتمان بــۆ قوڵکردنــەوەی هۆشــی سیاســی نەتــەوەیی لــە نــاو کۆمــەڵی کوردەواریدا ئەگەر لە کاریگەریی وتارە سیاسیەکانی زیاتر نەبێ کەمتر نیە. لە بەر ئەوە هەر لێکۆڵینەوەیــەکی دەربارەی بیروباوەڕی ژ. ک و گۆڤارەکەی بکرێ، پێویست ئەکا شیعرەکانیش بە بابەتێکی سەرەکی دابنرێ.

(گەنجینەی ئەدەبیات) لــە هــەمو ژمارەکــانیدا هەیــە و چەنــدین لاپــەڕە بــوە. لــەم گەنجینەیــەدا چەنــد شیعرێکی سیاســیی گرنگــی بڵاوکردۆتــەوە بــێ ئــەوەی نــاوی شــاعیرەکانی هێنــا بــێ. لــە جــێی ناوەکــەی نوسیویەتی: (شاعیرێکی بە ناوبانگ) و (بوێژێکی ناودار).

لە قەسیدەیەکدا بە ناونیشانی: (کۆمەڵی هیوا و حەرفی ژ. ک) ئەڵێ:

ئەی خودایا بۆم بنێری قاسیدێکی سینە ساف
بچتە خزمەت کۆمەڵی هیوا و حەرفی ژێ و کاف
گیر نەبێ، بڕوا، لە قەولی من بچێ پێیان بڵێ:
ئەی مودیری ئیتیحاد و ئەی مەداری ئیئتیلاف
ئینجا ئەڵێ:
کەس نیە پێیان بڵێ: ئەی پڕ نیفاقی بێ ویفاق
تا بە کەی تو خودا هەتا کەی ئەو شیقاق و ئیختیلاف
غەیری کوردی بێ تەعەسوب میللەتی دونیا هەمو
بونە ساحیب سەروەت و عیلم و سەواد و موشکاف
ئیختیراعی رادیۆ و تەییارە بۆ مە هاتە رو
چونکی پێیان هیچ نەبو ماشینی زەمینی و تێلگراف
هیمەتو ئەوڕۆکە بێ، ئەوڕۆکە ڕۆژی غیرەتە
دەس بدەینە دەستی یەک، روبکەینە مەیدانی مەساف

رەفعی زوڵم و حیفزی ناموس و حقوقی میللەتێ
چاکترە سەد مەرتەبە لە زیاراتی بەیت و تەواف
یا بە ئازادی و بە شادی دەچنە ناو حەلقەی میلەل
یا لە سەر کورسی سەر و مل دەچتە نێو حەلقەی تەناف
(نیشتمان. ژ3-4. ل 20- 21)

لە شیعرێکی تردا بە ناونیشانی (بیکەین بە جمهوری) ئەڵێ:
لە رۆژنامەی مودیری کەچ مەداری چەرخی شەفتوری
ئەنوسێ رۆژی کورد کەوتە ئەوجی بورجی بێ نوری
بوخار و دوکەڵی بێ ئیتیفاقی و سوئی ئەخلاقی
موجەسەم بو بە هەوری نەگبەت و رۆژ کەوتە مەستوری
لە بەر بێ فکر و ئیقدامی رەئیسانی عەشایر بو
کە رۆژن بۆتە زوڵماتی شەوی تاریکی دەیجوری
هەمو میلەت گەیشتنە مەنزلی مەقسود و خۆشنودی
فەقەت کوردن بە جێ ماون بە مەحرومی و مەهجوری
عەزیزم ئیفتیخاری خارجی هەم عیلمە هەم سنعەت
بە ملیۆن و بە فرسەخ تۆ لە عیلم و مەعریفەت دوری
تەماشاکە لە بەر شوعلەی چرابەرق و ئەلەتریکی
کورەی ئەرزی هەمو یەکپارچە بۆتە یەک کورەی نوری
مەگەر تۆش هەر بە پشتێندی زل و پێچ و شەدەی هەوری
بنازی بیکەیە ئەسبابی کیبر و فەخر و مەغروری
برا بیری چراییکی بکەن تاریکە شەو دادێ
قیامێکی بکەن تا فرسەتە بیکەن بە جمهوری
(نیشتمان. ژ5. ل 19- 20)

### 4. 2. دەمەتەقێیەکی دو کەسی

گۆشەیەکی هەمیشەیی نیشتمان بوە بە ناونیشانی (دەردی دەرون). لە ژ1 و 2 دا بە پەخشان و لەوە بە دواوە بە شیعر (دەمەتەقەیێکی دوکەسی لە نێوان بایز و باپیر) دا بە زمانێکی سادە و بە شێوەی گاڵتەجاڕی هەر جارەی بۆ باسێکی رۆژ تەرخان کراوە. نمونەی ئەمە هەرچەندە پێشتر بە (پەخشان) لە (پێشکەوتنی سلێمانی) و، لە هەندێ رۆژنامەکانی دوای ئەودا هەیە و، لە ئێران یش لە کۆنەوە ئەم بابەتە لە هەندێ گۆڤار و رۆژنامەدا باو بوە، بەڵام بڵاوکردنەوەی لەو کاتەدا، بەو شێوەیە بە شیعری رەوان و پەتی، داهێنانێکی تازە بوە لە رۆژنامەوانیی کوردیدا. ئەو سەردەمە نیشتمان ناوی نوسەری ئەم دەمەتەقێیانەی نەنوسیوە. بەڵام دواتر ئاشکرا بوە کە دانەرەکەی هەژار بوە و، لە شەستەکاندا ئەمەی کردبو بە رێچکەیەکی پێڕەویکراو لە شیعرە سیاسیەکانیدا، بۆ پەلاماردانی ناحەز و دوژمنەکانی بارزانی. (بۆ کوردستان) مکەی زۆر نمونەی لەم بابەتەی تێ دایە.

دەمەتەقێی ژ1 بە پەخشان نوسراوە باسی کڕینەوەی گەنم لە ئاغاکانی کورد و گرانکردنی ئەکا.(ل 4- 5)

هی ژ2 یش پەخشانە باسی هەواڵی سەرکەوتنی ئۆردوی سورە بە فەرمانی مارشـاڵ سـتالین بـە سـەر هیتلەر دا.(ل 9- 10)

هی ژ3- 4 باسی بانگهێشتنی گەورەپیاوانی کورد ئەکا لە لایەن سۆڤیێتەوە بۆ باکۆ. تانەی ئەوەیان لێ ئەدا کە لە باتی ئـازادی بـۆ کوردسـتان داوای قەنـد و چایی‌یـان لـێ کـردون بـۆ خۆیـان(ل 12- 13). لـەم ژمارەیەوە دەمەتەقێ ئیتر بە شیعر هۆنراوەتەوە.

هی ژ5 باسی راگەیاندنی ئەتلانتیک و مژدەی ئازادی گەلان ئەکا.(ل 8- 9)

هی ژ6 دیسانەوە چۆتەوە سەر باسی قەند... (ل 9- 10)

### 4. 3. لە ناو کۆمەڵەدا

لەم گۆشەیەدا هەندێ لە دەنگوباسەکانی کۆمەڵە و چالاکیەکانی و بەندەکانی مەرامنامەی باس کردوە.

لە ژ2 دا ئەم هەواڵەی بڵاوکردۆتەوە:

"جێژنی سەر ساڵی کۆمەڵ

رۆژی 25 ی گـەلاوێژ جێژنـی سـاڵانەی کۆمـەڵ بـە شـکۆوە و خۆشـیەکی زۆرەوە گیـرا و گـەلێ لـە ئەندامەکان مەقالەی باشیان نوسی بو خوێندیانەوە کە لە پاشان چاپیان ئەکەین."

### 4. 4. بابەتی مێژویی

(میجەر سۆن دەرحەق بە کورد چی ئەڵێ) بەشێکە لە کتێبی (تاریخی کورد و کوردسـتان)، لـە محەمـەد ئەمین زەکی‌یەوە وەری گرتوە.

(نیشتمان، ژ1، ل 6- 7)

لە بابەتێکی تریدا بە ناونیشانی (کورد و عیسبەتول ئومەم) نوسیوێتی:

"دوای شـەڕەکانی 1914- 1918 کـە کۆنفرانسـی ئاشـتی سـاز بـو جـەنابی (شـەریف پاشـای بەدرخانی) لایحەیەکی دا بەم کۆنفرانسە کە لە دواییا بەندی 62 و 63 و 64 ی موعاهەدەی سیڤەری داگیـر کرد. ئەوا لە ژێرەوە عەینی ئەم بەندانە کە جەنابی مامۆسـتا رەفیـق حیلمـی لـە کتێبـی (عیـراق و عیسـبەتول ئومەم) ی وەرگرتوە بۆتان دەنوسین."

ئینجا هەر 3 مادەی پەیمانەکەی نوسیوەتەوە. لە کۆتاییدا نوسیوێتی:

"برا خۆشەویستەکانمان ئەمە سەنەدی سەربەخۆیی کوردستان بو بۆمان گێڕانەوە بزانن چەند ساڵە و، چەند و چۆن جەور و ستەم لە کوردی بەستەزمان کراوە. حەقێکی وا مەشـروعی ئێمـە خراوەتـە بـەر پێـیان هێشتا ئێمە بە خۆمان ئەڵێین زیندو.

"هەی بەڵای لێ دا ژیانی وا بە زەلالەت!"

(نیشتمان، ژ1، ل 17- 19)

لاپەڕەی 11 ی ژ2 ی تەرخان کردوە بۆ وێنەیەکی (جەنابی شێخ عەبدولقادر شەهیدی ڕێگای سەربەسـتی کورد) و لە لاپەڕەی دوای ئەودا لە ژێر سەرناوی: (مەحکەمەی مەنحوسی ئیستیقلال) دا نوسیوێتی:

"دوای قیامی شێخ سەعید، کە ئیختیلالێکی میللی کورد بو، لە بەر بێ ئیحتیـاتی مـەجبورەن بـێ مـەوقیع دەس پێ کرا و نەتیجە بە گیرانی شێخ سەعید ئەفەندی رەئیسی ئیختیلال و هەندێک لە مودیرانی، قیام تەواو بو. لە لایەن حکومەتی جمهوری تورکیا مەحکەمەیەکی ئیستیقلال تەشکیل درا و جەنابی شێخ سـەعید و شـێخ

عەبدولقادر و گیراوەکانی تر لەم مەحکەمەیە دوای محاکەمەیەکی سەرسەری بێ ویجدانانە مەحکوم کران و هەڵاوەستران. ئەم پیاوکوژی و جینایاتە هێزێکی تایبەتی کردۆتە سەر مێشکی هەمو کوردێکی نیشتمانپەروەر، هەر کەسە بە جۆرێک:

"مێژونوسەکانمان بە دەرج کردن لە لاپەڕەکانی تاریخ، دەنگخۆش و گۆرانبێژەکان بە بەیت و بەندوباو، بوێژەکان بە هەڵبەستە، ئەم فاجیعەیان بە حروفی ئاگرین لە دڵی نەتەوەی کوردا نوسیوە. م. ش. هێمن کە یەکێکە لە ئەندامەکانی کۆمەڵە هەڵبەستێکی بە سەرەتایەکی پچوکەوە بۆ ناردوین کە عەینەن لە گەنجینەی ئەدەبیاتمان دا دەرجی ئەکەین."

بە دوای ئەم پێشەکیەدا شیعرێکی هێمنی بڵاو کردۆتەوە.

ژنێکی بوێژی کورد (حەیران خانمی دونبلی) باسی ژیانی ئەم ژنە نەناسراوەی کردوە و شیعرێکی بە نمونە هێناوەتەوە.

(نیشتمان، ژ3- 4، ل 29)

لە (کورد لە حەیات ئینسیکلوپیدیاسی) دا ع. بێژەن بەرپەرچی هەندێ بیروڕای چەوتی تورکی داوەتەوە دەربارەی نفوس و ڕەچەڵەکی کورد.

(نیشتمان، ژ5، 1- 4)

م. نادری وتارێکی یوسف مەلیکی بە ناونیشانی (کوردستان) لە ڕۆژنامەی (اللوا) ی لوبنانیيەوە لە عەرەبیەوە وەرگێڕاوە بۆ کوردی.

(نیشتمان، ژ6، ل 13)

#### 4. 5. بەشی طبی

نیشتمان گۆشەیەکی بۆ باسی پزیشکی تەرخان کردوە.

لە ژ1 دا (جیگارە چۆن ئەکێشرێت؟) باسی زیانی جگەرە کێشان ئەکا و،

لە ژ3- 4 دا باسی زیانی خواردنەوەی (ئالکول) ئەکا و،

لە ژ6 و 7- 9 دا (ئیرەج) باسی نەخۆشی (تیفوس) ی نوسیوە. لەو ساڵانەدا تیفۆس لە کوردستانی ئێران، بە تایبەتی لە دێهاتەکانیدا، زۆر بڵاو بوە و گەلێ کەسی کوشتوە.

### 5. شوێنی نیشتمان لە ڕۆژنامەوانیی کوردیدا

نیشتمان لە دوای تێشکانی جوڵانەوەکەی سمکۆ، لە سەرانسەری کوردستانی ئێراندا، یەکەمین بڵاوکراوەی کوردی بوە، بڵاو بوبێتەوە. نیشتمان بڵاوکراوەیەکی ئاسایی نەبوە. بەڵکو زمانی حاڵی ڕێکخراوێکی نهێنیی خاوەن پەیامی ڕزگاریخوازیی سیاسی و بیروبۆچونی پێشکەوتنخوازیی کۆمەڵایەتی، ئابوری، ڕۆشنبیری... بوە. نیشتمان هۆشی نەتەوەیی لە ناو دانیشتوانی موکریاندا قوڵتر کرد و زەمینەی خۆش کرد بۆ دامەزراندنی حیزبی دیمۆکراتی کوردستان و حکومەتی کوردستان و، ڕێگەی تەخت کرد بۆ دەرچونی زنجیرەیەک ڕۆژنامە و گۆڤاری کوردی، لە سەرو هەمویانەوە ڕۆژنامەی (کوردستان) ی بڵاوکەرەوەی بیری حیزبی دیمۆکراتی کوردستان.

دەنگدانەوەی دەرچونی نیشتمان لە گۆڤار و ڕۆژنامەکانی سەرانسەری کوردستاندا خۆی لە خۆیدا نیشانەی گرنگیی ئەم گۆڤارە و پایەی بەرز و بڵندێتی، نەک هەر لە ڕۆژنامەوانیی کوردیدا بەڵکو لە جوڵانەوەی ڕزگاریی نەتەوەیی کوردا. ژین و گەلاوێژ و ڕۆناهی و ڕۆژانو لە سەریان نوسیوە.

### 5. 1. دەنگدانەوەی لە کوردستاندا

گەلاوێژ لە ژ9 ی ساڵی 4 ی ئەیلولی 1943 دا لە ژێر ناونیشانی (نیشتمان) دا نوسیویێتی:

"مژدەیەکی خۆشی کوتوپڕ، دڵی هەمو کوردێکی شـاد کـرد، هۆشـی کوردایـەتی پـێ بـزوت، (ژیـن) ی ژیانەوە و (گەلاوێژ) یشی پێ گەشایەوە.

"ئەو مژدەیە مژدەی هاتنی گۆڤاری (نیشتمان) بـو، مژدانـەی گـەلاوێژیش سوپاسـێکی بـێ پایانـە بـۆ مامۆستا ڕەفیق حیلمی چونکە مژدانە بەر ئەو کەوت و بە هۆی ئەوەوە ژمـارەی یەکـەمی سـاڵی یەکـەمی ئـەم گۆڤارەمان چنگ کەوت.

"(نیشتمان) گۆڤارێکی کوردی، مانگی، ئەدەبی، عیلمـی، کۆمەڵـیـە، زۆر سەربەسـت و ئـازادە و جـێی هیوایە، بە شێوەی سۆرانی، لاوانی موکریان لە شـاری سـابڵاخ دەری دێـنن. گـەلاوێژ بـە پەیـدابونی دەسـتە خوشکێکی وای زۆر سەربەرز و دڵشادە و هیوای وایە کە (نیشتمان) ببێتە داردەستی دەستی نیشـتمان و بـە ناوی هەمو خوێندەوارانیشەوە تکای وایە کە لە خوێندنەوەی ئەم گۆڤارە نازدارە بێ بەش نەبن.

"ئەم یەکەم ژمارەیەی کە لە مانگی تەمموزی ئەم ساڵ دا دەرچوە تا بڵێی پڕ ئاهەنگ و لە هەمە ڕەنگـە و، ئەم باسانەی خوارەوەی تیایە:

| | |
|---|---|
| ئامانجی ئێمە | ... |
| ڕێک کەون تا سەرکەون | ع. بێژەن |
| مێجەر سۆن دەرحەق بە کورد چی ئەڵێ؟ | لە کتێبی کورد و کوردستانی ئەمین زەکی بەگەوە |
| پارچەیە ڕۆحی مەولەوی | پیرەمێرد |
| شیعر | زێوەر |
| شاعیری بە ناوبانگ (وەفایی) | ع. بێژەن |
| کورد و عصبە الامم | لە کتێبی عیراق و عصبە الاممی مامۆستا ڕەفیق حیلمیـیەوە |
| کوردستان ماڵی کوردە | ع. ساسان |
| پەلامارەکەی ئەوساڵی ئەڵمان لە ڕوسیادا | م. فەروخ |
| وە گەلێ باسی بە نرخی تریش | |

گەلاوێژ

"وا بۆ پیرۆزیش ئەم باسەی لە گەلاوێژدا ئەنوسین:

"کوردوستان ماڵی کوردە

"بە گوێرەی مێژو، بە گەواهی هەمو مێژونوس و ڕۆژهەڵات ناسەکان لە 47 چەرخی پێش میلادەوە ئەم چیا و شاخ و کێوانە، ئەم دۆڵ و دەشت و شیوانە، ئەم ڕوبار و گـۆم و ئاوانـەی کـە کـورد تیـا دانیشـتوە و ئاوی لێ ئەخواتەوە و کشتوکاڵی لە بەردا ئەکا لە لایەن باپیرەکانی نەتەوەی کورد داگیر کراوە.

"بەڵێ، ئیمڕۆ 47 چەرخی تەواوە کە کورد لە کوردوستانا دائەنیشن، هـەمو کـەلێن و قوژبنێـک، هـەمو دۆڵ و دەرەیەک، هەمو مێرگ و چیمەنێکی ئەم وڵاتەی لە بەرامبەر پەلاماری دراوسێکان بە خوێنی خۆی پاراو و سور کردوە، لاپەڕەکانی مێژو پڕن لە باسی ئەم شەڕانە کە نەتەوەی کورد بۆ پاراستنی نیشتمانەکەی توشی هاتوە.

"ئەم ئاسمان و مانگ و ڕۆژ و ئەستێرانە لە خاکی کوردستانا شاهیدی گەلێ خوێنڕێژی و شەڕان بون و بە هەزاران لاوی کوردیان دیوە کە لـە خوێنـا ئەتلێنـەوە، بـۆچی؟ بـۆ پاراسـتنی وڵاتەکـەیان لـە پـەلاماری پەلاماردەران، خولاصە کورد ئەم کوردستانەی ئێستای بە خوێن لە ئادەمیزاد کڕیوە و هەرگیز بە خـۆڕایی لـە

دەست خۆی نادا، بەشکردنی کوردستان و بڵاوکردنــەوە و لــە نــاوبردنی کــورد جینایــەتێکی زلــە لــە مێــژودا نەدیتراوە.

"کورد بە هەمو هێزی خۆی ئەچریکێنیٚ ئەڵیٚ: کوردستان ماڵی خۆمە و بە کەسی نادەم، وڵاتی خۆم بۆ کەس بە جیٚ ناهێڵم، لە کوردستان بوم و لە کوردستان ژیاوم و ئەژیم و، ئەبیٚ هەر لە کوردستان و لــە ڕێگــەی کوردستانیشا بمرم."

ڕۆناهی لە ژ19 ی ساڵی 2 ی 1 ی ئۆکتۆبەری 1943 دا لــە ژێــر ناونیشــانی: "مزگێنــی بــۆ چــاپی کوردی" نوسیویێتی:

"ڕیاسەت بیٚ سیاسەت گەنجە
ئەمما گەنجی بیٚ دەربان
سیاسەت بیٚ ڕیاسەت ڕەنجە
ئەمما ڕەنجی بیٚ دەرمان
حاجی قادری کۆیی

مزگێنی ئێمە بۆ چاپی کوردی، دەرچونی گۆڤاری نیشتمانە. گۆڤاری نیشتمان گۆڤارێکی کوردیە، بــە تیپی عەرەبی دەرئەچیٚ، لە لاهیجان (مەنتیقەی موکریان -ئیران) لە لایەن گەلێک لاوی بە نرخەوە.

ئەمە ژمارەی یەکەمی نیشتمانە بە دیاری گەیشتە گەلاوێژ، هاوار و ڕۆناهی. تا پێکەوە دەس بکــەن بــە خەبات بۆ ئــازادی کــورد و کوردســتان. لــەو وەختــەدا کــە هــەمو میللــەتانی دنیــا بــۆ سەربەســتی دەنــۆڕن و دیمۆکراتی شەڕی بۆ ئەکات. نابیٚ ئێمەیش لیٚی بیٚ بەهرە بین.

ڕۆناهی- ژمارەی پێشوی نیشتمان گەیشتە دەستمان. لە هەمو شتیٚ پتر کەیفی ئێمە بەوە هــات کــە لــە ئەرزی کوردستانی ژێر حوکمی ئیران دا زمانی ئێمە دێتە نوسین و چاپکردن. بەم جــۆرە لــە عیــراق، ئیــران، سوریا و سۆڤێت"

پیرەمێرد لە (ژین، ژ814 ی، 20 ی کانونی یەکەمی 1945 دا) لــە ژێــر ســەردێڕی: (دەمەوبــەیان) دا بەم جۆرە لە (نیشتمان) دواوە و نرخاندویەتی:

"حەفتا ساڵ لەمەوبەر، کەوام لیٚ هات بکەومە ناو کوڕان، ئێواران کە لە قوتابخانــە ئەهاتمــەوە، پــێم لــیٚ پێخاوس ئەکرد و قۆچەقانی قەڵماسکم ئەگرت بە دەستەوە، ئەچومە ئەو قەراخ شارە. دەستەی گەڕەکی خۆمــان ئامادە بون بۆ شەڕەگەڕەک، بە شەڕە قۆچەقانی، کارێزی دایکی پاشا (ناودین) مــان بــو، لــە گــەڵ دەرگــەزێنی ئێمە سەرەتای شەڕمان دائەمەزراند. هەروا بەرە بەرە پێوەی دەنیشت تــا لــە ئێمــە گــەورەتر دەســتیان ئەدایــە (دار). ئەم وشەی دارە (گۆچان) ی قەف ئەستور، کە لە پشت چەمەکەیەوە گــوڵمێخی ئاســنی لــیٚ درا بــو، کــە ئێشی زیاتر بیٚ و سەر و قۆڵ باشتر بشکێنیٚ. فێری ئەم نەریتی شەڕی ناوخۆمانــە بوبــوین. پیاوکوشــتنمان بە هونەر و ئازایی دەزانی. کە گەورە بوم هەر لــە بــەر ســنگمەوە تــا ئەشــکنج لــە چــەرمی گــاجوت ســفرە و خەنجەر و دەمانچە و بۆندرە و ساچمە و گوللەدان و تەرەقە. ئینجا بــو بــە دەوری مــارتینی. دو ڕیــز و ســیٚ ڕیزی فیشەک. هی وامان هەبو ئەیگوت پیاوکوشتنم بۆیە پیٚ خۆشە لنگەفرتیٚ ئــەکا. پەروەرشــێکی وا کــە لــە خوێن و ڕەگ و پەی مانا جێگیر بوبو، ڕاووڕوتمان بە جیهاد و غەزوە ئەزانی، تا ئاو و دانە بردمیە وڵاتێــک، وەکو جارێکی تر لە ژیان دا نوسی بوم، لە کۆڵانێک دا باستۆنێکم لــە چۆلەکەیــەک دا کوشــتم، ئافرەتێــک لــە پەنجەرەی سەر کۆڵانەوە چاوی لیٚ بو، هاواری کرد: (قاتل وار) کوشندە.

"کە هاتمەوە بە سەر ئاشوب و لەشکر و لەشکرئاراییدا چەندێک ڕێبەندان لـە کەرکوکـەوە نەمئـەتوانی بێمەوە. ئەمە پەردەیەکی تاریکی نادانی و دەشتەکی و جانەوەری بو، کە لـە نەخوێندەوارییـەوە پەیـدا بوبـو. ئاواتم بۆ خوێندەواری و پێگەیشتن و تێگەیشتنی لاوان بو. لە ترێنی ڕێی ئەستەموڵ دا وتبوم:

"ئومێدم وایە ئەم دەستەی کوڕانە مەشعەلێ هەڵ کەن

"لە تاریکیی نەزانینا، بە خوێندن، نیشتمان دەر کەن!

"خوا نەیکوشتم تا ئەو هیوایەم هاتە دی. وەکو تاریکەشەوێکی سارد و سەرما کـە شـارێکی بـێ چـرا ئەکێشێتە ژێر پەردەی کش و ماتیەوە و دەمەوبەیان، کەناری ئاسمان بە مـژدەی شـەفەق رون ئەبێتـەوە و، لـە منارە و هەمو سەربانی مزگەوتێکەوە، دەنگ و ئـاوازەی بـانگی بـەیانی بـەرز ئەبێتـەوە. وا لـە هـەمو خـاکی کوردستان دا بانگی ئازایی و وشیاری درا. ئەم هەمو گۆڤار و گوڵدەستەی مەتبوعاتە پەیدا بـو، وەک گـوڕەی باوە گوڕگوڕ کە نەوتی ڕەشی گڕی گەیشتە دەریای سپی، ڕۆژهەڵاتی ئێمەیش بـە ڕۆژهـەڵاتی هیـوای گـەل و تیشکی (گەلاوێژ) (گێتی تازە) یان ڕوناک کردەوە. گۆڤارێکی تازەی (نیشتمان) م دی، هەزاران ئافـەرینی لـێ بێ، بەو شێوەی ئەدەب و ئەدەبیاتەیە پیرەمێردی جوان کردەوە."

**تێبینی:**

بۆ ئاگاداری زیاتر لە سەر نیشتمان بڕوانە:

جەمال نەبەز:

گۆڤاری نیشتمان: تەموزی 1943- مایسی 1944، بنکەی چاپەمەنی ئازاد - سوید، 1985.

ژ1- 6 ی نیشتمان لە گەڵ ئەم لێکۆڵینەوەیەدا بڵاوکراوەتەوە. پێ ئەچێ ژ7-9 ی لەو کاتـەدا لـە بـەر دەس دا نەبوبێ.

عەلی کەریمی: بەسەرهاتی ژیانی زەبیحی، سوید. ژ7- 9 ی نیشتمان لەم کتێبەدا چاپ کراوەتەوە.

د. هیمـدادی حوسـێن: ڕۆژنامەنووسـی کـوردی سـەردەمی کۆمـاری دیمـۆکراتی کوردسـتان 1942-1947، دەزگای چاپ وپەخشی سەردەم، سلێمانی 2002.

دەربارەی دامەزراندنی کۆمەڵەی ژ. ک و، ڕوداوەکانی ئەو سەردەمەی کوردستانی ئێران بڕوانە:

نەوشیروان مستەفا ئەمین: حکومەتی کوردستان (ڕێبەنـدانی 1324- سـەرماوەزی 1325) کـورد لـە گەمەی سۆڤێتیدا، ئوتریخت، 1993.

## 3. رۆژنامەوانیی نهێنی و شیوعیەکانی کورد

### بیری شیوعێتی و کوردی عیراق

کە شۆڕشی ئۆکتۆبەری 1917 بە ڕێبەریی لینین لە روسیا قەوما، سپای روسیا لە سەروی کوردستانی جنوبیدا گەیشتبوە رەواندز و لە رۆژهەڵاتیدا گەیشت بوە خانەقین. خەریک بو لە گەڵ هێزەکانی سپای بریتانیدا، کە گەیشتبونە سەروی بەغداد، یەکی ئەگرتەوە.

راگرتنی جەنگ لە نێوان روسیا و لاکانی تری جەنگدا لەوانە دەوڵەتی عوسمانی و، فەرمانی لینین بۆ کشانەوەی دەسبەجێی هێزەکانی روسیا لە هەمو مەیدانەکانی شەڕ، شیرازەی جەنگیی هێزەکانی روسیای تێک دا و، بە ناڕێکوپێکییەکی نزیک لە بڵاوە لێ کردن و هەڵاتنەوە، ناوچە داگیرکراوەکانیان چۆڵ کرد.

سپای روس لە هاتنیدا بۆ ناو کوردستان نمونەیەکی باشی بە خەڵک نەدا بو. کوشتنی بە کۆمەڵ و، تاڵانکردنی ماڵ و سامان و، سوتاندنی ئاوایی لە گەڵ خۆی هێنا بو. دەستە چەکدارەکانی ئەرمەن کە پێشەنگی سپای روس بون لە هێرشەکان دا لە هیچ جۆرە خوێنڕێژی و خراپەیەک بەرامبەر دانیشتوانی ناوچەکان نەئەپونگانەوە. تۆڵەی تاوانەکانی ئالا حەمیدیەکانیان لە دانیشتوانی بێ تاوان ئەسەندەوە.

هەواڵی پاشەکشەی سەربازەکانی روسیا و هۆی پاشەکشەیان و، قەومانی شۆڕشی ئۆکتۆبەر، ئەگەر لە زمانی هەندێ لە ئەفسەر و سەربازەکانی سپای روسیایشەوە بوبێ، ئەبێ گەیشتبێتە گوێی خەڵک. بەڵام ئەو وێنە دزێوەی سەربازانی روس لە بیری دانیشتوانی کوردستاندا دروستیان کردبو، ئەبێ خەڵک چاوەڕوانی هیچ جۆرە چاکەیەکیان لێ نەکردبێ. هەر بۆیە بە درێژایی رێگای کشانەوەیان لە هەر جێگایەک خەڵک بۆی کرابێ رێگەیان پێ گرتون و روتیان کردونەتەوە و، ئەوەندەی ئەوانیش پێیان کرابێ خراپەیان کردوە.

شۆڕشی ئۆکتۆبەری 1917 ی روسیا روی دنیای گۆڕی. سیستەمی سەرمایەداری لە سەرانسەری دنیادا خستە ژێر مەترسییەکی راستەقینەوە. دنیای سەرمایەداری بە سەرکردایەتی بریتانیا، کۆمۆنیزمیان دانا بە دوژمنی ژمارە یەکی خۆیان و، هەمو توانای خۆیان بۆ تێکشکاندنی تەرخان کرد.

دوای هاتنی ئینگلیز بۆ عیراق و بۆ کوردستان، دەزگاکانی راگەیاندنی ئینگلیز، بە تایبەتی ئەو رۆژنامە و بڵاوکراوانەی لە ژێردەستی ئەوان دا بون، ئەوەندەی بۆیان کرابێ هەوڵی زڕاندنی ناوبانگی یەکێتی سۆڤێت و پارتی کۆمۆنیستی روسی و شێواندنی بیروبۆچونەکانیان داون. بە یەکێتی سۆڤێت و بە پارتی کۆمۆنیست ناویان نەبردون، بەڵکو هەر بە بۆلشەویک ناویان هێناون. بەلشەفیک و مەنشەفیک، کە بە زمانی روسی واتای زۆرایەتی و کەمایەتی ئەبەخشن، بوبون بە ناو بۆ باڵی زۆرایەتی و باڵی کەمایەتی ناو سەرکردایەتی پارتی کۆمۆنیستی روسی. ئەو باڵەی ناو پارتی کۆمۆنیستی روسی کە لینین سەرکردایەتی ئەکرد و شۆڕشی بەرپاکرد بو بە بەلشەفیک ناسرا بون، لە بەر ئەوە دوای سەرکەوتنی شۆڕشەکە و دامەزراندنی داوودەزگای حکومەتی سۆڤێتی، هەر بە بۆلشەویک ناویان ئەبردن.

رۆژنامەی (پێشکەوتن) ی سلێمانی (1920- 1922) و، دوای ئەویش رۆژنامە کوردیەکانی سلێمانی، بە تایبەتی ئەوانەی سەردەمی دەسەڵاتی ئینگلیز، کە چەند جارێ هەواڵی (بۆلشەویک) یان بڵاوکردۆتەوە، لە هەڵبژاردنی هەواڵەکاندا، هەمیشە هەواڵی سەلبییان هەڵبژاردوە و، لە جۆری دارشتن و بڵاوکردنەوەیدا، هەمیشە هەوڵی بەدناوکردنیان داون.

**ئەمانە چەند نمونەیەکن:**

"تەقویمی تازەی بۆلشەویک

"لە سەر خەبەراتی مۆسقوایە کە: بۆ گۆڕینی تەقویم لە لایەنی ئەهالیەوە ئیقتیراحاتێ بە مەجلیس دراوە، بە پێی ئەم ئیقتیراحە کە تەقدیم کراوە تەنها مانگی تشرینی ئەوەل و شوبات نەبێ بۆ یاد و لە بیر

نەچونەوەی ئەو ئینقیلاب و پشێویەی کە لەم دو مانگەدا ڕوی داوە ناگۆڕێ و لە سەر حاڵی خۆی ئەهێڵرێتەوە، باقی ناوی هەمو مانگەکانی تر ئەگۆڕێ، وەکو: لە مانگەکان دا لـە جیـاتی کـانونی سـانی: لـەنین، لـە جیـاتی مارت: ستالین و، لە ناو ڕۆژەکانیش دا لە بری دوشـەمە: ڕۆژی سـۆڤێت، لـە بـاتی سێشـەمە: ڕۆژی پشـێوی، هەروا بە ناوی پیاوەگەورەکانیان و سائیرەوە ناو نراون و، بۆ ڕۆژی بێ ئیشی لـە بـری یەکشـەمە سێشـەمە قبوڵ کراوە."

(ژیان، ژ57، 10 ی مارتی 1927)

"حوکمی مەحکەمەی بۆلشەویک

"مەحکەمەی خوست کە لە ولایەتی فەدغانایە (تورکستان) حوکمی داوە بە سەر دو ئیسلاما بە ئیعدام و دو ئیسلامی تر یەکی بە 5 ساڵ حەبسی لە سەر ئەوە کە موقابەلەی ئەوامیر و مەساعی حکومەتیان کردوە کـە ئیجباری کردون ئەبێ هەمو ژنەکانیان بە بێ پەچە بسـوڕێنەوە. لـە سـەر ئـەوە عمـومی مەشـایخ و عولـەما و سایری تەبەقاتی میلەت کۆبونەوە عەکسی ئەم قەرارە فتوای شەرعی‌یان دەرهێناوە و ئیعلانیان کردوە. لە سـەر ئەم فتوایە لە بەینی عەسکەر و ئەهالی‌دا هەرا واقیع بوە و دو کەس لە ئیسلامەکان کوژراون."

(ژیان، ژ82، 20 ی ئەیلولی 1927)

"ئیعدام لە روسیە

"وارشوا، حکومەتی بۆلشەویک ئیستایش دەوام ئەکات لـە سـەر ئیعـدام کردنـی مـەئمورە گـەورەکانی زەمانی قەیسەر و تەرەفدارەکانی لە بەر ئەوە زۆریان وەتەنەکەیان بە جێ ئەهێڵن و فیرار ئەکەن."

(ژیان، ژ87، 25 ی تشرینی ئەوەلی 1927)

ڕوی ڕاسـتی کۆمۆنیسـتەکانی ڕوسـیا و بیروبۆچونـەکانیان لای هـاووڵاتی کـورد نـەزانراو، بـەڵکو شێوێنراو بوە. دوای گەڕانەوەی هەندێ لە دیلەکانی جەنگ ئینجا هەندێ لە هەواڵەکانی شۆڕشی سۆسیالیستی ڕوسیا بە نیوەوناچڵ گەیشتونەتە کوردستان.

شێخ مەحمود، سەرکردەی بزوتنەوەی نەتـەوەیی کـورد، بـە پرۆپاگانـدەی ئینگلیـز بـاوەڕی نـەکردوە، یەکێتی سۆڤێتی بە هێزێکی ئازادیخواز و ڕزگارکەر زانیوە. لە 20 ی 1 ی 1923 دا نامەی بۆ نوسیون. بـۆ یارمەتیدانی لە شەڕی نابەرامبەری کورد- بریتانیادا داوای پشتیوانی و یارمەتی لێ کردون.

(تێبینی: یەکەم جار د. سەید عەزیزی شەمزینی ئەم نامەیەی شێخ مەحمودی لە ئارشیفی سـۆڤێتی‌دا دۆزیوەتـەوە و لە دکتۆرانامەکەی‌دا بڵاوی کردۆتەوە. بڕوانە: (دکتۆر عـەزیز شـەمزینی: جوڵانـەوەی ڕزگـاریی نیشـتمانیی کوردسـتان، وەرگێڕانی فەرید ئەسەسـەرد، بڵاوکردنـەوەی سـەنتەری لێکۆڵینـەوەی سـتراتیجیی کوردسـتان، چـاپی سـێیەم، سلێمانی 1998، ل 162- 164).

هەرچەنـدە لـە کۆتـایی بیسـتەکانەوە لـە ناوەڕاسـت و خـواروی عیـراقدا، بـە جـۆرێکی سـاکار و سەرەتایی‌یش بێ، جۆرێ لە ئاشنایەتی لە گەڵ بیروباوەڕی ئیشتیراکی و شیوعی‌دا پەیـدا بـوە، لێـرە و لـەوێ هەندێ شانەی پەراگەندە دروست کراوە و، سەرەنجام لە 1935 دا حیزبی شیوعی عیراق لە دایک بوە. بـەڵام ئەو ئاشنایەتی‌یە لە کوردستانی عیراق و لە ناو ڕۆشنبیرانی کوردا، زۆر دوا کەوتوە. لە نـاو بڵاوکـەرەوەکانی بیری سۆسیالیستی و کۆمۆنیستی و، لە ناو دامەزرێنەران و چالاکەکانی شانە شیوعیەکانی عیراقدا، کەسێکی ناسراوی کورد بەرچاو ناکەوێ.

یەکێتی تێکۆشین، لە ناوەڕاستی چلەکاندا، بە راشکاوی دانی بەمەدا ناوە. لەم بارەیەوە نوسیویێتی:

"ئێمە هەروەکو ئەزانین بزوتنەوەی کۆمیـۆنیزمی لـە کوردسـتانی عیـراقدا زۆر تازەیـە، بـەڵکو وەکـو منداڵێکە تازە لە دایک بوبێ و عومری یەکدو ساڵە بـێ، چونکـە میلـەت زۆر لـە پاشـەوە لـە دەوری دەرەبـەگی ئەژێت و، صەناعەت زۆر تازەیە، بۆیە حەتمی‌یە بیری کۆمیۆنیستی تازە بێت، وە بەم جۆرە کۆنەپەرست زبـانی لێ بکاتەوە، ئەم بیرەش نەتیجەی تەتەوری وڵات بڵاو ئەبێتەوە بە یارمەتی زروفی عالەمی."

(ییکتی تی کوشین، ژ3، ل 13)"

گۆڤاری گەلاوێژ (بەغداد 1939- 1949) هەندێ وتاری لە سەر لینـین و کـورد لـە روسـیا نوسـیوە. بەڵام ژین بە پێچەوانەوە بە ئاشکرا دژی بۆلشەویکی نوسیوە.

بۆ یەکەمجار لە ناوەڕاستی چلەکاندا لە نـاو کـوردی عیـراقدا شـیوعی پەیـدا بـون. ئـەویش لـە نـاو یەکێتی‌ی تێکۆشین و شۆڕشدا- دو رێکخراوی ناکۆک لە گەڵ حیزبی شیوعی- نەک لە ناو حیزبـی شـیوعی (رەسمیی) دانپیانراوی یەکێتی سۆڤێتی‌دا و، لە ناو خوێندکارانی کـوردا لـە بەغـداد نـەک لـە نـاو کرێکـارانی کوردستاندا.

## یەکێتی‌ی تێکۆشین

ساڵی 1942 فەهد، سکرتێری حیزبی شیوعی عیراق، جارێکی تر چو بۆ یەکێتی سـۆڤێت. دیسـانەوە حیزبی شیوعی توشی کەرت بون بو. بون بە 3 تاقمی جیاوازەوە. تاقمی موئتەمەریەکان کە (الی الامـام) یـان دەرئەکرد. تاقمی فەهد کە (القاعدة) یان دەرئەکرد. تاقمی (الشرارة) کـە بـە نـاوە کۆنەکـەی زمـانی حیزبـەوە ئەدوان.

لە مایسی 1943 دا پۆلیسی عیراقی پەلاماری رێکخراوە جیاوازەکانی شیوعیەکانی دا. زۆر لـە کـادرە سەرەکی‌یەکانیان گرتن. ئەمە بو بە هۆی راوەستانی چالاکیەکانیان، بە تایبەتی چاپی بڵاوکراوەکانیان.

لە شوباتی 1944 دا پاشماوەکانی هەردو تاقمی (الشرارة) و (الی الامام) لـە رێکخراوێکـی نـوێدا بـە ناوی (الحزب الشيوعي العراقي) یەکیان گرت و، دەستیان کرد بە بڵاو کردنەوەی رۆژنامەی (وحدة النضال).

ژمارەیەک لە گەنجەکانی هەولێر کە لە زانسـتگەکانی بەغـداد ئەیانخوێنـد، لەوانـە: سـاڵح حەیـدەری و جەمال حەیدەری (کە برا بون)، نافیع یونس، لەم رێکخراوەدا بوبون بە ئەندام. لقی کوردیی رێکخراوەکـەیان دامەزراند و، دەستیان کرد بە بڵاوکردنـەوەی پەخشـەیەکی دەوریـی بـە نـاوی (یـەکێتی تێکۆشـین) ەوە، کـە تەرجومەی کوردی ناوی عەرەبی (وحدة النضال) بو.

لە نیسانی 1945 دا، دوای ئەوەی حشع موئتەمەری بەست، رێکخراوی (وحـدة النضـال) نامـەیان بـۆ فەهد نارد و ئامادەیی خۆیان دەربڕی کە رێکخراوەکەیان هەڵبوەشێننەوە و بگەڕێنەوە ناو حیزب. فەهد وەری گرتنەوە.

سەرانی لقی کوردی (یەکێتی تێکۆشین) لە گەڵ فەهد کەوتنە گفتوگۆ بۆ ئەوەی ئەوان وەکـو رێکخراوێـک بە کۆمەڵ وەربگیرێن و، لە سەرکردایەتی حیزبەکەدا چەند جێگایەکیان بدرێتێ. فەهد بەمە رازی نەبو. لای وا بـو لە بەر ئەوەی ئەسلی رێکخراوەکە خۆی حەل کردوە و، ئەمانیش لقی ئەون ئەوا ئەمانیش حـەل بـون و پێویسـتە بە تاک بێنە ناو (حشع) ەوە. فەهد و سەرانی لقی کوردی یەکێتی تێکۆشین نەگەیشتنە یەک.

# شۆڕش

لقی کوردی یەکێتیی تێکۆشین لە باتی ئەوەی خۆی هەڵبوەشێنێتەوە و ئەندامەکانی بە تاک بچنە ناو (حشع) ەوە بڕیاری دا ڕێکخراوەکەی بهێڵێتەوە، بەڵام بە ناوێکی ترەوە کار بکا. (حیزبی شیوعی کوردستانی عیراق) ی دامەزراند. حیزبی شیوعی کوردستان چەند کارێکی گرنگی ئەنجام دا:

1. زمانحاڵی حیزبی بە ناوی (شۆڕش) ەوە دەرکرد. هەر لە بەر ئەوەیش ناوی ئەم ڕێکخراوە بە (حیزبی شۆڕش) ڕۆیشتوە، لە کاتێکدا ناوی ڕاستەقینەی (حیزبی شیوعی کوردستان) ە.

2. بە چاولێکەری حیزبە شیوعیەکانی فەرەنسا و یۆنان و یۆغۆسلافیا هەوڵی دا (بەرەی یەکگرتوی کوردستان) دروست بکا. بۆ ئەم مەبەستە حیزبێکی جەماوەریی بە ناوی حیزبی ڕزگاری کوردەوە پێکهێنا و، بۆ ئەوەی کۆمەڵانی خەڵک لە دەوری کۆببنەوە ئەم بەیانەی دەرکرد:

"بەیانی حیزبی شیوعی کوردستانی عیراق

"یەک بگرن بۆ دامەزراندنی حیزبی ڕزگاری کورد!

"تێ بکۆشن بۆ تێکشکاندنی پلانەکانی ئیستیعمار و کۆنەپەرستی!

"لەم ڕۆژانەدا کە جەنگ، بە سەرکەوتنی سەرەتاکانی ئازادی، نزیکبونەوەی ڕوخانی بناغەی هێزەکانی ئیستیعمار و کۆنەپەرستی، لە ڕۆژهەلات و ڕۆژئاوادا بڕایەوە، ئەویش بە نەمانی هێزی دەوڵەتانی فاشیستی، هەمو گەلانی پچوک و گەورەی دنیا کە تێکۆشان و خوێنی پاکیان بۆ پێشکەوتن ڕشت، چاوەڕێن و داوای سەربەستی و مافی نەتەوەیی و مافی چارەنوسی خۆیان ئەکەن، بە پێی بارودۆخی تازەی دنیا و ئەو بەڵێننامانەی دەوڵەتانی یەکگرتو رایان گەیاندوە.

"پێویستە باش بزانین دەسائیسی ئیستیعمار و کۆنەپەرستی بە هەمو توانایەکیانەوە کار ئەکەن، لە بەر ئەوە ئازادی ئاسان بە دەس نایە، بەڵکو ئەبێ بە هێزی پشتئەستور بە جەماوەری گەل و نیشتمانپەروەرانی دڵسۆز وەربگیرێ. ئەم بیرەش بە کردەوە لە زۆر وڵاتانی ڕۆژئاوادا جێبەجێ کراوە. بە ناوی (بەرەی بەرگری) لە فەرەنسا و (بەرەی ئەبام) لە یۆنان و (بەرەی ڕزگاری وڵات) لە یۆغۆسلافیا، خەبات دژی هێزەکانی ئیستیعمار و کۆنەپەرستی دەستی پێ کردوە.

"نەتەوەی کوردی دابەشکراو بە پێی نەخشەکانی ئیستیعمار و کۆنەپەرستی، ئەبێ تێ بکۆشێ لە پێناو مافی چارەنوس و ڕزگاری کوردستانی گەورەدا، ئەوەیش بە نەهێشتن و بڕینی دەستی ئیستیعماری ئینگلیزی و نۆکەرەکانیان، بە بەکارهێنانی هێزێکی ڕێکخراوی داڕێژراوی لە ناو خۆیدا بە تەواوی یەکگرتو لە هەمو ناوچە کاردیەکاندا.

"لەم ڕۆژانەدا حیزبی هەموان بە ناوی حیزبی ڕزگاری کورد، لە یەکگرتنی زۆر کۆمەڵی کوردی عیراقی پچوک، لە ئەنجامی هەوڵ و کۆششی حیزبی شیوعی کوردستانی عیراق و نیشتمانپەروەرانی تردا، پێکهات.

"لە پاڵ ئەوەدا کە حیزبی شیوعی پارێزگاری قەوارەی خۆی ئەکات، بە هەمو جۆرێ هاوکاری ئەکا بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانی ئیستای. ئەم حیزبە لە پێناوی ڕزگاری وڵات دا تێ کۆشاوە و لە پاشەڕۆژیش دا تێ ئەکۆشێ.

"لە کۆتاییدا، ئێمەی حیزبی شیوعی، بانگ لە جەماهیری گەلی کوردی خۆشەویست ئەکەین لە عیراق دا کار بکەن بۆ پێشخستنی حیزبی ڕزگاری کورد و یارمەتیدانی، بەو پەڕی دەنگمانەوە داوا لە هەمو نیشتمانپەروەران ئەکەین کە درێخی لە هیچ تەقەلایەک نەکەن بۆ بەهێزکردنی حیزبی ڕزگاری کورد.

مەکتەبی سیاسی

حیزبی شیوعی کوردستانی عیراق"

(احمد فوزي، خناجر و جبال، بیروت، 1961، ص 100- 101)

## رزگاری

حیزبی رزگاری کورد دوای ئەوەی کەوتۆتە چالاکی، چەند کاری گرنگی ئەنجام داوە:
1. لە بەیانێکی تایبەتیدا ئامانجەکانی خۆی رون کردۆتەوە.
2. زمانحاڵی حیزبی بە ناوی (رزگاری) یەوە دەرکردوە.
3. چەند یادداشتێکی دەربارەی کێشەی کورد داوە بە کۆڕ و کۆمەڵە ناودەوڵەتی‌یەکان.

حیزبی رزگاری کورد، لە بەر ئەوەی حیزبێکی جەماوەریی- نیشتمانیی بوە نەک حیزبێکی چینایەتی، خۆی وەکو بەرەی یەکگرتو داناوە. یادداشتەکانی بەم جۆرە ئیمزا کردوە: (اللجنة التنفيذية لحزب رزكاري كورد- حزب الجبهة الوطنية الكردية الموحدة في العراق)

تا ئیستا هیچ ژمارەیەکی (رزگاری) لە بەر دەسدا نیە، تا بخرێتە بەر باس و لێکۆڵینەوە. بەڵام هەندێ بەڵگەی سیاسی و فکریی گرنگی لە دوا بە جێ ماوە، کە بۆ تێگەیشتن لە بیروبۆچونی حیزبی رزگاری و ناوەرۆکی بڵاوکراوەکانی کەڵکی زۆریان هەیە. لێرەدا، ئەوەندەی لە بەر دەس دایە، دوای وەرگێڕانی لە عەرەبیەوە ئەیان نوسمەوە:

"بەیانی دەستەی دامەزرێنەری حیزبی رزگاری کورد:

1. ئامانجی بەرزمان یەکخستن و رزگارکردنی کوردستانی گەورەیە. لە بەر ئەوەی ناوەندی حیزب لە کوردستانی عیراق دایە تێ ئەکۆشین بۆ رزگارکردنی عیراق لە نفوزی ئیستیعمار و حکومەتە کۆنەپەرستەکان، کە گەورەترین کۆسپی رێگەی پێشکەوتنی عیراقن، بۆ گەیشتن بە ئامانجی گەورە، کە ئازادی و مافی چارەنوسە.
2. تێکۆشان بۆ سەربەخۆیی ئیداری کوردستانی عیراق کە هەنگاوێکی گەورەیە بەرەو مافی چارەنوسی کوردان.
3. تێکۆشان بۆ لابردنی هەمو جۆرەکانی چەوسانەوە و جیاوازی نەتەوەیی کە کورد و کەمایەتی‌یەکانی تر توشی بون.
4. هەوڵدان بۆ دروستکردن و بە هێزکردنی پێوەندی لە گەڵ حیزب و ناوەندە کاردیەکانی دەرەوەی عیراق بۆ یەکخستنی هەمو هەوڵەکان بۆ گەیشتن بە ئامانجی بەرز: مافی چارەنوس و رزگاری.
5. هەوڵدان بۆ چاک کردنی گشتلایەنەی هەمو گیروگرفتە سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوری و رۆشنبیری‌یەکان، بە دابینکردنی مافە دیمۆکراتیەکان و، بە بەرزکردنەوەی ئاستی کشتوکاڵ و پیشەسازی و بڵاوکردنەوەی خوێندەواری و ژیاندنەوەی مێژو و ئەدەبی کوردی.
6. بەکارهێنانی زمانی کوردی لە هەمو دائیرەکان و قوتابخانەکانی ناوچە کاردیەکان دا.
7. هەوڵدان بۆ رونکردنەوەی پرسی کورد بۆ هەمو گەلان بە تایبەتی گەلانی رۆژهەڵاتی ناوەراست.
8. هەوڵدان بۆ دروستکردنی پێوەندی و هاوکاری لە گەڵ حیزب و رێکخراوە دیمۆکراتیەکان.
9. هەوڵدان بۆ دروستکردنی پێوەندی سیاسی لە گەڵ دەوڵەتانی دیمۆکراتیدا بۆ بەرهەڵستی هەوڵی ئیستیعمار و کۆنەپەرستی و نۆکەرەکانیان بۆ بوژاندنەوەی میساقی سەعداباد و، بەگژاچونی هەمو گەلەکۆمەکێ ئیستیعماری و کۆنەپەرستی‌یەکان کە تەگەرە لە ئازادیی گشتی، بە تایبەتی ئازادی کورد ئەدەن."

(حميدي 222/1)

**یادداشتی حیزبی ڕزگاری کورد**

بۆ کۆبونەوەی وەزیرانی دەرەوە لە مۆسکۆ بە بۆنەی بڕانەوەی جەنگەوە:

"مرۆڤایەتی بە خۆشیەوە مژدەی بڕانـەوەی جـەنگ و سـەرکەوتنی هێـزە دیمۆکراتیـەکان و تێشـکانی دزێوترین شێوەکانی ئیستیعمار (فاشیزم) ی لە ڕۆژئاوا و ڕۆژهەڵات دا وەرگرت. گەلی کـوردی دابەشـکراو و ماف خـوراو، ماوەیـەکی درێـژە لـە ژێـر بـاری زوڵـم و چەوسـانەوەدا ئـەناڵێنێ و، لـە ئـەنجامی نەخشـە و قازانجەکانی ئیستیعماری بریتانی و حکومەتە کۆنەپەرستە فاشستییەکانی ئێـران و تورکیـا و عیـراق دا، لـە هەمو مافە مرۆڤایەتی و نەتەوایەتییەکانی بێ بەش کراوە.

"بـە بۆنـەی بڕانـەوەی جـەنگ و سـەرکەوتنی هاوپەیمانەکانـەوە گـەلی کـورد تکـا ئـەکا، بـە چـاوی دادپەروەری سەیری مەسەلەکەی بکرێ و بێ بەش نەکرێ لە گفتی هاوپەیمانەکان و ئەو بەڵێنانەی بـە گـەلانی پچوک دراوە بۆ ئازادی و مافی چارەنوسیان. ئیستایش کە لە مۆسکۆ وەزیرانی دەرەوەی سێ دەوڵەتە زلەکـە کۆ ئەبنەوە، هیواداڕین بە ئینسافەوە سەیری مەسەلەی گەلان و نەتەوەکان بکەن.

"حیزبی ڕزگاری کورد پێی خۆشە ئەم چەند نوقتەیەتان بخاتە بەرچاو کە پێوەندیەکی بە هێزیـان بـە مەسەلەی گەلی کورد و ئاشتیی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستەوە هەیە:

1. ئێمە لایەنگری ئەکەین لە خەباتی برا کوردەکـانی ئێرانمـان لـە گـەڵ بـرا ئازەربیجانیـەکانیان لـە پێناوی سەربەخۆیی خۆیی (ئیستیقلالی زاتی) و حوکمی دیمـۆکراتی و تێکۆشـان دژی حکومـەتی کۆنەپەرستی و لایەنگرەکانیان.
2. بە گرنگیەوە سەیری بارودۆخی گەلی کورد لـە تورکیـا بکـرێ. حکومـەتی فاشیسـتی تورکیـا بـە شێوەیەکی دڕندانە ڕەفتاریان لە گەڵ ئـەکا بـۆ ئـەوەی بـە تـەواوی لـە ناویـان ببـا و بیانکـا بـە تورک.
3. بار و دۆخی گەلی کورد لە عیراق دا تا ڕادەیەکی زۆر خراپ بوە. لە ئەنجامی وجودی ئیستیعماری بریتانی و حکومەتی کۆنەپەرستی ئیستا و ئوسلوبە فاشستییەکانیدا لە هەمو مافە دەستوریەکانی بێ بەش کراوە. سوتاندنی گوندەکانی بارزانیـەکان و شـوێنە نزیکـەکانیان و ڕاونـان و گرتنـی هاووڵاتیان وەکو مەلا مستەفا و لایەنگرەکانی بەڵگەی ئەمەن.

"لە بەر ئەوە داوا ئەکەین خواستە نیشتمانییەکانی کورد لە عیراق دا جێبەجێ بکرێن، بەڵام ئێمە لامان وایە ئەوەش ناکرێ بە لە ناوبردنی ئیستیعمار و حکومەتی کۆنەپەرسـتی ئیسـتا و گـۆڕینی بـە حکومـەتێکی دیمۆکراتی ڕاستەقینە نەبێ، کە مافە نەتەوەییەکانی کورد لە عیراق دا دابین بکا.

"وا سەرنجمان ڕاکێشان بۆ ئەم ڕاستییانە بە هیوای ئەوەی بە گیانی مرۆڤایەتی چارەسـەریان بکـەن. چارەسەرکردنیان بە شێوەیەکی واقیعی ڕاست ئەبێتە هۆی گەشانەوەی شارستانێتی و ئاشـتی لـە ڕۆژهـەڵاتی ناوەراست دا.

کۆمیتەی جێبەجێکردنی حیزبی ڕزگاری کورد"

دوای بڕانـەوەی جـەنگ وەزیرانـی دەرەوەی دەوڵەتـە گـەورە براوەکـان زنجیرەیـەک کۆبونـەوە و کۆنفرەنسیان بەستوە بۆ باسی پەیماننامـەی ڕێککـەوتنی ئاشـتی لـە گـەڵ وڵاتـانی هاوپـەیمانی ئـەڵمانیا و، داڕشتنەوەی نەخشەی دنیای دوای جەنگ:

خولی یەکەمی ئەنجومەنی وەزیرانی دەرەوەی یەکێتی سۆڤێت، وڵاتە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا، بریتانیا، فەرەنسا و، چین، لە لەندەن لە 11 ی ئەیلول تا 2 ی تشرینی یەکەمی 1945 دا کراوە.

بـە دوای ئـەم کۆبونەوانـەدا کۆبونـەوەی 3 قـۆڵی وەزیرانـی دەرەوەی یـەکێتیی سـۆڤێت و وڵاتـە یەکگرتوەکانی ئەمەریکا و بریتانیا لە 16 تا 26 ی کانونی یەکەمی (دیسەمبەر) 1945 لە مۆسکۆ بەسترا.

خولی دوەمی ئەنجومەنی وەزیرانی دەرەوە لە پاریس لە 25 ی نیسـان تـا 16 ی مـایس و لـە 15 ی حوزەیران تا 12 ی تەموزی 1946 بەسترا و،

کۆنفرەنسی ئاشتیی پاریس لە 29 ی تـەموز تـا 15 ی تشـرینی یەکـەمی 1946 بـۆ ئامـادەکردنی رێککەوتنی ئاشتی لە گەڵ ئیتالیا، مەجەر، رۆمانیاو بولغاریا، فینلەندە بەسترا.

خولی سێیەمی ئەنجومەنی وەزیرانی دەرەوە لـە نیۆیـۆرک لـە 4 ی تشـرینی دوەم تـا 11 ی کـانونی یەکەمی 1946 بەسترا. لەم خولەدا رێککەوتنەکان تەواو کران.

بڕوانە: تاريخ السياسة الخارجية للاتحاد السـوفيتي، الجـزء الثـاني (1945-1976)، باشـراف ا. جروميكـو، ب. بونوماريوف، دار التقدم، موسكو، 1980. ل 39 و 841-842)

یادداشتەکەی حیزبی رزگاری کورد رۆژی نوسین و ناردنی لە سەر نیە. لە بـەر ئـەوە بـۆ دۆزینـەوەی پێوەندی روداوەکان لە گەڵ یەکتری، پێویستە رۆژی هەندێ لەو روداوانە بە بیر بهێنرێنەوە:

لە 1945/5/9 دا دوەمین جەنگی جیهانی وەستاوە.

لە 16- 1945/12/26 دا کۆبونەوەی 3 قۆڵی وەزیرانی دەرەوەی سۆڤێت و ئەمەریکا و بریتانیا لـە مۆسکۆ کراوە.

لە 1946/1/22 دا جمهوریەتی کوردستان لە مەهاباد راگەیەنراوە.

ئەم یادداشتانە لە بەغداد بە هۆی سەفارەتەکانی ئەو وڵاتانەوە نێردراون بۆ حکومەتەکانیان. تا ئیسـتا کەسێ سۆراخی نەکردوە کە ئاخۆ ئەم یادداشتانە گەیشتونەتە دەسـتی وەزیرەکـان یـا نـە. بـەڵام ئـەوەی تـا ئیستا دیارە ئەوەیە کە نە لەم کۆبونەوەیەدا و، نە لە هیچ کۆبونەوەیەکی تردا کێشەی کورد باس نەکراوە.

جگە لەم یادداشتە، حیزبی رزگاری کورد چەند یادداشتێکی تری ناردوە، لەوانە:

- یادداشتێکی درێژ بۆ کۆبونەوەی نەتەوە یەکگرتوەکان لە لەندەن بۆ رونکردنەوەی کێشەی کـورد. (دەقەکەی لە موسوعة دا بڵاوکراوەتەوە).
- یادداشتێک بە هۆی (مفەوەزیەتی میسری لە بەغداد) بۆ دەربڕینی پشتیوانی گـەلی کـورد لـە گـەلی میسر لە خەباتی دا دژی ئیستیعماری ئینگلیزی.

حشع لە: العدد 4، السنة الرابعة، 18 كانون الثاني 1946 (القاعـدة) دا کـە زمانحـاڵی ناوەنـدی بـوە، سەبارەت بە حیزبی رزگاری کورد نوسیویتی:"انه يجمع شتات عناصر من حـزب هيـوا الرجعـي ومـن بعـض الكتل والحلقات المختلفة التي كانت تألفت وانحلت دون ان تتـرك أثـرا طيبـا علـى الحركـة الكرديـة." (حميـدي 223/1)

پاش ئەوەی هەمزە عەبدوڵا بە نوێنەرایەتی مەلا مستەفا و ئەفسەرە کـوردە عیراقیـەکانی دامەزرێنـەری پارتی لە مەهابادەوە ئەگەڕێتەوە بۆ عیراق، بە نیازی کۆکردنەوەی هەمو حیزب و تاقمـە کوردیـەکان لـە یـەک پارتی دیمۆکراتی دا و، پرۆگرام و پێڕەوی حیزبەکە لە گەڵ خۆی ئەهێنێ، داوا لە حیزبی رزگاری کـورد ئـەکا کە بێنە ناو ئەم پارتیەوە. حیزبی رزگاری کورد دەقەکـەی بـەم پێشـەکیەوە بـە سـەر ئەندامـەکانی دا دابـەش کردوە:

"الميثاق القومي والمنهاج والنظام الداخلي للحزب الديمقراطي الكردي (في العراق)

"ملاحظة: ان حزبنا (حزب رزگاری كورد) يناضل مع بعض العناصر الوطنية في سبيل تشكيل حزب وطني ديمقراطي موحد باسم (الحزب الديمقراطي الكردي) من جميع العناصر والمنظمات الموجودة في كردستان العراق. وها اننا نقدم منهاج الحزب ونظامه الداخلي طالبين من اعضاء حزبنا دراسته وارسال اقتراحاتهم وملاحظاتهم حوله الى اللجنة المركزية لحزبنا رزگاري"

دوای ئەمە رزگـاری کـۆنگرەیێکـی بەسـتوە و بـە کۆمـەڵ چۆتـە نـاو پـارتی دیمـۆکراتی کـوردەوە و ئۆرگانەکەیشی هەر بە ناوی رزگاری‌یەوە ماوەتەوە.

...

**چەند تێبینی‌یەک:**

1. دەربارەی مێژوی حیزبی شیوعی عیراق بڕوانە:

1. 1. حنا بطاطو، العراق، الكتاب الاول والثاني والثالث، ترجمة عفيف الرزاز، بيروت، 1992.

1. 2. سمير عبدالكريم، أضواء على الحركة الشيوعية في العـراق، 5 اجـزاء... هـەمان نوسـەر ئـەم 5 بەرگەی لە یەک بەرگ دا کورت کردۆتەوە:

سمير عبدالكريم، موجز أضواء على الحركة الشيوعية في العراق، مطبعة الاندلس، بيروت.

نوسەرەکەی، کە ناوێکی خواستەمەنی داناوە و ناوێکی وەهمی بۆ چاپخانە و شوێنەکەیشی نوسیوە، ئەگەرچی لە کتێبەکانی‌دا ئیشارەتی داوە بە سەدان بەڵگەی گرنگی حیزبی شیوعی، لەوانە بـەیان و بڵاوکـراوە و رۆژنامەکانیان، کە لە ئارشیفی دەزگا ئەمنیەکانی عیراق‌دا هەڵگیراون، بەڵام کتێبەکـەی نرخـی زانسـتی نیـە چونکە لە لایەن دەزگا ئەمنیەکانی بەعسەوە بۆ مەبەسـتێکی تایبـەتی ئامـادە کـراوە کـە پـەلاماردانی حشـع و شێواندنی رابوردویەتی، نەک لێکۆڵینەوەی مێژویی.

1. 3. بثينة ناجي يوسف، سلام عادل، جزوين، دار المدى، بيروت، 2001.

2. بۆ هەندێ لە بەڵگەکانی حیزبی شیوعی کوردستان و حیزبی رزگاری کورد بڕوانە:

2. 1. محمد شيرزاد، نضال الاكراد، کە لە کۆتایی چلەکان‌دا لە قاهیرە چاپ کراوە.

2. 2. احمد فوزي، قاسم والاكراد - خناجر وجبال، بيروت، 1963. سەرچاوەکەی ئـەمیش کتێبەکـەی محمد شیرزادە.

2. 3. جـلال الطالبـاني، كردسـتان والحركـة القوميـة الكرديـة، مـن منشـورات النـور، بغـداد، 1969. سەرچاوەکەی ئەم، کتێبەکەی احمد فوزی یە.

3. بە پێی کتێبەکەی: عباس جعفر حميدي، التطورات السياسية في العراق، لە ناو ئارشـیفی وەزارەتـی کاروباری ناوخۆی عیراق‌دا (ملفات وزارة الداخليـة) فایلێـک هەیـە بـە نـاو و ژمـارەی: "ملفـه بعنـوان (حـزب رزگاری كورد) الرقم 110/41."

4. د. کەمال مەزهەر، رزگاری لە کفری، کتێبی: چەند لاپەڕەیەک لە مێـژوی گـەلی کـورد، بـەرگی دوەم، دەزگای چاپ و بڵاوکردنـەوەی موکریـانی، هـەولێر، 2001. ل 381 - 387. سـەرچاوەکەی ئـەم، فـایلێکی وەزارەتی ناوخۆیە.

5. ساڵح حەیدەری، کە یەکێ بوە لە دامەزرێنەر و سەرکردەکانی حیزبی رزگاری کـورد، لـە وتارێـکدا کە لە پاشکۆی عیراق، لە 11 ی 4 ی 1978 دا بە ناونیشانی (بـە بۆنـەی ڕۆژی ڕۆژنامەگـەری کوردیـەوە رزگاری چۆن چاپ دەکرا؟) نوسیویێتی، باس ئەکا کە لە سەرەتای ساڵی 1945 دا لیژنـەی ناوەنـدی حیزبـی رزگاری کورد بریاری داوە ئۆرگانی خۆی بە نـاوی (رزگـاری) یـەوە بـە نهێنـی چـاپ بکـا. لـە بـەر ئـەوەی نەیانتوانیوە دەزگای چاپ دابین بکەن ناچار بون بە تایپ و رۆنیۆ چاپ و بـڵاوی بکەنـەوە. تایپەکـەیان لـە ئەرزوحاڵنوسێکی هەولێری کڕیوە و رۆنیۆکەیش لە بەغداد. لە بەغداد لە گەڕەکی ئەعزەمیە لە (راس الحـواش) خانویەکیان بە کرێ گرتوە تایپ و رۆنیـۆ و کەرەسـتەی دەرکردنـی رزگاریـان تـێدا دانـاوە. لـە پـێش دا هاوڕێیەکی حیزبییان و، دوای ئەوەی ئەو تاقەتی چوە، خۆی لەو خانوەدا نیشتەجێ بـوە. دوای ئـەوەی ئـەم ماڵە ئەفرۆشرێ دەزگاکان ئەگوێزنەوە خانویەکی تر لە هەمان گەڕەک و هەر لەوێ ئەمێنێتەوە تا ئـابی 1946 کە حیزبی رزگاری خۆی حەل ئەکا و ئەچێتە ناو پارتی دیمۆکراتی کوردەوە.

حەیدەری لە کۆتایی ئەم باسەدا نوسیویێتی: "ئەم جیهـازی چاپـە (مەبەسـتی تایـپ و رۆنیۆکەیـە. نـم) بێجگە (رزگاری) رۆژنامەی (شۆڕش) یشی پێ چاپ دەکرا، ئەم دوانە بە دو زمـان کـوردی و عـەرەبی تێکـڕا مانگی جارێک دەردەچون و، هەر جار چەند صەد ژمارەیەکیان دەردەچو، بە نهێنی لـە ناوچـەکانی کوردسـتان دا لە رێگای ریکخراوە حیزبیەکانەوە بڵاودەکرانەوە.

"سەبارەت بە دەستەی نوسەریش دەزگایەکی حیزبی تایبەتیمان نەبو بەم ناوەوە، ئەوانەی کە خەریکی چاپ و نوسین و گواستنەوە بون هەر ئەوانە بون بەرپرسیار بون لە هەمو شتێک کـە پەیوەنـدی بـە چـاپ و چاپەمەنییەوە هەبو.. واتە: دەستەی نوسەران دەزگایەکی حیزبی تەسک بو، هەر ئەم تەسـکییەش بـوە هـۆی بەردەوامی کار و پاراستنی."

ئەگەرچی لە شوێنێکی تریدا نوسیویێتی: "هەروەها ئەو هاوڕێیانە کە کاروباری چاپیان پـێ سـپێردرا بو لە کاتی دیـاریکراودا دەهـاتن و کـاری خۆیـان جێبـەجێ دەکـرد و دەرۆیشـتن" بـەڵام هـیچ زانیارییـەک دەرباری ناوی ئەوانەی کاروباری چاپیان پێ سپێردراوە یان لە نوسینەکانیدا بەشدار بون، بە دەستەوە نادا.

## 3. 1. یەکێتیی تێکۆشین

مردن بو فاشست ، ژیان بو گه‌لانی سه‌ربه‌ست




تی کوشین بو به‌هیز کردنی
جبهه‌ی وطنی بو ئازادی
وسه‌ربه‌ستی کورد

وریا به‌نه‌ی ماست له دسائسی
استعمار وکونه په‌رستی

[ژماره (٢)] (زبان حالی کومه‌له‌ی کومونیستی عراقی) [سال (١)]

((لقی کورد))

## 1. یەکێتیی تێکۆشین

### 1. 1. وەسفی گۆڤارەکە

لە ناوچەوانی سەربەرگی ژ2 دا نوسراوە: "مردن بۆ فاشیست، ژیان بۆ نیشتمانی سەربەست"

ئینجا بە خەتێکی گەورە ناوی گۆڤارەکە: "ییکتی تی کوشین"

لە ژێر ناوی گۆڤارەکەدا بە دو ستونی بەرامبەر بە یەک:

لە لای راستی: "تێ کۆشین بۆ بە هێز کردنی جەبهەی وەتەنی بۆ ئازادی و سەربەستی کورد" لە ژێریدا: "ژ2"

لە لای چەپیدا: "وریا بە ئەی میلەت لە دەسائیسی ئیستیعمار و کۆنەپەرستی" لە ژێریدا: "ساڵ 1"

لە ناوەراستی هەردو ستونەکەدا:

"زبان حالی کۆمەڵەی کۆمیۆنسی عیراقی" و لە ژێریدا: "لقی کورد"

لە ل 1 - 3 وتاری یەکەمی "وریا بە ئەی میلەت"

لە ل 3 - 8 "کورد و ئۆکتۆبەر"

لە ل 8 - 11 "یەکێتیی تێکۆشین بۆ ئازادی نیشتمان"

لە ل 11 - 13 "دەنگوباس"

لە ناوچەوانی سەربەرگی ژ3 دا نوسراوە: "تێکۆشن زدی ئینتیهازیەت و شۆڤێنیەت لە نێو گەنجی کورد"

ئینجا بە خەتێکی گەورە ناوی گۆڤارەکە: "ییکتی تی کوشین"

لە ژێر ناوی گۆڤارەکەدا بە دو ستونی بەرامبەر بە یەک:

لە لای راستی: "تێ کۆشین بۆ بەهێزکردنی جەبهەی وەتەنی بۆ نان و ئازادی میللەتی کورد" لە ژێری دا: "ژ3" و لە ژێر ئەویشدا "نرخی ژمارە 50 فلسە"

لە لای چەپیدا: "وریا بە ئەی میلەت لە دەسائیسی ئیستیعمار و کۆنەپەرستی" لە ژێریدا: "ساڵ 1"

لە ناوەراستی هەردو ستونەکەدا:

"زبان حالی کۆمەڵەی کۆمیونسی عیراقی" و لە ژێریدا: "لقی کورد"

لە ژێر ئەمانەدا:

بۆ خوێندەوارانی خۆشەویست!

کورتە بەیانێکی ڕێکخراوی (کۆمەڵەی برای سۆڤێتستان) ە مژدەی یەکگرتنی خۆیانی لە گەڵ یەکێتی تێکۆشین داوە.
لە ل 1 - 5 "دەشتی قەراج پێویستە دوبارە بگەڕێتەوە هەولێر! وە دابەش بکرێتە سەر فەلاحەکان"
لە ل 6 - 17 "بۆ زانینی ڕاستی لە بابەت تەنزیمی لقی کورد لە کوردستانی عیراق دا"
لە ل 17- 25 "گوێ بگرە لە ناڵەی میلەت". دەنگوباسی هەولێر و سلێمانی و هەڵەبجە و کەرکوک و کۆیە ئەگێڕێتەوە.

ڕۆژ و مانگ و ساڵی چاپ و بڵاوکردنەوە لە سەر هیچ ژمارەیەکیان نەنوسراوە. لە بەر ئەوە کاتی دەرچونی هەر بە مەزەندە ئەتوانرێ دیاری بکرێ:
یەکەم:
ڕێکخراوەکە لە مانگی شوباتی 1944 دا دامەزراوە و لە نیسانی 1945 دا هەڵوەشاوەتەوە.
دوەم:
لە ژ3 دا ریپۆرتاجێکی لە ژێر سەردێڕی (حەلەبجە دەڵێن و نایکەن) بڵاوکردۆتەوە، سەرەتاکەی بەم جۆرە دەس پێ کردوە: "قەزا و قەدەر وابو لە 945/1/3 دا ڕێگام بە شاری حەلەبجە کەوت بۆ کڕینی هەندێ ئەموالی تیجاری..."
بەم پێیە ئەبێ ژ1 و 2 لە دوا مانگەکانی ساڵی 1944 و ژ3 لە مانگەکانی سەرەتای 1945 دا بڵاوبوبێتەوە.

یەکێتی تێکۆشین تەنیا 2 ژمارەی لە بەر دەس دایە کە ژمارەکانی دوەم و سێیەمە. ڕەنگە هەر ئەو 3 ژمارەیشی لێ دەرچوبێ. تەمەنیشی زۆر کورت و کەم خایەن بوە. بەڵام شیکردنەوەی ناوەرۆکی بابەتەکانی، بۆ لێکۆڵینەوەی ڕەوتی گۆڕان و گەشەکردنی بیری سیاسی و شێوەی کارکردن لە ناو بزوتنەوەی نەتەوەیی کوردا، گرنگیی تایبەتی هەیە.

## 2. لە روی رۆژنامەوانییەوە

### 2. 1. لە روی هونەری رۆژنامەگەرییەوە

یەکێتی تێکۆشین بە دەزگای چاپ دەرکراوە. جگە لە ناوی گۆڤارەکە کە بە خەتاتی نوسراوە، ئەویش بە خەتێکی ناشیرین و بە ڕێنوسێکی ناڕاست، ئیتر خەتاتی تێدا بەکار نەهاتوە. لە قەوارەی کتێب دایە و هەمو لاپەڕەکانی یەک ستونی تێدا نوسراوە. وێنە و خەریتە و کاریکاتۆری تێدا نیە. هەڵەی چاپی زۆری تێ دایە. پێ ئەچێ پیتچنەکانی کوردییان نەزانی بێ. زۆر کەم پێڕەوی خاڵبەندی تێدا کراوە و، زۆر جار لە بەکارهێنانیدا بە هەڵەدا چون.
بە گشتی وەکو گۆڤارێکی نهێنی بە کارێکی گەورە دائەنرێ.

### 2. 2. لە روی هونەری رۆژنامەنوسییەوە

یەکێتی تێکۆشین زبانحاڵی نهێنی حیزبێکی سیاسی نهێنی بوە. نوسەرەکانی دیار و ئاشکرا نەبون و، شوێنی چاپ کردن و جۆری بڵاوکردنەوەی نهێنی بوە. ڕەنگە هەر بەرپرسەکانی لقی کوردی حیزبەکە بابەتەکانیشیان نوسی بێ.

پەیامێکی سیاسیی دیاریکراوی هەبوە. وەکو خۆی نوسیویێتی، بۆ چینی کرێکار و جوتیار و بە تایبەتی بۆ خاوەن بیر و خوێندەوارە پێشکەوتنخوازەکان. ویستویەتی سەرنجیان بۆ بیروبۆچونەکانی خۆی رابکێشی و لەو رێگایەوە رایان بکێشی بۆ ناو ریزەکانی رێکخراوەکەیان و، لە مرۆڤی ئاسایییەوە بیان کا بە تێکۆشەری شۆڕشگێڕ.

## 3. بابەتەکانی

### 3. 1. بابەتی ئایدیۆلۆجی

بابەتە ئایدیۆلۆجیەکانی ئامانجی رێکخراوەکە و بیروبۆچونەکانی و سروشتی رێکخستنەکە و جۆری رێکخستنەکە رون ئەکاتەوە.

### 3. 2. دەنگوباس

دەنگوباسەکانی بریتین لە دەنگوباسی داوودەزگاکانی حکومەتی عیراق لە شارە جیاوازەکانی کوردستاندا. دەنگوباسەکان هەر گێڕانەوە نین، بەڵکو بە لێدوانەوە نوسراون. لایەکی بریتیە لە ئاشکراکردنی گەندەڵی بەڕێوەبەرایەتی و، لایەکی تری داواکارییە لە دەزگا بەرزەکانی حکومەت، بە تایبەتی وەزارەتەکان، بۆ ئەوەی لە شکاتی خەڵک بپرسنەوە و، سنورێ بۆ گەندەڵی ئیداری دابنێن.

بابەتەکانی بە زۆری ئایدیۆلۆجین. مەبەستی قانیع کردنی خوێندەوارەکانێتی و، بە گشتی بابەتەکانی چ ئایدیۆلۆجی و چ هەواڵەکانی هاندەرانەن، بۆ بزواندنی ویژدان و وروژاندنی سۆزی خوێندەوارەکانی.

چ وتارە سیاسیەکانی و چ هەواڵەکانی، بە گشتی لە روی هونەری رۆژنامەوانییەوە، بە ناوەرۆک دەوڵەمەن و سەرنج راکێش و سەرکەوتون و، ئەگەر بە ئاشکرا و بە قانونی رێگەی دەرچونی هەبوایە لەو رۆژگارەدا خوێندەواری زۆری پەیدا ئەکرد.

رێنوسی گۆڤارەکە و جۆری داڕشتنی نوسینەکانی، لە چاو رێنوسی کوردی و داڕشتنی نوسینی ئەو سەردەمەدا، دواکەوتوتر بوە. لە سەرەتای چلەکانەوە تا کاتی دەرچونی یەکێتیی تێکۆشین چەندین گۆڤار و رۆژنامە دەرچون، لەوانە: رۆژنامەی حەفتانەی ژین لە سلێمانی، گۆڤاری مانگانەی گەلاوێژ و دەنگی گێتیی تازە لە بەغداد، گۆڤاری نیشتمان لە موکریان... لە بەر ئەوە رێنوسی کوردی و داڕشتنی نوسینی کوردی تا ئەندازەیەکی باش بۆ پێشەوە چو بو، کەچی داڕشتنی نوسینەکانی ئەوان بە هێزتر و رێنوسی ئەوان ئاسانتر بوە لە هی ئەم.

## 4. دیاریکردنی ئامانج

یەکێتیی تێکۆشین ئامانجی حیزبەکەیانی بە دیاریکراوی رون کردۆتەوە. لەو بارەیەوە نوسیویێتی:

"ئێمە لەم مەرحەلەیەدا بۆ سەربەستی عیراق هەوڵ ئەدەین، چونکە ئەم سەربەستیە قازانجی کورد و عەرەبە، وە چەند بزوتنەوەی پێشکەوتنی بە هێز بێ بە تایبەتی لە کوردستانی عیراق وە بە گشتی لە عیراق ئەوەندە سودی بۆ کوردی عیراق و گشت کورد ئەبێ. هەروەها ئیستا هەوڵ ئەدەین بۆ باش کردنەوەی ژیانی رەنجبەر و جوتیار و، رزگار کردنیان لە زوڵمی میر و بەگ و ئاغا. هەوڵ ئەدەین بۆ باش کردنی ژیانی کرێکار: ئیشی کەمتر وە کرێی زیاتر، بۆ پارێزگاری کاسب و تیجارەکانی بچوک، بۆ بڵاوکردنەوەی خوێندن و عیلم و سەقافەت لە نێو میلەتی کورد، بۆ مکافەحەی نەخۆشی، بۆ سەربەخۆیی ئیداری و سەقافی کوردستانی عیراق کە یەکەم هەنگاوە بۆ حەلی مەسەلەی کورد.

"ئەم شتانەی کە ئێمە هەوڵی بۆ ئەدەین سەربەستەکانی عەرەبیش تەئیدی ئەکەن وە بۆی هەوڵ ئـەدەن، وە جێ بە جێ بونی ئەم داخوازیيانە هەر بۆ ئێمە نیە، بێ گومان بۆ میلەتی عـەرەبی عیراقیشـە بـە حـوکمی زروفی موەحەد، چونکە هەردولا لە یەک حکومەت ئەژین وە داخوازیمان لە یەک حکومـەت داوا ئەکـەین بۆیـە خۆشی و سەربەستی بۆ هەردولایە، کەچی ئیستا هەژاری و دەست بە سەری هەردولای داگیر کـردوە. کەواتـە پێویستە کۆمیۆنیستەکانی کورد و عەرەب لە عیراق یەک مینهاجیان هەبێ، وە لە سـەر ئەساسـی یـەک مینهـاج کیفاح بکەن..."(ییکتی تی کوشین، ژ2، ل 9-10)

## 5. دیاریکردنی هێزی جوڵانەوەکە

ی. ت. خۆی بە حیزبی هەمو خەڵک نازانێ، بەڵکو سروشتی چینایەتی حیزبەکـەی بـە رونـی دیـاری کردوە. پێی وایە چینی دەرەبەگ سەنگەری ئیستیعمارە ئـەبێ هـەڵ بتـەکێنرێ. زەوی بـە سـەر جوتیـاراندا دابەش بکرێ. لەم بارەیەوە نوسیوێتی:

"کەوابو ئێمە کۆمیۆنیستانی کـورد لـە گـەڵ کۆمیۆنیسـتانی عـەرەب یـەک ئامانجمـان هەیـە ئـەویش: سەربەستی و ئازادی. بە نیسبەت ئێمە سەربەستی و ئازادی میللەتی کورد. وە بە نیسبەت ئەوان سەربەستی و ئازادی میللەتی عەرەب. وە سەربەستی و ئازادی هەردو، پارچەیەکە لە سەربەسـتی و ئـازادی گشـت میللـەتانی گێتی لە ژێر باری ئیستیعمار و کۆنەپەرستی عالەمی.

"وە زدی یەک دوژمن هەوڵ ئـەدەین ئـەویش: ئیسـتیعمار و کۆنەپەرسـتی. کۆنەپەرسـتی کـوردی بـە نیسبەت ئێمە و کۆنەپەرستی عەرەبی بە نیسبەت عەرەب، وە ئیستیعمار بە نیسبەت هەردو لا.

"وە باوەڕ بە یەک بیـر ئەکـەین وە لـە ژێـر رونـاکی یـەک نەزەریـە کیفـاح ئەکـەین ئـەویش: بیـری کۆمیۆنیستی و نەزەریەی مارکسی- لینینی.

"وە تەمسیلی یەک چین ئەکەین کە مەسالیحیان زدی یەکتر نیە ئەویش: چینی رەنجبەر و کرێکـار. بـە نیسبەت ئێمە چینی رەنجبەر و کرێکار و خـاوەن بیـر و هۆشـە پێشـکەوتوەکانی کـورد، وە نیسـبەت ئـەوان رەنجبەر و کرێکار و خاوەن بیر و هۆشە پێشکەوتوەکانی عەرەب..."(ییکتی تی کوشین، ژ3، ل 10- 11)

"... ئەڵێن: ئەم گۆڤارە گەلی کورد تەمسیل ناکات و چ هێزێک نیە لە پشتی ئـەم گۆڤـارە... بـەڵێ ئـەم گۆڤارە چینانی کۆنپەرست و ئینتیهازی کورد تەمسیل ناکا.."(ییکتی تی کوشین، ژ3، ل 11)

## 6. دیاریکردنی ئامرازی خەبات

بۆ بە جێ هێنانی سەربەستی عیراق، پێویستی بە ئەداتێکە ئەو هێزانە رێک بخات، کە قازانجیـان لـەم گۆڕینەدا هەیە، ئەویش حیزبە. حیزبێکی سیاسی کە لە سەر بنچینـەی سـنوری سیاسـی دەوڵـەت دامـەزرابێ، نەک لە سەر بنچینەی نەتەوە. ل 14- 15

پێکهێنانی حیزب و لقەکانی لە عیراقدا ئەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی عوسمانی. کاتێ کە حیزبی ئیتیحـاد و تەرەقی کاروباری گرتە دەس (1908) و لە هەمو ولایەتەکاندا لقی ئاشکرای دامەزراند. لـە بەغـداد و موسـڵ، تەنانەت لە جێگایەکی وەکو سلێمانیيش لقی ئیتیحاد و تەرەقی دامەزراوە. دوای ئەو، لقی هەندێ حیزبی تـری (مونافیس) دامەزراوە.

*(تێبینی: دەربارەی لقی سلێمانی ئیتیحاد و تەرەقی بڕوانە وتارەکەی کەمال رەئوف محەمەد لە کوردستانی نوێدا)*.

لە گەڵ دروستکردنی دەوڵەتی عیراق، لە بیستەکاندا، هەندێ لە سیاسیەکانی عیـراق هـەوڵیاندا ژیـانی حیزبایەتی بهێننە عیراقەوە. چەند حیزبێکیان پێکهێنـا. بـەڵام رەوتـی روداوەکـان بـە جـۆرێ رۆیشـتن ئـەم حیزبانە نەک هەر نەیان توانی دەورێکی کاریگەر لە ژیانی سیاسیدا بگێـڕن، بـەڵکو حیزبایـەتی‌یان لـە بـەر چاوی خەڵک سوک و قێزەون کرد. ئەم حیزبە عیراقی‌یانە بە درێژایـی بیسـتەکان و سـیەکان، هـیچ کامیـان، نەیانتوانیوە لقی خۆیـان لـە کوردسـتانی عیـراقدا دابمـەزرێنن. تەنانـەت لـە نـاو سیاسـی‌یە پیشـەیی‌یەکانی کوردیشدا بە دەگمەن توانیویانە کەسێک بکەنە هاودەنگی خۆیان.

لە کوردستانی عیراقدا چەند رێکخراوێکی ئاشکرا و نهێنی دامەزراون. ئەوانـە هەنـدێکیان سیاسـی و هەندێکیان کۆمەڵایەتی و رۆشنبیری بون. سیاسەتی ئینگلیز، کە ئەو سەردەمە لە عیراقدا دەسەڵاتدار بـون، وە سیاسەتی حکومەتی عیراقی ماوەی نەداون وەکو پێویسـت گەشـە بکـەن و، ئـەرکی سیاسـی و کۆمەڵایـەتی و رۆشنبیری خۆیان بە جێ بهێنن:

لە تەموزی 1922 دا جەمعیەتی کوردستان لە سـلێمانی دامـەزرا. لـەو کاتـەدا هێشـتا دەوڵـەتی عیـراق دروست نە کرا بو.

لە شوباتی 1925 دا جەمعیەتی مودافەعەی وەتەن لە سلێمانی دامەزرا. لەو کاتـەدا هێشـتا چارەنوسـی ولایەتی موسڵ بە لادا نەکەوت بو.

لە نیسانی 1926 دا کۆمەڵی زانستی کوردان لە سـلێمانی بـە موافەقـەتی وەزارەتـی نـاوخۆی عیـراق دامەزرا.

لە مایسی 1930 دا یانەی سەرکەوتن لە بەغداد بە موافەقەتی وەزارەتی ناوخۆی عیراق دامەزرا.

ساڵی 1929- 1930 هەیئەتی وەتەنی‌یە لە سلێمانی دامـەزرا و پـەلوپۆی هاویشـت بـۆ کـەرکوک و هەولێر. دوای 6 ی رەشی ئەیلولی 1930 بڵاوەیان کردوە.

ئەمانە بە هۆی ئەو تەگەرانەوە کە ئەهێنرایە رێگایان، نەیانتوانی هەتا سەر بڕ بکەن.

جگە لە مانە بە نهێنی چەند رێکخراوێکیش دامەزراون.

ساڵانی 1919- 1921 پێش گەڕانەوەی شیخ مەحمود چەند رێکخراوێکی پچوک دامەزراون.

ساڵی 1926 کۆمەڵی زەردەشتی دامەزرا

ساڵی 1928 لقی کۆمەڵی خۆیبون دامەزرا

ساڵی 1937 کۆمەڵی برایەتی دامەزرا

ساڵی 1939 حیزبی هیوا دامەزرا.

حیزبی هیوا لە ماوەیەکی کورتدا پەرەی سـەند و ژمارەیـەکی زۆر خوێنـدکار، دوکانـدار، ئەفسـەرانی جەیش، رۆشنبیر، سەرانی عەشائیری لێ کۆبـوەوە. لقـی لـە زۆری شـار و ناوچـەکانی کوردسـتانی عیـراقدا دامەزراند. پێوەندیی بەهێزی لە گەڵ تێکۆشەرانی کوردستانی ئێران و سوریا دروستکرد.

ئامـانجی سیاسـیی حیزبـی هیـوا رزگـاریی کوردسـتان بـو. بـەڵام بەرنامەیـەکی نوسـراو و دیاریکراوی نەبوە بۆ رێگەی رزگاریی کوردستان و، گۆڕینی بـاری کۆمەڵایـەتی، ئـابوری، رۆشـنبیری... کوردستانی عیراق.

لە روی پێکهاتنی چینایەتی‌یەوە، چینەکانی سەرەوەی کۆمەڵی کورد و چینی ناونجی کۆ کردۆتەوە.

لە روی رێکخراوەیی‌یەوە، نیمچە ئاشکرا بوە. تەلارێکی رێکخراوەیـی دیـاریکراوی نـەبوە. ئەگـەرچی سەرکردایەتی و کۆمیتەی ناوچەیی هەبوە بەڵام شتێکی رواڵەت بـون. هـەمو کـەس زانیـوێتی رەفیـق حیلمـی

(سەرۆکی باڵای) حیزبەکەیە و، سەرۆکی باڵا لە زۆری شارەکاندا (موعتەمید: باوەڕپێکراو) ێکی داناوە. ئەندامەکانی حیزب بە زۆری پێوەندییان لە گەڵ ئەم موعتەمیدەدا هەبوە.

ڕێبازێکی دیاریکراوی نەبوە بۆ جۆری تێکۆشان و، دیاری نەکردوە کە ئاخۆ کوردستان چۆن ڕزگار ئەکا: بە شۆڕش و خەباتی چەکدار؟ بە کاری جەماوەریی خۆپیشاندان و مانگرتن و دەربڕینی ناڕەزایی؟ یان بە ململانێی پارلەمانی و گفتوگۆ...؟

ئۆرگانێکی ڕێکوپێکی چاپکراوی نەبوە بیروبۆچونەکانی بۆ گۆڕان و باش کردنی ژیانی سیاسی، کۆمەڵایەتی، ئابوری، ڕۆشنبیری... کۆمەڵی کورد و، هەڵوێستی لە ڕوداوەکانی کوردستان و عیراق و ناوچەکە ڕون بکاتەوە. لە بەر ئەوە شوێنەوارێکی فکریی لە دوای خۆی بە جێ نەهێشتوە.

لە ناوەڕاستی چلەکاندا ناکۆکیەکانی ناو حیزبی هیوا، بە تایبەتی ناکۆکی سیاسی لە سەر دو کێشەی سەرەکی تەقییەوە:

یەکەمیان:

ئاخۆ حیزبی هیوا بەشداری جوڵانەوە چەکدارەکەی بارزان بکا یان خۆی لێ بە دور بگرێ؟

دوەمیان:

گەلی کورد لە خەباتی خۆیدا بۆ ئازادی، پشت بە یەکێتی سۆڤێت ببەستێ یان بە بریتانیا؟

هیوا نەیتوانی ئەم ناکۆکییانە چارەسەر بکات. لە ئەنجامی ئەوەدا ساڵی 1945 کەوتە هەڵوەشان و هەڵوەرین و پارچە پارچە بون.

هەڵوەشانی حیزبی هیوا جگە لەوەی بۆشایی سیاسی- ڕێکخراوەیی لە ناو بزوتنەوەی نەتەوەیی کوردا دروست کرد، بۆشایی فیکرییشی بە جێ هێشت. حیزب و ڕێکخراوی تر پڕیان کردەوە.

تا ناوەڕاستی چلەکان هیچ حیزبێکی عیراقی، چ ئاشکرا و چ نهێنی، نەی توانیوە لقی خۆی لە کوردستانی عیراقدا دابمەزرێنێ. تەنانەت حیزبی شیوعی عیراقی کە لە 1935 دا دامەزرا و، لە زۆری شارەکانی عیراقدا شانە و ڕێکخراوی پێک هێناوە، لە کوردستاندا بنکەیەکی ئەوتۆی نەبوە.

بۆ یەکەمجار حیزبی شیوعی عیراق (گروهی وحدة النضال) لقی حیزبێکی عیراقی لە کوردستاندا دامەزراند و، چەندین (مفاهیم) ی فکری و سیاسی نوێی هێنایە ناو جوڵانەوەی کوردەوە.

لقی کوردی کۆمەڵەی کۆمیۆنیستی کورد، کە ڕێکخراوێکی مارکسی- لینینی بوە، ئەگەرچی لقی حیزبێکی عیراقی بوە، بەڵام زۆری ناتەواوییەکانی لە حیزبی هیوادا هەبون چارەسەر کردوە و، بە ڕونی ستراتیجی کاری خۆی و هێزەکانی و، (ئەدات) ی تێکۆشان و (ئوسلوب) ەکانی دیاری کردوە. هەر ئەمەیش دواتر، ئاشکراتر، ڕەنگی داوەتەوە لە بیروباوەڕ و شێوەی خەباتی بزوتنەوەی نیشتمانی و نەتەوەیی کوردا بە هەردو باڵەکەیەوە: حیزبی شیوعی عیراق و پارتی دیموکراتی کورد.

ئامانجی کورد لە عیراقدا چیە و، ڕێگەی بەدیهێنانی کامەیە؟

بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی ئەبێ حیزبی تایبەتی خۆی هەبێ یان لقی حیزبێکی عیراقی بێ؟

ئایا کورد بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی ئەبێ خۆی بە تەنیا کار بکا یان لە گەڵ عەرەب پێکەوە؟

لە خەباتی خۆیدا لە ناوەوە پشت بە کێ ببەستێ و لە دەرەوە پشت بە کێ ببەستێ؟

یەکێتیی تێکۆشین وەڵامی ئەم پرسیارانەی داوەتەوە:

ئامانجی کورد لە عیراقدا سەربەستی عیراقە لە دەرەبەگایەتی و نفوزی ئیستیعمار، بە تێکۆشانی هاوبەش لە گەڵ عەرەب لە ناو یەک حیزبی عیراقیدا و، بە پشتیوانی یەکێتی سۆڤێت، بە رێگای تێکۆشانی جەماهیری.

یەکێتیی تێکۆشین خۆی تەمەنی کورت بو، بەلأم ئەو (مفاهیم) انەی هێنایە ناو جولأنەوەکەوە. دواتریش بە چونی ئەندامەکانی بۆ ناو حیزبی شیوعی عیراق و پارتی دیمۆکراتی کورد، بۆ دەیان ساڵ بون بە بنچینەی چەندین کێشە و دروستکەری ناکۆکی بنەڕەتیی فکری، سیاسی، رێکخراوەیی... لە ناو جولأنەوەی کوردا. سەرەنجام حیزبی عیراقی و، برایەتی کوردو عەرەب و، پەرستنی یەکێتی سۆڤێت، لە (وەسیلە) ەوە بۆ بەجێهێنانی ئامانجی سیاسی، خۆیان بون بە ئامانج (غایە).

## 7. دیاریکردنی شێوەکانی خەبات

لقی کوردی کۆمەڵی کۆمیۆنیستی عیراق، بەرنامەیەکی نوسراو و دیاریکراوی لە بەر دەسدا نیە تا بزانرێ بە چ رێگەیەک ویستویەتی باری کۆمەلأیەتی، ئابوری، رۆشنبیریی، خۆی گوتەنی (چینانی رەنجبەر) بە باری باشەدا بگۆڕێ. بەلأم لە دو تویێ گۆڤارەکەدا هەندێ لایەنی جۆری بیرکردنەوەیان ئەخوێنرێتەوە.

یەکێتیی تێکۆشین، چەکێکی کاریگەری خەباتی حیزبەکە بوە. جگە لەوەی هۆیەکی گرنگی بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕ و بۆچونەکانی بوە، لە هەمان کاتدا هۆیەکی گرنگی ریسواکردنی زوڵموزۆری کۆمەلأیەتی و گەندەڵیی بەڕێوەبەرایەتی و دواکەوتنی ولأت و، لە ئەنجامدا هۆیەکی هاندان (تحریض) و وروژاندنی هەستی مرۆڤدۆستانەی (خاوەن بیر و هۆشە پێشکەوتوەکان) و هەستی چینایەتی (چینانی کرێکار و فەلاح) بوە، بۆ سازدان و رێکخستنیان بۆ خەبات بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکانی حیزب.

یەکێتیی تێکۆشین، داوا لە میلەت ئەکا وریا بێ، بە فرتوفێڵی ئیستیعمار هەڵنەخەڵەتێ و، دەس نەداتە چەک دژی حکومەتی عیراق. لەو کاتەدا دوەمین جەنگی جیهان بەردەوام بوە. لەو جەنگەدا بریتانیا و ئەمەریکا و یەکێتی سۆڤێت لە لایەک بون، ئەڵمانیای نازی و ئیتالیای فاشی لە لایەکی تر بون. سیاسەتی بریتانی و سیاسەتی سۆڤێتی لە عیراقدا ئەوە بو کە هەلومەرجی ناوخۆی عیراق ئارام رابگیرێ. پشێوی و ئاژاوە و شەڕی تێدا نەبێ. حیزبی شیوعی عیراق (بە رابەری فەهد کە دانپیانراوی سۆڤێتی بو) ئەمە رێبازی بو. کاربەدەستانی بریتانیایش، کە دەسەلأتداری راستەقینە بون لە ناو عیراقدا، هەمان شتیان لە مەلا مستەفای بارزانی و سیاسیەکانی کورد داوا ئەکرد.

ئەم داوایەی یەکێتیی تێکۆشین لە گەڵ سیاسەتی بریتانیا و سۆڤێت و، لە گەڵ سیاسەتی حیزبەکەی فەهدا گونجاو بوە.

یەکێتیی تێکۆشین زۆر جار باسی سەربەستیی عیراق و رزگاریی کورد و کوردستان و، روخاندنی سەنگەری ئیستیعمار و دەرەبەگایەتی کردوە. بەلأم هەمیشە روی دەمی کردۆتە حکومەت و، داوای لەو کردوە زوڵمو زۆر هەڵبگرێ و چارەسەری گەندەڵیی بەڕێوەبردن بکا. لە چەند بۆنەیەکدا ئەمەی دوبارە کردۆتەوە، بۆ نمونە:

سەبارەت بە (بەلەدیەی هەولێر) نوسیوێتی:

"... رەئیسی بەلەدیە هەروەکو بوت لە دائیرەکەی دانیشتوە تا وەخت تەواو ئەبێ، ئومێد وایە حکومەت ئینسانێکی باش و موسەقەف بۆ ئیشوکاری میلەت هەڵبژێرێ." (ییکتی تی کوشین، ژ2، ل 11)

لە سەروتاری ژ3 دا کە لە سەر دەشتی قەراج نوسیوێتی:

"... بەو موناسەبەتە فەزائیحی تەسویە بەرچاو ئەکەین کە چۆن عەردەکان بە ناحەقی درا بە خاوەن نفوزەکان (ئاغا و دەرەبەگ) و کرمانجە بەستەزمانەکان لە حەقی خۆیان بێ بەری کران وە لە ترسی کوشتن و دەربەدەر بون بێ زبان مان و چاو لە حەقی خۆیان پۆشی، بەڵام ئێمە پێشڕەوی میلەت ئەم زوڵمە بە هیچ کلۆجێکەوە قبوڵ ناکەین و لە حکومەت داوا ئەکەین دوبارە قەزیەی تەسویە بەرچاو وەرگرێ و سەرلەنوێ بێنێتە کار و کرمانجی بەستەزمان لە حەقی خۆی، لە عەردی خۆی، کە بە ئارەقەی نێوچەوانی خۆ و باپیری و بە ڕەنجی کێڵاوە و چاندراوە بدرێتە دەست خۆی و بەرچاو حکومەت ئەکەین کە دوبارە نەکەوێتە هەڵە لە قەزیەی تەسویە و حەدێک بۆ مەسالیحی دەرەبەگەکان دابنرێ... ئیتر چاوەنۆڕی کاری حکومەت ئەکەین، ئایە کاریش وەک قەولێتی (مەبەستی قسەکانێتی. نم) وە یا بۆ (وزن الشعر) ئەم وتارانە ئەدات؟" (ییکتی تی کوشین، ژ3، ل 5)

لە شوێنێکی تردا نوسیوێتی:

"... ئیتر بە جۆشەوە نیشتمانپەروەرە دڵ بێگەردەکانمان بانگ ئەکەین بۆ تێکۆشین بۆ روخاندنی سەنگەری ئیستیعمار لە نێو وڵات کە دەرەبەگییە. وە لە حکومەت داوا ئەکەین ئەمهەندە مل کەچ نەبێت بەرامبەر دەرەبەگەکان کە لە هەر لایەکی وڵات لە فەساد و جەور و زوڵم چ کارێکی تریان نیە..." (ییکتی تی کوشین، ژ3، ل 19)

دەربارەی خەستەخانەی پێنجوین نوسیوێتی:

"... تکا لە پیاوە مەسئولەکان ئەکەین کە ئیهتیمام بە سیحەتی میلەت بدەن، ئەم ئیهتیمامە حەقێکی تەبیعی میلەتە." (ییکتی تی کوشین، ژ3، ل 20)

دەربارەی قوتابخانەکانی هەڵەبجە نوسیوێتی:

"... تکا لە دەوائیری مەسئول ئەکەین حەدێک بۆ تەعەدای ئەم گەنجانە لە سەر ئەم میلەتە هەژارە دابنێن." (ییکتی تی کوشین، ژ3، ل 22)

## 8. **هەندێ لە وتارەکانی یەکێتیی تێکۆشین:**

**"وریا بە ئەی میلەت!**

"بە وردی سەیری قەزیەی کورد بکەین، ئایە لە بەر چی ئەم هەمو هەوڵ و تەقەلا و خوێنڕشتنە تا ئیستا بۆ قەزیەی کورد بێ بەر (ثمره) بوە؟

"هەروەک ئەزانین کورد میلەتێکە لە دەوری دەرەبەگی ئەژێت، واتا جەماهیری میلەت بە چەند شوێنێکا بەش کراوە، هەر بەشێکی لە ژێر حوکمی دەرەبەگێک ئەژێت، کە وێنەی راستی ئەم حالە لە تەقسیماتی عەشائیری دیارە، کە هەر عەشیرەتێک رەئیسی تایبەتی خۆی بە رێ ئەبات و بەرامبەر عەشیرەتەکانی تر وەک میلەتێکی جیاواز و بێگانە دێتە بەرچاو، بە تایبەتی‌یش ئەو کاتە کە مەسالیحی دو رەئیس عەشیرەت رێک ناکەوێ، هەروەها جاری وا ئەبێ لە ناو یەک عەشیرەت مەسالیحی چەند ئاغا یەک و رێک ناکەوێ، کە (العیاذ بالله) بە سەدان کوشتار و سوتان ئەکەوێتە ناو ماڵی کرمانجە بەستەزمانەکان کە چ گوناهیان نیە غەیری تێکچونی مابەینی دو ئاغا، بەڵێ ئەم کوشتار و تاڵانە زەرەری کرمانجی بێ گوناه ئەبێ کە وەک چارپێن

(ماشیە) بۆ ئاغا. لە بەر ئەم جۆرە ژیانە- دەرەبەگی، جەماهیری میلەتی کورد یەک نەبۆتەوە لە تێ کۆشین بـۆ قەزیەی کورد. دیرۆکی (تاریخ) شۆرشەکانی کورد بـە رونـاکی ئـەم راسـتیە دەر ئـەخات کـە چـۆن لـە کـاتی داگیرسانی شۆرشا مەسلەحەتی چەند دەرەبەگێک رێک نەکەوتوە جـا چونەتـەوە گـژ یـەکتر. لـە بـاتی ئەمـە کیفاحی زۆردار بکەن پێکـڕا، بـەم بۆنەیـە ئـاگری شـۆڕش کوژاوەتـەوە (بێگومـان بـە خینێکـی بـێ ژمـاری کرمانجان دوایی شۆڕش هاتۆتەوە) هەروەها ئەم جۆرە ژیانە بۆتەوە چـەکێکی بـە هێـز لـە دەسـت بێگانـەی خاوەن مەتامیع لە کوردستان کە یەکی خستونە گژ ئەوی تر وە بە بۆنەی بێ هێز بونیان ئەو جێگیر بۆتـەوە، هەروەها ئەم جۆرە ژیانە بۆتەوە دینگەیەکی بەهێزی ئیستیعمار لە کوردستان. دوای جەنگی عالەمی یەکـەم لـە بێ قابیلیەتی میلەتی کورد لە دامەزراندنی حکومەتێکی کوردستانی سەربەخۆ- لە بەر دەرەبەگایەتی بـە هێـز- وە ئیجابی مەسلەحەتی ئیستیعمار بۆ جێ قایم کردنی، میلەتی کورد چەند بەشێک کرا تاکو تەگەرەی (مشکلە) ئەقەلیات پەیدا بکرێ لە ناو دەوڵەتانی... وە بە لێک دانی دو میلەت بە دەسائیسی ئیستیعمار بزوتنی ئـازادی بێ هێز ئەبێت (ئەمەیە ئامانجی گەورەی ئیستیعمار) (تەبادولی مەناتیقی نفوزیش) لـە بـەینی موسـتەعمەرەکان سەبەبێکی بو بۆ دابەشکردنی کوردستان بـە چەنـد جێگـا.. لـە نـەتائیجی ئـەم دابـەش کردنـە حکومـەتێکی عیراقی: لە عەرەب و کورد عیبارەت هاتە وجود، ئەمیش لە ژێر نفوزی ئیستیعمار. کـە بـێ گومـان ئیسـتیعمار نایەوێ مەناتیقی نفوزی لە دەست دەر بچێ، لە بەر ئەمە هەر جۆرە ئەسالیبێک بەکارئەهێنێ بۆ کوشتنی وەعـی میلەت بۆ ئازادی و سەربەستی. لە وڵاتی عیـراقیش، کـە لـە دەوری شـوبهە دەرەبـەگی ئـەژێت و تـازە بـونی صەناعەت لە شارە گەورەکانی بڵاو بۆتەوە، ئەڵێن ئیستیعمار دەرەبەگی بە هێز ئەکا، تاکو تەگەرە بێ لە رێگای تێکۆشینی میلەت بە یەکێتی بۆ ئازادی، هەروەها دو میلەتی عیراق - کورد و عەرەب - ئەخاتە گـژ یـەکتر بـە بڵاوکردنی بیری شۆڤێنی و کەراهێتە لە بەینی هەردو میلەت کە بە میلـەتی کـورد وا تـێ ئەگەیـەنێ کـە حـالی ناخۆشی کورد لەوەیە: کە لە ژێر دەست عەرەبە و لە لایەن ئەوەوە ئیستیعمار کراوە.

"لە نێو میلەتی عەرەبیش بیری خۆهەڵکێشان و حەقی تەسـەیتور (تسـیطر) بـە سـەر میلـەتی کـورد و مەحوی ئەقەلیات بڵاو ئەکات و تەشجیع ئەکات. ئەم بیرە شۆڤێنی‌یانە تەنیا لـە لایـەن ئیسـتیعمارەوە بـە هێـز ناکرێ بەڵکو چەند دەستی تریش هەیە لە گەڵی کە مەسلەحەتیان لە گەڵ ئیستیعمار یەکە، ئەمانیش: دەرەبەگی و کۆنەپەرستی و تیجارانی قەومیەت، کە ئەیانەوێ لە سـەر شـانی جـەماهیری میلـەتی کـورد بگەنـە مـەراکیز (مەراتیبی بەرز)

"بەڵام راستی کە وردبون و واقیع فێرمان ئەکات: دەردی هەردو میلەت (کورد و عەرەب) ئیستیعمارە.

"دەرمانی ئەم دەردەش: ئازادییەکی تەواوە کە عەناسیری دیموقراتی تەقەدومی بێتـە سـەر حـوکم، بـەم جۆرە رێ ئەکرێت لە بەر دەم هەردو میلەت بۆ پێشکەوتن و رێک کەوتنیان بۆ تـەقریری مەسـیر و ئـازادی و بەرزی کورد و عەرەب. پێویستە بەرچاو بکرێ: میلەتی کورد و هەر میلەتێک ئەوسا پێی ئەکرێ بـە تـەواوی ئازادی کە پێ بکرێ: گوزەرانی حوکمی خۆی بکات، ئەم توانایە ئەوسا جێگیر ئەبێ کە سەنگەری ئیسـتیعمار و دەرەبەگی بڕوخرێ و ون بکرێ لە نیشتمانی خۆشەویستمان کوردستان تاکو یەکێتی تێکۆشینی جەماهیری کورد بۆ تەقریری مەسیر بێتە کار، کە چ هێزێک لە توانای نابێت بەربەرەکانی بکات و لە پێشی راوەستێ.

"بێ گومان هەست کردن بەم راستی‌یانە لـە نێـو میلـەتی کـورد تیرێکـە بـۆ جـەرگی ئیسـتیعمار، جـا ئیستیعمار بۆ ئەوەی راوی خۆی بپارێزێ لەم کاتە وا دور نیە یەک لە ئەسالیبەکانی بە کار بێنێ بـۆ بـە هێـز کردنی سەنگەری خۆی بە بێ هێز بونی بزوتنی نیشتمانی و ئازادی... جا لە بەر ئەمە ئێمـە کـوڕانی میلـەت، شیوعی‌یانی کورد، دەنگمان بەرز ئەکەین میلەت بانگ ئەکەین: کە وریابە ئەی میلەت، وریابـە ئـەی میلـەت، لـە دەسائیسی ئیستیعمار، کە دور نیە ئیستا تەشجیعت بکات بۆ ئەوەی شۆڕشێک بکەیت گـژ حکومـەتی عیـراق

هەڵستی جا هەزاران خوێن پاکی رۆڵەکانت برژێ هەروەها لە میلەتی عەرەبیشا بە بۆنەی حەق وەرگرتن بەڵام بزانە حەقی هەردو میلەت لە زگ ئیستیعمارە. ئەو سوڵتەیە کە تـۆی ئیسـتیغلال ئـەکات عـەینی وەقـت میلەتـە بەستەزمانەکەی عەرەبیشی ئیستیغلال کردوە. ئەم دەسائیسە بۆ ئەوەیە کە هەردولا بێ هێز بکەوێ کەراهیـەت زیاد بێ لە ناو هەردو میلەتی خۆشەویست تاکو قەڵای خۆی هەندێکی تر بەردەوام بێت لە نێو وڵاتـی هـەردو میلەت ئیتر بزانە هەراوهوریایەک خزمەتێکی ئاشکرایە بۆ ئیستیعمار ئەگـەر مەسـدەری ئیسـتیعمار بـێ، بـێ گومان خیانەتێکی گەورەشە بۆ میلەتی کوردی شیرین. ئومێد وایە سەدەمین جار هەڵنەخەڵەتێن بـە فرتـوفێڵی ئیستیعمار. ئیستا کاتی ئەوەیە دەست بخەینە دەست کورە موخلیسەکانی میلەتی عەرەب بۆ عیراقێکی ئـازاد و دیمۆقراتی کە مەجال پەیدا بکرێ بۆ پێشکەوتنی و پێ گەیاندنی هەردو میلەت بۆ ئازادی و تـەقریری مەسـیر بۆ بەرزی و خۆشی میلەتی عەزیز... ئیتـر وریابـە وریابـە ئـەی میلـەتی دڵسـۆز و خۆشەویسـت."(یەکێتی تێکۆشین، ژ2، ل 1- 3)

**"یەکێتیی تێکۆشین بۆ ئازادی نیشتمان**

"ئەگەر ئاورێک بۆ پاشەوە بدەینەوە، ئەبینین میلـەتی کـورد و عـەرەب ژێردەسـتی یـەک زۆردار بـون ئەویش ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بو، وە هەردولا هەوڵ و تەقەلایان ئەدا بۆ سەربەستی و رزگار بـون لـە بـەر ئەمە وەرگەڕانی (ئینقیلاب) 1908 ی دیمۆقراتی- مەشروتیەت وە یا حەرەکـەتی ئیتیحادیـەکان- لـە هـەردولا تەئیدی وەرگرت، بە ئومێدی ژیـانێکی باشـتر، وە سەربەسـتیـیەکی میللـی. چونکـە شـیعاراتی ئیتیحادیـەکان هەروەک ئەزانین: سەربەستی، دادرەستی، وە یەکبون بو، بەڵام ئەمانە بە گەیشتنی حـوکم، هـیچ کامیـان پێـک نەهێنا لەم وتانە، وە هەر وەکو پێشوەکان سیاسەتی ئیزتیهادی قەومییان بە کار هێنا. کورد و عەرەب لە دوای جەنگی گەورەی پێشوەوە بۆ تەقریری مەسیر و بۆ سەربەستی هـەوڵیان ئـەدا، بـەڵام بـێ هێـزی بزوتنـەوەی نیشتمانی هەردولا، وە پێک نەهێنانی دەوڵەتانی سوێندخواران پەیمانیان بۆ میلەتانی رۆژهەڵات، وە خیانـەتی ئەحزابی ئومەمیەتی دوەم بۆ شیعاری حەقی تەقریری مەسیری میلـەتانی بـێ هێـز، ئـەم دو میلەتـەی لـە ژێـر ئیستیعمار بە جێ هێشت.

"وڵاتانی عەرەب دابەش کران بە سەر چەند مەنتیقەیەکی نفوزی ئیستیعماری، کوردیش دابەش کرا بە 3 جێ.

"کوردی عیراق لە گەڵ میلەتی عەرەبی عیراق ئیستا پێکەوە ئەژین لە ژێر یەک ئیستیعمار، لە بەر ئەمـە زروفی سیاسەتی واقیعی وا پێویست ئەکات کە هەوڵ بدەین بۆ ئەوەی مەسئەلەی کورد و عەرەب موشتەرەکەن پێک بێنـین، کـە بـێ گومـان یـەکبونی دولا هێزێکـی گەورەیـە بـۆ تـەحقیقی ئـازادی و تـەقریری مەسـیر و سەربەستی. ئێمە کە شیوعیەکانی کوردین لە عیراقدا پێویستە زۆرترین ئیهتیمام بە موشکیلەی کوردی عیـراق بدەین، چونکە بەری هەوڵمان لەم کاتەدا بۆ کوردی عیراق ئەبێت، بەڵام ئەم هەوڵ دانە زۆر بێ هێز ئەبێت گەر تەنها بێت. بـێ گومـان هێـزی ئـازادی پـەروەرەکانی عـەرەب لـە عیـراق موخلیسـترین هێـزە بـۆ پێکهێنـانی مەبەستمان کە قازانجی هەردو میلەتە.

"بەڵام ئەمە مەعنای ئەوە نیە، چاومان ئەپۆشین لە کوردی تورکیا و کوردی ئێران، بەری هـەر غـەدرێک بکەوێ پێویستە لە سەرمان رەئی گشتی عالەمی ئاگادار کەین، تاکە بزانرێ میلەتێکی مەزڵوم و مەغـدور هەیـە، ژیانێکی ناخۆش ئەژێت، وە حەقی ژیانێکی خۆشی هەیە وەک میلەتانی تر سەربەست لـە گێتـی، وە پێویسـتە ئەم حەقەش وەربگیرێ.

"ئێمە لەم مەرحەلەیەدا بۆ سەربەستی عیراق هەوڵ ئەدەین، چونکـە ئـەم سەربەسـتیە قـازانجی کـورد و عەرەبە، وە چەند بزوتنەوەی پێشکەوتنی بە هێز بێ بە تایبەتی لە کوردستانی عیراق وە بە گشـتی لـە عیـراق

ئەوەندە سودی بۆ کوردی عیراق و گشت کورد ئەبێ. هەروەها ئیستا هەوڵ ئەدەین بۆ باش کردنەوەی ژیانی رەنجبەر و جوتیار و، رزگار کردنیان لە زوڵمی میر و بەگ و ئاغا. هەوڵ ئەدەین بۆ باش کردنی ژیانی کرێکار، ئیشی کەمتر وە کرێی زیاتر، بۆ پارێزگاری کاسب و تیجارەکانی بچوک، بۆ بڵاوکردنەوەی خوێندن و عیلم و سەقافەت لە نێو میلەتی کورد، بۆ مکافەحەی نەخۆشی، بۆ سەربەخۆیی ئیداری و سەقافی کوردستانی عیراق کە یەکەم هەنگاوە بۆ حەلی مەسەلەی کورد.

"ئەم شتانەی کە ئێمە هەوڵی بۆ ئەدەین سەربەستەکانی عەرەبیش تەئیدی ئەکەن وە بۆی هەوڵ ئەدەن، وە جێ بە جێ بونی ئەم داخوازیانە هەر بۆ ئێمە نیە، بێ گومان بۆ میلەتی عەرەبی عیراقیشە بە حوکمی زروفی موەحەد، چونکە هەردولا لە یەک حکومەت ئەژین وە داخوازیمان لە یەک حکومەت داوا ئەکەین بۆ بە خۆشی و سەربەستی بۆ هەردولایە کەچی ئیستا هەژاری و دەست بە سەری هەردولای داگیر کردوە. کەواتە پێویستە کۆمیۆنیستەکانی کورد و عەرەب لە عیراق یەک مینهاجیان هەبێ، وە لە سەر ئەساسی یەک مینهاج کیفاح بکەن بەڵام ئەم کیفاحە پێک نایە، وە نرخێکی عەمەلی نابێ گەر هەردولا لە یەک حیزب کۆ نەبنەوە، تاکو ببن بە یەک فیکر وە یەک هێز، وە یەک ئیرادە. ئەم حیزبەش کە هەردولا کۆ ئەکاتەوە، حیزبی شیوعی عیراقە، چونکە برا شیوعیەکانی عەرەب وە یا ئێمە شیوعیەکانی کورد وە یا هەر شیوعیەکی عیراق قەزیەی میلەت بە تەواوی ئەزانێ وە عیلاجی ئەکات کە کردەوەیان سودی بۆ هەمو لا ئەبێ، ئەمەش مەعنای ئەوە نیە شیوعیەکانی کورد لە یەک حیزب ئیش کردنیان قەزیەی کوردایەتیان بە جێ هێشتوە. نەء! لە یەک حیزب ئیشکردن مەعنای ئەوەیە کە هێزمان یەک ئەکەین بۆ پێکهێنانی مەسئەلەی هەردولا، کە بێگومان هێزی هەردولا لە توانایەتی تەگەرە زوتر حەل بکات. حیزبی شیوعی عیراقی، حیزبی رەنجبەر و کرێکار و تێگەیشتوەکانی عیراقە، ئەم حیزبە لەوانە وە بۆ ئەوانە. هەروەها ئەم حیزبە لە سەر یەک نیزام ئەڕوا و، شیوعیەکانی کورد لقی تایبەتی خۆیان هەیە، کە مەسئولە لە رواندنی بزوتنەوەی نیشتمانپەروەری لە کوردستانی عیراق.

"هەژاری و دەست بە سەری، تێکۆشین بۆ سەعادەت و سەربەستی، هێزی کورد و عەرەبی یەک کردۆتەوە، لە بەر ئەمە یەکێتی تێکۆشین بۆ هەردو میلەتە، ئێمە بانگی گەلی کوردی عیراق ئەکەین کە رو بکەنە حیزبی شیوعی عیراق، کە حیزبی هەژار و رەنجبەر و کرێکاری کورد و عەرەبە.

"ئەی برایانی خۆشەویست زۆر باش بزانن کە یەکێتی تێکۆشین: دەنگی سەربەستی و ئازادیە، دەنگی کوڕانی میلەتە، بۆ نان و سەقافەت و ئازادی میلەتی کورد.

"یەکێتی تێکۆشین مینبەری میلەتی کوردە وە لە سەر ئەم مینبەرە بانگی گەلی کورد ئەکەین کە وریا بن وە بۆ نان و سەربەستی تێ بکۆشن!"(بیکتی تی کوشین، ژ2، ل 8 - 11)

**"کورد و ئۆکتۆبەر**

"لە نێو تاریکی زۆرداری، لە بەینی ئێش و ئازاری مرۆڤی بەندکراو، لە نێو هەناسە ساردی و، فرمێسکی گەرمی پیر و ساوا، لە نێو هەڵمەتی خوێن مرۆڤپەروەران: تیشکی روناک لە ناو دەستێکی بێ گەرد بەرز بوەوە و شەش یەکی گێتی روناک کردەوە ئەو تاریکیەی کە داگیر کرد بو وەک تەمی بەهار لابەلای کرد بێ گەڕانەوە...

"ئەم تیشکە روناکە حوکمی سۆڤیاتیە، ئەم دەستە بێ گەردە دەستی بۆلشەفیکانە، کە یەکەم وە بە هێزترین سەنگەری زۆرداریان روخاند...

"ئەم تیشکە روناکە هەمیشە دەورە و پشتی روناک ئەکاتەوە، تاکو میلەتان رێ ببیننەوە بۆ چۆن وێران کردنی موغارەی ئێش و ئازار و بەندایەتی...

"مانگی ئۆکتۆبەر بەم تیشکە پیرۆزە بەختیارە، ئەی لە پاش ئەم بەختیاریيە چ بەختیاریيەک؟

"روسیای قەیسەری وە یا (لینین) گوتەنی: بەندیخانەی میلەتان، لە ژێر جەور و زوڵمی گەلێک میلەتی کۆ ئەکرد، لەم میلەتانەش بەشێکی کەم لە کورد هەبو، ئەگەر بە وردی سەیری حالی میلەتانی روسیای قەیسەری بکەین ئەتوانین بڵێین واوەیلایان بو: کە لە هەر شتێک لە دوا بون، وە کاربەدەستەکان میلەت وەک حەیوانات بە کاریان ئەهێنان وە میلەتانەش هەر کات تێک ئەگیرسان وە ماڵی یەکتر هەندی تر وێرانیان ئەکرد لە نەزانی و داخی ناخۆشی ژیان، لەم میلەتانەش میلەتی کورد کە لە حالەتێکی گەلێ موتەئەخیر ئەژیا! دەوری بەداوەت و دەرەبەگی، جەماهیری میلەت لە لایەن ئاغا و مەلا و شێخ و حکومەت ئیستیغلال ئەکرێ، حالەتێکی ئیقتیسادی زۆر نزم، لە هەمو وڵاتا چاو بە دوکەڵی کارخانە ناکەوێ، لە نێو گشت زەویەکان ئالەتێکی زەراعی نابینـدرێ، هاتوچۆ بە کەر و وڵاغ، لە هەزاران کەس یەک خوێندەوار نادۆزرێ، لە سەد شوێنا خەستەخانەیەک بەرچاو ناکەوێ، حالەتی ژن لە نزمترین پلەیە، کوشتار و تالان لە هەردولا.. بە کورتی حاڵەتێکی وا کە بە چ رویەکەوە لە گەڵ مەزاهیری مەدەنیەتا ناپێورێ. بەڵام وڵاتی روسیا وە ئۆکرانیا هەندێ لە پێش بون کە لە تەنیشت ئیقتاعەوە (دەرەبەگی) کارخانەکان لوتیان بەرز کرد بو وە خوێندەواری هەندێ بڵاو بوبو...

"لە ئیحتیکاکی ئەم تەناقوزاتەوە بیری مارکس بڵێسەی ئەدا: ئەم بڵێسەیە لە تاریکی کارخانەکان وە گەڕەک و کوخە تێکەڵاوی کرێکارانیش تیشکی ئەدا، هەروەها لە کون و قوژبنی قوتابخانەکان ئیشی تریاقی دەرەبەگ و قومێسەرەکانی قەیسەر، بەندیخانەکانی سیبیریاش ئەم بڵێسەیان دەرئەخست. ئەم بڵێسەیە پیرۆزە لە هەر لایەکەوە حەلەقاتی مارکسی بڵاو کرد. ئەم حەلەقاتە کە بون بە نواتی حیزبی بۆلشەویک - حیزبی لینین و ستالین - کە بە راستی شەش یەکی دونیای گەڕاندەوە سەر دونیایەکی تازە کە تیشکی لە هەر لایەکی دونیای بۆگەنی بە نیزامی دەرەبەگی و سەرمایەداری رێ روناک ئەکاتەوە لە پێش کوڕانی میلەت تاکو عالەم بە گشتی بگەڕێتەوە سەر گێتیی تازە، عالەمی ئازادی و دادرەستی (عدالت) و یەکبون و خۆشی...

"ئەم تیشکە پیرۆزە هەندێ لە وڵاتی کوردیشی رزگار کرد، ئەم پارچەیە کوردستانە، کە وێنەی ژیانی بە کورتی بەرچاو کرا، لە ژێر حوکمی سۆڤیاتی - حوکمی کرێکار و فەلاحان - وەک بروسکە رێی پێشکەوتنی بڕی، بەڵکو ئەتوانین بڵێین هەرە گەورەترین دەوڵەتی عالەمی لە پاشە خۆی بە جێ هێشت لە نێو تەناقوزاتی دونیای بۆگەنی. بەڵێ بە هۆی حوکمی سۆڤیاتی و موجتەمەعی ئیشتیراکی کە کەس بەری ئیشوکاری یەکی تر نامژێ، هەروەها چ میلەتێک میلەتێکی تر ئیستیغلال ناکات لە ژێر سێبەری ئەم حوکمە و لە روناکی ئەم موجتەمەعە پیرۆزە ئەم چەند سەد هەزار کوردە وەک میلەتانی تری سۆڤیاتی بناغەی بەهێزی مەدەنیەت دروست کرد... موجتەمەعێکی بێ چین (طبقات)، کەس یەکی تر ئیستیغلال ناکات، هەر کارێک لە میلەتەوە بۆ گشتی میلەتە، حاڵەتێکی ئیقیسادی زۆر بەرز، لە هەر لایەکەوە کارخانەکان لە گەڵ گەردونا گفتوگۆ ئەکەن، تراکتۆر وە مەکینەکانی تری چاندن لە گەل دەریا لێک ئەدەن - بەڵام بێ گومان سەرکەوتن بۆ مرۆڤە - ولات وەک تۆڕێکە (شبکە) بە رێی ئاسن، لە سەدان کەس یەکی نەخوێندەوار نابینیت، لە هەر کوڕێکی وڵات عیلم و مەعاریف تیشک ئەدات (عەقلی ساغ لە لەشی ساغ) وڵات وەک ئەستێرەی ئاسمان بە خەستەخانە و جێگای منداڵ بون و ریازی مناڵان رازاوەتەوە، ژن و پیاو لە یەک ریزان چونکە هەردوکیان ئینسانن و ئیسپات کرا لە هەر وەزیفەیەکی گەل (مجتمع) ژن لە دوای پیاو نیە ئەگەر پێشەوە نەگرێ.

"لە نێو گشت میلەتانی سۆڤیاتی هەروەها لە نێو میلەتی کوردیش... برایەتی و ئاسایش و خۆشی ویستن لە باتی کوشتن و تالان... بەڵێ ئەمەیە حالی چەند سەد هەزار کورد لە دوای شۆڕشی پیرۆزی ئۆکتۆبەر! ئەمەیە حالی کورد لە وێنەی ژورەوەی با هەندێ لە وەزعی و مەرکەزی بدوێین کە یەکێکە لە میلەتانی سۆڤیاتی.

"لێکدگیری سۆڤیاتی (الاتحاد السوفیاتی) عیبارەتە لە یەکەتی ئەو میلەتانە کە لە روسیای قەیسەر ئەژیان وە هەر میلەتێک جمهوریەتێکی ئیشتیراکی سۆڤیاتی یا ئیقلیم وە یا مەنتیقەیەکی ئیشتیراکی هەیە کە کاربەدەستەکانی جمهوریەت یا ئیقلیم و یا مەنتیقە بە هەڵبژاردنی حوڕ هەڵ ئەبژێررێن کە مەسئول ئەبن لە ئیدارەی وڵات هەروەها هەر جمهوریەتێک یا ئیقلیمێک یا مەنتیقەیەک بە گوێرەی.. قەومی لە مەجلیسی سۆڤیاتی ئیتیحاد نێراوی ئەبێت وە بە مساوات هەر جمهوریەتێک مومەسیلی ئەبێت لە مەجلیسی قەومیات کە ژمارەی 25 نێراوە، کە ئەم دو مەجلیسە بەرزترین سوڵتەی یەکدگیری سۆڤیاتە. وە هەر جمهوریەتێک تا حەقی ئینفیسالی هەیە لە یەکدگیری (ییکدگیری سۆڤیات) سۆڤیات وە پێش ساڵێک بە هەر جمهوریەتێک حەق درا بۆ دامەزراندنی وەزارەتی ئیشوکاری دەرەوە وە وەزارەتی پارێزگاری وڵات (دفاع)، پێشان هەمو جمهوریەتەکانی سۆڤیاتی مفەوەزی ئیشوکاری دەرەوەیان هەبو هەروەها یەک وەزیری دیفاعیان هەبو. ئەمە بۆ ئەو میلەتانەی کە زۆرن بەڵام میلەتانی وەک کورد کە لە چەند سەد هەزارێک عیبارەتن: مەسەلەن کورد جمهوریەتێکی ئیشتیراکی خاوەن حوکمی زاتی‌یە بە ناوی نەخچیڤان، لە گەڵ جمهوریەتی قەرەباغی ئازەربایجان خاوەن حوکمی زاتی، یەک جمهوریەتی ئیشتیراکی سۆڤیاتی دائەمەزرێنن بە ناوی جمهوریەتی ئیشتیراکی سۆڤیاتی ئازەربایجان. ئەمجا جمهوریەتی نەخچیڤان خۆی مەجلیسی سۆڤیاتی تایبەتی هەیە کە بە هەڵبژاردنی سەربەستی هەڵبژێراوە و ئەم مەجلیسە بەرزترین سوڵتەیە لە جمهوریەتی نەخچیڤان 11 نێراوی هەیە لە مەجلیسی قەومیات... بەڵێ ئەم حوکمە پیرۆزەیە کە وڵاتی ئەم چەند سەد هەزار کوردەی گەڕاندۆتە بەهەشتی واقیعی هەروەها وڵاتانی هەمو میلەتانی سۆڤێتستان...

"ئەمەیە نەتائیجی ئۆکتۆبەری پیرۆز بۆ کوردەکانی سۆڤێتستان. با هەندێ بڕۆین لە ئەسەری سۆڤێتستان بۆ گشتی کورد وە مەوقیفی لە بەرامبەر هەر میلەتێک، لەم میلەتانەش میلەتی کورد.

"سۆڤێتستان هەر میلەتێک تەئید ئەکات کە بیەوێ لە ژێر ئیستیعمار دەرکەوێ و ئازاد بێ و خۆی چاوی لە بستە عەردێکی وڵاتانی تر نیە هەر لە بەر ئەمە بو پاش جەنگی گەورەی پێشو لە هەمو ئیمتیازاتی قەیسەری لە ئێران تەنازولی کرد هەروەها تەئیدی بزوتنەوەی ئەمانوڵا خان و لە هەمو تاریخی حوکمی سۆڤێتی بە قەدەر توانای تەئیدی ئازادی میلەتانی کردوە وە گژ ئیستیعمار راوەستاوە. بەڵام ئایە مەوقیفی چە بوە لە قەزیەی کورد وە لە بەر چی چ دەنگێکی نەبوە لەم بابەتە؟

"هەروەک بەرچاو کراوە لە وتارێکی تریش (وریابە ئەی میلەت) کە هۆی فەشەل بونی قەزیەی کورد لە بەر ژیانی دەرەبەگی و دەسائیسی ئیستیعمار بوە. ئەگەر سەیری حەرەکەتی شێخ مەحمود بکەین، لە کاتێ کە ئەیەویست لە ژێر نفوزی ئیستیعمار بە دەرەبەگیاتی کوردستان ئیدارە بکا، لە مەناتیقەکانی تری عیراق دەرەبەگەکان ئەیان وت: (هۆ چۆن ئەبێ شێخ مەحمود مەلیک بێ چما ئەو باووباپیری لە ئێمە گەورەترە؟) لە لایەکی تریشەوە بزوتنی سمکۆ لە ئێران زدی شێخ مەحمود دێتە بیر و هەتا لە ناو پیاوەکانی شێخ مەحمود تێکدانی ئیشوکار لە لایەن بەکرێگیراوەکانی ئیستیعمار بو، کەوابو ئەم دەسائیسە ئیستیعماریە چۆن لە لایەن سۆڤێتستانا تەئیدێک وەرئەگرێ. ئەما شۆڕشی شێخ سەعید لە ساڵی 1925 کە لە تورکیا داگیرسا بەرامبەر زۆرداری کەمالیەکان وە بە جێ نەهێنانیان وەعد و پەیمانەکان کە ئیستیعماریش ئیشی پێک هات بە بەشکردنی کوردستان لە سەر مەناتیقی نفوز جا بۆیە بەربەستی ئەم شۆڕشەی ئەکرد وە یاریدەی کەمالیەکانی ئەدا. ئەما کە لە بەر چی ئەم شۆڕشە تەئیدێکی لە لایەن سۆڤیات وەرنەگرت:

1. حکومەتی تورکیا بە گورجی توانی لە گشتی دنیا سەد جۆرە درۆ و دەلەسە بەم بزوتنە پیرۆزە هەڵبەستێ - کە لای هەمومان مەعلوم بو ئەم بزوتنە بۆ ئازادی کوردستان و ژیانێکی خۆشتر بو. لەم درۆ و

دەلەسـانەش کـە لـەم بزوتنـەوە بـە زەبـری ئیسـتیعمارە، وە بزوتنەوەیـەکی دەروێشـی و دەرەبەگیەتیـە بـۆ گەڕاندنەوەی خەلافەتی رجعی.

2. کوردەکان هیچ هەوڵێکیان نەدا کە راستی قەزیەیان پیشانی ئیتیحادی سـۆڤێتی بـدەن بـەڵکو ئـەو کاتە بە تەئسیری درۆ و دەلەسـەی ئیسـتیعمار بـە چـاوێکی تاریـک سـەیری حـوکمی بۆلشـەفیکیان ئـەکرد. هەروەها ئیستیعمار توانی زۆر کەس لە وڵات فرۆش و بێ هۆشەکان بە کرێ بگـرێ بـۆ ئـەوەی لـە سـنوری سۆڤیاتی هێرش ببەنە سەر حوکمی سۆڤیاتی وە تەگەرە پەیدا بکەن. جا لەم بەدبەخت و بیر بۆگەنانە جەنابی صدیق ئەلقادری ئەم زاتە ئاخرشەڕە یەک لەم پاڵەوانانە بو کە ئەیەویست حوکمی بۆلشەفیک بروخێنێ. وە بە هێزترین سیلاحی ئەم عەللامە (صدیق ئەلقادری) موزەکـەراتی قـادری نـاوە... داخـی بـە جـەرگم بـۆ ئـەم دڵ نەخۆشانە. کە لە لای هەر موخلیسێکی میلەت و مرۆڤ راستی کۆمیۆنیستەکان دەر کەوت.

3. سۆڤێتستان تازە لە حەرەکاتی تەدەخولی بێگانە رزگاری بوبو کە چوار دەوڵەت پەلاماریان ئـەبردە سەر ئەم حوکمە فەریک و تازە پێگەیشتوە، کە ئەو خوێنەی لە شۆڕشی ئینقیلاب رژا بو هێشتا وشک نەبوبو، لە لایەکی ترەوە هێشتا دەستە رەشە موفسیدەکان و چینەکانی موستەغیل و پاشماوەکانی قەیسەر جوڵە جوڵی ئەکرد. بەڵێ ئەم وێرانیە کە گەیاندرا بە روسـیا بـە تایبـەتی و گشـت وڵاتـانی سـۆڤیاتی ئیشـوکارێکی بـێ وەستانی ئەویست. لە لایەکی تریشەوە لە کاتی تازە بو حوکمی سۆڤیات نـەی ئەویسـت دوژمنـی زۆرتـر بـۆ خۆی بدۆزێ لە بەر ئەمە تەدەخولی بزوتنەوەی داخلی وڵاتانی ئەو کاتەی نەکرد... بەڵام کە هاتەوە سـەر خـۆ وڵاتی سۆڤێتستان تەنزیم کرا، هەردەم رەئی عامی عالەمی هوشیار ئەکرد بۆ موساعەدەی میلەتانی بـێ هێـز و لێقـەوماو وە داوای ئیشـی فیعلـی ئـەکرد، وە بـێ گومـان لـەم بابەتـەوە سـەدان میسـال هەیـە... ئێمـە کـە کۆمیۆنیستانی کوردین ئەگەر بەم چاوەش سەیر نەکەین وا وڵاتپـەروەرەکانمان وریـا ئەکـەین لـە سیاسـەتی دەرەوەی سۆڤێتستان و هەمو کۆمیۆنیستەکانی گێتـی هـەر بزوتنێکـی ئـازادی تەئیـد ئەکـەن گـەر لـە لایـەن میلەتەوە کرا بۆ ئازادی راست نەک بە دەسائیسی ئیستیعمار کە ئەنجامی بێ هێز کردنی میلەتانە وە بـە گـژ یەکتر دا هێنانیانە بۆ بە هێز کردن و رەگ دابەستنی نفوزی خـۆی... ئـەم میلـەتانی سـۆڤیاتی کـە بـون بـە سەنگەری هەمو میلەتانی گێتی بە هێز و هونـەری سـپای سـور بـەرەی پیـرۆزی ئۆکتۆبـەر سـلاڤ لـە هـەمو میلەتانی ئازاد بۆ کردەوەیان ئێمەش کە میلەتی کوردی ژێردەست و بێ هێزین بە بەختیاریەوە دەنگمان بـەرز ئەکەین و سلاڤ و گولاڤ بۆ میلەتانی سۆڤیات، بۆ سپای سور، بۆ سەرداری بەرزی هەمو ئازاپـەروەرەکان و میلەتە بێ هێزەکانی گێتی ستالین...

ئیتر بژی هەمو میلەتانی گێتی بە ئازادی و خۆشی لە ژێر سێبەری یەکبون و دادرەستی." (ییکتـی تـی کوشین، ژ2، ل 3- 8)

پێ ئەچێ نوسەری ئەم وتارە ئاگاداریی زۆری لە سەر روداوەکانی مێـژوی نـوێی کـورد و کاروبـاری ناودەوڵەتان و جمهوریەتەکانی ناو یەکێتی سۆڤێت و نەتەوەکانی نەبوبێ، باوەڕی بێ ئەندازەی بـە کۆمـۆنیزم و خۆشەویستی بێ سنوری بۆ یەکێتی سـۆڤێت و سـتالین، توشـی زیندەخـەوی کـردوە، هەنـدێ گوڵـەی بـە تاریکی‌یەوە ناوە:

یەکەم:

ئەو جمهوریەتە کوردی‌یە، یان ئەم بەهەشتەی ئەم باسی کردوە، تەنیا لە خەیاڵی نوسـەرەکەی‌دا هـەبوە، ئەگینا لە راستی‌دا شتی وا لە هیچ قۆناغێکی تەمەنی یەکێتی سۆڤێت‌دا نەبوە. لە هەنـدێ قۆنـاغ‌دا حەفتەنامـەی (رێیا تازە) دەرچوە و، لە رادیۆی یەریڤان بەرنامەیەکی کوردی بڵاوکراوەتەوە. ئـەویش لـە ئەرمەنسـتان بـوە

نەک لە ئازەربایجان. کەمایەتی کورد وەکو دوای هەرەسهێنانی یەکێتی سۆڤێت ئاشـکرا بـو، زۆریـان بـە زۆر راگوێزراون بۆ جمهوریەتە دورەکان و بڵاوەیان پێ کراوە.

دوەم:

جوڵانەوەی کورد لە هەمو بەشـەکانیدا پێوەنـدییان لـە گـەڵ یـەکێتی سـۆڤێت کـردوە، هـەوڵیان داوە دۆستایەتی لە گەڵ بکەن:

شێخ مەحمود نامەی بۆ ناردون و داوای هاوکاری و دان پێدانان و یارمەتی لێ کردون.

سمکۆیش پێوەندی لە گەڵ کردون. هەم بە ناوی خۆیەوە و، هەم بە نوێنەرایەتی کوردەکانی تورکیا.

هۆی ئەوەی کە یەکێتی سۆڤێت یارمەتی بزوتنەوەی نەتەوەیی کوردی نـەداوە ئـەوە بـوە، کـە یـەکێتی سۆڤێت بۆ ئەوەی تورکیا و ئێران، کە هاوسنوری لای خواروی بون، نەبن بە بنکەی پیلانگێرانـی دەوڵـەتانی ئیمپریالیستی دژی ئەو، هەر لە زوەوە پەیماننامەی سیاسی لە گەڵ بەست بون، بـۆ ئـەوەی داڵـدەی دوژمنـانی یەکتری نەدەن.

سێیەم:

سمکۆ نەک دژی شێخ مەحمود نەبوە، بـەڵکو دۆسـتێکی نزیکـی بـوە و، کـاتێ کـە خێزانەکـەی شـێخ مەحمود دوای بە دیل گیرانی لێیان قـەوماوە، رویـان کردۆتـە لای سـمکۆ و، لـە سـەردەمی مەلیکایـەتی شـێخ مەحمودیشدا بۆ سەردانی شێخ هاتۆتە سلێمانی.

**"بۆ زانینی راستی لە بابەت تەنزیمی لقی کورد لە کوردستانی عیراق**

"جوان سەرنج بدەینە ناو لاپەڕانی مێژو و حەوادیسی بەرچاو بکـەین، ئـەبینین کـە چـەرخی مێـژوی ئادەمیزاد لە کاتی سوڕانی- ئەو سوڕانەی کە ئادەمیزاد هـەڵ ئەقـەنێنێ لـەو زروفـە کـۆن و بـێ سـودەی کـە قۆزاخەیەکی ئاسنی بەستوە لە دەوروپشتی ئەحوالی ئیقیسادی و سیاسی و ئیجتیماعی ئەم کۆمەڵە ئـادەمیزادە لەم کاتە- بۆ قەراغی سەعادەت و ئاسایش، وە بۆ هەڵسوڕانی زروفێکی چـاکتر و پـڕ سـودتر بـۆ زۆرترینـی ئیشکەرانی ئەندامانی ئەم کۆمەڵەیە، وەنەبێ کە ئەم چەرخە بە هێزەی مێـژو رێگایـەکی لـوس و بـێ کەنـد و کۆسپەی لە بەر بێت لە کاتی رۆیشتنیا، بەڵکو تەقالید و بیر و هۆش و هەڵسـوڕانی زروفـی کۆنپەرسـتی بـێ سود، هەردەم و لە هەر شوێنێک ئامادەیە بۆ دامەزراندنی گرێ و چەوتی بۆ وەستانی چەرخی مێژو، چ زۆر و چ کەم.

"ئەو چەرخەی کە بازوی زۆرترین لە ئیشکەرانی ئادەمیزادی ئـەم کۆمەڵەیـە ئـەی سـوڕێنێ، بـە سـەر تەقالید و کەلوپەلە چەوتەکەی کەمترین و بێکارەترین... ئەندامانی ئەم گەلە کە دەستی حوکم و گیان مژینیـان گرتۆتە دەست.

بەڵام قوڕ بە سەر ئەم چینە کۆنە، لە هەر شوێنێک وە هەر زەمانێک شڵەژاو و شـکاوە لـە ژێـر هێـزی ئەم چەرخە پڕ هێزە وە بە دەنگە.

**سەرچاوە:**

جـــەمال نەبـــەز، گۆڤـــاری کۆمۆنیســـتانەی یـــەکێتی تێکۆشـــین (1944- 1945) و ئیـــدۆلۆژی هوردەبۆرژوازی مارکسیستی کورد، ستۆکهۆلم، 1988.

## 4. ڕۆژنامەوانیی نهێنی و حیزبی شیوعیی عیراق

لە عیراقی عەرەبیدا، لە کۆتایی بیستەکانەوە ئاشنایەتی لە گەڵ بیروباوەڕی سۆسیالیستی و کۆمۆنیستی بە جۆرێکی ساکار و سادە لای هەندێ کەس پەیدا بوبو. هەندێ شانەی پەراگەندە لێرە و لەوێ دروست بوبو. یەکێ لە چالاکەکانی ئەم بوارە گەنجێکی مەسیحی بو بە ناوی یوسف سەلمان یوسف (1901- 1949) کە دواتر بە ناوی (فەهد) ەوە ناوبانگی دەرکرد و، ناوی ئەو و ناوی حیزبی شیوعی عیراق تێکەڵاوی یەک بون.

لە مارتی 1935 دا هەندێ لەم شانە پەراگەندانە لە بەغداد یەکیان گرت. ڕێکخراوێکیان بە ناوی (لجنة مكافحة الاستعمار) ەوە دامەزراند و، بەیانێکیان بەم بۆنەیەوە دەرکرد ئامانجەکانی خۆیان تێدا رون کردبوەوە. هەر ئەم ڕێکخراوە بو بە ناوکی پێکهێنانی حیزبی شیوعی عیراق. زۆر زو ناکۆکی کەوتە ناو دامەزرێنەرەکانیەوە. هەندێکیان لایان وابو کە پێویستە بایەخ بدرێ بە جەماعەتی (ئەهالی) و ڕۆژنامەکەیان، کە جەماعەتێکی پێشکەوتنخواز بون، بە ئاشکرا بە پێی قانونەکانی عیراق کاریان ئەکرد و، هەندێکی تریان بە پێویستیان ئەزانی کۆمۆنیستەکان ڕۆژنامەی تایبەتی خۆیان هەبێ. لەو کاتەدا فەهد لە دەرەوەی عیراق بو، چو بو بۆ یەکێتی سۆڤێت، لەوێ لە (زانکۆی کۆمۆنیستی رەنجدەرانی ڕۆژهەڵات) ئەیخوێند.

عاسم فلەیح (لە دایکبوی 1905 ی بەغداد)، کە بە پیشە خەیات و، بە ئارەزو نوسەری (ریوایاتی شەعبی) بو، وە ساڵانی 1931- 1934 لە (زانکۆی کۆمۆنیستیی رەنجدەرانی ڕۆژهەڵات لە مۆسکۆ) خوێند بوی، یەکێ بو لە دامەزرێنەرەکانی (لجنة) و (حیزبی شیوعی)، لە تەموزی 1935 دا یەکەم ژمارەی (كفاح الشعب) ی وەکو زمانی (اللجنة المركزية للحزب الشيوعي العراقي) بڵاوکردەوە. ئەمە یەکەمین بڵاوکراوەی دەوریی ڕێکوپێک بو کە مانگانە بە نهێنی بە ناوی حیزبی شیوعییەوە لە عیراق دەربچێ.

### 4. 1. كفاح الشعب

لە ژ3 ی ئابی 1935 ی (كفاح الشعب) دا ئامانجەکانی حیزبی شیوعی رون کراوەتەوە:

مادەی یەکەمی بریتی بو لە "دەرکردنی ئیستیعمار و دابینکردنی ئازادی بۆ گەل و، سەربەخۆیی تەواو بۆ کورد و، مافی ڕۆشنبیری... بۆ هەمو کەمایەتییەکان."

مادەکانی تری دەربارەی "دابەشکردنی زەوی بە سەر جوتیاراندا" و "بەخشینیان لە قەرزی ئەرز و رەهن" و "دەسبەسەراگرتنی مومتەلەکاتی ئیستیعماریەکان وەکو بانک و، مەیدانی نەوت و، هێڵی شەمەنەفەر..." و "دانی دەسەڵات بە کرێکار و جوتیار" و "بەرپاکردنی شۆڕشی کۆمەڵایەتی لە هەمو بوارەکانی ژیاندا" و "رزگارکردنی گەل لە هەمو جۆرەکانی چەوسانەوە."

کفاح الشعب 500 دانەی لێ چاپ ئەکرا.

لە تشرینی یەکەمی 1935 دا پۆلیسی عیراقی، عاسم فلەیحی، دەرهێنەری رۆژنامەکەی گرت. زەکی خەیری، کە ئەندامێکی تری کۆمیتەی ناوەندی حیزبەکە بو، کاروباری رۆژنامەکەی گرتە ئەستۆ. بەڵام ئەویش لە کانونی یەکەمی هەمان ساڵدا گیرا. ئیتر (کفاح الشعب) پاش 5 ژمارە لە دەرچون کەوت. عاسم بەڵێنی بە پۆلیس دا ئیتر دەس لە کاری سیاسی وەرنەدا و بەڵێنەکەی خۆی بەجێهێنا. بەرنامەکەی (کفاح الشعب) یش فەرامۆش کرا.

لەو ساڵانەدا چەند روداوی گرنگ قەومان. بەکر سدقی (بە رێچەڵەک کورد)، یەکێ لە جەنەراڵەکانی جەیشی عیراقی، ساڵی 1936 کودەتایەکی سەربازی کرد. کاروباری عیراقی گرتە دەست. ئەمە یەکەمین کودەتای سەربازی بو لە هەمو وڵاتانی عەرەبیدا. چەپەکان بە گشتی، لەوانە جەماعەتی (الأهالي)، بە گەرمی پشتیوانییان لەم کودەتایە کرد. نیوەی وەزارەت ئەوان پێکیان هێنا. لەو کاتەدا چەندین رۆژنامەی پێشکەوتنخواز بە عەرەبی دەرئەچون. شیوعیەکان لەباتی دەرکردنی رۆژنامەی نهێنی لەو رۆژنامە قانونییانەدا کاریان ئەکرد و ئەیاننوسی. زۆری نەخایاند بەکر سدقی بە ئاشکرا هێرشێکی توندی کردە سەر شیوعیەکان. بەڵام زۆری پێ نەچو خۆیشی کوژرا و، ئەو داوودەزگایەی ئەم دروستی کردبو هەڵوەشایەوە. هەر لەو ماوەیەدا مەلیک غازی کوژرا.

عەبدوڵا مەسعود (لە دایکبوی 1911 ی گوندێکی بەسرا)، سەرەتا خوێندکاری حقوق و دواتر پارێزەر، سەرلەنوێ رێکخراوەکانی حیزبی شیوعی عیراقی رێک خستەوە.

ساڵی 1938 فەهد لە یەکێتی سۆڤێت گەڕایەوە و، بە نابەدڵی بو بە ئەندامی ئەو کۆمیتە ناوەندییەی کە عەبدوڵا مەسعود پێکی هێنا بو.

### 4. 2. **الشرارة، الى الامام، القاعدة، وحدة النضال**

لە کانونی یەکەمی 1940 دا یەکەمین ژمارەی (الشرارة) وەکو زمانی حشع بە نهێنی بڵاوکرایەوە. ئەم ژمارەیەی (الشرارة) لە دائیرەیەکی حکومەتیدا بە رۆنیۆ 90 دانەی لێ چاپ کراوە. لە پاش چەند مانگێ زیادی کردوە بۆ چەند سەد دانەیەک.

لە 1941 دا فەهد بو بە سکرتێری حشع. ساڵی 1942 حشع دەزگای چاپی پەیدا کرد. (الشرارة) هەم بو بە چاپ و هەم زیادی کرد بۆ 2 هەزار دانە.

ناوەرۆکی (کفاح الشعب: یەکەمین رۆژنامەی شیوعی) و (الشرارة: دوەمین رۆژنامەی شیوعی) جیاواز بون. هەرچی کفاح الشعب بو چەپێکی توندڕەو بو، بەڵام الشرارة هەوڵی ئەدا خۆی قورس و سەنگین پیشان بدا. ژمارەکانی بە ئایەتی قورئان و، باسەکانی بە باسی خولەفای راشیدین و ئیمام عەلی ئەڕازانەوە.

لە ساڵانی دوەمین جەنگی جیهانیدا (1939- 1944) تا یەکێتی سۆڤێت تێکەڵاوی جەنگەکە نەبوبو، حشع ئەم شەڕەی بە جەنگێکی نارەوای ئیمپریالیستی دائەنا کە بۆ دابەشکردنی دنیا و ناوچەی نفوزە. بەڵام کە ئەڵمانیا پەلاماری یەکێتی سۆڤێتیدا ئیتر حشع شەڕەکەی بە جەنگی رزگاری دانا و پشتیوانی لە بەرەی دیمۆکراتی ئەکرد.

لە تشرینی دوەمی 1942 دا فەهد لە ڕێگەی ئێرانەوە جارێکی تر چوەوە بۆ یەکێتی سۆڤێت. لەو ماوەیەدا کە ئەو لە دەرەوەی عیراق بو، حشع توشی تەنگوچەڵەمەیەکی قوڵی ڕێکخراوەیی بو. بو بە 3 پارچەوە:

یەکەمیان:

گروهێ بون کە دەستیان گرت بو بە سەر داوودەزگای چاپی حیزبەکەدا. بە ناوی حیزبی شیوعی عیراقەوە درێژەیان ئەدا بە دەرکردنی الشرارة. ئەیان ویست فەهد لە سکرتێری بخەن.

دوەمیان:

گروهێکی تر بون کە لە حشع جیابونەوە، بڵاوکراوەیەکیان لە تشرینی دوەمی 1942 دا بە ناوی (الی الامام) ەوە دەرئەکرد. لە بەر ئەوەی ئەم گروهە بۆ ڕێکخستنی کاروباری حیزب و دانانی پرۆگرام و پێڕەوی ناوخۆ و هەڵبژاردنی کۆمیتەی ناوەندی داوای گرتنی کۆنگرەی حیزبییان ئەکرد پێیان ئەوتن تاقمی موئتەمەر (المؤتمريون).

سێیەمیان:

گروهێک بون کە خۆیان بە دڵسۆزی فەهد دائەنا و بۆ ڕونکردنەوەی بیروبۆچون و هەڵوێستەکانی خۆیان لە کانونی دوەمی 1943 ەوە دەستیان کرد بە دەرکردنی ڕۆژنامەیەک بە ناوی (القاعدة) ەوە. پێیان ئەوتن تاقمی القاعدة.

لە نیسانی 1943 دا فەهد لە یەکێتی سۆڤێت گەڕایەوە. کەوتە هەوڵدانی ڕێکخستنەوەی حیزب و کۆتایی هێنان بەو پاشاگەردانیەی تێی کەوت بو. ئیتر حیزبی شیوعی لە سەر دەستی فەهدا بو بە هێزێکی خاوەن نفوزی کاریگەری (نهێنی) ناو مەیدانی جوڵانەوەی سیاسی لە عیراقدا.

لە مایسی 1943 دا پۆلیسی عیراقی شاڵاوی بۆ ڕێکخراوە شیوعیەکان برد و زۆری لێ گرتن. هەندێ لە سەرکردەی گروپەکانی (الی الامام) و (الشرارة) گیران. ئەمەش کاری لە چالاکیەکانیان، بە تایبەتی چاپی پەخشەکانیان، کرد.

لە شوباتی 1944 دا پاشماوەکانی هەردو گروپی (الشرارة) و (الی الامام) لە ڕێکخراوێکی نوێدا بە ناوی حیزبی شیوعی عیراق یەکیان گرت و، دەستیان کرد بە بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەی (وحدة النضال) بە زمانی عەرەبی. ئەمانە لقێکی کوردیشیان پێک هێنا کە (یەکێتی تێکۆشین) ی بە زمانی کوردی دەرئەکرد.

لە مارتی 1944 دا فەهد یەکەمین کۆنفرەنسی حیزبی شیوعی عیراقی بەست. کۆنفرەنس لە بەغداد لە گەڕەکی شێخ عومەر بە ئامادەبونی 18 ئەندام بەسترا. یەکێ لە ئامادەبوان مەلا شەریفی مەلا عوسمان (1925- 1976) بو.

مەلا شەریف کوردێکی هەولێری و بە پیشە چاپچی بو. کوڕە مەلا و خوێندنی دینیی بو. ساڵی 1943 پێوەندی بە حشع ەوە کردبو. لەو کۆنفەرەنسەدا بو بە ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی و بە سکرتێری

لقی کوردیی حشع. ئەوە یەکەمین جار بو کوردێک بچێتە دەزگای سەرکردایەتی حشع ەوە. تا ئەو کاتە کـورد لە ریزەکانی حشعدا زۆر کەم بون. ئەوەی هەیش بو لە رێکخراوی (یەکێتی تێکۆشین) کۆ بو بوەوە.

کۆنفرەنس پەیمانی نیشتمانی (المیثاق الوطني) حیزبی پەسەند کرد. لە مادەی 10 دا نوسیوێتی: "تـێ ئەکۆشین لە پێناوی یەکسانییەکی راستەقینەی مافەکانی کەمایەتی نەتەوەیی کورد لە گەڵ موراعـاتی مافـەکانی تاقمە نەتەوەیی و رەگەزی‌یە پچوکەکانی وەکو تورکمان و ئەرمەن و یەزیدی."

لەم کۆنفەرەنسەدا دروشمی (نیشتمانێکی ئازاد و میللـەتێکی بـەختیار) کـە دروشـمی حیزبـی شـیوعی سوریا بو، کرا بە دروشمی حشع و ئیتر لە سەروی هەمو بڵاوکراوەکانی‌دا بە عەرەبی و کوردی ئەینوسی.

پاش یەک ساڵ لە بەستنی یەکەمین کۆنفرەنس لە مارتی 1945 دا فەهد یەکەمین موئتەمـەری حیزبـی شیوعی عیراقی بەست. موئتەمەرەکە لە بەغداد لە کەرخ بە ئامادەبونی 27 ئەندام بەسترا. 17 یان لەوانە بـون کە لە کۆنفرەنسی یەکەمی ساڵی پاردا ئامادە بوبون. یەکێکیان هەمان مەلا شەریفی مەلا عوسمان بو.

موئتەمەر بەڵگەکانی حیزب، لەوانە نیزامی داخلی، پەسەند کـرد و، کۆمیتـەی ناوەنـدی هـەڵبژارد. مـەلا شەریف ئەندامی ئەم کۆمیتەیە بو.

بە پێی مادە 27 ی نیزامی داخلی حشع: "کورد و ئەرمەن هەر یەکەیان لقێکی حشع دائەمەزرێنێ. هەر یەکێ لەم لقانە پلانی سیاسی و تاکتیکی خۆی ئەبێ، کە نـابێ نـاکۆک بـێ لـە گـەڵ پلانـی گشـتی حیـزب و، نیزامی داخلی تایبەتی خۆی ئەبێ کە بنچینەکانی لەم نیزامەوە هەڵئەهێنجێ بە پێی هەلومـەرجی لقـەکان. هـەر لقە جەریدەی خۆی ئەبێ کە ئەبێتە زمانی حاڵی."

(سەرچاوە: جعفر عباس حمیدي، التطورات السیاسیة في العراق 1941 - 1952، مطبعة النعمان، نجف الاشـرف، 1976، ص 220)

دوای ئەم موئتەمەرە، لقی کـوردیی حشـع بـە سەرپەرشـتی فەهـد کەوتـە دەرکردنـی (ئـازادی). ئـەوە یەکەمین جار بو حیزبی شیوعی عیراق بە کوردی زمانحاڵی خۆی بڵاوبکاتەوە.

## 4. 3. ئازادی

ژ3 ی ئازادی کە ئیستا وێنەی یەکەم لاپەڕەی لە بەر دەس دایە لە حوزەیرانی 1945 دا دەرچوە. بەو پێیەی کە ئازادی لەو ماوەیەدا مانگانە دەرچوە، ئەبێ دوەم ژمارەی لە مایسدا و، یەکـەم ژمـارەی لـە نیسـانی 1945 دا دەرچوبێ.

لە ژمارەی مانگی شوباتی 1945 ی (القاعدة) دا فەهد ئەرکەکانی (ئازادی) بەمجۆرە دیاری کردوە:

"تێکۆشـــان لـــە پێنـــاوی ئـــازادی کـــورد و، ســـیادەی نیشـــتمانی‌یاندا، لـــە پێنـــاوی سەربەســـتی‌یە دیمۆکراتیـــەکانیاندا، لـــە پێنـــاوی دابینکردنـــی نـــان و جلوبـــەرگیاندا، لـــە پێنـــاوی دۆســـتایەتی و برایـــەتی ئارەزومەندانەی کورد و عەرەبدا، بۆ عیراقێکی ئازادی دیمۆکراتی و گـەلێکی رزگـار لـە هـەژاری و نـەزانی و نەخۆشی، لە پێناوی ئەوەدا کە دۆستایەتی عەرەب و کورد رەمزی یەکێتی‌ی نیشتمانی‌مان بێ و، لە پێش هـەمو دروشمەکانمانەوە لە پێناوی نیشتمانێکی ئازاد و میللەتێکی بەختیاردا."

ئازادی لە سەروتاری ژ1 ی دا نوسیوێتی:

"ئێمە داوا لە گەلی کورد ناکەین لە گەلی عەرەب جیا ببێتەوە، پشـتیوانی لـە جوڵانـەوەی لـەو بابەتـەش ناکەین، چونکە زەرەر لە قازانجی کورد و عەرەب ئەدا بەتایبەتی لە قۆناغی ئیستای جیهـان و عیـراقدا. بـەڵام

بیری گەلەکەمانی ئەخەینەوە و داوای لێ ئەکەین. داوا ئەکەین لە ڕۆڵە هوشیارەکانی گەلەکەمان. داوا ئەکەین لـە هەمو کوردێکی دڵسۆز کە گەل و نیشتمانەکەی خۆش ئەوێ، کە گەلەکەی بە ڕێک نەخراوی و ئامادە نەکراوی بە جێ نەهێڵێ. تێ بکۆشێ لە پێناوی دامەزراندنی حیزب و ڕێکخـراوی دیمـۆکراتیدا بـۆ ڕێکخسـتنی گـەلی کورد و ئامادەکردن و توانینی بۆ بە کارهێنانی مافی خۆی لە بڕیاردانی چارەنوسـی خـۆیدا، وە بـۆ ئـەوەی یەکێتییەکەی لە گەڵ عەرەب لە عیراقدا یەکێتییەکی ئارەزومەندانەی دامەزراو بێ لە سەر بنچینەی یەکسانی لە هەمو مافەکاندا."

*(تێبینی: ئەم دو دەقەی سەرەوە لە ئازادی وەرنەگیراون. لە تەقریرێکی عـەرەبی حشـع وەرگیـراون. تـا دەقی کوردی وتارەکان ئەدۆزرێنەوە، بە ناچاری ئەمە لـە عەرەبییـەوە کراوەتـەوە بـە کـوردی. لـە بـەر ئـەوە بێگومان هەندێ جیاوازی لە وشە و ڕستە و دارشتنەکانیدا لە گەڵ دەقی ئەسڵیدا ئەبێ).*

*بڕوانە:*

"تقرير اللجنة المركزية للحزب الشيوعي العراقي اذار عام 1962

سياستنا و طريقنا لحل المسألة القومية الكردية في العراق حلا ديمقراطيا عادلا"

## ڕێبازی ئازادی

بۆ تێگەیشتن لە ڕێبازی ئازادی پێویستە هێڵە گشـتیەکانی سیاسـەتی نـاوەکی و دەرەکـی حشـع ڕون بکرێنەوە:

دوای تەواوبونی دوەمین جەنگی جیهانی ئیتر جەنگی سارد لە نێوان بەرەی ڕۆژهەڵات بە سەرۆکایەتی یەکێتی سۆڤێت و بەرەی ڕۆژئاوا بە سەرۆکایەتی ئەمەریکا دەستی پێ کرد. حیزبی شیوعی، حیزبێکی نهێنـی بوە، بە پێی سەرەتا ڕێکخراوەییەکانی ستالین ڕێکخراوە. گوێڕایەڵی هـەمو ئەنـدامانی حیـزب بـۆ کۆمیتـەی ناوەندی و، گوێڕایەڵی کۆمیتەی ناوەنـدی بـۆ حیزبـی شـیوعی سـۆڤێتی، یـەکێ بـوە لـە سـەرەتاکانی هـەمو بیروبۆچون و کارەکانی. حیزبی شیوعی عیراق بە چاوی حیزبی شیوعی سۆڤێتی و یەکێتی سۆڤێتی تەماشای ڕوداوەکانی جیهان و ناوچەکە، تەنانەت تەماشای ڕوداوەکانی ناوخۆی عیراقی کردوە. یەکێتی سۆڤێتییش لـە ڕوانگەی بەرژەوەندیەکانی دەوڵەتەکەی خۆی و ململانێی لە گەڵ ئەمەریکا و وڵاتـە سـەرمایەداریەکانی تـرەوە سەیری دنیای کردوە.

ستایشی یەکێتیی سۆڤێت و، دژایەتی ئیمپریالیزم و نۆکەرەکانی، لای حشع، سەروی هەمو ئەرکەکانی بوە.

لە مەسەلەی دەسەڵاتی سیاسیدا، جگە لـە ماوەیـەکی کـورتی سـەردەمی سـکرتاریەتی باسـم (بـەهادین نوری) (1952- 1953)، هەرگیز دروشمی ڕوخاندنی ڕژێمی پاشایەتی بەرز نەکردۆتـەوە و، هەمیشـە داوای دامەزراندنی ڕژێمێکی دیمۆکراتی و نیشـتمانی کـردوە، کـە مـافی هـەڵبژاردنی ئـازاد و، دەربڕینـی بیـروڕا و پێکهێنانی حیزب و نەقابە و ڕێکخراوی پیشەیی دابین بکا.

بۆ چارەسەرکردنی کێشەی زەوی هەوڵی ڕوخاندنی ڕژێمی دەرەبەگی ئەدا و، داوای لـە جوتیـاران ئـەکرد خەباتی چینایەتی تیژ بکەن و خۆیان ڕێک بخەن بۆ تێکۆشـان دژی دەرەبەگایـەتی و، لـە پێنـاوی دابەشـکردنی خۆڕایی زەوی و زاردا. بۆ ئەم مەبەستە بەیان و بڵاوکراوەی تایبەتی جیا لە (ئازادی) ی دەرئەکرد.

حشع، کە خۆی بە حیزبی چینی کرێکار و، چینـی کرێکـاری بـە پێشـڕەوی کۆمـەڵ دائـەنا، داوای لـە کرێکـاران ئـەکرد خـەباتی چینایـەتی گـەرم بکـەن و، خۆیـان ڕێـک بخـەن بـۆ تێکۆشـان دژی دەرەبـەگ و بۆرجوازیی نۆکەری ئیمپریالیزم.

حشع، بە رواڵەت مافی نەتەوەیی کوردی لە سەر بنچینەی سەلماندنی ئازادیی بڕیاردانی چارەنوس پەسەند کرد بو، بەڵام لە وردکردنەوەی ئەم دروشمەدا، زۆر بە تونـدی دژی هەمو جۆرە بیروبۆچونێکی سەربەخۆیی خوازی ئەوەستا و، بە پیلانی ئیمپریالیزم و کۆنەپەرستی دائەنا. هەر لەو روانگەیەوە، بە بیانوی یەکێتیی بەرژەوەندی چینی کرێکاری عیراق و هەمو چین و توێژەکانی تـرەوە، دژی پێکهێنانی رێکخراوی تایبەتیی کوردستانی بو بۆ کرێکاران، قوتابیان، ئافرەتان، جوتیاران، مامۆستایان...

لە وتاری (شۆڕشی ئۆکتۆبەر و موشکیلەی نەتەوایەتیمان) دا کە لە ژمارە 1 ی ساڵی 4 ی 7 ی تشرینی دوەمی 945 ی (القاعدة) دا بڵاوی کردۆتەوە، نوسیوێتی:

"وە هەقی تەقریری مەصیر بۆ هەمو نەتەوە و گەلێک لە بیروباوەڕ و ئامانجە بنچینەییەکانی حیزبە شیوعیەکانی جیهان و حیزبە شیوعیە عیراقییەکەمانە.

"ئەمڕۆ لە عیراقدا دو نەتەوەی گەورە هەیە: عەرەب و کورد. وە داگیرکەرە ئینگلیزەکان بە شێوەیەکی راستەوخۆ وە ناراستەوخۆ ئەم دو گەلەی ژێردەست کردوە. هەروەها دەرەبەگ و خاوەن زەوی و زار و نۆکەرەکانی تری ئیستیعمار لە کورد و عەرەب یاریدەی ئەدەن بۆ دەست بە سەرا گرتن و جێگیر بونی دەسەڵاتی وە چەوساندنەوەی کۆمەڵانی گەل لە کورد و عەرەب.

"ئیستا با زیاتر بچینە باسەکەمانەوە. وتمان هەمو حیزبە شیوعیەکانی جیهان وە لەوانە حیزبە شیوعیە عیراقییەکەمان، باوەڕیان بە هەقی هەمو نەتەوەیەک هەیە لە بڕیاردانی ئەنجامی (مصیر) خۆیاندا هەتا بە هەقی جیابونەوەشیان.

ئەمجا لە داواکردنی جیابونەوەی کوردەکانی عیراق ئەکۆڵێتەوە و ئەڵێت:

"کەواتە هەقی جیابونەوەی هەمو نەتەوەیەک شتێکی جێگیر نیە، کە لە هەمو شوێنێکا سود بدا وە لە هەمو کاتێکا بە کار بێت. چونکە ئەم مەسەلەیەش وەک هەمو مەسەلەیەکی تر بەستراوە بە شوێن و کات و گۆڕانی کۆمەڵەوە وە بەستراوە بە جۆری جیابونەوە وە سود وەرگرتنی هەر چینێک لەمە.

"بەڵام ئایا مەوقیفی حیزبی شیوعی عیراق چیە لە هەقی نەتەوایەتی کورد؟

"حیزبە شیوعیە عیراقییەکەمان حیزبی کرێکاران و فەلاحە. حیزبی هەمو کۆمەڵانی گەلی عیراقی تێکۆشەرە لە پێناوی (نیشتمانێکی ئازاد و میللەتێکی بەختیار) دا وە تێ ئەکۆشێ لە پێناوی چاکەی عیراق و هەمو گەلی میللەتا، بە عەرەب و کورد و ئەوانی ترەوە، وە تێ ئەکۆشێ لە پێناوی سەربەستی گشتا، لە پێناوی هەقی خۆرێکخستنا، وە لە پێناوی ژیانێکی دیمۆکراتیا وە پەیڕەو و دەسەڵاتێکی دیمۆکراتی. تێ ئەکۆشێ بۆ بڵاوکردنەوەی زانستی بۆ هەموان، لە پێناوی خۆشی و کامەرانی هەموان، وە وەکیەکی تەواو لە بەینی هەمو عیراقیەکاندا، بە کورتی تێ ئەکۆشێ لە پێناوی بەختیاری گەلی کوردا، وەکو چۆن تێ ئەکۆشێ لە پێناوی بەختیاری عەرەب و هەمو عیراقیەکانی ترا.

"بەمە ئەو رێکخراوە دیمۆکراتیە پێویستانە بۆ گەلی کورد مسۆگەر ئەکات کە توانای ئەوەی پێ بدا کە بیری خۆی دەربڕێ لە مانەوە بە رەزامەندی یا جیابونەوە هەر کاتێ عیراق ئازاد بو لە کۆت و پێوەندی ئیستیعمار یا هەر کاتێ ئەو زروفانە هاتنە پێشەوە کە دەست بدات بۆ میللەتی کورد، وە لە چاکەی گەلی زەحمەتکێشا بێت.

"ئەوەی وتمان دەربارەی داواکەرانی جیابونەوە، ئەیڵێین دەربارەی داواکەرانی حیزبێکی شیوعی کوردی سەربەخۆ وە جیاواز لە حیزبی شیوعی عیراقی. ستالین ئەڵێت: (بە تاقی کردنەوە دەرکەوتوە کە رێکخستنی پرۆلیتاریا لە دەوڵەتێکا، بە گوێرەی نەتەوەکەی هیچ ئەنجامێک نابەخشێت، بێجگە لە کوشتنی

بیروباوەڕی یەکگرتنی چینایەتی، لە بەر ئەوە پێویستە هەمو ئەندامانی پرۆلیتاریا لە هەمو نەتەوەکان کەوا لـە یەک دەوڵەتا ئەژین لە یەک ڕێکخراودا کۆ بکرێنەوە، لە حیزبێکی پرۆلیتـاری گشـتیا، هـەرگیز دابـەش بـون نازانێت چیە.) (ستالین مارکسیەت و مەسەلەی نیشتمانی ل 66)"

ئەگەرچی فەهد لە ناوەڕاستی چلەکان دا لـە دو سـەروتاری (القاعـدة) دا کـە یـەکێکیان بـە ناونیشـانی (الشعب الكردي بحاجة الى حزب عمل و ليس حزب امل) و ئەوی تریان بە ناونیشـانی (الشـعب الكـردي بـين الحانة والمانة) داوای لە تێکۆشەرە هوشیارەکانی کورد کرد بو کە حیـزب و ڕێکخـراوی تایبـەتی خۆیـان بـۆ ڕێبەرایەتی گەلی کورد دابمەزرێنن و، بەڵێنی پێ دابون حیزبی شیوعی پشتیوانییان بکا، بەڵام سـەرکردایەتی حشع نەک ئەم ڕاسپێرییانەی فەهد و ئەم بەڵێنانەی بە جێ نەهێناوە، بەڵکو هەمیشە بە چاوی (هەوێ) یـەکی چارەگران سەیری حیزبە کوردیەکانی کردوە و، لە هەندێ قۆناغ دا هێرشی توندی کردۆتە سەریان. تاوانباری کردون بە بورجوازێتی و نەتەوەپەرستی گۆشەگیرانە...

لە وتاری (میللەتی کورد لە بەینی حانە و مانە) دا کە لە ژ5 ی سـاڵی 3 ی نیسـانی 945 ی (القاعـدة) دا بڵاوی کردۆتەوە، نوسیوێتی:

"ئەمرۆ گیانێکی تازە میللەتی کوردی داگرتوە، گیانی ڕزگار بون لە شێوەی دیکتـاتۆری و نمونـەکانی. گیانێک کە ئاڵای (نیشتمانێکی ئازاد و میللەتێکی بەختیار) ە وە گەلی کورد یەکێکە لەو گەلانـەی کـە ئەیـەوێ بەرگی کۆن فرێ بدا، بەرگی نەبونی و نەزانی و نەخۆشی و دوا کەوتن.

"حیزبەکەمان داوا لە هەڵگرانی ئاڵای ئەم گیانە تازەیە ئەکات، لـە ڕۆڵـە دڵسـۆزەکانی گـەلی کـورد کـە یەکتر بناسن و خۆیان کۆکەنەوە، کە گەلی کورد ڕێک بخەن و سەرکردەیان بکەن، بەرەو ئامانجەکانیان.

"حیزبەکەمان هەڵگرانی ئاڵای ئەم گیانە تازەیە بە تاقە هێز ئەزانێ کە بتوانێت گەلی کورد کۆ بکاتەوە، وە بیان هاوێتە کۆڕی تێکۆشانەوە، لە پێناوی داخوازیەکانیان دا.

"ئەی هاونیشتمانیە هوشیارەکان، لە هەمو چینەکانی گەلی کورد، مەسەلەی میللەتەکـەتان سـپاردەیەکە لـە گەردنتان، پێویستیی خۆتان بـە جـێ بهێـنن بەرامبـەر گەلەکـەتان، سـەرکردەیی بکـەن بـۆ ڕزگـار بـون لـەم پەشێویەی ئیستای.

"ڕێکخراوە میللیە کوردیەکەتان بە جۆرێک ڕێک بخەن کە لە گەڵ کـات و جێگـای گـەلی کـوردا ڕێـک بکەوێ. ڕێکخراوێک کە خزمەتی چاکەی بکات. تێ بکۆشن، ئـەو وەختـە هـەمو یارمـەتی و پشـتیوانیەک لـە حیزبەکەمانەوە وەرئەگرن. ئیتر بۆ پێشەوە!"

*(تێبینی: ئەم دو دەقە کوردیە لە ژ1 ساڵی 12 ی تەموزی 1956 ی ئازادی، زمان حاڵی حیزبی شیوعی عیراق لـە کوردستان، وەرگیراوە)*

لە مەسەلەی فەلەستیندا، کە بۆ بزوتنەوەی نەتەوەیی عەرەب بو، بو بە پێوانە. حشع پشتیوانی کـرد لـە بڕیاری دابەشکردنی فەلەستین لە نێوان جولەکە و عەرەبدا، چونکە یەکێتیی سۆڤێت لە ناو ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکاندا دەنگی بۆ ئەم بڕیارە دابو.

لە مەسەلەی یەکگرتنەوەی عەرەبـدا، کە بو بو بە دروشمی سەرەکی بزوتنەوەی نەتەوەیی عەرەب، ئەمان لایەنگری پاراستنی سنوری سیاسی دەوڵەتەکان و، گەشەکردنی سەربەخۆی هەر یەکێکیان بون بە جیا. ئازادی، بۆ بڵاوکردنەوەی ئەم بیروبۆچونانە لە ناو خەڵکی کوردستاندا دەرچوە.

## مێژووی ئازادی

مێژووی ئازادی و مێژووی لوجنە مەرکەزییەکانی حیزبی شیوعی تێکەڵاون. (ئازادی) زمانی حیزبی شیوعی بوە. سەردەمی فەهد لە ژێر چاودێری ڕاستەخۆی خۆیدا و بە پێی ئامۆژگاری و ڕێنماییەکانی ئەو و بە هەمان دەزگای چاپکردنی ئۆرگانی ناوەندی حیزب (القاعدة) چاپ کراوە. ئەم جۆرە سەرپەرشتیە دوای فەهدیش بۆتە نەریتێکی پێڕەویکراوی دەرچونی.

ڕۆژنامەی (ئازادی) کە دوای 14 ی تەموزی 1958 ڕێگەی بڵاوکرانەوەی قانونیی درا، لە ژ1 ی 1 ی ئایاری 1959 دا لەم بارەیەوە نوسیوێتی:

"ئازادی:

"ئەو شاپڵێتەیەی، کە چواردە ساڵ لەمەوبەر، دەستەیەک لە خەبات کەرانی حیزبی شیوعیی عیراقی پاڵەوان، لە ڕۆڵە دڵسۆزەکانی چینی کرێکاری عیراق، لە لاوە شۆڕشگێڕەکانی کوردی بە شەرەف، بە سەرۆکایەتی قارەمانی نەمری گەل هاوڕێ فەهد، هەڵیان کرد لە ئاسمانی کوردستانی پڕ هەورەتریشقەی زۆرداریدا. ئەوا ئیمڕۆ، لە سایەی جمهوریەتە دیمۆکراتیەکەماندا دێتەوە مەیدان وەکو مەشخەڵێک شان بە شانی برا گەورەکەی (اتحاد الشعب) بۆ ڕوناک کردنەوەی ڕێگای گەلی کوردستانی تێکۆشەر."

ژمارە نهێنیەکانی ئازادی هەموی لە بەر دەسدا نین و، ئەوەندەی من ئاگادار بم، هیچ لێکۆڵینەوەیەکیشیان لە سەر نەنوسراوە، چەند ژمارەیەکی کەمی دۆزراوەتەوە. ئەوەندەی کەوتونەتە بەردەستم لێرەدا باسیان ئەکەم:

## ژمارە 3 ی س1 ی ئازادی

ژ3 ی کە لە حوزەیرانی 1945 دا دەرچوە، لە لای چەپی سەروی ناوی (ئازادی) دا دروشمە بە ناوبانگەکەی حشع (نیشتمانێکی سەربەست و میللەتێکی بەختیار) نوسراوە و، لە لای ڕاستیدا سەروتاری ڕۆژنامەکە (بە قەڵەمی فوئاد، فوئاد ناوی حیزبیی مەلا شەریف بوە) لە ژێر سەردێڕی (میللەتی کورد و کۆمەڵی شیوعی عیراق) بڵاوکراوەتەوە. دەقی وتارەکە بەمجۆرەیە:

"تەنها حیزبی شیوعی یەکەم حیزبە لە عیراقدا کە بەرابەر موشکیلەی کورد مەوقیفێکی حازم وەستا بێ و، تەنها حیزبی شیوعیە کە تا ئیستا بە دڵێکی پاک بۆ پاراستنی مەصالیحی کورد هەوڵی دابێ و، لە گەڵ دوژمنەکانی کورد و شۆڤێنیەکان و ئینتیهازیەکان کەوتبێتە جیدال هەروەکو بۆ پاراستنی میللەتی عەرەب هەوڵ ئەدا کە لە ژێر سەیتەرەتی زوعەمایە ئینتیهازیەکان و پارەپەرستەکان قورتار بێ.

"لە موئتەمەری ساڵی 1944 کە بە موئتەمەری پەیمانی نیشتمانی ناو برا حیزبی شیوعی بە ئاشکرا مەوقیفی خۆی بەرابەر میللەتی کورد نیشان دا کە لە ژمارەکانی پێشوی بنکە (القاعدة) ش بەیانی کرد بو و لە مادەی 11 لە پەیمانی نیشتمانی کە لە لایەن کۆنفەرەنسەوە قەراری لە سەر درا داوای مساواتێکی تەواوی کرد لە بەینی کورد و عەرەب لە عیراق دا (تێ ئەکۆشین بۆ مساواتێکی تەمام بۆ کەمێتی قەومی کوردی ...) و حیزبی شیوعی هیچ دەمێک لە حقوقی میللەتی کورد و لەو مەزالیماتەی کە لێی دەکرێ غافڵ نەبوە و هەر دەمێک تەماشای ئیشوکار و دەسیسەی خائینەکانی کوردی کردوە و بۆ بە دەرخستنی مەکر و دەسیسەکانیان هەوڵی داوە، مەسەلەن لەم ڕۆژانە کە دیتمان تاقمی میللەت فرۆشەکان وەکو مەعروف جیاووک و عەلی کەمال و ماجید مستەفا و ئەوانیتر لە یانەی سەرکەوتن لە بەینی خۆیان سەبەب بە تەصادومی مەصالیحی ئیقتیصادی و شەخصی تێک ئاڵا بون و هەر کەسێ

دەیویست کە برێک لە کوردەکان و موسەققەفەکانی کورد لە دەست خۆی بکا بە ئالەت و بە گژ دوژمنــی خۆیــەوە نــێ و لە نەتیجەی تێک بەربانی وان بە خۆی مەرکەزی خۆی قایم بکا و یا پایەکی تر هەوراز بچێ.

"سکرتێری حیزبی شیوعی عیراق برادەر فەهد دەربارەی ئەو مەسەلەیە بەیانێکی دەرخســت و نیشــانی دا کە ئەو زوعەمایانە بۆ مەصالیحی میللەتی کورد ئیش ناکەن بەڵکو بۆ مەصالیحی بەرکی خۆیان ئیش دەکەن و بــە ڕێگەیەکی واقیعی نیشانی دا کە چۆن پێویستە میللەتی کورد ئەو چەشنە موجریمانە لە خۆی بــە دور بخاتــەوە و چۆن خۆی ڕێک بخا و هێزی خۆی لە گەڵ برا عەرەبەکان یەک بکا تاکو بە ئامانجی میللی خۆی دەگا.

"وە دیسان بەیانی کرد کە کۆمــەڵی هیــوا (امــل) کۆمــەڵێکی میللــی نیــە بــەڵکو کۆمــەڵی ئینتیهــازی و ئیستیعمار پەرستەکانە و میللەتی کورد پێویستی بە کۆمەڵی هیوا- امل نیە بەڵکو ئیحتیاجی بە کۆمەڵی کار- عمل هەیە و لە ئاخیردا برادەر (فەهد) تێگەیشتوەکانی کورد بانگ ئەکا بۆ یەکبون و دامەزرانــدنی کۆمــەڵێکی میللی و بە یاریدەدانێکی بێ قسور پەیمانیان لە گەڵ دەکا.

"وە لەم ڕۆژانەدا کۆمەڵی شیوعی بەیانێکی تری دەربارەی فەلاحی کورد دەرهێنــا (بــرای فــەلاح بزانــە، کۆمەڵی شیوعی بۆچ تێ ئەکۆشێ؟) ئیتر هەروا حیزبی شیوعی بەرابەر بــە دژواریــەکانی میللــەتی کــورد هــیچ دەمێک چاوی نەپۆشاوە."

### ئازادی و یانەی سەرکەوتن و ڕۆژنامەی ژین

سەبارەت بــەو ناکۆکیــەی لــە نــاو یانــەی ســەرکەوتندا روی داوە و لــەم ســەروتارەدا باســی کــراوە ڕۆژنامەی ژین لە ژ 782 دا بە ناونیشانی (یانەی سەرکەوتن) نوسیوێتی:

"ئێمە خوا لێمان تێک نەدا لە پایتەختی داروسەلاما یانەیەکی کوردیمان هەیە کە بە ڕەنج و تەقــەلا دامــەزراوە. ئینکار ناکرێ سەرەتا مەعروف جیاوک دایمەزرانــد. بەرامبــەر بــە هــەمو ناحــەزی و نەنگەویســتی دەروژورو خــۆی گرت. وەکو مەبادی ئیسلام بانگیان لە کولەکــەی تــەریا ئــەدا و ئیجتیماعیــان لــە مــاڵی مــەعروف جیــاوک دا ئــەکرد. تەنانەت ئەو زاتە هەڵسا بە هەمو کوردستان دا گەڕا، ســواڵی بــەردەر و پشــتدەری بــۆ کــرد، منیشــی وەک ڕەســول شایەر لە گەڵ خۆی گەڕاند. ناو و ناوێکی وای پەیدا کرد کە ئەمساڵ نەورۆزی کوردییان لە قاعــەی مــەلیک فەیســەڵ دا خوێندەوە. ئەمە شــەرەفێکی تاریخیــە چــاوی بــەدی لــێ کەوتــە کــار. کەوتنــە بەربــەرەکانی. ئەوەنــدەی نــەمابو (یانەوێرانی) بەسەر کوردان دا بێت. وەکو لە غەزەتەی بەغدادا خوێندمانەوە ئیختیلافەکە حەل بوە. بــە ئیتیفــاق عــەلی کەمال بەگ دەرهاوێژراوە. ئێستایش من خۆم سەرم سوڕماوە ئەو زاتــە چــۆن ئــەم ناکۆکیــەی ڕەوا بینیــوە؟ ئــەنجا ئومێدم پەیدا کرد کە زەوالی بەدبەختی بێت کە ئەمە حەدی کەمالە. خوا خراپتر نەدا."

### ژمارە 5 ی س1 ی ئازادی

ژ5 ی تشــرینی ســانی 1945، 12 لاپــەڕەی پێوانــە (5.22 × 5.17ســم) ە. لــە ژور ناوەکــەی "نیشتمانێکی سەربەست و میللەتێکی بەختیار" هەیە. لە بابەتەکانی ئەو ژمارەیە:

(کورد و سەورەی ئۆکتۆبەر) بە ئیمزای ئازادی،

(کورد و حکومەتی عیراق) بە ئیمزای جوتیار.

(میللەتی کورد پێخۆشحاڵە لە مەوقیفی حیزبی شیوعی عیراق بەرامبەر مەسئەلەی کورد) بە ئیمزای پۆلا،

(جولانەوەی بارزان جولانەوەیەکی رزگاری کوردە) بە ئیمزای جوتیار،

(بۆ ئاگاداری میللەتی کورد) بە ئیمزای بێ کەس،

(سەورەی ئۆکتۆبەر و مەسئەلەی قەومیمان) بە ئیمزای ج.

له هەر لایێکەوە: لەم گۆشەیەدا هەواڵی چەند شاری کوردستانی بڵاوکردۆتـەوە. هـەواڵی سـلێمانیە بـە ئیمزای ع. هێمن، هاتنی پێشەوا شێخ مەحمود بۆ سلێمانی بە ئیمزای بریندار، هەواڵی پێنجـوێن و قـەرەداغ، بە ئیمزای ئازاد. هەواڵی چوارتا بە ئیمزای شوان، هەروەها هەواڵی هەولێر، هەڵەبجە، خورماڵ. ئێـران و سـەر حدود بە ئیمزای رەنجبەر، نامەی حیزبی شیوعی عیراق.

له (جولانەوەی بارزان جولانەوەیەکی رزگاری کوردە) دا ئەو بۆچونەی حکومەتی عیراق بەرامبەر بە مەسـەلەی کـورد رەت کراوەتـەوە کـە بـە فیتـی بێگانـەی دانـاوە: "ئەفسـوس کـە جولانـەوەی هـۆزی کـورد لەلایـەن دوژمنەکانیـەوە بـە چەشـنێکی چـەوت بڵاوکراوەتـەوە، بـەلام رۆژ و حادیسـاتی عالـەمی دەریخسـت کـە جولانەوەیەکی رزگاریە بۆ ئازادی هـۆزی کـوردی هـەژارە لـەژێر دەسـتی فاشیسـتی و ئیسـتعمار و دیلـی و رەشوروتی و هەژاریە و، دەرکەوت کە هۆزی کورد نە بە حوکمی فاشیستی عیـراق و نـە بـە ئێـران و نـە بـە تورکیا رازی نیە و نابێ و، ئەیەوێ بە ئازادی بژی لە نیشتمانی خۆیـا بـە ئاسـودەگی. وە هـەر دەمێـک بـۆ پاراستنی حقوقی خۆی تێئەکۆشێ، حکومەتی عیراق وای دائەنێ جولانەوەی بارزان دەسیسەی روسـە، حاشـا ئەمە هیچ ئەسڵ و ئەساسی نیە چونکە هۆزی کورد چاوی کراوەتەوە و ئەیەوێ خۆی لەژێر چنگی دوژمنـەکان دەربهێنێ کە تائێستا ئەویان ئیستیعباد کردوە

"لەبەر ئەمـە حیزبـی شـیوعی عیـراق تەئیـدی نـەک بـارزان کـە حەرەکەیـەکی رزگـاری قەومیـە بـەڵکو هـەر حەرەکەیەکی رزگاری بۆ هۆزی کورد ئەکات لە هەر جێگایەک دا روبدات".

لـە (سـەورەی ئۆکتۆبـەر و مەسـئەلەی قـەومیمان) دا حشـع پشـت بەسـتو بـە کتێبـی (مارکسـی و مەسـئەلەی نیشتمانی) بنەمایەکی چەسپیوی بۆ سالانێکی درێژی لەوە بە دوای سیاسەتی خۆی داناوە و بەو پێیـە مـافی جیابونەوە و پێکهێنانی حیزبی شیوعی سەربەخۆی لە کورد سەندۆتەوە و چارەسەری ئەو کێشـەیەی یـەکجار دور خستۆتەوە کە نوسیویەتی: "هەر میلەتێک بۆی هەیە لەسەر ئەساسی حوکمی خـۆیی ژینـی خـۆی تنظیم بکا بەڵکو بۆی هەیە کە جودا بێتەوە. بەلام ئەوە مەعنای وا نیە کە هەر میلەتێک لە هەمو ظروفێک ئەو حەقەی بۆ هەبێ و ئەبێ بۆی بچێتە سەر و مەعنای وا نیە کە جودابونەوە و حوکمی زاتی هەر دەمێک باشە بـۆ هـەر قەومێک کە باشیەکەی بۆ بەشی گەورەی میلەتەکە بێ کە دەکا فەقیر و هەژارەکان... کەواتە شرط نیە انفصالی هەر قەومێک لە هەمو جێگایەک و هەر کاتێک فائیدەی بۆ میللەت هەبێ مثلا لە کوردستانی عیراق ئەگەر هـاتو دەرەبەگ و بۆرجوازییەکانی وەکو شێخ رەشید و شێخ رەقیب و نوری باویـل و تۆفیـق وەهبـی و مـەعروف جیاوک... هتد، قسەیان یەک کرد و بە سەفیری ئینگلیزەکانیان گوت ئێمەش قەومی کـورد تـەمثیل ئەکـەین و دەبێ بە خێرا خۆتان ئیستیقلالێ بە ئێمەش بدەن و ئەو میللەتە هەژارە لە ظولم و غەدر نـەجات بـدەن و ئـەو وەختە ئیستیعماری ئینگلیزیش گوتی سەرچاوان ئـەوا مـن دڵـی ئێـوە ناشـکێنم حکومـەتێکتان بـۆ دائـەنێم ئێوەش پێویستە چاکەی من لە بیر نەکەن.

"وە بەو جۆرە کوردستانی عیراقیان جودا کردەوە، ئاخۆ لێرانە کێ ئیستیفادە دەکات و ئـەم جـۆرە حکومەتـە فائیدەی بـۆ کـێ ئـەبێت؟ بێگومـان چینـی روت و رەجاڵـەکان زەلیلتـر و نیشـتماپەروەرەکان زێتـر ئەکەونـە ناخۆشی، چونکە ئیستیعمار بە واسیطەی ئەو میللەت فرۆشانە چـاکتر خـوێنی میللەتەکـە ئـەمژێ و ئـەوانیش پشتیان بە ئینگلیز قایم دەبێ و چاکتر نیشتماپەروەرەکان ئەزیـەت ئـەدەن و میللەتەکـە ئیسـتیغلال دەکـەن و ئەیانکەنە دیلی خۆیان چونکە ئەو زاتانە ئەگەر ناوی کوردیش بێنن بۆ ئەوەیە کە میللەتەکە هـەر بـە خۆیـان ئیسـتیغلال بکـەن و چ شـەریکی تریـان نـەبێ. سـتالین ئـەڵێ: (وا لای هـەموان ئاشـکرا بـو کـە هەوڵـدانی بۆرجوازی قەومی بۆ ئەوە نیە کە - شـەکلی تایبـەتی خـۆی- لـە ئیزتیهـادی قـەومی قورتـار بکـا بـەڵکو بـۆ ئەوەیەتی کە بە سەربەستی قانزاج لە میلەتەکە بکا و سەرمایە و ئیمتیازاتی خۆی بپارێزێ. ستالین..

تشرین ثاني ١٩٤٥ | ژماره ٥ | نرخي ١٥ فلس

→ نیشانەی سەربەست وەلاتی بەختیار ←

بژي تیکوشین ملەتان لە ریگای سربەستي

# آزادی

بژي ثورەي اکتوبر هەر دەمیـــــك

# کورد وثورەی اکـــتوبر

— آزادي —

وا لە ولاتي یەکەتي سوفیـات و لەهەمو دنیادا بەدلیکی خوش یادي ئەو روژە دەکرینەوە و تقدیسي ئەکري ، ئەو روژە کە لابەرەي ظلم غدر لە ولاتی روسیا آوا کرا و دەوریکي تازە دەستي پي کرد بو ملەتەکانی یەکەتي سوفیاتي ، ئەو روژە کەاستیرەي راستي و سربستي لە ولاتي یەکەتي سوفیات گەش بوە و روناکی لە گشت دنیا بلاو بوە باش رابردني بیست و هشت سال لە سەر شورشي اکتوبر کە لەم مدەیەدا ملەتاني یەکەتي سوفیاتي و هەمو ملەتاني دنیا چند شاقاویکي گەورە پیش کەوتون لە وەرگرتنەوەي حقوق ژینو آزادي ولەبەیکە یشتني معناي سربستي ، ملەتی کوردیش بە دلیکي پر لە خوشي و امل یادي ام روژە دەکاتەوە چونکە ازاني ئەم روژە روژي شکاندني زنجیري ژیر دەســـي ودیلي یە و روژي ورگەراني تختي ظلم استبدادي قیصریە جاعنە کەیتی .

ملەتي کورد کە لەناخوشترین وتاریکترین روژي خوي رائەبري و لەژیرا چنگي دوژمناني وکو استعمار و کونە پرستي هەر جورە استبدادیك دەبیني ، معناي شورشي اکتوبر تي ئەگا و تقدیسي ئەکا ثورەي اکتوبر ثورە ملەتیك لەملەتاني یەکەتي سوفیاتي و یا ثورەي یەك لەطبقەکاني ملەتي سوفیاتي نەبو بەلکو ثورەي ١٨٠ ملیون نفوس بو کە لەژیر قیادەتي حزبي کریکار و حزبي شیوعي خوي تنظیم کرد و برابر ئەو ظالمانەي کە با هیزي ئەمجي تسخیریان کردبو هەلساو لەسر حوکي لابردن ، ثورەي کریکاران بو چونکە کریکاراني یەکەتي سوفیاتي لەژیر سرداري کومەلي شیوعي ئیان کرا نظامي قیصري بروخینن و بەخویان بچنە سەر حکم ، ثورەی فلاحەکاني بو چونکە فلاحەکاني یەکەتي سوفیاتي لەسایەي ئەو فدا کاریەي کە لەگەل برا کریکارەکانیان بەسر یان گەیاند [illegible] حوکي قیصري لە جانیان بو وایستا لەدونیایکی تازە بەخوشي [illegible]

"هەروا بۆمان دەرئەکەوێ کە جودابونەوەی کورد و عەرەب لە عیراق هەمو وەختێک فائیدەی میللەتی تێدا نیە و نابێ ئەو شیعارە بە شتێکی وا دابنێین کە بۆ هەر دەمێک دەس ئەدا لینین لە شیوعی بالّی چەپ ئەڵێ ئەو کەسانەی عیلاجێکی وا نیشان ئەدەن کە لە هەر کاتێک و لە هەمو جیگایەک تطبیق بکرێ یا خەرەفاون یا ناتێگەیشتون.

"یەکەم شەقاو لە پێش میللەتی عیراق لە ناوبردنی ئیستیعمارە.. ستالین ئەڵێ: ئیستا لای هەرکەس زانراوە تاوەکو ئیستعمار نەڕوخێ و بۆرجوازی قەومە مەزڵومەکان وەرنەگێڕرێ و هەتا حکومەت نەکەوتە دەست گەلی هەژاری میلەتەکان سەربەستی ئەو قەومانە هەر بە خەیالیش دا نایێ.

"... ستالین ئەڵێ: دابەش کردنی تەنزیمی پرۆلیتاریا لە دەوڵەتێک بە گوێرەی قەومیەت دەبێتە سەبەبی تێکدانی یەکێتی تەبەقی لەبەر ئەوەی پێویستە پرۆلیتاریای هەمو قەومەکانی ئەو دەوڵەتە لە یەک مونەزەمە خۆیان کۆبکەنەوە، لە کۆمەڵێکی پرۆلیتاری گشتی کە قابیلی دابەش کردن نەبێ..."

## لە نێوان ژین و حشع و ئازادیدا

بڵاوکراوەکانی حشع دەورێکی گرنگیان گێڕاوە لە بڵاوکردنەوەی هۆشیاری سیاسی و چینایەتی و نیشتمانیدا و، لە پەروەردە کردنی هەزاران کەس بە گیانی دوژمنایەتی ئیمپریالیزم و کۆنەپەرستی و، خۆشەویستی یەکێتی سۆڤێتی و ئاشتی و پێشکەوتنخوازی و پەرستنی لینین و ستالین... سەدان کەسی راکێشاوەتە مەیدانی تێکۆشانی سیاسییەوە. بە دەیان کەس لە سەر ئەوەی یەکێ لەم بڵاوکراوانەی پێ گیراوە، گیراون و حوکمی قورس دراون.

پێ ئەچێ حشع لەو ماوەیەدا بەو بەرنامە نوێیە و بەو دروشمانەی بەرزی کردونەتەوە توانیبێتی ژمارەیەکی زۆر لە لاوانی تازەپێگەیشتوی کورد بە لای خۆیدا رابکێشێ و، بەو هێرشانەی کردویەتیە سەر کەسایەتییە ناسراوەکانی کورد و، بە بڵاوکردنەوەی هەواڵی گەندەڵی لە دائیرەکانی حکومەت دا، هەرایەکی زۆری نابێتەوە.

لە سەر ئەوە (ژین) بە دەنگ هاتوە. لە لایەکەوە ئامۆژگاری لاوانی کوردی کردوە کە خۆیان لەم کێشەیەوە نەگلێنن و، ئامۆژگاری کاربەدەستانی حیزب و رۆژنامەکەیان کردوە و، لە سەر کەسایەتییە ناسراوەکانی کوردی کردۆتەوە. ئەگەرچی ئێمە جگە لە ژمارەی پێنجەم دانەی ترمان لە بەر دەسدا نیە، بەڵام بە کاردانەوەی ژیندا هەندێ لە بابەتەکانی تێ ئەگەین.

ژین. ژ754 ی 17 ی ئاغستۆسی 1944 لە ژێر سەرناوی (بۆ لاوە جگەرگۆشەکانمان) دا نوسیوێتی:

"رۆڵەکانم!

"هەموتان پیرەمێرد ئەناسن کە کوردە و ئامۆژگاری گۆڕیشی بە کوردیە و بۆ ئەوەیش نیە خۆی پێ بەرێتە پێشەوە و چشتێکی پێ بیچڕێ هەر ئەویشە کە بەراستیەتی، ئەو پیرەمێردە هیوای بەرودوای بەلاوانی کوردە، تەنانەت لە ئەستەموڵ هاتەوە لە شەمەندوفەردا مەنزومەیەکی نوسیوە ئەڵێ: (ئومێدم وایە ئەم دەستەی کوڕانە مەشعەلێ هەڵکەن). بەڵێ دەستەی کۆن کە بە ئیستیلاحی کۆن (صنادید) یان پێ ئەڵێن کوردی خۆیان گرتوە ئیتر دەربەست نین. ماوەتەوە سەر ئێوە، ئێوەیش لە پێش هەمو چشتێک دا هەرچی ئەکەن ئەبێ بەچرای خوێندەواری بە رێ دا برۆن تا رێ گوم نەکەن، علم و فەن میلەتێک سەر دەخا، لە هەمو کارێک دا ئەبێ دو قۆڵتان بێ غایە و دەستور، مەرام و خەتی حەرەکەت، خوێن گەرمی لەشی پیاو ئەکا بە لیر و دومەڵ.

وەکو پێم وتن بزانن چیمان بۆ چاکە و، چۆنمان دەست ئەکەوێ؟ عەیب نیە لە جیهاندیدەکانتان بپرسن. خۆ من ئەگەر عەقلیشم نەبێ تەحصیلێکی بەرزم هەیە کەوا ئەمانەی پێ دەنوسم و تەجروبەیشم هەیە کە لەم مەیدانەدا زیندان و حوکمی ئیعدامم دیوە.

"وەرن بزانم چیتان ئەوێ، ئەگەر مەعقولە منیش لە گەڵتان و، ئەگەر نارەوایە بۆ چ بە خۆڕایی ئەم هەمو لاوانەمان لە باڵی بدرێ؟ لە بیرتان چوەوە کە چەند لاوی نازدارتان لەکەی بەیاننامەچییان پێوەنان و لە مەنفادا لە کەڵک کەوتن؟ بەڵێ کوڕانمان ئەبێ لە ڕێی نیشتمان دا نەبەزن بیشیان کوژن کونیان(!) نەچێ بەڵام مەعقول! و ئەساسەن ئەم نەوعە بەیاناتی دزیەتییە بۆ مەردان عارە کامتان خۆتان بە عیلاقەدار ئەبینن وەرن یەکتری ببینین خوا ئاگای لێ بێ بۆ کارێک کە ڕێی تێ بچێ من دەرێغیم نیە و بەم پیریە بەگیرم بەڵام خوا هەڵناگرێ بە هیچ تیا بچن. من اگر کوشتە شوم بهری بکاری باری."

ژین، ژ773 ی 1 ی شوباتی 1945 لە ژێر سەرناوی (شێوەی مەردی) دا نوسیوێتی:

"سەرەتای ئیش هەمو یەکبونە ئەویش نابێ هەتا

"هەر برینێک کە لە دڵ دا هەیە سارێژی نەکەی

"لەم ڕۆژانەدا وەکو تەماشا ئەکەین هەندێ کەس لەڕوی ناکۆکیەکەوە کە لە بەینی ئەوان و مەئموری ئیدارەدا روی داوە کەوتونەتە بەندوباو و بەیاننامە بڵاوکردنەوە کە بەشی زۆری بەشێوەیەک نوسراوە پیاو شەرم ئەکا بیانخوێنێتەوە چونکە سەراپا پڕە لە جنێو و قسەی ناشیرین کە پێویست نیە بە ناوی ئەهلی شارەکەمانەوە یا بە ناوی کوردەوە بڵاوبکرێتەوە و بکەوێتە بەر چاوی دۆست و دوژمن و ئێمە کە نامانەوێ بە هیچ جۆرێک لایەنی هیچ لایەک بگرین بەڵام، یەکەم بە ناوی کوردەوە و دوەم، بە ناوی ئەهلی سلیمانیەوە وامان بە باش زانی کە لە نوسەرانی ئەم جۆرە بەیاننامانە بگەیەنین کە ئەو کارەی ئەوان ئەیکەن لە خراپە و ناو زڕان هیچ سودێکی نیە بۆ ئەو وڵاتە کە بۆی ئەگرین و لەم بەیاننامانەدا ئەوەی لە هەمو ناشیرینتر بو بەدناو کردن و بە سوک ناوبردنی عەشیرەتێکی کوردە لە قینی یەکێ کە لەو عەشیرەتەیە، لامان وایە ئەم ڕێیە ڕێیەکی چەوتە تەنانەت لە دوژمنایەتیش دا ئەگەر گلەییتان لە مەئمورینی ئیدارەدا هەیە مەردانە بچنە لای و گلەیی خۆتانی لا بکەن ئەگەر ئەوەندەش بەخۆتانا ڕانابەرمون ئەتوانن بە ئاشکرا لە هەمو ڕێگایەکی قانونی و مەعقولەوە موراجەعەت و شکایەتی خۆتان بکەن ئەگینا بە بەیاننامەی وا ناشیرین نوسین و جنێو بەخوشک و ژن و دایکی خەڵق دان و بڵاوکردنەوەی بەبێ ناونیشان لامان وایە شێوەی مەردانە و کوردانەی تیا نیە.

"ئیتر هیوامان وایە کە نەختێ بێنەوە سەر خۆتان، قین و دوژمنایەتی کوێرتان نەکا، لەمە زیاتر ئابڕوی ئەم وڵات و قەومە بێچارەیە نەبرێت بۆ هەمو لایەک چاکتر و بە جێ ترە. دوا تکاشمان ئەمەیە هەمو کوردپەرست بن نەک ئەشخاس پەرست، یەکدڵ و یەکدەم دەست بدەینە دەست یەکتری و لەم وەقتە تەنگوچەڵەمەیەدا خۆمان بە دوژمنایەتی شەخسی و شتی هیچ و پوچەوە خەریک نەکەین ئاگامان لەخۆمان بێت وا خەریکە ڕەنگی دوا ڕۆژمان ئەڕێژرێت، ئەوەندەش بزانن ئەم هەراو هوریایانە هەر لەبنەرەتەوە تا ئێستا ئەوەندەی تۆزێ چاکەی کوردی تیا نیە.

محامی: شێخ ڕەوف شێخ مەحمود. محامی: ئیبراهیم ئەحمەد. محامی: فایەق هوشیار. محامی: مەجید یاوەر. بابا عەلی شێخ مەحمود. فایەق بێکەس. یەکتا بەگ.

ژین، ژ774 ی 17 ی شوباتی 1945 لە ژێر سەرناوی (گوێ ڕادێری) دا نوسیوێتی:

"ئێمە بەوە خۆمان بە بەختیار ئەزانین کە خدمەتی غەزەتەکەتان ئەکەین و غەزەتەکەش خدمەتی ئێوە دەکا. جارێ بەر لە هەمو شتێک خۆ هیچ نەبێ ئەڵێن کوردستان غەزەتەیەکی هەیە ئەم غەزەتەیەیش کە لە

تارانەوە و لە سنەوە، لە کرماشانەوە، لە میسرەوە، لە شـام و بێروتـەوە، ستایشـی وای بـۆ دێـت کـە دڵ رون ئەکاتەوە. رەشید یاسەمی ئەڵێ چاو رون ئەکاتەوە. تاهیر هاشمی ئەڵێ گیان تازە ئەکاتەوە. پیرەمێردێک ئـەم خزمەتەی گرتوەتە ئەستۆی خۆی بۆ جگەرگۆشە نازدارەکانی وازی لە هەمو جیهان هێنـاوە تـا ئێسـتا لەسـەر ئەمـە سـەد پـەڵی بـە قەبرغـەدا دراوە، کـەوتوە و هەڵسـاوەتەوە، نەبـەزیوە، دیـارە دنیـا بـۆ بـەرێوەبردنی جگەرگۆشەکەیەتی و کە کەڵکی ئێلەکەیە، کەوابو ئێوەش گوێ رادێری بکەن.

"خوێندن ئینکار ناکرێ کە قەومێک سەردەخا، بەڵام (ئەخلاق) کردەوە لـەپێش خوێندنەوەیـە. زۆری وا هەیـە خوێنـدەوارە موتەفەنینـە بـەڵام بـە کـرداریێ هـەموی لـە کـیس داوە. ئێسـتا مـن ئـەم جـارە لـە گـەڵ نەوجەوانانەکانمە چونکە هیوای زۆرم بەوانە و بارەها وتومە مەگـەر ئـەوان ئـەم قەومـە رزگـار کـەن، ئـەوەڵ چارەیش ئەمەیە شان بدەنە بەر هەیکەلی زۆر و دەستدرێژی زۆردار و تەماعکار بە مەنگەنەی عیلم و ئەدەب و راستەو راست، نەک بە پێچ و پەنا و لەژێر پەچەدا. خوا رەوای بینـی وا رێگەناسـانی حقـوق و مەعریفـەتتان کەوتوەتە ناو ئەتوانن لە رێیەکی مەشروعەوە حەقی خۆتان بپارێزن. بۆ ئەمەیش یەکـدڵی و یـەک وجـودی و نیشتمان پەروەری پێ ئەوێ، کە ئەم سێ سیفەتە ئەساسەن لە مەوالیدی سەلاسـە پەسـەندتر و بـەکارترە. مـن ئەمەم لە ئێوە ئەوێ ئەگەر هیچی ترم لە ئێوە ویست مەم دەنێ."

ژین، ژ798 ی 9 ی ئاغستۆسی 1945 لە ژێر سەرناوی (ئامۆژگاری بۆ لاوان) دا نوسیوێتی:

"لەکاروباری جیهانیدا بەراورد کراوە وا دەرکەوتوە رێ بە ئیش بردن بەتێگەیشتنێکە کـەناویان نـاوە (عەقڵ) هۆشیاری، عەقڵیش دو نەوعە:

"یەکێکیان، ئەوەتە لە سروشت و دروستکردنی ئادەمیزاد مادەرزاد خوا بەتەبیعەت ئەیبەخشـێ و بـەو زەیرەکیە تێ دەگا. ئەمە عەقڵی مەوهوبە.

"دوەمیان، لە گوزارشاتی جیهانیدا هەرچی بەراورد کرابـێ کـە چ رەنگێکـی باشـە و بـەکارە ئـەوەیان کردوە بە دەستور و، بەو رێیەدا رۆیون، رێیان لێ نەگۆڕاوە ئەمەیشە پێی ئەڵێن عەقڵی مەکسوب.

"ئینجا هەرچی عەقڵی خوداداە تیژپـەڕە زۆر (هەڵـە) ی تیایـە. عـەقڵی بـەراوردی کـە تاقیکراوەتـەوە زۆرتری جێی باوەڕە.

"جا بەم دەستورە زانراوە، لە ئیدارەی سیاسەت دا، لەهەر حکومەتێک دا، عەسکەر و تەلەبە تێکـەڵی بـو بن، ئەو ئیدارەیە شێواوە و بەڵکو ئەو حکومەتە فەوتاوە! هێشتا لەبیرمان نەچۆتەوە سەڵتەنەتی عوسمانی کـە ئەوروپای هێنابوە لەرزە لەم دواییەدا سیاسەتی عەسکەر و تەلەبەی مەکتەبی تێکەڵ بو. هەندێ تەلەبە رایـانکرد چونە (پاریس) ناوی خۆیان نا (ژۆن تورک) و هەمیشە لەپەیجۆری روخاندنی شـەکلی ئیمپراتـۆری بـون تـا روخاندیان و عەسکەریش (حەرەکەت ئۆردوسی) یان رێک خست و هاتن بەجارێ ئەو سەڵتەنەتەیان تێـک دا و، نمونەی ئەمەیش بەحەرەکاتی عەسکەری لە عێراق دا روی دا و چەند ناودارانی بەقیمەتی وڵاتەکەمانی تیا لە ناو چو کە وێنەیان ئەمرۆ نابێتەوە. خوا پاراستینی هاتینەوە قەوام.

"من بەتەجروبەی خۆم ئەمەم زانیوە کە هـەرچی هەڵسـێ و لەسیاسـەت بـدوێ ئەشـێوێ هـەمو کەسـێ ئەیزانێ من بە نەفسی خۆم هەرچی ئارەزوی شەخسی بێ نیمە و تا ئێستا کە دواییمە لە عێـراق دا چـاوم لـە موڵک و ماڵ و وەزیفە و مەوقیعی دیوانی نەبوە و نابێ، تەنها بۆ عیلم و تێگەیشتنی قەومەکەم هەوڵ ئـەدەم و وەستا خۆڕاییم و دڵسۆزم کەس ناتوانێ بڵێ ئەوەی برد یا خواردی، کەواتە بەم ئامۆژگاریە دڵسۆزیەم بـاوەڕ بکەن و هەر کەسە لە نەزمێ لێ نەدا، وا لەیلەتوقەدری هیوای کوردەواری لـە پێشـەوە مەبنـە کـابرای کـوردە و شوێن ئارەزوی ژنان مەکەون و گرۆگاڵ لەسیاسەت دا تێ هەڵ نـەقوتێن و سـەر لـە کاربەدەسـتان نەشـێوێنن کەسێ بەیاننامەی بە دزیەوە فڕێ دا و پەچە بگرێتەوە ئەبێ چۆن ناوی بەپیاو بەرن؟"

ژین، ژ804 ی 27 ی ئەیلولی 1945 لە ژێر سەرناوی (بۆ حیزبی شیوعی عیراق) دا نوسیوێتی:
"بەیاننامەیەکتان بە عەرەبی و کوردی نەشر کردبو عەرەبیەکەیانم دی..
"باشە و موبارەکە وا حیزبتان تەشکیل کردەوە و، ئیجتیهاد و باوەڕی ئێوە وایە کە ئـەو مەسـلەکە بـۆ وەتەن و قەومیەتتان بە فائیدەیە و، ئەتوانن لەو بەرگـەدا خۆتـان بنـوێنن. ئیجتیهـاد و ئیعتیقـاد لای هـەموان موقەدەسە و، دوعای خێرتان بۆ دەکەم کە ببنە وەسیلەی سەربەرزی و رەهایی وڵاتتان و، دوعای پیران گیرایـە نەخوازەڵا پیرێکی هەشتا ساڵە کە زۆرتری حەیاتی خۆی لـە خدمـەتی وەتـەنیا سـەرف کـردوە و زینـدان و دەربەدەری و دەردی سـەری دیـوە، نەبـەزیوە، بـە قەڵـەمێکی تیـژ و مـودەتێکی درێـژ، لـە هـەمو غەزەتـەکانی ئەستەموڵ و میسر و وڵاتان دا، بە ناڵەی مەنزوم و شیعری وەتەنیەوە لە مەیدان دا بـوە و، خاوەنـدی شـینی شەهیدان و وەفدی کوردستانە و، بەتەنیا غەزەتەیەکتان بیست ساڵە بۆ دەردێنێ. ئەو پیرە رجاتان لێ دەکا لـە رەهگوزاری مەساعیتان دا غەرەز و خۆخۆری مەکەنە کار، یەکتر مەشکێنن. تۆفیق وەهبی ئەو کەسـەیە کـە لـە سلێمانی خۆی نایـە پێنـاوی ئیـدعای کـوردی، مـردو زنـدوبوەوە. جیـاوکیش بـاوەڕ بـەمن بکـەن کـوردە و کوردپەرستە ئیتر کەیفی خۆتانە."

ژین، ژ813 ی 13 ی کانونی ئەوەلی 1945 لە ژێر سەرناوی (بۆ پارتی ئازادی عیراق) دا نوسیوێتی:
"ئێوە کۆمەڵێکتان بەناوی دەستەی ئازادییەوە لـە بەغـدا رێـک خسـتوە، نـاوێکی خـۆش و نیـەتێکی پەسەندە! کە بۆ لە هەموی باشتر ئەمەیە دو میلەت لە مەڵبەندێک دا، دوبرا لەخانویەک دا، خوا یـەکی خسـتون و شەیتان خەریکە بکەوێتە ناویان. ئێوە لەسەر یەکێتی و برایـەتی پـەیمانتان بەسـتوە و ئـەم پیرەمێـردەیش لەهەمو گەردش و ناکۆکیدا لەسەر ئەو ئارەزوە رۆیوە، بەمە زۆر دڵشاد و ئازادە. لە خوای ئەوێ تـا سـەربێ. ئەشیا پرس و راتان بەمن بوایە کە نەم ئەهێشت لەهەندێ چشتا بە سەهو بچن. بەڵێ تەنقیـد بەجێیـە بـەڵام نەک بە نابەجێیی. ئێوە لەمەوبەر ستایشی عیزەت ئەفەندی مودیری پێنجوینتان کرد بو کـەچی ئـەمجارە لـە سەروگوێلاکی ئەدەن. ئەمە بۆ ئێوە ناشیرینە. من بە نەفسی خۆم عیـزەت بـە مـودیرێکی زۆر بـە خدمـەت و کارئامەد ئەزانم و، ئێوە مەعروف جیاوکیش بە باش نـازانن ئـەوا مـن پێتـان ئـەڵێم و باوەڕیشـم هەیـە کـە باوەڕیشم پێ دەکەن چونکە لە ژێر ئەم قوبەیەدا ترس و پرسم لەکەس نیە و، لـە هـیچ خـوانی یەغمایـیەک دا پارویەکم نەناوەتە دەم، پارەیەکیشم وەرنەگرتوە، هەمو ئیکرامێکم رەد کردۆتەوە و خدمەتی زۆریشم بوە، جـا بەم سیفەتەوە ئەڵێم: پیاوی وەک جیاوک و موتەسەریفی وەک مەعروف بەگمان زۆر کەمە. بـەڵێ باشـە هـیچ کەس ئەتوانێ بڵێ ئەم پیاوە بەرتیل وەرگرێ و؟ ئینکاری ئەکرێ لە دو مادەی میللیدا کەتێ هەڵچو لـە کـەوتن نەترسا و کوردایەتی خۆی دەرخست؟"

ژین، ژ814 ی 20 ی کانونی ئەوەلی 1945 لە ژێر سەرناوی: (غەزەتەی ئازادی) دا نوسیوێتی:
"لە نوسخەی بەروی ژین دا ئێمە کەمێ لە غەزەتەی ئازادی دوابوین و بەیانی مەمنونێتیمان لەوە کردبـو کە رەهنمایی یەککەوتنی دو عونسور ئەکا. تەنقیدیش وەزیفەی مەتبوعاتە. تەنانەت غەزەتەکەی من، بۆی بلـوێ کردەوەی کەچرەوی هەندێک کە ئەوی پێیان بێژراوە خوێی چێشتە، ئەدا بەرویانا، بەڵام نەک بە رەنگێک کە هەندێ درۆی وای تیابێ راستیەکانیش بخاتە گومانەوە. بـەجیاوک ئـەڵێن: کـە هـاتوە هیچـی نـەبوە، ئێسـتا تەداروکاتی ماڵی بە دە لۆری بارناکرێ. ئاخر جیاوکێ کە بەرتیل نەخوا و هیچ کەسێ نەتوانێ بڵێ ئەوەی لـە فڵان وەرگرت ئەشیا لە کوێ کۆ کاتەوە؟ ئەگەر من سێ ساڵە شێخ حەفسە، خوا لێی بەزیادکا، لێفەیەکی داومـێ پێی ئەنوم، جیاوک ئەگەر بە نیسبەتی نفوسیەوە بەش بکرێ لێفەیەکی پێ نابرێ. ئەم پیاوە، پیاوە! خراپـەی

زۆری ئەوەیە لە هەمو کاتێک و شوێنێک دا نەراندویە وتویە کوردم. وا خوا لێرە دەربازی ئەکا ئەوسا ئەگەرێن لەشوێنی."

"شێخ سەلام و پەڵ پیا دراوێکی تر جوابی خۆیان نوسیوەتەوە عەینەن بۆمان دەرج کرن.

"پاسوخی شێخ سەلام

"بۆ خاوەنی رۆژنامەی ژین

"لەم چەن رۆژانەدا گۆڤارێکی (سرِی) بەناوی (ئازادی) یەوە دەرچوە، بەشی زۆری جنێوە بۆ ئەشخاس، کە لە ئەخباری قەزای چوارتا دا بەشی منیش بە ئیمزای موستەعاری (شوان) هوە نوسراوە و ئێمەیش ئەزانین با لە چ کونێکەوە دێ، پێویست بو کە ئەم پاسوخە بنوسمەوە و بەهۆی رۆژنامەکەتانەوە بەرچاوی خوێندەوارانی بەرێز بخرێ و بەڵکو شوان و هاورێکانیشی ببینن. ئیتر ژیان.

"شوان نوسیویەتی: (شێخ سەلام، مەئموری تەموین دەغلی دەرەجە 2 و 3 ی دابەش کرد بە سەر ئەهالیەکەدا بەناوی دەرجە 1 تا ماوەی دزی بۆ چۆڵ بێ، بەلام ئیستیفادەشی لێ نەکرد چونکە نەقڵ کرا. ئێستە فەزڵەی گەنم کە بۆ دزی داینابو 100 تەنە، نازانین حکومەت بۆ سوئالی لێ ناکا کە ئەم فەزڵەیە چیە؟)

"پاسوخ: ئەی خوێندەوارەکان تەماشا بفەرمون کە چەن غەرەزی شەخسی و درۆ و دەلەسەی بێ رێ و جێ و بێ مەنتیق لەم نوسینەدا هەیە. کاتبی وا زۆر عەیبە شوان بێ هەر ئەبێ کوری باوکی خۆی بێ (فردەوسی: پسر کە ندارد نیشان از پدر/تو بیگانە خوان و مخوانش پسر) بەڵێ ئەبێ (شوان) بۆ تەقەدوم نەچێ خۆی خەریکی کۆنەپەرستی و کۆنەفرۆشی بێ. کوری خزمەتکاری پیاوێکی خائین بێ! زۆر حەیفە کاغەز بۆ نوسینی ئەم جۆرە سەرف بکرێ. وا من بۆ ئێوە نوسینەکانی شوان تەحلیل ئەکەم:

1. من مەئموری مەنتوجاتی شەهربازار بوم نەقل کرام لە سەر عەریزەی خۆم و موافەقەتی موتەسەریفی لیوا لە بەر ئەوە کە موستەخدەم بوم و خەدەماتی تەقاعودی سوتاوم سەوز ببێتەوە ئیعادەی خەدەماتم لە دائیرەی نفوس کردوە.
2. گەنم لە لیواوە بۆ چوارتا رەوانە کراوە مەعلومە کە لە سەر دەرەجات بوە ئەگەر 100 تەن گەنمی دەرجە 1 زیاد بکات پێویستە 100 تەن گەنمی دەرەجە 2 و 3 کەم بکا.
3. 100 تەن گەنم زۆرە باوەر مەکەن لە سوچی مەخزەنی چوارتادا شارابێتەوە کە جارێک موفەتیش و دوجار مودەقیق وەزنی مەخزەنیان کردبێ لە زەمانی منا کە 8 مانگ بوە.
4. هیچ وەقتێ موافیقی تەعلیمات من لە مەوجودی زیاد و کەمی دەرەجاتی گەنمدم مەسئول نەبوم چونکە مەئمور مەخزەن و معاونی مەئمور مەخزەن موستەقیل بوە خۆیان وەریان گرتوە و دابەشیان کردوە تەنها من معامەلاتی حسابیەم تەماشا کردوە و قیمەتەکەم بەسندوق گەیاندوە.
5. ئەی ئەم میقدارە موهیمە قائیمقامی قەزا بەواریداتی فەزڵەی مەخزەن لە سجلی قەیدی کردبێت موحەقەق چاوی لێ نەپۆشیوە.
6. ئەگەر تەماشای یەومیەی شەهر بازار بکرێ هیچ وەقتێ 190 تەن گەنمی مەوجود نەبوە چ جای فەزلە.
7. شوان ئەڵێ: نازانم بۆچی لەم زیادە ناپرسێتەوە؟ منیش ئەڵێم: نازانم بۆچی؟ چونکە حەقیقەتەن لە 1200 کەس زیادی نەپرسیەوە کە ئیستیحقاقی 3 مانگی شەکر و کوتاڵیان بۆ وەرگیرا، وەکو تری بن گۆم رۆیی.

"برا کوردەکانم

"مەجەلەی ئازادی تازە پێ ئەگا. ئەمە ژمارە 5 یەتی. تازە بنچینەی بۆ دائەنرێ ئەگەر بەم ڕەنگە غایە جوێن دان بێ، درۆودەلەسە نوسین بێ، نازانم ئەم ئەساسە لەسەر چی و ئەم بینایە لەچی ئەبێ؟

"لاوەکان! کوردەکان!

"لازمە مەجەلەکەتان بۆ ئازادی هەوڵ بدات. ڕێگەی پێشکەوتن و سەرکەوتن بدۆزێتەوە چرای ڕوناکی هەڵکا. تاریکستانی شەوەزەنگ بەسەر میلەتی هەژاری کوردی داماودا نەهێنێ.

"قەومی کورد پیاوی خۆی ئەناسێ. تاریخی هەیە ئاشکرایە کێ خزمەتی کردوە کێ فیداکاری نوانـدوە کێ سنگی خۆی ناوە بە بەر گولەوە ون نەبوە.

"نازانم شوان لەو وەقتەدا لە کوێ بو؟ نوستبو ئەی کەرگەلە بزنی گوم بوبو ئەی....

"وەرن ڕێگەی ڕاست و پاک بدۆزنەوە. بەبێ سوچی تاوان درۆ و دەلەسە بۆ ئەمو ئـەو نەنوسـن. تـو یەزدان خێرخواهی کورد بن. هەر کوردبن بۆ ژیانی کورد بژین.

"برا لاوەکانی حیزبی شیوعی! لە مەجەلەکەتان دا گەلێ بەتانوپۆی هەندێ ئەشخاس دا چوبـون و نـاو بـەناو زۆر لە عەلەیهی کۆمەڵی هیوا - هیوی بون. مەوجودی ئەوانە لە 1250 لە کوردستانی عێـراق دا موتـەجاویز بـوە، لـە حاڵێکا کە 1250 کەس لە کوردەکانی عیراق جاسوس و خائین بن، جگـە لـە کـوردی خـاریج، تـەنها شـوان، پـۆلا، جوتیار و، خێوی مجەلەی ئازادی خزمەتی میلەتی کوردی داماوی قوربەسەر ئەکا؟ ئەم 1250 کەسە غـەیری ئەوانەیـە کە ئێوە لە مەجەلەکەتان دا جنێویان ئەدەنێ، ڕوم نایە هیچ بە ئێـوە بڵـێم، بـەزەییم بـە ئێـوە و کـوردا دێتـەوە. خـوا چارەی هەردولا بکا ئەگینا بە ئێوە چارەی کورد و بەکورد چارەی ئێوە ناکرێ. یەزدانی پاک ئاگاداری هەردولا بـێ. چونکە ئێوەش بێ گوناهن. خواردنی گوناهکاریەکە ئاخۆ بەرکێ ئەکەوێ زەمانی عیسا و موسا نییە.

**سەلام**

"ئێمە ئەمجارە بەناوی مجەلەی ئازادییەوە ئەو حیزبەی کە دەنگی هەیـە و ڕەنگـی نیـە، عالـەم ئـەزانێ حیزبێک بە جۆرێکی مەشروع و ڕێیەکی ڕاست تەشەکول بکا لە حکومەت دا ناو و قەیدی ئەبێ. ئـەم حیزبـە خۆی دەرناخا لە پەناوە ئەم هەمو جنێوە بەم عالەمە ئەدا، گوایە بەم مەسلەکە ناهەموارەوە پێشـەوایی قـەومێک یا دو قەوم ئەکا. ئەگەر ڕاست ئەکەن و ئینسانن بە ئاشکرا حیزب تەشکیل بکەن و پرۆغرامێک نەشـر بکـەن کە ئێمە ئەمەین و ئەمەمان ئەوێ، ئەوسا خەڵک تێ ئەفکرێ ئەگەر ئەمانە پیاوێکی بەناموس و ناسراوبن هەمو شوێنیان ئەکەون ئەگینا ئەمەیش بەدبەختی ئەو قەومەیە کە ئەمانە نەسەبی خویـانی ئەدەنـە پـاڵ. ئێمـە دوای هەرکەسێ کەوتین و گرتمانە کۆڵ ئەو ئاوزەنگی لێداین بۆ ڕوتکردنەوەی خەڵکی بۆ خۆی! وا ئێمە کە چەنـد ساڵێکە ڕاووروت و دار و فەلاقە و جەریمە و شەق و مادەمان نەماوە بۆچی بۆ واز لەخۆمان نـاییین، توخـوا پێمان بڵێن بۆ کێی بکەین؟ بەڵێ ئەگەر خوا کردبێتیە عادەت پارچەیـە لـە خاکێـک بەگیانـدار و بـێ گیانـەوە بگوێزێتەوە ئیقلیمێکی تر و ژێر تابیعی دەوڵەتێکی تر، با ئێمەیش بەرێتە کێوی قاف ئەگینا تا لە عێراقا بـین ئەبێ عەتابەی بەغداد بخوێنین و بانگمان (الله اکبر) ی خودێ مەزنە لە کولەکەی تەڕدا ئەبێ."

ژین ئیتر باسی ئازادی نەنوسیوە، ڕەنگە پێیان وت بێ خۆی لێ بێ دەنگ بکا.

بەڵگەیەک لە بەر دەسدا نیـە کـە ئـازادی چەنـد دانـەی لـێ چـاپ کـراوە و، چـۆن و لـە چەنـد جـێ بڵاوکراوەتـەوە. ڕۆژنامـەی (القاعـدة) لـە سـاڵانی 1947- 1949 دا، وەکـو حـەنا بـەتاتو لـە کتێبەکـەیدا خەملاندویەتی، 3 هەزار دانەی لێ چاپ کـراوە و، ژمارەیـەکی زۆر لـەوە زیـاتر خوێندویانەتـەوە. القاعـدة لـە سەرانسەری عیراقدا، هەروەها لە کوردستان دا، بڵاوکراوەتەوە. ئازادی کە هاوشانی القاعدة دەرچوە تەنیا بـۆ

کوردستان و بۆ خوێندەواری کورد بوە، لە بەر ئەوە پێویستی نەکردوە بەو ژمارە زۆرەی ڕۆژنامەیەکی عەرەبی چاپ بکرێ، بەڵام بێگومان ئەمیش لە چاو ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردیەکانی ئەو سەردەمەدا چەردەیەکی باشی لێ چاپ و بڵاوکراوەتەوە و بۆ خوێندنەوە دەستاو دەستی کردوە.

## فەهد و ڕێکخراوی وحدة النضال

لە نیسانی 1945 دا ڕێکخراوی (وحدة النضال) کە پێیان وابو بە گرتنی کۆنفرەنس و موئتەمەر و، دانانی پەیمانی نیشتمانی و پێڕەوی ناوخۆی حیزب، ئیتر داواکاریەکانیان هاتۆتە جێ و ناکۆکیەکانیان لە گەڵ حیزبەکەی فەهد بە لادا کەوتوە، نامەیان بۆ فەهد نارد و ئامادەیی خۆیان دەربڕی ڕێکخراوەکەی خۆیان هەڵبوەشێننەوە و بگەڕێنەوە ناو حیزب. فەهد وەری گرتنەوە. لقی کوردی (یەکێتی تێکۆشین) ئەیانویست بە جیا تێکەڵ ببن و لە سەرکردایەتی حیزبەکەدا ئەمانیش نوێنەریان هەبێ، فەهد ئامادە نەبو داواکەیان قبوڵ بکا چونکە حیزبە ئەسڵیەکەیان خۆی هەڵوەشاندبوەوە، ئەمانیش لقی ئەو بون بە هەڵوەشاوە دا ئەنران. ئەندامەکانی لقی کوردی یەکێتی تێکۆشین ئامادە نەبون وەکو تاک بچنە ناو حشع هوە، ڕێکخراوێکی نوێیان بە ناوی حیزبی شیوعی کوردستانەوە دامەزران و دەستیان کرد بە بڵاوکردنەوەی ئۆرگانەکەیان بە ناوی (شۆڕش) هوە.

ساڵی 1946 کە گفتوگۆ بۆ دروستکردنی پارتی دیمۆکراتی کورد دەستی پێ کرد زۆری ئەندامانی حیزبی شیوعی کوردستان (شۆڕش) پاش ئەوەی حیزبەکەی خۆیان هەڵوەشاندەوە، چونە ناو حیزبی شیوعی عیراقەوە. لە ناو ئەندامەکانی شۆڕش دا، خوێندەواری باش و ڕۆشنبیر و تێکۆشەری هۆشیار و ئازایان تێدا بو، بەمەیش لقی کوردیی حشع بە هێزتر بو.

دوای گیرانی فەهد و هاوکارەکانی (1947) ئەگەرچی لوجنەی مەرکەزی لە چەند ئەندامی نوێ ڕێکخرایەوە، بەڵام هەر فەهد لە ژوری زیندانەوە سەرکردایەتی حیزب و چالاکیەکانی ئەکرد. تەنانەت هەندێ لە وتارە گرنگەکانی (القاعدة) یش هەر ئەو ئەینوسین.

بەڵام حشع دوای گیرانی ڕابەرەکەی توشی تەنگوچەڵەمەیەکی گەورە بو بو. حیزبەکە هەرچەند خۆی ڕێک ئەخستەوە کەچی هەر توشی لێدان و داپڵۆسینی پۆلیسی عیراقی ئەبو. یەک لە دوای یەک سەرکردەکانی ئەگیران، لەوانە شەریفی مەلا عوسمانی سکرتێری لقی کوردی.

دوای بڕانەوەی دوەمین جەنگی جیهانی، جەنگێکی تر دەستی پێ کرد، کە لە مێژوی ناودەوڵەتاندا بە جەنگی سارد ناو ئەبرێ. دنیا دابەش بو بە سەر دو ئۆردوگای ناکۆکدا: ئۆردوگای سەرمایەداری یان وەکو پێیان ئەوت بلۆکی ئیمپریالیستی بە سەرۆکایەتی ولایەتە یەککرتوەکانی ئەمەریکا و، ئۆردوگای سۆسیالیستی یا وەکو پێیان ئەوت بلۆکی کۆمۆنیستی بە سەرۆکایەتی یەکێتیی سۆڤێت. حیزبی شیوعی عیراق، وەکو بەشێ لە ئەرکی ئینتەرناسیۆنالیستی (واجیبی ئومەمی) خۆی، پشتیوانی لە یەکێتیی سۆڤێت و دژایەتی بلۆکی ئیمپریالیستی، کرد بو بە فرمانی سەرەکی خۆی. ئەوەیش لە هەمو ڕۆژنامە و بڵاوکراوەکانیدا ڕەنگی ئەدایەوە.

عیراق کە بە ناو هاوپەیمانی بریتانیا و، بە ڕاستی لە پاشکۆیدا بو، ڕێگەی بە چالاکی شیوعی نەئەدا. بە پێی قانونی عیراقی بیروباوەڕی کۆمۆنیزم و چالاکی کۆمۆنیستی قەدەغە بو. هەر کەس بەم تۆمەتە بگیرایە، بە گوێرەی ئەم مادە قانونیە سزا ئەدرا:

"ذيل قانون العقوبات البغدادي الرقم 51 لسنة 1938

"المادة الاولى: يعاقب بالاشغال الشاقة او الحبس مدة لاتزيد على سبع سنين او بالغرامة او بهما كل من حبذ او روج باحدى وسائل النشر المنصوص عليها في المادة 78 من هذا القانون ايا من المذاهب الاشتراكية

البلشفية (الشيوعية) والفوضويه والاباحية وما يماثلها التي ترمي الى تغيير نظـام الحكـم والمبـاديء والاوضـاع السياسية للهيئة الاجتماعية المصونة بالقانون الاساسي"

**وەسبەی کانون**

ساڵی 1948 لە بەغداد و لە هەندێ لـە شـارەکانی عیـراقدا جوڵانەوەیـەکی نـاڕەزایی فـراوان سـەری هەڵدا، بە تایبەتی دوای ئەوەی نیازی وەزارەتەکەی ساڵح جەبر سەبارەت بە بەستنی پەیمانێکی نوێ لـە گـەڵ بریتانیا دەرکەوت. لە مانگی کانونی دوەمەوە خۆپیشاندانی گەورە و فراوان دەستی پێ کرد. هـەمو حیـزب و ڕێکخراوە نیشتمانیەکان، لە وانە پارتی دیمۆکراتی کورد، بەشدار بون. خۆپیشاندەران داوای ئازادیی سیاسی و چاکردنی گوزەرانی چینە هەژارەکانیان ئەکرد. دژی بەستنی پەیمانی عیراقی- بریتانی پۆرتسـماوس بـون. حیزبی شیوعی دەورێکی گرنگی هەبو لـە سـازدان و ڕێکخسـتن و ڕابـەریکردنی خۆپیشـاندانەکاندا. سـاڵح جەبر، سەرۆوەزیرانی عیراق، هەوڵیدا بە ڕێگەی توندوتیژی جوڵانەوەکە دابمرکێنێتەوە و، کۆتایی بـە شـەپۆلی خۆپیشاندان بهێنێ. لە زۆر شوێن پێکادان لە نێوان خۆپیشاندەران و پۆلیسدا قەوما. چەند کەسـێ کـوژران. ئەگەرچی لایەنگرانی حیزبە کۆنەپارێزەکان لە خۆپیشـاندان کشـانەوە بـەڵام وەسـبە (وثبـە)، وەکـو حیزبـی شیوعی ناوی نا بو، کۆتایی نەهات. ڕوخـانی وەزارەتـی سـاڵح جـەبر بوبـو بـە داواکاریـیەکی گشـتی. بـۆ هێمنکردنەوەی ناڕازیەکان و ئارامکردنەوەی هەلومەرجی سیاسی عیراق، عەبدولئیلاه، وەصـی عەرشـی عیراقـی، ساڵح جەبری لێ خست و، سەید محەمەد ئەل سەدری ڕاسپارد وەزارەتێکی نوێ پێک بهێنێ.

(بڕوانـە: 1. پۆسـتەی کـوردەواری، گـەلاوێژ، ژ 3، مـارتی 1948. ل 13- 2/23. د. کـەمال مەزهـەر ئەحمـەد، دەربارەی ڕاپەڕینە گەورەکەی کانونی دوەمی 1948 و شوێنی گەلی کورد تێیدا، کتێبـی: چەنـد لاپەڕەیـەک لـە مێـژووی گەلی کورد، بەشی یەکەم، بەغداد 1985. ل 199- 225)

وەزارەتی نوێ بواری ڕەخسان بۆ هەندێ ئازادیی گشـتی. ڕێگـە درا بـە چەنـد ڕۆژنامـە و گۆڤـاری سیاسی دەربچن، لە ناو ئەوانەدا گۆڤاری عەرەبی- کوردی (نزار). هەندێ لە گیراوەکان بەر دران و، هەندێ لـە حیزبە سیاسیە عیراقیەکان مۆڵەتی کاریان پێ درا. هەڵبژاردنی گشتی بۆ مەجلیسی نواب کرا. ژمارەیەکی کەم لە نوێنەرانی موعارەزە دەرچون.

ئەم بارودۆخە زۆری نەخایانـد. وەزارەتێکـی تـازە پێـک هـات. بـە بیـانوی شـەڕی فەلەسـتینەوە، ئەوەی وەزارەتی پێشو، لە ئەنجامی وەسبەی کانوندا، دابوی بە خەڵک وەزارەتی نـوێ بـە زیـادەوە لـێی وەرگرتنەوە. ئیجازەی قانونی لە حیزبەکان سەندەوە. زیاتر لە 100 ڕۆژنامە و گۆڤاری داخست، لـە نـاو ئەوانەدا نزار و گەلاوێژ. بە سەدان چالاکی سیاسی گرت و حەواڵەی دادگای عورفی کردن. بە سەختی لـە ڕێکخراوەکانی حیزبی شیوعی دا. هەندێ لە سەرکردە و ئەندامـەکانی پـارتی دیمـۆکراتی کـوردیش بـەر ئەم پەلامارە کەوتن.

چوارەمین کۆمیتەی ناوەندی (ئابی 1947- تشرینی یەکـەمی 1948) کـە فەهـد پێکـی هێنابـوەوە و، نـافیع یـونس (لـە دایکبـوی 1924 ی هـەولێر و پـارێزەر و ئەنـدامی پێشـوی شـۆڕش) یـەکێ لـە ئەندامـە چالاکـەکانی بـو، زۆری نەخایانـد بـەر لێـدان کـەوت و گیـرا. حشـع جەزرەبەیـەکی سـەختی خـوارد. زۆری ڕێکخراوە نهێنیەکانی گیران. چاپخانەکەی ئاشکرا بو. ڕۆژنامەکانی لە دەرچون کەوتن.

کۆمیتەیەکی ناوەندی کە دوای ئەو دامەزرا (تشرینی یەکەمی 1948- حوزەیرانی 1949) عەزیز ئەل حاج ڕێبەریی ئەکرد و، چەند ئەندامێکی کوردی تێدا بو لەوانە: هاشم عەبدوڵا ئەربیلی، ڕەفیق تۆفیق چـالاک،

مەهدی حەمید، حەمید عوسمان، ئەم کۆمیتەیەش گیرا. هەندێکیان بەرگەی ئەشکەنجەیان نەگرت، نەک هەر نهێنیەکانی حیزبیان هەمو درکاند، بەڵکو بونە هاوکاری پۆلیس بۆ ڕاونانی شیوعیەکان و ئەندامانی حیزبەکانی تر.

فەهد و هاورێکانی بە تاوانی (ڕێبەرایەتی حیزب لە ناو زیندانەوە) درانەوە بە دادگا. لە شوباتی 1949 دا فەهد و زەکی بەسیم و حسێن محەمەد ئەل شەبیبی حوکمی ئیعدام دران و، بەیانیی 14 و 15 ی شوبات هەر سێکیان بە دوای یەک دا لە 3 مەیدانی گشتی بەغداد، فەهد لە ساحەی مەتحەف لە کەرخ و، زەکی بەسیم لە بابەلشەرقی و حسێن شەبیبی لە بابەلموعەزەم هەڵواسران.

پاشماوەکانی حشع ئەوەی بەر دەستی پۆلیس نەکەوت بو پەرش و بڵاو بون. ناوەندێکیان نەمابو کۆیان بکاتەوە. هەندێکیان وازیان هێنا بو. هەندێکیان چونە دەرەوەی عیراق و، ئەوانەی درێژەیان بە کاری نهێنی دا، بوبون بە چەند ڕێکخراوێکی جیاواز، هەر یەکەیان بە جیا کاری ئەکرد.

لەو بارە نالەبارەدا بەهادین نوری (باسم، لە دایکبوی 1927 ی گوندی تەکیەی قەرەداخی سلێمانی)، کە بەرپرسی ناوچەی سلێمانی بو، کاروباری هەمو حیزبی گرتە دەست و، سەر لە نوێ ڕێکی خستەوە (حوزەیرانی 1949 - نیسانی 1953). ئەوە یەکەم جار بو کوردێک سکرتاریەتی حیزبی شیوعی بگرێتە دەس. حشع داوودەزگای چاپی نەما بو، ژ1 ی ساڵی 8 ی شوباتی 1950 ی (القاعدة)، کە زمانی حیزبەکەیان بو، بە دەسخەت نوسیوە. دواتر کە تایپ و ڕۆنیۆیان پەیدا کردوە، ئەوسا بە ڕۆنیۆ چاپیان کردوە.

لە بڵاوکراوە کوردیەکانی ئەم قۆناغە بەیانێکمان لە بەردەس دایە کە لە 21 ی ئابی 1951 دا لە چاپخانەی قاعدە دەرچوە بە ناونیشانی (یەکگرە ئەی جەماهیری میللەت بۆ تێکۆشان زدی پیلانی یەکگرتنی عیراق و ئوردون، وە لە پێناوی ڕوخاندنی حکومەتی نوری سەعید و دەرکردنی ئیستیعمارچیەکان لە وڵاتەکەمان، وە لە پێناوی ئاسایش و نان و سەربەستی و ئازادیدا).

**ئازادیی سەردەمی بەهادین نوری (باسم)**

بە پێی ژ22 ی ساڵی 10 ی کۆتایی ئابی 1952 ی (القاعدة)، لە ئابی هەمان ساڵدا ئازادی کەوتۆتەوە دەرچون.

ژ4 ی ساڵی 8 ی سەرەتای تشرینی دوەمی 1952ی ئازادی سەردەمی باسم 6 لاپەڕەی فولسکابە بە تایپ و ڕۆنیۆ چاپ کراوە. لە سەروی ناوەکەدا هەمان ئامانج و دروشمی ژ5 ی تشرینی سانی 1945 دوبارە کراوەتەوە.

لە ناوچەوان و لاجانگی چەپی ڕۆژنامەکەدا دروشمەکانی ئەو ڕۆژگارەی حشع نوسراوە:

"ئەی جەماهیری میللەتەکەمان یەک بگرە لە جەبهەیەکی نیشتمانی دا لە ڕێگەی:

ئاسایش. ڕوخاندنی حوکمی دیکتاتۆری. بەتاڵکردنەوەی پەیمانی 930 وە دەرچونی لەشکری ئینگلیزەکان. گۆڕکردنی مەشروعی دیفاع کردن لە ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست وە ضدی کردنی وڵاتەکەمان بە بناوانێکی جەنگی بۆ ئیستعماریەکان. بەتاڵکردنەوەی ئیمتیازاتی شەریکەتە ئیستعماریەکان وە دەست بەسەرداگرتنی مومتەلەکات و تەئمیم کردنیان. بەردانی سەربەستیە دیموکراتیەکان و بەردانی حەپسە ئازادیخوازەکان. زۆرکردنی ئیشوکار بۆ بێئیشەکان و دابەشکردنی زەویوزاری ئەمیری و دەرەبەگ و مەلاکە گەورەکان بەسەر فەلاحەکاندا. حەلکردنی موشکیلەی توتن لە شیمالدا.

"بژی تێکۆشان و برایەتی کورد و عەرەب لەپێناوی ئازادکردنی عیراق و حەقی تەقریری مەصیری کوردا".

## چەند بڕیارێکی لوجنەی فەرعی کوردیی حشع

بابەتی سەرەکی ئەم ژمارەیە بریتیە لە: "چەند بڕیارێکی لوجنەی فەرعی کوردی حیزبی شیوعی عیراق کە لە کۆبونەوەی 19 ی مانگی تشرینی یەکەمی‌دا دەری کردوە"

"لوجنەی فەرعی کوردی حیزبی شیوعی عیراق، لە مانگی تشرینی یەکەمی 952 دا کۆبووەوە وە ئەندامێکی لوجنەی مەرکەزی حیزبیش، کە لە لایەن لوجنەی مەرکەزی‌یەوە نێررا بو، ئیشتیراکی کۆبونەوەکەی کرد، وە باسی ئەم نوقتانە کرا کە لە جەدوەلی ئیشوکاری کۆبونەوەکەدا هاتوە وە گفتوگۆیان لە سەر کرا، ئەوانیش ئەم نوقتانەی خوارەوەن:

1. نیشاتی فەرع لە تێکۆشاندا لەپێناوی ئاسایش دا.
2. نیشاتی حیزبی لەناو هەمو بەشێکی جەماهیردا، کرێکارانی شەریکەی نەوتی کەرکوک و هەمو کرێکارانی تر، فەلاحەکان، ناو قوتابیەکان، موسەقەفەکان، کاسب و صەنعەتکار و بازرگانە بچوکەکان، عەسکەرەکان، ئافرەتەکان...هتد.
3. نیشات و پێکهێنانی ئیشوکار لە تێکۆشاندا زدی ئینعیزالییەت.
4. مەسئەلەی فەلاحەکان و دەرسکردنی مەشاکیلیان، نیشات لەناویان دا، مەوقیف و شیعارات بەرامبەریان.
5. موشکیلەی کادر و هەندێ مەشاکیلی تری تەنزیمی.
6. نیشات دەربارەی مونەزەماتە دیموکراتیە غەیرە حیزبیەکان (گەنجان، قوتابیان، کرێکاران...هتد)
7. مەسئەلەی کوردی و مەوقیفی حیزب دەربارەی ئەو مەسئەلەیە.
8. مەوقیفی حیزب دەربارەی پاشماوەی پارتیەکان، وە دەربارەی تەیاراتی ئینتیهازی.
9. نیشاتی ئەمریکاییەکان و نۆکەرەکانیان لەپێناوی مەشروعی سەربەخۆیی کوردستان، وە مەوقیفی حیزب دەربارەی ئەوە.
10. موشکیلەی توتن و ئینحیصار.
11. مەسئەلەی بڵاوکردنەوە و تەرجومە بە زوبانی کوردی و تورکی و غەیری ئەمانە".

### "حەوتەم، مەسئەلەی کوردی و مەوقیفی حیزب دەربارەی ئەم مەسئەلەیە:

"حیزب ئیعتیراف ئەکات بە حەقی تەقریری مەصیر، بە حەقی جیابونەوەوە بۆ میللەتی کورد، کە ئەمە حەقێکی تەبیعیە بۆ میللەتی کورد کە قەومیەتێکی برایانە پێک ئەهێنێت، لە تێکۆشان دا زدی ئیستیعمار، لە پێناوی ئاسایش و سەربەخۆیی و دیمۆکراتیەت دا. بەڵام حیزبەکەمان ئەبینێت کە حەقی تەقریری مەصیر بە حەقی جیابونەوەوە، بە میللەتی کورد نادرێت وە هەرگیز جێبەجێ ناکرێت تەنیا لە ژێر سایەی حوکمی چینی کرێکاران دا نەبێت. جا مەوقیفی حیزبەکەمان بەرامبەر مەسئەلەی کوردی ئێستا بەمجۆرەیە: ئیعتیراف کردن بە بێ چەنوچون بە حەقی تەقریری مەصیر، بە حەقی جیابونەوەوە، بۆ میللەتی کورد، وە تێکۆشان لەم وەختەی ئیستادا بۆ بە هێزکردنی گیانی برایەتی و یەکێتی لە تێکۆشان دا لە بەینی میللەتی کورد و عەرەب و هەمو قەومیەتە پچوکەکانی تر لە نیشتمانەکەمان دا، بۆ تێکۆشانێکی یەکگرتو لە زدی ئیستیعمار و کۆنەپەرستی عیراق لە عەرەب و کوردەکان و غەیری ئەوان، لە ڕێگەی ئاسایش و سەربەخۆیی و دیمۆکراتیەت دا وە لە ڕێگەی خوڵقاندنی ئەو زروفەدا کە میللەتی کورد حەقی تەقریری مەصیری خۆی تیا وەرئەگرێت، بە حەقی جیابونەوەوە.

"وە حیزبەکەمان بێ وچان تێ ئەکۆشێت لە زدی هەمو بیروباوەڕێـک یـا هـەمو مەشـروعێک کـە نیـازی سەربەخۆیی کوردستانە، لەم رۆژەدا لە ژێر سایەی سەیتەرەتی ئیستعماردا، وە حیزبەکەمان ئەم جۆرە بیروبـاوەڕە بە شتێک دائەنێت کە لە زدی مەصڵەحەتی میللـەتی کـورد و هـەمو عیراقیـە بەشـەرەفەکانە. وە هـەر ئیتسـعیمارە ئەمریکیەکانن کە ئاوی ئەم بیروباوەڕە ئەدەن لەپێناوی ئامانجە پـەرە پێسـەندنەکانی خۆیانـدا، وە بـۆ پچڕینـی کوردستانی عێراق لە ژێر چنگی ئیستیعماری ئینگلیزی وە بـۆ ئـەوەی ئیحتیکـاراتی ئـەمریکی دەسـت بکێشـێت بەسەر نەوتە زۆرەکەی کوردسـتانی عیراقـدا. وە بۆرجوازیـەکان و هەنـدێک لـە دەرەبەگـە کوردەکـان، ئەمانـەش لایەنگری سەربەخۆیی کوردستان ئەکەن وە ئیشی لـە پێنـاودا ئەکـەن لـەژێر سـایەی سـەیتەرەتی ئیسـتیعماردا، ئەمانە دوای ئامانجی چینایەتی و شەخسی خۆیان کەوتون بۆ چەوساندنەوە، وە ئەمانە تـەنیا سـەربەخۆییان بـۆ خۆیان ئەوێت، نەک بۆ میلەتی کورد، نەک بۆ کرێکار و فەلاح و جەماهیری کورد".

"**هەشتەم، مەوقیفی حیزب دەربارەی پاشماوەی جەماعەتی پارتەکان و دەربارەی تەیاراتی ئینتیهازی:**

کۆمەڵی (پارتی دیموکراتی کورد) بو بەچەند بەشێکەوە، وە پاشماوەکانی لـەرابوردو زیـاتر لـە جـەماهیر دور کەوتونەتەوە، وە ئەمەش ئەو دوارۆژە بو کە بۆ پارتی دیمۆکراتی کورد دانرابـو، کـە نەتیجەیـەکی حـەتمی رەوشـتی سیاسیی و ئینتیهازیانەی بو وە لە بەر سفەتی تەخریبی سـەرکردەکەی بـو (سـەرکردەی حـەمزە عەبـدوڵا). وە هـەمو عەناسرە بەشەرەفەکانی قەواعیدی پارتی دیموکراتی کورد بە رەوشتی سەرکردەکەی خۆیان زانی جا بۆیـە بـەجێیان هێشت و رەوشتی ئینتیهازی و تەخریبییان بەجێ هێشت. وە لێرەدا هەندێک عەناسیری ئینتیهازی هەیە لە گەورەکانی پارت دەستبەرداری تاقمەکەی (حەمزە) بون نەک لە دڵسۆزیەکی راسـتەوە بـەڵکو لـە بـەر دەرکـەوتنی ئینتیهازیـەت و خیانەتی حەمزە وە لە بەر ئەوەی کە جەماهیر بەتاقمەکەی حەمزەو ئەوانەی لە گەڵین هەڵناخەڵەتێن.

حزبەکەمان لە زدی ئەو ئینتیهازی و جاسوسانە ئەوەستێت، ئەوانەی کە لە گەورەکانی (پـارت) بـون وەکـو حەمزە عەبدوڵا و عەونی یوسف، وەلە زدی مناوەراتەکانیان ئەوەستێت بۆخوڵقاندنی ئیتیسالات بـە جـەماهیرەوە وە بۆ هەڵخەڵەتاندنی هیچ ئینسانێکی کوردو بە شەرەف، وە لە عەینی وەقتا حیزبەکەمان دەسـتی یارمـەتی درێـژ ئەکات بۆ هەمو ئەو نیشتمانپەروەر و دیموکراتیە بەشەرەفانەی کە لە رابردودا لە (پـارت) دا بـون وە بـە تـەواوی بەجێیان هێشتوە یا ئەوانەی ئێستاش لە پاشماوەکانی جەماعەتی پارتن، بانگیان ئەکات کە زیاتر دوربکەونەوە لە جاسوسەکان و بڵاوکەرەوەی بیروباوەڕی شۆڤینی، وە بۆ یەکگرتن لە گەڵ شیوعی و هـەمو تێکۆشـەرەکاندا زدی ئیستیعمار لە جەبهەیەکی نیشتمانیدا لەپێناوی ئاسایش و داخوازیەکانی میللەتەکەماندا".

"**نۆهەم، نەشاتی ئەمریکیەکان و نۆکەرەکانیان لە پێناوی مەشروعی سـەربەخۆیی کوردسـتان، وە مـەوقیفی حیزب دەربارەی ئەوە:**

لە سەرەوە دەرمان خست کە ئیستیعماری ئـەمریکی- بـەنیازی پـەرە پـێ سـەندنی دەسـتەڵاتی- لـە گـەڵ هەندێک لە دەرەبەگ و بۆرجوازیە کوردەکـان بیروبـاوەڕی "سـەربەخۆیی کوردسـتان" ئـاو ئـەدەن و ئیشـی لـە پێناودا ئەکەن لە ژێر سایەی سەیتەرەتی ئیسـتیعمارا وە ئـەم "سـەربەخۆییەش" ئەگـەر پێـک هـات ئیسـتیعماری ئەمریکی پێمان ئەبەخشێت کە ئەیەوێت ئیستیعماری ئینگلیزی شەریکی دەربکا لە هەمو شوێنێکدا- لەکوردستانی عراقیشدا- وە ئەیەوێت جێگەی ئەو بگرێتەوە. وەبـە شـێوەیەکی تایبـەتی هەنـدێک لەدەرەبەگـەکان گورجوگـۆڵی ئەنوێنن بە دوای ئەو نیازەدا (وەکو شێخ باباعەلی کوڕی شێخ مەحمود) ئەوانەی کـە ئەیانـەوێ بـبن بـە گـەورەی حکومەتێکی کوردی لە دەرەبەگـەکان لـەژێر چـاودێری ئیسـتیعماری ئەمریکیـدا، بـۆ ئـەوەی بتـوانن پارێزگـاری مەسڵەحەتی خۆیان بکەن وە زەویوزار و سەروەت و سامانی خۆیان زیاتر بکەن. حیزبەکەمان زۆر بەتونـدی تـێ

ئەکۆشێت لە زدی ئەم پیلانە کە سەری نەگرتوە و سەر ناگرێت، لەلایەکەوە لەبەر بەربەرەکانی میلەتی کورد وە لەلایەکی تریشەوە لەبەر ناکۆکی بەینی ئیستیعماریەکانی ئینگلیز و ئەمریکا وە پێویستە تەقدیرێکی راستی ئەم مناوەراتانە بکرێت، نە بە کەمکردنەوەی خەتورەتیان وە نەبە موبالەغە پێ کردنیان".

..."

### میساقی باسم (میثاق باسم)

باسم لە کانونی یەکەمی 1952 دا (میثاق) ێکی نوێی هێنابوە ئاراوە و، لە ئازاری 1953 دا حیزب کردبوی بە بەرنامەی خۆی. لەم بەڵگەیەدا کە بە (میثاق باسم) ناوی دەرکرد، ئاڵوگۆڕی بنەڕەتی لە میساقەکەی فەهد و بیروبۆچونەکانی‌دا کرا بو، لەوانە: لە باتی "نیزامێکی دیمۆکراتی" ی میساقی فەهد، دامەزراندنی "جمهوریەتێکی شەعبی دیمۆکراتی نوێنەرەوەی ویستی کرێکاران و جوتیاران و جەماوەری گەل" کرابوە ئامانجی سەرەکی. "هەڵوەشاندنەوەی پەیماننامە ئیستیعماریەکان" و "سەندنەوەی ئیمتیازات لە کۆمپانیە ئیستیعماریەکان" و "دەسبەسەراگرتنی زەوی و زاری دەرەبەگەکان و ئەرزەکانی ئەمیری و دابەشکردنی بە سەر جوتیاران دا" لە مادەکانی تری میساقی باسم بون.

سەبارەت بە مافی نەتەوەیی گەلی کوردیش، کە لە (میثاق فهد) ا وەکو کەمایەتی‌یەکی لە بابەتی ئاسوری و یەزیدی باسی کرا بو، مافی نەتەوەیی کوردی سەلماندبو لە سەر بنچینەی دانانان بە مافی ئازادی بڕیاردانی چارەنوس، بە مافی جیابونەوەیەوە لە عیراق.

### تەقینەوەی ناکۆکیەکان و هەڵتەکینی کۆمیتە ناوەندیەکەی باسم

ئەم ئاڵوگۆڕانە ناکۆکیەکانی ناو حیزبەکەیان تەقاندەوە. چەند پارچەیەکی لێ جیا بوەوە. ساڵی 1953 جەمال حەیدەری رێکخراوێکی شیوعی پێکەوە نا بە قسەی خۆیان بۆ دەرهێنان (انتشال) ی حشع لەو هەلومەرجەی تێ‌ی کەوت بو. بە زمانی عەرەبی (رایة الشغیلة) و بە زمانی کوردی (رێگا) ی دەرکرد. عەبدولرەحیم شەریف کە (حزب الوحدة الشیوعیة) ی هەبو ئەویش (النضال) ی دەر ئەکرد. ئەم 3 رێکخراوە هێرشی توندوتیژیان ئەکردە سەر یەکتری و، تۆمەتی جۆراوجۆریان ئەدایە پاڵ یەکتری.

پۆلیس ئەم کۆمیتەی ناوەندی‌یەیشی هەڵتەکاند. باسم و زۆری هاورێکانی گیران. کەریم ئەحمەد (نیسانی 1953- حوزەیرانی 1955) ماوەیەک کارەکانی گرتە دەست. بەڵام لە زیندانەوە حەمید عوسمان ئاڕاستەی ئەکرد. کە حەمید لە زیندان هەڵات، بو بە سکرتێری حیزب (حوزەیرانی 1954- حوزەیرانی 1955). بەیانەکانی بە ناوی خۆیەوە بە ئاشکرا ئیمزا ئەکرد.

حشع لەم قۆناغەدا کەوتەوە چالاکی‌یەکی فراوان. جگە لە رێکخستنی حیزبی، رێکخراوەکانی گەنجان و جوتیارانی ژیاندەوە و، ئۆرگان و بەیان و بڵاوکراوەکانیان پەرەی سەند.

### ئازادی‌ی سەردەمی کەریم ئەحمەد و حەمید عوسمان

ژ2 ی ساڵی 10 ی نیهایەتی مارتی 1954ی ئازادی کە بە تایپ و رۆنیو چاپ کراوە لە سەر ناوی رۆژنامەکەدا نوسیوێتی: (نیشتمانێکی ئازاد و میللەتێکی بەختیار) و لە ژێر ناوەکەیشی‌دا نوسیوێتی: (زمانی حزبی شیوعی عراق- لقی کورد. نرخی 20 فلسە)

لاپەڕەی یەکەمی دو ستونە. ستونی راستی وتارێکە لە ژێر سەردێڕی: (روی راستی حزبە شیوعیەکەمان) و ستونی چەپی لە ژێر سەردێڕی: (سڵاوی لوجنەی فەرعی کوردی بۆ لوجنەی مەکەزی حیزبەکەمان، بە بۆنەی یادی بیست ساڵەی دامەزراندنی حیزبە شیوعیەکەمان)

نیشتمانێکی آزاد و میللەتێکی بەختیار

# آزادی

زمانی حزبی شیوعی عراق ـ لقی کورد . نرخی ٢٠ فلسە
ژمارەی ٢ سالی ١٠ ، نیهایەتی مارتی ١٩٥٤ .

## رووی راستی حزبە شیوعیەکەمان

+ + + + + + +

دامەزرانی حزبە شیوعیە عراقیەکەمان ، وەك ئەمو
حزبێکی شیوعی تری دەستخواز ، سالی ٩٣٤ ، شتێك نەبوو
لە خۆیەوە بێ یا لە رێکەوتەوە هاتبێ ، بەڵکو انجامی
راستەوخۆی پێویستیەکانی جینی کرێکار و میللەتە
عراقیەکەمان بوو ، دوای ئەوەی کە دەرکەوت سەر
مایەدارەکان نەیانتوانی سەرکردایەتی شۆرشـ
تێکۆشانی نیشتمانی بکەن ، بە شێوەیەکی راستو دروست
بەرەو سەرکەوتنی دوایی . وە راستەوخۆ دوای شۆرشی
٩٢٠ ، کە آمانجەکانی خۆی جێبەجێ نەکرد ، جولانەوەی
میللەت زۆر پێویستی بە سەرکردەیەکی بەجەرگو تازە
بوو ، سەرکردەیەکی ئەوتۆ دوور بێ لە گیانی وازهێنانو
رێککەوتن لە گەڵ دوژمن ، گیانێکی شۆرشگێری لەوتوی
تیا بێت لە هەموو دەمێکدا بێ گوێ دانە هیچ کۆسپی
هەر لە سەر ئیشکردنو تێکۆشانی سەختی خۆی بڕوات ،
وە توانای سەرکردایەتی کردنی گەلی میللەتی هەبێ ، کە
ئەو سەرکردە بە جەرگو تازەیەش جینی کرێکار و حزبە
شیوعیەکەتی . تا بەم رەنگە لە ٣١ی مانگی مارتی ٩٣٤
حزبەکەمان دامەزرا ، لە تەرەدەستی سەرکردە مەزنو
کۆچ کردوومان ڕەفیقی فهد ـ ی ئەمرەوە دەستی
کرد بە ئیشکردنو تێکۆشان بەرامبەر استعماری بێگانەو
کۆنەپەرستی ناوخۆ ، بەپێی مصلحەتو حقوقی کرێکارو
گەلی میللەت ، وە بەکەمین رۆژنامەی خۆی "تێکۆشانی ـ
میللەت" دەرکرد ، بە نیازی دەرخستنو روونکردنەوەی
آمانجەکانی لە تێکۆشانا ، بو ئەوەی گەلی میللەت بە
رێگای راستی جولانەوەدا بەرێ لە ضدی دوژمنەکانی ،
وە شعارو سیاسەتی خۆی بلاو بکاتەوە لە ناو میللەتا ،
وە خەتەری فاشستیەتو شەڕی دەرخست . بەلام
لە بەر ئەوەی لەو سەردەمەدا جولانەوەو رێکوپێکی

ـ بڕوانە لاپەڕە ـ ٢ ـ

## سڵاوی لجنەی فرعی کوردی
## بو لجنەی مەرکەزی حزبەکەمان ، بە بونەی یادی
## بیست سالەی دامەزراندنی حزبە شیوعیەکەمان

. . . . . . . . . . . . . . .

هاوڕێ یانی خۆشەویست ، لە ئەندامانی لجنەی مەرکەزی حزبەکەمان
زۆر شادمانین بەوەی پیرۆزبایی و سڵاوی بەگەرمی خۆمانتان بۆ
بنێرین ، وە پێشکەشی بە هەموو ئەندامانو لایەنگرو برادەرانی
حزبی بکەین ، بە بونەی یادی بیست سالەی دامەزراندنی حزبە
شیوعیە نەبەزەکەمان .

بە راستی دامەزراندنی حزبەکەمان ، سالی ١٩٣٤ ، لە سەردەستی
داوەری ـ فهد ـ ی بەرزو کۆچ کردوو ، دانانی بەردی بناغەی
مسألەی آزاد بوونی میللەتو ولاتەکەمان بوو لە ژێر چەپۆکی
استعمار و نوکەرە خائنەکان . چونکە دامەزراندنی حزبێکی سیاسی
تێکۆشەر بو جینی کرێکار و میللەتە زەحمەتکێشەکەمان ، حزبێکی
ئەوتو لە سەر رۆشنایی مارکسیەتی ـ لەنینی بڕوات ، وە دڵسۆزانە
بەپێی داوا کردنی مسألەی تێکۆشانی میللەتو جولانەوەی نیشتمانیە
آزاد بوونەکەی بڕوات بە رێگاوە ، وە سەرکردەی جولانەوەی نیشتمانی
میللەت بێ ، بەبێ ئەوەی لە قوربانی گەورە گەورە بسلەمێتەوە ،
لە ضدی استعمارو کۆنەپەرستی خائنی ناوخۆ ، لە هەموو دەمێکدا
مانای ئەوە بە مسألەی میللەتەکەمان ، بە شێوەیەکی راست ،
بەرەو سەرکەوتنی دوایی ئەچێت ، مانای ئەوەیە دەست خرایە
سەر هەڵدەی ئەرەگەورەو پێویستی زنجیری واجباتی سەرشان ،
بەرامبەر میللەتەکەمانو بەگشتی کرێکاران لە دنیادا .

بەلی دامەزراندنی حزبەکەمان " سەرەتای دوایی هێنانی استعمار
بوو " ، وە دەرکەوت بە وردی ئەمانای لاپەرەکانی مێژوی حزبە
کەمان بکات ، وە لە رێگای تێکۆشانە پیرۆزەکەی ورد ببێتەوە ،
زۆر چاک ئەزانی دامەزراندنی ئەو جۆرە حزبە چەند شتێکی
پێویستو بەکەڵك بوو بو سەرکردایەتی تێکۆشانی راستی شۆرشگێری
جینی کرێکارو گەلی میللەتە عراقیە تێکۆشەرەکەمان .

ناوو تێکۆشانی هاوڕێ ـ فهد ـ ی کۆچ کردووش بە ستراوەتەوە
بە قارەمانێتیو تێکۆشانی سەختی حزبەکەمانەوە . چونکە ئەو رابەر
بوو ، لە سەر بناغەی مارکسیەتی ـ لەنینی ، رێگای راستی
تێکۆشانی گرتبوو ، وە ئەو شعارە شۆرشگێریانەی بەرز کردەوە ، کە
لە بناوەرەگەی مصلحەتو پێویستیەکانی مسألەی راستی نیشتمانیمان
هاتبوونە دەری . وە هەر ئەوبوو بە راستی یاسەوانی دڵسۆز و
سەرکردەی خۆشەویستی حزبەکەمان ، وە هوشیارانە وەستا بوو
بەرامبەر " بە زنو رەزنو گیرەشێوێنی أشتهارەکان " لە ریزی حزبو
دەرەوەی ، تا لە مەیدانی سەربەرزیو شەرەفدا ، ژیانی خۆی
تایە پێناوی تێکۆشان ، لە گەڵ دوو هاوڕێکەی ، حازم و صارم ،
وە بوونە نمونەی لێبوردنو خۆبەخت کردن لە رێگای میللەتو
آمانجە پیرۆزەکانیا ، کە آسایشو سەربەخۆیی نیشتمانیو دیموکراتیین .

ئەو رێگایەی حزبەکەمانی پیا رۆیشتووە ، لە ماوەی ئەم بیست
سالەیدا ، لە هەموو جۆرە تێکۆشانێکی قارەمانانەی لە ضدی

ـ بڕوانە لاپەڕە ـ ٣ ـ

ئەم ژمارەیە وتارێکی درێژی تێدایە بە قەڵەمی (م) بە ناونیشانی (حیزبەکەمان و مەسئەلەی کورد) بۆ تێگەیشتن لە بیروبۆچونی حشع سەبارەت بە مەسەلەی کورد و هەڵوێستی لە ڕێکخراوە سیاسی‌یە کوردیەکان خوێندنەوەی ئەم وتارە پێویستە:

"لێ وردبونەوەیەک لە سەر ڕۆشنایی بیروباوەڕی مارکسیەتی لینینی، بە چاکی بۆمان رون دەکاتەوە کە مەسئەلەی کورد وەک هەموو مەسئەلەیەکی تری کۆمەڵایەتی، ئەگەر بونی، وەک بوە، پێگەیشتن و برانەوەیشی هەیە. هەر بۆیەش دەبینین لە ماوەی سەدەیەک دا (قەرن) چەند گۆڕینێکی گەورەی بەسەر هاتوە.

"مەسئەلەی کورد کەوتە رو بەشێوەی (مەسئەلەیەکی قەومی) بە پێگەیشتنی بۆرجوازیەتی کورد شان بە شانی بۆرجوازیەتی تورک لە کاتێکدا کە کوردەکان، ئەو بەشانەی نەبێ کە لە ژێر دەستەڵاتی ئێران و روسیای قەیسەری‌دا بون، هەمو لە کوردستانی عوسمانیا لە ژیانێکی دەرەبەگی ژێر سایەی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی دەرەبەگیدا ئەژیان، بێ بەش لە هەمو جۆرە ئاوات و هەقێکی قەومی، بە چاوێکی تا بڵێی سوک و بێ نرخ، وەک میللەتە ژێر دەستەکانی تر، لە لایەن عوسمانیەکانەوە تەماشایان ئەکرا، بەم پێیە مەسئەلەی کوردیش لەو سەردەمەدا، یانی پێش شۆڕشە مەزنەکەی ئۆکتۆبەر، بەشێک بو لە جوڵانەوەی دیموکراتی لە دنیادا، یانی بەسترا بوەوە بە سەرکەوتنی بە سەر ئیمپراتۆریەتە دەرەبەگیەکەی عوسمانی‌دا... هەر بۆیەش جوڵانەوەی حیزبی بۆرجوازی بۆرجوازیەتی تورک (اتحاد وترقی) لەو سەردەمەدا ئەیویست وڵات بەپێی دەستورێکی دیموکراتی بروات بەڕێگاوە و، سنورێ بۆ دەستەڵاتی دەرەبەگی دابنرێت، لایەنگر و یارمەتی هەمو میللەتە ژێر دەستەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی بۆ خۆی وەرگرت بو، هەروەها کوردەکانیش لە شوێنیان ئەرۆیشتن بە سەرکردەیەتی بەدرخانیەکان، بۆئەوەی ئەنجامی ئەو تێکۆشانە تێکڕاییە لە حوکمی ستەمکارانەی سوڵتان و دەرەبەگیەوە بۆ دەستورێکی دیموکراتیانە، چەند حقوقێکی قەومی‌یان چنگ بکەوێ بۆ کوردستان تێکڕا لەژێر سایەی مەرکەزی. بەڵام خیانەتی حیزبی (اتحاد وترقی) حوکم و دەستەڵاتی کەوتە دەست، وە بەجێ نەهێنانی بەڵێن و پەیمانەکانی کە بەو میللەتانەی دابو، ئەمانە بونە هۆی بڕوا نەمان بە تێکۆشانی تێکڕایی، وە هەمو یەکێک لەو میللەتانە بۆ خۆی کەوتە تێکۆشانیش کەوتنە دانانی کۆمەڵە و ڕێکخستنی جوڵانەوە، ئەمجارە بۆ (لامەرکەزی بۆ کوردستان تێکڕا) وە گەلی میللەتی عەرەبیش لایەنگری و عەتفی دەرئەبڕی بەرامبەر حقوق و ئاواتەکانیان، وەبەچەند ڕاپەڕین و شۆڕشێک هەڵسان، بەتایبەتی لەکوردستانی تورکیا، بەڵام بێ هێزی سەرکردەییان کە لە بێ هێزی بۆرجوازیەتی کوردەوە هاتبو نەیان ئەتوانی سەرکەوتنی تەواو جێبەجێ بکەن، بەم ڕەنگە جوڵانەوە دەوامی کرد تا شەڕی یەکەم (سەفەربەلک).

"بەڵام مەسئەلەی کورد شێوەی (مەسئەلەیەکی بەینی دەوڵەتانی) وەرگرت، لەکاتی شەڕ و لە دوای شەڕەکە، بە تایبەتی پاش سەرکەوتنی شۆڕشە مەزنەکەی ئۆکتۆبەر، ئەو شۆڕشە گەورەیەی دەستەڵاتی سەرمایەدار و دەرەبەگەکانی گۆڕبەگۆڕ کرد، وە چینی کرێکار و فەلاحە هەژارەکانی خستە سەر حوکم بە سەرکردەی حیزبە شیوعیە مەزنەکەیان وە دەوڵەتی یەکێتی شورەوی دامەزراند، دوای ئەوە دەوڵەتە ئیستعماریەکان، بەتایبەتی بەریتانیا و فەرەنسا و ئیتالیا و ئەمەریکا، پاش سەرکەوتنیان لە شەڕ، بەپێی پیلانەکەی (پەیمانی سایکس بیکۆ) ئیمپراتۆریەتی عوسمانی‌یان بە سەر خۆیاندا دابەش کرد، وە هەستیان بەوە کرد کە گەورەترین دوشمن و خەتەر بۆ سەر مەصلەحەتی ئیستعماریان بونی یەکێتی شورەوی‌یە لە نزیک ئەم ناوچەیە، بۆیە کوردستانیان بە ناوچەیەکی گرنگ و ئەهمیەت کەوتە بەرچاو تا بیکەن بە بنکەو بناوانی شەڕ بۆ دەستدرێژکردن و هەڵکوتانە سەر دەوڵەتی کرێکارو فەلاح و گەورەترین پشتیوانی بەسۆزی

ملیۆنەها ڕەنج خوراوانی دنیا، یەکێتی شورەوی. پیلانە پیسەکەی (سیڤەر) کە خەریک بوون کوردستانی مەزن پێک بێنێ و بڕیاریشیان بە (سەربەخۆیی کوردستان) دا ئـەم نیـازە شـوم و بۆگەنـەی ئیسـتعماریەکانی زۆر چاک بە دەرخست. بەڵام ئەوەندەی پێ نەچوو ئەم پیلانە لە موئتەمەری (لۆزان) گۆڕ کرا، پاش ئەوەی یەکێتی شورەویش بەربەرەکانی کرد.

"گەورەترین گۆڕانێ کە بەسەر ئەم مەسـئەلەیەدا هـات ئـەوە بـوو کـە دوای سـەرکەوتنی شۆڕشـی ئۆکتۆبەر و بڕانەوەی شەڕی یەکەم، مەسئەلەی کورد بـەو شـێوەیەی باسـمان کـرد لـە جەوهـەرو ڕەنگـدا گۆڕرا.

"جارێ ئەو مەسئەلەیە، وەک هەموو جوڵانەوەیـەکی قـەومی (نیشـتمانی) تـر، ئەبووایـە لـەژێر سـایەی نیزامی دیموکراتی بۆرجوازیا چار بکرێ پێش شۆڕشی ئۆکتۆبەر، بەڵام دوای ئـەو شۆڕشـە ئـەم مەسـئەلەیە، مەسئەلەی کورد، بوو بە بەشێک لە جوڵانەوەو مەسئەلەی سەرکەوتنی ئیشـتراکیەت، سـەرکەوتنی دکتاتۆریـەتی کرێکاران. ئەمڕو دیموکراتی میللی، یانی مەسئەلەی قەومی لە هیچ وڵاتێک لە بنچینەوە بە پوختی چـار نـاکرێ لـەژێر سـایەی دیمـوکراتی بۆرجـوازی و دەسـەڵاتی ئـەوانا، بـەڵکو لـەژێر سـایەو دەسـتەڵاتی دکتاتۆریـەتی کرێکـاران و حـوکمی دیمـوکراتی میللیـدا چـار ئـەکرێ. ئەمـە ڕوویـەکی مەسـەلەکەیە، ڕووی ئەساسـی و جەوهەریەتی. ڕووەکەی تری ئەوەیە دوای بڕانەوەی شەڕی یەکەم بەو ڕەنگەی کە بـووە، بـەپێی ئـەو سـنورە ئیستعماریانەی دوای شەڕ لەم ناوچەیـەدا نـەخش کـرا، کوردسـتانی عوسـمانیش کـرا بـە چەنـد بەشـێکەوە، بەشێکی کەوتە سەر عێراق و بەشێکی سەر سوریا و بەشی گـەورەی لـە تورکیـا مایـەوە، بـەم ڕەنگـە ژیـانی میللەتی کورد دوای دابەشکردنی بەسەر ئەو وڵاتانەدا، بەسترایەوە بە ژیانی میللەتانی ئەو شـوێنانەوە، ژیـانی سیاسی و ئابوری و کۆمەڵایەتی... هتد. و تەنیا ئەو بەشە بچوکەی کەلە ڕوسـیای قەیسـەری بـوو، ئـەنجامی شۆڕشی ئۆکتۆبەر بە تەواوی ئازاد بوو وە هەموو هەقێکی قەومی خۆی وەرگرت، یانی مەسئەلەی لە بنەڕەتەوە چارکرا. بەشەکانی تری میللەتی کورد لە کوردستانی تورکیا و ئێران و عێراق و سوریا هەمیشـە لـە ژیـانێکی پڕ لە چەوسانەوەو بەشخوراوی و کەساسیدا ژیاون و ئەژین، شان بەشانی میللەتە بەشخوراوە چەوسـاوەکانی ئەم وڵاتانە، لەژێر چەپۆکی حوکمو دەستەڵاتی ئیستعمارو دەرەبەگی و کۆنەپەرستی، ئەمە بێجگە لـەوە کـە لـە حقوقی قەومی تایبەتی خۆیان بێ بەشن، ئەنجامی ئەو سیاسـەتە ئیسـتعماریە جیاوازیکـاری کـە تـۆزی دڵـی قەومێکی گەورە ڕائەگرێ لەسەر حسابی قەومە بچوکەکان، بۆئەوەی گیـانی دووبـەرەکی و شـۆڤینیـیان لـەناوا بەهێز بکات، وە قەومە گەورەکان بە دوژمنی قەومە بچوکەکان بداتە قەڵەم. لەبەرئەوە مەسـئەلەی هـەر بەشـێک لەو بەشانەی میللەتی کورد بەسترایەوە بە مەسئەلەی گشتی میللەتانی ئەو وڵاتانـەوە، بـە مەسـئەلەی نیشـتمانی ئەو شوێنانە، مەسئەلەی ئەو میللەتانەی لە گەڵیاندا بەژیانێکی تیکراری ئەژین. چونکە ئەم وڵاتانە لەبەرئـەوەی ژێر دەستن یا نیوە ژێر دەستی ئیستعمارن مەسئەلەی نیشتمانیـیان چار ناکرێـت بەتـەواوی، بـە ئـازادبوونی یـەکجاری، تـا لەدەسـت ئیسـتعمارو کۆنەپەرسـتی ڕزگاریـان نـەبێ، بـەجیا بوونـەوەی تـەواو لـە جمکرگـای ئیستعماری عالەمی و دامەزراندنی حـوکمی دیمـوکراتی میللـی... بـەم ڕەنگـە بۆمـان سـاغ بـووەوە کـە چـۆن مەسئەلەی کورد لە ڕەنگ و جەوهەردا گۆڕرا. جوڵانەوە بەناوی (کوردستانی مەزن) بو بە شـتێکی بـێ کـەڵک بۆ گەلی کورد چونکە جوڵانەوەی هەر وڵاتێک لەم وڵاتانە تورکیا و ئێران و عێراق و سوریا شێوەی تایبـەتی خۆی وەرگرت، بەپێی وەزعو گۆڕین و پێشکەوتنی خۆی، بەپێی ئامانجو داخوازیەکانیان لەم قۆناغە تاریخیەی ئێستایاندا.

"ئەگەر لەگۆشەی مەصلەحەتی ڕەنج خوراوانی میللەتی کوردەوە لە عێراق تەماشـای ئـەم مەسـئەلەیە بکرایە ئەبوایە لە زۆر دەمێکەوە ئاڵای تێکۆشـانی تیکڕایـی شۆڕشـگێڕی بـەرز بکرایەتـەوە لـەناو گـەلی

میللەتی کوردا. بەڵام (هەموو سڕ لە ژێـر سـەری ئـەم مەڵامەدایـە) بۆرجوازیـەت کـە (نیشـتمان پـەروەری لەبازار فێر ئەبێ- ستالین) هەرچاوی لە مەصڵەحەتی تەسکی خۆیەتی، بینیمان لـە کوردسـتانی عێـراقیش تاقم و کۆمەڵە شۆفینیەکان - دوربینی چاوی بۆرجوازیەتی تازە پێگەیشتووی کـورد- کـە سـەرکردەیەتی جوڵانەوەی قەومی کوردستانی ئەکرد لە شمال هەر بەچاوی کۆن تەماشـای مەسـئەلەی کوردییـان ئـەکرد. وەک بلبل حاشا وەک قەل، عاشقی شتێک بوون ناوی (کوردستانی مەزن) بوو، نەک میللـەتی کـورد. ئـەو ئاوازە ناشرینەی کە لە هەندێ ناوچەی ئیستعماری‌یەوە بە تایبەتی ئەمـەریکا، بـەرز ئـەبوەوە. ئەگـەرچی سەرکردەیەتی وەختی جوڵانەوە لە کوردەواری عێـراق بەدەسـت ئـەم تـاقم و کۆمەڵـە شـۆفینیانەوە بـوو، بەڵام سەرکردایەتی تاریخی جوڵانەوەی نیشتمانی هەموو میللەتی عێراق تێکـڕا کـەوتبووە سـەر ئەسـتۆی چینی کرێکاری عێراق، دوای شۆڕشـە مەزنەکـەی ئۆکتۆبـەر. هـەر بۆیـەش حزبەکـەمان، حزبـی شـیوعی عێراق، لە ساڵی 1934 دا لەناوجەرگەی جووڵانەوەی کرێکارو میللـەتا هاتـە روو، ئـەو حزبـەی شـەرەفی بەرزی دانان و بەخێوکردن و پێگەیاندنی ئەگەڕێتەوە سـەر دانـەر و پاسـەوانی بـەرزی هـاوڕێ (فهـد) ی نەمر، رۆڵەی نەبەزو سەرکردەی قارەمانی میللەتی عێراق. ئەو حزبەی ئێستا ئێمە 31ی ئـەم مانگـە یـادی بیست ساڵ تێپەڕبوونی ئەکەین بەسەر عومری پڕ لە تێکۆشـان و خۆبـەختکردنیا لـەپێناوی مەصـلەحەتی میللەتەکەمانا.

"بەڵێ بەم رەنگە رەشەبای مەینـەت لـەم تـاقم و کۆمەڵـە شـۆڤینیانەی هـەڵکرد، وەزعـی نـاوەوە و دەرەوەی عێراق دەستی کرد بە گۆڕین، بە پێگەیشـتنو پەرەسـەندنی حزبەکـەمان، بـە تایبـەتی لـە سـاڵی 34- 44 وە دەرکردنی میسـاقی نیشـتمانی حـزب کـە مـەوقفی خـۆی لـەو کاتـەدا بـە چـاکی و روونـی دەرئەخات بەرامبەر مەسئەلەی کورد... لەلایەکەوە هێرشە بێ رەزاکانی حزبو هاوڕێ فەهـد بۆسـەر تـاقمو کۆمەڵو بیروباوەڕی شۆڤینی و کۆنـە پەرسـتی، لەلایـەکی تریشـەوە بـەزینی بیروبـاوەڕی نـازیو، سـتیو سەرکەوتنی بیرو باوەڕو هێزی دیموکراتی و ئیشتراکیەت، ئەمانە تێکـڕا کـارێکی گـەورەیان کـردە سـەر جوڵانەوەی لەماڵ (؟) وە وردە وردە رەنگی دیموکراتی نیشتمانی وەرئەگرت، بەتایبـەتی دوای ئـەوەی کـە حزبەکەمان توانی رەگی خۆی داکوتێ لەناو میللەتی کوردا. جـا بەرامبـەر بـە جوڵانـەوەو پەرەسـەرەندنی دەستەڵاتی حزبەکـەمان، بەرامبـەر خۆشەویسـبوونی حزبەکـەمان لەلایـەن گـەلی کـوردەوە، تـاقمو کۆمەڵـە شـۆفینیەکان نـەیانتوانی لـەوە زیـاتر لەسـەر شـێوەی کـۆن بـڕۆن بۆهەڵخەڵەتانـدنی میللـەت: تاقمەکـەی (هیوا)ی کۆنەپەرست و شۆفینی لەژێر چەکوششە کرێکاریەکەی هـاوڕێ فەهـدا بـوو بەچەنـد کەرتێکـەوە چونکـە ئەمانـە حزبـی هیـوا بـوون نـەک حزبـی ئیشـکردن _فهـد. وە ئەوەنـدەیان پـێ نـەچوو وەک ئامۆزاکانیان کە تاقمی خۆییبوون- استقلال) بـوون ئـاش بـەتاڵیان لێکـردو خۆیـان داتەکانـد. هەنـدێکی تریش هەر لە پاشماوەی ئەم تاقم و کۆمەڵانە، وەک تاقمەکەی (میللەت) لـە ناوچـەی هـەولێر کەوتنـە گـەڕ، ئەم کۆنە ئینتهازیانەی لـە دەوری خـۆی هـەڵاتووی دەسـتی هـاوڕێ فهـد بـوون، ئەمانـە لقێکـی کوردیـان پێکەوە نابو بۆ تاقمی (وحدة النضال) بەخۆیان و زمانی پیسیان یەکێتی تێکۆشـین کەوتنـە بەربـەرەکانی حزبەکەمان. ئابەم جۆرە شۆڤینی و ئینتهازی یەک کەوتن. (تەیری گول عاشق بەداری زەقنەبوتـە) ئـەمجا ئەمانە بەناوی شیوعیەت کەوتنە رێگا گـۆڕین لـە میللـەتی کـورد. بـەڵام ئەوەنـدەی نەخایانـد هـەتا ئـەم تاقمەش بە رەحمەت چوو لە دەوری 44 - 45 ەوە حزبە قارەمانەکەمان نەئەبووە حزبێکی خۆشەویسـت و سەرکردە و جەماهیری لەناو میللەتی کوردا ئەگەر ئـەم تـاقم و کۆمەڵـە شـۆڤینی و ئینتهازی‌یانـەی بـەو دەردە نەبردایـە. چەنـد بەشـێکیان لەمانـە پەشـیمانیەکی زۆریـان دەربـڕی لـەو کـردەوە ناهەمواریانـەی کردبویان دەربارەی حزبە شیوعیەکەمان و جووڵانـەوەی نیشـتمانی لـە عێراقـدا، بـەڵام هـەیهات، چونکـە

"تۆبەی گورگ مەرگە" ئێستاش هەر ئەوانەی کە ئەمڕۆ بەڕێوەبەری (رایة الشغیلة) ی ئینتیهازین، بەناوی حزبی شیوعی عێراقیەوە، هەر ئەوەندەی پێ نەچو ئەمانە لە حزب هەڵگەڕانەوە و تاقمێکی تریان ڕێکخست بەناوی حزبی شیوعی لە کوردستانی عێراقدا، زمانە پیس و ناپاکەکەیان لەهاوڕێ فهد و حزب خستە کار، وە دەستیان کرد بە بڵاوکردنەوەی گیانی دووبەرەکی و جیاجیایی لەناو حیزب و جوڵانەوەی نیشتمانیا. کۆنە شۆڤینیەکانی وەک عەونی یوسف و عەلی کاکەخانی دەرەبەگ و ئەحمەدی حەمەدئەمین ئاغاش... هتد کۆمەڵێکیان پێکەوەنا بەناوی کۆمەڵی رزگاری. بەم رەنگە بە شۆڕش و رزگاری ئەیانویست وڵاتی عێراق ئازاد بکەن! بەڵام عەرەب گوتویەتی (ئەگەر قەلەڕەشکە ڕێگا پیشاندەری میللەتێ بێ هەر کەلاوەیان پیشان ئەدات) ئەمانیش وەک تاقمەکانی تر لەبن چەکوش و هێرشی حزبەکەمانا و هاوڕێ فهد روخان و کۆڵیان داو کەوتنە پەشیمان بونەوە و تۆبەکاری! پاش ئەوەی کە میللەتی کورد لێیان ئەسڵەمیەوە وە بە دەست (ئەو ریز تێکدەر و گێرەشێوێن کەرانەی ناو میللەتی کورد، گەلی کورد کەوتبوە بەینی حانە و مانە!! فهد. تا قەسابخانەکەی (گاوربـاغی) و قارەمانێتی و ڕێکوپێکی کرێکارانی نەوت بەسەرکردەیەتی حزبە شیوعیەکەمان یەکجاری هەڵی تەکاندن. بەشێکیش لە شۆڤینیەکانی رزگاری پاش ئەوەی تاقمەکەی شۆرش یەکتریان بەردا و دوای حزب کەوتن، دەرکردنی هەمزە عەبدوڵلای کۆنە جاسوسیان لە ئێران بەهەل زانی، هاتن لە گەڵیا تاقمێکیان پێکەوەنا بەناوی (پارتی دیموکراتی کوردستانی عێراق) وە بەناوی جووڵانەوەی دیموکراتی ئێران کەسێکیان بەدرۆ دەلەسە خستە شوێن خۆیان تا لەم ساڵانی دواییەدا ئینسانە بەشەرەف و هەڵخەڵەتاوەکان راستی جاسوسیەتی هەمزە عەبدوڵلایان بۆ دەرکەوت، ئیتر وازیان لێ هێنا و کەوتنە فەزح کردنی خۆی و تاقمەکەی کە دەرەبەگەکانن، وە خۆیان وا پیشان ئەدەن کە لەماوەی جەبهەی نیشتمانیدا چیان لەتوانادا هەبێ ئیش بکەن.

"چاو پیاخشانێکی وا کورت بەسەر گۆڕینی مەسئەلەی کورد بەسەر دەوری حزبە شیوعیەکەمانا، بەپێی ساغکردنەوەی ئەم مەسئەلەیە لەسەر رۆشنایی مارکسیەتی- لینینی، تێمان ئەگەیەنێ کە: مەسئەلەی کورد بەشێکە لە مەسئەلەی گشتی نیشتمانی لەعێراقدا، مەسئەلەی بونی ئیستیعمار و شەریکاتە ئیحتیکاریەکانی لەوڵاتمانا، مەسئەلەی مانەوەی پاشماوەی دەرەبەگی و ژیانی دیلێتی گەلی فەلاحەکان، مەسئەلەی ژێردەستی و دواکەوتنمان، لەبەرئەوە نابێ بیر لەهیچ چارکردنێک بکرێت وە نەچارەش ئەکرێ تەنیا بە ئازادکردنی وڵاتمان نەبێ لەژێر دەستەڵاتی ئابوری و سیاسی و عەسکەری ئیستیعمار، لە گەڵ گۆڕکردنی حوکمی کۆنەپەرستی و پاشماوەی دەرەبەگی، بەچارکردنی مەسئەلەی فەلاح و دانانی حوکمی دیموکراتی میللی و جیابوونەوەی تەواومان لە لەشکرگای شەڕ و ئیستیعمار و فاشیستی، لە گەڵ چوونە پاڵ لەشکرگای ئاسایش و دیموکراتی و ئیشتراکیەت، بەسەرکردەی یەکێتی شورەوی مەزن. جا ئەو سایە بە چارکردنی ئەم مەسئەلانە، کە مەسئەلەی کوردیش یەکێکە لێیان، مەسئەلەی کورد چار ئەکرێ لە بنەڕەتەوە، وە ئەبێ لە گۆشەی مەصلەحەتی رەنجکێشەکانی میللەتی کوردەوە تەماشای چارکردنی بکرێت.

"میللەتی روسیای قەیسەری و چین بە تەجروبەی تایبەتی خۆیان بۆیان دەرکەوت هەژاری و کەساسیان لەوەوە نەبوو کە بە سەر یەکەوە بە ژیانێکی تێکڕایی ئەژیان، بەڵکو لەوەوە بو کە حوکم و دەستەڵات بە دەست خۆیان نەبوو، بە دەست ئیستیعمار و چینە خوێن مژەکانەوە بوو. ئەوەتا ئیستا هەموویان تێکڕا بەسەریەکەوە ئەژین وە وڵاتی یەکێتی شورەوی و چین یان کردوە بە (بەهەشتی بەختیاری).

"گەلی میللەتی کوردیش پاش ئەوەی زۆر تاڵ و سوێری چەشت وە بەتەجروبەی تایبەتی خۆی لە ژیانا بۆی دەرکەوتوە هەر جولآنەوەیەک لە ژێر سەرکردەیەتی حیزبی شیوعی عێراقدا نـەبێ کارەسـات و مەینـەتی نەبێ هیچی تری بۆ ناهێنێتە دی، بۆیە رۆژ بەرۆژ چـاکتر و زۆرتـر، بـە بڕوایـەکی قایمـەوە، لـە دەوری ئـاڵا بەرزەکەی (فهد) کۆئەبێتەوە پڕ بەدەم هاوار ئەکەن: بژی برایەتی کورد و عەرەب و هەموو گەلی عێراق لە زدی ئیستیعمارو کۆنەپەرستی.

"حیزبە شیوعیەکەمان و گەلی میللەتی کورد لـەم رۆژە بـەرز و پیـرۆزەدا، رۆژی 31 ی مـارت، لـەو کاتەدا کە یادی بیست ساڵ تێپەڕبون ئەکـەن بـە سـەر عـومری حیزبـە قارەمانەکـەمانا، حیزبەکـەمان بـە سـەربەرزی و شـانازیەکی بـێ هاوتـاوە پیرۆزبـایی لەگـەلی میللەتەکـەمان ئـەکات، وە داوا لـە رۆڵـە تێکۆشەرەکانی میللەتی کورد ئەکات زیاتر دەستی یـەکێتی و برایانـە بخەنـە نـاو دەسـتی هـەمو میللـەتی عیراقەوە، بۆ تێکۆشانی بێ وچان لە رێگـای ئـازادکردنی وڵات و سـەربەخۆیی نیشـتمانی و ئاسـایش و سەربەستیە دیمۆکراتیەکان دا.

"هەر بژی یادی بیست ساڵەی دامەزراندنی حیزبە قارەمانەکەمان

"بەرزی و نەمردن بۆ سەرکردە و قارەمانەکانی حیزب فەهد و حازم و صارم"

(ئازادی، ژمارە 2 ساڵی 10 نیهایەتی مارتی 1954)

## بڵاوکراوەی تر

حشع جگە لە ئازادی چەند بڵاوکراوەیەکی تری بە کوردی بۆ کرێکاران، جوتیاران، قوتابیـان، سـەرباز و ئەفسەرانی جەیش، دەرکردوە. لە مارتی 1954 دا شیوعیە کوردەکـان چەنـد پەخشـەی تریـان دەرکـردوە، لەوانە:

### 4. 4. یەکێتی فەلاح

یەکێتی فەلاح بۆ ئاسـایش و زەوی و زار و ئـازادی کـە ژ2 ی س 1 ی لـە مـارتی 1954 دا بـە تایپ و رۆنیـۆ چـاپ کـراوە. ئەمـە زمـانی (کۆمـەڵی ئـازادکردنی فـلاح) بـوە. لـە تەنیشـت ناوەکەیـەوە نوسراوە: (ئەی گەلی فەلاحـەکان تـێ بکۆشـن بـۆ: دامەزرانـدن و بـە هێزکردنـی کۆمەڵەکـەمان کۆمـەڵی ئازادکردنی فلاح. دابەشکردنی زەویوزاری ئەمیری بە سەر فەلاحەکانا. کەمکردنەوەی مڵکانـە. زیـادکردنی کرێ و موچەی رەنجبەر و هەمو ئیشکەرانی لادێ. تەحدیـد نـەکردنی شـوێن و جێگـای چانـدنی تـوتن. یاخی بون لە سەرانە و بێگار بۆ دەرەبەگە خوێنمژەکان و حکومـەتی خایـەن.) سـەروتاری ئـەم ژمارەیـە (کەس لە پڕێ ... نابێتە کوڕێ).

### 4. 5. گەنجان،

گەنجان یش بڵاوکراوەیەکی زمانی یەکێتی گەنجە دیموکراتیەکانی کوردی عیراق بـوە. ژ1 ی س 1 ی مارتی 1954 بە چوار لاپەڕە دەرچوە، لـە ژور ناوەکـەی دروشـمی "ئاسایشـێکی هەمیشـەیی و دوارۆژێکـی باشتر" نوسراوە. ناوەڕۆکی بریتی‌یە لە: بـەرەو یـەکێتی، موئتەمـەری گەنجـە فەلاحـەکانی دنیـا، کۆبونـەوەی لوجنەی بڵندی گەنجە دیموکراتیەکانی عیراق، هەڵبژاردنی مەجلیسی بەلەدیە لە سلێمانی، نەورۆز (رۆژی نـوێ)، دەنگوباسی گەنجان.

# یەکیتی فلاح

بو ئاسایشی زەوی و زارو ئازادی

سالی یەکەم – ژمارەی ٢ – مارتی ١٩٥٤

ئەی گەلی فلاحەکان تی بکوشن بو :–

داهێزراندنو بە هێز کردنی کومەلەکەمان "کومەلی ئازاد کردنی فلاح".
دابەش کردنی زەوی و زاری ئەمیری بە سەر فلاحەکانا . کەم کردنەوەی ملکانە . زیاد کردنی کریو مووچەی رەنجبەرو عەموو ایشکەرانی لادی . تحدید نەکردنی شوین و جیگای چاندنی توتن . یاخی بوون لە سەرانە و بیگار بو دەرەبەگەخوین مژەکانو حکومەتی خایەن .

(( کەس لە پرزی . . . نابیتە کورری ! ))

ئەی برا فەلاحە دلسوزو بەشەرەفەکان !

جاری پیشو هەر لەم دوو سی کاغەزەدا کە ناوی "یەکیتی فەلاح" ە ، ئەم نامیلکە بچوکەی کە هەرر دیرریکی بە دلی ئەو زارەدا ئەلایی ناوچەی هەولیرو سلیمانیو کەرکوك ، بگرە تارە بوستانیش ، لی ئەدا ، وە هەر رینگاو دەسگا یەکی کە بو ئازادبوونی ئیمەی ئەنوسی ئەلی ی نەخشی بەردە لە راستی و دروستیدا ، بەلی هەر لەم نامیلکە بچوکەدا کەوا زمانی حالی برا" دو ئینی ئیمەیە ، زمانی حەق و دادپرسینی ئیمەیە لە عینەیی و تەنگانەدا ، زمانی یەکیتی و هەولوتەفەلا دانی ئیمەیە بو ئازادی و رزگاریمان ، بەلی هەر لەم نامیلکەدا جاری پیشو زور چاك بە ووردی روونمان کردەوە کە "چون نەگەیندە ژیانیکی باش ؟" وە پیشانماندا کەوا هەرچەندە دشمنەکانمان زور بە هیزن بەلام بەرامبەر بە یەکیتی و تیکوشانی ئیمە ئەمو بی هیزن ، چونکی دوشمنەکانی خومان لە پیش چاوە کەوا استعماری بیگانەو دەرەبەگ زلمەکان و مەلاکو سەرمایەداروگەورەکانن ، وە حکومەتی خایەنیش هەر لەم جانەوەرانە پیك هاتووە ، ئەگەر ئەوان یەك بن ئیمە دەزارین ، ئەگەر ئەوان سەد بن ئیمە ملیونین ، بەلام ئەمە وا ناگەینی لە خومان بائەربینو بلی ین بە هەلایەك ئەبی سەرکەوینو حساب لەگەل ئەم خایەنو دزو جەردانە ببرینەوە ، ئەگەر ئەمەشمان پی نەکرا آش بەتالی لی بکەین وە بلی ین ئەم ایشە سەرناگری ! ، ئەم کوشکو بالەخانانەی وا لە سەدان سالەوە تا ئەمرو لە سەر بررررەی پشتو کەللە سەری باووکو باپیرمانیان دروست کردوە ، ئەم زەوی وزارو هەردو بەرزاوی کە دەرر بستیکی بە خوینی هەزارەها فلاح آو دراوە بە آسانی بە جی ی ناهیلن ، ئەمەش تیمان دەگەیەنی ئەم جوولانەوەی ئیمە بە بە چاو قووچانیك ناچیتە سەر و دەستەلات بکەویتە دەست خومانو خومان ببینە حاکمی خومان . نەتان بیستوە پیشوفان گوتویانە ( کەس لە پرزی نابیتە کورری ! ) . . . لە لایەکی تریشەوە ئەبی بە چاویکی سووك تەماشای ئەم توزە حقوقو داخوازیانە نەکەین کە جنگمان دەکەوی ، بەلکە ئەبی پاریزگاری بکەینی بو ئەوەی لە کیسمان نەچی وە هی تری پیوە بستینین ، بو ئەوەی وەك پەیژە پی بە پی سەر بکەوین ! وەك چون لە پیش چاومانە لە هەندی گوندەکانی یزەپیان سەرانە و بیگاری دەرەبەگەکانیان نەلگرت ، ئەو دەرەبەگانەی کە پیشان وەك حەیوانات تەماشای فلاحیان دەکرد ، وا ئەمرو گشت باواریانە ئەلین ( لەوەتی فلاحمان لی راست بوتەوە ژنەکانی خویشمانمان پیمان رازی نین ) ، دیمان چون حکومەت بەری بو فەلاحەکانی قضای مخمور دانەواندو وا دەستی کردوە بە زەوی ئەمیری دابەش کردن ، هەرچەندە فەلاحەکانیش بە مەندە رازی نین ، وە دیمان چون فەلاحەکانی هەلبجە لەم روژانە حامد بەگیان راونا بو ئەوەی حەسیر بەیدانی بکەن ، وە فەلاحەکانی طاویخ کە پیشان فتاح آغایان – کە لەم روژانە توپی بە آرەق – دیبایە ئەبوایە جگەرتی لەدەمیان فریدەن . . . بەلام لەم دواییەدا وەك سەگ تەماشایان ئەکرد . . ئەمە هەمووی لە چی بەوەیە ؟ . .

بی شك ئەمە هەمووی لە ئەنجامی هەولو تیەقەلای خومانە ، نابی بە چاویکی سوك تەماشای ئەم سەرکەوتنانە بکەین هەرچەندە کە بچوکن ، بەلکە ئەبی تی بکوشین بتا شتی گەورەمان دەستکەوی . وە بو ئەوەش کە شارەزایی پەیدا بکەین و هەر لە خومانەوە کویرە رینگا نەگرین و رینگای راست هەلبکەین ، پیوستە چاو لە برا فەلاحەکانمان بکەین لەو وولاتانەی کەوا رزگاربون و خویان گەورەی نەفسی خویانن . . وەك وولاتی یەکیتی شورەوی و وولاتی چین . . ئەم وولاتەی کەسی سەد ، تا چوار سەد ملیون فەلاحی تیدا آزادو رزگار بو ، خویان بون بە حاکمی خویان ، چونکی ئەگەر بیتو بە راستی بمانەوی – دەشمانەوی – بە چاکی و یەکجاری رزگارو آزاد بین ئەبی دەرسو عبرەت وەرگرین لەم شتانەی کەوا لە دەرەوە یاخود لە وولاتی خومان روئەدەن ، رەنگە بپرسن چون دەرسو عبرەت وەرگرین ؟ دەرسو عبرەت چی یەو چون ئەبی ؟ .

کومەلەکەمان "کومەلی ئازاد کردنی فەلاحەکان" تیمان دەگەینی دەرسو عبرەت ئەمەیە :– زیتر گوی نەگرینە قسەی پرو پوچی دیوەخانە و وەکیلو سەرکارانی کە ئەیانەوی فەلاحەکان هەروا زەلیلو کەساس

ئاسایشێکی هەمیشەیی و دوا ڕۆژێکی باشتر

# گەنجان

زمانی یەکێتی گەنجە دیموکراتیەکانی کوردی عیراق

— ژمارە —١— ساڵی —١— مارتی ١٩٥٤ نرخی (٢٠) فلسە

### سوپاس

* * * *

زۆر بە گەرمی سوپاسی یەکێتی گەنجە دیموکراتیەکانی عیراق دەکەین ئەو یارمەتیە دڵسۆزو برایەتیەی نواندی بەرامبەرمان، بۆ دامەزراندنی (یەکێتی) یەکمانو دەرکردنی ڕۆژنامەو نووسینەکانی ترمان .

## بەرەو یەکێتی

یەکێتی گەنجە دیموکراتیەکانی کورد، وەك یەکێتی گەنجە دیموکراتیەکانی عیراق، لەسەر بیرو باوەڕی دیموکراتیو لەسەر بناغەیەکی ڕێکو پێکی قایم، دامەزراوە، کەبۆ جێ بەجێ کردنی ئامانجی گەنجە کوردەکان، تێ ئەکۆشێت .

بەشێ زۆری گەنجانی کورد، ئەمڕۆ وەك مەوپێش، تووشی چەند مشکلەو گیروگرفتێك بوون، وە بەدەستیانەوە ئەناڵێنن وە ماوەی ئەم مشکلانە بێ چارە سەرکردن، ئەبنە هۆی، وکوێرن، تاڵکردنی ژیانی گەنجانو کێژاندنەوەی ترووسکەی میللەتەکانمان .

ئەبینین لەهەموو لایەکەوە بەرسیتیو نەخوێنەوارێتی، دەمیان زەنوەتە گەنجەکانمانو هیزو توانایان لەبەر بڕیون و هەر بە گەنجێتی پالیان پێوە ئەنێن بەرەو مردن، ئەمانە لە فەرزیکا بە ئاگری شەڕو نەسرتین، ئەو شەڕەی کەوا دوژمنانی گەنجان، بەهەموو هێزو توانایانەوە بە پارەو جبەخانەیانەوە، بە مشروعی تەجاوزکاریو پیلانی سیاسی کردە پەرستیانەوە، بە دروست کردنی بناغەی عەسکری زۆر لەناو وڵاتی ئێمەشدا و، بە بەستنی پیلانی شەڕی تەجاوزکاریانەوە (کە هەر ڕۆژەی بە ناوێك سەر دەرئەهێنێ)، بە تەرخان کردنی پارەیەکی زۆر بۆ دروست کردنی چەکو جبەخانەی زەرەو بۆمبای هیدرۆجینیەوە) بە هەموو پڕوپاگەندەو درۆودەلەسەو بوختانو هەڵخەڵەتاندنیانە وە بە هەموو توندو تیژیەکەوە، هەوڵی بۆ ئەدەن، بۆ هەڵگیرساندنی ئاگرەکەی، بۆ ئەوەی لە خوێنی گەنجانو میللەت ئاڵتون هەڵینجن و لە ئێسقانەکانیان کۆشکو تەلاری پاشایەتی لەسەر کاولەکەی وڵات دروست بکەن .

بەرامبەر بەم مەترسیە زلە پڕسامە، ژیانی هەموو گەنجان، لە چۆتە ملە کەوچیچکە گوللەو بۆمبا، فەرقی کرێکارو فەلاحو قوتابیو خوێندەوار، کاسبو سنعەتکار، بەئافرەتو منالەوە، ناکات، بە تایبەتی ئەمرو کە چەکو جبەخانە لە (زەرەو هیدرۆجین) دروست ئەکرێت، سەرەوەی بۆمبای (ناپالمو میکرۆب)!

ئەگەر زیاتر بکۆڵینەوە لە ژیانی گەنجەکان، لە کێزەرانو چۆنیەتی ئیشکردنیان، لەنەسافیو خوێندەواریان، لە کۆتو زنجیری دیلایەتی کۆمەڵ کە کراوەتە ئەستویان، باشتر بۆمان دەرئەکەوێت، کە مشکلەی گەنجانو مەسلەحەتیان وەك یەك وایە، بێ گوێ دانە ئەوەی، ئەمە کرێکارە یا فەلاح، قوتابیە یا کاسبکار هەتد... هەروەها، بێ گوێ دانە ئەوەی، ئەمە پارتیە یا شیوعی، قەومیە یا نیشتمان پەروەر، ئاشتیخوازە یا أخوان المسلمین، ئەمانە هەموویان، ڕووبەڕووی ئەو هەموو مشکلە تایبەتیانە وەستاون، کە بەرەو ڕووی گەنجانی هەموو وڵاتەکەمان ئەبێتەوە، بە عەرەبو تورکمانو ئەرمەنیو ئاشوریـــەوە .

جا ئەم گەنجانە، مادام مشکلەکانیان وەك یەکن، مادام زۆربەی گەنجانن، پێویستە دەست بخەنە دەستی یەکو پشتگیری یەکتر بکەن لە تێ کۆشانا، بۆ چارکردنی ئەو مشکلانە، بۆ جێ بە جێکردنی ئامانجەکانیـــان .

و یەکێتیەکمان لەسەر بناغەیەکی ڕێکو پێکی قایم دامەزراوە، وە ئەو پەیڕەوە ناوخۆیەی لەسەری ئەڕوێن، واجباتو حقوقی هەموو ئەندامو لجنەکانی دەرخستووە، مرکزیەتی دیموکراتی کردوە بە شتێکی پێویست بۆ هەڵسوڕاندنی کاروباری یەکێتیەکەمان، وە ماوەی داوە بە هەموو ئەندامێك بۆ دەرخستنی بیرو باوەڕی خۆی و هاوکاری کردنێکی تەواو بۆ لێکۆڵینەوەی سیاسەتی یەکێتیەکەی، ڕەخنە گرتن لە هەموو کەموکوڕیو چەوتیەکیو، چارکردنیان، بۆ وەرگرتنی هەموو گەنجە بەشەرەفوئەو ڕێکو پێکیانەی ـ منظمة ـ کە ئەیانەوێ بێنە ڕیزی یەکێتیەکەمانەوە، پاش ئەوەی کە دان بە ئامانجەکانیا ئەنێنو خۆیان بە پەیڕەوی ناوخۆو ئەبەستنەوە، و یەکێتیەکەمان داوا ناکات لەو گەنجانەی کە سەر بە کۆمەڵو حزبی ترن، دەست لە کۆمەڵو حزبەکانیان هەڵگرن، بەڵکو داوای ئەوەیان لێ ئەکات ـ پاش ئەوەی کە دێنە یەکێتیەکەوە ـ کە بە پێی پەیڕەوی ناوخوو، واجباتی خۆیان بە دڵسۆزانەیی بە جێ بکەن .

یەکێتیەکمان کە لەسەر ڕۆشنایی ئەم بیروباوەڕە ڕاستو پاکەوە لەسەر ئەم ڕێکو پێکیە ئەڕوات، داوا لە هەموو ئەندامو لجنەو لایەنگرەکانی ئەکات، کە ڕووی پاکی ئەم بیروباوەڕە و ئەم پەیڕەوە، بۆ هەموو گەنجێکی بەشەرەف دەربخەن، هەروەها داوا لە هەموو گەنجێکی بەشەرەف ئەکات کە بێتە ڕیزەکانیەوەو شان بە شانی تێ کۆشەرەکانی هەوڵ بدات بۆ جێ بەجێ کردنی ئامانجەکانی بۆ گەیشتن بە ئاسایشێکی هەمیشەیی و دوا ڕۆژێکی باشتر .

لە حوزەیرانی 1955 دا کۆمیتەی ناوەندی حشع حەمید عوسمانی لادا، دەستی بە سەر چاپخانە و کەلوپەلەکانی حیزبدا گرت و، حسێن ئەحمەد ئەل رەزی (سەلام عادل) ی کردە سکرتێری خۆی.

سەلام عادل هەوڵی یەکخستنەوەی ڕێکخراو و باڵە جیاوازەکانی دا. ساڵی 1956 هەر 3 تاقم: تاقمی لوجنەی مەرکەزی (سەلام عادل)، وحدة الشیوعیین (عەبدولرەحیم شەریف)، رایە الشغیلة (جەمال حەیدەری)، یەکیان گرت.

**ئازادیی سەردەمی سەلام عادل**

ژ1 ی ساڵی 12 ی تەموزی 1956 (ئازادی زمان حاڵی حیزبی شیوعی عیراق لە کوردستان) کە بە چاپێکی جوان چاپ کراوە. مانشێتی سەرەوەی (بژی برایەتی کورد و عەرەب) و لە ژێر ئەودا سەروتارەکەی لە ژێر سەردێڕی (ئازادی بەردەوامە لە سەر تێکۆشان لە پێناوی حقوقی میللەتی کورد) نوسیوێتی:

"پاش چەند مانگ لە بە ناچار دەرنەچونی (ئازادی) وا سەرلەنوێ (ئازادی) زمانی حاڵی حیزبی شیوعی عیراق لە کوردستان، دەستی کردەوە بە دەرچون.

"لەم چەند مانگەدا گەلێ قەوماوی گەورە لە دەرەوە و ناوەوە روی دا.

"تێکچونی پەیرەوی ئیستیعماری عالەمی، وە پەرەسەندنی هێزی ئاسایش و ئازادی دەرکەوت وە ئاشکرا بو لە چەند گۆڕانێک دا لە جوڵانەوەی ئازادی و ئاسایشی عالەمیدا. هەروەها میللەتانی عەرەب بە سەرکەوتویی هاتنە دەرێ لە بەرهەڵستیەکەیانا بەرەنگاری (پەیمانی بەغداد) وە بەرامبەر زۆر لێ کردنی ئیستیعمار، وە هەمو یەکیان گرت لە جوڵانەوەیەکی سەربەخۆیی و ئازادی گەورەدا ... وە هەستی نەتەوایەتی- عەرەبی و کوردی- لە عیراقیش دا پەرەی سەند کە ئەمە بو بە هۆی زیادبونی گۆشەگیری پیسترین تاقمی کۆنەپەرست لە چینی کاربەدەست، تاقمەکەی نوری سەعید و (پەیمانی بەغدا). دیسان هێزە نیشتمانێکان گەلێک هەنگاوی باشیان نا بۆ نزیک بونەوە لە یەکتر، وە بڕوا بە یەک کردن، پاش کەڵک وەرگرتنیان لە تەجروبە ناخۆشەکانی پێشویان. وە بە هۆی رەنج و تەقەللای حیزب وە گشت دڵسۆزان ئەوزاعی دوبەرەکی دوایی پێ هات، بە گەڕانەوەی هاوڕێیانی (رایة الشغیلة) بۆ حیزبەکەیان، وە بە ئینزیمام کردنی (حیزبی یەکێتی شیوعێکان)، بە حیزبەکەمان.

"جا لە گەڵ ئەوەدا کە (قاعدە) رۆژنامەی مەرکەزی حیزبە شیوعیەکەمان، وە بەیانەکانی تری حیزب، ئەم قەوماوانەی تا رادەیەکی زۆر جوان رون کردەوە، بەڵام بەشێکی زۆر لە گەلی زەحمەتکێشی کوردستان پێویستی بە ئەوپەڕی یارمەتی بو، لە لایەن (ئازادی)ەوە لە ئاراستەی گشتیا.

"ئەم مەسەلەیە جێگای ئیهتیمامی سەرکردەی حزب و کادرەکانی بو بە تایبەتی ئەوانەی لە کوردستان ئیش ئەکەن... وا ئێستا ئەم کۆششە هاتە بەرهەم، وە (ئازادی) خۆشەویست دەرچو لەبەرگێکی جوان و تازەدا، بەگوێرەی مەرامی گەل، وە بە کوێرایی چاوی کۆنەپەرستی عێراق و ئیستیعماری ئاغای.

"مونەزەماتی حزب لە کوردستان، وە رۆژنامەکەیان (ئازادی) ئەوپەڕی هەوڵ و تەقەللا ئەدات بۆ تێگەیشتنی سیاسەتی حزب وە ئیش پێکردنی لەسەر بناغەی گۆڕانە تازەکان. وە هەموو دەم.. وەک هەموو کاتەکانی تری.. بەدڵسۆزی و ئیهتیمامەوە سەیری چاکەو هەستی گەل ئەکات لە کوردستان، وە زمانی حاڵی ئەبێت لە هەستی نەتەوایەتیا بۆ رزگاربونی لە تەوقی ئیستیعمارو کۆنەپەرستی.

"گەلێ قەوماوی دورو نزیک، راستی ئەو رێگەیە ساغ ئەکاتەوە کە حزبەکەمان هەموو دەم پیشانی داوە، رێگای برایەتی عەرەب و کورد لە تێکۆشانا بەرەنگاری دوشمنی هەردولا، وە لە پێناوی وەرگرتنی سەربەستی و حقوقیانا، وە بەرەنگاری چەوسانەوەی نەتەوایەتی کە بەشێوەیەکی تایبەتی لەسەر میللەتی کوردە. ئەم رێگە

راست و رەوانە دروست ئەبێت لەسەر بناغەی برایەتی بەینی میللەتان لە تێکۆشانا لـەپێناوی ئـازادی و حـەقی تەقریری مەصیردا، لەپێناوی حقوقێکی وەکو یەکا، لە یەکگرتنێکی پێشکەوتو بەختیارا، بەرەزامەندی.

"بە ئیشارەتێک لە ئیستیعمارەکانی ئینگلیزو ئەمریکاوە، وەلە ژێرسەرپەرشتی ئەوانا (پـەیمانی بەغـدا) ی تەجاوەزکارانە پێک هات کە شێوەیەکی تازەیە لـە شـێوەکانی دەسـت بەسـەراگرتنی ئیسـتیعمار. وە پـاش ئەوەی میللەتەکەمان داگیرکردنی ئاشکراو ئینتیداب و پەیمانی 930 دو قۆڵی قبوڵ نەکرد، ئیسـتیعمار ناچـار بـو ئـەم رێگایـە بـەکاربهێنێت، رێگـای پـەیمانی گەلەکۆمـەکی.. بـۆ سـەر لێشـێواندن. بـەڵام هـەتا ئینسـانە ساویلکەکانیش هەست بەوە ئەکەن کەئەم پەیمانە هـیچ چاکەیـەکی نیـە بـۆ وڵاتـە بچکۆلـە و دواکـەوتوەکان، بەقەدەر ئەوەی رێگایە بۆ مانەوەی دەست بەسەراگرتن و بەری رەنج خـواردن لەلایـەن دەوڵەتـە ئیسـتیعماریە گەورەکانەوە، کە ئەم پەیمانە، بەهاندانی ئەوان وەبۆ پاراستنی چاکەی ئەوان پێک هاتوە وەپێک دێـت. وەزۆر باش ئەزانن دۆستایەتی گورگو مەڕ گاڵتە نەبێت هیچی تر نییە.

"سەرەرای ئەمەش (پەیمانی بەغدا) بە شێوەیەکی تایبەتی پیلانێکی گەورەیـە بـۆ سـەر هـەموو میللـەتی کورد، ئامانجی مانەوەی دیلایەتی و پەرتوبڵاوی میللەتی کـوردە، بـە لـەناوبردنی جوڵانـەوەی ئازادیەکـەی، وە نەهێشتنی هەموو نیشانەیەکی نەتەوایەتی. وەئـەم پەیوەندیـە لەبـەینی کاربەدەسـتانی کۆنەپەرسـتی ئێـران و تورکیا و عێراق وە کۆبونەوەیان لە (پەیمانی بەغدا) دا بەم گەرموگوڕیە، بەخۆڕایی نیە.

"جارەها، نوری سعید هەندێ لە وەزیرەکانی تر، وە سەرۆکی وەفدی عەسکەری تورکی کە حازربو لـەو مناوەراتە عەسکەریانەی چەند مانگێک لەمەوپێش لەکوردستان کرا. تەصریحیان داوە، کە ئـەم اتجاهـە خراپـە دەرئەخات لە (پەیمانی بەغدا).

"دیسان هێرش بردنـە سـەر عەشـیرەتی جـوانرۆ، وە رێکـەوتنی کاربەدەسـتانی ئێـران و عێـراق بـۆ ئاوارەکردن و لەناوبردنی، وەئەو اجرائاتانەی وەرگیرا بەرامبەر شێخ مـەحمود و شـێخ لـەتیف وە عەشـیرەتی پشدەرو ئەوانی تر لەسەر ئامۆژگاری سەرۆکی وەفدی تورکی! وەدانانی کاربەدەستێکی عەسکەری تـورانی لـە سلێمانی وە حەرامکردنی قسە بەناوی کوردو کوردستانەوە، وە دانانی بەرنامەیەکی ئەوتۆ کـە زمـانی کـوردی کز بکات و لەپاشا نەیهێڵێ هەتا لە قوتابخانە ئیبتیدائەکانەوە سیاسەتی جیاوازی لە بەینی میللەتانی عێـراق دا وە کردنی کوردستان بەیەک پارچە لە بنکەی شەڕو فرۆکەخانەی ئاوی، وە کردنەوەی شەبەکەیەک لـە رێگـای عەسکەری وە گوێ نەدان بەپێشخستنی کشتوکاڵ و پیشەسازی وە گوێ کـەڕ کـردن لـە مەشـاکلەکانی ئەمانـە هەمووی بەڵگەیەکی رون و ئاشکرایە، ئەو ئامانجانە دەرئەخات کە (پەیمانی بەغـدا) ئەیـەوێت. بـەو اعتبـارەی پیلانێکی گەورەیە بەرەنگاری میللەتی کورد.

"پاش سازکردنی پەیمان و پیلانەکانی ئیستیعماریەکان دوای شەڕی عالەمی یەکەم، میللەتی کورد پـەرت و بڵاوەی پێ کرا بەنیازی لەناوبردنی هەموو گیانێکی نەتەوایەتی، وەسەر دانەواندنی هـەموو پارچەیـەکی بـۆ زوڵم و زۆری کاربەدەستانی کۆنەپەرستی ئەو وڵاتەی بەزۆر خراونەتە ژێر چنگیەوە، ئەم واقعە لەدوو سەرەوە ئەرکی خستە سەرشانی جوڵانەوەی نەتەوایەتی لەهەموو بەشەکانی کوردستانا.

"بەهێزکردنی پەیوەندی تێکۆشانی یەکگرتوو لە گەڵ میللەتانی ئەم وڵاتانەدا، وە بەردەوام تـرن لەسـەر پەیوەندی وە رێکخستنی تێکۆشان لە گەڵ هەموو بەشەکانی جوڵانەوەی کوردیا.

"لەبەرئـەوە میللـەتی کـورد، سـەراپا، لـە عێـراق هـەروەها لـە ئێـران وە لـە تورکیـا، لەبـەردەمی پێویستیەکی مێژوویی گەورەدان پێویستی راپەڕین بە ئازایانەو قارەمانانە، وە شان بەشـانی میللەتـەکانی تر لەم وڵاتانـەدا، بـۆ روخانـدنی (پـەیمانی بەغـدا) وە دەرکردنـی ئیسـتیعمار وە لـەپێناوی سیاسـەتێکی نیشتمانی سەربەخۆدا.

"لەم چەند مانگەدا، بەشێوەیەکی تایبەتی، هەستی نیشتمان پەروەری و نەتەوایەتی لە ولاتــە عەرەبــەکانا پەرەی سەند، وە جولاَنەوەیەکی ئازادی و سەربەخۆیی گەورە دەستی پێکرد، بەرەنگاری ئیستیعمارو (پەیمانی بەغدا) ئەم ڕاپەڕینە قەومیە روداوێکی زۆر گرنگە لەمێژووی تازەدا، وە هەمو ئەم بەڵگانــە پیشـانی ئـەدات کـە پاشماوەی نفوزی ئیستیعمار، هەڕەشەی لێ ئـەکرێت بەنـەمانێکی بـێ گەڕانــەوە، هـیچ گومانیشـی تیانیـە کـە جولاَنەوە نیشتمانیەکەمان لە عێـراق بەشـێکە جیانابێتــەوە ئـەم لافـاوە گەورەیـە، بـەرەنگاری ئیسـتیعمار وە هەرچی هەوڵ دانێک یا بیروباوەڕێک بێتە کایەوە، بۆ جیاکردنەوەی لەم لافاوە مەزنە، بێجگە لـە ئیسـتیعمارو کۆنەپەرستی هیچ کەسێک سودی لێ وەرناگرێت. وە بەرودوا زەرەر ئەگەیەنێت بەجولاَنەوەی میللەتەکەمان، چە عەرەب چە کورد لەپێناوی سەربەخۆیی و ئازادیا.

"دیسان ئەم لافاوە زروفێکی باش ئامادە ئەکات نەک تەنها بۆ برایەتی ئەم دوو میللەتە کوردو عـەرەب، لەعێراقدا، بەڵکو برایـەتی میللـەتی کـورد سـەراپا لـە گـەڵ هـەموو میللەتــە عەرەبیــەکانا، لـەپێناوی دەرکردنــی ئیستیعمار لەم ناوچە فراوانە لە عالەما، لە پێناوی ئازادی و نەتەوایەتی و دیموکراتیا.

"ئەمە هەندێک لە ختوتە گشتییەکانی سیاسەتی حزبی شیوعی، کە (ئـازادی) لەسـەری ئـەڕوات لەشـێوە تازەکەیا. وە تادوایی تێ ئەکۆشین لەپێناوی ئازادی و کەرامەت و بەختیاری میللەتا وە زۆر باش ئەزانێت کـە خۆی بە تەنهایی تێ ناکۆشێ لەم ڕێگا پیرۆزەدا، بەڵکو دەست لەناو دەستا، بەگیانێکی برایانە و پاکەوە لەگەڵ هەمو هێزێکی نیشتمانی و نەتەوایەتیا لە کوردستان، وە لە جەبهەیەکی نیشتمانی فراوانی یەکگرتودا."

لەم ژمارەیەدا دو بەیاننامەی لوجنەی مەرکەزی حیزبی شیوعی عیراقی بڵاوکراونەتـەوە. لـە یـەکێکیاندا باسی خۆ هەڵوەشاندنەوەی ڕێکخراوی (راية الشغيلة) و لەوی تریاندا باسی خـۆ هەڵوەشـاندنەی ڕێکخـراوی (وحدة الشيوعيين) ئەکا. لێرەدا هەردوکیان ئەنوسمەوە:

هەر بژی یەکێتی حیزبە شیوعیەکەمان

بەیاننامەی لوجنەی مەرکەزی حیزبی شیوعی عێراق

لە مانگی کانونی دوەمی 1948 میللەتە عێراقیەکەمان خەباتێکی نەبەردانەی کرد لـە ڕوی پیلانــی تـازە کردنەوەی پەیمانی 1930 ی بەینی بەریتانیا و عێراق. بەم خەباتە میللەتەکـەمان پـەیمانی پۆرتسمۆسـی، کـە بەبێ ئاگاداری میللەت بەسترابوو، لابرد. وە ئەو وەزارەتەی، کە ئەم پەیمانەی بەسـت، ڕوخانـد. وە پەرلـەمانی 1946 ی، کە سەعید بەساختەکاری و نارەزایی گەل پێکی هێنابو، هەڵوەشاند. وە تـوانی هێنـدێک حقـوق و سەربەستیەکانی دەستوری دەست خۆی بخات.

بەڵام دوژمنانی میللەت، بەپشتیوانی ئیستیعمار، بەهەمو جۆرە شـێوەیەکی ناپەسـەندانە هـەوڵیاندا کـە سەرکەوتنەکانی میللەت لە میللەت وەرگرنەوە، وە تۆڵە بسـێنن لـە ڕاپـەڕینی ئـازادی بەخشـی، وە بـە بیـانوی جەنگی فەلەستینەوە هێرشیان بردە سەر جولاَنەوەی نیشتمانی میللەت، سەر گشت ئەو حیزب و کۆمەلاَنەی کە دوژمنایەتی ئیستیعمار ئەکەن. لەم هێرشـە کۆنەپەرسـتە، سـەری ڕم بـەرەوڕوی جولاَنــەوە و تـەنزیمی چینــی کرێکار کرا، وە بە تایبەتی بەرەوڕوی حیزبە شیوعیەکەمان کرا. بەبۆنەی گیان و توانـای تێکۆشـانی یـەکجار بەرزی حیزب، ئەو گیانە کە لە هۆشیار کردنەوەی بەشی زۆری گـەلی میللـەت وە خـەبات بـۆ مەصـلەحەتی بـە دەرکەوت چونکە حیزب ڕەنجێکی بە شەرەفی بەخشی لەپێناوی یەکێتی هێزە نیشتمانییەکانا.

ئەگەر جولاَنەوەی نیشتمانی و حیزب بەوێنەیەکی ڕاست تەقدیری ئەهمیەتی یەکێتی هێزەکـانی نیشـتمانی بکردایـە، وە ئەگـەر زیـاتر وریـا بوایـە بەرامبـەر پیلانــەکانی ئیسـتیعمار و نۆکـەرانی وە بەرامبـەر بزوتنــەوە و پروپاگەندەی صەهیۆنیەت و نۆکەرانی... ئەگەر هاتو ئەمە بقەومایە، جولاَنەوەی نیشتمانی و حیزب ئەیان تـوانی لە ڕوی هێرشی دوژمن بوەستن و پارێزگاری سەرکەوتنەکانی میللەت بکەن وە بەرەو پێشەوە بیبەن.

"لەو کاتەی حزب توشی ئەو هێرشە جانەوەرانەیە ئەهات هەندێ کەسی داوێن پـیس خۆیـان هاویشـتە باوەشی ئیستیعمارو کۆنەپەرست و سەری بۆ زۆردار شۆڕکرد، وەبەم کردەوە پیسترین زیانی گەیاندە چینـی کرێکار و رەوشی شۆڕشگێڕانەی گەلی میللەتە عێرەقیەکەمان، کەبەشێوەیەکی نامەردانە حزبی بریندار کرد.

رفانـدن و هەڵواسـینی سـەرکردەکانی حزبەکـەمان، لـە بیژنـگ دانـی گشـت روداوەکـانی حـزب وە بەنـدکردنیان بـە حـوکمی قـورس، وە گـرتن و حەپسـکردن و نـەفی کردنـی هـەزاران تێکۆشـەری ئـازا.. یقەوماوێکی زۆر گەورەبو نسبەت بە دەوری سیاسی و جەماهیری حزب لـە وڵاتـدا. ئـەو کارەسـاتەی بەسـەر حزب هات، بەراستی کارەساتی جوڵانەوەی نیشتمانی و گشت میللەتی زەحمەتکێش بو.

بەڵام زۆر ئاشکرایە، کە سەرەرای ناخۆشی زروف و توندی، حزبەکەمان، ئەوسا کارو تـەنزیمی خـۆی پاراست و لە فەعالیەت قەت نەوەستا. شیوعیەکانی عێـراق، توانیـان تـا رادەیـەکی زۆر پەیوەندیـەکی بـەتین بخولقێنن، لەبەینی ئیشیان و لەبەینی ئەو پەیمانانەی کەلەسەر خۆیانیان دابرِی بو بەرامبەر بـە گـەلی میللـەت، کە بەبێ وچان بەربـەرەکانی ئیسـتیعمار و کۆنەپەرسـتی بکـەن، بـەم چەشـنە سـەر لـەنوێ ئیسـپاتیان کـرد بەشێوەیەکی نیشتمان پەروەرانە، لەسەر گیانی فیداکاری و خۆبەخشین لەبناری مەصلەحەتی گەل کە رەوشێکی مەعلومی هەموو شیوعیەکانە لەهەموو شوێنێکا.

بەڵام ئـەوزاعی نـاوبراو.. لەسـاڵانی نـاوبراو.. زروفێکـی شـازی لەسـەر حـزب فـەرزی کـرد لەبابـەت سەرکردەیی حزب، کە سەرکردەیەکی نەزان (قیادت جاهلە) دەستی بەسەر کاروباری حزبدا نا، وە حزبیان برد بەرێگاوە بەئامانجی بیرۆکراتی مناڵانە، بو بەهۆی روانی نەوەک خەتاکردنی سیاسی وە تـەنزیمی یـەکجـار زل وە تیکرار کردنەوەی هەروەک حزب لەزۆر مناسەبەتدا، گوتویەتی: بەڵکو، بوو بـەهۆی بـێ بـەش کردنـی حزب لەتەجروبەو زانینی هاورێیانی باش باش ئەوانەی بەدڵسۆزی رەخنەیان لە حزب گـرت، وە بـە چـەوتی لەحزب دەرکران بەئەنجامی دامرکاندنی رەخنەگرتن لە حزبا وەلەم هاورِیانە ئەو هاورێیانـەی کەلـە پێشـان لـە (راية الشغيلة) رێکخران.

بێگومان ئەوزاعی دووبەرەکی (الأوضاع الانقسامية) لە هەر کاتێکا جوڵانەوەو حزبی توشـی زیـانێکی زۆر گەورە کردوە وە تێکۆشانی گەلی بەرامبەر ئیستیعمارو کۆنەپەرستی و پەیمانی بەغدای دواخسـت، وە بـو بە مەصدەرێک بۆ بڵاوکردنەوەی بەلبەلەو شکوکیەت لە جوڵانەوەدا، وە بو بە چەکێک بەدەست ئـەو کەسـانەی حەز لە زەبت ناکەن وە ئەیانەوێت تەخریب بکەن.

ئەمرۆ پاش رابوردنی زیاتر لە 3 ساڵ، ئەم هاورێیانە، لـە بەیاننامـەی ناوچـەی سـەرکردەیان (المركـز القيادي، راية الشغيلة) کە لە 13ی حوزەیرانی 1956 دەرچوە ئەڵێن (لەسەر روناکی ئەو تەجرەبـە ناخۆشـەی کـە بەسـەر حزبەکـەمان و جوڵانەوەکـەمان دا رابـورد لەسـاڵانی دواییـدا، وە بـەروناکی تەجروبـەی یـەکجار دەوڵەمەندی ئومەمی... ئەتوانین تێبگەین کە ئێمە لە وەختی خۆی لـە رێگایـەکی دوبـەرەکی تـەخریبی چـەوت رۆیشتین، کە تەنزیم و ناوچەیەکی سەربەخۆمان دروستکرد، وە بە ناوی حزبی شیوعی عێراق، لەوکاتـەی کـە حزبە شیوعیەکەمان لە مەیدانا وەستابو، وە نەبەزانە لەسەر خەباتی خۆی ئەرۆیشت)

وە گوتیان کە ئەو هەنگاوەی ناویان نابو (انتشال) هەنگاوێک بو بە پێچەوانـەی مەبـدەئی مارکسـی- لینینی، کە ئەڵێ، ئەبێ یەکێتی حزب بپارێزرێت.)

ئێستا پاش ئەوەی رێکخراوەکەی خۆیـان هەڵوەشـاند وە داوایـان کـرد لـە ئەندامـەکانی خۆیـان کـە بگەرێنەوە بۆ حزبە شیوعیەکەیان بەبێ چەنـدوچون (قیـد أو شـەرت). وە حزبـە شـیوعیە عێراقیەکـەمان زۆر دڵشادە بە گەرانەوەی ئەم هاورێ دڵسۆزانە بۆ باوەشی. هەروەها حزب دڵنیایە کە ئەم هاورِیانە لەم خەتایەیان (دەرسێکی گەورە فێربوون، کـە هۆشـیار بـن، هۆشـیاربونێکی شۆڕشـگێری، وە لـە دوا رۆژیشـدا، لـەپێناوی

پاراستنی یەکێتی حزب، وە بەربەرەکانیکردنی هەرجۆرە هەوڵدانێکی دوژمنانە، کە یـەکێتی حـزب ئـەروخێنێ یـاخود تەهدیـدی ئـەکات بەهـەر بیانوویـەک بێـت). وە تێگەیشـتوون بـەقووڵی ئـەو راسـتیەی کـە ئـەڵێت (مارکسیەتی-لینینیەت هیچ رێگایەک نادات غەیرە رێگای رەخنەو رەخنە لەخۆگرتن نەبێت لەسـنوری زەبـت و پەیرەوی ناوخۆیی حزب لەبۆ راست کردنی خەتاو کەموکورتیو موشکلەکانی حزب).

بژی حزبی شیوعی عێراق دڵسۆز بۆ مەصلەحەتی چینی کرێکارو میللەتی زەحمەت کێش.

لەژێر ئاڵای مارکسی-لینینی بەرەو سیاسەتێکی نیشتمانی راست.

لجنەی مەرکەزی حزبی شیوعی عێراق

17 ی حوزەیرانی 956

### بەیاننامەی لجنەی مەرکەزیی حزبی شیوعیی عێراق

نوێنەری حزبی شیوعی عێراق لە گەڵ نوێنەری حزبی یەکێتی شـیوعیەکان کۆبونـەوە، وە لـە ئـەوزاعی جوڵانەوەی شۆڕشگێری و نیشتمانی ئێستامان دوان لەسەر بناغـەی مارکسـی-لینینـی، وە بـەپێی تەجرەبـەی ئومەمی و نیشتمانی جوڵانەوەی چینی کرێکار و جوڵانەوەی نیشتمانی. وە هـەردولا تاکیـد لەسـەر ئەمانـەی خوارەوە ئەکەن:

1. دامەزراندنی حزبی شیوعی عێراقی، حزبی چینی کرێکارو میللەتی زەحمەت کێش پێویسـتیەکی نیشتمانی و چینایەتیە. وە حزب پێکهێنـراو بـەرەو پێشـەوە رۆیشـت لەناوجەرگـەی خـەباتی نیشتمانی پیرۆز بەرەنگاری ئیستیعمارو کۆنەپەرستی، وە بەرەنگاری ئینتیهازیـەت کـە نیـازی وایەو ئەیەوێت تێکۆشانی چینی کرێکار چەوت بکات و رووی وەربگێرێت بەشێوەیەکی غەیرە شۆڕشگێری. حزب، مارکسیەتی- لینینی کردوەتە پەیرەو لە تێکۆشانیا وە لەژیانی ناوخۆیا، وە رووی میللی پەرە پێ سەندوەو لەو چەند ساڵە دوورو درێژەی دواییدا کە پڕبوو لـە کارەسـاتو لێ قەومان، نەوەستا رۆژێک لەخەبات کردن. وە پاش نەکـەوت لـە بەخشـینی خۆشەویسـتترین قوربانی لەپێناوی خزمەتکردنی مەسەلە هەقو راستەکەی میللـەت، بـە جوڵانـەوەو رێکخسـتن و سەرکردەی گەل لەو خەباتانـەی کـەوا هەمیشـە پەڕەیـەکی رونـاکو پرشـنگدارە لـە پـەڕەکانی قارەمانی میللی.
2. هەردوولا بەنرخی ئەزانن خەباتی نیشتمانی ئەو تێکۆشەرانەی کە خۆیان رێکخست لەدواییـدا لـە حزبـی یـەکێتی شـیوعیەکاندا وە بـەنرخی ئـەزانن ئـەو قوربانیدانـەی ئـەوان لـە تێکۆشـانیانا بەرەنگاری ئیستیعمارو کۆنەپەرستی وە دەوریان لەبڵاوکردنەوەی هۆشی نیشـتمانی و دیمـوکراتی و رەنجیان دەربارەی سـەقافەت و بەتایبـەتی سـەقافەتی مارکسـی، لـەکاتی و لـەپێش جوڵانـەوەی حزبی، لەدوای جەنگی عالەمیی رابردوو.
3. تەجاربی ئـەو چەنـد سـاڵە، ئـەو تێکۆشـەرانەی کەلـە دواییـدا ئیشـیان کـرد لـە حزبـی یـەکێتی شیوعیەکان، فێرکرد، کەوا گەلی میللەت هەقی هەیە لە خۆرێکخستنی سیاسی، وە ئەبێت بەو هەنـدە رازی نەبێت کـەوا قـەوانینی ئـەو کاربەدەسـتانەی پاسـەوانی مەصـلەحەتی ئیسـتیعمار ئـەکات وە پارێزگاری نیزامی دەرەبەگی ئەکات رێی ئەدا. وەلەکاتی ئاوادا زۆر خەتایـە کـەوا بەتـەنیا اعتمـاد بکرێتە سەر فرسەتی قانونی و ئیشی ئاشکرایی کـەوا میللـەت دەسـت خـۆی ئـەخات بـەزۆر. وە پێویستە بەدامەزرانـدنی رێکخراوەکانمـان و تاکتیکـەکانمان لەسـەر بناغەیـەکی شۆڕشـگێری کـە هێزەکانی میللەت پشت بەستی بێت لەبۆ بەردەوامبون و پێشکەوتنی جوڵانەوە لـە هـەموو چەشـنە

زروفێکدا، لە تەنیشتی چاکە وەرگرتن لە فرسەتە ئاشکراکان بـۆ پێشخسـتنی تێکۆشـانی میللـی. لەبەرئەمە ویستیان اسلوبی ئیشکردنیان پێ بخەن بە شێوەیەکی ئـەوتۆ کـە بـەردەوامی خـەباتیان مسۆگەر بکات لە هەموو زروفێکدا.

4. چەنـد فرسـەتێک تێپـەڕبو، ئەبوایـە هەسـتکردن بەرزتربوایـە بـە مەسـئولیەت، وەبـە گـەرمتر و دڵفراوانتر ئیش بکرایە لە پێناوی دواهێنانی ئەم وەزعە، بـەڵام حزبـی شـیوعی لەسـەر سـاردی و مەوقیفی سەلبی خۆی مایەوە بەرامبەر تێکۆشەرەکانی حزبـی یـەکێتی شـیوعیەکان، وە تەقـدیری ئـەوەی نـەکرد کـەوا تـەجرەبی تێکۆشـان هـەر ئـەمو ئـەو ناتوێنێتـەوە بـەڵکو، ڕێکخـراوە تێکۆشـەرەکانیش کـەوا دوژمنایـەتی ئیسـتیعمارو کۆنەپەرسـتی ئەکـەن، ئەتوێنـەوەو تەسـقیف ئەکات.
5. وە سەرەڕای ئەمەش کارێکی خەتا بو هەڵسانی ئەو تێکۆشەرانە بەجۆرێک لـە خـۆ ڕێکخسـتن و ئیش کردنی سەربەخۆ بەناوی (حیزبی شـیوعی عێـراق) یـان لەدواییـدا بـەناوی (حزبـی یـەکێتی شیوعیەکان) مادام حزبی شـیوعی بـەبێ ڕوپـان و جەنگاوەرانـە تـێ ئەکۆشـا، وە ئیسـتیعمار بـە شێوەیەکی جانەوەرانە خەریکی لێدانی حزبـی شـیوعی و گشـت جوڵانـەوەی نیشـتمانی بـو. وە لەبەرئەمـە مەصـلەحەتی میللەتەکـەمان وای داوا ئـەکرد لەهـەموو دڵسـۆزێک کـە ئـیش بکـەن بـۆ بەهێزکردنی یەکێتی جوڵانەوەی نیشتمانی، بەبێ ڕێگادان بە ئەتواری دووبـەرەکی و بەربـەرەکانی کردنی یەکتر.
6. وە پێویستە دان بەوەدا بنێین کەوا ئەتواری شەڕە جنێوو ناووناتۆرەنانی ناهەق لەمو لەو، هەمیشە هیچ سودێک نابەخشێت بە چینی کرێکار و میللەتی زەحمەت کێش.
7. وە بەپێی ئەم ئەنجامانـەی کـە هـەردولا گەیشـتونەتێ، سـەرەڕای ئـەوەش کـەوا حیزبـی یـەکێتی شیوعیەکان بڕوا بە عەینی ئامانجی سیاسی و کۆمەڵایەتی، نزیـک و دور، ئـەکات کـەوا پـەیڕەوی حزبی شیوعی عێراقـە لـە تێکۆشـانیا لـەپێناوی ئاسـایش و، ئـازادی نیشـتمانی و، دیموکراسـی میللی‌دا، بێجگە لەمەش حزبی یەکێتی شیوعیەکانیش بڕوا بە مارکسی- لینینی ئەکات کـەوا حزبـی شیوعی عێراقیش بە پشتیوانی ئەڕوات بەڕێوە لە خەباتیا وە لەژیانی ناوخۆییـدا، وە بـە مادیـەتی دیالێکتیکی کەوا بناغەی هەموو بیروباوەڕێکە وە کە ڕۆژ بەڕۆژ ژیان ئیسپاتی ڕاستی و گیانداری ئەکات.

وە بە پێی ئەم روناکیانە، نوێنەری هەردولا ڕێک کـەوتن کـە حیزبـی یـەکێتی شـیوعیەکان دوایـی بـە کاروبار و ڕێکخراوی سەربەخۆ بێنێ، وە ئینزیمام بکات بە حیزبی شیوعی عێراقی.

وە بێ گومانە کە ئەم هەنگاوە لە لایەن هـەمو دڵسـۆزەکان بـۆ مەسـەلەی حزبـی ئـازادی دیموکراسـی نیشتمان، وە ئەوانەی بەربەرەکانی ئیستیعمار و پەیمانە شەڕاویەکانی ئەکەن.

وە نوێنەری هەردو حزب ڕێک کەوتن کە لجنەی مەرکەزی حزبـی شـیوعی عێـراق ئـەم بـەیان نامەیـە دەرکات.

بژی حیزبی شیوعی عێراقی دڵسۆز بۆ مەصلەحەتی چینی کرێکار و میللەتی زەحمەتکێش.
گەشانەوە بۆ مارکسیەتی - لینینیەت ئاڵای سەرکەوتن.
لوجنەی مەرکەزی حیزبی شیوعی عێراق
25 ی نیسانی 956

## کۆنفرەنسی دووەمی حشع و دەرکردنی ئازادی کوردستان

لە ئەیلولی 1956 دا حشع دوەمین کۆنفرەنسی بەست.

لەم کۆنفەرەنسەدا هەمو ئەو تاقم و گروپانەی لێی جیا بوبونەوە سەرلەنوێ یەکیان گرتەوە و، لە سەر راپۆرتێک پێکهاتن، کە مافی چارەنوسی بۆ نەتەوەی کورد، لەوانە مافی جیابونەوە و پێکهێنانی دەوڵەتی تایبەتی خۆی، سەلماند. سەلام عادل، کە بو بە سکرتێری حیزب، دەورێکی گرنگی لەم کۆنفەرەنسە و، لە ژیانی حشعدا گێرا. وەکو بەڵگەی یەکگرتنەوەی باڵە جیاوازەکانی حیزب، هەر 3 ئۆرگان: (القاعدة، راية الشغيلة، النضال) کە بۆ بەدناوکردنی یەکتری هێرشی زۆریان کرد بوە سەر یەکتری بە یەکجاری راگیران. لە 22 ی تەموزی 1956 دا (اتحاد الشعب) وەکو زمانحاڵی حشع دەرچو. هەر لەو دەوروبەرەدا لە باتی (ئازادی) کە زمانحاڵی لقی کوردستان بو، دەس کرا بە دەرکردنی (ئازادی کوردستان).

لەم کۆمیتەی ناوەندیە یەکگرتوەدا جەمال حەیدەری، ساڵح حەیدەری، کەریم ئەحمەد، کاکەی فەلاح، بون بە ئەندام. زۆری پێ نەچو ساڵح حەیدەری و، حەمید عوسمان و، چەند کادرێکی لقی کوردستان، حشع یان بە جێ هێشت و چونە ریزی پدک ەوە. کاکەی فەلاح یش بە یەکجاری دەستی لە کاری حیزبی و سیاسی هەڵگرت. بەڵام (ئازادی کوردستان) بە رێکوپێکی بە چاپێکی جوان دەرچونی بەردەوام بو تا 14 ی تەموزی 1958.

### 4. 6. ئازادی کوردستان

ژ1ی ساڵی 14 ی دوایی حوزەیرانی 1957 ی ئازادی کوردستان، 16 لاپەڕەی پێوانە (20 × 14سم) ە. بابەتەکانی ئەمانەن: لاچونی نوری سەعید، گۆرینی مەبەستەکانی ئیستیعمار نیە!، تێکۆشان بۆ وەستاندنی تاقیکردنەوەکانی ئەتۆم و هیدرۆجینی فرمانێکی پێویستی نەتەوەی کوردە، بوێژی بەرزی کوردستان مامۆستا گۆران، داخوازیەکانی لیژنەی بەرزی نیشتمانی، یادی رۆژی شەهیدانی کورد، دەنگوباسی کوردستان: سلەیمانی، کەرکوک، هەولێر، گۆرانی کارگەران، پەتای ئاژاڵ و سستی دەزگای حکومەت.

### تیراژی ئازادی

بەڵگەیەک لە بەر دەسدا نیە کە ئازادی چەند دانەی لێ چاپ کراوە و، چۆن و لە چەند جێ بڵاوکراوەتەوە. رۆژنامەی (القاعدة) لە ساڵانی 1947- 1949 دا، وەکو حەنا بەتاتو لە کتێبەکەیدا خەمڵاندویەتی، 3 هەزار دانەی لێ چاپ کراوە و، ژمارەیەکی زۆر لەوە زیاتر خوێندویانەتەوە. القاعدة لە سەرانسەری عیراقدا، هەروەها لە کوردستاندا، بڵاوکراوەتەوە. ئازادی کە هاوشانی القاعدة دەرچوە تەنیا بۆ کوردستان و بۆ خوێندەواری کورد بوە، لە بەر ئەوە پێویستی نەکردوە بەو ژمارە زۆرەی رۆژنامەیەکی عەرەبی چاپ بکرێ. بەڵام بێگومان ئەمیش لە چاو رۆژنامە و گۆڤارە کوردیەکانی ئەو سەردەمەدا چەردەیەکی باشی لێ چاپ و بڵاوکراوەتەوە و بۆ خوێندنەوە دەستاو دەستی کردوە.

نیشتمانێکی ئازادو میللەتێکی بەختیار

# ئازادی کوردستان

زمانی حزبی شیوعی ی عیراق ، لقی کوردستان

ژمارە (١) سالی (١٤) دوایی حەزیران ٩٥٧

نرخی - ٢٥ - فلسە

## لاچوونی

نوری سەعید ، گورینی

مەبەستە کانی ئیستیعمار

نیـــە !!

✻ ★ ✻

سێ سال لەمەوبەر ، بەپێی پیلانی ئیستیعمار نوری سەعید هاتە سەر کار و دەزبەجی کەوتە ئیش .

مەجلیسی نوێنەران کە چەند نوێنەرێکی نیشتمانی تیابو هەلی وەشاند ، حزب و کومەلە و روژنامە کانی داخست پەیوەندی لەگەل یەکێتی سوڤیتا بری و دوایش پەیمانی ژەهراوی بەغدای گری دا . ئەمانە جگە لەو هەمو مەرسومانەی بو پیوەند کردنی گەل هینایەدی و خستیە کار .

بەلی توانی پەیمانی بەغدا ببەستی ، بەلام هەرچی کردی نەیتوانی پیشی جوولانەوەی میللەت بگری و لە تیکوشان بیوەستینی . چونکە جگە لەوەی میللەت - بە کورد و عەرەبەوە - بە گیجی بەرامبەر بەم پیلانە گلاوانە هاتە دەست و ریزی تیکوشانی خویانیان پتەوتر و پەستیوراوتر کرد ، هەمو میللەتی عەرەب و حکومەتە عەرەبە ئازادیخوازە کانیش پشتیوانییان لی کردن . تەنانەت نوری سەعید بەخوی و نەوپەرری تەقەلای ئاغا ئیستیعماری یەکانیەوە ، نەیتوانی یەکی لە حکومەتە عەرەبە کان راکیشێتە بەری پەیمانە شەرراوی یەکانیەوە .

نە مەرسومە کانی سەعیدی و نە حوکمە « درر » ە کانی عورفی و نە ژێرپێخستنی هەمو یاسا کانی دەستوری و رەوشتی ، هیچی نەیتوانی پیش بە رق و توورەیی میللەت بگری ، بەلکو [ برروانە لاپەررە ١٢ ]

## کاریگەریی ئازادی لەسەر ژیان و بۆچونی خەڵک

ئازادی، وەکو بڵاوکەرەوەی ئایدیۆلۆجی کۆمۆنیستی، کاریگەری لە سەر ژیان و بیروبۆچونی هەزاران کەس هەبوە. بە هۆی ئازادییەوە تێکەڵاوی ژیانی سیاسی بون، توشی گیران و ڕاونان و نانبڕان بون. بەڵام پیاچونەوە بە بەیان و بڵاوکراوە جۆراوجۆرەکانی ئەم قۆناغەی ژیانی حشع و تاووتوێ کردنی ناوەڕۆکی ئۆرگانەکانی چەند ڕاستیەکی تاڵ دەر ئەخەن:

**یەکەم:**

دەورێکی گەورەی هەبوە لە چەواشەکردنی بیری ڕۆشنبیر و سیاسی و تێکۆشەرانی کوردا. دۆست و دوژمنی لێ شێواندون. زۆر جار ڕێگەی نادروستی تێکۆشانی بۆ هەڵبژاردون. نۆکەرایەتی سۆڤێتی لە لا کردونەتە ئەرکێکی پیرۆز و فرمانێکی نیشتمانی. هەوڵی داوە بزوتنەوەی ڕزگاریی کورد بکا بە بەشێ لە جەنگی ساردی نێوان بلۆکی ڕۆژهەڵات و بلۆکی ڕۆژئاوا، بێ ئەوەی کورد هیچ قازانجێکی لەوەدا هەبوبێ.

**دوەم:**

حشع پێی وابوە، ئەوە ئەو لایەنەی، کە ناسنامەی نیشتمانپەروەری بە کەس و ڕێکخراو و حیزبەکان ئەبەخشێ یان لێیان ئەسێنێتەوە. حشع هەر لە سەرەتاوە دوژمنایەتی ڕێکخراوە سیاسیەکانی کوردستان، چ ئەوانەی نیشتمانی و نەتەوەیی بون و چ ئەوانەی کۆمۆنیست و مارکسی بون، کردوە بە بەشێکی کاری سیاسی و ئایدیۆلۆجی. لەم بڵاوکراوانەدا زۆر بە توندی و بێ پەروا هێرش ئەکاتە سەر حیزبی هیوا، حیزبی ڕزگاری، حیزبی شۆڕش، پارتی دیمۆکراتی کورد. بە هەمو توانایەوە هەوڵی داوە ناووناوبانگیان بزڕێنێ. سەرکردە و ڕەمزەکانیان سوک و چروک بکا.

حشع لە بڵاوکراوەکانیدا پەلاماری زۆر لە کەسایەتییە سیاسی و فەرهەنگیەکانی کوردی داوە و هەوڵی داوە ناووناوبانگیان بشێوێنێ و لە ناو خەڵک دا سوکیان بکا.

حشع یەکێکە لەو حیزبانەی لە مێژوی عێراقدا تێکۆشانی زۆر و قوربانی بێ شوماری داوە، بەڵام سەرەنجام بە هۆی چەوتی ڕێبازەکەیەوە مایەپوچ و ڕەنج بە خەسار دەرچوە.

**سەرچاوەکان:**


1. وێنەی ژ3 ی حوزەیرانی 1945 و 2 ی مارتی 1954 و 1 ی تەموزی 1956 ی (ئازادی) لە (ئارشیفی نەتەوەیی کوردستان) و،

ژ4 ی تشرینی دوەمی 1952 ی (ئازادی) و، ژ1 ی حوزەیرانی 1957 ی (ئازادی کوردستان) لە ژ11 - 12 ی گۆڤاری ڕۆژنامەڤانی و،

ژ5 ی تشرینی دوەمی 1945 لە ئەرشیڤی دکتۆر مارف خەزنەدار وەرگیراوە.

هەمو ئەم سەرچاوانەم لە مامۆستایان ڕەفیق ساڵح و سدیق ساڵح وەرگرتوە.

2. کۆڤارا ئازادی، گۆڤاری (ڕۆژا نو)، ژ61، 5 ی چریا پاشینی 1945.
3. سکرتێری نوسین (عەبدوڵا زەنگەنە): ڕۆژنامە یان گۆڤاری ئازادی؟ گۆڤاری (ڕۆژنامەڤانی)، ژ5، هەولێر، کۆتایی ئابی 2001. ل 204 - 209.
4.

## 5. ڕۆژنامەوانیی نهێنی و پارتی دیمۆکراتی کوردستان

شۆڕشی 1943- 1945 ی بارزان پاش چەند شەڕ و پێکادان کەوتە گفتوگۆ لە گەڵ کاربەدەستانی عیراق. بەڵام گفتوگۆی بارزانی- حکومەتی عیراق سەرنەکەوت. سەرلەنوێ شەڕ هەڵگیرسایەوە. جەیشی عیراق بە یارمەتی هێزی ئاسمانی بریتانی هێرشی توندی ئاسمانی و زەمینی بۆ سەر ناوچەی بارزان دەس پێ کردەوە.

ناکۆکیەکانی ناو ریزەکانی حیزبی هیوا تەقینەوە. حیزبی هیوا بەرەو پارچە پارچە بون و هەڵوەشان ئەچو. ئەفسەرەکانی کە دابویانە پاڵ شۆڕشی بارزان، لە سەرکردایەتی حیزبی هیوا نائومێد بون. لە شاخ خۆیان بە سەرۆکایەتی مەلا مستەفا ڕێکخراوێکی نوێیان بە ناوی (هەیئەتی ئازادی) هوە دامەزراند.

شۆڕشی بارزان نەتەنیەوە بۆ ناوچەکانی تری کوردستانی عیراق. لە ناوچەی بارزاندا قەتیس ما. جەیشی عیراق و جاشی کورد تەنگیان پێ هەڵچنی. توانای بەرگری نەما. ڕۆژی 11 ی 10 ی 1945 بارزانیەکان بە کۆمەڵ، چەکدار و بێ چەک، بە خاووخێزانەوە، لە ڕێگەی کێلەشینەوە کشانەوە بۆ کوردستانی ئێران.

لەو کاتەدا لە کوردستانی ئێران، ناوچەی موکریان، ئەگەرچی لە ژێر نفوزی سۆڤێتیدا بو بەڵام وەکو ناوچەیەکی بێلایەن لە نێوان هێزەکانی ئینگلیز و روسدا دەسەڵاتی راستەقینەی حکومەتی ئێرانی تێدا نەما بو. خەریک بو دەسەڵات ئەکەوتە دەس سەرانی کوردی ناوچەکە.

لە 22 ی 1 ی 1946 دا حیزبی دیمۆکراتی کوردستانی ئێران لە کۆبونەوەیەکی جەماوەریی فراواندا لە مەهاباد، دامەزراندنی حکومەتی کوردستانی راگەیاند. بارزانیەکان و ئەفسەرە کوردەکانی عیراق: عیزەت عەبدولعەزیز، خەیروڵا عەبدولکەریم، مستەفا خۆشناو، محەمەد مەحمود قودسی، بەکر عەبدولکەریم، میرحاج ئەحمەد، نوری ئەحمەد تەها و جەلال ئەمین بەگ، کە لە مەهاباد کۆبوبونەوە، بون بە پێشمەرگە لە ریزی هێزە چەکدارەکانی پارێزگاری ئەم حکومەتەدا.

### بیری دامەزراندنی پارتی

کۆتایی هاتنی دوەمین جەنگی جیهانی بە سەرکەوتنی بەرەی دیمۆکراتی و تێشکانی بەرەی فاشیزم و، ئەو بەڵێنانەی هاوپەیمانەکان بە گەلانی ژێردەستە و زۆرلێکراویان دابو، لە ناو کوردیشدا دەنگی دابوەوە.

بیری دیمۆکراتی و ئازادیخوازی لە بڵاوبونەوەدا بو. لە ژێـر کاریگـەری ڕوداوەکـانی دنیـا و بـە چاولێکـەری حیزبی دیمۆکرات، وەکو تاقە حیزب بۆ کوردستانی ئێران و لە ژێر یەک سـەرکردایەتی‌دا، لای ئەفسـەرەکانی کە پێشتر (هەیئەتی ئازادی) یان پێک هێنـا بـو، بیـری دامەزرانـدنی یـەک حیزبـی یـەکگرتو لـە ژێـر یـەک سەرکردایەتی‌دا بە سەرۆکایەتی مەلا مستەفای بارزانی، بۆ کوردستانی عیراق، گەڵاڵە بو. پەیمانی نەتـەوەیی و پرۆگرام و پێڕەوی ناوخۆی حیزبەکەیان ئامادە کرد و هەر لە مەهابادیش چاپ کرا.

هەمزە عەبدوڵا، کە ئەو دەم لە مەهاباد بو، بە نوێنەرایەتی مەلا مستەفا و دەستەی دامەزرێنەری حیزبـی تازە، بۆ گفتوگۆ لە گەڵ هەمو حیزب و ڕێکخراو و گروپە کوردیەکان گەڕایەوە بۆ عیراق. تا هەمویان بە پێی ئەو پەیمانی نەتەوەیی و پرۆگرام و پێڕەوی ناوخۆیەی بە ئامادەکراوی لە گەڵ خۆی لە مەهابادەوە هێنا بونی و، بە پێی ئەو ڕێنماییانەی لە لایەن مەلا مستەفا و هاوڕێکانیەوە کرا بو، لە یەک حیزبدا و لە ژێر باڵی یەک سەرکردایەتی‌دا بە سەرۆکایەتی مەلا مستەفا، یەک بگرن.

هەمزە کەوتە گفتوگۆ لە گەڵ سـەرکردەکانی حیزبـی شـیوعی کوردسـتانی عیـراق (شـۆڕش)، حیزبـی ڕزگاری کورد، لقی کوردستانی عیراقی ژ. ک، پاشماوەکانی حیزبی هیوا.

ئەندامانی سەرکردایەتی حیزبی شیوعی کوردستان ڕازی نەبون بێنـە نـاو ئـەم حیزبـە نوێیـەوە. بـە تایبەتی چونکە مەلا مستەفا کە خۆی سەرۆکی حیزبەکە بو، پێشنیاری کرد بـو شـێخ لـەتیفی حەفیـد و کاکـە زیادی غەفوری، کە دو موڵکداری گەورە بـون، لـە سـەرۆکایەتی حیـزبدا بـبن بـە جێگـری. حیزبـی شـیوعی کوردستان خۆی هەڵوەشاندەوە و زۆری ئەندامەکانی چونە ناو حیزبی شـیوعی عیراقـەوە (بـە سـەرکردایەتی فەهد). بڵاوکراوەکەیشیان (شۆڕش) نەما.

حیزبی ڕزگاری کورد بو بە دو بەشەوە. بەشـی زۆریـان چونـە نـاو حیزبـی تـازە دامـەزراو (پـارتی دیمۆکراتی کورد) ەوە و بەشێکی تریان چونە ناو حیزبی شیوعی عیراقەوە.

لقی کوردستانی عیراقی ژ. ک، لـەو کاتـەدا، کـە هێشـتا حکومـەتی کوردسـتان لـە مـەهاباد مـابو، بـێ وەرگرتنی ڕەزامەندی پێشەوا قازی محەمەد ئامادە نەبو خۆی هەڵبوەشێنێتەوە، بەڵام دوای ڕوخانی حکومـەتی کوردستان ئەویش چوە ناو پارتی‌یەوە.

بەر لە گرتنی کۆنگرە، پەیمانی نەتەوەیی و پرۆگرام و پێڕەوی ناوخۆی پـارتی دیمـۆکراتی کـورد، لـە مەهاباد ئامادە کرا بو. حیزبی ڕزگاری کورد بۆ باس و لێکۆڵینەوە بەسەر ئەندامەکانی خۆی‌دا دابەشی کرد.

لەبەر گرنگی‌یان لێرەدا لە مەتنی عەرەبی‌یەوە، کە لە (موسوعة سرية خاصـة بـالحزب الشـيوعي العراقـي السري، بغداد، 1948) وەرم گرتون، ئەیانکەم بە کوردی:

**"پەیمانی نەتەوەیی پارتی دیمۆکراتی کورد**

1. بە ڕێگەی خەباتی سیاسی و بە ڕێگـەی تـر تـێ ئەکۆشـین بـۆ پێکهێنـانی دەوڵـەتی کوردسـتانی فیدرالی دیمۆکراتی لە عیراق‌دا کە پێکدێ لە لیواکانی موسـڵ و هـەولێر و کـەرکوک و سـلێمانی و خانەقین. دەستورەکەی ئەنجومەنێکی دامەزرێنەر دایئەنێ کە لە لایەن گەلی کوردەوە ڕاستەوخۆ بـە دەنگدانی نهێنی هەڵئەبژێردرێ.
2. دەسـەڵاتەکان لـە دەوڵـەتی کـوردی‌دا لـە گەلـەوە هەڵئـەهێنجرێ، حکومـەت بـە هـۆی پارلـەمانی هەڵبژێردراوی ڕاستەوخۆی گەلەوە وەری ئەگرێ. دەسەڵاتەکانی جێبەجێکردن و قەزا سەربەخۆن.
3. دەوڵەتی کوردستانی فیدرالی دیمۆکراتی ئازادە لە بەستنی هاوپەیمانێتی و پەیمانی دۆسـتایەتی لـە گەڵ حکومەتی (جمهوریەتی کوردستان لە ئێران) و لە گـەڵ حکومـەتی ئازەربایجـان، هـەروەها لـە

بەستنی ڕێککەوتننامەی سیاسی و بازرگانی و ڕۆشـنبیری لـە گـەڵ هـەمو دەوڵـەتانی دیمـۆکراتی تردا.

4. مافە دیمۆکراتیەکانی هاوولاتی‌یان لە ناو سنوری دەوڵەتدا کە مـافی کۆبونـەوە و بڵاوکردنـەوە و دامەزراندنی حیزبی سیاسـی و ئـازادیی بـە کارهێنـانی زمـانی نەتـەوەیی و ئـازادیی بـاوەڕ و ویژدان پارێزراون، هەروەها ئازادی کەسایەتی.
5. دامەزراندن لە وەزیفەکانی دەوڵەتدا بە پێی لێوەشاوەیی زانستی و ڕۆشنبیری و هونـەری ئـەبێ. شـارەکان و قـەزاکان بـە ئەنجومـەنی بەڕێوەبەرایـەتی هـەڵبژێردراو لـە لایـەن خەڵکەکەیـەوە بـە سەرۆکایەتی کەسێ کە دەسەڵاتی جێبەجێ کـردن دای ئـەنێ، بـە ڕێـوە ئـەبرێن. بەڕێوەبەرایـەتی شارەوانی لە شـار و قـەزاکاندا بـە ئەنجومـەنی شـارەوانی و سـەرۆکی هـەڵبژێردراو لـە لایـەنی خەڵکەکەیەوە بەڕیوە ئەبرێن.
6. ڕێگای ئاسنین و ڕێگای وشکایی و ئاوی و دارسـتان و کانگـا و کارگـەکانی چـەک و تەقەمـەنی جەنگی، بە تەنیا موڵکی دەوڵەتن.
7. دارایی دەوڵەت، گەنجینەیەکی گشتیی ناوەندی بەڕێوەی ئەبا، پێکدێ لە بـاجی عادلانـە بـە پـێی قانون لە داهـاتی گـومرگ و مـەکوس و کـرێی موڵکـەکانی. بـاجی دەرامـەت تەسـاعودی ئـەبێ. دامەزراندنی بانکی تایبەتی بۆ کەسان و کۆمپانیا قەدەغەیە و بە تەنیا دەوڵەت بـۆی هەیـە بـانکی ناوەندی دابنێ.
8. قانونی کار مەرجەکانی نێوان کرێکار و خاوەن کـار دیـاری ئـەکا و دەوڵـەت دان بـە نەقابـەکانی کرێکاران و کۆمەڵە هەرەوەزیـە بەرهـەمهێن و ئیسـتیهلاکیەکاندا ئـەنێ و، هـەوڵی بڵاوکردنـەوەی فێرکردنی هونەری ئەدا، بە کردنەوەی پەیمانگا بۆ ئەم مەبەستە. وە هەوڵی زیادکردنی پیشەسـازی و بڵاوکردنەوەی کشتوکاڵی ماکیناوی ئەدا، لە گەڵ بایەخدان بە گۆڕینی مەرجەکانی نێوان زەویدار و جوتیار بە هی دادپەروەرانە، بە جۆرێ کە ئەو زۆرەی لە چینی بەرهەمهێنـەری جوتیـار ئـەکرێ، لابیا.
9. فێربون لە خوێندنگای سەرەتایی و ناوەندیدا خـۆڕایی و ئیلزامیـیـە. پـەیمانگای ڕۆشـنبیری بـە پێی پرۆگرامی پەروەردەیی گشتی دائەنرێ بۆ دابینکردنی پێویستیە ئابوری و سیاسی و جەنگی و بەڕێوەبەرایەتی و دادگایی و هونەری و ئەدەبیەکانی کۆمەڵ.

**"پرۆگرام**

**"ئامانجەکانی حیزب**

**1. ئامانجە سیاسیەکان**

سەربەخۆیی تەواوی کوردستان. بەم ڕێگایانەی خوارەوە ئەیگاتێ:

1. خەبات لە پێناوی دامەزراندنی دەوڵـەتێکی فیـدرالی لـە عیـراقدا بـە نـاوی دەوڵـەتی کوردسـتانی فیدرالی دیمۆکراتی‌یەوە.
2. بنچینەی دامەزراندنی دەوڵەتی فیـدرالی کوردسـتان پـەیمانێکی یەکگرتنـە، نوێنـەرانی حکومـەتی عیراق و نوێنەرانی سیاسی کورد بەشداری لە بەستنی‌دا ئەکەن.
3. دەوڵەتی فیدرالی کوردستان ئازادە لە بەستنی پەیمانی یەکێتی و هاوپەیمانی یا دۆستایەتی لە گـەڵ حکومەتی جمهوریەتی کوردی لە ئێران.

4. دەوڵەتی کوردستان ئازادە لە بەستنی پەیمانی هاوپەیمانی یا دۆستایەتی لە گەڵ هەر دەوڵەتێکی دیمۆکراتی بێ پرسی حکومەتی عیراقی.
5. دەوڵەتی فیدرالی کوردستان ئەم شوێنانە ئەگرێتەوە: لیواکانی موسڵ و هەولێر و کەرکوک و سلێمانی و خانەقین.
6. ئەنجومەنی نیشتمانیی دامەزرێنەری هەڵبژێردراوی گەلی کورد لە عیراقدا، بە ڕێگەی هەڵبژاردنی ڕاستەوخۆ و دەنگدانی نهێنی سەرۆکی دەوڵەتی فیدرالی کوردستان هەڵئەبژێرێ و قانونی بنچینەیی بۆ دائەنێ.
7. دەوڵەتی فیدرالی کوردستان، ئیستیعماری دەوڵەتی بێگانە و نیزامی ویصایە و حیمایە، هەرچی چۆنێک و لە هەر دەوڵەتێکەوە بێ، قبوڵ ناکا.
8. دەوڵەتی فیدرالی کوردستان هەوڵ ئەدا بچێتە ناو پەیمانی سەلامەتی بە کۆمەڵی ناودەوڵەتانەوە و کۆنگرەکانی ئاشتی نەتەوە یەکگرتوەکانی دیمۆکراتی و پەیماننامە ئابوری و ڕۆشنبیری و کرێکاریەکانەوە.

### 2. **ئامانجە ئابوریەکان**

أ. حیزب هەوڵ ئەدا دەوڵەت ببێتە خاوەنی موڵکیەتی گشتیی پیشەسازیی جەنگی بە هەمو جۆرەکانیەوە و، بە خاوەنی دارستان و کەنارەکان و ڕیگای وشکایی و ئاوی و ئاسنینەکان و کانگاکان.
ب. حیزب هەوڵ ئەدا بۆ دامەزراندنی بانکێکی ناوەندی بۆ دەوڵەت و بۆ قەدەغە کردنی دامەزراندنی بانک لە لایەن کەس و کۆمپانیاوە.
ج. ڕێگەدان بە دامەزراندنی کۆمپانیای بازرگانی و پیشەسازیی ئازاد.
د. موڵکیەتی فەردیی ئەرز و کەلوپەل پارێزراوە.
هـ. حیزب هەوڵ ئەدا بۆ نەهێشتنی کۆمپانیای ئیحتیکاریی مەوادی ئیستیهلاکی و کەلوپەل و، ئەو ڕێوشوێنە ئەهلی و حکومەتییانەی (بۆ ئەمە ئەکرێ) بە ڕەوا ئەزانێ.

### 3. **کاروباری کار و خزمەتی کۆمەڵایەتی**

أ. حیزب هەوڵ ئەدا بۆ دانانی قانون بۆ دیاریکردنی مەرجەکانی گرێبەند لە نێوان خاوەن کار و کرێکاردا.
ب. حیزب هەوڵ ئەدا بۆ دانانی بنچینەیەک بۆ کرێی کرێکارانی پیشەسازی و خەدەماتی حکومەتی و هەمو لقەکانی بەرهەمهێنانی پیشەسازی و کاری گشتی و کرێکارانی کشتوکاڵ، بە جۆرێ کە لایەنی کەمی کرێ بەشی دابینکردنی پێویستیەکانی ژیان بکا.
ج. حیزب خەبات ئەکا بۆ نەقابەی کرێکاران و کۆمەڵەکانیان.
د. حیزب هەوڵ ئەدا بۆ ئەوەی خزمەت و دامەزراوە تەندروستیەکان گشتی و خۆڕایی بن. بایەخی تایبەتی بە پزیشکیی ویقائی ئەدا.
هـ. حیزب هەوڵ ئەدا بۆ زیادکردنی کۆمەڵی هەرەوەزیی ئیستیهلاکی و بەرهەمهێنەر.
و. حیزب هەوڵ ئەدا شارەوانی شارەکان بسپێردرێ بە ئەنجومەنی هەڵبژێردراوی شارەکان لە لایەن دانیشتوانیەوە. هەروەها موختاری گوند و لادێکان تابیعی ئەنجومەنی هەڵبژێردراوی گوند بن.
ز. حیزب هەوڵ ئەدا بۆ یەکسانی ژن لە گەڵ پیاو لە هەمو مافەکان و ئەرکەکاندا.

**4. کاروباری رۆشنبیری و پەروەردە**

أ. کردنی خوێندن لە خوێندنگا سەرەتایی و ناوەندیەکاندا بە خۆڕایی و ئیلزامی.

ب. حیزب هەوڵ ئەدا بۆ دامەزراندنی پەیمانگای زانستی ناوەندی و بەرز لە سەر بنچینەی دابینکردنی پێویستیە ئابوری، سیاسی، جەنگی، بەڕێوەبەرایەتی، قەزائی و هونەریەکانی کۆمەڵ.

ج. حیزب هەوڵ ئەدا بۆ دامەزراندنی یانەی وەرزش و یاری بۆ بەڕێوەبەرایەتی خوێندنگا و پەیمانگای بەرز یا نەقابەی کرێکاری و کۆمەڵی هەرەوەزی.

د. حیزب هەوڵ ئەدا بۆ دامەزراندنی پەیمانگای موسیقا و ئاداب و شانۆ و سینەما.

هـ. حیزب هەوڵ ئەدا بۆ دامەزراندنی باخچەی منداڵان و پشتیوانی لە بزوتنەوەی دێدەوانی لە خوێندنگاکان و لە بزوتنەوەی گەشتوگوزار.

**5. مادەی جۆراوجۆر**

أ. پارتی دیمۆکراتی کورد حیزبێکی گەلیە داکۆکی لە بەرژەوندیەکانی چینی کرێکار و جوتیار و رۆشنبیران و خاوەن پیشە و بازرگانەکان ئەکا.

ب. پارتی دیمۆکراتی کورد لە سەر بنچینەی عەلمانیەت دامەزراوە دان ئەنێ بە جیاکردنەوەی سیاسەت لە دین.

ج. پارتی دیمۆکراتی کورد دان ئەنێ بە گۆڕاندا، لە بەر ئەوە گۆڕین لە پرۆگرام و پێڕەوی ناوخۆیدا قبوڵ ئەکا بەو رێگەیەی لە پێڕەوی ناوخۆیدا دیاری کراوە."

**یەکەمین کۆنگرەی پارتی**

لە 16 ی ئابی 1946 دا لە بەغداد یەکەمین کۆنگرەی پارتی دیمۆکراتی کورد لە ماڵی مامۆستایەکی کورد بەسترا. لە بەر ئەوەی زۆری ئەندامەکانی حیزبی رزگاری کورد هاتنە ناو ئەم حیزبە نوێیەوە، لەو کۆنگرەیەدا بڕیاریاندا ناوی ئۆرگانەکەی پارتی دیمۆکراتی کورد بە ناوی (رزگاری) یەوە بمێنێتەوە.

**5. 1. رزگاریی ئۆرگانی پارتی (خولی یەکەم)**

هەندێ ژمارەی رزگاری ئیستا دۆزراونەتەوە و، پێ ئەچێ لە ناو ئارشیفی دەزگا ئەمنیەکانی عیراقیشدا هەندێ ژمارەی هەڵگیرابێ. هەندێ لێکۆڵەر لە لێکۆڵینەوەکانیاندا کەڵکیان لێ وەرگرتوە و ئیشارەتیان بە ژمارەکانی و بە بابەتەکانی داوە، کە دیارە بە عەرەبی نوسراون، لەوانە: جعفر عباس حمیدي، التطورات السياسية في العراق 1941- 1952، النجف 1976.

ژ2 ی س1 کە لە تشرینی یەکەمی 1946 دا دەرچوە، بە تایپ و رۆنیۆ چاپ کراوە. لاپەڕەی یەکەم و دوەمی، کە بە عەرەبی ئیستا لە بەر دەس دایە، تەرخان کراوە بۆ سەروتارێ بە ناونیشانی "الاتحاد الكردي الارمني". بەڵام بە پێی نوسینەکانی حمیدي لەم ژمارەیەدا پێڕەوی ناوخۆ (نیزامی داخلی) ی پارتی بڵاوکراوەتەوە.

# رزگاری

ئۆرگانی پارتی دیموکراتی کورد

عـدد ( ٢ ) السنه الاولى ت ١٠

## الاتحاد الكردي الارمني

عام ١٩٠٨م

افاقت الشعوب الرازحة تحت حكم السلطان الفردي المطلق في الامبراطوريه العثمانيه لتجد ان دستوا عنوانه "حريه، عداله، مساواة" يكاد يمزق ظلاما دامسا ناءت به عهدا بعيدا اورثته ظلال الله في الارض. وفي ضوء هذه النيرات الثلاثه بادرت الجمعيات والاحزاب الى اعداد مناهج الخلاص من القيود الجامعه العثمانيه والاخوه الاسلاميه اللتين كانتا تكبلان حكم السلاطين خلفاء الله. اخذ الاكراد والعرب والارمن بتنظيم جمعياتهم واحزابهم وفي نفس العام اعلنت جمعية (تعالي وترقي) الكرديه عن نفسها في الآستانه. اذ دعت شعوب الدوله اليه بالدستور الذي لم تفرضه ثورة الشعوب كما اندلعت معها اوروبا فحسبت ان مبادئ الثورة الفرنسية الكبرى بدات بهذا الانقلاب البهلواني تلقم جسم "الرجل المريض" فاوقفت مقررات موتمر (ريفال) التي اتفقت الدولتان بها الدولة العثمانيه.

لم يطل العهد بالاتحاديين حتى كشفوا عن آخر ورقة في اجيتهم ، مزيلين اعلنوه عداء ومناهضا للشعوب غير التركية في الدولة ، مترسمين خطوات هولاكو في التدمير والقتل. والطورانية التي استمدت غطرسة السيادة العرقية التركية غاية لها هي المسؤولة اولا واخيرا عن دماء مليون من الشعب الارمني النبيل قبل الحرب العالمية الاولى وبعدها وخلالها. وعن هجرة مئات العائلات من وطنها هربا من سيف الجلاد. وهي المسؤولة ايضا عن نصب مئات المشانق لابناء كردستان وقتل الآلاف الآمنين وتهجير عشرات الالوف من وطنهم الى الاقاليم الغربية تنفيذا للسياسة الطورانية بوجوب افناء كل كيان قومي لغير الاتراك وقد عبر عن ذلك فيما بعد غرانكو الشرق عصمت اينونو في خطابة افتتاح سكة الحديد سيواس في ٣٠ اغسطس عام ١٩٣٠ "ليس لغير هذه البلاد جماعة الحق بادعاء كيان قومي ووطني الا غير الجماعة التركية" وبوقاحة اكثر وزير العدلية محمود اسعد في خطبة القاها في (اوديمش) "ليعلم الصديق والعدو حتى الجبال ان سيد هذه البلاد هو التركي ، فمن لم يكن من دم تركي ليس له فيها سوى حق واحد ، هو ان يكون خادما وعبـــدا"

**عبر الماضي ...**

بازاء السياسة العرقية الطورانية المعتدية لم يكن الا الوحيد الضروري وهو الاتحاد الشعبي الارمني الكردي لصد العدوان على الرغم من التماس وطن الشعبين ارمنيا وكردستان ، وتكوينهما منطقة استراتيجية واحدة اولا ، ووجودهما بالقرب من مراكز الاعتداء الرئيسية وسرعة اجتياز الحملات عليها ثانيا . ويرجع انعدام هذا الاتحاد الشعبي الى اخطاء المنظمات التي فرضت نفسها قائدة للحركات السياسية للارمن والاكراد على السواء . نلخصها بما يلي..

١- ان الجمعية السياسية الكردية (تعالي وترقي) المؤسسة غداة اعلان الدستور وسائر الجمعيات المتكونة بعد ذلك كجمعية (هيفي) وجمعية "التشكيلات الاجتماعية الكردية" و "حزب الامة الكردية" لم تكن ذات صلة بالشعب الكردي في كردستان ، وقد اقتصر نشاطها في الآستانة فقط غير ملتفتة الى انشاء قواعد لها في ارجاء كردستان ، وبانعدام الصلة بينها وبين الشعب الكردي فقدت ان تكون ذات قيادة بلا جماهير ، وصار من جراء ذلك ان جرت السياسة التركية الشعب الكردي وراءها دون تعكر عليها معارضة جدية او مقاومة تذكر . وابسط مثال على ذلك انجراف اكثرية الاكراد مع الكماليين الطورانيين وتحملهم لاعظم التضحيات في الاهوال والانفعالات اثناء ما تسمى بـ "حرب الاستقلال" ولم يحتج الكماليون الى اكثر من ترديدهم "ان حق التكلم من فوق هذا المنبر الذي هو للملاهين التركية والكردية" كما جاء في خطاب نائب ارضروم حسين عوني ، او كما صرح به فتحي بك رئيس الوفد التركي في موتمر الترسانه بالآستانه بقوله "ان هذا الوطن يخص الامتين التركية والكرديه"

اما الارمن فان جمعية الطاشناق التي وان كانت اوثق من الجمعيات السياسية الكردية بالشعب الارمني الا انها كانت خادمة امينة للرجعية وتيارات العائلة ، واتجاهها السياسي الذي لم يحالف بينها وبين الدفاع عن مصلحة جماهير الشعب الارمني المتقدم اكثر من الشعوب الداخلة في الدولة العثمانية ، وهذا الاتجاه الرجعي المتمثل بعقدتها الملجئ على اعتاب الوكالات والسفارات للدول الاستعمارية الاوروبية ومن ثم خادمة لها عاملة بوحيها كما اشار الهجوم المعتدي على جمهورية ارمنيا السوفياتية المعترفة بان العمال والفلاحين الارمن في الصحف الصفراء الصادرة في مصر واميركا ...

٢- ونجم عن ذلك انعدام الثقة بين هذه الجمعيات والشعب فاعتبر ما تقرر سياسيا كبيرا سواء ما كان متعلقا بالوضع الداخلي للدولة العثمانية او الحالة الدولية العامه . فبينما تبرز اعلام ازمة داخلية باعلان الدستور وتبعثر قوات الدولة ووجود السلطان بلا حول او قوة، ازمة حادة ، اعطت امكانيات ثورية للشعبين الارمني والكردي، نجد زعماء هذه الجمعيات ـ مع الاحترام العميق لذكراهم ـ اما ملتفين حول الخليفة الاعزل المقلص او مترددين على قنصليات الدول الاوروبية تستنصحها وتستوحيها الخطة للعمل في سبيل الاوطان ! هكذا استطاع الكماليون تسخير الاكراد في الحرب ليفوزوا اخيرا بدولة تركية تضع في رأس برنامجها محو الشعب الكردي ونصب المشانق لاولئك الزعماء على السواء . اما موتمر الصلح في فيرساي وتصريحات كليمنصو فيه فلم يكن ذلك جميعا مفهوما ،

ژ3 ی س1 ی تشرینی دوەمی 1946، وەکو حمیدي لە (ل226) دا نوسیویێتی: زۆری تەرخان کـراوە بۆ رونکردنەوەی هۆی دامەزراندنی پارتی دیمۆکراتی کورد و رونکردنــەوەی پرۆگـرام و پێـڕەوی نـاوخۆی. بەیانێکی مەلا مستەفای بەو بۆنەیەوە تێدا بڵاوکراوەتەوە.

ژ13 ی س2 ی ئەیلولی 1947، وەکو حمیدي لە (ل230- 231) دا ئەڵێ، ئەو هەڵبژاردنــەی ریسـوا کردوە کە نوری سەعید لە ئازاری 1947 دا ئەنجامی داوە. لەو بارەیەوە رزگاری نوسیویێتی:

"هەڵبژاردنەکە ساختە بو... گەل نائیبــەکانی ئــەم ئەنجومەنــەی هەڵنــەبژاردوە بــەڵکو لــە لایــەن نــوری سەعیدەوە تەعین کراون.."

سەبارەت بە پەیمانی تورکی- عیراقی یش نوسیویێتی:

"پەیماننامەی تورکی- عیراقی، کوردی خستۆتە نێوان چەکوش و دەزگاوە"

هەر ئەم ژمارەیە بەیانێکی پارتی تێدایە، بە بۆنەی لە سـێدارەدانی ئەفســەرە کوردەکانــەوە دەرکـراوە. ئەفسەرەکان: عیزەت عەبدولعەزیز، خەیروڵا عەبدولکەریم، مستەفا خۆشناو، محەمەد مەحمود قودسی، بــە هــۆی بەشدارییانەوە لە شۆڕشی بارزاندا. لە 19ی حوزەیرانی 1947 دا لە بەغداد لە سێدارە دران.

ژمارەکانی 17 و 18 س2 ی کـانونی دوەم و شـوباتی 1948، کـە ئیسـتا لــە بــەر دەس دایــە، 14 لاپەڕەیە، لە شێوەی کتێبدا بە حەرف چـاپ کـراوە. لــە لاپــەڕەی یەکــەمیدا بــە ناونیشـانی (عهـد و میثـاق) نوسیویێتی:

"في اعناقنا لشعبنا الكردي المناضل وللعراق ثم للشرقين الاوسط والادنى وللجبهة الديموقراطيـة العالميـة دين سنوفيه كاملا على هدى ونور ماتضمنته الكلمات التالية لزعيمنا وابطالنا وعد.. (لێرەدا هەندێکی لــێ دڕاوە. نم)"

دوای ئەمە بەشێ لە بەیانێکی جەنەرال مستەفا بارزانی نوسیوەتەوە کە ئاراستەی گەلی عیراقی کـردوە و، وەسێتنامەکەی کە چوار ئەفسەرەکە لە شەوی پێش لە سێدارەدانیاندا بۆ گەلی کوردیان ناردوە.

لە لاپەڕەی 2 دا (تحية الشهداء) سـڵاوی رێزنانــە لــە شــەهیدان: مســتەفا خۆشـناو، محەمــەد مــەحمود قودسی، عیزەت عەبدولعەزیز و خەیروڵا عەبدولکەریم.

ل3 تا 8 و نیوەی ل9 وتارێکی بێ سەردێڕە، باسی راپەڕینی کـانونی دوەمـی 1948 و هاتنــە ســەر کاری حکومەتی محەمەد سەدر و هەڵبژاردنی مەجلیسی نیابی ئەکا... لــە کێشــەی بارزانیــەکان و ئابلۆقــەدانی ئابوری کوردســتان ئــەدوێ و بــاس ئــەکا لــە بــاتی ئــەوەی ئـازاد بکـرێن حوکمەکــەیان سـاڵێکی تــر درێــژ کراوەتەوە... لە کێشەی توتن ئەدوێ کە بە چارەسەرنەکراوی ماوەتەوە...

لە ناوەراستی ل3 دا ئەم هەواڵەی بڵاو کردۆتەوە:

"موت المؤرخ: فجع الاكراد وكردستان بموت الرائد الاول لتاريخ (الاكراد وكردستان) معـالي امـين زكـي بک فعزاء الامة الكردية فيما خلفه لها من اثار علمية ستحيط اسمه بهالة من نـور فـي ثبـت الخالـدين الـى ابـد الدهر. هيئة التحرير".

لە ل9 دا "نعي ژدانوف" پرسەی مردنی ژدانۆفە.

لە ل10 دا "مهزلة الانتخابات: صورة من السليمانية" باسی هەڵبژاردنی پەرلەمانی ئەکا لــە سـلێمانی کە چۆن فڕوفێڵی تێدا کراوە بۆ ئەوەی پاڵێوراوەکانی حکومــەت دەربچــن. بــە "گاڵتــەجاڕی هــەڵبژاردن" ناوی ئەبا.

ل11 "امام المجلس العرفي العسكري" باس ئەكا كە حكومەت بە هۆی راگەیاندنی حوكمی عورفییەوە خەڵكانێكی زۆری گرتوە، لەوانە ناوی عەونی یوسف ئەبا كە ئەوكاتە ئەندامی كۆمیتەی ناوەندی پارتی بوە.

ل12- 14 "حول اعلان وزارة الدفاع" لەم وتارەدا لەوە ئەدوێ كە وەزارەتی دیفاع ئیعلانێكی بڵاوكردۆتەوە داوای شوفێری كردوە بۆ لێخوڕینی ئوتومبیلەكانی جەیش بۆ رۆژهەڵاتی ئەردەن بۆ شەڕی فەلەستین، بەڵام مەرجی بۆ شۆفێرەكان داناوە كە ئەبێ لەباوكەوە عەرەب بن. ئەپرسێ لەكاتێكا سەدان سەرباز و ئەفسەری كورد راپێچی مەیدانی شەڕ ئەكرێن بێ ئەوەی لە باوكیان بپرسن كەچی كە دێتە سەر بە كرێگرتنی شۆفێر ئەبێ باوكی عەرەب بێ. ئەمە وەكو نمونەیەكی جیاوازی نەتەوەیی لە عیراقدا باس ئەكا.

ل14 "اخبار من كردستان" هەندێ هەواڵی كوردستانە.

بە پێی نوسینی حمیدي (ل232) ئەبێ لەم ژمارەیەدا، بە بۆنەی پێكهێنانی وەزارەتەكەی محەمەد سەدرەوە بەیانێكی بڵاوكردبێتەوە داواكاریەكانی ئەو سەردەمەی خەڵكی نوسی بێ كە بریتی بون لە:

1. "هەڵوەشاندنەوەی پەیمانی 1930 ی عیراقی- بریتانی.
2. هەڵوەشاندنەوەی مەجلیسی نیابی و ئەنجامدانی هەڵبژاردنێكی ئازاد بۆ ئەنجومەنێكی نوێ.
3. دادگایی كردن و سزادانی ئەوانەی بەرپرسیارن لە خوێنی شەهیدانی گەل و، دادگایی كردنی ساڵح جەبر و نوری سەعید و جەمال بابان و سزادانیان.
4. رێزگرتنی سەربەستیە دیمۆكراتیەكانی كە دەستور دەستەبەری كردون و ماوەدان بە دەربڕینی سیاسی و ژیانی پارتایەتی.
5. چارەسەركردنی گیروگرفتی خۆراك و پۆشاك و دەسكاری قانونی ئینحیساری توتن بە قازانجی جوتیارانی كورد.
6. دەسكاری وەزارەتی ئیستا بە لابردنی ئەو وەزیرانەی كە بە دوژمنایەتی گەل و چەوساندنەوەی ناسراون.
7. هەڵوەشاندنەوەی پەیمانی عیراقی- توركی و ئوردونی- عیراقی.
8. ئازادكردنی هەمو گیراوە سیاسیەكان و تێكڕای بارزانیەكان و یارمەتی دانی راستەقینەی خێزانە ئاوارەكان و، چاكردنی دەزگای حكومەتی و نەهێشتنی بەرتیلخۆری و بەد رەفتاری."

لە ژمارەكەی بەردەستی ئێمەدا ئەم بەیانە نیە.

ژ2 ی س3 ی تشرینی یەكەمی 1948، 14 لاپەڕەیە. لە شێوەی كتێبدا بە حەرف چاپ كراوە. لە لای چەپی ناوەكەیدا نوسراوە: "یا جماهیر الشعب الكردي والعربي كافحوا یدا واحدة ضد الاستعمار وجیوشە ومشاریعە ومعاهداتە ومراكزە وامتیازاتە"

سەروتاری ئەم ژمارەیە پاشماوەی وتارێكی پێشوە بە ناونیشانی: "في سبیل تحریر كردستان (2) القضیة الكردیة والاحزاب العراقیة" ل1- 4 و ل13- 14 ی گرتۆتەوە. هەڵوێستی خۆی لە حیزبی (الاستقلال) و (الاحرار) رون كردۆتەوە.

ل5- 6 (المفوضیة السوفیاتیة والحكومة العراقیة)

ل6- 8 (تعلیقات محطة رادیو الحزب الدیموقراطي الانربایجاني الحرة على الاحداث في كوردستان والعراق)

ل8- 9 (انباء الجهات)

ل10- 12 (رسالة السجن)

# رزگاری

لسان پارتی دموکراتی کورد عراق

يا جماهير الشعب الكردي
والعربي كافحوا يداً واحدة ضد
الاستعمار وجيوشه ومشاريعه
ومعاهداته ومراكزه وامتيازاته

السنة الثالثة العدد ( ٢ ) تشرين الاول ( ١٩٤٨ ) الثمن (٣٠) فلساً

في سبيل تحرير كوردستان ( ٢ )

## القضية الكردية

### والاحزاب العراقية

***

قدمنا في العدد الماضي من مجلتنا تحليلاً مقتضباً لسياسة الحكومة العراقية تجاه الاكراد وكردستان في عهد وزارة الصدر وزارة التخدير والتسكين والوعود الخلابة الفارغة التي عهدها بنصب مجلس نيابي اكثريته من ذات طينة مجلس نوري السعيد تحت ضغط الارهاب والمجالس العرفية العهد الذي اختتم بخطاب العرش المؤكد للتحالف مع بريطانيا على اساس معاهدة ١٩٣٠ الاستعمارية وبشجب ورثة الشعب المتأزمة امام موقف حكومة التعديل السابق لموسى ليوني مزاحم الباجه جي من شعبنا ووطننا فهو لا يفرق عن موقف الشوفيني المتوفي حمدي الباجه جي وصالح جبر بطل بورتسموث الخائن. مع زيادة محسوسة في الاعداء نحوها ونحو العراق باجمعه فالبارزانيون يموتون جوعاً في السجون ولا يمر اسبوع دون اخراج هيكل بارزاني ميت من مستشفى العزل قضى عليه السل الرئوي. وامر جديد هو تجنيد مواطني كردستان الآشوريين في جيش خاص يعد للاعتداء على كردستان مقابل هبة منطقة بارزان لهم. اما العجز المالي في ميزانية الدولة ومعالجته بزيادة نسبة الضرائب فشرها يعم العراق جميعه ولكنها اشد وطأة

له وتاری (لەپێناوی رزگاری کوردستاندا: کێشەی کـورد و حیزبـە عیراقیـەکان) کـە یەکـەم بەشـی لـە ژمارەی پێشودا بڵاوکراوەتەوە، سیاسەتی حکومەتی عیراقی لە سەردەمی وەزارەتی محەمەد سەدردا بەرامبەر بە کورد و کوردستان رون کراوەتەوە. لەم بەشەدا رەخنەی توند لە حیزبەکانی (الاستقلال) و (الاحرار) گیراوە و وتراوە:

"ئەو حیزبانە چەند بەندێکیان بۆ چارەسەری کێشەی فەلەستین کە رۆژێ لە رۆژان مەسەلەیەکی تایبەت بە عیراق نەبوە، خستۆتە ناو بەرنامەی خۆیانەوە، لەکاتێکا مەسەلەی کورد و شۆڕشـی رزگـاریخوازیی کـورد لەناو کرۆکی سیاسەتی عیراقدایە. ئەوی راسـتیبێ حیزبـە عیراقیـە مۆڵـەت پێـدراوەکان خۆیـان لـەوە لاداوە هەڵوێستیان دەرهەق بە کێشە رەواکـەمان ئاشـکرا بکـەن. چونکـە دان نـە بـەم کێشـەیە و نـە بـە شۆڕشـی رزگـاریخوازیی کـوردا نـائێن و، لـەڕوی مەبدەئـەوە پشـتگیری سیاسـەتی چەوسـاندنەوە و زوڵـم و زۆری پێڕەوکراوی حکومەتە یەک لەدوایەکەکانی عیراق ئەکەن".

مام جەلال تاڵەبانی، لە نامەیەکی تایبەتیدا، لە وەڵامی چەند پرسیارێکی منا کە لە بارەی رزگارییـەوە کردبومن، نوسیویەتی و ئەڵێ:

"رزگاری یەکەم ژمارەی لە 2 ی ئـەیلولی 1946 دا بـە زمـانی عـەرەبی دەرچـوە. نوسـەری سـەرەکی سەروتار و مەقالە گرنگەکانی کاک هەمزە عەبـدوڵا بـوە. ناوبـەناو د. جەعفـەریش (جەعفـەر محەمـەد کـەریم) مەقالەی تێدا نوسیوە. موراسیلەکانیش لەشارەکانەوە شتیان تێدا دەنوسی.

"بابەتەکانی زۆرتر لەسەر وەزعی کوردستانی عێراق، جمهوریەتی مهاباد، وەزعـی بارزانیـەکان، کێشـەی شار و شارۆچکەکانی کوردستان و هەندێ روداوی گرنگی نێو دەوڵەتی بوە، جگە لە بیرەوەریەکانی شۆڕشـی ئۆکتۆبەر، مردنی ژدانوف و ...هتد.

"کە بە چاپ دەرچو، حروفچنەکانی کاک زەبیحی و کـاک سـەعید قزلجـی بـون. پاشـان کـە مامۆسـتا هەمزە لە گەڵ شێخ لەتیف تێکی دا، ئیتر هەر کاک قزلجی مایەوە.

"بە تایپ و رۆنیۆش، لە سلێمانی، هەر لە ژێر چاودێری مامۆستا هەمزەدا دەردەچو."

## بڵاوکراوەی تر

پ. د. ک جگە لە رزگاری وەکو لە نوسینەکانی (حمیدي، ل233) دا دەرئەکەوێ، گۆڤارێکی بە کـوردی بە ناوی (مرۆڤ) ەوە دەرکردوە.

هەروەها لە بۆنە گرنگەکاندا بەیان و هەندێ پەخشە و بڵاوکراوەی تریشـی دەرکـردوە. پەخشـەیەکی ئیستا لە بەر دەس دایە، بە تایپ و رۆنیۆ چاپ کراوە. ئەگەرچی مێژوی دەرچونی بە سەرەوە نیـە، بـەڵام بـە پێی ناوەرۆکەکەی ئەبێ ساڵی 1946 دەر کرابێ. ئەو ساڵەی حکومەتی کوردستان لە مەهاباد پێک هاتوە و، پارتی دیمۆکراتی کورد- عیراق دامەزراوە.

**دەقی پەخشەکە بەمجۆرەیە:**

"بۆ میللەتی کوردی هەورامان

"حکومەتی کۆنەپەرسـتی ئێـران بـە درێـژی حـوکمی رەزا شـاهی پەهلـەوی ناکۆکیـەکی زۆری بـە میللەتی کوردی هەورامان چێشـت. فـەلاح و رەنجبـەرانی دێهـات و ناوچـەکانی دەربـەدەر کـرد. باغچـە و پاوانەکانی ئاگر تێ بەردا. لە منداڵ و ژن و پیر کوشتارێکی زۆری کرد. بـەم بۆنەیـەوە ژمارەیـەکی زۆر لەم فامیلیانەی کە تاڵی بێ بەشی و هەژارییان چێشت بو، بـە سـەرگەردانی رویـان کـردە عیـراق. تـاکو

ئیستاش تارمایی ناکۆکی 1934 هەر لە پێش چاوە کە لەشکری ئێران بە پێی فەرمانی شاهانی هێزی هەورامانیان پەرت کرد. هەژاری و ناخۆشی کەوتە ناو میللەت. ژمارەیەکی زۆریان لە برسێتی و دەربەدەری لێ مرد، کە هیچ لە بیر ناچێتەوە.

"ئەی رەنجبەر و رەوشەنفیکرانی رۆڵەی میللەتی کوردی هەورامان!

"هاتنی شەڕی ئەم دواییە کە گشت میللەتە سەربەستەکانی سەرزەمین چونە گێژەڵوکەیەوە بۆ لابردنی فاشیست و وەرگرتنی سەربەستی و رزگار بون لە زۆرداره دیکتاتۆریەکان بو. هەر هێزی ئازادخواهەکان بو کە وای لە رەزا پەهلەوی کرد لە سەر تەختی زۆردارێتی بێتە خوارەوە. هێزی میللەتی ئازەربایجان و کوردی ئێران و هێزی میللەتانی سەرزەمین. کوردەکانی ئێران لەم رۆژەی کەوا هێزی کۆنەپەرستی ئێرانیان لە نیشتمانە خۆشەویستەکەتان دەرکرد حکومەتێکی دیمۆکراسی لە ژێر سەرۆکی پێشەوا جەنابی قازی محەمەد دامەزراند. هەر ئەم حکومەتەیە کە بتوانێ پارێزگاری حقوقی ماڵ و منداڵتان بکات، بۆیە بویتە نیشانگای دەسائیسی حکومەتی کۆنەپەرستی ئێران و عیراق بۆ نەمانی. چونکە دڕکێکە بە چاوی ئیستیعمار و کۆنەپەرستی لە مەش زیاتر خەنجەرێکە لە پەراسویان چەقیوە. ئەم حکومەتەش جێگەی ئومێدی هەمو کوردێکی کوردستانی مەزنە. هێزی ئیستیعمار و کۆنەپەرستی ناتوانن هیچ کارێکی دەرباره بکەن. وە بە قەڵایەکی سەخت ئەمێنێتەوە بۆ سەربەستی کوردستان و گشت گڕوگیفێکی لەشکری ئێران و داوی حکومەتی عیراق و جرتەجرتی ئیستیعمار دەربارەی ئەم حکومەتە، ئەنجامی بێ بەرە.

"جا برایانی هەورامی! پارتی دیمۆکراتی کوردی عیراق بانگتان ئەکات کە ببنە پشتیوانی حکومەتی میللی کوردستان چونکە هەر ئەمەیە کە بتوانێ حقوقی لێ ستاندراوتان بۆ وەرگرێتەوە و تۆڵەی ئەو ناخۆشیانەی کە پەهلەوی لە ساڵی 1934 بە سەری هێنان، بۆتان بستێنێ. هەر ئەم حکومەتەیە حکومەتی دڵسۆزی خۆتان و خۆشیتان پێ ئەگەیەنێ و، برابەشیتان لە نێو بڵاو ئەکاتەوە، هەر ئەمە حکومەتی میللەتی کوردە. جا بە پرۆپاغاندەی ئەم ئاغا بە کرێ گیراوانەی حکومەتە کۆنەپەرستەکان و ئیستیعمار بە هەڵە مەچن و هەڵنەخەڵەتێن، چونکە ئەمانە ئەیانەوێت تاکو مردنتان هەر بە نۆکەری و ژێردەستی بمێننەوە. هەمو شتێکیان لا پەشمە جگە لە پێکهاتنی داخوازی خۆیان و دەست بە سەردا گرتنی حقوقی ئێوە نەبێت، هەر لەم دواکەوتنەدا بمێننەوە برسێتی و هەژاری بتان کرۆژێت. دوای ئەمە ئەکەون کە لە سەر حسابی دەستبەسەری ئێوە خۆیان بە خۆشی رابوێرن.

"ئەی ئاغاکانی هەورامان پارتیمان لە داونانەوە بۆ حکومەتی میللی کوردستان ئاگادارتان ئەکاتەوە هۆشتان لە خۆ بێت نەکەن فریوی ئیستیعمار و حکومەتی کۆنەپەرستی عیراق بخۆن. خیانەت لە گەڵ میللەتی هەورامان و حکومەتی کوردستان نەکەن چونکە لەم خیانەتە جگە لە زیان و شاربەدەرکردن و روسیایی چی ترتان چنگ ناکەوێ، چونکە حکومەتی میللی کوردستان لە سەر بناغەیەکی ئەوتۆ چەسپاوە کە روخانی بۆ نیە جا یەک بن لە گەڵ میللەتی کورد بۆ وەرگرتنی سەرکەوتن و گێڕانەوەی حقوقتان.

"بژی حکومەتی میللی کوردستان

"بژی پێشەوای خۆشەویست جەنابی قازی محەمەد

"بژی پارتی دیمۆکراتی کورد- عیراق پارێزگارێکی دڵسۆزی میللەتی کورد

"بژی میللەتی هەورامان یاریدەدەری حکومەتی میللی دیمۆکراسی کوردستان

پارتی دیمۆکراتی کورد- عیراق"

ساڵی 1948 بە بیانوی شەڕی فەلەستینەوە، لە عیراقدا (ئەحکامی عورفی) ئـیعلان کـرا. هێـزە نیشتمانیەکانی عیراق بە گشتی بەر داپڵۆسین و جەزرەبە کەوتن. ئـەم شـاڵاوە سـەرکردەکانی پـارتی دیمـۆکراتی کوردیشــی گرتــەوە. هەنــدێکیان گیــران و حــوکم دران. هەنــدێکیان وازیــان هێنــا و لــە کاروباری پارتی دور کەوتنەوە. هەندێکیشیان (رەگەزنامەی عیراقی) یان لـێ سـەنرایەوە و لـە عیـراق دەر کران، لەوانە: د. جەعفەر محەمەد کەریم. ژمارەیەکی کەم لە ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی بـەر ئـەم شاڵاوە نەکەوتن، لەوانە: سکرتێری حیزب هـەمزە عەبـدوڵا. بـەڵام ئـەویش لـە کۆتـایی 1949 دا لـە سلێمانی گیرا.

بەمجۆرە یەکەمین کۆمیتەی ناوەندی هەڵتەکی. بڵاوکراوەکانی لە دەرچون کەوت. دەزگای چاپەکەیشیان لە ناو چو.

دوای گیرانی هــەمزە هەنـدێ لـە ئەندامـە چالاکـەکانی حیـزب کۆنفرەنسـێکیان بەسـت. کۆمیتەیـەکی ناوەندی کاتی‌یان پێک هێنا. بەڵام زۆری ئەندامەکانی بەم کۆمیتەیە رازی نەبون و ریزەکـانی پـارتی پشـێوی تێ کەوت، بۆیە بیریان لە بەستنی کۆنگرە کردەوە. بە تایبەتی دوای ئـەوەی هەنـدێ لـە گیراوەکـان بـەربون. هەمزە عەبدوڵاش، لە بەر ئەوەی هیچ بەڵگەیەکی لە سەر نەبو، پاش ماوەیەکی کـورت بـەر درا. ئەمـە لـە بـاتی ئەوەی ببێتە مایەی خۆشحاڵی هاوڕێکانی، گومانی لـە لا دروسـت کـردن. بـۆ چارەسـەرکردنی ناکۆکیـەکانی ناوخۆیان بڕیاریان دا کۆنگرە ببەستن.

### دوەمین کۆنگرەی پارتی

دوەمین کۆنگرەی پ د ک لە مانگی ئازاری 1951 دا لە بەغداد بەسترا.

لەم کۆنگرەیەدا پرۆگرام و پێڕەوی ناوخۆی حیزبەکە بێ دەسـکاری وەکـو خۆیـان هێڵرانـەوە. بـەڵام کۆمیتەیەکی ناوەنـدی نـوێ هـەڵبژێردرا. ئیبـراهیم ئەحمـەد کـە تـازە لـە زینـدان دەرچـو بـو، وە تێکـەڵاوی ناکۆکیەکانی ناو حیزبەکە نەبوبو، هەڵبژێردرا بە سکرتێری حیزب.

لە زستانی 1951- 1952 دا سەرکردایەتی نوێی پارتی توانی سەر لە نوێ دەزگای چـاپ (تایـپ و رۆنیۆ) بکڕێ و لە مانگی ئـەیلولدا دەسـتی کـرد بـە دەرکردنـی (رزگـاری) بـە کـوردی و دەرکردنـی (نـداء کوردستان) بە عەرەبی.

ئیستا چەند ژمارەیەکی خولی دوەمی رزگاری لە بەر دەس دان.

### 5. 2. رزگاری، خولی دوەم

ژ6 س6 ی مارتی 952. 4 لاپەڕەی فولسکابە. بە تایپ و رۆنیـۆ چـاپ کـراوە. هـەموی بـە کـوردی نوسراوە. ناوی رزگاری لە نێوان دو ژوری دروشم دا بە قەڵەم لە سەر رۆنیۆ نوسراوە.

لە ژوری لای راستدا نوسراوە:

"ئەی گەلی کـورد بـانگی ئاشـتی ئیمـزا بکـە کـەوا حـوکمی ئیعدامـە گـەلانی دنیـا بـە سـەر شـەڕ و چەوساندنەوە و ئیمپریالیزمدا داویانە.

"خەباتکردن لە رێگەی ئاشتی‌دا خەباتکردنە لە رێگەی ئازادی و سەربەخۆیی نەتەوایەتی کوردا.

"پایەدار بێ برایەتی کورد و عەرەب بۆ رزگاری هەردوکیان."

لە ژوری لای چەپدا نوسراوە:
"ئەی کۆمەڵانی گەلی کورد خەبات بکەن!
"بۆ نەهێشتنی پەیمانی 1930 و بنکە و فرۆکخانەکانی ئیمپریالیزم.
"(تأمیم) ی نەوت کە کۆمپانیاکان بە تاڵان ئەیبەن.
"لابردنی حکومەتی بۆگەنی نوری سەعید.
"بەرەڵاکردنی حەبسە سیاسیەکان."
سەروتاری ل1، لە جەژنی نەوروزا - لە ڕێگەی نەورۆزێکی نوێدا
ل2 (ترومان هیتلەری بۆردا لە جانەوەریدا)
ل3 (ئازاردانی گیراو پێچەوانەی هەمو هەقێکی ئینسانە)
ل4 (دەنگوباسی ناوخۆ) ی کەرکوک و بەغدا و هەولێر و کۆیە.

لە (لە ڕێگەی نەورۆزێکی نوێدا) ئەمە تەئکید کراوەتەوە:
"بێگومان یەکیەتی دامەزراو و پارتیەیە ئازادیخوازە راستەقینە پێشکەوتوەکانی عیراق لەناو خۆیـان دا و یەک کەوتنیان لە گەڵ پارتی دیموکراتی کورد- نوێنەری کوردستانی داگیرکراوی عیراق- لەسەر بناغەیـەکی وەکو ئەوەی کە حیزبی دیموکراتی کوردسـتان و حیزبـی تـودەی ئێـران و فیرقـەی دیمـوکراتی ئـەزربایجان لەسەری یەک کەوتون، هەنگاوێکی زۆر پێویسـت و زۆر گەورەیـە لەرێگـەی نزیـک خسـتنەوەی نـەورۆزێکی نوێدا، لەرێگەی ئەو رۆژەدا کە کۆمەڵانی خەڵک بەسەرکردەیی دامـەزراوە پێشـکەوتوەکانی سـەری هـەژدیهای ئیمپریالیزمی تێدا پان کرایەوە و دوا دەزگای زوڵم و زۆری سەرەوژێر ئەکەن"

ژ7 ی س6 ی نیسانی 952. 4 لاپەڕەی فولسکابە. بە تایپ و رۆنیۆ چاپ کراوە. هەموی بە کـوردی نوسراوە.

هەمان دروشمەکانی پێشو لە ناوچەوانی لاپەڕەی یەکەمیدا دوبارە کراونەتەوە.
سەروتار، ل1، یادی رۆڵەی نەبەز و پێشەوای نەتەوەی کورد.

ل1- 4 (کورد دوژمـن و دۆسـتی خـۆی بـاش دەناسـێ) لـە سـەر گۆڤـاری ئاگـا و روداوی هەفتـەیی کاروباری ئاڵوگۆڕی ئەمەریکا. 3 لاپەڕە بۆ ئەم باسە تەرخان کراوە. هێرش ئەکاتە سـەر ئەمـەریکا و هـەوڵ ئەدا دەوری ئەمەریکا لە دوژمنایەتی کردنی کوردا رون بکاتەوە. لەکۆتایی وتارەکەدا نوسیوێتی:

"دۆستایەتی نەتەوەی کورد لە گەڵ گەلانی مەزنی سۆڤێتی و دوژمنایەتییان بەرامبەر بـە ئیمپریـالیزمی ئەمەریکی و هەمو هێزێکی ئیمپریالیستی تر وەکو وتمان بـەری تاقیکردنـەوە و کردەوەیـە نـەک دەسـتکردی پروپاگەنـدە و چـاووراو. بۆیـە هـەرگیز نـە پروپاگەنـدەی دامـەزراوی جاسوسـی (کاروبـاری ئـاڵوگۆڕی خوێندەواری ئەمەریکا) و نە قسەی قۆڕی ئەو چەند زۆڵـەکوردەی کـە بەتـەمای ئـەوەن لەسـایەی ئەمـەریکاوە بەناوی کوردەوە بێنە پێشـێ، هـەرگیز درۆ و دەلەسـەی ئەمانـە کـار لـە گـەلی کـورد ناکـات و هـەرگیز ئـەو راستییەیان لەبیر ناباتەوە کە ئەمەریکا سەرەکی جەبهەی شەڕ و ئیمپریالیزم و دنیاداگیرکەرییـە و کـوردیش وەکو نەتەوەیەکی بچوکی بەشـخوراوی داگیرکـراوی خەباتکـەر سـەربەخۆیی و رزگـاری و کامـەرانی خـۆی دەستگیر نابێت بە رماندنی جەبهەی شەڕ و ئیمپریـالیزم نـەبێ، بـە سـەرکەوتنی بـەرەی ئـازادی و ئاشـتی و وەکیەکی گەلان نەبێ، ئەو بەرەیەی کە یەکیەتی سۆڤێت سەرەک و قەڵا و پشتیوانیەتی. بۆیە بە هەمو هێزیەوە دەچێ بەگژ هەمو پرۆژە و پیلانێکی شەڕهەڵگیرسێنەری و دنیاداگیرکەری ئیمپریالیستەکاندا و خەبات دەکات لە ڕێگەی پاراستنی ئاسایش و ئاشتیدا بۆ دەستخستنی رزگاری و ئازادی."

ئەی گەلی کورد بانگی ئاشتی ئیمزا بکە ئەوا
حوکمی ئیمەد اهە گەلانی دنیا بە سەر شەرو
چەوساندنەوەو ئیمپریالیزمدا ئەیانـــــە
خەباتکردن لەرێگەی ئاشتی دا خەباتکردنە
لە رێگەی آزادی و سەربەخوی نەتـــە
وایەتی کوردا .
پایەدار بی برایەتی کورد و عەرەب بـــو
رزگاری هەردوکیان .

# رزگاری

ئورگانی پارتی دیموکراتی کورد ـ عیراق

ئەی کومەلانی گەلی کورد خەبات بکەن بـــو ـ
نەهێشتنی پەیمانی ۱۹۳۰ و بنکەو فروکخانەکانی
ئیمپریالیزم
( تامەم ) ی سەوت کە کوچبانیاکان بەتالان ـــ
ئەدەیەن
لابردنی حکومەتی بوگەنی نوری سعید .
بەرەلا کردنی حبسە سیاسیەکان .

زمارە ( ٦ ) سـال ( ٦ ) مارت ١٥٢

لە جەژنی نەوروزا

## لە رێگەی نەوروزێکی نوی دا

بەپێی ئەفسانە ( اسطورە ) یەکی زانراو نەوروز جەژنی بیرەوەری ئەو روژە پیروزەیە کە گەلی کورد بەسەرکردەیی کاوەی آسنگەر ـ کەللەی سەری (( ضحاك = دەهاك = ئەژدەهاك )) ی زوردار بە چە کوتریان کردەوە و داودە زنگەی زولم و زوری سەرەوژیر کرد ، ـ هەقی داگیرکراوی خوی سەندەوە .

لەم روژەدا کە جەژنی یادگاری رماندنی جەوری زورداری و هەلهاتنی روژی آزادی و سەربەستی و شکانی سوپای سەرماو سولەو زولمی زستان و ژیانەوەی کزوگیاو گەشانەوەی گول و گولالەی دەشتو چیایە . نیشتمانی خوشەویست و رەنگینی کورد کوت کوت و تیکە تیکە کـــراو لەژێر سەختترین بارو درندانەترین حوکمادەژی . هەژدیهای ئیمپریالیزمی خوینمژ هەر بەوەوە نەوەستاوە کە کوردستانی پارچە پارچە کردووە و داویەتە دەستی چەند دەستە جەلاد و بیاوکوژیك وەکو بیسترین زارو ( نەرو ) خەمی ئەمژی وخیرو بەرەکتو کشتوکال و دەرهینراوی کانگاکانی بەتالان ئەبات و گەلی کوردیشی جی هێشتووە نوقمی دەریای نەزانی و هەژاری و نەخوشی بێت . نەربەوەوە نەو وەستاوە کە نەتەوەی کوردی نەك هەر لە بچوکترین و سادەترین هەقی نەتەوایەتی بگرە لە هەموو هەقیکی مروڤایەتیش بێ بەش کردووە . هـــەر بەوەوە نەوەستاوە کە نوکەرانی نیشتمان فروشی عیراقی و فاشیستی جەکەرەتی تورك و کونەپەرستانی ئیرانی وەکو سەگی هار بەرداوەتە سەر مال و گیانی ، وا خەریکە لە کوردستاندا رێگەی جەنگی و پرد و فروکخانە و دەبووعـــمارە دروست ئەکات بو لەشکرو سوپاو تفاق و جبەخانەو بنکەکانی ، ئەیەویت نیشتمانی کورد بکات بە بنکەیەکی عەسکەری ، بیکا بە پرد و بەرد مباز بو هەلکوتانە سەر یەکیەتی سوفیت ـ قەلای سەختی هیزی ئاشتی و ـــ دیموکراتی پشتو پەنای جیهانی چەوسینراوەکان و گەلە آزادی پەرستەکان و دوستو پشتیوانی گەلی نەبەزی کوردی بەشخوراو . ئەیەوی بیکـا بە مەیدانی شەری سییەمی دنیا ، خان و بەرەمان بە تەوەنە بیبری ، لاوانمان بکات بە تەلغانی گوللەو چاوگەی شەر ، باب و داك مندالمان بکات بە خوراکی توپو ئەستیر ، بەهەشتی کوردستان بکا بە جەهەنەمی شەرر لەرێگەی باراستنی و زیاد کردنی قازانجی پیس خویا .

لەم وەختە تەنگوچەلەمەیەدا کە بەسەر گەلی کوردا تی ئەپەریت ، کەوا لەلایەکەوە حکومەتانی کونەپەرستو نیشتمانفروشو فاشیستی نوکەرانی ئیمپریالیزم پیسترین سیاسەتی توقاندن و ازاردانی لەگەل بە کار ئەهینن ، لەسەرانسەری کوردستاندا آسن و خوین و آگـــر حوکم دەکات ، وە لەلایەکی کەشەوە ئیمپریالیزم خوی خەریکە کوردستان و هەموو ولاتانی روژهەلاتی نزیك و ناوەراست ببەستی بە پاشکوی ـ بلوکی روژاواوە کەوا بە تیژترین خیرایی بەرەو تەزار بەتەزار شەر تاو ئەدەن . ئەمەشبە پیچەوانەی ویستن خەباتی گەلانی ئەم ناوچـەیە و بەبارمتی حکومەتە پولیسیە نوکەرەکانی خوی .

لەم کاتە ناسکەدا نەك هەر گەلی کورد بە تەنیا بگرە هەموو گەلانی روژهەلاتی نزیك ناوەراست لە حالیکی بەسامترو بیستر لە حالی کوردا ـ لە دەوری ( ضحاك ) دا دەژین بە دەست ئەژدیهای ئیمپریالیزمی زامداری مەرگ بە چاوی خودیلەو ، وە توولـە مارانی پێچوبەوەر بویە لەم روژەدا چاکترین و پیویستترین آهەنگی نەوروز خەبات کردنە لە رێگەی نەوروزێکی نوی دا کە گەلان سەری هەژدیهای ئیمپریالیزمی تیا پان بکەنەوە .

بە بەرچاوانەوە دەبینین ئەوا گەلان بە عەزمیکی مەردانەوە خەباتیکی قارەمانانە ئەکەن لە رێگەی سەربەخوی و ازادی نیشتمانی خویان و آشتی دنیادا بەرامبەر بە دوژمنی آشتی دنیاو ازادی بەشەر ، بەرامبەر بە دڕندەی پیاوخوری ئیمپریالیزم . گەلی کوردیش هـــەر چەندە هەمیشە بو دەستخستنی هەقی تەواوی نەتەوایەتی خوی بو سەربەخوی رزگاری هەر لە خەباتدا بووە . وە هەمیشە شان بـــە شانی برایانی خەلکی عیراق و ئیران و تورکیا و سوریە بو لابردنی حکومەتانی نیشتمان فروشی ساختە و رماندنی ئیمپریالیزمی اغایان ـــ جەنگیوە و تیهەلچنگی بەلام چونکە خەباتی گەلی کورد لە رێگەی ازادی و سەربەخویدا ـ لەبەر نەبیمەتی پیشکەوتوی دوژمنایەتی سەختی لەگەل ئیمپریالیزم تیکرا بزوتنەوەیکی ازادیخوازانەی پیشکەوتووی شورشگیری دایە کە خزمەتی بزوتنەوەی گشتی بکات و بە شیکە لە بزوتنەوەی گشتی بەپێی پلەی پیشکەوتنی خوی . بویە وەزعی تاسکی ئیمروی کوردستان ـ وەکو سەرچاوەیەکی نەوتو زخیرەو شوینیکی ستراتیجی زورلە ئەهمیەت ـ بە تایبەتی وبەپێی وەزعی ئیستەی روژهەلاتی نزیك ناوەراست و پلەی خەباتی نیشتمانی و نەتەوایەتی گەلانـــ

ماوەتی بو ٢

ژ10 و 11 و 12 و 13 ی ساڵی 6- 7 ی تەموز و ئاغستوس و ئەیلول و تشـرینی یەکـەمی 952. ئەم ژمارانە پێکەوە دەرکراون. 4 لاپەڕەی فولسکابە. بـە تایـپ و ڕۆنیـۆ چـاپ کـراوە. هـەموی بـە کـوردی نوسراوە.

بۆ ڕونکردنەوەی هۆی دەرنەچونی ڕزگاری و دەرچونی چوار ژمارەی پێکەوە، لـە پـاینی دوا لاپـەڕەدا نوسیویانە:

"لە بەر ئەمەی کە ڕۆنیۆ گرفتی تێدا پەیدا بو ڕزگاری بەینێک دەرنەچو"

دو بابەتی تێدایە:

سەروتارەکەی دەربارەی (کۆنگرەسی نۆزدەمینی پارتی کۆمیۆنیسـتی سـۆڤێتی مـەزن) بەیاننامەیەکـە پارتی لە 5 ی 10 ی 1952 دا بەو بۆنەیەوە دەری کردوە.

ل1- 4، لە بابەتی (ئەو هەڵبژاردنەی لە پێشمانە) دا، داوای پێکهێنانی بەرەیەکی نیشـتمانی یـەکگرتوی کردوە بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمانی تازە.

مام جەلال لە هەمان نامەدا بۆی نوسییوم:

"ڕزگاری دەوری دوەم لە ساڵی 1951 ەوە مامۆستا برایم سەرنوسـەر و نوسـەری وتـارە گرنگـەکانی بو. بەکوردی دەردەچو. لە کەرکوک چاپ دەکرا بە ڕۆنیۆ.

"تایپەکەی، خوالێخۆشبو میرزا فەندی عەبدولکەریم دەیکرد کە باشکاتبی مەحکەمە بو.

"ڕۆنیۆکەی، شەهید عەلی حەمدی دەیکرد کە مودیری تاپۆ بو لە کەرکوک.

"دابەشکردنەکەی، مام جەلال دەیکرد کە خوێندکار بو لە کەرکوک.

"مام جەلال لە هەندێ کورتە باس بەولاوە هیچـی تێـدا نـە نوسـیوە. زۆربـەی زۆری نوسـینەکان هـی مامۆستا برایم ئەحمەد خۆی بو."

### سێیەمین کۆنگرەی پارتی

لە 26 ی کانونی دوەمی 1953 دا سێیەمین کۆنگرەی پ د ک لە کەرکوک بەسترا.

لەم کۆنگرەیەدا گۆڕینی بنەڕەتی لە پرۆگرامی پارتی و دروشمەکانیدا کرا:

- ناوی پارتی دیمۆکراتی کورد-عیراق کرا بە پارتی دیمۆکراتی کوردستان.
- بەربەرەکانی دەرەبەگایەتی و ڕیفۆرمی زەوی و داکۆکی لە جوتیاران.
- تەئمیمی نەوت و پیشەسازیە گرنگەکان.
- داکۆکی لە مافی کرێکاران.
- ڕەتکردنەوەی بێلایەنی لە کاروباری ناودەوڵەتاندا.
- پشتیوانی لە ئۆردوگای سۆسیالیستی و دوژمنایەتی ئیمپریالیزم.
- هەڵوەشاندنەوەی ڕێکەوتننامەکانی عیراق و بریتانیا.
- ڕوخاندنی ڕژیمی پاشایەتی و دامەزراندنی جمهوریەتێکی دیمۆکراتی گەلی و ئۆتۆنـۆمی بـۆ گـەلی کورد، خرانە ناو پرۆگرامی نوێی پارتییەوە.

هەر لەم کۆنگرەیەدا بڕیار درا ڕێکخراوی تایبەتی بۆ قوتابیان و لاوان و ئافرەتان دروست بکرێ.

ئەی گەلی کورد بانگی ئاشتی ئیمزا بکە کەوا
حوکمی ئیعدامە گەلانی دنیا بە سەر شەڕو
چەوساندنەوەو ئیمپریالیزمدا دەیانـــــــ
خەبات بکەن لە ڕێگەی ئاشتی دا خەبات بکردنە
لە ڕێگەی ئازادی و سەربەخۆیی نەتەوایەتی
کوردا .
پایەدار بێ برایەتی کورد و عەرەب بـــــــو
ڕزگاری هەردوکیان .

# ڕزگاری

ئۆرگانی پارتی دیموکراتی کوردی ـ
عـــیراق

ئەی کۆمەڵانی گەلی کورد خەبات بکەن بۆ ـ
نەهێشتنی پەیمانی ١٩٣٠ و بنکەو فرۆکخانە
کانی ئیمپریالیزم
( تأمیم ) ی نەوت کە کۆمپانیاکان بە تالان
ئەیبەن .
لابردنی حکومەتی بوگەنی نوری سعید و .
مصطفی عمری و هەموو چەشنە حکومەتێکی وەها
بەرەڵا کردنی حبسە سیاسیەکان .

ژمارە ١٠ – ١١ – ١٢ – ١٣ ســـال ٦ – ٧ تموز ائب اوس ایلول تشرین یەکـــەم ١٩٥٢

ـ ( کۆنگرەسی نوزدەمینی پارتی کۆمۆنیستی سۆڤیـــێتی مەزن ) ) ـ

لەم ڕۆژەدا کە کۆنگرەسی نوزدەهەمی پارتی کۆمۆنیستی سۆڤیێتی ، پارتی پێشرەوی گەلان ، پارتی لینین و ستالینی تیا کـــۆ دەبێتەوە . نەک هەر پرۆلیتاری دنیا ، نەک هەر جوتیارانی چەوساوە ، نەک هەر گەلانی ئازادیخوازی دیلی ژێر دەستی ئیمپریالیـــزم هەموو مرۆڤایەتی پێشکەوتو لە هەموو کونو قوژبنێکی دنیاوە بە یەکجار چاوی پڕ پرشنگی شادی و شانازی ئەبڕنە موسکو ، شاری ڕوناکـــی پایتەختی ئاشـــتی .

نەتەوەی دیل و پارچە پارچە کراوی کورد کەوا ساڵە های ساڵە نە بە زانە بەسود دەچێ بە گژ ئیمپریالیزمی زۆردار و کۆنە پـــە رستی ناڵە بارا هەتا دێت ڕۆژ لە دووای ڕۆژ باشتر هەستی ئەوە دەکات کە چاکترین و کاریگەرترین بڕندەترین چەک بۆ ئەم شەڕی ژیان و مردنەی ئەو دەبێکات سەرمشاکانی ( مبادیء ) مارکس ـ لینین ـ ستالین ە تاقی کردنەوەی ڕۆژانەی خەباتی سات لە سات ـ زیاتر بوی دەر دەخات کە لە بەر تیشکی ئەو سەرمتایە نە بێت و بەبی دەرز وەر گرتن لە گەلان و دەستانەوەو سەر کەوتنی پارتی کۆمۆنیستی سۆڤیاتی مەزن و یارمەتی بە هەڵە کانی ڕێگەی خەبات ڕوناک نابێتەوە و گە یشتنە ئامانجی سەرفرازی و ئازادی و کامەرانی پێک نایەت . لـــە بەر ئەمەیە کە هەتا دێت ژمارەیەکی زۆرتر لە نەتەوەی کورد بە چاوی ماموستاو ڕابەرو یارێدەدەر تەماشای پارتی قارەمانی کۆمۆنیـــستی سۆڤیێتی دەکەن .

نەتەوەی کورد کە بە تاقی کردنەوە بوی دەر کەوتووە یەکێتی سۆڤیێت پشتو پەنای گەلانی ئازادیخوازو پشتیوانی چینی چەوساوەیـــە دەزانی سەربەخۆیی و یەکێتی و ئازادی خوی بە توندی بە ستراوە بە پایەداری و سەر کەوتنی بەرەی ئاشتی و دیموکراسیەوە کە یەکێتـــی سۆڤیێت بەرابەری ستالینی مەزن سەر کردەیەتی . بویە هەموو سەر کەوتنێکی یەکێتی سۆڤیێت بە هەنگاوێکی گەورە دەژمێرێت بەرەو ڕزگاری و سەر بە خۆیی خوی .

پارتی دیموکراتی کورد ئەم کۆبونەوەیە بە هەل دەژمێرێت بۆ پێشکەش کردنی هاوی پاکترین نیازی سەرکەوتن و پایەداری بە گەلانی مەزنی سۆڤیێت .

بژی پارتی کۆمۆنیستی سۆڤیێتی قارەمان هەڵگری ئاڵای ڕزگاری و کامەرانی مرۆڤ . بژی ستالینی مەزن دەستو دۆستی نەتەوەی دەستداری کورد و یەکەم قارەمانی ئاشتی لە دنیادا .

بڕوخێ بەرەی شەڕ فرۆشە بەرزەندەکان دوژمنی خوێنە خوێی سەربەستی گەلان و ئاشتی جیهان .

د/ ١٠ / ٢

پارتی دیموکراتی کورد ـ عیراق

ئەو هەڵبژاردنەی لە پێشمـــانـــە

چاو پیا خشاندنێکی باری ناوەوەی عیراق و وەزعی دنیای عەرەب بە تایبەتی وەزعی کامپی ئیمپریالیستە شەر هەڵگیرسێنە کان بە گشتی زۆر باش دەری ئەخات کە ئەو هەڵبژاردنەی مصطفی عمری دزی ساختەچی فرمانی پێکهێنانی گرتوتە ئەستو ، ئەو پارلەمانەی ئیمپریالیزم ، بە هۆی نوری سعیدی سەرۆک دەلالی یەوە ، دایەتی بەو بە فونتمرات بوی دروست بکات فرمانێکی یەک ئاربـــە ئەهەمیەتە و دەتا بزوتنەوەی دامەزراندنی دیکتاتۆری عەسکەری لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست نزیکدا لە سەر کەوتنا بێت ئـــە هەمیەتی ئەم فرمانەش لە زیاد بونایە .

ئیمپریالیستە شەرهەڵگیرسێنەکان زۆر بە پەرۆشەوە خەریکی ڕێ پاکردنەوەو شوێن ئامادەکردنن بۆ ئەوەی پەیمانی پاریزگاری پە مایەتی بو

لە 18 ی شوباتی 1953 دا یەکێتی قوتابیانی کوردستان-عیراق و، هەر لەو دەوروبەرەدا یەکێتی لاوانی دیمۆکراتی کوردستان- عیراق و، یەکێتی ئافرەتانی دیمۆکراتی کوردستان دامەزران. ئەم ڕێکخراوانە، کە لە لایەن سەرکردە و کادرە پێشکەوتوەکانی پارتی‌یەوە بەڕێوە ئەبران، بۆ ئەوەی بیرو بۆچونەکانیان بڵاوبکەنەوە و، جەماوەر رابکێشن، هەر بە دەزگای چاپی پارتی کەوتنە بڵاوکردنەوەی بەیان و ئۆرگانی تایبەتی خۆیان. یەکێتی لاوان (خەباتی لاوان) و یەکێتی قوتابیان (دەنگی قوتابیان) یان دەرکرد. ئەگەرچی ڕێکخراوی تایبەتی بۆ جوتیاران دانەمەزراند، بەڵام بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی هۆشیاریی سیاسیی جوتیاران (نرکەی جوتیار) ی دەرکرد.

سەرکردایەتی نوێی پارتی، لە دوای کۆنگرەی سێیەم، چەپایەتی کردە ڕێبازی حیزبەکە و، هەوڵی ئەدا بیسەلمێنی کە ئەمان لە شیوعیەکان مارکسیترن و، لە شەڕی ساردی نێوان یەکێتی سۆڤێت و وڵاتانی ڕۆژئاوادا ئەمان گەرمترن.

### 5 .3. رزگاری، خولی سێیەم

هەندێ ژمارەی رزگاریی خولی سێیەم لە بەر دەس دان.

ژ1 ی س7، مانگ و ساڵی بڵاوبونەوەی لە سەر نیە، بەڵام ئەبێ هی 1953 بێ.

رزگاری، جاران لە ژێر ناوەکەیدا ئەنوسرا:

"ئۆرگانی پارتی دیمۆکراتی کوردی-عیراق"

لەم ژمارەیەوە نوسراوە:

"ئۆرگانی پارتی دیمۆکراتی کوردستان-عیراق" و، دروشمەکانیشی گۆڕاوە.

لە لای راستی‌دا نوسراوە:

"ئەی کۆمەڵانی خەڵکی نەبەردی کوردستان خەبات کردنتان لەرێگەی پاراستنی ئاشتی‌دا خەبات کردنە لە رێگەی رزگاری و سەربەستی کوردستان‌دا.

"پایەدار و سەرکەوتو بێ خەباتی گەلان لەرێگەی پاراستنی ئاشتی‌دا.

"بڕوخێ پیلانی شەرهەڵگیرسێنەری ئیمپریالیستە پیاو خۆرەکان"

لە لای چەپی‌دا نوسراوە:

"ئەی کۆمەڵانی خەڵکی عێراق! خەبات بکەن بۆ ئەوەی ڕۆژێک زوتر لە بەینی هەمو دوژمنەکانی ئیمپریالیزم‌دا، لە بەینی کرێکاران و جوتیاران و بیرروناکان و کەسەبە و سنعەتکاران و سەرمایەدارانی نیشتمانی‌دا، بەرەیەکی یەکگرتو پێک بهێنرێت."

سەروتارەکەی بریتی‌یە لە "وێنەی ئەو پرسەنامەیەی پارتی دیمۆکراتی کوردستان- عیراق بۆ کۆمیتەی ناوەندی پارتی کۆمیۆنیستی سۆڤێتی ناردوە" هەروەها "پرسەی ئەندامان بۆ کۆمیتەی ناوەندی پارتی دیموکراتی کوردستان بەبۆنەی کۆچی دوایی سەرکردەی مەزنی مرۆڤایەتی پێشکەوتو ستالینی مەزنەوە"

لاپەڕەی 3 تەرخان کراوە بۆ (بەیاننامەی پارتی بە بۆنەی نەورۆزەوە) کە لە 21 ی 3 ی 1953 دا دەرچوە.

ژ6 ی س7 ی ئاغستۆسی 1953.

کلێشەکەی گۆڕاوە بۆتە مۆر و جوانتر بوە لە جاران. لە سەری لاپەڕەکە نوسراوە: "ئاشتی- دیمۆکراسی- سەربەخۆیی". دروشمەکەی گۆڕاوە و بۆتە جۆرێ لە پرۆگرامی کاری سیاسی حیزب، نوسیویتی:

"ئەی کۆمەلانی خەلکی کوردستانی داگیرکراوی عێراق، ئەی کۆمەلانی خەلکی بەشەرەفی عێراق!

خەبات بکەن بۆ ئەوەی رۆژێک زوتر لە بەینی دوشمنانی ئیمپریالیزمدا، لە بەینی کرێکاران و جوتیاران و بیرڕوناکان و کەسەبە و سنعەتکاران و سەرمایەدارانی نیشتمانیدا بەرەیەکی یەکگرتو پێک بهێنرێت بۆ جێبەجێ کردنی ئەم داخوازیانەی ئامانجی ئیمرۆی هەمو دوشمنانی ئیمپریالیزمن لە عێراقدا:

پاراستنی ولات لە مەترسی شەڕ بە بەهێزکردنی بزوتنەوەی ئاشتیخوازی و نەهێشتنی هەمو بنکە و فرۆکەخانەیەکی جەنگی و گشت لەشکر و سوپایەکی بێگانە لە سنوری دەولەتی عێراق دا و، بەرهەلستی کردنی پەیمانی پاراستنە درۆزنەی رۆژهەلاتی کە ئیمپریالستەکان عەودالین، لە ژێر هەر پەردەیەکدا ئەبێ ببێ.

رمانـدنی ریژیمی کۆنەپەرستی و دەرەبەگی و پۆلیسی و دیکتاتۆری بۆگەنی ئێستەی عێراق و دامەزراندنی دەولەتێکی دیموکراتی بەدلی گەل.

دابینکردنی هەمو جۆرە سەربەستیەکی دیموکراسی بۆ گەلی عێراق.

دەستخستنەوەی سەربەخۆیی راستەقینە و تەواوی عێراق بە لابردنی هەمو ئەو پەیمان و رێکەوتنە زۆرەدارانەیەی ئیمپریالیزم لە گەل نۆکەرە نیشتمانفرۆشە عێراقییەکانی بەستویە.

دەستخستنەوەی سەربەخۆیی ئابوری (اقتصادی) تەواوی عێراق بە نەهێشتنی هەمو ئەو رێکەوتن و ئیمتیازانەی سەروەت و سامانی ولاتیان پێ بە تالان دراوە بە کۆمپانیا ئینحیصاریەکانی بێگانە."

لە باتی سەروتار: "بانگی پارتی دیمۆکراتی کوردستان- عیراق و حزب وحدة الشیوعیین في العراق"

"لە رێگەی بەرەیەکی نیشتمانی یەکگرتودا"

(لە سەرەتای مایسی 953 دا نوێنەری هەردو پارتی کۆبونەوە...

هەمان ژمارە (بەیاننامەی حیزبی دیمۆکراتی کوردستان بە بۆنەی دامەزراندنی حکومەتی نەتەوایەتی کوردستانەوە) ی بلاوکردۆتەوە.

ژ2 ی س8 ی مارتی 1954. باسەکانی بریتین لە:

بەیاننامەی 5 ی 3 ی 1954 ی پارتییە بە بۆنەی (بیرەوەری یەکەمین سالی کۆچکردنی ستالینی مەزن) ەوە.

لەم بەیانەدا ئەلێ:

"پارتی دیمۆکراتی کوردستان- عیراق لەم رۆژەدا کە یادی یەکەمین سالی کۆچکردنی ئەم قارەمانە بلیمەتەی دنیا و ئەم باوکە دلسۆزەی نەتەوەی کوردی چەوساوە و زۆرلێکراو ئەکاتەوە، بانگی کۆمەلانی خەلکی کوردستان ئەکا بۆ هەلگرتنی چەکی لە خەباتدا قالبوی مارکسیزم - لینینیزم، ئەو چەکەی قەیسەری لە روسیادا رامالی و سۆشیالیزمی لە جێ دامەزراند، ئەو چەکەی هێزی پیاوخۆری خوێنمژی هیتلەری لە ناو برد، ئەو چەکەی هێزی یەکگرتوی ئیمپریالیزمی ئەمەریکی و کۆنەپەرستی چینی سەرەونگون کرد، ئەو چەکەی کە بێگومان کوردستانی دیلی پارچە پارچە کراویش بە سەربەخۆیی و یەکێتی و کامەرانی ئەگەیەنێ، پارتی دیموکراتی کوردستان-عیراق بەم بۆنە پر داخ و ئازارەوە بەلێن ئەدا بە کۆمەلانی خەلکی کوردستان کە لە سەر پەیرەوی تەعالیمی کۆچکردوی نەمرمان ئالای ئاشتی و سەربەخۆیی نیشتمانی و سەربەستی دیموکراسی هەلگرێ، هەروەکو تا ئێستە هەلیگرتوە و، بیبا بۆ پێشەوە."

"لە موحاکەمەی دکتۆر موصەدەق‌دا دیسانەوە شاهی خائین حوکم ئەدرێ" وتارێکە لە ڕۆژنامەی "مردم"ی حیزبی تودەی وەرگرتوە.

"پەیام بنێرەوە ئەو شوێنە پیسەی لێی دەرچوە" لە ژێر سەردێڕی وتارەکەدا ئەم پەندەی نوسیوە: "ئەی گەلی نەبەزی کورد ئیمپریالیزم سێ سەرە دوشمنتە: دوشمنی خۆتە، دوشمنی دۆستتە، دۆستی دوشمنتە." ئەم وتارەی بە بۆنەی دەرچونی گۆڤاری (پەیام) ەوە نوسیوە. پەیام لە لایەن (کاروباری ئالوگۆڕی خوێندەواری ئەمەریکا) ی سەفارەتی ئەمەریکی لە بەغداد دەرکراوە.

"ڕێککەوتنی تورکیا- پاکستان هەڕەشە لە یەکیەتی خەبات و ئاشتی گەلانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست ئەکا" وتارێکە لە شێوەی بەیاندا بە ئیمزای پارتی‌یەوە بڵاوکراوەتەوە.

لە ژێر سەردێڕی "دەنگوباس" دا هەندێ هەواڵی سلێمانی و هەڵەبجەی بڵاوکردۆتەوە.

ژ2 ی س9 ی حوزەیرانی 1955. 6 لاپەڕەی فولسکابە. بە تایپ و ڕۆنیۆ چاپ کراوە.

لە لای ڕاستی‌یەوە نوسراوە:

"ئەی کۆمەڵانی خەڵک تێکۆشن بۆ پێکهێنانی بەرەیەکی نیشتمانی یەکگرتو لە بەینی هەمو پارتی و دامەزراوە نیشتمانیەکان و هەمو دوژمنەکانی ئیمپریالیزمدا، بۆ لابردنی حکومەتی نوری سەعیدی خاین و هێنانی حکومەتێکی نیشتمانی.

لە لای چەپی‌یەوە نوسراوە:

"ئەی کۆمەڵانی خەڵک خەبات بکەن بۆ هەڵوەشاندنەوەی مەجلیسی داتاشراو، لابردنی مەرسوم و قانونە فاشیستی‌یەکان، بەرەڵڵا کردنی هەمو سەربەستی‌یە دیمۆکراسیەکان، سەربەستی نوسین و بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕ، سەربەستی کۆبونەوە و خۆنواندن، سەربەستی پارتی و کۆمەڵ و نەقابە دانان."

سەروتارەکەی: "بەرەی نیشتمانی یەکگرتو تەنها هێزە بتوانێ ئیمپریالیزم بشکێنێ و پرۆژەکانی ژێر خا". ئەم وتارە لە "نداء کردستان" وەرگیراوە.

بابەتێکی تری، بەیاننامەیەکی پارتی‌یە لە 19 ی 6 ی 1955 دا لە ژێر سەردێڕی: "ئەی گەلی کوردی نەبەز شەهیدانی ڕێگەی ئازادیت لەبیرنەچێ!" دەری کردوە بە بۆنەی یادی هەشت ساڵەی لەسێدارەدانی چوار ئەفسەرەکەوە.

لەم بەیانەدا نوسراوە:

"نەتەوەی کورد ڕێگەی ڕزگاری و سەربەخۆیی خۆی دۆزیوەتەوە کە ئەویش خەباتکردنی شۆڕشگێڕی و تێکەڵکردنی ئەم خەباتەی خۆیەتی لە گەڵ خەباتی هەمو گەلانی ئازادیخواز و ئاشتی‌پەرستی دنیا، شوێن سوپێری خۆی دۆزیوەتەوە کەوا لە کامپی ئاشتی و دیموکراسی‌دا کە سەرکردەکەی دۆستی مەزنی نەتەوەی کورد یەکیەتی سۆڤێتە...... چەکی خۆی دیوەتەوە کە ئەویش چەکی کاریگەری لە تەجروبە دەرچوی مارکسیزم - لینینیزمە"

بۆ یەکەمین جار لەم ژمارەیەدا بێ ناوی دانەر شیعری (دوا تیری کەوان) بڵاوکراوەتەوە. ئەم شیعرە، کە یەکێکە لە شاکارەکانی ئەدەبی بەرەنگاری- کوردی، ئیبراهیم ئەحمەد ساڵی 1948 لە زیندانی ئەبو غرێبدا دایناوە. سەرەتاکەی بەمجۆرە دەس پێ ئەکا:

دوا تیری کەوانی خۆت بهاوێژە هەلە دوژمن

دوا سەرکەوتنی تۆیە دوا نوچی گەلە دوژمن
شەوی ترساندنت سامی نەماوە، تاریک و رونە
بە ئاسۆی ئەرخەوانی‌دا هەتاو لەو دیو کەلە دوژمن

## بڵاوکراوەی تر

جگە لە (رزگاری) کە ئۆرگانی ناوەندی بوە، پارتی، بۆ رۆشنبیریی پارتایەتی بڵاوکراوەی (رێگەی نوێ) و بۆ هوشیارکردنەوەی جوتیاران (نرکەی جوتیار) و چەند پەخشەی تری بڵاوکردۆتەوە:

### 5. 4. نداء کوردستان

تەنیا یەک ژمارەی لە بەر دەس دایە ئەویش ژ2 ی مایسی 1956 ە. 6 لاپەڕەی فولسکابە. بە تایپ و رۆنیۆ چاپ کراوە. هەموی عەرەبی‌یە. بابەتەکانی ئەمانەن:

"لەپێناوی یەکخستنی جوڵانەوەی دیموکراتی شۆڕشگێڕ لە کوردستانی داگیرکراوی عیراقدا" باسی پێویستی و ناچاری یەکخستنەوەی حیزبەکانی کوردستان لە یەک حیزبی یەکگرتوی پێشرەودا ئەکا. ئەوە ئاماژەیە بۆ یەکگرتنەوەی هەردو باڵی هەمزە عەبدوڵا و ئیبراهیم ئەحمەد لە پارتی دیموکراتی یەکگرتوی کوردستان‌دا.

"جوانرۆ یەکەم قوربانی بو" لە رزگارییەوە وەرگیراوە و تەواوکەری ژمارەی پێشوە. سەبارەت بە پەلاماری ئەرتەشی ئێرانە بۆ سەر کوردی ناوچەی جوانرۆ.

"گەوهەری دیموکراسی میللی" باسێکی تیۆری تەواونەکراوە.

### 5. 5. نرکەی جوتیار

ژ5 ی س1 ی ئەیلولی 1953 ی نرکەی جوتیار، دەوری ناوەکەی:

لای سەروی لێ‌ی نوسراوە: "زەوی بۆ جوتیار".

لای خواروی ئەم وتەیەی ستالین هێنراوەتەوە: "جوڵانەوەی نیشتمانی لە جەوهەریا جوڵانەوەی جوتیارانە".

لای راست نوسراوە: "برایانی جوتیار تێکۆشن بۆ لە رەگوریشەوە هەڵکەندنی شێوەی ژیانی دەرەبەگی. بۆ لابردنی دۆنم و سەربەستکردنی هەمو جۆرە کشتوکاڵێک. بژی برایەتی جوتیار و کرێکار لەرێی ئاشتی و ئازادی‌دا"

لای چەپ ئەم شیعرە نوسراوە:
"گەلێ کە مێژوی بە خوێن نەنوسرێ،
چۆن تۆڵەی ژینی دوارۆژ وەرئەگرێ؟
یا کەی سەربەستی بە کەس دراوە؟
کە هەر بە خوێن و خەبات ئەسەنرێ"

دەرد و دەرمانی جوتیاران و دەنگوباس لە بابەتەکانیەتی.

ژ6 ی س1 ی تشرینی یەکەمی 1953 و ژ7- 8 ی س1 ی تشرینی دوەم و کانونی یەکەمی 953 دەرچوە.

ئاشتی      دیموکراسی      سەربەخۆیی

ئەی کۆمەلانی خەلکی کوردستانی داگیرکراوی عیراق، ئەی کۆمەلانی خەلکی بەشەرەفی عیراق!
خەبات بکەن بۆ ئەوەی ڕۆژێک زووتر لەبەینی دوژمنانی ئیمپریالیزمدا، لەبەینی کرێکاران وجووتیاران و بیرەڕووناکان و کاسبە و سنعەتکاران و سەرمایەدارانی نیشتمانیدا بەرەیەکی یەکگرتوو پێک بهێنرێت بۆ جێبەجێ کردنی ئەم داخوازیانەی ئامانجی ئەمڕۆی هەموو دوژمنانی ئیمپریالیزمن لەعیراقدا: (١) ـ پاراستنی ولات لەمەترسیی شەڕ بە بەهێزکردنی بزووتنەوەی ئاشتی خوازی ونەهێشتنی هەموو بنکەو فڕۆکخانەیەکی جەنگی وگشت لەشکرو سوپایەکی بێگانە لەسنووری دەولەتی عیراقدا، وهەڵوەشاندنی کردنی پەیمانی پاراستنە دروزنەی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست کەئیمپریالیستەکان عەودالین، لەژێر هەر پەردە یەکدا ئەبێ ببێ. (٢) ـ ڕماندنی ڕژێمی کۆنەپەرستی پەرەبەیەکی پۆلیسی دیکتاتۆری بۆگەنی ئێستەی عیراق ودامەزراندنی دەولەتێکی دیموکراتی بەدلی گەل. (٣) ـ دابین کردنی هەموو جۆرە سەربەستیێکی دیموکراسی بۆگەلی عیراق. (٤) ـ دەستخستنەوەی سەربەخۆیی ڕاستەقینەو تەواوی عیراق بەلابردنی هەموو ئەو پەیمان ڕێکەوتنانە زۆرە ملێیەی ئیمپریالیزم لەگەل نۆکەرە نیشتمانفرۆشە عیراقیەکانی بەستوویە (٥) ـ دەستخستنەوەی سەربەخۆیی ئابووری (اقتصادی) تەواوی عیراق بەنەهێشتنی هەموو ئەو ڕێکەوتن و ئیمتیازانەی سەروەت و سامانی ولاتیان پێی بە تالان دراوە بەکۆمپانیا ئیحتکارچیەکانی بێگانە.

# ڕزگاری

ئۆرگانی پارتی دیموکراتی کوردستان ـ عیراق

ژمارە (٢)      مارت ١٩٥٤      سال (٨)

## بیرەوەری یەکەمین سالی
## کۆچکردنی (ستالینی مەزن)

پار لەم ڕۆژەدا مرۆڤایەتی پێشکەوتوو خەباتکەرێکی نەبەز، چینی پرولیتاری ڕابەرێکی شارەزا و مامۆستایەکی زانای بەرز، گەلانی ئاشتیخواز وئازادی پەرستی دنیا دۆستێکی بەنرخی دلسۆز، ئاشتی وئاسایش قارەمانێکی مەزن وەکیەتی سۆڤیەت وپارتی دلێری کۆمونیستی ولاتی سۆڤیەت پێشوا وڕێ ـ پیشاندەرێکی بلیمەتیان لەکیس چوو.

هەڤالی نەمر یوسف فیساریونوڤیچ ستالین، ئەگەرچی بەم کۆچکردنەی بەدیمەن لەناو وون بوو، بەلام تعالیمی بەرزی، ئەو سەروەت و سامانە بێ بەهایەی خستوویەتە سەر گەنجینەی بێ بنی مارکس ـ ئەنگلز ـ لینین، ئەو گەشەپێکردن و بۆپێشەوە بردنەی لە تەعالیمی زیندووی مارکس ـ ئەنگلز ـ لینیندا پێکی هێناوە وەکوو ئەستێرەیەکی گەشنە وەکوو ڕۆژ ڕێگەی خەبات بۆکۆمەلانی خەلکی هەموو ولاتانی دنیا ڕووناک ئەکاتەوە لەو خەباتە سەختە یانەدا کە لە پێناوی ئاشتی و دیموکراسی و سۆشیالیزمدا ئەیکەن بەرامبەر بە ئیمپریالیزم دوژمنی خوێنمژی مرۆڤایەتی.

پارتی دیموکراتی کوردستان ـ عیراق لەم ڕۆژەدا کە یادی یەکەمین سالی کۆچکردنی ئەم قارەمانە بلیمەتەی دنیا وئەم باوکە دلسۆزەی نەتەوەی کوردی چەوساوەو زۆرلێکراو ئەکاتەوە بانگی کۆمەلانی خەلکی کوردستان ئەکا بۆهەلگرتنی چەکی لەخەباتدا قال بووی مارکسیزم ـ لینینزم، ئەو چەکەی قەیسەریەتی لەڕووسیادا ڕامالی وسۆشیالیزمی لەجێ دامەزراند، ئەو چەکەی هێزی پیاوخۆری خوێنمژی هیتلەری لەناوبرد، ئەو چەکەی هێزی یەکگرتووی ئیمپریالیزمی ئەمریکی وکۆنە پەرستی چینی سەرەونگوون کرد، ئەو چەکەی کە بێ گومان کوردستانی دیلی پارچە پارچە کراویش بە سەربەخۆیی و یەکیەتی وکامەرانی ئەگەیەنێ. پارتی دیموکراتی کوردستان ـ عیراق بەم بۆنە پڕ داخ وئازارەوە بەلێن ئەدا بە کۆمەلانی خەلکی کوردستان کەلەسەر پەیڕەوی تەعالیمی کۆچکردووی نەمر ئالای ئاشتی و سەربەخۆیی نیشتمانی و سەربەستی دیموکراسی هەلگرێ، هەروەکوو تا ئێستە هەلیگرتووە، وبیبا بۆپێشەوە.

ئیتر بژی یادی یەکەمین سالی کۆچکردنی ستالینی نەمر
بژی پارتی کۆمونیستی یەکیەتی سۆڤیەت، پارتی قارەمان و نەبەز، پەروەردەکراوی لینین و ستالین!
بژی ئاشتی بەینی گەلان.

٥/٣/٩٥٤      (پارتی دیموکراتی کوردستان ـ عیراق)

آشتی — دیموکراسی — سەر بەخۆیی

ئەی کۆمەلانی خەلک تێبکۆشن بۆ
پێکهێنانی بەرەیەکی نیشتمانی
یەکگرتو لە بەینی هەمو پارتی
و دامەزراوە نیشتمانی یەکان
وە هەمو دوژمنە کانی ئیمپریالیزمدا
بو لابردنی حکومەتی نوری سعید
خائن و هێنانی حکومەتێکی نیشتمانی

# رزگاری

ئورگانی پارتی دیموکراتی کوردستان ـ عیراق

ئەی کومەلانی خەلک خەبات بکەن بو ـ •
هەلوەشاندنەوەی مەجلیسی دا تلشراو
بردنی مەرسومو قانونە فاشیستی یەکان
بەرەللا کردنی هەمو سەر بەستی یـــە
دیموکراسیەکان •
سەر بەستی نوسین و بلاو کردنەوی بیروباوە
سەر بەستی کوبونەوەو خوپیشاندن •
سەر بەستی پارتی و کومەلو نەقابە دانان

ژمارە ٢ — حزیران ٩٥٥ — سال (٩)


بەرەی نیشتمانی یەکگرتـــــــــــــــــو

تەنیا ئەمەیە کە بتوانی ئیمپریالیزم بشکێنێ و پروژەکانی زیرخـــــا

بەو جەژنەی دیمان پەیمانی تورکیا ـ عیراق بەسترا • وە لەلایەن هەردو مەجلیسەوە بە نزیکەی گشـــتی دەنگ پەسند کرا • دەیان بی شیرو شەپوری بێسود وە بی عەررشەی گوررشەی پرو پوچ لە هوی ئەم سەر کەوتنە خراو ئاسانەی ئیمپریالیزمو نوکەرانی بتوژینەوە • هەندی کەس ئەم سەر کەوتنە بە عەتتابەیکی تەبیعی داکەنی سەرەتاو دەست پی کردنی خو کوکردنەوە کانی پیشەوەی کە بریتین لە • داتاشینی مەجلیسێکی ساختە کە پڕ بی لە نوکەرو ـ خائنە تاقی کراوەکان • وە دەر کردنی رەوەبەیە مەرسومی پوچەیانەی دەستوری عیراق و پەیمانی ئەقەکانی ئینسان " وە هەلوەشاندنی هەمو پارتی و کومەلو یانەکان • وە داخستنی هەمو نەقابە کریکاری یەکان وە هەلبریزو گرتنی سەر ـ کردەکانیان • وە نەهیشتنی ئیمتیازی هەمو گوفارو رۆژنامەکان وە ئاوە نەدان بە دەر کردنەوەی تەنیا چەنـــــد ژمارەیە نەبی کەوا خاوەنەکانیان بەلێنیان داوە بە حکومەت بی پرسو رای کار بە دەستان هیچ شتی نەنوســـن: وە (فصلی) ماموستایان و مامورانە بە کومەلو ناردنیان بو دەورەی (احتیاط) • وە دەر کردنی دەیان قوتابـــی و راپیچ کردنیان بو عەسکەری • وە گرتنی سەدان هاو نیشتمانی بلەو بی وەی بە خوتو غوررایی • وە خستنە ژیر دەست وە سپاردنی نەک هەر ئاسایش و سەر بەستی بەلکو چارە نوس و ژیانی خەلک بە جاسوسانی بی ویژدان و ـ شەرەفەوە نە هیشتنی تورە ئەو شتەی ناویان لینابو " سەر بە خویی محکمەو سەر بەستی حاکم " وە بلاو کردنـــەوەی گیانی ترس و توقاندن لە سەرانسەری وولاتدا • وە دامەزراندنی حوکمێکی عورفی پولیسی بەبی هیچ لاوێکی قانونی یا رێپیدانی •

راستە ئەم ناوچە بە سانە یارمەتی ئەوەی دا کە پەیمانە کەو ئەوەندە بە سوکو ئاسانی ببەستری کـــــە خاوەنەکانیشی بە خەیالیاندا نە ئەهاتــــە بارەت بەوی هەمو دوژمنە خوینی یانەی کار بە دەستانی عیراق پاوە ـ روانی ئەوەیان لی ئەکردن کە هیرشی تەند بهێننە سەر پەیدانەکە وە بەر گری لاسارانەی بەستنی بکەن بە لەناوەوە چ لە دەرەوەی عیراق بەلام وەکو ئەبینین ئەم لیکدانەوەیە بومان دەر نا کەوێ کە بوچی نوری سعید توانی وا بـــــە خراپی و ئاسانی وە بەبی بەرنگاری هیچ سەر گری یەکی ریکو پیکی ئەم ناوچە بەسانە نوری کرد ؟ بە تایبەتـــی لە کاتیکدا کە هەمو ئەو بەلگانەی بە رووەوە بون پایان نیشان ئەدا کە زور پیش زیر ئەکەوی • جاری هەرای ئەو هەلبژاردنەی هەمو پارتی یە نیشتمانی یەکان ی تی چون لە قابینەی ارشد العمری دا ـ ئەگەر بی وەکو پیویست بە کاریش نە هینرا ـ بە شیکی فراوانی کومەلانی خەلکی لە خەوی قور سیان راست کردبووەوە وە نزیکی خستبووەوە ـ لە مەیـــدانی خەباتەوە وە ئەو توندی تیژی و سانەی فیلەی حکومەت لە هەلبژاردنەکەدا نواندی کومەلانـــــی خەلکی هوشیار تری بە رەنگی زوروودانە کە ئامادە بن بو هەمو ئیدا کاری یەک لە پیناوی رزنار بونا لەو بوسەتیو

# نداى كوردستان

العدد ٢ — مايس — سنة ١٩٥٦


### في سبيل توحيد الحركة الديمقراطية الثورية في كردستان العراقية المغتصبة

ان توحيد حركة الجماهير الديمقراطية الثورية في كردستان العراقية المغتصبة كان من اقدس اهداف حزبنا منذ تأسيسه . ليس هذا فحسب بل ان تأسيس حزبنا نفسه من قبل زعيمنا البطل المارشال مصطفى البارزاني كان بقصد صهر كافة اجزاء الحركة الديمقراطية الثورية المجزأة آنذاك في كيان حزبنا باعتباره الحزب الطليعي . اذ كان واضحا لدى الزعيم وزملائه كما كان واضحا لدى الواعين جميعا ان وجود حزب طليعي ( نموذجه الحي حزب ديموكراتي كورد ستان المجيد الذي كان قد حرر جزءا من كوردستان الايرانية المغتصبة ) كان الخطوة الاساسية الاولى لنجاح نضال جماهير كوردستان الجنوبية المغتصبة الكادحة المظلومة في سبيل التحرر والسعادة والديمقراطية .

وبالرغم من ان صحة وضرورة وجود مثل هذا الحزب الطليعي ( الذي تحتم وجوده مستلزمات تقدم وانتصار نضال جماهير كوردستان كما تحتمه ضرورة التمهيد لتطهير الحياة المادية للجماهير وتحريرها اي تحتمه ضرورة تاريخية ملحة ) كانتا واضحتين للواعين جميعا ونالتا التأييد الحار من قبل ( حزب شورش ) في البداية والتأييد الصميمي الى النهاية من قبل ( حزب رزكارى كورد ) غير ان من المؤسف كان انحراف جماعة من الشورشيين بدافع الجهل وحب الذات والانتهازية في بداية تأسيس حزبنا عن السبيل السوي وانجرافهم مع تيار القاعديين الخاطئ وبذلك اصبحوا المسؤولين عن هذه التفرقة الموجودة الى الآن والتي مازالت العناصر الثورية الواعية تئن منها . ومع ان ( حزب ديموكراتي كوردستان ) قرر بالاجماع الالتحاق بحزبنا بعد مرور مدة قصيرة على تأسيسه الا ان وحدة القوى الديمقراطية الثورية في كوردستان - العراقية المغتصبة التي كانت هدف حزبنا وامنية جميع الوطنيين الاكراد الواعين المخلصين لم تتحقق ولقد اتت الوضعية الحالية للحركة الديمقراطية الجماهيرية في كوردستان الملحقة بالعراق ناتجة قبل كل شيء عن انعدام الحركة الديمقراطية الطليعية فيها . وفي رأينا ان السبب الاساسي لعدم تحقق الوحدة طوال هذه المدة منذ تأسيس حزبنا يرجع الى النقائص والاهمالات التي حدثت في پارتينا اذ لولا هذه النواقص والاهمالات ولو قام حزب طليعي وجوده ضرورة تاريخية مثل حزبنا بواجبه بهمة ونشاط كما كان مفروضا لتغلب حتما على كافة اخطاء وتخريبات وانتهازية وانحرافات جماعة القاعدة اليمينية واليسارية وحقق الوحدة منذ امد بعيد . ومع الاعتراف بهذه الحقيقة يجب التسليم بحقيقة اخرى وهي ان حزبنا ظل يواصل النضال الى الآن لتحقيق هذه الوحدة .

والآن في الوقت الذي يشدد الاستعمار من الامريكان والانكليز وعملائهم من الاتراك والعرب والعجم هجماتهم علينا لادامة استعبادهم لنا واستغلالهم ايانا وافقارهم لجماهير كوردستاننا العزيزة وبقصد جعلها قاعدة - حربية للانقضاض منها على صديق شعبنا الوفي الاتحاد السوفياتي الجار وبقصد تحويل مدننا وقرانا وبيوتنا الى خرائب مهجورة واغراق وطننا في بحر من الدماء والدموع . في الوقت الذي يعلن فيه اعضاء ميثاق بغداد الحربي بصراحة ان عدوهم الاقليمي الذي عقد الميثاق للقضاء عليه هو الشعب الكردي ليس الا -

**5. 6. ڕزگاری، بەرەی پێشکەوتو**

هەمزە عەبدوڵا کە لە حیزب دور خرایەوە، بەو سزایە ڕازی نەبو، دریژەی دا بە چالاکیی حیزبی:

لە لایەکەوە، دریژەی بە کاری ڕێکخراوەیی دا. کەوتە ڕێکخستنەوەی ئەنـدامانی لایـەنگری خـۆی، بـە هەمان ناوی پێشویەوە: پارتی دیموکراتی کوردی- عیراق. بـەڵام بـۆ ئـەوەی لـە باڵەکـەی تـری حیـزب جیـا بکرێتەوە، بە کوردی (بەرەی پێشکەوتو) و بە عەرەبی (الجناح التقدمي) خستە سەر ناوەکەی.

لە لایەکی ترەوە، کەوتە دەرکردنەوەی ڕزگاری بە کوردی و عەرەبی.

هەندێ ژمارەی ئەم خولەی ڕزگاری، کە هەمزە دەری کردوە، لە بـەر دەس دان. هـەمان ڕیـزی ژمـارە و ساڵی ڕزگاری بۆ دانراوە. پێ ئەچێ مانگانە دو ژمارەی لێ دەرچوبێ. ژمارەیەکی بە کوردی و ژمارەیەکی بـە عەرەبی. بەڵام وتارەکانی بە هەردو زمان هەمان بابەتن و تەرجومە کراون.

ژ3 ی س8 ی کانونی یەکەمی 1953. 15 لاپەڕەی نیو فولسکابە لـە شـێوەی گۆڤـاردا. بـە تایـپ و ڕۆنیۆ چاپ کراوە. دروشمە سیاسیەکانی لە سەروی ناوی ڕزگارییەوە نوسیوە:

"لە پێشڕەوی گەلی کوردا خەبات ئەکەین:

1. بۆ ڕزگارکردنی عیراق ڕزگارییەکی سیاسی و ئابوری و ئایـدیۆلۆجی لـە ئیمپریـالیزمی ئـەنگلۆ- ئەمریکا و چینی کۆنەپەرستان.
2. بۆ ڕزگارکردنی چینی جوتیاران لە دەرەبەگ بـە نـابوتکردنی سیسـتەمی فیـۆدالی لـە زەویـدا وە دابەشکردنی زەوی بە سەر جوتیاران.
3. بۆ پێکهێنانی حوکمێکی زاتی لە کوردستانی عیراق دا.
4. لە پێناوی ئاشتی و دیموکراتیدا."

سەروتار: "بەرەی پارتی و دەستە دیموکراتیە نیشتمانییەکان پێویسـتیەکی زۆر بـە پەلەیـە." ئـەم وتـارە پرۆگرامـی پێشـنیار کـراوی بـەرەی پێشـکەوتوە بـۆ هـەمو هێزەکـانی عیـراق کـە لـە بەرەیـەکی یەکگرتودا کۆ ببنەوە.

لە پاینی دوا لاپەڕەیدا نوسیوێتی: "لە لایەن بەرەی پێشکەوتوی پـارتی دیمـۆکراتی کـورد- عیراقـەوە دەر ئەچێت.

ژ3 بـە عـەرەبی، هـەمان بابـەت و بـە هـەمان قـەوارە و شـێوە چـاپ کـراوە. لـە پـاینی دوا لاپـەڕەی عەرەبییەکەیدا نوسراوە: "صادرة عن الجناح التقدمي لبارتي ديموكراتي كورد- عراق".

ژ4 ی س8 ی کانونی دوەمی 1954، 12 لاپەڕەی هەمان قەبارەیە. لە بابەتەکانی:

نامەی شێخێک،

پرۆژەی قەلاچۆکردنی مێشولەی لەرزوتا لە سلێمانی،

یادی لینین،

بێریای خائین،

یادی ڕاپەڕینەکـەی کـانونی دوەمـی 1948 کـە بەیاننامەیـەکی 27 ی 1 ی 1954ی ئـەو باڵـەی پارتییە.

ئەم دو ژمارەیەی دوایی بە هەمان بابەت و مێژوەوە بە عەرەبی دەرکراون.

له پیش ره وی گه لی کورد ا خه بات ئه که ین

١ ــ بو رزگار کردنی عراق رزداری یه کی سیاسی و ئابوری و ئاید ولوجی له امپریالیزمی ئه نگلو ــ ئه مریکا وچینی کونه په رستان •

٢ ــ بو رزگار کردنی چینی جووتیاران له ده ره به گ بسه نا بووت کردنی سیسته می فیودالی له زه وی یا و دابه ش کردنی زه وی به سه رجووتیاران •

٣ ــ بو پیك هینانی حکمیکی زاتی له کورد ستانی عراقدا •

# رزگاری

ئورگانی پارتی دیموکراتی کورد
عـــــــــراق

---

ژماره (٣) کانونی (١) ١٩٥٣ سالی (٨)

---

٤ ــ له پیناوی ئاشــــــــتیو دیموکراتیــــدا •

((نرخی ٢٠ فلسه ))

نناضل في طليعة الشعب الكردي

١ ـ لتحرير العراق سياسيا واقتصاديا وـ ايدلوجيا من الاستعمار الانكلو ـ امريكـــي ومن حكم الطبقات الرجعيــــــــــة

٢ ـ لتحرير الفلاحين من ظلم الاقطاعيين وكبار المالكين بالغاء نظام التملك الاقطاعي للارض ـ واعطاء الارض للفلاحــــــــــين




٤ ـ في سبيل السلم والديموقراطيـــــة

لسان پارتي ديموكراتي كورد ـ عراق

العدد (٣) كانون الاول ٩٥٣ السنة (٨)

٣ ـ من اجل ممارسة الشعب الكردي لحقوق الحكم الذاتي على كوردستان العراقية

ﻪ پيش ره وی‌گه لي‌كوردا خه بات ئه كه ين :

١ ــ بو رزگاركردني‌عراق رزگاری‌یه كي سياسي و ئابوری‌وئايد يولوجي له امپريالزمي‌ئه نگلو ـــ ئه مريكا و جيني كونه په رستان •

٢ ــ بو رزگاركردني چيني جوتياران له ده ره به گ به نابــوت كردني سيسته مي‌فيودالي‌له زه ويا تو دابه ش كردني‌زه وی به ســـه ر جوتياران •

٣ ــ بو پيك هينانى حكميكي زاتي له كورد ســتاني عراقدا •

٤ ــ له پيناوی ئاشـــتيو ديموكراتيدا •

# رزگاری

ئورگاني پارتي ديموكراتي كورد ـعـراق

ژماره (٤) كانوني‌دوەم ١٩٥٤ سالي (٨)

((نرخي ٢٠ فلسه ))

ژ5 ی س8 ی مـارتی 1954، 16 لاپەڕەیـە و ئەمـە لەسـەر بەرگەکـەی زیـادکراوە: "تێکۆشـن بـۆ پوچەڵکردنەوەی پـڕۆژەی هاوپـەیمانی لـە گـەڵ پاکسـتان- تورکیـادا و، دژی خۆبەسـتنەوە بـە ئیسـتیعماری ئەمریکی و بریتانی".

ناوەڕۆکەکەی ئاوایە:

"لەنێوان پەیمانی سەعداباد و ئیتیحادی عەرەبی و پەیمانی عەسکەری تورکیا- پاکستان دا"

"یادی ستالین" بەیاننامەیەکی 5 ی 3 ی 1954 ی بەرەی پێشکەوتوی پارتی‌یە و، لەبارەیەوە نوسراوە:

"ئەی رۆڵە ئازادیخوازەکانی میللەتەکەمان! بـۆ پیـرۆز راگرتنـی یـادی سـتالینی نـەمر و بـەجێ‌هێنانی رێنوێنیە شۆڕشگێڕیە بەزەبرەکانی، داواتان لێ ئەکەین پێوەندیتان بە حیزبەکەمانەوە کـە بـە رێگـەی لینـین- ستالین دا ئەڕوا پتەو بکەن و، زیاتر و زیاتر لە دەوری جەنەراڵ مستەفا بارزانیی پێشەوامان و قوتابی‌یـەکی ستالین خڕبنەوە"

"مەبەستی خۆپیشاندانە جەماوەریەکان لە سلێمانی" و "هەندێ هەواڵ".

ژ6 ی س8 ی نیسانی 1954، 12 لاپەڕەیە. باسەکانی بریتین لە:

مەینەتی بارزانیەکان،

نەگبەتی لافاو،

گۆڕانکاریەکانی سیاسەتی ناودەوڵەتان.

ژ7 ی س9 ی تشرینی دوەمی 1954، 8 لاپەڕەیە، بە یەک وتاری تایبەت بە "ئەو هێزانەی کارئەکـەن لەپەنا کارەساتەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دا" پڕکراوەتەوە.

بـەرەی پێشـکەوتو بەیانیشـی دەرکـردوە، لـەوانـە: بـەیانێک لـە 16 ی 12 ی 1953 دا کـە داوای پێکهێنانی حکومەتێکی نیشتمانی دیمۆکراتی و، بەردانی زیندانیە سیاسیەکان و پێکهێنانی بـەرەی یـەکگرتوی کردوە و، پشتیوانی لە مانگرتنەکانی کرێکاران و راپەڕینی جوتیاران ئەکا.

### 5. 7. خەباتی کوردستان، ئۆرگانی پارتی دیمۆکراتی یەکگرتوی کوردستان

لـە هـاوینی 1956 دا هـەردو باڵەکـەی پـارتی: پـارتی دیمـۆکراتی کـورد- بـەرەی پێشـکەوتو بـە سەرکردایەتی هەمزە عەبدوڵا و، پـارتی دیمـۆکراتی کوردسـتان بـە سـەرکردایەتی ئیبـراهیم ئەحمـەد یـەکیان گرتەوە (پارتی دیمۆکراتی یەکگرتوی کوردستان) یان پێک هێنا و، لە باتی رزگاری (خەباتی کوردستان) یـان کرد بە ئۆرگانی ناوەندی. خەباتی کوردستان بە عەرەبی نوسراوە.

هەندێ لە ژمارەکانی لە بەر دەس دان، لەوانە:

ژ3 ی س1 ی مایسی 1957. لە سەری لاپەڕەکەدا نوسراوە: "نناضل من اجل حق شعبنا الكردي فـي تقرير مصيره بنفسه"

لە ژێر ئەویش دا: "السلام - الديمقراطية- الاستقلال"

لە تەنیشت ناوی گۆڤارەکەوە نوسراوە: "نناضل من اجل:

التحرر من الاستعمار وحلف بغداد. حكومة وطنية. الظفـر بالحريـات والحقـوق الديموقراطيـة للشـعبين الكوردي والعربي"

نناضل في طليعة الشعب الكوردى :

١ـ لتحرير العراق سياسيا واقتصاديا وآيديولوجيا من الاستعمار الانكلو ـ امريكي ومن حكم الطبقات الرجعيـــة •

٢ ـ لتحرير الفلاحين من الاقطاعيين وكبار الملاكين بالغاء التملك الاقطاعي للأرض واعطاء الارض للفـــلاحيـــن •

٣ ـ من اجل ممارسة الشعب الكوردى لحقوق الحكـــم الذاتي على كوردستان العراقيـــة •

٤ ـ في الســــــلم والديموقراطيــــــة

# رزگاری

پارتی دیموکراتی کورد ـ عراق

العدد (٥) مارت ١٩٥٤ السنة الثامنة

ناضلوا لاحباط مشروع التحلف مع باكستان ـ تركيا • وضد الارتباط مع الاستعمار الامريكي والبريطاني.

الثمن (٢٠) فلسا

(( صادرة عن الجناح التقدمي ـ پارتي ديموكراتي كورد عراق ))

نناضل في طليعة الشعب الكردى :

١ ــ لتحرير العراق سياسيا واقتصاديا وآيديولوجيا من الاستعمار الانكلو ــ امريكي ومن حكم الطبقات الرجعية

٢ ــ لتحرير الفلاحين من الاقطاعيين وكبار الملاكيـــن بالغاء التملك الاقطاعي للارض واعطاء الارض للفلاحين

٣ ــ من اجل ممارسة الشعب الكردى لحقوق الحكم الذاتي على كردســتان العراقيــة

٤ ــ في سبيل السلم والديمقراطية





لسان پارتي ديموكراتي كورد - عراق

العدد (٦) نيسان ١٩٥٤ السنة الثامنة الثمن (٢٠) فلس


ناضلوا لاحباط مشروع التحالف مع پاكستان ــ تركيا وضد الارتباط مع الاستعمار الامريكي البريطانــي

سەروتارەکەی ل1- 4: (الكورد والعرب) و نوسراوە: مترجمة عـن الكوردیـة. سـەرلەوحەی ئـەم وتـارە بانگەکەی مستەفا بارزانی‌یە: "انني اوجه ندائي هذا الى الشعبين..."

ل4، عيد العمال والكادحين الاممي

ل5، لتحيا ذكرى شهداء 29 مايس

ل5- 6، الشعب الكوردي يؤيد نضال الجزائر الباسلة

ل6 الاصوات ترتفع في كل مكان للمطالبة بوقف التجارب النووية وتحريم اسلحة الإبادة الجماعية

ل7- 8، كوردستان والنظام الديمقراطي في العراق

ل8- 10، ان تجهل فاعلم

ل10- 12، سياسة الحكومة وحقوق الشعب الديمقراطية

مام جەلال لە نامەی گۆڕیندا نوسیویێتی:

"کە ڕزگاری بو بە کوردی ئیتر پێویستیان بە گۆڤارێکی عەرەبیش هەبو، هەم بـۆ بادینـان و بـرا فەیلیـەکانی بەغدا و تا ڕادەیەکیش بۆ خوێندەوارانی هەولێر، کە ئەوسا زۆر ئاشنای کوردی نەبون، هەم بۆ برا عەرەبەکانیش.

"وا پەسەند کرا کە جگە لە (ڕزگاری) ئۆرگانێکی تر هەبێت. لەسـەر پێشـنیاری مـام جـەلال (خـەباتی کوردستان) پەسەند کرا. پێشتر پارتی لە ساڵی 1949- 1950 دا لە بەغدا لە لایەن لقی بەغداوە، گۆڤـارێکی بە عەرەبی بەناوی (خەباتمان) چاپ دەکرد کە زۆربـەی مەقالـەکانی شـەهید عـەلی حەمـدی و مامۆسـتا سـاڵح ڕوشدی دەیان نوسی.

"ناوی (خەبات) لەو گۆڤارەوە هات بە بیرا (کوردستان) یشی خرایە سەر.

"ئەو گۆڤارە بە عەرەبی دەردەچو زۆربـەی مەقالـەکانی مامۆسـتا بـرایم و مـام جـەلال دەیـان نوسـی. چاپەکەی بە ڕۆنیۆ بو. تایپ و ڕۆنیۆکەی مام جەلال دەیکرد بـەهاوکاری خورشـید شـێرە و مـەرحوم سـاڵح شێرە کە مام جەلال لە ماڵەکەی وەکری پارتی دا داینا بو. خورشید نائیب زابت کاتب بو، تایپی دەزانی، بۆیە کەڵکمان لێ وەردەگرت.

"بڵاوکردنەوەکـەی بـە شـارەکان دا زۆرتـر کاکـە (مەبەسـتی خوالێخۆشـبو عومـەر مسـتەفایە) پـێی هەڵدەستا. ئەوە ماوەی کەرکوک.

"پاشان کە مام جەلال گوازرایەوە بۆ سلێمانی، تایپ و ڕۆنیۆکەش هێنرا بۆ ئەو ماڵـەی کـە ئـەو لـێی موختەفی بو، ماڵەکە هی باوکی خولە کۆمەڵە بو، خانوەکەش هی خوالێخۆشبو قادر تەگەرانی بـو. ئەوسـا زۆر لە دەرەوەی شار بو.

"لە سلێمانی زۆربەی نوسـینەکان و تایـپ و ڕۆنیۆکـەی مـام جـەلال دەیکـرد. ناوبـەناو کـاک هـەمزە وتارێکی بۆ دەنارد، هەروەها مامۆستا برایم و کاک حیلمی.."

پـێ ئـەچێ هەنـدێ لـە ژمارەکـانی خـەباتی کوردسـتان لـە ئارشـیفی دەزگاکـانی ئاسایشـی عیـراقدا هەڵگیرابن. چونکە هەندێ لێکۆڵەر لە باسەکانیاندا ئیشارەتیان بە بابەتی هەندێ لە ژمارەکانی داوە.

حمیدي (ل230) نوسیویێتی: ژمارەی کانونی دوەمی 1957 دژی سیاسەتی نوری سـەعید و پـەیمانی بەغدادی نوسیوە. ڕونی کردۆتەوە کە ئەو پەیمانە بە شێوەیەکی سەرەکی دژی جوڵانەوەی کورد بەستراوە لـە عیراق و تورکیا و ئێران و، هەڕەشە لە ئاسایش و سەربەخۆیی گەلان ئەکا چونکە "دوژمنی کورد و عەرەب و ئاشتیخوازان و هەمو گەلانی دنیایە"

نناضل من اجل حق شعبنا الكردي في تقرير مصيره بنفسه

السلام  الديمقراطية  الاستقلال

# خەباتی کوردستان

للحزب الديمقراطي الموحد لكوردستان

نناضل من اجل :
التحرر من الاستعمار وحلف بغداد
حكومة وطنية
الدستور بالحريات والحقوق الديمقراطية
للشعبين الكردي والعربي

العدد (٣)  السنة (١)  مايس ١٩٥٧  الثمن (٣٠) فلسا

انني أوجه ندائي هذا الى الشعبين الكردي والعربي على السواء ليتكاتفا ويوحدا جهودهما في النضال المشترك ضد العدو المشترك وهو الاستعمار واذنابه ، ولكي يعيش كل شعب في ارضه حرا سعيدا مستقلا . مصطفى البارزاني

## الكرد والعرب

مترجمة عن الكردية

يربط الكرد والعرب معا اوثق العهود واحسن الروابط التي تدعمت امد طويل ، منذ انتشار الاسلام في كوردستان فقد عاشا قرونا عديدة وهم تحت لواء راية الخلافة الاسلامية واختلطت دماؤهما مرارا في الدفاع عن الديار الاسلامية لدرء هجمات المغيرين ، وخاصة في الحروب الصليبية التي ابلى فيها الكرد بلاء حسنا ايما بلاء تضامنا مع اخوانهم العرب ضد الغزاة الاوربيين الغربيين واراقوا دماء كوردية غزيرة حتى امكن الحاق الهزيمة بالمعتدين على يدي البطل الكوردي صلاح الدين يوم تم تطهير ارض فلسطين المقدسة من رجس الغاصبين .

ثم ان الكرد قد رفدوا الثقافة العربية بعلمائهم وادبائهم من (ابن خلكان) الى (الزهاوي) ودأبوا على اغناء الثروة الادبية والفنية والتاريخية العربية وقدموا للعالم العربي فوائد وخدمات عظمى .

وفي الفترة المظلمة التي كان فيها الكرد والعرب يئنون تحت الكابوس التركي ويناضلان في سبيل حريتهما واستقلالهما كانت علاقاتهما طيبة ، وكان الصفاء والاخاء سائدين علاقاتهما خلال المدة الطويلة التي عاشاها معا والتي لم تحدث فيها قط منازعات دموية او خلافات

هەر لەم ژمارەیەدا وتارێکی لە سەر پشتیوانیی جەماوەری کورد دژی دەسدرێژی بۆ سەر میسر نوسیوە، دایناوە بە دەسدرێژی بۆ سەر گەلی کورد چونکە سەرکەوتنی دوژمنانی گەلی میسری تا ئەندازەیەکی زۆر گەورەترین زەرەر لە مەسەلەی رزگاریی کوردستان و گەلی کورد ئەدا.

هەر حمیدي (ل258) نوسیوێتی: ژمارەی شوباتی 1958 بروسکەی پیرۆزبایی نوسیوە بۆ سەرۆکەکانی میسر و سوریا بە بۆنەی یەکگرتنی سوریا و میسرەوە. بەڵام لە بەیانێکی تردا دژی یەکگرتنی عیراق و ئوردون وەستاوە و داوای دابینکردنی مافی نەتەوەیی کوردی کردوە لەم یەکێتییەدا. (حمیدي، ل261)

## سەرچاوەکان:


رزگاری، خەباتمان، نداءکوردستان، خەباتی کوردستان، نرکەی جوتیار. هەمو ئەم بڵاوکراوانەم لە مامۆستایان ڕەفیق ساڵح و سدیق ساڵح وەرگرتوە.

موسوعة سرية خاصة بالحزب الشيوعي العراقي، ستة اجزاء، بغـداد، مطبعـة الحكومـة، 1948- 1949. کـە لـە ئارشـیفی نەتەوەیی کوردستاندا هەڵگیراوە.

د. جعفر عباس حميدي، التطورات السياسية في العراق 1941- 1952.

د. جعفر عباس حميدي، التطورات السياسية في العراق 1953- 1958.

دەربارەی دامەزراندنی پارتی و گفتوگۆی نێوان حیزبە کوردیەکانی ناوەڕاستی چلەکان بڕوانە:

جلال الطالباني، كردستان والحركة القومية الكردية، من منشورات النور، بغـداد، 1969. هـەمان کتێـب بـۆ جـاری دوەم لـە لایەن (دار الطليعة) هوە لە بێروت چاپ کراوەتەوە.

صالح حیدری، یادداشتێک دەربارەی حیزبی رزگاری کورد کە لە ساڵی 1945 لە کوردسـتانی عیراقـدا دامـەزرا، دەفتـەری کوردەواری، ژ1، کانونی دوەمی 1970. ل47 - 55.

د. کەمال مەزهەر: رزگاری لە کفری، کتێبی: چەند لاپەڕیەک لە مێژووی گـەلی کـورد، بـەرگی دوەم، ئامـادەکردنی عەبـدوڵڵا زەنگەنە، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی، هەولێر 2001. ل381 - 387.

کۆمەڵێک ژمارەی (رزگاری) و (نداء کوردستان) و (نرکەی جوتیار) لە ئەرشیفی کاک محەمەدی مەلا کەریم وەرگیراوە.

بەیاننامەکانی پارتی لە (ئەرشیفی نەتەوەیی کوردستان) وەرگیراوە.

# پاشکۆ:

1 – **قانونی چاپەمەنیی عوسمانی** 1865

2 – **قانونی مافی دانانی عوسمانی (قانون حق التألیف العثماني)** 1910

3 – **قانونی چاپەمەنیی عیراق** 1933

# قانونی چاپەمەنیی

# عوسمانی 1865

### بەشی یەکەم
### بابەتی گشتی

مادەی 1:

ڕۆژنامە و سایرە کە بابەتی سیاسی و حکومەتی بڵاو ئەکاتەوە، بە هەر زمانێ بێ، چ بە ڕێکوپێکی لە کاتی دیاری کراودا دەربچێ و چ بەش بەش لە کاتی دیاری نەکراودا، بە بێ ئیجازە ناتوانێ بڵاو بکرێتەوە.

داواکارانی ئیمتیازی ئەم پەخشە و ڕۆژنامانە ئەگەر ڕەعیەتی دەوڵەتی بەرز بن عەریزە ئەدەن بە وەزارەتی علوم و، ئەگەر ڕەعیەتی بێگانە بن بە وەزارەتی کاروباری دەرەوە، بۆ ئەوەی ئیجازەی پێویستیان بدرێتێ لە لایەن ئەو دو وەزارەتەوە، مادەی سێیەم دەرحەق خاوەن عەریزەکان جێبەجێ ئەکرێ، بەڵام ئیجازەنامەیان ئەبێ لە لایەن ئیدارەی ئینتیباعاتەوە بدرێتێ.

مادەی 2:

ئەو کەسانەی لە ولایاتی شاهانەدا ئیمتیازی ئەم جۆرە ڕۆژنامە و پەخشانە ئەخوازن ئەبێ عەریزە بدەن بە حاکمی ولایەت. ئەگەر ڕەعیەتی دەوڵەتی بەرز بێ بۆ وەزارەتی علوم ئەنوسێ و ئاگاداریان ئەکا. ئەگەر ڕەعیەتی بێگانە بێ بۆ وەزارەتی شکۆداری کاروباری دەرەوە ئەنوسێ. ئەگەر مەرجەکانی م3 یان تێدا بێ ئیجازەنامەکەیان بۆ حاکم بۆ ئەنێرێ.

مادەی 3:

کەسێ کە ئەیەوێ ڕۆژنامە دابمەزرێنێ، ئەگەر ڕەعیەتی دەوڵەتی بەرز بێ، ئەبێ تەمەنی لە 30 ساڵ کەمتر نەبێ و، بە تاوانی جنحە و جنایت سزا نەدرابێ و، خاوەنی مافی تەواوی کەسایەتی خۆی بێ، لەم حالەتەدا ئەتوانێ ئیجازە وەربگرێ.

ئەگەر ڕەعیەتی بێگانە بێ، ئەبێ وەکو ڕەعیەتی دەوڵەتی بەرز پێڕەوی مەرجەکانی ئەم قانونە بکا، لە کاتی ڕودانی تاوانی چاپەمەنیدا ڕەفتارێ کە لە گەڵ ڕەعیەتی دەوڵەتی بەرز لە دیوانخانە و دادگادا ئەکرێ بە هەمان تەرتیب و ئوسوڵ بەرامبەر بەویش ئەکرێ. ئەگەر ئەم مەرجانەی قبوڵ کرد، ئیجازە بەویش ئەدرێ.

مادەی 4:

لە گەڵ عەریزەیەکدا کە لە م1 دا باس کرا توغراسەنەدێ بە مۆر و ئیمزاکراوی باسی ناوی ڕۆژنامە و ناوی چاپخانە و بەڕێوەبەری بەرپرسی و ڕۆژانی چاپی، کە چەن ڕۆژ لە مانگێکدا چاپ ئەکرێ، ئەبێ پێشکەش بکا. بەڕێوەبەری ڕۆژنامە بە قەڵەمی خۆی دانەیەک ئیمزا ئەکا و ئەینێرێ بۆ ئینتیباعات دوای ئەوە نسخەکانی تر بە ئیمزای خۆی چاپ ئەکا. لە ولایەتەکاندا پێشکەش بە حاکمی ولایەتی ئەکا.

مادەی 5:

کاتێ کە خاوەن و بەڕێوەبەری ڕۆژنامە و بڵاوکراوە ئیجازەکەی خۆیان بدەن بە کەسێکی تر، ئەبێ ئاگاداری مەرجەع بکەن. هەمان کەس ئەبێ بە پێی مادەکانی 1 و 2 و 3 ئیجازە وەربگرێ. ئەگەر ڕۆژیNامەکە و چاپخانەش بگۆڕێن ئەبێ ئاگاداری مەرجەع بکەن.

مادەی 6:

ڕۆژنامەی سیاسی کە ئیستا لە ئەستەموڵ و مەمالیکی شاهانەدا دەرئەچن لەم ئیجازە ڕەسمیە بەخشراون و حوکمی ئیختار و ئیعلان دەربارەیان هەڵوەشێنراوەتەوە، بەڵام دوای ئەوە ئەبێ هەمویان پێڕەوی ڕێنماییەکانی ئەم قانونە بکەن.

مادەی 7:

لە پایینی هەر وتارێ یا باسێکا کە لە لایەن یەکێکی ترەوە لە ڕۆژنامەکەدا بڵاو ئەکرێتەوە ئیمزا نەکرابێ، ئۆباڵی ئەوە لە ئەستۆی هەمان ڕۆژنامەنوس دایە کە ئیمزای کردوە. ئەگەر ئیمزای نوسراو بە پێچەوانەی ئەم قانونەوە بێ، خاوەنی ڕۆژنامە و نوسەری وتار هەردو لە بەرپرسیارێتیدا بەشدارن.

مادەی 8:

ئەگەر لە سەرۆکایەتی ئینتیباعاتەوە لە ئەستەموڵ و لە لایەن حاکمی ولایەتەکانەوە نوسینی ڕەسمییان بۆ بنێردرێ، بە بێ داوای پارەی نرخەکەی ئەبێ لە چاپی یەکەم و دوەمی ڕۆژنامەدا بنوسرێ. ئەگەر لە ڕۆژنامەدا ناوی کەسێکی بەڕێز بە ئاشکرا یان بە کینایە ببرێ و ئەو کەسە وەڵامنامەیان بۆ بنێرێ ئەبێ لە چاپی یەکەم و دوەمدا بێ پارە بڵاوی بکەنەوە، بەو مەرجەی لە دو ئەوەندەی وتارەکەی پێشو درێژتر نەبێ.

مادەی 9:

ڕۆژنامە و بڵاوکراوەی تر کە بابەتی سیاسی و جیاوازی تێ دایە و بەدگۆیی بەرامبەر دەوڵەتی بەرز کردوە و بیری دوژمنایەتی هەیە و، لە مەمالیکی دەرەوەدا چاپ ئەکرێ، گەیشتنی بە مەمالیکی پارێزراو قەدەغەیە.

## بەشی دوەم
## دەربارەی سزادان

مادەی 10:

هەرکەس بە بێ ئیجازەی دەوڵەتی بەرز، واتە پێچەوانەی ئەم قانونە، ڕۆژنامە یا پەخشە دابمەزرێنێ و بڵاو بکاتەوە بۆ هەر نسخەیەک یا جزوەیەک 10 لیرەی زێڕ تاوانەی لێ ئەسێنرێ. ڕۆژنامەکەشی دائەخرێ.

مادەی 11:

هەرکەس بە حوکمی م4 ی ئەم قانونە نسخەیەکی ئیمزاکراو بۆ مەرجەعەکەی خۆی یا بە بێ ئیمزا بڵاو بکاتەوە 10 لیرەی زێڕ تاوانەی لێ ئەسێنرێ.

مادەی 12:

ئەگەر رۆژنامەنوس لە بڵاوکردنەوەی ئـەو نوسـینە رەسـمی‌یانەی کـە لـە م8 دا وتـراوە کـە لـە لایـەن حکومەتەوە ئەنێردرێ سەرپێچی بکا بە 2 تا 25 لیرە تاوانە سزا ئەدرێ، یا وەڵامنامەیـەک کـە لـە یـەکێ لـە خەڵکەوە بۆی ئەنێردرێ نەنوسێ، لە 2 تا 25 لیرە تاوانەی لێ ئەسێنرێ.

لە سەر وتاری تر کە ئەهێنێ شکاتی لێ بکرێ، بە جیا حوکم ئەدرێ.

مادەی 13:

هەروەک لە بەشی دوەمی قانونەکەدا رون کراوەتەوە، هەرکەس بە هۆی رۆژنامەوە هەنـدێ کـەس هـان بدا بۆ فەسادێ کە ئاسایشی ناوخۆی دەوڵـەتی بـەرز و ئاسایشـی مـەمالیکی پـارێزراو تێـک بـدا، سـزادانی هاوبەش کە دەرحەق کەسێکی وا بە دەرەجەی جنح و جنایە بێ، کەسی هاندەر و رۆژنامەنوس شایانی هەمان سزان. چاپی ئەو رۆژنامەیەش بۆ ماوەیەک یا بە یەکجاری قەدەغە ئەکرێ.

مادەی 14:

هەر رۆژنامەنوسێ پێچەوانەی ئادابی گشـتی و محاسـن اخلاقـی میلـەتی شـتێ بنوسـێ یـا بـە هـۆی رۆژنامەوە سوکایەتی بە یەکێ لە دینە باوەکان بکا لە 1 لیرە تا 25 لیـرە تاوانـەی لـێ ئەسـێنرێ یـان لـە 1 حەفتە تا 3 مانگ بەند ئەکرێ.

مادەی 15:

ئەگەر رۆژنامەنوس دەرحەق سەڵتەنەتی بەرز و خانەوادەی سەڵتەنەتی قسـە و دەربڕینـی نـەگونجاوی بەکارهێنا یان دژی حکومەتی ئەعلاحەزرەتی همایون پرکێشیی کرد، لە 6 مانگ تا 3 ساڵ گرتن و یا لە 25 لیرە تا 150 لیرە تاوانەی لێ ئەسێنرێ.

مادەی 16:

ئەگەر نوسینێ ئـابڕوی وەزیرەکـانی دەوڵـەت و سـەرۆکەکانی ولایەتـە سـەربەخۆکان و مومتازەکـان بشکێنێ، نوسەر لە 1 مانگ تا 1 ساڵ گرتن یا 5 لیرە تا 100 لیرە تاوانە سزا ئەدرێ.

مادەی 17:

ئەگەر قسە و دەربڕینێ دژی پاشایانی هاوپەیمانی دەوڵەتی بەرز بنوسرێ لە 3 مانگ تا 1 ساڵ گرتن یا لە 5 لیرە تا 100 لیرە تاوانە سزا ئەدرێ.

مادەی 18:

زەم، ئەوەیە کە کاری تایبەتی کەسێ یا دەزگایەک بنوسرێ ببێتە هـۆی ئـەتکی نـاموس و شـکانی نرخی.

قەدح، ئەوەیە بێ ئەوەی کاری تایبەتی‌یان باس کرابێ سوکایەتی‌یان پێ کرا بـێ یـا جنێویـان پـێ درا بێ.

مادەی 19:

ئەگەر زەم و قەدح بەرامبەر هەیئەتێکی مجلس و دادگا یا کۆمیسیۆن بکرێ پڕکێشیکەر بە 15 ڕۆژ تا 1 ساڵ یا لە 2 لیرە تا 50 لیرە تاوانە سزا ئەدرێ.

مادەی 20:

ئەگەر زەم دەرحەق مامورین و کارمەندانی دەوڵەت بێ لە 10 ڕۆژ تا 10 مانگ گرتن و لە 1 لیرە تا 20 لیرە تاوانە ئەسێنرێ.

مادەی 21:

زەم دەرحەق سەفیری گەورە و وەزیری موختار و مەسلەحەتگوزار و کارمەندانی تری دەوڵەتانی بێگانەی نیشتەجێی دەوڵەتی بەرز بنوسرێ، پڕکێشیکەر بە 8 ڕۆژ تا 8 مانگ گرتن و لە 1 لیرە تا 30 لیرە تاوانە سزا ئەدرێ.

مادەی 22:

زەم دەرحەق کەسانی ئاسایی ڕۆژنامەنوس لە 50 قرۆش تا 50 لیرە تاوانە یا لە 5 ڕۆژ تا 50 ڕۆژ گرتن سزا ئەدرێ.

مادەی 23:

زەم دەرحەق کارمەندێکی دەوڵەتی بنوسرێ سزای پێشو ئەدرێ وە ئەگەر لە کاتی ڕاپەڕاندنی کاردا زەم دەرحەق کارمەند بنوسرێ ئەگەر لە دادگادا سابیت کرا نوسەر سزا نادرێ و، ئەگەر کارمەند قەدح کرا بو، تەنیا سزای قەدحەکە ئەدرێ.

مادەی 24:

دەرحەق کارمەندانی دەوڵەتانی دۆست و دەوڵەتی بەرز وەکو لە مادەکانی 20 و 21 دا ڕون کراوەتەوە قەدح ڕوبدا، پڕکێشیکەر بە 5 ڕۆژ تا 5 مانگ گرتن و لە 50 قرۆش تا 15 لیرە تاوانە سزا ئەدرێ.

مادەی 25:

قەدح دەرحەق کەسانی ئاسایی، پڕکێشیکەر لە 2 ڕۆژ تا 2 مانگ گرتن و لە 30 قرۆش تا 50 لیرە تاوانە ئەسێنرێ.

مادەی 26:

ئەگەر ڕۆژنامەنوس بە ئەنقەست هەواڵی درۆ و بەڵگەی ساختە بە نیازی خراپ بنوسێ یان ئەم جۆرە هەواڵانە لە ڕۆژنامەی ترەوە ڕابگوێزێ، لە 1 مانگ تا 1 ساڵ گرتن یا لە 10 لیرە تا 50 لیرە تاوانە ئەسێنرێ.

مادەی 27:

ئەو سزایانەی دەرحەق رۆژنامەنوسان بە پێی مادەکانی 15 و 16 و 17 و 21 ئەبێ بدرێ، لە لایەن حکومەتەوە ئەشێ لاببرێ. ماوەی 1 مانگ ئەتوانرێ قەدەغە بکرێ ئەگەر پێویستی کرد.

مادەی 28:

وێنەی حوکمێ دەربارەی چاپی قەدەغەی رۆژنامە کە دەرئەچێ رۆژنامەنوس ئەبێ لە یەکێ لە ژمارەکانی رۆژنامەکەیدا کە تا 1 مانگ چاپ ئەکرێ بڵاو بکاتەوە. پارەی چاپی ئەم بریارە بە ئەستۆی سزادراو ئەبێ. ئەتوانێ حکم بدا لە چەند رۆژنامەی تریشدا بڵاو بکرێتەوە.

مادەی 29:

ئەگەر لە ماوەی 2 ساڵدا بە پێی ئەم قانونە رۆژنامە یا پەخشە 3 جار حکم درا، حکومەت ئەتوانێ بە یەکجاری یان بۆ ماوەیەک قەدەغەی بکات.

مادەی 30:

ئەگەر بەرێوەبەر یا خاوەنی بەرپرسی رۆژنامە بە جنحە یا جنایەت بەند کرا رۆژنامەکەی بە هۆی بەرێوەبەرێکی کاتییەوە ئەتوانێ چاپ بکرێ، بەڵام ئەبێ پێرەوی ئەم قانونە بکا.

مادەی 31:

ئەگەر لە رۆژنامەکەدا جنحەیەک رویدا هەرکەس بگرێتەوە... دادگایی ناکرێ...

بەڵام بەدنوسی کرا بەرامبەر سەڵتەنەتی هومایون و خانەوادەی سەڵتەنەت و حکومەتی ئەعلاحەزرەتی هومایونی و وەزیرانی دەوڵەتی بەرز یا پێچەوانەی ئادابی گشتی و محاسن اخلاقی میلەتی بێ، حکومەت مدعی ئەبێ.

ئەگەر بە دینی باو و مەزهبە باوەکان سوکایەتی کرا تا کارمەندانی ئەو دین و مەزهبە داوا نەکەن لە لایەن حکومەتەوە دەعوا نابینرێ.

مادەی 32:

ئەگەر لە رۆژنامەدا جنحە رویدا و دوای ئەوە تا 6 مانگ حکومەت یا هیچ کەسێ مدعی نەبو، دوای تێپەرینی ئەو ماوەیە هەرکەس ئیدیعا بکا گوێی لی ناگیرێ.

مادەی 33:

لە کاتی دوبارەبونەوەی جنحە و جنایتدا ئەگەر لە لایەن حکومەتەوە بریار درا بێ یان لە لایەن دادگاوە بریار درا بێ، سزا ئەبێتە دو بەرامبەر.

مادەی 34:

لە بارەی جنحە و جنایت کە لە مادەکانی 15 و 16 و 17 و 19 و 20 و 21 و 24 دا رون کراونەتەوە کۆمیسیۆنێکی 5 کەسی لە بابی عالی کۆ ئەبیتەوە، پاش لێکۆڵینەوە راپۆرت بۆ دیوانخانەی عالی

ئەنوسێ. لەوێ حکمی سزادان دەرئەچێ و، جنحە و جنایت کە لە مادەکانی تردا نوسراون لـە دادگـای نەزمیـە بڕیار ئەدرێ.

مادەی 35:
ئەم قانونە لە 2 ی شەعبانی 1281 ەوە کاری پێ ئەکرێ.

# قانونی مافی دانانی عوسمانی

# (قانون حق التأليف العثماني)*

ئەم قانونە لە 9 ی مایسی 1326 ی رۆمی، بەرامبەر 9 ی مایسی 1910 ی زاینی دەرچوە.

مادەی 1:

هەمو جۆرە بەرهەمێکی فکری و قەڵەمی مافێکی خاوەنەکەیی بـە سـەرەوەیە کـە پـێی ئـەوترێ "مـافی دانان".

مادەی 2:

بەرهەمەکانی فکر و قەڵەم بریتی‌یە لە هەمو جۆرەکانی کتێب، دانراو، رەسم، تـابلۆ، خـەت، مەسـکۆکات، پەیکەر، پلان، نەخشە، موسـەتەح، موجەسـەماتی میعمـاری و جـوگرافی و تۆبـۆگرافی، هـەمو موسـەتەحێک و موجەسەمێکی هونەری، تەرانیم و نۆتەی مۆسیقی.

مادەی 3:

مافی دانان ئەمانە لە خۆ ئەگرێ: چاپ و بڵاوکردنەوەی بەرهەمەکان، بازرگانی پێوەکردنیان، گۆڕینیـان بۆ زبانێکی تر، یان کردنیـان بـە چیرۆکێکـی تەمسـیلی. هـەروەها دەرس و مـەوعیزە و خوتبـە و ئەوانـەش ئەگرێتەوە کە لە پێناوی فێربون و پەروەردە و فوکاهەدا ئەوترێنەوە. بەڵام ئەو نوتقانـەی لـە ئەنجومەنـەکانی مەبعوسان و ئەعیان، دادگاکان، کۆبونەوە گشتییەکان ئەدرێن، هەمو کەسێ ئەتوانێ زەبت و بڵاویان بکاتـەوە. بەڵام کۆکردنەوەی خوتبەی خەتیبێک یان دەرسی مامۆستایەک و تـەدوین کـردن و چـاپ کردنـی مافێکـە لـە مافەکانی خاوەنەکەی.

مادەی 4:

ئەو وتار و رەسمانەی لە رۆژنامە رۆژانەکان و کاتی‌یەکانا بڵاوئەکرێنەوە، ئەگـەر بـە عیبـارەتی "مـافی پارێزراوە" و "بڵاوکردنەوەی بۆ خاوەنەکەی نەبێ قەدەغەیە" بەسرابونەوە، مـافی بڵاوکردنـەوەیان پـارێزراوە. بەڵام ئەو وتار و رەسم و هەواڵانەی بەو شێوەیە نەبەسراونەتەوە مافی دانانیان تیا نیە، بە مەرجێک لە کـاتی بەکارهێنانیدا ناوی سەرچاوەکەیان بنوسرێ.

مادەی 5:

نابێ هیچ کەسێ ناوی رۆژنامەکان و تاقمەکان و نامەکان و کتێبە بڵاوکراوەکان لـە دانراوەکـانی بنـێ، بەڵکو هەمو کەسێ ئەبێ ناو و ناونیشانی گشتی لە دانراوەکانی بنێ.

مادەی 6:

مافی دانان هی دانەرە ئەگەر لە ژیانا بو. بەڵام دوای مردنی ئەگەڕێتەوە بۆ:

یەکەم: منداڵەکانی و هاوسەرەکانی بۆ ماوەی 30 ساڵ لە دوای مردنی.

دوەم: بۆ باوکەکانی و دایکەکانی

سێیەم: بۆ نەوەکانی بە یەکسانی. وە لەو ماوەیەدا کەس ناتوانێ، بێجگە لە دانەرەکەی و وەرەسەکانی، ئەو دانراوانە چاپ و بڵاو بکاتەوە یان بیانگۆڕێ بۆ زبانێکی تر.

مادەی 7:

مافی دانانی تابلۆ، خەت، نەقش، رەسم، شکڵ، نەخشە و هەمو جۆرە موجەسەماتێکی میعماری و جوگرافی و تۆبۆگرافی دوای مردن، 18 ساڵە. بەڵام مافی دانانی تەرانیم و نۆتەی مۆسیقی وەکو کتێب و دانراوەکان 30 ساڵە.

مادەی 8:

قانونەکان و نیزامەکان و فەرمانەکان و تەعلیماتی رەسمی و ئیعلاناتی بازرگانی و پیشەسازی مافی دانانیان تیا نیە، بەڵام ئەوانەی تەعلیقیان لێ ئەدەن و شەرحیان ئەکەن مافیان لە تەعلیق و شەرحەکانا پارێزراوە.

مادەی 9:

مافی دانان بۆ بەرهەمێ کە دوای مردنی خاوەنەکەی بڵاوئەبێتەوە، لە مێژوی بڵاوکردنەوەیەوە دەس پێ ئەکا.

مادەی 10:

تەمسیلکردنی رۆمانێکی پەخشان سیفەت یان مەنزوم، یاخود تەمسیلکردنی بەشێکی، بە بێ ئیزنی دانەرەکەی نابێ و، مافی چاپکردن و بڵاوکردنەوەی ئەم بەرهەمانە خۆ بە خۆ مافی تەمسیلکردنیشیان ناگرێتەوە.

مادەی 11:

تەمسیلکردنی رۆمانی پەخشان سیفەت و مەنزوم یش، لەو جێگایانەدا کە مەکاتیب و کۆمەڵە تایبەتەکان بە بێ مەبەستی دەسکەوتنی قازانج ئەیکەن، مافی دانان نای گرێتەوە.

مادەی 12:

ئەشێ هەندێ پارچە لە هەر بەرهەمێ وەربگیرێ بۆ پێویستیی یان سودی بەرهەمی ئەدەبی و عیلمی و کتێبی تایبەت بە قوتابخانە و بۆ رەخنەش، بە مەرجێ ناوی دانەرەکەی بهێنرێ.

مادەی 13:

نوسراوەکان بە بێ ئیزنی خاوەنەکانیان، ئەگەر زیندو بون، یان وەرەسەکانیان، ئەگەر مرد بون، بڵاو ناکرێنەوە.

مادەی 14:

ئەشێ بەرهەمێ لە بەرهەمەکان لە چوارچێوەی حوکمی ئەم قانونەدا لە لایەن موتەرجیمێ یان زیاترەوە تەرجومە بکرێ، وە مافی هەر موتەرجیمێ لە تەرجومە کراوەکەی وەکو مافی دانانە لە دوای مردنی موتەرجیمەکەوە.

مادەی 15:

مافی دانانی ئەو بەرهەمانەی فەرمانگە رەسمیەکان و کۆمەڵە رەسمی و ناسراوەکانی لای حکومەت بڵاویان ئەکەنەوە، ئەگەڕێتەوە بۆ ئەو فەرمانگە و کۆمەڵانە.

مادەی 16:

ئەگەر بە بێ ڕێکەوتنی پێش وەخت بەرهەمێ لە لایەن ژمارەیەک کەسەوە دانرا یان تەرجومە کرا، ئەوا مافی دانان یان تەرجومە بە شێوەیەکی یەکسان هی هەموویانە. وە ئەگەر یەکێ لە شەریکەکان مرد، ئەوا مافی کەڵک وەرگرتن لەو بەشانەی کە لە ژیانیا بڵاوی کردونەتەوە و لەو دەسخەتانەی کە ئامادە کراون بۆ بڵاوکردنەوە ئەگوێزێتەوە بۆ وەرەسەکەی. لەم حاڵەتەدا مافی دانان بریتییە لە 30 ساڵ و هی تەرجومە 15 ساڵ لە ئیعتباری ڕۆژی مردنی ئاخر دانەری شەریکەوە. خۆ ئەگەر ڕێکەوتنێک لە نێوان شەریکەکانا هەبوبێ ئەوا بە حوکمی ئەو ڕێکەوتنە ئەکرێ، وە ئەگەر خیلاف کەوتە نێوانیان پەنا بۆ دادگا ئەبرێ.

مادەی 17:

ئەگەر بەرهەمێ خاوەنەکەی نەما، خاوەنەکەی مرد و وەرەسەیشی نەبو، یاخود ماوەی وەرەسەیی تێپەڕی بو، یان وەرەسەیی پچڕا یان هەر هۆیەکی تر، ئەوا هەمو کەسێ مافی چاپکردن و تەرجومەکردنی ئەو بەرهەمەی هەیە.

مادەی 18:

هەمو کەسێ ئەتوانێ ئەو بەرهەمە چاپکراوانەی پێشتر چاپکراون و خاوەنیان نەماوە، وەکو لە مادەی پێشودا باسکرا، چاپ بکاتەوە. بەڵام ئەوانەی ئەیانەوێ بەرهەمێ چاپ بکەن کە پێشتر چاپ نەکراوە، ئەوا لەسەر داوایان لە لایەن وەزارەتی مەعاریفەوە مافی ئیمتیازیان ئەدرێتێ بۆ ماوەی 10 تا 15 ساڵ. لەو حاڵەتەدا بێجگە لە خاوەنی ئیمتیاز و وەرەسەکەی کەسی تر بۆی نیە لەو ماوەیەدا ئەو بەرهەمە چاپ بکا. خۆ ئەگەر لە ماوەی ساڵێکدا ئەو بەرهەمە چاپ نەکرا، یان دوای دەسکردن بە چاپکردنی ساڵێک دوا کەوت، ئەوا مافی ئیمتیازەکەی وەکو نەبوی لێ دێ.

مادەی 19:

ئەگەر لە دوای مردنی دانەرەوە بەرهەمێ لەو بەرهەمانەی کەڵکی عام ئەگرن لە بازاڕا نەما و بە هەر هۆیەک بو نە توانرا چاپ بکرێتەوە، وەکو دەسکورتیی وەرەسەی دانەر و ئیهمالییان یان ڕێنەکەوتنیان لەسەر لە چاپدانەوەی، ئەوا وەزارەتی مەعاریف هەلومەرجی لە چاپدانەوەی ئەڕەخسێنێ، لەگەڵ موراعاتکردنی مافی وەرەسە.

مادەی 20:

لەسەر دانەرانی بەرهەمەکان پێویستە 3 دانەی چاپکراو لە بەرهەمەکانیان بدەن بە وەزارەتی مـەعاریف لە ئاستانە و بە بەڕێوەبەرێتی مەعاریف لە دەرەوە، وە قەید و تۆماری ئەکەن بۆ ئەوەی مافی دانانی بپـارێزن. بەڵام ئەو بەرهەمانەی کە لە یەک نوسخە زیاتریان نیـە، وەکـو تـابلۆ و پەیکـەر و هەڵواسـراو (مـەدالیا)، لـەم مامەڵەیە دەرهاوێژراون.

مادەی 21:

لـەو دەفتـەرە تایبەتی‌یانـەدا کـە لـە وەزارەتـی مـەعاریف و بەڕێوەبەرێتی‌یـەکانی‌دا بـۆ مـافی دانـان ڕێکئەخرێن، ماهیەتی دانەر و ناوی بەرهەمەکـە و بابەتەکـەی و مێژوەکـەی و شـوێنی چـاپکردنی و ژمـارەی لاپـەڕەکانی قەیـد ئـەکرێن و ژمارەیەکیشـی بـە ڕیـز ئـەدرێتێ. دوایـی لـە لایـەن خـاوەنی بەرهەمەکـە یـان وەکیلەکەیەوە ئیمزا ئەکرێ.

مادەی 22:

لـە فەرمانگـەکانی محاسـەباتی مـەعاریف تـەنیا چارەکـە لیرەیـەک وەکـو خـەرجی‌ی قەیـد و تۆمـار وەرئەگیرێ، لە بەرامبەرا وەزارەتی مەعاریف یان بەڕێوەبەرێتی‌یـەکانی عـیلم و خەبـەرێک ئـەدەن کـە جێگـەی سەنەد ئەگرێتەوە و کاری پێ ئەکرێ تا لە دادگایی‌یەکا پێچەوانەی نەسەلمێنرێ.

مادەی 23:

مامەڵەی قەیدی مەتبوعاتی کاتی‌ی هـەمو کۆتـایی سـاڵێک ئـەکرێ، لـە کـاتی بینینـی ئـەو نوسـخانەی بڵاوکراونەتەوە و، تۆمارکردنیان.

مادەی 24:

گوێ لە داوای مافی دانانی ئەو بەرهەمانە ناگیرێ کە تۆمار نـەکراون، تـا تۆمـار ئـەکرێن. لـە کۆتـایی هەمو ساڵێکا لە ڕێگەی ڕۆژنامەکانەوە ئەو بەرهەمانە و ناوی دانـەرەکانیان بـە ڕەسـمی ڕائەگەیـەنرێن کـە لـە ماوەی ئەو ساڵەدا قەید و تۆمار کراون.

مادەی 25:

خاوەنی بەرهەم یان موتەرجیم یـان خـاوەنی ئیمتیـاز یـان وەرەسـەکانیان ئـەتوانن لـە مـاوەی کـاتی نیزامی‌دا مافی دانان یان ئیمتیاز بە یەکجاری یـان بـە موەقـەت بفرۆشـن یـا واز لـێ بێـنن؛ یـاخود ژمـارەی نوسخەی فرۆشراو دیاری بکەن بە گوێرەی ڕێکەوتنێک بەرامبەر پارە یان بێ بەرامبەر. ئەو کاتە کڕیـار یـان وەرگر بە مەرج جێگەی خاوەنەکەی ئەگرێتەوە، تەنانەت ئەگەر کڕیار یان وەرگـر پـێش تـەواو بـونی مـاوەی دیاریکراو مرد، وەرەسەکەی لە باقی‌ی ماوەکەدا ئەتوانێ تەسەڕوفی پێوە بکا.

مادەی 26:

پێویسـتە بەڵێننامـەی فرۆشـتن یـان وازلێهێنـان لـە وەزارەتـی مـەعاریف لـە ئاسـتانە و لـە بەڕێوەبەرێتی‌یەکانی لە دەرەوە، تۆمار بکرێ. بۆ ئەوە نیو لیرەی عوسمانی خەرجی‌ی قەید، وەرئەگیرێ. وە لـە

دادگاكان له كاتی پیشاندانی هەر بەڵێننامەیەكدا كە بەم شێوەیە قەید نەكرابێ، وەرئەگیرێ و ئەنێردرێ بۆ سنوقی مەعاریف.

مادەی 27:

نوسەران و ئەسحابی سەناعەت، ئەوانەی بۆ كەسانی تر كار ئەكەن، ئیعتبار ئەكرێن بەوەی مافی دانانیان فرۆشتوە، ئەگەر رێكەوتنێكی تایبەتی لە نێوانیاندا نەبێ.

مادەی 28:

چاپكەر ناتوانێ بە بێ ئیزنی نوسەر دەسكاری بەرهەمەكەی بكا. ئەگەر شتی وەها كرا، لە رێگەی دادگاوە بڵاوكردنەوەی بەرهەمەكە قەدەغە ئەكرێ و وێنەیەكی بڕیارەكە لە رۆژنامەكاندا بڵاوئەكرێتەوە و چاپكەرەكەش ناتوانێ ئەو كرێیە لە نوسەرەكە وەربگرێتەوە كە داویەتێ.

مادەی 29:

چاپكردنی كتێبێك و تەمسیلكردنی لە ماوەی حقوقیدا بە بێ ئیزنی خاوەنەكەی بە لاسایی كردنەوە دائەنرێ. هەروەها تەمسیلكردنی چیرۆكێكی پەخشان سیفەت یان مەنزوم لە ماوەی حقوقیدا بە بێ ئیزنی خاوەنەكەی وە چاپكردنی نۆتەی مۆسیقا و لەبەرگرتنەوەی نەخشە و تابلۆ و رەسم و جۆرەكانی خەت بە فۆتۆگراف یان بە ئامرازی تر و دروستكردنی چوارچێوە بۆ بەرهەمی قەڵەم و مۆسیقا بە ئامرازی سەناعی، حوكمی لاسایی كردنەوەیان لەسەرە، لاسایی كەرەوان بە گوێرەی مادەی 32 ی ئەم قانونە سزا ئەدرێن.

مادەی 30:

نرخی بەرهەمی دانراو و هونەری دانسقە بۆ غەیری خاوەنەكەی بێ، بە ئینتیحال لە قەڵەم ئەدرێ. هەروەها هەركەس عیباراتی ناو كتێبێ یان سرودێكی مۆسیقی پاش و پێش پێ كرد یاخود لە سود لێ وەرگرتندا هەموی بەشێوەیەك تەحریف كرد كە رێچەڵەكەكەی بناسرێتەوە، بەڵام كردی بەهی خۆی، حسابی مونتەحیل (خۆ بە كەسێی كە كەر) ی بۆ ئەكرێ.

تێبینی:

گومانم هەیە وشەیەك، عیبارەتێك لەم مادەیەدا كەوتبێ. سەرچاوەیەكی كەشم لە بەردەست نەبو بۆ بەراورد. لە بەر ئەوە بۆ ئەمانەت، لێرەدا دەقەكەی بە عەرەبی یش ئەنوسمەوە:

ان قيمة الآثار في التاليف والفنون النفيسة لغير اصحابها يعد انتحالا وكذلك من قدم واخر عبارات كتاب او اناشيد موسيقية او طرز افادتها كله بصورة يفهم منها الاصل واسندها لنفسه يعد بحكم منتحل.

مادەی 31:

رەخنە و شەرح و پەراوێز نوسین بە ئینتیحال حساب ناكرێن. هەروەها ئەگەر دانەر هەندێ رستەو برگەی لە بەرهەمێكی ترەوە بۆ بەرهەمەكەی گواستەوە و ئاماژەی پێدا كە لە شوێنێكی كەی وەرگرتون، نابێ بە مونتەحیل.

مادەی 32:

کەسێ بەرهەمێکی چاپ کرد کە مافی دانانی لەسەر بێ و پرسی بە خاوەنەکەی نەکردبێ، یـان بـوە هۆی لە چاپدانی، یاخود چیرۆکێکی پەخشان سیفەت یـان مـەنزومی کـرد بـە تەمسـیل، لـە 25 تـا 100 لیرەی عوسمانی تاوانەی لێ ئەسێنرێ و لە هەفتەیەکیشەوە بۆ دو مانگ حەپس ئەکرێ و بەرهەمەکەش لـە دەرەوە دەسی بە سەرا ئەگیرێ، ئەو کەسەشی داخڵی مەمالیکەکانی عوسـمانی کـردوە تاوانەیـەکی نەقـدی لێ ئەسەنرێ کە بریتیـیە لـە 25 تـا 101 لیـرەی عوسـمانی. ئەوانەشـی ئـەم چاپکراوانـە ئەفرۆشـن و چیرۆکەکەی ئەزانن یاخود دایئەنێن بـۆ فرۆشـتن، لـە 5 تـا 25 لیـرەی عوسـمانی تاوانـەی نەقـدیان لـێ ئەسێنرێ.

مادەی 33:

ئەگەر دەعوایـەکی زەرەر و خەسـارەت لـە لایـەن خـاوەنێکی زەرەر لـێ کـەوتوی بەرهەمێکـەوە برایـە دادگایەک، بە گوێرەی دەعواکە هەمان دادگا بڕیارێکی بۆ دەرئەکا.

مادەی 34:

ئەو چاپکەرانەی ژمارەی زیاتر لەوە چاپ ئەکەن کە لەگەڵ دانەرەکەی لەسەری ڕێککەوتون، مامەڵەی ئەو کەسانەیان لەگەڵ ئەکرێ کە ئەمانەتیان نـە پاراسـتوە و دەس بەسـەر نوسـخە زیادەکـان و ئـەو پارانـەشدا ئەگیرێ کە لە فرۆشتنیان دەستی کەوتوە و هەمویان ئەدرێنەوە بە خاوەنی بەرهەمەکە.

مادەی 35:

حوکمەکانی مادەی 32 بە سەر لاسایی کەران و مونتەحیلەکان یشدا جێبەجێ ئەبن.

مادەی 36:

خاوەنـەکانی دانـراوی هاوبـەش ئـەتوانن بـە تـاک (بـە جیـا) موراجەعـەی دادگـا بکـەن و داوای قەرەبوی ئەو زەرەر و خەسارەیە بکەن کە بە هۆی پامالکردنی مافی تەسەڕوف لە لایەن کەسـانی تـرەوە، لێیان کەوتوە.

مادەی 37:

خاوەن قەرز ناتوانێ بەرهەمی لە چاپ نەدراوی دانەر لە باتی قەرز حیجز بکا، وە ئەگەر بڕیاری دادگـا دەرچو بۆ فرۆشـتی ئـەو بەرهـەم و دانراوانـەی حیجزیـان لەسـەر دانـراوە، بایـەخی زۆر بـە پاراسـتنیان و خستنەڕو بۆ فرۆشتنیان و پاراستنی خاوەنەکەی لە غەدر، ئەدرێ.

مادەی 38:

ئەو نیزامەی پەیوەندی بە چاپی کتێبەوە هەیە و لە 8 ی ڕەجەبی سـاڵی 30/289 ئـابی سـاڵی 289 دەرچوە، بەم قانونە خۆی و بڕگە هاوپێچەکانی بەتاڵ ئەبنەوە.

مادەی 39:

ئەوانەی پێش دەرچونی ئەم قانونە بە بێ پرس و رەزای خاوەنەکەی یان وەرەسەکەی بەرهەمێکیان لە چاپداوە، لەسەریانە موراجەعەی خاوەنەکەی یان وەرەسەکەی بکەن و رەزامەندیيان وەرگرن. ئەگەر بە بێ رەزامەندی خاوەنەکەی درێژەیان بە فرۆشتنی بەرهەمەکە دا، ئەوا بە گوێرەی ئەم قانونە سزا ئەدرێن.

مادەی 40:

جێبەجێکردنی حوکمی قانون لەسەر ئەو تاوانانەی لەم قانونەدا ناویان هاتوە، وەستاوەتە سەر شکاتی شەخسی.

مادەی 41:

مافی دانانی ئەو بەرهەمەی بە بێ ئیمزا یان بە ئیمزای خواستراو بڵاوکراوەتەوە، هی بڵاوکەرەوەکەیەتی تا ئەو کاتەی خاوەنەکەی خۆی دەر ئەخا.

مادەی 42:

وەزیرانی مەعاریف و عەدلیە بەرپرسن لە جێبەجێکردنی ئەم قانونە.

10 ی جەمادی ئەوەل ساڵی 1328: 9 ی مایسی ساڵی 1326 ی شەرقی

* ئەم قانونە مەحمود رەزا ئەمین لە عەرەبیيەوە کردوێتی بە کوردی

# قانونی مەتبوعات

# ژ 57 ی ساڵی 1933

دوای سەیرکردنی مادەی ژمارە 23 ی هەموارکراوی قانونی بنچینەیی و پشت ئەستور بەو دەسەڵاتەی خاوەن شکۆ مەلیک فەیسەڵی یەکەم پێی داوم، وە بە رەزامەندی هەردو مەجلسی ئەعیان و نواب. لە باتی خاوەن شکۆ فەرمانم دەرکرد بۆ دانانی ئەم قانونەی خوارێ:

## بەشی یەکەم
## مەرجەکانی مەتبوع

مادەی 1:

لەم قانونەدا مەبەست لە تەعبیری مەتبوع هەمو رۆژنامە و گۆڤار و رسالەیە یا پەخشەیەکە کە لە کاتێکی دیاریکراو یا جیاوازدا دەربکرێ. پەخشەی بازرگانی و خێری لەمە هەڵاوێردراون.

مادەی 2:

هەمو مەتبوعێ ئەبێ بەرێوەبەری بەرپرسی هەبێ و مەرجە ئەبێ:

1. عیراقی بێ.
2. 25 ساڵی تەمەنی تەواو کردبێ.
3. حوکم نەدرابێ بە گوناهێکی نەسیاسی کە شەرەف لەکەدار بکا یا بە گوناهێ لەکە لە شەرەفی بدا.
4. لە خوێندنگەیەکی بەرز دەر چوبێ، ناوبانگی باش بێ، بۆ مەتبوعی دینی ئیسلامی ئیجازەی دەرسی هەبێ.
5. کارمەند نەبێ و ئەندامی ئەنجومەنی گەل نەبێ.
6. شوێنی دانیشتینی لەو شوێنە بێ کە مەتبوعەکەی لێ چاپ ئەکرێ.
7. خاوەن مەتبوع ئەتوانێ بەرێوەبەری بەرپرسی مەتبوعەکەی بێ ئەگەر ئەو مەرجانەی تێدا بێ کە لەم مادەیەدا نوسراون.

مادەی 3:

ئەوی بیەوێ مەتبوعێ دەربکا ئەبێ خواستێ پێشکەش بە وەزارەتی ناوخۆ بکا بۆ وەرگرتنی ئیجازەی دەرچونی مەتبوع، ئەم رونکردنەوانەی خوارێی تێدا بێ:

1. ناوی داواکار و ناوبانگی و تەمەنی و شوێنی دانیشتنی و رەگەزنامەکەی.
2. ناوی مەتبوع و ئەو زمانەی پێی دەرئەچێ.

3. شوێنی دەرچون و نوسینگەی بەڕێوەبردنی.
4. جۆری بابەتەکانی ئەدەبی یا هونەری یا زانستی یا سیاسی‌یە.
5. کاتی بڵاوکردنەوەی.
6. نـاوی بەڕێوەبـەری بـەرپرس و ناوبـانگی و پلـەی زانسـتی و تەمـەنی و شـوێنی دانیشـتنی و ڕەگەزنامەکەی.
7. ئەگەر بەڕێوەبەرانی مەتبوع کۆمپانیایەکی هاوبەش بێ ئەبێ بەڵگەی تۆمارکردن و وێنەیەک لـە گرێبەستی کۆمپانیاکە و پێڕەوی ناوخۆ لە گەڵ ناوی نوێنەرەکەی یا بەڕێوەبەری بەرپرسی کاروبارەکـانی و، ئەندامانی بەڕێوەبەرایەتیەکەی و تەمەنیان و شوێنی دانیشتنیان و ڕەگەزنامەیان و پیشەکانیان، بـەیان بکرێ.
8. ئەگەر مـەتبوع هـی کۆمەڵـە بـێ، ئـەبێ نـاوی ئەندامـەکانی دەسـتەی بەڕێوەبەرایـەتی و سـەرۆکی بەرپرسی کاروبارەکانی، تەمەنیان و شوێنی دانیشتن و ڕەگەزنامە و پیشەکانیان بەیان بکرێ.

مادەی 4:

1. خاوەن مەتبوع، دوای وەرگرتنی ئیجازە، لە ڕۆژی پێشکەش کردنی خواستەکەیەوە تا ماوەی مانگێ ئەبێ بارمتە بە دراو بەمجۆرەی خوارێ، دابنێ:

أ. ئەگەر مەتبوع لە هەر 15 ڕۆژدا جارێ زیاتر دەرنەچێ بارمتەکە 30 دینار ئەبێ.
ب. ئەگەر مەتبوع لە هەفتەیەکـدا جارێ زیاتر دەرنەچێ بارمتەکە 75 دینار ئەبێ.
ج. ئەگەر مەتبوع لە هەفتەیەکـدا جارێ زیاتر دەربچێ بارمتەکە 100 دینار ئەبێ.
د. مەتبوعاتی دینی و زانستی و هونەری و ئەدەبی لە بارمتە ئەبەخشرێن.

2. خاوەنی مەتبوع ئەشێ چەردەی بارمتەکە لە بانکێکـدا دابنێ بە ناوی وەزارەتی ناوخۆوە بۆ ئەوەی سود لە قازانجەکەی وەربگرێ، بەڵام بۆی نەبێ بێ موافەقەتی وەزارەتی ناوخۆ دەسکاری بکا.
3. هەر مەتبوعێ ماوەی 6 مانگ دەرنەچو لە کاتی دانانی بارمتەکەوە، لەغو ئەکرێ.

مادەی 5:

ئەحکامی ئەم مادەیە ئەو مەتبوعانە ناگرێتەوە کە دائیرەکـانی حکومـەت یـا شـارەوانی‌یەکان دەری ئەکەن.

مادەی 6:

1. مەتبوع موڵکی خاوەنەکەیەتی، ئەشێ ببێ بە موڵکی یەکێکی تر بەو مەرجەی وەزیری نـاوخۆی لـێ ئاگادار بکرێ.
2. ئەگـەر خـاوەن مـەتبوع مـرد مـەتبوع ئەبێتـە مـوڵکی وەرەسـەکەی بـە پـێی قـانونی پێـڕەوی کراو.
3. ئەگەر خاوەن مەتبوع ئەرکی بەڕێوەبەری بەرپرسی گرتـە ئەسـتۆ، لـە کـاتی مردنـی‌دا ئـەتوانێ بەردەوام بێ لە سەر بڵاوکردنەوە بەو مەرجەی بەڕێوەبەرێکی بەرپرس دابنێن مەرجە قانونی‌یەکانی تـێ‌دا بێ.

مادەی 7:

جگە لە خاوەنی مەتبوع کەسی کە بۆی نیە ناوی هەمان مەتبوع یا بە جۆرێ سەرلێتێکدانی تێدا بێ، بە کار بهێنێ.

مادەی 8:

1. ئەگەر خاوەن مەتبوع ویستی گۆڕینێ لە زانیارییەکانی ناو ئەو خواستەدا بکا، کە لە م3 دا رون کراوەتەوە، ئەبێ وەزیری ناوخۆ لەو گۆڕینە ئاگادار بکا. بەڵام ئەگەر ویستی کاتی بڵاوکردنەوەی بگۆڕێ ئەبێ بە پێی م4 ی ئەم قانونە بارمتەکەی تەواو بکا.

2. ئەگەر یەکێ لە مەرجەکانی بەڕێوەبەری بەرپرس نەما، ئەبێ دەسبەجێ مەتبوع رابوەستێ و، وەزیری ناوخۆی لێ ئاگادار بکرێ.

3. خاوەن مەتبوع بۆی نیە پاشکۆ بۆ مەتبوعەکەی دەر بکا بێ موافەقەتی وەزیری ناوخۆ، مەگەر مەتبوعەکەی هەفتەی لە جارێ زیاتر دەربچێ.

4. خاوەن مەتبوع ئەبێ لە پایتەخت وەزیری ناوخۆ یا موتەسەریف لە لیواکاندا، لە هەر گۆڕانێکی بە سەر حاڵەتە باسکراوەکانی برگەکانی 7 و 8 ی م3 ی ئەم قانونەدا دێ، لە ماوەی 3 رۆژدا لە رودانی گۆڕانەکە ئاگادار بکا.

مادەی 9:

ئەگەر خاوەن مەتبوع ویستی دەس لە مافی خۆی لە مەتبوعەکە هەڵبگرێ، ئەبێ وەزیری ناوخۆ لەوە ئاگادار بکا، ئەوسا مەتبوعەکە لەغو ئەکرێ و، بە پێی م15 ی ئەم قانونە بارمتەکەی بۆ ئەگێڕدرێتەوە، ئەگەر کۆسپێ لە گێڕانەوەیدا نەبێ.

مادەی 10:

1. بەڕێوەبەری بەرپرس ئەبێ ناوی خۆی و ناوی ئەو چاپخانەیەی لێی چاپ ئەکرێ، لە سەروی مەتبوعەکەدا یا لە خوارویدا بنوسێ.

2. لە هەمو ژمارەیەک 2 دانە بنێرێ بۆ هەر یەک لە وەزیری ناوخۆ و داواکاری گشتی یا جێگرەکەی لە پایتەخت. وەزیری ناوخۆ بۆی هەیە بڕیار بدا، کە لە 5 دانە زیاتر نەبێ، بۆ ئەو فەرمانبەرانەی دانراون بۆ چاودێری مەتبوعەکان.

مادەی 11:

فرۆشیاری مەتبوع ئەبێ بەڕێوەبەری پۆلیسی ناوچەکە لە شوێنی و ناسنامە و شوێنی دانیشتنی ئاگادار بکا بۆ ئەوەی لە دەفتەری تایبەتیدا تۆماری بکا و، بەیانێکی دەربارەی بە خۆڕایی بداتێ. فرۆشیار بۆی نیە جگە لە ناوی ئەو مەتبوعەی ئەیفرۆشێ هاواری تر بکا.

## بەشی دوەم
## ڕاگرتن و ئیلغا

مادەی 12:

وەزیری ناوخۆ بۆی هەیە هۆشیاری بدا بە بەڕێوەبەری بەرپرس ئەگەر مەتبوعەکەی شتێ بڵاو بکاتەوە:

1. ئاسایشی ناوەکی یا دەرەکی دەوڵەت تێک بدا.
2. ببێتە هۆی رق و کینە لە ناو ریزەکانی گەل و چینەکانیدا بە جۆرێ ئاسایش بشێوێنێ.
3. کار لە پێوەندی دۆستانەی عیراق و دەوڵەتانی بێگانە بکا.
4. ئاداب و رەوشتی گشتی بشێوێنێ.
5. راستی بشێوێنێ بە نیازی وروژاندنی رای گشتی.

مادەی 13:

أ. ئەگەر بە پێی مادەی پێشو بەڕێوەبەری بەرپرس بۆ یەکەم جار هۆشیار کرایەوە، بەڵام بۆ جاری دوەم هەمان شتی بڵاوکردەوە کە لە مادەی ناوبراودا رون کراوەتەوە، لە ماوەی 30 رۆژدا لە رۆژی ئاگادار کردنی هۆشیاریەکەوە، وەزیری ناوخۆ بۆی هەیە بڕیاری راگرتنی (تەعتیل) بدا بۆ ماوەیەک لە 10 رۆژ زیاتر نەبێ.

ب. ئەگەر لە مەتبوعدا شتێ بڵاوکرایەوە کەرامەتی کەسانێ بگرێتەوە، یا ناوبانگیان، بێ ئەوەی سەرپێچییەکی قانونییان درابێتە پاڵ، یا بێ ئەوەی رەخنەی لە کارێکی دیاریکراویان گرتبێ، یا ئەگەر کارمەند بون-بێ ئەوەی لە مەتبوعەکەدا شتێ نوسرا بێ پێوەندی بە رەفتاریان یا ئیشەکانیان لە دەوڵەتدا هەبێ، وەزیری ناوخۆ بۆی هەیە مەتبوع بۆ ماوەی 10 رۆژ رابگرێ بێ هۆشیارکردنەوەی پێشەکی.

ج. ئەگەر مەتبوع بە پێی برگەی (أ) راگیرا دیسان شتی بڵاوکردەوە وەکو لە مادەی پێشودا باس کراوە پاش تەواو بونی ماوەی راگرتنی بە ماوەی کەمتر لەساڵێ، وەزیری ناوخۆ بۆی هەیە پرسەکە بخاتە بەردەم ئەنجومەنی وەزیران، ئەنجومەن بۆی هەیە بڕیاری راگرتنی بدا بۆ ماوەیەک لە 1 مانگ تێ نە پەڕێ.

مادەی 14:

ئەگەر مەتبوع بە بڕیاری ئەنجومەنی وەزیران راگیرا دوای تەواو بونی راگیرانەکەی شتی بڵاوکردەوە کە لە مادە 12 دا باس کراوە، وەزیری ناوخۆ بۆی هەیە پرسەکە بە دادگا بسپێرێ. دادگا بۆی هەیە بڕیاری راگرتنی بدا بۆ ماەیەکی کاتی یان هەمیشەیی.

مادەی 15:

1. ئەگەر مەتبوعێ بۆ ماوەیەکی کاتی راگیرا، خاوەنەکەی بۆی نیە داوای گێڕانەوەی بارمتەکەی یا حەواڵەکردنی بۆ کەسێکی کە بکا لە ماوەی راگیرانیدا.

2. ئەگەر مەتبوعێ بە بڕیاری دادگا لەغو کرا، خاوەنەکەی بۆی نیە داوای گێڕانەوەی بارمتەکەی یا حەواڵەکردنی بۆ کەسێکی کە بکا، مەگەر پاش تێپەڕینی مانگێ بە سەر رۆژی لەغوکردنیدا.

3. ئەگەر لەسەر ناوەرۆکی مەتبوعەکە دەعوا لە سەر بەڕێوەبەری بەرپرس کرا، دادگا بۆی هەیە فەرمانی حیجزی بارمتەی مەتبوعەکە بدا.

## بەشی سێیەم
## بەخشینی ئیجازە بە بێگانە

مادەی 16:

بێگانە ئەتوانێ خاوەنی مەتبوع بێ بە بڕیاری ئەنجومەنی وەزیران، بەو مەرجەی هاووڵاتی یەکێ لە دەوڵەتانی دۆستی عیراق بێ و، لەوەدا پێڕەوی رەفتاری بەرامبەری ناودەوڵەتانی تێدا بکرێ. ئەحکامی ئەم قانونە و ئەوەی لەم فەسڵەدا دێ بە سەریدا جێبەجێ ئەکرێ.

مادەی 17:

بێگانەی خاوەن مەتبوع ئەبێ:

1. لەسەر ژیننامەی و رەفتاری بەڵگە لە لایەن نوێنەری سیاسیی حکومەتەکەی یا کۆنسوڵی حکومەتەکەیەوە بهێنێ.

2. مەتبوعەکەی نەکا بە زمانی حاڵی یەکێ لە حیزبە سیاسییەکانی عیراق.

3. بەڕێوەبەرێکی بەرپرسی عیراقی دابنێ مەرجەکانی مادەی 2 ی ئەم قانونەی تێدا بێ.

4. بارمتە بە دراو لەلای وەزارەتی ناوخۆ دابنێ کە 75 دینارە.

مادەی 18:

وەزیری ناوخۆ بۆی هەیە مەتبوعی بێگانە بۆ ماوەیەک رابگرێ لە 3 مانگ تێ نە پەڕێ ئەگەر:

أ. پشتیوانی یا دژایەتی یەکێ لە حیزبە سیاسییەکانی کرد.

ب. بەرهەڵستیی سیاسەتی حکومەتی عیراقی کرد.

ج. شتێکی بڵاوکردەوە کەرامەتی عیراق یا گەلی عیراق بگرێتەوە.

د. شتێکی بڵاوکردەوە کە لە م12 ی ئەم قانونەدایە.

مادەی 19:

ئەنجومەنی وەزیران، لە سەر پێشنیاری وەزیری ناوخۆ، بۆی هەیە مەتبوعی بێگانە ئیلغا بکا لە هەلومەرجێکی تایبەتیدا کە، ئیلغاکردنەکەی لە بەرژەوەندی گشتی بێ.

## بەشی چوارەم
## سەرپێچی و سزا

مادەی 20:

1. سزا ئەدرێ بە تاوانە کە لە 5 دینار زیاتر نەبێ و، ئەگەر دوبارەی کردەوە لە 10 دینار زیاتر نەبێ، یا بە گرتن لە مانگێ زیاتر نەبێ، هەرکەسێ مەتبوعات دەر بکا:

أ. پێش دانانی بارمتەی قانونی و وەرگرتنی ئیجازە، یا پاش ئیلغای یا لە کاتی راگرتنیدا یان

ب. پێچەوانەی ئەوە بجوڵێتەوە کە لە مادەکانی 3 و 8 ی ئەم قانونەدا نوسراون. وەزیری ناوخۆ بۆی هەیە فەرمان دەر بکا بۆ دەسبەسەراگرتنی مەتبوع یا راگرتنی بڵاوکردنەوەی.

2. سزادان بە پێی ئەم مادەیە ڕێ ناگرێ لە سەپاندنی سزادانی قـانونی تـر ئەگـەر لـە مەتبوعەکـەدا شتێ هەبو پێویستی بەمە کرد.

مادەی 21:

بە تاوانەیەک سزا ئەدرێ لە 3 دینار زیاتر نەبێ:

1. بەڕێوەبەری بەرپرس، ئەگەر سەرپێچی لە ئەحکامی م10 ی ئەم قانونە کرد.

2. فرۆشیار، ئەگەر سەرپێچی لە ئەحکامی م11 ی ئەم قانونە کرد.

مادەی 22:

1. دادگایی و گفتوگـۆی نـاو ئەنجومـەنی قـانون دانـان و ئەنجومەنـەکانی کـارگێڕی و شـارەوانی و ئەنجومەنە ڕەسمی‌یەکانی تر، ئەشێ بڵاوبکرێنەوە.

2. کۆنوسی دادگا یا دەزگایەکی ڕەسمی کە بە نهێنی بە پێی قانون کۆبونەتەوە، یـا هـەر معاملەیـەک دادگا بڕیاری بڵاونەکردنەوەی هەموی یا هەندێکی دابێ، ناشێ بڵاوبکرێنەوە.

3. ناشێ شکات و ئەو دادگاییانەی پێوەندی‌یان بە کێشەی ناوزڕاندن و بەدگۆییەوە هەیە کە ناشێ بە قانون ئیسپات بکرێن، بڵاوبکرێنەوە. هەر کەس سەرپێچی ئەمە بکا بـە تاوانەیـەک سـزا ئـەدرێ کـە لـە 15 دینار زیاتر نەبێ.

مادەی 23:

بڵاوکردنەوەی قانون و نیزام پێش ئەوەی لە جەریدەی ڕەسمی‌دا بڵاوبکرێتەوە، نابێ. ئەوی سـەرپێچی بکا بە تاوانەیەک کە لە 7 دینار زیاتر نەبێ سزا ئەدرێ. بەڵام لەم مادەیەدا ڕێگرێـک نیـە بـۆ بڵاوکردنـەوەی لائیحەی قانونی.

مادەی 24:

ناشێ ئەو جۆرە دەنگوبـاس و کاروبـاری ڕۆژنامەیـەی م4 ی قـانونی مـافی دانـانی عوسـمانی‌ی 9 ی مایسی 1326 ڕێگەی بڵاوکردنەوەی داون، بە مەرجێ سەرچاوەیان ڕون بکرێتەوە، بڵاوبکرێنـەوە، ئەگـەر بـە لایەنی کەمەوە 24 سەعات بە سەر بڵاوبونەوەی‌دا تێنەپەڕی بێ. ئـەوی سـەرپێچی بکـا بـە تاوانەیـەک سـزا ئەدرێ لە 7 دینار زیاتر نەبێ.

تێبینی:

مادەی 4 ی قانونی دانانی عوسمانی (قانون التأليف العثماني):

ئەو وتار و ڕەسمانەی لە ڕۆژنامە ڕۆژنامەکان و کاتی‌یەکانا بڵاوئەکرێنەوە، ئەگـەر بـە عیبـارەتی "مـافی پارێزراوە" و "بڵاوکردنەوەی بۆ خاوەنەکەی نەبێ قەدەغەیە" بەسترابونەوە، مافی بڵاوکرادنەوەیان پـارێزراوە. بەڵام ئەو وتار و ڕەسم و هەواڵانەی بەم شێوەیە نەبەسترابنەوە مافی دانانیان تیا نیە، بـە مـەرجێ لـە کـاتی بەکارهێنانیان‌دا ناوی سەرچاوەکەیان بنوسرێ.

مادەی 25:

1. سزا ئەدرێ بە بەندی بۆ ماوەیەک لە 3 ساڵ تێ نە پەڕێ یا بە تاوانەیەک لە 200 دینار زیاتر نەبێ، یان بە هەردوکیان، هەرکەسێ لە مەتبوعێکا شتێ بڵاوبکاتەوە هەستی نادڵسۆزی بۆ شا بهروژێنێ یا سوکایەتی تێدا بێ بۆ زاتی شاهانە یا شاژن، یا وەلیعەهد، یا نائیبی شا.

2. بەڵام ئەگەر سوکایەتی بە ئەندامێکی بنەماڵەی شاهانە کرا بو کە لە قانونا دیاری کرابێ، یا بە یەکێ لە شاکانی دەوڵەتانی دۆستی عیراق، یا سەرۆکی حکومەتەکەی، بە بەندی بۆ ماوەیەک کە لە 1 ساڵ تێ نە پەڕێ یا بە تاوانەیەک کە لە 75 دینار زیاتر نەبێ سزا ئەدرێ.

مادەی 26:

سزا ئەدرێ بە ماوەیەک گرتن لە 6 مانگ تێ نە پەڕێ یا بە تاوانەیەک کە لە 50 دینار زیاتر نەبێ، هەرکەسێ لە مەتبوعێکا سوکایەتی بە نوسین یا بە وێنە بە دەستەی وەزیران، مجلسی امە، یا بە یەکێ لە ئەندامەکانی بکا، یا بە جەیش یا بە دەزگایەکی رەسمی، یا بە یەکێ لە کارمەندانی حکومەت، یا بە هەندێکیان بە هۆی بە جێ هێنانی ئەرکەکانیانەوە، بێ ئەوەی ناو ببا، یا مادەیەک تەرخان بکا، بە جۆرێ کە شەرەفیان یا شەرەفی هەندێکیان بگرێتەوە.

مادەی 27:

سزا ئەدرێ بە ماوەیەک کە لە 3 مانگ زیاتر نەبێ یا بە تاوانەیەک کە لە 25 دینار زیاتر نەبێ، هەرکەسێ شتێ لە مەتبوعێکا بڵاوبکاتەوە ئیهانە بێ بۆ کەسێ یا نهێنییەک بدرکێنێ بە بڵاوکراوە تەعەڕوز بێ بۆ کەرامەتی کەسێ یا شەرەفی یا زەرەر بدا لە ناوبانگی یا سامانەکەی، یا بە جۆرێکی تر شتێکی بڵاوکردەوە تەعەروز بە شەرەفی یا ناوبانگی بێ یا بە نیازی هەڕەشە لێ کردنی بۆ کێشانەوەی پارە، یا کرێی ئیعلانی بڵاوکراوە لە مەتبوعەکەیدا پێچەوانەی کرێی بڕیار دراو، یا ئەوەندەی ئەو، یا دەسکەوتی لەم بابەتە بۆ خۆی یا بۆ یەکێکی تر. بەڵام قەزف و سەب بڵاوکەرەوەکانیان بە پێی قانونی عقوبات سزا ئەدرێن.

مادەی 28:

سزا ئەدرێ بە گرتن بۆ ماوەیەک لە 1 ساڵ زیاتر نەبێ یا بە تاوانەیەک کە لە 75 دینار زیاتر نەبێ هەرکەسێ لە مەتبوعێکا شتێکی رەسمیی بڵاوبکاتەوە پێوەندی بە لەشکرکێشی جەیش یا هەر کارێکی سەربازی یا مدنییەوە هەبێ، کە بزانێ ئاگادار بونی لەوانە بە جۆرێکی ناڕەوا بوە، یا بە هۆی درکاندنیەوە بوە لە کەسێکی تر بە جۆرێکی ناقانونی، یا سوکایەتی بە جەیش، وە ئەگەر بزانێ بڵاوکردنەوەی زەرەر بە بەرژەوەندی دەوڵەت ئەگەیەنێ، یا ئەبێ بە هۆی ئەوە، سزا ئەدرێ بە بەندی بۆ ماوەیەک لە 3 ساڵ تێ نە پەڕێ یا بە تاوانەیەک لە 200 دینار زیاتر نەبێ.

مادەی 29:

1. لە سەر خاوەن مەتبوع پێویستە بە خۆڕایی لە هەمان شوێنا کە قەزف یا ئیهانەی بەرامبەر کەسێ تێدا نوسراوە، ئەو وەڵامە بڵاوبکاتەوە کە لە هەمان کەسەوە، یا لە وەکیلەکەیەوە، یا لە یەکێ لە کوڕ و نەوەکانیەوە، ئەگەر بڵاوکراوەکە قەزفی مردو بو، بڵاوبکاتەوە. بەو مەرجەی وەڵامەکە بە قەوارە گونجاو بێ لەگەڵ بڵاوکراوەکە.

2. ئەبێ وەڵامدانەوەکانی کە حکومەت ئـەیاننێرێ لـە وەڵامـی ئـەو بڵاوکراونـەدا کـە بـە پێچەوانـەی ڕاستی‌یان ئەزانێ، بڵاوبکرێنەوە.

3. خاوەنی مەتبوعێ کە دادگایی تایبەت بە یەکێکی بڵاوکردەوە ئەبێ ئەو بڕیارەش بڵاوبکاتەوە کە لـە ئەنجامی دادگاکەدا دەرچوە، ئەگەر ئەو کەسە داوای کرد.

4. خاوەن مەتبوع ئەبێ ئەوەی لە بڕگەکانی 1 و 2 و 3 ی ئەم مادەیەدا باس کـران بڵاوبکاتـەوە بـە هەمان تیپ و لە هەمان ستوندا، لە یەکەم ژمارەی مەتبوعەکەی‌دا. ئەوی سـەرپێچی ئەمـە بکـا سـزا ئـەدرێ بـە تاوانەیەک لە 20 دینار زیاتر نەبێ.

مادەی 30:

1. هەر یەکێ لەوکەسانەی لە خوارێ ناوبراون بە پێی ئەم قانونە بە ناشر دائەنرێن:

بەڕێوەبەری بەرپرس لە هەمو حاڵەتێکا و، خاوەنی وتاری شایانی سزادان ئەگەر ئیمزای هەبو، خاوەن چاپخانە و فرۆشیار لە کاتی نەناسین یا نەدۆزینەوەی بەڕێوەبەری بەرپرس و خاوەنی وتاردا.

2. بەڵام دابینکردنی زەرەری ئـەدەبی و مـادی ئەکەوێتـە سـەر خـاوەن وتـار، ئەگـەر هـەبو، وە سـەر بەڕێوەبەری بەرپرس و خاوەن مەتبوع پێکەوە.

مادەی 31:

داواکاری گشتی ئـەو دەعوایانـە بـەرز ئەکاتـەوە کـە پێکـدێ لـە سـەرپێچی مادەکـانی ئـەم قانونـە و دەعواکانی ئیهانە بە پێی مادەکانی 25 و 26 و بە پێی م29 ئەگەر ئیهانە یا قـەزف و سـەبـی سـەفیر، یـا نوێنەری یەکێ لە دەوڵەتانی مەوجود لە عیراق کرا بو، بـەڵام ئیهانـە و قـەزف و سـەبـی یـەکێکی تـر، مـدعی شەخسی، یا وەرەسەکەی ئەیکا، ئەگەر مرد بو.

مادەی 32:

وەزیری ناوخۆ بۆی هەیە فەرمان دەر بکا بە موسادەرەی ژمارەکانی مەتبوع لەم حاڵەتانەدا:

1. ئەگەر شتێکی تێدا بو پێویستی بە جێبەجێ کردنی مادەکانی فەسڵی دوەمی ئەم قانونە کرد.

2. ئەگەر ئیهانە و قەزف و سەبی تێدا بو ئەرکی داواکاری گشتی‌یە بە پێی ئەم قانونە دەعوایـان لـە سەر بکا.

3. ئەگەر پێچەوانەی م20 ی ئەم قانونە دەرچو.

مادەی 33:

1. ئەوەی خۆی بە زەرەرمەندی مادی یا مەعنەوی دابنێ لە بڵاوکراوەکانی مەتبوعێکا، مراجعـەی دادگـا بکا و دەعوا لە سەر کەسانی بەرپرس تۆمار بکا بە پێی م30 و بۆی هەیە داوای زیان و بژاردن بکا. دادگـا بۆی هەیە بڕیاری بژاردنی گونجاو بدا سەرەڕای حوکمدان بە سزای گرتن و تاوانە یا ڕاگرتنـی مـەتبوع، بـە پێی ئەم قانونە و قانونەکانی تر.

2. بەڕێوەبـەری بـەرپرس ئـەبێ بڕیـاری دەرچـوی دادگـا بـە پـێی بڕگـەی 1، لـە ژمـارەی یەکـەمی مەتبوعەکەی‌دا دوای پێ ڕاگەیاندنی، بڵاوبکاتەوە. ئەگەر نەتوانرا لە ژمارەی دوەمـی‌دا، ئەگـەر سـەرپێچی کـرد سزا ئەدرێ بە تاوانەیەک لە 20 دینار زیاتر نەبێ.

3. دادگا بۆی هەیە بڕیارەکەی لە مەتبوعێکی تردا بڵاوبکاتەوە بەو مەرجەی حوکمدراو پارەی بڵاوکردنەوەکەی بدا، ئەگەر نەتوانرا لە هەمان مەتبوعا بڵاوبکرێتەوە.

مادەی 34:

1. گوێ لە دەعوای تاوانی مەتبوعات ناگیرێ ئەگەر لە ماوەی 3 مانگدا لە رۆژی بڵاو کردنەوەیەوە بەرز نەکرێتەوە، بێ گوێ دانە رۆژی ئاگادار بون.

2. دەعواکە پوچ ئەبێتەوە ئەگەر 3 مانگ پاش بەرزکردنەوەی وازی لێ هێنرا.

مادەی 35:

هەمو ئینزار و موخابەراتێ کە لە دائیرەکانی حکومەتەوە بە گوێرەی ئوسوڵ ئەنێردرێن بۆ تەبلیغی نوسینگەی بەڕێوەبردنی مەتبوع، وا دائەنرێ کە بەشێوەیەکی قانونی تەبلیغ کراوە.

مادەی 36:

حکومەت بۆی هەیە نیزام دەر بکا بۆ چۆنیەتی دامەزراندنی نەقابەی مەتبوعات.

مادەی 37:

قانونی مەتبوعاتی ژمارە 82 ی ساڵی 1931 و و تعدیلی ژمارە 56 ی ساڵی 1932 ی لەغو ئەکرێن.

مادەی 38:

ئەم قانونە لە رۆژی بڵاوکردنەوەیەوە لە جەریدەی رەسمیدا جێبەجێ ئەکرێ.

مادەی 39:

وەزیری ناوخۆ و داد پێویستە ئەم قانونە جێبەجێ بکەن.

لە رۆژی 16 ی رەبیع لئەوەل ی ساڵی 1356، بەرامبەر 9 ی تەموزی 1933 لە بەغدا نوسرا.

**غازی**
**نائیبی مەلیک**

| محەمەد زەکی | حیکمەت سلێمان | رەشید عالی |
|---|---|---|
| **وەزیری عەدلیە** | **وەزیری ناوخۆ** | **سەروەزیر** |

**(لە وەقائیعی عیراقی ژ1280 لە 1933/8/3 دا بڵاوکراوەتەوە)**

